www.alibapir.com

# تەفسیری قورئانی بەرزو بەپێز

## بەرگی بیست و هەشتەم

سوورەتەکانی
(الطور) و (النجم) و (القمر)
(الرحمن) و (الواقعة)


لە تۆڕە کۆمەڵایەتییەکان لەگەڵتانین
Stay in touch on social media
نحن معكم عبر مواقع التواصل الاجتماعي

عەلی باپیر/AliBapir
ڕاگەیاندنی مەکتەبی مامۆستا عەلی باپیر
عەلی باپیر/AliBapir
archive.org/details/@alibapir
کەناڵی
ڕاگەیاندنی مەکتەبی مامۆستا عەلی باپیر
AliBapir
Google Play
App Store
www.alibapir.net
کوردی - عربي - English
ڕاگەیاندنی مەکتەبی مامۆستا عەلی باپیر

www.alibapir.com

تەفسیری سوورەتەکانی

# الطور و النجم و القمر
# الرحمن و الواقعة

نووسینی : عەلی باپیر

دیزاینی ناوەوە : زەردەشت کاوانی

چاپی یەکەم ١٤٤٤ك - ٢٠٢٣ز

٨٢٠ لاپەڕە

١٧* ٢٤ سم

بابەت : ئایینی

لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتیەکان - هەرێمی کوردستان
ژمارە سپاردنی ( ٧ ) ی ساڵی ٢٠١٢ پێدراوە

www.alibapir.com

## تەفسیری سوورەتەکانی

# الطُّور و النَّجْم و القَمَر
# الرَّحْمن و الوَاقِعَة




**نووسینی:** عەلی باپیر

www.alibapir.com


## پێشەكی ئەم تەفسیرە بەگشتیی

إنَّ الحَمْدَ للَّهِ نَحْمَدُهُ وَنَسْتَعِينُهُ، وَنَسْتَغْفِرُهُ، وَنَعُوذُ بِاللَّهِ مِنْ شُرُورِ أَنْفُسِنَا، وَمِنْ سَيئَاتِ أَعْمَالِنَا، مَنْ يَهْدهِ اللَّهُ فَلاَ مُضِلَّ لَهُ، وَمَنْ يُضلِلْ فَلاَ هَادِيَ لَهُ، وَأَشْهَدُ أَن لاَ إلَهَ إلاّ اللَّهُ وَحْدَهُ لاَ شَرِيكَ لَهُ، وَأَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّداً عَبْدُهُ وَرَسُولُهُ.

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱتَّقُواْ ٱللَّهَ حَقَّ تُقَاتِهِۦ وَلَا تَمُوتُنَّ إِلَّا وَأَنتُم مُّسۡلِمُونَ ١٠٢ ﴾ آل عمران.

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ ٱتَّقُواْ رَبَّكُمُ ٱلَّذِي خَلَقَكُم مِّن نَّفۡسٖ وَٰحِدَةٖ وَخَلَقَ مِنۡهَا زَوۡجَهَا وَبَثَّ مِنۡهُمَا رِجَالٗا كَثِيرٗا وَنِسَآءٗۚ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ ٱلَّذِي تَسَآءَلُونَ بِهِۦ وَٱلۡأَرۡحَامَۚ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَلَيۡكُمۡ رَقِيبٗا ١ ﴾ النساء.

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱتَّقُواْ ٱللَّهَ وَقُولُواْ قَوۡلٗا سَدِيدٗا ٧٠ يُصۡلِحۡ لَكُمۡ أَعۡمَٰلَكُمۡ وَيَغۡفِرۡ لَكُمۡ ذُنُوبَكُمۡۗ وَمَن يُطِعِ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ فَقَدۡ فَازَ فَوۡزًا عَظِيمًا ٧١ ﴾ الأحزاب .

أَمَّا بَعْدُ: فإِنَّ أَصْدَقَ الحَدِيث كَلاَمُ اللَّه، وَخَيْرَ الْهَدِي هدْيُ مُحَمَّد ﷺ وَشرَّ الأُمُورِ مُحْدَثاتُها، وَكُلَّ مُحْدَثَةٍ بِدْعَة، وَكُلَّ بِدْعَةٍ ضَلاَلَةٌ، وَكُلَّ ضَلاَلَةٍ فِي النَّار[١].

**خوێنەرە بەڕێزو خۆشەویستەكان!**

هیچ گومانی تێدانییە - بۆ مرۆڤی بڕوادار - كە ئەو تەمەنەی لە خزمەت دوایین كتێبی خوا (قورئان)دا بەسەردەبرێ، جا بە هەر شێوەیەك لە شێوەكانی لە خزمەتدابووندا بێ؛ خوێندنەوە، تێفكرین و ڕامان، فێركردن، كارپێكردن ... هتد، بە باشترین جێگرتن جێگا دەگرێ و، خاوەنەكەی لە دنیاو دواڕۆژدا لێی بەهرەمەندە.

---

(١) ئەوە پێی دەگوترێ: (خطبة الحاجة) كە پێغەمبەر ﷺ هاوەڵانی بەڕێزی فێردەكرد، پێش هەر قسەیەكی گرنگ، بیڵێن، وەك وتاری جومعەو داخوازییكردن (خِطْبة)و... هتدو، ئەم وتارە، هەركام لە: الترمذي: (١١٠٥)، النسائي: (١١٠٤)، ابن ماجه: (١٨٩٢) أحمد: (٣٧٢٠)، الطّبراني: (٢٤١٤) هێناویانەو (مسلم)یش بەشێكی هێناوە.

www.alibapir.com


منیش - کە وەك باسکردنی چاکەی خوا (التحدّث بنعمة اللّه) دەیخەمەڕوو- لەوەتی فامم کردۆتەوە، خوای بەبەزەیی و بەخشەر چاکەی لەگەڵ کردووم و، بە فەرمایشتی بەرزو بێ وێنەی خۆیەوە سەرگەرمی کردووم و، بەر لە تەمەنی بیست ساڵییەوە هیدایەتی داوم، قورئانی بەڕێزو پێز لەبەر بکەم و، سەرقاڵی خوێندنەوەی تەفسیرەکانی قورئان و، تێوەڕامانی ئایەتە پڕ بەرەکەتەکانی و، لێوردبوونەوەیان بم.

هەر بۆیەش تێکڕای کتێب و نامیلکەو وتارو دەرسەکانم، کەم و زۆر لەبەر ڕۆشنایی قورئان دابوون، کە دیارە هەر ئەمەش شتێکی سرووشتییە؛ ئاخر ئایا ئیسلام، بێجگە لە قورئان پاشان سوننەتی پێغەمبەر ﷺ، کە ئەویش هەر ڕوونکردنەوەی قورئان و چۆنیەتی جێبەجێکردن و کارپێکردنیەتی، شتێکی دیکەیە؟! بێگومان نەخێر.

ئنجا لەمێژ ساڵیش بوو، کە براو خوشکانێکی دڵسۆزی نزیك و ئاشنام، داوایان لێدەکردم کە دەست بکەم بە دانانی تەفسیرو لێکدانەوەیەکی قورئان، هەتا لە ڕەمەزانی ساڵی (١٤٢٨)دا هاتە دڵمەوە، کە ناوی خوای لێبهێنم و دەست بەو کارە گەورەو گرنگە بکەم، بەڵکو وردە وردە بەپێی بوارو دەرفەت، هەرساڵە هەندێکی لێ ئەنجام بدەم، لەگەڵ سەرقاڵیی زۆرو جۆراو جۆریشدا، هەتا دەرفەتێکی وام بۆ دەڕەخسێ کە بتوانم خێرایی تێدا بکەم و خۆمی بۆ یەکلایی (متفرِّغ) بکەمەوەو، خوا پشتیوان بێ تەواوی بکەم، ئەگەر تەمەن بەبەریەوە مابێ.

سەرچاوەی دانانی ئەم تەفسیرو لێکدانەوەیەشم، وێڕای سەرنجدانی زۆربەی ئەو تەفسیرانەی کە باون و، دەستم پێیان گەیشتوە، بریتیە لە وردبوونەوەو تێوەڕامانی خۆم لە خودی قورئان، چونکە بێگومان قورئان: هەندێکی هەندێکی ڕوون دەکاتەوە: (**القرآن يُفَسِّر بَعْضُهُ بَعْضاً**)، پاشان سوننەتی پێغەمبەری خوا ﷺ، چونکە پێغەمبەری خواش ڕوونکەرەوە(**مُبَيِّن**)ی قورئانە،وەك خوا بسم الله الرحمن الرحيم فەرموویەتی:

www.alibapir.com



﴿...وَأَنزَلْنَآ إِلَيْكَ ٱلذِّكْرَ لِتُبَيِّنَ لِلنَّاسِ مَا نُزِّلَ إِلَيْهِمْ وَلَعَلَّهُمْ يَتَفَكَّرُونَ ﴿٤٤﴾﴾ النحل.

واتـە: هەروەهـا زیكرمـان بـۆ لای تـۆ ناردۆتـە خـوار، تاكـو ئـەوەی بـۆ خـەڵكی نێرراوەتـە خـوار، بۆیـان ڕوون بكەیـەوە، وە بەڵـكو خۆشـیان بیـربكەنەوە.

ئومێدیشم وایە - بە یارمەتی خوای بەخشـەر بسم الله الرحمن الرحيم - شـایسـتەیی ئەوەم هـەبێ تەفسـیـرو لێكدانەوەیەكی وا بۆ قورئـان پێشـكەش بە مسـوڵمانانی كوردسـتان بكەم، كـە لـە قورئـان بوەشـێتەوەو، مایـەی بەهـرەو سـوودی خوێنـەران بـێ، بەتایبـەتیش كـە زیاتـر لـە سـی (٣٠) ساڵە لەگەڵ قورئانی بـەرزو مـەزن و تەفسـیـرەكانی و كتێبەكانی سـوننەتدا خـەریكم و، دەیـان كتێـب و بەرهــەمی جۆراوجـۆرم لـە زۆربـەی بـوارەكانی زانسـتەكانی شـەریعەتدا پێشـكەش كردوون.

شـایانی باسیشـە كـە ئەو بیسـت و دوو مانگ زیندانیـی كرانەم لەلایـەن ئەمریكاوە - لـە (٢٠٠٣/٧/١٠ تاكـو: ٢٠٠٥/٤/٢٨) - دەرفەتێـكی گـەورەو گرنـگ بـوو، بـۆ زیاتـر پێدا قووڵـبوونەوەی كتێبـی خـوا (تبـارك و تعالـى) و، بۆ پەیدابوونی تێگەیشـتنی تایبـەت لەبـارەی زۆرێـك لـە ئایەتـەكانییەوە، ئـەم ڕاسـتییەش لـە مەوسـووعەی: (**الإسـلام كـما يتجلّى فـي كتـاب اللّـه تعالـى**)دا زۆر چـاك دەرەوشـاوەتەوە[1]، بـەڵام هـەڵبەتە ناڵـێم و هیچكەسیش بـۆی نیە بڵـێ: كـە ئـەم تەفسـیرەی من تێروتـەواوە، چونكـە وێـڕای سـنووردارbوونی توانـاو بڕسـتم، لـە بەرانبـەر كتێبـی لـە هـەموو ڕوویێكـەوە ڕەهـا (مطلـق)و بێسـنوور (لا محـدود)ی خـوادا، نەشـمویسـتوە كـە زۆر بەمـلاولادا بچـم و بچمـە نێو هـەندێك وردەكارییەوە، كە یان من تێیـدا پسپۆڕو

(١) ئـەو مەوسـووعەیە ئێسـتا چـاپ كـراوەو، كەوتۆتـە بەردەسـتی خوێنـەران و، سـەرجەم هەشـت بەرگ و دەوری سـێ هـەزارو پێنج سـەد (٣٥٠٠) لاپەڕەیەو، هـەوڵمـداوە بەگشـتی تێیدا باسـی سـەرجەم لایەنـەكانی ئیسـلام بكـەم و، تاكـە سـەرچـاوەشم قورئـان بـووە، وێـڕای دەقـەكانی سـوننەت، كـە لـە هـۆش (ذاكـرة)دا بـووون.

شـایانی باسـە ئەو مەوسـووعەیە لە چاپی دووەمی دا، كراوە بە دوازدە (١٢) كتێبـی سـەربەخۆ، بە مەبەستی ئاسـانتـر سـوود لێ بینـرانی .

www.alibapir.com


شـارەزا نیم، یان خوێنـەر پێویسـتی پێی نیە، لە کاتێکدا دەیـەوێ لـە قورئان تێبگات و، بزانێ خـوا (تبارك وتعالى) ڕاستەوخۆ چی پێ فـەرمووە؟!

ئنجا هـەر لێرەشەوە بە پێویستی دەزانم پڕ بە دڵ سوپاسی ئەو برا گەنجە ڕووح سـووك و گورج و گۆڵ و دڵسۆزە بکەم (حەزی نەکرد ناوی بهێنم)، کە هـەڵسا بـە نووسینەوەو هێنـانە سـەر کاغـەزو، پاشان تایپکردن و دوایی پێداچوونـەوەو هەڵەگیریی، سـەرجـەم ئـەم زنجیـرە دەرسە، کە لـە ئەسـڵدا لـە شێوەی وتار (محاضرة)دا پێشکەش کراون، هـەروەها هـەڵسا بـە (تخريج)ی سـەرجەم دەقەکانی سـوننەت، لـە سـەرچاوە متمانە پێکراوەکانـەوەو، زەحمـەت و ماندووبوونێکی زۆری بـە سـەرجەم بەرگـەکانی ئـەم تەفسیـرەوە کێشـاوە، خـوا بـە باشترین شـێوە پاداشتی بداتـەوەو، هـەر صـاڵح و سـاغ و سـەلامەت و سـەربەرزبێ[1]، لـە خـوای بـەرزو بێهـاوتاش داواکارم ئـەو جـۆرە گەنج و لاوانـە لـە کوڕان و کچـان، لەنێو گەلەکەمانـدا، زۆر بـکات .

شـایانی باسیشـە کـە ئێمـە لـەم تەفسیـرەماندا، بـاسی بـەش (جـزء)ەکانی قورئـان و دابەشـکردنەکانی دیکـەی وەك: - (حـزب) - ناکەیـن، چونکـە هــەر سـوورەتێك بۆخـۆی شـتێکی سـەربەخۆیـەو، سـەرجەم ئایەتـەکانی وەك ئاڵقـەکانی زنجیرێـك پێکـەوە پەیوەستن و، ئاشکراشـە کـە دابەشـکرانی سـەرجەم قورئـان بـۆ سـی (٣٠) بـەش (جـزء) و شەسـت (٦٠) (حـزب)، شـتێکە لەلایـەن زانایانـەوە کـراوە، بـۆ ئاسـانکاریی خوێنـدنی قورئـان، دیـارە ئێمـە لـە دابەشـکردنی بەرگـەکانی ئـەم تەفسیـرەشـدا، دیسـان حیسـاب بـۆ بەشـەکان (أجـزاء)ی ناکەیـن و، بـە گوێـرەی سـوورەتەکان، بەرگـەکانی دیـاریی دەکەیـن.

---

(١) ئـەو بـرا دڵسـۆزە ئێسـتاش پاش تەواوکردنی زۆربـەی قورئان، لێبڕاوانـە بەردەوامـە و عەزمیشـی جـەزم کردوە، کە ئەگەر تەمەنمـان بەردەوام بێ، هەتـا کۆتـایی ئەم تەفسیـرە سـەرگەرمی کارەکـەی بێ .

دوا قســەشــم ئەوەیــە کە:

ئـەم تەفســیرە - وەك پێشــتــر گوتمــان - لـە ئەســڵدا بەشـێوەی دەرس و وتـار پێشـکەش کـراوە، بـەڵام دواتـر خـۆم دووجـار بـە وردیـی پێیـدا چوومـەوەو، بەپێـی پێویسـت دەسـتکارییم کـردوە، دیـارە هـەموو دەرسـێکیش بەنـاوی خـواو سـتایشی خوا بسم الله الرحمن الرحيم دەسـتی پێکردوە، بەڵام ئێمە لە سـەرەتای دەرسـەکانەوە، ئەوانەمان لابـردوە، بـۆ زۆر دووبـارە نەبوونـەوەو، ئـەو (خطبـة الحاجـة)یەی لـە سـەرەتای ئـەم پێشـەکەییەوە هاتـوە، لەجیـاتی سـەرەتای سـەرجەم دەرسـەکانە.

سُبْحَانَ رَبِّكَ رَبِّ الْعِزَّةِ عَمَّا يَصِفُونَ،

وَسَلامٌ عَلَى الْمُرْسَلِينَ، وَالْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ .

دووشەممە ٢٥ رجب ١٤٣٢

٢٠١١/٦/٢٧

هـەولـێر

لە ئۆرە کۆمەڵایەتییەکان لەگەڵتانین
Stay in touch on social media
نحن معكم عبر مواقع التواصل الاجتماعي
ڕاگەیاندنی مەکتەبی مامۆستا عەلی باپیر
عەلی باپیر/AliBapir
archive.org/details/@alibapir
عەلی باپیر/AliBapir
AliBapir
Google Play
App Store
کەناڵی ڕاگەیاندنی مەکتەبی مامۆستا عەلی باپیر
www.alibapir.net
کوردی - عربي - English
ڕاگەیاندنی مەکتەبی مامۆستا عەلی باپیر

## بەرچاو ڕوونییەکی گرنگ

## لەبارەی ئەم تەفسیرەوە

**خوێنەری بەڕێز !**

هەرچەندە لە (پێشەکی گشتیی) ئەم تەفسیرەدا باسمان کردوە کە بۆ نووسینی ئەم تەفسیرە، لە هەموو ئەو تەفسیرە باوانەی دەستم پێیان گەیشتوە، بەهرەمەندبووم، هەروەها لە کۆتایی هەر بەرگێکی ئەم تەفسیرەدا، سەرجەم ئەو تەفسیرانەی کەم و زۆر لێیان سوودمەند بووم، ناوەکانیانمان بە ڕیز نووسیون[1]، بەڵام لێرەش وەك جەختکردنەوەی زیاترو بەرچاوڕوونیی باشتر بۆ ئێوەی بەڕێز دەڵێم :

مادام ناوی تەفسیرەکانمان نووسیوە، نە پێویست دەکات و نەدەشگونجێ، بۆ هەر تێگەیشتن و بیرۆکەیەك، کە زۆربەی تەفسیرەکان لەبارەی ئایەتێکەوە، یان ڕستەو بڕگەیەکی ئایەتێکەوە، دەیهێنین، ئێمە هەموو جارێ ناوی ئەو تەفسیرانە بێنین، بەڵام بێگومان هەر کات بیرۆکەو تێگەیشتنێکی تایبەتی یەکێك لە تەفسیرەکان هەبێ و بکەوێتە بەرچاوم، ئنجا چ پەسندی بکەم، چ ڕەفزی بکەم، هەر کات بە پێویستی بزانم، بە تایبەت ئاماژەی پێدەکەم، ئەگەرنا بە ئاماژەی گشتیی و بە نووسینی ناوی تەفسیرەکان لە کۆتایی هەر بەرگێك دا، ئیکتیفا دەکەم و، زۆریش لە ئەمانەتی زانستیی (الأمانة العلمیة) دەخەفتێم و مەبەستمە ڕەچاوی بکەم، چونکە ئەمینیی و ئەمانەت پارێزیی، ڕەوشتێکی گەورەو بەرزی مسوڵمانەتییە .

---

(١) دوایی وا بەباش زانرا ناوی تەفسیرەکان لاببرێن و، لە کۆتایی کۆی بەرگەکانی [تەفسیری قورئانی بەرز و بەپێز]دا دەیاننووسین.

www.alibapir.com


شایانی باسیشـە جاری وا هەیـە بیـرۆکەو تێگەیشـتنێکی تایبەتیـی خـۆمم، دەربارەی کۆمەڵـە ئایەتێـك یـان ئایەتێـك یـان ڕسـتەو بڕگـەیەکی ئایەتێـك، بۆ دروست دەبێ، وەك تێگەیشـتن و بۆچـوونـی خـۆم دەینووسـم، کەچـی ڕەنگـە لـە تەفسـیـرەکانی دیکـەش – یەکێکیـان یـان زیـاتر - دا هەبـێ، ئەویـش بەهـۆی ئەوەوەیـە کـە مـن ئەو تەفسیـرەم نەکەوتـۆتـە بەر دیـدە، یان دیتوومـەو لەیـادم نەمـاوە.

لە ڕێی کۆمەڵایەتییەکان لەگەڵتانین
Stay in touch on social media
نحن معکم عبر مواقع التواصل الاجتماعي
ڕاگەیاندنی مەکتەبی مامۆستا عەلی باپیر
AliBapir/عەلی باپیر
archive.org/details/@alibapir
AliBapir/عەلی باپیر
AliBapir
کەناڵی ڕاگەیاندنی مەکتەبی مامۆستا عەلی باپیر
www.alibapir.net
کوردی - عربي - English
ڕاگەیاندنی مەکتەبی مامۆستا عەلی باپیر

www.alibapir.com


## پێشەكی ئەم بەرگە

الحمدللـه ذي الجـلال والإكـرام، والصـلاة والسـلام علـى محمـد خيـر الأنـام وآلـه الكـرام، مـن الصحبـه وأهـل البيـت والقرابـة والتابعيـن لهـم بإحسـان إلـى يـوم القيامة.

خوێنەری سەنگین و شیرین!

ستایشـی شایسـتە بـۆ خـوای بەرزومـەزن و میهرەبـان كە لـە چـاپ و بڵاوكردنەوەی ئـەم تەفسـیرەمان دا - تەفسـیری قورئانـی بەرزوبەپێـز - گەیشـتینە ئـەم بەرگـی بیسـت و هەشـتەمە، كـە زۆربـری هـەرە زۆری بـەش (جـزء) ی بیسـت و حـەوت (٢٧)ی گرتۆتەخـۆی، سـوورەتەكانی: (الطـور والنجـم والقمـر والرحمـن والواقعـة).

ئاشكراشـە لـەم بەرگـەش دا هەمـان شـێواز و چۆنیەتیـی بەرگەكانـی پێشـوو ڕەچـاو كـراوەو بـە حـەوت قۆنـاغ، ئایەتـە بەپێزاكانـی هـەركام لەو پێنج سـوورەتە تەفسـیركراون و چەمـك و واتاكانیـان ڕوونكراونـەوە:

پێناسـەی ئایەتـەكان و، هێـنران و نووسرانیـان و، مانـای دەقاودەقیان و، شـیكردنەوەی وشـەكان و، خسـتنەڕووی هـۆی هاتنەخـوار - ئەگـەر هەیانبـێ - و، مانـای گشـتیی و، مەسـەلە گرنگـەكان.

ئـەم بەرگـەش وێـڕای لێكدانـەوەی مانـای ئایەتەكانـی ئـەو پێنـج سـوورەتە موبارەكە، چەنـد كورتـە باسێكیشـی گرتوونەخـۆی بەمجـۆرەی خوارێ:

**یەكەم: سوورەتی (الطور):**

دەرسی سێیەم:

كورتەباسێك لە سێ سەرنج دا.

www.alibapir.com


## دووەم: سوورەتی (النجم):

### دەرسی یەكەم:

١- ڕوونكردنەوەیەك لەبارەی واتای (ضل) و (غوی)وە.

٢- كورتەباسێك: سێ سەرنجی ورد.

٣- ڕوونكردنەوەیەك لەبارەی (سدرة المنتهى).

٤- كورتەباسێك لەبارەی دوو دیتنەكەی پێغەمبەرەوە (صلى الله علیه وسلم).

### دەرسی دووەم:

٥- پێناسەیەكی كورتی گوناهە گەورەكان و وردە گوناح.

٦- كورتەباسێك لەبارەی خۆ، یان خەڵك بە پاك و چاك دانانەوە.

### دەرسی سێیەم:

٧- باسێكی كورت لەبارەی لاپەڕەكانی مووسا و ئیبراهیمەوە (علیه السلام).

٨- كورتەباسێك لەبارەی بەهرەمەند بوونی مرۆڤەوە لەچاكەی جگە لەخۆی.

٩- كورتەباسێك لەبارەی ئەستێرەی گەلاوێژەوە.

## سێیەم: سوورەتی (القمر):

### دەرسی یەكەم:

١٠- كورتەباسێك لەبارەی دژواریی ڕۆژی دواییەوە.

١١- كورتەباسێك لەبارەی لەتبوونی مانگەوە.

### دەرسی سێیەم:

١٢- كورتەباسێك لەبارەی ئەندازەگیریی خواوە لە دروستكراوەكانی دا.

www.alibapir.com


## چوارەم: سووڕەتی (الرحمن):

دەرسی یەکەم:

**١٣-** مەبەست لە وشەی (المیزان) لە هەرسێك ئایەتی: (٧ و ٨ و ٩)دا.

**١٤-** کورتەباسێك لەبارەی فراوانیی و بەرزکرانەوەی ئاسمان و، هاوسەنگیی نێوان خۆر و زەوی و مانگەوە.

**١٥-** پێناسەی (لؤلؤ) و (مرجان) و سەرنجدانێکی زەوی.

دەرسی سێیەم:

**١٦-** کورتەباسێك: سێ بابەتی گرنگ.

## پێنجەم: سووڕەتی (الواقعة)

دەرسی یەکەم:

**١٧-** کورتەباسێك لەبارەی دەرنجامی زەوی و چیایەکانەوە لە ئاخیرزەمان دا.

دەرسی دووەم:

**١٨-** پوختەی باسی سزای بێبڕوایان و هۆکارەکانی

دەرسی سێیەم:

**١٩-** کورتەباسێك لەبارەی گۆڕانی گەردوون و گۆڕانی جەستەی مرۆڤەوە.

**٢٠-** دارودرەخت کانگای ئاگر و سووتەمەنییەوە.

دەرسی چوارەم:

**٢١-** کورتەباسێك لەچوار سەرنج دا.

**٢٢-** حوکمی دەستلێدانی قورئان بۆ بابای بێ دەستنوێژ.

**٢٣-** چوار بەڵگە لەسەر سزا و نیعمەتی بەرزەخ.

هیواداریشم ئەم بەرگەش وەك سەرجەم بەرگەکان، باشترین بەهرەی لێوەربگیرێ لەلایەن خوێنەرانی بەرێزەوە.

**٩ محرم ١٤٤٤ك**

**٢٠٢٢/٨/٧ ز - هەولێر**

www.alibapir.com


دەستپێک

بەڕێـــــزان!

خـوا پشـتیوان بـێ ئەمڕۆ کـە (٢٤)ی (رجـب)ی سـاڵی (١٤٤١)ی کۆچییـە، بەرانبەر: (٢٠٢٠/٣/١٩)ی زایینـی، لـە شـاری هەولێـر، دەسـت دەکەیـن بـە تەفسـیرکردنی سـووڕەتی (الطـور)، سـەرەتا پێناسـەو نێوەڕۆکـی ئـەم سـووڕەتە موبارەکـە دەخەینـە ڕوو، لـە حـەوت بڕگـەدا.

پێناسە سووڕەتی (الطور) و بابەتەکانی

## یەکەم: ناوی ئەم سووڕەتە:

ئـەم سـووڕەتە موبارەکـە، هـەر بـە (سـورة الطـور)، یـان (الطـور) نـاسراوەو، لـەو بـارەوە ئـەم دوو دەقـە دێنیـن:

**١- {عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ جُبَيْرِ بْنِ مُطْعِمٍ عَنْ أَبِيهِ رضي الله عنه قَالَ: سَمِعْتُ النَّبِيَّ ﷺ يَقْرَأُ فِي الْمَغْرِبِ بِالطُّورِ، فَلَمَّا بَلَغَ هَذِهِ الْآيَةَ: ﴿أَمْ خُلِقُوا مِنْ غَيْرِ شَيْءٍ أَمْ هُمُ الْخَالِقُونَ ۝٣٥ أَمْ خَلَقُوا السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضَ بَل لَّا يُوقِنُونَ ۝٣٦ أَمْ عِندَهُمْ خَزَائِنُ رَبِّكَ أَمْ هُمُ الْمُصَيْطِرُونَ ۝٣٧﴾ كَادَ قَلْبِي أَنْ يَطِيْرَ} (أخرجه البخاري: ٧٦٥، وأبو داود: ٨١١، والنسائي في التفسير: ج٢، ص: ١٦، ابن ماجه: ٨٣٢، وأحمد: ج٤، ص: ٨٤).**

واتە: موحەممەدی کوڕی جوبەیری کوڕی موتعیم لە بابیەوە رضي الله عنه دەگێڕێتەوە، گوتوویـەتی: گوێـم لـە پێغەمبـەر ﷺ بـوو، لـە نوێـژی شـێواندا، سـووڕەتی (الطـور)ی

www.alibapir.com


دەخوێنـد، کاتێـک گەیشـتە ئـەم ئایەتانـە: ﴿أَمْ خُلِقُوا۟ مِنْ غَيْرِ شَىْءٍ أَمْ هُمُ ٱلْخَٰلِقُونَ ﴿٣٥﴾ أَمْ خَلَقُوا۟ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ ۚ بَل لَّا يُوقِنُونَ ﴿٣٦﴾ أَمْ عِندَهُمْ خَزَآئِنُ رَبِّكَ أَمْ هُمُ ٱلْمُصَۜيْطِرُونَ ﴿٣٧﴾﴾، خەریـک بـوو دڵـم بفـڕێ، (واتـە: یەکجـار کەوتمـە ژێـر کاریگەریـی).

**٢- {عَنْ أُمِّ سَلَمَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْهَا، أَنَّهَا سَمِعَتْ رَسُولَ اللهِ ﷺ يُصَلِّي إلى جَنْبِ البَيْتِ بِـ: ﴿وَٱلطُّورِ ﴿١﴾ وَكِتَٰبٍ مَّسْطُورٍ ﴿٢﴾﴾} (أخرجه البخاري: ٤٨٥٣، ومسلم: ١٢٧٦، وأبو داود: ١٨٨٢، والنسائي ٢٩٢٥، وابن ماجه: ٢٩٦١).**

واتـە: ئوممـو سـەلەمە (خـوا لێـی ڕازی بـێ)، لێـی گێڕدراوەتـەوە، کـە گوێـی لـە پێغەمبـەری خـوا ﷺ بـووە، لـە تەنیشـت بەیـت (کەعبـە)، سـوورەتی: ﴿وَٱلطُّورِ ﴿١﴾ وَكِتَٰبٍ مَّسْطُورٍ ﴿٢﴾﴾، خوێنـدوە.

کەواتـە: ئـەم سـوورەتە موبارەکـە، هـەر (الطـور)ی پـێ گوتـراوە، یـان (سـورة الطـور)ی پـێ گوتـراوەو، نەبیسـتراوە هیـچ ناوێکـی دیکـەی هەبـێ.

## دووەم: کات و شوێنی دابەزینی:

ئـەم سـوورەتە بـە یەکدەنگیـی هەمـوو زانایـان سـوورەتێکی مەککەییـە، لـەو بـارەوەش وێـڕای دەلالـەتی سرووشـتی سـوورەتەکەو نێوەڕۆکەکـەی، کـە هەمـان شـێوەو سرووشـتی قورئـانی مەککەییـە، وێـڕای ئـەوە دەقیـش لـە هاوەڵانـەوە زۆرن، بـۆ نموونـە، ئێمـە ئـەم دوو دەقـە دێنییـن:

**١- (عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا، قَالَ: نَزَلَتِ الطُّورُ بِمَكَّةَ) (فتح القدير: ج٥، ص١٣٢).**

واتـە: عەبدوڵـڵای کـوڕی عەبباس رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا، گوتوویەتی: سـوورەتی (الطـور) لە مەککە دابەزیـوە.

**٢- (عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ الزُّبَيْرِ رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا، قَالَ: نَزَلَتِ الطُّور بـمَكَّة)، (أخرجه ابْن مرْدَوَيْه)**

عەبدوڵڵای کوڕی زوبەیر رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا، گوتوویەتی: سوورەتی (طور) لە مەککە دابەزیوە.

www.alibapir.com


ئنجا بەپێی ئەوە کە لە ڕیزبەندیی هاتنە خواردا ژمارەی (٧٥)ە، واتە: لە پێش ئەم سوورەتەدا (٧٤) سوورەتی دیکە دابەزیون، وا پێدەچێ لە نێوان ساڵانی (٩ - ١١)دا دابەزیبێ، واتە: (٩ - ١١)ی پێغەمبەرایەتیی، پێش کۆچکردنی پێغەمبەر ﷺ بۆ مەدینە.

## سێیەم: ژمارەی ئایەتەکانی:

زانایان سێ ژمارەیان باسکردوون بۆ ئایەتەکانی ئەم سوورەتە: (٤٧، ٤٨، ٤٩)، بەڵام زیاتر لەسەر ژمارەی (٤٩) کۆکن، پێشتریش باسمان کردوە، کە جیاوازیی ژمارەی ئایەتەکان، دەگەڕێتەوە بۆ کورتیی و درێژیی ڕستەکان و، شوێنی لەسەر وەستان و، کۆتایی پێهێنانی ڕستەیەکیان کردوە بەسەرە ئایەت، هەیە لەو شوێنە نەوەستاوەو لە ڕستەی دواتر وەستاوەو، لە جیاتی ئەوەی بە دوو ئایەت دابنرێن، بە ئایەتێک دانراوە.

## چوارەم: ڕیزبەندیی لە موصحەف و لە دابەزین دا:

ڕیزبەندیی ئەم سوورەتە موبارەکە لە موصحەفدا، ژمارەکەی (٥٢)ە، یانی کە لە سوورەتی (**فاتحة**)وە دێ، ئەمە (٥٢)مین سوورەتەو، لە ڕیزبەندیی دابەزیندا ژمارە: (٧٥)ە، لە دوای سوورەتی (**نوح**)و، پێش سوورەتی (**المؤمنون**) دابەزیوە، ئەم سوورەتە دەکەوێتە جوزئی (٢٧)ەمەوە، وەک دابەشکردنی زانایان، کە قورئانیان کردۆتە سی (٣٠) بەش (**جزء**).

## پێنجەم: نێوەڕۆکی:

نێوەڕۆکی ئەم سوورەتەش بە گشتیی هەمان نێوەڕۆکی قورئانی مەککەییە، وەک پێشتریش گوتمان، بەڵام تەوەری بنەڕەتیی ئەم سوورەتەش، وەک سوورەتی

www.alibapir.com


(**الذاریات**) باسی ڕۆژی دواییە، بە هەردوو قۆناغی ئاخیر زەمان و، قیامەت و زیندوو کرانەوەو لێپرسرانەوەوە، بەڵام وێڕای ئەوە باسی هەردوو پایەی: خوا بە یەکگرتن و، پێغەمبەرایەتیی و، وەحییش کراوە، ئەگەر تەماشای جوگرافیای ئایەتەکان بکەین، چل و نۆ (٤٩) ئایەتەکە بەم شێوەیە دەبینین:

**١-** بیست و هەشت (٢٨) ئایەتی سەرەتا، کە ئایەتەکانی: (١ - ٢٨) و (٦) ئایەتی کۆتاییش، کە ئایەتەکانی: (٤٤ - ٤٩)ن، (٢٨ + ٦ = ٣٤)، سی چوار (٣٤) ئایەت، لەو (٤٩) ئایەتە، بۆ باسی ڕۆژی دوایی تەرخانکراون، بۆیەش گومان تەوەرە سەرەکییەکەی ئەم سووڕەتەش، وەک سووڕەتی (**الذاریات**) باسی ڕۆژی دواییە، هەڵبەتە ئەم سووڕەتە هەردوو قۆناغەکەی ڕۆژی دوایی واتە: ئاخیر زەمان (**الساعة**) و، هەڵسانەوەو زیندوو کرانەوە (**القیامة**)شی گرتۆتەوە،

**٢-** شەش (٦) ئایەتیش، کە ئایەتەکانی: (٢٩ - ٣٤)ن، بۆ باسی پێغەمبەرایەتیی و، قورئان و، وەحیی داندراون.

**٣-** نۆ (٩) ئایەتیش، کە ئایەتەکانی: (٣٥ - ٤٣)ن، بۆ باسی بەدیهێنەرایەتیی و پەروەردگاریەتیی و، تەنیا پەرستراوێتیی خوا، دانراون.

کەواتە: (٣٤ + ٦ + ٩) دەکاتە: (٤٩) ئایەتەکەی ئەم سووڕەتە موبارەکە.

## شەشەم: تایبەتمەندییەکانی:

ئێمە چوار تایبەتمەندییمان لەم سووڕەتە موبارەکەدا بەدیکردوون، کە تایبەتن بەم سووڕەتەوە:

**١-** ئەمە یەکەمین سووڕەتە لە سەرەتای موصحەفەوە پێی دەگەین، واتە: کە لە لای ڕاستەوە دێین، کە پێنج سوێندی لەسەر یەکی تێداهاتبن: ﴿وَٱلطُّورِ ۝١ وَكِتَـٰبٍ مَّسۡطُورٍ ۝٢ فِى رَقٍّ مَّنشُورٍ ۝٣ وَٱلۡبَيۡتِ ٱلۡمَعۡمُورِ ۝٤ وَٱلسَّقۡفِ ٱلۡمَرۡفُوعِ ۝٥ وَٱلۡبَحۡرِ ٱلۡمَسۡجُورِ ۝٦﴾،

www.alibapir.com



یەکەمین سووڕەتیش بریتی بوو لە سووڕەتی **(الصافات)**، کە سێ سوێندی لەسەر یەک تێداهاتبوون، یەکەمین سووڕەتیش کە چوار سوێندی تێداهاتبن، سووڕەتی **(الذاريات)** بوو: ﴿وَٱلذَّٰرِيَٰتِ ذَرْوًا ﴿١﴾ فَٱلْحَٰمِلَٰتِ وِقْرًا ﴿٢﴾ فَٱلْجَٰرِيَٰتِ يُسْرًا ﴿٣﴾ فَٱلْمُقَسِّمَٰتِ أَمْرًا ﴿٤﴾﴾.

**٢-** ئەم سووڕەتە تاکە سووڕەتێکە کە پازدە (١٥) جار لەسەر یەک وشەی: **(أم)**ی بە دوای یەکدا تێدا هاتبێ، کە ئایەتەکانی: (٣٠ - ٤٣)ن، ژمارەیەک لەو پازدە جارەی **(أم)**، لە بارەی پێغەمبەری خاتەمەوە ﷺو، قورئان و، ئەو تۆمەتانەی پاڵ دراونەی لای پێغەمبەر ﷺ، بۆ بەرپەرچدانەوەی ئەوانەیە، ئەوانی دیکەش لە بارەی تەنیایی خوان لە بەدیهێنەرایەتیی و، پەروەردگارێتیی و، تەنیا پەرستراوێتیی دا و، خستنەڕووی پووچەڵیی ژمارەیەک لە بیرۆکەکانی هاوبەش بۆ خوا دانەران.

**٣-** هەردووک ڕستەی: ﴿أَمْ خُلِقُوا۟ مِنْ غَيْرِ شَىْءٍ أَمْ هُمُ ٱلْخَٰلِقُونَ ﴿٣٥﴾ أَمْ خَلَقُوا۟ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ ۚ بَل لَّا يُوقِنُونَ ﴿٣٦﴾﴾، تەنیا لەم سووڕەتەدا هاتوون، کە بەرپەرچدانەوەی بیرۆکەی ئیلحادن، لە سووڕەتی **(الجاثية)**شدا، خوا ﷻ ئاماژەیەکی بە بیرۆکەی مولحیدەکان کردوە، کە گوتوویانە: ﴿...وَمَا يُهْلِكُنَآ إِلَّا ٱلدَّهْرُ... ﴿٢٤﴾﴾، واتە: تەنیا ڕۆژگار ئێمە دەفەوتێنێ، واتە: کەس ئێمەی دروست نەکردوەو، کەسیش ئێمە نافەوتێنێ، ئێمە هەر لە خۆوە هەین! ئەمەش بیرۆکەی ئیلحادە، بەڵام بۆ خستنەڕووی پووچەڵیی بیرۆکەی ئیلحاد، لە هەموو قورئاندا بەم تەعبیرە، تەنیا لەم دوو ئایەتە موبارەکەدا هاتوە.

**٤-** چەند وشەیەک تەنیا لەم سووڕەتەدا هاتوون و، دەگونجێ زیاتریش بن، بەڵام من ئەم حەوتەم هێناون:

١- ﴿وَكِتَٰبٍ مَّسْطُورٍ﴾.

٢- ﴿رَقٍّ مَّنشُورٍ﴾.

٣- ﴿وَٱلْبَيْتِ ٱلْمَعْمُورِ﴾.

www.alibapir.com


٤- ﴿ وَٱلۡبَحۡرِ ٱلۡمَسۡجُورِ ﴾.

٥- ﴿ وَمَآ أَلَتۡنَٰهُم ﴾.

٦- ﴿ رَيۡبَ ٱلۡمَنُونِ ﴾.

٧- ﴿ سَحَابٌ مَّرۡكُومٌ ﴾.

ئەم حەوت (٧) وشەیەم هێناون، کە شەش (٦)یان وشەی لێکدراون، ئەوەی دیکەشیان: ﴿ وَمَآ أَلَتۡنَٰهُم ﴾، ئەمە ڕستەیەکە، واتە: هیچمان لێ کەم نەکردوونەوە (مَا نَقَصْنَاهُم).

## حەوتەم: دابەشکردنی ئەم سوورەتە بۆ چەند دەرسێك:

(٤٩) ئایەتەکەی ئەم سوورەتە موبارەکەمان، بۆ سێ (٣) دەرسان دابەش کردوون، بەپێی نێوەڕۆکیان، جاری دیکەش باسمکردوە: کە هەر کام لەو سوورەتە موبارەکانەی تەفسیریان دەکەم، پێش هەموو شتێک دێم: سەرنجێکی وردو قووڵ و گشتگیر لە کۆی سوورەتەکە دەدەم، بزانم لە کوێ چەند ئایەت بە یەکەوە پەیوەستن و، چەندیان بەیەکەوە پەیوەست نین؟ هەڵبەتە ئایەتەکانی هەر سوورەتێ هەموویان، وەک ئاڵقەکانی زنجیرێک یەکدی دەبەستنەوە، بەڵام جارجاریش دەتوانی بڕ بڕیان بکەی، بۆ ئەوەی هەر کۆمەڵ ئایەتە لە دەرسێکدا، تەفسیر بکرێن، نەک هەمووی بەسەر یەکەوە، ئەو شێوازەش کە هەڵمبژاردوە، پێم وایە باشترە بۆ چاک لێ تێگەیشتن و، ئاسانکاریی بۆ کەسێک کە بیەوێ لە ئایەتەکانی سوورەتێک تێ بگات، ئنجا بەپێی سەرنجدانی من، (٤٩) ئایەتە موبارەکەکانی ئەم سوورەتە پۆلێن کراون بۆ سێ کۆمەڵ:

**دەرسی یەکەم:** ئایەتەکانی: (١ - ١٦)، کە شازدە (١٦) ئایەتەکەی سەرەتای سوورەتەکەن، نێوەڕۆکەکەشیان بریتیە لە پێنج جار سوێند خواردن بە پێنج

www.alibapir.com


شتی جیا جیا، لەسەر هاتنی سزاو ئازاری ڕۆژی دوایی و، گرفتاربوونی بێبڕوایان بە سزاو ئازاری خواو، بێ چارەیی و بێ دەرەتانییان.

**دەرسی دووەم:** ئایەتەکانی: (١٧ - ٢٨)، کە دوازدە (١٢) ئایەتی نێوەڕاستی ئەم سووڕەتەن، باسی پاداشتی خوایە بۆ پارێزکاران لە بەهەشتە ڕازاوەو نەبڕاوەکاندا، لە بەهەشتە پڕ نازو نیعمەتەکانی خواداو، پێوە پەیوەست کردنی ڕۆڵەو وەچەکانیشیان بەو دایک و بابانەوە، کە خاوەن ئیمان بوون و وەچەکەشیان بە ئیمانەوە شوێنیان کەوتوون و، ستاییشی خوا کردنیان لە بەهەشتدا، لەسەر ئەوە کە خوا ﷻ خستوونیە سەر ڕاستە ڕێی خۆی لە دنیادا، بۆیە سەرەنجام ئەو ڕاستە ڕێیە بەو بەهەشتەی گەیاندوون، ئنجا پێکەوە قسەکردنیان لە بارەی ژیانی دنیاوە، کە بە هۆی چاکەی خواوە، بە چاکەکاریی و بە تاعەتەوە گوزەراندوویانەو، خوا خستوونیە شوێنێکەوە کە شوێنی دۆستەکانیەتی، شوێنی ئەو کەسانەیە کە بەزەیی پێیاندا دێ و، چاکەی لەگەڵیاندا کردوە، کە بەهەشتە.

**دەرسی سێیەم:** ئایەتەکانی: (٢٩ - ٤٩)، کە بیست و یەک (٢١) ئایەتی کۆتایی ئەم سووڕەتەن: بێوەڕۆکیان باسی ڕاستیی موحەممەدە ﷺ لە داوای پێغەمبەرایەتیی کردنیداو، بەرپەرچدانەوەی ددان شکێنی تۆمەتەکانی بێبڕوایانە، لە بارەی بە درۆ دانانی موحەممەدەوە ﷺ، گوایە کاهینە، یاخود شێتە، یان خۆی قورئانی هەڵبەستوە، یان شاعیرەو، گێڕانەوەیان بۆ سەر ئەصڵی هۆکاری بێبڕواییان کە خوا نەناسییەو، ئەفسانەسازیی و عینادییانەو، لە کۆتاییشدا فەرمانکردنی خوا ﷻ بە پێغەمبەرەکەی ﷺ کە وازیان لێ بێنێ، واتە: پشت گوێیان بخات، لەو ڕووەوە نا، کە واز لە ئاگادارکردنەوەو بیرخستنەوەیان بێنێ، بەڵکو لەو ڕووەوە کە زیاد لە پێویست خۆییان پێوە ماندوو نەکات و، خەفەتیان پێوە نەخوات و، لێیان گەڕێ تاکو تووشی ڕۆژی خۆیان دەبن و، خۆڕاگریی و دڵنیابوونی لەوە کە خوا ﷻ خستوویەتە ژێر چاودێریی خۆی و، سەرگەرم بوونی بە خوا بە پاکگرتن و ستایشکردنی و بەندایەتیی بۆ کردنی، لە شەوگارو ڕۆژگارو لە بەرەبەیاندا.

## پێناسەی ئەم دەرسە

ئـەم دەرسـەمان لـە شـازدە (١٦) ئایـەتی سـەرەتای ئـەم سـوورەتە پێـک دێ، ئایەتـەکانی: (١ - ١٦)، کـە پـاش جەختکردنەوە لەسـەر هاتنی سزای خوای پـەروەردگار لـە ڕۆژی و دوایـی دا، بـە پێنـج سـوێندان، لـە ئایەتـەکانی: (١ - ٨)دا، ئنجا دوو دیمـەن لـە دیمەنـەکانی ئاخیـر زەمـان، خراونـەڕوو کـە زۆر سـەرنجڕاکێش و ڕاچڵەکێنـەرن، لـە ئایەتـەکانی: (٩ - ١٢)دا.

پاشان خستنە ڕووی ئاکام خراپیی بە درۆ دانەران، لە ئایەتەکانی: (١١ - ١٢)دا.

لـە چـوار ئایـەتی کۆتاییشـدا، ئایەتـەکانی: (١٣ - ١٦)، باسـکردنی سـزای سـەختی خـوا بـۆ بێبڕوایـان، لـە ڕۆژی دواییـدا کـە لـە دۆزەخـی کڵپـەدارو پـڕ بڵێسـەی بەتینیـدا بەرجەسـتە دەبـێ.

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

﴿ وَٱلطُّورِ ﴿١﴾ وَكِتَٰبٍ مَّسْطُورٍ ﴿٢﴾ فِى رَقٍّ مَّنشُورٍ ﴿٣﴾ وَٱلْبَيْتِ ٱلْمَعْمُورِ ﴿٤﴾ وَٱلسَّقْفِ ٱلْمَرْفُوعِ ﴿٥﴾ وَٱلْبَحْرِ ٱلْمَسْجُورِ ﴿٦﴾ إِنَّ عَذَابَ رَبِّكَ لَوَٰقِعٌ ﴿٧﴾ مَّا لَهُۥ مِن دَافِعٍ ﴿٨﴾ يَوْمَ تَمُورُ ٱلسَّمَآءُ مَوْرًا ﴿٩﴾ وَتَسِيرُ ٱلْجِبَالُ سَيْرًا ﴿١٠﴾ فَوَيْلٌ يَوْمَئِذٍ لِّلْمُكَذِّبِينَ ﴿١١﴾ ٱلَّذِينَ هُمْ فِى خَوْضٍ يَلْعَبُونَ ﴿١٢﴾ يَوْمَ يُدَعُّونَ إِلَىٰ نَارِ جَهَنَّمَ دَعًّا ﴿١٣﴾ هَٰذِهِ ٱلنَّارُ ٱلَّتِى كُنتُم بِهَا تُكَذِّبُونَ ﴿١٤﴾ أَفَسِحْرٌ هَٰذَآ أَمْ أَنتُمْ لَا تُبْصِرُونَ ﴿١٥﴾ ٱصْلَوْهَا فَٱصْبِرُوٓا۟ أَوْ لَا تَصْبِرُوا۟ سَوَآءٌ عَلَيْكُمْ ۖ إِنَّمَا تُجْزَوْنَ مَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ ﴿١٦﴾ ﴾

www.alibapir.com


## مانای دەقا ودەقی ئایەتەکان

{بـە نـاوی خـوای بـە بەزەیـی بەخشـندە، سـوێند بـە (کێـوی) **طـوور** ﴿١﴾ هەروەها سـوێند بـە کتێبێکـی نـووسراو ﴿٢﴾ لـە پێسـتێکی (تەنکـی) بڵاوکـراودا ﴿٣﴾ هەروەهـا سـوێند بـە ماڵـە ئاوەدانەکـە ﴿٤﴾ هەروەهـا سـوێند بـە بـانی بڵندکـراو ﴿٥﴾ هەروەهـا سـوێند بـە دەریـای داگیرسـێنراو ﴿٦﴾ بـە دڵنیایـی (سـزاو) ئـازاری پـەروەردگارت بـۆ بێبڕوایـان هـەر ڕوودەدا ﴿٧﴾ هیـچ بەرپەرچـدەرەوەی بـۆ نیـە ﴿٨﴾ ئـەو ڕۆژە کـە ئاسـمان بـە توندیـی تێکـەوە داوێ (و دێ و دەچـێ) ﴿٩﴾ چیایەکانیـش بـە خێرایـی دەڕۆن ﴿١٠﴾ ئنجـا لـەو ڕۆژەدا هـاوار (و سـزای سـەخت) بـۆ بـەدرۆ دانـەران (ی پەیامـی خـوا) ﴿١١﴾ ئەوانـەی لـە تێـڕژان (ی قسـەی پـووچ دا) یاریـی دەکـەن ﴿١٢﴾ ئـەو ڕۆژە کـە بـە توندیـی بـەرەو لای ئاگـر پاڵەسـتۆ دەدرێـن ﴿١٣﴾ (دەگوتـرێ:) ئـەم ئاگرەیـە کـە ئێـوە پێـی بێبـڕوا بـوون، بـە درۆتـان دادەنـا ﴿١٤﴾ ئنجا ئایا ئەمە جادوویـە یاخـود ئێـوە نابینـن؟ ﴿١٥﴾ بچنـە تێـی و تێیـدا ببرژێنرێـن، ئنجـا خۆتـان بـۆ (ئازارەکـەی) ڕاگـرن، یـان خۆتـان ڕانەگـرن، لەسـەرتان یەکسـانە (چونکـە) بێگومـان هـەر بـە (پێـی) ئـەوە کـە کردووتانـە سزا دەدرێـن ﴿١٦﴾}.

## شیکردنەوەی هەندێک لە وشەکان

(وَٱلطُّورِ): (**الطُّورِ: إسْمُ جَبَلٍ مَخْصُوصٍ، وَهُوَ الَّذِي كَلَّمَ اللهُ عَلَيْهِ مُوسَى** عليه السلام، **أو اسْمٌ لِكُلِّ جَبَلٍ**)، (طـور): یـان نـاوی چیایەکـی تایبەتـە، ئەویش ئەوەیـە کـە خـوای بەرز لە سـەری فەرمایشـتی لەگەڵ مووسـادا کرد عليه السلام (کە لە دەشـتی سـینایە، وەک لـە ئایەتەکانـی دیکـەدا هاتـوە: ﴿وَطُورِ سِينِينَ ﴿٢﴾﴾ التين) یاخـود (طـور): (وشـەیەکی سـوریانییەو) نـاوە بـۆ هـەر چیایـەک.

www.alibapir.com



(رَقٍّ مَّنشُورٍ): (الـرَّقُّ: مَـا يُكْتَـبُ فِيْـهِ، شِـبْهُ الكَاغِـذِ)، (رَقّ): هــەر شـتێکە لـە سـەری بنـووسرێ، وێنـەی کاغـەز، هەندێکیـش دەڵێـن: (رَقّ): بـە پێسـتی تەنکـی سـپی دەگوتـرێ، کـە کاتی خـۆی کاغـەز نەبـووە، یـان کـەم بـووەو بـۆ لەسـەر نـووسران بەکارهێـنراوە، یـان لەبـەر ئـەوەی ئـەو چەرمـە زیاتـر ماوەتـەوە.

(وَٱلسَّقۡفِ): (سَـقْفُ البَيْـتِ، جَمْعُـهُ: سُـقُفْ)، (سَـقْف) یـانی: بـان، سـەربان، کـە بـە (سُـقُفْ)، کـۆ دەکرێتـەوە، (سقف) وێـڕای بـانی خانـوو و سـەربان، بەمانـای ئاسـمانیش دێ، (السَّـقِيْفَةُ: كُلُّ مَـكَانٍ لَـهُ سَـقْفٌ)، (سَـقِيْفَة): هـەر شـوێنێکە سـەقف و بانێکی هەبێ.

(ٱلۡمَسۡجُورِ): (السَّـجْرُ: تَهيِيـجُ النَّـارِ)، (سـجْر) خۆشـکردنی ئاگـرە، دەگوتـرێ: (سَـجَرْتُ التَّنُّـورَ)، واتـە: تەندوورەکـەم خۆشـکرد، (البَحْـرُ المَسْـجُور) دەریـای داگیرسـێنراو، واتـە: دەریایـەک کـە گـڕی گرتـوە، کڵپـەی گرتـوە، دوایـی لـە مەسـەلە گرنگەکانـدا زیاتـر شـی دەکەینـەوە، کـە هـەر ئـەم وشـەیە بـۆ خـۆی ئیعجازێکـی عیلمیـی تێدایـە، هەڵبەتـە هەندێکیـش (مَسْجُور)یان، بـە (مَمْلُوء)، لێکداوەتـەوە واتـە: دەریایـەک کـە پـڕە لـە ئـاو.

(إِنَّ عَذَابَ رَبِّكَ لَوَٰقِعٌ): بـە دڵنیایـی سـزای پـەروەردگارت دێ، (الوُقُـوعُ: ثُبُـوتُ الـشَّيءِ وَسُـقُوطُهُ)، (وُقُـوعْ): بریتیـە لـە چەسـپان و کەوتنـی شـتێک، واتـە: هاتـن و ڕوودان.

(تَمُورُ): (الـمَوْرُ: الجَرَيَـانُ السَّرِيْـعُ، وَالـمَـوْرُ: الـتُّرَابُ المُـتَرَدِّدُ بـِهِ الرِّيْحُ، وَنَاقَةٌ تَمُور فـي سَـيْرِهَا فَهِـيَ مـوَارَّة)، (مَـوْر): بـە ڕۆیشـتنێکی خێـرا دەگوتـرێ، هەروەهـا (مَـوْر): بـەو گڵـەش دەگوتـرێ کـە بـا دەیهێنـێ و دەیبـات، دەگوتـرێ: (نَاقَـةٌ تَمُـورُ فـي سَـيْرِهَا فَهِـيَ مَـوَّارَة)، حوشـترەکە لـە کاتی ڕۆیشـتنیدا بـێ و دەچـێ و بەڕێکیـی نـاڕوات.

(خَوۡضٍ): (الخَـوْضُ: هُـوَ الـشرُوعُ فـي المَـاءِ، وَالمرُوُر فِيْهِ، وَيُسْـتَعَارُ فـي الأُمُـورِ، وَالأَكْثَرُ فِيْـمَا يَـذَمُّ الـشرُوعُ فِيْـهِ)، (خَـوْض): بریتیـە لـە ڕژانـە نێـو ئاوەوە، چوونـە نێـو ئـاوو بـە نێویـدا ڕۆیشـتن، بـەڵام دەخوازرێتـەوە بـۆ چوونـە نێـو کاروبارەکانـەوە، بـە زۆرییـش بـۆ چوونـە نێـو کارێکـەوە، کـە شـتێکی خـراپ و ڕەخنـە لێگیـراو بـێ.

www.alibapir.com


(يَدُعُّونَ): بـە توندیـی پـاڵ پێـوە دەنرێـن، (الـدَّعُّ: الدَّفْـعُ الشَّـدِيْد)، پـاڵ پێوەنـانی تونـد، (وَأَصْلُـهُ أَنْ يُقَـالَ لِلْعَاثِـر: دَعْ دَعْ)، ڕیشـەکەی ئەوەیـە کەسـێک کـە دەکـەوێ، پێـی بگوتـرێ: (دَعْ دَعْ)، لێگـەڕێ لێگـەڕێ، عـەرەب ئـەوە عادەتیـان بـووەو لـەوەوە هاتـوە، کەواتـە (دَعْ) بـە مانـای پـاڵ پێوەنـانی تونـد.

(ٱصْلَوْهَا): (أَصْلُ الصِّلِيَ: الإِيقَـادُ بِالنَّـارِ، صَلِيَ بِالنَّـارِ، وبِكَـذَا: بُلِيَ بِـهَا، وَاصْطَـلَى بِهَـا، وَصَلَيْـتُ الشَّـاةَ: شَـوَيْتُهَا وَهِـيَ مَصْلِيَّـةٌ)، (صِلَى): لە ڕیشـەدا بە مانـای ئاگردانەبـەرە، ئاگر بدەیـە بـەر شـتێک و بیسـووتێنی، دەگوتـرێ: (صَـلِيَ بِالنَّـارِ وَبِكَـذَا)، کەسـێک بخرێتـە نێـو ئاگـرەوە (وصَـلِيَ بِكَـذَا)، بـەو شـتە تاقیکرایـەوە، (وَاصْطَـلَى بِهَـا)، بـە هەمـان شـێوە هەمـان مانـای هەیـە، (وَصَلَيْـتُ الشَّـاةَ: شَـوَيْتُهَا)، مەڕەکـەم (صَـلِي) کـرد، برژانـدم، (وَهِـيَ مَصْلِيَّـةٌ)، ئـەو برژێـنراوەو پیشـێنراوە، بـە عەرەبیـی، ئێسـتا (مَكْـذُوف)ی پـێ دەگوتـرێ، کـە جۆرێکـە لـە برژانـدن، نـەک بـە شـێوەی برژانـدنی ئاسـایی.

## مانای گشتیی ئایەتەکان

بەڕێـــــزان!

خـوای بـەرزو مـەزن وەک لـە پێناسـەی ئـەم سـوورەتەدا، گوتمـان: لـەم سـوورەتە موبارەکـەدا سی و چـوار (٣٤)، ئایـەتی تەرخانکـردوون، بـۆ باسـی ڕۆژی دوایـی، بیسـت و هەشـت لەسـەرەتایەوەو شەشـیش لـە کۆتاییـەوە، بـەڵام ڕۆژی دوایـی بـە هـەردوو قۆناغەکـە: (الساعة والقيامة)وە، ئاخیـر زەمـان و زیندووکرانـەوەو لێپرسرانـەوە، بـەڵام دیـارە لەمیـانی باسـکردنی ڕۆژی دواییـدا، باسـی دۆزەخ و باسـی بەهەشـت، بـە تایبەت نـازو نیعمەتێـک کـە بەهەشـتییەکان تێیـدا دەژیـن، باسـی ئـەوەش کـراوەو تیشـکی باشـی خراوەتـە سـەر، هەروەهـا لـە ئایەتـەکانی دیکەشـدا، کـە شەشـیان لەم سـوورەتە موبارەکـەدا، تەرخانکـراون بـۆ باسـی پێغەمبـەر ﷺ و، قوڕئان و، نۆشـیان تەرخانکراون بـۆ باسـی خـوای پـەروەردگار: بـە دیهێنەرایەتیـی خـواو، پەروەردگارێتیـی خـواو،

www.alibapir.com


پاشان بیرۆکە ئەفسانەییەکانی هاوبەش بۆ خوا دانەرەکان، لە بارەی خواوە ﷻ و، تێڕوانینیان بۆ ژیان و ... هتد.

لەم دەرسەدا، ئەم شازدە ئایەتەی سەرەتا، کە ئێمە دامانناون بۆ دەرسی یەکەم، هەم باسی ئەو پێنج سوێندەی خوای پەروەردگارە، لەسەر ئەوە کە سزای خوا بۆ بێبڕوایان دێ و، بەرپەرچدانەوەی نیە، هەم باسی ئاخیر زەمانە، هەروەها هاوکات و پەیوەست لەگەڵ ئاخیر زەمان و تێکچوونی ئەم گەردوونەدا، باسی ڕۆژی دواییشە، بە تایبەت باسی بێبڕوایان کە تووشی چ سزاو جەزرەبەیەک دێن!

سەرەتا خوا ﷻ دەفەرموێ: (بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ) بە ناوی خوای بە بەزەیی بەخشندە، واتە:

دەستپێکردنم بە ناوی خوایە، مەبەستیش پێی ئەوەیە:

١ - ئەم کارە تەنیا بۆ خوا دەکەم.

٢ - ئەم کارە بە پێی شەرعی خوا دەکەم.

٣ - ئەم کارە بە تواناو یارمەتیی خوای پەروەردگار دەکەم.

٤ - ئەم کارە بۆ هێنانەدی ڕەزامەندیی خوا ئەنجام دەدەم.

ئنجا خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿وَالطُّورِ﴾، (و) لێرەدا، واوی سوێند (**وَاو القَسَم**)ە، کە سێ پیت هەن بۆ سوێند: (**و، ب، ت**)، دەگوترێ: (**واللە، باللە، تاللە**)، هەر سێکیان بۆ سوێندن، بەڵام بە زۆریی (**و**) بەکاردێ، کەواتە: ﴿وَالطُّورِ﴾، یانی: (**أُقْسِمُ بالطُّور**)، سوێند دەخۆم بە طوور، طووریش زیاتر وا پێدەچێ مەبەست پێی ناوی ئەو چیایەو ئەو کێوە بێ، کە مووسا عليه السلام لەسەری وەستا لە کاتێکدا بۆ یەکەمجار خوا فەرمایشتی لەگەڵدا کردو کردی بە پێغەمبەر عليه السلام، هەندێکیش دەڵێن: لە کاتێکدا کە خوا ﷻ تەوراتی پێدا، گرنگ ئەوەیە

www.alibapir.com


طووڕ هەرچەند بە مانای چیا دێ بە گشتیی، بەڵام وا پێدەچێ لێرەدا مەبەست پێی چیایەک و کێوێکی تایبەت بێ، ئەویش ئەو کێوەیە کە خوای پەروەردگار فەرمایشتی لە سەری لەگەڵ مووسادا ﷺ کردوە، سوێند بە **طووڕ**.

﴿ وَكِتَٰبٖ مَّسۡطُورٖ ﴾، سوێندیش بە کتێبێکی نووسراوە، ﴿ وَكِتَٰبٖ مَّسۡطُورٖ ﴾، (**كِتَاب**)، بە نەناسراو (**نَكِرَة**) هاتوە، کتێبێکی نووسراوە، ئەویش وا پێدەچێ مەبەست پێی تەوڕات بێ، چونکە دوای ئەوەی خوا ﷻ لەسەر کێوی **طووڕ** مووسای دواند، تەوڕاتیشی پێدا، چونکە بەڵێ قورئانیش کتێبە، بەڵکو گەورەترین کتێبە، گەورەترین کتێبی خوایە کە بۆ مرۆڤایەتیی ناردوویەتی، بەڵام ئەو کاتەی ئەم سووڕەتە هاتۆتە خوار، قورئان لە شێوەی کتێبێکدا، وەک موصحەفێک بوونی نەبووە، بەڵام تەوڕات هەبووە، ﴿ وَكِتَٰبٖ مَّسۡطُورٖ ﴾، کتێبێکی نووسراو.

﴿ فِي رَقّٖ مَّنشُورٖ ﴾، لە پێستێکی تەنکی بڵاوکراودا، یاخود لە تیانووسێک دا، ئنجا ئایا کاغەز بووە، یان چەرم بووە، یان هەر شتێک بووە، کە بڵاوکراوەتەوە، بەڵام زیاتر وا پێدەچێ مەبەست پێی پێستی تەنک بێ، کە کاتی خۆی تەوڕاتی تێدا نووسراوەتەوە، چونکە ئەو کاتەی تەوڕات نووسراوەتەوە لە چەرم داو چەرمەکان یەک دانە نەبوون، بەڵکو چەند چەرمێک بوون و خراونەوە سەر یەک و، دوایی پێچراوەتەوە، وەک تۆمارێک هەڵوێزنەراوەو پێچراوەتەوە، ﴿ فِي رَقّٖ مَّنشُورٖ ﴾، لە چەرمێکداو، لە پێستێکدا کە بڵاوکراوە بووەو کە ویستوویانە بیخوێننەوە، بڵاویان کردۆتەوە.

﴿ وَٱلۡبَيۡتِ ٱلۡمَعۡمُورِ ﴾، هەروەها سوێند بە ماڵە ئاوەدانەکە، واتە: ماڵە ئاوەدانەکە، کە بە مرۆڤان ئاوەدانە و خواپەرستیی تێدا دەکەن، ئەگەر مەبەست کەعبە بێ، کە تەوافی بەدەوردا دەکەن، مزگەوتی حەڕامیش نوێژی تێدا دەکەن و خواپەرستیی تێدا دەکەن، یاخود ئەوماڵەی بە فریشتان ئاوەدانە، ئەگەر مەبەست لە: ﴿ وَٱلۡبَيۡتِ ٱلۡمَعۡمُورِ ﴾، ئەو شوێنە تایبەتە بێ کە لە ئاسمانی حەوتەمەو، دوایی باسی

دەکەین و دەیهێنین و، پێغەمبەری خواش ﷺ لە فەرمایشتەکانیدا باسی کردوە، کە (بیت المعمور) لە ئاسمانی حەوتەمەو پەرستگای فریشتەکانە، هەموو ڕۆژێ حەفتا هەزار (٧٠٠٠٠) فریشتە دەچنە نێوی و، هەتا ڕۆژی دوایی ئەو حەفتا هەزارە ناچنەوە نێوی و، حەفتا هەزاری دیکە دێن، ئنجا چ مەبەست کەعبە بێ و، مزگەوتی حەڕام کە بە دەوری کەعبەوە کراوەو، ئاوەدانە بە خواپەرستان لە مرۆڤان، هەروەها لە جند، یاخود مەبەست (بَيْتِ المَعْمُوْر) بێ کە لە ئاسمانی حەوتەمە، خوای پەروەردگار سوێندی پێ دەخوات.

﴿ وَٱلسَّقۡفِ ٱلۡمَرۡفُوعِ ﴾، هەروەها سوێند بە بانی بڵند کراو، (سَقْف)، یانی: بان، (سەربان)یشی پێ دەگوترێ، کە بەدڵنیایی لێرەدا مەبەست پێی ئاسمانەو، ئاسمان بۆ ئێمەی دانیشتوانی زەوی وەک بانێک و سەربانێک وایە، بەرز کراوەتەوە.

﴿ وَٱلۡبَحۡرِ ٱلۡمَسۡجُورِ ﴾، سوێندیش بە دەریای داگیرسێنراو، دەریایەک کە داگیرسێنراوەو، ئاگری بەردراوەتێ، یاخود: (البَحْر المملوء مَاء)، سوێند بە دەریایەک کە پڕکراوە لە ئاو، بەڵام زیاتر وا پێدەچێ مەبەست پێی دەریای داگیرسێنراو بێ، دەریاش کە ئێستا ئێمە دەیبینین، داگیرسێنراو نیە، بەڵکو مەبەست پێی ئەو دەریایەیە کە لە ڕۆژی دواییدا دادەگیرسێنرێ، وەک دەفەرموێ: ﴿ وَإِذَا ٱلۡبِحَارُ سُجِّرَتۡ ۝٦ ﴾التكوير، واتە: کاتێک کە دەریاکان داگیرسێنران، بەڵام لە سوورەتی (الإنفطار)دا دەفەرموێ: ﴿ وَإِذَا ٱلۡبِحَارُ فُجِّرَتۡ ۝٣ ﴾، کاتێک دەریاکان تەقێندرانەوە، کە ئەمە کاتی خۆی زانایان هەر گوتوویانە، کاتێک دێ ئەم دەریایانە گڕ دەگرن، بەڵام نەیانزانیوە چۆن؟ بەڵام دوای ئەوەی زانست بەرەو پێشەوە چوو، بە تایبەت زانستی کیمیا، ئێستا ئێمە دەزانین کە گەرد (مولکۆل - جزيء)ێکی ئاو لە دوو گەردیلەی هایدرۆجین و گەردیلەیەکی ئۆکسجین پێک دێ، کە هێما کیمیاییەکەی بریتیە لە ($H_2O$)، ئنجا هایدرۆجین دەسووتێ و ئۆکسجین یارمەتیی سووتان دەدات، واتە: دوو ماددەی سووتێنەرن، بەڵام کاتێک گەردیلەیەک لە ئۆکسجین و، دوو گەردیلە لە هایدرۆجین یەک دەگرن، مولکۆلێکی ئاو پێکدێنن

www.alibapir.com


و، ئەگەر لێک بکرێنەوە، ئەو دوو جۆرە گەردیلانە هەردووکیان دوو ماددەی سووتێنەرن، یەکیان خۆی دەسووتێ و، ئەوەی دیکەش یارمەتیی سووتان دەدا.

﴿ إِنَّ عَذَابَ رَبِّكَ لَوَٰقِعٌ ﴾، سوێند بەو پێنج شتە، بە دڵنیاییی سزاو ئازاری پەروەردگارت دێ، ڕوو دەدات، (وَقَعَ الشَّيء، أي: سَقَطَ وَحَدَث)، واتە: شتەکە کەوتوو و ڕوویدا، مەبەست پێی سزای خوای پەروەردگارە بۆ ئەوانەی بێبڕوان، بۆ هاوبەش بۆ خوا دانەران و، بۆ بە درۆ دانەرانی پەیامەکانی خوا.

﴿ مَّا لَهُۥ مِن دَافِعٍ ﴾، هیچ بەرپەرچدەرەوەیەکی بۆ نیە، لەو ڕۆژەدا کە دێ، کەس ناتوانێ ڕێی لێ بگرێ، هیچ کۆسپ و لەمپەرێکی نایەتە بەر.

ئنجا خوا ﷿ باسی دوو دیمەن لە دیمەنەکانی ئەو ڕۆژە دەکات، کە تێیدا سزای خوا دێ: ﴿ يَوۡمَ تَمُورُ ٱلسَّمَآءُ مَوۡرٗا ﴾، ئەو ڕۆژەی ئاسمان تێکەوە داوێ، دێ و دەچێ بە خێرایی.

﴿ وَتَسِيرُ ٱلۡجِبَالُ سَيۡرٗا ﴾، چیاپەکانیش بە ڕۆیشتن دەڕۆن و دەجووڵێن، ئەمانە دوو دیمەنن لە دیمەنەکانی ئاخیر زەمان، قۆناغی یەکەمی ڕۆژی دوایی.

﴿ فَوَيۡلٞ يَوۡمَئِذٖ لِّلۡمُكَذِّبِينَ ۝١١ ٱلَّذِينَ هُمۡ فِي خَوۡضٖ يَلۡعَبُونَ ﴾، ئنجا لەو ڕۆژەدا هاوارو سزای سەخت بۆ ئەو بە درۆ دانەرانەی، ئەوان لە تێڕژانی قسەی پووچ دا، لە بێبڕواییدا، گەمەو یاریی دەکەن.

﴿ يَوۡمَ يُدَعُّونَ إِلَىٰ نَارِ جَهَنَّمَ دَعًّا ﴾، ئەو ڕۆژەی زۆر بە توندیی بەرەو ئاگری دۆزەخ پاڵیان پێوە دەنرێن و پاڵە پەستۆ دەدرێن.

﴿ هَٰذِهِ ٱلنَّارُ ٱلَّتِي كُنتُم بِهَا تُكَذِّبُونَ ﴾، پێیان دەگوترێ: ئەمە ئەو ئاگرەیە کە ئێوە پێی بێبڕوا بوون، بە درۆتان دادەنا.

﴿ أَفَسِحۡرٌ هَٰذَآ أَمۡ أَنتُمۡ لَا تُبۡصِرُونَ ﴾، ئایا ئەمە جادوویە، یاخود ئێوە نابینن، ئایا جادوویە، وەک دەتانگوت، یان کاتی خۆی هەقتان نەدەدی؟ یان ئێستا

ئێـوە نابینـن؟ ﴿ ٱصۡلَوۡهَا ﴾، بیچنەتـێ، پێـی بسـووتێنرێن و، پێـی جەزرەبـە بدرێـن، ﴿ فَٱصۡبِرُوٓاْ أَوۡ لَا تَصۡبِرُواْ ﴾، تێیـدا هەڵبکـەن، یـان هەڵنەکـەن، خۆتـان تێیـدا ڕابگـرن، یـان خۆتـان ڕانەگـرن، ﴿ سَوَآءٌ عَلَيۡكُمۡ ﴾، بـۆ ئێـوە یەکسـانە، هـەردووک لا یەکسـانن، چونکـە ئەگـەر مرۆڤ لەسـەر شـتێک خـۆی ڕابگـرێ، کە پاداشـتی دەسـت بکەوێتەوە، ئـەوە بێگومـان باشـترە لـەوەی خـۆی ڕانەگـرێ، بـەڵام خۆڕاگرتـن لەسـەر سـزای ڕۆژی دوایـی، هیـچ پاداشـتێکی لەسـەر نیـەو هـەر بـۆ خـۆی سـزایە.

﴿ إِنَّمَا تُجۡزَوۡنَ مَا كُنتُمۡ تَعۡمَلُونَ ﴾، بـە دڵنیایـی ئێـوە تەنیا بەپێـی ئـەوەی کردووتانـە سـزاتان دەدرێتـەوە، کەواتـە: ئـەو سـووتێنران و برژێـنران و جەزرەبەدرانـە، بـەو ئاگرە، کـە بـە درۆتـان دادەنـا، هـەر بەرهەمـی کـردەوەکانی خۆتانـەو، سـزای کـردەوەی خۆتانـە هاتۆتـەوە ڕێتـان، بۆیـە بێجگـە لـە خۆتـان گلەیـی لـە کـەس مەکـەن.

لە تۆڕە کۆمەڵایەتییەکان لەگەڵتانین
Stay in touch on social media
نحن معكم عبر مواقع التواصل الاجتماعي
ڕاگەیاندنی مەکتەبی مامۆستا عەلی باپیر
AliBapir/عەلی باپیر
archive.org/details/@alibapir
AliBapir/عەلی باپیر
AliBapir
www.alibapir.net
عربي - كوردی - English
کەناڵی
ڕاگەیاندنی مەکتەبی مامۆستا عەلی باپیر

www.alibapir.com


مەسەلە گرنگەكان

## مەسەلەی یەكەم:

**سوێند خواردنی خوا ﷻ بە كێوی طوورو كتێبێكی نووسراو، لە پێستێكی بڵاوكراوەداو، ماڵە ئاوەدانەكەو، بانی بڵندكراوو، دەریای داگیرسێنراو، لەسەر ئەوە كە سزاو ئازاری خوا بۆ بێبڕوایان دێ و ڕوو دەدات و، هیچ پەرچ و لەمپەرێكی نایەتە بەرو، هیچ كەس ناتوانێ بەرپەرچی بداتەوەو ڕێگریی لێ بكات:**

خوا دەفەرموێ: ﴿وَٱلطُّورِ ١ وَكِتَٰبٖ مَّسۡطُورٖ ٢ فِي رَقّٖ مَّنشُورٖ ٣ وَٱلۡبَيۡتِ ٱلۡمَعۡمُورِ ٤ وَٱلسَّقۡفِ ٱلۡمَرۡفُوعِ ٥ وَٱلۡبَحۡرِ ٱلۡمَسۡجُورِ ٦ إِنَّ عَذَابَ رَبِّكَ لَوَٰقِعٞ ٧ مَّا لَهُۥ مِن دَافِعٖ ٨﴾.

## شیكردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە هەشت بڕگەدا:

**١)**- ﴿وَٱلطُّورِ﴾، سوێند بە**طوور**، پێشتر گوتمان: (**و**) لێرەدا واوی سوێند پێخواردنە، واتە: سوێند بە **طوور**، **طوور**یش گوتمان: دەگونجێ مەبەست هەر چیایەك بێ، (**الطور**) (**أل**)ەكە بۆ ناساندنە و ئەگەر بۆ جینس بێ، واتە: سوێند بە هەر چیایەك، بە هەموو چیایەكان، بەڵام زیاتر وا پێدەچێ (**أل**)ەكە بۆ ناساندنی (**عَهْد**) بێ، واتە: سوێند بەچیایەكە ئەویش ئەو چیایەیە كە ناسراوە و خوا ﷻ مووسای ﵇ لەسەر دواندوە، وەك لە سوورەتی (**التین**)دا دەفەرموێ: ﴿وَٱلتِّينِ وَٱلزَّيۡتُونِ ١ وَطُورِ سِينِينَ ٢﴾، یانی: **طوور**ی سینا، وەك لە سوورەتی (**المؤمنون**)دا باسی (**طور سَيْنَاء**) كراوە، (**سِينِيْن**، **سَيْنَاء، سِيْنَاء**)، هەموویان مەبەست پێیان دەشتی سینایە، ئنجا ئەو كێوەش كە خوا ﷻ مووسای ﵇ لەسەر دواندوە لە دەشتی سینایە چونكە دوایش خوا دەفەرموێ:

**٢)**- ﴿وَكِتَٰبٖ مَّسۡطُورٖ﴾، سوێند بە كتێبێكی نووسراو، ئەو كتێبە نووسراوەش وا پێدەچێ مەبەست پێی تەورات بێ، كە خوا ﷻ دوای ئەوەی مووسای لەسەر ئەو كێوە

دیارییکراوە دواند، ئەو کتێبەشی پێدا، ئەو کتێبەی خواش کە تەوراتە، لە ئەصڵدا لەسەر چەند لەوحێک و تەختێک، نووسراوە، ئنجا جۆری تەختەکان، ئایا بەرد بووە، چ جۆرە بەردێک بووە؟ یان چی بووە؟ گرنگ ئەوەیە بە نووسراویی دراوەتە مووسا بسم الله الرحمن الرحيم و مووساش هەڵیگرتوون بەبەڵگەی ئەوەش کە دوایی مووسا بسم الله الرحمن الرحيم دەچێتەوە بۆ لای گەلەکەی و، تەماشا دەکات دەستیان کردوە بە گوێلک پەرستیی، تەختەکان فڕێ دەدات، وەک لە سوورەتی (**الأعراف**)دا هاتوە دەفەرموێ: ﴿ وَأَلْقَى ٱلْأَلْوَاحَ ﴿١٥٠﴾ ﴾، (مووسا) لەوحەکانی فڕێدان، ئەو لەوحانەی پێی درابوون، واتە: هەر لە ئاسمانەوە تەورات نووسرا بوو، فریشتەکان نووسیویانەتەوە.

(**الأَلْواح**) کۆی (**لَوْح**)ە و، (**لَوْح**)یش یانی: تەختە، تەختە بەرد، یان هەر شتێکی تەخت، کە تەوراتی لەسەر نووسراوە، کاتێک مووسا ئەو دیمەنە دەبینێ، خەڵکەکە دەستیان کردوە بە گوێلک پەرستیی و سامیریی هەڵیخەڵەتاندوون، لەوحەکانی فڕێ داون، بۆ ئەوەی دەستی خاڵیی و بەتاڵ بن، بۆ گرتنی سەرو ڕیشی هاڕوونی برای، پێشێ لە خەڵکەکەوە دەست پێدەکات، سەرکۆنەیان دەکات و لێپرسینەوەیان لەگەڵدا دەکات، ئنجا دوایی ڕوو لە هاڕوون دەکات و، لە قۆناغی سێیەمیشدا، ڕوو لە سامیریی دەکات و سەرکۆنەو لێپرسینەوەی لەگەڵدا دەکات، وەک لە تەفسیری سوورەتی (**طـه**)دا بە تەفصیل باسمانکردوە.

کەواتە: ﴿ وَكِتَٰبٍ مَّسْطُورٍ ﴾ یانی: کتێبێکی نووسراو، زیاتر وا پێدەچێ مەبەست پێی تەورات بێ، ئەگەرنا ﴿ وَكِتَٰبٍ مَّسْطُورٍ ﴾، کتێبی نووسراو، بەدڵنیایی دەبێ مەبەست پێی کتێبێک بێ، ئنجا ئایا ئەگەر مەبەست تەورات نەبێ، دەگونجێ بڵێین: مەبەست پێی قورئانە؟ هەڵبەتە ئەو کاتە قورئان نەبوو بەو شێوەیە، کە نووسرابێتەوە لە دوو توێی کتێبێکدا، بەڵام خوا بسم الله الرحمن الرحيم زانیویەتی دوایی دەبێتە کتێب و دەنووسرێتەوە، لە شێوەی موصحەفێکدا دەبێ، بەڵام زیاتر وا پێدەچێ مەبەست پێی تەورات بێ.

www.alibapir.com


وشـەی (**مَسْـطُور**)یش لـە (**سَـطْر**)ەوە هاتـوە، (**السَّـطْرُ: كِتابَـةٌ طَوِيلَـةٌ؛ لِأَنَّهَـا تُجْعَـلُ سُـطُورًا، أي: صُفُوفَـاً مِـنَ الكِتابَـةِ**)، (**سَـطْر**): نووسـینێكی درێـژەو (**مَسْـطُور**)یش، واتـە: ئـەو كتێبـە لـە چەنـد دێڕێـك پێكهاتـوە، كە دێڕەكان لـە تەنیشـت یەكـن و ڕیزكراون.

**٣)**- ﴿فِى رَقٍّ مَّنشُورٍ﴾، (**الرَّقُّ: الصَّحِيفَةُ تُتَّخَذُ مِن جِلْدٍ مُرَقٍّ أَبْيَضَ لِيُكْتَبَ عَلَيْهِ**)، (**رَقّ**): تیانووسێكە، لە پێستێكی تەنككراوی سپی، تاكو لە سەری بنووسرێ.

كاتی خـۆی كاغـەز بـەو شـێوەیە نەبـووەو، ئەگـەر كاغـەز هەشـبووبێ، ئـەو پێسـت و چەرمـە، بـە زەحمەتـر دەسـتكەوتوە، بـەڵام باشـتر بـووە بـۆ لەسـەر نـووسران، لەبـەر ئـەوەی ماوەتـەوەو ئـەو شـتەی لەسـەریان نووسـیوە زیاتـر پارێـزراو بـووەو ماوەتـەوە.

كەواتـە: (**رق**)، یـانی: چـەرم و پێسـت، (**مَنشُـور**)، یـانی: بڵاوكـراو، (**المَنشُـورُ: المَبْسُـوطُ غَـيْرُ المَطْوِيُّ**)، بڵاوكـراو بـووەو پێچـراوە نەبـووە.

**٤)**- ﴿وَٱلْبَيْتِ ٱلْمَعْمُورِ﴾، سوێند بە ماڵە ئاوەدانەكە، ئەمیش وەك گوتمان: دوو ڕا لە بارەیەوە هەن:

**أ**- مەبەست پێی كەعبەیەو، ئەو ماڵەی بە دەوری كەعبەدا كراوە، ئەو مزگەوتە كە ئاوەدانە بە خواپەرستان، لەسەردەمی نەفامییشدا هەر ئاوەدان بووە، عەرەبەكان كە خۆیان لەسەر ئایینی ئیبراهیم ﷺ زانیوە، بەدەوری كەعبەدا تەوافیان كردوەو، لە نێوان صەفاو مەڕوەدا، سەعیان كردوە، بەو شێوەیە كە بۆ خۆیان بە خواپەرستییان زانیوەو، ئەنجامیان داوە.

**ب**- مەبەست پێی ئەو پەرستگایەیە كە لە ئاسمانی حەوتەمە، كە ئێمە دوایی وردتر لەوبارەوە قسە دەكەین و، فەرمایشتەكانی پێغەمبەریش ﷺ لەو بارەوە دێنیین.

**٥)**- ﴿وَٱلسَّقْفِ ٱلْمَرْفُوعِ﴾، سوێند بە بانی بڵندكراو، (**سَقْف**)، یانی: بان، سەربان، (**مَرْفُوع**)، یانی: بڵندكراوو بەرزكراوە، كە ئەمە بێگومان مەبەست پێی ئاسمانە، لە سووڕەتی

www.alibapir.com


(الأنبياء)دا خوا دەفەرموێ: ﴿وَجَعَلْنَا ٱلسَّمَآءَ سَقْفًا مَّحْفُوظًا ﴿٣٢﴾﴾، واتە: ئاسمانمان کردوە بە بانێکی پارێزراو، ئاسمان وەک بان و سەربان وایەو پارێزراویشە، هەم پارێزەرە بۆ خەڵکی سەر زەوی، هەم خۆشی پارێزراوە لەوەی پارچە ئەستێرەکان و پارچە نەیزەکەکان کونی بکەن، لەبەر ئەوەی ئاسمان بە هەمووی دەگوترێ لە ئاستی زەوییەوە بەرەو سەر، بەڵام بە تایبەت لە دەوری زەوی، بەرگە هەوایەک هەیە، کە پێشتر باسمانکردوە، بە بەرزیی (١٠٠٠)کم بەڵکو زیاتریش، کە چەند چین هەوای تێدایە، هەر شتێک لە دەرەوەی گۆی زەوی بەرەو گۆی زەوی بێ، بە هۆی ئەو بەرگە هەوایەوە، دەسووتێ و دەبێتە خۆڵەمێش، مەگەر زۆر بە دەگمەن، ئەگەرنا بە تەواویی ناکەوێتە سەر زەوی، کە دەبێتە هۆی ڕوودانی کارەسات.

٦)- ﴿وَٱلْبَحْرِ ٱلْمَسْجُورِ﴾، سوێند بە دەریای داگیرسێنراو، یان: دەریایە داگیرسێنراوەکە، (**مَسْجُور: موقَدْ**)، داگیرسێنراو هەڵگیرسێنراو گڕتێبەردراو، یاخود (**مَسْجُور**) بە مانای (**مَمْلُوءٌ**)ە، پڕکراو، (**مُشْتَقٌّ مِنَ السَّجْرِ، وَهُوَ المَلأُ والإِمْدَادُ**)، (**سَجْر**): بە مانای پڕ کردن و لێ زیاد کردن دێ، هەروەک چۆن (**سَجَّرْتُ التَّنُّوْرَ**)، واتە: تەندوورەکەم گڕ تێبەرداو ئاگرم تێدا کردەوە، (**مسجور**) بە مانای هەردووکیان دێ، بەڵام زیاتر وا پێدەچێ بە مانای داگیرسێنراو بێ، چونکە هەر مۆلکوولێکی ئاو، هەر گەردێکی ئاو لە سێ گەردیلە پێکهاتوە، دوو گەردیلەی هایدرۆجین و، گەردیلەیەکی ئۆکسجین، بۆ ڕەمزە کیمیاییەکەی دەگوترێ: ($H_2O$)، ئنجا هایدرۆجین بۆ خۆی دەسووتێ، بەڵام ئۆکسجین یارمەتیی سووتان دەدات.

کەواتە: ئەو دوو توخمە کە ئاویان لێ پێکهاتوە، هەردووکیان دوو ماددەی سووتێنەرن، ئەگەر لێک جیابکرێنەوە، هەردووکیان سووتێنەرن، یەکیان خۆی دەسووتێ، ئەوی دیکەشیان یارمەتی سووتان دەدات، کاتێ پێکەوە کۆ دەبنەوە بە ڕێژەیەکی دیارییکراو، کە خوا دایناوە، دەبنە هۆی ئەوەی ئاو پێکبێنن، بۆ خوای پەروەردگار زۆر ئاسانە - بە عەقڵی ئێمە، دەڵێین: فڵان شتە ئاسانەو فڵان شتە قورسە - لە ڕۆژی دواییدا خوا ﷻ فەرمان بکات بە گەردیلەکانی کە

www.alibapir.com


ئاویان پێکهێناوە، هەردوو گەردیلەکەی هایدرۆجین و گەردیلەکەی ئۆکسجین کە گەردێکی ئاویان پێکهێناوە، بفەرموێ لێکببنەوە، ئەو کاتەش ئەوە ڕوو دەدات، کە خوا ﷻ لێرە دەفەرموێ: ﴿وَٱلْبَحْرِ ٱلْمَسْجُورِ ۝٦﴾، واتە: سوێند بە دەریا داگیرسێنراوەکە.

هەروەها لە سوورەتی (**التكوير**)دا دەفەرموێ: ﴿وَإِذَا ٱلْبِحَارُ سُجِّرَتْ ۝٦﴾، کاتێک دەریایەکان گڕیان گرت.

هەروەها لە سوورەتی (**الإنفطار**)دا دەفەرموێ: ﴿وَإِذَا ٱلْبِحَارُ فُجِّرَتْ ۝٣﴾، کاتێک دەریایەکان تەقینەوە، هەڵبەتە لە ئەنجامی گڕ گرتنەکەدا، تەقینەوەکە دروست دەبێ، ئەوەش بۆ خۆی ئیعجازێکی عیلمییە، کە هەم لێرە لە سوورەتی (**الطور**) دا، هەم لە سوورەتی (**التكوير**)دا، هەم لە سوورەتی (**الإنفطار**)دا، خوا ﷻ ئاماژەی پێ کردوە.

٧)- ﴿إِنَّ عَذَابَ رَبِّكَ لَوَٰقِعٌ﴾، بە دڵنیایی ئازارو سزای پەروەردگارت دێ، ڕوو دەدات، (**الوُقُوعُ: النُّزُولُ مِن عُلوٍّ، واسْتُعْمِلَ مَجازاً لِلتَحَقُّقِ، إنَّ عَذَابَ رَبِّكَ مُتَحَقِّقٌ**)، (**وُقُوع**): بریتیە لە دابەزین و هاتنە خوار لە سەرەوەو داکەوتن، بەڵام بە (مجاز) بەکارهێنراوە بۆ هاتنە دی، واتە: سزاو ئازاری پەروەردگارت دێ، ڕوو دەدات، بۆ ئەوانەی شایستەی سزادرانن، کە بێبڕوایانن.

٨)- ﴿مَا لَهُۥ مِن دَافِعٍ﴾، هیچ بەرپەرچدەرەوەیەکی بۆ نیە، (**الدَّفْعُ: إبْعَادُ الشَّيْءِ عَنْ شَيْءٍ باليَدِ، وأُطْلِقَ هُنا مَجَازاً عَلَى الوِقَايَةِ**)، (**دَفْع**): لە ئەصڵدا بریتیە لەوە کە بەدەست شتێک، لە شتێک دووربخرێتەوە، بەڵام لێرەدا بە (مجاز) بەکارهێنراوە بۆ پاراستن، واتە: هیچ پارێزەرێک نیە بۆ کەسێک کە دەویسترێ سزای خوای بۆ بێ، بیپارێزێ لەو سزایە.

وشەی (مِن)، کە خراوەتە سەر (مِن دَافِعٍ)، ئەصڵی خۆی (مَا لَهُ دَافِعٌ)، بەڵام لێرەدا: (**زِيدَتْ «مِن» فِي النَّفْي لِتَحْقِيقِ عُمُومِ النَّفْيِ وشُمُولِهِ، أيْ: نَفْي جِنْسِ**

www.alibapir.com


**الدَّافِـعِ**)، (مـن) زیـاد کـراوە لـە لابردنەکـە بـۆ چەسـپانی گشـتگیریی لابـردنی پـاڵ پێوەنانەکـە، یـانی: جینسـی پـاڵ پێوەنـان و لابـردن و بەرپەرچدانـەوە بـۆ سـزای خـوا، لـەو ڕۆژەدا نیـە، هـەر لەسـەرەتاوە تـا کۆتایـی، هیـچ بەشـێک لـە سـزای خـوا لـەو ڕۆژەدا، ناگونجـێ بەرپـەرچ بدرێتـەوەو لابـرێ و، دووربخرێتـەوە، لەوانـەی ڕوویـان تێـدەکات، کـە بێبڕوایـان و بـە درۆ دانـەرانی پەیامـەکانی خـوان.

## سێ کورتە سەرنج لە بارەی ئەم ئایەتە موبارەکانەوە:

**سـەرنجی یەکـەم:** ئـەو پیتـی (و)انـەی هاتـوون، هـی یەکـەم: ﴿وَالطُّورِ ۝١﴾، دیـارە کـە واوی سـوێند (**واو القَسَم**)ە، یـانی: سـوێند بـە **طـوور** (**قَسَـماً بِالطُّور**)، هەموو زانایـان لەسـەر ئـەوە یەکدەنگـن، بـەڵام واوەکانی دیکـە: ﴿وَكِتَٰبٖ مَّسۡطُورٖ ۝٢ فِي رَقّٖ مَّنشُورٖ ۝٣ وَٱلۡبَيۡتِ ٱلۡمَعۡمُورِ ۝٤ وَٱلسَّقۡفِ ٱلۡمَرۡفُوعِ ۝٥﴾، دوو حاڵەتیـان هـەن:

أ- یان هەر چواریان واوی سوێندن و دووبارە بوونەوە، چونکە عادەت وایە سوێند دووبارە ببێتەوە، واتە: ئەوانیش هەر چواریان (و)ی سوێندن، واتە: (قَسَماً بِالطُّور)، دوایی (قَسَماً بكِتَاب مَّسطُور، قَسَماً بالبَيْتِ المَعْمُورِ، قَسَماً بالسَّقْفِ المَرفُوعِ، قَسَماً بالبَحرِ ٱلمَسجُورِ).

ب- یاخود هەموویان بۆ گێڕانەوەی سوێند خواردنەکەن بۆ سەر (و)ی یەکەم، دیارە (**المَعْطُوفُ عَلَى القَسَمِ قَسَمٌ**)، ئەوەی دەگێڕدرێتەوە بۆ سەر سوێند، ئەویش هەر سوێندە، کەواتە: لە دەرەنجامدا هەردووک ڕایەکە دەبنەوە بە یەک.

**سـەرنجی دووەم:** وەک پێشـتر گوتمـان: **طـوورِ** نـاوی ئـەو چیایەیـە کـە نـاسراوو زانراوەو، ئەو کێوەیە کە خوا ﷻ مووسای ﵇ لەسەر دواندوە، وشەی **طووڕیـش** بـە زمـانی سـوریانی بـە مانـای چیـا دێ، بـەڵام (**أل**)ەکـەی بـۆ ناسـاندنی (**عهـد**)ەو لـە زمـانی عەرەبییـدا بەرانبـەر بـە (کە)یـە لـە زمـانی کوردییـدا (چیایەکـە)، بـەڵام ئەگـەر ناسـاندنەکە بـۆ جینـس بـێ، مانایەکـەی دەبـێ بـە سـوێند بـە کـۆی چیایـەکان، بـەڵام ڕای یەکـەم بەهێـزە.

www.alibapir.com


(**كِتَابٍ مَّسۡطُورٍ**)یش، سوێند بە كتێبێكی نووسراو، ئەو ڕایە بەهێزترە كە مەبەست پێی تەورات بێ، چونكە هەر لەسەر ئەو كێوە، ئەو تەوراتەش بە مووسا درا، لەوحەكانی كە تەوراتیان تێدا نووسرا بوو.

شایانی باسە: ئەو لەوحانەی تەوراتیان تێدا نووسرابوو، لەوەی كە ئێستا پێی دەگوترێ: پەیمانی كۆن، چوار سیفرە، هەندێكیش گوتوویانە: پێنجن، بەڵام زیاتر ڕای چوار سیفرە كە بە هێزە: سیفری {**تكوين**} سیفری {**الخروج**} سیفری {**العدد**} سیفری {**التثنية**} تەوراتی ئەصڵیی هەر ئەو چوارەن، بەڵام كتێبەكانی دیكە، لە دوای مووسا ﷺ خراونە پاڵ تەورات و بە هەموویان دەگوترێ: پەیمانی كۆن، كە جوولەكەو نەصرانیی لەسەر پەیمانی كۆن ڕێككەوتوون و، تەبەنییان كردوە، ئنجا چ بەو سەرژمێرەی كە سی و نۆ (٣٩) كتێبن، چ بەو سەرژمێرەی كە چل و نۆ (٤٩) كتێبن[1]، كە هەردوو ڕایەكان هەن، بەپێی مەزهەبە جیاجیاكانی نەصرانییەكان، ئەگەرنا جوولەكە تەنیا دان بە سەرژمێرە سی و نۆ كتێبەكەی پەیمانی كۆندا دێنن.

بۆیەش گوتمان: زیاتر واپێدەچێ مەبەست پێی تەورات بێ، لەبەر ئەوە ئەو كاتە قورئان بە شێوەی كتێبێك كە نووسرابێتەوە، نەبوو، موصحەفێك لەبەر دەستدا نەبوو، بەڵام ئەگەر بشگوترێ: مەبەست پێی قورئانە، چونكە خوا زانیویەتی ﷻ كە لە داهاتوودا قورئانیش لە دوو بەرگی كتێبێكداو، لە موصحەفێكدا دەنووسرێ، ئەوەش ڕێی تێدەچێ.

هەڵبەتە كە خوا ﷻ باسی **طوور** دەكات، دوایی باسی كتێبێكی نووسراو دەكات، كە وادیارە تەوراتەو، دواییش باسی دەریای گڕگرتوو، یان دەریای پڕ دەكات، كە دەگونجێ ئەویش مەبەست پێی دەریای سوور بێ كە كاتی خۆی (**بحر القلزوم**)یان پێ گوتوە، ئەمە هەمووی ئاماژەیە بەوە كە وەك چۆن خوا

---

(١) بە پێی سەرژمێری (العهد القديم قراءة رعائية).

www.alibapir.com


بسم الله الرحمن الرحيم مووسای دواند، لەسەر کێوی **طوور**و، دوایی تەوڕاتی پێدا، پاشان بە دەریای سووردا مووساو گەلە چەوسێنراوەکەی دەرباز کردو دوژمنەکانی لەو دەریایەدا فەوتاندن، کەواتە: ئەی موحەممەد ﷺ! تۆش دڵنیابە کە سەرەنجامت هەر بەو شێوەیە دەبێ و، دوژمنەکانی تۆش خوا بسم الله الرحمن الرحيم بۆتیان سزا دەدات.

**سەرنجی سێیەم:** ﴿وَٱلۡبَيۡتِ ٱلۡمَعۡمُورِ﴾، دوو ڕای لە بارەوە هەن:

**أ-** یەکەمیان دەڵێ: مەبەست پێی کەعبە و مزگەوتی دەوری کەعبە بێ، کە بە خواپەرستان ئاوەدانە، خواپەرستانی مرۆڤ و جند کە تەوافی بە دەورەدا دەکەن و نوێژی لێ دەکەن، خواپەرستیی لە دەورەدا دەکەن.

**ب-** دووەمیان دەڵێ: مەبەست پێی ئەو پەرستگایەیە کە هەر بە ناوی: (**البيت المعمور**) ماڵی ئاوەدان، لە ئاسمانی حەوتەمەو، لەو بارەوە لە فەرمایشتی پێغەمبەردا ﷺ ئەم دوو دەقە دێنین:

**١-** پێغەمبەر ﷺ لە درێژەی باسی شەو ڕۆو بەرزبوونەوەی (**الإسراء والعروج**)یدا دەفەرموێ: {**ثُمَّ رُفِعَ إِلَيَّ البَيْتُ المَعْمُورُ، وَإِذَا هُوَ يَدْخُلُهُ كُلَّ يَوْمٍ سَبْعُونَ أَلْفَ مَلَكٍ، لَا يَعُوْدُونَ إِلَيْهِ**} (**أخرجه البخاري: ٣٢٠٧ ومسلم: ١٤٩ والطبري: ٣٢٢٨٧**).

واتە: دوایی (**بيت المعمور**)م بۆ بەرز کرایەوە، (پێشانم دراو تەماشام کرد) هەموو ڕۆژێ حەفتا هەزار (٧٠٠٠٠) فریشتە دەچنە نێوی، دوایی بۆی ناگەڕێنەوە، (واتە: ڕۆژی دوای وی حەفتا هەزاری دیکە دێن).

**٢-** پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (**البَيْتُ المَعْمُورُ فِي السَّمَاءِ السَّابِعَةِ يَدْخُلُهُ كُلَّ يَوْمٍ سَبْعُونَ أَلْفَ مَلَكٍ، ثُمَّ لاَ يَعُودُونَ إِلَيْهِ حَتَّى تَقُومَ السَّاعَةُ**)، (**أخرجه أحمد: ١٢٥٨٠، وعبد بن حميد: ١٢١٠، والنسائي في الكبرى: ١١٥٣٠، والحاكم: ٣٧٤٢، وقال: صحيح على شرط الشيخين، والبيهقي في شعب الإيمان: ٣٩٩٣**).

واتە: (**البَيْتُ المَعْمُورُ**) لە ئاسمانی حەوتەمەو، هەموو ڕۆژێ حەفتا هەزار فریشتە دەچنە نێوی، دوایی تاکو ئاخیر زەمان دێ، بۆی ناگەڕێنەوە.

واتـە: ڕۆژی دوای وی حەفتا هـەزاری دیکـەی دێنـە نێـوی، مانـای وایـە شـوێنێکی زۆر قەڕەباڵـغە بـە پەرسـتش و بەندایەتیـی تێداکـردنی فریشـتەکان.

هەڵبەتـە هـەردوو ماڵـەکـەی خـوا، چ ئـەوەی لەسـەر زەوی دایـناوە کـە کەعبەیـەو، چ ئـەوەی ئاسـمانی حەوتـەم، هەردووکیـان پەرسـتگای خـوای پـەروەردگارن، یەکیـان بـۆ جنـدو مـرۆڤ، ئـەوەی دیکـەش بـۆ فریشـتەکان و، ئایەتەکـەش هەردووکیـان دەگرێتـەوە.

زانایانیـش هەندێکیـان ئـەو ڕایەیـان زاڵکـردوە کـە مەبەسـت پێـی کەعبـەو مزگـەوتی دەوری کەعبەیـەو، هەندێکیشـیان ئەوەیـان زاڵکـردوە کـە مەبەسـت پێـی ئـەو ماڵەیـە کـە لـە ئاسـمانی حەوتەمـە.

لە تۆڕە کۆمەڵایەتییەکان لەگەڵتانین
Stay in touch on social media
نحن معكم عبر مواقع التواصل الاجتماعي
ڕاگەیاندنی مەکتەبی مامۆستا عەلی باپیر
AliBapir/عەلی باپیر
archive.org/details/@alibapir
AliBapir/عەلی باپیر
AliBapir
www.alibapir.net
عربي - کوردی - English

www.alibapir.com


### مەسەلەی دووەم:

**لـەو ڕۆژەدا کـە ئاسـمان تێکـەوە داوێ و دێ و دەچـێ و، چیایـەکان دەڕۆن، هـاوارو سـزای سـەخت بـۆ ئـەو بـەدرۆ دانەرانـەی بـەردەوام دەڕژێنـە نێـو گەمـەو گاڵتـەوە، دەڕژێنـە نێـو قسـەی پـووچ، کـە وەک گەمـەو گاڵتـە وایـە، ئـەو ڕۆژە بـە توندیـی پاڵەسـتۆ دەدرێـن بـەرەو لای دۆزەخ و، پێیـان دەگوتـرێ: ئەمـە ئەوەیـە کـە بـە درۆتـان دادەنـا، ئنجـا ئایـا ئـەوە جادوویـە، یـان ئێـوە نایبینـن؟! بیچێـژن هەڵکـردن و هەڵنەکردنتـان یەکسـانە، تێیـدا مـەدار بکـەن و، خۆتـان ڕابگـرن، یـان خۆتـان ڕانەگـرن هـەردووک لای یەکسـانن:**

خـوا دەفەرمـوێ: ﴿ يَوْمَ تَمُورُ ٱلسَّمَآءُ مَوْرًا ﴿٩﴾ وَتَسِيرُ ٱلْجِبَالُ سَيْرًا ﴿١٠﴾ فَوَيْلٌ يَوْمَئِذٍ لِّلْمُكَذِّبِينَ ﴿١١﴾ ٱلَّذِينَ هُمْ فِى خَوْضٍ يَلْعَبُونَ ﴿١٢﴾ يَوْمَ يُدَعُّونَ إِلَىٰ نَارِ جَهَنَّمَ دَعًّا ﴿١٣﴾ هَٰذِهِ ٱلنَّارُ ٱلَّتِى كُنتُم بِهَا تُكَذِّبُونَ ﴿١٤﴾ أَفَسِحْرٌ هَٰذَآ أَمْ أَنتُمْ لَا تُبْصِرُونَ ﴿١٥﴾ ٱصْلَوْهَا فَٱصْبِرُوٓا۟ أَوْ لَا تَصْبِرُوا۟ سَوَآءٌ عَلَيْكُمْ إِنَّمَا تُجْزَوْنَ مَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ ﴿١٦﴾ ﴾.

### شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە یازدە بڕگەدا:

١)- ﴿ يَوْمَ تَمُورُ ٱلسَّمَآءُ مَوْرًا ﴾، ئەو ڕۆژەی ئاسمان بە توندیی تێکەوە داوێ و، دەجووڵێ بە خێرایی، یان دەسووڕێتەوە.

وشـەی (تَمُـور): بـە مانـای ڕۆیشـتنی خێـراو، بـە مانـای سـووڕان و جـووڵان و تێکـەوە هاویشـتن، دێ، (**تَمُـوُر مَـوْرًا، أي: تَـدُوُر دَوْرًا**):

أ- هەندێکیان گوتوویانە: (مَوْر)، بە مانای جووڵەیە.

ب- هەندێک گوتوویانە: (**مَوْرُهَا: تَشقُّقها**)، واتە: شەق و پەق دەبێ.

ج- هەندێکیش گوتوویانە: (**مَوْرُهَا: اسْتَدَارَتُهَا وَتَحْرّكُهَا**)، سووڕان و جووڵانی.

د- هەندێک گوتوویانە: بە خێرایی دەجووڵێ.

www.alibapir.com



ه- هەندێک گوتوویانە: (**المَوْر: التَّحَرُّكُ بِاضْطِراب**)، (مَوْر) بریتیە لە جووڵانێکی نارێک، واتە: بە شێوەیەکی ڕێک نارِوات، بەڵکو تێکەوە داوێ و دێ و دەچێ، کە بێگومان لێرەدا مەبەست پێی ئاخیر زەمانە، ئەو کاتەی ئەم ئاسمان و زەوییەو، ئەو چیایانەی ئێستا هەن دەمێننەوەو گۆڕانیان بەسەردا دێ، ئەو دوو دیمەنە: چ جووڵان و سووڕانی ئاسمان و، چ ڕۆیشتنی چیایەکان، دوو دیمەنن کە لە ئاخیر زەماندا لە کاتی تێکچوونی ئەم سەر زەوییەو، ژیانی مرۆڤ لەسەر زەوی دا، ڕوو دەدەن.

٢)- ﴿ وَتَسِيرُ ٱلۡجِبَالُ سَيۡرٗا ﴾، چیایەکانیش دەڕۆن بە ڕۆیشتن، بۆ ڕوونکردنەوەی ئەم ئایەتە، ئەوە تەعبیری یەکێک لە زانایانە دەڵێ: (**سَيْرُ الجِبَالِ: انْتِقَالُهَا مِنْ مَوَاضِعِهَا بِالزَّلَازِلِ الَّتِي تَحْدُثُ عِنْدَ انْقِرَاضِ عَالَمِ الدُّنْيَا**)، ڕۆیشتنی چیایەکان، بریتیە لە گواستنەوەیان لە شوێنی خۆیان بەهۆی ئەو بوومەلەرزانەوە، کە لە کاتی کۆتایی پێ هاتنی ژیانی دنیادا ڕوو دەدەن.

هەڵبەتە لە زۆر شوێن دا خوا بسم الله الرحمن الرحيم باسی چیایەکانی کردوە، بۆ وێنە: لە سوورەتی (**الواقعة**)دا دەفەرموێ: ﴿ وَبُسَّتِ ٱلۡجِبَالُ بَسّٗا ۝٥ فَكَانَتۡ هَبَآءٗ مُّنۢبَثّٗا ۝٦ ﴾، واتە: چیایەکانیش وردو خاش دەبن، دەبن بە تۆزو گەرد، یان دەفەرموێ: ﴿ يَوۡمَ تَكُونُ ٱلسَّمَآءُ كَٱلۡمُهۡلِ ۝٨ وَتَكُونُ ٱلۡجِبَالُ كَٱلۡعِهۡنِ ۝٩ ﴾المعارج، ئەو ڕۆژە کە ئاسمان وەک کانزای تواوەو، چیایەکان وەک خوری شکراوەیان لێ دێ.

٣)- ﴿ فَوَيۡلٞ يَوۡمَئِذٖ لِّلۡمُكَذِّبِينَ ۝١١ ﴾، لەو ڕۆژەدا سزای سەخت و، هاوارو ئازاری زۆر بە ئێش بۆ بە درۆ دانەران، وشەی (وَيْلٌ)، وەک زۆرجار گوتوومانە:

أ- (**الوَيْلُ: سُوءُ الحالِ البالِغِ مُنْتَهى السُّوءِ**)، واتە: حاڵ خراپیەک کە گەیشتبێتە ئەوپەڕی.

ب- هەندێکیش دەڵێن: (وَيْلٌ)، واتە: هاوار، کاتێک دەگوترێ: هاوار بۆ فلانکەس، کە تووشی دەردو ئازارو نەهامەتییەک بووبێ، کە نەتوانێ خۆی لێ دەرباز بکات.

www.alibapir.com


ج- هەندێکیش گوتوویانە: (وَيْلٌ)، شیوێکە لە شیوەکانی دۆزەخ، کە هەموو دۆزەخ پەنای لێ بە خوا دەگرن.

(المُكَذِّبِيـنَ)، بـە درۆ دانـەران ئەوانـەی ڕۆژی دواییـان بـە درۆ دانـاوەو، پێغەمبەری خوایـان بـە درۆ دانـاوەو، پەیامـی خوایـان بـە درۆ دانـاوە، هەموویـان دەگرێتـەوە.

٤)- ﴿ ٱلَّذِينَ هُمۡ فِي خَوۡضٖ يَلۡعَبُونَ ﴾، ئەوانەی لە تێڕژاندا یاریی دەکەن، واتە: لە تێڕژانی قسەی پڕوپووچدا گەمەو یاریی دەکەن، یاخود گاڵتە دەکەن، (الخَوْضُ: الإنْدِفاعُ فـي الكَلَامِ البَاطِلِ والكَذِبِ)، (خَوْض): لە ئەصڵدا بریتیە لە چوونە نێو شتێکی شل و چوونە نێوی و بە نێودا ڕۆیشتنی باتڵاغێک.

خواش ﷻ ئەو قسـە پڕوپووچانەی بێبڕوایەکان کردوویانن، چواندوونی بە باتڵاغێکـەوە، بـە قـوڕو چڵپاوێکـەوە کـە مـرۆڤ دەچێتـە نێـوی، ئەوانـەی دەڕژێنـە نێـو قسـەی پـڕو پووچـەوە، (يَلْعَبُـون) واتـە: لـە تێڕژانیانـدا بـۆ نێـو قسـەی پڕوپـووچ، وەک گاڵتەکـردن دەڕژێنـە نێـو ئـەو قسـانەوە، چونکـە لێـرەدا: (اللَّعِـبُ: الإسْتِـهْزاءُ)، (لَعِـب): بـە مانـای گەمـەو یاریـی دێ، یـان بـە مانـای گاڵتـە پێکردنـە، وەک لـە سـووڕەتی (التوبة)داخوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ وَلَئِن سَأَلۡتَهُمۡ لَيَقُولُنَّ إِنَّمَا كُنَّا نَخُوضُ وَنَلۡعَبُۚ قُلۡ أَبِٱللَّهِ وَءَايَٰتِهِۦ وَرَسُولِهِۦ كُنتُمۡ تَسۡتَهۡزِءُونَ ٦٥ ﴾، واتـە: ئەگـەر لێشـیان بپـرسی (ئەوانـەی کـە لـە جەنگـی تەبـووک دا قسـەی خراپیـان دەکـرد، دوایـی کـە بـە پێغەمبـەری خـوا ﷺ دەگەیشـتەوەو، بانگـی دەکـردن بـۆ لێپرسـینەوەو سـەرکۆنە، دەیانگوت:) دەڵێن: ئێمە هەر تێدەڕژاین و یارییمان دەکرد، (دوایی خوا ﷻ ئەم یارییکـردن و تێڕژانـەی ئـەوانی بـە گاڵتـە پێکـردن تەفسـیر کـردوە، دەفەرمـوێ:) ئایـا بـە خـواو بـە ئایەتـەکانی خـواو بـە پێغەمبـەری خـوا ﷺ گاڵتەتـان دەکـرد؟!

کەواتـە: (لعـب)، بـە مانـای گاڵتـە پێکـردن دێ، ئەوانـەی کـە لـە کاتێـکدا دەڕژێنـە نێـو قسـەی پڕوپووچـەوەو گاڵتـە دەکـەن، بـە ئایەتـەکانی خـوا، ئەوانـە لـە ڕۆژی دواییـدا سـزای هـەرە سـەخت بـۆ ئـەوان.

www.alibapir.com



٥)- ﴿ يَوۡمَ يُدَعُّونَ إِلَىٰ نَارِ جَهَنَّمَ دَعًّا ﴾، ئەو ڕۆژەی زۆر بە توندیی بەرەو ئاگری دۆزەخ پاڵ پێوەدەنرێن، ئەم بەتوندیی پاڵ پێوەنانە، لە زمانی کوردییدا پاڵەستۆی پێ دەڵێن، پاڵەستۆیان دا واتە: پاڵیان پێوەنا بە توندیی بەرەو ئەو شوێنەی دەیانەوێ بیبەن، (الدَّعُّ: الدَّفْعُ العَنِيفُ، إهَانَةً لَهُمْ وغِلْظَةٌ عَلَيْهِمْ)، (دَعّ): بریتیە لە پاڵپێوەنانی توند، وەک بێ ڕێزیی پێکردن و، زبریی لەسەر نواندن، کە بە کوردیی (پاڵەستۆی) پێ دەڵێن، بەرەو ئاگری دۆزەخ پاڵەستۆ دەدرێن.

٦)- ﴿ هَٰذِهِ ٱلنَّارُ ٱلَّتِي كُنتُم بِهَا تُكَذِّبُونَ ﴾، (دەگوترێ:) ئەمە ئەو ئاگرەیە کە بەدرۆتان دادەنا، ئەمە گوتراوی قسەیەکی قرتێنراوە، یانی: (يُقَالُ لَهُمْ: هَـٰذِهِ ٱلنَّارُ ٱلَّتِي كُنتُم بِهَا تُكَذِّبُونَ)، پێیان دەگوترێ: ئەمە ئەو ئاگرەیە کە ئێوە بە درۆتان دادەنا، ئایا بۆچی خوا نەیفەرموە: (يُقَالُ لَهُمْ)؟ هەمیشە لە قورئاندا ئەوەی بە سیاق و سەلیقە دەزانرێ، خوا ﷻ قرتاندوویەتی و کتێبی خۆی پێ قەڵەباڵغ نەکردوە، چونکە دەزانرێ کە بێژەرێک ئەو قسەیە دەڵێ.

کە دەفەرموێ: ﴿ هَٰذِهِ ٱلنَّارُ ٱلَّتِي كُنتُم بِهَا تُكَذِّبُونَ ﴾، ئەم ناوی ئاماژەیە (هَـٰذِهِ)، بەڵگەیە لەسەر ئەوەی ئەوان لەو کاتەدا، ئاگری دۆزەخ دەبینن و دەچنە سوێی، بۆیە بە ئاماژەی نیزیک ئاماژەی پێ دەکات.

٧)- ﴿ أَفَسِحۡرٌ هَٰذَآ ﴾، ئایا ئەمە جادوویە؟ ئەوەی دەیبینن و بۆ ئێوە بینراوە، ئایا جادوویە؟ یاخود ئەمە هێنانەوەیانە بۆ ژیانی دنیا: ئایا ئەم قورئانە جادوویە، کە ئێوە بە جادووی ناو دەبەن، ئەو قورئانەی بەسەرتاندا دەخوێنرێتەوە، ئەو قورئانەی کە سروش دەکرێ بۆ موحەممەد ﷺ ئایا ئێوە بە جادووی دەزانن؟ دوای ئەوەی خوا ﷻ ئەو دیمەنەی ڕۆژی دوایی دەخاتە بەرچاویان، ئنجا دەیانهێنێتەوە بۆ ژیانی دنیا، ئایا ئەم قورئانە کە بۆ موحەممەد ﷺ دەخوێنرێتەوەو ئێوە بە جادووی ناوزەد دەکەن، ئایا جادوویە؟

www.alibapir.com


٨)- ﴿أَمۡ أَنتُمۡ لَا تُبۡصِرُونَ﴾، یاخود ئێوە نابینن، پێم وایە کە تەفسیری ئەم ئایەتە، ئاوا بکرێ ڕێکتر دێتەوە، چونکە ئەوەندە بینیومە هەموو توێژەرەوانی قورئان وایان لێکداوەتەوە، کە ئەمە هەر دواندنی خوایە ﷻ بۆ کافرەکان لە ڕۆژی دوایی دا، بەڵام پێم وایە دوای ئەوەی دەفەرموێ: ﴿هَٰذِهِ ٱلنَّارُ ٱلَّتِي كُنتُم بِهَا تُكَذِّبُونَ﴾، ئەمە ئەو ئاگرەیە کە ئێوە بە درۆتان دادەنا، ئنجا دێتەوە بۆ ئێرە بۆ دنیاو دەفەرموێ: ﴿أَفَسِحۡرٌ هَٰذَآ﴾، ئایا ئەمە، ئەم قورئانەی بەسەرتاندا دەخوێنرێتەوە بۆ موحەممەد ﷺ دابەزێنراوە، جادوویە؟ ﴿أَمۡ أَنتُمۡ لَا تُبۡصِرُونَ﴾، یاخود ئێوە نابینن، ئێوە عەقڵی خۆتان بەکارناهێنن؟

بۆیەش پێم وایە کە مەبەست لە (هَـذَا) قورئانە، نەک دۆزەخ، چونکە پێشێ دەفەرموێ: ﴿هَٰذِهِ ٱلنَّارُ ٱلَّتِي كُنتُم بِهَا تُكَذِّبُونَ﴾، ئنجا ئەگەر مەبەست دۆزەخ و، ئاگرەکەی بووایە، دەیفەرموو: (أَفَسِحْرٌ هَـذِهِ)، ئایا ئەم دۆزەخە، ئەم ئاگرە، جادوویە، یاخود ئێوە نایبینن، بەڵام کە دەفەرموێ: ﴿أَفَسِحۡرٌ هَٰذَآ﴾، ئەوە هێناونیەوە بۆ ژیانی دنیا، ئایا ئەم قورئانە کە بەسەرتاندا دەخوێندرێتەوەو باسی ڕۆژی دوایی دەکات، باسی سزایەک دەکات کە چاوەڕێتان دەکات، ئەگەر لەسەر کوفر بەردەوام بن، ئایا ئەم قورئانە جادوویە، یاخود ئێوە نایبینن بە چاوی عەقڵ و دڵ نایبینن؟!

٩)- ﴿ٱصۡلَوۡهَا﴾، واتە: بیچنەتێ و تێشیدا سزا بدرێن، چونکە (صَلِيَ)، بریتیە لە ئاگر تێبەردان و داگیرساندن، دەگوترێ: (صَلِيَ بالنَّارَ: بُلِّيَ بِـهَا)، واتە: پێیەوە گرفتار بوو، ئنجا خوا نەیفەرمووە: (ادْخُلُوهَا)، کە وشەی (ادْخُلُوهَا)ش لە شوێنی دیکەدا هاتوە، بەڵکو لێرە دەفەرموێ: (اصْلَوْهَا)، بیچنەتێ و پێشی بسووتێنرێن، (صَلِيَ)، تەنیا ئەوەندە نیە بچنە نێو ئاگر، بەڵکو ئەوەیە کە بە شێوەیەکی تایبەتیی لەوێدا بسووتێنرێن، (صَلِيَ) جۆرێک لە سووتێنرانی تایبەتە، کە لە هەر چوار دەورەوە ئاگرەکە لێی بدات، وەک عەرەب دەڵێن: (شَاةٌ مَصْلِيَّةٌ)، واتە: سووتاندنێک کە لە هەر چوار دەورەوە ئاگر لێی بدات و بیپیشێنرێ.

www.alibapir.com



١٠)- ﴿فَاصْبِرُوا أَوْ لَا تَصْبِرُوا سَوَاءٌ عَلَيْكُمْ﴾، واتە: خۆتان ڕابگرن، یان خۆتان ڕانەگرن، یەکسانە بۆ ئێوە، (سَواءٌ عَلَيْكم)، (سَوَاءٌ مُبْتَدَأ حُذِفَ خَبَرُهُ)، (سواء) نیهادەو گوزارەکەی قرتێنراوە، یانی: (سَواءٌ عَلَيْكُمْ: الصَّبْرُ وَغَيْرُهُ، وَغَيْرُ الصَّبْرِ)، خۆتان ڕابگرن یان خۆتان ڕانەگرن، یەکسانە لەسەر ئێوە خۆڕاگرتن و خۆڕانەگرتن.

١١)- ﴿إِنَّمَا تُجْزَوْنَ مَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ﴾، بە دڵنیایی ئێوە بەس سزای ئەوەتان دەدرێتەوە کە دەتانکرد، ئەمە پاساودانەوەی ئەوەیە: بۆچی خۆڕاگرتن و خۆڕانەگرتن، هەڵکردن و هەڵنەکردنیان، یەکسانە لە دۆزەخداو هەروەک یەکن؟ ئنجا خوای کارزان ئەوە بەوە پاساو دەداتەوە، یاخود بەوە هۆکار دۆزیی (تعليل)ی بۆ دەکات، چونکە خۆڕاگریی لەسەر ناڕەحەتیی کاتێک سوودی دەبێ، کە لە دنیادا خۆڕابگری لە پێناوی ئەوەدا کە پاداشتت دەست بکەوێ، بەڵام خۆڕاگرتن لەسەر ئازارو سزا لە ڕۆژی دوایی دا، هیچ ئیمتیازێکی نیە، بەسەر خۆڕانەگرتندا، بەڵێ ئەگەر لە دنیادا خۆڕابگری لەسەر ناڕەحەتیی لە پێناوی ئەوەدا کە پاداشتت دەست بکەوێ، بەدڵنیایی خۆڕاگرتن باشترە لە خۆڕانەگرتن و، هەڵکردن باشترە لە هەڵنەکردن، دان بەخۆداگرتن باشترە لە دان بە خۆدا نەگرتن، بەڵام ئەوە لە دنیادا، ئەگەرنا لە ڕۆژی دوایی دا لە نێو ئاگرو لە سزای خوادا، هەڵکردن و هەڵنەکردن، مەدارکردن و مەدارنەکردن، دان بە خۆداگرتن و دان بە خۆدانەگرتن، هەروەک یەکن.

ئنجا کە دەفەرموێ: ﴿إِنَّمَا تُجْزَوْنَ مَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ﴾، چونکە لە هەندێک شوێناندا دەفەرموێ: ﴿بِمَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ﴾، بەڵام لێرە (ب)ی نەخراوەتە سەر، بۆچی؟ (وعُدِّيَ تُجْزَوْنَ إلى ﴿مَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ﴾ لِيَشْمُلَ القَصْرُ مَفْعُولَ الفِعْلِ المَقْصُورِ، أَيْ: تُجْزَوْنَ مِثْلَ عَمَلِكُمْ لاَ أَكْثَرَ مِنْهُ، فَيَنْتَفِيَ الظُّلْمُ عَنْ مِقْدَارِ الجَزَاءِ، كَمَا انْتَفَى الظُّلْمُ عَنْ أَصْلِهِ)، بۆیە وشەی (تُجْزَوْنَ)، تێپەڕی پێکراوە بۆ ﴿مَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ﴾، بەبێ (ب) بۆ ئەوەی کورت هەڵێنانەکە ئەو واتایە بگەیەنێ، کە ئێوە چیتان کردوە، ڕێک وەک کردەوەکەی خۆتان سزا دەدرێنەوە، نەک زیاتر، کەواتە: ستەم لە ئەندازەی سزایەکە لادەبردرێ، هەروەک چۆن لە ئەصڵەکەشی لابراوە،

www.alibapir.com

لـە ئەصڵـدا سـزایەکە پـڕ بـە پێسـتی خۆتانـە، ئەندازەکەشـی زیاتـر لـە کـردەوەی خۆتـان نیـە، سـزایەکە ڕێـک پـڕ بـە پێسـتی کردەوەکـەی خۆتانـە، هـەروەک چـۆن لـە ئەصڵـدا سـزادانەکە ڕەوا بـووە، ئەندازەکەشـی ڕێـک پـڕ بـە پێسـتەو، زیاتـر نیـە لـە کردەوەکـەی خۆتـان.

خـوا بـە لوتـف و کەرەمـی خـۆی یارمەتییـمان بـدات، کـە بـە شـێوەیەک بژیـن، لەسـەر کردەوەکانمـان پاداشـت بدرێینـەوە، جـم وجـۆڵ و کـردارو چالاکیـی وامـان هەبن، چ لە پەیوەندییمان لەگەڵ خوادا ﷻ، چ لە پەیوەندیی و لە جم وجۆڵمان لەگـەڵ خەڵکـدا، کـە بەهرەمەنـد بیـن لـە جـم وجۆڵەکانمـان نـەک زەرەرمەنـد بیـن و، پاداشـت بدرێینـەوە نـەک سـزا بدرێیـن.

خـوا بـە لوتـف و کەرەمـی خۆشـی یارمەتییـمان بـدات، زیاتـر لـەو فەرمایشـتە موبارەکـەی حاڵیـی بیـن و، پاشـانیش تەوفیقـمان بـدات کـە حاڵیـی بوونەکـەش لـە خۆمانـدا بکەینـە حـاڵ، خـوا زیاتـر زانینـمان پـێ ببەخشـێ لـە کتێبەکـەی خۆیـداو، دواییـش یارمەتییـمان بـدات زانینەکەشـی بگۆڕیـن بـۆ توانیـن، هـەم لـە چوارچێـوەی خۆمانـدا، خۆمـانی پـێ تێبگەیەنیـن و پێبگەیەنیـن، هـەم یارمەتییشـمان بـدات و، دەسـتمان کـراوە بـکات کـە دەوروبەریشـمان تـێ بگەیەنیـن و پێبگەیەنیـن، بـە دڵنیایـی کتێبـی خـواو فەرمایشـتی خـوا، پـڕە لـە نـوورو بەرەکـەت، بـەڵام بێگومـان دەبـێ مسـوڵمان حەرەکـەتی بـەرەو لا بـکات، وەک گوتـراوە: (لـە تـۆ حەرەکـەت و لـە خـوا بەرەکـەت)، خـوا ئـەو حەرەکەتـە ڕاسـت و بـە سـوودەمان پـێ بـدات، بـۆ ئـەوەی سـەرەنجام حەرەکەتەکەمـان هـۆکاری ئـەوە بـێ کـە بەرەکـەتی خـوای پەروەردگاریشـمان چنـگ بکـەوێ.

سُبحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ، أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إلاَّ أَنْتَ، أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إلَيْكَ.

## پێناسەی ئەم دەرسە

ئـەم دەرسـە دوازدە ئایەتـەو ئایەتـەکانی: (١٧ - ٢٨) دەگرێتـە خـۆی، لـەم دوازدە ئایەتەدا، خوا بسم الله الرحمن الرحیم باسی سەرەنجامی پڕخێرو بەرەکەت و، بەختەوەری پارێزکاران دەکات، لـە ڕۆژی دواییـدا، کـە سـەرەنجام لـە میـانی باسـکردنی سـەرەنجامی پارێزکارانـدا، یـازدە لـە نـازو نیعمەتـەکان خراونـەڕوو:

١- نیشتەجێ بوون لە نێو باخ و نازو نیعمەتی بەردەوام و هەمیشەییدا.

٢- شادمانبوون و چێژوەرگرتن لە بەخششی خوا.

٣- پارێزران لە کڵپەی ئاگری دۆزەخ.

٤- نۆشی گیانتان بێ، پێ گوترانیان و، خواردن و خواردنەوەکانیان کە نۆشیان دەکەن، هیچ دەرەنجام و دەرکەوتەی خراپیان نابێ، بە پێچەوانەی خواردن و خواردنەوەی دنیاوە.

٥- پاڵدانەوەیان لەسەر تەخت و قەنەفەی لە تەنیشت یەک و ڕیز بوو.

٦- جووتکرانیان لەگەڵ ئافرەتانی قەشەنگدا.

٧- پێکەوە کۆکردنەوەیان لەگەڵ ڕۆڵەو وەچەکانیاندا، بێ ئەوەی لە کردەوەیان کەم بکرێتەوە.

٨- زێدەیی پێدانیان لە میوەو، گۆشتی دڵ پەسندیان، واتە: بەردەوام بۆ زیادکردنیان لەو خۆراکانەی حەزیان پێدەکەن.

٩- پێکەوە نۆشکردنی مەی (شەڕاب) بێ ئەوەی قسەی پووچ و گوناهی تێدابێ.

١٠- خزمەتکرانیان لە لایەن کوڕانی پاک و جوانی وەک گەوهەری شێردراوەوە.

www.alibapir.com



**١١-** پێکەوە یادکردنەوەی ژیانی دنیایان و، یادکردنەوەی چاکەی خوا بەسەریانەوە، کە ڕاستە ڕێی کردبوون و وای لێکردبوون ئەهلی تاعەت و چاکەبن.

﴿إِنَّ ٱلۡمُتَّقِينَ فِي جَنَّٰتٖ وَنَعِيمٖ ﴿١٧﴾ فَٰكِهِينَ بِمَآ ءَاتَىٰهُمۡ رَبُّهُمۡ وَوَقَىٰهُمۡ رَبُّهُمۡ عَذَابَ ٱلۡجَحِيمِ ﴿١٨﴾ كُلُواْ وَٱشۡرَبُواْ هَنِيٓـَٔۢا بِمَا كُنتُمۡ تَعۡمَلُونَ ﴿١٩﴾ مُتَّكِـِٔينَ عَلَىٰ سُرُرٖ مَّصۡفُوفَةٖۖ وَزَوَّجۡنَٰهُم بِحُورٍ عِينٖ ﴿٢٠﴾ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَٱتَّبَعَتۡهُمۡ ذُرِّيَّتُهُم بِإِيمَٰنٍ أَلۡحَقۡنَا بِهِمۡ ذُرِّيَّتَهُمۡ وَمَآ أَلَتۡنَٰهُم مِّنۡ عَمَلِهِم مِّن شَيۡءٖۚ كُلُّ ٱمۡرِيِٕۭ بِمَا كَسَبَ رَهِينٞ ﴿٢١﴾ وَأَمۡدَدۡنَٰهُم بِفَٰكِهَةٖ وَلَحۡمٖ مِّمَّا يَشۡتَهُونَ ﴿٢٢﴾ يَتَنَٰزَعُونَ فِيهَا كَأۡسٗا لَّا لَغۡوٞ فِيهَا وَلَا تَأۡثِيمٞ ﴿٢٣﴾ ۞وَيَطُوفُ عَلَيۡهِمۡ غِلۡمَانٞ لَّهُمۡ كَأَنَّهُمۡ لُؤۡلُؤٞ مَّكۡنُونٞ ﴿٢٤﴾ وَأَقۡبَلَ بَعۡضُهُمۡ عَلَىٰ بَعۡضٖ يَتَسَآءَلُونَ ﴿٢٥﴾ قَالُوٓاْ إِنَّا كُنَّا قَبۡلُ فِيٓ أَهۡلِنَا مُشۡفِقِينَ ﴿٢٦﴾ فَمَنَّ ٱللَّهُ عَلَيۡنَا وَوَقَىٰنَا عَذَابَ ٱلسَّمُومِ ﴿٢٧﴾ إِنَّا كُنَّا مِن قَبۡلُ نَدۡعُوهُۖ إِنَّهُۥ هُوَ ٱلۡبَرُّ ٱلرَّحِيمُ ﴿٢٨﴾﴾.

## مانای دەقا و دەقی ئایەتەکان

{بە دڵنیایی پارێزکاران لە نێو باخ و گوڵزاران و، نازو نیعمەتی بەردەوام دان ﴿١٧﴾ بە هۆی ئەوەوە کە پەروەردگاریان پێیداون، شادمانن و پەروەردگاریان لە ئازاری کڵپە (ی ئاگری دۆزەخ) پاراستوونی ﴿١٨﴾ (پێیان دەگوترێ:) بخۆن و بخۆنەوە ئاسوودەو بێ گرفت (نۆشی گیانتان بێ) بە هۆی ئەوەوە کە لە ژیانی دنیادا دەتانکرد ﴿١٩﴾ لەسەر تەخت و قەنەفە ڕیزبووەکان، پاڵیانداوەتەوە، هەروەها ئافرەتانی سپی و ساف و چاو گەورەو گەشمان کردوونە هاوسەریان ﴿٢٠﴾ ئەوانەش کە بڕوایان هێناوەو، وەچەکەشیان بە بڕواوە شوێنیان کەوتوە، وەچەکەیانیان پێوە پەیوەست دەکەین و، پێکەوە کۆیان دەکەینەوەو، هیچ شتێکیش لە کردەوەیان کەم ناکەینەوە، هەر مرۆڤە بارمتەی ئەوەیە کە وەدەستی هێناوە ﴿٢١﴾ بەردەوام

www.alibapir.com


لـە میوەو گۆشـتێک کـە ئـارەزووی دەکـەن، بۆیـان زێـدە دەکەیـن ﴿٢٢﴾ لەوێـدا (لـە بەهەشـت دا) پـەرداخ (ی مـەی) لـە یەکـدی وەردەگـرن، کـە نـە قسـەی پووچـی تێدایـە نـە (هـۆکاری) گوناهباربـوون ﴿٢٣﴾ نەوجەوانانێکـی خۆیـان (بـۆ خزمەتکـردن) بەسـەریانەوە دەگەڕێـن، وەک گەوهـەری شـێردراوە (ی نێـو قۆزاخـەی پـاک و جـوان) ن ﴿٢٤﴾ (لەوێـدا) هەندێکیـان بـە پرسـیار لـە یەکـدی کردنـەوە ڕوویـان لـە یەکـدی کـرد ﴿٢٥﴾ گوتیـان: بێگومـان ئێمـە پێشـتر لـە (دنیـادا) لـە نێـو کـەس و کارمانـدا بیمـدار بوویـن (لـە سـزای خـوا) ﴿٢٦﴾ ئنجـا خـوا چاکـەی لەگەڵـدا کردیـن و لـە ئـازاری گڕەبـا (ی دۆزەخ) چەپاڵـەی دایـن ﴿٢٧﴾ بـە دڵنیایـی ئێمـە پێشـتر بـەردەوام لێـی دەپاڕاینـەوە، مسـۆگەر ئەویـش بـەس خـۆی چاکـەکاری بـە بەزەییـە ﴿٢٨﴾}.

## شیکردنەوەی هەندێک لە وشەکان

(وَنَعِيمٍ): (النَّعِيْم: النِّعْمَـةُ الكَثِـيْرَةُ الدَّائِمَـة، وَالنِّعْمَـةُ: الحَالَـةُ الحَسَـنَةَ)، (نَعِيْـم)، واتـە: خێـرو خۆشـیی و چاکـەی زۆرو بـەردەوام، (نِعْمَـة): بریتیـە لـە حاڵەتێکـی بـاش، حاڵێـک کـە مـرۆڤ پێـی بـاش و پەسـند بـێ.

(فَـٰكِهِينَ): (فَكِـه، يَفْكَـهُ، فَكَهَـاً وَفُكَاهَـةً: كَانَ طَيِّـب النَّفْـسِ مَزَّاحَـاً)، (فَكِـه، يَفْكَـهُ، فَكَهَـاً وَفُكَاهَـة)، ئـەو کەسـەی حاڵـەتی دەروونیـی خـۆش بـێ و، قسـەی خـۆش و سـوعبەت بـکات، وای پـێ دەگوتـرێ، (فُكَاهَـةً)، یـانی: قسـەی خـۆش و سـوعبەت پێکـەوە کـردن، (تَفَكَّـه مِنْـهُ: تَعَجَّـبَ)، سـەری لێـی سـوڕماو، (تَفَكَّـهَ بِالـشَّيءِ : تَمَتَّـعَ بِـهِ وَتَلَـذَّذَ)، چێـژی لـە شـتەکە وەرگـرت و لێـی بەهرەمەنـد بـوو، (وَالفَاكِـهُ: النَّاعِـمُ العَيْـش)، (فَاكِـه): کەسـێکە ژیانەکـەی پڕخێـرو خۆشـیی بـێ، (نَاعِـم)، یـانی: نـەرم پێچەوانـەی زبـرە، دەگوتـرێ: ژیانەکـەی زبـرە، یـانی: ناڕەحەتـە، یـان: ژیانەکـەی نـەرم و نیانـە، واتـە: خـۆش و بەچێـژە.

www.alibapir.com



(هَنِيٓـًٔا): (هَنَـأَ فُـلانٌ، يَهْنَـأُ هَنْئَـاً، أي: أَعْطَـاهُ طَعَامَـاً، وَهَنَـأَ الطَّعَـامُ الرَّجُـل: سَـاغَ لَـهُ وَلَـذَّ لَـهُ، وَالهَنِـيءُ وَالمُهْنَـأُ وَطَعَـامٌ هَنِـيءٌ: سَـائِغٌ)، (هَنَـأَ فُـلانٌ، يَهْنَـأُ هَنْئَـاً، أي: أَعْطَـاهُ طَعَامَـاً)، واتـە: خواردنێکـی دایـە، (هَنَأَ الطَّعَـامُ الرَّجُـلَ)، واتـە: خواردنەکـە بـۆ پیاوەکـە خـۆش و پەسـند بـوو، (سَـاغَ لَـهُ وَلَـذَّ لَـهُ)، بـە ئاسـانیی لـە گـەرووی چـووە خـوارو چێـژی لـێ وەرگـرت، (الهَنِـيءُ وَالمُهْنَـأُ وَطَعَـامٌ هَنِـيءٌ)، ئەمـە هەمـووی یـانی: (سَـائِغٌ)، واتـە: خواردنێـک بـە خۆشـیی لـە گـەروو بچێتـە خـوار.

بـەڵام ڕاسـت نیـە کـە وشـەی (هَنِيئاً)، بـەس ئەوەنـدە بگەیەنـێ کـە خـواردن، یـان خواردنـەوە بـە ئاسـانیی لـە گـەروو بچێتـە خـوار، بەڵکـو (هنیـئ) ئەوەیـە سەرەنجامیشـی بـاش بـێ، واتـە: خاوەنەکـەی لێـی بەهرەمەنـد بـێ و پێـی ناڕەحـەت نەبـێ، بـە پێچەوانـەی هـی دنیـاوە، کەسـێک پاروویـەک لـە خـۆی زیاتـر بخـوات، پێـی ناڕەحـەت دەبـێ، ئەگـەر کەمیـش بـێ، هەسـت بـە برسـێتیی دەکات، هەروەهـا بـۆ خواردنـەوەش هـەروا.

(مُتَّكِـِٔينَ): (المُتَّـكَأُ: الـمَكَانُ الَّـذِي يُتَّـكَأُ عَلَيْـهِ، وَالمِخَـدَّة)، (مُتَّكَأ): ئـەو شـوێنەیە پاڵی لـێ دەدرێتـەوە، شـانی لـێ دادەدرێ، هەروەهـا (مِخَـدَّة)، ئـەو سـەرین و باڵنجـەش کە شـانی وێ دەدرێ، پێـی دەگوتـرێ: (مُتَّكَأ)، (إتِّكَاء)، بـە کوردیـی دەبێتـەوە شـاندادان و پاڵدانـەوە، کـە عـادەتی کەسـانێکە زۆر ئاسـوودە و ئیسـڕاحەتن و لـە خۆشـیی و شـادیی دان.

(سُرُرٖ مَّصۡفُوفَةٖ): (سُرُر) تەختـەکان کـۆی تەخـت (سَرِيـر)ە، (السَّرِيـرُ: الَّـذِي يُجْلَـسُ عَلَيْـهِ مِـنَ السُّـرُورِ، وَجَمْعُـهُ أَسِرَّة وَسُرُر)، (سَرِيـر): ئـەو تەختەیـە کـە مـرۆڤ لـە کاتی دڵخۆشـییدا لەسـەری دادەنیشـێ، کۆیەکـەی (أَسِرَّة)و (سُرُر)ە، (سَرِيـر)، ئـەو تەخـت و قەنەفەیـە کـە مـرۆڤ لەسـەری دادەنیشـێ، یاخـود لەسـەری ڕادەکشـێ، (مَصْفُوفَـة)، (صَـفّ): ئەوەیـە کـە چەنـد شـتێک بەهێڵێکـی یەکسـان لـە پەنـای یەکـدا دابنرێـن، (مَصْفُوفَـة)، پێکـەوە ڕیزکـراو.

www.alibapir.com



(وَزَوَّجۡنَـٰهُم بِحُورٍ عِينٍ): ئافرەتـانی سـپی چاوگـەش و چاوگەورەمـان کـردە هاوسـەریان، چونکـە (**وَزَوَّجْنَاهُـمْ**)، مـادام بـە (ب) بـەرکاری خواسـتوە (**وَزَوَّجْنَاهُـمْ بِحُـورٍ عِـين، أي: قَرَّنَاهُـمْ**)، واتـە: لەگـەڵ وانـدا کردماننـە هـاودەم و هـاوڕازو هاونشـین، لـە بەهەشـتێ نیـکاح و مارەکـردن نیـە، ئەگـەر مەبەسـت پێـی نیـکاح بایـە، دەیفەرمـوو: (**وَزَوَّجْنَاهُـمْ حُـوراً عِيْنَـاً**)، ئافرەتـانی سـپی چاوگـەش و گەورەمـان لـێ مارەکـردن، بـەڵام لـە بەهەشـتێ مارەکـردن نیـە، ئـەوەی خـوای پـەروەردگار پێیـان دەدات، حەڵاڵـی خۆیانـە، بـێ ئـەوەی پێویسـتیی بـە گرێبەسـتی نیـکاح ببـێ، کـە ئـەوە بـەس بـۆ ژیـانی دنیـا پێویسـتە، (**حُـورٍ: جَمْـعُ أَحْـوَر وَحَـوْرَاء، وَالحَـوَرُ: ظُهُـور قَلِيْـلٍ مِـنَ بَيَـاضِ العَـيْنِ فـي سَـوَادٍ، وَذَلِـكَ نِهَايَـةُ الحُسْـنِ فـي العَـيْنِ**) (**حُـور**) کـۆی (**أَحْـوَر**)و (**حَـوْرَاء**)ە، (**حَـوَر**): بریتیـە لـە دەرکەوتنـی کەمێـک لـە سـپێنە لـە چـاودا لـە نێـو ڕەشـاییەکی زۆردا، ئـەوەش ئەوپـەڕی جوانییە لـە چـاودا، ئەوەش بـۆ چـوونی ئـەو زانایەیـە.

گرنگ ئەوەیە خوا ﷻ دوو وشـەی بەکارهێناون: (**حُور**)و (**عِين**)، ئنجا من وای تێدەگـەم کـە (**حُـور**) کـۆی (**حَـوْرَاء**)ە بۆ ئافرەتـان و، کـۆی (**أحْوَر**)ە بـۆ پیـاوان، دەگەڕێتەوە بـۆ وەسـفی جەسـتەیان، واتـە: جەسـتەیان سـپی و سـۆڵە، (**عِيْن**)یـش، کـە کـۆی (**عَيْنَـاء**)ە، مەبەسـت پێـی چـاوە، ئنجـا هەمـوو بەشـەرەکان حـەز بـە سـپیی و سـافیی دەکـەن لـە جەسـتەداو، حـەز بـە چـاوی گـەورەو جوانیـش دەکـەن لـە دەم و چاویشـدا، چـاو زیاتـر جوانیی دەدا، بە ڕووی مرۆڤ، بۆیە خوا ﷻ جەسـتەیانی بەسـپیی و ساف وەسف کـردوە و، دەم و چاویشـیانی بـە چـاوی گـەش و گـەورەو جـوان وەسـف کـردوە.

(وَمَآ أَلَتۡنَـٰهُم): لـە کردەوەکەیـان هیچـمان لـێ کـەم نەکـردوە، (**لاتَـهُ عَـنْ كَـذَا يَلِيْتُـهُ، أي: صَرَفَـهُ عَنْـهُ، وَنَقَّصَـهُ حَقَّـاً لَـهُ**)، (**لاتَـهُ عَـنْ كَـذَا يَلِيْتُـهُ**)، بـە دوو واتایـان هاتـوە: أ- (**صَرَفَـهُ عَنْـهُ**)، لـەو کارەی لایـدا. ب- (**نَقَّصَـهُ حَقَّـاً لَـهُ**)، مافێـک کـە هەیبـوو مافەکـەی نەدایـەو لێـی کەمکـردەوە، ئنجا وشـەی (**أَلَتْنَـا**) کـە بـە (**لاتَ وَألاَتَ**) هاتـوە، وەک لـە سـوورەتی (**الحجـرات**)دا دەفەرمـوێ: ﴿لَا يَلِتۡكُم ﴿١٤﴾﴾، ئەمـە لـە (**لاَتَ**)وە هاتـوە، بەڵام لێـرە (**وَمَـا أَلَتْنَاهُـمْ**)، لـە (**أَلاَتَ**)یـەو، هەردووکیـان یـانی: (**نَقْـص**)، لێـی کەمکـردەوە.

www.alibapir.com


ئایا ئەوە لە چییەوە هاتوە؟

(**راغب الأصفهاني**) دەڵێ: (**أَصْلُهُ مِنْ رَدِّ اللِّيْتِ، وَهُوَ صَفْحَةُ العُنُقِ**)، ڕیشەکەی بریتیە لە وەرسووڕاندنی مل (**لِيْت**)، لامل، ئنجا ئەگەر کەسێک لاملی لە کەسێک کرد، مانای وایە مافەکەی لێ کەم کردۆتەوە، بە کورتیی خوا ﷻ دەفەرموێ: ئەوانەی بڕواداربوون لە دنیادا، منداڵ و وەچەکانیشیان بە ئیمانەوە شوێنیان کەوتوون، لە بەهەشتدا، پێکەوە پەیوەستیان دەکەین و کۆیان دەکەینەوە، لە کردەوەی باب و دایکیان کە پلەیان بەرزترە، کەم ناکەینەوە، چونکە لە عادەتی خوا نیە، کەم کردنەوە، بەڵکو خوا لە بەخششی خۆی بۆ هی ڕۆڵەو منداڵەکانیان زیاد دەکات و، ئەوان بەرز دەکاتەوە بۆ لای باب و دایکیان، نەک ئەوان داگرێتە خوار بۆ لای ئەوانەی لە خوارێن.

(رَهِينٌ): بارمتە، (**الرَّهْنُ: مَا يُوضَعُ وَثِيقَةً للدَّيْنِ، والرِّهَانُ مِثْلُهُ، لَكِنَّهُ يَخْتَصّ بِمَا يُوضَعُ فِي الخِطَارِ، رَهِيْن وَرَهِيْنَة، فَعِيْلٌ بِمَعْنى فَاعِل، أي: ثَابِتَةٌ مُقِيْمَة، أو بِمَعْنى مَفْعُولٍ أي: مُقَامَةٌ في جَزَاء مَا قَدَّمَ**)، (**رَهْن**): بە کوردیی دەبێتە بارمتە، بارمتەش ئەوەیە لە بەرانبەر قەرزێکدا دادەنرێ، (**رِهَان**)یش بە هەمان شێوەیە، بەڵام (**رِهَان**) زیاتر بۆ ئەوەیە: پێشبڕکێیەک دەکرێ هەردووکیان ئەندازەیەک، پارە یان شتێک دادەنێن، ئنجا هەر کامێکیان بردیەوە، هەردووکیان دەبات، هەم هی خۆی و، هەم هی بەرانبەرەکەشی.

وشەی (**رَهِيْن، وَرَهِيْنَة**)، یان لەسەر کێشی (**فَعِيْل**)ە، بە مانای بکەر (**فَاعِل**)ە، واتە: چەسپاوو بەردەوام، یاخود لەسەر کێشی (**فَعِيْل**)ە، بە مانای بەرکار (**مَفْعُول**)ە، واتە: بەردەوامکراوو چەسپێنراو، لە بەرانبەر ئەوەدا کە کردوویەتی، ﴿كُلُّ ٱمۡرِيِٕۭ بِمَا كَسَبَ رَهِينٞ﴾، واتە: هەر مرۆڤە بارمتەی کردەوەکانی خۆیەتی.

(وَأَمۡدَدۡنَٰهُم): (**أَصْلُ المَدِّ: الجَرُّ، مَدَدْتُهُ في غَيِّهِ، وَأَمُدُّ الجَيْشَ بِمَدَدٍ، وَالإنْسَانَ بطَعَامٍ، وَالإمْدادُ في المَحْبُوبِ، وَالمَدُّ في المَكْرُوهِ**)، (**إمْدَاد**) لە (**مَدّ**)ەوە هاتوە،

www.alibapir.com


(مَدّ): بە مانای ڕاکێشان و تێنووسان دێ، دەگوترێ: (**مَدَدْتُهُ في غَيِّهِ**)، واتە: لە گومڕایی و سەرگەردانییەکەیدا ڕستم بۆ درێژ کرد، (**أَمُدُّ الجَيْشَ بِمَدَدٍ**)، هاوکاریی سوپایەکەم کرد، زێدەییم بۆ نارد، (**أَمُدُّ الإنْسَانَ بِطَعَامٍ**)، واتە: خواردنم بۆ مرۆڤ زیاد کرد، (**إمْدَاد**)، لە شتی خۆشویستراودا بەکاردێ و، (**مَدّ**)، بە زۆریی وایە لە شتی ناخۆشویستراو و خراپدا بەکاردەهێنرێ، (**مَدَّ لَهُ**)، یانی: لە خراپەدا بۆی زیاد کرد، بەڵام (**أَمَدَّهُ، أَمْدَدْنَاهُمْ**)، واتە: لە چاکەدا بۆی زیاد کرد، بۆمان زیادکردن.

(غِلْمَانٌ): (**جَمْعُ غُلاَم، أي: طارُّ الشَّارِب**)، (**غِلْمَان**) کۆی (**غُلام**)ە، (**غُلام**)، کوڕێکی گەنجە کە تازە سمێڵی خەتی دابێ، یانی: لە سەرو حەدی باڵغبوون دابێ.

(لُؤْلُؤٌ مَّكْنُونٌ): دەگوترێ: (**تَلَأْلَأَ الشَّيء: أي لَمَعَ، لَمَعَانَ اللُّؤْلُؤِ**)، درەوشایەوە وەک چۆن گەوهەر دەدرەوشێتەوە، (**مَكْنُونٌ**)یش، بە مانای شێردراوە (**مَخْزُوْن**)، أو (**مَسْتُوْر**)، واتە: هەڵگیراو، یاخود پەنهانکراو، دێ، (**المَكْنُ: بَيْضُ الضَبِّ، الْكِنّ: مَا يُحْفَظُ فِيْهِ الشَّيءُ، بَيْضٌ مَكْنُون، أي: مَسْتُوْر، أو مَحْفُوظ**)، (**مَكْن**): بە هێلکەی (**ضَبّ**)، دەگوترێ واتە: بزنمژە، (**كِنّ**)، هەر شتێکە شتێکی تێدا پەنهان دەکرێ و دەشاردرێتەوە، کە ڕەنگە (کون)ی کوردییش هەر لە (**كِنّ**)ی عەرەبییەوە هاتبێ، (**بيض مَكْنُون**)، واتە: هێلکەی پەنهانکراو.

(مُشْفِقِينَ): بیم هەبووان، (**الإشفاق**) ترسان لەگەڵ بەزەییدا، (**الإِشْفَاقُ: عِنَايَةٌ مُخْتَلَطَةٌ بِخَوْفٍ، لأنَّ الْمُشْفِقَ يُحِبُّ الْمُشْفَقَ عَلَيْهِ، وَيَخَافُ مَا يَلْحَقُهُ، مِنَ الشَّفَقِ: وَهُوَ إخْتِلَاط النهار بسَّوَادِ اللَّيْلِ**)، (**إشْفَاق**): بریتییە لە پەرۆش بوونێکی تێکەڵ لەگەڵ ترسدا، چونکە بابای (**مُشْفِق**)، ئەو کەسەی شەفەقەتی بەرانبەری هەیە، خۆشیدەوێ، بەڵام دەشترسێ لەوەی ناڕەحەتیی و گرفتارییەکی تووش بێ، ئەویش لە ئەصڵدا لە (**شَفَق**)ەوە هاتوە، کە بریتییە لە تێکەڵیی ڕووناکیی ڕۆژ لەگەڵ تاریکیی شەودا، کاتێ خۆر ئاوا دەبێ، بە عەرەبیی دەڵێن: (**الشَّفَقُ الأحْمَر**)، زەردە پەڕ، کوردەواریی دەڵێن: تاریک و ڕوونیی بەیانی، هەروەها بە هی دوای

نوێـژی شـێوان و دوای خۆرئـاوا بوونیـش دەڵێـن: بوولێڵـی ئێـواری، واتـە: تاریکیـی و ڕووناکیـی تێکـەڵ، جـاری تـەواو تاریـک نەبـووە، بـەڵام ڕووناکیـی ڕۆژێـش بـەرەو کۆتاییـە، (إِشْـفَاقُ)یش، بریتیـە لـە دوو شـتی تێکـەڵ، بەزەیـی و پـەرۆش هەبـوون بەرانبـەر بـە کەسـێک، هەروەهـا ترسـانیش، بەزەیـی بەرانبـەری هەیـە لـە ئەنجامـی خۆشویسـتنی دا، ترسیشـی بەرانبـەری هەیـە کـە نارەحەتیـی تـووش ببـێ.

(عَذَابَ ٱلسَّمُومِ): واتـە: ئـازاری گڕەبـا، (**السَّـمُومِ: الرِّيْـحُ الحَـارَّةُ الَّتِـي تُؤَثِّـرُ تَأْثِيْرَ السُّـمِّ**)، (**سـموم**)، ژەهـر، هەروەهـا (**سَـمُوم**): ئـەو گـڕە بـا گەرمەیـە، کـە وەک چـۆن ژەهـر کاریگەریـی خـراپ لەسـەر جەسـتەی مـرۆڤ دادەنـێ، ئـەو گڕەبـا گەرمـەش ئـاوا کاریگەریـی تـێ دەکات، هەندێکیـش گوتوویانـە: (**السَّمُوم: الرِّيْـحُ التَّـي تَدْخُـلُ مَسَـامَّ الجِسْـمِ**)، ئـەو گڕەبـا گەرمەیـە کـە دەچێتـە نێـو کونـەکانی جەسـتەوە.

(ٱلْبَرُّ ٱلرَّحِيمُ): (**بَـرٌّ**) و (**بَـارّ**)، هەردووکیـان بـە مانـای (چاکـە کار) دێـن و، چونکـە (**البِرُّ: تَوَسُّـعٌ فِـي فِعْـلِ الخَيْرِ**)، (**بِـرّ**): بریتیـە لـە فراوانیـی لـە چاکەکارییـدا، ئەویـش لـە (**بـر**)ەوە هاتـوە، (**البرّ والبَحْـر**)، (**بَحْـر**): دیـارە دەریایـە، (**بر**)یـش، واتـە: وشـکانیی و بیابـان کـە فراوانـە، ئنجـا (**بِـرّ**)، یـانی: فراوانیـی لـە چاکەکارییـدا، (**الـبَرُّ**)، واتـە: بابایەکـی چاکـەکار کـە چاکـەی فـراوان دەکات.

هەڵبەتـە لێـرەدا: (**البَرُّ الرَّحِيْم**)، هەردووکیان دوو سیفەتی خوان ﷻ واتە: چاکـەکار و، چاکـە فـراوان و، بـە بەزەیـی بـەردەوام.

لە تۆڕە کۆمەڵایەتییەکان لەگەڵتانین
Stay in touch on social media
نحن معكم عبر مواقع التواصل الاجتماعي
ڕاگەیاندنی مەکتەبی مامۆستا عەلی باپیر
AliBapir/عەلی باپیر
archive.org/details/@alibapir
AliBapir/عەلی باپیر
کەناڵی
ڕاگەیاندنی مەکتەبی مامۆستا عەلی باپیر
AliBapir
Google Play
App Store
www.alibapir.net
عربي - كوردی - English
ڕاگەیاندنی مەکتەبی مامۆستا عەلی باپیر

www.alibapir.com


## ماناى گشتيى ئايەتەكان

له ئايەتەكانى پێشوودا، دواى ئەوەى خوا ﷻ سوێندى به پێنج شتان خوارد، لەسەر ئەوە كە: سزاو ئازارى پەروەردگارت هەر دێ و، ڕوودەدات و هيچ بەرپەرچدانەوەى نيه، بۆ بێبڕوايان و خراپەكاران، باسى چەند ديمەنێك لە سزاو جەزرەبەى خواى كرد بۆ بێبڕوايان لە ڕۆژى دوايى دا، ئنجا وەك عادەتى قورئان كه هەميشە خوا ﷻ ترس و ئومێد پێكەوە باس دەكات، سزاو پاداشتەكەى پێكەوە باس دەكات، سزاى بۆ بێبڕوايانى خراپەكارو، پاداشتيشى بۆ بڕوادارانى پارێزكارو چاكەكار، دێتە سەر باسى ئەو پاداشتەى كە بۆ پارێزكارانى داناوە، كە بێبڕوايان بە بەدرۆدانەران (**مُكَذِّبِين**) و، بڕوادارانيش بە پارێزكاران (**مُتَّقِيْن**)، پارێزكاران ناويان دێنێ، باباى پارێزكاريش دەبێ پێشێ خۆى لە كوفر بپارێزێ تووشى نەبێ و، پێچەوانەى كوفر هەڵبگرێ، كە ئيمانە، هەروەها خۆى لە شيرك بپارێزێ و پێچەوانەى شيرك تەبەننيى بكات، كە بريتيە لە خوا بە يەكگرتن، هەروەها خۆى لە سەرپێچيى و لادان بپارێزێ و، پێچەوانەكەى كە بريتيە لە فەرمانبەريى و چاكەكاريى، بكاتە پيشە، كەواتە: (**مُتَّقِيْن**)، ئەوانەن كە خۆيان پاراستوە لە هەموو ئەو شتانەى خوا پێى ناخۆشن، هەر لە كوفرو شيرك و گوناهو سەرپێچييەوە بگرە تاكو هەر شتێكى ديكە، كە خوا ﷻ پێى ناخۆشەو پێغەمبەرى خوا ﷺ پێى ناخۆشە، دەفەرموێ:

﴿إِنَّ ٱلْمُتَّقِينَ فِى جَنَّٰتٍ وَنَعِيمٍ﴾، بە دڵنيايى پارێزكاران لە نێو باغ و گوڵ و گوڵزارەكان و لە نێو نازو نيعمەتى بەردەوامدان، (**جَنَّات**) كۆى (**جَنَّة**)يە، واتە: باغ و بێستان و گوڵ و گوڵزار، (**نَعِيْم**) لە (**نِعْمَة**)ەوە هاتوە، (**نِعْمَة**)، واتە: (**الحَالَةُ الحَسَنَة**)، حاڵەتێكى باش، (**نَعِيْم**): لەسەر كێشى (**فَعِيْل**)، نازو نيعمەتێكى بەردەوام و زۆرە، هەم زۆر بێ، هەم بەردەواميش بێ و كۆتايى نەيەت.

www.alibapir.com



پێشیێ وەک سەردێڕ خوای بەخشەر دەفەرموێ: لە نێو باغ و گوڵ و گوڵزاردان و، لە نێو نازو نیعمەتی بەردەوامدان.

دوایی خوا ﷻ باسی تاک تاک و پێکهاتەکانی ئەو نازو نیعمەتە دەکات، وەک لە پێناسەی دەرسەکەدا گوتمان، کە سەرجەم یازدە نیعمەتن، دەفەرموێ: ﴿ فَٰكِهِينَ بِمَآ ءَاتَىٰهُمۡ رَبُّهُمۡ ﴾، ئەوەی پەروەردگاریان پێیداون، چێژی لێوەردەگرن یاخود: پێی شادمان و دڵخۆشن، واتە: لەوەدا کە پەروەردگاریان پێیداون، بە خۆشیی دەیگوزەرێنن و پێی دڵخۆشن و شادمانن، (فَاكِهِيْن)، خوێندراویشەتەوە: (فَكِهِين) و هەردووکیان بە یەک واتان.

﴿ وَوَقَىٰهُمۡ رَبُّهُمۡ عَذَابَ ٱلۡجَحِيمِ ﴾، هەروەها پەروەردگاریان لە ئازاری کڵپەی دۆزەخ پاراستوونی و چەپاڵەی داون، لە ڕاستییدا چوونە بەهەشت، چەندە گرنگە، پارێزران لە سزای دۆزەخ و لە ئازارو لە ئەشکەنجەی خوا ﷻ کە لە دۆزەخدا دایناوە، لەوە گرنگترو گەورەتریشە.

﴿ كُلُواْ وَٱشۡرَبُواْ هَنِيٓـَٔۢا ﴾، پێیان دەگوترێ: بخۆن و بخۆنەوە، (هَنِيْئَاً)، بەبێ گرفت، یانی: خواردن و خواردنەوەکە کە دەیخۆن هیچ گرفتی نیە، چ لە کاتی خواردنیدا، چ لە دوای خواردنی، بەڵام هی دنیا بە زۆریی، هەم لە کاتی خواردنیدا گرفتی هەیە، مرۆڤ لە گەرووی دەگیرێ یان پێیخۆش نیە، یان پێی نارەحەت دەبێ، هەم دوای خواردنیشی، هەر گرفتی هەیە، بە لای کەمەوە: پاشەڕۆکی هەیەو مرۆڤ پێی نارەحەت دەبێ، بەڵام خواردن و خواردنەوەی بەهەشت هەم لە کاتی خواردنیاندا، هەم لە دواییشدا بێ گرفت و بێ نارەحەتیین، تەنیا چێژ وەرگرتنی ڕووتن.

ئنجا خوا دەفەرموێ: ﴿ بِمَا كُنتُمۡ تَعۡمَلُونَ ﴾، بەهۆی ئەوەوە کە دەتانکرد، واتە: ئەوە پاداشتی کردەوە باشەکانتانە، دیارە کردەوە باشەکان و، ئیمان هێنانیشیان،

www.alibapir.com


ئەویش هەر بەخششی خوا بوون، بەڵام بۆیە وادەفەرموێ، تاکو ئەوان دڵخۆشبن کە ئەوە کردەی دەستی خۆیانەو، بەری ڕەنجی شانی خۆیان دەخۆن، بۆیەش ئەو تەعبیرە لە قورئان دا زۆر هاتوە.

﴿مُتَّكِـِٔينَ عَلَىٰ سُرُرٍ مَّصۡفُوفَةٍ﴾، پاڵیان داوەتەوەو شانیان داداوە لەسەر تەختانێکی ڕیزکراو، (سُرُر)، کۆی (سَرِیْر)ە، ئەویش ئەو تەخت و شوێنەیە کە مرۆڤ لەسەری ڕادەکشێ، یان لەسەری دادەنیشێ بەدڵخۆشییەوە، (مَصْفُوفَة)، پێکەوە ڕیزکراو، ئەو کورسیی و قەنەفە و تەختانەی بەهەشتییان لەسەریان دادەنیشن، لە بەهەشتێ دا هەندێک شوێنیان هەن، لە تەنیشت یەکن، لە شوێنی دیکەدا دەفەرموێ: ﴿مُتَقَـٰبِلِينَ﴾، ڕووبەڕووی یەکدی دادەنیشن، ئەمەش ئەوە دەردەخات کە ئەهلی بەهەشتێ لە ڕووی تێکەڵیی کۆمەڵایەتییەوە لە لووتکەدان و، جگە لە شوێنی تایبەتی خۆیان، هەندێک شوێنی گشتییشیان هەن، وێڕای ئەوە کە میوانی یەکدی دەبن و هەر کامێکیان دەچێ بۆ لای ئەوی دیکە، هەندێک جێشیان هەن، هەموویان لێیان کۆدەبنەوە، وەک چۆن ئێستا شوێنە گشتییەکان هەن، باغ و باخچەو، هەندێک شوێن هەن، خەڵک لێیان کۆدەبێتەوەو موڵکی گشتیین!

ئەوەم نەبینیوە تەفسیرەکان باسی بکەن، بەڵام وای تێدەگەم وێڕای جێگاو ڕێگاو کۆشک و شوێنی تایبەتی هەر کام لە بەهەشتییەکان، هەندێک شوێنی گشتییشیان هەبن پێکەوە لێیان دابنیشن، وێڕای ئەوەی لە کاتێکدا بە میوانیی دەچن، بۆ لای یەکدی و پێکەوە کۆدەبنەوە، چونکە بەداخەوە هەندێک کەس بە هەڵە بۆی باسی بەهەشت کراوە، وادەزانێ: بەهەشتییەکان هەر کەس لە جێگاو ڕێگاو شوێنی خۆیەتی بە تەنێ و، ئەگەر بشیانەوێ یەکدی ببینن هەردووکیان بەرەو لای یەکدی دێن و لە نێو قەدی ڕێ پێک دەگەن، دوایی هەر کەس دەچێتەوە شوێنی خۆی! ئەوە بیستوومە لە نێو خەڵکدا باوە، بەڵام ئەگەر وابێ دەبێ بەهەشت زیندانی تاکیی بێ، ئەگەر هەر کەسە لە شوێنی

www.alibapir.com


خۆی بێ و، لە نێو قەدی ڕێیە بگەنە یەکدی!! بەڵام ئەوەی خوا ﷻ باسی دەکات زۆر جیایە لەمە، ناشزانم ئەو وێناکردنە لەچییەوە هاتوە؟ ڕەنگە یەکێک لە مامۆستایان بە هەڵە لە ئایەتەکان تێگەیشتبێ، بەڵام خوا ﷻ لێرە ئاوا دەفەرموێ: ﴿وَنَزَعْنَا مَا فِي صُدُورِهِم مِّنْ غِلٍّ إِخْوَانًا عَلَىٰ سُرُرٍ مُّتَقَابِلِينَ ﴿٤٧﴾﴾ الحجر، هەرچی کینە بوو لە سینەکانیان دەرمانهێناو دامانڕنی و برایانە لەسەر تەختان ڕووبەڕووی یەکدیی دانیشتوون، لە تەفسیری سووڕەتی (**الصافات**)دا باسمان کرد لەو دانیشتنانەدا کە پێکەوە دادەنیشن، یادی دنیا دەکەنەوەو، لەوێوە یەکێکیان دەڵێ: ئاشنایەکم هەبوو دەبێ چی لێهاتبێ؟ لەوێوە لە بەهەشتەوە تەماشا دەکات و لەدۆزەخدا دەیدوێنێ و قسەی لەگەڵدا دەکات!

﴿وَزَوَّجْنَاهُم بِحُورٍ عِينٍ﴾، لەگەڵ ئافرەتانی سپی و سۆڵ و چاو گەش و گەورەدا، کردمانن بە هاوسەر جووتمان کردن، ئنجا ئایا ئەو ئافرەتانە هەر ئافرەتانی دنیایی خۆیانن، یاخود ئافرەتانی دیکەن؟ هەردووکیان ئەگەریان هەیە، بەڵام ئەوەی لە سووڕەتی (**الواقعة**)دا هاتوەو خوا پشتیوان بێ پێی دەگەین، کە خوا ﷻ زۆر بە ڕوونیی دەفەرموێ: ﴿إِنَّا أَنشَأْنَاهُنَّ إِنشَاءً ﴿٣٥﴾ فَجَعَلْنَاهُنَّ أَبْكَارًا ﴿٣٦﴾ عُرُبًا أَتْرَابًا ﴿٣٧﴾ لِّأَصْحَابِ الْيَمِينِ ﴿٣٨﴾﴾، کەواتە: وێڕای ئافرەتە دنیاییەکان ئەگەر بە ئیمانەوە پێکەوە بووبن، ئافرەتانێکی تایبەتییش خوا ﷻ بۆ پیاوانی بەهەشت دەیانخوڵقێنێ، کە لە تەفسیری سووڕەتی (**الواقعة**)دا، خوا پشتیوان بێ باسی ئەوە دەکەین.

ئنجا ئەو پرسیارو ئیشکالەش کە دەکرێ: خوا باسی پیاوان دەکات، کە ئافرەتی جوانی بۆ خوڵقاندوون، کە حۆرییەکانن، ئەدی بۆچی بۆ ئافرەتان باسی ئەوە نەکراوە؟ لە هەندێک لە کتێبەکانی خۆمدا، وەڵامی ئەو پرسیارو ئیشکالەم داوەتەوە، بۆ وێنە لە کتێبی: (ئافرەت و خێزان لە سایەی شەریعەتدا).

www.alibapir.com



﴿ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَٱتَّبَعَتۡهُمۡ ذُرِّيَّتُهُم بِإِيمَٰنٍ ﴾، ئەوانـەش کـە بڕوایـان هێنـاوەو، وەچـەو ڕۆڵەکانیشـیان بـە ئیمانـەوە شـوێنیان کەوتـوون، ﴿ أَلۡحَقۡنَا بِهِمۡ ذُرِّيَّتَهُمۡ ﴾، وەچەکانیـان بەوانـەوە پەیوەسـت دەکەیـن، واتـە: پێکیـان دەگەیەنیـن و پێکـەوە کۆیـان دەکەینـەوە، (ذُرِّيَّتَهُـم)، هـەم لە یەکـەم و، هەم لە دووەمیش دا ﴿ أَلۡحَقۡنَا بِهِمۡ ذُرِّيَّتَهُمۡ ﴾ ، هەردووکیـان خوێندراونـەوەش: (وَذُرِّيَّاتِهِـمْ)، هـەردووک خوێندنەوەکانیـان هـەن، وەچەکەیـان و وەچەکانیـان، ﴿ وَمَآ أَلَتۡنَٰهُم مِّنۡ عَمَلِهِم مِّن شَيۡءٖ ﴾، هیـچ لـە کردەوەیـان کەم ناکەینەوە، یانی: (مَا نَقَصْنَاهُمْ)، واتە: وە نەبێ خوا بسم الله الرحمن الرحيم لە کردەوەی باب و دایکـەکان کـەم بکاتـەوە، تاکـو بیانباتـەوە ئاسـتی ڕۆڵەکانیـان، بەڵکـو پلـەی ڕۆڵـەکان زیـاد دەکات و دەیانبـات بـۆ لای بـاب و دایکیـان، ﴿ كُلُّ ٱمۡرِيِٕۭ بِمَا كَسَبَ رَهِينٞ ﴾، (بـەڵام لەگـەڵ ئەوەشـدا) هـەر کەسـە بارمتـەی کـردەوەی خۆیـەتی، واتـە: بـا هیـچ کـەس بـە تەمـای ئەوەنەبـێ، کـە بـە هیـوای بـاب و دایکـی لێـی گـەڕێ، هـەر کەسـە بارمتـەی کـردەوەی خۆیـەتی، بـەڵام خـوای پـەروەردگار یەکێـک لـەو نیعمەتانـەی بـە بەهەشـتییانی دەدات، ئەوەیـە کـە لەگـەڵ خـزم و کـەس و نیزیـکانی خۆیـدا کـۆی بکاتـەوە.

﴿ وَأَمۡدَدۡنَٰهُم بِفَٰكِهَةٖ وَلَحۡمٖ مِّمَّا يَشۡتَهُونَ ﴾، بۆمـان زیـاد کـردن، زیادەیـان بـۆ دەکەیـن لـە میـوەو لـە گۆشـتێک کـە ئارەزوویانـە، پێشـێ باسـی میـوە دەکات، ئنجـا دوایـی باسـی گۆشـت دەکات، پزیشـکەکان دەڵێـن: وا باشـترە پێشـێ میـوە بخـورێ، ئنجـا گۆشـت، ئەمـە ئاماژەیەکـە هەرچەنـدە حاڵەکانـی بەهەشـت و قیامـەت جیـان، لـە هـی دنیـا، بـەڵام لـە ڕووی تەندروسـتییەوە لـە دنیـادا، واباشـە پێشـێ میـوە لـە خورێنیـی بخـورێ، دوایـی خـواردنی دیکـە بخـورێ، تاکـو ئـەو ڤیتامینانـەی لـە میوەدا هـەن، جەسـتە لێیـان بەهرەمەنـد بـێ، هەروەهـا میـوە سووکیشـە و بـە ئاسـانیی جەسـتە دەتوانـێ لێـی بەهرەمەنـد بـێ.

﴿ يَتَنَٰزَعُونَ فِيهَا كَأۡسٗا ﴾، (كَأْس)، یـانی: پەرداخێـک یـان کووپێـک کـە شـەڕابی تێدایـە، (كُوُب) بـە (أَكْوَاب)، کـۆ دەکرێتـەوەو، بریتیـە لـە پەرداخێـک کـە جـارێ شـەڕابی

www.alibapir.com


تێ نەكرابێ، بەڵام كە گوترا: (كَأْس)، كە بە (كُئُوس)، كۆ دەكرێتەوە، دیارە شەڕابی تێدایە، دەفەرموێ: لەوێدا پەرداخ و كووپی شەڕاب لە دەستی یەكدی وەردەگرن و ڕایدەكێشن (يَتَنَازَعُونَ)، یانی: (يَتَجَاذَبُونَ)، بێگومان هەر بۆ خۆشیی و بۆ سوعبەت پەرداخ لە یەكدی دەستێنن و وەردەگرن، ﴿لَّا لَغْوٌ فِيهَا وَلَا تَأْثِيمٌ﴾، بەڵام وەك شەڕابی دنیا نیە، قسەی پووچ و كردەوەی گوناهباركەری تێدابێ: نە قسەی پووچی تێدا هەیەو، نەكردەوەی گوناهباركەریش، لە كاتێك دا شەڕاب دەخۆنەوە، لە شوێنی دیكەش دەفەرموێ: ﴿وَلَا يُنزِفُونَ ﴿١٩﴾﴾الواقعة، هەروەها ﴿يُنزَفُونَ ﴿٤٧﴾﴾الصافات، هەردووكیان یانی: عەقڵیان لە دەست نادەن.

﴿وَيَطُوفُ عَلَيْهِمْ غِلْمَانٌ لَّهُمْ﴾، كوڕانێكی نەوجەوانیش بەسەریانەوە دەگەڕێن، كە هی خۆیانن (غِلْمَان)، كۆی (غُلَام)ە، كوڕێكە تازە پێگەیبێ، ئایا ئەوانە كێن؟ ئەوانەش وابێ دەچێ خوای پەروەردگار بە تایبەت بیانخوڵقێنێ، بۆ خزمەتی ئەهلی بەهەشت، وەك چۆن حۆرییان بە تایبەت دەخوڵقێنێ بۆ پیاوانی بڕوادار، ئەو مێرد منداڵانەش، ئەو نەوجەوانانەش بە تایبەت دەخوڵقێنێ بەس بۆ خزمەتكردن، ئنجا ئایا ئەوانە چۆنن؟ ﴿كَأَنَّهُمْ لُؤْلُؤٌ مَّكْنُونٌ﴾، وەك گەوهەری شێردراوەن، گەوهەر ئەگەر زۆر بەكارنەهێنرێ و بشاردرێتەوە، سپیی و سافترو بریقەدارترە.

﴿وَأَقْبَلَ بَعْضُهُمْ عَلَىٰ بَعْضٍ يَتَسَاءَلُونَ﴾، هەندێكیان ڕوویان لە هەندێكیان كرد، لە یەكدییان پرسی:

﴿قَالُوٓاْ إِنَّا كُنَّا قَبْلُ فِيٓ أَهْلِنَا مُشْفِقِينَ﴾، گوتیان: ئێمە پێشتر لە نێو كەس و كاری خۆماندا، ترس و بیممان هەبوو و بەزەییمان هەبوو تووشی نارەحەتیی بین.

﴿فَمَنَّ ٱللَّهُ عَلَيْنَا﴾، خواش چاكەی لەگەڵدا كردین، ﴿وَوَقَىٰنَا عَذَابَ ٱلسَّمُومِ﴾، لە ئازاری گڕە بای دۆزەخ پاراستینی.

﴿إِنَّا كُنَّا مِن قَبۡلُ نَدۡعُوهُ﴾، ئێمـه پێشـتر لێـی دەپاڕاینـەوە (هەمیشـه لێـی دەپاڕاینـەوە کـه چەپاڵەمـان بـدات لـه سـزای دۆزەخ) ﴿إِنَّهُۥ هُوَ ٱلۡبَرُّ ٱلرَّحِيمُ﴾ (ئەویـش وەڵامـی داینـەوە) بـه دڵنیایـی ئـەو زۆر چاکـەکاری زۆر بەبەزەییـه.

خـوا بـه لوتـف و کەرەمـی خـۆی ئێمـەش لـەو کەسانه بگێـڕێ، کـه دەیانخاتـه نێـو ئـەو نـازو نیعمەتـەی بەهەشـتەوە.



www.alibapir.com


مەسەلە گرنگەکان

### مەسەلەی یەکەم:

**باسی پارێزکاران و، شەش لە نازو نیعمەتەکانیان لە بەهەشتدا کراوە:**

**١- باشترین خانووبەرە.**

**٢- شادمان بوون بە بەخششی خوا.**

**٣- پارێزران لە ئاگری دۆزەخ.**

**٤- خواردن و خواردنەوەی بێ گرفت و بەچێژ.**

**٥- ئیسراحەت و پاڵدانەوە لەسەر تەخت و قەنەفە ڕیزکراوەکان.**

**٦- جووتکرانیان لەگەڵ قەشەنگترینی ئافرەتان دا.**

خوا دەفەرمووێ: ﴿إِنَّ ٱلْمُتَّقِينَ فِى جَنَّٰتٍ وَنَعِيمٍ ﴿١٧﴾ فَٰكِهِينَ بِمَآ ءَاتَىٰهُمْ رَبُّهُمْ وَوَقَىٰهُمْ رَبُّهُمْ عَذَابَ ٱلْجَحِيمِ ﴿١٨﴾ كُلُوا۟ وَٱشْرَبُوا۟ هَنِيٓـًٔۢا بِمَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ ﴿١٩﴾ مُتَّكِـِٔينَ عَلَىٰ سُرُرٍ مَّصْفُوفَةٍ ۖ وَزَوَّجْنَٰهُم بِحُورٍ عِينٍ ﴿٢٠﴾﴾.

## شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە حەوت بڕگەدا:

١)- ﴿إِنَّ ٱلْمُتَّقِينَ فِى جَنَّٰتٍ وَنَعِيمٍ﴾، بە دڵنیاییی پارێزکاران، لە نێو باخ و گوڵ و گوڵزارەکان و، لە نێو نازو نیعمەت دان، (مُتَّقِي)، ناوی بکەر (إِسْمِ الفَاعِل)ە، خۆپارێز، (مُتَّقِين)، خۆپارێزان، کەواتە: ئەوانە خۆیان پارێزگارییان لە خۆیان کردوە لە دنیادا، لە چی خۆیان پاراستوە؟ لە هەموو ئەو شتانەی خوا پێی ناخۆشن، لە کوفر، لە شیرک، لە گوناهو تاوان و خراپە، ئایا بە چی خۆ لە کوفر دەپارێزرێ؟ بە ئیمان.

www.alibapir.com


ئەدی بە چی خۆ لە شیرک دەپارێزرێ؟ بە خوا بە یەکگرتن (**توحيد**).

ئایا بەچی خۆ لە گوناهو سەرپێچیی و لادان و تاوان دەپارێزرێ؟ بە فەرمانبەریی و تاعەت و پابەندیی بە شەریعەتی خوای پەروەردگارەوە، ئەو جۆرە کەسانە: ﴿فِي جَنَّٰتٍ وَنَعِيمٍ﴾، (**جَنَّات**) و (**نَعِيْم**)، هەردووکیان بە نەزانراو (**نكرة**) هاتوون، ئەوەش، بۆ قەبەو مەزن پیشاندان (**لِلتَفْخِيْم وَالتَّعْظِيْم**)ە، چونکە بەپێی سیاق دەزانرێ جاری وایە شتێک کە بە نەزانراو (**نَكِرَة**) دێ، بۆ کەم بایەخییەو، جاری واش هەیە بۆ مەزنیی و گەورەییە، بەڵام ئەوە بەپێی سیاق و بە سەلیقە دەزانرێ.

خوا دوو وشان باس دەکات: ﴿فِي جَنَّٰتٍ﴾، لە نێو باغ و گوڵ و گوڵزارەکاندان، (**ونَعِيْم**)، یانی: (**النِّعْمَةُ الكَثِيْرَة**)، هەروەها (**نَعِيْم**)، بە مانای نازو نیعمەتێکی بەردەوام و نەبڕاوەو بێ کۆتایی دێ.

**٢)-** ﴿فَٰكِهِينَ بِمَآ ءَاتَىٰهُمۡ رَبُّهُمۡ﴾، چێژ وەرگروشادمانن بەوەی پەروەردگاریان پێیداون، (**فَاكِهِيْن**)، خوێندراویشەتەوە: (**فَكِهِين**)، هەردووکیان یەک واتایان هەیە، (**فَكِه وَفَاكِه**)، (**فَاكِهِيْن وَفَكِهِين**)، هەردووکیان: (**وَصْفٌ من فَكِهَ كَفَرِحَ، إِذَا طَابَتْ نَفْسُهُ وَسُرَّ**) وەسفی کەسێکە شادمان و دڵخۆش بێ، کەواتە: ﴿فَٰكِهِينَ بِمَآ ءَاتَىٰهُمۡ رَبُّهُمۡ﴾، دوو واتایان دەگەیەنێ: أ- شادمان و دڵخۆشن بەوەی خوا پێی داون. ب- چێژ وەرگرن بەهۆی ئەوەوە کە پەروەردگاریان پێیداون.

**٣)-** ﴿وَوَقَىٰهُمۡ رَبُّهُمۡ عَذَابَ ٱلۡجَحِيمِ﴾، پەروەردگاریشیان لە ئازاری کڵپەی دۆزەخ پاراستوونی، لەم دوو ئایەتەدا، وشەی (**رَبُّهُمْ**)، دووبارە بۆتەوە، پەروەردگاریان، خاوەنیان، چونکە هی یەکەمیان بۆ بەهرەمەند بوونەو، هی دووهەمیان بۆ پارێزرانە، یانی: یەکەمیان (**لِجَلْبِ النِّعْمَة**)و، هی دووەمیان (**لِدَفْعِ النِّقْمَة**)، یانی: پەروەردگارو خاوەنیانە کە نازو نیعمەتی بەسەردا ڕشتوون، هەروەها هەر ئەو خاوەن و پەروەردگارەشیانە کە پاراستوونی لە سزای کڵپەی دۆزەخ، چونکە (**جَحِيْم**)، یەکێکە

www.alibapir.com


لە ناوەکانی دۆزەخ و یەکێک لە وەسفەکانی ئاگری دۆزەخیشە، (**النَّار المُتَأَجِّجَة**)، ئاگری کڵپە سەندو بڵێسەدا، کە زۆر بەهێزە.

٤)- ﴿كُلُوا۟ وَٱشْرَبُوا۟ هَنِيٓـًٔا﴾، (پێیان دەگوترێ:) بخۆن و بخۆنەوە بێ گرفت و خۆش. ئەمە لە قورئاندا زۆر دووبارە دەبێتەوە، یانی: (**يُقَالُ لَهُمْ**)، یان (**قِيْلَ لَهُمْ**)، پێیان دەگوترێ، یان پێیان گوترا: بخۆن و بخۆنەوە (**هَنِيئًا: اسْمٌ عَلَى وزْنِ فَعِيلٍ بِمَعْنى مَفْعُولٍ، وقَعَ وصْفًا لِمَصْدَرَيْنِ لِفِعْلَيْ** ﴿كُلُوا۟ وَٱشْرَبُوا۟﴾، **أي: أَكْلاً هَنِيئًا وشُرْبًا هَنِيئًا**)، (**هَنِيئ**)، لەسەر کێشی (**فَعِيْل**)ە، بەڵام بە مانای (**مَفْعُول**)ە، بۆتە وەسف بۆ چاوگی هەردووک کرداری ﴿كُلُوا۟ وَٱشْرَبُوا۟﴾، بخۆن و بخۆنەوە، واتە: بخۆن خواردنێکی (**هَنِيء**)و، بخۆنەوە خواردنەوەیەکی (**هَنِيء**)، (**هَنِيء**)یش ئەوەیە مرۆڤ بە ئاسانیی و بە خۆشیی بیخوات، دواییش مایەی ئاسوودەیی و بەهرە وەرگرتن و چێژ وەرگرتنی بێ و، هیچ دەرهاویشتەو دەرەنجامی خراپی نەبێ، وەک خواردن و خواردنەوەی دنیا.

٥)- ﴿بِمَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ﴾، بەهۆی ئەوەوە کە پێشتر دەتانکرد (لە ژیانی دنیادا) واتە: ئەوە پاداشتی کردەوەی خۆتانە، خوا ﷻ شارەزای سرووشتی مرۆڤە، مرۆڤ پێی خۆشە بە ئەندازەی ئەوە کە ڕەنج دەدات، گەنجیش ببات، گوتراوە: ئەوەی ڕەنج بدات گەنج دەبات، گەنج یانی: خەزێنە، مرۆڤ پێی خۆشە تەقدیر بکرێ و بگوترێ: تۆ خۆت کارت کردووەو خۆت ماندوو بووی، هەر بۆیە وشەی (**مُتَّقِيْن**)، خۆ پارێزەران، یانی: خۆیان پاراستوە، بۆیە چوونە نێو نازو نیعمەتەوەو، ئەو خواردن و خواردنەوە بێ گرفت و بێ سەرەنجام خراپەیان، پاداشتی ئەوەیە کە دەیانکرد لە کردەوەی باش، کە باشترین کردەوەی باش بریتیە لە ئیمان، دوایی بەندایەتیی بۆ خوا، ئنجا کردەوەکانی دیکە، کە مرۆڤ لەزاتی خۆی ئەنجامیان دەدات، یان لەگەڵ دەوروبەریدا.

٦)- ﴿مُتَّكِـِٔينَ عَلَىٰ سُرُرٍ مَّصْفُوفَةٍ﴾، پاڵیان داوەتەوەو، شانیان داداوە لەسەر تەختانێکی ڕیز کراو، (**الإتِّكَاء**) بە مانای پاڵدانەوەو شاندادان دێ، (**سُرُر**)یش کۆی (**سَرِيْر**)ە،

www.alibapir.com



(مَا يُضْطَجَعُ عَلَيْهِ)، ئەوەیە کە مرۆڤ لەسەر ڕادەکشێ، یان شانی لەسەردا دەداو پاڵدەداتەوە، (مَصْفُوفَة): بە مانای ڕیز کراوەکان دێ، بەڵام بە مانای بەرەو ڕووەکانیش دێ، ئەو تەخت و کورسییانەی لەسەریان پاڵ دەدەنەوەو ئیسراحەت دەکەن، بەرەو ڕووی یەکدیین، وەک لە شوێنی دیکە دەفەرموێ: ﴿مُتَقَٰبِلِينَ﴾، خواردن و خواردنەوەکەشیان پێکەوە دەخۆن، چونکە بۆ ئولفەت و دڵخۆشیی و شادمانیی وا خۆشترە، ﴿يَتَنَٰزَعُونَ فِيهَا كَأۡسٗا﴾، ئنجا یەکێک لە خۆشیی و چێژەکانی خواردن و خورادنەوە ئەوەیە، کە مرۆڤ بە تەنیا نەبێ و بە کۆمەڵ و لەگەڵ خەڵکدابێ.

ئنجا خوای میهرەبان باسی نازو نیعمەتێکی دیکەی بەهەشت دەکات:

٧)- ﴿وَزَوَّجۡنَٰهُم بِحُورٍ عِينٖ﴾، هەروەها جووتمان کردوون لەگەڵ ئافرەتانی سپی و سۆڵ و ساف و، چاو گەش و گەورەو جوان دا، (**أي: قَرَنَّاهُم وَاجَعَلَنْا كُلَّ فَرْدٍ زَوْجَاً وَالبَاءُ لِلْمُصَاحَبَةِ**)، کە دەفەرموێ: (**وَزَوَّجْنَاهُمْ: أي قَرَنَّاهُم**)، واتە: جووتمانکردن و کردمانن بە هاوسەر، لەوێ کەس بە تەنێ نیە، هەر تاکێکیان بەرانبەرێکی هەیە، کە بە هەر کامێکیان دەگوترێ: (**زَوْج**)، واتە: هاوسەر، ئەگەر بە مانای مارەکردن بایە، دەیفەرموو: (**زَوَّجْنَاهُمْ حُـوراً عِيْنَاً**)، وەک لە سوورەتی (**الأحزاب**)، خوا دەفەرموێ: ﴿فَلَمَّا قَضَىٰ زَيۡدٞ مِّنۡهَا وَطَرٗا زَوَّجۡنَٰكَهَا ٣٧﴾، چونکە (**زَوَّج**) بە مانای (**نَكَحَ**) پێویستیی بە (ب) ناكات بۆ خواستنی بەرکارو دەگوترێ: (**زَوَّجنَاكَهَا**)، بەڵام (**زَوَّجَهُ بِه: قَرَنَهُ بِه**)، واتە: لەگەڵیدا جووتی کردو کردی بە هاوسەری.

ئنجـا (**حـورٍ عِـيْنٍ**)، لـە ئەصڵـدا (**حـورٍ وَعـِينٍ**)ە، بـەڵام لەبـەر ئـەوەی زۆر پێکـەوە هاتـوە (**و**)ەکـەی قرتێـنراوەو بۆتـە: (**حـورٍ عِـيْنٍ**)، ئەگەرنـا لـە ڕاسـتییدا ئەوانـە دوو وەصفـن (**حُـور**)، کـۆی (**أحْـوَر**)، بـۆ پیـاو و (**حَـوْرَاء**)، بـۆ ئافرەتـە، واتـە: زۆر سـپیی و ڕوون و سـاف، (**عِـيْن**) یـش کـۆی (**عَيْنَـاء**)ە، واتـە: چاوگـەش و گـەورە.

کەواتە: لەم چوار ئایەتەدا، شەش جۆرە نیعمەت باسکراون:

١- خانووبەرەکانیان و، نازو نیعمەتی بەردەوام.

٢- شادمانییان.

٣- پارێزرانیان لە سزا.

٤- خواردن و خواردنەوەی بێ گرفت و دەرد.

٥- پاڵدانەوە بەرانبەر بە یەکدی.

٦- جووتکرانیان لەگەڵ حۆرییاندا.

لە ئۆرە کۆمەڵایەتییەکان لەگەڵتانین
Stay in touch on social media
نحن معكم عبر مواقع التواصل الاجتماعي
ڕاگەیاندنی مەکتەبی مامۆستا عەلی باپیر
AliBapir/عەلی باپیر
archive.org/details/@alibapir
AliBapir/عەلی باپیر
کەناڵی
ڕاگەیاندنی مەکتەبی مامۆستا عەلی باپیر
AliBapir
Google Play
App Store
www.alibapir.net
کوردی - عربي - English
ڕاگەیاندنی مەکتەبی مامۆستا عەلی باپیر

www.alibapir.com



مەسەلەی دووەم:

**بڕوادارانێـک کـە وەچەکەیـان بـە ئیمانـەوە شـوێنیان کەوتـوون، خـوا پێکەوەیـان کۆدەکاتـەوە، بـێ ئـەوەی لـە پاداشـتی ئـەوان کـەم بکاتـەوە، چونکـە هـەر کەسـە بارمتـەی کـرداری خۆیـەتی:**

خـوا دەفەرمـوێ: ﴿ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَٱتَّبَعَتۡهُمۡ ذُرِّيَّتُهُم بِإِيمَٰنٍ أَلۡحَقۡنَا بِهِمۡ ذُرِّيَّتَهُمۡ وَمَآ أَلَتۡنَٰهُم مِّنۡ عَمَلِهِم مِّن شَيۡءٖۚ كُلُّ ٱمۡرِيِٕۭ بِمَا كَسَبَ رَهِينٞ ﴿٢١﴾ ﴾.

## شیکردنەوەی ئەم ئایەتە بە پێزە، لە چوار بڕگەدا:

١)- ﴿ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَٱتَّبَعَتۡهُمۡ ذُرِّيَّتُهُم بِإِيمَٰنٍ ﴾، ئەوانەی بڕوایان هێناوەو، وەچەکەشیان بەبڕواوە شوێنیان کەوتوون، خوێندراوەتەوەش: (**ذُرِّيَّاتِهِمْ**)، وەچەکەیان و وەچەکانیان واتە: ڕۆڵەکانیشیان بە ئیمانەوە شوێنیان کەوتوون لە دنیادا.

هەروەهـــا (**وَاتَّبَعَتْهُـم**)، خوێندراویشـەتەوە: (**وَأَتْبَعْنَاهُـمْ**)، وەچەکانیشـیانمان خسـتۆتە شـوێنیان، ئنجـا ئەگـەر (**أَتْبَعْنَاهُـمْ**) بـێ، ئـەو کاتـە ئەگـەر (**ذُرِّيَتَهُـم**) بـێ، دەبـێ بگوتـرێ: (**وَأَتْبَعْنَاهُـمْ ذُرِّيَتَهُـم**)، بـەڵام ئەگـەر (**وَاتَّبَعَتْهُـم**) بـێ، دەخوێندرێتـەوە: (**وَاتَّبَعَتْهُـم ذُرِّيَتُهُـم**)، بـەڵام (**ذُرِّيَّاتِهِـمْ**)، لـە هـەردوو حاڵەتانـدا هـەروەک خۆیـەتی.

کـە دەفەرمـوێ: ﴿ بِإِيمَٰنٍ ﴾، وشـەی (**إِيْمَـان**)، بـە نەزانـراو (**نَكِـرَة**) هاتـوەو دوو حاڵـەتی هـەن:

أ- دەگونجێ بۆ مەزنیی بێ، واتە: بە ئیمانێکی چاکەوە شوێنیان کەوتوون.

ب- دەشگونجێ بۆ ئەوە بێ کە هەر جۆرە ئیمانێکیان هەبێ، بەس ئیماندار بن، ئێمە وەچەکانیان کە لە دوایانەوە دێن، لەگەڵ ئەواندا کۆیان دەکەینەوە.

٢)- ﴿ أَلۡحَقۡنَا بِهِمۡ ذُرِّيَّتَهُمۡ ﴾، یان: (**أَلْحَقْنَا بِهِمْ ذُرِّيَّاتِهِمْ**)، ئێمە وەچەکەیان یان وەچەکانیان بەوان دەگەیەنین، (**الإِلْحَاقُ: بَدَلَ الإِدْخَالِ إِشَارَةَ إِلى أَوَّلاً: لَمْ يَكُونُوا مُسْتَحِقِّيْن، ثَانِيَاً: قَدْ**

www.alibapir.com


**يَكُونُ بَعْدَ إِجْرَاءِ العِقَاب**)، بۆیەخوا ﷻ لەجیاتی (**أَدْخَلْنَا**)، (**أَلْحَقْنَا**)ی بەکارهێناوە {پێمانەوە پەیوەست کردن و بە دوای ئەواندا بردمانن} ئەوە ئاماژەیە بۆ ئەوە:

**یەکەم:** هەرچەندە شایستەی ئەو پێگەو پاداشتە نەبوون، بەڵام ئێمە ئەوانیشمان بە ئەوانەوە پەیوەست کرد لە بەخششی خۆمان.

**دووەم:** ﴿أَلْحَقْنَا بِهِمْ﴾، ئاماژەیە بۆ ئەوە کە ئەگەر ئەو منداڵ و کوڕو کچانەیان، ڕۆڵەکانیان پێویست بووبێ، سزا بدرێن و شایستەی سزا بووبن، دوای سزاو پاک بوونەوە، ئنجا خوا ﷻ ئەوانیش دەباتە لای باب و دایکیان.

**٣)**- ﴿وَمَآ أَلَتْنَٰهُم مِّنْ عَمَلِهِم مِّن شَيْءٍ﴾، لە کردەوەکەیان هیچمان لێ کەم نەکردوونەوە، (**لات وألاتَ**)، هەردووکیان بە مانای کەمی کردەوە (**نَقَصَ**) دێن، (**لاتَه وَألاتَه**)، واتە: (**نَقَصَهُ**)، لێی کەمکردەوە، ﴿وَمَآ أَلَتْنَٰهُم مِّنْ عَمَلِهِم مِّن شَيْءٍ﴾، لە کردەوەکەیان هیچمان لێ کەم نەکردنەوە، واتە: خوا لە کردەوەی باب و دایکیان کەم ناکاتەوە، بیخاتە سەر هی ڕۆڵەکانیان، تاکو پێیان بگەن، یاخود: لە پلەی ئەوان دانابەزێنێ، کە بیانباتەوە خوارتر، تاکو لەگەڵ ڕۆڵەکانیان دا پێکەوە کۆببنەوە، بەڵکو خوای بەخشەر لە بەخششی خۆی بۆ ڕۆڵەکانیان زیاد دەکات، تاکو بەرزیان بکاتەوە بۆ ئاستی باب و دایکیان.

کە دەفەرموێ: (**مِنْ شَيء**)، ئەم (**مِنْ**)ە، بۆ بەشکردن (**تَبْعِيْض**)ە،واتە: هیچ شتێ لە پاداشتی کردەوەکەیان کەم ناکەینەوە.

**٤)**- ﴿كُلُّ ٱمْرِيِٕۭ بِمَا كَسَبَ رَهِينٌ﴾، هەر مرۆڤێک بارمتەی ئەوەیەکە وەدەستی هێناوە، (**الكَسْبُ: يُطْلَقُ عَلَى مَا يُحَصِّلُهُ المَرْءُ بعَمَلِهِ لِإرَادَةِ نَفْعِ نَفْسِهِ، ورَهِينٌ: فَعِيلٌ بِمَعْنى مَفْعُولٍ مِنَ الرَّهْنِ وهو الحَبْسُ**)، (**كَسْب**): ئەوەیە کە مرۆڤ بە ویستی خۆی، بۆ سوود بە خۆ گەیاندن و بۆ قازانجی خۆی وەدەستی دێنێ، (**رَهِين**)یش، لەسەر کێشی (**فَعِيْل**)ە، بەڵام بە مانای (**مَفْعُول**)ە، یانی: (**مَرْهُون**)، لە (**رَهن**)ەوە هاتوە، یانی: ڕایگرت (**حَبس**)، واتە: هەر کەسێک بارمتەی کردەوەکەی خۆیەتی، بەپێی کردەوەکەی خۆی جێگاو ڕێگاو شوێنی بۆ دیاریی دەکرێ.

www.alibapir.com


مەسەلەی سێیەم:

**زیادکردنی خوا لە میوەو گۆشت بەپێی ئارەزووی بەهەشتییان و، دەستاو دەست پێکردنی، پێکی مەی لە نێوانیاندا، بێ ئەوەی قسەو کرداری پووچ و گوناهبارکەری تێدابێ و، بەسەرەوە گەڕانی کوڕانی نەوجەوان، وەک گەوهەری شێردراوە بۆ خزمەتکردنیان:**

خوا دەفەرموێ: ﴿وَأَمْدَدْنَاهُم بِفَاكِهَةٍ وَلَحْمٍ مِّمَّا يَشْتَهُونَ ﴿٢٢﴾ يَتَنَازَعُونَ فِيهَا كَأْسًا لَّا لَغْوٌ فِيهَا وَلَا تَأْثِيمٌ ﴿٢٣﴾ وَيَطُوفُ عَلَيْهِمْ غِلْمَانٌ لَّهُمْ كَأَنَّهُمْ لُؤْلُؤٌ مَّكْنُونٌ ﴿٢٤﴾﴾.

## شیكردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە چوار بڕگەدا:

١)- ﴿وَأَمْدَدْنَاهُم بِفَاكِهَةٍ وَلَحْمٍ مِّمَّا يَشْتَهُونَ﴾، بۆمان زیادکردن لە میوەو لە گۆشت، لەوەی ئارەزووی دەکەن، (**الإِمْدَادُ: إِعْطَاءُ المَدَدِ، وَهُوَ الزِّيَادَةُ مِنْ نَوْعٍ نَافِعٍ فِيمَا زِيدَ فِيهِ**)، (**إمْداد**): بریتییە لە بەخشینی زیادە لە جۆری ئەو شتەی سوودی هەیە، وەک گوتمان: (**إمْدَاد**): زێدەییە لە شتە خۆشویستراوەکانداو، (**مَدّ**)، زێدەکردنە لە شتی ناخۆشویستراو، بۆ وێنە: لە سزادا.

پێشتریش ئاماژەمان پێدا کە خوا لێرەدا (**فَاكِهَة**)ی، پێش گۆشت، خستوە، پسپۆڕانی بواری تەندروستیی دەڵێن: وا باشە مرۆڤ سەرەتا میوە بخوات، پاشان خواردن بخوات، بە پێچەوانەی عادەتی زۆربەی خەڵکەوە، وا باشە مرۆڤ پێشێ میوە بخوات، دوایی خواردنی دیکە، بخوات: نانە، گۆشتە، هەرچی هەیە، لەبەر ئەوەی میوەکە ئاسانتر هەرس دەبێ و، جەستە لە ڤیتامین و پێکهاتەکانی بەهرە وەردەگرێ و، ئنجا کە خواردن دەخوات، مادام پێشتر میوەی خوارد بێ، بەشێک لە گەدەی پڕبۆتەوەو کەمتریش خواردنی بۆ دەخورێ.

بەڵام بەدڵنیاییی کە بۆ دنیا وایە، پێشێ میوە بخورێ باش بێ، دوایی خواردنی دیکە بخورێ، مەرج نیە لە بەهەشتیش دا وابێ، چونکە حاڵ و دۆخی

www.alibapir.com


بەهەشتێ هەمووی جیایە لە هی دنیا، چونکە لە دنیادا مرۆڤ ئەگەر زیادە بخوات، لە میوە، یان لە خواردن و خواردنەوە، پێی ناڕەحەت دەبێ، بەڵام لە بەهەشتدا وانیە، بۆیە دەفەرموێ: (هَنِيْئَـاً)، بێ گرفت.

٢)- ﴿يَتَنَٰزَعُونَ فِيهَا كَأۡسٗا لَّا لَغۡوٞ فِيهَا وَلَا تَأۡثِيمٞ﴾، پەرداخێک - پڕ لە شەڕاب - لێک وەردەگرن و لە یەکدی دەستێنن لەوێدا، هیچ جۆرە قسەیەکی پووچ و گوناهبارکەری تێدانیە. (يَتَنازَعُونَ، التَّنَازُعُ: التَّداوُلِ والتَّعَاطِي، وَأَصْلُهُ تَفَاعُلٌ مِنْ نَزْعِ الدَّلْوِ مِنَ البِئْرِ عِنْدَ الإِسْتِقاءِ)، (تَنازُع): بە مانای وێکدیدان و دەستاو دەست پێکردنە، ئەصڵەکەشی (تَفَاعُل)ە، لە دەرهێنانی دۆڵچە لە بیر، لە کاتی ئاو هەڵهێنجاندا {کە ئەویان بەشی خۆی هەڵێنجاوە، ئنجا وە ئەویدیکەشی بدات، ئەویش دۆڵچەیەک هەڵبهێنجێ} واتە: ئەو پەرداخە پڕ شەڕابە وەدەستی یەکدی دەدەن.

﴿لَّا لَغۡوٞ فِيهَا وَلَا تَأۡثِيمٞ﴾، ئەمە بە دوو شێوە خوێندراوەتەوە: (لَا لَغْـوَ فِيْهَـا وَلَا تَأْثِيْـمَاً)، هەروەها خوێندراویشەتەوە: ﴿لَّا لَغۡوٞ فِيهَا وَلَا تَأۡثِيمٞ﴾، (لَغْـو): بە مانای قسەی پووچ و کرداری پووچ دێ، (تَأْثِيم)یش، واتە: گوناهبارکردن، هەر شتێک ببێتە هۆی گوناهبارکردنی مرۆڤ، بۆیەش خوا ﷻ وا دەفەرموێ، لە بە هەشتدا گوناهی لێ نیە، لەبەر ئەوەی خەڵکی مەیخۆرەوە لە دنیادا، شەڕاب خۆران لە دنیادا، هەم قسەی ناڕێک و، هەم کردارو ڕەفتاری ناڕێکیشیان لێ دەپشکوێتەوە، واتە: وا مەزانن کە شەڕاب خواردنەوەی بە هەشت وەک هی دنیایە، نەپێی سەرخۆش دەبن و نە قسەی پووچیش دەکەن و، نە ڕەفتارو هەڵسوکەوتی ناڕێکیش لەگەڵ یەکدیدا دەکەن.

٣)- ﴿وَيَطُوفُ عَلَيۡهِمۡ غِلۡمَانٞ لَّهُمۡ﴾، نەوجەوانانێک کە هی خۆیانن، بەسەریانەوە دەگەڕێن، (الغِلْمَانُ: جَمْعُ غُلَامٍ، وحَقِيقَتُهُ مَنْ كَانَ فـي سِنٍّ يُقَارِبُ البُلُوغَ، أَوْ يَبْلُغُهُ، ويُطْلَقُ عَلَى الخَادِمِ؛ لِأَنَّهُمْ كَانُوا أَكْثَرَ مَا يَتَّخِذُونَ خَدَمَهُم مِنَ الصِّغارِ)، (غِلْمان) کۆی (غُلام)ە، (غُلام): ئەوەیە نیزیک بووبێتەوە، لە باڵغ بوون یان گەیشتبێتێی، وشەی

www.alibapir.com


(غُلام)یان، زیاتر بۆ خزمەتکار بە کارهێناوە، لەبەر ئەوەی عادەتیان وابووە، ئەگەر ویستبیان خزمەتکاران بگرن، لە گەنجی کەم تەمەن گرتوویانن {لەبەر ئەوەی ئاسانتر کاروباریان بۆ ڕادەپەڕێنرێ} ئنجا کە دەفەرموێ﴿ لَا لَغْوٌ فِيهَا ﴾ لەوێدا ڕاناوەکە بۆ مێینەیەکی مەجازیی دەچێتەوە:

أ- دەگونجێ مەبەست پێی مەی (**خَمر**) بێ، کەمێینەی مەجازیی (**مُؤنَّث المجازي**)ە، واتە: شەڕابەکەی دەیخۆنەوە، هیچ قسەی پووچ و گوناهبارکەری تێدانیە.

ب- یاخود دەگەڕێتەوە بۆ پەرداخ (**كَأساً**) ئەویش بریتیە لەو دەفرەی شەڕابی تێکرابێ، کە ئەویش لە ڕووی زمانی عەڕەبییەوە بە مێینەی مەجازیی بەکاردەهێنرێ.

ج- یاخود (**فِيهَا**)، دەچێتەوە بۆ بەهەشت، واتە: لە بەهەشتدا هیچ قسەی پووچ و گوناهبارکەری تێدانیە، دیارە وشەی (**لَغو**): یانی: قسەی پووچ (**اللَّغْوُ: سَقَطُ الكَلَامِ، والتَّأْثِيمُ: مَا يُؤْثَمُ بِهِ فَاعِلُهُ شَرْعَاً، أَوْ عادَةً مِن فِعْلٍ أَوْ قَوْلٍ**)، (**تَأْثِيم**): هەر شتێکە بکەرەکەی پێی گوناهبار بێ، قسە بێ یان کردەوە.

کە دەفەرموێ: ﴿ وَيَطُوفُ عَلَيْهِمْ ﴾، (**الطَّوَافُ: مَشْيٌ مُتَكَرِّرٌ ذِهَابَاً ورُجُوعَاً، وأَكْثَرُ مَا يَكُونُ عَلَى اسْتِدَارَةٍ**)، لە ئەصڵدا (**طواف**): بە مانای ڕۆیشتنێکە، کە چوون و هاتنەوەی تێدابێ، بەڵام بە زۆریی کە حاڵەتی بازنەیی بێ، لەوسەرەوە دەچێ و لەو سەرەوە دەگەڕێتەوە.

بۆچی دەفەرموێ: ﴿ غِلْمَانٌ لَّهُمْ ﴾؟

واتە: ئەو نەوجەوانانە هی خۆیانن، یانی: خزمەتکاری خۆیانن و بەس خزمەتیان وان دەکەن و، بەسەریانەوە دەگەڕێن و پێداویستییەکانیان جێبەجێ دەکەن.

٤)- ﴿ كَأَنَّهُمْ لُؤْلُؤٌ مَّكْنُونٌ ﴾، وەک گەوهەری شێردراوەن، واتە: گەوهەر، زۆر سپی و بریقەدارو جوانە، ئنجا ئەگەر گەوهەر بەکارهێنرابێ و زۆر هێنرابێتە گۆڕێ، لەوانەیە

ئەو بریقەیی و سپیی و سافییەی نەما بێ، بەڵام کە شێردرابێتەوەو بەس بۆ هەندێ بۆنە بهێنرێتە دەرێ و لە کاتی پێویستدا، ئەوە دیارە بریقەیی و سافییەکەی خۆی دەپارێزێ، (**واللُّؤْلُؤُ: الدُّرُّ، واللُّؤْلُؤُ: يَتَكَوَّنُ فـي الأَصْدَافِ مِنْ رَوَاسِبَ، أو جَوامِدَ صَلْبَة، لَمَّاعَة مُسْتَدِيْرَة فـي بَعْض الحَيْوَانَات المائِية الدُّنْيَا مِنَ الرَّخْوِيَات**)[1]، واتە: (**لُؤْلُؤ**) یانی: (**دُرّ**)، بە کوردیی دەڵێین: گەوهەر، لە نێو قۆزاخان، صەدەفان دا دروست دەبێ، لە هەندێک ماددەی نیشتوو، یان ماددەی وشکی ڕەق کە بریقەدارو، مەیلەو خڕە، لە نێو هەندێک لە ژیاندارانی ئاویی پلە خواردا، لەوانەی پێیان دەگوترێ: نەرمەکان (**رَخْوِيَات**) {کە جەستەیان نەرمە و لە نێو ئەو ژیاندارانەی نێو قۆزاخان دا، ئەو گەوهەرو مرواریيە پێک دێ}.




(١) المعجم الوسيط: ص٨١٠.

www.alibapir.com


مەسەلەی چوارەم و کۆتایی:

**یەکدیی دواندنی بەهەشتییان بە ڕوو، لە یەکدی کردنەوەو، یادکردنی چاکەی خوا بەسەریانەوە لە دنیادا، کە بەرانبەر بە خواو قیامەت، بیمداربوون، ترس و سامیان لە دڵدابوو، نەک بێباک بن، خواش بە چاکەی خۆی لە ئازاری گڕەبای دۆزەخ پاراستوونی و، ئەوان لە دنیادا بەردەوام لە خوا پاڕاونەوەو، ئەویش بێگومان پاڕانەوەکەی وەرگرتوون، چونکە خوا هەرە چاکەکاری ئەوپەڕی بە بەزەییە:**

خوا دەفەرموێ: ﴿ وَأَقْبَلَ بَعْضُهُمْ عَلَىٰ بَعْضٍ يَتَسَاءَلُونَ ﴿٢٥﴾ قَالُوا إِنَّا كُنَّا قَبْلُ فِي أَهْلِنَا مُشْفِقِينَ ﴿٢٦﴾ فَمَنَّ اللَّهُ عَلَيْنَا وَوَقَانَا عَذَابَ السَّمُومِ ﴿٢٧﴾ إِنَّا كُنَّا مِن قَبْلُ نَدْعُوهُ إِنَّهُ هُوَ الْبَرُّ الرَّحِيمُ ﴿٢٨﴾ ﴾.

## شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە شەش بڕگەدا:

١)- ﴿ وَأَقْبَلَ بَعْضُهُمْ عَلَىٰ بَعْضٍ يَتَسَاءَلُونَ ﴾، بە هەشتییەکان هەندێکیان ڕوویان لە هەندێکیان کردو پرسیاریان کرد، واتە: لە نێو خۆیاندا، قسەو باسیان دەکرد، وەک لە تەفسیری سوورەتی (**الصافات**)دا، کورتە باسێکمان لەوبارەوە کرد، کە بەهەشتییەکان چۆن پێکەوە دادەنیشن: ﴿ فَأَقْبَلَ بَعْضُهُمْ عَلَىٰ بَعْضٍ يَتَسَاءَلُونَ ﴿٥٠﴾ قَالَ قَائِلٌ مِّنْهُمْ إِنِّي كَانَ لِي قَرِينٌ ﴿٥١﴾ يَقُولُ أَإِنَّكَ لَمِنَ الْمُصَدِّقِينَ ﴿٥٢﴾ أَإِذَا مِتْنَا وَكُنَّا تُرَابًا وَعِظَامًا أَإِنَّا لَمَدِينُونَ ﴿٥٣﴾ قَالَ هَلْ أَنتُم مُّطَّلِعُونَ ﴿٥٤﴾ فَاطَّلَعَ فَرَآهُ فِي سَوَاءِ الْجَحِيمِ ﴿٥٥﴾ قَالَ تَاللَّهِ إِن كِدتَّ لَتُرْدِينِ ﴿٥٦﴾ وَلَوْلَا نِعْمَةُ رَبِّي لَكُنتُ مِنَ الْمُحْضَرِينَ ﴿٥٧﴾ ﴾.

لە ڕاستییدا یەکێک لە نیعمەتە زۆر بەرچاوەکانی بەهەشت، کە خوا بسم الله الرحمن الرحيم لە قورئاندا، زۆر باسی کردوە، بریتیە لەو پێکەوە کۆبوونەوەو، هۆگربوونی یەکدیی و یادکردنەوەی ژیانی دنیا، بە تایبەتی ئەوەی سوورەتی (**الصافات**)، هەر زۆر ڕوون و

www.alibapir.com


ڕاشکاوە، کە تەنانەت یادی ئاشناو ناسیاوەکانیشیان دەکەنەوە، کە لە بەهەشتێش نین، بەڵکو لە دۆزەخدان و، لەوێوە دەشیاندوێنن، لەوێ باسمانکردوە کە بەرەو پێشچوونی تەکنۆلۆژیا، ئێستا تێگەیشتنی ئەو ئایەتانەی بۆ ئێمە ئاسانتر کردوە، وەک لە ڕابردوودا، ئێستا لە ڕێی ئینتەرنێتەوە کەسێک لێرە دانیشتوە، لە ماڵی خۆی پاڵیداوەتەوە، دۆستێک، یان خزمێکی لە ئەمریکا دەدوێنێ، لە ئوستوڕاڵیا دەدوێنێ، بەڵکو ئەگەر لەسەر مانگ بێ دەتوانێ بیدوێنێ، بێگومان بەهەشت عالەمێک دەبێ و، دۆزەخ عالەمێکی دیکەو، یەکجار زۆر لێک دوور دەبن، ئەدی چۆن لەوێڕا یەکدی دەدوێنن؟ ئنجا ئەگەر مرۆڤ بتوانێ لە ڕێی ئینتەرنێتەوەو بەهۆی ئامێرێکەوە یەکدی بدوێنن، بە دەنگ و بە وێنەوە، بەدڵنیایی خوای پەروەردگار، بەس خۆی دەزانێ چی بۆ ئەهلی بەهەشت دەڕەخسێنێ و، چۆن هەم یەکدی بەسەر دەکەنەوە لە بەهەشتدا، هەم ناسیاوەکانیشیان کە کاتی خۆی لە دنیادا پێکەوە بوون، بزانن داخۆ چۆنن و چییان لێهاتوەو سەرەنجامیان چی بووە؟ لێرەش دەفەرموێ: ﴿ وَأَقْبَلَ بَعْضُهُمْ عَلَىٰ بَعْضٍ يَتَسَاءَلُونَ ﴿٢٥﴾ ﴾، هەندێکیان ڕوویان لە هەندێکیان کرد، پێکەوە قسەیان دەکرد، پرسیاریان لە یەکدی دەکرد.

٢)- ﴿ قَالُوا إِنَّا كُنَّا قَبْلُ فِي أَهْلِنَا مُشْفِقِينَ ﴾، گوتیان: ئێمە پێشتر، (لە دنیادا) لە نێو کەس و کاری خۆمان و ماڵ و خێزانماندا ترس و بیممان هەبوو، **(الإِشْفَاقُ: تَوَقُّعُ المَكْرُوهِ، وَهُوَ ضِدُّ الرَّجَاءِ)**، **(إِشْفَاق)**: بریتیە لە چاوەڕێکردنی شتی خراپ و پێچەوانەی ئومێد **(رَجَاءِ)**ە، کە بە مانای ئومێدەواربوونە بە شتی باش، **(إِشْفاق)**: بریتیە لە ترس و بیم هەبوون، لە شتی خراپ، دەڵێن: ئێمە پێشتر لە نێو کەس و کارو ماڵ و خێزانماندا، خاوەنی ترس و بیم بووین، لەوە کە تووشی سزای خوا ببین.

٣)- ﴿ فَمَنَّ اللَّهُ عَلَيْنَا ﴾، ئنجا خوا ﷻ چاکەی لەگەڵدا کردین، یانی: **(أَنْعَمَ عَلَيْنَا بِالإِيمَانِ أَو أَنْعَمَ عَلَيْنَا بِالْعَفْوِ)**، خوا چاکەی لەگەڵدا کردین، کە ئیمانی بە قسمەت کردین، یان چاکەی لەگەڵدا کردین کە چاوپۆشیی لێکردین، هەڵبەتە خواش چاوپۆشیی بەس لە بڕواداران دەکات.

www.alibapir.com



کەواتە: ئەو دووانە هەردووکیان یەکن: چاکەی لەگەڵدا کردین، کە ئیمانی پێ بەخشین و، یارمەتیی داین ئیمان بێنین، چاکەشی لەگەڵدا کردین، بەوە کە چاوپۆشیی لە کەم و کورییەکانمان کرد، هەموو کەس پێویستیی بە چاوپۆشیی و لێبوردنی خوا ﷻ هەیە، تەنانەت پێغەمبەرانیش (عَلَيْهِمُ الصَّلَاةُ وَالسَّلَامُ).

٤)- ﴿ وَوَقَىٰنَا عَذَابَ ٱلسَّمُومِ ﴾، ئێمەی چەپاڵەداو پاراست لە ئازاری گڕەبا، (السَّمُوم: الرِّيحِ الَّتِي تَهُبُّ مِن جِهَةٍ حارَّةٍ جِدًّا، فَتَكُونُ جافَّةً شَدِيدَة الحَرارَةِ)، ئەوەی ئێمە دەیزانین (سَمُوم): ئەو بایەیە کە لە شوێنێکی زۆر گەرمەوە هەڵدەکات، کە زۆر وشک دەبێ و زۆریش گەرم دەبێ.

لەو بیابانانە، کاتی خۆی کە سەفەر دەکراو ئێستاش - بەڵام ئێستا سەیارەکان سارد کەرەوەیان تێدایەو هەوای فێنک دەدەن - ئەگەرنا کاتی خۆی کە سەفەر دەکرا، کە پەنجەرەی پاسەکەت دەکردەوە وەک گڕەبای تەندوور لێت دەدا، ئاوا بۆت دەهاتە ژوورێ، ئنجا ئەوە بای سەموومی پێدەڵێن، واتە: ئەو بایە دەچێتە نێو کونەکانی پێستەوە، یاخود ئەو بایەی وەک چۆن ژەهر کاریگەریی لەسەر مرۆڤدا دادەنێ، ئاوا کاریگەریی خراپ لەسەر جەستەی مرۆڤ دادەنێ.

زانایان دەڵێن: خوا ﷻ بۆ تێگەیشتنی ئێمە وشەی (سَمُوم)ی، بەکارهێناوە، واتە: گڕەبا، گڕی ئاگری دۆزەخ ئەو وشەیەی بۆ بەکارهێناوە، لەبەر ئەوە ئێمە لەوە حاڵیی دەبین و تێدەگەین، ئەگەرنا ئەو گڕە بایەی لە دۆزەخدا هەیە، زۆر جیایە لەو گڕە بایەی لە دنیادا هەیە، هەرچەندە زۆر زۆر گەرم بێ، جیاوازییەکەیان زۆر زۆرە.

٥)- ﴿ إِنَّا كُنَّا مِن قَبْلُ نَدْعُوهُ ﴾، ئێمە پێشتر لێی دەپاڕاینەوە، واتە: دەپاڕاینەوە بۆ خۆمان کە چەپاڵەمان بدات و، بۆ ماڵ و منداڵمان کە بیانپارێزێ.

٦)- ﴿ إِنَّهُۥ هُوَ ٱلْبَرُّ ٱلرَّحِيمُ ﴾ {نەیفەرموە: ئەویش وەڵامی داینەوە، بەڵکو دەفەرموێ:} بە دڵنیایی ئەو زۆر چاکەکاری بە بەزەییە، ئنجا کە زۆر چاکەکاری بە بەزەیی بێ و، تۆش داوای لێ بکەی، مسۆگەر وەڵامت دەداتەوە.

www.alibapir.com


(بَـرّ)، کەسـێکە چاکـەی زۆر فـراوان بـێ، (رَحِيْم)یـش، واتـە: زۆر بـە بەزەیـی و میهرەبـان، ئنجـا زاتێـک خـاوەنی ئەوپـەڕی چاکەکاریـی بـێ و، خـاوەنی ئەوپـەڕی بەزەیـی بـێ، تـۆش لێـی بپاڕێـەوەو داوای لێبکـەی، بەدڵنیایـی بەدەنگتـەوە دێ و وەڵامـت دەداتـەوە.

کەواتـە: پاڕانـەوەی بـاب و دایـکان بـۆ ڕۆڵـەکان، گیرایـە، هـەروەک پاڕانـەوەی ڕۆڵـەش بـۆ بـاب و دایـکان، دیسـان وەردەگیـرێ، ئـەوە کـە پاڕانـەوەی بـاب و دایـکان بـۆ ڕۆڵەکانیـان وەردەگیـرێ، ئـەم ئایەتـە ئامـاژەی پـێ دەکات و، ئـەوەش کـە پاڕانـەوەو چاکـەی ڕۆڵەکانیـش بـۆ بـاب و دایـکان سـوودی هەیـە، ئـەو فەرمایشـتەی پێغەمبـەر ﷺ دەیگەیەنـێ کـە دەفەرموێ:

{**إِذَا مَـاتَ الْإِنْسَـانُ انْقَطَـعَ عَنْـهُ عَمَلُـهُ إِلاَّ مِـنْ ثَـلاَثٍ: صَدَقَـةٍ جَارِيَـةٍ، أَوْ عِلْـمٍ يُنْتَفَـعُ بِـهِ، أَوْ وَلَـدٍ صَالِـحٍ يَدْعُـو لَـهُ**} (**أخرجـه مسـلم: ١٦٣٢**)، ئەگـەر مـرۆڤ مـرد، کـردەوەکانی هەموویـان دەپچڕێـن، جگـە لـە سـێ شـتان: خێرێکـی بـەردەوام، یـان زانیارییەکـی بـە سـوود (کـە بەهـرەی لـێ وەربگیـرێ)، یاخـود منداڵێکـی چـاک (هـەم کـوڕ دەگرێتـەوە، هـەم کـچ)، کـە بـۆ بـاب و دایکیـان بپاڕێنـەوە.

هەڵبەتـە پێغەمبـەر ﷺ لێرەدا نموونـەی هێناوەتەوە بەو سـێ شـتە، ئەگەرنا شـتی دیکـەش هەیـە کـە مـرۆڤ لـە دوای مەرگـی لێیـان بەهرەمەنـد بـێ، بـەڵام ئـەو سـێ نموونـەی هێناونـەوە کـە یەکێکیـان بریتیـە لـە پاڕانـەوەی منـداڵ بـۆ بـاب و دایکـی.

کۆتایـی ئەم دەرسەشـمان بـەم فەرمایشـتەی پێغەمبەر ﷺ دێنین، کـە هەرچەندە لـە ڕووی سـەنەدەکەیەوە، هەنـدێ مشـتومڕ هەیـە، بـەڵام مەگـەر چـۆن ئەگەرنـا هەمـوو تەفسـیرەکان هێناویانـەو بـە چەنـد ڕیوایەتێکیـش هاتـوە، مـن یەکێـک لـە ڕیوایەتـەکان دێنـم، کـە پێـم وایـە لـە هەموویـان گونجاوتـرە دەفەرمـوێ:

{**إِذَا دَخَـلَ أَهْـلُ الْجَنَّـةِ الْجَنَّـةَ، سَـأَلَ أَحَدُهُـمْ عَـنْ أَبَوَيْـهِ وَعَـنْ زَوْجَتِـهِ وَوَلَـدِهِ؟ فَيُقَـالُ لَهُـمْ: إِنَّهُـمْ لَـمْ يُدْرِكُـوا مَـا أَدْرَكْـتَ، فَيَقُـولُ: يَـا رَبِّ إِنِّي عَمِلْـتُ لِي وَلَهُـمْ، فَيُؤْمَـرُ بِإِلْحَاقِهِـمْ**

www.alibapir.com


**بِـهِ}، (أخرجـه الطـبراني في الكبـير: ١٢٢٤٨، وفي الصغـير: ٦٤٠، قـال الهيثمـي ج٧، ص١١٤: فيـه محمـد بـن عبـد الرحمـن بن غـزوان، وهـو ضعيـف، وأخرجـه أيضـاً: الديلمـي: ١١٥٣).**

واتـە: کاتێـک خەڵکـی بـە هەشـت دەچنـە بەهەشـت، یەکێکیـان دەپرسـێ لـە بـارەی بـاب و دایکـی و هاوسـەری و ڕۆڵـەکانی، پێیـان دەگوتـرێ: ئـەو (پلـەی)ەی تـۆ پێـی گەیشـتووی ئـەوان بـەوە نەگەیشـتوون {واتـە: ئەوانیـش هـەر لـە بەهەشـتن، بـەڵام لـە خوارێـن} دەڵـێ: پـەروەردگارم! مـن بـۆ خۆشـم و بـۆ ئەوانیشـم کـردەوەی بـاش کـردوە، ئیـدی فەرمـان دەکـرێ کـە ئەوانیـش بـەو بگەیەنـن.

وەک گوتـم سـەنەدەکەی بـێ هێـزە، بـەڵام ئێمـە هێنامـان لەبـەر ئـەوەی زانایـان دەڵێـن: ئـەو دەقانـەی لـە ڕووی سـەنەدەوە بێهێزیـش بـن، مـادام بـۆ وەرگرتنـی حوکمێکـی شـەرعیی نەبـێ، دەگونجـێ سـوودیان لـێ ببینـرێ، وەک گوتـم: زۆربـەی تەفسـیرەکانیش ئـەو دەقـە، یاخـود شـێوەی ئـەو دەقەیـان هێنـاوە.

لێـرەدا دێینـە کۆتایـی ئـەم دەرسـەمان و، لـە خـوای پـەروەردگار دەپاڕێینـەوە: خوایـە! بـە لوتـف و کەرەمـی خـۆت، ئێمـە لـەو کەسـانە بگێـڕی، کـە هـەم لـە دنیـادا، چاکەیـان لەگەڵـدا دەکـەی، بەهـۆی ئـەوەوە کـە ئیمانیـان پـێ دەبەخشـی و، بـە هـۆی ئـەوەوە کـە بەپێـی داخـوازی ئیمانەکەیـان کـردەوەی بـاش دەکـەن، هەروەهـا لـەو کەسانەشـمان بگێـڕی کـە لـە دنیـاو دواڕۆژدا دڵخـۆش و شـادمان بیـن، بـە چاکەو خێـری وەچـەو ڕۆڵـەو خـزم و کـەس و دۆسـت و نیزیکانمـان.

سُبحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ، أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إلاَّ أَنْتَ، أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ.

## پێناسەی ئەم دەرسە

ئەم دەرسەمان ئایەتەکانی: (٢٩ - ٤٩)، یانی: بیست و یەک (٢١) ئایەتی کۆتایی سوورەتی (**الطور**) دەگرێتە خۆی، تەوەری بنەڕەتیی ئەم بیست و یەک ئایەتەش باسی پێغەمبەرایەتیی موحەممەد ﷺ و، بەرپەرچدانەوەی تۆمەتەکانی ناحەزانیەتی بە پلەی یەکەم، هەروەها باسی نالۆژیکیی بێبڕوایی و، پێچەوانەی عەقڵ و زگماکبوونی و، پووچەڵیی ژمارەیەک لە بیرۆکەکانی هاوبەش بۆ خوادانەران و بێبڕوایانە، تێکڕای تۆمەتەکانی بۆ پێغەمبەری خوایان ﷺ کردوون، چوارن:

١- گوایە کاهینە (فاڵچیی).

٢- گوایە شێتە.

٣- گوایە شاعیرە.

٤- گوایە خۆی قورئانی هەڵبەستوە.

هەروەها سەرجەم بیرۆکە ئەفسانەییە پووچەڵ و نالۆژیکییەکانیشیان، ئەم یازدەیەن:

١- بەبێ بەدیهێنەر دروست بوون و، کەس وەدی نەهێناون!

٢- خۆیان بەدیهێنەری خۆیانن!

٣- ئاسمانەکان و زەوییان هێناونە دی!

٤- عەمبارەکانی خوایان لەبەر دەست دان، خەزێنەکانی خوا!

٥- باڵادەستن بەسەر گەردووندا!

٦- پەیژەیەکیان هەیە، لێیەوە دەچنە ئاسمان و، گوێ دەگرن و هەواڵی پەنهان دێنن!

٧- خوا ﷻ کچی هەن و، ئەوان کوڕانیان هەن!

www.alibapir.com


٨- کرێیان لێ داوا دەکرێ، بۆیە بارگران کراون و، ئامادەنین مل بۆ پەیامی خوا بدەن، لەبەر ئەو کرێیە قورسەی لێیان داوا دەکرێ!

٩- پەنهان دەزانن و، لە لای خۆیان نووسیویانە!

١٠- دەیانەوێ فێڵ و پیلان بگێڕن، (ئەمەیان بە ڕاستیی وابووە).

١١- جگە لە خوا پەرستراوێکی دیکەیان هەیە!

خواش سەرجەم ئەو یازدە تۆمەتە، یان ئەو یازدە بیرۆکە پووچە، بەس باس دەکات و دەیانخاتەڕوو، بە پێچەوانەی چوار تۆمەتەکەوە کە بۆ پێغەمبەر کراون، بەرپەرچیان دەداتەوە.

لە کۆتاییشدا خوا عینادیی و نەسەلماندنی بێبڕوایان دەخاتە ڕوو، کە ئەگەر پارچەیەک لە ئاسمانیشیان بەسەردا بکەوێ، دەڵێن: ئەوە هەورێکی کەڵەکە بوویە! واتە: دانی پێدا ناهێنن، هەرچەندە دەشزانن، بۆیە خوا فەرمان بە پێغەمبەرەکەی موحەممەد دەکات، کە وازیان لێ بێنێ، واتە: وازیان لی بێنێ و گوێ بە ئازارەکانیان بدات، یاخود واز لە زۆر دواندن و شەڕە قسە لەگەڵ کردنیان بێنێ، نەک واز لە وریا کردنەوەو ئاگادارکردنەوەیان بێنێ، وازیان لێ بێنێ تاکو ڕۆژی خۆیان دەبینن، تووشی سزای خۆیان دەبن، کە بەر لەوەش ئازارو سزای دیکەیان هەر هەیە، بەڵام زۆربەیان نازانن!

سەرەنجامیش فەرمان بە پێغەمبەر کراوە، کە خۆڕاگر بێ و، بشزانێ خوا ئاگادارو چاودێریەتی و، بەردەوام بێ لەسەر بە پاکگرتن و ستاییشکردنی خواو، پەرستنی بە ڕۆژو شەوو لە بەرەبەیانیشدا.

www.alibapir.com



﴿ فَذَكِّرْ فَمَآ أَنتَ بِنِعْمَتِ رَبِّكَ بِكَاهِنٍ وَلَا مَجْنُونٍ ﴿٢٩﴾ أَمْ يَقُولُونَ شَاعِرٌ نَّتَرَبَّصُ بِهِۦ رَيْبَ ٱلْمَنُونِ ﴿٣٠﴾ قُلْ تَرَبَّصُوا۟ فَإِنِّى مَعَكُم مِّنَ ٱلْمُتَرَبِّصِينَ ﴿٣١﴾ أَمْ تَأْمُرُهُمْ أَحْلَٰمُهُم بِهَٰذَآ ۚ أَمْ هُمْ قَوْمٌ طَاغُونَ ﴿٣٢﴾ أَمْ يَقُولُونَ تَقَوَّلَهُۥ ۚ بَل لَّا يُؤْمِنُونَ ﴿٣٣﴾ فَلْيَأْتُوا۟ بِحَدِيثٍ مِّثْلِهِۦٓ إِن كَانُوا۟ صَٰدِقِينَ ﴿٣٤﴾ أَمْ خُلِقُوا۟ مِنْ غَيْرِ شَىْءٍ أَمْ هُمُ ٱلْخَٰلِقُونَ ﴿٣٥﴾ أَمْ خَلَقُوا۟ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ ۚ بَل لَّا يُوقِنُونَ ﴿٣٦﴾ أَمْ عِندَهُمْ خَزَآئِنُ رَبِّكَ أَمْ هُمُ ٱلْمُصَيْطِرُونَ ﴿٣٧﴾ أَمْ لَهُمْ سُلَّمٌ يَسْتَمِعُونَ فِيهِ ۖ فَلْيَأْتِ مُسْتَمِعُهُم بِسُلْطَٰنٍ مُّبِينٍ ﴿٣٨﴾ أَمْ لَهُ ٱلْبَنَٰتُ وَلَكُمُ ٱلْبَنُونَ ﴿٣٩﴾ أَمْ تَسْـَٔلُهُمْ أَجْرًا فَهُم مِّن مَّغْرَمٍ مُّثْقَلُونَ ﴿٤٠﴾ أَمْ عِندَهُمُ ٱلْغَيْبُ فَهُمْ يَكْتُبُونَ ﴿٤١﴾ أَمْ يُرِيدُونَ كَيْدًا ۖ فَٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ هُمُ ٱلْمَكِيدُونَ ﴿٤٢﴾ أَمْ لَهُمْ إِلَٰهٌ غَيْرُ ٱللَّهِ ۚ سُبْحَٰنَ ٱللَّهِ عَمَّا يُشْرِكُونَ ﴿٤٣﴾ وَإِن يَرَوْا۟ كِسْفًا مِّنَ ٱلسَّمَآءِ سَاقِطًا يَقُولُوا۟ سَحَابٌ مَّرْكُومٌ ﴿٤٤﴾ فَذَرْهُمْ حَتَّىٰ يُلَٰقُوا۟ يَوْمَهُمُ ٱلَّذِى فِيهِ يُصْعَقُونَ ﴿٤٥﴾ يَوْمَ لَا يُغْنِى عَنْهُمْ كَيْدُهُمْ شَيْـًٔا وَلَا هُمْ يُنصَرُونَ ﴿٤٦﴾ وَإِنَّ لِلَّذِينَ ظَلَمُوا۟ عَذَابًا دُونَ ذَٰلِكَ وَلَٰكِنَّ أَكْثَرَهُمْ لَا يَعْلَمُونَ ﴿٤٧﴾ وَٱصْبِرْ لِحُكْمِ رَبِّكَ فَإِنَّكَ بِأَعْيُنِنَا ۖ وَسَبِّحْ بِحَمْدِ رَبِّكَ حِينَ تَقُومُ ﴿٤٨﴾ وَمِنَ ٱلَّيْلِ فَسَبِّحْهُ وَإِدْبَٰرَ ٱلنُّجُومِ ﴿٤٩﴾ ﴾

## مانای دەقا و دەقی ئایەتەکان

{ئنجا (ئەی موحەممەد! کە حاڵ بەو جۆرەیە ڕاستییەکان) بیر (خەڵکی) بخەوە، بێگومان تۆ بەهۆی چاکەی پەروەردگارتەوە (کە کردوویی بە پێغەمبەر) نەفاڵچیی و نە شێتیشی (وەک ناحەزانت دەڵێن) ﴿٢٩﴾ بەڵکو ئایا دەڵێن: (موحەممەد!) شاعیرێکە (وەک شاعیرانی دیکە)، چاوەڕێی ڕووداوی ڕۆژگاری بۆ دەکەین! ﴿٣٠﴾ بڵێ: چاوەڕێ بن! بێگومان منیش لەگەڵتان لە چاوەڕوانانم ﴿٣١﴾ ئایا عەقڵ و هۆشەکانیان فەرمانیان بەو (جۆرە قسان)ە، پێدەکەن؟ بەڵکو ئەوان کۆمەڵێکی یاخیین ﴿٣٢﴾ یان ئایا دەڵێن: خۆی (قورئانی داناوەو بە ناوی خواوە) هەڵیبەستوە؟ بەڵکو بڕواناهێنن (ئەگەرنا خۆشیان دەزانن، ڕاست ناکەن) ﴿٣٣﴾

www.alibapir.com


دەجا ئەگەر لە ڕاستانن، با قسەیەکی وێنەی وی بێنن ﴿٣٤﴾ بەڵکو ئایا بەبێ شتێک دروستکراون، یان خۆیان بەدیهێنەری خۆیانن؟ ﴿٣٥﴾ یان ئایا ئاسمانەکان و زەوییان دروستکردوون؟ بەڵکو دڵنیانین (لە خواناسییاندا) ﴿٣٦﴾ یان ئایا عەمبارەکانی پەروەردگارتیان لەلان، یان ئەوان باڵادەستن (بەسەر هەموو شتێکدا)؟ ﴿٣٧﴾ یان ئایا پەیژەیەکیان هەیە (بەهۆیەوە دەچنە ئاسمانێ و) لێیەوە گوێ هەڵدەخەن (بۆ هەواڵی ئاسمانێ)؟ دەجا با گوێ هەڵخەرەکەیان بەڵگەیەکی ڕوون بێنێ ﴿٣٨﴾ یان ئایا ئەو (خوا) کچی هەن و کوڕانیش بۆ ئێوەن؟ ﴿٣٩﴾ یان ئایا کرێیەک (ی زۆر)یان لێ داوا دەکەی، (لە) بەرانبەر گەیاندنی پەیامی خوادا، ئنجا ئەوانیش بە هۆی باجدانەوە بارگرانن (و بۆیان نادرێ)؟ ﴿٤٠﴾ یان ئایا (زانیاریی) پەنهانیان لە لایەو، ئەوان (بۆ خەڵکی) دەنووسن (و هەواڵیان پێدەدەن)؟ ﴿٤١﴾ یان ئایا دەیانەوێ فێڵ و پیلان ساز بکەن (لە دژی تۆ)؟ بێگومان ئەوانەی بێبڕوان گرفتاری نەخشە (ی خوا) دەبن ﴿٤٢﴾ یان ئایا جگە لە خوا پەرستراوێکی دیکەیان هەیە؟ پاکیی بۆ خوا لەوەی دەیکەنە هاوبەشی ﴿٤٣﴾ (ئەوانە هێندە کەللەڕەق و نەسەلمێنن)، ئەگەر پارچەیەکی کەوتووە خواریش لە ئاسمانەوە ببینن، دەڵێن: (ئەوە) هەوری کەڵەکە بوویە! ﴿٤٤﴾ دەجا وازیان لێ بێنە، تاکو تووشی ئەو ڕۆژەیان دەبن، کە تێیدا بێهۆش دەبن ﴿٤٥﴾ ئەو ڕۆژە کە نەفێڵەکەیان هیچ دادیان دەدات و، نەسەریش دەخرێن ﴿٤٦﴾ بە دڵنیاییش بەر لەوە، بۆ ئەوانەی ستەمیان کردوە (بە هۆی بێبڕواییەوە)، (سزاو) ئازاری دیکە هەیە، بەڵام زۆربەیان نازانن ﴿٤٧﴾ خۆڕاگریش بە (بۆ بەجێ هێنانی) بڕیاری پەروەردگارت، چونکە مسۆگەر زۆر باش چاودێرییت دەکەین (و دەتپارێزین) و، لە کاتی (لە خەو) هەڵسانیشتدا بەستاییشکردنەوە پەروەردگارت بە پاک بگرە ﴿٤٨﴾ هەروەها لە شەوێش دا بە پاکی بگرە (و ستاییشی بکە)و، دوای (ئاوابوون و پەنهان بوونی) ئەستێرانیش (لە کاتی بەرەبەیان دا) ﴿٤٩﴾}.

www.alibapir.com


## شیکردنەوەی هەندێک لە وشەکان

(بِكَاهِنٍ): (**الْكَاهِنُ: الَّذِي يُخْبِرُ بِالأَخْبَارِ الْمَاضِيَةِ الخَفِيَّةِ بِضَرْبٍ مِنَ الظَّنِّ، وَالعَرَّافُ: الَّذِي يُخْبِرُ بِالأَخْبَارِ الْمُسْتَقْبَلَةِ**)، (**كَاهِن**): ئەو کەسەیە هەواڵە ڕابردووەکان، کە پەنهانن بە شێوەیەک لە گومان، بە خەڵک دەدات، بەڵام (**عَرَّاف**): بە کەسێک دەگوترێ: کە هەواڵە داهاتووەکان -بە حیسابی خۆی- بە خەڵک ڕادەگەیەنێ، بێگومان هەردووکیشیان درۆ دەکەن.

(رَيْبَ الْمَنُونِ): (**رَيْبَ الْمَنُونِ: حَوَادِثُ الدَّهْرِ**)، ڕووداوەکانی ڕۆژگار، یاخود (**رَيْب**) بە مانای ڕووداوە، (**الْمَنُون**): بە مانای مردنە، (**مَنُون**): بە مانای ڕۆژگاریش دێ و بە مانای مردنیش دێ، یان ڕووداوی ڕۆژگار، یاخود مەبەست پێی کارەساتی مەرگ و مردنە.

(أَحْلَامُهُم): (**أَحْلَامٌ جَمْعُ حِلْمٍ، وَهُوَ ضَبْطُ النَّفْسِ وَالطَّبْعِ عَنْ هَيَجَانِ الغَضَبِ، وَالأَحْلَامُ: العُقُولُ لِكَوْنِ العِلْمِ مِنْ مُسَبَّبَاتِهِ**)، (**أَحْلَام**) کۆی (**حِلْم**)ە، کە بریتیە لە خۆکۆنتڕۆڵکردن و سرووشت کۆنتڕۆڵکردن لە کاتێک دا توورەیی مرۆڤ هەڵدەچێ و، مەبەست لە (**أَحْلَام**)، عەقڵەکانن، لەبەر ئەوەی بە هۆی عەقڵەوە مرۆڤ هێدیی و مەندو خۆ کۆنتڕۆڵکەر دەبێ، واتە: (**حِلْم**)، لە پەیداکراوەکانی عەقڵە، بۆیە ناوی یەکێک لە ناوەکانی عەقڵ بریتیە لە (**حِلْم**).

(تَقَوَّلَهُ): واتە: هەڵیبەستوە، (**تَقَوَّلَ عَلَيْهِ**)، یانی: (**كَذَبَ عَلَيْهِ**)، درۆی بە ناوی ئەوەوە کرد.

(الْمُصَيْطِرُونَ): زاڵبووان، کە هەموو شتێکیان خستبێتە ژێر ڕکێفی خۆیانەوە، (**الْمُسَيْطِرُ وَالْمُصَيْطِر**): هەم بە (س) و هەم بە (ص)، (**الْمُسَلَّطُ عَلَى الإِنْسَانِ لِيُشْرِفَ عَلَيْهِ**)، (**مُسَيْطِر**): بە (س) و (**مُصَيْطِر**): بە (ص)، کەسێک کە باڵادەستە بەسەر مرۆڤدا، تاکو چاودێریی و سەرپەرشتیی بکات.

www.alibapir.com


(مَّغْرَمٍ): (الـمَغْرَمُ: الغَرَامَـةُ: مَـا يَلْـزَمُ أَداؤُهُ، وَكَـذَا الغُـرْمُ)، سێ وشـه هـەن: (مَغْـرَم) و، (غَرَامَـة) و (غُـرْم): بـه كوردیـی دەبـن بـه بـاج، ئـەوەی پێویسـته بـدرێ، بـەڵام هەقیـش نیـه بـدرێ، بـه كوردیـی تاوانیشـی پێدەڵێـن، تـاوانی لێوەرگـرت، هەروەهـا باجیشـی پێدەڵێـن، بـەڵام بـاج جـاری وایـه بـه هەقـەو، جـاری وایـه بـه ناهەقـه، بـەڵام کـه دەگوتـرێ: تـاوانی لێوەرگـرت، تـاوان نـەک بـه مانـای گوناهــ بەڵكـو یـانی: ئەندازەیـەک ماڵـی لـێ سـتاند بـه ناهـەق.

(مُّثْقَلُونَ): (الْمُثْقَـلُ: المُحَمَّـلُ بِـشَيءٍ ثَقِيْـل)، کەسـێک کـه کۆڵێکـی گـرانی لێنرابـێ، (مُسْـتَعَارٌ لِمَـنْ يُطَالَـبُ بِمَـا يَعْـسِرُ عَلَيْـهِ أَدَاؤُهُ)، (مُثْقَـل): خوازراوەتـەوه بـۆ کەسـێک کە داوای شـتێکی لـێ دەکـرێ، لەسـەری بـه زەحمەتـه بیـدات و، بـه کوردیـی (مُثْقَـل)، دەبێتـه بارگرانکـراو کەسـێک بارگرانیـی خراوەتـه سەرشـان.

(الْمَكِيدُونَ): فێڵێکـراوان، (الكَيْـدُ: إِرَادَةُ مَـضَرَّةِ الغَـيْرِ خِفْيَـةً، وَهُـوَ مِـنَ الخَلْـقِ: الحِيلَـة السَّـيِّئَة، وَمِـنَ اللـهِ التَّدْبِـيْرُ بِالْحَـقِّ)، (كَيْـد): بریتیـه لـه ویسـتنی زیانگەیانـدن بـه بەرانبـەر بـه پەنهانیـی، ئنجـا ئەگـەر لـه دروسـتکراوانەوەو لـه خەڵکـەوه بـێ، پێـی دەگوتـرێ: فێـڵ و شـتێکی خراپـه، بـەڵام ئەگـەر ئـەم وشـەیه بـۆ خـوا بەکاربهێـنرێ، بریتیـه لـه نەخشـه دانـانی خـوا بـه شـێوەیەکی پەنهـان، بـەڵام بـه هـەق، چونکـه خـوای پـەروەردگار جگەلـه هـەق و چاکـەی لـێ چـاوەڕوان ناکـرێ.

(كِسْفًا): (الكِسْـفَةُ: القِطْعَـةُ مِـنَ الـشَّيءِ، وَالجَمْـعُ كِسْـف وَكِسَـف)، (كِسـف): لێـرەدا بـه مانـای (كِسْـفَة)یە، کـه بریتیـه لـه پارچەیـەک لـه شـت، پارچەیـەک لـه ئاسـمان کـه بـه (كِسْـف وكِسَـف)، واتـه: (قِطَـع)، کۆدەکرێتـەوە.

(مَّرْكُومٌ): (رَكَمَـهُ يَرْكُمُـهُ رَكْـمَاً: جَمَعَـهُ وَأَلْقَـى بَعْضَـهُ عَـلَى بَعْـض)، کـۆی کـردەوەو هەندێکـی هەڵدایـه سـەر هەندێکـی دیکـەی، بـه کوردیـی پێـی دەڵێـن: کەڵەکـه بوو، کەڵەکـەی کـرد، بـۆ وێنـه: کەڵەکـه بـەرد، بۆیـه پێـی دەگوتـرێ: چونکـه بـەردەکان لەسـەر یـەک هەڵدەچنرێـن و خـڕ دەکرێنـەوە سـەر یـەک.

www.alibapir.com


(يُصۡعَقُونَ): (صَعِقَ الرَّجُلُ: غُشِيَ عَلَيْهِ، هَلَكَ، وَالصَّاعِقَةُ: نَارٌ تَسْقُطُ مِنَ السَمَاءِ)، دەگوترێ: (صَعِقَ الرَّجُلُ)، یان (صُعِقَ الرَّجُلُ، غُشِيَ عَلَيْهِ)، چونكە هەردوو قیرائەتەكەی هاتوون: (يَصْعَقُون)یش هاتوەو (يُصْعَقون)یش هاتوە، ئنجا (صُعِقَ أي: غُشِيَ عَلَيْهِ) واتە: بێهۆش بوو، هەروەها بە مانای مردنیش دێ و، (صَاعِقَة)ش ئاگرێكە لە ئاسمان دەكەوێتە خوارو دەبێتە هۆی فەوتاندن.

(بِأَعۡيُنِنَا): (فُلانٌ بِعَيْنِي، أي: بِمرأىً مِنّي وَمَسْمَعٍ)، ئەگەر دەگوترێ: (فُلانٌ بِعَيْنِي)، واتە: لەبەر چاوی منەو گوێم لە دەنگیەتی و چاوم لێیەتی و، كەواتە: (بِأَعْيُنِنَا) واتە: تۆ لە ژێر چاودێریی و پاراستنی ئێمە دای.

(وَإِدۡبَٰرَ ٱلنُّجُومِ): (إِدْبَار: مَصْدَرٌ مَجْعُولٌ ظَرْفَاً نَحْوَ مَقْدَمِ الحَاجِّ، وَخُفُوقَ النَّجْم، وَمَنْ قَرَأَ «أَدْبَار»، فَجَمْعٌ)، (إِدْبَار النُّجُوم)، (إِدْبَار): چاوگە، بەڵام كراوە بە (ظَرْف)، واتە: لە كاتی ئاوابوونی یان پشت هەڵكردنی ئەستێراندا، ئەستێرەكان كە پشتت تێدەكەن و دەڕۆن، وەک دەگوترێ: (مَقْدَمَ الحَاج)، (مَقْدَم) چاوگە، یانی: هاتن، بەڵام كراوە بە (ظَرْف)، واتە: لە كاتی هاتنی حاجییان دا، (وَخُفُوقَ النَّجْم)، (خُفُوق)یش، دیسان چاوگە بە مانای كاتی ئاوابوونی ئەستێرە، (إِدْبَار النُّجُوم)، خوێندراویشەتەوە: (أَدْبَار النُّجُوم)، واتە: لە پشت ئەستێرەكانەوە، دوای ئەستێرەكان، واتە: دوای ئەوەی ئەستێرەكان ئاوا دەبن، هەڵبەتە ئەستێرەكان لە جێی خۆیانن، بەڵام لە ئەنجامی ئەوەدا كە تیشكی خۆر دنیا دادەگرێ، دنیا ڕووناک دەكاتەوەو شوقی ئەستێرەكان نامێنێ.

www.alibapir.com



## مانای گشتیی ئایەتەکان

وەک لە پێناسەی ئەم دەرسەدا گوتمان، ئەم دەرسە دەرسی سێیەم و کۆتاییە و، بیست و یەک ئایەتی کۆتایی سوورەتی (**الطور**)ی تێدایە، کە تەوەری سەرەکییان باسی پێغەمبەرایەتیی موحەممەد ﷺ و، ڕاستییەتیی قورئانە، کە فەرمایشتی خوایەو بۆ موحەممەد دابەزێنراوە، بەڵام هاوکات لەگەڵ ئەوەش دا، کۆمەڵێک بیرۆکەی پووچی هاوبەش بۆ خوادانەران و بێبڕوایانیش خراونەڕوو، بۆ ئەوەی دەربخرێ کە ئەوانەی بڕوایان بە موحەممەد نیەو، تۆمەتی فاڵچیەتیی و، شێتیەتیی و، شاعیریی و، ئەوە کە گوایە خۆی قورئانی بە ناوی خواوە هەڵبەستوە، ئەو تۆمەتانەی دەدەنە پاڵ، بزانرێ کە چەند دواکەوتوون و، چەند بیرۆکەی پووچ و ئەفسانەییان هەن، یازدە (١١) بیرۆکەی پووچی ئەفسانەییشیان خراونەڕوو.

دواییش باسی کەللەڕەقیی و نەچوونە ژێر باری هەقی ئەوان کراوە، کە تەنانەت ئەگەر ئاسمانیش ببینن بەسەریاندا بڕووخێ، دەڵێن: ئەوە هەورە هەڵەکە بووە لەسەریەک!

لە کۆتاییدا خوا ﷻ بە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ کە وازیان لێ بێنێ، بەڵام بەو واتایەنا واز لە ئامۆژگاریی کردن و بیرخستنەوەیان بێنێ، بەڵکو بەو واتایە:

**أ-** کە واز لە ئازارو ناڕەحەتییەکانیان بێنێ و نادیدەی بگرێ.

**ب-** یاخود واز بێنێ لەوەی زۆر خەفەتیان لێ بخوات.

**ج-** یاخود واز بێنێ لەوەی زۆر شەڕە قسەو وتووێژیان لەگەڵدا بکات و ئومێدی پێیان بێ بڕوا بێنن، ئەوانەش وەک کۆمەڵێکی دیارییکراوی ئەو کاتە، نەک تێکڕای خەڵک.

www.alibapir.com


خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ فَذَكِّرْ فَمَا أَنتَ بِنِعْمَتِ رَبِّكَ بِكَاهِنٍ وَلَا مَجْنُونٍ ﴾ بیربخەوەو ئامۆژگاریی بکەو پەندیان دابدە، بێگومان تۆ بە هۆی چاکەی پەروەردگارتەوە، نە فاڵچیی و نە شێتیشی، ئەوانە دوو لە تۆمەتەکانی بێبڕوایان بوون، پاڵیان دەدانە لای پێغەمبەر موحەممەد ﷺ!! ئەو ئایەتە موبارەکانەی بۆی دادەبەزین و، باسی هاتنی ڕۆژی دوایی: ئاخیر زەمان و، قیامەت و، باسی بەهەشت و دۆزەخ و ... هتدیان دەکرد، ئەوانیش ئەو قسانەیان پێ سەیر بوون و، خۆشیان بەس بەوە ئاشنابوون کە فاڵچیی و کاهینیان هەبوون، قسەی سەیریان بۆ دەکردن، هەروەها کە قورئان باسی گەلانی ڕابردووی دەکرد، کە لە ڕابردوودا گەلی نووح ئاوا فەوتاون و، گەلی عادو گەلی ثەموودو گەلی مەدیەن و گەلی لووط و ... هتد، دەیانگوت: ئەوە کاهین و فاڵچییە هەواڵمان پێ دەدات، بە شتە ڕابردووەکان، هەرچەندە هەندێک لە زانایان دەڵێن: (**کَاهِن**)، کەسێکە هەواڵ دەدات بە شتە ڕابردووەکان، بەڵام (**عرّاف**)، کەسێکە هەواڵ دەدات بە شتە داهاتووەکان، بەڵام لە قورئاندا تەنیا وشەی (**کَاهِن**)، بەکارهێنراوەو، ئەو شێوە لێکدانەوەیەش دەگونجێ بڵێین لێکدانەوەیەکی زاراوەییە[1]، بەڵام لە ئەصڵی زماندا (**کَاهِن**)، کەسێکە کە هەواڵ بەشتی نادیار دەدا، چ پەیوەندیی بە ڕابردووەوە هەبێ، چ پەیوەندیی بە داهاتووەوە هەبێ، خوا دەفەرموێ: تۆ بەهۆی چاکەی پەروەردگارتەوە {کە بریتیە لە پێ بەخشرانی پلەی پێغەمبەرایەتیی} نە فاڵچیی و نە شێتیشی.

﴿ أَمْ يَقُولُونَ شَاعِرٌ نَّتَرَبَّصُ بِهِۦ رَيْبَ ٱلْمَنُونِ ﴾، یاخود ئایا دەڵێن: (موحەممەد) شاعیرێکە چاوەڕێی ڕووداوی ڕۆژگاری بۆ دەکەین، یاخود چاوەڕێی ڕووداوی مەرگ و مردنی بۆ دەکەین!

---

(١) زاراوەیی: إصطلاحي، یانی: ڕێککەوتنی کۆمەڵێک لەسەر چەمک و واتایەکی تایبەت بۆ وشەیەک یان ڕستەیەک، کە تایبەتە بە خۆیانەوە، بۆ وێنە: ئەو وشەو زاراوانەی شەرعزانان (فقهاء)، یان فەرموودەناسان (مُحَدِّثون) لە سەریان پێکهاتوون.

www.alibapir.com


﴿ قُلْ تَرَبَّصُوا ﴾، پێیان بڵێ: چاوەڕێ بن، ﴿ فَإِنِّي مَعَكُم مِّنَ الْمُتَرَبِّصِينَ ﴾، منیش لەگەڵ ئێوەدا لە چاوەڕوانانم، واتە: من دڵنیاو پشت ئەستوورم بە پەیامی خۆم و بە خوای خۆم، کە داهاتوو لە گرەوی من دایە، چونکە پێغەمبەرو ڕەوانەکراوی خوام و، خوا سەرپەرشتییم دەکات و ئاگای لێمەو پشتیوانمە، بەڵام ئێوە هیچ سەرەنجامێکتان نیە، جگە لە زەبوونیی و سەرشۆڕیی لە دنیاداو، ڕیسوایی و شەرمەزاریی لە ڕۆژی دوایی دا.

﴿ أَمْ تَأْمُرُهُمْ أَحْلَامُهُم بِهَٰذَا ۚ أَمْ هُمْ قَوْمٌ طَاغُونَ ﴾، وشەی (أَمْ)، کە لەم ئایەتە موبارەکانەدا، پازدە (١٥) جاران دووبارە بۆتەوە، زانایان دەڵێن: (أَمْ)، لێرەدا پێی دەگوترێ: (أَمْ المُنْقَطِعَة)، واتە: (ئەم)ی دابڕاو، کە زۆربەیان دەڵێن: هەم مانای (هَمْزَة الإسْتِفْهَام) دەگەیەنێ و هەم مانای (بَلْ)یش، دەگەیەنێ، واتە: بەڵکو ئایا عەقڵەکانیان فەرمانیان بەوە پێدەکەن، بەڵکو ئایا ئەوان کۆمەڵێکی یاخیین؟ هەندێکیش گوتوویانە: (أم) هەر بە مانای پرسیارکردنە، یانی: ئایا، هەندێکیش گوتوویانە: (أم) هەر بە مانای (بەڵکو)یە یانی: بەڵکو عەقڵیان بەوە فەرمانیان پێ دەکات، بەڵام دیسان دەبێ بە شێوەی پرسیارو بەئاوازی پرسیارکردن بێ، بەڵام ڕای یەکەمیان زیاتر زانایان لەسەری کۆکن، دواییش لە مەسەلە گرنگەکاندا زیاتر تیشك دەخەینە سەر ئەو بابەتە.

لێرەدا خوا ﷻ دەفەرموێ: بەڵکو ئایا ئەوە عەقڵەکانیانن فەرمانیان بەو جۆرە قسانە پێدەکەن؟ ئایا ئەو قسانە لە عەقڵەوە دێن، موحەممەد ﷺ کە لە لووتکەی عەقڵ و تێگەیشتن دایە، بە شێت تۆمەتبار بکرێ؟ موحەممەد ﷺ کە لە ژیانیدا درۆی لەگەڵ خەڵکدا نەکردوە، ئێستا بە ناوی خواوە هەواڵ بدات بە ناڕاستیی؟ یان موحەممەد ﷺ کە لە ژیانی دا شیعری نەگوتوە، ئێستا لە ناکاو ببێتە شاعیر؟ ئنجا ئەم قورئانە کەی شیعرەو کوێی وەک شیعر دەچێ؟

هەروەها ئەوەش کە ئەوان دەڵێن: ئێمە چاوەڕێ دەکەین مەرگ و مردنی بەسەر بێ، یاخود ڕووداوی ڕۆژگاری بەسەر بێ، فەرموون ئێوە چاوەڕێ بن و

www.alibapir.com


ئێمەش چاوەڕێین، ئێمە دڵنیاین کە سەرەنجام چۆن دەبێ؟ بۆیە خوا دەفەرموێ: ئایا عەقڵەکانیان بەوە فەرمانیان پێ دەکەن، بەڵکو ئەوانە کۆمەڵێکی یاخیین، یانی: ئەو جۆرە هەڵوێست و قسانەیان، لە یاخیی بوونیانەوە سەرچاوە دەگرن، نەک لە عەقڵ و لۆژیکەوە.

﴿ أَمْ يَقُولُونَ تَقَوَّلَهُۥ ﴾، یان ئایا دەڵێن: هەڵیبەستوە، موحەممەد ﷺ قورئانی هەڵبەستوە، ﴿ بَل لَّا يُؤْمِنُونَ ﴾، بەڵکو هەر بڕواناهێنن، ئەگەرنا دەزانن و بە موحەممەد ﷺ شارەزان و پێی ئاشنان، کە پیاوی قسە هەڵبەستن نیە، بەڵام هەر نایانەوێ بڕوابێنن و ئەو شتانە دەکەنە بیانووی بڕوانەهێنانیان.

﴿ فَلْيَأْتُوا۟ بِحَدِيثٍ مِّثْلِهِۦٓ إِن كَانُوا۟ ﴾، ئەگەر ڕاست دەکەن و لە ڕاستانن کە موحەممەد ﷺ قورئانی هەڵبەستوە، بە ناوی خواوە، با ئەوانیش قسەیەکی وەک هی ئەو بێنن، چونکە ئەوان تاکە هونەرێک زۆر تێیدا باڵادەست بن، بریتیە لە ڕەوانبێژیی و زمانپاراویی و قسەزانیی، فەرموون مەیدان مشکان نەیانکێلاوە، با ئەوانیش قسەیەکی وا بێنن، ئەگەر ڕاست دەکەن، بەڵام کە نەیانتوانی، مانای وایە ڕاست ناکەن.

ئنجاخوا ﷻ لەسەرباسی پێغەمبەرەکەی ﷺ لایان دەبات و، دەیانهێنێتە سەر ئەصڵی مەبەست، کە بریتیە لەوەی ئەوان بڕوایان بە خوا نیەو، وەک پێویست خوایان نەناسیوە ﷻ، بۆیە ئەو جۆرە تۆمەتانە ئاڕاستەی پێغەمبەرەکەی ﷺ دەکەن، ئەوەش شێوەیەک لە شێوەکانی پێکەوە پەیوەست بوونەوەی ئایەتەکانە، شێوەیەکی دیکە کە من زیاتر ئەوەم بە دڵە، وەک دوایی باسی دەکەم، ئەوەیە کە لێرەدا خوا ﷻ بۆ پووچەڵیی ئەو تۆمەتانەو بێ بنەماییان، یازدە لە بیرۆکە پووچەکانیان باس دەکات، کە ئەوانە خاوەنی ئەو جۆرە بیرو بۆچوونانەن و، خاوەنانی ئەو بیرو بۆچوونانەش هەر ئەوەیان لێ دەوەشێتەوە کە موحەممەد ﷺ بە شێت و فاڵچیی و، شاعیرو هەڵبەستەر ناوزەد بکەن.

www.alibapir.com


دەفەرموێ ﴿أَمۡ خُلِقُواْ مِنۡ غَيۡرِ شَيۡءٍ﴾، ئایا ئەوانە بەبێ هیچ شتێک هێنراونە دی، ﴿أَمۡ هُمُ ٱلۡخَٰلِقُونَ﴾، یان خۆیان بەدیهێنەری خۆیانن، واتە: ئایا بەبێ بەدیهێنەر دروست بوون، یان خۆیان بەدیهێنەری خۆیانن، کە بێگومان هەردووکیان نالۆژیکیی و غەڵەتن، نە هیچ پەیداکراوێک بەبێ پەیداکەر دەبێ و، هیچ دروستکراوێک بەبێ دروستکەر دەبێ، نە دەشگونجێ هیچ شتێک بۆ خۆی خۆی دروستکرد بێ، چونکە ئەگەر نەبوو بێ، چۆن بە دیهێنەری خۆی بووە؟ هەردووکیان مە حاڵی عەقڵیین، کەواتە: بەحوکمی عەقڵ تەنیا خوا بەدیهێنەریانە. ئنجا لەوە گەڕێ ئایا ئەوان لە خۆوە پەیدا بوون، بەبێ بەدیهێنەر، یان خۆیان بەدیهێنەری خۆیانن؟ ئەدی ئەم گەردوونە؟!

﴿أَمۡ خَلَقُواْ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضَ﴾، بەڵکو ئایا ئاسمانەکان و زەوییان هێناونەدی؟ یانی: ئەگەر گریمان گوتیان: ئێمە خۆمان خۆمانمان بەدیهێناوە، یان هەر کامێکیان گوتی: باب و دایکم منیان دروستکردوە، کە ئەوەش ڕاست نیە، ئەدی باب و دایکی، کێ هێناونیەدی تاکو دەگاتەوە سەر دوو مرۆڤی یەکەم کە (ئادەم و حەووا)ن سەلامی خوایان لەسەر بێ؟ هەروەها ئەوانەی بڕوایان بە ئادەم و حەوواش نەبێ، ئەو زنجیرەیە، هەر دەبێ لە شوێنێک بوەستێ، دیسان گریمان بیردۆزەکەی داروینیش ڕاستبێ، کە ئێستا زانست دەریخستوە، پووچەڵەو شتێکی بێ بنەمایە، بەڵام مرۆڤ ئەگەر بچێتەوە سەر مەیموونیش و مەیمونەکەش بچێتەوە سەر شتێکی دیکەش، لە شوێنێک هەر دەوەستێ و زنجیرەی بێ کۆتایی مەحاڵێکی عەقڵییە، بەڵام با ئەوە لەوێ بوەستێ: ئاسمانەکان و زەوی واتە: ئەم گەردوونە بەسەرو خواریەوە، ئایا ئەوان وەدییان هێناون؟

﴿بَل لَّا يُوقِنُونَ﴾، بەڵکو ڕاستییەکەی ئەوەیە ئەوان خاوەنی زانیاریی دڵنیاکەر نین، لە خوا ناسییەکەیاندا، واتە: باش خوا ناناسن و، کە دەڵێن: دەزانین خوا هەیەو بڕوامان بە خوا هەیە، هەر قسەیەکە بەزار دەیکەن، دەنا ئەگەر بە ڕاستیی خوایان ناسیباو دڵنیابان لەوەدا، ئەو جۆرە قسانەیان نەدەکردن.

www.alibapir.com


﴿ أَمۡ عِندَهُمۡ خَزَآئِنُ رَبِّكَ أَمۡ هُمُ ٱلۡمُصَيۡطِرُونَ ﴾، یان ئایا عەمبارەکانی پەروەردگارتیان لەلان، ئنجا بە کەیفی خۆیان ببەخشن، فڵانکەس دەکەنە پێغەمبەرو، فڵانکەس ناکەنێ، ﴿ أَمۡ هُمُ ٱلۡمُصَيۡطِرُونَ ﴾، یان ئایا ئەوانن زاڵ و باڵادەست بەسەر هەموو شتێکدا، بەسەر گەردووندا، ئەوان بڕیار بەدەستن؟ بێگومان هیچیان وا نین.

﴿ أَمۡ لَهُمۡ سُلَّمٞ يَسۡتَمِعُونَ فِيهِ ﴾، یان ئایا پەیژەیەکیان هەیە، کە لەو پەیژەیەدا گوێ دەگرن و، بەهۆی ئەو پەیژەیەوە گوێ دەگرن، بۆ هەواڵی ئاسمان، ﴿ فَلۡيَأۡتِ مُسۡتَمِعُهُم بِسُلۡطَٰنٖ مُّبِينٍ ﴾، ئنجا با گوێ هەڵخەرەکەیان، گوێگرەکەیان کە بەهۆی پەیژەکەوە چۆتە سەرێ و گوێی لە دەنگ و باسی ئاسمان گرتوە، بەڵگەیەکی ڕوون و ئاشکرا بێنێ!! ئەمەش جۆرێکە لە گاڵتە پێکردن و، توانج تێگرتن، کە مەگەر هەواڵی نادیارو پەنهانی ئاسمان لەلای ئەوانە، کە موحەممەد ﷺ پێغەمبەری خوا نیە؟ کە بەدڵنیایی وانیە، ئنجا ئەگەر وایە، ئایا ئەو هەواڵەیان چۆن دەستکەوتوە؟ دەبێ پەیژەیەکیان هەبێ و، قادرمەیان هەبێ، پێیدا سەرکەوتبن، دەبا بەڵگە بێنن.

﴿ أَمۡ لَهُ ٱلۡبَنَٰتُ وَلَكُمُ ٱلۡبَنُونَ ﴾، یان ئایا ئەو، (خوا بسم الله الرحمن الرحيم) کچانی هەن و ئێوە کوڕانتان هەن؟ چونکە یەکێک لە بیرۆکە ئەفسانەییەکانی هاوبەش بۆ خوا دانەران، ئەوە بوو دەیانگوت: فریشتەکان مێن و کچانی خوان، کەچی بۆ خۆیان ڕازیی نەدەبوون بە کچ، کەواتە: ئەوەی بۆ خۆتان پێی ڕازی نین، چۆن پاڵی دەدەنە لای خوا؟!

﴿ أَمۡ تَسۡـَٔلُهُمۡ أَجۡرٗا فَهُم مِّن مَّغۡرَمٖ مُّثۡقَلُونَ ﴾، یان ئایا تۆ کرێیەکیان لێ داوا دەکەی، ئەوانیش لە ئەنجامی ئەو غەرامەو تاوانەدا کە لێیان داوا دەکەی، بارگرانن؟ واتە: ئایا ئەرکێکیان کەوتۆتە سەر شان بۆیان جێبەجێ ناکرێ، بۆیە بڕوا ناهێنن؟ کە ئەوەش وانیەو پێغەمبەر ﷺ هیچ چاوەڕوانییەکی لێیان نەبووە.

﴿ أَمۡ عِندَهُمُ ٱلۡغَيۡبُ فَهُمۡ يَكۡتُبُونَ ﴾، یان ئایا پەنهان لەلای ئەوانەو ئەوان دەینووسن و، تۆماری دەکەن، ئایا هەواڵە نادیارەکان، لەلای ئەوانن، تاکو بزانن موحەممەد ﷺ پێغەمبەری خوا نیە؟!

www.alibapir.com


﴿ أَمۡ يُرِيدُونَ كَيۡدٗا ﴾، یـان ئایـا ئـەوان پیـلان و فێڵیـان دەوێ، نەخشـەو پلانێکیـان بەدەسـتەوەیەو مەبەسـتیانە پیـلان لـە پێغەمبـەر ﷺ بگێـڕن؟

﴿ فَٱلَّذِينَ كَفَرُواْ هُمُ ٱلۡمَكِيدُونَ ﴾، بـە دڵنیایـی ئەوانـەی بێبـڕوان، بـەس ئـەوان فێـڵ لێکراون، واتە: فێڵەکە بەسـەر سـەری خۆیاندا دەشکێتەوەو، خوا ﷻ نەخشە دادەنـێ بـۆ پووچەڵکردنـەوەی فێـڵ و پیـلانی ئـەوان.

﴿ أَمۡ لَهُمۡ إِلَٰهٌ غَيۡرُ ٱللَّهِۚ ﴾، یـان ئایـا پەرسـتراوێکی دیکـەی جگـە لـە خوایـان هەیـە؟ ﴿ سُبۡحَٰنَ ٱللَّهِ عَمَّا يُشۡرِكُونَ ﴾، پاکیـی بـۆ خـوا لـەوەی دەیکەنـە هاوبەشـی، واتـە: خـوا ﷻ پاک و بێگەردو دووره لەوەی هاوبەشی هەبن لە پەرستراندا، چونکە خوا بەدیهێنـەری هەمـوو شـتێکەو پـەروەردگاری هەمـوو شـتێکە، ژیێنـەرو مرێنـەرەو، هەرشـتێکی دیکـە هەمـووی دروسـتکراوی خۆیـەتی، ئنجـا لـە کۆتایـی دەرخسـتنی ئـەو بیرۆکـە ئەفسـانەییانەی کافـرەکان و، پووچەڵیـی بیرکردنەوەیـان دا، باسـی عینادیـی و کەللەڕەقییـان دەکات و دەفەرمـوێ: ﴿ وَإِن يَرَوۡاْ كِسۡفٗا مِّنَ ٱلسَّمَآءِ سَاقِطٗا ﴾، ئەگـەر پارچەیـەک لـە ئاسـمان بەکەوتوەخـوار ببینـن، بەربێتـەوەو بکەوێتـە خـوار، ﴿ يَقُولُواْ سَحَابٞ مَّرۡكُومٞ ﴾، دەڵێـن: هەورێکـی کەڵەکـە بوویـە، هەورێکـە چۆتـە سـەر یـەک و پەسـتراوەتەوە، یـانی: ئەگـەر ئاسمانیشـیان بەسـەردا بڕووخـێ، دیسـان دانی پێـدا ناهێنـن!

﴿ فَذَرۡهُمۡ حَتَّىٰ يُلَٰقُواْ يَوۡمَهُمُ ٱلَّذِي فِيهِ يُصۡعَقُونَ ﴾، ئنجـا (مـادام بـەو شـێوەیەن) وازیـان لـێ بێنـە، تاکو تووشـی ئـەو ڕۆژەیـان دەبـن، کـە تێیـدا بـێ هـۆش دەکـەون، یـان تێیـدا دەمـرن، کـە ڕۆژی ئاخیـر زەمانـە، یاخـود ئـەو ڕۆژەیـە کـە تێیـدا دەمـرن، چونکـە هەمـوو مرۆڤێـک ئاخیـر زەمانێکـی هەیـەو ڕۆژێکـی هەیـە، تێیـدا لـە دنیـا دەردەچـێ و، دەمـرێ و، پێـش مردنەکەشـی بێهـۆش دەبـێ.

﴿ يَوۡمَ لَا يُغۡنِي عَنۡهُمۡ كَيۡدُهُمۡ شَيۡـٔٗا ﴾، ئـەو ڕۆژە کـە پیـلان و فێڵەکەیـان هیـچ دادیـان نـادات و سـوودیان پێناگەیەنـێ، ﴿ وَلَا هُمۡ يُنصَرُونَ ﴾، پشتیوانییشـیان لێناکـرێ، واتـە:

www.alibapir.com



نەبۆ خۆیان پیلان و فێڵەکەیان لە فریایان دێ، دەربازیان بکات، نە لە دەرەوەی خۆشیان هاوکاریی دەکرێن و پشتیوانیی دەکرێن.

﴿ وَإِنَّ لِلَّذِينَ ظَلَمُوا۟ عَذَابًا دُونَ ذَٰلِكَ ﴾، بە دڵنیایی ئەوانەی ستەمیان کردوە (بەهۆی کوفرو شیرکەوە) بەر لەوەش سزاو ئازارێکیان هەیە، واتە: بەر لە هاتنی ئاخیر زەمان، یان بەر لە سزای ڕۆژی دواییش، سزاو ئازاری دیکەیان هەیە، کە مەبەست پێی ئەو ئازارو ناڕەحەتییانەیە کە لە ژیانیاندا دێنە ڕێیان، لە نەخۆشیی و ناخۆشیی و گرفتاریی، یاخود ئەوە هەڕەشەیەکە لێیان، کە بەر لە هاتنی ئاخیر زەمان و قیامەتیش، ئەوانە بە دەستی ئەهلی ئیمان تووشی سزا دێن و، ئاماژەیە بۆ جەنگی بەدرو ڕووبەڕوو بوونەوەکانی دیکە.

﴿ وَلَٰكِنَّ أَكْثَرَهُمْ لَا يَعْلَمُونَ ﴾، بەڵام زۆربەیان نازانن، یانی: هەندێکیان بەدڵنیایی زانیویانە کە موحەممەد ﷺ پێغەمبەری خوایەو، ئەو هەڕەشانەی لێیان دەکات، ڕۆژێک دێ، تووشی دەردی خۆیان دەبن، چ بە نسبەت ڕۆژی دواییەوە، چ بە نسبەت دنیاشەوە، هەندێکیان دەستیان هەر لەسەر دڵیان بووە، بەڵام کەللەڕەقیی و عینادیی و بەرژەوەندییە ناشەرعییەکانیان دەست و پێیان بەستوون، بۆیە بڕوایان نەهێناوە، بۆیەش دەفەرموێ: زۆربەیان نازانن، چونکە هەندێکیان هەر زانیویانە کە ئەو ڕێیە پووچەی ئەوانی لەسەرن، بێ سەرەنجامەو، ئەوەی موحەممەد ﷺ دەیفەرموێ، ئاکام و سەرەنجامی خێری هەیە، لە دنیاو دواڕۆژدا.

لە کۆتاییدا خوا بە پێغەمبەر دەفەرموێ: ﴿ وَٱصْبِرْ لِحُكْمِ رَبِّكَ ﴾، خۆت ڕابگرە بۆ بڕیاری پەروەردگارت، یان بۆ دادوەریی کردنی پەروەردگارت، هەتا دێ، یان ئەو بەرنامەیەی پەروەردگارت بۆی داناوی، خۆتی لەسەر ڕابگرەو پشوو درێژ بە، ﴿ فَإِنَّكَ بِأَعْيُنِنَا ﴾، بە دڵنیایی تۆ لە ژێر چاودێریی ئێمەدای، تۆ بە چاوەکانی ئێمەی، یانی: لە ژێر چاودێریی ئێمەدای و ئاگامان لێتەو دەتپارێزین، ﴿ وَسَبِّحْ بِحَمْدِ رَبِّكَ حِينَ تَقُومُ ﴾، بەستاییش کردنەوەش پەروەردگارت بە پاک بگرە،

لـە كاتێكـدا هەڵدەسـتی، لـە مەجلیـس هەڵدەسـتی، یاخـود لـە خـەو هەڵدەسـتی، هـەردووک واتایەکـەی هـەن، بـەڵام زیاتـر وا پێدەچـێ مەبەسـت پێـی لـە كاتی لـە خـەو هەڵسـان بـێ.

﴿وَمِنَ ٱلَّيۡلِ فَسَبِّحۡهُ وَإِدۡبَٰرَ ٱلنُّجُومِ﴾، هەروەهــا لــە شەوێشــدا پــەروەردگارت بــە پـاک بگـرە (و ستاییشـی بکـەو یـادی بکـە) ﴿وَإِدۡبَٰرَ ٱلنُّجُومِ﴾، هەروەهـا لـە کاتی ئـاوا بـوونی ئەستێرەکانیشـدا، کاتێـک ئەسـتێرەکان ون و پەنهـان دەبـن، بەهـۆی دەرکەوتنـی تیشـکی خـۆرەوە ئەسـتێرەکان دیـار نامێنـن، واتـە: کـە دەکەویـە نێـو ڕۆژێـش، دیسـان پـەروەردگارت بـە پـاک بگـرەو ستاییشـی بکـە، یـانی: بـە شـەو و ڕۆژ سـەرگەرمی بـە پاکگرتـن و ستاییشـکردنی پـەروەردگارت بـەو، سـەرگەرمی بەندایەتیـی بـۆ خـوا کـردن و پەرسـتنی بـە، ئائـەوە وزەو توانایەکـت دەداتـێ کـە خۆڕاگـر بـی، لەسەرئەوڕاستەڕێیەیخوا بسم الله الرحمن الرحيم.

خــوای پــەروەردگار ئێمــەش تەوفیـق بـدات و، یارمەتییـمان بـدات کـە بەهـۆی بەندایەتیـی بـاش بـۆ کـردنی و، بـە پاکگرتنـی و سـتاییش بـۆ کـردنی و، هەمیشـە یادکردنیـەوە، لـە شـەو و ڕۆژانـدا، دڵ و دەروونمـان بەهێـز و پـڕ وزەو توانـا بـێ و، خۆڕاگربیـن لەسـەر ڕاسـتە ڕێـی خـوا.

لە تۆڕە کۆمەڵایەتییەکان لەگەڵتانین
Stay in touch on social media
نحن معكم عبر مواقع التواصل الاجتماعي
ڕاگەیاندنی مەکتەبی مامۆستا عەلی باپیر
AliBapir/عەلی باپیر
archive.org/details/@alibapir
AliBapir/عەلی باپیر
کەناڵی ڕاگەیاندنی مەکتەبی مامۆستا عەلی باپیر
AliBapir
www.alibapir.net
کوردی - عربي - English
ڕاگەیاندنی مەکتەبی مامۆستا عەلی باپیر

www.alibapir.com


## مەسەلە گرنگەکان

### مەسەلەی یەکەم:

**فەرمانکردنی خوا ﷻ، بە پێغەمبەرەکەی موحەممەد ﷺ کە لەسەر بیرخستنەوەو ئامۆژگاریی کردنی خۆی بەردەوام بێ و، نە فاڵچییەو، نە شێتەو، نە شاعیرە، وەک ناحەزانی دەڵێن و، ئەو قسانەیان لە عەقڵەوە نایەن، بەڵکو بەرهەمی لە خوا یاخیی بوونیانن، هەروەها کە دەڵێن: موحەممەد ﷺ خۆی قورئانی هەڵبەستوە، ڕاست ناکەن، ئەگەر ڕاست دەکەن، با ئەوانیش وێنەی ئەو فەرمایشتەی خوا ﷻ بێنن، چونکە موحەممەدیش ﷺ مرۆڤێکە وەک ئەوان و ئەگەر ئەم قورئانە، قسەی خۆی بێ، ئەوانیش مرۆڤن و، دەتوانن قسەی وەک وی بکەن، بەڵام ئەگەر وەک موحەممەد ﷺ دەفەرموێ: فەرمایشتی خوا بێ، بێجگە لە خوا هیچ کەس ناتوانێ فەرمایشتی وەک هی خوا ﷻ بفەرموێ:**

خوا دەفەرموێ: ﴿فَذَكِّرْ فَمَآ أَنتَ بِنِعْمَتِ رَبِّكَ بِكَاهِنٍ وَلَا مَجْنُونٍ ﴿٢٩﴾ أَمْ يَقُولُونَ شَاعِرٌ نَّتَرَبَّصُ بِهِۦ رَيْبَ ٱلْمَنُونِ ﴿٣٠﴾ قُلْ تَرَبَّصُوا۟ فَإِنِّى مَعَكُم مِّنَ ٱلْمُتَرَبِّصِينَ ﴿٣١﴾ أَمْ تَأْمُرُهُمْ أَحْلَٰمُهُم بِهَٰذَآ ۚ أَمْ هُمْ قَوْمٌ طَاغُونَ ﴿٣٢﴾ أَمْ يَقُولُونَ تَقَوَّلَهُۥ ۚ بَل لَّا يُؤْمِنُونَ ﴿٣٣﴾ فَلْيَأْتُوا۟ بِحَدِيثٍ مِّثْلِهِۦٓ إِن كَانُوا۟ صَٰدِقِينَ ﴿٣٤﴾﴾.

## شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە دە بڕگەدا:

١)- ﴿فَذَكِّرْ فَمَآ أَنتَ بِنِعْمَتِ رَبِّكَ بِكَاهِنٍ وَلَا مَجْنُونٍ﴾، بیریان بخەوە تۆ بەهۆی چاکەی پەروەردگارتەوە نەکاهینی و نەشێت. (دُمْ وَاسْتَمِر عَلَى التَّذْكِيْرِ، وَاثْبُتْ عَلَى مَا أَنْتَ عَلَيْهِ مِنَ الوَعْظِ وَالتَّذْكِير)، بەردەوام و پشوو درێژبە، لەسەر بیرخستنەوەو، چەسپاو بە لەسەر ئەوەی تۆی لەسەری، لە ئامۆژگاریی کردن و بیرخستنەوە، واتە:

www.alibapir.com


بیرخستنەوەی ڕاستییەكان بۆ ئەو خەڵكە، ﴿فَمَآ أَنتَ بِنِعۡمَتِ رَبِّكَ بِكَاهِنٖ وَلَا مَجۡنُونٍ﴾، تۆ بە هۆی چاكەی پەروەردگارتەوە، نە فاڵچیی و نە شێتیشی، كە دەفەرموێ: (فَذَكِّرْ)، ئەم (ف)ە، (فَاء التَّفْرِيع)ی پێ دەڵێن، واتە: مادام حاڵ بەو شێوەیە بێ، كە لە ڕابردوودا باسكرا، كەواتە: تۆ یادیان بخەوەو بیریان بخەوەو، بەردەوامبە لەسەر بیرخستنەوەی خۆت و، بەدڵنیایی بەهۆی چاكەی پەروەردگارتەوە {كە بریتیە لە پێ بەخشرانی پلەی پێغەمبەرایەتیی} نە فاڵچیی و نە شێتیشی.

ڕستەی: ﴿فَمَآ أَنتَ بِنِعۡمَتِ رَبِّكَ بِكَاهِنٖ وَلَا مَجۡنُونٍ﴾، تۆ بە هۆی چاكەی پەروەردگارتەوە، نە فاڵچیی و نە شێتیی، زانایان چوار واتایان بۆ لێكداونەوە:

١- ﴿فَمَآ أَنتَ بِنِعۡمَتِ رَبِّكَ﴾، دەڵێن: (ب)ەكە، (مُتَعَلِّقٌ بِمَحْذُوفٍ هُوَ حَال)، ئەم (ب) ایە پەیوەستە بە شتێكی قرتێنراوەو كە دەبێتە حاڵ، یانی: (مَا أَنْتَ مُتَلَبِّساً بِنِعْمَةِ رَبِّكَ الَّتِي أَنْعَمَ بِهَا عَلَيْكَ، مِنْ رَجَاحَةِ العَقْلِ وَالنُّبُوَّةِ، بكَاهِنٍ وَلاْ مَجْنُون)، واتە: تۆ لە حاڵێكدا كە بەهرەمەندی لە چاكەی پەروەردگارت و بە تۆی بەخشیوە لە تێر و تەواویی لە عەقڵداو، لە پلەی پێغەمبەرایەتیی، نە فاڵچیی و نە شێتیشی.

٢- (مَا أَنْتَ فِي حَالِ إِذْكَارِكَ بِنِعْمَةِ رَبِّكَ بكَاهِنٍ، وَلاْ مَجْنُون)، تۆ لە حاڵێكدا كە چاكەی پەروەردگارتیان بۆ باس دەكەی و دەیخەیەوە یادیان، كە بریتیە لە پەیامی خوا، نە فاڵچیی و نە شێتیشی.

٣- (إِنْتَفَى عَنْكَ الكَهَانَةُ وَالجُنُونُ بِسَبَبِ نِعْمَةِ اللهِ عَلَيْك)، هەر كام لە فاڵچیەتیی و شێتیی لە تۆدا لاچوون، بەهۆی چاكەی پەروەردگارتەوە لەسەرت.

٤- ﴿فَمَآ أَنتَ بِنِعۡمَتِ رَبِّكَ﴾، (ب) بۆ سوێندە، وەک: (وَاللهِ، بِاللهِ، تَاللهِ، مَا أَنْتَ بِنِعْمَةِ رَبِكَ)، سوێند بە چاكەی پەروەردگارت، تۆ نە فاڵچیی و، نە شێتی.

هەر چوار واتایەكەش ڕێک و گونجاون و ئەمە (الشوكاني)، لە (فتح القدير) ەكەی خۆیدا هێناونی[١].

---

(١) ج٥، ص١٢٠.

www.alibapir.com


(**کَاهِــن**)، وەک: (ڕاغیبــی ئەســفەهانیی)، دەڵــێ: کاهیــن ئەوەیــە کــە هــەواڵ دەدات بــە شــتی پەنهانــی ڕابــردوو، بــەڵام (**عَـرَّاف**)، ئەوەیــە کــە هــەواڵ دەدات بــە شــتی پەنهانــی داهاتــوو، بــەڵام لــە بەکارهێنــانی قوڕئانــدا کاهیــن ئــەو کەســەیە وا دەخاتــە وەهــم و زەینــی خەڵکــەوە کــە پەنهــان دەزانــێ، بەبــێ وەحیــی، چ ئــەو پەنهانە پەیوەندیی هەبێ بە ڕابردووەوە یان بە داهاتووەوە، چونکە خوا ﷻ بــاسی (**کَاهِــن**) و (**عَـرَّاف**)ی نەکــردوە، بەڵکــو هــەر بــاسی (**کَاهِــن**)ی کــردوە، کەهانــە هەبــووە لــە کاتی خۆیــداو، کاهینــەکان هــەم بــاسی داهاتووشــیان کــردوەو، هــەم بــاسی ڕابردووشــیان کــردوە، ئنجــا ئــەوان کــە تۆمــەتی کاهینیــی و فاڵچییەتییــان پاڵداوەتــە لای پێغەمبــەر ﷺ، لەبــەر ئــەوە بــووە، کــە ئــەو قوڕئانــەی خوێندوویــەتی، هــەم بــاسی ڕابــردووی تێــدا هەبــووەو بــاسی گــەلانی ڕابــردوو، هــەم بــاسی داهاتــووشی تێــدا هەبــووە، کــە ئاخیــر زەمــان و ڕۆژی دوایــی دێ و ســزا و پاداشــت، بــاسی هەردووکیــانی تێــدا هەبــووە، بۆیــە گوتوویانــە: کاهینــە، واتــە، فاڵچییــەو هەواڵدەرێکــە بــە نادیــار، وەک ئــەو کاهینانــەی ناسیویانن، کــە درۆو دەلەســەی زۆریــان بــۆ خەڵــک کــردوە و، کڵاویــان لەســەری خەڵــک نــاوەو بەدڵنیایــی ســادەیی خەڵکیــان ئیســتیغلال کــردوەو، ئــەو جــۆرە کەســانە لــەم ڕۆژگارەی ئێســتای ئێمەشــدا هــەر هــەن، کــە چ لــە بــواری تەندروســتییداو، چ لــە بــواری بەخــت و چارەنووســداو، چ لــە بــواری دیکــەدا، قســە دەکــەن، بــێ ئــەوەی قســەکەیان پشــت ئەســتوور بــێ، بــە بەڵگەیەکــی زانســتیی، کــە لــە ڕێــی عەقــڵ و هــۆش و هەســتەکانەوە دەزانــرێ، یاخــود بــە بەڵگەیەکــی نەقڵیــی، کــە دەبــێ لــە وەحیــی ســاغ و بــێ خڵتــەوە ســەرچاوە بگــرێ.

هەڵبەتــە کــە تۆمــەتی شــێتییان پاڵداوەتــە لای پێغەمبــەری خــوا ﷺ، لــە ڕاســتییدا ئــەوە شــێتییە، تۆمــەتی شــێتیی پــاڵ بدرێتــە لای پێغەمبــەری خاتــەم ﷺ، کــە لە عەقڵ و تێگەیشــتندا لــە لووتکــەدا بــووە، هەمــوو پێغەمبــەران (**عَلَيْهِـمُ الصَّـلَاةُ وَالسَّـلَامُ**) عاقڵترینــی خەڵکــی ڕۆژگاری خۆیــان بــوون، پاکتریــن و چاکتریــن و ڕەوشــت بەرزترینی خەڵکــی ڕۆژگاری خۆیــان بــوون، تەنانــەت پێــش ئــەوەی خــوا هەڵیشــیانبژێرێ بــە

www.alibapir.com


پێغەمبەر، بەڵام دوای ئەوەش کە خوای پەروەردگار بەهرەمەندی کردوون لە وەحیی و پێغەمبەرایەتیی، بێگومان هەم عەقڵەکەیان زیادی کردوەو، هەم عیلمەکەیان و، هەم ڕەوشتەکەیان و، هەم پاکیی و چاکییەکەیان.

٢)- ﴿أَمۡ يَقُولُونَ شَاعِرٞ﴾، یان ئایا دەڵێن: شاعیرێکە، شاعیریش ئەوانە بوون کە شیعرو هۆندراوەیان گوتوە.

٣)- ﴿نَّتَرَبَّصُ بِهِۦ رَيۡبَ ٱلۡمَنُونِ﴾، چاوەڕێی بۆ دەکەین، بەڵای ڕۆژگاری بەسەر بێ، یاخود چاوەڕێی دەکەین ڕووداوی مەرگی بێتە سەرێ، (رَيْب)، لە عەبدوڵڵای کوڕی عەبباسەوە (خوا لە خۆی و بابی ڕازی بێ)، هاتوە کە گوتوویەتی: (**رَيْب فِي الْقُرْآنِ شَكٌّ، إِلاَّ مَكَانَاً وَاحِدَاً فِي الطُّورِ: رَيْبَ الْمَنُونِ**)، واتە: وشەی (رَيْب): لە قورئاندا هەمووی بە مانای دوو دڵییە، جگە لە شوێنێك لە (**الطور**)دا.

(ظَنّ) بە مانای گومانە، بەڵام (شَك) بە مانای دوو دڵییە، دوو دڵییش ئەوەیە لە نێو قەدێ بوەستێ و بە هیچ لایاندا نەکەوێ، (ظَنّ) ئەوەیە بە لاکیاندا بکەوێ، لای بوونی ئەو شتە، یان لای نەبوونی، عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس (خوا لە خۆی و بابی ڕازی بێ)، دەڵێ: وشەی (رَيْب) لە هەموو قورئاندا بە مانای دوو دڵیی بەکارهاتوە، تەنیا لە یەک شوێن لە قورئاندا بە مانای ڕووداوی مەرگ، یاخود ڕووداوی ڕۆژگار بەکارهاتوە، کە بریتییە لە ﴿نَّتَرَبَّصُ بِهِۦ رَيۡبَ ٱلۡمَنُونِ﴾ (**رَيْب الْمَنُونِ**): (**حَوادِثَ الدَّهْرِ، صُرُوفَ الدَّهْرِ، نَنْتَظِرُ بِهِ الحَوادِثَ فَيَمُوتُ كَمَا مَاتَ غَيْرُهُ**)، کارەسات و پێشهاتەکانی ڕۆژگاری بۆ چاوەڕێ دەکەین و دەمرێ، وەک چۆن ئەوانی دیکەی پێشتریش مردوون، لە شاعیرەکان، (**الْمَنُونِ**) هەم بە مانای ڕۆژگار (**دَّهْرِ**)، هاتوە، هەم بە مانای مردنیش.

٤)- ﴿قُلۡ تَرَبَّصُواْ فَإِنِّي مَعَكُم مِّنَ ٱلۡمُتَرَبِّصِينَ﴾، بڵێ: چاوەڕێ بن، منیش لەگەڵ ئێوەدا لە چاوەڕوانانم، واتە: ئێوە چاوەڕێی مردن و لە بەینچوونی من بن، منیش چاوەڕێی مردن و فەوتانی ئێوەم و، دڵنیام کە سەرەنجامی چاک بۆ من و بۆ شوێنکەوتووانم و بۆ

www.alibapir.com


پەیامەکەم دەبێ، ئێوەش بەشتان تەنیا لە بەینچوون و سەرنگووم بوون و ڕیسوایی و، شەرمەزاریی دنیاو دوارۆژە، کە هەر واش دەرچوو، ئنجا ئەمە بۆ خۆی ئیعجازێکی مێژووییە لە قورئاندا، کە لە زۆر شوێندا هاتوە، چونکە کەسێک هەر لە سەرەتاوە کە ئەگەری هەبووە بکوژرێ یان پەنهانکوژ بکرێ، یاخود بەمردنی ئاسایی بمرێ، یان بەڵای بەسەر بێ، کەچی لەو سەرەتایەوە زۆر بە دڵنیایی و پشتئەستوورانە، بڵێ: سەرەنجامی چاک بۆ منە، چاوەڕێ بن، منیش چاوەڕێم و سەرکەوتن، بۆ پەیامەکەمەو، لە بەینچوون و شەرمەزارییش بۆ ئێوەیە، ئاوا بە لەخۆڕادیتوویی قسەبکات! بەدڵنیایی ئەگەر پشت بە خوا بەستوو نەبێ و، لە خواوە قسە نەکات و، لە خواوە دڵنیا نەکرابێتەوە، ناتوانێ قسەی وا بکات.

وشەی (أَمْ)، کە دەفەرموێ: ﴿ أَمْ يَقُولُونَ شَاعِرٌ نَّتَرَبَّصُ بِهِۦ رَيْبَ ٱلْمَنُونِ ﴾، کە لەم ئایەتانەدا پازدە (١٥) جاران دووبارە بۆتەوە، وەک پێشتریش گوتوومانە، زانایان بە چوار واتایان هێناویانە:

١- هەندێکیان گوتوویانە: (أَمْ)، لێرەدا هەم بە مانای هەمزەی پرسیارکردن (**هَمْزَة الإِسْتِفْهَام**)و هەم بە مانای (**بَلْ**)ە، (**بَل الإِسْتِدْرَاكِيَة**)، بە مانای (ئایا)و، بە مانای (بەڵکو)، هەردووکیان پێکەوە، کە دەفەرموێ: (**أَمْ يَقُولُون**)، یانی: (**بَلْ أَيَقُولُون**)، بەڵکو ئایا دەڵێن؟

٢- هەندێک گوتوویانە: تەنیا بە مانای (**بل**)ە، واتە: بەڵکو (**أَمْ يَقُولُون**)، یانی: بەڵکو دەڵێن.

٣- هەندێکیان گوتوویانە: بە مانای پرسیارکردنە، (**أَمْ يَقُولُون**)، یانی: ئایا دەڵێن؟ (**خليل بن أحمد الفراهيدي**) ڕای وابووە.

٤- سیبەوەیهیی گوتوویەتی: (**الْخُرُوج مِن كَلامٍ إِلى كَلاَمٍ آخَر**)، گوتوویەتی: (**أَمْ**)، لێرەدا تەنیا بۆ ئەوەیە قسەیەکت کردوەو لەوەوە دەگوازیەوە بۆ قسەیەکی دیکە، ئەم چوار ڕایە هەن و ڕەنگە هەر چواریشیان، هەر کامێکیان لە حاڵ و مەقامی خۆیدا ڕاست

www.alibapir.com


بێ، واتە: وشەی (أَمْ)، کە خوا ﷻ بەکاری هێناوە، جاری وایە: بە مانای هەمزەی پرسیارکردن و بەڵکو (بَلْ)یش بێ و، جاری وایە تەنیا بە مانای (بەڵکو)یە، جاری وایە تەنیا بە واتای (ئایا)ی پرسیارکردنەو، جاری واش هەیە بۆ ئەو گواستنەوەیە لە قسەیەکەوە بۆ قسەیەکی دیکە، وەک شارەزایان و پسپۆڕانی زمانی عەرەبیی گوتوویانە.

٥)- ﴿أَمْ تَأْمُرُهُمْ أَحْلَامُهُم بِهَٰذَا﴾، (خوا دەفەرموێ:) ئایا عەقڵەکانیان فەرمانیان بەوە پێدەکەن؟ یانی: (**بَلْ أَتَأْمُرُهُمْ عُقُولُهُمْ بِهَذَا الكَلَامِ الْمُتَنَاقِض**)، بەڵکو ئایا عەقڵەکانیانن کە فەرمانیان پێدەکەن، بەو قسە تێکەڵ و پێکەڵ و دژیەکانە؟ چونکە ئەگەر شاعیر بێ، چۆن شێتەو، ئەگەر فاڵچیی بێ، چۆن شێتە، ئەو قسانە هەموویان یەکدی هەڵدەوەشێنەوەو دژیەکن، ئنجا ئایا ئەو قسانەیان لە عەقڵیانەوە سەرچاوە دەگرن و عەقڵیان بەوە فەرمانیان پێدەکات؟ ئاشکراشە قسە لە بارەوەکراوانێ، کە ئەم ئایەتە موبارەکانە قسەیان لە بارەوە دەکەن، بە پلەی یەکەم کافرەکانی ڕۆژگاری پێغەمبەری کۆتایی بوون، لە هۆزی قوڕەیش پێش هەموان، قوڕەیشیش خۆیان زۆر بە خاوەن عەقڵ و هۆش و ڕەوانبێژیی و باڵادەستیی زانیوە، بە تایبەت لە بواری عەقڵ و تێگەیشتن و قسەزانیی و قسە نەستەقییدا، واتە: ئەوان کە لافی ئەوە لێدەدەن عەقڵ و هۆشێکی بەهێزیان هەیە، ئایا عەقڵەکانیان فەرمانیان بەوە پێدەکەن، ئەو جۆرە قسانە بکەن، کە هەر کامێکیان دژی ئەوی دیکەیە؟

٦)- ﴿أَمْ هُمْ قَوْمٌ طَاغُونَ﴾، بەڵکو ئەوان، کۆمەڵێکی یاخیین، یانی: (**بَلْ تَجَاوَزُوا الحَدَّ فِي الطُّغْيَانِ وَالعِنَادِ، فَقَالُوا مَا قَالُوا**)، بەڵکو سنوور شکێنییان کردوە لە یاخیبوون و کەللەڕەقیی و نەسەلماندندا، بۆیە ئەوەیان گوتوە کە گوتوویانە، هەندێک لە زانایان گوتوویانە: ئەم قسانە گواستنەوەن لە قسەیەکەوە بۆ قسەیەکی دیکە، لەگەڵ پرسیارکردندا، هەروەک چەمک واتای (أم)ی دابڕاو (**أَمِ الْمُنْقَطِعَةِ**)، کە بە مانای (پرسیارکردن) و بە مانای (بەڵکو)یە، ئەوە دەگەیەنێ کە ئەو قسانە، هەر کامێکی دواتر، لەوەی پێشتر ناقۆڵاتر و نەگونجاوترەو، کەللەڕەقیی زیاتریشی تێدایە.

www.alibapir.com


٧)- ﴿ أَمْ يَقُولُونَ تَقَوَّلَهُۥ ﴾، یان ئایا دەڵێن: هەڵیبەستوە، وەک لە جێی دیکەدا دەفەرموێ: ﴿ أَمْ يَقُولُونَ ٱفْتَرَىٰهُ ﴿٣٨﴾ ﴾ یونس، ئایا دەڵێن: هەڵیبەستوه (بە ناوی خواوه)؟ (تَقَوُّلْ)، ئەوەیە قسە بە ناوی کەسێکەوە بکرێ، (التَّقَوُّلُ: نِسْبَةُ كَلام إِلَى أَحَدٍ لَمْ يَقُلْهُ، وَيَتَعَدَّى إِلَى الْكَلامِ بِنَفْسِهِ، وَيَتَعَدَّى إِلَى مَنْ يُنْسَبُ إِلَيْهِ بِحَرْفِ «عَلَى»، قَالَ تَعَالَى: ﴿ وَلَوْ تَقَوَّلَ عَلَيْنَا بَعْضَ ٱلْأَقَاوِيلِ ﴿٤٤﴾ ﴾ الحاقة، وَضَمِيرُ «تَقَوَّلَهُ» عَائِدٌ إِلَى الْقُرآنِ الْمَفْهُومِ مِنَ الْمَقَام).

واتە: (تَقَوُّلْ)، بریتیە لەوە کە قسەیەک پاڵ بدرێتە لای کەسێک کە نەیگوتبێ، ئنجا (تقوّل الكلام)، هەر بۆ خۆی تەعەددا دەکات و بەرکار دەخوازێ، بێ ئەوەی پیتێکی دیکە بەکار بێ، بەڵام ئەگەر بویسترێ ئەم (قسە بە دەم هەڵبەستنەو)ە، پاڵ بدرێتە لای کەسێک، بە پیتی (عَلَى)، بەرکار دەخوازێ، وەک دەفەرموێ: ﴿ وَلَوْ تَقَوَّلَ عَلَيْنَا بَعْضَ ٱلْأَقَاوِيلِ ﴿٤٤﴾ ﴾ الحاقة، ئەگەر بە ناوی ئێمەوە هەندێ قسەی هەڵبەستبانایە، ﴿ لَأَخَذْنَا مِنْهُ بِٱلْيَمِينِ ﴿٤٥﴾ ثُمَّ لَقَطَعْنَا مِنْهُ ٱلْوَتِينَ ﴿٤٦﴾ ﴾ الحاقة، قۆڵی ڕاستیمان دەگرت، دوایی ڕەگی ملیمان دەپەڕاند، ﴿ فَمَا مِنكُم مِّنْ أَحَدٍ عَنْهُ حَٰجِزِينَ ﴿٤٧﴾ ﴾ الحاقة، هیچ کام لە ئێوەش نەیدەتوانی ڕێگر بێ و بەرگریی لێ بکات. کە دەفەرموێ: (تقوّلَهُ) ئەم (ه)ی سەر (تقوّلَهُ)، ڕاناوێکە دەچێتەوە بۆ قورئان کە لە ڕەوت دەفامرێتەوە، ئەگەرنا پێشێ لەم ڕستانەدا باسی قورئان نەکراوە، بەڵام لە ڕەوت دەفامرێتەوە کە مەبەست پێی قورئانەو، ئەوەش لە قورئاندا زۆرە، کە خوا ﷻ جارێ باسی شتێکی نەکردوە، بەڵام ڕاناوێک بەکاردەهێنرێ دەچێتەوە بۆ ئەو شتەی پێشتر باس نەکراوە، بەڵام بە سیاق و سەلیقە دەزانرێ کە مەبەست پێی ئەوە، چونکە ئەوەی کە پێغەمبەری ﷺ پێ تۆمەتبار کراوە، هەر ئەوە بووە کە قورئانی لە خۆیەوە گوتوەو هەڵبەستوە، بە ناوی خواوە، بۆیە دەزانین کە دەگوترێ: ئەوەی هەڵیبەستوە، مەبەست پێی قورئانە.

٨)- ﴿ بَل لَّا يُؤْمِنُونَ ﴾، واتە: بەڵکو (ئەو قسانە بۆیە دەکەن، چونکە) بڕوا ناهێنن، یانی: نایانەوێ بڕوا بێنن، بۆیە ئەو قسانە دەکەن، وەک پاساو دانەوەی هەڵوێستی خۆیان و، بیانوو هێنانەوە بۆ بڕوا نەهێنانیان.

www.alibapir.com


٩)- ﴿ فَلْيَأْتُوا۟ بِحَدِيثٍ مِّثْلِهِۦٓ إِن كَانُوا۟ صَـٰدِقِينَ ﴾، ئەگەرنا ئەگەر لە ڕاستانن، با قسەیەكی وەک ئەو (قورئانە) بێنن، كە دەڵێن: قورئان موحەممەد ﷺ بە ناوی خواوە هەڵیبەستوە، با ئەوانیش قسەیەكی ئاوا بكەن، ئەگەر ڕاست دەكەن، ئەوانیش كەس دەستی نەگرتوون و ئەوانیش مرۆڤن، وەک موحەممەد ﷺو، خۆشیان بەوی نادەن و، پێیان وایە لەو ژیرترن و، قسە زانترن و، بە تواناترن، چونكە ڕەخنەیان دەگرت دەیانگوت: ﴿ أَهَـٰذَا ٱلَّذِى بَعَثَ ٱللَّهُ رَسُولًا ﴿٤١﴾ ﴾ الفرقان، واتە: ئا ئەوەیە خوا كردوویەتی بە پێغەمبەر ﷺ؟! حاشای مەقامی بەرزی پێغەمبەر ﷺ، ئنجا ئەگەر خۆیان بەوی نادەن و، خۆیان پێ لەو گرنگترو بە تواناترە، ئەگەر ڕاست دەكەن موحەممەد ﷺ ئەو قسەیەی هەڵبەستوە، با ئەوانیش قسەیەكی وا بێنن، بەڵام ڕاست ناكەن.

كەواتە: لە كۆی ئەم شەش ئایەتەدا، خوا ﷻ چوار تۆمەتی بێ بڕوایانی خستنەڕوو، كە بۆ پێغەمبەری خاتەمیان كردوون:

**یەكەمیان:** فاڵچیەتیی.

**دووەم:** شێتییەتیی.

**سێیەم:** شاعیریی.

**چوارەم:** گوایە خۆی قورئانی هەڵبەستوە.

خواش ﷻ بەرپەرچی هەر كام لەو چوار تۆمەتەی داوەتەوەو، هەر چواری هەڵوەشاندوونەوە:

**أ و ب** - بە نسبەت ئەوەوە كە تۆمەتباریان كردوە بەوەی فاڵچییەو لە خۆوە قسەی پەنهان دەكات، لە بارەی ڕابردوو و داهاتووەوەو، شێتە، خوا ﷻ بەوە بەرپەرچی ئەو دوو تۆمەتەیانی داوەتەوە كە دەفەرموێ: ﴿ فَمَآ أَنتَ بِنِعْمَتِ رَبِّكَ بِكَاهِنٍ وَلَا مَجْنُونٍ ﴾، واتە: تۆ بە هۆی چاكەی پەروەردگارتەوە (كە پێغەمبەرایەتییە) فاڵچیی و شێت نی. كەسێک خوا بیكاتە پێغەمبەرو وەحیی بۆ بنێرێ، ناگونجێ نە فاڵچیی بێ و، نە شێتیش بێ.

www.alibapir.com


ج- بە نسبەت تۆمەتی شاعیرییەوە کە گوتوویانە، شاعیرە، پێغەمبەر وەک خوا لە سووڕەتی (یس)دا، لەبارەیەوە دەفەرموێ: ﴿وَمَا عَلَّمْنَٰهُ ٱلشِّعْرَ وَمَا يَنۢبَغِى لَهُۥٓ ۚ إِنْ هُوَ إِلَّا ذِكْرٌ وَقُرْءَانٌ مُّبِينٌ ﴿٦٩﴾﴾، واتە: نە شیعرمان فێر کردووە، نە شیعریشی بۆ دەگونجێ، پێغەمبەری خوا ﷺ ویستبیشی، شیعر بڵێ، شیعری بۆ نە گوتراوە، ﴿إِنْ هُوَ إِلَّا ذِكْرٌ وَقُرْءَانٌ مُّبِينٌ﴾ ئەوەی دەیڵێ شیعر نیە، بەڵکو یادخستنەوەی خوایەو، قورئانێکی ڕوون و ئاشکرایە، یاخود ڕوونکەرەوەیە، ئنجا لە بارەی تۆمەتی شاعیرییەوە، خوا ﷻ بەوەبەرپەرچیان دەداتەوە کە دەفەرموێ: ﴿فَتَرَبَّصُوٓا۟ إِنَّا مَعَكُم مُّتَرَبِّصُونَ ﴿٥٢﴾﴾ التوبة، چونکە ئەوان گوتوویانە: شاعیرەو چاوەڕێی ڕووداوی ڕۆژگار دەکەین، یان ڕووداوی مردن دەکەین، بەسەری بێ، خواش ﷻ بەوە بەرپەرچیان دەداتەوە دەفەرموێ: چاوەڕێبن منیش لەگەڵ ئێوەدا لە چاوەڕوانانم، کەواتە: دڵنیابن! ئەو قسەیەی دەیڵێم شیعر نیەو من شاعیر نیم، بەڵکو پێغەمبەری خوام و بە ناوی خواوە هەواڵدەدەم، ڕاستییش لە مەیدانی درێژدا تاقی دەکرێتەوە، فەرموون چاوەڕێ بن، بەڵام مەیدانی درۆیە کورتە، فەرموون بۆ داهاتووتان، تاکو دەڵێن، چاوەڕێ بن، منیش چاوەڕێم، چونکە ئەوەی پاکە بێ باکەو، ڕاستیی لە مەیدانی بە بەرەوە بوو و فراوان و دوورو درێژدا تاقی دەکرێتەوە، بەڵام مەیدانی درۆیە کورتە، جاری وایە کەسێک درۆیەک دەکات، پێنج خولەک بڕ دەکات، یان سەعاتێک، یان ڕۆژێک بڕ دەکات!

د- بە نسبەت تۆمەتی چوارەمەوەش کە گوتوویانە: (تَقَوَّلَهُ)، بە ناوی خواوە هەڵیبەستوەو گوتوویەتی، خوا بەوە بەرپەرچیان دەداتەوە: ﴿فَلْيَأْتُوا۟ بِحَدِيثٍ مِّثْلِهِۦٓ إِن كَانُوا۟ صَٰدِقِينَ ﴿٣٤﴾﴾، با ئەوانیش قسەیەکی وەک قورئان بێنن، ئەگەر ڕاست دەکەن موحەممەد بە ناوی خواوە هەڵیبەستوە، با ئەوانیش قسەیەکی وا بکەن، وەک قورئان بێ، بەڵام بەدڵنیایی ناتوانن، بۆیە با دڵنیابن کە ئەو تۆمەتەشیان بێ بنەمایەو ئەو تیرەشیان نیشانەی نەپێکا.

www.alibapir.com


## مەسەلەی دووەم:

**خستنەڕووی یازدە (١١) بیرۆکەی پووچی کافرەکان بەبێ بەرپەرچدانەوەیان، چونکە تەنیا بە خستنەڕوویان، پووچەڵییان دیارە، ئەو یازدە بیرۆکە پووچەی کافرەکانیش ئەمانەن:**

١- دروستکردنیان بەبێ هۆکار، یان بەبێ بەدیهێنەر.

٢- یان خۆیان بەدیهێنەر بن.

٣- بەدیهێنەری گەردوون بن.

٤- خەزێنەکانی خوایان لە لابن.

٥- باڵادەست بن بەسەر هەموو شتێکدا.

٦- پەیژەی چوونە ئاسمانیان لەلا بێ، هەواڵی نادیار لە ئاسمانەوە بێنن.

٧- خوا کچی هەبن، بەڵام ئەوان کوڕیان هەبن.

٨- موحەممەد ﷺ کرێیان لێ داوا بکات، کرێیەک کە بارگرانیی بێ بۆیان و نەیتوانن.

٩- ئەوان پەنهانبزانن و بینووسن لەلای خۆیان.

١٠- ئەوان لە پیلان گێڕان بن و، بیانەوێ پیلان بگێڕن.

١١- جگە لە خوا پەرستراوێکی دیکەیان هەبێ.

خوا ﷻ ئەم یازدە بیرۆکە پووچەی بیرڕوایان دەخاتەڕوو، بێ ئەوەی بەرپەرچی هیچ کامێکیان بداتەوە، چونکە هەندێک بیرۆکە کە پووچەڵەو بێ بنەمایە، هەر خستنەڕووی بیرۆکەکە بۆ خۆی، بەرپەرچ دانەوەیەتی:

خوا دەفەرموێ: ﴿أَمْ خُلِقُوا۟ مِنْ غَيْرِ شَىْءٍ أَمْ هُمُ ٱلْخَٰلِقُونَ ﴿٣٥﴾ أَمْ خَلَقُوا۟ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ ۚ بَل لَّا يُوقِنُونَ ﴿٣٦﴾ أَمْ عِندَهُمْ خَزَآئِنُ رَبِّكَ أَمْ هُمُ ٱلْمُصَۜيْطِرُونَ ﴿٣٧﴾ أَمْ لَهُمْ سُلَّمٌ يَسْتَمِعُونَ فِيهِ ۖ فَلْيَأْتِ مُسْتَمِعُهُم بِسُلْطَٰنٍ مُّبِينٍ ﴿٣٨﴾ أَمْ لَهُ ٱلْبَنَٰتُ وَلَكُمُ ٱلْبَنُونَ ﴿٣٩﴾ أَمْ تَسْـَٔلُهُمْ أَجْرًا فَهُم

www.alibapir.com



﴿مِّن مَّغْرَمٍ مُّثْقَلُونَ ﴿٤٠﴾ أَمْ عِندَهُمُ ٱلْغَيْبُ فَهُمْ يَكْتُبُونَ ﴿٤١﴾ أَمْ يُرِيدُونَ كَيْدًا ۖ فَٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ هُمُ ٱلْمَكِيدُونَ ﴿٤٢﴾ أَمْ لَهُمْ إِلَٰهٌ غَيْرُ ٱللَّهِ ۚ سُبْحَٰنَ ٱللَّهِ عَمَّا يُشْرِكُونَ ﴿٤٣﴾﴾.

## شیكردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە شازدە بڕگەدا:

١)- ﴿أَمْ خُلِقُوا۟ مِنْ غَيْرِ شَىْءٍ﴾، یان ئایا، ئەوانە بێ هیچ شتێک وەدیهێنراون و دروستكراون؟ تەعبیری: (مِنْ غَيْرِ شَيْءٍ)، زانایان سێ واتایان بۆ لێكداونەوە:

أ- (مِنْ غَيْرِ خَالِقٍ)، ئایا بە بێ بەدیهێنەر هاتوونە دی و، هێنراونە دی؟

ب- (مِنَ غَيْرِ آبَاءٍ وَأُمَّهَات)، ئایا ئەوانە بەبێ باب و دایک پەیدابوون؟

ج- (لِغَيْرِ شَيْءٍ)، ئایا ئەوانە بێ حیكمەت هێنراونە دی؟ وەک عەرەب دەڵێن: (فَعَلْتُ كَذَا وَكَذَا لِغَيْرِ شَيْءٍ)، واتە: بەبێ ئەوەی هیچ مەبەستێكم هەبێ و هیچ حیكمەتێک هەبێ لە كارەكەمدا.

بەڵام ئەوەی زیاتر دێتە زەینەوە ئەوەیە: (مِنْ غَيْرِ خَالِقٍ)، ﴿أَمْ خُلِقُوا۟ مِنْ غَيْرِ شَىْءٍ﴾، ئایا دروستكراون بەبێ بەدیهێنەر؟ چونكە دوایی لە بەرانبەرەكەیدا دەفەرموێ:

٢)- ﴿أَمْ هُمُ ٱلْخَٰلِقُونَ﴾، یان ئەوان بەدیهێنەرن؟ واتە: ئایا ئەوانە بێ بەدیهێنەر بەدیهێنراون، یان خۆیان بەدیهێنەری خۆیانن، یاخود: ئایا ئەوانە بێ بەدیهێنەر دروستكراون، یاخود خۆیان بەدیهێنەری خۆیانن و هەموو دروستكراوەكانی دیكەشن؟ ئێمە دوایی لە كورتە باسێک لە سێ سەرنجدا، زیاتر تیشک دەخەینە سەر ئەم ئایەتە موبارەكەو، ئەم ئایەتە موبارەكە بەڵگەیەكی زۆر دەمكوتكەرو ددانشكێنە بۆ بیرۆكەی ئیلحاد، وەک لە مەوسووعەی (دەروشاوەیی ئیمان و پووچەڵیی ئیلحاد، لەبەر ڕۆشنایی زگماک و عەقڵ و زانست و وەحیی)دا قسەمان لەبارەوە كردوە، هەروەها لە هەندێک لە كتێبەكانی دیكەی خۆمان دا وەک كتێبی (خواناسیی، ئایین، ئیمان) و مەوسووعەی: (ئیمان و عەقیدەی ئیسلامیی) كتێبی دووەم.

www.alibapir.com


٣)- ﴿ أَمْ خَلَقُوا۟ ٱلسَّمَـٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ ﴾، یان ئایا ئەوان ئاسمانەکان و زەوییان وەدیهێناون؟ ئەم پرسیارکردنە پرسیارکردنی نکووڵییلێکردنە، واتە: ئەوان ئاسمان و زەوییان وەدی نەهێناون و، خۆشیان دان بەوە دادێنن.

٤)- ﴿ بَل لَّا یُوقِنُونَ ﴾، بەڵکو ئەوانە دڵنیانین، زانیارییەکی دڵنیاکەریان نیە، یانی: هۆکاری ئەو جۆرە قسانەیان ئەوەیە، کە زانیارییەکی دڵنیاکەریان نیە لە بارەی خواناسییەوە، یاخود: لە بارەی زیندووکرانەوەو هاتنی ڕۆژی دواییەوە دڵنیانین، ئەگەرنا ئەو جۆرە قسانەیان نەدەکردن، ئەو تۆمەتانەیان پاڵ نەدەدانە لای پێغەمبەری خاتەم ﷺ.

٥)- ﴿ أَمْ عِندَهُمْ خَزَآئِنُ رَبِّكَ ﴾، یان ئایا ئەوان عەمبار و خەزێنەکانی پەروەردگارتیان لە لان؟ (**الْخَزَائِنُ: جَمْعُ خَزِينَةٍ، وَهِيَ الْبَيْتُ، أَوِ الصُّنْدُوقُ الَّذِي تُخَزَّنُ فِيهِ الأَقْوَاتُ**)، (**خَزَائِن**) کۆی (**خَزِينَة**)یە، کە بریتیە لەو ژوورە، یاخود صندووقەی بژیوەکانی تێدا هەڵدەگیرێن، کاتی خۆی ناو بووە بۆ ئەوە، بە کوردیی دەڵێن: عەمبار، خەزێنە، شوێنی شت تێدا کۆکردنەوە، یانی: ئایا عەمبارەکانی پەروەردگارتیان لەلان، کە هەموو شتێک بە دەستی ئەوان بێ، ئنجا بە کەیفی خۆیان بێ: کێ دەکەنە پێغەمبەرو کێ ناکەنە پێغەمبەر؟!

٦)- ﴿ أَمْ هُمُ ٱلْمُصَيْطِرُونَ ﴾، یان ئایا ئەوان زاڵ و دەستڕۆیشتوون؟ (**ٱلْمُصَيْطِرُونَ**): بە دوو شێوە خوێندراوەتەوە، بە (ص)، (**مُصَيْطِرُونَ**)و، بە (س)، (**مُسَيطرون**)، (**مُسَيْطِر**)، (**اسْمُ فَاعِلٍ مِنْ سَيْطَرَ، وصَيْطَرَ: حَفِظَ وَتَسَلَّطَ**)، (**مُصَيطر**)، ناوی بکەر لە (**سَيْطَرَ**)و (**صَيْطَرَ**)، یانی: پاراستی و خستیە ژێر ڕکێفی خۆیەوە، کە لێرەدا مەبەست ئەوەیە (**أي: غَالِبُونَ عَلَى الكَوْن، أو قَاهِرُوْن مُتَجَبِّرُوْنَ عَلَى الخَلْق**)، زاڵن بەسەر گەردووندا، یاخود خۆسەپێنن بەسەر خەڵک و وڵاتدا، کە بێگومان هیچ کامیان نین، واتە: نە بەسەر گەردووندا زاڵن و نە بەسەر خەڵکیشدا، بەڵێ دەتوانن ستەم و زوڵم بکەن، زلەزلەکانیان ستەم بکەن لە خەڵکە بێ چارەکەیان، بەڵام مانای ئەوە نیە بەسەر هەموو خەڵکی دنیادا زاڵ و خاوەن ڕکێفن.

www.alibapir.com


ئنجا دەگوازێتەوە بۆ بیرۆکەیەکی دیکەی پووچیان و دەفەرموێ:

٧)- ﴿أَمْ لَهُمْ سُلَّمٌ يَسْتَمِعُونَ فِيهِ﴾، یان ئایا ئەوانە پەیژەیەکیان هەیە، تێیدا گوێ هەڵدەخەن؟ واتە: گوێ هەڵدەخەن بۆ باسی ئاسمان و هەواڵی پەنهان، تاکو لەوێوە بزانن کە موحەممەد ﷺ ڕاست ناکات و پێغەمبەری خوا نیە، ئایا ئەوەیان هەیە؟ (السُّلَّمُ: آلَةُ الصُّعُودِ إِذْ يَكُوْنُ الصَّاعِد عَلَى السُّلَّمِ فـي السُّلَّمِ)، (سُلَّم)، ئامرازی پێ بەرزبوونەوەو سەرکەوتنە، بۆیە دەفەرموێ: ﴿يَسْتَمِعُونَ فِيهِ﴾ تێیدا گوێ هەڵدەخەن، لەبەر ئەوەی کەسێک کە بەسەر پەیژەیەکدا سەردەکەوێ لە نێو پەیژەکەدایە، ئنجا کە دەفەرموێ: (يَسْتَمِعُونَ فِيهِ)، (يَسْتَمِعُونَ فِيهِ الغَيْب مِنَ السَّمَاء)، گوێی تێدا هەڵدەخەن تاکو پەنهانی ئاسمان بزانن؟! چونکە موحەممەد ﷺ فەرموویەتی: من ڕەوانەکراوو پێغەمبەری خوام، زانیویشیانە کاروباری خوا زیاتر پەیوەندیی بە ئاسمانەوە هەیە، یانی: دەرەوەی زەوی، بەو واتایە کە لە سەرێوە دەنگ و باس و فەرمانەکانی خوای پەروەردگار دێن.

٨)- ﴿فَلْيَأْتِ مُسْتَمِعُهُم بِسُلْطَانٍ مُّبِينٍ﴾، دەجا با گوێ هەڵخەرەکەیان، بەڵگەیەکی ڕوون و ئاشکرا بێنێ (لەسەر ڕاستیی ئەو قسانەی دەیکەن) کە دەڵێن: ئەی موحەممەد ﷺ! تۆ پێغەمبەری خوا نی و، فاڵچیی، یان شاعیری، یان شێتی، یان قسەت هەڵبەستوە، با بەڵگەیەکی ڕوون و ئاشکرا بێنن، بەڵگە ڕوون و ئاشکرایەکەی موحەممەد ﷺ ئەو قورئانەیەو، موحەممەدیش خۆشی هەر بەڵگەیە لەسەر ڕاستیی خۆی، بە حەیاتی درۆتان لێ نەبیستوەو، شتێکی ناشیرینتان لێ نەبینیوە، ئێستا دوای ئەوەی تەمەنی لە چل (٤٠)ساڵیی هەڵکشاوە، مادام لە قۆناغی منداڵیی و گەنجیی و دوای گەنجیەتییدا شتی خراپی لێ نەپشکوەتەوەو، درۆتان لێ نەبیستوەو، خراپەتان لێ نەبینیوە، ئایا لە دوای چل ساڵیی؟ کە مرۆڤ بەرەو کامڵبوونی زیاتر دەچێ، هەموو مرۆڤێک، ئەوە شتێکی پێچەوانەی عەقڵ و لۆژیکە.

٩)- ﴿أَمْ لَهُ الْبَنَاتُ وَلَكُمُ الْبَنُونَ﴾، یان ئایا خوا ﷻ کچانی هەن و، ئێوە کوڕانتان هەن؟ ڕاناوی (لَهُ): هەر دیارە بۆ خوا ﷻ دەچێتەوەو بە پێی سیاق دەزانرێ، چونکە

www.alibapir.com



نەک لێرە لە شوێنی دیکەش دا گوتوویانە: خوا ﷻ کچانی هەن کە بریتین لە فریشتەکان و فریشتەکانیان بە مێ لە قەڵەمداون، وەک لە تەفسیری سوورەتی (**الزخرف**)دا، باسمان کردو لە سوورەتی (**الأنعام**)یش دا هاتوە: ﴿وَخَرَقُواْ لَهُۥ بَنِينَ وَبَنَٰتِۭ بِغَيۡرِ عِلۡمٍۚ ١٠٠﴾، واتە: کچان و کوڕانیان بۆ خوا دانان، بەبێ زانیاریی.

دەیانگوت: فریشتەکان کچانی خوان و شەیتانەکانیش کوڕانی خوان، کە دەفەرموێ: ﴿أَمۡ لَهُ ٱلۡبَنَٰتُ وَلَكُمُ ٱلۡبَنُونَ﴾ ئایا ئەو کچانی هەن و ئێوە کوڕانتان هەن؟ (**هَذَا مُبَالَغَةٌ فِي تَشْنِيعِ قَوْلِهِمْ، فَلَيْسَ المُرَادُ أَنَّهُمْ لَوْ نَسَبُوا الذُّكُورَ إِلَيْهِ، لَكَانَ قَوْلُهُمْ مَقْبُولاً**)، ئەمە زیاتر بۆ ناشیرین و ناقۆلا پێشاندانی قسەکەیانە، ئەگەرنا مەبەست ئەوە نیە، ئەگەر کوڕیان بۆ خوا دانابایە، قسەکەیان پەسندو چاک دەبوو! بەڵکو مەبەست ئەوەیە کە تەنانەت ئەوانە بە پێوەری خۆشیان خوای پەروەردگاریان، وەک خۆشیان حیساب نەکردوە، خۆیان ئەگەر موژدەی کچیان پێ درابایە ناڕەحەت دەبوون و پێیان ناخۆش بوو، کچیان ببێ، کەچی ئەوەی بۆ خۆیانیان پێناخۆشە، پاڵیدەدەنە لای خواو دەڵێن: خوا کچی هەن کە فریشتەکانن، لێرەدا مەبەست دەرخستنی پووچەڵیی بیرکردنەوەی ئەوانە کە هەر ئەو عەقڵە پووچەیانە، ئەو تۆمەتانەشی لێوە هەڵدەقوڵن و بۆ موحەممەدیان ﷺ دەکەن، چونکە وەک پێشتر گوتمان: تەوەرەی سەرەکیی ئەم سوورەتە موبارەکە، باسی پێغەمبەرایەتیی موحەممەدو ڕاستیی وی و ڕاستیی قورئانە، کە فەرمایشت و پەیامی خوایە.

**١٠)**- ﴿أَمۡ تَسۡـَٔلُهُمۡ أَجۡرٗا﴾، یان ئایا (ئەی موحەممەد ﷺ! کرێیان لێ داوا دەکەی، پاداشت و بەرانبەرێکیان لێ داوا دەکەی؟ لێرەدا مەبەست پێی گاڵتە پێکردنەو، بە توانجەوە قسە بەرانبەر کردنیانە، چونکە پێغەمبەر کرێی لێ داوانەکردوون و، خوای پەنهانزان زانیویەتی کە موحەممەد ﷺ کرێیان لێ داوا ناکات، خوای زاناو تواناش پێی فەرمووە: ﴿قُلۡ مَآ أَسۡـَٔلُكُمۡ عَلَيۡهِ مِنۡ أَجۡرٖ وَمَآ أَنَا۠ مِنَ ٱلۡمُتَكَلِّفِينَ ٨٦﴾ص، بڵێ من کرێتان لێ داوا ناکەم و، من لە ئەرکدانەرانیش نیم (لەسەر شانی خەڵک) کە باری شانی خەڵک گران بکەم، یاخود لە لاف لێدەران نیم، کە شتێک بڵێم وانەبێ.

www.alibapir.com


١١)- ﴿فَهُم مِّن مَّغۡرَمٖ مُّثۡقَلُونَ﴾، ئنجا ئەوان بەهۆی ئەو تاوان و باجەوە، کە لێیان وەردەگیرێ، بارگران کراون. (**الْمَغْرَمُ وَالغُرْمُ وَالغَرَامَةُ: وَهُوَ مَا يُفْرَضُ عَلَى أَحَدٍ مِنْ عِوَضٍ يَدْفَعُهُ ظُلْماً**)، (**الْمَغْرَمُ وَالغُرْمُ وَالغَرَامَةُ**)، ئەوەیە قەرەبوویەک لەسەر کەسێک فەرز بکرێ، بەڵام بە ستەم لێی وەربگیرێ و هەق نەبێ، (**وَالْمُثْقَلُ: أَصْلُهُ الْمُحَمَّلُ بِشَيْءٍ ثَقِيلٍ، وَهُوَ هُنَا مُسْتَعَارٌ لِمَنْ يُطَالَبُ بِمَا يَعْسُرُ عَلَيْهِ أَدَاؤُهُ**)، (**مُثْقَل**): لە ئەصڵدا، کەسێک کۆڵێکی قورسی خرابێتە سەرو، لێرەدا خوازراوەتەوە بۆ کەسێک داوای شتێکی لێ بکرێ، پێی قورس بێ، پێی هەڵنەستێ لە توانایدا نەبێ، ﴿فَهُم مِّن مَّغۡرَمٖ مُّثۡقَلُونَ﴾، لە ئەنجامی پاداشت و کرێیەک کە لێیان داوا دەکەی، ئەوان بە هۆی ئەو باج و تاوانەوە کە لێیان وەردەگیرێ، باری شانیان گران کرابێ و بۆیان هەڵنەستێ، بۆیە بڕوا ناهێنن؟ کە واش نیە، بۆیە ئەم پرسیارکردنە پرسیارکردنی نکووڵیلێکەرانەیە.

١٢)- ﴿أَمۡ عِندَهُمُ ٱلۡغَيۡبُ فَهُمۡ يَكۡتُبُونَ﴾، یان ئایا ئەوان نادیاریان لەلایەو دەینووسن، لێرەدا وشەی (**الْغَيْبُ**)، (أل)ی ناساندنی لەسەرەو بۆ تێکڕا (جنس)یە: ئایا سەرجەم نادیارو پەنهان لە وانەو دەینووسن، کە بێگومان ئەوەشیان وانیەو پەنهان لەلای وان نیە، تاکو بزانن: ئایا موحەممەد ﷺ پێغەمبەری خوایە، یان نا، قورئان فەرمایشتی خوایە، یان نا؟ ئەدی چۆن لە خۆڕا ڕەتی دەکەنەوە؟ (**الْغَيْبُ: هُنَا مَصْدَرٌ بِمَعْنَى الْفَاعِلِ، أَيْ: غَائِبٌ**)، ﴿أَمۡ عِندَهُمُ ٱلۡغَيۡبُ﴾، یانی: (غیب) لێرەدا چاوگەو بە مانای بکەرە، پەنهانبوو.

١٣)- ﴿أَمۡ يُرِيدُونَ كَيۡدٗا﴾، یاخود ئایا فێڵیان مەبەستە، پیلان گێڕییان مەبەستە؟

(**انْتِقَالٌ مِنْ نَقْضِ أَقْوَالِهِمْ إِلَى إِبْطَالِ نَوَايَاهُمْ**) ئەمە، گواستنەوەیە لە هەڵوەشاندنەوەی قسەکانیانەوە بۆ هەڵوەشاندنەوەی نیاز و مەبەستەکانیان، کە بەدڵنیایی ئەوان مەبەستیان لەو قسانە هەموویان، بیانوو هێنانەوەو پاساو هێنانەوە بووەو، ترس خستنە بەردەم خۆیان بووە بۆ ئیمان هێنان، یانی: مەبەستیان پیلان گێڕیی و فێڵکردن بووە، بۆیە دەفەرموێ: ئایا پیلان و فێڵیان دەوێ و، دەیانەوێ پیلان و فێڵ لە دژی تۆ بکەن؟

١٤)- ﴿ فَٱلَّذِينَ كَفَرُواْ هُمُ ٱلۡمَكِيدُونَ ﴾، بە دڵنیاییی ئەوانەی بێبڕوان، ئەوان فێڵ لێکراون و ئەوان نەخشە لە دژ داندراون، (**الكَيْد: إِرَادَةُ مَضَرَّةِ الغَيْرِ خُفْيَةً**)، (**كَيْد**): بریتیە لەوەی بە پەنهانیی بویستریْ زیان بە کەسێک بگەیەنریْ، (**مَكِيدُونَ**)یش، یانی: (**المَمْكُورُ بِهِمْ**)، فێڵلێکراو، ئەوانەی فێڵیان لە دژ دەکریْ و، نەخشەیان لە دژ دادەنریْ.

١٥)- ﴿ أَمۡ لَهُمۡ إِلَٰهٌ غَيۡرُ ٱللَّهِ ﴾، (لە کۆتاییدا خوا بسم الله الرحمن الرحيم دەفەرمویْ:) یان ئایا ئەوانە جگە لە خوا پەرستراوێکی دیکەیان هەیە؟ ئەمە خراپترین بیرۆکەیان بوو، کە پێیان وابوو دەبیْ جگە لە خوا پەرستراوی دیکە بپەرستن.

١٦)- ﴿ سُبۡحَٰنَ ٱللَّهِ عَمَّا يُشۡرِكُونَ ﴾، پاکیی بۆ خوا لەوەی دەیکەن بە هاوبەش (ی خوا بسم الله الرحمن الرحيم)، چونکە هەرچی بیکەن بە هاوبەشی خوا هەر دروسکراوی خوایە، خوا بسم الله الرحمن الرحيم تەنیا خۆی بەدیهێنەرەو، تەنیا خۆی پەروەردگارەو، تەنیا خۆی خاوەنە، کەواتە: هەموو ئەو شتانەی دیکەی دەکرێنە هاوبەشی خوا، بێگومان هەموویان دروستکراوی خوان، ئنجا ئەگەر دروستکراوو خاوەندار بهێنرێتە، ڕیزی بەدیهێنەرو پەروەردگار، بەمسۆگەریی ئەوە تاوانێکی زۆر گەورەیەو، پاکیی بۆ خوا لەوە.

لە تۆڕە کۆمەڵایەتییەکان لەگەڵتانین
Stay in touch on social media
نحن معكم عبر مواقع التواصل الاجتماعي
ڕاکەیاندنی مەکتەبی مامۆستا عەلی باپیر
AliBapir/عەلی باپیر
archive.org/details/@alibapir
AliBapir/عەلی باپیر
AliBapir
کەناڵی ڕاکەیاندنی مەکتەبی مامۆستا عەلی باپیر
www.alibapir.net
کوردی - عربي - English
ڕاکەیاندنی مەکتەبی مامۆستا عەلی باپیر

www.alibapir.com


## کورتە باسێک لە سێ سەرنج دا

**سەرنجی یەکەم:** خوا ﷻ بە پێچەوانەی چوار تۆمەتەکەوە کە بۆ پێغەمبەری خاتەم کراون، لە ئایەتەکانی: (٢٩ - ٣٤)داو، وەڵامی داونەوە، وەڵامی ئەو یازدە بیرۆکە پووچەڵەی هاوبەش بۆ خوا دانەرەکانی نەداوەتەوە، کە لە نۆ ئایەتی دوای ئەواندا هاتوون، ئایەتەکانی: (٣٥ - ٤٣).

حیکمەتی ئەو جیاوازییەش ئەوەیە، کە خوا ﷻ کاتێک ئەو چوار تۆمەت و گومانەی بێبڕوایەکان لە بارەی پێغەمبەرەوە ﷺ باس دەکات:

١- کە تۆمەتباریان کردوە بەوەی کاهین (فاڵچیی)ە.

٢- گوایە شێتە.

٣- گوایە شاعیرە.

٤- گوایە هەڵبەستەری قورئانە بە ناوی خواوە.

وەک پێشتر باسمانکرد خوا ﷻ بەرپەرچی هەر کام لەو چوار تۆمەتەی داوەتەوە، چونکە خەڵکێکی سادەو فامکاڵ هەیە، ڕەنگە هەندێک لەو تۆمەتانەی بچێتە عەقڵەوەو دزە بکاتە نێو عەقڵ و هۆشی کرچ و کاڵی، بابزانین چۆن؟

١- پێغەمبەری خاتەم ﷺ کە بە ناوی خواوە هەواڵیداوە، هەم لە بارەی گەلانی ڕابردووەوە: چۆن فەوتاون و چییان بەسەر هاتوە؟ دەربارەی گەردوون و ژیان، چۆن دەستیان پێکردوە؟ لە داهاتوودا ئاخیر زەمان چۆن دێ و، ڕۆژی دوایی چۆن دێ و، سزاو پاداشت چۆنەو، سەرەنجامی ئەهلی ئیمان چۆن دەبێ و، سەرەنجامی نەیارانی ئیمانداران چۆن دەبێ؟ کە سەرەنجامێکی شوومیان دەبێ لە دنیاو دوارۆژدا، بەڵێ

www.alibapir.com


پێغەمبەری خوا ﷺ کە لەو بارەوە هەواڵی داوە، ئەوە بە ڕواڵەت دەشوبهێتە ئەوەوە کە لەنێو کاهینەکاندا باو بووەو، ئەوانیش لە بارەی ڕابردووەوە قسەیان کردوە، کە بەدڵنیایی ئەوان بە گومان قسەیان کردوە، بەڵام پێغەمبەری خاتەم ﷺ لەبەر ڕۆشنایی وەحیی خوادا، دواوە، بەڵام گرنگ ئەوەیە جۆرێک لە وێکچوون هەیە.

٢- هەروەها کە گوتوویانە: شێتە، لەبەر ئەوەی پێغەمبەری خوا ﷺ شتێکی هێناوە، پێچەوانەی عورف و عادەت و باوو کلتووری کۆمەڵگاکەی خۆی بووە، بۆیە سەریان سوڕماوەو گوتوویانە: ﴿أَجَعَلَ ٱلْـَٔالِهَةَ إِلَـٰهًا وَٰحِدًا ۖ إِنَّ هَـٰذَا لَشَىْءٌ عُجَابٌ ۝٥﴾ ص، واتە: ئایا هەموو پەرستکراوەکانی کردنەوە بە یەک، بە ڕاستیی ئەوە شتێکی زۆر سەیرە، هەروەها گوتوویانە: ﴿أَءِذَا مِتْنَا وَكُنَّا تُرَابًا ۖ ذَٰلِكَ رَجْعٌۢ بَعِيدٌ ۝٣﴾ ق، واتە: ئایا کە مردین و بووینەوە بە خاک و خۆڵ، ئائەوە گەڕانەوەیەکی زۆر دوورە، ئنجا گوتوویانە: شتی سەرسوڕهێنەرو دوور لە عەقڵ، بەس مرۆڤێک دەیکات عەقڵ و هۆشی تێکچووبێ، بۆیە لە سۆنگەی ئەوەشەوە خەڵکێکی فامکاڵ جۆرێک لە ئیشکالی دروستکردوە.

٣- هەروەها کە قوڕئان هەندێک کێش (وزن) یان سەروا (قافیة) لە بەشێک لە ئایەتەکانی دا هەن و، شیعر نیە، بەڵام هەندێک لە ڕەگەزەکانی شیعری تێدا هەن، بۆیە ئەوەش دیسان جۆرێک لە شوبهەو ئیشکالی بۆ دروست کردوون.

٤- هەروەها کە پێغەمبەری خاتەم ﷺ بە ناوی خوای پەروەردگارەوە قسەی کردوە، گوتوویانە: بە ناوی خواوە قسەی هەڵبەستوە! بۆیە ئەو چوار تۆمەتە کە بۆ پێغەمبەر کراون، پێویستییان بەوەڵام بووەو، خواش بسم الله الرحمن الرحيم هەر کامیانی داوەتەوەو پووچەڵی کردۆتەوە.

بەڵام ئەو یازدە بیرۆکەیەی لە نۆ ئایەتەکانی: (٣٥ - ٤٣)دا هەن، کە پێشتر باسمانکردن، هەموویان بیرۆکەی پووچەڵن و، بەس خستنەڕووی خۆیان بەسە بۆ دەرخستنی پووچەڵییان و، پێویستییان بە وەڵامدانەوە ناکات:

www.alibapir.com


١- ئەوە کە بەبێ بەدیهێنەر دروست بووبن، بیرۆکەیەکی زۆر پووچە، چۆن شتێک دروستکرابێ، دروستکەری نیە و، پەیداکرابێ، پەیداکەری نیە؟ ئەوە پێچەوانەی یاسایەکی عەقڵیی زۆر بەهێزە کە بریتیە لە یاسای هۆکاریی **(قانون السببية)** کە هەموو پەیداکراوێک دەبێ پەیداکەرێکی هەبێ **(لِكُلِّ حَادِثٍ مُحدث، لِكُلِّ مَخْلُوق خَالِق)**.

٢- هەروەها ئەوە کە خۆیان بەدیهێنەری خۆیان بن، ئەوەش دیسان بیرۆکەیەکی زۆر پووچە، چونکە شتێک نەبێ، چۆن خۆی پەیدا دەکات؟

٣- دیسان ئەوە کە مرۆڤەکان ئاسمانەکان و زەوییان هێنابنە دی، یانی: گەردوون بەو پان و پۆڕو زەبەلاحییە، ئەوەش هەموو کەس دەزانێ کە بۆچوونێکی پووچە.

٤- ئنجا ئەوە کە عەمبارو خەزێنەکانی خوای پەروەردگار لەبەر دەستی ئەواندابن، ئەوەش هەموو کەس دەزانێ بیرۆکەیەکی بۆشەو وانیە.

٥- ئەوەش کە ئەوان زاڵبن بەسەر کەون و کائیناتداو، هەموو شتێک لە ژێر ڕکێف و دەستەڵاتی ئەواندا بێ، دیسان دیارە کە بیرۆکەیەکی پووچ و بێ بناغەیە.

٦- ئەوە کە پەیژەیەکیان هەبێ و پێیدا سەرکەون بۆ ئاسمان و، گوێ لە هەواڵی نادیار بگرن، لە هەواڵی ئاسمان قسەو باسی فریشتەکان، دیسان ئەوەش دیارە جگە لە خەیاڵپڵاو هیچی دیکە.

٧- ئەوە کە خوا کچی هەبن و ئەوان کوڕیان هەبن، کوا بەڵگەکەی؟ بێگومان بیرۆکەیەکی پووچەو، چۆن دەبێ شتی خراپتر کە بە لای ئەوانەوە خراپترە، نەک لە واقیع و **(نفس الأمر)**دا، هی خوا بێ؟ چونکە هەم نێرو هەم مێ، هەردووکیان خوا خوڵقاندوونی و هەر کامێکیان ئەرکی خۆی هەیەو، کۆمەڵێک تایبەتمەندیی خۆیانیان هەن و، نە نێر بوون نیشانەی چاکییەو، نە مێ بوون نیشانەی خراپییە، بەڵکو نێرو مێ، بە کردەوەی چاکی خۆیان چاک دەبن و، بە کردەوەی خراپی خۆیان خراپ دەبن، بەڵام ئەوە کە خوا کچی هەبن و ئەوان کوڕیان هەبن، وێڕای ئەوە کە ئەوە دانانی بەشی خراپترە، بە لای ئەوانەوە، بەپێی فەرهەنگی ئەوان بۆ

www.alibapir.com



خواو، خوای پەروەردگاریش کە ڕەگەزی نەبێ، زاووزێشی نیەو، خوا ﷻ لەسەرووی دروستکراوەکانی خۆیەتی و، لە سەرووی ئەوەوەیە کە وەچەی هەبێ و، لە کەس بووبێ و یان کەسی لێ بووبێ.

٨- هەروەها ئەوە کە پێغەمبەر داوای کرێیان لێ بکات و، ئەوان لە ئەنجامی داوالێکرانی ئەو کرێیەدا، باری شانیان گران بووبێ، بۆیە وەڵامی پێغەمبەر نەدەنەوە! ئەوەشیان ئەصڵ و ئەساسی نیەو، ئاشکرایە کە پێغەمبەر ﷺ هەرگیز هیچ چاوەڕوانییەکی لێیان نەبووە.

٩- دیسان ئەوە کە ئەوان پەنهانبزانن و بینووسن، دیسان جگە لە خەیاڵ پشتئەستوور نیە بەهیچ بەڵگەیەک و شتێکی پووچە.

١٠- ئەوەش کە ئەوان بە تەمابن، پیلان لە دژی پێغەمبەر بگێڕن و پیلانەکەیان سەربگرێ! ئاشکرایە: مادام خوا سەرپەرشتیاری پێغەمبەر بێ و هاوکارو پشتیوانی بێ، موستەحیلە پیلان و فێڵی ئەوان سەربگرێ، لە دژی پێغەمبەر، بەڵکو پیلان و فێڵەکەیان بەسەر خۆیاندا دەشکێتەوە.

١١- یازدەیەم و کۆتایی: ئەوە کە ئەوان پەرستراوێکیان هەبێ جگە لە خوا، ئاخر بێجگە لە خوا، بەڵگەتان چییە، کە شتێکی دیکە بپەرسترێ، چ جندێک و مرۆڤێک بێ، چ لە خوار مرۆڤەوە بێ، ئەستێرەو خڕۆکەیەک، مانگ و خۆر، ئاژەڵ، دارودرەخت ... هتد، بەڵگەتان چییە؟!

بۆیە ئەم یازدە بیرۆکەیە خوا ﷻ هیچیانی بەپێویست نەزانیوە کە لەم سیاقەدا، پووچەڵییان دەربخات، بەڵام بێگومان لەجێی دیکەدا، لە قورئاندا خوا ﷻ کەم و زۆر بەرپەرچی ئەو بیرۆکانەی داوەتەوە.

www.alibapir.com


**سەرنجی دووەم:** لە دوو ئایەتەکەی: (٣٥ و ٣٦)دا، بەهێزترین بەڵگەی هەڵوەشاندنەوەی بیرۆکەی ئیلحاد هەیە، چونکە بۆ دروستکرانی مرۆڤ و، بۆ دروستکرانی ئەم گەردوونە، تەنیا سێ ئەگەری عەقڵیی، کە مەرج نیە هەر سێکیان مەعقووڵ بن، بەڵام سێ ئەگەر (إحتمال) هەن:

**١-** مرۆڤ و گەردوون و ژیان، کەس نەیهێنابنە دی و، گەردوون هەر بووبێ و لە خۆوە بووبێ!

**٢-** مرۆڤەکان خۆیان و گەردوونیان هێنابنە دی!

**٣-** خوا ﷻ بەدیهێنەرو پەیداکەری مرۆڤ و ژیان و گەردوون بێ بەسەرو خواریەوە.

لەم دوو ئایەتە موبارەکەدا هەرسێک ئەگەرەکان خراونەڕوو:

**یەکەم:** کە خوا دەفەرموێ: ﴿أَمۡ خُلِقُواْ مِنۡ غَيۡرِ شَيۡءٍ﴾، ئەمە ئەگەری یەکەمە، ئایا دروستکراون بەبێ هیچ بەدیهێنەرێک؟

**دووەم:** ﴿أَمۡ هُمُ ٱلۡخَٰلِقُونَ﴾، ئەمیش ئەگەری دووەم: یاخود خۆیان بەدیهێنەرن؟ ئەم دوو ئەگەرە کە خوا ﷻ دەیانهێنێ، هەرکات پووچەڵ بوونەوە، دەمێنێتەوە ئەگەری سێیەم کە ئەم گەردوونە کە پەیداکراوە، بەبێ بەدیهێنەر پەیدا نەکراوەو، خۆشیان مرۆڤەکان بەدیهێنەر نین، کەواتە مایەوە ئەگەریی:

**سێیەم:** خوا ﷻ بەدیهێنەرە.

ئنجا لە کتێبەکانی زانستیی عەقیدە (**علم الكلام**)دا، دوو ئەگەری دیکەش باسکراون لە ئەگەرە پووچەکان:

**یەک:** پێی دەگوترێ: (**الدّور**)، ئەوەی کە دوو شت بوونی هەر کامێکیان لەسەر بوونی ئەوەی دیکە بوەستێ، بۆ وێنە: (**أ**)، بەبێ (**ب**) نەیەتە دی و (**ب**)ش بەبێ (**أ**) نەیەتە دی، کە ئەمەش مەحاڵە، بۆ وێنە: مرۆڤ گەردوونی دروستکردبێ و، گەردوونیش مرۆڤی دروستکردبێ، بوونی هەر کامێک لەو دووانە، لەسەر ئەوەی دیکە وەستابێ،

www.alibapir.com


ئەمە شتێکی مەحاڵە، بڵێی (أ) پەیدانابێ، تاکو (ب) پەیدانەبێ و، (ب)یش پەیدانابێ، تاکو (أ) پەیدانەبێ، مانای وایە هیچیان پەیدانابن، چونکە ئەوە مەحاڵێکی عەقڵییە.

**دوو:** ئەوی دیکە بریتیە لە زنجیرەی بێ کۆتایی **(التسلسل اللاَّنِهَائِي)**، زنجیرەیەک بڕوا بەرەو ڕابردوو، بەبێ ئەوەی بوەستێ، ئەمەش مەحاڵێکی عەقڵییە، بۆیە ئەزەلیی بوونی گەردوون، مەحاڵێکی عەقڵییە، هەڵبەتە کاتی خۆی هەندێک لە مولحیدەکان، پەنایان دەبردە بەر بێ سەرەتایی و هەر بوویی مادده، یان گەردوون، لەگەڵ ئەوەشدا کە مەحاڵی عەقڵییە، بەڵام دوای ئەوەی زانستی گەردووناسیی و فیزیا بەرەو پێشتر چوو، ئێستا بە خواناس و خوانەناسەوە، بەوانەی بڕوایان بەبوونی خوا هەیەو، بەوانەش کە بڕوایان پێی نیە، هەموویان لەسەر ئەوە یەکدەنگن واتە: زانایانی گەردووناس و فیزیازان، کە ئەم گەردوونە سەرەتایەکی هەیەو، ئەوەی پێی دەگوترێ: تۆوی گەردوونیی **(البذرة الكونية)** یان هێلکەی گەردوونیی **(البيضة الكونية)** یان یەکەی گەردوونیی، **(الوحدة الكونية)**، کە بە ئینگلیزیی (سینگۆلارتی (SUNGLARTY) پێ دەڵێن، کە گوایە تەنێکی یەکجار یەکجار بچووک بووە کە بە هیچ پێوەرێک ناگونجێ بپێورێ، لەبەر بچووکییان، زۆر لە ئەلیکترۆنیش بچووکترە، ئەلیکترۆن کە بە دەوری نێوکی گەردیلەدا دەخولێتەوە، نێوکی گەردیلەش لە پرۆتۆن و نیترۆن پێک دێ، (سینگۆلارتی) زۆر زۆر لەوەش بچووکتر بووە، بەڵام خاوەنی ئەوپەڕی گەرمیی بووەو، لە ئەنجامدا تەقیوەتەوەو، ئەوەی پێی دەگوترێ: (بیگ بانگ) (BIG BANG) تەقینەوەی مەزن **(الإنفجار العظيم)**، لەوە پەیدابووە، سەرەنجام ئەو گەردوونە لەوەوە هاتوە، واتە: لە نەبوونەوە هاتوە، چونکە ئەو تەنۆلکەیەی ئەوان دەیڵێن، دیارە هەر نەبوونە، بەڵام لەبەر ئەوەی ئەگەر بڵێن: هیچ شتێک نەبووەو گەردوون دروست بووە، دیارە دەبێ بەدیهێنەرێکی بووبێ و، ئەوەش یەکسەر ناچاریان دەکات، بەڵام کە دان بەوەش دا ناهێنن، هەموویان دان بەوەدا دێنن کە ئەم گەردوونە سەرەتایەکی هەبووەو، کاتێک بووە گەردوون بوونی نەبووە، ناوی لە کوولەکەی تەڕدا نەبووە.

خوا ﷽ ئەو دوو ئەگەرەی دیکەی لێرەدا باس نەکردوون:

**أ-** ئەگەری پەککەوتنی دوو شتان هەر کام لەسەر بوونی ئەوەی دیکە.

www.alibapir.com



**ب-** زنجیرەی بێ کۆتایی، خوای کاربەجێ، ئەو دووەی باس نەکردوون، چونکە ڕێک دژو پێچەوانەی عەقڵ و لۆژیکن، بەڵکو تەنیا ئەو دووەی باسکردوون، کە مرۆڤەکان و گەردوون، بەبێ بەدیهێنەر دروست بووبن، یان خۆیان بەدیهێنەربن؟ بێگومان هیچ شتێکی پەیداکراو بەبێ پەیداکەر نابێ و، ناشگونجێ مرۆڤ خۆی خۆی پەیدا بکات، یان مرۆڤ گەردوون پەیدابکات، وەک دوایی دەفەرموێ: ﴿ أَمْ خَلَقُوا۟ ٱلسَّمَـٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ ۚ بَل لَّا يُوقِنُونَ ﴿٣٦﴾ ﴾، واتە: یان ئایا ئاسمانەکان و زەوییان هێناونە دی؟ بەڵکو زانیاریی جێی دڵنیاییان نیە، یانی: چاک خوا ناناسن، بۆیە ئەو جۆرە بیرۆکە پووچەڵانەیان دەکەونە زەین و مێشکەوە.

**سەرنجی سێیەم:** زانایان لە بارەی چۆنیەتیی پەیوەست بوونی ئەو ئایەتانەوە، زۆریان قسە کردوون.

من پێم وایە باشترین ڕا لەو بارەوە، ئەوەیە کە بڵێین: خوا ﷻ ویستوویەتی پووچەڵیی بیروڕایەکانیان بخاتەڕوو، بۆیەش بەرپەرچی نەداونەوە، تاکو بزانرێ کوفر بەچی گەیاندوون، وەک هەر لەسەرەتاوە گوتوومانە: تەوەری سەرەکیی سووڕەتی (**الطور**)، بریتیە - بە تایبەتی ئەم ئایەتانەی دوایی لە ئایەتی (٢٩)وە، تاکو کۆتایی - باسی پێغەمبەرایەتیی موحەممەد ﷺ، ئنجا دوای ئەوەی لە شەش ئایەتی پێشوودا ئایەتەکانی: (٢٩ - ٣٤)، چوار تۆمەتی بێبڕوایانی باسکرد، کە بۆ پێغەمبەر دەکرێن و خوای باڵادەست پووچەڵی کردنەوە، ئنجا باسی ئەو یازدە بیرۆکەیەی بێبڕوایەکان دەکات، واتە: ئەوانەی پێغەمبەری خاتەم ﷺ تۆمەتبار دەکەن، بە جادووگەریی و، بە فاڵچییەتیی و، بە شاعیریی و، بە شێتیی و، بە قسە هەڵبەستن، هەروەها لە شوێنی دیکەدا تۆمەتی جادووگەریی هاتوە، خاوەنی ئەو جۆرە بیرۆکانەن، ئنجا کەسانێ خاوەنی ئەو جۆرە بیرە پووچەڵانە بن، دیارە قەدری زێڕ لەلای زێڕنگەرە، ئەو کەسەش هەڵگری ئەو یازدە بیرۆکە پووچانە بێ، بە تەئکید ئەوەشی لێ چاوەڕێ دەکرێ، کە پێغەمبەری خاتەم ﷺ بە شێتیی تۆمەتبار بکات، کە لە لووتکەی عەقڵمەندیی و تێگەیشتن دابووەو، بە شاعیریی

تۆمەتباری بکەن، کە شیعری هەر نەزانیوەو، بە کاهینیی تۆمەتباری بکات، کە پێغەمبەری خوا هیچ شتێکی نەفەرمووە، نەبووبێ و، هەمووی لەبەر ڕۆشنایی وەحییدا فەرمووەو، بەقسە هەڵبەستن بە ناوی خواوە تۆمەتباری بکات، کە پێغەمبەر بسم الله الرحمن الرحيم درۆی لەگەڵ خەڵکیشدا نەکردوە، پێش ئەوەی ببێتە پێغەمبەریش، پێش تەمەنی چل (٤٠)ساڵیش، بە ئیعتیرافی کافرەکانی مەککە، کە ناویان لێنا بوو: **(الصَّادق)** ڕاستگۆو ناویان لێنا بوو: **(الأمِيْن)** ئەمیندارو دەستپاک، ئەدی لە دوای تەمەنی چل ساڵی و، دوای ئەوەی لاجاینگی سپیی بوون، وەک خۆیان گوتوویانە، چۆن بە ناوی خواوە بسم الله الرحمن الرحيم شتی ناڕاست دەڵێ؟ بۆیە من پێم وایە: چۆنیەتیی پەیوەستکردنی ئەم ئایەتانە، بە شەش ئایەتی پێشووەوە، ئەوەیە کە خوا بسم الله الرحمن الرحيم ویستوویەتی پووچەڵیی بیرکردنەوەی ئەوان و بیرو زەینیان و بخاتەڕوو، کە ئەوانە خاوەنی ئەو جۆرە بیرۆکانەن، بۆیەش خوا بسم الله الرحمن الرحيم بەرپەرچی ئەو بیرۆکە پووچەڵانەی نەداوەتەوە.

لە تۆڕە کۆمەڵایەتییەکان لەگەڵتانین
Stay in touch on social media
نحن معكم عبر مواقع التواصل الاجتماعي
ڕاگەیاندنی مەکتەبی مامۆستا عەلی باپیر
AliBapir/عەلی باپیر
archive.org/details/@alibapir
AliBapir/عەلی باپیر
AliBapir
Google Play
App Store
www.alibapir.net
کوردی - عربي - English
کەناڵی
ڕاگەیاندنی مەکتەبی مامۆستا عەلی باپیر
ڕاگەیاندنی مەکتەبی مامۆستا عەلی باپیر

www.alibapir.com



## مەسەلەی سێیەم:

**دەرخستنی عینادیی و، کەللەڕەقیی کافرەکان، کە ئەگەر پارچەیەکی ئاسمانیشیان بەسەردا بکەوێ دەڵێن: ئەوە هەوری کەڵەکە بوویە! بۆیە خوا فەرمانی بە پێغەمبەرەکەی کردوە کە لێیان بگەڕێ و وازیان لێ بێنێ، هەتا تووشی ڕۆژی خۆیان دەبن، کە تێیدا دەمرن، یان لە هۆش خۆیان دەچن و، فێڵ و پیلانیشیان دادیان نادات، لەو ڕۆژەداو پێش ئەوەش سزای دیکەش هەر هەیە بۆیان و، فەرمانکردنی خوا بە پێغەمبەر بەخۆڕاگریی و، سەرگەرمبوونی بە پاکگرتنی خواو، ستاییشکردنی و پەرستنی، هەم لە ڕۆژێدا، هەم لە شەوێدا، هەم لە بەرەبەیانانـدا:**

خوا دەفەرمـوێ: ﴿وَإِن يَرَوْاْ كِسْفًا مِّنَ ٱلسَّمَآءِ سَاقِطًا يَقُولُواْ سَحَابٌ مَّرْكُومٌ ﴿٤٤﴾ فَذَرْهُمْ حَتَّىٰ يُلَـٰقُواْ يَوْمَهُمُ ٱلَّذِى فِيهِ يُصْعَقُونَ ﴿٤٥﴾ يَوْمَ لَا يُغْنِى عَنْهُمْ كَيْدُهُمْ شَيْـًٔا وَلَا هُمْ يُنصَرُونَ ﴿٤٦﴾ وَإِنَّ لِلَّذِينَ ظَلَمُواْ عَذَابًا دُونَ ذَٰلِكَ وَلَـٰكِنَّ أَكْثَرَهُمْ لَا يَعْلَمُونَ ﴿٤٧﴾ وَٱصْبِرْ لِحُكْمِ رَبِّكَ فَإِنَّكَ بِأَعْيُنِنَا ۖ وَسَبِّحْ بِحَمْدِ رَبِّكَ حِينَ تَقُومُ ﴿٤٨﴾ وَمِنَ ٱلَّيْلِ فَسَبِّحْهُ وَإِدْبَـٰرَ ٱلنُّجُومِ ﴿٤٩﴾﴾.

## شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە دوازدە بڕگەدا:

١)- ﴿وَإِن يَرَوْاْ كِسْفًا مِّنَ ٱلسَّمَآءِ سَاقِطًا يَقُولُواْ سَحَابٌ مَّرْكُومٌ﴾، ئەگەر پارچەیەک لە ئاسمان ببینن، بکەوێتە خوار، بە کەوتوویی و بە بەربووەوەیی دەڵێن: هەورێکی کەڵەکە بوویە، (**سَاقِط**)، یانی: بەربووەوە، کەوتووە خوار، (**الكِسْفُ: الْقِطْعَةُ، وَيُقَالُ: كِسْفَة**)، (**كِسْف وَكَسْفَة**)، بە مانای (**قِطْعَة**)ن، پارچەیەک لە ئاسمان، (**مِنْ**)ی، (**مِنَ السَّمَاء**)، بۆ بەشێک، یانی: ئەگەر بەشێک لە بەشەکانی ئاسمان ببینن، بەسەریاندا بکەوێتە خوارو بەربێتەوە، دەڵێن: ئەوە هەورێکی کەڵەکەبوویە، (**سَحَابٌ**)، کە (**مُزْن**)یشی پێ دەگوترێ و، لە قورئاندا جاری وایە وشەی (**سَمَاء**)یش بۆ هەور بەکارهاتوە، (**مَرْكُومٌ أي: مَجْمُوعٌ بَعْضُه عَلَى بَعْض**)، واتە: هەندێکی لەسەر هەندێکی کۆبۆتەوەو کەڵەکە بووە، وەک

www.alibapir.com



دەفەرمویێ: ﴿ثُمَّ يَجْعَلُهُۥ رُكَامًا فَتَرَى ٱلْوَدْقَ يَخْرُجُ مِنْ خِلَـٰلِهِۦ ﴿٤٣﴾﴾ النور، دوایی هەورەکە، پاش ئەوەی پاڵی پێوەدەنێ، کەڵەکەی دەکات لەسەر یەک و ئاو دەبینی، لەمیانی ئەو هەورە دێتە خوارێ.

لێرەدا وەک توێژەرەوانی قورئان گوتوویانە، ڕایەکەشیان زۆر ڕاست و بەجێیە، -بە بۆچوونی من- خوای موتەعال بۆیە لێرەدا ئەمە باس دەکات، یانی: ئەو بێبڕوایانەی ڕۆژگاری تۆ پێغەمبەر ﷺ ئەی موحەممەد! لە عینادیی و کەللەڕەقیی و سەرەخەریی و نەسەلەماندندا گەیشتوونە لووتکە، تەنانەت ئەگەر پارچەیەک لە ئاسمانیشیان بەسەردا بەربێتەوە، دانی پێداناهێنن و دەڵێن: ئەوە هەورە کەڵەکە بووە لەسەر یەک.

**٢)-** ﴿فَذَرْهُمْ﴾، مادام حاڵیان وایە وازیان لێ بێنە، ئەم (**ف**)ە، (**فَاءُ التَّفْرِيْعِ**)ە، یانی: ئنجا کە ئەوان حاڵیان وایە، وازیان لێ بێنە و لێیان گەڕێ، (**فَذَرْهُمْ**): (**فَدَعْهُم**)، (**فاتركهم**) وشەی (**ذَرْ**)، تەنیا حاڵەتی کرداری فەرمانیی هاتوە وەک ئێرە و حاڵەتی کرداری ئێستاش: (**أَمْر وَمُضَارِع**)ی هاتوون، بەڵام ڕابردوو (**مَاضِي**)ی نەهاتوە، (**مضارع**) یش وەک: ﴿وَيَذَرُهُمْ فِى طُغْيَـٰنِهِمْ يَعْمَهُونَ ﴿١٨٦﴾﴾ **الأعراف**، لێیان دەگەڕێ و وازیان لێ دێنێ.

**٣)-** ﴿حَتَّىٰ يُلَـٰقُوا۟ يَوْمَهُمُ ٱلَّذِى فِيهِ يُصْعَقُونَ﴾، هەتا تووشی ئەو ڕۆژەیان دەبن کە تێیدا لە هۆش خۆیان دەچن، (**يُلَاقُوْا**)، خوێندراویشەتەوە: (**حَتَّى يَلْقَوا**)، یانی: تووشی دەبن، (**يُلَاقُوْا**) لەسەر کێشی (**مُفَاعَلة**)یە، واتە: پێکدەگەن، تاکو تووشی ئەو ڕۆژەیان دەبن، یاخود: بەو ڕۆژەیان دەگەن ﴿ٱلَّذِى فِيهِ يُصْعَقُونَ﴾، ئەوەی تێیدا لە هۆش خۆیان دەچن، یاخود تێیدا دەمرن، چونکە (**صَعْق**)، بە مانای مردن (**إِغْمَاء**) دێ و بە مانای (**مَوْت**)یش دێ.

کە دەفەرموێ: (**فَذَرْهُمْ**)، لێیان گەڕێ، وازیان لێ بێنە، واتایەکەی چەند ئەگەرێکی هەن:

**یەکەم:** لێیان گەڕێ کە داوات لێ دەکەن، نیشانەو موعجیزەیەک وەک پێغەمبەرانی پێشوویان بۆ بێنی، گوێیان پێ مەدە، بایەخیان بکە.

www.alibapir.com


**دووەم:** واز لە شەڕە قسەو مشتومڕ بێنە لەگەڵیان.

**سێیەم:** ئەمە هەڕەشەکردنە لێیان، یانی: لێیان گەڕێ و وازیان لێ بێنە، داخۆ دوایی چییان پێ دەکەین؟

هەر سێ واتایەکە هەن و، هەر سێکیشیان پێکەوە نەگونجاو نین و، دەگونجێ لە یەک کاتدا هەر سێکیان مەبەست بن:

أ- لێیانگەڕێ کە داوای نیشانەو موعجیزەی وەک هی پێغەمبەرانی پێشووت لێدەکەن، وازیان لێبێنەو گوێیان بۆ مەگرە، موعجیزەی و بەڵگەی تۆ بەس ئەم قورئانەیە، چونکە موعجیزەی پیغەمبەرانی پێشوو (عَلَيْهِمُ الصَّلَاةُ وَالسَّلَامُ) گونجاو بووە، لەگەڵ ئاستی فیکریی گەلانی ڕابردوودا، هەروەها تەنیا پەیوەست بووە بە ڕۆژگاری ئەو پێغەمبەرەوە کە بوویەتی، بەڵام بە وەفاتکردنی پێغەمبەرەکە، موعجیزەکەشی ڕۆیشتوە، بەڵام تۆ تەنیا پێغەمبەری ئەو کۆمەڵگەو ڕۆژگارەی خۆت نی، بەڵکو هی هەموو مرۆڤایەتیی بە پانتایی زەمین و بە درێژایی زەمان، بۆیە دەبێ شتێک موعجیزەو بەڵگەی تۆبێ، بمێنێتەوە، ئەویش موعجیزەیەکی فیکریی و عیلمییە، کە فەرمایشتی خوایەو، لە هەمان کاتدا بەرنامەشتەو موعجیزەشتە، بۆیە گوێ بەو داواکارییانەیان مەدە.

ب- زۆر لەگەڵیان پێدا مەچۆ و مشتومڕیان زۆر لەگەڵدا مەکە، دیارە ئەوانە هەر نایانەوێ بڕوابێنن و پەکیان لەسەر ئیقناعکردن و تێگەیاندن نەکەوتوە، قەناعەت هێنانی پێش بیرکردنەوە، ڕێی لێگرتوون بڕوا بێنن، وەک پێشتریش فەرمووی: ﴿بَل لَّا يُؤۡمِنُونَ﴾، نایانەوێ بڕوا بێنن.

ج- ئەوە جۆرێکە لە هەڕەشە لێیان، لە هەمان کاتدا کە تۆ لێیان دەگەڕێی، بزانە چییان بەسەر دێ، هەر لە خودی ئایەتەکەشدا هاتوە: ﴿فَذَرۡهُمۡ حَتَّىٰ يُلَٰقُواْ يَوۡمَهُمُ ٱلَّذِي فِيهِ يُصۡعَقُونَ﴾، لێیان گەڕێ هەتا تووشی ئەو ڕۆژەیان دێن، کە تێیدا لە هۆش خۆیان دەچن، یاخود دەمرن.

www.alibapir.com


٤)- ﴿يَوۡمَ لَا يُغۡنِي عَنۡهُمۡ كَيۡدُهُمۡ شَيۡـٔٗا﴾، ئەو ڕۆژەی پیلان و فێڵەکەیان هیچ سوودیان پێ ناگەیەنێ و هیچ دادیان نادات، (الإِغْنَاءُ: جَعْلُ الْغَيْرِ غَنِيًّا)، (إغْنَاء): ئەوەیە بەرانبەرەکە، ئەوی دیکە بێ نیازو دەوڵەمەند بکرێ، دەگوترێ: (أَغْنَى عَنْهُ: قَامَ مَقَامَهُ فِي دَفْعِ حَاجَةٍ كَانَ حَقُّهُ أَنْ يَقُومَ بِهَا)، (أَغْنَى عَنْهُ) واتە: چووە شوێنی ئەو لە جێبەجێ کردنی پێویستییەکدا کە هەق بوو جێبەجێی بکات، بەڵام ئەو لەجیاتی وی جێبەجێی کرد.

کە دەفەرموێ: ﴿يَوۡمَ لَا يُغۡنِي عَنۡهُمۡ كَيۡدُهُمۡ شَيۡـٔٗا﴾، ئەو ڕۆژەی پیلان و فێڵەکەیان هیچ سوودێکیان پێ ناگەیەنێ، هەڵبەتە لە دنیادا بێبڕوایان دەتوانن فێڵ بکەن و پێلان بگێڕن و لە پیلان و فێڵەکەیان بەهرەمەند بن، بەڵام ئەوە تەنیا لە چوارچێوەی ژیانی دنیادایە، کە شوێنی تاقیکردنەوەیەو لە ڕۆژی دوایی دا، ئەو پیلان و فێڵ و تەڵەکەیە سوودی نیە بۆیان.

٥)- ﴿وَلَا هُمۡ يُنصَرُونَ﴾، هەروەها لە دەرەوەی خۆشیان هاوکاریی ناکرێن، یانی: نە پیلانی خۆیان بە کەڵکیان دێ و، نە جگەلە خۆشیان لە فریایان دێ، ﴿وَلَا هُمۡ يُنصَرُونَ﴾، سەریش ناخرێن، کەس دەربازیان ناکات و پشتیوانییان لێ ناکرێ.

٦)- ﴿وَإِنَّ لِلَّذِينَ ظَلَمُواْ عَذَابٗا دُونَ ذَٰلِكَ﴾، بە دڵنیایی بۆ ئەوانەی ستەمیان کردوە، پێش ئەوەش ئازارێک هەیە

وشەی (دُون)، چەند مانایەکی هەیە لەم ڕەوت (سیاق)ەدا:

أ- بە مانای پێش (قَبْل) دێ، (دُونَ ذَلِكَ): (قَبْلَ ذَلِكَ)، پێش ڕۆژی دواییش سزاو ئازاری دیکە بۆ ئەوان هەیە.

ب- هەروەها (دُونَ) بە مانای کەمتر (أَقَلّ)یش دێ، یانی: (أَقَلّ مِنْ ذَلِكَ)، کەمتر لە سزای ڕۆژی دواییش، سزای دیکە بۆوان هەیە لە دنیادا، یاخود لە قۆناغی بەرزەخ دا.

ج- هەروەها (دُون)، بە مانای جگەلە (غَيْر)یش دێ، واتە: جگە لە سزای ڕۆژی دوایی، سزای دیکەش بۆ ئەوان هەیە، ئنجا چ لە دنیاداو، چ لە قۆناغی بەرزەخ دا.

www.alibapir.com


٧)- ﴿ وَلَٰكِنَّ أَكْثَرَهُمْ لَا يَعْلَمُونَ ﴾، بەڵام زۆربەیان نازانن، واتە: زۆربەیان نازانن کە پێش سزای قیامەتیش، سزاو ئازاری دیکە چاوەڕێیان دەکات، بۆیە فەرموویەتی: زۆربەیان نازانن، چونکە هەندێکیان کە زیاتر دووربین بوون و خاوەنی تێگەیشتنی قووڵترو وردتر بوون، ئەگەری ئەوەیان داناوە، شتیان بێتە ڕێ، بەڵکو کەمینەیەکیان هەر دڵنیابوون کە موحەممەد پێغەمبەری خوایە ﷺ، بۆیە زانیویانە ئەوەی هەواڵی پێدەداو، هەڕەشەی پێ لێیان دەکات، دێ، بەڵام زۆربەیان کە شوێنکەوتووی زلەزلەکان و لاساییکەرەوەی کوێرانەیان بوون، وەک زۆربەی خەڵکی ڕۆژگارەکان کە بە دوای تاغووتە، خۆ بە پەروەردگارزانەکان و خۆ بە پەرستراوزانەکان و خۆسەپێنەکان دەکەون و، پێشیان وایە ڕاست دەکەن، بگرە پێیان وایە هیچ کەس لەوان چاکترو ڕاسترو باشتر نیە! ئیدی دەیانپەرستن بە نەزانیی و لاساییکردنەوەی کوێرانە، بۆیە دەفەرموێ: زۆربەیان نازانن، بەڵام کەمینەیەکیان زانیویانە کە موحەممەد ﷺ ڕاست دەفەرموێ و، ئەوەی دەشیڵێ، دێتە دی، چ لە دنیاداو، چ لە ڕۆژی دوایی دا.

لە هەندێك سەرچاوەی سیرەدا هاتوە: جارێک پێغەمبەری خوا ﷺ بە لای هەندێک لە زلە زلانی قوڕەیشدا تێپەڕی، ئەوانیش گاڵتەیان پێکرد و قسەیان پێگوت و پێی پێکەنین، پێغەمبەریش ﷺ ڕووی تێکردن و فەرمووی: سوێند بەوەی گیانی منی بە دەستە (أَتَيْتُكُمْ بِالذَّبْحِ)، هاتووم سزای سەربڕینم بۆتان پێیە! ئەوانیش ترسان و ڕاچڵەکین و گوتیان: ئەی ئەبالقاسم تۆ هەرگیز ئینسانی نەفام نەبووی (چۆن هەڕەشەی وامان لێ دەکەی؟)، کەواتە: دەیانزانی پێغەمبەر ﷺ ڕاست دەکات و ئەوەی دەیفەرموێ، دێتە دی، هەڵبەتە زلەزلەکانیان و بڕیار بەدەستەکانیان ئەوەیان زانیوە، بەڵام خەڵکە زۆرینەکە کە بڕیار بەدەستەکان هەڵیانخەڵەتاندوون و چەواشەیان کردوون و کڵاویان لەسەر ناون، بەو قسانەی بۆ پێغەمبەریان هەڵبەستوون، کە کاهینەو، جادووگەرەو، شێتەو، شاعیرەو، لەخۆوە قسە هەڵدەبەستێ، وادیارە لە خشتەچوون و چەواشەکراون و ئەو تۆمەتانە لە بازاڕی ڕەشی ئەوان دا ساغ کراونەوە پێیان فرۆشراون! ئەگەرنا زلەزلەکان زانیویانە

www.alibapir.com


کـە موحەممـەد ﷺ شایسـتەی ئـەو تۆمەتانـە نیـەو، پیاوێکـی ڕاسـتگۆیەو ئـەوەی دەیفەرمـوێ ڕێـک وایـە.

٨)- ﴿ وَٱصۡبِرۡ لِحُكۡمِ رَبِّكَ ﴾، بۆ بڕیار و حوکمی پەروەردگاریشت خۆڕاگربە، حوکمی پەروەردگارت، لێرەدا سێ واتایان هەڵدەگرێ:

١- بۆ ئایین و بەرنامەی پەروەردگارت کە حوکمی خوایە، خۆڕاگربەو پێیەوە پەیوەست و پابەندبە.

٢- حوکمی پەروەردگارت واتە: بۆ دادوەرییکردنی پەروەردگارت، کە لە نێوان تۆ و ئەواندا، دەیکات، بۆیە تاکو کاتی ئەو دادوەرییەدێ، خۆڕاگر و چاوەڕێ بە.

٣-خۆڕاگربەبۆئەوەی خوا ﷻ بڕیاری داوەو، ئەندازەگیریی بۆکردوەو، پشوودرێژو دامەزراوو نەلەخشاو بە هەتا دێتەدی.

٩)- ﴿ فَإِنَّكَ بِأَعۡيُنِنَا ﴾، بە دڵنیایی تۆ بە چاوەکانی ئێمەی، واتە: تۆ لە ژێر چاودێریی ئێمە دای، (**هَذَا مِنْ تَفْرِيعِ الْعِلَّةِ عَلَى الْمَعْلُولِ**)، ئەمە لق لێکردنەوەی هۆکارە لە پەیداکراو، بۆچی خۆڕاگر بێ بۆ حوکمی پەروەردگاری؟ چونکە تۆ لە ژێر چاودێریی ئێمە دای و، لە ئەنجامی ئەوەدا کە تۆ لە ژێر چاودێریی ئێمە دای، دەبێ خۆڕاگربی، یەکێک لە ڕوونکەرەوانی قورئان، گوتوویەتی: (**لأَنَّكَ بِمَحَلِّ الْعِنَايَةِ وَالْكِلَاءَةِ مِنَّا، فَاصْبِرْ لِلأَنَّنَا نَحْنُ نَعْلَمُ مَا تُلَاقِيهِ وَمَا يُرِيدُونَهُ بِكَ، فَنَحْنُ نُجَازِيكَ عَلَى مَا تَلْقَاهُ، وَنَحْرُسُكَ مِنْ شَرِّهِمْ، وَنَنْتَقِمُ لَكَ مِنْهُمْ**)، {وەک زۆرجاران گوتوومە: هەندێک جار ئەوەی زۆربەی تەفسیرەکان دەیهێنن و، لە ڕواڵەتی ئایەتەکان وەردەگیرێ بەسەرنجدان و تێوەڕامانێک، بە پێویستی نازانم هەموو جارێ بیگێڕمەوە بۆ یەکێک لە تەفسیرەکان، چونکە جاری وا هەیە تەعبیری یەکێک لە تەفسیرەکان هەڵدەبژێرم، کە زۆربەی تەفسیرەکان هەمان ماناو مەبەست دێنن}.

کـە دەفەرمـوێ: ﴿ فَإِنَّكَ بِأَعۡيُنِنَا ﴾، واتـە: بەهـۆی ئـەوەوە کـە تـۆ لە ژێـر چاودێریی ئێمـەو لـە ژێـر پارێزگاریـی ئێمـە دای، خۆڕاگـر بـە، ئێمـە ئاگامـان لـە تۆیـە، چونکـە

www.alibapir.com



ئێمە دەزانین تۆ تووشی چی دێی، لە لای وانەوەو، ئەوەی ئەوان دەیانەوێ بەسەر تۆی بێنن، ئێمە دەیزانین، بۆیە ئێمە پاداشتت دەدەینەوە لەسەر ئەوەی تووشی دێی و، دەشتپارێزین لە پیلان و خراپەی ئەوان و، تۆڵەشت بۆ دەکەینەوە لەوان، کەواتە: هیچ پاساوێک نیە بۆ خۆڕانەگرییت و خۆڕاگربە.

وشەی (**بِأَعْيُنِنا**)، (**عَيْن**)، بە مانای چاوە (**أَعْيُن**)، چاوەکان، کە بەدڵنیایی لێرەدا مەبەست پێی چاودێرییکرن و پاراستنە، وەک چۆن لە سوورەتی (**طه**)دا، خوا ﷻ بە مووسای فەرمووو: ﴿ وَلِتُصۡنَعَ عَلَىٰ عَيۡنِيٓ ﴿٣٩﴾ ﴾، تاکو لەسەر چاوی من دروست بکرێی، واتە: لە ژێر چاودێریی مندا پەروەردە ببی و، بەخێو بکرێی، بەڵام لێرەدا خوا بۆ پێغەمبەری خاتەم فەرمووی: ﴿ فَإِنَّكَ بِأَعۡيُنِنَا ﴾، تۆ بە چاوەکانی ئێمەی، بۆی کۆکردۆتەوە! واتە: زۆر ئاگامان لە تۆیەو دەتپارێزین و چاودێرییت دەکەین، ئەم تەعبیرە وەک ئەوە وایە بگوترێ: (**نحن لَا نَغْفُلُ عَنْكَ**)، ئێمە لە تۆ بێ ئاگا نین، یاخود کە دەگوترێ: (**هُوَ بِمَرْأَى مِنِّي وَمَسْمَع، أَيْ لَا يَخْفَى عَلَيَّ شَأْنُهُ**)، واتە: من دەیبینم و دەیبیستم، واتە: حاڵی لە من پەنهان نیە.

لێرەدا کە دەفەرموێ: ﴿ فَإِنَّكَ بِأَعۡيُنِنَا ﴾، بۆچی (**عَيْن**)ی بە کۆ هێناوە، بە چاوەکانی ئێمە؟ ئەمە دوو واتای هەن:

١- بۆ تۆخکردنەوەی وێنە هێنانەوەکەیە، واتە: ئێمە بە زۆر چاوان ئاگامان لە تۆیەو چاودێریی تۆ دەکەین، وەک لە سوورەتی (**هود**)دا، خوای پەروەردگار بە نووحیشی فەرمووە: ﴿ وَٱصۡنَعِ ٱلۡفُلۡكَ بِأَعۡيُنِنَا ﴿٣٧﴾ ﴾، واتە: لە ژێر چاودێریی چاوەکانی ئێمەدای، یانی: لە ژێر چاودێرییەکی خەست و خۆڵی ئێمەدا کەشتییەکە دروست بکە، کەواتە: (**بِأَعْيُنِنا**) زیاتر بۆ تۆخکردنەوەی چاودێریی خوای ئاگادارو پارێزەرو ئاگا لێبوونیەتی لە پێغەمبەری خاتەم.

٢- بۆیە خوا چاوەکانی کۆکردوونەوە، چونکە ئەوەی چاودێریی کردنەکە پێیەوە پەیوەستە، جۆراو جۆرە؛ جارێک چاودێریی دەکات بۆ بەرگریی لێکردنی، جارێک

www.alibapir.com


چاودێریی دەكات بۆ سەرخستنی، جارێک چاودێریی دەكات بۆ ڕێنمایی و ئامۆژگاریی كردنی، جارێک چاودێریی دەكات بۆ پاداشت دانەوەو پلە بەرزكردنەوەی و ... هتد.

١٠)- ﴿وَسَبِّحْ بِحَمْدِ رَبِّكَ حِينَ تَقُومُ﴾، بە ستاییش كردنەوەش پەروەردگارت بە پاک بگرە، كاتێک هەڵدەستی، هەڵدەستی دەگونجێ:

أ- مەبەست پێی هەڵسان بێ لە خەو، واتە: كاتێک لە شەودا بێدار دەبیەوە، پەروەردگارت بە پاک بگرەو، ستاییشیشی بكە، هەم بڵێ: (**سُبْحَانَ الله**)، هەم بڵێ: (**الحَمْدُ لله**) و وێنەی ئەوانە.

ب- یاخود (**حِيْنَ تَقُوْم**)، هەر كاتێک لە هەر كۆڕو مەجلیسێک هەڵدەستی، بەو شێوەیە یادی خوا بكە، بە پاكی بگرەو ستاییشی بكە.

١١)- ﴿وَمِنَ ٱلَّيْلِ فَسَبِّحْهُ﴾، هەروەها لە شەوگاریشدا دیسان پەروەردگارت بە پاک بگرە، هەروەها ستاییشیشی بكە.

١٢)- ﴿وَإِدْبَٰرَ ٱلنُّجُومِ﴾، لە كاتی ئاوابوونی ئەستێرەكانیشدا، بەهەمان شێوە بە پاكی بگرەو ستایشی بكە. (**إِدْبَارُ**)، بە مانای ئاوابوونە، خوێندراویشەتەوە: (**أَدْبَارُ النُّجُومِ**)، لە پشت ئەستێرەكانەوە، (**أَدْبَارُ**)، كۆی (**دُبُرْ**)ە، واتە: پشت ئەستێرەكان كە ئاوا دەبن، (**إِدْبَارُ**)یش، واتە: لەگەڵ ئاوابوونی ئەستێرەكاندا، یان دوای ئاوابوونی ئەستێرەكان، كە مەبەست پێی بەرەبەیانە.

كە دەفەرموێ: ﴿وَسَبِّحْ بِحَمْدِ رَبِّكَ﴾، هەروەها دوایی دەفەرموێ: ﴿وَمِنَ ٱلَّيْلِ فَسَبِّحْهُ﴾، (**التَّسْبِيحُ: التَّنْزِيهُ، وَالْمُرَادُ مَا يَدُلُّ عَلَيْهِ مِنْ قَوْلٍ، وَأَشْهَرُ ذَلِكَ هُوَ قَوْلُ: «سُبْحَانَ اللَّهِ» وَمَا يُرَادِفُهُ مِنَ الْأَلْفَاظِ، وَلِذَلِكَ كَثُرَ إِطْلَاقُ التَّسْبِيحِ وَمَا يُشْتَقُّ مِنْهُ عَلَى الصَّلَوَاتِ، وَالْبَاءُ فِي قَوْلِهِ: بِحَمْدِ رَبِّكَ، لِلْمُصَاحَبَةِ جَمْعًا بَيْنَ تَعْظِيمِ اللَّهِ بِالتَّنْزِيهِ عَنِ النَّقَائِصِ، وَبَيْنَ الثَّنَاءِ عَلَيْهِ بِأَوْصَافِ الْكَمَالِ**).

www.alibapir.com


وشـەی (تَسْـبِيحُ)، واتـە: بـە پاکگرتـن کـە مەبەسـت پێـی هـەر قسـەیەکە ئـەوە بگەیەنـێ، کـە ناوادارتریـن قسـە لـەو بـارەوە بریتیـە لـە: (سُـبْحَانَ اللَّـهِ)، {هەروەهـا بۆ ستاییشـکردنی خـوا بریتیـە لـە (الحَمْـدُ اللَّـهِ)،} هەروەهـا هـەر بێژەیـەک ئـەو واتایانـە بگەیەنـێ، بۆیـەش وشـەی (تَسْـبِيح)و ئـەوەی لـە (تَسْـبِيح)، دادەتـاشرێ، بەکارهێـنراوە بـۆ نوێـژ و مەبەسـت پێـی نوێـژە {چونکـە لـە نوێـژدا هـەم خـوا بـە پـاک دەگیـرێ، هـەم خـوا سـتاییش دەکـرێ} پیتـی (ب)، کـە لەسـەر (بِحَمْـدِ رَبِّـكَ)، دانـراوە، بـۆ هاوەڵایەتییـە و بـۆ کۆکردنەوەیـە لـە نێـوان بـە مەزنگرتنـی خـوادا بەهـۆی بـە پاکگرتنیـەوە، لـە سـەرجەم کـەم و کوڕییـان و، ستاییشـکردنی بـە سـیفەتە تێـرو تـەواوەکانی.

کـە دەفەرمـوێ: (حِـينَ تَقُـومُ)، واتـە: (وَقْـتَ الْهُبُـوبِ مِـنَ النَّـوْمِ)، لـە کاتی لـە خـەو هەڵسـاندا، ئەویـش کاتێکـە مـرۆڤ تێیـدا ڕووبـەڕووی کارەکانی ڕۆژ دەبێتـەوەو، ئـەو حاڵەتانـەی پێویسـتییان بەخۆڕاگریـی و پشـوو درێژیـی دەکات، دووبـارە دەبنـەوە، بۆیـە لـەو کاتانـەدا مـرۆڤ پێویسـتیی بـەوە هەیـە کـە زیاتـر خـوا بـە پـاک بگـرێ و ستاییشیشـی بـکات، تاکـو توانـاو وزەیەکـی ڕووحیـی زیاتـری هەبـێ و، ئـەو یـادی خـواو بـە پاکگرتـن و سـتاییش کـردنی خـوا، بـۆی ببێتـە داینەمۆیـەک و سـەرچاوەی وزە بـۆ خۆڕاگریـی لەسـەر ئـەو شـتانەی لـە ڕۆژدا دێنـە ڕێـی.

﴿ وَمِنَ ٱلَّيۡلِ ﴾، چونکـە (مِـن)ی بەشـێک (تبعیـض)ی لـە سـەرە، یـانی: لـە بەشـێک لـە شەوگاریشـدا خـوا بـە پـاک بگـرە، چ هـەر (سُـبْحَان اللـه وَالحَمْـدُ للـه)، بگوتـرێ، چ مەبەسـت پێـی نوێـژ بـێ، کـە (تَسْـبِيْحُ تَحميد)یشـی تێدایـەو، واش پێدەچـی هـی دووەم مەبەسـت بـێ.

﴿ وَإِدۡبَٰرَ ٱلنُّجُومِ ﴾، (الإِدْبَـارُ: رُجُـوعُ الـشَّيْءِ مِـنْ حَيْـثُ جَـاءَ، لِأَنَّـهُ يَنْقَلِـبُ إِلَى جِهَـةِ الدُّبُـرِ، أَيِ الظَّهْـرِ، وَإِدْبَـارُ النُّجُـومِ: سُـقُوطُ طَوَالِعِهَـا، فَإِطْـلَاقُ الْإِدْبَـارِ هُنَـا مَجَـازٌ فِي الْمُفَارَقَـةِ وَالْمُزَايَلَـةِ، أَيْ عِنْـدَ احْتِجَـابِ النُّجُـومِ)، (إِدْبَـارُ) گەڕانـەوەی شـتێکە بـۆ شـوێنی

www.alibapir.com



لێوەهاتنــی، لێـردا پشــت هەڵکـردنی ئەســتێرەکان، بــە مەجــاز بەکارهێـنراوە بــۆ دوورکەوتنەوەیـان و ون بوونیـان، واتــە: لـە کاتێـک دا ئەسـتێرەکان پەنهـان دەبـن.

ئەسـتێرەکان کەنگـێ پەنهـان دەبـن؟ کاتێـک کـە خـۆر هەڵـدێ، ئەگەرنـا ئەسـتێرەکان هــەر لــە شــوێنی خۆیانــن، کــە دەگوتـرێ ئەســتێرە ئاوابــوون واتــە: تیشـکیان بـەدەرەوە نەمـا، لەبـەر ئـەوەی تیشـکی خـۆر دنیـا ڕووناک دەکاتـەوەو، ناگونجـێ تیشـکی ئەسـتێرەکان کـە بێهێزتـرە لـە هـی خـۆر، بـۆ ئێمـە ببینـرێ.

کۆتایی ئەم دەرسەش بەم دوو فەرمایشتەی پێغەمبەری خوا ﷺ دێنین:

**١- {كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ بِآخِرَةٍ إِذَا قَامَ مِنَ الْمَجْلِسِ يَقُولُ: سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ، أَشْهَدُ أَنْ لا إِلَهَ إِلاَّ أَنْتَ، أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ} (أخرجه أبو داود: ٤٨٥٩، والنسائي فـي «عمل اليوم والليلة»: ٤٢٦، وَصَحَّحَهُ الحَاكِم، وَوَافَقَهُ الذَّهبي).**

واتـە: پێغەمبـەر ﷺ کـە لـە کۆتایـی کـۆڕو مەجلیسـدا هەڵدەسـتا دەیفەرمـوو: (**سُبْحَانَكَ اللَّهُـمَّ وَبِحَمْـدِكَ**)، ئـەی خوایـە! تـۆ بـە پـاک دەگـرم و ستاییشـت دەکـەم، (**أَشْـهَدُ أَنْ لَا إِلَـهَ إِلَّا أَنْـتَ**)، شـایەدیی دەدەم جگـە لـە تـۆ هیـچ پەرسـتراوێک نیـە، (**أَسْـتَغْفِرُكَ وَأَتُـوبُ إِلَيْـكَ**)، داوای لێبوردنـت لێدەکـەم و بـۆ لای تـۆ دەگەڕێمـەوە.

لە کۆتایی هەر مەجلیسێکدا پێغەمبەر ﷺ ئەو زیکرەی دەفەرموو.

**٢-** پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: **{مَنْ جَلَسَ فِي مَجْلِسٍ فَكَثُرَ فِيهِ لَغَطُهُ، فَقَالَ قَبْلَ أَنْ يَقُومَ مِنْ مَجْلِسِهِ: سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ، أَشْهَدُ أَنْ لَا إِلَهَ إِلاَّ أَنْتَ، أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ، إِلَّا غُفِرَ لَهُ مَا كَانَ فِي مَجْلِسِهِ ذَلِكَ}، (أخرجه أبو داوود: ٤٨٥٨، والترمذي: ٣٤٣٣، إسناده صحيح).**

واتــە: هــەر کەسـێک لــە کـۆڕو مەجلیسـێکدا دابنیشـێ، قسـەی جـۆراو جـۆری تێـدا بکـرێ، {قسـەی بـاش و خـراپ، تێکـەڵ بکرێـن} پێـش ئـەوەی هەڵبسـتێ بڵـێ: (**سُـبْحَانَكَ اللَّهُـمَّ وَبِحَمْـدِكَ، أَشْـهَدُ أَنْ لا إِلَـهَ إِلاَّ أَنْـتَ، أَسْـتَغْفِرُكَ وَأَتُـوبُ إِلَيْـكَ**)، ئەم زیکرە

www.alibapir.com



بخوێنێ کە پێشتر مانامان کرد، ئەوە مسۆگەر هەرچی لەو کۆڕو مەجلیسەیدا بووە، لە قسەیەک کە خراپەو، بیستوویەتی، یان خۆی کردوویەتی و لە دەمی دەرچووە، لێی دەبوردرێ و چاوپۆشیی لێ دەکرێ.

ئێمەش لێرەدا دوای ستاییشکردنی شایستە بۆ خوا بسم الله الرحمن الرحيم، کۆتایی بەم دەرسەمان دێنین و، کۆتایی بە تەفسیری سوورەتی (**الطور**)یش دێنین، خوا بە لوتف و کەرەمی خۆی یارمەتییمان بدات، زیاتر لەو فەرمایشتە بەرزو بێ وێنەیەی تێبگەین و، بە هۆیەوە پێبگەین، خوا بۆمان ئاسان بکات کە کۆمەڵگەو دەوروبەری خۆشمان تێبگەیەنین و پێ بگەیەنین، بەو فەرمایشتە موبارەک و پڕ پیت و پێزەی خوا **سبحانه وتعالى**.

سُبحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ، أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ أَنْتَ، أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ.

لە تۆڕە کۆمەڵایەتییەکان لەگەڵتانین
Stay in touch on social media
نحن معكم عبر مواقع التواصل الاجتماعي
AliBapir/عەلی باپیر
ڕاگەیاندنی مەکتەبی مامۆستا عەلی باپیر
AliBapir/عەلی باپیر
archive.org/details/@alibapir
کەناڵی ڕاگەیاندنی مەکتەبی مامۆستا عەلی باپیر
AliBapir
www.alibapir.net
English - عربي - کوردی
ڕاگەیاندنی مەکتەبی مامۆستا عەلی باپیر

www.alibapir.com



## دەستپێک

بەڕێـــــزان!

ئەمـڕۆ کـە ڕۆژی (٢٨)ی (رجـب)ی سـاڵی (١٤٤١)ی کۆچییـە، بەرانبـەر: (٢٠٢٠/٣/٢٣)ی زایینـی، بـە پشـتیوانیی خـوای پـەروەردگارو، ئاسـانکاریی خـوای بەخشـش و بەزەیـی بـێ سـنوور، لـە شـاری هەولێـر دەسـتدەکەین بـە تەفسـیری سـوورەتی (النجـم)، سـەرەتاش پێناسـەو نێوەڕۆکـی ئـەم سـوورەتە موبارەکـە دەخەینـەڕوو، لـە حـەوت (٧) برگـەدا.

## پێناسە سوورەتی (النجم) و بابەتەکانی

### یەکەم: ناوی ئەم سوورەتە:

ئـەم سـوورەتە هـەر بـە نـاوی (سـورة النَّجْـم)، هەروەهـا بـە (النَّجْـم) نـاسراوە، وەک لـەم دەقانـەوە دیـارە:

**١- {عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رضي الله عنهما: أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ، سَجَدَ بِالنَّجْمِ، وَسَجَدَ مَعَهُ الْمُسْلِمُونَ وَالْمُشْرِكُونَ وَالْجِنُّ وَالْإِنْسُ} (أخرجه البخاري: ١٠٧١، والترمذي: ٥٧٥، وابن حبان: ٢٧٦٣، والبيهقي فـي الكبرى: ٣٥٢٧، والطبراني في الكبير: ١١٨٦٦).**

واتـە: عەبدوڵڵای کـوڕی عەببـاس رضي الله عنهما، دەڵـێ: پێغەمبەری خوا ﷺ سـوورەتی (النَّجْـمِ)ی خوێنـدو کڕنووشـی تێـدا بـرد، مسـوڵمانان و هاوبـەش بـۆ خـوا دانـەران و جینـن و ئینـس، (هەمـوو ئەوانـەی ئامادە بـوون لـەوێ، کڕنووشـیان بـرد، بەهـۆی کڕنـووش بردنەکەی پێغەمبـەرەوە ﷺ).

www.alibapir.com


٢- {عَنْ عَبْدِ اللهِ بنِ مَسعودٍ رضي الله عنه، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ، قَرَأَ سُورَةَ النَّجْمِ، فَسَجَدَ لَهَا، فَمَا بَقِيَ أَحَدٌ فِـي الْقَوْمِ إِلاَّ سَجَدَ، أَخَذَ رَجُلٌ مِنَ الْقَوْمِ كَفًّا مِنْ حَصْبَاءَ، أَوْ تُرَابٍ فَرَفَعَهُ إِلَى وَجْهِهِ وَقَالَ: يَكْفِينِي هَذَا، «قَالَ عَبْدُ اللَّهِ: فَلَقَدْ رَأَيْتُهُ بَعْدُ قُتِلَ كَافِرًا} (أخرجه البخاري: ١٠٦٧، ومسلم: ٥٧٦).

واتـە: عەبدوڵڵای کوڕی مەسعوود رضي الله عنه گێڕاویەتەوە، کـە پێغەمبەری خوا ﷺ سـوورەتی نەجمـی خوێنـدوەو سـەجدەی بـۆ بـردوە، هیـچ کـەس نەمـا، لـەو خەڵکـەی لـەوێ بـوون، مەگـەر سـەجدەی بـرد، پیاوێـک لـە خەڵکەکـە، (لـە ڕیوایـەتی دیکـەدا هاتـوە، دەڵـێ: لەبـەر ئـەوەی زۆر زەبـەلاح و بەکەلـەش بـوو)، نەیتـوانی و چنگـە چەوێـک یاخـود چنگـە گڵێکـی هەڵگـرت و بـەرزی کـردەوە بـۆ لای نێوچـەوانی خـۆی، سـەری وێکـردو گوتـی: ئـەوە بـۆ مـن بەسـە، عەبدوڵـڵا دەڵـێ: دوایـی ئـەو کابرایـەم بینـی بـە کافرێتیـی کـوژرا.

لـە ڕیوایـەتی دیکـەدا هاتـوە وەک (**القرطبـي**)، هێناویـەتی دەڵـێ: پیاوەکـە نـاوی (**أُمَيَّةُ بْـنُ خَلَـفٍ**) بـوو، لـە جەنگـی بـەدردا لەگـەڵ کـوژراوەکانی هاوبـەش بـۆ خـوا دانـەران بـوو، لـە حەفتا کوژراوەکـە بـوو.

٣- (عَنْ زَيْدِ بْنَ ثَابِتٍ رضي الله عنه، أَنَّهُ قَرَأَ عَلَى النَّبِيِّ ﷺ سُورَةَ النَّجْم: ﴿وَالنَّجْمِ إِذَا هَوَىٰ ۝١﴾، فَلَمْ يَسْجُدْ فِيهَا)، (أخرجه البخاري: ١٠٧٢، مسلم: ٥٧٧).

واتـە: زەیـدی کوڕی سـابیت رضي الله عنه، دەڵـێ: سـوورەتی: ﴿وَالنَّجْمِ إِذَا هَوَىٰ ۝١﴾ی بەسـەر پێغەمبـەری خـوادا ﷺ خوێنـد، کڕنووشـی نەبـرد.

کەواتـە: دەشـگونجێ کڕنـووش نەبـردرێ، ئنجـا ئایـا ئـەوە تایبەتـە بـەم سـوورەتەوە، یاخـود بـە نسـبەت شـوێنەکانی دیکەشـەوە هەروایـە؟ چونکـە ئێمە لـە کۆتایی سـوورەتی (**الأعـراف**)دا، باسـێکمان کـرد لـە بـارەی کڕنـووش بردنـەکانی قورئـان خوێندنـەوە، کـە زانایـان هەندێکیـان بەواجبیـان دانـاوەو، هەندێکیـان بـە شـتێکی پەسـندو باشـیان دانـاوە، بەگشـتیی لـەو شـوێنانەدا کـە لـە قورئانـدا هاتـوون و، زانایـان لـە بـارەی ژمارەی

www.alibapir.com


شوێنەکانیشـەوە، دیسـان مشـتومڕیان هەیـە، هەندێـک کەمـترو هەندێـک زیاتـران دەڵێـن، کڕنـووش بردنەکـەش بـەڕای هەمـووان بـەلای کەمەوە شـتێکی پەسـەندو باشـە، بـەڵام مسـوڵمان پابەنـد نیـە، حەتمـەن کڕنـووش بـەرێ، ئنجـا تەنانـەت لەسـەر ئـەو ڕایـەش کـە واجبـە کڕنـووش بـبردرێ، ئەگـەر مـرۆڤ بـۆی نەگونجـا، دەکـرێ ئامـاژە بـکات، وەک ڕای هەندێـک لـە زانایـان، یاخـود ببوێـردرێ و چاوپۆشـیی لـێ دەکـرێ، مـادام بـۆی نەگونجـێ، چونکـە خـوا زیـاد لـە توانـا پێویسـت نـاکات.

## دووەم: کات و شوێنی دابەزینی:

ئـەم سـوورەتە موبارەکـە بـە یەکدەنگیـی هەمـوو زانایـان سـوورەتێکی مەککەییـە، وەک **(السـيوطي)** لـە **(الـدرّ المنثـور)**دا[١]، لـە هـەر کام لـە عەبدوڵـڵای کـوڕی عەببـاس و عەبدوڵـڵای کـوڕی زوبەیـرەوە (خـوا لـە خۆیـان و بابیـان ڕازی بـێ)، هێناویـەتی و، **(السـيوطي)** ئـەو گێـڕدراوەشی پاڵداوەتـە لای **(ابـن مردويـه)**.

ئنجـا بەپێـی ئـەوەش کـە زانایـان ژمـارە (٢٢)، یـان (٢٣)یـان بـۆ دانـاوە، لـە ڕیزبەندیـی دابەزینـدا، وەک دوایـی باسـی دەکەیـن، وا پێدەچـێ ئـەم سـوورەتە لـە نێـوان سـاڵانی چـوارو پێنجـی پێغەمبەرایەتییـدا دابەزیبـێ، کـە ئەمـەش ئیشـکالێکی گـەورە بـۆ مێـژووی بـاوی سـەفەری شـەوڕۆو بەرزبوونـەوە **(الإسراء والعـروج)**، کـە بـە **(المعـراج)**، زیاتـر هاتـوە، پەیـدا دەکات، چونکـە مێـژووی بـاوی سـەفەری شـەوڕۆو بەرزبوونـەوە:

**أ-** هەندێک دەڵێن: ساڵی دەیەمی پێغەمبەرایەتیی بووە.

**ب-** هەندێک دەڵێن: ساڵی یازدەیەم بووە.

**ج-** هەندێک دەڵێن: ساڵی دوازدەیەم بووە.

---

(١) ج٧، ص٦٣٩.

www.alibapir.com


ئیشکالێکی گەورە بۆ ئەو ڕایە دروست دەبێ، بەڵام ئەوە هەڵدەگرین و دوایی لەو بارەوە کورتە باسێک دەکەین و، لە نێویدا باسی ئەم مەسەلەیەش دەکەین.

## سێیەم: ژمارەی ئایەتەکانی ئەم سووڕەتە:

ژمارەی ئایەتەکانی بە (٦١)و، هەندێک بە (٦٢)، دایانناوە، بەڵام زیاتر ژمارە (٦٢)یان تەبەنیی کردوە، لەو موصحەفانەی لەبەر دەستی ئێمەدا هەن، بەڵام ئەگەر ژمارە (٦١)یشتان کەوتە بەرچاو، بزانن ئەویش هەر سەرژمێرێکی دیکەی زانایانەو، کەمیی و زۆریی ژمارەی ئایەتەکانیش، دەگەڕێتەوە بۆ کورتیی و درێژیی ڕستەکانی قورئان.

## چوارەم: ڕیزبەندیی لە موصحەف و لە دابەزین دا:

ڕیزبەندیی لە موصحەفدا ژمارە (٥٣)یەو، لە دابەزینیشدا وەک گوتمان: ژمارە (٢٢)، یاخود (٢٣)ی، بۆ دانراوەو، زیاتریش ژمارە (٢٣)یان تەبەنیی کردوە، واتە: لە پێش ئەم سووڕەتە موبارەکەدا، تەنیا (٢٢) سووڕەتی دیکەی قورئان لە مەککە دابەزیون، ئنجا بەپێی ئەم مێژووە بێ، کە واش پێدەچێ و سرووشتی سووڕەتەکە وا دەخوازێ لە ساڵانی سەرەتای دابەزینی قورئاندا بوو بێ، ساڵانی سێ و چوارو پێنج و ئەو دەوروبەرە، ئەمە ئیشکالێک دروست دەکات، بۆ ئەو مێژووە باوەی بۆ سەفەری شەوڕۆو بەرزبوونەوەی پێغەمبەر ﷺ **(الإسراء والمعراج)** دانراوە، کە لە نێوان ساڵی دە تاکو ساڵی دوازدەیەم (١٠ - ١٢)ی پێش کۆچکردنی پێغەمبەر دایە.

www.alibapir.com


## پێنجەم: نێوەڕۆکی:

ئـەم سـووڕەتەش، وەک سـەرجەم قوڕئـانی مەککەیـی بـە گشـتیی، هەرسـێک تـەوەری سـەرەکیی ئیـمانی گرتوونـە خـۆی:

أ- خواناسیی و تەنیا خواپەرستیی.

ب- پێغەمبەرایەتیی و وەحیی، بە تایبەت پێغەمبەرایەتیی موحەممەد ﷺ و، وەحیی بۆ کرانی و باسی قوڕئان.

ج- ڕۆژی دوایی و سزاو پاداشت و، بەهەشت و دۆزەخ، بەڵام ئەوەی زیاتر لەم سووڕەتە موبارەکەدا جەختی لەسەر کراوەتەوە، هەردوو تەوەری خوا بەیەکگرتن و ڕاستیی موحەممەدن ﷺ لە پێغەمبەرایەتیی و لە سروش بۆکرانیدا، بە تایبەت لەم سووڕەتەدا، هێرشێکی توندو خەست و خۆڵ کراوەتە سەر بتپەرستیی، بە تایبەت پەرستنی فریشتان و، گومانی سەیرو سەمەرە پێبردنیان.

هەڵبەتـە لـەم سـووڕەتەدا جگـە لـەو سـێ تـەوەرەی باسـمانکردن، کۆمەڵێـک ڕێنمایـی گـەورەو گرنگیـش هاتـوون، لـە بـواری بووناسـیی و فیکـرو عەقیـدەی ئیسـلامیی داو، ئاماژەیەکـی کورتیـش بـە فەوتێـنرانی کۆمەڵێـک لـە گـەلانی یاخیـی کـراوە.

## شەشەم: تایبەتمەندییەکانی:

ئێمە پێنج تایبەتمەندییمان بۆ ئەم سووڕەتە موبارەکە هێناون:

١- تەنیا لەم سووڕەتەدا باسی بەرزبوونەوەی پێغەمبەر کراوە، کە ناوی **(معراج)**ی، بۆ بەکارهێنراوە لە سەرچاوە ئیسلامییەکاندا، بەڵام **(معراج)**، **(آلة العروج)**، ئامرازی پێ بەرزبوونەوەیەو، لە ئەصڵدا دەبوو گوترابایە: **(الإسراء والعروج)**، شەوڕۆو بەرزبوونەوە، ئەویش لە حەوت ئایەت، ئایەتەکانی: (١٢ - ١٨)دا، باسکراوەو، تەنیا

www.alibapir.com


لەم سوورەتەشدا باسی ئەوە كراوە، چونكە لە سوورەتی (**الإسراء**)دا، تەنیا باسی شەوڕۆ (**إسراء**)ی پێغەمبەر كراوە لە مزگەوتی حەڕامەوە بۆ مزگەوتی ئەقصا، باسی بەرزبوونەوەی پێغەمبەریش بۆ ئاسمانەكان و تاكو لای درەختی كۆتایی (**سدرة المنتهى**)، تەنیا لەم سوورەتەدا هاتوە، لە ئایەتەكانی: (١٢ - ١٨) دا.

٢- وردەكاریی چۆنیەتیی وەحیی ناردنی خوا بۆ پێغەمبەر لە ڕێی جیبریلەوە، تەنیا لەم سوورەتەدا باسكراوە، هەڵبەتە لە سوورەتی (**التكویر**)و، سوورەتی (**الشعراء**)دا، باسی ئەوە كراوە، كە جیبریل قورئانی دابەزاندۆتە سەر دڵی پێغەمبەر ﷺ، بەڵام ئەو وردەكارییەی لەم سوورەتەدا هاتوە، وەک دوایی باسی دەكەین، لە هیچ كام لە شوێنەكانی دیكەی قورئاندا نەهاتوە، ئەویش لە ئایەتەكانی: (٣ - ١١)دا.

٣- ناوی سێ بتە سەرەكییەكەی گەلی عەرەب، تەنیا لەم سوورەتەدا هاتوە: (ٱللَّـٰتَ، وَٱلْعُزَّىٰ، وَمَنَوٰةَ).

٤- تەنیا لەم سوورەتەدا، ئەو دوازدە ڕاستییە كە صوحوفی ئیبراهیم و مووسا خستوویاننەڕوو، باسكراون، كە لە ئایەتەكانی:(٣٨ - ٥٤)دا، خراونەڕوو، خوا بسم الله الرحمن الرحیم فەرموویەتی: ئەو ڕاستییانە - كە دوازدە ڕاستی گەورەو گرنگن - لە هەر كام لە صوحوفی ئیبراهیم و صوحوفی مووسادا، صەڵات و سەلامی خوا لەسەر ئیبراهیم و مووسا بێ، هاتوون.

٥- چەند وشەیەک تەنیا لەم سوورەتەدا هاتوون، هەڵبەتە زیاتر ئەوانەی زەق بوون، هێناومن، ئەگەرنا زیاتریش هەن:

١- ﴿وَمَا يَنطِقُ عَنِ ٱلْهَوَىٰٓ ۝٣﴾.

٢- ﴿شَدِيدُ ٱلْقُوَىٰ ۝٥﴾.

٣- ﴿ذُو مِرَّةٍ ۝٦﴾.

٤- ﴿بِٱلْأُفُقِ ٱلْأَعْلَىٰ ۝٧﴾.

www.alibapir.com


٥- ﴿قَابَ قَوْسَيْنِ ۝٩﴾.

٦- ﴿سِدْرَةِ الْمُنْتَهَىٰ ۝١٤﴾.

٧- ﴿اللَّاتَ ۝١٩﴾.

٨- ﴿وَالْعُزَّىٰ ۝١٩﴾.

٩- ﴿وَمَنَاةَ ۝٢٠﴾.

١٠- ﴿ضِيزَىٰ ۝٢٢﴾.

١١- ﴿اللَّمَمَ ۝٣٢﴾.

١٢- ﴿وَأَكْدَىٰ ۝٣٤﴾.

١٣- ﴿وَأَقْنَىٰ ۝٤٨﴾.

١٤- ﴿سَامِدُونَ ۝٦١﴾.

وەک گوتمان: وشەی دیکەش هەن، بەڵام ئەوانەم بە پێویست زانین، ئاماژەیان پێ بکەین.

## حەوتەم: دابەشکردنی ئایەتەکان بۆ چەند دەرسێك:

ئێمە هەر (٦٢) ئایەتەکەی ئەم سوورەتە موبارەکەمان بۆ سێ دەرسان دابەش کردوون:

**دەرسی یەکەم:** ئایەتەکانی: (١ - ١٨)، هەژدە ئایەتی سەرەتای ئەم سوورەتە، باسی ڕاست بوونی پێغەمبەر موحەممەد ﷺ لە پێغەمبەرایەتییداو، چۆنیەتیی وەحیی بۆ نێردرانی و، باسی میعراج، بەرزبوونەوەی پێغەمبەری خوا.

**دەرسی دووەم:** ئایەتەکانی: (١٩ - ٣٢)، چواردە ئایەت باسی دەرخستنی پووچەڵیی بتپەرستیی و، ناڕاستیی پەرستنی فریشتان و، ڕێنمایی کردنی پێغەمبەر

بۆ چۆنیەتیی مامەڵەکردنی لەگەڵ هاوبەشدانەران و بێبڕوایانداو، چەند بابەتێکی دیکە، بە تایبەت ئەوە کە خوا بسم الله الرحمن الرحيم ئاسمانەکان و زەوی هێناونەدی بۆ ئەوەی سزای خراپەکاران بدات و، پاداشتی چاکەکاران بداتەوە، چاکەکارانیش ئەوانەن کە خۆیان لە هەرچی گوناهی گەورەو ناقۆڵایە دەپارێزن، جگە لە گوناهی گچکەو ورد.

**دەرسی سێیەم:** کە لە ئایەتەکانی: (٣٣ - ٦٢)، سی (٣٠) ئایەتی کۆتایی ئەم سوورەتە موبارەکە، پێکدێ، باسی جۆرە مرۆڤێکی پشوو کورت لە دیندارییداو بە گڕو فڕ، کە سەرەتا ویستوویەتی ڕووبکاتە خواو دینداریی، بەڵام دوایی بەرەو پاش چۆتەوەو لێ چووەتەوەو، سەرزەنشتکردنی کە ئایا ئاگاداری ئەو ڕاستییانە نیە، کە صوحوفی ئیبراهیم و مووسا گرتوویاننە خۆیان؟ کە سەرجەم دوازدە ڕاستیین، پاشان هۆشداریی دان بە نیزیک کەوتنەوەی قیامەت و، سەرزەنشتکردنی بێبڕوایان کە بۆچی مامەڵەی جیددیی، لەگەڵ فەرمایشتی خوادا ناکەن و، بێئاگان؟ لە کۆتاییش دا فەرمان پێکرانیان بە کڕنووش بردن بۆ خوا عزو جل.

لە تۆڕە کۆمەڵایەتییەکان لەگەڵتانین
Stay in touch on social media
نحن معكم عبر مواقع التواصل الاجتماعي
ڕاگەیاندنی مەکتەبی مامۆستا عەلی باپیر
AliBapir/عەلی باپیر
archive.org/details/@alibapir
AliBapir/عەلی باپیر
کەناڵی ڕاگەیاندنی مەکتەبی مامۆستا عەلی باپیر
AliBapir
www.alibapir.net
English - عربي - کوردی
ڕاگەیاندنی مەکتەبی مامۆستا عەلی باپیر

www.alibapir.com


## پێناسەی ئەم دەرسە

بەڕێـــــزان!

ئـەم دەرسـەمان لـە هـەژدە (١٨) ئایـەتی سـەرەتای (**النجـم**) پێـک دێ، ئایەتـەکانی: (١ - ١٨)، کـە خـوای بـەرزو مـەزن لـەو هـەژدە ئایەتـەدا، سـەرەتا سـوێند بـە ئەسـتێرە دەخـوات، لـە کاتی ئاوابـوون، یاخـود کەوتنیـدا، کـە پێغەمبـەری خاتـەم موحەممـەد ﷺ نـە ڕێـی لـێ ون بـووەو نـە بـێ مـرادو بـێ ئاکامیـش بـووە، هەروەهـا لەسـەر ئـەوە کـە ئـەوەی دەیڵـێ، لـە ئـارەزووەوە نیـە، بەڵکـو وەحیـی و پەیامـی خوایـە، بۆی دەنێـردرێ، کـە مەبەسـت پێـی قوڕئانـە، چونکـە مشـتومڕ هـەر لەسـەر قوڕئـان بـووە، وەک دوایـی باسـی دەکەیـن.

پاشـان باسـی چۆنیەتیـی پەیامـی خـوا پـێ گەیەنـدرانی موحەممـەد لـە لایـەن جیبریلـەوە (**عَلَیْـهِ السـلام**)، باسـی ئـەوە کـراوە، وێـڕای وەسـفی جیبریـل و، جەختیـش لەسـەر ئـەوە کراوەتـەوە کـە پێغەمبـەر ﷺ لـەوەدا کـە بینیویـەتی، بـە چـاوی سـەر بینیویـەتی، عەقـڵ و دڵـی بـە هەڵـەدا نەچـوون و، وێڕای جـاری یەکەمی لەسـەر زەوی، جارێکـی دیکـەش لـە ئاسـمان لـەلای درەختـی کۆتایـی جبریلـی دیـوە، کـە مەبەسـت کاتی بەرزبوونـەوەی پێغەمبـەرە ﷺ لـەو سـەفەرەدا، کـە بـە شـەوڕۆو بەرزبوونـەوە (**الإسراء والعـروج**) نـاسراوەو، لـەو سـەفەرو گەشتەشـیدا چـاوی پێغەمبـەر ﷺ نـە لایـداوەو، نـە سەرکێشـیی کـردوەو، گەلـێ لـە نیشـانە گـەورەکانی خـوای بـەرزو مـەزن و بـێ وێنـەشی بینیـون.

www.alibapir.com



بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

﴿وَٱلنَّجۡمِ إِذَا هَوَىٰ ﴿١﴾ مَا ضَلَّ صَاحِبُكُمۡ وَمَا غَوَىٰ ﴿٢﴾ وَمَا يَنطِقُ عَنِ ٱلۡهَوَىٰٓ ﴿٣﴾ إِنۡ هُوَ إِلَّا وَحۡيٞ يُوحَىٰ ﴿٤﴾ عَلَّمَهُۥ شَدِيدُ ٱلۡقُوَىٰ ﴿٥﴾ ذُو مِرَّةٖ فَٱسۡتَوَىٰ ﴿٦﴾ وَهُوَ بِٱلۡأُفُقِ ٱلۡأَعۡلَىٰ ﴿٧﴾ ثُمَّ دَنَا فَتَدَلَّىٰ ﴿٨﴾ فَكَانَ قَابَ قَوۡسَيۡنِ أَوۡ أَدۡنَىٰ ﴿٩﴾ فَأَوۡحَىٰٓ إِلَىٰ عَبۡدِهِۦ مَآ أَوۡحَىٰ ﴿١٠﴾ مَا كَذَبَ ٱلۡفُؤَادُ مَا رَأَىٰٓ ﴿١١﴾ أَفَتُمَٰرُونَهُۥ عَلَىٰ مَا يَرَىٰ ﴿١٢﴾ وَلَقَدۡ رَءَاهُ نَزۡلَةً أُخۡرَىٰ ﴿١٣﴾ عِندَ سِدۡرَةِ ٱلۡمُنتَهَىٰ ﴿١٤﴾ عِندَهَا جَنَّةُ ٱلۡمَأۡوَىٰٓ ﴿١٥﴾ إِذۡ يَغۡشَى ٱلسِّدۡرَةَ مَا يَغۡشَىٰ ﴿١٦﴾ مَا زَاغَ ٱلۡبَصَرُ وَمَا طَغَىٰ ﴿١٧﴾ لَقَدۡ رَأَىٰ مِنۡ ءَايَٰتِ رَبِّهِ ٱلۡكُبۡرَىٰٓ ﴿١٨﴾﴾

## مانای دەقاودەقی ئایەتەکان

{بە ناوی خوای بە بەزەیی بەخشندە، (سوێند) بە ئەستێرە کاتێ دەکەوێ (ئاوا دەبێ) ﴿١﴾ هاوەڵەکەتان (موحەممەد) نە ڕێی لێ ونبووەو، نە بێمراد بووە ﴿٢﴾ بە ئارەزووەوەش نادوێ ﴿٣﴾ ئەوەی (دەیخوێنێ و دەیڵێ: تەنیا سروش (ی خوای)ە بۆی دەنێردرێ ﴿٤﴾ (فریشتەیەکی) زۆر بەهێزو توانا فێری دەکات ﴿٥﴾ کە خاوەنی هۆش و عەقڵێکی پتەوە، ئنجا (ئەو فریشتەیە لەسەر شێوەی خۆی) ڕێک وەستا ﴿٦﴾ لە کاتێکدا ئەو لە ئاسۆی هەرە بەرز بوو ﴿٧﴾ دوایی نیزیک کەوتەوە، ئنجا شۆڕبۆوە (بۆ لای پێغەمبەر) ﴿٨﴾ ئنجا وەک ئەندازەی دوو کەوانە یان نزیکتریش بوو (لە پێغەمبەر) ﴿٩﴾ ئنجا (خوا) ئەوەی سروش کرد بۆ بەندەکەی کە سروشی کرد ﴿١٠﴾ عەقڵی (موحەممەد) لەوەدا کە بینی بەهەڵەدا نەچوو ﴿١١﴾ (ئەی بێبڕوایەکان!) ئایا لە بارەی ئەو (فریشتەیـ)ەوە، کە دەیبینێ، مشتومڕی لەگەڵدا دەکەن! ﴿١٢﴾ بە دڵنیایی جارێکی دیکەش ئەوی بینیوە ﴿١٣﴾ لە لای درەختی کۆتایی ﴿١٤﴾ کە بەهەشتی سرەوتگای (بڕوادارانی) لەلایە ﴿١٥﴾ کاتێک کە درەختەکەی دادەپۆشی ئەوەی دا پدەپۆشی! ﴿١٦﴾ چاوی (موحەممەد) بەملاولادا لای نەداو سنووریشی

نەبەزانـد ﴿١٧﴾ بـە دڵنیایـی (ژمارەیـەک) لـە نیشـانە گـەورەکانی پـەروەردگاری (لـەو سـەفەرەیدا) بینیـن ﴿١٨﴾}.

## شیکردنەوەی هەندێک لە وشەکان

(﴿وَٱلنَّجۡمِ﴾): واتـە: ئەسـتێرە، (**أَصْلُ النَّجْمِ: الكَوْكَبُ الطَّالِعُ، جَمْعُهُ نُجُوْم**)، وشـەی (**نَجْم**)، لـە ئەصڵـدا بە ئەستێرەیەکی هەڵهاتـوو دەگوتـرێ و بە (**نُجُـوم**)، کۆدەکرێتـەوە، دەگوترێ: (**نَجَـمَ: طَلَـعَ**)، دەرکـەوت، (**نُجُومَـاً وَنَجْـمَاً**)، ئەمانـە هەردووکیـان چاوگـن، (**فَالْنَّجْـمُ مَصْـدَرٌ وَاسْـمٌ**)، (**نَجْـم**)، هـەم چاوگـەو، هـەم ناویشـە، (**نُجُوم**)یـش دەگونجـێ چـاوگ بـێ و، دەشـگونجێ کـۆی (**نَجْـم**) بـێ، واتـە: ئەسـتێرەکان کـە بـە (**أَنْجم**)یـش، کۆدەبێتـەوە.

(﴿هَوَىٰ﴾): (**الهُـوِيُّ: سُـقُوطٌ مِـنْ عُلْـوٍ إلى سُـفْلٍ**)، (**هُـوي**): بریتیـە لـە کەوتنـە خـوار لـە بەرزییـەوە بـۆ نزمیـی، بـەڵام (**الهَـويُّ: ذَهَـابُ فـي ارْتِفَـاع**)، (**هَـويّ**): بریتیـە لـە بەرزبوونـەوەو ڕۆیشـتن بـەرەو بەرزیـی.

(﴿ضَلَّ﴾): (**الضَّـلاَلُ: العـدُولُ عَـنِ الطَّرِيْـقِ الْمُسْـتَقِيْمِ وَيُضَـادُّهُ: الهِـدَايَة**)، (**ضَـلاَل**): بریتیە لـە لادان لـە ڕێـی ڕاسـت و، هیدایـەت دژو پێچەوانەکەیـەتی، کەواتـە: هیدایـەت، واتـە: ڕێـی ڕاسـت گرتـن.

(﴿صَاحِبُكُمۡ﴾): (**الصَّاحِـبُ: المُـلاَزِمُ إنْسَـانَاً كَانَ، أو حَيْوانَـاً، أو مَكَانَـاً، أو زَمَانـاً**)، (**صَاحِـب**): یـانی: هـاوەڵ، کەسـێک یـان شـتێک لەگـەڵ کەسـێک بـێ، مـرۆڤ بـێ، یـان ئـاژەڵ بـێ، یـان شـوێن بـێ، یاخـود کات بـێ.

دیـارە مەبەسـت لـە (**صَاحِبُكُـم**)، موحەممـەد پێغەمبـەری خوایـە ﷺ، ئـەو تەعبیرەش بۆیـە بەکارهاتـوە، واتـە: ئـەو هاوەڵـەی خۆتـان کـە چاکـی دەناسـن و لـە نیزیکـەوە پێـی ئاشـنان.

www.alibapir.com


(غَوَىٰ): (الغَيُّ: جَهْلٌ عَنِ اعْتِقَادٍ فَاسِدٍ)، وشەی (غَيّ): زانایان بە چەند واتایەک لێکیان داوەتەوە:

أ- هەندێکیان گوتوویانە: بریتیە لە نەزانینێک بەهۆی بڕوا پێ بوونێکی خراپەوە.

ب- هەندێک گوتوویانە: (الغَيُّ: الخَيْبَةُ): بریتیە لە بێ مرادیی و بە ئامانج نەگەیشتن.

ج- هەندێک گوتوویانە: (غَوَي: أي فَسَدَ عَيْشُهُ، غَوِيَ الفَصِيْلُ أي: بَشِمَ)، (غوي)، یانی: ژیانی تێکچوو، (غَوِيَ الفَصِيْل)، (فَصِيْل)، واتە: بەچکە حوشتر، ئەگەر شیر زۆر بخوات و گەدەی پێی تێکبچێ، ئەوەیان بۆ بەکارهێناوە، (وَيُضَادّهُ الرُّشْدُ)، ئەوەی دژو پێچەوانەی (غَيّ)یە، بریتیە لە (رُشْد)، ﴿قَد تَّبَيَّنَ ٱلرُّشۡدُ مِنَ ٱلۡغَيِّۚ ﴿٢٥٦﴾﴾ البقرة، (رُشْد)، واتە: بە ئامانج گەیشتن و بە ئاکام گەیشتن، بەڵام (غَوَايَة)، بریتیە لە بێ مرادیی و بێ ئاکامیی.

(يَنطِقُ): (النُّطْقُ فِي التَّعَارُفُ: الأَصْوَاتُ المُقَطَّعَةُ الَّتِي يُظْهِرُهَا اللِّسَانُ وتَعِيهَا الآذَانُ)، (نُطق): لە باوی نێو خەڵکدا بریتیە لەو دەنگە پچڕ پچڕانەی زمان دەریان دەخات و گوێیەکان لێیان تێدەگەن، زمانەکان دەیانبێژن و گوێیەکان لێیان تێدەگەن.

(ٱلۡهَوَىٰٓ): (الهَوَى: مَيْلُ النَّفْسِ إلى الشَّهْوَة)، (هَوَى): لادانی نەفسە بەرەو ئارەزوو، (الهَوَى: النَّفْسُ المَائِلَةُ إلى الشَّهْوَة) (هوى)، نەفسێکە لایداوە بەرەو ئارەزوو، (لأَنَّهُ يَهْوِي بِصَاحِبِه فِي الدُّنْيَا إلى كُلِّ دَاهِيَة)، لەبەر ئەوەی خاوەنەکەی لە دنیادا تووشی هەر بەڵایەک دەکات، بەریدەداتەوە بۆ چاڵ و زەلکاوی هەر بەڵایەک.

(وَحۡيٌ): (أَصْلُ الوَحِي: الإشَارَةُ السَرِيْعَة، قِيْلَ: أَمْرٌ وَحِيٌّ، أي: سَرِيْعٌ، وَالوَحِيُ: الصَّوْتُ الخَفِي، وَالوَحِي: صَوْتُ الحُلِيِّ)، وشەی (وَحي): لە ئەصڵدا بە ئاماژەی خێرا دەگوترێ، بۆیە گوتراوە: (أَمْرٌ وَحِيٌّ)، کارێکی خێرا، هەروەها بە دەنگی کپ دەگوترێ و بە دەنگی خشڵیش دەگوترێ، لەبەر ئەوەی دەنگێکی کپە.

www.alibapir.com


(**فَٱسۡتَوَىٰ**): (**اسْتَوَى أي: اسْتِقَام وَاعْتَدَلَ**)، (**فَاسْتَوَى**)، یانی: ڕێک وەستاو هاوسەنگ وەستاو، جوان خۆی خستە بەرچاو.

(**بِٱلۡأُفُقِ**): (**النَّاحِيَة والجَمْعُ آفَاق: النَّوَاحِي**)، (**أُفُقْ**): بە مانای لا، کە بە (**آفَاق**)، کۆدەکرێتەوە: لایەکان، خوا دەفەرموێ: ﴿ سَنُرِيهِمۡ ءَايَٰتِنَا فِي ٱلۡأٓفَاقِ وَفِيٓ أَنفُسِهِمۡ ﴾فصلت: ٥٣، واتە: نیشانەکانی خۆمانیمان پێشان دەدەین لە ئاسۆیەکاندا (لە لایەکاندا، لە گەردووندا)و لە خودی خۆشیاندا.

(**دَنَا**): (**الدُّنُوُ: القُرْبُ بِالذَّاتِ، أو بِالحُكْمِ، وَيُسْتَعْمَل فِي المَكَان والزَّمَانِ وَالمَنْزِلَةِ**)، (**دُنُو**): بریتیە لە نیزیک بوونەوە، خودی ئەو شتە، نیزیک بێتەوە، یاخود بە حوکم، هەروەها بەکارهێنراوە لە شوێن و لە کاتتداو لە ڕووی پێگەوەش.

(**فَتَدَلَّىٰ**): (**التَدَلِّي: الدُّنُو وَالإسْتِرْسَالُ، دَلَوْتُ الدَّلْو: إذَا أَخْرَجْتَهَا، أو أَرْسَلْتَهَا، وَأَدْلَيْتُ الدَلْو، إذَا أَرْسَلْتَهَا أو أَخْرَجْتَهَا**)، (**تَدَلِّي**): بە مانای بەردانەوەو شۆڕبوونەوە دێ، نزیککەوتنەوەو شۆڕبوونەوە، ئەگەر لەسەرێوە شۆڕبێتەوە، (**دَلو**)، واتە: دۆڵچە کە ئاویان پێ لە بیر هەڵێنجاوە، (**دَلَوْتُ الدَّلْوَ**)، بۆ دەرهێنانی دۆڵچەکە لە بیر، کە ئاوی پێ هەڵهێنجن و، جاری واش هەیە بۆ بەردانەوە نێو بیر، بەکارهاتوە، (**أَدْلَيْتُ**) یش دیسان بۆ بەردانەوەی نێو بیرەکە کە ئاوەکەی پێ هەڵهێجن و، جاری واش هەیە بۆ دەرهێنانەوەی لە بیرەکە بە ئاوەوە، بەڵام (**دَلَوْتُ**) زیاتر بۆ دەرهێنانی دۆڵچەکە لە بیرو (**أدْلَيْتُ**)، بۆ بەردانەوەی، بەکارهاتوە.

(**قَابَ**): (**القَابُ: مَا بَيْنَ المِقْبَضِ وَالسِّيَة مِنَ القَوْس**)، (**قَوْس**)، یانی: کەوان، ئنجا کەوان ئەملاو لای پێیان دەگوترێ: (**سِيَة**)و ئەو شوێنەی دەستی پێ دەگیرێ، پێی دەگوترێ: (**مِقْبَض**)، (**وَتَر**)یش، ژێیەکەیە کە پێی ڕاهێڵدراوە، بۆ ئەوەی تیرەکەی پێ هەڵبدرێ، کەواتە: هەر کەوانێ: دوو سیەی هەن، ئەملاو لای و (**مِقْبَض**)ێکی هەیە و ژێیەکیشی هەیە.

www.alibapir.com


هەندێکیش گوتوویانە: ئەو لاو لای کەوان پێیان دەگوترێ: (قَابْ) و کە دەفەرموێ: (قَابَ قَوْسَيْنِ: أي قَابَي قَوْسَيْن)، واتە: بە ئەندازەی ئەملاو لای کەوان.

(قَوْسَيْنِ): (القَوْسُ: آلَةٌ عَلَى هَيْئَةِ هِلَالٍ تُرْمَى بِهَا السِّهَامُ)، (قَوْس): ئامێرێکە بە شێوەی مانگی چەند شەوە، تیری پێ دەهاویشترێ و پێ هەڵدەدرێ، وشەی (قَوْس)، بە (مُذَكَّر)یش دێ، بە (مُؤَنَّث)یش دێ و بە (أَقْوَاس)، کۆدەکرێتەوەو بە (قِسِّي)یش کۆدەکرێتەوە.

(مَا كَذَبَ ٱلْفُؤَادُ مَا رَأَىٰٓ): واتە: عەقڵی، یان دڵی لەوەدا کە بینی، درۆی نەکرد، (كَذَبَ: أي أَخْبَرَ عَنِ الشَّيْءِ بِخَلَافِ مَا هُوَ عَلَيْهِ فِي الوَاقِع)، (كَذَبَ)، یانی: هەواڵیدا لە بارەی شتێکەوە، بە پێچەوانەی ئەوەوە کە ئەو شتە لە واقیعدا لەسەریەتی.

هەروەها (كَذَبَ)، بە مانای (أَخْطَأَ) بەهەڵەدا چوو، دێ، دەگوترێ: (كَذَبَ فُلَانٌ فُلَانَاً)، فلانکەس لەگەڵ فلانکەس دا درۆی کرد، واتە: هەواڵی درۆی پێدا.

(ٱلْفُؤَادُ): (الفُؤَادُ كَالْقَلْبِ)، هەندێک لە زانایان وایان لێکداوەتەوە کە (فُؤاد): بە مانای دڵ دێ، هەندێکیش دەڵێن: (فُؤاد) بە مانای عەقڵ دێ، لە قورئاندا بە زۆریی (أَفْئِدَة) دێ و، جاروباریش (فُؤاد) دێ بە تاک و، هەر بە مانای عەقڵەو، هەندێک جاری کەمیش بە مانای دڵە، عەقڵ و دڵیش لە قورئاندا هەردووکیان وەک چەقی تێگەیشتن و فامکردن و لێ وردبوونەوەو ڕامان، بەکارهاتوون.

(أَفَتُمَٰرُونَهُۥ): (المُمَارَاةُ: المُحَاجَّةُ وَالمُجَادَلَةُ)، (مماراة) بەمانای شەڕە قسەو دمبەدمەیە، ئایا ئێوە شەڕە قسە و، مشت و مڕی لەگەڵ دەکەن؟ خوێندراویشەتەوە: (أَفَتَمْرُونَهُ)، یانی: (أَفَتَجْحَدونَهُ)، ئایا نکوولیی لێدەکەن؟

(نَزْلَةً أُخْرَىٰ): (النَّزْلَةُ: المَرَّةُ مِنَ النُّزُولِ)، (نَزْلَة): بریتیە لە جارێک لە دابەزین، ﴿وَلَقَدْ رَءَاهُ نَزْلَةً أُخْرَىٰ ﴿١٣﴾﴾، لە دابەزینێکی دیکەشدا پێغەمبەر ﷺ جیبریلی بینیوە.

www.alibapir.com


(سِدۡرَةِ ٱلۡمُنتَهَىٰ): (سِدْرَة) تاکی (سِدْر)ە، کە کۆیەو (سِدْرَة)، تاکەکەیەتی، (**شَجَرٌ قَلِيْلُ الغَنَاءِ عِنْدَ الأَكْلِ**)، (**سدرة**) درەختێکە بەرەکەی سوودێکی وای نیە، کاتێک دەخورێ، ئنجا ئەو درەختی کۆتاییەی خوا ﷻ باسی دەکات، دەبێ شێوەی درەختی (**سِدْر**)ی، هەبێ و (**نَبْق**)یشی، پێدەڵێن، جۆرە درەختێکە گەڵای وردەو بۆنێکی خۆشی هەیە، بەڵام دیارە گەورەییەکەی بەس خوا دەزانێ، چەندە!

(جَنَّةُ ٱلۡمَأۡوَىٰٓ): بە هەشتی سرەوتگا، (سرەوتگا) بۆ خۆم داماتشیوە، چونکە سرەوتن بە مانای پشوودان و ئیسڕاحەت کردنە، سرەوتگاش یانی: شوێنی تێدا سرەوتن و ئیسڕاحەت، (**مَأْوَى**)، (**مَصْدَرُ: أَوَى يَأْوِي، أوِيّاً وَمَأْوَى، أَوَى إلى كَذَا: انْضَمَّ إلَيْهِ**)، (**مَأْوَى**): چاوگە لە (**أَوَى يَأْوِي، أوِيّاً**)وە، هاتوە، واتە: پەنای برد، پەنا دەبا، پەنا بردن، (**مَأْوَى**)ش بە مانای پەنابردن و، شوێنی تێدا پشوودان و تێدا سرەوتن، دێ، (**أَوَى إلى كَذَا: انْضَمَّ إلَيْهِ**)، واتە: چوو بۆ ئەو شوێنە، یاخود پەنای پێبرد و تێیدا سرەوت.

(مَا زَاغَ ٱلۡبَصَرُ): چاو لای نەدا، دیارە (**أل**)ی سەر (**بَصَر**) بۆ ناساندنە (**أل**)ی، (**عَهْد**)ە، واتە: چاوەکە لای نەدا، کە مەبەست پێی چاوی پێغەمبەرە ﷺ، یاخود (**أل**)ەکە، (**عِوَضٌ عَنِ الإضَافَة**)، یانی: (**مَا زَاغَ بَصَرُهُ**)، چاوی وی، هی پێغەمبەر ﷺ لای نەدا، (**الزَّيْغُ: المَيْلُ عَنِ الإسْتِقَامَة وَالتَّزَايُغُ: التَّمَايُلُ**)، (**زَيْغ**): بریتیە لە لادان لە ڕاستییەوەو لە خەتی نێوەڕاست، بە لای ڕاستدا، یان بە لای چەپدا پێی دەگوترێ: (**زَيْغ**)، وەک لە سوورەتی (**آل عمران**)، خوا دەفەرموێ: ﴿فَأَمَّا ٱلَّذِينَ فِي قُلُوبِهِمۡ زَيۡغٞ فَيَتَّبِعُونَ مَا تَشَٰبَهَ مِنۡهُ ﴿٧﴾﴾، ئەوانەی دڵیان لادانی تێدایە، بە دوای ئەو ئایەتانە دەکەون، کە مانای وێکچوویان هەن، نەک مانایەکی ڕوون و دیاریکراو، بەڵکو بە دوای ئەو ئایەتانە دەکەون کە مانایەک زیاتر هەڵدەگرن، (**تَزَايغ**)، بە مانای (**تَمَايل**)، واتە: لادان دێ، بەڵام لەسەر کێشی (**تَفَاعُل**)ە.

(طَغَىٰ): (**طَغَوْتُ وَطَغَيْتُ طُغْيَاناً وَطُغْوَاناً، وَأَطْغَاهُ كَذَا: حَمَلَهُ على الطُّغْيَانِ وَذَلِكَ تَجَاوُزُ الحَدِ في العِصْيَان**)، (**طَغَوْتُ وَطَغَيْتُ**)، هەردووکیان واتە: سنوورشکێنییم

www.alibapir.com


کرد، (**طُغْيَانَ وَطُغْوَانَ**)یش هەردووکیان چاوگن، بە مانای سنووربەزاندن و سنوور شکاندن، (**وَأطْغَاهُ كَذَا**)، فڵان شتە وای لێکرد، سنوور ببەزێنێ و سنوور بشکێنێ، (**حَمَلَهُ على الطُّغْيَانِ**)، واتە: هانیداو وای لێکرد، سنوور بشکێنێ، (**طُغْيَان**)یش، بریتیە لە (**تَجَاوُزُ الحَدّ في العِصْيَان**)، واتە: سنوورشکێنیی لە سەرپێچیی کردندا، سەرپێچییکردن هەر بۆ خۆی سنوور شکێنیە، بەڵام کەسێک کە زۆر تێبپەڕێنێ و سنوور ببەزێنێ، پێی دەگوترێ: (**طَغَى**).

## مانای گشتیی ئایەتەکان

بە کورتیی و پوختیی مانای ئایەتەکان دەکەین، لەبەر ئەوەی ئێمە دوایی کورتە باسێکمان هەیە لە بارەی چەمک و واتای ئەو ئایەتە موبارەکانەوەو، لە شیکردنەوەی ئایەتەکانیشدا، جارێکی دیکە هەڵوەستەیان لە بەردەمدا دەکەین.

خوا ﷽ دەفەرموێ: (بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ) بەناوی خوای بەبەزەیی بەخشندە، واتە:

دەستپێکردنم بە ناوی خوایە، کە ئەوەش مەبەستی ئەوەیە:

١- ئەم کارە تەنیا بۆ خوا دەکەم.

٢- ئەم کارە بە پێی شەرعی خوا دەکەم.

٣- ئەم کارە بە تواناو یارمەتیی خوای پەروەردگار دەکەم.

٤- ئەم کارە بۆ هێنانەدی ڕەزامەندیی خوا، ئەنجام دەدەم.

﴿وَالنَّجْمِ إِذَا هَوَىٰ﴾، سوێند بە ئەستێرە کاتێک ئاوا دەبێ، یاخود: سوێند بە ئەستێرە کاتێک دەکەوێ، کە لە ئەنجامی کەوتنەکەشیدا، لەبەر چاوی ئێمە ئاوا دەبێ، دەشگونجێ مەبەست پێی جووڵەی ئەستێرەکان بێ، یان مەبەست

www.alibapir.com


ئەوە بێ کە لەبەر چاوی ئێمە کاتێک خۆر هەڵدێ، ئەستێرەکان ئاوا دەبن، کە ئەستێرەکان هەر لە شوێنی خۆیانن، بەڵام ئەوە تیشکی خۆرە وا دەکات ئێمە ئەستێرەکان نەبینین، ﴿ وَٱلنَّجۡمِ إِذَا هَوَىٰ ١ مَا ضَلَّ صَاحِبُكُمۡ وَمَا غَوَىٰ ٢ ﴾، سوێند بە ئەستێرە کاتێک ئاوا دەبێ، یاخود دەکەوێ، هاوەڵەکەتان، کە موحەممەدە ﷺ و لە نیزیکەوە چاکی دەناسن و پێی ئاشنان، نە گومڕا بووەو نە بێمرادیش بووە، نە ئەوەیە ڕێی لێ تێکچووبێ و، نە ئەوەشە سەرگەردان و بێ ئاکام بووبێ.

﴿ وَمَا يَنطِقُ عَنِ ٱلۡهَوَىٰٓ ﴾، لە ئارەزووەوەش قسە ناکات، واتە: ئەوەی دەیڵێ کە قورئانە، وەک گوتراوە: قسە لە گیرفانی خۆی دەرناهێنێ و لە ئارەزووەوە قسە ناکات، ئەدی چییە؟

﴿ إِنۡ هُوَ إِلَّا وَحۡيٞ يُوحَىٰ ﴾، ئەوەی دەیڵێ، تەنیا سروشێکە بۆ لای دەنێردرێ و، بۆی سروش دەکرێ.

﴿ عَلَّمَهُۥ شَدِيدُ ٱلۡقُوَىٰ ﴾، کەسێک فێری دەکات کە زۆر بەهێزە، هێزی زۆر توندە، واتە: فریشتەیەک کە زۆر بەهێزە، فێری دەکات، وەک لە سوورەتی **(التكوير)** دا، دەفەرموێ: ﴿ ذِي قُوَّةٍ عِندَ ذِي ٱلۡعَرۡشِ مَكِينٖ ﴾، خاوەن هێزێک کە لە لای خاوەن عەرش، پێگەدارو بەڕێزو حورمەتە، کە جبریلە **(عَلَيْه السَّلَام)**.

﴿ ذُو مِرَّةٖ فَٱسۡتَوَىٰ ﴾، واتە: زۆر عاقڵ و ژیرو بەهۆشە، عەقڵێکی زۆر پتەوی هەیە، یاخود ﴿ ذُو مِرَّةٖ ﴾، هەر بە مانای زۆر پتەوو بەهێزە، هەندێکیش ئاوایان لێکداوەتەوە: شێوەو دیمەنی زۆر جوانە، **(فَاسْتَوى)**، واتە: ڕێک وەستا، لە کاتێکدا خۆی پێشانی پێغەمبەردا ﷺ، واتە: هاتە سەر شێوەی ڕاستەقینەی خۆی.

﴿ وَهُوَ بِٱلۡأُفُقِ ٱلۡأَعۡلَىٰ ﴾، کە لەو کاتەدا لە ئاسۆی بەرزتر بوو، ئەمەیان باسی یەکەم خۆ پێشاندانی جیبریل دەکات بۆ پێغەمبەر ﷺ لەسەر زەوی.

﴿ ثُمَّ دَنَا فَتَدَلَّىٰ ﴾، دوایی نیزیک کەوتەوەو شۆڕبۆوە، خۆی وەنیزیک خست.

www.alibapir.com


﴿ فَكَانَ قَابَ قَوْسَيْنِ أَوْ أَدْنَىٰ ﴾، بە ئەندازەی دوو كەوان، یاخود نیزیكتریش بوو، دوو كەوان كە پێكەوە جووتكراون، یاخود: ﴿ قَابَ قَوْسَيْنِ ﴾، واتە: كەوانێك كە ئەملاولای هەن، چەند لێك نزیكن بەوجۆرە، یاخود: ﴿ قَابَ قَوْسَيْنِ ﴾، بە ئەندازەی دوو كەوان، ئەگەر درێژ بكرێن، یانی: دوو باسك، یاخود كەمتریش لێی نیزیك بۆوە، لە پێغەمبەری خوا ﷺ.

﴿ فَأَوْحَىٰٓ إِلَىٰ عَبْدِهِۦ مَآ أَوْحَىٰ ﴾، ئنجا (خوا) سروشی كرد بۆ لای بەندەكەی ئەوەی بۆی سروشكرد، دەشگونجێ بڵێین: جیبریل سروشی كرد بۆ بەندەی خوا، ئەوەی بۆی سروشكرد، واتە: بەس خوا دەزانێ چی بوو و چۆن بوو؟ نایەتە وەصف لەبەر مەزنیی.

﴿ مَا كَذَبَ ٱلْفُؤَادُ مَا رَأَىٰٓ ﴾، عەقڵەكە (ی پێغەمبەر ﷺ) هەڵەی نەكرد، لەوەدا كە بینی، بە هەڵەدا نەچوو، درۆی نەكرد، بەڵكو ڕێك ئەوەی چاو بینیبووی، عەقڵیش پێی باوەڕدار بوو، یان ئەوەی بەچاو بینیبووی، عەقڵیش پشتگیری كردو هەڵەی نەكرد، لەبەر ئەوەی بەر لەوەی بە چاو جیبریل ببینێ، بە عەقڵ و دڵی جیبریلی ناسیبوو، پێی ئاشنابوو، بۆیە عەقڵەكەی بەهەڵەدا نەچوو بوو لەوەدا كە بە چاو بینی.

﴿ أَفَتُمَٰرُونَهُۥ عَلَىٰ مَا يَرَىٰ ﴾، ئایا ئێوە مشتومڕی لەگەڵدا دەكەن، لەسەر ئەوەی دەیبینێ، یانی: ئایا مشتومڕ لەگەڵ موحەممەد دا ﷺ دەكەن، لەسەر ئەوە كە جیبریل دەبینێ؟!

﴿ وَلَقَدْ رَءَاهُ نَزْلَةً أُخْرَىٰ ﴾، بەدڵنیایی لە دابەزینێكی دیكەشدا بینیویەتی، ﴿ عِندَ سِدْرَةِ ٱلْمُنتَهَىٰ ﴾، لە لای درەختی كۆتایی، ﴿ عِندَهَا جَنَّةُ ٱلْمَأْوَىٰٓ ﴾، كە بەهەشتی سرەوتگای بڕواداران لەوێیە، ﴿ إِذْ يَغْشَى ٱلسِّدْرَةَ مَا يَغْشَىٰ ﴾، كاتێك ئەوەی ئەو درەختە دادەپۆشێ، كە دایدەپۆشێ، یانی: شتێك كە وەسف ناكرێ.

www.alibapir.com


﴿ مَا زَاغَ ٱلْبَصَرُ وَمَا طَغَىٰ ﴾، چاو، واتە: چاوی پێغەمبەر ﷺ لای نەداو سنوور شكێنییشی نەكرد، بەو شێوەیەی بۆی دیارییكرابوو، سەرنجی ئەو شتانەی دا.

﴿ لَقَدْ رَأَىٰ مِنْ ءَايَٰتِ رَبِّهِ ٱلْكُبْرَىٰٓ ﴾، بە دڵنیاییی لە نیشانە گەورەكانی پەروەردگاری خۆی، بینی، لەو سەفەری شەوڕۆییەدا، كەواتە: ئەی كافرەكان! ئێوە مشتومڕی لەگەڵدا مەكەن و شەڕە قسەی لەگەڵدا مەكەن، یاخود نكوولّیی مەكەن، چونكە خوێندراویشەتەوە: (**أَفَتَمرونه**)، یانی: (**أَفَتَجحَدونه**)، ئایا نكوولّیی لێ دەكەن لەوەدا، كە دەفەرمووێ: جیبریلم بینی كە فریشتەیەكەو وەحیی بۆ هێنام؟ هەڵبەتە كەسێكیش كە دەزانێ بەڵگەیە لەسەر كە نازانێ و، كەسێك كە دەبینێ، بەڵگەیە لەسەر كەسێك كە نابینێ و، هەرگیز نەدیتن و نەزانین بەڵگەنین و نەبوون، لەسەر نەبوون (**عدم العلم لایستلْزم علم العدم**).

لە تۆڕە كۆمەڵایەتییەكان لەگەڵتانین
Stay in touch on social media
نحن معكم عبر مواقع التواصل الاجتماعي
راگەیاندنی مەكتەبی مامۆستا عەلی باپیر
AliBapir/عەلی باپیر
archive.org/details/@alibapir
AliBapir/عەلی باپیر
AliBapir
www.alibapir.net
كوردی - عربي - English
كەناڵی راگەیاندنی مەكتەبی مامۆستا عەلی باپیر

www.alibapir.com


مەسەلە گرنگەکان

## مەسەلەی یەکەم:

**سوێند خواردنی خوا ﷻ بە ئەستێرە، لە کاتی کەوتنی، یان ئاوابوونیدا، کە موحەممەدی ئاشناو هاوەڵیان، نە گومڕایەو نە بێمرادەو، بە ئارەزووش قسە ناکات، بەڵکو لە سروشەوەیە، فریشتەیەکی خاوەن هێزی زۆرو خاوەن ژیری مەحکەم، بۆ وی چۆتە سەر شێوەی خۆی، لە کاتێکدا لە ئاسۆی هەرە بەرزدا بووە لەسەر زەوی، پاشان بۆ لای شۆڕبۆتەوەو نزیک بۆتەوەو، خوا ئەوەی مەبەستی بووە بۆ بەندەکەی خۆی ناردوەو، عەقڵەکەشی لەوەدا کە دیویەتی، بە هەڵەدا نەچووە:**

خوا دەفەرمووێ: ﴿وَٱلنَّجْمِ إِذَا هَوَىٰ ﴿١﴾ مَا ضَلَّ صَاحِبُكُمْ وَمَا غَوَىٰ ﴿٢﴾ وَمَا يَنطِقُ عَنِ ٱلْهَوَىٰٓ ﴿٣﴾ إِنْ هُوَ إِلَّا وَحْىٌ يُوحَىٰ ﴿٤﴾ عَلَّمَهُۥ شَدِيدُ ٱلْقُوَىٰ ﴿٥﴾ ذُو مِرَّةٍ فَٱسْتَوَىٰ ﴿٦﴾ وَهُوَ بِٱلْأُفُقِ ٱلْأَعْلَىٰ ﴿٧﴾ ثُمَّ دَنَا فَتَدَلَّىٰ ﴿٨﴾ فَكَانَ قَابَ قَوْسَيْنِ أَوْ أَدْنَىٰ ﴿٩﴾ فَأَوْحَىٰٓ إِلَىٰ عَبْدِهِۦ مَآ أَوْحَىٰ ﴿١٠﴾ مَا كَذَبَ ٱلْفُؤَادُ مَا رَأَىٰٓ ﴿١١﴾﴾.

## شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە سێزدە بڕگەدا:

١)- ﴿وَٱلنَّجْمِ إِذَا هَوَىٰ﴾، سوێند بە ئەستێرە کاتێک ئاوا دەبێ، یاخود: سوێند بە ئەستێرە کاتێک دەکەوێ، (و)ەکە، بۆ سوێند **(واو القسم)**ە، یانی: **(قَسَمَاً بالنَّجْمِ)**، چونکە سێ پیت هەن، سوێندیان پێ دەخورێ: **(و، ب، ت)**، **(والله، بالله، تالله)**، لە هەمووشیان ناودارتر (و)ە، لە هەمووان زیاتر بۆ سوێند بەکاردەهێنرێ.

کەواتە: **(والنَّجْم)**، یانی: سوێند بە ئەستێرە، ئنجا **(ألْ)**ی سەر **(نَجْم)**یش بۆ ناساندنەو، مەبەست پێی جینسە، واتە: سوێند بە تێکڕای ئەستێران، **(إذَا هَوى)**،

www.alibapir.com


لـە کاتێکـدا ئـاوا دەبـێ، (**والهُـوِيُّ: السُّـقُوطُ، وأُطْلِـقَ عَـلَى غُـرُوبِ الكَوْكَـبِ**)، (**هُـوِي**): بریتیـە لـە بەربوونـەوە، بـەڵام لێـرەدا بەکارهێـنراوە بـۆ ئاوابـوونی ئـەو ئەسـتێرەیە، ئەمـەش ئاماژەیـە بـەوە کـە ئەسـتێرەیەک نەتوانـێ بـەردەوام بـێ، لەبـەر چـاوان ون بـێ و، ئـاوا ببـێ، یاخـود جووڵـەی ببـێ، چـۆن دەیپەرسـتن؟ ئنجـا خـوا دەفەرمـوێ: سـوێند بـە ئەسـتێرە، کـە ئـاوا دەبـێ، یاخـود سـوێند بـە ئەسـتێرە، کـە دەکـەوێ.

**٢)**- ﴿ مَا ضَلَّ صَاحِبُكُمْ وَمَا غَوَىٰ ﴾، هاوەڵەکەتان (کە لە نیزیکەوە دەیناسن، موحەممەد ﷺ) نە گومڕا بووەو، نە بێمرادو بێ ئاکامیش بووە، بۆیەش دەفەرموێ: (**صَاحِبُكُم**)، هاوەڵەکەتان، چونکە لە نیزیکەوە ناسیویانەو لەگەڵی ژیاون و پێی ئاشنا بوون، ئەو موحەممەدەی ﷺ کە پێیەوە پەیوەستن و لە نیزیکەوە پێی ئاشنان، نە گومڕا بووە، (**وَمَا غَوَى**) نە بێمرادو بێ ئاکامیش بووە.

## ڕوونکردنەوەیەك لە بارەی واتای (ضَلّ) و (غوى)وە:

زانایـان هەموویـان لەسـەر ئـەوە یەکدەنگـن کـە (**ضَـلَّ**)، یانـی: (**ضَـاعَ وَفُقِـدَ**)، گومڕابـوو، نەمـا، ئنجـا ئەگـەر بـە (**لازِم**) بهێـنرێ، یانـی: ونبـوو، وەک: (**ضَـلَّ فُـلانٌ**)، فلانکـەس ون بـوو، (**ضَـلَّ البَعِـيْرُ**)، وشـترەکە ون بـوو، بـەڵام ئەگـەر بـە تێپەرکـەر (**مُتَعَـدِّي**) بهێـنرێ وەک: (**ضَـلَّ فُلَانٌ الطَّرِيْـقَ**)، فلانکـەس ڕێیەکـەی ون کـرد، ئـەو کاتـە بـە مانـای: ونکـردن و بـزر کـردن دێ، (**مَـا ضَـلَّ صَاحِبُكُـم**)، یـانی: (**مَـا ضَـلَّ صَاحِبُكُـم الطَّرِيْـقَ**)، هاوەڵەکەتـان ڕێـی ڕاسـتی ون نەکـردوەو بـزر نەکـردوە، نـەک مەبەسـت ئـەوە بـێ: ون نەبـووە، (**وَمَـا غَـوَى**)، بێمـرادو بـێ ئاکامیـش نەبـووە، ئنجـا لـە بـارەی مانـای (**ضَـلَّ**)ەوە، زانایـان هەموویـان لەسـەر ئـەوە یەکدەنگـن، کـە گوتمـان، بـەڵام لـە بـارەی (**غَـوَى**)وە، مـن ڕای پێنـج لـە زانایانـم هێنـاوە، کـە تەعبیـرو دارشـتنەکانیان لێـک جیـان و، هەندێـک جـار لـە ماناشـیان دا لێـک جیـان، دوایـی ڕای خۆشـم لـەو بـارەوە دەڵێـم، بەپێـی تێوەڕامانـم بـۆ قسـەی زانایـان و شـارەزایان:

www.alibapir.com



**یەکەم:** خاوەنی (**المعجم الوسيط**)، دەڵێ: (**غَوَى يَغْوِي غَوَايَةً أي: أَمْعَنَ فِي الضَّلال**)[1]، واتە: زۆر گومڕا بوو، یانی: مانای (**غَوَى**)ی، بە زۆر گومڕا بوو و زۆر سەری لێشێوا، کردوە.

هەروەها واتایەکی دیکەشی بۆ دێنێ و دەڵێ: (**غَوَى الشَّيْطَانُ فُلَاناً أي: أَضَلَّهُ وَخَيَّبَهُ**)، واتە: شەیتان فلانکەسی گومڕا کردو بێمراد کرد، (**خَيْبَة**) بە مانای بێ ئامانجیی و بێ ئاکامیی دێ.

دیسان واتایەکی دیکەش دێنێ و دەڵێ: (**الرَّضِيْعُ أَكْثَرَ مِنَ الرَّضَاعِ حَتَّى أَتْخَمَ وفَسَدَ جَوْفُهُ**)، کۆرپە زۆری مەمکی دایکی مژی، هەتا لە خۆی زیاد بوو و، نێو هەناوی تێکچوو، واتە: لە ئەنجامی زۆر شیر خواردندا، تێکچوو، ئەوە بۆ بەچکە حوشتریشیان بەکارهێناوە (**غَوِيَ الفَصِيْلُ أي: بَشِمَ**)، واتە: بەچکە حوشترەکە شیری زۆر خواردو سەرەنجام هەناوی تێکچوو.

**دووەم:** (**راغب الأصفهاني**) بە سێ واتایان هێناویەتی و دەڵێ:

**أ-** (**الغَوَايَةُ: جَهْلٌ عَنِ اعْتِقَادٍ فَاسِد**)، (**غَوَايَة**): نەزانینێکە لە بڕوا پێ بوونێکی هەڵەو خراپەوە.

**ب-** واتایەکی دیکە: (**غَوَى أي: خَابَ**)، واتە: پەشێمان و بێمراد بوو، بێ ئاکام بوو.

**ج-** واتایەکی دیکە: (**غَوَى: أي فَسَدَ عَيْشُه**)، ژیانی تێکچوو خراپ بوو.

**سێیەم:** (**الشوكاني**) دەڵێ: (**الغَيُّ: ضِدُّ الرُّشْدِ**)، (**غَيّ**) دژی (**رُشْد**)ە، (**رُشْد**)، ماناکەی چی بێ، (**غَيّ**) پێچەوانەکەیەتی، ئنجا دەڵێ: کە دەفەرموێ: (**وَمَا غَوَى: مَا خَابَ فِيْمَا طَلَبَ**)، لەوەدا کە داوای کردوەو بە دوایدا چووە، بێمرادو بێ ئاکام نەبووە، بۆیە دەڵێ: (**الغَيُّ: الخَيْبَةُ**)، (**غَيّ**): بە مانای بێمرادیی و بێ ئاکامیی دێ.

---

(١) المعجم الوسيط: ٦٦٧.

www.alibapir.com


**چوارەم:** (محمد حسين الطباطبائي) لە (تفسير الميزان)دا[1]، دەڵێ: (**الضَّلالُ: الخُرُوجُ وَالإنْحِرَافُ عَنِ الصِّرَاطِ المُسْتَقِيْم، وَالغَيُّ: خِلَافُ الرُّشْدِ الَّذِي هُوَ إِصَابَةُ الوَاقِع**)، واتە: (ضلال): بریتیە لە دەرچوون و لادان لە ڕێی ڕاست، بەڵام (غَيّ): پێچەوانەی (رُشْد)ە، کە بریتیە لە ئەوەی شتێک پڕ بە پێستی واقیع بێ، دوایی دەڵێ: (**مَا ضَلَّ صَاحِبُكُم وَمَا غَوَى: أي لَمْ يُخْطِئ فِي طَرِيْقِ السَّعَادَةِ، وَلاَ فِي الغَايَةِ المَطْلُوبَة الَّتي هِيَ السَّعَادَةُ الإنْسَانِيَة، وَهِيَ عُبُودِيَّتُه للهِ تَعَالَى**)، واتە: ڕێی بەختەوەریی ون نەکردوەو بە هەڵەدا نەچووە، نە لە ڕێیەکەدا بەهەڵەدا چووەو، نە لە ئامانجە داواکراوەکەش دا، کە بریتیە لە بەختەوەریی مرۆڤایەتیی کە لە بەندایەتیی دایە بۆ خوای بەرز.

**پێنجەم:** (ابن عاشور) دەڵێ: (**الضَّلاَلُ: عَدَمُ الإهْتِداءِ إلى الطَّرِيقِ المُوصِلِ إلى المَقْصُودِ، وَهُوَ مَجَازٌ فِي سُلُوكِ ما يُنَافِي الحَقَّ، وَالغَوايَةُ: فَسادُ الرَّأْيِ وتَعَلُّقُهُ بِالبَاطِل**)، (ضَلال): بریتیە لە بە ڕێ نەزانین، ڕێیەکی بە ئامانج گەیەنەر، کە لێرەدا مەبەست پێی گرتنی ڕێیەکە کە پێچەوانەی هەقە، بەڵام (غَوَايَة)، {کە چاوگی (غَوَى)یە} بریتیە لە تێگەیشتنی خراپ و پەیوەست بوونی بە شتی ناهەقەوە.

ئەوەش کە من لە کۆی قسەی زانایان بۆم دەردەکەوێ، ئاوایە:

(ضَـلال): بریتیـە لـە بـە ڕێ نەزانیـن و (غَوَايَـة) و (غَـيّ): بریتیـە لـە بێمـراد بـوون و بـێ ئاکامبـوون، واتـە: (ضَـلال) و (غَـي)، پێشـەکیی و ئەنجامـن، هەرکەسـێک تووشـی (ضـلال) بـوو، تووشـی (غَوَايَة)یـش دەبـێ، لـە ئەنجامـی بـە ڕێ نەزانینـدا، مـرۆڤ بـێ ئـاکام و بێمـراد دەبـێ، هـەروەک هیدایـەت و ڕوشـدیش لـەولاوە، هــەروان، وەک لەجێـی دیکـەش دا باسـم کـردوە، کـە بەداخـەوە زۆر لـە زانایـان ئەوانـە تێکـەڵ دەکەن، (ضـلال) هـەر بـە مانـای (غَـيّ) دێنـن و (هداية)یـش، بـە مانـای (رُشْـد) دێنـن، کـە لـە ڕاسـتییدا وانیـە، (هِدَايَـة)، واتـە: بـە ڕێ زانیـن، بـەڵام (رُشْـد)، یـانی: دوای ئـەوەی بـە ڕێـت زانیـوە، ئنجـا بـە مـراد و ئـاکام بگـەی و بگەیـە ئـەو ئامانجـەی دەتـەوێ.

---

(١) ج١٩، ص٢٧.

www.alibapir.com


کەواتـە: (رُشْـد)، واتـە: ئامانـج پێـکان، بـەڵام (غَوَایَـة)، واتـە: بێمرادیـی و بێئاکامیی، (ضَـلال) بـە ڕێ نەزانینـەو، (هِدَايَة)یـش بـە ڕێ زانینـە، یـانی: (ضَـلال) و (هُـدَى)، پێچەوانـەی یەکدیـن و، (غَـيّ) و (رُشْـد)یش، هـەر پێچەوانـەی یەکدیـن، (ضَـلال) و (هِدَايَـة) زیاتـر لایـەنی تیۆریـی و فیکریـی دەگرنـەوە، کـە (هِدَايَـة) بـە ڕێ زانینـەو، (ضَـلال) بـە ڕێ نەزانینـە، بـەڵام (رُشْـد) و (غَوَايَـة)، زیاتـر حاڵـەتی کردەییـن واتـە: بـە ئامانـج گەیشـتن و، بـێ ئـاکام بـوون و بێمـراد بـوون.

٣)- ﴿ وَمَا يَنطِقُ عَنِ ٱلْهَوَىٰٓ ﴾، لە ئارەزووەوە قسە ناکات و نادوێ، (الهَوَى: مَيْلُ النَّفْسِ إلى ما تُحِبُّهُ أَوْ تُحِبُّ أَنْ تَفْعَلَهُ، دُونَ أَنْ يَقْتَضِيَهُ العَقْلُ السَّلِيم)، (هَوَى): بریتیە لە ئارەزووکردنی نەفس بۆ شتێک کە حەزی لێ دەکات، یاخود حەزی لێیەتی بیکات، بەبێ ئەوەی عەقڵی ڕاست و چاک پەسندی بکات، واتە: ئەوەی موحەممەد ﷺ بۆتان دەفەرموێ، ئەو دوان و قسەکردنەی لە ئارەزووەوە نیە.

٤)- ﴿ إِنْ هُوَ إِلَّا وَحْىٌ يُوحَىٰ ﴾، ئەوەی دەیبێژێ تەنیا وەحییێکە سروش دەکرێ. (إِنْ): (إن النَّافِيَة)یە، یانی: (مَا هُوَ إلاَّ وَحيٌ يُوحى)، ئەوەی دەیڵێ تەنیا وەحییێکە بۆی سروش دەکرێ، پەیامێکە بۆی دەنێردرێ، ڕاناوی (هُوَ)، (عائِدٌ إلى المَنطُوقِ مِن فِعْلِ «يَنْطِقُ» كَما فـي قَوْلِهِ تَعالى: ﴿ ٱعْدِلُوا۟ هُوَ أَقْرَبُ لِلتَّقْوَىٰ ﴿٨﴾ ﴾المائدة، أي: العَدْلُ المَأْخُوذُ مِن فِعْلِ: ﴿ ٱعْدِلُوا۟ ﴾)، یەکێک بۆی هەیە بڵێ: (إنْ هُوَ إلاَّ وحيٌ يُوحى)، ئەم ڕاناوی (هُوَ)، بۆچی دەچێتەوە؟ دەڵێین: دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی پەیوەندیی بە بێژراوەوە هەیە، کە فەرموویەتی: ﴿ وَمَا يَنطِقُ عَنِ ٱلْهَوَىٰٓ ﴿٣﴾ ﴾، ئەوەی لە کرداری (يَنْطِقُ) وەردەگیرێ، واتە: ئەو دوانەی وی، تەنیا وەحییە، بۆی سروش دەکرێ، ئنجا ئەمە وەک قسەی خوای بەرز وایە کە دەفەرموێ: ﴿ ٱعْدِلُوا۟ هُوَ أَقْرَبُ لِلتَّقْوَىٰ ﴿٨﴾ ﴾المائدة، ڕاناوی (هُوَ)، بۆچی دەچێتەوە؟ کە دەفەرموێ: دادگەر بن ئەوە لە پارێزکارییەوە نیزیکترە، باسی عەدل نەکراوە، بەڵام ئەو عەدلەی لە (اعْدِلُوا)، وەردەگیرێ، ئەوە لە پارێزکارییەوە نیزیکترە، لێرەش (إنْ هُوَ إلاَّ وَحيٌ يُوحَى)، واتە: ئەو بێژراوەی لە کرداری (يَنْطِقُ)، وەردەگیرێ، ئەوە تەنیا سروشێکە بۆی دەنێردرێ.

www.alibapir.com


٥)- ﴿عَلَّمَهُۥ شَدِيدُ ٱلۡقُوَىٰ﴾، یەکێکی زۆر بەهێز فێری کردوە، کە مەبەست پێی جیبریلە، یانی: (عَلَّمَهُ مَلَكٌ شَدِيدُ القُوَى)، فریشتەیەکی زۆر خاوەن هێزی پتەو فێری کردوە.

کە دەفەرمووێ: (عَلَّمَهُ) ڕاناوەکە بۆ پێغەمبەر دەچێتەوە، واتە: فێری موحەممەدی کردوە، فریشتەیەکی زۆر بەهێز، دەگوترێ: (رَجُلٌ شَدِيدُ القُوَى، أي: شَدِيدُ أَسْرِ الخَلْق)، یانی: ئەندامەکانی زۆر پتەون، (شَدِيدُ القُوى)، واتە: لە ڕووی جەستەییەوە زۆر بەهێزە، جەستەی فریشتانیش لە ڕووناکیی دروست بووە، وەک پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: {خُلِقَتِ الْمَلَائِكَةُ مِنْ نُورٍ}[1].

٦)- ﴿ذُو مِرَّةٖ﴾، خاوەن هۆشێکی بەهیزو دیمەنێکی جوان، (ذُو)، یانی: (صَاحِب)، (مِرَّة) بە سێ واتایان هاتوە:

أ- {(المِرة): قُوَّةُ الذَّات} لە زاتی خۆیدا زۆر بەهێزە.

ب- (المِرّة: مَتَانَةُ العَقْلِ وَأَصَالَتَهُ)، عەقڵ و هۆشێکی زۆر بەهێزو ڕەسەنی هەیە، ئنجا لەبەر ئەوەی پێشێ فەرمووی: (شَدِيدُ القُوى)، وا پێدەچێ (ذو مِرَّة): بە مانای عەقڵ و هۆشێکی زۆر بەهێزی هەیە، بێ، وەک چۆن جەستەیەکی زۆر بەهێزیشی هەیە.

ج- هەندێکیش گوتوویانە: (مِرَّة): بە مانای دیمەنی جوان دێ.

٧)- ﴿فَٱسۡتَوَىٰ﴾، ئنجا (جیبریل) ڕێک وەستا، (مُفَرَّعٌ عَلَى «عَلَّمَهُ» وَالفاءُ لِتَفْصِيلِ عَلَّمَهُ، والمُسْتَوِي هُو جِبْرِيلُ)، (ف)ەکە، پەیوەندیی بە (فێری کرد)ەوە هەیە، ڕێک وەستاو (مُستوي)یش جیبریلە، یانی: ئەو فریشتە زۆر بەهێزەی فێری کرد، ڕێک وەستا، هاتە سەر شێوەی خۆی.

٨)- ﴿وَهُوَ بِٱلۡأُفُقِ ٱلۡأَعۡلَىٰ﴾، لە کاتێکدا ئەو لە ئاسۆی هەرە بەرز بوو، ئەمە مەبەست پێی یەکەمین بینینی پێغەمبەرە ﷺ بۆ جیبریل لەسەر زەوی، وەک لە صەحیحی

---

(١) أخرجه أحمد: ٢٥٢٣٥، ومسلم: ٢٩٩٦، وعبد بن حميد: ١٤٧٩، وإسحاق بن راهويه: ٧٨٦، وابن حبان: ٦١٥٥.

www.alibapir.com



بوخاریی و صەحیحی موسلیمدا هاتوە[1]، کە پێغەمبەر ﷺ کاتێک جیبریلی ئاوا بینیوە، کەوتوەو زۆر ترساوەو داچڵەکاوە، جیبریلیش ئاسۆی ون کردوە، ئەوەندە گەورە بووە.

(**الأُفُقُ: اسْمٌ لِلْجَوِّ الَّذِي يَبْدُو لِلناظِرِ**)، (**أُفُقْ**)، ناوە بۆ ئەو جەووەی لە بابای بینەر دەردەکەوێ، (**وغَلَبَ إطْلاقُهُ عَلى ناحِيَةٍ بَعِيدَةٍ عَنْ مَوْطِنِ القَوْمِ**)، بەزۆریی بە شوێنێکی دوور لە نشینگەی کۆمەڵە خەڵکەکەوە، گوتراوە.

لێرەدا مەبەست ئەو کاتەیە کە جیبریل (**عَلَيْهِ السلام**)، بۆ یەکەم جار لەسەر شێوەی ڕاستەقینەی، خۆی پێشانی پێغەمبەردا ﷺ، کە وەک دوایی باسی دەکەین، پێغەمبەری خاتەم ﷺ جیبریلی زۆرجار بینیوە لە شێوەی پیاوێکدا، بۆ وێنە: شێوەی (**دحية الكلبي**)دا، کە یەکێک بووە لە هاوەڵان، بەڵام تەنیا دووجاران لە شێوەی ڕاستەقینەی خۆیدا، دیتوویەتی:

یەکەمجار: لەسەر زەوی، کە ئەو یەکەمجارەیە، ئێستا ئەم ئایەتانە باسی دەکەن.

دووەمجار: لەئاسمان، وەک خوا بسم الله الرحمن الرحيم دەفەرموێ: ﴿وَلَقَدْ رَءَاهُ نَزْلَةً أُخْرَىٰ ﴿١٣﴾ عِندَ سِدْرَةِ ٱلْمُنتَهَىٰ ﴿١٤﴾﴾ واتە: بەدڵنیایی جارێکی دیکەش بینی، لەلای درەختی کۆتایی.

وشەی (**فاسْتَوى**)، زانایان دوو واتایان بۆ لێکداونەوە:

یەکەم: ڕێک وەستاو خۆی پێشاندا، بە شێوە ڕاستەقینەی خۆی، کە لە سەریەتی.

دووەم: هەڵسا زۆر بە ئیرادەیەکی پتەوەوە، بۆ ئەوەی پەیامی خوا وەربگرێ، یان بۆ ئەوەی پەیامی خوا بگەیەنێ.

کەواتە: (**فاسْتَوى**)، یان مەبەست پێی حاڵەتی جەستەیی و ماددییە، یان مەبەست حاڵەتی مەعنەویی و ڕووحییە.

---

(١) أخرجه البخاري: ٤٨٥٦، ومسلم: ١٧٤.

www.alibapir.com



٩)- ﴿ثُمَّ دَنَا﴾، دوایی نیزیک کەوتەوە، جیبریل بۆلای موحەممەد شۆڕبۆوە. (**ثُمَّ للتراخِي الرُّتَبِي**)، (**ثمَّ**) بۆ بە دواداهاتنی پلەییە، چونکە دوای ئەوەی جیبریل لە شێوەی ڕاستەقینەی خۆیدا، خۆی پیشانداوە، ئنجا نزیک کەوتۆتەوە.

١٠)- ﴿فَتَدَلَّىٰ﴾، ئنجا خۆی شۆڕکردەوە، لە سەرێوە بەرەوخوار دابەزی. (**وتَدَلَّى: انْخَفَضَ مِن عُلوٍّ قَلِيلاً**)، واتە: شۆڕبۆوە لەسەرێوە خۆی شۆڕ کردەوە.

١١)- ﴿فَكَانَ قَابَ قَوْسَيْنِ أَوْ أَدْنَىٰ﴾، بە ئەندازەی دوو کەوان، یاخود نزیکتریش بوو، واتە: لەگەڵ پێغەمبەردا ﷺ هێندە نیزیک بۆوە، وەک چۆن دوو کەوان لێک نیزیک دەکەونەوە، دوایی زیاتر ئەمە شی دەکەینەوە.

١٢)- ﴿فَأَوْحَىٰٓ إِلَىٰ عَبْدِهِۦ مَآ أَوْحَىٰ﴾، ئنجا بۆ بەندەکەی خۆی سروشکرد، ئەوەی بۆی نارد،واتە:خوا سبحانه وتعالى سروشی بۆلای بەندەی خۆی کرد(کەموحەممەدە ﷺ)ئەوەی بۆلای سروشکرد، یاخود جیبریل بە بەندەی خوای ڕاگەیاند، ئەوەی پێی ڕاگەیاند، بەڵام زیاتر وا پێدەچێ ڕاناوی شێرراوە (**مُسْتَتِر**)ی نێو (**أَوْحَى**) بۆ خوای پەروەردگار بچێتەوە، چونکە جیبریل تەنیا گەیاندنی لەسەر بووە، بەڵام وەحیی ناردنەکە هی خوای بەرز بووە، یانی: (**فَأَوْحَى الله عَن طَرِيْق جِبْرِيْل إلى عَبْدِهِ مَا أَوْحَى**)، خوا لە ڕێی جیبریلەوە بۆ لای بەندەکەی خۆی، کە موحەممەدە ﷺ ناردی، ئەوەی بۆی نارد.

وشـەی (مَـا)، (**مَـا: إبْهَـامٌ للتَفْخِيْـم**)، بـۆ مـەزن پیشـاندان و گـەورە پیشـاندانی ئەوەیە، کە خوا سبحانه وتعالى بۆموحەممەدی ﷺ ناردوە.

١٣)- ﴿مَا كَذَبَ ٱلْفُؤَادُ مَا رَأَىٰٓ﴾، عەقڵ، دڵ ئەوەی دیتی درۆی تێدا نەکرد، تێیدا بەهەڵەدا نەچوو. (**مَا كَذَبَ**)، خوێنراویشەتەوە: (**مَا كَذَّبَ**)، یانی: بە درۆی دانەنا، بەڵام (**مَا كَذَبَ**)، یانی: درۆی نەکردو بەهەڵەدا نەچوو، عەقڵ یان دڵ واتە: عەقڵ و دڵی موحەممەد ﷺ، ئنجا (مَا كَذَبَ ٱلْفُؤَادُ مَا رَأَىٰٓ) بەدوو شێوە مانایان لێکداوەتەوە:

**یەکەم:** (**مَا أَخْطَأَ عَقْلُهُ فِيْمَا رَآهُ**)، عەقڵی پێغەمبەر ﷺ بەهەڵەدا نەچوو بوو، لەوەدا کە بە چاوبینی، واتە: ئەوەی بە چاوبینی، عەقڵیشی لە ناسینیدا، بەهەڵەدا نەچوو.

**دووەم:** (**لَمْ يكْذِب قَلْبُهُ، أو عَقْلُهُ فِيْمَا رَآهُ وَأبْصَرَهُ**)، عەقڵی، یان دڵی (پێغەمبەر ﷺ) درۆی نەکرد لەوەدا کە بینی، یانی: ئەوەی بە چاو بینیبووی، عەقڵیشی درۆی نەکردو هەواڵی بە درۆی نەدا.

بەڵام: (**مَا كَذَّبَ الفُؤَادُ مَا رَأَى**)، واتە: دڵ و عەقڵی پێغەمبەری خوا ئەوەی بە درۆ دانەنا، کە بە چاو بینیبووی، بەڵکو بە ڕاستی دانا، واتە: عەقڵ و چاوی پێغەمبەر ﷺ پشتگیریی یەکدییان کرد، لەوەدا کە بینی.

(**إبْنُ عَجِيْبَة**)، خاوەنی: (**البَحْرُ المديد في تفسير كتاب الله المجيد**)، بۆئەم تەعبیرە، دوو ڕای هێناون:

**أ-** (**مَا قَالَ فُؤَادُهُ لَمَّا رَآهُ: لَمْ أَعْرِفْكَ، وَلَوْ قَالَ ذَلِكَ، لَكَانَ كَاذِبَاً لأنَّهُ عَرَفَهُ بِقَلْبِهِ، كَمَا عَرَفَهُ بِبَصَرِهِ**)، واتە: عەقڵەکەی (پێغەمبەر ﷺ) کاتێک کە (جیبریلی) بینی، نەیگوت: ناتناسم، ئەگەر وای گوتبایە، بە درۆکار دادەنرا، چونکە بە دڵ و عەقڵ جیبریلی ناسیبوو، وەک چۆن بە چاو ناسیی و بینی.

**ب-** (**مَا كَذَبَ القَلْبُ فِيْمَا رَآهُ البَصَرُ، بَلْ مَا رَآهُ البَصَرُ حَقَّقَهُ**)، عەقڵ و دڵەکەی (پێغەمبەر ﷺ) درۆی نەکرد لەوەدا کە بە چاو بینی، بەڵکو ئەوەی بە چاو یتبووی، بە دڵیش چەسپاندی و ساغی کردەوە (کە ئەوە جیبریل خۆیەتی).

لە تۆڕە کۆمەڵایەتییەکان لەگەڵتانین
Stay in touch on social media
نحن معكم عبر مواقع التواصل الاجتماعي
ڕاگەیاندنی مەکتەبی مامۆستا عەلی باپیر
عەلی باپیر/AliBapir
archive.org/details/@alibapir
عەلی باپیر/AliBapir
AliBapir
کەناڵی
ڕاگەیاندنی مەکتەبی مامۆستا عەلی باپیر
www.alibapir.net
عربي - کوردی - English
ڕاگەیاندنی مەکتەبی مامۆستا عەلی باپیر

www.alibapir.com


کورتە باسێک: سێ سەرنجی ورد

**سەرنجی یەکەم:** ﴿ وَمَا يَنطِقُ عَنِ الْهَوَىٰ ۝٣ ﴾، لە ئارەزووەوە قسە ناکات، واتە: ئەوەی موحەممەد دەیڵێ، لە ئارەزووەوە نایڵێ، کە مەبەست پێی قورئانە، بەڵام زانایان لەو بارەوە زۆریان قسە کردوەو، هاتوونە سەر باسی ئەوەش کە: ئایا وەحیی خوا ﷻ بۆ پێغەمبەرەکەی ﷺ تەنیا قورئان بووە[1]؟ لەو بارەوەش ئەم دەقە دێنن کە پێغەمبەر فەرموویەتی: {**أَلاَ إِنِّي أُوتِيتُ الْكِتَابَ وَمِثْلَهُ مَعَهُ**} (**أخرجه أحمد: ١٧٢١٣، وأبو داود: ٤٦٠٤**)، واتە: ئاگادار بن! من کتێبم پێدراوەو، وێنەی ئەویشم پێدراوە.

بێگومان سوننەتیش هەر بریتیە لە جێبەجێ کردنی قورئان لە بەشێکی زۆری دا، بۆ بەشێکیشی بریتیە لە ڕوونکردنەوەی هەندێک لە ئایەتەکانی قورئان، لە چۆنیەتیی جێبەجێ کردنیان دا، یان لە چۆنیەتیی لێ تێگەیشتنیان دا، پێشتریش باسی ئەو بابەتەمان کردوە، بەڵام ئەگەر ئینسان باش سەرنجی ئایەتەکان بدات، دەزانێ کە ئەوانەی مشتومڕیان بووە لە خزمەت پێغەمبەردا ﷺ و نکووڵییان لێکردوە، نەیانگوتوەو مشتومڕیان لەسەر ئەوە نەبووە، کە هەموو ئەو قسانەی دەیانکەی وەحیی نین، بەڵکو مشتومڕ هەمووی لەسەر قورئان بووە، یانی: (**محل النزاع**)، شوێنی مشتومڕ، قورئان بووە، پێغەمبەریش ﷺ کێشەو مشتومڕی لەگەڵ قورەیش و لەگەڵ کافرەکانی مەککەدا لە سەر ئەوە نەبووە، کە بڵێ: هەرچی دەیڵێم وەحییە، بەڵکو فەرموویەتی: قورئان وەحییە.

---

(١) بێگومان پێغەمبەری خوا ﷺ جگە لە قورئانیش وەحیی دیکەی بۆ هاتوە کە سوننەت گرتوویەتە خۆی، بەڵام بەدڵنیایی قورئان هەمووی وەحیی خوایە، بەڵام ڕێباز (سنة) وانیەو جۆراو جۆرە.

www.alibapir.com



بێگومانیش پێغەمبەر ﷺ هەرچی فەرموویەتی و کردوویەتی، هەمووی هەر وەحیی نەبووە، بە بەڵگەی ئەوە کە خوا ﷻ لە چەند شوێن لە قورئاندا، ئەو ئیجتیهادو کۆششانەی کە پێغەمبەر ﷺ کردوونی و تێیاندا نەیپێکاوە، بۆی ڕاست کردوونەوە، بۆ وێنە:

**أ-** ئەو شێوە مامەڵەیەی لەگەڵ (**عبدالله ابن أم مكتوم**)دا کردی، کە لە سەرەتای سووڕەتی (**عبس**)دا باسکراوە:

﴿عَبَسَ وَتَوَلَّىٰٓ ﴿١﴾ أَن جَآءَهُ ٱلْأَعْمَىٰ ﴿٢﴾ وَمَا يُدْرِيكَ لَعَلَّهُۥ يَزَّكَّىٰٓ ﴿٣﴾ أَوْ يَذَّكَّرُ فَتَنفَعَهُ ٱلذِّكْرَىٰٓ ﴿٤﴾ أَمَّا مَنِ ٱسْتَغْنَىٰ ﴿٥﴾ فَأَنتَ لَهُۥ تَصَدَّىٰ ﴿٦﴾ وَمَا عَلَيْكَ أَلَّا يَزَّكَّىٰ ﴿٧﴾ وَأَمَّا مَن جَآءَكَ يَسْعَىٰ ﴿٨﴾ وَهُوَ يَخْشَىٰ ﴿٩﴾ فَأَنتَ عَنْهُ تَلَهَّىٰ ﴿١٠﴾ كَلَّآ .... ﴿١١﴾﴾، (**كلاّ**) واتە: جارێکی دیکە وانەکەی، یاخود: ئەوان ڕاست ناکەن، گرنگ ئەوەیە خوا لەوبارەوە ڕەخنەی لە پێغەمبەر گرت و، لە شوێنەواردا هاتوە، هەندێک جار پێغەمبەری خوا ﷺ کە عەبدوڵڵای دەبینی، دەیفەرموو: (**مَرْحَبَاً بِالَّذِي عَاتَبَنِي فِيهِ رَبِّي**)، سڵاو لەو کەسەی لەسەر وی، پەروەردگارم گلەیی لێ کردم و، سەر کۆنەی کردم.

**ب-** هەروەها لە مەسەلەی مۆڵەتدانی هەندێک لە دڵ نەخۆش و ئیمان لاوازەکان، یان دەغەڵ و مونافیقەکان لە جەنگی تەبووکدا، کە پێغەمبەر ﷺ مۆڵەتی دان نەیەن، خوا ڕەخنەی لێگرت: ﴿عَفَا ٱللَّهُ عَنكَ لِمَ أَذِنتَ لَهُمْ حَتَّىٰ يَتَبَيَّنَ لَكَ ٱلَّذِينَ صَدَقُوا۟ وَتَعْلَمَ ٱلْكَـٰذِبِينَ ﴿٤٣﴾﴾، واتە: خوا لێت ببووری بۆچی مۆڵەتت دان، تاکو ئەوانەی ڕاست دەکەن، لەگەڵ ئەوانەی درۆکار بوون، بۆت لێک جیابووبانەوە؟

**ج-** هەروەها لە بواری مامەڵەی لەگەڵ دیلەکانی جەنگی بەدردا خوا ڕەخنەی لێگرت: ﴿مَا كَانَ لِنَبِىٍّ أَن يَكُونَ لَهُۥٓ أَسْرَىٰ حَتَّىٰ يُثْخِنَ فِى ٱلْأَرْضِ ﴿٦٧﴾﴾ **الأنفال**، واتە: هیچ پێغەمبەرێک بۆی نیە، دیلان بگرێ، هەتا کافران لە پەل و پۆ نەخات، لە زەوییدا، تاکو زۆریان کوشتار لێ نەکات، یانی: ڕەخنەکەی خوای کاربەجێ لە سووڕەتی (**الأنفال**)دا، لەسەر ئەوە نیە، کە بۆچی دیلەکانی نەکوشتوون؟ چونکە دیل هەر ناکوژرێ، بەڵکو

www.alibapir.com


گلەییەکە لەسەر ئەوەیە بۆچی بە دیلتان دەگرتن، بە تەماعی ئەوەی قەرەبوویان لە بەرانبەردا وەربگرن.

هەروەها لە شوێنی دیکەشدا هاتوە، کە خوا ﷻ هەندێک لە هەڵوێستەکانی پێغەمبەرەکەی کە لە ئیجتیهادو کۆششیەوە هەڵقوڵیون، ڕەخنەی لێگرتوون.

کەواتە: ناگونجێ بڵێین: پێغەمبەر ﷺ هەرچی فەرموویەتی: هەمووی وەحیی بووە، بەڵکو لێرەدا ﴿وَمَا يَنطِقُ عَنِ ٱلْهَوَىٰٓ﴾ مەبەست قورئانە، بەڵام بێگومان جگەلە قورئانیش، وەحیی بۆ هاتوەو، هەر شتێک بە وەحیی بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ هاتبێ، سەدا سەد تێیدا پێکاوە، بەڵام ئەوەی بە کۆششی خۆی بوو بێ، زۆر جاران پێکاویەتی و، جاروباریش نەیپێکاوە، ئنجا کە نەیپێکابێ، خوا ﷻ بۆی ڕاستکردۆتەوە.

بەڵێ ئەوەی شوێنی مشتومڕ بووە، بریتی بووە لە قورئان، بۆیە: ﴿وَمَا يَنطِقُ عَنِ ٱلْهَوَىٰٓ ﴿٣﴾﴾، ناکرێ بە بەڵگە بهێنرێتەوە لەسەر ئەوە کە هەرچی پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی، هەمووی وەحییە، لەبەر ئەو بەڵگانەی باسمانکردن و، لەبەر ئەوەش کە ئەوەی کێشەو مشتومڕی لەسەر بووە، ئەوە بووە: ئایا قورئان فەرمایشتی خوایە، بۆ پێغەمبەر (موحەممەد)ی دەنێرێ، یان موحەممەد وەک کاهینێک دەیڵێ، یان وەک شاعیرێک، یان وەک جادووگەرێک، یان وەک شێتێک، یان وەک هەڵبەستەرێک: ﴿أَمْ يَقُولُونَ ٱفْتَرَىٰهُ ﴿٨﴾﴾الأحقاف؟! حاشای پێغەمبەری خوا ﷺ لەو تۆمەتانە.

کەواتە: ئەصڵی کێشە لەسەر قورئان بووە، لەبەر ئەوە ناگونجێ ﴿وَمَا يَنطِقُ عَنِ ٱلْهَوَىٰٓ﴾ بە بەڵگە بهێنرێتەوە لەسەر ئەوە کە هەرچی پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی، هەمووی وەحییە، هەڵبەتە ئەوەی وەحیی بێ، وەحییە، بە بەڵگە، بەڵام ئەم ئایەتە ناکرێتە بەڵگە لەسەر ئەوەی هەرچی لە زاری موبارەکی پێغەمبەر دەرچووە، هەمووی وەحییە، بەڵکو جاری وا هەیە، پێغەمبەر ﷺ شتێکی فەرمووەو، دوایی

www.alibapir.com


بۆ خۆی دەستبەرداری بووە، بۆ وێنە: موتوربە کردنی دارخورمایەکان کە فەرمووی: پێم وایە ئەگەر واش نەکەن، زەرەری نیە، دوایی هاوەڵان وازیان هێنا لە موتوربە کردنی دارخورمایەکان و بەریان نەگرت و چوونەوە خزمەتی، ئەویش فەرمووی: ئەگەر شتێکم پێگوتن وەک وەحیی، لێم وەربگرن، بەڵام بە ڕای خۆم وامگوت، ئەگەر شتێک بە ڕای خۆم وامگوت، ئێوە لە کاروباری دنیاتاندا شارەزاترن، (**فأنتم أعلم بأمر دنياكم**) وەک لە (صحيح مسلم)دا هاتوە[1].

**سەرنجی دووەم:** کە دەفەرموێ: ﴿ عَلَّمَهُۥ شَدِيدُ ٱلۡقُوَىٰ ﴾، ئەو کەسە فێری کردوە، کە زۆر بەهێزە، (**قُوَى**) کۆی (**قوَّة**)یە، (**قُوَى**)، یانی: هێزەکان، بەڵام لێرە هەر بە مانای هێز (**قوة**) بەکارهاتوە، بۆ دەلالەت لەسەر زۆر بەهێزیی، یانی: زۆر زۆر بەهێز، زاتێکی زۆر بەهێز فێری کردوە، هەندێک لە زانایان گوتوویانە: مەبەست پێی خوای بەرزە، ئنجا ئەگەر مەبەست پێی خوای بەرز بێ، بێگومان شەش سیفەتەکانی دیکەش هەر بۆ خوای بەرزی بێ وێنە دەگەڕێنەوە: ١- ﴿ عَلَّمَهُۥ شَدِيدُ ٱلۡقُوَىٰ ﴾، ٢- ﴿ ذُو مِرَّةٖ ﴾، ٣- ﴿ فَٱسۡتَوَىٰ ﴾، ٤- ﴿ وَهُوَ بِٱلۡأُفُقِ ٱلۡأَعۡلَىٰ ﴾، ٥- ﴿ ثُمَّ دَنَا ﴾، ٦- ﴿ فَتَدَلَّىٰ ﴾، ٧- ﴿ فَكَانَ قَابَ قَوۡسَيۡنِ أَوۡ أَدۡنَىٰ ﴾.

هەموویان بۆ خوا دەچنەوە، بەدڵنیاییش ئەو سیفەتانە لەگەڵ خوای پەروەردگاردا ناگونجێن، بۆیە ڕای ڕاستتر ئەوەیە: کە مەبەست پێی جیبریلە (**عليه السلام**)، بەڵگەمان چییە؟ ئێستا با ئەوە ساغ و ڕوون بکەینەوە، چونکە هەندێک لە تەفسیرەکان، هەندێک شوێنەواریش دێنن و دەڵێن: ئەو سیفەتانە مەبەست پێیان خوای بەرزی مەزنە، بەڵام بەو سێ بەڵگانەی من ئێستا دەیانهێنمەوە، دەسەلمێنرێ کە ناگونجێ ئەو سیفەتانە بۆ خوا بەکاربهێنرێن:

**یەکەم:** لە سووڕەتی (**التكوير**)، ئایەتەکانی: (١٩ - ٢٣)دا، هەر شێوەی ئەو ئایەتانە بۆ جیبریل بەکارهاتوون، لەوێ هیچ گومانی تێدانیە، کە مەبەست جیبریلە: ﴿ إِنَّهُۥ لَقَوۡلُ رَسُولٖ

---

(١) أخرجه مسلم: ٢٣٦٣، عن أنس وعائشة معًا.

www.alibapir.com


كَرِيمٍ ﴿١٩﴾ ذِى قُوَّةٍ عِندَ ذِى ٱلْعَرْشِ مَكِينٍ ﴿٢٠﴾ مُّطَاعٍ ثَمَّ أَمِينٍ ﴿٢١﴾ وَمَا صَاحِبُكُم بِمَجْنُونٍ ﴿٢٢﴾ وَلَقَدْ رَءَاهُ بِٱلْأُفُقِ ٱلْمُبِينِ ﴿٢٣﴾﴾، ئەمانە بێگومان هەموویان وەسفن بۆ جیبریل (**علیه السلام**):

﴿إِنَّهُۥ﴾، ئـەم قورئانـە، ﴿لَقَوْلُ رَسُولٍ كَرِيمٍ﴾، قسـەی نێردراوێکـی بەڕێـزە، ﴿ذِى قُوَّةٍ﴾، خـاوەن هێـزە، وەک لێـرە دەفەرمـوێ: ﴿شَدِيدُ ٱلْقُوَىٰ﴾، لەوێـش دەفەرمـوێ: ﴿ذِى قُوَّةٍ﴾، خـاوەن هێـزە، ﴿عِندَ ذِى ٱلْعَرْشِ مَكِينٍ﴾، لـە لای خـاوەن عـەڕش، (کـە خوایـە) بەڕێـزو حورمـەت و خـاوەن پێگەیـە، ﴿مُّطَاعٍ﴾، گوێڕایەڵیـی بـۆ کـراوە، ﴿ثَمَّ أَمِينٍ﴾، لـەوێ ئەمینـدارە، ﴿وَمَا صَاحِبُكُم بِمَجْنُونٍ﴾ هاوەڵەکەشـتان شـێت نیـە، ﴿وَلَقَدْ رَءَاهُ بِٱلْأُفُقِ ٱلْمُبِينِ﴾ لـە ئاسـۆی ڕوون و ئاشـکرادا بینیویـەتی، کـە مەبەسـت پێـی دیتنـی یەکـەم جـاری پێغەمبـەرە ﷺ بـۆ جیبریـل ئەمـە بەڵگەیـەک.

**دووەم:** هەروەها هاوشێوەی ئەوە لە سوورەتی (**الحاقة**)، ئایەتەکانی: (٤٠ - ٤٧)یشدا هاتوە، بۆیە قورئان هەندێکی هەندێکی تەفسیر دەکات و، لە ڕاستییدا هەر کەسێک چاو لەسەر ئایەتێک چڕ داگرێ، بە تایبەتی ئەو ئایەتەش لە سیاقی خۆی دەربێنێ و تەماشاش نەکات، لە بارەی ئەم بابەتەوە، خوا چی دیکەی فەرمووە؟! بەهەڵەدا دەچێ لە تێگەیشتنی زۆر ئایەتاندا، یانی: ئەگەر زانایان ئەوانەی ڕایان وابووە کە ﴿شَدِيدُ ٱلْقُوَىٰ﴾ مەبەست پێ خوای پەروەردگارەو سیفەتەکانی دیکەش، ئەگەر تەماشای ئەم ئایەتانەی سوورەتی (**التكوير**)یان، کردبایە، دەیانزانی هەر شێوەی ئایەتەکانی ئێرەن و هەموویان باسی جیبریل دەکەن، هەروەها لە سوورەتی (**الحاقة**)ش دا، ئایەتەکانی: (٤٠ - ٤٧)، بەهەمان شێوەن:

﴿إِنَّهُۥ لَقَوْلُ رَسُولٍ كَرِيمٍ ﴿٤٠﴾ وَمَا هُوَ بِقَوْلِ شَاعِرٍ قَلِيلًا مَّا تُؤْمِنُونَ ﴿٤١﴾ وَلَا بِقَوْلِ كَاهِنٍ قَلِيلًا مَّا تَذَكَّرُونَ ﴿٤٢﴾ تَنزِيلٌ مِّن رَّبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿٤٣﴾ وَلَوْ تَقَوَّلَ عَلَيْنَا بَعْضَ ٱلْأَقَاوِيلِ ﴿٤٤﴾ لَأَخَذْنَا مِنْهُ بِٱلْيَمِينِ ﴿٤٥﴾ ثُمَّ لَقَطَعْنَا مِنْهُ ٱلْوَتِينَ ﴿٤٦﴾ فَمَا مِنكُم مِّنْ أَحَدٍ عَنْهُ حَٰجِزِينَ ﴿٤٧﴾﴾.

واتـە: بـە دڵنیایـی ئـەم قورئانـە، قسـەی نێردراوێکـی بەڕێـزە، (کـە مەبەسـت پێـی جیبریلـە)، قسـەی شـاعیرێک نیـە، کـەم بـڕوا دێنـن . قسـەی کاهیـن و فاڵچییەکیـش

www.alibapir.com


نیە، کەم بیر دەکەنەوە . دابەزێنراوە لە پەروەردگاری جیهانییانەوە . ئەگەر (موحەممەد) هەندێک قسەی پێوە هەڵبەستباین. دەستی ڕاستیمان دەگرت، دوایی ڕەگی ملیمان دەپەڕاند. هیچ کام لە ئێوەش نەیدەتوانی (بێتە بەردەمان و) ببێتە پەردەو نێوان (و نەهێڵێ ئێمە سزای بدەین).

**سێیەم:** وەسفەکانی دیکەش، کە دێن، هەموویان هی جیبریلن (**علیه السلام**)و، تەنیا لەگەڵ ئەویشدا دەگونجێن، نەک لەگەڵ خوای بەرزی بێ وێنەدا.

بۆ وێنە:

أ- کە دەفەرموێ: ﴿ذُو مِرَّةٍ﴾، نەمانبینیوە لە قورئاندا خوای پەروەردگار خۆی بە ﴿ذُو مِرَّةٍ﴾، یانی: خاوەن عەقڵ و هۆشی بەهێز، یان خاوەن جەستەی بەهێز، یان خاوەن شێوەی جوان، وەسف بکات!

ب- (فاسْتَوى)، خوای پەروەردگار (**استوى**)ی بۆ خۆی بەکارهێناوە، ﴿ثُمَّ ٱسْتَوَىٰ عَلَى ٱلْعَرْشِ ۝٢﴾الرعد، یان ﴿ثُمَّ ٱسْتَوَىٰٓ إِلَى ٱلسَّمَآءِ ۝٢٩﴾البقرة، کە لەوێدا بە مانای چوونە سەر عەرش، بەرز بوونەوە بۆ سەر عەرش، یاخود: ﴿ثُمَّ ٱسْتَوَىٰٓ إِلَى ٱلسَّمَآءِ ۝٢٩﴾البقرة، واتە: ڕووی کردە ئاسمان.

ج- ﴿وَهُوَ بِٱلْأُفُقِ ٱلْأَعْلَىٰ ۝٧﴾، خوای پەروەردگار خۆی بەوە وەسف نەکردوە کە لە ئاسۆی هەرە بەرز بێ!

د- ﴿ثُمَّ دَنَا فَتَدَلَّىٰ ۝٨﴾، نیزیک بۆوەو شۆڕبۆوە، ئەو وەسفانە هەموویان لەگەڵ جیبریلدا دەگونجێن.

هـ- ﴿فَكَانَ قَابَ قَوْسَيْنِ أَوْ أَدْنَىٰ ۝٩﴾، بە ئەندازەی دوو کەوان، یاخود نیزیکتریش لەوانە، لە پێغەمبەرەوە بوو، ئەوانە هیچیان ناگونجێ بۆ خوای بەرزی مەزن بەکاربهێنرێن.

www.alibapir.com



**سەرنجی سێیەم:** لە كۆتایی ئەم باسەدا قسەیەكی (**محمد حسين الطباطبائي**) لە تەفسیرەكەی خۆی دا (**الميزان**) دێنین[1]، كە لە تەفسیری ئەو وشەیەدا كردوویەتی، كە دەفەرموێ: ﴿ مَا كَذَبَ ٱلْفُؤَادُ مَا رَأَىٰٓ ﴿١١﴾ ﴾، سەرەتاش دەڵێین: وشەی (**فُؤاد**)، (**أل**)ەكە بۆ (**عَهْد**)ە، واتە: عەقڵە زانراوەكە كە عەقڵی پێغەمبەرە ﷺ، یان دڵەكە، هەرچەندە (**فُؤاد**)، زیاتر بە مانای عەقڵ هاتوە، بە هەڵەدا نەچوو بوو، یان درۆی نەكرد بوو، لەوەدا كە بینی، یاخود (**أل**)ەكە قەرەبووی پاڵوەلادراو (**مضاف إليه**)ە، یانی: (**مَا كَذَبَ فُؤَادُه**)، دڵەكەی ئەو یان عەقڵەكەی ئەو (هی پێغەمبەر) بە هەڵەدا نەچوو بوو.

ئنجا خاوەنی تەفسیری (**الميزان**)، دەڵێ: (**وَلاَ بِدْعَ فِي نِسْبَة الرُّؤْيَة وَهِيَ مُشَاهَدَةُ العَيَانِ إلى الفُؤَادِ، فَإِنَّ لِلإِنْسَانِ نَوْعَاً مِنَ الإِدْرَاكِ الشُّهُودِيّ وَرَاءِ الإِدْرَاكِ بِإِحْدَى الحَوَاسّ الظَّاهِرَة وَالتَّخَيُّلِ وَالتَّفَكُّرُ بِالقُوَى البَاطِنَة، كَمَا أَنَّنَا نُشَاهِدُ مِنْ أَنْفُسِنَا أَنَّنَا نَرَى، وَلَيْسَتْ هَذِهِ المُشَاهَدَة العِيَانِيَّةُ إبْصَارَاً بَالْبَصَرِ، وَلاَ مَعْلُومَاً بِفِكْرِ، وَكَذَا نَرَى مِنْ أَنْفُسِنَا أَنَّنَا نَسْمَعُ وَنَشُمّ وَنَذُوْقُ وَنَلْمَسُ وَنُشَاهِدُ أَنَّنَا نَتَخَيَّلُ**).

واتە: شتێكی سەیر نیە كە بینین كە بریتیە لە بینینی چاو، پاڵ بدرێتە لای عەقڵ، یان لای دڵ، چونكە مرۆڤ زانینێكی دیكەی هەیە، لە پشت زانین، بە یەكێك لە پێنج هەستەكان و، خەیاڵ كردن و، بیركرنەوە بە هێزە پەنهانەكان، وەك ئێمە لە زاتی خۆماندا دەتوانین شتێك هەست پێ بكەین، بێ ئەوەی بە چاو بینیبمان، یاخود بە فیكر زانیبمان، هەروەك ئێمە دەتوانین لە خودی خۆماندا هەست بكەین، بە بیستن و بۆنكردن و چێژتن دەست لێ كوتان و دیتن، یاخود خەیاڵكردن، [بێ ئەوەی پێنچ هەستەكان بەكاربێنین].

منیش دەڵێم: كەواتە: (**فُؤاد**) چ مەبەست پێی عەقڵ بێ، چ مەبەست پێی دڵ بێ، ئەویش جۆرێك لە زانین ئیدراكی هەیە، زۆر بەهێزتر لەو ئیدراك و

---

(١ ) الميزان: ج١٩، ص٣٠.

هەست پێکردن و زانینەی لە ڕێی پێنج هەستەکانەوە، یاخود لە ڕێی عەقڵی ڕواڵەتییەوە دەستگیر دەبێ، ئینسان بە هێزە پەنهانەکانی خۆی، بە زگماکەکەی و بە هێزی ڕووحیی خۆی، هەندێک شت دەزانێ، مەرج نیە پەیوەندیی بە پێنج هەستەکانەوە هەبێ، ئینسان لەزاتی خۆیدا هەست بە بوونی خۆی دەکات، هەست بە زۆر لە شتان دەکات، بێ ئەوەی بتوانێ بە پێنج هەستەکان، بیانسەلمێنێ، بەڵام لە دەرککردنی پێنج هەستەکانیش زیاتر متمانەی بەو زانین و هەست پێکردن و ئیدراکەی خۆی هەیە.



www.alibapir.com


## مەسەلەی دووەم:

**سەرکۆنە کردنی خوا ﷻ بۆ بێبڕوایەکان، کە لە بارەی دیتنی پێغەمبەرەوە ﷺ بۆ جیبریل (علیه السلام) مشتومڕیان کردووە، ڕاگەیاندنی ئەو ڕاستییەش کە پێغەمبەری خوا موحەممەد ﷺ، وێڕای ئەو جارەی سەر زەوی، جارێکی دیکەش جیبریلی بینیوە لەسەر شێوەی ڕاستەقینەی خۆی، بەڵام لە ئاسمان و لە شەوی بەرزبوونەوە (العروج)دا، لە لای درەختی کۆتایی، کە بەهەشتی سرەوتگای بڕودارانیشی لێیە، تەنیا خواش ﷻ دەزانێ چی ئەو درەختەی داپۆشیوەو، پێغەمبەر بێ ئەوەی چاوی لابداو سنوورشکێنیی بکات، گەلێک نیشانەی گەورەی پەروەردگاری بینین:**

خوا دەفەرموێ: ﴿ أَفَتُمَٰرُونَهُۥ عَلَىٰ مَا يَرَىٰ ﴿١٢﴾ وَلَقَدْ رَءَاهُ نَزْلَةً أُخْرَىٰ ﴿١٣﴾ عِندَ سِدْرَةِ ٱلْمُنتَهَىٰ ﴿١٤﴾ عِندَهَا جَنَّةُ ٱلْمَأْوَىٰٓ ﴿١٥﴾ إِذْ يَغْشَى ٱلسِّدْرَةَ مَا يَغْشَىٰ ﴿١٦﴾ مَا زَاغَ ٱلْبَصَرُ وَمَا طَغَىٰ ﴿١٧﴾ لَقَدْ رَأَىٰ مِنْ ءَايَٰتِ رَبِّهِ ٱلْكُبْرَىٰٓ ﴿١٨﴾ ﴾.

## شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە حەوت بڕگەدا:

١)- ﴿ أَفَتُمَٰرُونَهُۥ عَلَىٰ مَا يَرَىٰ ﴾، ئایا شەڕە قسەو مشتومڕی لەگەڵ دا دەکەن، لەسەر ئەوەی دەیبینێ (کە بریتیە لە جیبریل (عَلَيْهِ السَّلَام و وەحیی پەیامی خوای بۆ دێنێ)؟ خوێندراویشەتەوە: (أَفَتَمْرُونَهُ)، یانی: (أَفَتَجْحَدُونَهُ)، ئایا نکووڵیی لێدەکەن لەوەی دەیبینێ، نەیارو ناحەزانی پێغەمبەر ﷺ بەوە تۆمەتباریان دەکرد، دەیانگوت: ئەوە شەیتانێکە خۆی پێشان دەدات و خوتخوتەی بۆ دەکات، یاخود تۆمەتباریان دەکرد بەوەی کە شێت بووەو، جندو شەیتان دەستیان لێ وەشاندوە! خواش ﷻ بە پرسیارکردنی نکووڵییلێکەرانەو ڕەخنەگرانەوە دەفەرموێ: ئایا ئێوە شەڕە قسەی لەگەڵ دەکەن، لەسەر ئەوەی دەیبینێ، یاخود: ئایا ئێوە نکووڵیی لێدەکەن؟

www.alibapir.com



٢)- ﴿ وَلَقَدۡ رَءَاهُ نَزۡلَةً أُخۡرَىٰ ﴾، بەدڵنیاییی دابەزینێکی دیکەش بینیویەتی، بە (ل)ی سوێندو، بە (قَدْ)ی ساغ کردنەوە: ﴿ وَلَقَدۡ رَءَاهُ نَزۡلَةً أُخۡرَىٰ ﴾ بە دڵنیاییی دابەزینێکی دیکەش بینیویەتی، جارێکی دیکەش بینیویەتی، (**النَّزْلَةُ: مَرَّةً مِنَ النُّزُولِ، وَهُوَ مَصْدَرٌ بِمَعْنَى مَرَّةً**)، (**نَزْلَة**) لە (**نُزُول**)ەوە هاتوە، چاوگە بە مانای جارێک، (**نَزْلَة**)، یانی: جارێک دابەزین، هەروەک (**جَلْسَة**)، بە مانای جارێک دانیشتن، لە کوێ بینی؟

٣)- ﴿ عِندَ سِدۡرَةِ ٱلۡمُنتَهَىٰ ﴾، لە لای درەختی کۆتایی بینی، (**سِدْر**)، جۆرێکە لە درەخت (**نَبْق**)یشی پێ دەڵێن، گەڵای وردە، (**سِدْرَةِ**)ش تاکەکەیەتی واتە: یەک درەختی (**سِدر**).

(**المُنْتَهَى**)، (**سِدْرَةِ**)، پاڵدراوەتە لای (**مُنْتَهَى**)، واتە: درەختی کۆتایی، (**سِدْرَةُ المُنْتَهَى اسْمٌ أَطْلَقَهُ القُرْآنُ عَلى مَكانٍ عُلْوِيٍّ فَوْقَ السَّماءِ السَّابِعَةِ، والإضافَةُ بَيانِيَّةٌ، أو تَعْرِيفٌ لِسِدْرَةٍ بِمَكانٍ يُنْتَهى إلَيْهِ ولاَ يَتَجاوَزُهُ أَحَدٌ**)، واتە: ﴿ سِدۡرَةِ ٱلۡمُنتَهَىٰ ﴾، ناوێکە قورئان بەکاریهێناوە بۆ شوێنێکی بەرز لەسەرووی ئاسمانی حەوتەمیشەوەیەو، پاڵدرانەلایەکە [ ﴿ سِدۡرَةِ ٱلۡمُنتَهَىٰ ﴾ {(**سِدْرَة**) پاڵدراو (**مُضَاف**)ە و(**مُنْتَهَى**)، **پاڵوەلادراو** (**مُضَاف إلَيْه**)یە]، بۆ ڕوونکردنەوەیە، واتە: درەختێک کە هی کۆتاییە، یاخود: ناساندنی درەختەکەیە بە شوێنێک، کە هیچ کەس لەو شوێنە تێناپەڕێ و کۆتا شوێنە.

دوایی باسی ئەوە دەکەین، بۆچی بە: ﴿ سِدۡرَةِ ٱلۡمُنتَهَىٰ ﴾، گوتراوە درەختی کۆتایی؟!

٤)- ﴿ عِندَهَا جَنَّةُ ٱلۡمَأۡوَىٰٓ ﴾، لە لای وی [درەختی کۆتایی]، بەهەشتی سرەوتگا هەیە، یانی: ئەو بەهەشتەی شوێنە بۆ تێدا سرەوتن و پشوودانی بڕواداران، ئنجا ئەمە دەگونجێ مەبەست پێی ئەو بەهەشتە بێ کە لە قۆناغی بەرزەخدایەو، جیابێ لە بەهەشتی یەکجارەکیی، کە لە قیامەتدا بڕواداران دەیچنەتێ، دەشگونجێ هەر مەبەست پێی ئەو بەهەشتە بێ، کە لە قیامەتدا هەیەو، بڕواداران ئەو کاتە بە ڕووح و جەستەوە دەیچنەتێ، بەڵام ئێستا تەنیا ڕووحەکەیان لەوێ بێ، هەردووک واتایان

www.alibapir.com


هەڵدەگرێ و، ئەوە شتێکی پەنهانە تەنیا خوا ﷻ دەیزانێ و، پێغەمبەری خۆشی بێگومان ئاگادار کردوە، بەڵام ئەوەی لە ئایەتەکانی قورئان و دەقەکانی سوننەت بۆ ئێمە دەردەکەوێ، ڕوون نیە، کە ئایا ئەو بەهەشتە بەهەشتێکە تایبەتە بە قۆناغی بەرزەخەوە؟ ئەگەر وابێ، دەبێ ئاگرو دۆزەخەکەش تایبەت بێ، بە قۆناغی بەرزەخەوە، یاخود هەر مەبەست پێی بەهەشتی یەکجارەکییەو، مەبەست پێی دۆزەخی یەکجارەکییە. کە لە فەرمایشتەکاندا هاتوە، مرۆڤ کە ڕووحی لە جەستەی جیادەبێتەوە، یان لە بەهەشتدا دەبێ، یاخود لە دۆزەخدا دەبێ؟!

٥)- ﴿إِذْ يَغْشَى ٱلسِّدْرَةَ مَا يَغْشَىٰ﴾، لە کاتێکدا کە درەختەکە دادەپۆشێ، ئەوەی دایدەپۆشێ، (يَغْشَى)، یانی: (يُغَطِّي)، (**إِذْ يُغَطِّي السِّدْرَةَ مَا يُغَطِّي**)، دایدەپۆشێ ئەوەی درەختەکە دادەپۆشێ، (مَا)، لێرەدا: (**لِلتَّفْخِيْم أي: تَضِيْق عَنْه عِبَارَاتُ الوَصْفِ فِي اللُّغَة**)، بۆ قەبەو گەورە پێشاندانە، واتە: دەربڕینەکانی باسکردن لە زماندا تەنگن، لەوەی جێگای ئەو وەسفکراوەیان تێدابێتەوە.

٦)- ﴿مَا زَاغَ ٱلْبَصَرُ وَمَا طَغَىٰ﴾، چاو نە لایدا، نە سنوور شکێنیی کرد، (**لَمْ يَمِلِ البَصَرُ، وَلَمْ يَنْحَرِف، وَلَمْ يَتَجَاوَزِ الحَدَّ المَرْسُومَ لَهُ**)، چاو نە لایداو، بەملاولادا چوو، نە لەو سنوورەی بۆی دیارییکراوە، تێپەڕی.

وشەی (بَصَر)، یان (أل)ەکە کە بۆ ناساندنە بۆ (عَهد)ە، واتە: چاوەکە ئەو چاوەی دەزانرێ چاوی پێغەمبەری خوا ﷺ، چونکە باس باسی ئەوە، یاخود (أل)ەکە (**عِوَضٌ عَن المُضَاف إليْه**) قەرەبووی پاڵوەلادراوە، یانی: (**مَا زَاغَ بَصَرُهُ**)، چاوەکەی ئەو [ﷺ پێغەمبەر]، لای نەداو سنوور شکێنییشی نەکرد.

٧)- ﴿لَقَدْ رَأَىٰ مِنْ ءَايَٰتِ رَبِّهِ ٱلْكُبْرَىٰٓ﴾، بەدڵنیاییی لە نیشانە گەورەکانی پەروەردگاری دیتن، دووبارە خوا ﷻ بە (ل)ی سوێند پێ خواردن، یاخود زەمینە خۆشکەر بۆ سوێندو، بە (قَدْ)ی ساغکردنەوە دەفەرموێ: بە دڵنیایی و مسۆگەر لە نیشانە گەورەکانی پەروەردگاری بینین، مەبەست لە نیشانە گەورەکانی پەروەردگاریش خوا

ﷺ بەس خۆی دەزانێ، چییە؟ ڕەنگە یەکێک لە نیشانە گەورەکان ﴿سِدۡرَةِ ٱلۡمُنتَهَىٰ﴾، بێ کە بینیویەتی، هەروەها ئەوشتەی: ﴿سِدۡرَةِ ٱلۡمُنتَهَىٰ﴾ ی داپۆشیوە، کە وەک دوایی باسی دەکەین، جۆرێک بووە لە ڕووناکیی، لە شێوەی پەپوولەی زێڕین دا. یەکێکی دیکە، لە نیشانە گەورەکانی پەروەردگاری جیبریل بووە لەسەر شێوەی خۆی، یەکێکی دیکە لەو نیشانانە، بەهەشت ﴿جَنَّةُ ٱلۡمَأۡوَىٰٓ﴾ بووە، تەنیا خواش دەزانێ چیدیکەشی بینیوە، وا پێدەچێ فریشتەکانی دیکەشی هەر بینیبن، گرنگ ئەوەیە مەبەست لە نیشانە گەورەکانی پەروەردگار، ئەو شتانەن کە دەستەڵاتی خواو مەزنیی خوایان تێدا بەرجەستە دەبێ، ئەو نیشانە گەورانەو ئەو بەڵگە گەورانەی بینین، لێرەدا کە دەفەرموێ: ﴿وَلَقَدۡ رَءَاهُ نَزۡلَةً أُخۡرَىٰ ١٣ عِندَ سِدۡرَةِ ٱلۡمُنتَهَىٰ ١٤ عِندَهَا جَنَّةُ ٱلۡمَأۡوَىٰٓ ١٥﴾، ئێمە کاتی خۆی، لە باسی شەوڕۆو بەرزبوونەوەی پێغەمبەردا ﷺ، باسێکی خەست و خۆڵمان کردوە، لە سەرەتای تەفسیری سووڕەتی **(الإسراء)**داو، ئەو فەرمایشتانەی لەو بارەوە هاتوون، بە درێژیی هێناومانن، هەم دەقەکەیان و، هەم ماناشمان کردوون.

لە تۆڕە کۆمەڵایەتییەکان لەگەڵتانین
Stay in touch on social media
نحن معكم عبر مواقع التواصل الاجتماعي
ڕاگەیاندنی مەکتەبی مامۆستا عەلی باپیر
AliBapir/عەلی باپیر
archive.org/details/@alibapir
AliBapir/عەلی باپیر
AliBapir
Google Play
App Store
کەناڵی ڕاگەیاندنی مەکتەبی مامۆستا عەلی باپیر
www.alibapir.net
عربي - کوردی - English
ڕاگەیاندنی مەکتەبی مامۆستا عەلی باپیر

www.alibapir.com


## ڕوونکردنەوەیەک لە بارەی (سِدْرَةِ الْمُنْتَهَى)وە

لێرەدا بەس ئەوەی لە دەقەکانی سوننەت، کە پەیوەستە بە (سِدْرَةِ الْمُنْتَهَى) وە دەیهێنین:

پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: {**ثُمَّ ذُهِبَ بِي إِلَى سِدْرَةِ الْمُنْتَهَى، وَإِذَا وَرَقُهَا كَآذَانِ الْفِيَلَةِ، وَإِذَا ثَمَرُهَا كَالْقِلَالِ، فَلَمَّا غَشِيَهَا مِنْ أَمْرِ اللَّهِ عَزَّ وَجَلَّ مَا غَشِيَ، تَغَيَّرَتْ فَمَا أَحَدٌ مِنْ خَلْقِ اللَّهِ يَسْتَطِيعُ أَنْ يَنْعَتَهَا مِنْ حُسْنِهَا**} (**أخرجه أحمد: ١٢٥٢٧، ومسلم: ١٦٢، وأبو يعلى: ٣٣٧٥**).

واتە: دوایی بردرام بەرەو درەختی کۆتایی، گەڵایەکانی وەک گوێیەکانی فیلان وابوون، (واتە: زۆر پان بوون)، میوەکانی وەک گۆزە وابوون {یان وەک کووپە} ئنجا کاتێک بە فەرمانی خوا (عزوجل) دایپۆشی ئەوەی دایپۆشی، گۆڕا، هیچ کەس لە دروستکراوانی خوا ناتوانێ لەبەر جوانییان وەسفی بکات.

ئەوەش کە پێغەمبەر ﷺ گەڵایەکانی بە گوێی فیلان شوبهاندوون و، بەرو میوەکەشی بە گۆزەو کووپە شوبهاندوون، لەبەر ئەوەیە کە ئێمە هەر ئەوەندە حاڵیی دەبین و، بۆی خستووینە قاڵبێکی تەعبیرییەوە، کە ئێمە پێی ئاشنا بین، چونکە ئێمە هیچ شتێکمان لە گوێی فیل پانتر نەبینیوە، تاکو گەڵای ئەو درەختەی پێ تەشبیه بکرێ و، هیچ شتێکیشمان لە کووپەو گۆزە گەورەتر نەبینیوە، کە لە شێوەی میوەدا بێ و میوەی پێ بچوێنرێ.

هەروەها ئەم فەرموودەیەش هاتوە: {﴿إِذْ يَغْشَى ٱلسِّدْرَةَ مَا يَغْشَىٰ ١٦﴾: **قَالَ غَشِيَهَا فَرَاشٌ مِنْ ذَهَبٍ**} (**أخرجه مسلم: ١٧٣**)، کە دەفەرموێ: کاتێک دایپۆشی ئەوەی درەختەکەی داپۆشی، فەرمووی: پەپوولەی لە زێڕ ئەو درەختەیان داپۆشی.

www.alibapir.com


(القرطبي) لە بارەی ئەوەوە کە بۆچی بە درەختی کۆتایی گوتراوە: درەختی کۆتایی، نۆ ڕای زانایان دێنێ، لە تەفسیرەکەی خۆیدا:

١- (عَنِ ابْنِ مَسْعُود رضي الله عنه أَنَّه يَنْتَهِي إِلَيْهَا كُلُّ مَا يَهْبِطُ مَنْ فَوْقِهَا، وَيَصْعَدُ مَنْ تَحْتِهَا) واتە: لەبەر ئەوەی هەرچی لە سەرێی دێتە خوارەوەو، هەرچی لە خوارێی بەرز دەبێتەوە، لەوێ کۆتایی پێ دێ، بۆیە واناونراوە، هەڵبەتە ئەوە ڕای عەبدوڵلای کوڕی مەسعوودە رضي الله عنه، ئەوانەش هەموویان ڕای زانایانن و، بێگومان ئەگەر دەقێکی لەسەر بووایە، نۆ ڕای لەسەر پەیدا نەدەبوون و یەکڕا دەبوون!

٢- هەندێکی دیکە گوتوویانە: (يَنْتَهِي عِلْمُ الأَنْبِيَاءِ إِلَيْهَا)، بۆیە وا ناونراوە چونکە زانیاریی پێغەمبەران (عَلَيْهِمُ الصَّلَاةُ وَالسَّلَام) لەوێ کۆتایی دێ، واتە: لە بارەی بوون (وجود)ەوە، پێغەمبەرانیش (عَلَيْهِمُ الصَّلَاةُ وَالسَّلَام) زانیارییەکەیان تاکو درەختی کۆتایی دەڕوا، لەوە بەو لاوە نازانن چیدیکە هەیە!

٣- (الأَعْمَالُ تَنْتَهِي إِلَيْهَا وَتُقْبَضُ مِنْهَا)، کردەوەی مرۆڤان تاکو درەختی کۆتایی دەچن و، لەوێوە کردەوەکان وەردەگیرێن.

٤- (لِانْتِهَاءِ الْمَلَائِكَةِ وَالأَنْبِيَاءِ إِلَيْهَا وَتَوقُّفِهِمْ عِنْدَهَا)، لەبەر ئەوەی هەم فریشتەکان، هەم پێغەمبەران (عَلَيْهِمُ الصَّلَاةُ وَالسَّلَام) تاکو وێ دەچن و، لەوێ کۆتایی دێ و دەوەستن.

٥- (يَنْتَهِي إِلَيْهَا أَرْوَاحُ الشُّهَدَاءِ)، ڕووحی شەهیدان دەگەنە وێ و، لە وێ کۆتایی بە ڕۆیشتن و بەرز بوونەوەیان دێنن.

٦- (تَنْتَهِي إِلَيْهَا أَرْوَاحُ الْمُؤْمِنِينَ)، ڕووحی بڕواداران بە گشتیی، نەک تەنها هی شەهیدان، لە بەرزبوونەوەیاندا لەوێ دەوەستن و کۆتاییان دێ.

٧- (يَنْتَهِي إِلَيْهَا كُلُّ مَنْ كَانَ عَلَى سُنَّةِ مُحَمَّدٍ صلى الله عليه وسلم وَمِنْهَاجِهِ)، ئەوانەی بە دوای ڕێبازو ڕێ و شوێنی پێغەمبەر کەوتوون، ڕووحەکەیان تاکو وێ دەڕوا.

٨- (هِيَ شَجَرَةٌ عَلَى رُوؤسِ حَمَلَةِ الْعَرْشِ)، درەختێكە لەسەر سەری هەڵگرانی عەرشەوەیە.

٩- (مَنْ رُفِعَ إِلَيْهَا، فَقَدِ انْتَهَى مِن الْكَرَامَةِ)، بۆیە وا ناونراوە، چونكە كەسێك بگاتە وێ، مانای وایە لە ڕێزلێگیراندا، كۆتایی پێهێناوەو گەیشتۆتە ئەوپەڕی.

هەڵبەتە هەندێك لەو ڕایانە دەچنەوە نێو هەندێكیان، بەڵام هیچیشیان دەق نین لەسەر ئەوەی بتوانین لێی دڵنیابین و بڵێین: ئەوە مەبەستە، دەگونجێ زۆربەی ئەو ڕایانەش بەیەكەوە مەبەست بن.



www.alibapir.com


## کورتە باسێک لە بارەی دوو دیتنکەی پێغەمبەرەوە 

بەڕێـــــزان!

خوا لەو ئایەتانەدا باسی دووجار بینینی پێغەمبەر دەکات، جارێکیان لەسـەر زەوی و، جارێکیـان لـە ئاسـمان، ئنجـا زانایـان لـە بـارەی ئـەو دوو دیتنـەی پێغەمبـەرەوە، مشـتومڕو ڕاجیایـی زۆریـان بـووە، هەرچەنـدە زۆربەیـان لەلایەکـن و کەمینەیـەک لەلایەکـی دیکـەن، گرنـگ ئەوەیـە مـن ئـەم باسـە لـە پێنـج بڕگـەدا، دەخەمـەڕوو:

**بڕگـەی یەکـەم:** زانایـان لـە بـارەی ئـەو دووجـار دیتنـەی پێغەمبـەرەوە، کـە ئایـا بـۆ خـوای بـەرزو بـێ وێنـە بـووە، یـان بـۆ جیبریـل؟! مشـتومڕی زۆریـان بـووە، بەهـۆی چۆنیەتیـی تەفسـیرکردنی ئـەو ئایەتانـەوە، کـە بـە گشـتیی بـە دوو جـۆر تەفسـیریان کـردووە:

**جـۆری یەکـەم:** زۆربـەی هـەرە زۆری زانایانـی لەسـەرن، ئەوەیـە کـە پێغەمبـەری خـوا جیبریلـی بینیوە و، باسـی دیتنی پێغەمبـەرن بۆ جیبریل (**عَلَيْهِ السلام**).

**جـۆری دووەم:** کـە هەنـدێ لـە زانایانـی لەسـەرن، ئەوەیـە کـە گوایـە پێغەمبـەری خـوا خـوای بـەرزو بـێ وێنـەی بینیـوە، لـە شـەوی شـەوڕۆو بەرزبوونـەوەدا، لەو بارەوەیـە، وەک دوایـی دەقـەکان دێنیـن، لـە نێـوان دایکـمان عائیشـە (خـوا لێـی ڕازی بـێ)و لـە عەبدوڵڵای کـوڕی عەبـاس (خـوا لـە خـۆی و بابـی ڕازی بـێ)دا، ڕاجیاییەک هەیـە کـە پەیوەندیـی بـە دیتنـی پێغەمبـەر بۆ خـوای بـەرزی بێ وێنـەوە هەیە، لـە شـەوی شـەوڕۆو بەرزبوونـەوەدا، نـەک لەسـەر زەوی.

**بڕگـەی دووەم:** سـەرەتا چەنـد دەقێکـی سـوننەت دێنینـەوە لـەو بـارەوە، کـە مـن هەوڵمـدا هەمـوو ئـەو دەقانـەی لـەو بـارەوە هاتـوون، بیانهێنـم، کـە هەندێکیـان

www.alibapir.com


لــە صەحیحــی بوخاریــی و صەحیحــی موســلیمدا هاتــوون و، هەندێکیشــیان لــە جگەلــە ئەوانــدا هاتــوون، هەندێکیــان ســەنەدەکەیان ڕاســتەو، هەندێکیــان لەســەر ســەنەدەکەیان ڕاجیایــی هەیــەو، مــەرج نیــە ســەنەدەکەیان ڕاســت بــێ، دوازدە (١٢) دەقــم لــەو بــارەوە هێنــاون، هەمــوو ئــەو دەقانــەی لــەو بــارەوە هاتــوون، یاخــود پوختــەی هەموویــان:

**١- {عَنِ ابْنِ مَسْعُودٍ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ، أَنَّهُ قَالَ: إِنَّ مُحَمَّداً ﷺ لَمْ يَرَ جِبْرِيلَ فِي صُورَتِهِ إِلَّا مَرَّتَيْنِ: أَمَّا مَرَّةٌ فَإِنَّهُ سَأَلَهُ أَنْ يُرِيَهُ نَفْسَهُ فِي صُورَتِهِ، فَأَرَاهُ صُورَتَهُ فَسَدَّ الْأُفُقَ، وَأَمَّا الْأُخْرَى فَإِنَّهُ صَعِدَ مَعَهُ حِينَ صَعِدَ بِهِ، وَقَوْلُهُ: ﴿وَهُوَ بِالْأُفُقِ الْأَعْلَىٰ ۝٧﴾، ﴿لَقَدْ رَأَىٰ مِنْ آيَاتِ رَبِّهِ الْكُبْرَىٰ ۝١٨﴾، قَالَ: خَلْقَ جِبْرِيلَ} (أخرجه أحمد: ج١، ص٤٠٧، والطبري: ٣٢٤٧١، إسناده حسن، وَصَحَّحَهُ الشيخ أحمد شاكر: ٣٨٦٤).**

واتــە: عەبدوڵــڵای کــوڕی مەســعوود رَضِيَ اللهُ عَنْهُ دەڵــێ: پێغەمبەری خــوا ﷺ جیبریلی لەســەر وێنــەی ڕاســتەقینەی خــۆی نەبینیــوە، مەگــەر دووجــاران، جارێکیــان ئــەوە بــوو کــە داوای لێکــرد، خــۆی پێشــان بــدات و، ئــەوی لەســەر شــێوەی ڕاســتەقینەی خــۆی بینــی، ئاســۆی پــڕ کردبــوو، جارێکــی دیکــەش ئــەوە بــوو کــە لەگەڵــی دابــوو، کاتێــک بــەرز بــۆوە لەگەڵــی، وەک دەفەرمــوێ: ﴿وَهُوَ بِالْأُفُقِ الْأَعْلَىٰ ۝٧﴾، لــە کاتێکــدا ئــەو لــە ئاســۆی هــەرە بــەرز بــوو، دوایــی دەفەرمــوێ: ﴿لَقَدْ رَأَىٰ مِنْ آيَاتِ رَبِّهِ الْكُبْرَىٰ ۝١٨﴾، بــە دڵنیایــی (موحەممــەد) لــە نیشــانە گــەورەکانی پــەروەردگاری خــۆی بینیــن، دەڵــێ: مەبەســت پێــی جەســتەو دیمــەنی جیبریــل بــوو.

**٢- {عَنِ ابْنِ مَسْعُودٍ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَالَ: رَأَيْتُ جِبْرِيلَ عِنْدَ سِدْرَةِ الْمُنْتَهَى لَهُ سِتُّمِائَةِ جَنَاحٍ} (أخرجه الطبري: ٣٢٤٧٢، وإسناده حسن).**

واتــە: عەبدوڵــڵای کــوڕی مەســعوود رَضِيَ اللهُ عَنْهُ دەڵــێ: پێغەمبــەر ﷺ فەرموویــەتی: جیبریلــم لــە لای درەختــی کۆتایــی بینــی، شەشســەد (٦٠٠) باڵــی هەبــوو.

www.alibapir.com



٣- {عَنِ ابْنِ مَسْعُودٍ رضي الله عنه، فِي قَوْلِهِ: ﴿فَكَانَ قَابَ قَوْسَيْنِ أَوْ أَدْنَىٰ ۝٩﴾، قَالَ: رَأَى النَّبِيُّ ﷺ جِبْرِيلَ لَهُ سِتُّمِائَةِ جَنَاحٍ} (أخرجه البخاري: ٤٨٥٦، ومسلم: ١٧٤، والترمذي: ٣٢٧٧، والنسائي في التفسير:٥٥٤).

واتـە: عەبدوڵـڵای کـوڕی مەسـعوود رضي الله عنه، لـە بـارەی فەرمایشـتی خـواوە کـە دەفەرمـوێ: ﴿فَكَانَ قَابَ قَوْسَيْنِ أَوْ أَدْنَىٰ ۝٩﴾، واتـە: بـە ئەنـدازەی دوو کەوانـە، یاخـود نیزیکتریـش لێـی نیزیـک بـوو، گوتوویـەتی: پێغەمبـەر ﷺ جیبریلی بینیوە، شەشسـەد (٦٠٠) باڵـی هەبـووە.

واتە: لێرەدا مەبەست پێی دیتنی پێغەمبەرە ﷺ بۆ جیبریل.

٤- {عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رضي الله عنهما، قَالَ فِي قَوْلِهِ تَعَالَى: ﴿مَا كَذَبَ ٱلْفُؤَادُ مَا رَأَىٰ ۝١١﴾، ﴿وَلَقَدْ رَءَاهُ نَزْلَةً أُخْرَىٰ ۝١٣﴾، رَأَى مُحَمَّدٌ ﷺ رَبَّهُ بِقَلْبِهِ مَرَّتَيْنِ}، (أخرجه مسلم: ٢٨٥ و ٢٨٦، والنسائي في التفسير: ٥٥٥).

واتـە: عەبدوڵـڵای کـوڕی عەبباس رضي الله عنهما، لـە بـارەی قسـەی خـوای بـەرزەوە کـە دەفەرمـوێ: ﴿مَا كَذَبَ ٱلْفُؤَادُ مَا رَأَىٰ ۝١١﴾، دوایـی دەفەرمـوێ: ﴿وَلَقَدْ رَءَاهُ نَزْلَةً أُخْرَىٰ ۝١٣﴾، گوتوویـەتی: موحەممـەد ﷺ پـەروەردگاری خـۆی بـە دڵ بینـی، دوو جـاران.

٥- {عَنْ أَبِي ذَرٍّ رضي الله عنه، قَالَ: سَأَلْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ: هَلْ رَأَيْتَ رَبَّكَ؟ قَالَ: نُورٌ أَنَّى أَرَاهُ؟} (أخرجه مسلم: ١٧٨، والطيالسي: ٤٧٤، والترمذي: ٣٢٨٢، وأبو عوانة: ج١، ص١٤٦، وابنُ حبان: ٥٨).

واتە: ئەبوو زەڕ رضي الله عنه دەڵێ: لە پێغەمبەری خوام ﷺ پرسـی: ئایا پەروەردگاری خۆتـت بینـی؟ فەرمـووی: ڕووناکییـە چـۆنی ببینـم!!

٦- (عَنْ أَبِي ذَرٍّ رضي الله عنه، قَالَ: سَأَلْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ: هَلْ رَأَيْتَ رَبَّكَ؟ قَالَ: رَأَيْتُ نُورًا)، (أخرجه مسلم: ٢٩٢).

واتە: ئەبوو زەڕ رضي الله عنه دەڵێ: لە پێغەمبەری خوام ﷺ پرسـی: ئایا پەروەردگاری خۆتـت بینـی؟ فەرمـووی: ڕووناکییـم بینـی.

٧- {عَنْ أَبِي ذَرٍّ رضي الله عنه، قَالَ: رَأَى رَسُولُ اللَّهِ ﷺ رَبَّهُ بِقَلْبِهِ وَلَمْ يَرَهُ بِبَصَرِهِ} (أخرجه النسائي في التفسير: ٥٥٦، وابن خزيمة: ٣١٠، وإسناده صحيح).

واتە: ئەبوو زەڕ رضي الله عنه دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ پەروەردگاری خۆی بە دڵ بینیوەو بە چاو نەیبینی.

٨- (عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رضي الله عنه فِي قَوْلِهِ تَعَالَى: ﴿وَلَقَدْ رَءَاهُ نَزْلَةً أُخْرَىٰ ﴿١٣﴾﴾، قَالَ: رَأَى جِبْرِيلَ} (أخرجه مسلم: ١٧٥). واتە: ئەبوو هورەیرە رضي الله عنه لە بارەی قسەی خوای بەرزەوە کە دەفەرموێ: ﴿وَلَقَدْ رَءَاهُ نَزْلَةً أُخْرَىٰ ﴿١٣﴾﴾، جارێکی دیکە دابەزینێکی دیکە بینی، دەڵێ: جیبریلی بینی.

٩- {عَنْ مَسْرُوقٍ قَالَ: كُنْتُ مُتَّكِئاً عِنْدَ عَائِشَةَ رَضِيَ الله عَنْهَا، فَقَالَتْ: يَا أَبَا عَائِشَةَ! ثَلَاثٌ مَنْ تَكَلَّمَ بِوَاحِدَةٍ مِنْهُنَّ فَقَدْ أَعْظَمَ عَلَى اللَّهِ الْفِرْيَةَ، قُلْتُ: مَا هُنَّ؟ قَالَتْ مَنْ زَعَمَ أَنَّ مُحَمَّدًا رَأَى رَبَّهُ، فَقَدْ أَعْظَمَ عَلَى اللَّهِ الْفِرْيَةَ. قَالَ: وَكُنْتُ مُتَّكِئًا فَجَلَسْتُ فَقُلْتُ: يَا أُمَّ الْمُؤْمِنِينَ! أَنْظِرِينِي وَلَا تُعْجِلِينِي، أَرَأَيْتَ قَوْلَ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ: ﴿وَلَقَدْ رَءَاهُ نَزْلَةً أُخْرَىٰ ﴿١٣﴾﴾، ﴿وَلَقَدْ رَءَاهُ بِٱلْأُفُقِ ٱلْمُبِينِ ﴿٢٣﴾﴾ التكوير، قَالَتْ: إِنَّمَا هُوَ جِبْرِيلُ، رَآهُ مَرَّةً عَلَى خَلْقِهِ وَصُورَتِهِ الَّتِي خُلِقَ عَلَيْهَا، و رَآهُ مَرَّةً أُخْرَي حِيْنَ هَبَطَ مِنَ السَّماءِ سَادًّا عِظَمُ خَلْقِهِ ما بيْنَ السَّماءِ والأَرْضِ، قَالَتْ: أَنا أَوَّلُ مَنْ سَأَلَ النَّبِيَّ ﷺ عَنْ هَذِهِ الآيَة، قَالَ: هُوَ جِبْرِيل عَلَيْهِ السلام} (أخرجه مسلم: ١٧٧).

واتە: مەسڕووق (ڕەحمەتی خوای لێ بێ) کە یەکێکە لە زانایانی شوێنکەوتووان لە دایکمان عائیشەوە (خوا لێی ڕازی بێ) (دایکی بڕواداران) دەگێڕێتەوە کە گوتوویەتی: ئەی بابی عائیشە! {دیارە مەسڕووق کچێکی هەبووە بە ناوی عائیشە، ئنجا بە کونیەکەی بانگی کردوە} هەر کەسێک پێی وابێ موحەممەد ﷺ پەروەردگاری خۆی بینیوە، ئەوە هەڵبەستنێکی مەزنی بە ناوی خواوە کردوە، مەسڕووق دەڵێ: من لەو کاتەدا پاڵم دابۆوە، شانم دادابوو دانیشتم و گوتم: ئەی دایکی بڕواداران! چاوەڕێم بکەو پەلەم لێ مەکە، ئەدی

www.alibapir.com


قسەی خوای بەرزت بینیوە: ﴿ وَلَقَدۡ رَءَاهُ نَزۡلَةً أُخۡرَىٰ ﴿١٣﴾ ﴾، جارێکی دیکە بینی، هەروەها کە دەفەرمووێ: ﴿ وَلَقَدۡ رَءَاهُ بِٱلۡأُفُقِ ٱلۡمُبِينِ ﴿٢٣﴾ ﴾التكوير، بە دڵنیاییی لە ئاسۆی ڕووندا بینی؟ ئەویش گوتی: {واتە: دایکمان عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ)} ئەوە مەبەست جیبریلە، جارێک لەسەر شێوەو وێنەی خۆی، کە لەسەری دروستکراوە بینی {واتە: لە ئاسمان} جارێکی دیکەش بینی کاتێک دابەزیە سەر زەوی، کە جەستەی مەزنی جیبریل نێوان ئاسمان و زەوی، {ئاسۆی هەموو گرتبوو} گوتی: دایکمان عائیشە گوتی: من یەکەمین کەس بووم کە پرسیارم لە پێغەمبەر ﷺ کرد لە بارەی ئەو ئایەتەوە، فەرمووی: ئەوە جیبریل بوو، مەبەست پێی جیبریلە (عَلَیْـهِ السلام).

**١٠- {قَالَ كَعْبٌ لابْنِ عَبَّاس رضي الله عنهما يَعْنِي كَعْبٌ الأحْبَار، إنَّ الله قَسَمَ رُؤْيَتَهُ وَكَلامَهُ بَيْنَ مُحَمَّدٍ وَمُوسَى، فَكَلَّمَ مُوسَى مَرَّتَيْنِ، وَرَأَى مُحَمَّدُ رَبَّهُ مَرَّتَيْنِ} (أخرجه الترمذي: ٣٧٢٨، وضَعَّفه الألباني).**

واتە: کەعبی ئەحبار (کە یەکێک بووە لە زانایانی جوولەکەو مسوڵمان بووە)، بە عەبدوڵڵای کوڕی عەبباسی رضي الله عنهما گوتوە: بێگومان خوا بینینی خۆی و فەرمایشتکردنی خۆی لە نێوان موحەممەدو مووسادا دابەشکردوە: دوو جاران مووسای دواندوەو، دوو جاریش موحەممەد بینیویەتی صەڵات و سەلامی خوا لەسەر موحەممەدو لەسەر مووسا.

**١١- (قِيْلَ لابْنِ عَبَّاسٍ رضي الله عنهما: أَلَمْ يَقُلِ الله: ﴿ لَّا تُدۡرِكُهُ ٱلۡأَبۡصَٰرُ ﴿١٠٣﴾ ﴾الأنعام، قَالَ ذَلِكَ إِذَا تَجَلَّى بِنُورِهِ الَّذِي هُوَ نُورُهُ الأَصْلِيُّ)،** واتە: بە عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس گوتراوە: ئەدی خوا نەیفەرموە: ﴿ لَّا تُدۡرِكُهُ ٱلۡأَبۡصَٰرُ ﴿١٠٣﴾ ﴾الأنعام، چاوەکان نایبینن؟ {هەڵبەتە ئیبنو عەبباس رضي الله عنهما گوتوویەتی: پێغەمبەر ﷺ خوای پەروەردگاری بینیوە، ئنجا لەوبارەوە پرسیارکەرەکە ئەو ئایەتەی بە بەڵگە لەسەر هێناوەتەوە، کە خوا دەفەرمووێ: چاوەکان نایبینن} ئەویش گوتوویەتی: ئەوە کاتێکە کە خوا بە ڕووناکییەکەی کە ڕووناکیی خودی خۆیەتی خۆی دەربخات.

واتـە: بـەڵام دەگونجـێ بـە شـێوەیەکی دیکـە خـۆی بـۆ بەنـدەکان دەربخـات و بتوانـن ببینـن.

(إبـن عجيبـة) خـاوەنی تەفسـیری (البحـر المديـد)، دەڵـێ: (يَعْنِـي أَنَّ اللـه تَعَـالَى يَتَجَلَّى لِخَلْقِـهِ عَلَى مَـا يُطِيقُـونَ، وَلَـوْ تَجَلَّى بِنُـورِهِ الأَصْلِي، لَتَلاَشى الخَلْـقُ، كَمَا قَـالَ فـي الحَدِيْـث: حِجَابُـهُ النُّـورُ لَـوْ كَشَـفَهُ، لَأَحْرَقَـتْ سُـبُحَاتُ وَجْهِـهِ مَـا انْتَهَـى إِلَيْـهِ بَـصَرُهُ مِـنْ خَلْقِـهِ) (أخرجـه مسـلم: ٢٩٣).

واتـە: خـوای بـەرز بـۆ دروسـتکراوەکانی خـۆی بـە ئەنـدازەی ئـەوەی بتوانـن خۆیـان پیشـان دەدا، ئەگـەر بـێ و بـە ڕووناکییـە ڕاسـتەقینەکەی خـۆی، خـۆی دەربخـات، دروسـتکراوەکان هەموویـان لـە بەیـن دەچـن، وەک لـە فەرمایشـتدا هاتـوە {کـە پێغەمبـەر ﷺ دەفەرمـوێ:} پەردەی خـوا ڕووناکییە، ئەگەر لایبەرێ، پڕشـنگەکانی ڕووی هەرچـی بکەوێتـە بـەر حوکمـی دیتنـی، هەمـووی لـە بەیـن دەبـەن.

واتـە: هەمـوو دروسـتکراوەکان، چونکـە هیـچ شـتێک لـە دروسـتکراوەکان نیـە، خـوا نەیبینـێ.

**١٢-** {عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رضي الله عنهما، فـي قَوْلِه تَعَالَى: ﴿ وَلَقَدْ رَءَاهُ نَزْلَةً أُخْرَىٰ ﴿١٣﴾ ﴾، قَالَ: ﴿ ثُمَّ دَنَا فَتَدَلَّىٰ ﴿٨﴾ ﴾، ﴿ فَكَانَ قَابَ قَوْسَيْنِ أَوْ أَدْنَىٰ ﴿٩﴾ ﴾، قَالَ ابْن عَبَّاسٍ: قَدْ رَآهُ النَّبِيُّ ﷺ} (أخرجه الطبري: ٣٢٥٦٨).

{عَـنِ ابْـنِ عَبَّـاسٍ رضي الله عنهما إِنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ رَأَى رَبَّـهُ بِقَلْبِهِ» فَقَالَ لَهُ رَجُـلٌ عِنْدَ ذَلِكَ، أَلَيْـسَ: ﴿ لَّا تُدْرِكُهُ ٱلْأَبْصَٰرُ ﴿١٠٣﴾ ﴾الأنعـام، قَـالَ لَـهُ عِكْرِمَـةُ: أَلَيْـسَ تَـرَى السَّـمَاءَ؟ قَـالَ: بَـلَى، أَفَكُلَّهَـا تَـرَى؟} (أخرجـه الطـبري: ٣٢٥٦٧).

واتـە: لـە تەفسـیری ئـەو ئایەتـەدا کـە دەفەرمـوێ: جارێکـی دیکـەش بینـی، پـەروەردگاری لێـی نیزیـک کەوتـەوەو هاتـە خـوار، هەتـا بـە ئەنـدازەی دوو کەوانـە، یاخـود نزیکتریـش لـە پێغەمبـەرەوە بـوو، ئنجا ئیبنو عەبباس رضي الله عنهما گوتوویـەتی: (قَدْ

www.alibapir.com


**رَآهُ النَّبِيُّ**)، پێغەمبەری خوا ﷺ خوای پەروەردگاری بینی، واتە: خوای بینیوە بە چاوی سەر.

هەر لە ئیبنو عەبباسەوە هاتوە، کە پێغەمبەر ﷺ پەروەردگاری خۆی بینیوە، بەڵام بە دڵی بینیویەتی، پیاوێک پێی گوت: ئەدی ئەوە نیە خوا دەفەرموێ: ﴿لَّا تُدْرِكُهُ ٱلْأَبْصَٰرُ ﴿١٠٣﴾﴾الأنعام، چاوەکان نایبینن؟ عیکریمەش {کە قوتابی عەبدوڵڵای کوڕی عەبباسە} گوتوویەتی: تۆ ئاسمان نابینی؟ گوتی: با، گوتی: هەمووی دەبینی؟ واتە: بە ئەندازەی خۆت ئەوەندە ئاسمانەی لە چەشمەندازی چاودایە، دەیبینی، واتە: هەر کەسەش ئەگەر خوای پەروەردگار ببینێ، بە چاوی سەر، بە ئەندازەی خۆی دەیبینێ.

ئەوانە ئەو دەقانەن لەو بارەوە، کە ئەگەر بە گشتیی تەماشایان بکەین، دەبینین: ئەو ڕایەی دەڵێ پێغەمبەری خاتەم ﷺ خوای پەروەردگاری نەبینیوە، پشتئەستوورن بەو فەرموودانەی سەنەدەکەیان ڕاستەو، لە بوخاریی و موسلیمدا هاتوون و، دایکمان عائیشەش (خوا لێی ڕازی بێ)، زۆر بە جەختکردنەوە گوتوویەتی و بۆ خۆشی لە پێغەمبەری پرسیوەو ئەویش فەرموویەتی: ئەوەی ئەو ئایەتانە باسی دەکەن، باسی دیتنی پێغەمبەرە ﷺ بۆ جیبریل.

**بڕگەی سێیەم:** لە سیاقی ئەم ئایەتانەوە، زۆر جوان دیارە، کە مەبەست لەو ئایەتە موبارەکانە، چۆنیەتیی وەحیی ناردنی خوایە بۆ موحەممەد لە ڕێی جیبریلەوەو، ئەو سیفەتانەش بەهیچ جۆرێک لەگەڵ خوادا گونجاو نین، واتە: ئەو ئایەتانە باسی دیتنی پێغەمبەر ناکەن، بۆ خوای بەرزی بێ وێنە، هەڵبەتە ناڵێین: شتێکی نەگونجاوە، خوا ﷻ کە ئەو سەفەرە گەورەو گرنگەی بە پێغەمبەری خاتەم کردوە، دەشگونجێ خۆشی پێشان بدات، واتە: پێغەمبەر ﷺ هێندە بە توانا بکات و چاوی هێندە بە حوکم بکات، یان دڵی هێندە بە حوکم بکات، بتوانێ خوا ببینێ، هەڵبەتە دیتنی بە عەقڵ و دڵ، هەموو

www.alibapir.com


دەمێ هەر هەیە، بۆ ئەهلی ئیمان، هەر کەس لە قەدەر خۆی، بەڵام دیتنی چاویش، خوای موتەعال دەتوانێ چاوی پێغەمبەری خاتەم هێندە بەهێز بکات، خوا ببینێ، لە حاڵێک دا مووسا نەیتوانی، کێوەکەش ببینێ و، لە هۆش خۆی چوو، کاتێک خوا خۆی پیشانی کێوەکەدا، وەک لە سوورەتی **(الأعراف)** دا هاتووەو، ئێمە لە سوورەتی **(الأنعام)**دا، لە کاتی تەفسیرکردنی ئەو ئایەتەدا: ﴿لَّا تُدْرِكُهُ ٱلْأَبْصَٰرُ وَهُوَ يُدْرِكُ ٱلْأَبْصَٰرَ ﴿١٠٣﴾﴾ الأنعام، باسێکی سەربەخۆمان لەو بارەوە کردوە، بۆیە ناچینە نێو ئەو وردەکارییەوە، بەڵام ئەم ئایەتانە ئەگەر سەرنجیان بدەین، زۆر جوان دیارن، کە باسی چۆنیەتیی وەحیی ناردنی خوا دەکەن بۆ پێغەمبەری خاتەم، جیبریل چۆن وەحیی بۆ هێناوە؟ ئەو سیفەتانەی خوا باسی کردوون، بەهیچ جۆرێک لەگەڵ خوای پەروەردگاردا ناگونجێن، کە حەوت سیفەتن:

١- ﴿عَلَّمَهُۥ شَدِيدُ ٱلْقُوَىٰ ﴿٥﴾﴾، خاوەن هێزی زۆر، فێری کردوە، خوا لە قورئاندا خۆی بە **(قَوِيّ)** و **(مَتِيْن)** **(قادر)** و **(مقتدر)** وەسف کردوە، بەڵام بە: ﴿شَدِيدُ ٱلْقُوَىٰ﴾، خوا خۆی وەسف نەکردوە، ئنجا وەک پێشتریش گوتمان، هەر ئەم تەعبیرە لە سوورەتی **(التكوير)**یش دا هاتوە: ﴿إِنَّهُۥ لَقَوْلُ رَسُولٍ كَرِيمٍ ﴿١٩﴾ ذِى قُوَّةٍ عِندَ ذِى ٱلْعَرْشِ مَكِينٍ ﴿٢٠﴾﴾، تەعبیری: ﴿ذِى قُوَّةٍ﴾، خاوەن هێز، مەبەست پێی جیبریلە، بە تەئکید ئەوەی سوورەتی **(التكوير)** کەس مشتومڕی لەبارەوە نیە، چونکە دەڵێ: ﴿إِنَّهُۥ لَقَوْلُ رَسُولٍ كَرِيمٍ﴾، قسەی ڕەوانەکراوێکی بەڕێزە، ﴿ذِى قُوَّةٍ﴾، خاوەن هێزە، ﴿عِندَ ذِى ٱلْعَرْشِ مَكِينٍ﴾، لە لای خاوەن عەرش، خاوەن پێگەو ڕێزو حورمەتی گەورەیە.

٢- ﴿ذُو مِرَّةٍ فَٱسْتَوَىٰ ﴿٦﴾﴾، ﴿ذُو مِرَّةٍ﴾، چ **(مِـرَّة)**: بە مانای دیمەنی جوان بێ، چ بە مانای هێز بێ، چ بە مانای عەقڵ و هۆشی بەهێز بێ، **(فَاسْتَوى)**، واتە: ڕێک وەستا، دیسان ئەمەش بەس لەگەڵ جیبریل دا دەگونجێ و، بۆ خوا بەکارنایەت و پێشتریش لەوبارەوە قسەمان کرد.

www.alibapir.com


٣-﴿ وَهُوَ بِالْأُفُقِ الْأَعْلَىٰ ۝٧ ﴾،خوا ﷻ هەرگیز خۆی بەوەوەسف نەکردوە،بفەرموێ: لە ئاسۆی هەرە بەرزم، ئاسۆی هەرە بەرزیش بۆ خەڵکی سەر زەوییە، ئێمە وەک خەڵکی سەرزەوی تەماشای ئاسۆدەکەین،خوا ﷻ هەرگیز بەوشێوە خۆی وەسف نەکردوە و، ئەو وەسفە لەگەڵ خوادا ناگونجێ.

٤- ﴿ ثُمَّ دَنَا فَتَدَلَّىٰ ۝٨ ﴾، دوای نیزیک کەوتەوەو شۆڕبۆوە، هەرگیز ئەوە لەگەڵ خوای بێ و وێنەو تاک و پاک دا ناگونجێ: نیزیک کەوتنەوەو شۆڕبوونەوە.

٥- ﴿ فَكَانَ قَابَ قَوْسَيْنِ أَوْ أَدْنَىٰ ۝٩ ﴾، وەک ئەندازەی دوو کەوانە، یان نیزیکتریش (قَابَ)، یانی: (مقدار)، (قَوْسَيْن)، واتە: دوو کەوان، مەبەست جووتە کەوانە، عەڕەبەکان عادەتیان وابووە، کاتێک پەیمانیان پێکەوە دەبەست، سەرۆک عەشیرەتی ئەملاو، سەرۆک عەشیرەتی ئەولا، هەردووکیان دوو کەوانەکانی خۆیان دەهێنان و پێکەوەیان جووت دەکردن، دوایی بەو کەوانە تیرێکیان دەهاویشت، بەو مانایەی ئەوانە لەمەودوا هێزیان یەک هێزەو، یەک هەڵوێستن.

یاخود مەبەست لە: ﴿ قَابَ قَوْسَيْنِ ﴾، ئەوەیە هەر کەوانێک دوو لای هەن، ئەو لاو ئەو لای پێیان دەگوترێ: (قَابْ)، ژێیەکەش پێی دەگوترێ: (وَتَرْ)، ئەوەی دیکەش بنکەکەیەتی.

هەندێکیش گوتوویانە: ئەملاولای کەوانەکە پێیان دەگوترێ: (سية)، گرنگ ئەوەیە، چ مەبەست کەوانێک بێ کە دەکاتە دەوری باسکێک، گەزێک، کە ئەوکاتەش بە ئەندازەی دوو کەوان، یانی: دوو گەز، یاخود دوو باسک، چ مەبەست پێی دوو کەوان بن کە پێکەوە جووت دەکرێن، هەرگیز بۆ خوای پەروەردگار ناگونجێ، هێندە لە پێغەمبەر ﷺ نیزیک بوو بێ.

٦- ﴿ وَلَقَدْ رَءَاهُ نَزْلَةً أُخْرَىٰ ۝١٣ عِندَ سِدْرَةِ الْمُنتَهَىٰ ۝١٤ ﴾، لە دابەزینێکی دیکەشدا بینی لە لای درەختی کۆتایی، کەواتە: ئەوەی پێشێ باسی دیتنی پێغەمبەر دەکات لەسەر

www.alibapir.com


زەوی، چونکە ئەمەیان لە ئاسمانێیە، لە لای درەختی کۆتایی، ئەوەی پێشێ لەسەر زەوییە، ئنجا هەرگیز پێغەمبەر ﷺ بۆ هیچ کەس باسی ئەوەی نەکردوە، کە خوای بەرز و مەزنی لەسەر زەوی بینیوە.

٧- ﴿لَقَدْ رَأَىٰ مِنْ ءَايَٰتِ رَبِّهِ ٱلْكُبْرَىٰٓ ١٨﴾، بەدڵنیایی لە نیشانە گەورەکانی پەروەردگاری بینین، ئەمیش دیسان هەر پشت ڕاستی دەکاتەوە، کە پێغەمبەر ﷺ تەنیا نیشانەکانی پەروەردگاری بینیون، ئەگەرنا دەیفەرموو: خوای پەروەردگاری بینی، بەڵام دەفەرموێ: بە دڵنیایی نیشانە گەورەکانی پەروەردگاری بینین.

**برگەی چوارەم:** لەو ئایەتانەوەش بە ڕوونیی دیارە، - پێشتریش ئاماژەمان پێدا - کە ناگونجێ شەوڕەوو بەرزبوونەوە (**الإسراء والعروج**)، لەساڵی (١٠، ١١، ١٢) ی پێش پێغەمبەرایەتیی دا بووبێ، چونکە خوا عزوجل لەم سوورەتەدا، ئاماژەی بە دیتنی پێغەمبەر ﷺ بۆ جیبریل کردوە، لە لای درەختی کۆتایی، کە بێگومان ئەویش بەهەشتی سرەوتگای بڕواداراني لێ نیزیکە، کە بێگومان لە ئاسمانەو، لە سەفەری شەوڕەوو بەرزبوونەوەکەی دا بووە، ئنجا مادام ئەم سوورەتە ژمارەی (٢٣)ی هەبێ لە ڕیزبەندیی دابەزیندا، دەبێ لە ساڵانی (٤ و ٥)دا دابەزیبێ، نەک ساڵانی (١٠ و ١٢)دا، چونکە ئەم سوورەتە باسی ئەو دیتنەی پێغەمبەری خاتەم دەکات بۆ جیبریل لە لای درەختی کۆتایی، کە بە تەئکید لە سەفەری شەوڕەوو بەرزبوونەوەکەیدا بووە، کەواتە: دەبێ دیتنەکەی پێغەمبەر بۆ جیبریل لە پێش دابەزینی ئەم سوورەتەدا بووبێ، چونکە ئەم سوورەتە باسی دیتنەکە دەکات، وەک شتێکی ڕابردوو، هەروەها ئەم دەقەش بەڵگەیەکی دیکەی بەهێزە لەسەر زوو دابەزینی ئەم سوورەتە:

{**عَنِ ابْنِ مَسْعُودٍ** رضي الله عنه **قَالَ: أَوَّلُ سُورَةٍ نَزَلَتْ فِيهَا السَّجْدَةُ: (والنَّجْمُ) فَسَجَدَ رَسُولُ اللهِ** ﷺ، **وَسَجَدَ مَنْ خَلْفَهُ، إِلَّا رَجُلًا رَأَيْتُهُ أَخَذَ كَفًّا مِنْ تُرَابٍ فَسَجَدَ عَلَيْهِ، فَرَأَيْتُهُ بَعْدَ ذَلِكَ قُتِلَ كَافِرًا، وَالرَّجُلُ أُمَيَّةُ بْنُ خَلَفٍ**} **(أخرجه البخاري: ٤٨٥٣، ومسلم: ٥٧٦، وأبو داود: ١٤٠٦).**

واتــە: عەبدوڵـڵای کـوڕی مەسـعوود ﷺ، دەڵـێ: یەکەمیـن سـوورەتێک کـە دابەزیـی و سـەجدەی تێـدا بـوو، سـوورەتی **(والنجـم)** بـوو، کـە پێغەمبـەر ﷺ کڕنووشـی بـرد، خەڵکیـش تێکـڕا کڕنووشـیان بـرد، (واتـە: ئـەوەی کـە لـەوێ بـوون بـە مسـوڵمان و نامسـوڵمانەوە، چونکـە ئـەو سـوورەتە مەزنـە، هەمـووی باسـی خـوای پـەروەردگارو نیشـانەکانی خوایـە و خاڵـی هاوبەشـی زۆری تێـدان، لـە نێـوان ئیمانـداران و هاوبـەش بـۆ خـوا دانەرانـدا)، تەنیـا پیاوێـک کڕنووشـی نەبـرد، بینیـم چەنگـە گڵ یاخـود چەنگـە چەوێکـی هەڵگـرت و بـەرزی کـردەوەو بەنێـو چـەوانی خۆیـەوە نـاو، سـەجدەی لەسـەر بـرد، دواییـش بینیـم: بـە بێبڕوایـی کـوژرا، ئەویـش ئومەییـەی کـوڕی خەلـەف بـوو.

**برگـەی پێنجـەم:** بۆیـەش زانایـان لـە بـارەی کاتی شـەوڕۆو بەرزبوونـەوە **(الإسراء والعـروج)**ەوە، لـە دێـر زەمانـەوە مشـتومڕیان بـووە.

١- لە بارەی ئەوەوە کە ئایا بە جەستەو ڕووحەوە بووە، یاخود تەنیا بە ڕووح بووە؟

٢- ئایا لە حاڵەتی بێدارییدا بووە، یان بە خەون بووە؟

٣- ئایا لە چ کاتێکدا بووە؟

ئنجـا ئێمـە بـە درێژیـی لـەو بـارەوە، لـە سـەرەتای تەفسـیری سـوورەتی **(الإسراء)**دا قسـەمان کـردوەو دووبـارەی ناکەینـەوە، بـەڵام لێرەدا دەڵێیـن:

١- ناگونجێ ئەو سەفەرە لە ساڵی (١٠) تاکو (١٢)ی پێش پێغەمبەرایەتییدا بووبێ، لەبەر ئەو هۆیانەی باسمان کردن.

٢- ئەو قسەیەی دەڵێ: ڕەنگە سەفەرەکە تاکو (بیت المقدس)، بە ڕووح و جەستەوە بوو بێ و، لەوێوە بەرەو سەرێ، تەنیا بە ڕووح بوو بێ، قسەیەکی میانجییە لە نێوان ئەو دوو ڕایەدا، کە ڕایەکیان دەڵێ: هەمووی هەر بە ڕووح بووەو، هەندێکیش دەڵێن: هەمووی هەر بە ڕووح و جەستە بووە، هەرچەندە من هەر ئەو ڕایەم پێ ڕاستە، کە هەموو سەفەرەکە بە ڕووح و جەستەوە بووە.

**٣-** ئەو ڕایەی زانایان کە دەگونجێ پێغەمبەری کۆتایی ﷺ زیاتر لە بەرزبوونەوە (**عروج**)ێکی بوو بێ، وەک (**القرطبي**) هێناویەتی، بە ڕایەکی گرنگ و جێی سەرنجی دەزانم[1].

**٤-** وا پێدەچێ ئەوەی ئەو ئایەتانەی (**النجم**) باسی دەکەن، لە ساڵانی (٤ و ٥)دا بوو بێ، یان زووتریش، چونکە ئایەتەکان وەک ڕابردوو باسی دەکەن، ئەوەش ڕای (**إبن الوقاصي**)یە، کە لە (**إبن شهاب**)ەوە هێناویەتی و، (**إبن شهاب**) ڕای وایە لە ساڵی حەوتەمی پێغەمبەرایەتیی (**بعثة**)دا بووبێ، وەک **القرطبي** لە تەفسیرەکەی خۆی دا[2] لێوەی نەقڵ کردوون.

کەواتـە: ئەگـەر بڵێیـن: پێغەمبـەری خوا ﷺ بـە لای کەمەوە دوو جاران سـەفەری (**عـروج**) بـەرز بوونـەوەی بـووە، یەکیـان پێـش دابەزینـی سـوورەتی (**النجـم**) و، یەکێکیشـیان لـە سـاڵانی نێوان: (١٠ و ١٢)دا، لـەو ئیشـکالەی باسـمان کـرد دەربازمـان دەبـێ، بـەڵام لـەو تەفسـیرانەدا کـە تەماشـام کـردوون، نەمبینیـوە باسـی ئـەو ئیشـکالەو چۆنیەتیـی لابردنییـان کـرد بـێ و، شـایانی باسـە: بەشـێک لـە زانایانیـش ڕایـان وایـە پێغەمبـەری کۆتایـی (موحەممـەد) ﷺ نـەک دووجـار، بگـرە زیاتریـش ئەوجـۆرە سـەفەرەی پێکـراوە.

سُبحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ، أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ أَنْتَ، أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ.

---

(١) الجامع لأحكام القرآن: ج٩، ص٢٧٣.

(٢) جامع الاحكام القرآن: ج٩، ص٢٧٣.

## پێناسەی ئەم دەرسە

ئـەم دەرسـە چـوارده (١٤) ئایـەت دەگرێتـە خـۆی، ئایەتـەکانی: (١٩ - ٣٢)، تەوەری سـەرەکییان باسـی پووچەڵیـی بیرۆکـەی بـت پەرسـتییە، بـە تایبـەت هەرسـێک بتـی نـاوداری: (اللَّات) و (الْعُزَّى) و (مَنَاة)، کـە گوایـە مێینـەن و کچـانی خـوا بـوون.

خـوای کارزان و شـارەزاش ڕایگەیانـدوە کـە بتپەرسـتەکان، جگـە لـە شـوێن کەوتنی گومـان و خەیـاڵ و ئـارەزووی خۆیـان و، پەرستراوەکانیشـیان، جگـە لـە چەنـد ناوێکـی بـێ نێـوەڕۆک کـە بـاب و باپیرانیـان لـەو دروسـتکراوانەیان هەڵـداون، هیچـی دیکـە نین، دواییش خوای بەرزو بێ وێنە ﷻ ڕوونی کردۆتەوە، کە فریشتەکان بە ڕێ پێـدان و مۆڵـەتی خـوا نەبـێ، تـکا بـۆ هیـچ کـەس ناکـەن، ئەویـش لـە حاڵێکـدا کـە ئـەو تـکا بـۆ کـراوە، خـوا ڕازی بـێ، تـکای بـۆ بکـرێ.

پاشـان خـوا تبـارک وتعـالى فەرمـان بـە پێغەمبـەری خـۆی موحەممـەد دەکات: ئەوانـە پشـت گـوێ بخـات، کـە لامـل دەکەنـە بەرنامـەی خـواو، تەنیـا ژیـانی دنیایـان دەوێ و دواڕۆژیـان فەرامـۆش کـردوە.

لە کۆتاییشدا خوا ﷻ ڕایدەگەیەنێ کە خاوەنی ڕەهای گەردوونە بەسەرو خواریـەوە (ئاسـمانەکان و زەوی)، بـۆ ئـەوەی سـزاو پاداشـتی شایسـتە بەسـەر خراپـەکاران و چاکەکارانـدا بچەسـپێنێ و، ئامۆژگاریـی هەمـوو لایەکیـش دەکات، کـە ئاگاداربـن! خـوا پێیـان زانایـەو، بـا ستاییشـی خۆیـان نەکـەن و خۆیـان پـێ پەسـندو چـاک نەبـێ.

www.alibapir.com



﴿ أَفَرَءَيْتُمُ ٱللَّـٰتَ وَٱلْعُزَّىٰ ﴿١٩﴾ وَمَنَوٰةَ ٱلثَّالِثَةَ ٱلْأُخْرَىٰٓ ﴿٢٠﴾ أَلَكُمُ ٱلذَّكَرُ وَلَهُ ٱلْأُنثَىٰ ﴿٢١﴾ تِلْكَ إِذًا قِسْمَةٌ ضِيزَىٰٓ ﴿٢٢﴾ إِنْ هِىَ إِلَّآ أَسْمَآءٌ سَمَّيْتُمُوهَآ أَنتُمْ وَءَابَآؤُكُم مَّآ أَنزَلَ ٱللَّهُ بِهَا مِن سُلْطَـٰنٍ ۚ إِن يَتَّبِعُونَ إِلَّا ٱلظَّنَّ وَمَا تَهْوَى ٱلْأَنفُسُ ۖ وَلَقَدْ جَآءَهُم مِّن رَّبِّهِمُ ٱلْهُدَىٰٓ ﴿٢٣﴾ أَمْ لِلْإِنسَـٰنِ مَا تَمَنَّىٰ ﴿٢٤﴾ فَلِلَّهِ ٱلْـَٔاخِرَةُ وَٱلْأُولَىٰ ﴿٢٥﴾ وَكَم مِّن مَّلَكٍ فِى ٱلسَّمَـٰوَٰتِ لَا تُغْنِى شَفَـٰعَتُهُمْ شَيْـًٔا إِلَّا مِنۢ بَعْدِ أَن يَأْذَنَ ٱللَّهُ لِمَن يَشَآءُ وَيَرْضَىٰٓ ﴿٢٦﴾ إِنَّ ٱلَّذِينَ لَا يُؤْمِنُونَ بِٱلْـَٔاخِرَةِ لَيُسَمُّونَ ٱلْمَلَـٰٓئِكَةَ تَسْمِيَةَ ٱلْأُنثَىٰ ﴿٢٧﴾ وَمَا لَهُم بِهِۦ مِنْ عِلْمٍ ۖ إِن يَتَّبِعُونَ إِلَّا ٱلظَّنَّ ۖ وَإِنَّ ٱلظَّنَّ لَا يُغْنِى مِنَ ٱلْحَقِّ شَيْـًٔا ﴿٢٨﴾ فَأَعْرِضْ عَن مَّن تَوَلَّىٰ عَن ذِكْرِنَا وَلَمْ يُرِدْ إِلَّا ٱلْحَيَوٰةَ ٱلدُّنْيَا ﴿٢٩﴾ ذَٰلِكَ مَبْلَغُهُم مِّنَ ٱلْعِلْمِ ۚ إِنَّ رَبَّكَ هُوَ أَعْلَمُ بِمَن ضَلَّ عَن سَبِيلِهِۦ وَهُوَ أَعْلَمُ بِمَنِ ٱهْتَدَىٰ ﴿٣٠﴾ وَلِلَّهِ مَا فِى ٱلسَّمَـٰوَٰتِ وَمَا فِى ٱلْأَرْضِ لِيَجْزِىَ ٱلَّذِينَ أَسَـٰٓـُٔوا۟ بِمَا عَمِلُوا۟ وَيَجْزِىَ ٱلَّذِينَ أَحْسَنُوا۟ بِٱلْحُسْنَى ﴿٣١﴾ ٱلَّذِينَ يَجْتَنِبُونَ كَبَـٰٓئِرَ ٱلْإِثْمِ وَٱلْفَوَٰحِشَ إِلَّا ٱللَّمَمَ ۚ إِنَّ رَبَّكَ وَٰسِعُ ٱلْمَغْفِرَةِ ۚ هُوَ أَعْلَمُ بِكُمْ إِذْ أَنشَأَكُم مِّنَ ٱلْأَرْضِ وَإِذْ أَنتُمْ أَجِنَّةٌ فِى بُطُونِ أُمَّهَـٰتِكُمْ ۖ فَلَا تُزَكُّوٓا۟ أَنفُسَكُمْ ۖ هُوَ أَعْلَمُ بِمَنِ ٱتَّقَىٰٓ ﴿٣٢﴾ ﴾

## مانای دەقاودەقی ئایەتەکان

{(ئەی هاوبەشدانەرەکان!) ئایا لات و عوززاتان دیون! ﴿١٩﴾ هەروەها مەناتی سێیەمی دیکە! ﴿٢٠﴾ ئایا (ڕەوایە) ئێوە نێرینەتان هەبێ و ئەو (خوا)یش مێینە؟ ﴿٢١﴾ کەواتە: ئەوە دابەشکردنێکی ستەمکارانەیە! ﴿٢٢﴾ ئەو (پەرستراو)انە تەنیا ناو (ی بێ نێوەڕۆک)ن، خۆتان و باب و باپیرانتان داتاناون، خوا هیچ بەڵگەی لەسەر نەناردوونە خوار، ئەو (بێبڕوایانە) تەنیا شوێن گومان و ئەوە دەکەون، کە نەفسەکان ئارەزووی دەکەن، لە حاڵێکدا کە بێگومان لە پەروەردگاریشیانەوە، ڕێنماییەک (ی مەزن)یان بۆ هاتووە! ﴿٢٣﴾ یان ئایا مرۆڤ هەرچی خۆزگەی پێ بخوازێ، بۆی دەبێ (بەبێ ویستی خوا؟!) ﴿٢٤﴾ (بە دڵنیایی نەخێر، چونکە)، (ژیانی) دواڕۆژو یەکەم (ی دنیا) تەنیا هی خوان ﴿٢٥﴾ گەلێک فریشتەش لە

ئاسـماناندا هـەن، کـە تـکا کردنەکەیـان هیـچ ئەندازەیـەک سـوود (بـە کـەس) ناگەیەنـێ، مەگـەر دوای ئـەوەی خـوا بـۆ هـەر کەسـێ بیـەوێ و پەسـندی بـکات، مۆڵـەت بـدات (تـکای بـۆ بکـەن) ﴿٢٦﴾ بـە دڵنیایـی ئەوانـەی بڕوایـان بـە (ژیـانی دوایـی نیـە، فریشـتان بـە نـاوی مێینـە ناودەنێـن ﴿٢٧﴾ هیـچ زانیارییشـیان لـەو بـارەوە نیـە، بـەس شـوێن گومـان دەکـەون و، گومانیـش هیـچ کەڵێنێکـی هـەق ناگـرێ (و نابێتـە جێگـرەوەی) ﴿٢٨﴾ (دەجـا مـادام حـاڵ وایـە ئـەی موحەممـەد!) ڕوو لـەو کەسـە وەرگێـڕە، کـە پشـتی کردۆتـە (یـادو بەرنامـەی) ئێمـەو، تەنیـا ژیـانی دنیـای مەبەسـتە ﴿٢٩﴾ (هەڵبـژاردنی ژیـانی دنیـا) ئەوپـەڕی زانیاریـی (و عەقـڵ پێشـکان)یانە، بێگومـان پـەروەردگار زاناتـرە بـە کەسـێک لـە ڕێـی وی لایـداوەو، هـەر ئەویـش بـەو کەسـە زاناتـرە کـە ڕێـی ڕاسـتی گرتـوە ﴿٣٠﴾ هەرچـی لـە ئاسـمانەکان و لـە زەویـش دایـە (تەنیـا) هـی خوایـە، تاکـو سـزای ئەوانـەی خراپەیـان کـردوە، بەپێـی ئـەوەی کردوویانـە، بداتـەوەو، پاداشـتی هـەرە چاکیـش بداتـە ئەوانـەی چاکەیـان کـردوە ﴿٣١﴾ ئەوانـەی خۆیـان لـە گوناهـە زلـەکان و (ڕەفتـارە) دزێـوو ناقۆڵایـەکان دەپارێـزن، جگـە لـە گوناهـە وردیلـەکان، بـە دڵنیایـی پـەروەردگارت لێبـوردنی فراوانـە، ئەویـش پێتـان زاناتـرە، کاتێـک لـە زەوییـەوە پێیگەیانـدوون و، کاتێکیـش ئێـوە کۆرپەلـە بـوون لـە سـکی دایکتانـدا، بۆیـە خۆپەسـندیی مەکـەن، ئـەو (خـوا) زاناتـرە بـەو کەسـەی پارێـزی کـردوە ﴿٣٢﴾}

لە تۆڕە کۆمەڵایەتییەکان لەگەڵتانین
Stay in touch on social media
نحن معكم عبر مواقع التواصل الاجتماعي
ڕاگەیاندنی مەکتەبی مامۆستا عەلی باپیر
عەلی باپیر/AliBapir
archive.org/details/@alibapir
عەلی باپیر/AliBapir
AliBapir
کەناڵی ڕاگەیاندنی مەکتەبی مامۆستا عەلی باپیر
www.alibapir.net
کوردی - عربي - English
ڕاگەیاندنی مەکتەبی مامۆستا عەلی باپیر

www.alibapir.com



## شیکردنەوەی هەندێک لە وشەکان

(اللَّات) و (الْعُزَّى) و (مَنَاة)،: ئەمانە هەر سێکیان بت و صەنەمی ناوداری بێبڕوایەکانی ڕۆژگاری پێغەمبەر بوون، لە نێو گەلی عەرەبدا دەپەرستران، (**اللَّاتُ والعُزَّى صَنَمَانِ وَأَصْلُ اللاَّتِ: اللاَّه فَحَذَفُوا مِنْهُ الهَاءَ، وَأَدْخَلُوا التَّاءَ فِيْهِ، وَأَنَّثُوْه تَنْبِيْهَاً عَلَى قصُوره عَنِ الله**)، بنەڕەتی وشەی (لَات)، (لَاه)، بووە (ه)کەیان لێ لابردوەو (ت)یان لە جیاتی داناوەو، وەک مێینە تەماشایان کردوە، بە حیساب کە لە خوار خوای پەروەدگارەوەیە.

(**عُزَّى**): هەندێک گوتوویانە: (**مُؤنَّث**)ی، (**أَعَزّ**)، یان (**مُؤنَّث**)ی، (**عَزِيْز**)ە، (**فِعْلٌ مِنَ العِزّ**)، ئەویش لە وشەی (عِزَّة)ەوە هاتوە، (مَنَاة)یش، بتێکی دیکەیە، هەندێک گوتوویانە: (**مُؤنَّث**)ی (مَنَّان)ە، لە ڕووی داتاشرانی ئەو وشانەوە، زانایان ڕاجیایی زۆریان هەیە، گرنگ ئەوەیە: (لاة)و، (**عُزَّى**)و، (وَمَنَاةَ)، سێ بتی ناوداروو سەرەکیی بێبڕوایەکان و هاوبەش بۆ خوا دانەرانی ڕۆژگاری پێغەمبەر بوون.

(مَا تَمَنَّىٰ ): (**التَّمَنِّي: تَقْدِيْرُ الشَّيء فِي النَّفْسِ، وَتَصْوِيْرُهُ فِيْهَا**)، (**تَمَنِّي**): بە کوردیی خۆزگە خواستن و بە ئاوات خواستنی پێ دەڵێین و، بریتیە لە ئەندازەگیریی شتێک لە دەروون داو وێناکردنی.

(لَا تُغۡنِي ): واتە: سوودی پێناگەیەنێ، کەڵێنی بۆ ناگرێ، (**أَغْنَى عَنْهُ: كَفَاهُ**)، واتە: بوو بە جێگرەوەی.

(مَبۡلَغُهُم): ﴿ ذَٰلِكَ مَبۡلَغُهُم مِّنَ ٱلۡعِلۡمِ ﴾، واتە: ئەوە ئەوپەڕی زانیاریی و عەقڵ پێ شکانیانە، (**قَدْرُ عُقُولِهِمْ وَنِهَايَةُ عِلْمِهِم**)، ئەوە ئەندازەی عەقڵ پێ شکان و کۆتایی زانیارییانە.

(كَبَٰٓئِرَ ٱلۡإِثۡمِ ): (**كَبَائِرَ: جَمْعُ كَبِيْرَة**)، یانی: گەورەو بۆ مێینە (**مُؤنَّث**)یە، (**الإِثْمُ: الذَّنْبُ، المَعْصِيَة**)، (**إِثْم**): گوناهو تاوانە.

www.alibapir.com


(وَٱلْفَوَٰحِشَ): (الفَوَاحِشُ: جَمْعُ فَاحِشَة)، وەک پێشتر گوتوومانە، (الفُحْشُ وَالفَحْشَاءُ وَالفَاحِشَةُ)، هەر سێکیان بۆ گوناهێک بەکاردەهێنرێن کە لە سنوور دەرچوو بێ، یان زۆر ناقۆڵاو دزێو بێ، هەندێکیش گوتوویانە: (كَبَائِر): بریتین لەو گوناهە گەورانەی جیا لەو گوناهانەی لە لایەنی سێکسییەوە پەیدادەبن و، (فَواحِش)یش ئەو گوناهانەن کە لەو ڕووەوە پەیدادەبن.

بەڵام من وای تێدەگەم: هەر کام لە (كَبَائِرَ) و (فَوَاحِشَ)، هەر بە مانای گوناهی گەورە دێن، بەڵام لە ڕووی قەبارەوە گەورەن و، لە ڕووی ناشیرینیشەوە ناشیرین و ناقۆڵاو دزێون، بۆیە زیناش گوناهی گەورەیەو لە هەمان کاتدا فاحیشەشە، قەتڵیش گوناهی گەورەیەو، لە هەمان کاتدا گوناهێکی ناقۆڵاو دزێویشە، بەڵام بە ئیعتیباری ناشیرینییان پێیان دەگوترێ: (الفَوَاحِش)و، بە ئیعتیباری گەورەییان، پێیان دەگوترێ: (كَبَائِرَ).

(ٱللَّمَمَ): (صَغَائِرُ الذُّنُوبِ)، (اللَّمَم)، وەک دواییش باسی دەکەین، زانایان بە چەند تەعبیرێک هێناویانە، گرنگ ئەوەیە مادام خوا ﷻ (اللَّمَم)ی، هەڵاواردوە لە: ﴿كَبَٰٓئِرَ ٱلۡإِثۡمِ وَٱلۡفَوَٰحِشَ﴾، کەواتە: جیایە لەوان، بۆیە زۆربەی زانایان گوتوویانە: گوناهە گچکەکان، هەندێکیش گوتوویانە: (اللَّمم) نیزیکەوتنەوەیە لە گوناه بەڵام نەکردنی، هەندێکیش گوتوویانە: (مَا يُعْمَلُ مَرَّةً وَلَا يُتَعَمَّقُ فِيْهِ)، ئەو گوناهەی جارێک دەکرێ، بەڵام پێیدا قووڵ نابێتەوە، چونکە (الإلْمَامُ: الدُّنُوُّ وَالقُرْبُ)، لێ نزیککەوتنەوەو تخوونکەوتن، دواتریش زیاتر قسەی لێوە دەکەین.

(أَجِنَّةٌ): (جَمْعُ جَنِيْن، وَهُوَ الوَلَدُ فِي البَطْنِ، أو فِي الرَّحِم) (جنين)، بریتییە لە ڕۆڵە یان کۆرپەلە لە سکدا، یان لە منداڵداندا، ئنجا بە هی مرۆڤیش دەگوترێ و، بە هی ئاژەڵیش دەگوترێ هەتا لە تۆڵدابێ.

﴿فَلَا تُزَكُّوٓاْ أَنفُسَكُمۡ﴾: (أَيْ: لَا تَمْدَحُوهَا وَلَا تُبَرِّؤُهَا عَنِ الآثَامِ، وَلَا تُثْنُوا عَلَيْهَا)، بە چەند تەعبیرێک هێناویانە، ﴿فَلَا تُزَكُّوٓاْ أَنفُسَكُمۡ﴾ تەزکییە، یانی: بە پاک و چاک

www.alibapir.com


و گەشە كردو دانان، یاخود ئەنجامدانی پاككردن و چاككردن و گەشەكردن، ئنجا ﴿فَلَا تُزَكُّوٓا۟ أَنفُسَكُمْ﴾، واتە: مەدحی خۆتان مەكەن، یاخود خۆتان لە گوناهان بەریی مەكەن، پێتان وابێ هیچ گوناهتان نیە، یاخود: بە خۆتان هەڵمەڵێن و خۆپەسندیی مەكەن.

## مانای گشتیی ئایەتەكان

خوا ﷻ ڕوو دەكاتە هاوبەش بۆ خوا دانەرەكان، كە نكووڵییان دەكرد لەوەی موحەممەد ﷺ ئەو كەسەی دەیبینێ، فریشتەیەكی خوا بێ، كە جیبریلەو پەیامی خوای بۆ دێنێ، بەڵكو پێیان وابوو ئەوە شەیتانێكەو حاڵی تێكداوەو دەستی لێوەشاندوە، یان خوتخوتەو خەیاڵی بێ جێی بۆ دەكات، ئەو جۆرە گومانانەیان پێ دەبردن!! خوا ﷻ ڕوو لە هاوبەش بۆ خوا دانەرەكان دەكات، كە بەو شێوەیە تەماشای پێغەمبەری خاتەم ﷺو، ئەو فەرمایشتەی خوا دەكەن، كە بۆی دێ، لە ڕێی جیبریلەوە ئنجا ڕووبەڕوویان دەكاتەوە لەگەڵ پەرستراوەكانی خۆیان دا، كە ئێوە كاتێك بڕوا ناهێنن بە پەیامەكەی موحەممەد ﷺ كە لە خواوە بۆی دێ، بەو فەرمایشتەی خوا ﷻ كە ئەوپەڕی زانیاریی و حیكمەت و ڕێ ڕوونیی تێدایەو، تۆسقاڵێك هەڵەو كەم و كوڕیی تێدا نیەو، تۆسقاڵێك زێدەڕۆیی تێدانیە، لە هیچ ڕوویەكەوەو، هەر كەسێ لێی وردبێتەوە: دەزانێ كە بەشەر قسەی واناكەن و دڵنیا دەبێ كە فەرمایشتی خوایە ﷻ، ئێوەش ئەوە جۆری بوونناسیی و جۆری تێڕوانینتانە كە ئەو هەڵوێستە لارو هەڵەیەتان تێدا پەیدادەكات، ئنجا با تەماشا بكەین داخۆ، ئێوە چی دەپەرستن و عەقیدەتان بەچییە؟

﴿أَفَرَءَيْتُمُ ٱللَّٰتَ وَٱلْعُزَّىٰ﴾، ئایا لات و عوززاتان بینیون! لێرەدا ئەگەر بینین، بینینی چاو بێ، (أَفَرَءَيْتُم)، ئایا بینیوتانن واتە: ئەگەر بینیوتانن دەبێ سەرتان لێیان سووڕبمێنێ ئەوانە بپەرسترێن، بەڵام ئەگەر بینین، بینینی عەقڵ و دڵ بێ،

واتـە: ئایـا زانیوتانـن؟! ئنجـا ئەگـەر مەبەسـت دیتنـی عەقـڵ و زانیـن بـێ، دەبـێ بـەرکاری دووەمیشـی هەبـێ، بـەڵام ئەگـەر بینینـی چـاو بـێ، بـەس یـەک بـەرکاری هەیـە: ئایـا بینیوتانـن؟ بـەڵام ئەگـەر بـە مانـای زانیـن بـێ: ئایـا زانیوتانـن ئەوانـە پەرسـتراوبن؟ یاخـود: ئایـا زانیوتانـن ئەوانـە هیچیـان بەدەسـت بـێ؟ ﴿ وَمَنَوٰةَ ٱلثَّالِثَةَ ٱلۡأُخۡرَىٰٓ ﴾، هەروەهـا مەنـاتی سـێیەمی دیکـە، لـە سـێ پەرسـتراوە سـەرەکییەکەی کـە لەنێـو گـەلی عەرەبـدا بـاو بـوون.

﴿ أَلَكُمُ ٱلذَّكَرُ وَلَهُ ٱلۡأُنثَىٰ ﴾، ئـەو سـێیە کـە ئێـوە بـە مێینەیـان لـە قەڵـەم دەدەن، پێشـتان وایـە فریشـتەن، یـان پێیـان وابـووە ئەوانـە جۆرێـک لـە پەیوەندییـان لەگـەڵ خـوای پـەروەردگاردا هەیـە، نـەک پەیوەندیـی نێـوان دروسـتکراو و دروسـتکەر، بەڵکو پەیوەندییەکـی تایبـەت، کـە ئەوانـە کچـی خوابـن! یـان بـە جۆرێـک لـە جـۆرەکان ئەوانـە وەچـەی خوابـن! ﴿ أَلَكُمُ ٱلذَّكَرُ وَلَهُ ٱلۡأُنثَىٰ ﴾، ئنجـا ئایـا دەگونجـێ ئێـوە نێرینەتـان هەبـێ و، ئەویـش مێینـەی هەبـێ؟ واتـە: هـەر بـە پێودانگـی خۆشـتان، چـۆن دەبـێ خۆتـان کـە بـە مێینـە و بـە کچـان ڕازی نیـن، ئەوانـە بـە کچـانی خـوا لـە قەڵـەم بـدەن؟

لێرەدا مەبەست ئەوە نیە کە خوا ﷻ هەڵوێستەکەی ئەوان، کە بە کچان ڕازی نیـن و ناڕازیـن لـەوەی کچیـان ببـێ، بـە ڕاسـت بزانـێ، بـەڵام وەک عـەرەب دەڵێـن: (أدِيْنُـكَ مِـنْ فَمِـك)، بـە زاری خـۆت دەتگـرم.

﴿ تِلۡكَ إِذٗا قِسۡمَةٞ ضِيزَىٰٓ ﴾، کەواتـە: ئـەوە (ئەگـەر ئێـوە نێرینەتـان هەبـێ و، خـوا مێینـەی هەبـێ) دابەشـکردنێکی سـتەمکارانەیە.

﴿ إِنۡ هِيَ إِلَّآ أَسۡمَآءٞ سَمَّيۡتُمُوهَآ أَنتُمۡ وَءَابَآؤُكُم ﴾، ئەمانـە تەنیـا نـاون، خۆتـان و بـاب و باپیرانتـان داتاننـاون، ﴿ مَّآ أَنزَلَ ٱللَّهُ بِهَا مِن سُلۡطَٰنٍ ﴾، خـوا هیـچ بەڵگـەی لەسـەر نەناردوونـە خـوار، (سُلْطَان): بـە مانـای بەڵگـەو دەلیلـە، بۆیـەش ئـەو نـاوەی لێنراوە، چونکـە بەڵگـە دەسـتەڵاتی هەیـە، لەسـەر عەقـڵ و دڵـی مـرۆڤ و، ئەگـەر چ بـڕ بـە

www.alibapir.com


ئینصاف بێ، دەیخاتە ژێر ڕکێف و کۆنترۆڵی خۆیەوە، ﴿إِن يَتَّبِعُونَ إِلَّا ٱلظَّنَّ وَمَا تَهْوَى ٱلْأَنفُسُ﴾، پێشێ خوا ﷻ بە شێوەی دواندن (خطاب) دەیاندوێنێ، دوایی بە شێوەی نادیار (غیاب)، وەک چۆن کەسێک پێشێ کەسێک دەدوێنێ، دوایی بۆ دەرخستنی ئەوە کە شایستەی ئەوە نیە، بیدوێنێ، ڕووی لێ وەردەگێڕێ و بە شێوەی نادیار قسە دەکات، دەفەرموێ: ئەوانە تەنیا شوێن گومان و شوێن ئەوە دەکەن، کە نەفسەکان دەیخوازن و ئارەزووی دەکەن، ﴿وَلَقَدْ جَآءَهُم مِّن رَّبِّهِمُ ٱلْهُدَىٰٓ﴾، بە دڵنیایی لە پەروەردگاریشیانەوە ڕێنماییەکی زۆر ناوازەو مەزنیان بۆ هاتوە، کە لە قورئاندا بەرجەستەیە، هەروەها لە ڕێبازەکەی پێغەمبەردا ﷺ.

﴿أَمْ لِلْإِنسَٰنِ مَا تَمَنَّىٰ﴾، یان ئایا مرۆڤ هەرچی بیخوازێ، بۆی دەبێ، ئەمە دەگونجێ مەبەست پێی مرۆڤی بێبڕوابێ، کە پێیان وابوو ئەو فریشتانە تکاو ڕەجایان بۆ دەکەن، لەلای خوا، دەشگونجێ مەبەست مرۆڤ بەگشتیی بێ، واتە: مرۆڤ بەگشتیی هەرچی بیخوازێ، بۆی نایەتە دی، بەبێ ویستی خوا، واتە: وانیە کە مرۆڤ هەرچی پێی خۆش بوو بیکات و بە ئەنجام بگات، بەڵکو شتەکان بە ویستی خوا دەبن، ﴿فَلِلَّهِ ٱلْءَاخِرَةُ وَٱلْأُولَىٰ﴾، مەنزڵگای دوایی و هی یەکەم، بەس هی خوان، واتە: مەنزڵگای کۆتایی کە بەهەشتەو، مەنزڵگای یەکەم، کە ژیانی دنیایە، هەردووکیان لەبەر دەستی خوادان.

﴿وَكَم مِّن مَّلَكٍ فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ لَا تُغْنِى شَفَٰعَتُهُمْ شَيْـًٔا﴾، (كَمْ): لێرەدا ناوی پرسیارکردنە (كَمْ الإسْتِفْهَامِيَة)یە، بەڵام مەبەست پێی زۆرییە، دەگوترێ: (كَمْ كِتَابٌ عِنْدَك؟)، چەند کتێبت لەلان؟ ﴿وَكَم مِّن مَّلَكٍ فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ﴾، واتە: زۆر فریشتە هەن، لە ئاسمانەکاندا، ﴿لَا تُغْنِى شَفَٰعَتُهُمْ شَيْـًٔا﴾، تکا کردنەکەیان هیچ سوودیان پێ ناگەیەنێ، ﴿إِلَّا مِنۢ بَعْدِ أَن يَأْذَنَ ٱللَّهُ لِمَن يَشَآءُ وَيَرْضَىٰٓ﴾، مەگەر دوای ئەوەی خوا مۆڵەت و ڕێگا دەدات بۆ هەر کەسێک بیەوێ و لێشی ڕازی بێ، ئەو کەسە تکای بۆ بکرێ، ڕواڵەتی ئەم تەعبیرە ئەوە دەگەیەنێ، کە ئەوان تکا بکەن و تکا کردنەکە سوودی نەبێ، بەڵام مەبەست پێی ئەوەیە ئەوان هەر کەسێ

www.alibapir.com


نەزانن خوا مۆڵەتی داوەو لێی ڕازییە، تکای بۆ ناکەن، بەڵام تەعبیرەکە بۆیە واهاتوە، تاکو ئەو بیبڕوایانەی بە تەمای تکاکردنی پەرستراوەکانیان، لێ گەڕاون، ئنجا ئەگەر فریشتەن و، ئەگەر هەرچی هەن، بزانن کە لە ڕاستییدا تکاکردنی ئەوان، هیچ دادێکیان نادات و هیچ سوودێکیان پێ ناگەیەنێ، مەگەر دوای ئەوەی خوا ﷻ بۆ هەر کەسێ بیەوێ، مۆڵەت بدات و لێشی ڕازی بێ، تکای بۆ بکرێ.

﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ لَا يُؤْمِنُونَ بِٱلْـَٔاخِرَةِ لَيُسَمُّونَ ٱلْمَلَـٰٓئِكَةَ تَسْمِيَةَ ٱلْأُنثَىٰ﴾، بە دڵنیایی ئەوانەی بڕوایان بە مەنزڵگای کۆتایی نیە، بە ناو هێنانی مێینان، فریشتەکان ناو دێنن، لێرەدا ناوهێنان مەبەست پێی وەسفکردنە، واتە: بە وەسفی مێینە، وەسفیان دەکەن و وەک مێینە تەماشایان دەکەن.

﴿وَمَا لَهُم بِهِۦ مِنْ عِلْمٍ﴾، هیچ زانیارییەکیشیان لەو بارەوە نیە، (بِهِ)، واتە: ئەو وەسفەی لەو فریشتانەی هەڵدەدەن، یان ئەوەی باسکرا، هیچ زانیارییان پێی نیە، (مِنْ)، کە خراوەتە سەر (عِلْمٍ)، (مِنْ عِلْمٍ)، بۆ دەستپێکە یانی: هەر لە سەرەتای زانیارییەوە نیانە تاکو کۆتایی، واتە: هیچ جۆرە زانیارییەکیان نیە، شارەزایان گوتوویانە: (زَائِدَة للتَوْكِيْد) بۆ جەختکردنەوە زیاد کراوە کە هیچ جۆرە زانیارییەکیان نیە کەم و زۆر، بەو شتە، ئەدی چۆن ئەو قسەیە دەکەن؟ ﴿إِن يَتَّبِعُونَ إِلَّا ٱلظَّنَّ﴾، تەنیا شوێن گومان دەکەون، ﴿وَإِنَّ ٱلظَّنَّ لَا يُغْنِى مِنَ ٱلْحَقِّ شَيْـًٔا﴾، بە دڵنیایی گومانیش هیچ کەلێنی هەق پڕ ناکاتەوە، گومان نابێتە جێگرەوەی هەق و، هیچ سوودێک بە کەسێک ناگەیەنێ کە بە دوای هەقدا دەگەڕێ، ئەو گومانە بۆی ببێتە جێداری هەقێک، کە لێی دەگەڕێ.

ئنجا خوا ﷻ پێغەمبەری خاتەم ﷺ دەدوێنێ و دەفەرموێ: ﴿فَأَعْرِضْ عَن مَّن تَوَلَّىٰ عَن ذِكْرِنَا﴾، ڕوو وەرگێڕە لەو کەسەی پشتی کردۆتە یادی ئێمەو بەرنامەی ئێمە، وشەی (ذِكْر)، کە خوا پاڵی داوەتە لای ڕاناوی کۆ و بۆ خۆی بە کاری

www.alibapir.com


هێناوە، زیاتر وا پێدەچێ مەبەست پێی قورئان بێ، ئەگەرنا (**ذکر**) بە مانای (یاد کردن) دێ، بەڵام یەکێک لە ناوەکانی قورئانیش بریتیە لە (**الذِّكْر**): ﴿ إِنَّا نَحْنُ نَزَّلْنَا ٱلذِّكْرَ وَإِنَّا لَهُۥ لَحَٰفِظُونَ ٩ ﴾**الحجر**، لەبەر ئەوەی قورئان ڕاستییەکان دەخاتەوە بیر مرۆڤ و، ئامۆژگاریی و بیر خستنەوەیە بۆ مرۆڤ.

﴿ وَلَمْ يُرِدْ إِلَّا ٱلْحَيَوٰةَ ٱلدُّنْيَا ﴾، جگە لە ژیانی دنیاشی ناوێ، تەنیا ژیانی دنیای دەوێ، هەڵبەتە لێرەدا کە خوا بسم الله الرحمن الرحيم بە پێغەمبەری خاتەم ﷺ دەفەرموێ: ڕوویان لێ وەرگێڕە پشت گوێیان بخە، مەبەست ئەوە نیە کە بەردەوام نەبێ لەسەر ئامۆژگاریی کردن و بیرخستنەوەیان، چونکە ئەوە ئەرکی پێغەمبەرە ﷺ، بەڵکو مەبەست ئەوەیە: ڕوویان لێ وەرچەرخێنەو زۆر لەگەڵیان پێدا مەچۆو، زۆر مشتومڕیان لەگەڵ مەکە، یاخود: گوێ مەدە بە ئازارو ناڕەحەتییەکان، کە لە لایەن ئەوانەوە بۆت دێنە پێش، یاخود: ڕوو وەرگێڕە لەو داواکارییە بێ جێیانەی دەیانکەن، کە پێغەمبەری خوا موعجیزەو بەڵگەی بەرهەستیان بۆ بێنێ، یاخود: ئەمە هەڕەشەیەکە یانی: ڕوویان لێ وەربچەرخێنەو بە کەڵکی بیرخستنەوەو ئامۆژگاریی کردن نایەن، ئەمەش هەم جۆرێکە لە بێ بایەخ پێشاندانیان و، هەم جۆرێکە لە هەڕەشە لێکردنیشیان، یانی: ئەوانە بەڵگەیان لەسەر تەواو کراوەو، هەر ئەوە ماوە خوا سزایان بدات، چونکە نایانەوێ هەق وەربگرن و، یادی خواو بەرنامەی خواو کتێبی خوایان لەبەر دەستەو لەبەر چاوە، بەڵام پشتی تێدەکەن و ڕووی لێ وەردەگێڕن، ئەویش لەبەر دنیا ویستیی و ئارەزوو خوازیی.

هەڵبەتە لێرەدا زیاتر مەبەست زلە زلانی بێبڕوایەکانەو، سەرکردەو قسە ڕۆیشتووەکانیانە، کە دەیانزانی ئەگەر شوێن ئەو پەیامەی خوا بکەون، کە بە پێغەمبەری خاتەمدا ﷺ ناردوویەتی، ئەو بەزم و بازاڕەی پێکیانەوە ناوە، کە بریتیە لە چەوساندنەوەی خەڵک و قۆرخکاریی و دەست بەسەرداگرتنی سامانی گشتیی، ئەوەیان لێ تێکدەچێ، چونکە ئەو کاتە بەپێی پەیامی خوا، هیچ

www.alibapir.com



مرۆڤێـک لـە هیـچ مرۆڤێکـی دیکـە، زیاتـر بەشـی بـە نیعمەتـەکانی خـواوە نیـەو، مرۆڤـەکان لـە ڕووی ئابوورییـەوەو لـە ڕووی کۆمەڵایەتییـەوە، هەموویـان، وەک یەکـن، لـە ڕووی سیاسییشـەوە، نابێ هیچکـەس خـۆی بەسـەر خەڵـک و کۆمەڵـگادا بسـەپێنێ، بەڵکـو دەبـێ بـە مۆڵـەتی خۆیـان و، بـۆ خۆیـان کارێکـی پـێ بسـپێرن و، بـەو شـێوەیەش کـە ئـەو خەڵکـە دەیـەوێ، وڵاتیـان بـۆ بەڕێوەبـەرێ.

کەواتـە: ئـەوان بەهـۆی پەیـام و بەرنامـەی پـڕ دادگەریـی خـواوە: دۆخـی سیاسـیی و حاڵـەتی ئابووریـی، واقیعـی کۆمەڵایەتیـی، کـە بەسـتەم سـازاندبوویان، لێیان تێکدەچوو، بۆیە خوا ﷽ دەفەرموێ: ﴿ وَلَمْ يُرِدْ إِلَّا ٱلْحَيَوٰةَ ٱلدُّنْيَا ﴾، تەنیا ژیـانی دنیـای دەوێ، ئنجـا کەسـێک تەنیـا ژیـانی دنیـای بـوێ و، بـڕوای بـە ڕۆژی دوایـی نەبـێ، بێگومـان چـۆن بـۆ ژیانـە دنیاییەکـەی قازانـج بـێ، وا دەکات و، ئـەو بەرنامەیـەش تەبەننیـی دەکات، کـە بەرژەوەندییـە ناشـەرعییەکانی لـە دنیـادا، بـۆ دەسـتەبەرو مسـۆگەر دەکات.

﴿ ذَٰلِكَ مَبْلَغُهُم مِّنَ ٱلْعِلْمِ ﴾، خوا ﷽ دەفەرموێ: ئا ئەوە ئەوپەڕی زانیارییانە، (مَبْلَـغ)، بـە مانـای (بَـلاغ)ە، یانـی: گەیشـتن بەوپـەڕی شـتێک، ئـەوە ئەوپـەڕی زانیارییانـە، هـەر ئەوەنـدە عەقڵیان پـێ دەشـکێ، زانیارییەکەیـان هـەر ئەوەنـدە بـڕ دەکات، ﴿ إِنَّ رَبَّكَ هُوَ أَعْلَمُ بِمَن ضَلَّ عَن سَبِيلِهِۦ ﴾، بـە دڵنیایـی پـەروەردگارت زاناتـرە بـەو کەسـەی لەڕێـی وی لایـداوە، ﴿ ضَلَّ عَن سَبِيلِهِۦ ﴾، واتـە: لایـداوەو ون بـوو، ﴿ وَهُوَ أَعْلَمُ بِمَنِ ٱهْتَدَىٰ ﴾، هەروەهـا خـوا زاناتـرە بـەو کەسـەی ڕێـی ڕاسـتی گرتـوەو، هاتۆتـە سـەر ڕاسـتە ڕێـی خـوا.

ئەمـە بـۆ دڵنیاکردنـەوەی پێغەمبـەری خاتەمـە، کـە: تـۆ بەڵـێ زۆرت مەبەسـتە، ئەوانـە هەموویـان بێنـە سـەر ڕاسـتە ڕێـی خـواو، لـە گومڕایـی بیانگێڕیـەوە، بـەڵام بـەس خـوا زاناتـرە بـەوەی کـێ لـە ڕێـی وی، لایداوەو ناشـیەتەوە سـەر ڕێ و، کێـش ڕێـی ڕاسـتی گرتـوەو ڕێـی ڕاسـت دەگـرێ، کەواتـە: تـۆ ئەرکـی خـۆت جێبەجـێ

www.alibapir.com


بکە، بەڵام خۆزگەی ئەوەت لە دڵدا نەبێ، ئەو خەڵکە هەمووی هیدایەتی خوا وەربگرێ و، هەمووی واز لە گومڕایی بێنێ!

﴿ وَلِلَّهِ مَا فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِى ٱلْأَرْضِ ﴾، هەرچی لە ئاسمانەکان و هەرچی لە زەویدایە، هی خوایە، هەمووی موڵکی خوایەو بەس خوا خاوەنیەتی، بۆچی؟ ﴿ لِيَجْزِىَ ٱلَّذِينَ أَسَٰٓـُٔوا۟ بِمَا عَمِلُوا۟ ﴾، بۆچی خوا ﷻ ئەوئاسمان وزەوییەی ڕەخساندوون، (ل)ی (لیجزي) دەگونجێ (لام التَّعْلِيْل) بێ و، دەشگونجێ (لام الأَجْل) بێ، یانی: خوا هەرچی لە ئاسمانەکان و زەویدایە، هی خوایە، بۆ ئەوەی ئەوانە خراپەیان کردوە بە پێی خراپەکەیان سزایان بدات، ﴿ وَيَجْزِىَ ٱلَّذِينَ أَحْسَنُوا۟ بِٱلْحُسْنَى ﴾، ئەوانەش کە چاکەیان کردوە، بە پاداشتی هەرە چاک پاداشتیان بداتەوە، یاخود: هەرچی لە ئاسمانەکان و زەویدا هەیە، هی خوایەو خوا خاوەنی هەموو شتێکە، تاکو سەرەنجام خراپەکاران بە سزای خۆیان بگەن و، چاکەکارانیش بە پاداشتی هەرە باشی خۆیان بگەن.

ئنجا خوا ﷻ پێناسەی ئەوانە دەکات کە بە پاداشتی هەرە چاک، پاداشتیان دەداتەوە، ئەو چاکەکارانە، تاکو وا نەزانرێ، کە ئەوانە بوونە فریشتەو هەرچی کەم و کوڕییە دەبێ تێیاندا نەمێنێ، ئنجا وەبەر ئەو موژدەیەی خوا دەکەون و، پاداشتی هەرە چاکی خوایان پێ دەبڕێ، دەفەرموێ: ﴿ ٱلَّذِينَ يَجْتَنِبُونَ كَبَٰٓئِرَ ٱلْإِثْمِ وَٱلْفَوَٰحِشَ ﴾ ئەوانەش کەسانێکن خۆیان دەپارێزن و خۆیان دوور دەگرن لە گوناهە گەورەکان، ﴿ وَٱلْفَوَٰحِشَ ﴾ هەروەها لە گوناهە ناقۆڵاو دزێوو ناشیرینەکان، ﴿ إِلَّا ٱللَّمَمَ ﴾، جگە لە وردەگوناهان ﴿ ٱللَّمَمَ ﴾ پێشتریش گوتمان: (اللَّمم) واتە: وردە گوناه یاخود: مەگەر کەسێک جارێک بە هەڵە گوناهێکی کرد بێ، یاخود: کەسێک نزیک کەوتبێتەوە لە گوناهی گەورە، بەڵام نەیکردبێ، بەڵام زیاتر زانایان وایان لێکداوەتەوە: ﴿ ٱللَّمَمَ ﴾، واتە: گوناهی بچووک، (أَلَمَّ بالشَّيء)، واتە: چووە سوێی و لێی نیزیککەوتەوە، یان کەمێکی لێکرد (إلمَام)، ئەوەیە کە مرۆڤ بەشێکی کەمی لە شتێک پێ ببڕێ، دەگوترێ: (لَهُ إلمَامٌ بِهَذا العِلْم)، یانی: شتێکی لێ دەزانێ و سەرە دەرێکی لێ دەکات، کەواتە: ﴿ ٱللَّمَمَ ﴾، ئەوەیە مرۆڤ کەمێک گوناه بکات، واتە: گوناهی بچووک.

www.alibapir.com


﴿إِنَّ رَبَّكَ وَٰسِعُ ٱلْمَغْفِرَةِ﴾، بە دڵنیایی پەروەردگارت لێبوردنی فراوانە، واتە: لێبوردنی خوا هێندە فراوانە، جێی بەخشین و چاوپۆشیی کردن لە هەموو گوناهانی تێدا دەبێتەوە، ئەگەر کەسێکیش گوناهی گەورەی لە دەست قەوما بێ، یان گوناهێکی ناقۆڵا، با بزانێ، کە لێبوردنی خوا هێندە فراوانە، جێی ئەو گوناهەی ئەویشی تێدا دەبێتەوە، کە بیبەخشێ و چاوپۆشیی لێ بکات و، با نائومێد نەبێ.

﴿هُوَ أَعْلَمُ بِكُمْ إِذْ أَنشَأَكُم مِّنَ ٱلْأَرْضِ﴾، خوا بە ئێوە زاناترە لە کاتێکدا ئێوەی لە زەوی دا پێگەیاندوە، (الإِنْشَاءُ وَالتَّنْشِئَة) بریتیە لە پێگەیاندن و دروستکردنی شتێک بە پلە پلە، ﴿أَنشَأَكُم مِّنَ ٱلْأَرْضِ﴾، یان مەبەست پێی ئادەمە ﷺ ئادەم و حەووایە، کە ڕاستەوخۆ لە خاک دروستبوون، لە زەوی، یان مەبەست پێی ئەوەیە کە ئێمە ئەصڵی بوونەکەمان لە ڕووی جەستەوە دەگەڕێتەوە بۆ خاک، ڕووحەکەشمان نهێنییەکی خوایەو، دروستکراوێکی تایبەتیی خوایە، چونکە جەستەی ئێمەش، چ وەک ئەو نوتفەیەی ئێمەی لێ دروست بووین، تۆوی باب و دایک، ئەو تۆوە لە خوێن پەیدادەبێ و، خوێن لە خواردنی هەرسکراوو، خواردنی هەرسکراویش لە خواردن و، خواردنیش دەگەڕێتەوە بۆ زەوی، بە شێوەیەک لە شێوەکان: بەرهەمی دانەوێڵەو سەوزەو تەڕەکارو میوەیە، یان بەرهەمی ئاژەڵ و پەڕەوەرەو، ئەوانیش هەر دەگەڕێنەوە بۆ زەوی.

بەڵێ چ وەک نوتفە، هەر لە زەوی پەیدا دەبین و، ئەو خواردن و خۆراکەش کە دەیخۆین، دیسان هەر لە زەوی پەیدادەبێ و، لەو خواردن و خۆراکەش خانەکانی جەستەمان پێک دێن، کەواتە:

أ- چ وەك دروست بوونی باب و دایکمان ڕاستەوخۆ لە خاکی زەوی، لە زەوییەوە هاتووین.

ب- چ وەک دروست بوونی ئەو نوتفەیەی لێی پێکهاتووین، کە ئەویش هەر دەگەڕێتەوە بۆ خوێن و، خوێنەکەش بۆ خواردنی هەرسکراو، ئەویش بۆ زەوی.

www.alibapir.com


ج- چ وەک جەستەی خۆمان، ئەویش دیسان خانەکانی لە خواردنی هەرسکراو، دروست دەبن، دوای ئەوەی دەبێتە خوێن و، ئەویش دیسان هەر دەگەڕێتەوە بۆ زەوی

بۆیە خوا دەفەرموێ: ﴿هُوَ أَعْلَمُ بِكُمْ إِذْ أَنشَأَكُم مِّنَ الْأَرْضِ﴾، خوا لە ئێوە زاناترە، کاتێ ئێوەی لە زەوی پێ گەیاندوە، پلە پلە، ﴿وَإِذْ أَنتُمْ أَجِنَّةٌ فِي بُطُونِ أُمَّهَاتِكُمْ﴾، هەروەها پێتان زاناترە، کاتێک کە ئێوە کۆرپەلە بوون، لە سکانی دایکانتان دا، (**أَجِنَّة**) کۆی (**جَنِيْن**)ە، واتە: کۆرپەلە، (**الجَنِيْن: هُوَ الوَلَدُ مَادَامَ فِي بَطْنِ أُمِّهِ**)، منداڵ هەتا لەسکی دایکیدایە، پێی دەگوترێ: کۆرپەلە (**جَنِيْن**)، کاتێک کە ئێوە کۆرپەلە بوون، لە سکی دایکتانیشدا، خوا پێتان زاناتر بووە، ﴿فَلَا تُزَكُّوا أَنفُسَكُمْ﴾، کەواتە: خۆتان پەسند مەکەن، واتە: خۆتان پێ پەسند نەبێ و ستاییشی خۆتان مەکەن، خۆتان پێ پاک و چاک نەبێ، بە قسە، بەڵام بە کردەوە، خوا دەفەرموێ: ﴿قَدْ أَفْلَحَ مَن تَزَكَّىٰ ﴿١٤﴾﴾الأعلى، ﴿قَدْ أَفْلَحَ مَن زَكَّاهَا ﴿٩﴾﴾الشمس، بە ڕاستیی سەرفرازە، ئەو کەسەی خۆی پاك و چاك دەكات، خۆی پاک و چاک کردوە، بە کردەوە، بەڵام کە بە قسە خۆت پاک و چاک پیشان بدەی، قەدەغە کراوە، هەم لێرەو هەم لە سوورەتی (النساء)یشدا، خوای پەروەردگار دەفەرموێ: ﴿أَلَمْ تَرَ إِلَى الَّذِينَ يُزَكُّونَ أَنفُسَهُم ۚ بَلِ اللَّهُ يُزَكِّي مَن يَشَاءُ وَلَا يُظْلَمُونَ فَتِيلًا ﴿٤٩﴾ انظُرْ كَيْفَ يَفْتَرُونَ عَلَى اللَّهِ الْكَذِبَ ۖ وَكَفَىٰ بِهِ إِثْمًا مُّبِينًا ﴿٥٠﴾﴾، تەماشای ئەوانەت نەکردوە خۆیان پاک و چاک دەکەن، بەڵکو خوا هەر کەسێ بیەوێ، پاک و چاکی دەکات و هێندەی توێکڵی سەر نێوکە خورما (**نواة**)یش ستەمیان لێناکرێ. دوایی دەفەرموێ: ﴿انظُرْ كَيْفَ يَفْتَرُونَ عَلَى اللَّهِ الْكَذِبَ﴾، سەرنج بدە چۆن درۆ بەخواوە هەڵدەبەستن! کەواتە: خۆ پەسەندکردن و خۆ پێ پاک و چاک بوون، درۆیەکە بە ناوی خواوە، چونکە کە گوتت: من پاک و چاکم، یانی: لەلای خوا وام، کە ئاگاداری زانیاریی لای خواش نیە، بە تایبەتی بۆ کەسانێک -کە هەم لێرەو، هەم لە ئایەتەکانی سوورەتی (النساء)یش دا، کە لە سیاقی باسکردنی جوولەکەکاندایە- کە لەسەر ڕێبازی هیدایەت نین و، لەسەر ڕاستە ڕێی خوا

www.alibapir.com



نین، کەچی خۆیان پێ پاک و چاک بێ، بێ ئەوەی ڕێی پاک و چاکیان گرتبێ، ئەوە بەدڵنیایی درۆکردنەو درۆ هەڵبەستنە بە ناوی خواوە.

﴿هُوَ أَعْلَمُ بِمَنِ ٱتَّقَىٰٓ﴾، خوا زاناترە بەو کەسەی پارێزی کردوە، کەواتە: لە ڕێی پارێزکردنەوە، ئینسان پاک و چاک دەبێ، نەفسی تەزکیە دەبێ، هەروەک لە ڕێی تەزکیە بوونیشەوە، تەقوا پەیدا دەبێ، وەک لە ئایەتەکانی سوورەتی (الشمس)دا، خوا بسم الله الرحمن الرحيم دەفەرموێ: ﴿وَنَفْسٍ وَمَا سَوَّىٰهَا ﴿٧﴾ فَأَلْهَمَهَا فُجُورَهَا وَتَقْوَىٰهَا ﴿٨﴾ قَدْ أَفْلَحَ مَن زَكَّىٰهَا ﴿٩﴾ وَقَدْ خَابَ مَن دَسَّىٰهَا ﴿١٠﴾﴾، واتە: سوێند بە نەفس و بەو کەسەی دروستی کردوە (هێناویەتە دی، بە ڕێک و پێکی) . هەم گوناهکردنەکەی فێر کردوە، هەم پارێزکاری کردنەکەی فێر کردوە، (واتە: توانایەکی داوەتێ، هەم گوناهان بکات، هەم چاکە و پارێزیش بکات) ئنجا ئایا پارێز لە ڕێی چییەوە پەیدادەبێ؟ ﴿قَدْ أَفْلَحَ مَن زَكَّىٰهَا﴾، بەدڵنیایی هەرکەس خۆی پاک و چاک کردوە، سەرفرازە. کەواتە: لە ڕێی تەزکیە بوونی نەفسەوە، تەقوا پەیدا دەبێ، ﴿وَقَدْ خَابَ مَن دَسَّىٰهَا﴾، زیانبارو پەشێمانە، کەسێک خۆی ون کردوەو پەنهان کردوە، لە ژێر چڵکی گوناهاندا، کەواتە: بەهۆی گوناهبارییەوە ئینسان تووشی خراپەکاریی (فجور) دێ و، بە هۆی پیسکردنی نەفسەوە، ئینسان گوناهان دەکات، هەروەها بەهۆی پاککردن و چاککردنی نەفسەوەش، ئینسان بەرەو پارێزکاریی هەنگاو دەنێ، بۆیە دەفەرموێ: ﴿فَلَا تُزَكُّوٓا۟ أَنفُسَكُمْ ۖ هُوَ أَعْلَمُ بِمَنِ ٱتَّقَىٰٓ﴾، خۆتان بە پاک و چاک دامەنێن، خوا زاناترە بەو کەسەی پارێزی کردوە، ئەو کەسەش پارێز دەکات کە ڕوو لە بەرنامەی خوا بکات، ئە و کەسە پارێز دەکات، کە خۆی بپارێزێ لە هەر شتێک کە خوا پێی ناخۆشە، ئەوەش کاتێک بۆ مرۆڤ دەستەبەر دەبێ، بەرنامەکەی خوا بکاتە ڕێبازی ژیانی و، بە دوای هیدایەتی خوا بکەوێ، ئنجا کە بە دوای ڕێبازو بەرنامەو هیدایەتی خوا کەوت، ئەو کاتە بەرنامەی خوا هەرچی خراپە، پێشانی دەدات کە نەیکات و، هەرچی چاکەو پەسندە، پێشانی دا کە بیکات، ئنجا لە ئەنجامی خۆپاراستن لە خراپەو قەدەغە کراوەکان و، جێبەجێ کردنی فەرمان پێکراوەکان دا، حاڵەتی تەقوا پەیدادەبێ و، حاڵەتی پاکیی و چاکیی نەفس پەیدا دەبێ.

www.alibapir.com


مەسەلە گرنگەکان

## مەسەلەی یەکەم:

**خستنە ڕووی پووچەڵیی بیرۆکەی بتپەرستیی، بە تایبەت هەر سێک بتی: (لات)و، (عُزَّى)و، (مَنَاةَ)، بە مێینەو کچی خوا دانانیان، کە جگە لە ناوی بێ نێوەڕۆک هیچی دیکە نین و، پەرستانیان بناغەکەی بریتیە لە شوێنکەوتنی گومان و ئارەزوو:**

خوا دەفەرمووێ: ﴿ أَفَرَءَيْتُمُ ٱللَّـٰتَ وَٱلْعُزَّىٰ ﴿١٩﴾ وَمَنَوٰةَ ٱلثَّالِثَةَ ٱلْأُخْرَىٰٓ ﴿٢٠﴾ أَلَكُمُ ٱلذَّكَرُ وَلَهُ ٱلْأُنثَىٰ ﴿٢١﴾ تِلْكَ إِذًا قِسْمَةٌ ضِيزَىٰٓ ﴿٢٢﴾ إِنْ هِىَ إِلَّآ أَسْمَآءٌ سَمَّيْتُمُوهَآ أَنتُمْ وَءَابَآؤُكُم مَّآ أَنزَلَ ٱللَّهُ بِهَا مِن سُلْطَـٰنٍ ۚ إِن يَتَّبِعُونَ إِلَّا ٱلظَّنَّ وَمَا تَهْوَى ٱلْأَنفُسُ ۖ وَلَقَدْ جَآءَهُم مِّن رَّبِّهِمُ ٱلْهُدَىٰٓ ﴿٢٣﴾ ﴾.

## شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە حەوت بڕگەدا:

١)- ﴿ أَفَرَءَيْتُمُ ٱللَّـٰتَ وَٱلْعُزَّىٰ ﴿١٩﴾ وَمَنَوٰةَ ٱلثَّالِثَةَ ٱلْأُخْرَىٰٓ ﴾، خوا بسم الله الرحمن الرحيم ڕوولەهاوبەش بۆ خوا دانەرەکان دەکات و دەفەرمووێ: ئایا (لات)تان بینیوە، هەروەها عوززا (شتان دیوە)، هەروەها مەناتی سێیەمی دیکەشتان بینیوە؟ ئەو سێ پەرستراوە، کە دەیانکەنە هاوبەشی خواو لە جیاتی خوا دەتانپەرستن! هەمزەی (أَفَرَأَيْتُمْ)، بۆ پرسیارکردنەو پرسیارکردنەکەش: (تَهَكُّمِيٌّ تَقْرِيْرِيٌّ)، بۆ جۆرێک لە گاڵتەپێکردن و توانج تێگرتن و بۆ چەسپاندنە، یانی: بە دڵنیایی ئێوە لات و عوززاو مەناتی سێیەمی دیکەتان بینیون، (ف)ی (أَفَرَأَيْتُمُ)، (تَفْرِيعٌ عَمَّا سَبَق)، بۆ هەڵچنرانە لە سەر بناغەی ئەوەی ڕابردوە، واتە: بینا لەسەر ئەو قسانەی پێشتر کران، ئایا ئێوە لات و عوززاو مەناتتان بینیون؟ ئنجا ئەگەر بینینەکە مەبەست پێی بینینی چاو بێ، یانی: ئایا دەیانبینن

www.alibapir.com


چۆنن؟ بەڵام ئەگەر مەبەست لە بینین دیتنی عیلمیی و عەقڵیی بێ، واتە: ئایا پێتان وایە کە لات و عوززاو مەنات مێینەبن و کچانی خوا بن، وەک خەیاڵ دەکەن؟!

چونکە ئەگەر مەبەست لە دیتن (**رؤية**) دیتنی چاو بێ یەک بەرکاری دەوێ و، ئەویش خودی: لات و عوززا و مەناتن، بەڵام ئەگەر مەبەست لە دیتن زانین بێ، دوو بەرکاری دەوێن: ئایا زانیوتانە لات و عوززا و مەنات مێینە بن، یان پەرستراو بن؟!

چونکە دوایی کە دەفەرموێ: ﴿ أَلَكُمُ ٱلذَّكَرُ وَلَهُ ٱلۡأُنثَىٰ ﴾، ئەمە جێگرەوەی بەرکاری دووەمە، واتە: ئایا پێتان وایە ئەوانە کچ و مێینەبن؟ چونکە ڕستەی: ﴿ أَلَكُمُ ٱلذَّكَرُ وَلَهُ ٱلۡأُنثَىٰ ﴾، ئایا ئێوە نێرینەتان هەیەو خوا مێینەی هەیە؟ کەلێنی بەرکاری دووەم پڕ دەکاتەوە.

لە بارەی داتاشرانی ئەو وشانەوە لە ڕووی زمانی عەرەبییەوە: گوتوویانە:

**أ**- لات (**ألاّه**) بووەو (ه)کەیان لابردوەو (ت) یان لە شوێن داناوە، تاکو لە خوار خواوە حیسابی بکەن.

**ب**- عوززا (**مُؤَنَّث**)ی، (**أعَزّ**)ە.

**ج**- مەناتیش (**مُؤَنَّث**)ی، (**مَنّان**)ە، بەڵام هەندێک لە زانایانی دیکەی شارەزایی ڕێزمان و داتاشین لە زمانی عەرەبییدا، بە جۆرێکی دیکە قسەیان کردوە، ئەوەی بە لای ئێمەوەش گرنگە، ئەوەیە کە ئەوانە هەر سێکیان (**لات**)و (**عُزّى**)و (**مَنَاة**)، سێ پەرستراوی ناوداری عەرەبان بوون، ئنجا مەرج نیە، هەموو خەڵکەکە هەر سێکیان پەرستبن، بەڵکو بە سەریان دا دابەش بوون، هەندێکیان پتر لاتیان پەرستوەو، هەندێکیان عوززایان زیاتر پەرستوەو، هەندێکیان مەناتیان پەرستوە.

(**الزمخشري**) دەڵێ: ﴿ أَلَكُمُ ٱلذَّكَرُ وَلَهُ ٱلۡأُنثَىٰ ﴾، (**سَادٌّ مَسَدَّ المَفْعُولِ الثَّانِي**)، ئەو ڕستەیە لە شوێنی بەرکاری دووەم دانیشتوە، ئەگەر مەبەست (**أَفَرَأَيْتُم**)، بینینی

www.alibapir.com



عەقڵیی و عیلمیی بێ، ئەو کاتە دوو بەرکاران دەخوازێ: ئایا لات و عوززاو مەناتتان زانیون، زانیوتانە مێینە بن؟ ئنجا ئایا {ئەو زانیوتانە، مێینە بن} لە کوێیە؟ زەمەخشەریی دەڵێ: ﴿ أَلَكُمُ ٱلذَّكَرُ وَلَهُ ٱلْأُنثَىٰ ﴾، لە شوێنی بەرکاری دووەم دانیشتوە.

زانایان لەو بارەوە کە بۆچی خوا فەرموویەتی: ﴿ وَمَنَوٰةَ ٱلثَّالِثَةَ ٱلْأُخْرَىٰٓ ﴾ ئاشکرایە کە مەنات سێیەمە؟! ئنجا (**أُخْرَى**)ی بۆچی لێ زیاد کراوە؟ لەو بارەوە زۆر مشتومڕیان بووە:

أ- بەڵام ئەوەی زیاتر بە عەقڵەوە دەنووسێ، ئەوەیە کە خوا بسم الله الرحمن الرحيم لێرەدا بە جۆرێک لە درێژ کردنەوە (**إطناب**) باسی ئەو سێ بتەی کردوە، لەبەر ئەوەی مەقامەکە وا دەخوازێ، واتە: مەنات سێیەمەو، هی دیکەشەو، لە کۆتاییشەوە هاتوە.

ب- بەڵام هەندێک گوتوویانە: بۆیە خوا فەرموویەتی: (**الأُخرَى**)، لەبەر ئەوەی لە هەمووان کەمتر، جێی بایەخ بووە لەلای عەرەبەکان.

ج- هەندێکیش گوتوویانە: بە پێچەوانەوە لەبەر ئەوەی لە هەموویان گرنگتر بووە، چونکە لە زمانی عەرەبییدا شتێکی باوە کە دەگوترێ: (**وفُلانٌ هُوَ الآخَر**)، فڵانکەسیش کۆتاییەکەیە، ئنجا لەبەر زێدە گەورەیی خوای پەروەردگار دەفەرموێ: مەناتی سێیەمی دیکەش: ﴿ وَمَنَوٰةَ ٱلثَّالِثَةَ ٱلْأُخْرَىٰٓ ﴾، لەبەر ئەوەی لەلایان زۆر گەورە بووە.

د- هەندێکیش گوتوویانە: لەبەر ئەوەی لە ڕووی ڕیزبەندییەوە، لە دوای لات و عوززاوە هاتوە.

وشەی (**لات**)، وەک چۆن بە: ﴿ أَفَرَءَيْتُمُ ٱللَّٰتَ ﴾، یانی: بە فەتحە خوێندراوەتەوە، بە فەتحەو گیرەش خوێندوویانەتەوە: (**أَفَرأيتم اللَّاتَّ**)، مەناتیش وەک چۆن بە (**مَنَاةَ**)، خوێندراوەتەوە، بە (**مَنَاءَة**)یش، خوێندراوەتەوە: (**وَمنَاءَةَ الثَّالِثَة الأخْرَى**)، بەڵام لە مانادا وەک یەکن و جیاواز نین.

www.alibapir.com


٢)- ﴿ أَلَكُمُ ٱلذَّكَرُ وَلَهُ ٱلْأُنثَىٰ ﴾، ئایائێوەنێرینەتانهەیەوئەو(خوا بسم الله الرحمن الرحيم)مێینە؟!ئەمە بەرزبوونەوەیە لە هەڵوەشاندنەوەو، توانج تێگرتن و نەفام پێشاندانی بێبڕوایان دا.

٣)- ﴿ تِلْكَ إِذًا قِسْمَةٌ ضِيزَىٰ ﴾، کەواتە ئەو دابەشکردنە ستەمکارانەیە! (تِلْكَ)، دەچێتەوە بۆ (قِسْمَة)، واتە: ئەو دابەشکردنە، دابەشکردنێکی نادادگەرانەیە، وشەی (ضِيْزَى)، خوێندراویشەتەوە: (ضِئْزَى)، بە هەردوو جۆر خوێندراوەتەوە، (ضَازَ فـي الحُكْمِ: جَارَ، وَضَازَ حَقَّهُ يَضِيْزُهُ ضَيْزَاً: نَقَصَهُ وَبَخَسَهُ)، (ضَازَ فـي الحُكْمِ)، واتە: لە دادوەریی کردندا، لایداو ستەمی کرد، (وَضَازَ حَقَّهُ يَضِيْزُهُ ضَيْزَاً)، مافەکەی لێ کەم کردو لێی نادیدە گرت و لێی داشکاند.

لـە بـارەی وشـەی (ضیـزى)وە (محـي الديـن الدرويـش) لـە تەفسـیرەکەی خـۆی (إعـراب القـرآن)دا،[1] قسـەیەک لـە (إبـن الأثـير)ەوە دێنـێ، دواییـش بـۆ خـۆی زێـدەی دەخاتـە گـەڵ و دەڵـێ:

ڕۆژێـک کابرایەکـی موتەفەلسـیف (وای نـاو نـاوە، یـانی: ئەوانـەی خۆیـان بـە فەیلەسـووف زانیـوە)، هـات ڕەخنـەی هەبـوو لـە قوڕئـان، لەبـەر ئـەوەی لـەو ئایەتـە موبارەکـەدا وشـەی (ضِيـزَى) بەکارهاتـوە، لـە حاڵێکـدا کـە لـە وشـەی (ضِيـزَى)، لـە ڕووی زمـان پاراویـی و ڕەوانبێژییـەوە، باشـتر هەیـە، وەک (جَائِـرَة) و (ظَالِمَـة)، لـە جیـاتی ئـەوەی فەرمووبـای: ﴿ تِلْكَ إِذًا قِسْمَةٌ ضِيزَىٰ ﴾ دەبـوو ئاوابووایـە: (تِلْـكَ إذًا قِسْـمَةٌ جَائِـرَة)، یـان (ظَالِمَـة)!

(إبـن الأثـير) وەڵامـی دەداتـەوەو دەڵـێ: ئـەم سـووڕەتە ئەگـەر تەماشـا بکەیـن، کۆتایـی ئایەتـەکان هەموویـان بە یائـی مەقصـووڕە هاتـوە: ﴿ وَٱلنَّجْمِ إِذَا هَوَىٰ ١ مَا ضَلَّ صَاحِبُكُمْ وَمَا غَوَىٰ ٢ وَمَا يَنطِقُ عَنِ ٱلْهَوَىٰ ٣ ﴾، هەموویـان واهاتـوون و وشـەی (ضِيـزَى)، لەگـەڵ ئـەو سـەجعانەی پێشـوو و دوایـی دا دێتـەوە، بـەڵام ئەگـەر فەرمووبـای (جَائِرَة)، یـان (ظَالِمَـة)، نـە دەگونجـاو گرنگییـدان بـە ئـاوازی کۆتایـی ئایەتەکانیـش، کـە پێکـەوە

---

(١) ج٩، ص : (٣٥٥ – ٣٥٦).

www.alibapir.com


ڕێک بکەون، کە پێی دەگوترێ: (سَجْع)، یەکێکە لە ڕووەکانی ڕەوانبێژیی و خوای کاربەجێ ئەوەشی زۆر ڕەچاو کردوە، (محي الدين الدرويش) دەڵێ: قسەکەی ئەوم پێ چاکەو دەلالەت لەسەر ئەوە دەکات، کە تێگەیشتن و چێژێکی باشی هەبووە، بەڵام هەر چۆن بێ لە سنووری بێژەو وشان دەرناچێ، بەڵام لێرەدا شتێکی دیکەی مەعنەویی هەیە، کە پەیوەستە بەم قسەیەوەو دەڵێین: لەبەر ئەوەی مەبەست لەو فەرمایشتەی خوا هەڵوەشاندنەوەو پووچەڵ دەرخستنی بیرۆکەی بتپەرستیی و ناشیرین پێشاندانی بووە، بۆیە خوا ﷻ وشەیەکی گونجاوی بۆ ئەو ناشیرین پێشاندان و قێزەون پێشاندانەی بیرۆکەکەی ئەوان هەڵبژاردوە، کە بریتیە لە وشەی (ضِيْزَى)، وشەی (ضِيْزَى)ش وشەیەکە لە چاو وشەکانی دیکە، پلەکەی لە خوارێیەو کەم بایەخترە، بۆ ئەوەی خوا ﷻ پێیان بفەرموێ: وەک چۆن بیرۆکەی بتپەرستنەکەی ئێوە شتێکی پووچە، منیش وشەیەکی کەم بایەخم بەکارهێناوە بۆ تەعبیرکردن لە کەم بایەخیی بیرۆکەکەی ئێوە.

دوایی لە کۆتاییدا (محي الدين الدرويش) دەڵێ: (**وَهَذَا مِنْ أَعَجَبِ مَا وَرَد فِي القُرْآنِ الكَرِيْم مِنْ مُطَابَقَةِ الألْفَاظِ لِمُقْتَضِى الحَال**)، ئەمە لە سەرسوڕهێنەرترین شتە، کە لە قورئانی بەڕێزدا هاتوە، لە پڕ بە پێست بوونی وشەکان لەگەڵ ئەو حاڵ و مانایەدا، کە وشەکان تەعبیری لێ دەکەن.

٤)- ﴿إِنْ هِيَ إِلَّآ أَسْمَآءٌ سَمَّيْتُمُوهَآ أَنتُمْ وَءَابَآؤُكُم﴾، ئەو بتە پەرستراوانەی ئێوە، تەنیا ناون، خۆتان و باب و باپیرانتان داتانناون، (**إِنْ هِيَ: مَا هَذِهِ الأوْثَان**)، ئەو بتانە هیچ شتێک نین، جگە لە چەند ناوێک کە خۆتان و باب و باپیرانتان داتانناون، (**سَمَّيْتُمُوهَا: جَعَلْتُمُوهُا أَسْمَاء وَوَضَعْتُمُوهَا، فَهِيَ أَسْمَاءٌ مُجَرَّدَات بِلَا مُسَمَّيَات**)، ئەوانە تەنیا چەند ناوێکی ڕووتن، خۆتان و باب و باپیرانتان داتانناون و ڕۆتانناون و هیچ نێوەڕۆکێکیان نیە.

٥)- ﴿مَّآ أَنزَلَ ٱللَّهُ بِهَا مِن سُلْطَٰنٍ﴾، خوا هیچ بەڵگەی لەسەر دانەبەزاندوون، دابەزاندنی بەڵگە لەلایەن خواوە، واتە: هەواڵ پێدانی، خوا لە لای خۆیەوە، هیچ بەڵگەیەکی لەسەر ئەوانە، هەواڵ پێ نەداون و داینەبەزاندوە.

www.alibapir.com


٦)- ﴿ إِن يَتَّبِعُونَ إِلَّا ٱلظَّنَّ وَمَا تَهْوَى ٱلْأَنفُسُ ﴾، بەس شوێن گومان دەکەون و ئەوەی نەفسەکان بیخوازن، خوا بسم الله الرحمن الرحيم ڕوویان لێوەردەگێڕێ لەشێوەی دواندنە(خطاب)ەوە بۆ شێوەی نادیار (غیاب)، (إلتِفَاتٌ مِنَ الخِطَابِ إلى الغِيَابِ، تَحْقِيْراً لَهُمْ)، ئاوڕدانەوەیە لە شێوەی دواندنەوە بۆ شێوەی نادیار، بۆ بەکەم دانانیان، یانی: ئەوانە شایستەی ئەوە نین، چیدیکە بدوێنرێن، بۆیە دەفەرموێ: تەنیا شوێن گومان دەکەون و ئەوەی نەفسەکانیان حەزی لێ دەکەن و دەیخوازن، وشەی (الأَنْفُسُ)، (أل)ەکەی بۆ ناساندنە، (عِوَضٌ عَنِ الإِضَافَة: أَنْفُسُهم)، ئەمە قەرەبوویە بۆ پاڵوەلادان یانی: لە جێی پاڵوەلادراو دانیشتوە، (أي: أنْفُسُهم)، تەنیا دوای گومان و ئەوە دەکەون کە نەفسەکەیانیان ئارەزووی دەکەن.

٧)- ﴿ وَلَقَدْ جَآءَهُم مِّن رَّبِّهِمُ ٱلْهُدَىٰٓ ﴾، بە دڵنیاییش لە لایەن پەروەردگاریانەوە، ڕێنماییەکی تێرو تەواویان بۆ هاتوە، (هَذِهِ الجُمْلَة حالِيَّةٌ مُقَرِّرَةٌ لِلتعْجِيبِ مِن حالِهِمْ)، ئەم ڕستەیە ڕستەیەکی حاڵییە، چەسپێنەری سەرسوڕماندنە لە حاڵیان، لە حاڵێکدا لە پەروەردگاریشیانەوە، ڕێنماییەکی تێرو تەواویان بۆ هاتوە.

هەڵبەتە کە دەفەرموێ: ﴿ وَلَقَدْ جَآءَهُم ﴾، (ل) بۆ سوێندەو (قَدْ)یش بۆ ساغکردنەوەیە (لِتَأْكِيدِ الخَبَرِ لِلْمُبالَغَةِ فِيها مِنَ التَّعْجِيبِ مِن حَالِهِمْ، كَأَنَّ المُخاطَبَ يَشُكُّ فِي أَنَّهُ جَاءَهُمْ مَا فِيهِ هُدَىً) (لَقَدْ) بۆ جەختکردنەوەی هەواڵەکەیە بۆ زێدەڕۆیی کردن لە سەرسوڕماندن لە حاڵیان، وەک بابای دوێندراو دوو دڵ بێ، لەوەدا کە لەلایەن خواوە ئەوەیان بۆ هاتبێ، ڕێنمایی تێدابێ، بۆیە دڵنیایان دەکاتەوە کە لە لایەن پەروەردگاریانەوە ڕێنماییان بۆ هاتوە.

(أَصْلُ الظَّنِّ: الإعْتِقَادُ غَيْرُ الجازِمِ، وَقَدْ يُطْلَقُ عَلى العِلْمِ الجازِمِ، إذَا كَانَ فِي مَقَامِ المَدْحِ مِثْلُ: ﴿ يَظُنُّونَ أَنَّهُم مُّلَٰقُواْ ٱللَّهِ ﴿٢٤٩﴾ ﴾، البقرة، وشەی (ظَن): لە ئەصڵدا بە مانای بڕوا پێ بوونێکە خاوەنەکەی تێیدا دڵنیا نەبێ، بەڵام جاری واش هەیە، ئەگەر لە مەقامی مەدح و ستاییش دابێ، مەبەست پێی بڕوابوونێکی

www.alibapir.com


دڵنیایانەیە، وەک لە سوورەتی (البقرة)دا هاتوە، دەفەرمویٚ: ﴿يَظُنُّونَ أَنَّهُم مُّلَٰقُواْ ٱللَّهِ ﴿٢٤٩﴾﴾، ئەو بڕوادارانەی پێیان وایە، بە دیداری خوا دەگەن.

ئەم پێیان وایە واتە: دڵنیان، لێرەدا (ظَنَّ)، بە مانای دڵنیاییە، واتە: (يَسْتَيْقِنُونَ أَنَّهُمْ مُلاقُوا اللهِ)، چونکە هەر کەسێ پێی وابێ و گومانی وابێ بە دیداری خوا دەگات، ئەوە هیچ مەدحێکی تێدا نیە، زانایان دەڵێن: بۆیە خوا بسم الله الرحمن الرحیم وشەی (ظَن)ی هەم بە مانای گومان بەکارهێناوەو، هەم بە مانای یەقینیشی بەکارهێناوە، چونکە زانیاریی مرۆڤ لە بارەی شتەکانەوە، پلە پلەیە، ئنجا ئەگەر لەسەرەتاوە بێ، دەگونجێ بەس جۆرێک لە گومان و دوو دڵیی و پێ وابوون بێ، بەڵام ئەگەر ئەو زانیارییە نیشانەکانی و بەڵگەکانی زۆر بن، دەگاتە حاڵەتی دڵنیایی تەواو، ئنجا بەپێی سیاق تەماشا دەکرێ: ئایا ئەو (ظـن)ە، مەبەست پێی گومانە، یاخود مەبەست دڵنیاییە، کە لە چەند شوێنێکی کەمدا (ظن) بە مانای (دڵنیایی) هاتوە، ئەویش لە حاڵێکدا کە خوا مەدحی بڕوادارانی کردوە، ئەگەرنا بە زۆریی (ظن) لە قورئاندا بە سەرزەنشتکراویی و بە خراپ باسکراوە، لەبەر ئەوەی بریتیە لەوە کە مرۆڤ دڵنیا نیە، لەو شتەی هەڵوێستی لە بەرانبەردا وەردەگرێ.

کە دەفەرمویٚ: ﴿وَمَا تَهْوَى ٱلْأَنفُسُ﴾، لەوەی کە نەفسەکانیان ئارەزووی دەکەن، (أي: مَا تَشْتَهِيهِ أَنْفُسُهُم الأَمَّارَةُ بالسُّوءِ بِدُونِ دَلِيْلٍ مُسْتَنَدٍ إليْهِ، وَإلاَّ فَلَيْسَ كُلُّ مَا تَهْوَاهُ النَّفْسُ مَذْمُومَاً، فَيِنْظُرُ فِي نَوْعِيَّةِ الشَّيءِ المُشْتَهَى، وَدَافِعِ الإشْتِهَاء وَمُسْتَنَدِهِ)، یانی: ئەوەی نەفسەکانیان دەیخوازن، واتە: نەفسێک کە فەرمان دەکات بە خراپە، بەبێ بەڵگەیەکی پشت پێ بەستراو، ئەگەرنا مەرج نیە، هەرچی نەفس حەزی پێکرد، خراپ بێ، بەڵکو دەبێ تەماشای ئەو شتە بکرێ کە حەزی پێکراوەو تەماشای پاڵنەری، حەز پێکردنەکە بکرێ و، تەماشای بەڵگەی حەز پێکردنەکە بکرێ، ئەگەرنا ئیماندار حەزی لە بەهەشتەو، حەزی لە ئیمانەو ئارەزووی لێ خۆشبوونی خواش دەکات، هەروەها مرۆڤ ئارەزووی

خـواردنی خـۆش دەکات، کەواتـە: دەبـێ تەماشـا بکـرێ: داخـۆ جـۆری ئـەو شـتەی ئـارەزووی بـۆ کـراوە چییـەو، پاڵنـەری ئـارەزوو بۆکردنەکـە چییـەو، بەڵگەکەشـی چییـە؟ کەواتـە: ﴿وَمَا تَهۡوَى ٱلۡأَنفُسُ﴾ وەک گوتمـان: (أل)ی سـەر (**الأنْفُسُ**)، کـە (أل)ی ناسـاندنە، دەگونجـێ بـۆ (**عهد**)بـێ، واتـە: نەفسـەکان، نەفسـەکانی ئـەوان و، دەگونجـێ (أل)ەکـە قەرەبـووی (**مُضَافُ إلَيْهِ**) پاڵـوەلادراوی کردبێتـەوە: (**وَمَا تَهْـوَى أَنْفُسُـهُمْ**)، نەفسـەکانی ئـەوان، لـە هـەردوو حاڵانـدا، مەبەسـت هەمـوو نەفسـێک نیـە، یـانی: ئەلیـف و لامەکـە بـۆ جینـس نیـە، هەرچـی هـەر نەفسـێک بیخـوازێ، چونکـە نەفسـێک ئارامگرتـوو (**مُطْمَأنّة**)بـێ، حـەز لـە شـتی چـاک دەکات، بـەڵام نەفسـێک کـە زۆر فەرمانکـەر بـە خراپـە (**أَمَّـارَة بِالسُّـوء**) بـێ، حـەز لـە شـتی خـراپ دەکات، کـە لێـرەدا مەبەسـت پێـی ئـەو جـۆرە نەفسـەیە.

کـە دەفەرمـوێ: ﴿وَلَقَدۡ جَآءَهُم مِّن رَّبِّهِمُ ٱلۡهُدَىٰٓ ٢٣﴾، (أل)ی سـەر (**الهُـدى**)، بـۆ ناسـاندنەو، بـۆ پێشـاندانی ئەوەیـە کـە ئـەو ڕێنماییـە، ڕێنماییەکـی زۆر ڕۆشـنەو، ڕێنماییەکـی زۆر تێـرو تـەواوە، کەچـی ئـەوان لـە حاڵێکـدا کـە ئـەو ڕێنماییـە تێـرو تـەواو و بەرچاوڕۆشـنییە تێـرو پڕەیـان بـۆ هاتـوە، دوای گومـان و دوای ئـەوە دەکەون کـە نەفسـیان ئـارەزووی دەکات.

لە تۆڕە کۆمەڵایەتییەکان لەگەڵتانین
Stay in touch on social media
نحن معكم عبر مواقع التواصل الاجتماعي
ڕاگەیاندنی مەکتەبی مامۆستا عەلی باپیر
AliBapir/عەلی باپیر
archive.org/details/@alibapir
AliBapir/عەلی باپیر
AliBapir
کەناڵی ڕاگەیاندنی مەکتەبی مامۆستا عەلی باپیر
www.alibapir.net
کوردی - عربي - English
ڕاگەیاندنی مەکتەبی مامۆستا عەلی باپیر

www.alibapir.com



## مەسەلەی دووەم:

**مـرۆڤ هەرچـی خۆزگـەی پـێ خواسـت، بـۆی نابـێ، ناشـبێ پێـی وابێ، بـە خەیاڵ پـڵاوان بـە ئـاوات دەگات، چونکـە هـەر خوا خـاوەنی ڕەهـای دواڕۆژو دنیایە:**

خوا دەفەرموێ: ﴿أَمْ لِلْإِنسَٰنِ مَا تَمَنَّىٰ ﴿٢٤﴾ فَلِلَّهِ ٱلْءَاخِرَةُ وَٱلْأُولَىٰ ﴿٢٥﴾﴾.

## شیکردنەوەی ئەم دوو ئایەتە موبارەکە، لە دوو بڕگەدا:

١)- ﴿أَمْ لِلْإِنسَٰنِ مَا تَمَنَّىٰ﴾، ئایا مرۆڤ هەرچی خۆزگەی پێ خواست، بۆی دەبێ؟! ئەمە پرسیارکردنی نکووڵیلێکردنە، واتە: مرۆڤ هەرچی خۆزگەو ئاواتی پێ خواست، بۆی نایەتە دی.

٢)- ﴿فَلِلَّهِ ٱلْءَاخِرَةُ وَٱلْأُولَىٰ﴾، بە دڵنیایی مەنزڵگای کۆتایی و مەنزڵگای یەکەمیش هەردووکیان هی خوان ﷽، لە ڕووی ڕەوانبێژییەوە زانایان دەڵێن: (**هذا إضْرَابٌ انْتِقَالِيٌّ ناشِئٌ عَنْ قَوْلِهِ: ﴿وَمَا تَهْوَى ٱلْأَنفُسُ﴾، والإِسْتِفْهامُ بَعْدَ أَمْ إنْكارِيٌّ، قُصِدَ بِهِ إبْطالُ نَوالِ الإنْسانِ ما يَتَمَنَّاهُ، وَأَنْ يَجْعَلَ مَا يَتَمَنَّاهُ باعِثاً عَلى أَعْمَالِهِ، بَلْ عَلَيْهِ أَنْ يَطْلُبَ الحَقَّ مِن دَلائِلِهِ**).

واتـە: ئەمـە گواسـتنەوەیەکە لـەوە پەیدابـووە کـە دەفەرمـوێ: ﴿وَمَا تَهْوَى ٱلْأَنفُسُ﴾، ئەوانـە شـوێن گومـان و ئـەوە دەکـەون، کـە نەفسـەکان دەیخـوازن، ئنجا پرسـیارکردنەکە بـۆ نکووڵیلێکردنـەو، مەبەسـت پێـی ئەوەیـە ئـەوە هەڵبوەشـێنێتەوە کـە مـرۆڤ هەرچـی خۆزگـەی پـێ خواسـت بـۆی ببـێ و، خۆزگـە پـێ خواسـتنەکەی بکاتـە هانـدەری کـردەوەکانی، بەڵکـو دەبـێ هـەق لـە ڕووی بەڵگـەوە داوا بـکات، نـەک لـە ڕووی پـێ خۆشـبوون و خۆزگـە پـێ خواسـتنەوە.

کەواتـە: کـە دەفەرمـوێ: ﴿فَلِلَّهِ ٱلْءَاخِرَةُ وَٱلْأُولَىٰ﴾، ئەمـە: (**تَفْرِيْعٌ عَلَى مَا سَبَق، أي الله هُوَ المَالِكُ المُطْلَق، وَالمُتَصَرِّفُ فـي أحْوالِ الدَّارَيْن**)، ئـەم (ف)یـە بـۆ تەفریعـە،

واتـە: بنیاتنـان لەسـەر ئـەوەی ڕابـردووە، یـانی: خـوا خـاوەنی ڕەهـای حـاڵ و باڵـی هـەردوو مەنزڵـگای کۆتایـی و یەکەمـە، ڕۆژی دوایـی و دنیـا، کەواتـە: بـە خۆزگـە پێخواسـتن و پـێ خۆشـبوونی مرۆڤـان، شـت نایەتـە دی، بەڵکـو بـە ویسـتی ڕەهـای خـوا شـت دێتـە دی.

لەبەر ئـەوە بە تەما مەبن، بـت و صەنەمەکانتان تکاو ڕەجاتـان بـۆ بکـەن، بـە نسبەت کاتی خۆیـەوە، هەروەهـا کەسانێکی دیکەش ئێسـتا لە نێو ئەهلی ئیسلامیشـدا هـەن، بـە هەندێـک خۆزگـەو بریـاو ئـاواتی بـێ بناغـە، خۆیانیـان هەڵخەڵەتانـدووەو وەک گوتـراوە: ئیمانـێ بەنیسـکێ دەسـپێرن، یەکێـک بـە تەمـای ڕەچەڵەک و نەسـەبی تێکەوتـوەو، یەکێـک بـە تەمـای نـاوو لەقەبـی تێکەوتـوەو، یەکێ بـە تەمای مەشـڕەب و شـێخەکەی تێکەوتـوە، یەکـێ بـە تەمـای ئـەوە تێکەوتـوە، کـە نـاوی فـڵان شـتەیەو، فـڵان نازنـاوەی هەڵگرتـوە، کـە ئەوانـە هیچـی وانیـن و، مـەرج بناغـەو نێوەڕۆکـە لـە زاتی خۆتـدا، بـۆ خـۆت چـۆنی، نـەک عینوانەکـەت چۆنـە؟ سـەلەفیی یـان خەلەفیـی، یـان صۆفیـی، یـان ئیسـلامیی ... هتـد، بەڵـێ ئەگـەر مسـوڵمانی دەبـێ نێوەڕۆکـی مسـوڵمانەتییت هەبـێ و، هـەر ناوێکـی دیکـەت هەیـە، دەبـێ نێوەڕۆکێکـی باشـی هەبـێ، ئەگەرنـا نـاوی بـە تەنـێ دادی کـەس نـادات.

لە تۆڕە کۆمەڵایەتییەکان لەگەڵتانین
Stay in touch on social media
نحن معكم عبر مواقع التواصل الاجتماعي
AliBapir/عەلی باپیر
ڕاگەیاندنی مەکتەبی مامۆستا عەلی باپیر
AliBapir/عەلی باپیر
archive.org/details/@alibapir
کەناڵی ڕاگەیاندنی مەکتەبی مامۆستا عەلی باپیر
AliBapir
www.alibapir.net
کوردی - عربي - English
ڕاگەیاندنی مەکتەبی مامۆستا عەلی باپیر

www.alibapir.com


## سێ ڕاستیی گرنگ لەم ئایەتەدا

**١- ڕاستیی یەکەم:** مرۆڤ بە کارکردنی ڕاست و دروست بە ئامانج دەگات و، هەر کارەش دەبێ لە ڕێی خۆیەوە بێ، نەک بە خۆزگە پێ خواستن، وەک خوا لە بارەی (**ذو القرنین**)ەوە، فەرموویەتی: ﴿وَءَاتَيۡنَٰهُ مِن كُلِّ شَيۡءٖ سَبَبٗا ٨٤ فَأَتۡبَعَ سَبَبًا ٨٥﴾ **الكهف**، واتە: بۆ هەر شتێک هۆکارێکمان پێدابوو، دەکەوتە شوێن هۆکارەکە (و بە ئامانج دەگەیشت).

کوردەواریی خۆشمان دەڵێن: (کەس بە خەیاڵ نەبووە بە ماڵ)، کەسێک کە بە بێ بناغەو بە بێ هەوڵدان و، بە بێ کارکردنی ڕێک و ڕاست، بەرەو شتێک بچێ، دەڵێن: فلانکەس خەیاڵ پلاوان دەکات!

**٢- ڕاستیی دووەم:** تەنیا خوا خاوەن و هەمەکارەی دوارۆژو دنیایەو، پێویستە لە ڕێی پەیوەندیی ڕاست و دروستەوە لەگەڵ خوادا، بەرەو ئامانج و مەبەستەکانمان بچین، لێرەدا خوا ﷻ دوارۆژی پێش دنیا خستوە: ﴿فَلِلَّهِ ٱلۡأٓخِرَةُ وَٱلۡأُولَىٰ ٢٥﴾، هەم مەنزڵگای کۆتایی، هەم هی یەکەم، هی خوان، تاکو حاڵییمان بکات: ئەوێ گەورەو گرنگەو جێی بایەخ پێدانی تەواوەو، دنیا تەنیا شوێنی پێدا ڕەتبوون و تێدا تاقیکرانەوەیە، ئاگاتان لێ بێ! بائەم هۆڵی تێدا تاقیکرانەوەیەو، ئەم پردی بەسەردا ڕەت بوونە، هەموو هەوڵ و گرنگیی پێدانی ئێوە بەخۆیەوە خەریک نەکات و، دوارۆژتان لە بیر بچێ، ئێرە تەنیا ئامرازە بۆ ڕۆژی دوایی و، پردێکە دەتانگەیەنێ بەوێ و، شوێنی تێدا تاقیکرانەوەیەو ئەنجامەکەی لەوێ وەردە گرنەوە.

**٣- ڕاستیی سێیەم:** ئەوشتانەش کە کاتی خۆی کافرەکان بە ئاواتیان خواستوون، کە لێرەدا خوا ﷻ بەرپەرچیان دەداتەوە، مەرج نیە هەر شتێ بە ئاواتیان خواستوەو خۆزگەیان پێ خواست، بۆیان ببێ، لێرەدا ئاماژە بە چواریان دەکەین:

**یەکەم:** شەفاعەتی بتەکانیان بووە، کە شەفاعەتیان بۆ بکەن.

**دووەم:** بۆچی خوا ﷻ مرۆڤێکی کردۆتە پێغەمبەرو فریشتەی نەناردوە؟ لەچەند شوێنان ئەوە دووبارە بۆتەوە، بۆ وێنە: لە سووڕەتی **(الأنعام)** -٨- و سووڕەتی **(الإسراء)** -٩٤-.

**سێیەم:** شتێکی دیکە کە بە ئاواتیان بووەو خۆزگەیان پێ خواستوە، ئەوەبووە کە پێغەمبەری کۆتایی موحەممەد ﷺ موعجیزەی وەک هی پێغەمبەرانی پێشووی هەبێ.

**چوارەم:** شتێکی دیکە کە خۆزگەیان پێ خواستوە، ئەوە بووە کە پێغەمبەرایەتیی بە پێی پێوەری ئەوان ببەخشرێ: ﴿وَقَالُواْ لَوْلَا نُزِّلَ هَٰذَا ٱلْقُرْءَانُ عَلَىٰ رَجُلٍ مِّنَ ٱلْقَرْيَتَيْنِ عَظِيمٍ ۝٣١﴾ الزخرف، ﴿أَهَٰذَا ٱلَّذِى بَعَثَ ٱللَّهُ رَسُولًا ۝٤١﴾، **(الفرقان)**.

وشەی **(مَا)**، لە: ﴿أَمْ لِلْإِنسَٰنِ مَا تَمَنَّىٰ ۝٢٤﴾، پسپۆڕانی زمان گوتوویانە: وەک **(لام الجنس)** وایە، بە تایبەتی لەگەڵ پرسیارکردنی نکوولێلێکردنداو مانای گشتیی دەگەیەنێ، یانی: **(ما لِلْإنْسانِ شَيْءٌ مِمَّا تَمَنَّى، أيْ: لَيْسَ شَيْءٌ جارِياً عَلَى إرادَتِهِ وحَسَبِ اشْتِهَائِهِ وَتَمَنِّيْهِ، بَلْ يَجْرِي عَلَى إرَادَةِ اللهِ تَعَالَى فِي الدَّارَيْنِ)**، ئینسان ئەوەی دەیخوازێ هیچ شتێکی بۆ نابێ، بە خۆزگەو ئاواتی ڕووت، چونکە کاروبارەکان بەپێی ئارەزوو و خۆزگە خواستنی مرۆڤ بەڕێوە ناچن، بەڵکو بەپێی ویستی خوای بەرز لە هەردوو مەنزڵگای دنیاو دواڕۆژدا، بەڕێوە دەچن.

لە تۆڕە کۆمەڵایەتییەکان لەگەڵتانین
Stay in touch on social media
نحن معكم عبر مواقع التواصل الاجتماعي
ڕاگەیاندنی مەکتەبی مامۆستا عەلی باپیر
AliBapir/عەلی باپیر
archive.org/details/@alibapir
AliBapir
www.alibapir.net
کوردی - عربي - English
کەناڵی ڕاگەیاندنی مەکتەبی مامۆستا عەلی باپیر

www.alibapir.com


## مەسەلەی سێیەم:

**زۆر فریشتە لە ئاسمانێ هەن، کە تکا کردنیان نابێ و، گریمان بشبێ هیچ کەس لێی بەهرەمەند نابێ، مەگەر دوای مۆڵەتدانی خوا بۆ هەر کەسێ کە بیەوێ و پەسەندی بکات:**

خوا دەفەرموێ: ﴿ وَكَم مِّن مَّلَكٍ فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ لَا تُغۡنِي شَفَٰعَتُهُمۡ شَيۡـًٔا إِلَّا مِنۢ بَعۡدِ أَن يَأۡذَنَ ٱللَّهُ لِمَن يَشَآءُ وَيَرۡضَىٰٓ ٢٦ ﴾.

## شیکردنەوەی ئەم ئایەتە، لە دوو بڕگەدا:

**١)-** ﴿ وَكَم مِّن مَّلَكٍ فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ لَا تُغۡنِي شَفَٰعَتُهُمۡ شَيۡـًٔا ﴾، گەلێک فریشتە لە ئاسمانان دا هەن، تکاکردنەکەیان هیچ شتێک سوود ناگەیەنێ. **(كَمْ: اسْمٌ يَدُلُّ عَلَى كَثْرَةِ العَدَد)**، **(كَمْ: الخَبَرِية)**ی پێ دەڵێن، یانی: زۆر فریشتە هەن لە ئاسمانان دا، ئەو ڕستەیە لە ڕووی ڕێزمانییەوە بە نیهاد **(مُبْتَدأ)**، لە قەڵەم دەدرێ و، گوزارە (خبر)کەی بریتیە لە ڕستەی دوایی کە دەفەرموێ: ﴿ لَا تُغۡنِي شَفَٰعَتُهُمۡ شَيۡـًٔا ﴾، تکاکردنیان هیچ سوود ناگەیەنێ، ﴿ وَكَم مِّن مَّلَكٍ ﴾، هەمووی دەبێتە نیهاد **(مُبْتَدأ)** و ﴿ فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ ﴾، دەبێتە سیفەتی **(مَلَك)** و، مەبەست پێی ئەوەیە کە ئەو فریشتانە زۆر بەڕێزن و لە ئاسمانێن، ئەو شوێنە بەرزەی بێ فەرمانیی خوای لێ ناکرێ، هەر بۆیە هەر کەسێ بێ فەرمانیی خوای کرد بێ، لەوێ شۆڕبۆتەوە، ئیبلیس بێ فەرمانیی کرد، شۆڕکرایەوە، ئادەم و حەووا بێ فەرمانییان کرد، شۆڕکرانەوەو هێنرانە سەر زەوی، چونکە ئەوێ شوێنی بێ فەرمانیی خوای پەروەردگار نیەو، سەر زەوی شوێنی تاقیکرانەوەیە، بۆیە لەوێدا خوا مۆڵەتی داوە خەڵک فەرمانبەریی بکات، یان بێ فەرمانیی بکات، بە مەبەستی تاقیکرانەوەیان.

کە دەفەرموێ: ﴿ لَا تُغۡنِي شَفَٰعَتُهُمۡ شَيۡـًٔا ﴾، وشەی (شَيْئًاً)، دەبێتە بەرکاری ڕەها **(مفعول مطلق)**، واتە: تکاکردنی ئەو فریشتانە هیچ جۆرە سوودێک ناگەیەنێ.

www.alibapir.com


٢)- ﴿إِلَّا مِنۢ بَعۡدِ أَن يَأۡذَنَ ٱللَّهُ لِمَن يَشَآءُ وَيَرۡضَىٰٓ﴾، مەگەر دوای ئەوەی خوا مۆڵەت دەدات، بۆ هەر کەسێ بیەوێ و پەسەندی دەکات. کەواتە: دوو بەند هەن، لەسەر ئەوە کە تکاکردنی فریشتان سوود بگەیەنێ:

**یەکەم:** دەبێ خوا مۆڵەت بدات، ئەو فریشتانە تکا بکەن.

**دووەم:** دەبێ خوا ﷻ ئەو کەسە تکای بۆ دەکرێ، لێی ڕازی بێ و پەسەندی بکات.

ئنجا ئەو قەیدەی دوایی کە دەفەرمووێ: هەر کەسێ خوا لێی ڕازییەو پەسەندی دەکات، هاندانە بۆ خەڵک کە کارێکی وابکەن خوا لێیان ڕازی بێ، بەهۆی ئەو کردەوانەوە، کە ڕەزامەندیی خوایان بۆ دەستەبەر دەکەن، واتە: تاکو خوا پەسەندت نەکات، ڕێ نادات فریشتەکان تکات بۆ بکەن، کەواتە: کارێکی وا بکە خوا پەسەندت بکات، خواش بەوە پەسەندمان دەکات و لێمان ڕازی دەبێ، شوێن ئەو بەرنامەیە بکەوین کە پەسەندی کردووەو بریتیە لە ئیسلام: ﴿وَرَضِيتُ لَكُمُ ٱلۡإِسۡلَٰمَ دِينٗا ۝٣﴾ **المائدة**، هەر کەسێک بە دوای بەرنامە پەسەند کراوەکەی خوا بکەوێ، خوا پەسەندی دەکات و، هەر کەسێکیش خوا پەسەندی بکات و لێی ڕازی بێ، فریشتەکان تکای بۆ دەکەن.

ئنجا کە خوا دەفەرمووێ: ﴿لَا تُغۡنِي شَفَٰعَتُهُمۡ شَيۡـًٔا﴾، ڕواڵەتەکەی وای لێ وەردەگیرێ، کە ئەو فریشتانە تکا دەکەن، کەچی خوا تکا کردنەکەیان وەرناگرێ، بەڵام مەبەست پێی ئەوەیە: ئەوانە تکا ناکەن و ناوێرن تکا لە لای خوای بەرز بکەن، بەڵام بۆ زیاتر زەقکردنەوەی ئەوە کە هاوبەش بۆ خوا دانەرەکان، بە تەمای تکای فریشتان نەبن، ئەوەی پێشخستوە: ﴿لَا تُغۡنِي شَفَٰعَتُهُمۡ شَيۡـًٔا﴾، تکای وان هیچ سوودێک ناگەیەنێ.

دوایی کە دەفەرمووێ: ﴿إِلَّا مِنۢ بَعۡدِ أَن يَأۡذَنَ ٱللَّهُ لِمَن يَشَآءُ وَيَرۡضَىٰٓ﴾، یانی: دوای ئەوەی خوا مۆڵەت دەدات بۆ هەر کەسێک کە بیەوێ و پەسەندی دەکات، فریشتەکان تکا دەکەن و ئەو کاتەش تکاکەیان سوود دەگەیەنێ، بەڵام بۆیە

www.alibapir.com



خوا ﷻ سوود نەگەیاندنی تکاکردنەکەی ئەوانی پێشخستوە - هیچ جۆرە سوود گەیاندنێک، چونکە (شَيْـًٔا)، وەک بەرکاری ڕەها (**مَفْعُول مُطْلَق**)یە، یانی: هیچ جۆرە سوود گەیاندنێک سوود ناگەیەنێ - بۆ نائومێد کردنی هاوبەش بۆ خوا دانەران و بتپەرستەکانە کە بەتەمای تکاو ڕەجای فریشتان تێکەوتوون، بەڵام خوا دەفەرموێ: ئەوانە تکا ناکەن، مەگەر دوای ئەوەی خوا مۆڵەت بدات، بۆ هەر کەسێ بیەوێ و لێشی ڕازی بێ.

ئەمە وەک ئایەتەکەی سوورەتی (**الأنبياء**)، وایە کە دەفەرموێ: ﴿وَلَا يَشْفَعُونَ إِلَّا لِمَنِ ٱرْتَضَىٰ وَهُم مِّنْ خَشْيَتِهِۦ مُشْفِقُونَ ﴿٢٨﴾﴾، فریشتەکان تکا ناکەن، مەگەر بۆ کەسێک خوا لێی ڕازی بێ و، ئەوان زۆر خاوەنی ترس و بیمن لە بەرانبەری دا، هەروەها وەک ئایەتەکەی سوورەتی (**البقرة**)یە، (**آية الكرسي**)، کە دەفەرموێ: ﴿مَن ذَا ٱلَّذِى يَشْفَعُ عِندَهُۥٓ إِلَّا بِإِذْنِهِۦ ﴿٢٥٥﴾﴾، کێیە ئەو کەسەی تکا دەکات، مەگەر دوای مۆڵەتی وی[1].

بۆ چۆنیەتیی پێکەوە بەستنەوەی ئایەتەکانیش دەڵێین: پێشتر خوا ﷻ فەرمووی: ﴿أَمْ لِلْإِنسَٰنِ مَا تَمَنَّىٰ ﴿٢٤﴾ فَلِلَّهِ ٱلْءَاخِرَةُ وَٱلْأُولَىٰ ﴿٢٥﴾﴾، ئایا بۆ مرۆڤە هەرشتێک خۆزگەی پێخواست؟ مەنزلگای کۆتایی و هی یەکەم بەس هی خوان، لێرەش دەفەرموێ: ﴿وَكَم مِّن مَّلَكٍ فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ لَا تُغْنِى شَفَٰعَتُهُمْ شَيْـًٔا إِلَّا مِنۢ بَعْدِ أَن يَأْذَنَ ٱللَّهُ لِمَن يَشَآءُ وَيَرْضَىٰٓ﴾، زۆر فریشتە هەن لە ئاسمانان تکا کردنەکەیان هیچ سوود ناگەیەنێ، مەگەر دوای ئەوەی خوا بۆ هەر کەسێ بیەوێ مۆڵەت بدات و پەسندی بکات، چونکە بە هیوای شەفاعەت بوونی فریشتان، زەقترین نموونەی خۆزگەو ئاوات و خەیاڵپڵاوی کافرەکانە، کە دەیانگوت: ﴿مَا نَعْبُدُهُمْ إِلَّا لِيُقَرِّبُونَآ إِلَى ٱللَّهِ زُلْفَىٰٓ ﴿٣﴾﴾الزمر، نا یانپەرستین، مەگەر بۆ ئەوەی بە نیزیک خستنەوە لە

---

(١) شایانی باسە: ئێمە لە تەفسیری سوورەتی (یونس)دا، کورتە باسێکی تاڕادەیەک باشمان لە بارەی شەفاعەت و تکاکردنەوە کردوە.

خوامان نیزیک بخەنەوە، بەڵام خوا ﷻ خستوویەتە ڕوو کە لە ڕاستییدا نەک پەرستنی ئەوان لە خوایان نیزیک ناخاتەوە، بەڵکو لە خوایان دوور دەخاتەوە، چونکە شایستەی پەرستران نین و، پەرستران تەنیا شایستەی خوای بەدیهێنەرو پەروەردگارو خاوەنی هەموو شتێکە.

لە تۆڕە کۆمەڵایەتییەکان لەگەڵتانین
Stay in touch on social media
نحن معكم عبر مواقع التواصل الاجتماعي
راگەیاندنی مەکتەبی مامۆستا عەلی باپیر
AliBapir/عەلی باپیر
archive.org/details/@alibapir
AliBapir/عەلی باپیر
AliBapir
کەناڵی
راگەیاندنی مەکتەبی مامۆستا عەلی باپیر
www.alibapir.net
English - عربي - کوردی
راگەیاندنی مەکتەبی مامۆستا عەلی باپیر

www.alibapir.com


## مەسەلەی چوارەم:

ناوبردنی بێبڕوایان بۆ فریشتان بە مێینە، بەبێ هیچ زانیارییەک، بەڵکو تەنیا بە گومانی کوێرانەو، گومانیش هیچ دادێکیان نادات بۆ هەقناسیی:

خوا دەفەرموێ: ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ لَا يُؤۡمِنُونَ بِٱلۡأٓخِرَةِ لَيُسَمُّونَ ٱلۡمَلَٰٓئِكَةَ تَسۡمِيَةَ ٱلۡأُنثَىٰ ٢٧ وَمَا لَهُم بِهِۦ مِنۡ عِلۡمٍۖ إِن يَتَّبِعُونَ إِلَّا ٱلظَّنَّۖ وَإِنَّ ٱلظَّنَّ لَا يُغۡنِي مِنَ ٱلۡحَقِّ شَيۡـًٔا ٢٨﴾.

## شیکردنەوەی ئەم دوو ئایەتە، لە پێنج بڕگەدا:

١)- ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ لَا يُؤۡمِنُونَ بِٱلۡأٓخِرَةِ﴾، بە دڵنیایی ئەوانەی بڕوایان بە مەنزڵگای کۆتایی نیە.

٢)- ﴿لَيُسَمُّونَ ٱلۡمَلَٰٓئِكَةَ تَسۡمِيَةَ ٱلۡأُنثَىٰ﴾، ناو لە فریشتان دەنێن، بە ناوهێنانی مێینە، واتە: فریشتەکان بە وەسفی مێینە وەسف دەکەن، {اسْتُعْمِلَتِ التَّسْمِيَةُ هُنَا بِمَعْنَى التَّوْصِيْفِ، مِثْلُ قَوْلِهِ تَعَالَى: ﴿عَيۡنٗا فِيهَا تُسَمَّىٰ سَلۡسَبِيلٗا ١٨﴾، أي تُوصَفُ، وَ {هَلْ تَعْلَم لَهُ سَمِيَّاً} مريم -٦٥ -، أي: مَثِيْلاً)، ﴿لَيُسَمُّونَ ٱلۡمَلَٰٓئِكَةَ تَسۡمِيَةَ ٱلۡأُنثَىٰ﴾، أي: (لَيَصِفُونَ المَلَائِكَةَ وَصْفَ الأنْثَى)} واتە: (تسمية) بەمانای وەسفکردن بەکارهێنراوە، وەک فەرموودەی خوای بەرز: سەرچاوەیەکە پێدەگوترێ: سەلسەبیل، یانی: بەوە وەسف دەکرێ، هەروەها: ئایا هیچ هاوناوێکی دەزانی؟ یانی: وێنەی وی، کەواتە: (لَيُسَمُّونَ ٱلۡمَلَٰٓئِكَةَ تَسۡمِيَةَ ٱلۡأُنثَىٰ) یانی: فریشتەکان بە مێینە وەسف دەکەن.

(الأُنْثى مُعَرَّفٌ تَعْرِيفَ الجِنْسِ وَهُوَ فِي مَعْنَى المُتَعَدِّدِ، وَذَلِكَ مُرَاعَاة للفَاصِلَة، أَوَّلاً: ثُمَّ لَوْ قَالَ (إِنَاث)، لأَوْهَمَ أَنَّهُ يُقْصَدُ بِه الأَسْمَاءُ الأَعْلَامِ المُعْتَادَةِ: حَفْصَة، وَعَائِشَة، نَجَاة)، کە دەفەرموێ: ﴿تَسۡمِيَةَ ٱلۡأُنثَىٰ﴾، (أل)ی سەر (الأُنْثى)، مەبەست پێی جینسە، یانی: کۆی مێینەکان و مانای زۆریش دەگەیەنێ، ئەویش لەبەر:

**یەکەم:** ڕەچاو کردنی کۆتایی ئایەتەکە، بۆ ئەوەی لەگەڵ ئەوانی دیکە سەجعەکەی بێتەوە، {ئەوەش یەکێکە لە ڕووەکانی ڕەوانبێژیی}.

www.alibapir.com



**دووەم:** ئەگەر خوا فەرمووبای: (تَسْمِيَة الإنَاث)، وێڕای ئەوەی سەجعەکەی تێکدەچوو، ئەو وەهمەشی دروست دەکرد، کە مەبەست پێی ناوی ئافرەتان بێ بە گشتیی، وەک ناوی (حَفْصَة وَعَائِيشَة ونَجَاة)، بەڵام ئێستا کە دەفەرمویێ: ﴿تَسۡمِيَةَ ٱلۡأُنثَىٰ﴾، واتە: ناوی مێینە، نەک ناوی ئافرەتان بە گشتیی.

٣)- ﴿وَمَا لَهُم بِهِۦ مِنۡ عِلۡمٍ﴾، هیچ زانیارییشیان پێی نیە، (مِنْ)، کە چۆتە سەر (عِلْمٍ أي: أيَّ قَدَرٍ مِنَ العِلْم)، هیچ جۆرە زانیارییەکیان بەوە نیە کە دەیڵێن.

٤)- ﴿إِن يَتَّبِعُونَ إِلَّا ٱلظَّنَّ﴾، شوێن هیچ ناکەون جگەلە گومان، تەنیا شوێن گومان دەکەون و، جگەلەوە شوێن هیچ شتێک ناکەون، چونکە (إنْ) بە مانای (ما)ی لابەرەیە.

٥)- ﴿وَإِنَّ ٱلظَّنَّ لَا يُغۡنِي مِنَ ٱلۡحَقِّ شَيۡـٔٗا﴾، گومانیش شتێک سوود ناگەیەنێ بە خاوەنەکەی و قەرەبووی هەقی بۆ ناکاتەوە، قەرەبووی هەقناسینی بۆ ناکاتەوە، (وَاسْتُعِيرَ الاتِّبَاعُ لِلأَخْذِ بِالشَّيْء، وَاعْتِقَادِ مُقْتَضَاهُ)، کە دەفەرمویێ: ﴿إِن يَتَّبِعُونَ﴾، وشەی (اتِّبَاع): خوازراوەتەوە بۆ گرتنی شتێک و بڕوابوون بە داخوازیی ئەو شتە، یانی: تەنیا بڕوایان بە گومان هەیە، کە دەفەرمویێ: تەنیا شوێن گومان دەکەون، لەبەر ئەوەی ئینسان بڕوای بە شتێک بێ، شوێنیشی دەکەوێ، بۆیە پەیوەست (لازِم)ەکەی هێناوەو، مەبەست پێی پێوە پەیوەستکراو (ملزوم)ەکەیەتی کە بریتیە لە بڕوا پێبوون، (وأُطْلِقَ الظَّنُّ عَلَى الإِعْتِقَادِ الخَاطِئِ عَلَى الأَكْثَر)، وشەی (ظن)، لە زۆربەی بەکارهێنانەکانی قورئاندا، مەبەست پێی حاڵەتی زەممەو، لێرەدا مەبەست پێی بڕوای هەڵەیە، وشەی (شَيْئًا)، بەرکارە بۆ (يُغْنِي)، یانی: (شَيْئًاً مِنَ الإغْنَاءِ) هیچ شتێک لە سوود گەیاندن، مانایەکەی ئاوای لێ دێتەوە: ئەو هەقەی بریتیە لە ڕاستیی شتەکان، وەک لە خودی خۆیاندا لەسەرنی و زانینیشان، زانین (عِلم)یش ئاوا پێناسە کراوە، (تَصَوُّرُ المَعْلُومِ عَلَى مَا هُوَ عَلَيْهِ)، وێنا کردنی زانراوە، بەو شێوەیەی خۆی لەسەریەتی، ئنجا گومان هیچ کەلێنێکی ئەو جۆرە زانینە پڕناکاتەوە، تەنانەت ئەگەر هەندێک جار بە ڕێکەوتیش هەق بپێکێ، چونکە خاوەنەکەی لەسەر بناغەی بەڵگە ئەو

هەقەی نەپێکاوە، بەڵکو لەسەر بناغەی گومان و بۆچوونێکەو، پێی وابووە وایەو واخەیاڵی یکردوە، بۆیە هیچ کات گومان شوێنی ناسینی هەق و، پەی پێبردنی هەق ناگرێتەوە.

واتە: گومان هیچ سوودێک ناگەیەنێ بە خاوەنەکەی لە هەقناسیندا، بەڵکو دەبێ هەق خۆی بناسرێ، بەهۆی بەڵگەکانیەوە، نەک هەروا لە گۆترەو بەبێ بەڵگە کەسێک شتێک بڵێ.



www.alibapir.com



## مەسەلەی پێنجەم:

**فەرمانکردن بە پشتکردنە کەسانێک، کە ڕوو لە بەرنامەی خوا وەردەگێڕن و، جگە لە ژیانی دنیایان ناوێ و، عەقڵ و زانستیان لەوە زیاتر بڕ ناکات، چونکە خوا بە هەموو لایەک زاناترە:**

خوا دەفەرموێ: ﴿ فَأَعْرِضْ عَن مَّن تَوَلَّىٰ عَن ذِكْرِنَا وَلَمْ يُرِدْ إِلَّا الْحَيَاةَ الدُّنْيَا ﴿٢٩﴾ ذَٰلِكَ مَبْلَغُهُم مِّنَ الْعِلْمِ ۚ إِنَّ رَبَّكَ هُوَ أَعْلَمُ بِمَن ضَلَّ عَن سَبِيلِهِ وَهُوَ أَعْلَمُ بِمَنِ اهْتَدَىٰ ﴿٣٠﴾ ﴾.

## شیکردنەوەی ئەم دوو ئایەتە، لە پێنج بڕگەدا:

**١)-** ﴿ فَأَعْرِضْ عَن مَّن تَوَلَّىٰ عَن ذِكْرِنَا ﴾ {خوا ﷻ ڕوودەکاتە پێغەمبەری خاتەم موحەممەد ﷺ و، فەرمانی پێ دەکات دەفەرموێ:} ڕوو وەرگێڕە لە کەسێک، کە پشتی کردۆتە یادی ئێمە (یان بەرنامەی ئێمە). پیتی (ف)ی سەر (فَأَعْرِضْ)، (**فَاء: مُفْصِحَةٌ عَمَّا قَبْلَهَا أو مُتَفَرِّعَةٌ عَمَّا سَبَق**)، ئەم فایە (**مُفصِحة**)یە، گەیەنەری چەند واتایەکە، کە مەزەننە دەکرێن لە پێش ئەوەدا، واتە: مادام حاڵ بەو شێوەیەو ئەوان وادەکەن و ئاوا نەسەلمێن و کەللەڕەقن، تۆ ڕوویان لێ وەربگێڕە، یاخود (**ف**) بۆ (**تفریع**)ە، واتە: بینا لەسەر ئەوەی ڕابرد، ڕوو وەرگێڕە لە کەسێک کە پشتی کردۆتە بەرنامەو یادی ئێمە.

کە دەفەرموێ: ﴿ عَن ذِكْرِنَا ﴾، (**ذِكْر**): پاڵدراوەتە لای ڕاناوێک، کە بۆ خوا بەکارهێنراوە، مەبەست پێی قورئانە، دەشگونجێ مەبەست پێی لە بیربوون و لە یادبوونی خوا بێ، چونکە قورئانیش بە (**ذِكْر**) ناو براوە: ﴿ إِنَّا نَحْنُ نَزَّلْنَا الذِّكْرَ وَإِنَّا لَهُ لَحَافِظُونَ ﴿٩﴾ ﴾**الحجر**، هەروەها یادی خوا کردنیش دیسان بە (**ذِكْر**)، هاتووە: ﴿ أَلَا بِذِكْرِ اللَّهِ تَطْمَئِنُّ الْقُلُوبُ ﴿٢٨﴾ ﴾الرعد، ﴿ يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا اذْكُرُوا اللَّهَ ذِكْرًا كَثِيرًا ﴿٤١﴾ ﴾**الأحزاب**، (**ذكر**)یش، دوو واتای هەن:

**یەکەم:** بەسەر دڵدا هێنانی شتێک، چ دوای لە بیرچوونەوە بێ، چ بەبێ لە بیر چوونەوە.

www.alibapir.com


**دووەم:** بەسەر زماندا هێنان و باسکردنی ئەو شتەی باس دەکرێ، واتە: باسکراو (مَذْكُور)ەکە.

کـە دەفەرمـوێ: ڕووو وەرگێـڕە لـە کەسـێک کـە پشـتی کردۆتـە بەرنامـەی ئێمـە، یاخـود: یـادی ئێمـە، مەبەسـت ئـەوە نیـە ئـەو جـۆرە کەسـە ئامۆژگاریـی نەکـرێ و بیری نەخرێتـەوە، بەڵکـو مەبەسـت ئەوەیـە: وتووێژو دمبەدمەو شـەڕە قسـەی لەگەڵـدا مەکە، یاخـود: گرنگیـی و بایەخـی پـێ مـەدە، بـا تووشـی سـزا ببـێ، مـادام هـەر بـە قسـەت نـاکات و بـە ئەندازەیـەک کـە پێویسـت بـووە، بـە ئەرکـی سەرشـانی خـۆت هەڵسـاوی، لەمـەودوا زیاتـر کاتی خـۆتی پێـوە بەفیـڕۆ مـەدەو، زیاتـر لـەوە خەفەتـی پێـوە مەخـۆ.

ئنجـا وەک جـاری دیکـەش باسـمانکردوە: هەمـوو ئـەو ڕێگرتنانـەی خـوای موتەعال لە پێغەمبەر ﷺ کە زیاتر خەفەت بخوات و، ئەو فەرمانانەی خوا ﷻ بـە پێغەمبـەر ﷺ کـە وازیـان لـێ بێنێ و پشـتیان تـێ بـکات و ڕوویان لـێ وەرگێڕێ، سـتاییش و مەدحێکـی گـەورەی پێغەمبـەری خوایـان تێدایـە، چونکـە مانـای وایـە پێغەمبـەری خـوا ﷺ ئەوەنـدە بـە خـەم و دڵسـۆز و بـە مشـوور بـووەو، ئەوەنـدە خـۆی ماندوو کردوە، پێویسـت بووە خـوا ﷻ زوو زوو پێی بفەرموێ: هێندە خەفـەت مەخـۆ و هێنـدە ناڕەحـەت مەبـە، وازیـان لـێ بێنـەو ڕوویـان لـێ وەرگێـڕە.

**٢)- ﴿وَلَمْ يُرِدْ إِلَّا الْحَيَوٰةَ الدُّنْيَا﴾**، کەسێک کە پشتی لە بەرنامەو یادی ئێمە کردوەو تەنیا ژیانی دنیای دەوێ، هیچی ناوێ، جگە لە ژیانی دنیا، واتە: بڕوای بە ڕۆژی دوایی نیە، کەسێکیش بڕوای بە ڕۆژی دوایی نەبوو، دنیای زۆر لەلا گەورەو خۆشەویست دەبێ و، زۆر باوەشی پێدا دەکات.

**(الإعْـرَاضِ: لَفْـتُ الْوَجْـهِ عَـنِ الـشَّيْءِ؛ لِأَنَّـهُ مُشْـتَقٌّ مِـنَ الْعَـارِضِ وَهُـوَ صَفْحَـةُ الْخَـدِّ)،** **(عَـارِض)**: بریتیـە لـە لا ڕوومـەت، ئنجـا **(إِعْـرَاضِ)** لـە ئەصڵـدا بریتیـە لـە ڕوو وەرگێـڕان لـە شـتێک، چونکـە کـە لا ڕوومەتـت تێکـرد، مانـای وایـە ڕووت تێـی نیـە، ئەمـە مانـا ڕاستەقینەکەیەتی، بـەڵام لێرەدا مانـا مەجازییەکـەی مەبەسـتەو، ڕوو لێوەرگێـڕان

www.alibapir.com


خوازراوەتـەوە بـۆ وازهێنـان لـە شـەڕە قسـە لەگـەڵ کـردن، یاخـود: وازهێنـان لـە گرنگیـی و بایـەخ پێـدان و خـەم لێخـواردن.

وشـەی (تَـوَلَّى)ش، مانایەکـەی: پشـتتێکردن و واز لـێ هێنانـە، بـەڵام لێـرەدا خوازراوەتـەوە بـۆ گـوێ لێنەگرتـن لـە پەیامـی خـواو، گرنگیـی نـەدان بـە پەیامـی خـوا، واتـە: پشـتتێکردنەکە مەبەسـت پێـی گـوێ لـێ نەگرتـن و گرنگیـی پـێ نـەدان و بایـەخ پـێ نەدانـە.

٣)- ﴿ذَٰلِكَ مَبۡلَغُهُم مِّنَ ٱلۡعِلۡمِۚ﴾، (خوا دەفەرموێ:) ئا ئەوە ئەندازەی ئەوانە لە زانیارییدا، واتە: هەر ئەوەندەیان زانیاریی هەیە، بەس ئەوەندەیان عەقڵ پێ دەشکێ، (مَبْلَغ)، چ بە مانای ئەندازە بێ، چ بە مانای کۆتایی بێ، (أي: هَذَا مقدار ونِهَايَةُ عِلْمِهِم)، ئەوە ئەندازەو کۆتایی زانیاریی ئەوانە، زانیارییان تەنیا تاکو ئەوێ دەڕوات، هەتا ژیانی دنیا دەڕواو لەوە بەولاوە بڕ ناکات.

٤)- ﴿إِنَّ رَبَّكَ هُوَ أَعۡلَمُ بِمَن ضَلَّ عَن سَبِيلِهِۦ﴾، بە دڵنیایی پەروەردگارت خۆی زاناترە بە کەسێک کە لە ڕێی وی لایداوەو سەرگەردان بووە.

٥)- ﴿وَهُوَ أَعۡلَمُ بِمَنِ ٱهۡتَدَىٰ﴾، هەروەها تەنیا خۆی زاناترە بە کەسێک کە ڕێی ڕاستی گرتووەو ڕاستە ڕێ بووە.

لێـرەدا کـە دەفەرمـوێ: ﴿إِنَّ رَبَّكَ هُوَ أَعۡلَمُ بِمَن ضَلَّ عَن سَبِيلِهِۦ وَهُوَ أَعۡلَمُ بِمَنِ ٱهۡتَدَىٰ﴾، ئەمـە پاسـاو هێنانەوەیـە بـۆ ڕسـتەی پێشـوو و دڵدانەوەیـە بـۆ پێغەمبـەر ﷺ، دەفەرمـوێ: پـەروەردگارت زاناتـرە بـە کەسـێک کـە لـە ڕێـی وی لایـداوە، ئنجـا کـە پـەروەردگارت پێیـان زاناتـرە، کەواتـە: ئەویـش بەسـەریان ڕادەگات و مشـوورىان دەخـوات بـۆ لێپرسـینەوەو سـزا، کـە ئەمـە هەڕەشـەیەکی پێچراوەیـە بـۆ بێبڕوایـەکان، هەروەهـا کـە دەفەرمـوێ: ﴿وَهُوَ أَعۡلَمُ بِمَنِ ٱهۡتَدَىٰ﴾ ئەمـەش دیسـان گفـت و بەڵێـن و موژدەیـە بـۆ بـڕواداران، کـە خـوا پێیـان زاناتـرەو، خۆشـی پاداشـتی کەسـێک دەداتـەوە کـە ڕێـی ڕاسـتی گرتـوە.

## مەسەلەی شەشەم و کۆتایی:

**ڕاگەیاندنی ئەو ڕاستییە کە خوا ﷻ خاوەنی ئاسمانەکان و زەوی (گەردوون)ە، تاکو سزای خراپەکاران و پاداشتی چاکەکاران بداتەوە، ئەو چاکەکارانەی خۆیان لە هەرچی گوناهی زل و ناقۆڵایە دەپارێزن، جگە لەگوناهی گچکە، نابێ هیچ کەسیش خۆپەسندیی بکات، چونکە خوا پێیان زاناترە، هەر لە سەرەتای دروستکردنیانەوە لە زەویداو، لەو کاتەشدا کە لەنێو سکی دایکیشیاندا بوون وەک کۆرپەلە:**

خوا دەفەرمووێ: ﴿وَلِلَّهِ مَا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِي ٱلْأَرْضِ لِيَجْزِيَ ٱلَّذِينَ أَسَٰٓـُٔواْ بِمَا عَمِلُواْ وَيَجْزِيَ ٱلَّذِينَ أَحْسَنُواْ بِٱلْحُسْنَى ﴿٣١﴾ ٱلَّذِينَ يَجْتَنِبُونَ كَبَٰٓئِرَ ٱلْإِثْمِ وَٱلْفَوَٰحِشَ إِلَّا ٱللَّمَمَۚ إِنَّ رَبَّكَ وَٰسِعُ ٱلْمَغْفِرَةِۚ هُوَ أَعْلَمُ بِكُمْ إِذْ أَنشَأَكُم مِّنَ ٱلْأَرْضِ وَإِذْ أَنتُمْ أَجِنَّةٌ فِي بُطُونِ أُمَّهَٰتِكُمْۖ فَلَا تُزَكُّوٓاْ أَنفُسَكُمْۖ هُوَ أَعْلَمُ بِمَنِ ٱتَّقَىٰٓ ﴿٣٢﴾﴾.

## شیکردنەوەی ئەم دوو ئایەتە، لە یازدە بڕگەدا:

**١)-** ﴿وَلِلَّهِ مَا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِي ٱلْأَرْضِ﴾، هەرچی لە ئاسمانەکان و لە زەویدا هەیە، هی خوایە.

ئەمە هەواڵدانە بە خاوەندارێتیی خوا بۆ بوون، بەسەرو خواریەوە، بەڵام ئایا بۆچی خوا ﷻ ئەو هەواڵەمان پێ دەدات، کە خۆی خاوەندارێتیی هەرچی لە ئاسمانەکان و هەرچی لە زەویدایە، دەکات؟

**٢)-** ﴿لِيَجْزِيَ ٱلَّذِينَ أَسَٰٓـُٔواْ بِمَا عَمِلُواْ﴾، تاکو ئەوانەی خراپەیان کردوە، بەپێی ئەوەی کردوویانە سزایان بدات.

**٣)-** ﴿وَيَجْزِيَ ٱلَّذِينَ أَحْسَنُواْ بِٱلْحُسْنَى﴾، ئەوانەش کە چاکەیان کردوە، بە پێی چاکەکەیان پاداشتی هەرە چاکیان بداتەوە، (الحُسْنَى)، (مُؤَنَّث)ی، (الأَحْسَن)ە، واتە: پاداشتی

www.alibapir.com


هەرە چاک، (الحُسْنَى) سیفەتی وەصفکراوێکی قرتێنراوە، یانی: (بالـمَثُوبَةِ الحُسْنَى)، بە پاداشتی هەرە چاک.

کـە دەفەرمـوێ: ﴿لِيَجْزِيَ ٱلَّذِينَ أَسَٰٓـُٔواْ بِمَا عَمِلُواْ وَيَجْزِيَ ٱلَّذِينَ أَحْسَنُواْ بِٱلْحُسْنَى ٣١﴾، (ل)ی سـەر: ﴿لِيَجْزِيَ ٱلَّذِينَ أَسَٰٓـُٔواْ بِمَا عَمِلُواْ﴾، تاکـو سـزای ئەوانـەی کـە خراپەیـان کـردوە، بەپێـی کردەوەکەیـان بداتـەوە، یـان لامـی هـۆکار (لام تَعْلِيْـل)ە، واتـە: لـە بـەر ئـەو هـۆکارە خـوا خاوەنداریێتیـی ئاسـمانەکان و زەوی کردوە.

یاخـود: لامـی سـەرەنجام (لام العَاقِبَة)یـە، واتـە: خـوا خاوەنداریێتیـی ئاسـمانەکان و زەوی و هەرچـی تێیانـدا هەیـە، دەکات، تاکـو سـەرەنجام سـزاو پاداشـت بەسـەر خراپـەکاران و چاکەکارانـدا بسـەپێنێ.

دەشـگونجێ ﴿وَلِلَّهِ مَا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِي ٱلْأَرْضِ﴾، پەیوەسـت بێتـەوە بـە (أعلـم) کـە، لـە ئایەتی پێشـوودا هاتـوە: ﴿إِنَّ رَبَّكَ هُوَ أَعْلَمُ بِمَن ضَلَّ عَن سَبِيلِهِۦ وَهُوَ أَعْلَمُ بِمَنِ ٱهْتَدَىٰ ٣٠﴾، خـوا زاناتـرە بـە کەسـێک کـە لـە ڕێـی وی لایـداوەو، زاناتریشـە بـە کەسـێک کـە ڕێـی ڕاسـتی گرتـوەو، هەرچـی لـە ئاسـمانەکان و زەویـدا هەیـە، خـۆی خاوەنیـەتی و خاوەنداریێتیـی دەکات، تاکـو ئەوانـەی خراپەیـان کـردوە بـە پێـی کردەوەکەیـان سـزایان بـدات و، ئەوانـەش کـە چاکەیـان کـردوە پاداشـتی هـەرە باشـیان بداتـەوە.

ئنجا خوا ﷻ پێناسەی ئەوانە دەکات کە بە پاداشتی هەرە چاک، پاداشتیان دەداتـەوەو دەفەرمـوێ:

٤)- ﴿ٱلَّذِينَ يَجْتَنِبُونَ كَبَٰٓئِرَ ٱلْإِثْمِ وَٱلْفَوَٰحِشَ إِلَّا ٱللَّمَمَ﴾، ئەوانەی خۆیان دووردەگرن لە گوناهە گەورەکان و (لە گوناهە) ناقۆڵاو دزێوەکان، جگە لەوردە گوناه ﴿كَبَٰٓئِرَ ٱلْإِثْمِ﴾، خوێندراویشەتەوە: (كَبِيْرَ الإِثْم)، واتە: گوناهی گەورە.

ئێسـتاش لـە کورتـە باسـێك دا پێناسـەی گوناهـە گـەورەکان و وردە گوناهـان دەکەیـن:

www.alibapir.com


## پێناسەیەکی کورتی گوناهە گەورەکان و وردە گوناح

ئێمە لە ڕابردووشدا لە چەند شوێنێکی دیکەی تەفسیرەدا، پێناسەی گوناهی گەورەمان کردوە، لێرەش کەمێکی لێ باس دەکەینەوە، مادام خوا ﷻ لە چەند شوێنێکدا ئەم تەعبیرەی هێناوە، ئەگەر لە هەموو ئەو شوێنانەشدا تیشکێکی بخرێتەوە سەر، جێی خۆیەتی:

زانایان لە بارەی گوناهانی گەورە: ﴿كَبَٰٓئِرَ ٱلۡإِثۡمِ﴾ەوە، ڕا جیاییان هەیە:

بەڵام زۆربەیان لەسەر ئەوە یەکدەنگن دەڵێن: (**الكَبِيْرَة: كُلُّ ذَنْبٍ عَلَيْهِ عِقَابٌ دُنْيَوِيٌّ، أو وَعِيد أُخْرَوِي**)، گوناهی گەورە هەر گوناهێکە سزایەکی دنیایی یاخود هەڕەشەیەکی قیامەتیی لەسەر هاتبێ، بۆ وێنە: ئەوەی سزای دنیایی لەسەرە وەک: قەتڵ، زینا، دزیی و ڕێگریی، بوختان، ئەوانە هەموویان سزای دنیاییان لەسەرە، ئەوەی هەڕەشەی قیامەتیی لەسەرە وەک: غەیبەت کردن، بوختان کردن، {نەک هی داوێن پیسیی، کە سزای هەیەو هەشتا قەمچییە، واتە: تۆمەت هەڵبەستن بۆ خەڵک جگە لە مەسەلەی داوێن پیسیی، کە ئەوە سزایەکەی دیارییکراوە} هەروەها درۆکردن لەگەڵ خەڵک و، پەیمان شکێنیی و، ئازاردانی خەڵک، ئەوانە هەموویان هەڕەشەی قیامەتییان لەسەرە، وەک لە تەفسیری سووڕەتی (**الحجرات**)دا، باسمانکردوە.

﴿وَٱلۡفَوَٰحِشَ﴾، (**الفَوَاحِشُ: الفِعْلاتُ الَّتِي يُعَدُّ الَّذِي فَعَلَهَا مُتَجاوِزًا الكَبائِرَ، مِثْلُ الزِّنَى، والسَّرِقَةِ وقَتْلِ الغِيلَةِ**)، (**فَواحِشْ**)، کۆی (**فاحشة**)یە، بریتییە لەو کردەوانەی ئەنجامدانەکەی بریتییە لە تێپەڕاندن لە گوناهە گەورەکانیش، وەک زیناو دزیی و کوشتنی پەنامەکیی، ئەوە قسەی یەکێک لە زانایانە

بەڵام من پێم ڕاست نیە، چونکە مەرج نیە (**فَواحِش**)، لە گوناهە گەورەکان تێپەڕێنن، بەڵکو (**فَواحِشْ**)، جۆرێکن لە گوناهە گەورەکان، کە زۆر دزێوو ناشیرین

www.alibapir.com


و ناقۆڵان، لەبەر چاوی خەڵک، یاخود ئەو گوناهانەن کە پەیوەندییان بەلایەنی جینسییەوە هەیە، وەک هەندێک لە زانایان گوتوویانە، یاخود گوناهە گەورەکان و (**فَواحِش**) هەر یەکن، بەڵام لە ڕووی قەبارەیانەوە، بە گوناهی گەورە دادەنرێن و، لە ڕووی دیمەنیانەوە بە دزێوو ناقۆڵا ئەژمار دەکرێن، ئەو تەعبیرەشم لە تەفسیرەکاندا نەبینیوە، بەڵام پێم وایە واباشە بەو شێوەیە تەعبیریان لێ بکرێ لەو دوو جۆرە، واتە: (**فَواحِش**) و (**كَبائِر**)، هەموویان گوناهی گەورەن، لە ڕووی قەبارەیانەوە بە گەورە دادەنرێن و، لەڕووی دیمەن و حاڵەتی بینراویانەوە بە دزێوو ناشیرین دادەنرێن، لە سۆنگەی ئەوەوە کە هەموو گوناهێکی گەورە، وێڕای گەورە بوونی ناقۆڵاشەو، هەموو گوناهێکی ناقۆڵاش، وێڕای نا قۆڵاو دزێوو ناشیرین بوونی گەورەشە، بەڵام خوا ﷻ هەردوو وشەکەی بەکارهێناون.

زانایان لە بارەی پێناسەی: (**كَبائِر**) و (**فَواحِش**)ەوە، زۆر قسەیان کردوە، بەڵام ئەوەی گوتم، بە ڕایەکی گونجاوی دەزانم.

﴿**إِلَّا ٱللَّمَمَ**﴾، خۆیان لە هەموو گوناهە گەورەکان و، گوناهە ناقۆڵاو دزێوەکان دەپارێزن، جگە لە هی بچووک، ئەم هەڵاواردنە پێی دەگوترێ: هەڵاواردنی دابڕاو (**إِسْتِثْناءٌ مُنْقَطِع**)، هەڵاواردنی پەیوەست (**إستثناء متصل**) ئەوەیە کە هەڵاوێردراو (**مُستَثْنى**) بەشێک بێ لە لێ هەڵاوێردراو (**مُسْتَثْنَى منه**)، کە لێرەدا (**لَمَمْ**) جیایە لە گوناهی گەورەو گوناهی ناقۆڵاو دزێو، کەواتە: هەڵاوێردراو جیایە لە لێ هەڵاوێردراو، بۆیە پێی دەگوترێ: هەڵاواردنێکی دابڕاو، واتە: خۆیان لە هەموو گوناهەکان دەپارێزن، گوناهە گەورەکان و گوناهە ناقۆڵاو ناشیرینەکان، بێجگە لە گوناهی بچووک، زۆربەی هەرە زۆری زانایان (**لَمَم**)یان بە گوناهی گچکە لێکداوەتەوە، ئنجا ئایا (**لَمَمْ** ) لەچییەوە هاتوە؟

با سەرنجێکی قسەی زانایان بدەین: (**لَمَمْ**) ناوی چاوگەو (**إلْمَام**)، چاوگەکەیەتی (**أَلَمَّ يُلِمُّ إلْمَاماً**)، (**اللَّمَم**): ناوی چاوگ (**اسم مصدر**)ە، ئێمە چەند ڕایەکی

www.alibapir.com



زانایان لەو بارەوە دێنین تاکو زیاتر تیشک بخەینە سەر چەمک و واتای وشەی (لـمَم)، کە زانایان زۆر قسەیان لە بارەیەوە کردوە:

١- **(الأزهري)** کە یەکێکە لە زانایانی شارەزای زمان دەڵێ: **(الإِلْمَامُ: الدُنُّو وَالقُرْب)**، **(إِلْمَام)**: (کە چاوگی (لَمَم)ە) بریتیە لە نیزیک کەوتنەوەو توخن کەوتن.

٢- **(المبرِّد)** دەڵێ: **(أن تُلِمَّ بشَيء مِنْ غَيْرِ أَنْ تَرْكَبَهُ)**، **(لَمَمُ)**، ئەوەیە لە شتێک نیزیک ببیەوە، بێ ئەوەی ئەنجامی بدەی.

٣- **(الزَّجَّاج)** دەڵێ: **(مَا يَعْمَلُهُ الإِنْسَانُ المَرَّةَ بَعْدَ المَرَّةِ، ولا يَتَعَمَّقُ فِيهِ)**، **(لَمَم)**: بریتیە لەو گوناهەی مرۆڤ جاروبار دەیکات، بەڵام پێیدا قووڵ نابێتەوە، لەسەری بەردەوام بێ.

٤- **(الرازي)** لە **(مختار الصِّحاح)**دا، دەڵێ: **(أَلَمَّ الرَّجُلُ مِنَ اللَّمَمِ، وَهُوَ صَغَائِر الذُّنُوبِ)**، **(أَلَمَّ الرَّجُلُ)**، پیاوەکە ئیلمامی کرد لە لەمەمەوە هاتوە، ئەویش گوناهە بچووکەکانن.

٥- **(الشوكاني)** دەڵێ: **(الجُمْهُور عَلَى أَنَّهُ صَغَائِرِ الذُّنوبِ)**، زۆربەی زانایان لەسەر ئەوەن کە مەبەست لە **(لمم)** وردە گوناهەکانە.

٦- **(ابن عاشور)** دەڵێ: **(اللَّمَمُ: الفِعْلُ الحَرَامُ الَّذِي هُوَ دُونَ الكَبَائِرِ وَالفَوَاحِشِ فِي تَشْدِيدِ التَّحْرِيمِ)**، **(لَمَم)**: بریتیە لەو کردەوە قەدەغەیەی کە لە خوار گوناهە گەورەکان و گوناهە ناقۆڵاو دزێوەکانەوەیە، لە ڕووی خەستیی قەدەغەبوونیدا.

٧- **(وَقِيْلَ: هُوَ الـهَمُّ بِالسَّيِّئَة)**، گوتراوە: **(لَمَم)**: بریتیە لەوەی مرۆڤ بیەوێ گوناهێ بکات، بەڵام نەیکات، واتە: بە دڵیدا بێ کە گوناهەکە بکات، بەڵام نەیکات و دڵی خۆی لەسەر نەچەسپێنێ.

٨- لە ئەبوو سەعیدی خودرییەوە رضي الله عنه گێڕدراوەتەوە گوتوویەتی: **(اللَّمَمُ: هي النَّظْرَةُ والغَمْزَةُ والقُبْلَةُ)**، خاوەنی **(إعراب القرآن)**[1] هێناویەتی، لێرەدا ئەبوو سەعیدی خودریی

---

(١) ج٩، ص٣٥٩.

ﷺ، چەند نموونەیەکمان لە (لـمَم) بۆ دێنێتەوەو دەڵێ: بریتیە لە تەماشاکردنی بە حەرامیی و چاو لێ داگرتن و ماچ کردن، ئەوانە ئەو گوناهە بچووکانەن کە ئەوانەی چاکەکارن، ئەگەر خۆشیان پێ لەووردە گوناهانە نەپارێزرێ، خوا ﷻ پاداشتیان بە پاداشتی هەرە باش دەداتەوە، مادام خۆیان لە گوناهە زل و ناقۆڵایەکان بپارێزن.

**٩- (عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﷺ فِي قَوْلِهِ تَعَالَى: (إِلاَّ اللَّمَم) قال: هو الرجل يُلِمُّ بالفاحشة ثم يتوب عنها) أخرجه الترمذي: ٣٢٨٤ والحاكم: ٣٧٥٠.**

واتە: (اللّمم) بریتیە لەوەی پیاوێک جارێک گوناهیک بکات، دوایی بگەڕێتەوە.

ئەگەر بمانەوێ لەو نۆ ڕایەش شتێک هەڵێنجین، ئەوەیە کە خوا دەفەرموێ: ئەوانەی خۆیان دەپارێزن لە گوناهە گەورەکان و گوناهە ناشیرین و ناقۆڵایەکان (**إِلاَّ اللَّمَمُ**)، کەواتە: ئەو گوناهانەی خۆیانیان بۆ لێ ناپارێزرێن، نە گەورەن و نە زۆر ناشیرین و ناقۆڵاشن، ئنجا وەک ئەبوو سەعیدی خودریی ﷺ گوتوویەتی: ڕوانینی حەرام یەکێک لەوانەیە، هەروەها سەرجەم ئەو شتانەی دیکە کە دەچنە ئەو بازنەیەوەو، گوناهی بچووکیش پێناسەیەکی باشە بۆ ئەوە، خواش ﷻ لە سووڕەتی (النساء)دا، دەفەرموێ: ﴿إِن تَجْتَنِبُوا۟ كَبَآئِرَ مَا تُنْهَوْنَ عَنْهُ نُكَفِّرْ عَنكُمْ سَيِّـَٔاتِكُمْ ﴿٣١﴾﴾، ئەگەر خۆتان لەو گوناهە گەورانە بپارێزن، کە لێتان قەدەغە کراون، خراپەکانتان لێ دەسڕینەوە، کەواتە: (**سَيِّئَات**)و (**اللَّمَمُ**) یەک دەگرنەوە (**سَيِّئَات**)، یانی: ئەو خراپانەی وانین سزای دنیایی، یان هەڕەشەی قیامەتییان لەسەر بێ و، بە گەورە لە ڕووی ئەندازەوەو، بە ناقۆڵاو ناشیرین لە ڕووی دیمەنەوە، دانانرێن، کەواتە: لە خوار وانەوەن، هەروەک چۆن (**اللَّمَمُ**)یش لە گوناهە گەورەو دزێوەکان جیان.

٥)- ﴿إِنَّ رَبَّكَ وَٰسِعُ ٱلْمَغْفِرَةِ﴾، بە دڵنیایی پەروەردگارت لێبوردنی فراوانە، واتە: لێبوردنەکەی هێندە فراوانە، جێی هەموو ئەو گوناهو تاوانانەی تێدا دەبێتەوە، کە خاوەنەکانیان لێیان پەشێمان دەبنەوەو دەستیان لێ هەڵدەگرن.

www.alibapir.com


٦)- ﴿هُوَ أَعْلَمُ بِكُمْ﴾، خوا بە ئێوە زاناترە.

٧)- ﴿إِذْ أَنشَأَكُم مِّنَ الْأَرْضِ وَإِذْ أَنتُمْ أَجِنَّةٌ فِي بُطُونِ أُمَّهَاتِكُمْ﴾، کاتێک ئێوەی لە زەوی دا پێگەیاندوەو، کاتێک کە ئێوە کۆرپەلە بوون لە سکی دایکتاندا، واتە: هەر لە سەرەتاوە تاکو نێو سکی دایکتان، خوا پێتان زاناتر بووەو دواتریش، بەڵام بۆچی ئەو دووحاڵەتەی فەرموون؟ چونکە بەر لەوەی مرۆڤ ببێتە نوتفەش، خوا ﷽ کاتێک کە لە شێوەی گەردیلان دا بووە، ئەو گەردیلانەی دوایی گەرد (**جُزَيْء** - molcol) پێک دێنن، دوایی خانەی زیندوویان لێ پێک دێ، پاشان دەبن بە خواردن و خۆراک و دوایی دەبن بە خوێن، دوایی دەبن بە تۆو (**منيٌّ**) هی پیاوو ئافرەت، خوا قۆناغ بە قۆناغ پێتان ئاگادار بووە، بۆیەش وشەی (**إِنْشَاء**)ی، بەکارهێناوە: ﴿هُوَ أَعْلَمُ بِكُمْ إِذْ أَنشَأَكُم﴾، چونکە (**إِنْشَاء وَتَنْشِئة**)، بریتیە لە پێگەیاندن و دروستکردنی شتێک پلە پلە، لەو کاتەوە خوا پێتان زانا بووە: ﴿وَإِذْ أَنتُمْ أَجِنَّةٌ فِي بُطُونِ أُمَّهَاتِكُمْ﴾، هەروەها لە کاتێکدا ئێوە کۆرپەلە بوون لەسکی دایکتاندا، خوا پێتان زاناترو شارەزاتر بووە، (**جَنِيْن**)، کە کۆیەکەی (**أَجِنَّة**) یە: (**الوَلَدُ مَا دَامَ فِي الرَّحِمِ، وُهَو فَعِيلٌ بِمَعْنى مَفْعُولٍ**)، (**جَنِيْن**) لەسەر کێشی (**فَعِيْل**)ە، بەڵام بە مانای (**مَفْعُول**)ە، بە منداڵ دەگوترێ هەتا لە نێو منداڵدانی دایکیدا بێ.

خوا ئەمەی بۆیە فەرمووە تاکو ئەوەی لەسەر بینا بکات، کە دەفەرموێ:

٨)- ﴿فَلَا تُزَكُّوا أَنفُسَكُمْ﴾، کەواتە: (بە قسەی زار) خۆتان پەسند مەکەن، پەسندیی خۆتان دەرمەبڕن، پاکیی پاڵ مەدەنە لای خۆتان، خۆتان پێ پاک و چاک نەبێ.

٩)- ﴿هُوَ أَعْلَمُ بِمَنِ اتَّقَىٰ﴾، خوا زاناترە بەوکەسەی پارێزی کردوە، کەواتە: بە هۆی پارێز کردنەوە تەزکیە پەیدا دەبێ و، بەهۆی تەزکیەی نەفسیشەوە پارێز لە خوا کردن پەیدادەبێ و، لە ڕاستییدا ئەو دووانە تێکهەڵکێشن، ئینسان تاکو زیاتر لەگەڵ خۆیدا خەریک بێ و، خۆی پاک و چاک بکات، زیاتر شایستە دەبێ کە خەسڵەتی تەقوای تێدا بێتەدی و، هەتا زیاتریش پارێز بکات، نەفسی پاک و چاکتر دەبێ، پاک دەبێتەوە لە خراپەکان و، دەڕازێتەوە بە چاکەکان.

کـە دەفەرمـوێ: ﴿هُوَ أَعۡلَمُ بِمَنِ ٱتَّقَىٰٓ﴾، ئەمـە پاسـاو هێنانەوەیـە بـۆ ڕێگرتـن لـە خۆپەسـند کـردن، واتـە: مـادام خـوا زاناتـرە بـەوەی کـێ پارێـزی کـردوە؟ تەقـواش حاڵەتێکـی پەنهانـەو لـە دڵ و سـینەی مرۆڤدا، سـەقامگیر دەبـێ، بەڵام شـوێنەوارەکانی دەردەکـەون، وەک پێغەمبـەر ﷺ سـێ جـاران ئاماژەی بـۆ سـینەی موبارەکی کردووەو فەرموویـەتی: (**التَّقْـوَى هَـا هُنَـا، التَّقْـوَى هَـا هُنَـا، التَّقْـوَى هَـا هُنَـا**)، (**أخرجـه أحمـد: ٧٧١، ومسـلم: ٢٥٦٤**)، تەقـوا لێرەدایـە، تەقـوا لێرەدایـە، تەقـوا لێرەدایـە. واتـە: ڕیشـەو بنکی تەقـوا لـە دڵ و دەروونی مرۆڤدایـە، بـەڵام دوایـی شـوێنەوارەکانی لەسـەر جەسـتەی مـرۆڤ دەردەکـەون، ئنجـا هـەر خـوا دەزانـێ چـی لـە دڵ و سـینەی مرۆڤەکانـدا هەیـە، بۆیـە نابـێ کـەس لافـی پارێزکاربـوون لـێ بـدات، هەروەهـا نابـێ هیـچ کـەس لافـی ئـەوە لـێ بـدات، کـە پـاک و چاکـە.

لە ڕێگەی کۆمەڵایەتییەکان لەگەڵتانین
Stay in touch on social media
نحن معكم عبر مواقع التواصل الاجتماعي
ڕاگەیاندنی مەکتەبی مامۆستا عەلی باپیر
عەلی باپیر/AliBapir
archive.org/details/@alibapir
عەلی باپیر/AliBapir
AliBapir
کەناڵی ڕاگەیاندنی مەکتەبی مامۆستا عەلی باپیر
www.alibapir.net
عربي - کوردی - English
ڕاگەیاندنی مەکتەبی مامۆستا عەلی باپیر

## کورتە باسێک لەبارەی خۆ یان خەڵک بە پاک و چاک دانانەوە

سەرەتا با چەند دەقێکی سوونەت بێنینەوە، کە تیشکی زیاتر دەخەنە سەر چەمک و واتای ئەو دوو ئایەتە موبارەکەی ژمارە: (٣١ و ٣٢)، کە باسی زاناتربوونی خوا بە پارێزکاران و، قەدەغە بوونی خۆ پێ پاک و چاکبوون، دەکەن:

**١-** پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: **{إِنَّ اللهَ كَتَبَ عَلَى ابْنِ آدَمَ حَظَّهُ مِنَ الزِّنَا أَدْرَكَ ذَلِكَ، لاَ مَحَالَةَ: فَزِنَا الْعَيْنِ النَّظَرُ، وَزِنَا اللِّسَانِ الْمَنْطِقُ، وَالنَّفْسُ تَتَمَنَّى وَتَشْتَهِي، وَالْفَرْجُ يُصَدِّقُ ذَلِكَ أَوَ يُكَذِّبُهُ} (أخرجه أحمد: ٨٩١٩، والبخاري: ٦٢٣٨، ومسلم: ٢٦٥٧، وأبو داود:٢١٥٢).**

واتە: بێگومان خوا پشک و بەشی خۆی لە زینا لەسەر ڕۆڵەی ئادەم نوسیوە، هیچ چاری نیە، تووشی پشک و بەشێک دەبێ: زینای چاو بریتیە لە ڕوانین (ڕوانینی حەڕام)و، زینای زمان بریتیە لە قسەکردن (قسەکردنی حەڕام)، نەفسیش ئەوە دەخوازێ و ئارەزووی دەکات، داوێنیش ئەوە بەڕاست دەگێڕێ، یاخود بە درۆی دەگێڕێ.

کەواتە: ڕوانینی حەڕام، هەروەها قسەکردنی حەڕام، {هەروەها خەڵوەتی حەڕام، واتە: بە تەنیاو لە شوێنی چۆڵدا، ئافرەتێک و پیاوێکی نامەحرەم پێکەوە بوون}[1]، ئەوانە هەموویان پێشەکیی و زەمینە خۆشکەرن بۆ زینا.

ئنجا کە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: خوا لەسەر ڕۆڵەی ئادەم پشک و بەشی خۆی لە زینا هەر بۆ نووسیوە، واتە: ئەمانە دەبنە پێشەکیی و زەمینە خۆشکەر بۆ زینا، ئەگەرنا بەدڵنیایی ئەوانە بە زینا دانانرێن، بەڵام لەبەر ئەوەی بە زۆریی ئەوانەی زینا دەکەن، لە ڕوانینی حەڕامەوە، پاشان لە قسەکردنی

---

(١) وەک لە دەقی دیکەی سوونەت دا هاتوە: {لَا يَخْلُوَنَّ أَحَدُكُمْ بِامْرَأَةٍ ، فَإِنَّ الشَّيْطَانَ ثَالِثُهُمَا} أخرجه أحمد: ١٤٦٩٢، تعليق شعيب الأرنؤوط: صحيح رجاله ثقات رجال الشيخين.

www.alibapir.com


حەڕامەوە، دوایی لە جێژوان دانانی حەڕامەوەو لە پێکگەیشتنی حەڕامەوەو، لە تێکەڵیی حەڕامەوە، تووشی دەبن، بۆیە وایفەرمووە.

**٢-** دەقێکی دیکەش لە بارەی لەمەمەوە دێنین: {**عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ** رضي الله عنهما **فِي قَوْلِهِ تَعَالَى:** ﴿إِلَّا ٱللَّمَمَ﴾، **قَالَ: هُوَ الرَّجُلُ يُلِمُّ بِالْفَاحِشَةِ، ثُمَّ يَتُوبُ مِنْهَا، وَقَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ** ﷺ: **إِنْ تَغْفِرِ اللَّهُمَّ تَغْفِرْ جَمًّا، وَأَيُّ عَبْدٍ لَكَ لا أَلَمَّا**} **(أخرجه الترمذي: ٣٢٨٤، وقال: حسن صحيح غريب، والحاكم: ٣٧٥٠، وَقَالَ: صَحِيحٌ عَلَى شَرْطِ الشَّيْخَيْنِ، والبيهقي في شعب الإيمان: ٢٠٥٣٥، وَصَحَّحَهُ الألباني في «صحيح الترمذي»: ٢٦١٧)**.

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس رضي الله عنهما، دەڵێ: لە بارەی فەرمایشتی خواوە کە دەفەرموێ: ﴿إِلَّا ٱللَّمَمَ﴾، بریتیە لە پیاوێک کە جارێک گوناهێک دەکات، بەڵام دوایی لێی پەشێمان دەبێتەوەو دەگەڕێتەوە.

بەڵام پێویستە ئەوە بزانرێ کە دەڵێ: دوایی پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: (**إِنْ تَغْفِرِ اللَّهُمَّ تَغْفِرْ جَمًّا، وَأَيُّ عَبْدٍ لَكَ مَا أَلَمَّا**)، ئەی خوایە! ئەگەر تۆ لێ ببووری، بە گشتیی لێ دەبووری {واتە: لێبوردنی تۆ زۆر گەورەیە (**جم**)، یانی: گەورەو فراوان}و چ بەندەیەکی تۆ هەیە، تووشی لەمەم نەبووبێ، واتە: تووشی گوناهێکی بچووک نەبوو بێ، تووشی هەڵەنگوتن و ساتمەبردنێک و لادانێک، یان خەتەرەیەکی خراپ بەسەر دڵدا هاتن، نەبووبێ.

بەڵام ئەم شیعرە هی پێغەمبەری خوا نیەو خۆی نەیفەرمووە، بەڵکو شیعری (**أمية بن أبي صلت**)ە، وەک (**لِسَان العَرَب**)، لە بێژەی (**لمم**)دا هێناویەتی، کەواتە: پێغەمبەری خوا ﷺ جاری واش هەبووە، شیعری شاعیرێکی هێناوەتەوە، ئەگەر مانایەکەی پێ ڕاست بوو بێ، هەروەک لە مەقامێکی دیکەدا شیعرێکی لەبیدی کوڕی ڕەبیعەی هێناوە:

{**عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ** رضي الله عنه **، أَنَّ رَسُوْلَ اللهِ** ﷺ **قَالَ: إِنَّ أَصْدَقَ بَيْتٍ قَالَهُ شَاعِرٌ: أَلَا كُلُّ شَيْءٍ مَا خَلَا اللهَ بَاطِلٌ**} **(أخرجه أحمد: ١٠٠٧٦، والبخاري: ٣٦٢٨، ومسلم: ٢٢٥٦،**

www.alibapir.com


وابن ماجه: ٣٧٥٧)، واته: ئەبوو هورەیرە (رضي الله عنه) دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: ئەوە ڕاستترین قسەیە شاعیرێک گوتبێتی: ئاگاداربن! هەموو شتێک جگە لە خوا پووچەو بۆشە....

٣- {عَنْ زَيْنَب بِنْتِ أَبِي سَلَمَةَ (رضي الله عنها)، أَنَّهَا سُمِّيَتْ بَرَّةَ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ): «لَا تُزَكُّوا أَنْفُسَكُمْ، اللَّهُ أَعْلَمُ بِأَهْلِ الْبِرِّ مِنْكُمْ، سَمُّوهَا زَيْنَبَ}، (أخرجه مسلم: ١٦٨٨، وأبو داود: ٤٩٥٣)،

لە زەینەبی کچی ئەبی سەلەمەوە هێناویانە {زەینەبی کچی ئەبی سەلەمە (رضي الله عنها)، کچی ئوممو سەلەمەشە کە هاوسەری بەڕێزی پێغەمبەر (ﷺ) بووە، بەڵام دوای کۆچی دوایی ئەبوو سەلەمە شووی کردۆتەوە بە پێغەمبەر (ﷺ)} گێڕاویەتەوە کە ناوی لێنراوە: (برّة) {یانی: چاک، چاکەکار}، پێغەمبەری خواش (ﷺ) فەرموویەتی: خۆتان پەسەند مەکەن و خۆتان پێ چاک نەبێ، خوا دەزانێ لە ئێوە کێ چاکەکارە، ناوی لێ بنێن زەینەب، بچووک بووەو پێغەمبەری خوا (ﷺ) ناوەکەی لێ گۆڕیوە لە (برّة)ەوە بۆ زەینەب.

٤- دەقی چوارەم کە لەو بارەوە دەیهێنین: {عَنْ أُمِّ عَطِيَّةَ رَضِيَ اللهُ عَنْهَا، حِيْنَ مَاتَ عُثْمانُ بْنُ مَظْعُونٍ فِـي بَيْتِها، ودَخَلَ عَلَيْهِ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ)، فَقالَتْ أُمُّ عَطِيَّةَ: رَحْمَةُ اللَّهِ عَلَيْكَ أَبَا السَّائِبِ «كُنْيَةُ عُثْمانَ بْنِ مَظْعُونٍ» فَشَهادَتِي عَلَيْكَ، لَقَدْ أَكْرَمَكَ اللَّهُ، فَقالَ لَها رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ): وَمَا يُدْرِيكِ أَنَّ اللَّهَ أَكْرَمَهُ؟ فَقالَتْ: إذا لَمْ يُكْرِمْهُ اللَّهُ فَمَن يُكْرِمُهُ اللَّهُ؟ فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) أَمَّا هُوَ فَقَدْ جاءَهُ اليَقِينُ، وَإِنِّي لَأَرْجُو لَهُ الخَيْرَ، وإِنِّي وَاللَّهِ مَا أَدْرِي وَأَنَا رَسُولُ اللَّهِ، مَا يُفْعَلُ بِي! قالَتْ أُمُّ عَطِيَّةَ: فَلا أُزَكِّي أَحَدًا بَعْدَ مَا سَمِعْتُ هَذا مِن رَسُولِ اللَّهِ (ﷺ)} (أخرجه أحمد: ٢٧٤٩٧، والبخاري: ١١٨٦).

واتە: ئوممو عەتییە (خوا لێی ڕازی بێ) دەڵێ: کاتێک عوسمانی کوڕی مەزعوون {کە یەکێک بووە لە هاوەڵانی بەڕێزی پێغەمبەر (ﷺ) و زۆر پیاوێکی خوا پەرست و دنیا بە کەمگربووە} لە ماڵەکەی ئەودا {لە ماڵی ئوممو عەتییەدا} کۆچی دوایی کردوە، پێغەمبەری خوا (ﷺ) لە ئوممو عەتییە وەژوور کەوت {کە

www.alibapir.com


جەنازەکەشی لەوێ بووە} ئوممو عەتییە گوتی: خوا بەزەیی پێتدا بێ، ئەی ئەبا سائیب، {ئەبا سائیب کونیەی عوسمانی کوڕی مەزعوونە، کوڕێکی هەبووە ناوی سائیب بووە} من شایەدییت بۆ دەدەم کە خوا ڕێزی لێگرتووی، پێغەمبەر ﷺ بە ئوممو عەتییەی فەرموو: چووزانی خوا ڕێزی لێگرتوە؟ ئەویش گوتی: ئەگەر خوا ڕێز لەو نەگرێ، ئایا ڕێز لە کێ دەگرێ، (دیارە زۆر بە ئینسانی باشی هاتۆتە بەرچاو، هەرواش بووە)، پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمووی: ئەو مردنی بۆ هات و من خێرو چاکەی بۆ بە ئومێد دەخوازم، بەڵام سوێند بە خوا من کە پێغەمبەری خوام، نازانم چیم لێ دەکرێ؟ ئوممو عەتییە گوتی: دوای ئەوەی ئەوەم لە پێغەمبەری خوا بیست، لەمەودوا هەرگیز هیچ کەس تەزکیە ناکەم {بەو شێوەیە کە مەدحێکی بکەم، بە نسبەت لای خواوە، لەبەر ئەوەی پەنهانە}.

هەڵبەتە پێغەمبەری خوا ﷺ دەرسێکی باشی داوەتە مسوڵمانان، لە ڕێی ڕەخنەگرتنیەوە لە ئوممو عەتییە، کە هەر لە خۆڕا وەک وەکیلی خوا، قسە نەکەن، چونکە بە نسبەت لای خوای پەروەردگارەوە دەتوانی بڵێی: گومانەکەم وایەو ئومێدم وایە، بەڵام بڵێی: شایەدیی دەدەم تۆ خوا ڕێزی لێگرتووی، ئەوە پێویستیی بەوە دەکات مرۆڤ پەنهان و نادیار (غیب) بزانێ، بەدڵنیاییش هیچ کەس غەیب نازانێ، بۆیە زانایان وەک ئەدەبێکی بەرزی ئیسلامیان داناوە کە مرۆڤ دەبێ خۆی بپارێزێ، لە بە چاک دانانی خەڵک و خۆ بە چاک دانان، بۆ بە چاک دانانی خەڵک و مەدح کردنیان بەنسبەت لای خواوە بسم الله الرحمن الرحيم، دەتوانی بڵێی: پێم وایە بەو شێوەیە، بەڵام من بە پاک و چاکی دانانێم، وەک تەعبیرێک بە عەرەبیی دەڵێ: (**أَحْسَبُهُ كَذَلِكَ، وَلاَ أُزَكِّي عَلَى اللَّهِ أَحَدًا**)، کە هەر ڕەنگە لەو تەعبیرەی ئوممو عەتییە وەریانگرتبێ: (**فَلاَ أُزَكِّي أَحَدًا بَعْدَ مَا سَمِعْتُ هَذَا مِنْ رَسُولِ اللَّهِ** ﷺ).

ئنجا بۆ بە پاک و چاک دانانی خەڵک بە نسبەت لای خواوە نا، بە نسبەت قیامەتەوە، بەڵکو بە نسبەت ژیانی دنیاوە، چەند حاڵەتێک لەو بنەمایە هەڵاوێردراون:

١- بە پاک و چاک دانانی شایەدان، کەسێک شایەدیی بدات لە بارەی شتێکەوە، دروستە یەکێکی دیکە لە بارەیەوە بڵێ: ئاگادارم کە مرۆڤێکی ڕاستگۆیەو ئەمینەو ...هتد، چونکە پێویست بەوە دەکات، بناسرێ: ئایا ئەو کەسە بە کەڵکی شایەدیی دێ و شایەدیی لێ وەردەگیرێ، یان نا؟

٢- هەروەها گێڕەرەو (**راوي**)ەکان، کە فەرمایشتەکانی پێغەمبەریان ﷺ نەقڵ کردوون، بۆیەش زانایان باسیان کردوون و، زانستێکی تایبەتیان داناوە بە ناوی (**علم الجرح والتعديل**) زانیاری بریندارکردن و بە چاک دانان، دروستە بگوترێ: فڵانکەس مرۆڤێکی ڕاستگۆیە ئاواو ئاوایە، بەڵام جار جار شتی لە بیر چووە، ئنجا بەپێی وەسفی ڕاوییەکانیش، دەقەکانی سوننەت لە ڕووی ڕیوایەتەوە، پلەیان بۆ دانراوە، ئایا ئەو دەقە بە موتەواتیر دانراوە، ئەگەر گێڕەوەکان زۆر بووبن و هەموویان ڕاستگۆو متمانە پێ کراو بووبن، یاخود بە ڕاست (**صحيح**) دادەنرێ، یان بە چاک (**حسن**) دادەنرێ، یان بە بێهێز (**ضعيف**) دادەنرێ، یان بەهەڵبەستراو (**موضوع**) دادەنرێ؟ بەپێی سرووشتی دەقەکەو نێوەڕۆکی و شێوەی گێڕەرەوەکانی دەقەکانی سوننەت، پلە بەندییان بۆ دادەنرێ.

٣- هەروەها حاڵەتێکی دیکە، بریتیە لە تەزکیە کردنی بابای فەرماندە یاخود پێشەواو حوکمڕان، بۆ هەندێک لە وانەی بە دەوریەوەن و کاربەدەستان، بۆی هەیە بڵێ: فڵانکەس بە کەڵکی فڵان کارە دێ و، فیسارکەس کەسێکی وایە، تاکو خەڵک متمانەی پێ بکەن و کارەکەی بۆ بڕواو وەک خۆی بیناسن.

٤- هەروەها کاتێک چەسپاندنی هەقێک، یاخود لابردنی ناهەقێک و ستەمێک، پەکی لەسەر ئەوە کەوت، دروستە مرۆڤ قسەی خۆی بکات و بڵێ: ئەو شتە وایە یان وانیە، ئەو کەسە چاکە یان خراپە، دروستە بۆ ئەو مەبەستەش هەم بە باری چاکەدا باس بکرێ، هەم بە باری خراپەو کەم و کوڕییەکانیدا باس بکرێ، بۆ ئەوەی خەڵک وەک خۆی بیناسێ.

ئـەم چەنـد حاڵەتـە هەڵاوێـردراون لـە بنەمـای: بـە چـاک دانـان، یـان زەم کـردنی خەڵـک، ئەگەرنـا بـە گشـتیی دەبـێ مـرۆڤ خـۆی بپارێـزێ لـە مـەدح کـردن و پێـدا هەڵگوتنـی خەڵـک، یـان زەمکـردن و شـکاندنیان، مەگـەر بەرژەوەندییەکـی شـەرعیی یەکـی لەسـەر ئـەوە کەوتبـێ، یـان باسـکردنی مافێکـی خـۆی کـە پێویسـت بـێ لـەو مەقامـەدا بخرێتـەڕوو.

لێـرەدا کۆتایـی بـەم دەرسـەمان، دێنیـن، خـوا بـە لوتـف و کەرەمـی خـۆی وامـان لـێ بـکات کـە بـە کـردەوە خۆمـان پـاک و چـاک بکەیـن، بـەڵام بـە قسـە خۆپەسـند نەبیـن و خۆمـان پەسـند نەکەیـن، خـوا بـە لوتـف و کەرەمـی خـۆی وامـان لـێ بـکات، لـەلای خـوا چـاک بیـن و لـەلای خەڵـک چـاک بیـن، بـەڵام لـە لای خۆمـان و لـە دەروونـی خۆمانـدا، خۆمـان پـێ خـراپ و گوناهبـار بـێ، تاکـو ئـەوە ببێتـە هاندەرمـان بـۆ زیاتـر خـۆ پـاک و چاککـردن و، باشـتر لـە خـواوە نیزیـک کەوتـن.

سُبحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ، أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إلاَّ أَنْتَ، أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ.

www.alibapir.com


## پێناسەی ئەم دەرسە

ئـەم دەرسـەمان لـە سی (٣٠) ئایـەتی کۆتایـی سـوورەتی (**النجـم**)، پێـک دێ، ئایەتـەکانی: (٣١ - ٦٢)، کـە تـەوەری سـەرەکییان باسـی جـۆرە کەسـێکی تایبەتـە، یـان کەسـێکی دیارییکـراو، کـە پشـتی کردۆتـە خـواو بەرنامەکـەی و، دوای بەخشـینێکی کـەم، وازیهێنـاوەو وەسـتاوە! خـوای دادگەریـش سەرزەنشـتی دەکات و، بـە سـەر کۆنـە کردنـەوە دەفەرمـوێ: ئایا ئـەو کەسـە نادیـار دەزانـێ؟ یـان ئایا بـەو ڕاسـتییانە هەواڵـی پـێ نـەدراوە، کـە لـە لاپـەڕەکانی مووسـاو ئیبڕاهیـم (**عَلَيْهـما الصَّلاةُ وَالسَّـلاَم**) دان؟ کـە سـەرجەم دوازدە ڕاسـتیین و بریتیـن لـە:

١- کەس گوناهی کەس هەڵناگرێ.

٢- مرۆڤ جگە لە کۆششی خۆی، خاوەنی هیچ شتێک نیە، واتە: وەک ماف و خاوەندارێتیی تەنیا خاوەنی بەرهەم و کۆششی خۆیەتی.

٣- مرۆڤ کۆششەکەی دەبینێتەوە، واتە: بەرهەمەکەی دەبینێتەوە، چاک، یان خراپ، بێ.

٤- مرۆڤ پاداشتی هەرە تەواوی دەدرێتەوە، ئەگەر چاکەی کردبێ.

٥- کۆتایی کارەکان بۆ لای خوایە بسم الله الرحمن الرحيم.

٦- خوا مرۆڤی پێکەناندوەو گریاندوە، واتە: خوا هەردووک سیفەتی پێکەنین و گریانی لە مرۆڤدا داناون و تایبەتیشن بە مرۆڤەوە.

٧- تەنیا خوا بسم الله الرحمن الرحيم دەژیەنێ و دەمرێنێ.

٨- بەس خوا بسم الله الرحمن الرحيم نێرو مێ، جووت، دروست دەکات.

٩-تەنیاخواش بسم الله الرحمن الرحيم جارێکی دیکە دروستیان دەکاتەوە،واتە:دوای مردنیان،ژیانیان بۆ دەگێڕێتەوە.

**١٠-** تەنیا خوا خەڵک دەوڵەمەندو خاوەندار دەکات، واتە: کەسێک خوا بیەوێ دەوڵەمەندی دەکات و، دەیکاتە خاوەنی کەل و پەل و شمەک و سەروەت و سامان.

**١١-** خوا خۆی خاوەن و سەرپەرشتیاری ئەستێرەی گەلاوێژە (**شِعرَى**) بە عەرەبیی.

**١٢-** هەروەها خوا هەر کام لە گەلەکانی عادو **ثە**موودو گەلی نووح و گەلی لوو**طی** سزا داون.

ئەمانە ئەو دوازدە ڕاستییەن، کە لە لاپەڕەکانی مووساو ئیبڕاهیمیشدا هاتوون و، مەرج نیە تەنیا ئەو دوازدە ڕاستییەشیان تێدا هاتبن، وەک دوایی باسی دەکەین.

لە کۆتاییشدا خوا بە پرسیار کردنی نکووڵیلێکەرانەوە ڕوو دەکاتە مرۆڤ، کە بە کام لە چاکەکانی خواو، لە بارەی کام لە چاکەکانی خواوە، مشتومڕ دەکەی و نایسەلمێنی؟ دواییش خوا ﷻ ڕایدەگەیەنێ کە ئەم قوڕئانە، یان پێغەمبەریش ﷺ هەر لە شێوەی وریا کەرەوەکانی پێشوویە، واتە: عادەتی خوا وابووە کە وریاکەرەوەو ترسێنەر بۆ مرۆڤەکان بنێرێ، لە دوو توێی پەیامەکانیداو، لە ڕێی پێغەمبەرەکانیەوە (**عَلَيْهِمُ الصَّلَاةُ وَالسَّلَامُ**)، ئنجا باسی نیزیک کەوتنەوەی قیامەت دەکات و، بە نکووڵییلێکردنەوە دەپرسێ: ئایا ئەم قسەیەتان پێ سەیرەو پێدەکەنن و ناگرین، لە حاڵێکدا کە بێئاگان؟! دواجار پێیان دەفەرموێ: کڕنووش بۆ خوا بەرن و بیپەرستن، ئەگەر دەتانەوێ لەو نەهامەتییەی لە ڕۆژی دواییدا چاوەڕێتان دەکات، دەربازبن.

لە تۆڕە کۆمەڵایەتییەکان لەگەڵتانین
Stay in touch on social media
نحن معكم عبر مواقع التواصل الاجتماعي
ڕاگەیاندنی مەکتەبی مامۆستا عەلی باپیر
AliBapir/عەلی باپیر
archive.org/details/@alibapir
AliBapir/عەلی باپیر
AliBapir
Google Play
App Store
www.alibapir.net
عربي - كوردی - English
کەناڵی
ڕاگەیاندنی مەکتەبی مامۆستا عەلی باپیر
ڕاگەیاندنی مەکتەبی مامۆستا عەلی باپیر

www.alibapir.com



﴿ أَفَرَءَيْتَ ٱلَّذِى تَوَلَّىٰ ﴿٣٣﴾ وَأَعْطَىٰ قَلِيلًا وَأَكْدَىٰٓ ﴿٣٤﴾ أَعِندَهُۥ عِلْمُ ٱلْغَيْبِ فَهُوَ يَرَىٰٓ ﴿٣٥﴾ أَمْ لَمْ يُنَبَّأْ بِمَا فِى صُحُفِ مُوسَىٰ ﴿٣٦﴾ وَإِبْرَٰهِيمَ ٱلَّذِى وَفَّىٰٓ ﴿٣٧﴾ أَلَّا تَزِرُ وَازِرَةٌ وِزْرَ أُخْرَىٰ ﴿٣٨﴾ وَأَن لَّيْسَ لِلْإِنسَٰنِ إِلَّا مَا سَعَىٰ ﴿٣٩﴾ وَأَنَّ سَعْيَهُۥ سَوْفَ يُرَىٰ ﴿٤٠﴾ ثُمَّ يُجْزَىٰهُ ٱلْجَزَآءَ ٱلْأَوْفَىٰ ﴿٤١﴾ وَأَنَّ إِلَىٰ رَبِّكَ ٱلْمُنتَهَىٰ ﴿٤٢﴾ وَأَنَّهُۥ هُوَ أَضْحَكَ وَأَبْكَىٰ ﴿٤٣﴾ وَأَنَّهُۥ هُوَ أَمَاتَ وَأَحْيَا ﴿٤٤﴾ وَأَنَّهُۥ خَلَقَ ٱلزَّوْجَيْنِ ٱلذَّكَرَ وَٱلْأُنثَىٰ ﴿٤٥﴾ مِن نُّطْفَةٍ إِذَا تُمْنَىٰ ﴿٤٦﴾ وَأَنَّ عَلَيْهِ ٱلنَّشْأَةَ ٱلْأُخْرَىٰ ﴿٤٧﴾ وَأَنَّهُۥ هُوَ أَغْنَىٰ وَأَقْنَىٰ ﴿٤٨﴾ وَأَنَّهُۥ هُوَ رَبُّ ٱلشِّعْرَىٰ ﴿٤٩﴾ وَأَنَّهُۥٓ أَهْلَكَ عَادًا ٱلْأُولَىٰ ﴿٥٠﴾ وَثَمُودَا۟ فَمَآ أَبْقَىٰ ﴿٥١﴾ وَقَوْمَ نُوحٍ مِّن قَبْلُ ۖ إِنَّهُمْ كَانُوا۟ هُمْ أَظْلَمَ وَأَطْغَىٰ ﴿٥٢﴾ وَٱلْمُؤْتَفِكَةَ أَهْوَىٰ ﴿٥٣﴾ فَغَشَّىٰهَا مَا غَشَّىٰ ﴿٥٤﴾ فَبِأَىِّ ءَالَآءِ رَبِّكَ تَتَمَارَىٰ ﴿٥٥﴾ هَٰذَا نَذِيرٌ مِّنَ ٱلنُّذُرِ ٱلْأُولَىٰٓ ﴿٥٦﴾ أَزِفَتِ ٱلْءَازِفَةُ ﴿٥٧﴾ لَيْسَ لَهَا مِن دُونِ ٱللَّهِ كَاشِفَةٌ ﴿٥٨﴾ أَفَمِنْ هَٰذَا ٱلْحَدِيثِ تَعْجَبُونَ ﴿٥٩﴾ وَتَضْحَكُونَ وَلَا تَبْكُونَ ﴿٦٠﴾ وَأَنتُمْ سَٰمِدُونَ ﴿٦١﴾ فَٱسْجُدُوا۟ لِلَّهِ وَٱعْبُدُوا۟ ۩ ﴿٦٢﴾ ﴾.

## مانای دەقاودەقی ئایەتەکان

{ئایا ئەو کەسەت دی، کە (دوای بە ڕێی ڕاست ئاشنا بوون)، پشتی هەڵکرد! ﴿٣٥﴾ کەمێکی بەخشی و چەقی (چرووکیی کرد) ﴿٣٦﴾ ئایا زانیاریی پەنهانی لەلایە، بۆیە ئەو (کاروباری خوا) دەبینێ! ﴿٣٧﴾ یان ئایا لە بارەی ئەو (ڕاستییان)ەوە هەواڵی پێنەدراوە کە لەلاپەڕەکانی مووسادایە ﴿٣٨﴾ هەروەها لە (لاپەڕەکانی) ئیبراهیمدا، ئەو کەسەی بە تەواویی ئەرکی خۆی ئەنجام دا! ﴿٣٩﴾ کە (هیچ کەسێکی) گوناهبار، گوناهی کەسێکی دیکە هەڵناگرێ؟ ﴿٤٠﴾ هەروەها کە مرۆڤ تەنیا (بەرهەمی) کۆشش و تەقەلالای خۆی دەبێتە هی وی؟ ﴿٤١﴾ هەروەها کە لەمەودوا (بەرهەم و پاداشتی) کۆششەکەی دەبینرێ؟ ﴿٤٢﴾ ئنجا پاداشتی هەرە تەواوی دەدرێتەوە ﴿٤٣﴾ هەروەها کە کۆتایی (هەموو شتێک) بەرەو لای پەروەردگارتە ﴿٤٤﴾ هەروەها کە بەس ئەو (خوا) پێدەکەنێنێ و دەگریەنێ ﴿٤٥﴾

هەروەها کە بەس ئەو (خوا) دەمرێنێ و دەژیەنێ ﴿٤٦﴾ هەروەها (ئەو) جووتی نێرو مێی دروستکردوون ﴿٤٧﴾ لە نوتفەیەک کاتێک دەڕژێنرێ (بۆ نێو منداڵدان) ﴿٤٨﴾ هەروەها کە ئەو (خوا) دروستکردنەوەی کۆتایی لەسەرە، هەروەها کە تەنیا ئەو خەڵکی دەوڵەمەندکردووەو خاوەندارکردووە ﴿٤٩﴾ هەروەها کە تەنیا ئەو (خوا) پەروەردگاری (ئەستێرەی) گەلاوێژە ﴿٥٠﴾ هەروەها کە ئەو (خوا) گەلی عادی یەکەمی فەوتاند ﴿٥١﴾ وێڕای گەلی **ثە**موود، ئنجا هیچی لێ نەهێشتن ﴿٥٢﴾ گەلی نووحیشی بەر لەوە (فەوتاند) بە دڵنیایی ئەوان ستەمکارترو، یاخیتریش بوون (لە گەلانی پێشوویان) ﴿٥٣﴾ (ئاوەدانییە) هەڵگێڕاوەکەشی (پاش بەرزکردنەوە) بەردایەوە خوار ﴿٥٤﴾ ئیدی داپۆشی ئەوەی داپۆشی (لەبەردە پێ بەردبارانکراوەکان) ﴿٥٥﴾ ئنجا ئایا لە بارەی کام لە چاکەکانی پەروەردگارتەوە لە دوودڵیی دای؟ ﴿٥٦﴾ ئەمە ترسێنەرو وریاکەرەوەیەکە لە (جۆری) ترسێنەرو هۆشیارکەرەوە پێشووەکان ﴿٥٧﴾ (قیامەتی) نیزیک وەنیزیک کەوت ﴿٥٨﴾ بێجگە لە خوا هیچ لابەرو دوورخەرەوەیەکی نیە ﴿٥٩﴾ ئایا سەرتان لەم قسەیە سوڕدەمێنێ (ئەی بێبڕوایەکان)؟ ﴿٦٠﴾ هەروەها پێدەکەنن و ناگرین؟ ﴿٦٠﴾ لە حاڵێکدا کە خافڵاوو بێ ئاگان؟ ﴿٦١﴾ دەجا (ئەگەر بە تەمای سەرفرازیین) کڕنووش بۆ خوا بەرن و بیپەرستن ﴿٦٢﴾}.

لە تۆڕە کۆمەڵایەتییەکان لەگەڵتانین
Stay in touch on social media
نحن معكم عبر مواقع التواصل الاجتماعي
ڕاگەیاندنی مەکتەبی مامۆستا عەلی باپیر
AliBapir/عەلی باپیر
archive.org/details/@alibapir
AliBapir/عەلی باپیر
AliBapir
Google Play
App Store
www.alibapir.net
کوردی - عربي - English
کەناڵی ڕاگەیاندنی مەکتەبی مامۆستا عەلی باپیر
ڕاگەیاندنی مەکتەبی مامۆستا عەلی باپیر

www.alibapir.com


## شیکردنەوەی هەندێ لە وشەکان

(وَأَكۡدَىٰٓ): دوایی چەقی (الْكُدْيَةُ: صَلَابَةٌ تَكُونُ فِي الْأَرْضِ، يقال: حَفَرَ فَأَكْدَى، وَصَلَ إِلَى الْكُدْيَةِ، وَاسْتُعِيْرَ ذَلِكَ للطَّالِبِ الْمُخْفِقِ وَالْمُعْطِي الْمُقِلِّ)، (كُدْيَة): بە شوێنێکی چەقەن، یاخود بەردێک، شاخێک، دەگوترێ لە زەویداو بە زەحمەت هەڵدەقەنرێ، دەگوترێ: (حَفَرَ فَأَكْدَى)، زەوی هەڵقەند، دوایی گەیشتە چەقەن (كُدْيَة)، واتە: زەوییەکی ڕەقەنی زۆر سەخت، یاخود: پارچە شاخێک، بەردێک، ئەمە خوازراوەتەوە بۆ کەسێک کە بە دوای شتێکدا دەچێ، بەڵام سەرکەوتوو نابێ، هەروەها بۆ کەسێک کە دەبەخشێ، بەڵام دوایی دەست دەگرێتەوە، یاخود کەم دەبەخشێ.

(صُحُفِ): (جَمْعُ صَحِيْفَة: الْمَبْسُوطُ مِنْ كُلِّ شَيء، مَا يُكْتَبُ عَلَيْهَا، وَالجَمْعُ صُحُف، وَصَحَائِف)، (صُحُف) و (صَحَائِف) کۆی (صَحِيْفَة)ن، ئەویش هەر شتێکە ڕاخرا بێ، یان کرابێ، بەڵام لێرەدا مەبەست پێی ئەوەیە کە لەسەری دەنووسرێ، بە کوردیی دەگوترێ: پەڕ، لاپەڕ، پەڕاو، دەفتەر.

(وَفَّىٰٓ): (أي أَوْفَى: تَمَّم العَهْدَ، وَفَّى: بَذَلَ الْمَجْهُودَ فِي جَمِيْعِ مَا طُلِبَ بِهِ)، (وَفَّى): پەیمانەکەی بردە سەر، یاخود کارەکەی بە تەواویی ئەنجامدا، دەگوترێ: (وَفَّى)، هەرچی لێی داواکراوە، توانای خۆی تێدا بەکارهێنا.

(وَازِرَةٌ): (أي نَفْسٌ وَازِرَة)، نەفسێکی گوناهکار (نَفْسٌ آثِمَة، لأنَّ الإِثْمَ حِمْلٌ ثَقِيْلٌ)، لەبەر ئەوەی گوناه بارێکی گرانە، کۆڵێکی قورسە بۆ خاوەنەکەی.

(سَعَىٰ): (السَّعيُ: المَشِيُ السَّرِيْعُ، وَهُوَ دُونَ العَدْوِ، وَيُسْتَعْمَلُ لِلْجِدِّ فِي الأَمْرِ خَيْراً كَانَ، أو شَرًّا)، (سَعِي): ڕۆیشتنێکی خێرا بەڵام نەگاتە ئەندازەی ڕاکردن و غاردان، بەکاریش دەهێنرێ بۆ سووربوون لەسەر کارێک، چاک بێ، یان خراپ.

www.alibapir.com


(ٱلْجَزَآءَ ٱلْأَوْفَىٰ): (الجَـزَاءَ الأَكْمَـل)، پاداشـتی هـەرە چـاک، (الـوَافِي: الَّـذِي بَلَـغَ التَّـمَام)، (وافي) ئـەوەی گەیشـتۆتە كۆتایـی و حاڵـەتی تـەواوی خـۆی.

(ٱلْمُنتَهَىٰ): (مُنْتَهَـى): چاوگـی میمییـە، ﴿ وَأَنَّ إِلَىٰ رَبِّكَ ٱلْمُنتَهَىٰ ﴿٤٢﴾ ﴾، واتـە: پـەروەردگارت كۆتایـی هەمـوو دروسـتكراوەكان و شـوێنی بـۆلا گەڕانەوەیانـە، (مُنْتَهَـى)، یـانی: كۆتایـی هەمـوو كاروبـارەكان.

(تُمْنَىٰ): (أَي: تُقْـذَفُ وَتُصَـبُّ وَتُنْـزَلُ)، (تُمْنَـى): بـە مانـای دەڕژێـنرێ و دادەبەزێـنرێ و دەخرێتـە نێـو، لـە بەرزییـەوە دەخرێتـە نێـو نزمیـی، (تُمْنَـى: تُقَـدَّرُ بِالعِـزَّةِ الإِلَاهِيَّـةِ مَـا لَـمْ يَكُـن مِنْـهُ)، بـە هـۆی عیززەتی خـواوە، ئـەو نوتفەیـە شـتێكی تێـدا دادەنـرێ كـە تێیـدا نەبـووە، كـە بریتیـە لـەوە مرۆڤێكـی پـڕ بـە كراسـی، لـەو نوتفـە بچووكـە پەیدادەبـێ بـە دەسـتەڵاتی بـێ سـنووری خـوا.

(ٱلنَّشْأَةَ): (النَّشْـأُ وَالنَّشْـأَةُ: إِحْـدَاثُ الـشَّيءِ وَتَرْبِيَتُـهُ)، (نَشْـأَ وَنَشْـأَةٌ)، بریتیـە لـە پەیداكـردنی شـتێک و پەروەردەكـردنی و بـە خێوكـردنی و پێگەیانـدنی.

(وَأَقْنَىٰ): (أَعْطَـى مَـا فِيْـهِ القِنْيَـةُ: وَهُـوَ المَالُ المُدَّخَـرُ، وَقِيْـلَ: أَقْنَـى: أَرْضَى)، (أَقْنَى)، واتە: شـتێكی بەخشـی سـامانی پاشـەكەوت كـراوی تێدابـێ، (قنيـة) ماڵـی پاشـەكەوتكراو، هەندێكیـش گوتوویانـە: (أَقْنَـى)، یـانی: (أَرْضَى)، خـوا بەخشـیی بـەو كەسـە، تاكـو ڕازی بوو.

(ٱلشِّعْرَىٰ): (الشِّـعْرَى: نَجْـمٌ، وَتَخْصِيْصُـهُ فِـي قَوْلِـهِ: ﴿ وَأَنَّهُۥ هُوَ رَبُّ ٱلشِّعْرَىٰ ﴾، لِكَوْنِهَـا مَعْبُـودَةً لِقَـوْمٍ)، (شِـعْرَى): ئەسـتێرەیەكە بـە كوردیـی گەلاوێـژی پـێ دەڵێـن، لـە هاوینانـدا كـە ئەسـتێرەی گەلاوێـژ هەڵـدێ، دنیا بـەرەو فێنكیـی دەچـێ، دەگوترێ: گەلاوێـژ ئەنگوتـوە، كـە ئەسـتێرەی گەلاوێـژ دەردەكـەوێ، سـاڵ لـە گەرمیـی هاوینـەوە بـەرەو فێنكیـی پاییـز دەچـێ، لێـرە كـە بـە تایبـەت باسـكراوە: ﴿ وَأَنَّهُۥ هُوَ رَبُّ ٱلشِّعْرَىٰ ﴾، بێگومـان تەنیـا خـوا پـەروەردگاری (شِـعْرَى)یە، لەبـەر ئـەوەی كەسـانێک پەرسـتوویانەو، لەبـەر كۆمەڵێـک تایبەتمەندیـی كـە دوایـی باسـیان

www.alibapir.com


دەکەین، کۆمەڵێک تایبەتمەندیی لە ئەستێرەی گەلاوێژدا هەن، جیای دەکەنەوە لە ئەستێرەکانی دیکە.

(وَٱلْمُؤْتَفِكَةَ): (القَرْيَـة المُؤْتَفِكَـة)، ئاوەدانییە هەڵگێڕدراوەکە، (الإفْكُ: كُلُّ مَصْرُوفٍ عَنِ وَجْهِهِ الَّذِي يَحِقُّ أَنْ يَكُونَ عَلَيْهِ)، (إفْك): بریتییە لە هەر شتێک کە لەو ڕووە ڕاستەی پێویستە لەسەری بێ، لابدرێ، درۆ بۆیە پێی دەگوترێ: (إفْك) لەبەر ئەوەی پێچەوانەی ڕاستییە، (المُؤْتَفِكَةَ: المُنْقَلِبَةُ)، واتە: هەڵگێڕدراوە، (مُؤْتَفِكَة)، ئاوەڵناوی وەصفکراوێکی قرتێندراوە: (القَرْيَةُ المُؤْتَفِكَة)، یان: (المَدِيْنَةُ المُؤْتَفِكَة)، شارە هەڵگێڕدراوەکە، ئاوەدانییە هەڵگێڕدراوەکە.

(أَهْوَىٰ): (أي أَسْقَطَ: رَفَعَهُ فِي الهَوَاءِ وَأَسْقَطَهُ)، بەریدایەوە، بەرزی کردەوە بۆ سەرێ و، دوایی بەریدایەوە.

(ءَالَآءِ): (وَاحِدُهَا: أَلاً وَإِلًى)، (ءَالاَءِ)، بە (ألاً)، و بە (إلًى)، کۆدەکرێتەوە، وەک (أَنَاً وَإِنًى لِوَاحِدِ الآنَاء)، (آنَاء)، کاتەکان، تاکی (آناء)، بریتییە لە (أناً وإنًى)، هەم بە سەری هەمزەکە، هەم بە ژێری، بە هەمان شێوە: (ءَالاَء)یش، تاکەکەی بریتییە لە (ألاً وإلًى)، واتە: یەک نیعمەت، ئەوی دیکەش، یانی: یەک کات.

(تَتَمَارَىٰ): (المِرْيَةُ: التَّرَدُّدُ فِي الأَمْرِ، وَهُوَ أَخَصُّ مِنَ الشَكِّ)، (مِرْيَة): بریتییە لە دڵ لە دڵدان لە کارێکدا کە تایبەتترە لە دوو دڵیی، هەروەها (المُمَارَاةُ: المُحَاجَّةُ فِيْمَا فِيْهِ مِرْيَةٌ)، (مُماراة) بریتییە لە مشتومڕ کردن لە بارەی شتێکەوە دوودڵیی تێدا هەبێ، بۆیە (تَتَمَارَى)، هەندێکیان بە مانای: (تَتَشَكَّكُ)، هێناویانە، واتە: لە بارەی کام لە چاکەکانی پەروەرگارتەوە لە دوو دڵیی دای؟

(ٱلْأَزِفَةُ): ﴿أَزِفَتِ ٱلْأَزِفَةُ﴾، یانی: (دَنَتِ القِيَامَة)، (آزِفَة)، یەکێکە لە ناوەکانی قیامەت، واتە: ڕووداوە نزیکەکە، (أزِفَة)ش، وەصفی وەصفکراوێکی قرتێندراوە، یانی: (الحَادِثَةُ الأزِفَة)، یان (الوَاقِعَة الأزِفَة)، ئەو ڕووداوە، ئەو کارەساتە نیزیکە، ﴿أَزِفَتِ ٱلْأَزِفَةُ﴾ وەنیزیک کەوت ڕووداوە نیزیکەکە، کە مەبەست پێی ڕۆژی دوایییە

www.alibapir.com


بەگشتیی، یان قۆناغی یەکەمیەتی کە ئاخیر زەمانە، یان قۆناغی دووەمیەتی کە قیامەت و زیندووکرانەوەو هەڵسێنرانەوەی مرۆڤەکانە.

(**كَاشِفَةٌ**): (**كَشَفْتُ الثَّوْبَ عَنِ الوَجْهِ وَغَيْرِهِ**)، واتە: پۆشاکەکەم لەسەر دەم و چاوو جگە لەویش لادا. (**وَيُقَالُ: كَشَفَ غَمَّهُ**)، خەمەکەی لابرد، (**وَاسْتُعِيْرَ لِلإِزَالَةِ**)، لێرەدا وشەی (**كَاشِفَة**)، خوازراوەتەوە بۆ لابردن، کەواتە: ﴿لَيْسَ لَهَا مِن دُونِ ٱللَّهِ كَاشِفَةٌ﴾، جگە لە خوا هیچ کەسێک توانای لادان و لابردن و دوور خستنەوەی نیە.

(**سَٰمِدُونَ**): (**سَمَدَ: عَلَى وَرَفَعَ رَأْسَهُ، وَنَصَّبَ صَدْرَهُ، سَمَدَ لَهَا وَسَمَدَ عَنْهُ، سَمَدَ: أي لَهَا وَسَمَدَ عَنْهُ: أي لَهَا عَنْهُ: غَفَلَ وَسَهَا، سَمَّدَهُ: أَلهَاهُ**)، وشەی (**سَامِدُوْن**)، مانا لێکدەرەوانی وشەکانی قورئان بە: (**لَاهُون**) و (**سَاهُون**)، لێکیان داوەتەوە، (**لَاهُون**)، خافڵاوان، (**سَاهُون**)، بێئاگایان، جگە لەو دوو واتایە، (**سَمَدَ**) بە مانای (**عَلَى**)، بەرز بۆوەو، سەری بەرزکردەوەو، سینگی هێنایە پێش، سینگی دەرپەڕاند، هاتوە، (**سَمَدَ**)، بێئاگا بوو، (**سَمَدَ عَنْهُ**)، لێی بێئاگا بوو، (**غَفَلَ وَسَهَا**)، دەگوترێ: (**سَمَّدَهُ: أَلهَاهُ**)، خافڵاندی و بێئاگای کرد.

## هۆی هاتنە خوارەوەی ئایەتەکان

ئەم ئایەتانە، یان باسی کەسێکی دیارییکراو دەکەن، کە لە تەفسیرەکاندا ناویان هێناوەو دوایی باسی دەکەین، یاخود باسی جۆرە کەسێکی تایبەت دەکات، (**الطبري**) لە تەفسیرەکەی خۆی دا[1]، دەڵێ:

{**وَذُكِرَ أَنَّ هَذِهِ الآيَةَ**: ﴿أَفَرَءَيْتَ ٱلَّذِى تَوَلَّىٰ ﴿٣٣﴾ وَأَعْطَىٰ قَلِيلًا وَأَكْدَىٰٓ ﴿٣٤﴾﴾ **نَزَلَتْ فِي الْوَلِيدِ بْنِ الْمُغِيرَةِ مِنْ أَجْلِ أَنَّهُ عَاتَبَهُ بَعْضُ الْمُشْرِكِينَ، وَكَانَ قَدِ اتَّبَعَ رَسُولَ اللَّهِ** ﷺ

---

(١) ج١٥، ص٧٤، ج: ٢٧.

www.alibapir.com

عَلَى دِينِهِ، فَضَمِنَ لَهُ الَّذِي عَاتَبَهُ إِنْ هُوَ أَعْطَاهُ شَيْئاً مِنْ مَالِهِ، وَرَجَعَ إِلَى شِرْكِهِ أَنْ يَتَحَمَّلَ عَنْهُ عَذَابَ الْآخِرَةِ، فَفَعَلَ، فَأَعْطَى الَّذِي عَاتَبَهُ عَلَى ذَلِكَ بَعْضَ مَا كَانَ ضَمِنَ لَهُ، ثُمَّ بَخِلَ عَلَيْهِ وَمَنَعَهُ تَمَامَ مَا ضَمِنَ لَهُ}،

**(الطبري)** ڕەحمەتی خوای لێ بێ، دەڵێ: باسكراوە كە ئەم ئایەتە: ﴿ أَفَرَءَيْتَ ٱلَّذِى تَوَلَّىٰ ﴿٣٣﴾ وَأَعْطَىٰ قَلِيلًا وَأَكْدَىٰٓ ﴿٣٤﴾ ﴾ لە بارەی وەلیدی كوڕی موغیرەوە هاتۆتە خوار، لەبەر ئەوەی هەندێک لە هاوبەش بۆ خوا دانەرەكان سەركۆنەیان كرد، چونكە شوێن پێغەمبەری خوا كەوتبوو، شوێن ئایین و بەرنامەكەی كەوتبوو، بابای سەركۆنەكەری گوتی: من ئۆباڵت بۆ دەكێشم، (گرەنتییت دەدەمێ)، ئەگەر ئەندازەیەک لە ماڵ و سامانی خۆتم بدەیە، بەڵام بگەڕێیەوە بۆ بتپەرستیی و هاوبەش بۆ خوا دانان، من سزاو ئازاری ڕۆژی دواییت بۆ تەحەممول دەكەم {ئەگەر هەبوو، با من لە جیاتی تۆ سزا بدرێم} وەلیدی كوڕی موغیرەش وایكرد، ئنجا ئەندازەیەک لەو ماڵ و سامانەی كە بەڵێنی دابوو، (بە بابای سەركۆنەكەر) پێیدا، بەڵام دوایی چرووكیی كردو تەواوی مافەكەی نەدایە، {كە بەڵێنی پێدابوو، ئەگەر ئەو سزای قیامەتی لە كۆڵ بكاتەوە، ئەویش هەندێ ماڵ و سامانی بداتێ، وەک بەڵا گێڕەوە).

هەروەها ئێمە دوو ڕیوایەتی دیكەشی لێ دێنین:

١- {عَنْ مُجَاهِد فِي قَوْلِهِ: ﴿ وَأَكْدَىٰٓ ﴾ قَالَ: الوَلِيْدُ بْنُ الْمُغِيْرَة أَعْطَى قَلِيْلاً ثُمَّ أَكْدَى} **(أخرجه: الطبري: ٣٢٦٧٦، مرسلاً)**، واتە: لە موجاهیدەوە هاتوە لە بارەی فەرمایشتی خواوە كە دەفەرموێ: ﴿ وَأَكْدَىٰٓ ﴾ گوتوویەتی: وەلیدی كوڕی موغیرە هەندێک لە ماڵی خۆی دا {بەو كەسەی كە گرەنتیی سزادرانی قیامەتی بۆ كرد بوو، كە لە جیاتی ئەو سزا بدرێ} دوایی چەقی {و ئەندازەكە كە بەڵێنی پێدابوو بۆی تەواو نەكرد}.

٢- (قَالَ ابْنُ زَيْدٍ، فِي قَوْلِهِ: ﴿ أَفَرَءَيْتَ ٱلَّذِى تَوَلَّىٰ ﴿٣٣﴾ ﴾، إِلَى قَوْلِهِ: ﴿ أَعِندَهُۥ عِلْمُ ٱلْغَيْبِ فَهُوَ يَرَىٰٓ ﴿٣٥﴾ ﴾، قَالَ: هَذَا رَجُلٌ أَسْلَمَ، فَلَقِيَهُ بَعْضُ مَنْ يُعَيِّرُهُ، فَقَالَ: أَتَرَكْتَ دِيْنَ الْأَشْيَاخِ

www.alibapir.com


وَضَلَّلْتَهُمْ، وَزَعَمْتَ أَنَّهُمْ فِي النَّارِ، كَانَ يَنْبَغِي لَكَ أَنْ تَنْصُرَهُمْ، فَكَيْفَ يُفْعَلُ بِآبَائِكَ؟ فَقَالَ: إِنِّي خَشِيتُ عَذَابَ اللَّهِ، فَقَالَ: أَعْطِنِي شَيْئًا، وَأَنَا أَحْمِلُ كُلَّ عَذَابٍ كَانَ عَلَيْكَ عَنْكَ، فَأَعْطَاهُ شَيْئًا، فَقَالَ زِدْنِي، فَتَعَاسَرَ حَتَّى أَعْطَاهُ شَيْئًا، وَكَتَبَ لَهُ كِتَابًا، وَأَشْهَدَ لَهُ، فَذَلِكَ قَوْلُ اللَّهِ: ﴿ أَفَرَءَيْتَ ٱلَّذِى تَوَلَّىٰ ﴿٣٣﴾ وَأَعْطَىٰ قَلِيلًا وَأَكْدَىٰٓ ﴿٣٤﴾ ﴾، عَاسَرَهُ: ﴿ أَعِندَهُۥ عِلْمُ ٱلْغَيْبِ فَهُوَ يَرَىٰٓ ﴿٣٥﴾ ﴾، نَزَلَتْ فِيهِ هَذِهِ الْآيَةُ). (اخرجه: الطبري: ٣٢٦٧٧، وإسناده مرسل، الإستيعاب في بيان الأسباب: ج٣، ص٢٩٩، قلنا: وسندهُ ضَعِيفٌ جِدًّا لِضُعْفِ عبدالرحمن و إعضاله).

واتە: ئیبنو زەید (کە یەکێکە لە زانایانی جیلی شوێنکەوتووانی هاوەڵان خوا لە هەموویان ڕازی بێ)، لە بارەی قسەی خوای بەرزەوە، کە دەفەرموێ: ﴿ أَفَرَءَيْتَ ٱلَّذِى تَوَلَّىٰ ﴿٣٣﴾ ﴾، تاکو دەگاتە ئەو شوێنەی دەفەرموێ: ﴿ أَعِندَهُۥ عِلْمُ ٱلْغَيْبِ فَهُوَ يَرَىٰٓ ﴿٣٥﴾ ﴾، گوتوویەتی: لە بارەی کەسێکەوە هاتە خوار، کە مسوڵمان بوو بوو، ئنجا هەندێک لەوانەی ڕەخنەی لێ دەگرن و سەرکۆنەی دەکەن، پێی گەیشتن، یەکێکیان پێی گوت: ئایا ئایینی پیاوە بە تەمەنەکانت واز لێ هێناوەو، بە گومڕات داناون و، پێت وایە ئەوان لە نێو ئاگردان؟ لەسەر تۆ پێویست بوو، ئەوان سەربخەی و پشتیان بگری، چۆن بەو شێوەیە لەگەڵ باب و باپیراندا مامەڵە دەکرێ؟ ئەویش وەڵامی دایەوەو گوتی: لە سزاو ئازاری خوا ترسام، بابای سەرکۆنەکەر پێی گوت: ئەگەر شتێک لە ماڵ و سامانت بدەیە من، هەر سزایەک لەسەر تۆ بێ، لە قیامەتدا هەڵیدەگرم، ئەویش ئەندازەیەک لە ماڵ و سامانی خۆی دایە، ئنجا داوای زیادەی لێ کرد، بەڵام تێکگیران، هەتا هەندێکی دیکەی دایە، دوایی نووسراوێکی بۆ نووسی و شایەدیشی بۆ گرت، کە لە ڕۆژی دواییدا ئەو سزاو ئازارەی دەخرێتە سەر {ئەو کەسە هەڵگێڕاوەتەوە لە ئیسلام} ئەو تەحەممولی بکات و لە جیاتی وی سزا بدرێ {لە بەرانبەر ئەو ماڵ و سامانەدا} ئەوەیە قسەی خوای بەرز کە دەفەرموێ: ﴿ أَفَرَءَيْتَ ٱلَّذِى تَوَلَّىٰ ﴿٣٣﴾ وَأَعْطَىٰ قَلِيلًا وَأَكْدَىٰٓ ﴿٣٤﴾ ﴾، ئایا ئەو کەسەت بینی کە پشتی هەڵکردو ئەندازەیەک ماڵ و سامانی بەخشیی، دوایی چەقیی و چیدیکەی نە بەخشیی،

www.alibapir.com


(**أَكْدَى: عَاسَرَه**)، واتە: لەگەڵی کەوتە مشتومڕ، ﴿ أَعِندَهُۥ عِلْمُ ٱلْغَيْبِ فَهُوَ يَرَىٰٓ ﴿٣٥﴾ ﴾، ئایا زانیاریی پەنهانی لە لایەو دەبینێ؟! {کە کەسێکی دیکە بۆی هەیە، لە جیاتی وی سزا بدرێ و کۆڵی کوفر و شیرک و تاوانی وی هەڵبگرێ؟] لەوبارەوە ئەم ئایەتە موبارەکە هاتە خوار.

هەڵبەتە هەردووک نووسەری (**الإستيعاب في بيان الأسباب**)، دەڵێن: سەنەدەکەی زۆر بێهێزە، لەبەر عەبدورڕەحمان، کە فەرموودەکەی (**إعضال**)ی تێدا هەبووە، (**إعضال**)یش زاراوەیەکە لە زاراوەکانی فەرموودە ناسان[1]، بەڵام مادام ئەو دەقە (**الطبري**) هێناویەتی و زۆربەی تەفسیرەکان ئەو بەسەرهاتەیان هێناوە، کە دواتریش ئێمە جارێکی دیکە قسەی لە بارەوە دەکەینەوە، بۆیە ئێمەش هێنامان و، جاری واش هەیە، یەکێک لە زانایان و شارەزیانی فەرموودە دەڵێ: ئەو دەقەم پێ بێهێزە لە ڕووی سەنەدەوە، بەڵام زانایانی دیکە بە بەهێزی دادەنێن.

جاری واش هەیە زانایەک لە قۆناغێکی تەمەنیدا، دەقێکی پێ بێهێزەو لە قۆناغێکی دیکەدا، دەڵێ: پەشێمان بوومەوە لەوە کە بە بێهێزم داناوە، یاخود بەپێچەوانەوە: دەقێکی بە بەهێز داناوە، لە ڕووی سەنەدەوەو، دوایی لە قۆناغێکی دیکەدا، زیاتر لێ دەکۆڵێتەوەو دەڵێ: بەهەڵەدا چوو بووم، ئەو دەقە بەهێز نیەو بێهێزە، وەک (**ناصرالدين الألباني**) ڕەحمەتی خوای لێ بێ، فەرموودەناسی ناوداری سەدەی بیستی زایینی، ئەو حاڵەتەی بووە و دوو بەرگ کتێب دانراون لە بارەی چاو پێداگێڕانەوەکانی ئەلبانییەوە، بە هەڵوێستی خۆی دا لە بارەی هەندێک لە دەقەکانی سوننەتەوە، کە بەبێهێزی داناون، دوایی لێیان پەشێمان بۆتەوەو گوتوویەتی: بەهێزن، یاخود بە بەهێزی داناون و، دوایی گوتوویەتی: بێهێزن، ئەوەش شتێکی ئاساییە، گرنگ ئەوەیە ئەو ڕیوایەتانە لە زۆربەی تەفسیرەکاندا هاتوون، ئێمەش وەک بەرچاو ڕوونیی هێنامانن.

---

(١) ئەو فەرموودەیە کە دوو لە گێڕەرەوەکان (رواة)ی بە دوای یەک دا کەوتبن و دیار نەبن، لە هەر شوێنێکی زنجیرەکەدا بێ.

www.alibapir.com



## مانای گشتیی ئایەتەکان

خوا ﷻ لەم سی (٣٠) ئایەتەی کۆتایی سووڕەتی **(النجم)**دا، ئایەتەکانی: (٣٣ - ٦٢)، کە وەک گوتمان: ئەم سووڕەتی **(النجم)** هەمووی، جگە لە ئایەتەکانی سەرەتای کە باسی چۆنیەتیی سروشکردنی خوا ﷻ بۆ پێغەمبەری خاتەم ﷺ لە ڕێی جیبریلەوەو، ئەوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ جیبریلی بینیوە، جارێک لەسەر زەوی و، جارێک لە ئاسمان، لە لای درەختی کۆتایی، کە بەهەشتی سرەوتگای بڕوادارانیشی لێیە، جگە لەو بابەتە، ئەوەی دیکە هەمووی باسی هەڵوەشاندنەوەی بیرۆکەی بتپەرستییە، بە تایبەت پەرستنی هەر سێ بتی سەرەکیی: **(لات)**و، **(عُـزَّى)**و، **(مَنَاة)**و، بە مێینەو کچی خوا دانانیان، لە دوای ئایەتی ژمارە (١٨)ەوە، لە ئایەتی (١٩)ەوە، تاکو کۆتایی، ئەوە سوڕگە سەرەکییەکەیەتی.

ئنجا لێرەدا خوا ﷻ دوای ئەوەی بە گشتیی لە بارەی هاوبەش بۆ خوا دانەران و بیرۆکەی پووچی هاوبەش بۆ خوا دانان و پەرستنی جگەلە خواوە، فەرمایشتی کرد، وەک نموونەیەک لە بارەی کەسێکی تایبەت و دیارییکراو، یاخود جۆرە کەسێک، کە وەک دوایی لە مەسەلە گرنگەکانیشدا باسی دەکەین، هەندێک لە زانایان گوتوویانە: لێرەدا خوا ﷻ لە بارەی جۆرە کەسێکەوە قسە دەکات، نەک کەسێکی دیارییکراو، بەڵکو جۆرە کەسێک، یانی: ئەو جۆرە کەسانەش هەن، کە بەو شێوەیە مامەڵە دەکەن و، هەردوو واتایەکانیش هەر گونجاون، هەرچەندە زیاتر وا پێدەچێ مەبەست پێی کەسێکی دیارییکراو بێ، کە لە هۆی هاتنە خوارەوەکەشدا باسمان کرد، بەڵام بێگومان چەمک و واتایەکە گشتگیرەو، تایبەت نیە بە کەسێکی دیارییکراوەو لە سەری قۆرخ نەکراوە.

خوا دەفەرموێ: ﴿ أَفَرَءَيْتَ ٱلَّذِى تَوَلَّىٰ ﴾، ئایا ئەو کەسەت بینی، کە پشتی هەڵکرد، پشتی کردە خواو بەرنامەکەی، ئایا بینیوتە؟ **(أَفَرَأَيْتَ)**، دەگونجێ

مەبەست بینینی چاو بێ، ئەگەر کەسێکی دیارییکراو بێ، دەشگونجێ مەبەست بینینی عەقڵ و دڵ بێ، ئەگەر مەبەست جۆرە کەسێک بێ، ئەو کاتەش یانی: ئایا زانیت ئەو کەسەی پشتی هەڵکرد، کە دەفەرموێ: (تَوَلَّى)، مانای وایە پێشێ بڕوای هێناوەو، هاتۆتە سەر ڕێی ڕاست، بەڵام دوایی پشتی کردۆتە ڕێی ڕاست و پشتی کردۆتە خوا.

﴿ وَأَعْطَىٰ قَلِيلًا وَأَكْدَىٰٓ ﴾، کەمێکی بەخشیی و دوایی چەقیی، واتە: چیدیکەی نەبەخشی وازی هێناو چرووکیی نواند.

﴿ أَعِندَهُۥ عِلْمُ ٱلْغَيْبِ فَهُوَ يَرَىٰٓ ﴾، ئایا زانیاریی پەنهانی لە لایە، ئنجا دەبینێ، یان: دەزانێ؟ بەپێی هاتنە خوارەوەکەی بێ، واتە: ئەندازەیەک لە ماڵ و سامانەکەی دا، بەو کەسەی بەڵێنی پێدا بوو، سزای دوا ڕۆژی لە کۆڵ بکاتەوەو خۆی لە کۆڵی بنێ و لە جیاتی وی سزا بدرێ، ئیدی ئەندازەیەک لە ماڵ و سامانی خۆی پێدا بە مەرجێک ئەو ببێتە بەڵاگێڕەوەی، بەڵام دوایی چیدیکەی پێنەداو چەقیی، خوا دەفەرموێ: ئایا زانیاریی پەنهانی لەلایە، کە ئەو کەسە دەتوانێ لە جیاتی ئەو سزا بدرێ و ئۆباڵی بۆ بکێشێ و، گرەنتیی سزا نەدرانی بۆ بکات؟!

﴿ أَمْ لَمْ يُنَبَّأْ بِمَا فِى صُحُفِ مُوسَىٰ ﴾، یان ئایا هەواڵی پێ نەدراوە بەوەی لەلاپەڕەکانی مووسادا هەیە، ﴿ وَإِبْرَٰهِيمَ ٱلَّذِى وَفَّىٰٓ ﴾، هەروەها لە لاپەڕەکانی ئیبڕاهیم دایە، کە بە تەواویی ئەرکی سەر شانی خۆی ئەنجامدا؟ ئایا ئەو ڕاستییە، چییە؟

﴿ أَلَّا تَزِرُ وَازِرَةٌ وِزْرَ أُخْرَىٰ ﴾، کە هیچ نەفسێکی گوناهکار، گوناهی کەسی دیکە هەڵناگرێ، (وِزْر): بە مانای (ثِقْل)ە، قورسایی لەبەر ئەوەی گوناه قورسە کە بابای گوناهبار لە کۆڵی دەنێ، واتە: هەم لە لاپەڕەکانی مووسادا، یانی: لە تەوراتدا، هەم لە لاپەڕەکانی ئیبڕاهیمدا ﷺ هاتوە، کە هیچ گوناهبارێک گوناهی کەسی دیکە هەڵناگرێ.

www.alibapir.com



﴿ وَأَن لَّيْسَ لِلْإِنسَـٰنِ إِلَّا مَا سَعَىٰ ﴾، دیسان ئەو ڕاستییەش هەیە، کە بۆ مرۆڤ نیە، مەگەر ئەوەی خۆی هەوڵی بۆ دابێ و کۆششی بۆ کردبێ، واتە: مرۆڤ تەنها دەبێتە خاوەنی بەرهەمی کۆششی خۆی.

﴿ وَأَنَّ سَعْيَهُۥ سَوْفَ يُرَىٰ ﴾، ئەو ڕاستییەش: کە هەوڵ و کۆششەکەی لە مەودوا دەبینرێ، یانی: پاداشت دەدرێتەوە.

﴿ ثُمَّ يُجْزَىٰهُ ٱلْجَزَآءَ ٱلْأَوْفَىٰ ﴾، دوایی پاداشتی هەرە باش دەدرێتەوە، لەسەر کردەوە باشەکانی.

﴿ وَأَنَّ إِلَىٰ رَبِّكَ ٱلْمُنتَهَىٰ ﴾، هەروەها هەر لەو لاپەڕانەی مووساو ئیبڕاهیمدا (عَلَيْهِما الصَّلَاةُ وَالسَّلَامُ)، ئەو ڕاستییەش هەیە، کە کۆتایی بەرەو لای خوایە، کۆتایی هەموو کاروبارەکان، کۆتایی ژیانی مرۆڤەکان و، خاڵی کۆتایی هەموو دروستکراوەکان بۆ لای پەروەردگارە.

﴿ وَأَنَّهُۥ هُوَ أَضْحَكَ وَأَبْكَىٰ ﴾، هەروەها هەر لەو لاپەڕانەشدا هەیە، کە هەر خوا پێدەکەنێنێ و دەگریەنێ.

﴿ وَأَنَّهُۥ هُوَ أَمَاتَ وَأَحْيَا ﴾، هەروەها لەو لاپەڕانەدا هەیە، کە هەر خوا دەمرێنێ و دەژیەنێ.

﴿ وَأَنَّهُۥ خَلَقَ ٱلزَّوْجَيْنِ ٱلذَّكَرَ وَٱلْأُنثَىٰ ﴿٤٥﴾ مِن نُّطْفَةٍ إِذَا تُمْنَىٰ ﴾، هەروەها لەو لاپەڕانەدا هەیە، کە خوا بسم الله الرحمن الرحيم جووتی دروستکردوە، نێرو مێ لە نوتفەیەک کە دەڕژێنرێ، نوتفەیەک کە دەچێتە نێو منداڵدانەوەو، بریتیە لە ئاوی هەر کام لە پیاوو ئافرەت.

﴿ وَأَنَّ عَلَيْهِ ٱلنَّشْأَةَ ٱلْأُخْرَىٰ ﴾، هەروەها ئەو ڕاستییەش هەیە، کە زیندووکردنەوەو پێگەیاندنەوەی دوایەش بەس لەسەر خوایە بسم الله الرحمن الرحيم وبەڵێنی داوە.

﴿ وَأَنَّهُۥ هُوَ أَغْنَىٰ وَأَقْنَىٰ ﴾، هەروەها لەو لاپەڕانەشدا هەیە، کە هەر خوا دەوڵەمەندو بێ نیاز دەکات و، ساماندارو خاوەندار دەکات.

www.alibapir.com



﴿ وَأَنَّهُۥ هُوَ رَبُّ ٱلشِّعۡرَىٰ ﴾، هەر لەو لاپەڕانەدا هەیە، کە تەنیا خوا خاوەنی ئەستێرەی گەلاوێژە کە ئەستێرەیەکی تایبەتەو کۆمەڵێک تایبەتمەندیی هەن، وەک دوایی باسی دەکەین.

﴿ وَأَنَّهُۥٓ أَهۡلَكَ عَادًا ٱلۡأُولَىٰ ﴾، هەروەها لەو لاپەڕانەدا هەیە، لاپەڕەکانی مووساو ئیبراهیم (عَلَيْهِما الصَّلاةُ وَالسَّلاَم) کە خوا عادی یەکەمی فەوتاندوە.

﴿ وَثَمُودَاْ فَمَآ أَبۡقَىٰ ﴾، گەلی ثەموودیشی فەوتاندوەو هیچی لێ نەهێشتوون.

﴿ وَقَوۡمَ نُوحٖ مِّن قَبۡلُ ﴾، هەروەها گەلی نووحیشی لەوەپێش فەوتاندوە.

﴿ إِنَّهُمۡ كَانُواْ هُمۡ أَظۡلَمَ وَأَطۡغَىٰ ﴾، کە بە دڵنیایی ئەوان ستەمکارترو یاخییترو سنوور شکێنتریش بوون، لە گەلەکانی دوای خۆیان.

﴿ وَٱلۡمُؤۡتَفِكَةَ أَهۡوَىٰ ﴾، هەروەها بەس خوا ﷻ ئاوەدانییە هەڵگێڕدراوەکەی بەردایەوە، یانی: بەرزی کردەوەو بەری دایەوە، کە مەبەست پێی ئاوەدانییەکەی گەلی لووطە ؑ

﴿ فَغَشَّىٰهَا مَا غَشَّىٰ ﴾، ئنجا دایپۆشی ئەوەی دایپۆشی، واتە: شتێک دایپۆشی کە نایەتە وەصفکردن، کە مەبەست پێی ئەو بەردانەیە کە بەسەریاندا بارێنران، وەک دەفەرموێ: ﴿ حِجَارَةٗ مِّن سِجِّيلٖ ﴿٧٤﴾ ﴾ **الحجر**، بەردێ کە لە قوڕی وشککراوە دروستکرا بوون.

﴿ فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكَ تَتَمَارَىٰ ﴾، ئنجا ئایا لە کام لە چاکەکانی پەروەردگارتدا دوو دڵی، یان: لە بارەی کام لە چاکەکانی پەروەردگارتەوە مشتومڕ دەکەی، ئەی مرۆڤ!

﴿ هَٰذَا نَذِيرٞ مِّنَ ٱلنُّذُرِ ٱلۡأُولَىٰٓ ﴾، ئەمە ترساندنێکەو وریا کردنەوەیەکە لە ترساندن و وریاکردنەوە پێشووەکان، واتە: ئەو قورئانە، یاخود ئەو پێغەمبەرە ﷺ وریاکەرەوەو ترسێنەرێکە لە هەمان شێوەی وریاکەرەوەو ترسێنەرە پێشووەکان، واتە: عادەتی خوا ﷻ، هەروابووەو، موحەممەد ﷺ شتێکی داهێنراووپەیداکراوی

www.alibapir.com


بـێ پێشـینە نیـە، وەک لـە سـوورەتی (**الأحقـاف**)دا، دەفەرمـوێ: ﴿ قُلْ مَا كُنتُ بِدْعًا مِّنَ ٱلرُّسُلِ ﴾، بڵـێ: مـن داهێنراوێـک نیـم، لـە پێغەمبەرانـدا (بەڵکـو منیـش یەکێکـم لـە پێغەمبـەران).

لـە کۆتاییـدا خـوا دەفەرمـوێ: ﴿ أَزِفَتِ ٱلْآزِفَةُ ﴾، وەنیزیـک کەوتـوو وەنیزیـک کـەوت، نیزیـک کەوتـوو، مەبەسـت پێـی ڕۆژی دواییـەو، یەکێـک لـە نـاوەکانی ڕۆژی دواییـە.

﴿ لَيْسَ لَهَا مِن دُونِ ٱللَّهِ كَاشِفَةٌ ﴾، جگـە لـە خـوا کـەس ناتوانـێ لای بـدات، کـەس ناتوانـێ دووری بخاتـەوە.

﴿ أَفَمِنْ هَٰذَا ٱلْحَدِيثِ تَعْجَبُونَ ﴾، ئایـا لـەم فەرمایشـتە سـەرتان سـوڕدەمێنێ، لەبـەر نەزانیـی خۆتـان؟ چونکـە مـرۆڤ بـە زۆریـی وایـە، لەبـەر نەزانیـی بەرانبـەر بـە شـتێک سـەری سـوڕدەمێنێ کـە تێـی نـاگات، واتـە: بەهـۆی نەزانییتانـەوە سـەرتان لـەم قسـەیە سـوڕدەمێنێ، مەبەسـت لـە سەرسـوڕماندنیش لێـرەدا نکوڵییلێکـردن و بـە ناڕاسـت دانانـە.

﴿ وَتَضْحَكُونَ وَلَا تَبْكُونَ ﴾، هەروەهـا پێدەکەنـن و ناگریـەن؟ واتـە: پێدەکەنـن وەک گاڵتـە پێکـردن و، ناگریـن وەک ئـەوەی بترسـێن لـە هەڕەشـەی خـوا؟

﴿ وَأَنتُمْ سَٰمِدُونَ ﴾، لە حاڵێکدا ئێوە بێ ئاگاو خافڵاون؟

﴿ فَٱسْجُدُوا۟ لِلَّهِ وَٱعْبُدُوا۟ ﴾، دەجا کڕنووش بۆ خوا بەرن و بیپەرستن.

ئەگـەر دەتانـەوێ دەربـاز بـن، لـەو هەڕەشـەیەی خـواو، لـە سـزای خـوا، کـە بـۆ کەسـانێکی دانـاوە، بـە شـێوەیەک دەژیـن، خـوا بـۆ ئـەو شـێوە ژیانـە دروسـتی نەکـردوون و، حیکمـەتی دروسـتکران و ئامانجـی دروسـتکرانیان لـە ژیـانی خۆیانـدا، ناهێننـەدی، بـە بەندایەتیـی کـردن بـۆ خـوا، کـە ئەگـەر وابکـەن، هـەم ژیـانی دنیایان ڕێـک و ڕاسـت دەبـێ، هـەم لـە ڕۆژی دواییشـدا سـەربەرزو سـەرفراز دەبـن.

www.alibapir.com


مەسەلە گرنگەکان

## مەسەلەی یەکەم:

**باسی کەسێک یان جۆرە کەسێک، کە دوای ناسینی ڕێنمایی خوا، پشتی هەڵکردووەو شتێکی کەمی بەخشیوەو دوایی چەقیوە، وەک کەسێک پەنهان بزانێ، بەڵام وا دیارە بێ ئاگایە لەو ڕاستییانەی لە پەڕەکانی مووساو، ئیبراهیمی بە تەواویی ئەرکی سەرشانی خۆ جێبەجێکەردا، هاتوون:**

خوا دەفەرموێ: ﴿ أَفَرَءَيْتَ ٱلَّذِى تَوَلَّىٰ ﴿٣٣﴾ وَأَعْطَىٰ قَلِيلًا وَأَكْدَىٰٓ ﴿٣٤﴾ أَعِندَهُۥ عِلْمُ ٱلْغَيْبِ فَهُوَ يَرَىٰٓ ﴿٣٥﴾ أَمْ لَمْ يُنَبَّأْ بِمَا فِى صُحُفِ مُوسَىٰ ﴿٣٦﴾ وَإِبْرَٰهِيمَ ٱلَّذِى وَفَّىٰٓ ﴿٣٧﴾ ﴾.

## شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە پێنج بڕگەدا:

١)- ﴿ أَفَرَءَيْتَ ٱلَّذِى تَوَلَّىٰ ﴾، ئایا ئەو کەسەت دی کە پشتی هەڵکرد! دوێندراو (مُخَاطَب)، دەگونجێ پێغەمبەری خاتەم موحەممەد ﷺ بێ و، دەشگونجێ هەر کەسێک بێ، کە قورئان دەخوێنێتەوە، ﴿ أَفَرَءَيْتَ ٱلَّذِى تَوَلَّىٰ ﴾ ئایا ئەو کەسەت بینی کە پشتی هەڵکرد، ئەم بینینە، وەک پێشتریش باسمان کرد، دەگونجێ بینینی چاو بێ، بە چاوی سەر، واتە: ئایا بە چاوی سەر ئەو کەسەت بینی، ئەمە لە حاڵێکدایە ئەو کەسە کەسێکی دیارییکراو بێ، کە لە هۆی هاتنە خوارەوەکاندا زیاتر باسی وەلیدی کوڕی موغیرەیان کردوە، بەڵام ئەگەر مەبەست جۆرە کەسێک بێ، نەک کەسێکی تایبەت، ئەو کاتە دەبێ بڵێین: بینین لێرەدا مەبەست پێی زانینە نەک بینینی چاو، چونکە ئەو جۆرە کەسە دیار نیە، تاکو بە چاوی سەر ببینرێ، بەڵکو بە چاوی عەقڵ و دڵ دەزانرێ، لە هەردوو حاڵاندا، پرسیارکردنەکە (أَفَرَأَيْتَ)، بۆ سەرلێ سوڕماندنە (ف)کەش بۆ لق لێکردنەوە (تَفْرِيع) و بنیاتنانی قسەیەکە، پەیوەست بە

www.alibapir.com


قسەیەکی پێشووەوە، کە بریتیە لەوەی خوا فەرمووی: ﴿لِيَجْزِيَ الَّذِينَ أَسَاءُوا بِمَا عَمِلُوا وَيَجْزِيَ الَّذِينَ أَحْسَنُوا بِالْحُسْنَى ﴿٣١﴾﴾، بینا لەسەر ئەوە، دەفەرموێ: ئایا ئەو کەسەت بینی، کە پشتی هەڵکرد، کە دەفەرموێ: پشتی هەڵکرد، یان ڕووی وەرگێڕا، مانای وایە پێشێ ڕێی ڕاستی گرتوە، ڕێی ڕاستی ناسیوەو پێی ئاشنا بووە، بەڵام دوایی دەستبەرداری بووەو وازی لێهێناوە.

٢)- ﴿وَأَعْطَىٰ قَلِيلًا وَأَكْدَىٰ﴾، کەمێکی بەخشیی دوایی چەقیی، وازی هێنا، وەک چۆن کەسێک زەوییەک هەڵدەقەنێ، دوایی دەگاتە شوێنێکی ڕەقەن و سەخت و چیدیکە ناتوانێ هەڵقەنێ، ئەویش ماوەیەک بەخشیی، بەڵام دوایی ڕاوەستا، ئەگەر مەبەست کەسێکی تایبەت و دیارییکراو بێ، بەپێی هۆی هاتنە خوارەوەکە واتە: ئەندازەیەک ماڵ و سامانی دا، بەو کەسەی سەرکۆنەی کردبوو و گوتبووی: بە مەرجێک ئەندازەیەک ماڵ و سامانی خۆی بداتێ، ئۆباڵی ئەوەی بۆ دەکێشێ و گرەنتیی دەداتێ کە سزای دواڕۆژی لە کۆڵ بخات، بەڵام ئەگەر مەبەست پێی جۆرە کەسێکی تایبەت بێ، نەک کەسێکی دیارییکراو، ئەو کاتەش واتە: کەمێک ماڵ و سامانی خۆی بەخشیی لە پێناوی خواداو خێرو چاکەی کرد، دوایی وازی هێنا.

یاخود کەمێکی بەخشیی لە فەرمانبەریی کردن و شوێنکەوتنی پەیام و بەرنامەی خواو، کەمێک هاتە پێش، دوایی وازی هێناو چەقیی، (**أعْطَى**)، یانی: (**أعْطَى الطَّاعَة**)، فەرمانبەریی بەخشیی و ملکەچیی و جێبەجێکردنی ئەرکی بەندایەتیی بەخشیی، بەڵام دوایی دەستی لێ هەڵگرت و وازی لێهێنا.

٣)- ﴿أَعِندَهُ عِلْمُ الْغَيْبِ فَهُوَ يَرَىٰ﴾، ئایا زانیاریی پەنهانی لەلایەو دەبینێ، ئەم پرسیارکردنە، بێگومان پرسیارکردنی نکووڵییلێکردنە، ئەگەر مەبەست جۆرە کەسێک یان کەسێکی دیارییکراو بێ، مانایەکەی: نکووڵییلێکردنە لەوەی ئەو باسکراوە زانیاریی پەنهانی لەلا بوو بێ و زاینبی، یان دیتبی کە ئەو کەسەی بۆتە ئۆباڵداری، بتوانێ سزای دواڕۆژی لە کۆڵ بخات، ئایا زانیاریی پەنهانی لەلابوو و ئەوەی دەبینی؟ بەدڵنیایی نەخێر.

www.alibapir.com



٤)- ﴿ أَمۡ لَمۡ يُنَبَّأۡ بِمَا فِي صُحُفِ مُوسَىٰ ﴾، یان ئایا هەواڵی پێ نەدرابوو بەوەی لە لاپەڕەکانی مووسادا هەیە؟ (**أَمْ**) لێرەدا بۆ گواستنەوەیە لە بابەتێکەوە بۆ بابەتێکی دیکە، شتێک کە زیاتر جێی سەرسوڕمانە لەوەی پێشێ و، بۆ نکووڵییلێکردنی زیاتریشە لەوەی کە پێشێ نکوڵییلێکرا، ئەویش بریتیە لەوە کە بێئاگابووە لەوەی دەبێ ئەوانەی لە خوا دەترسێن، بیزانن، شتێک کە لەسەر زمانی پێغەمبەران (**عَلَيْهِمُ الصَّلاَةُ وَالسَّلاَم**)، هاتوە، ئایا هەواڵی پێنەدراوە بەوەی لەلاپەڕەکانی مووسادا هەبوو؟

٥)- ﴿ وَإِبۡرَٰهِيمَ ٱلَّذِي وَفَّىٰٓ ﴾، هەروەها لە لاپەڕەکانی ئیبراهیمدا هەبوو، ئەو ئیبراهیمەی بسم الله الرحمن الرحيم هەرچی ئەرکی سەرشانی بوو، بەتەواویی جێبەجێی کرد؟ لێرەدا خوا بسم الله الرحمن الرحيم باسی پەڕەکانی مووساو ئیبراهیم دەکات، وەک لە سوورەتی (**الأعلى**)ش دا دەفەرموێ: ﴿ صُحُفِ إِبۡرَٰهِيمَ وَمُوسَىٰ ١٩ ﴾، چونکە ئیبراهیم لەپێش مووساوەیە بسم الله الرحمن الرحيم، چ لە پلەو پێگەو، چ لە ڕووی ڕیزبەندیی کاتییەوە، بەڵام لێرەدا لە خوارترەوە بۆ سەرتر، ڕیزبەندی کردوون، واتە: ئایا هەواڵی پێنەدراوە بەوەی لە لاپەڕکانی مووسادا هەبوو، یان ئەوەی لە سەرچاوەیەکی متمانە پێکراوتردا هەبوو، کە لاپەڕەکانی ئیبراهیمی وەفادار و ئەرکی سەرشانی خۆ بە تەواویی جێبەجێکەرن؟ یان هەر لەبەر ئەوەی سەجع و کۆتایی ئایەتەکان پێکەوە بگونجێن، لێرەدا مووسا بسم الله الرحمن الرحيم پێشخراوە، سەڵات و سەلامی خوا لەسەر هەموو پێغەمبەران بێ.

پێشتریش باسمان کرد، کە ڕوونکەرەوانی قورئان ڕەحمەتی خوایان لێ بێ و خوا پاداشتیان بداتەوە، دوو ڕایان هەن:

**ڕای یەکەم:** گوتوویانە: ﴿ ٱلَّذِي تَوَلَّىٰ ﴾، ئەو کەسەی پشتی هەڵکردوە، کەسێکی دیارییکراوە، ئنجا لەو بارەوە کە ئایا کێیە؟ لە تەفسیرەکاندا بە کۆی هەموویان چوار جۆرە کەس باسکراون:

١- (**الوليد بن المغيرة**)، ئەمە (إبن زيد ومجاهد) وایانگوتوە، کە زۆربەی تەفسیرەکان هەر باسی وەلیدی کوڕی موغیرە دەکەن.

٢- **(العاصُ بن وائل السَّهمي)**، ئەمیشیان **(السُّدِّي)** گوتوویەتی.

٣- **(أبو جهل)**، **(محمد بن كعب)** گوتوویەتی.

٤- **(النضر بن الحارث)**، **(الضحاك)**، گوتوویەتی.

**ڕای دووەم:** گوتوویانە: **(الذي تولّی)** جۆرە کەسێکە، خوا بسم الله الرحمن الرحيم وێنەی پێ هێناوەتەوە، جۆرە کەسێکە پێشێ ڕوو دەکاتە ئیسلام، بەڵام بە نەفەسی کورتەوەو زوو پشووی سوار دەبێ و، دوایی لێی هەڵدەگەڕێتەوە، وەک کوردەواریی خۆمان دەڵێن: فلانکەس گڕو فڕە، واتە: ئەوە کەسێکی دیارییکراو نیە، بەڵکو جۆرە کەسێکە، کە ئەو کاتیش دەگرێتەوەو، ئێستاش دەگرێتەوەو، دوای ئێستاش دەگرێتەوە، هەڵبەتە ئەگەر مەبەست کەسە دیارییکراوەکەش بێ، ئنجا وەلیدی کوڕی موغیرە یان هەر کامێکیان بێ، بەڵام زیاتر باسی ئەو دەکرێ، زانایان بنچینەیەکیان هەیە دەڵێ: **(إنَّ خُصُوصَ السَّبَبِ لاَ يَمْنَعُ شُمُولَ المَعْنَى)**، تایبەتیی هۆکار، ڕێ لە گشتگیریی واتا ناگرێ، بەڵێ دەڵێین: لە بارەی ئەو کەسە دیارییکراوەوە خوا ئەوەی فەرمووە، بەڵام هەر کەسێکی دیکەش ئەو سیفەتانەی ئەو کەسەی تێدابن، هەر دەیگرێتەوە، ئەمەش بنچینەیەکە هەموو زانایان لە سەری یەکدەنگن.

لە تۆڕە کۆمەڵایەتییەکان لەگەڵتانین
Stay in touch on social media
نحن معكم عبر مواقع التواصل الاجتماعي
ڕاگەیاندنی مەکتەبی مامۆستا عەلی باپیر
AliBapir/عەلی باپیر
archive.org/details/@alibapir
AliBapir/عەلی باپیر
کەناڵی ڕاگەیاندنی مەکتەبی مامۆستا عەلی باپیر
AliBapir
www.alibapir.net
کوردی - عربي - English
ڕاگەیاندنی مەکتەبی مامۆستا عەلی باپیر

www.alibapir.com


## باسێکی کورت لە بارەی لاپەڕەکانی

## مووساو ئیبراهیمەوە (علیهما السلام)

بەڕێـــزان!

بەدڵنیاییەوە مەبەست لە لاپەڕەکانی مووسا (**صحف موسى**) ﷺ تەوڕاتە، ئەو تەوڕاتەی بۆ مووسا دابەزێنراوەو لە لەوحاندا نووسراوەتەوەو، هەر بە نووسراوەیی تەسلیمی مووسا ﷺ کراوە، وەک خوا ﷻ لەسووڕەتی (**الأعراف**) دا، دەفەرموێ: ﴿وَأَلۡقَى ٱلۡأَلۡوَاحَ وَأَخَذَ بِرَأۡسِ أَخِيهِ يَجُرُّهُۥٓ إِلَيۡهِۚ ١٥٠﴾، واتە: مووسا {کاتێک لە جێژوانی خوای پەروەردگاری گەڕایەوە، دوای چل شەو و ڕۆژەکە بە لەوحەکانەوە} لەوحەکانی فڕێدان و (قژی) سەر برایەکەی گرت بەرەولای خۆی ڕایکێشا.

کاتێک مووسا تەماشای کرد، خەڵکەکەی دەستیان کرد بوو بە گۆلک پەرستیی، لەوحەکانی دانان، یان فڕێیدان لە تووڕەییان، هەتا لە هەندێک گێڕدراوان دا هاتوە، کە هەندێک لە لەوحەکان شکاون، کە دەڵێن: جۆرە بەردێکی تایبەت بوون، بەس خوا دەزانێ لە چ ماددەیەکی زۆر سەیرو بە نرخ بوون، گرنگ ئەوەیە تەوڕات بەنووسراوەیی لەسەر لەوحەکان هەبووەو، مووسا بۆ ئەوەی دەستی بە تاڵ بێ بۆ سەرو ڕیش گرتنی هاڕوونی برای، لەوحەکانی فڕێ داون! ئەو لاپەڕانەی مووساش ﷺ کە تەوڕاتەکەی پێکدێنن - تەوڕات یانی: شەریعەت، بەرنامە - لە چوار بەش پێکهاتوە، کە پێیان دەگوترێ: (**الأسفار الأربعة**): (**سفر التكوين، سفر الخروج، سفر العدد، سفر التثنية**)[1]، کە ئێستا (پەیمانی کۆن) سی و نۆ (٣٩) سیفرە، (**سِفر**) واتە: کتێب، یان بەش، بە هەندێک سەرژمێریش چل و نۆ (٤٩) سیفرە، چواری یەکەمیان، پێیان دەگوترێ: تەوڕات و دیارن،

---

(١) هەندێکیش سیفری پێنجەمیشیان خستوونە گەڵ: (سفر اللاويين).

www.alibapir.com


بەڵام ئایا چەندی وەک خۆی ماوە، کە خوا بۆ مووسای ناردووەو ﷺ، چەندی کەم و زیادیی تێدا کراوە؟ هیچ گومانی تێدا نیە، کەم و زیادیی تێدا کراوەو، لە (**سفر التكوين**)دا، کە یەکەمین سیفری تەوراتە، شتی وای تێدا هەیە، بە هیچ شێوەیەک لەگەڵ خوای بەرزی مەزندا ناگونجێ، هەروەها شتی وای تێدا هەیە، کە لەگەڵ پێغەمبەراندا (**عَلَيْهِمُ الصَّلَاةُ وَالسَّلَام**) ناگونجێ، بەڵام هەندێک زانیاریشی تێدا هەن، لەگەڵ عەقڵداو لەگەڵ قورئاندا دەگونجێن، کە دەگونجێ وەک زیاتر بەرچاو ڕوونیی، بەهرەیان لێ وەربگیرێ، هەر بۆیەش پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: {**بَلِّغُوا عَنِّي وَلَوْ آيَةً، وَحَدِّثُوا عَنْ بَنِي إِسْرَائِيلَ وَلَا حَرَجَ**} (**أخرجه أحمد: ٦٤٨٦، والبخاري: ٣٢٧٤، والترمذي: ٢٦٦٩، وابن حبان: ٦٢٥٦**) واتە: ئایەتێکیش بێ لە منەوە بیگەیەنن و لە بارەی بەنوو ئیسڕائیلەوەش قسە بکەن، شت بگێڕنەوەو سەغڵەتییتان لەسەر نیە، واتە: وەک بەرچاو ڕوونیی بۆتان هەیە، لە کتێبەکانی ئەوان بەهرەمەندبن، بەڵام نەک وەک پشت پێ بەستن، چونکە لە فەرمایشتی دیکەی پێغەمبەردا ﷺ هاتووە: {**لاَ تُصَدِّقُوا أَهْلَ الْكِتَابِ وَلاَ تُكَذِّبُوهُمْ**} (**أخرجه البخاري: ٤٢١٥**) واتە: خاوەن کتێبەکان نە بە ڕاست دابنێن، نە بە درۆیان دابنێن، بە ڕاستیان دامەنێن، نەوەک شتێک بڵێن، پێچەوانەی هەق بێ و، بە درۆشیان دامەنێن، نەوەک شتێک بڵێن، ڕاست بێت و ئێوەش بە درۆی دابنێن و تووشی گوناح بن، یانی: بە ڕەهایی نەبەڕاستیان دابنێن، نە بەدرۆیان دابنێن.

کەواتە: قەبارەی پەڕەکانی مووسا ﷺ بە گشتیی ئەندازەکەی دیارە، ئەو چوار سیفرەن، کە ئێستا لە پەیمانی کۆندا هەن، بەڵام بە لەبەر چاوگرتنی ئەوە کە کەم و زیادییان تێدا کراوە.

لاپەڕەکانی ئیبراهیم (**صحف إبراهيم**) ﷺ زانایان گوتوویانە: دە (١٠) لاپەڕە بوون، بە ئەندازەی چل (٤٠) ئایەت، ئەگەر هەر چوار ئایەت، لاپەڕێکی بۆ دابنێین و دەکاتە دە لاپەڕ، ئەو کاتە هەر لەسەر دیوێکی پەڕەکە نووسیویانە، ئنجا تیانووسەکە: پێستی تەنک بووە، بەرد بووە، کاغەز بووە، هەرچی بووە،

www.alibapir.com



باسی پەڕەکانی ئیبراهیم و مووسا، وێڕای ئێرە لە یەک شوێنی دیکەی قورئانیشدا هاتوە، ئەویش بریتیە لە سوورەتی (**الأعلى**)، کە خوا بسم الله الرحمن الرحيم دەفەرمویٚ: ﴿قَدْ أَفْلَحَ مَن تَزَكَّىٰ ﴿١٤﴾ وَذَكَرَ اسْمَ رَبِّهِ فَصَلَّىٰ ﴿١٥﴾ بَلْ تُؤْثِرُونَ الْحَيَاةَ الدُّنْيَا ﴿١٦﴾ وَالْآخِرَةُ خَيْرٌ وَأَبْقَىٰ ﴿١٧﴾ إِنَّ هَٰذَا لَفِي الصُّحُفِ الْأُولَىٰ ﴿١٨﴾ صُحُفِ إِبْرَاهِيمَ وَمُوسَىٰ ﴿١٩﴾﴾، بەڵام لێرەدا، ئیبراهیم پێش خراوە، چونکە هەم لە ڕووی پلەو پایەوەو، هەم لە ڕووی ڕیزبەندیی کاتییەوە، ئیبراهیم پێش مووسایە سەڵات و سەلامی خوا لەسەر هەردووکیان بێ.

بەڵام لە سوورەتی (**النجم**)دا، مووسا پێشخراوە: بەو ئیعتیبارەی کە لە نزمییەوە بەرەو بەرزی چووە، یان لەبەر ڕەچاوکردنی کۆتایی ئایەتەکە، کە هەموویان لەسەر یەک ئاواز بێن: ﴿وَالنَّجْمِ إِذَا هَوَىٰ ﴿١﴾ مَا ضَلَّ صَاحِبُكُمْ وَمَا غَوَىٰ ﴿٢﴾ وَمَا يَنطِقُ عَنِ الْهَوَىٰ ﴿٣﴾﴾، ئەوەی دیکەش: ﴿أَمْ لَمْ يُنَبَّأْ بِمَا فِي صُحُفِ مُوسَىٰ ﴿٣٦﴾ وَإِبْرَاهِيمَ الَّذِي وَفَّىٰ ﴿٣٧﴾﴾.

شایانی باسە: لە سوورەتی (**الأعلى**)شدا، لەو ئایەتانەدا کە باسمانکردن، کە خوا دەفەرمویٚ: ئەمە لەلاپەڕە پێشووەکاندا، لاپەڕەکانی ئیبراهیم و مووسادا هەیە، لەوێ پێنج ڕاستیی باسکراون:

١- ﴿قَدْ أَفْلَحَ مَن تَزَكَّىٰ ﴿١٤﴾﴾، بە ڕاستیی سەرفرازە، ئەو کەسەی خۆی پاک و چاک کردوە.

٢- ﴿وَذَكَرَ اسْمَ رَبِّهِ ﴿١٥﴾﴾، ئەو کەسەی ناوی پەروەردگاری دێنێ.

٣- ﴿فَصَلَّىٰ ﴿١٥﴾﴾، ئنجا نوێژی بەرپا کردوە.

٤- ﴿بَلْ تُؤْثِرُونَ الْحَيَاةَ الدُّنْيَا ﴿١٦﴾﴾، بەڵکو ئێوە ژیانی دونیا (یان نزمتر یان نیزیکتر) هەڵدەبژێرن.

٥- ﴿وَالْآخِرَةُ خَيْرٌ وَأَبْقَىٰ ﴿١٧﴾﴾، بەڵام مەنزڵگای کۆتایی چاکترەو بەردەوامتریشە.

ئنجا دوای ئەوەی خوا دەفەرمویٚ: ﴿قَدْ أَفْلَحَ مَن تَزَكَّىٰ ﴿١٤﴾ وَذَكَرَ اسْمَ رَبِّهِ فَصَلَّىٰ ﴿١٥﴾ بَلْ تُؤْثِرُونَ الْحَيَاةَ الدُّنْيَا ﴿١٦﴾ وَالْآخِرَةُ خَيْرٌ وَأَبْقَىٰ ﴿١٧﴾﴾، دوایی دەفەرمویٚ: ﴿إِنَّ هَٰذَا﴾،

www.alibapir.com

بێگومـان ئـەوەی باسـکرا ﴿لَفِى ٱلصُّحُفِ ٱلْأُولَىٰ ﴿١٨﴾﴾، لـە لاپـەڕە پێشـووەکاندا هەیـە، ﴿صُحُفِ إِبْرَٰهِيمَ وَمُوسَىٰ ﴿١٩﴾﴾، لاپـەڕەکانی ئیبراهیـم و مووسـا، صـەڵات و سـەلامی خوایـان لەسـەر بـێ.

لێرەش لە سووڕەتی (**النجم**)دا، خوا بسم الله الرحمن الرحيم وەک لە سەرەتاوە باسمان کرد، دوازدە ڕاستیی خستوونەڕوو و پاڵیداونە لای صوحوفی مووساو ئیبراهیم (**عَلَيْهِما الصَّلَاةُ وَالسَّلَام**)، لێرەش پێنج ڕاستیی دیکەی باسکردوون، کەواتە: (١٢ + ٥ = ١٧)، ئەمە حەڤدە (١٧) ڕاستیی مەزن، لە لاپەڕە پێشووەکان، لاپەڕەکانی ئیبراهیم و مووسادا (**عَلَيْهِما الصَّلَاةُ وَالسَّلَام**)، بەڵام ئایا لاپەڕەکانی مووساو ئیبراهیم، یان ئیبراهیم و مووسا، هەر ئەم حەڤدە ڕاستییەیان تێدان؟ بەدڵنیایی نەخێر، بەڵام خوا بسم الله الرحمن الرحيم ئەو حەڤدە ڕاستییەی لەو دوو شوێنەدا، لە شوێنێک دوازدەو، لە شوێنێک پێنج، بۆ ئێمە گواستوونەوە.

لە تۆڕە کۆمەڵایەتییەکان لەگەڵتانین
Stay in touch on social media
نحن معكم عبر مواقع التواصل الاجتماعي
AliBapir/عەلی باپیر
ڕاگەیاندنی مەکتەبی مامۆستا عەلی باپیر
AliBapir/عەلی باپیر
archive.org/details/@alibapir
کەناڵی ڕاگەیاندنی مەکتەبی مامۆستا عەلی باپیر
AliBapir
Google Play
App Store
www.alibapir.net
English - عربي - کوردی
ڕاگەیاندنی مەکتەبی مامۆستا عەلی باپیر

www.alibapir.com


## مەسەلەی دووەم:

یازدە ڕاستیی گەورەو گرنگ، کە لە پەڕەکانی مووساو ئیبراهیمدا هاتوون، کە چواریان پەیوەستن بە مرۆڤەوە، حەوتیشیان پەیوەستن بە ژمارەیەک لە سیفەت و کردەوەکانی خواوە، کە بەڵگەو نیشانەی پەروەردگاریتیی و باڵادەستیی و هەمەکارەبوونی خوای پەروەردگارن.

ڕاستیی دوازدەیەم و کۆتاییش هەڵدەگرین بۆ مەسەلەی سێیەم، چونکە ئەویش جۆرە ڕاستییەکی تایبەتەو جیایە لەم یازدە ڕاستییە:

خوا دەفەرموێ: ﴿ أَلَّا تَزِرُ وَازِرَةٌ وِزْرَ أُخْرَىٰ ﴿٣٨﴾ وَأَن لَّيْسَ لِلْإِنسَانِ إِلَّا مَا سَعَىٰ ﴿٣٩﴾ وَأَنَّ سَعْيَهُ سَوْفَ يُرَىٰ ﴿٤٠﴾ ثُمَّ يُجْزَاهُ الْجَزَاءَ الْأَوْفَىٰ ﴿٤١﴾ وَأَنَّ إِلَىٰ رَبِّكَ الْمُنتَهَىٰ ﴿٤٢﴾ وَأَنَّهُ هُوَ أَضْحَكَ وَأَبْكَىٰ ﴿٤٣﴾ وَأَنَّهُ هُوَ أَمَاتَ وَأَحْيَا ﴿٤٤﴾ وَأَنَّهُ خَلَقَ الزَّوْجَيْنِ الذَّكَرَ وَالْأُنثَىٰ ﴿٤٥﴾ مِن نُّطْفَةٍ إِذَا تُمْنَىٰ ﴿٤٦﴾ وَأَنَّ عَلَيْهِ النَّشْأَةَ الْأُخْرَىٰ ﴿٤٧﴾ وَأَنَّهُ هُوَ أَغْنَىٰ وَأَقْنَىٰ ﴿٤٨﴾ وَأَنَّهُ هُوَ رَبُّ الشِّعْرَىٰ ﴿٤٩﴾ ﴾.

## شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە دوازدە بڕگەدا:

١)- ﴿ أَلَّا تَزِرُ وَازِرَةٌ وِزْرَ أُخْرَىٰ ﴾، کە هیچ گوناهکارێک، گوناهی هیچ نەفسێکی دیکەی گوناهبار، هەڵناگرێ: (تَأْنِيثُ وازِرَة بِتَأْوِيلِ: نَفْسٍ، وكَذَلِكَ تَأْنِيثُ أُخْرى)، کە دەفەرموێ: ﴿ أَلَّا تَزِرُ وَازِرَةٌ ﴾، کە هیچ (وَازِرَة)یەک، (وِزْر)ی، یەکێکی دیکە هەڵناگرێ، (وَازِرَة)، بۆچی بە مێینە (مؤنث) هاتوە؟ یانی: (نَفْس وَازِرَةٌ)، هیچ نەفسێکی گوناهکار، گوناهی نەفسێکی دیکە هەڵناگرێ، واتە: کەس گوناهی کەس لە کۆڵێ ناکات و، کەس ناتوانێ لە جیاتی کەس سزا بدرێ و ببێتە بەلاگێڕەوەی.

٢)- ﴿ وَأَن لَّيْسَ لِلْإِنسَانِ إِلَّا مَا سَعَىٰ ﴾، هەروەها کە مرۆڤ بەس خاوەنی ئەوەیە هەوڵی بۆ دەدات.

www.alibapir.com


ئەمەش ڕاستییەکی دیکەیە کە مرۆڤ تەنیا ئەوەندەی هەوڵدەدات و کۆشش دەکات، تەنها خاوەنی ئەوە دەبێ کە کۆششی بۆ کردوە، (**أَصْلُ السَّعيّ: المَشْيُ، السَّرِيعُ، فَأُطْلِقَ عَلَى العَمَلِ مَجازاً مُرْسَلاً أَوْ كِنَايَةً، والمُرَادُ هُنَا عَمَلُ الخَيْرِ بِقَرِينَةِ ذِكْرِ لامِ الإِخْتِصَاصِ**)، وشەی (سَعْي): لە ئەصڵدا بە مانای ڕۆیشتنی خێرایە، بەڵام لێرەدا بە مانای کردارو وەدەستهێنان هاتوە، مەبەستیش پێی کاری خێرە، بە نیشانەی ئەوە کە لامی تایبەتکردنی خراوەتە سەر ﴿ وَأَن لَّيْسَ لِلْإِنسَٰنِ إِلَّا مَا سَعَىٰ ﴾، یانی: هیچ بەرهەم و سوودێک بۆ مرۆڤ نیە، مەگەر ئەوەی خۆی هەوڵی دابێ.

٣)- ﴿ وَأَنَّ سَعْيَهُۥ سَوْفَ يُرَىٰ ﴾ هەروەها کە کۆششەکەی لەمەودوا دەبینرێ، واتە: بە بەرجەستە کراویی دەبینرێ، کە ئەمە یەکێکە لە بەڵگەکانی ئەوەی لە ڕۆژی دواییدا، خوا کردەوەی مرۆڤەکان، چ نیەتی دڵیان و، چ دەربڕینەکانی زمانیان، چ کردەوەی ئەندامەکانیان، بۆیان بەرجەستە دەکات، وەک لە تەفسیری سوورەتی (**الجاثية**)دا، لەو بارەوە باسێکمان کرد، هەروەها لە سوورەتی (**الكهف**)یشدا، لەبەر ڕۆشنایی ئەو ئایەتەدا کە دەفەرموێ: ﴿ وَوَجَدُواْ مَا عَمِلُواْ حَاضِرًا ﴿٤٩﴾ ﴾، ئەوەی کردبوویان بە ئامادە کراویی بینییان، یانی: بە دەنگ و وێنەوە، هەروەها لە سوورەتی (**الجاثية**)دا، کاتێک دەفەرموێ: ﴿ إِنَّا كُنَّا نَسْتَنسِخُ مَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ ﴿٢٩﴾ ﴾، ئێمە ئەوەی کە دەتانکرد، کۆپییمان دەکردو نوسخەمان لەبەر دەگرتەوە، لێرەش بە هەمان شێوە: ﴿ وَأَنَّ سَعْيَهُۥ سَوْفَ يُرَىٰ ﴾، کۆششەکەی لەمەودوا دەبینرێ، بە بەرجەستەکراویی دەبینرێ.

٤)- ﴿ ثُمَّ يُجْزَىٰهُ ٱلْجَزَآءَ ٱلْأَوْفَىٰ ﴾، دوایی پاداشتی هەرە تێرو تەواوی دەدرێتەوە، یانی: لێی کەم ناکرێتەوە، {**ضَمِيرُ النَّصْبِ فِي قَوْلِهِ: «يُجْزَاهُ» عَائِدٌ إِلى السَّعْي، أَيْ: يُجْزَى عَلَيْهِ، أَوْ يُجْزى بِهِ**: ﴿ ٱلْجَزَآءَ ٱلْأَوْفَىٰ ﴾} واتە: ڕاناوی مەنصووب لە: (**يجزاه**)دا کە (ه) یەکەیەو بەرکارەو دەگەڕێتەوە بۆ (سَعْي)، واتە: لەسەر کۆششەکەی پاداشتی هەرە تێرو تەواوی دەدرێتەوە.

(**الأَوْفَى: اسْمُ تَفْضِيلٍ مِنَ الوَفَاءِ، وَهُوَ التَّمَامُ وَالكَمَالُ، وَالتَّفْضِيلُ مُسْتَعْمَلٌ هُنَا فِي القُوَّةِ، وَلَيْسَ المُرادُ تَفْضِيلُهُ عَلَى غَيْرِهِ**)، واتە: وشەی (الأَوْفَى) لە (وفاء)ەوە، هاتوە

کە بەمانای تێرو تەواوییەو ناوی هەڵبژاردنە، بەڵام لێرەدا مەبەست پێی ئەوە نیە، بەسەر بەرامبەرێکدا هەڵبژێردرێ، بەڵکو مەبەست پێی هێزو تێرو تەواویی خودی پاداشتەکەیە، نەک بەراورد کردنی لەگەڵ پاداشتی کەسێکی دیکەدا.

٥)- ﴿ وَأَنَّ إِلَىٰ رَبِّكَ ٱلْمُنتَهَىٰ ﴾، {ئەو ڕاستییەش لە لاپەڕەکانی مووساو ئیبراهیمدا هاتوە} کە کۆتایی بەرەو لای پەروەردگارتە، (**مُنْتَهَى**)، دەگونجێ ناوی شوێن (**اسْم مَكَان**) بێ و، دەگونجێ چاوگێکی میمیی بێ، واتە: کۆتایی، یانی: خودی کۆتایی بۆ لای پەروەردگارتە، کۆتایی هەموو کارەکان لەلای خوایە.

یانی: شوێنی، یاخود کۆتایی هەموو کارەکان و سەرەنجامەکەیان لەلای خوای پەروەردگارە.

شایانی باسە: ئێمە دوایی کورتە باسێک دەکەین، لە بارەی واتای ئەم ئایەتە موبارەکەوە: ﴿ وَأَن لَّيْسَ لِلْإِنسَٰنِ إِلَّا مَا سَعَىٰ ﴾، کە مشتومڕی زانایانی زۆر لەسەرە، لەو کورتە باسەدا خوا پشتیوان بێ تیشکی باش دەخەینە سەر ئەوە، کە ئایا مەبەست لەم ئایەتە موبارەکە ئەوەیە کە مرۆڤ هەر شتێ بۆ خۆی وەدەستی نەهێنێ و نەیکات، لێی بەهرەمەند نابێ؟ کە ئێمە چەندان ئایەت و چەندان فەرمایشتی پێغەمبەرمان هەن، ئەوە دەگەیەنن کە مسوڵمانان لە هەوڵ و کۆششی یەکدی بەهرەمەند دەبن، بە تایبەت خزمان لە هی یەکدیی و، دایک و باب لە هی ڕۆڵە، ڕۆڵە لە هی دایک و باب!! دوایی قسەی لێ دەکەین کە ئەم ڕستە قورئانییە، مەبەست پێی ئەوەیە کە مرۆڤ وەک خاوەنداریێتیی، تەنیا دەبێتە خاوەنی ئەوەی خۆی کردوویەتی، بەڵام کردەوەیەک خەڵکی دیکە کردبێتی، ئەو خاوەنی نیە، بەڵام ئەگەر خاوەنەکەی پێی ببەخشێ و بۆی بکاتە دیاریی، ئەم ئایەتە ڕێی لێ ناگرێ، کە لێی بەهرەمەند ببێ، بەڵام وەک خاوەنداریی، مرۆڤ تەنیا خاوەنی بەرهەمی کردو کۆششی خۆیەتی.

کە دەفەرموێ: ﴿ وَأَنَّ إِلَىٰ رَبِّكَ ٱلْمُنتَهَىٰ ﴾، زانایان چەند واتایەکیان بۆ لێکداونەوە:

www.alibapir.com



١- (الرُّجُوعُ وَالإنْتِهَاءُ إلى حُكْمِهِ المحَض الَّذِي لا تُلاَبِسُهُ أَحْكَام أُخْرَى)، گەڕانەوەو کۆتایی پێهاتن بۆ لای حوکمی ساغی خوای پەروەردگارەو، حوکمی کەسێکی دیکەی لەگەڵ تێکەڵ نیە، واتە: تەنیا دەچنەوە بۆ لای خواو بڕیار تەنیا بڕیاری ئەوە.

٢- (المُنْتَهَى: الوُقُوفُ وَانْتِهَاء السَّيْرِ مِثْلُ: حُدُودِ الله، فَيَجِبُ الوُقُوفِ عِنْدَهُ)، کۆتایی، یانی: وەستان لە ڕۆیشتندا بۆ لای خوایە ﷻ وەک وشەی (حُدُودِ الله)، سنوورەکانی خوا، کەواتە: دەبێ ئەوەی خوا بڕیاری داوە، لەوێ بوەستی و کۆتایی بێ.

٣- (إنْتِهَاءُ المَخْلُوقَاتِ عِنْدَ اللهِ وَوجُودِهِ الوَاجِب)، دروستکراوەکان هەموویان لە لای خوا و بوونی پێویستی خوا ﷻ دەوەستن.

کە تەنیا خوا بوون پێویست (وَاجِب الوُجُود)ە[1]، ئەگەرنا جگەلە خوا هەمووی بوون گونجاو (مُمْكِنُ الوُجُود)ە، واتە: جگەلە خوا هەمووی دەگونجا ببێ و خوا دروستی بکات و، دەشگونجا نەبێ و خوا دروستی نەکات، بەڵام بوونی خوا ﷻ پێویستەو نەدەگونجا خوا ﷻ نەبێ.

٦)- ﴿وَأَنَّهُۥ هُوَ أَضۡحَكَ وَأَبۡكَىٰ﴾، دیسان بەس ئەو (خوا) هێناویەتە پێکەنین و گریان. ئەو ڕاستییەش لە لاپەڕەکانی مووساو ئیبراهیمدا صەڵات و سەلامی خوایان لەسەر بێ، هاتوە، کە ئەمە دەبێتە ڕاستیی شەشەم، کە بەس خوا پێدەکەنێنێ و دەگریەنێ، (جَعَلَ الإنْسَانَ ضَاحِكَـاً بَاكِيَاً)، مرۆڤی وا لێکردوە پێبکەنێ و بگری، کە دیارە پێکەنین دەرەنجامی دڵخۆشییەو، گریانیش بەزۆریی دەرەنجامی دڵتەنگییە، هەرچەندە جاری واش هەیە، ئینسان لە خۆشیانیش دەگری و، جاری واش هەیە ئینسان لە ناڕەحەتییانش پێدەکەنێ، بەڵام بە زۆریی وایە، مرۆڤ کە دڵخۆش بوو پێدەکەنێ و، کە دڵتەنگ بوو دەگری و، ئەم دووەش تایبەتن بە مرۆڤەوەو، تەنیا مرۆڤ پێدەکەنێ

---

(١) زاراوەکانی: (واجب الوجود) و (ممكن الوجود) دوو زاراوەی عیلمی کەلام و فەلسەفەن و لە مەوسووعەی: (ئیمان و ئیلحاد) و، بەرگی دووەمی مەوسووعەی (ئیمان و عەقیدەی ئیسلامیی)و، کتێبی: (خواناسیی، ئلیین، ئیمان)دا بە درێژیی لە بارەیانەوە دواوین.

www.alibapir.com


و دەگری، هەندێک لە زانایانی ئاژەڵناس گوتوویانە: مەیموونیش پێدەکەنێ بەڵام ناگری و، حوشتریش دەگری، بەڵام پێناکەنێ، بەڵام تەنیا مرۆڤ پێدەکەنێ و دەگری. دەڵێم: نەپێکەنینی مەیموون و نەگریانی حوشتریش، بەڵگەیەکی وا پشت ڕاستی ناکاتەوە، کە جێی دڵنیایی بێ، ڕەنگە مەیموون وەک چۆن لە شتی دیکەشدا، لاسایی مرۆڤ دەکاتەوە، لەوەشدا خۆی وا لێ بکات کە پێدەکەنێ نەک پێکەنینی ڕاستەقینە بێ، بەس لاسایی کردنەوە بێ.

٧)- ﴿ وَأَنَّهُۥ هُوَ أَمَاتَ وَأَحۡيَا ﴾، هەروەها بەس ئەو (خوا)ە کە مراندوویەتی و ژیاندوویەتی، **(أحيا وأمات)** یانی: **(أَعْطَى الحَيَاة وَسَلَبَهَا)**، ژیانی داوەو وەری گرتۆتەوە، دوایی دووبارە دەژیەنێتەوە، لێرەدا خوا بسم الله الرحمن الرحيم مردنی پێشخستوە، چونکە حاڵەکە وادەخوازێ و، مەقامی باسکردنی باڵادەستیی خوایەو، لە باڵادەستیی خواش ئەوەیە کە دەمرێنێ و دەژیەنێ، ژیان وەردەگرێتەوەو ژیانیش دەبەخشێتەوە.

٨)- ﴿ وَأَنَّهُۥ خَلَقَ ٱلزَّوۡجَيۡنِ ٱلذَّكَرَ وَٱلۡأُنثَىٰ ﴾، هەروەها ئەو (خوا) جووتی نێرو مێی دروستکردوون، هەر کام لە نێرو مێ لە زمانی عەرەبییدا پێیان دەگوترێ: **(زَوْج)**، ئەوە کە ئێستا لە عورفی زمانی عەرەبییدا باوە دەڵێن: **(زَوْج وَزَوْجَة)**، لە ڕووی زمانی عەرەبییەوە ڕاست نیە، بەڵکو ئافرەتیش **(زَوْج)**ەو پیاویش **(زوج)**ە، بە یەکێکیان دەگوترێ: **(زَوْج)**و بە هەردووکیان دەگوترێ: **(زَوْجَيْن)**، بۆیە دەفەرموێ: ﴿ وَأَنَّهُۥ خَلَقَ ٱلزَّوۡجَيۡنِ ﴾ خوا دوو **(زَوْج)**ی دروستکردوون، جووتی دروستکردوە، ئەو دوو **(زَوْج)**ە چین؟ هەردووکیان خاوەنی ڕەگەزن: نێرو مێن.

٩)- ﴿ مِن نُّطۡفَةٍ إِذَا تُمۡنَىٰ ﴾، لە نوتفەیەک لە کاتێکدا دەڕێژرێ، **(تُمْنَى: تُدْفَقُ، أو تُصَبّ، أو تُنْزَل)**، واتە: کاتێک کە دەردەقوڵێنرێ، یان دەڕێژرێ، یان بەر دەدرێتەوە، دەگوترێ: **(أَمْنَى وَمَنَى بِمَعْنَىً)**، **(أَمْنَى وَمَنَى)**، یانی: تۆوی هات، هەروەها **(تُمْنى)**، بە مانای **(تُقَدَّر)**یش دێ، یانی: ئەندازەگیریی دەکرێ، دەگوترێ: **(مَنَى لَكَ المَانِي: أي قَدَّرَ لَكَ المُقَدِّرُ)**، **(مَانِي)**، ئەندازەگیرکار، ئەندازەگیرییکار بۆی ئەندازەگیریی کردوویی، **(نُطْفَة)**ش، یانی: ئاوێکی کەم.

www.alibapir.com


بێگومان مەبەست لە نوتفەش، لێرەدا تۆوی پیاوو ئافرەتە، چونکە خوا باسی هەردووکیانی کردوە: ﴿ وَأَنَّهُۥ خَلَقَ ٱلزَّوۡجَيۡنِ ٱلذَّكَرَ وَٱلۡأُنثَىٰ ﴿٤٥﴾ مِن نُّطۡفَةٍ إِذَا تُمۡنَىٰ ﴿٤٦﴾ ﴾، لە تەفسیری سوورەتی (**الحجرات**)یس دا، باسمان کرد، کە خوا دەفەرموێ: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ إِنَّا خَلَقۡنَٰكُم مِّن ذَكَرٖ وَأُنثَىٰ ﴿١٣﴾ ﴾، بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کۆرپەلەی مرۆڤ، کە دروست دەبێ لە کۆی ئاوی پیاوو ئافرەت دروست دەبێ، لە تۆوی باب و دایک، هەردووکیان دروست دەبێ، ئەمەش پێچەوانەی ئەوەیە کە کاتی خۆی وا باو بووەو، پێیان وابووە: تەنیا تۆو ئاوی پیاوە، کۆرپەلەی لێ دروست دەبێ، بەڵام لە نێو منداڵدانی دایکدا گەورە دەبێ و پەروەردە دەبێ و گەشە دەکات، بەڵام ئێستا زانیاریی کۆرپەلەناسیی (**علم الأجنَّة**) ڕوونی کردۆتەوە کە لە زیندەوەری تۆوی پیاو و هێلکۆڵەی ئافرەت (**الحَيْوان المَنَوِي وَالبُوَيْضَة**)، لە هەردووکیان نوتفە دروست دەبێ و، ئێمە لە سەرەتای سوورەتی (**المؤمنون**)دا، باسێکی تێرو تەسەلمان لە بارەی دروست بوونی مرۆڤەوە، کردوە.

**١٠)-** ﴿ وَأَنَّ عَلَيۡهِ ٱلنَّشۡأَةَ ٱلۡأُخۡرَىٰ ﴾، هەروەها پێگەیاندنەوەو دروستکردنەوەی دیکەش هەر لەسەروی (خوا)یە. (**النَّشْأةُ: المَرَّةُ مِنَ الإنْشاءِ، أي: الإيجادِ والخَلْقِ، والأُخْرى: مُؤَنَّثُ الأخِيرِ، أي: النَّشْأةُ الَّتِي لا نَشْأةَ بَعْدَها، وَهِيَ مُقابِلُ النَّشْأةِ الأُولى الَّتِي يَتَضَمَّنُها قَوْلُهُ تَعَالى:** ﴿ وَأَنَّهُۥ خَلَقَ ٱلزَّوۡجَيۡنِ ٱلذَّكَرَ وَٱلۡأُنثَىٰ ﴿٤٥﴾ ﴾)، واتە: (**نشْأة**): جارێکە لە (**إنْشاء**)، دروستکردن و پەیداکردن[١]، وشەی (**أُخْرى**)ش، مێینەی (**أخير**)ە، یانی: دروستکردنێک کە دروستکردنی دیکەی بەدوادا نایەت، بەرانبەری دروستکردنی یەکەمە، کەواتە: بە مانای زیندووکرانەوە دێ.

**١١)-** ﴿ وَأَنَّهُۥ هُوَ أَغۡنَىٰ وَأَقۡنَىٰ ﴾ {ئەو ڕاستییەش لە لاپەڕەکانی مووساو ئیبراهیمدا هەیە} کە بەس خوا خەڵک دەوڵەمەند دەکات {مرۆڤەکان دەوڵەمەند دەکات}و خاوەن سامانیان دەکات، (**أَغْنَى أي: مَوَّلَ، أَقْنى: أَخْدَمَ**)، ئەوەش واتایەکی دیکە (**أقنى**)یە:

---

(١) لە ڕاستیی دا (نشأة) بەمانای پێگەیاندنی پلەپلەییە، وەک پێشتر باسمان کردوە.

خەڵک ساماندار دەكات و، واشیان لێ دەكات خزمەت بكرێن، یان: (أَغْنَى: أي جَعَلَه غَنِيًّا، وأقْنَى أي جَعَلَهُ ذَا قِنْيَةٍ، وَهُوَ المَالُ المُدَّخَر)، (أغْنَى)، واتە: دەوڵەمەندی كرد (أقْنَى)، واتە: كردی بە خاوەن ماڵ و سامانێكی پەزمەندە كراو، هەروەها (أقْنَى)، بە مانای (أَرْضَى)ش دێ، واتە: وای لێكرد ڕازیی بێ.

واتە: (أقنى) چوار مانای هەن: ١- ساماندارى كرد، ٢- خزمەتكراوی كرد، ٣- كردیە خاوەنی سامانی پەزمەندەكراو، ٤- ڕازییكرد.

١٢)- ﴿وَأَنَّهُۥ هُوَ رَبُّ ٱلشِّعْرَىٰ﴾، {دیسان لە لاپەڕەكانی مووساو ئیبڕاهیمدا هاتووە، كە} بەس خوا پەروەردگاری (شِعْرَى)یە، بە كوردیی ئەستێرەی گەلاوێژی پێدەڵێن، كە ئەستێرەیەكی تایبەتەو، دوایی لە كورتە باسێكدا باسی ئەستێرەی گەلاوێژ دەكەین.

لە تۆڕە كۆمەڵایەتییەكان لەگەڵتانین
Stay in touch on social media
نحن معكم عبر مواقع التواصل الاجتماعي
ڕاكەیاندنی مەكتەبی مامۆستا عەلی باپیر
عەلی باپیر/AliBapir
archive.org/details/@alibapir
عەلی باپیر/AliBapir
AliBapir
كەناڵی ڕاكەیاندنی مەكتەبی مامۆستا عەلی باپیر
www.alibapir.net
كوردی - عربي - English
ڕاكەیاندنی مەكتەبی مامۆستا عەلی باپیر

## سێ کورتە سەرنجی گرنگ

خـوای بـەرزی مـەزن کـە دەفەرمـوێ: ﴿وَأَنَّهُۥ خَلَقَ ٱلزَّوۡجَيۡنِ ٱلذَّكَرَ وَٱلۡأُنثَىٰ ﴿٤٥﴾ مِن نُّطۡفَةٍ إِذَا تُمۡنَىٰ ﴿٤٦﴾﴾، واتـە: یەکێـک لـەو ڕاسـتییانەی لـە لاپـەڕەکانی مووسـاو ئیبراهیمـدا (عَلَيْهِـما الصَّـلَاةُ وَالسَّـلَام) هـەن، ئەوەیـە کـە خـوا جووتێکـی نێـرو مێـی دروسـتکردوە، لـە نوتفەیـەک کاتێـک دەڕژێـنرێ، ئنجـا ئێمـە لەبـەر تێشـکی ئـەم دوو ئایەتـە موبارەکـەدا، سـێ سـەرنجی گرنـگ دەخەینـە ڕوو:

**سـەرنجی یەکـەم:** کـە دەفەرمـوێ: ﴿وَأَنَّهُۥ خَلَقَ ٱلزَّوۡجَيۡنِ ٱلذَّكَرَ وَٱلۡأُنثَىٰ﴾، لێـرەدا کـە خـوا بسم الله الرحمن الرحیم وشـەی (**الزَّوْجَيْن**)، باس دەکات لـە دوای ئەویش وەک جێگرەوە (بَـدَل) دەفەرمـوێ: ﴿ٱلذَّكَرَ وَٱلۡأُنثَىٰ﴾، لـە جیـاتی ئـەوەی بفەرمـوێ: (**خَلَـقَ الإنْسَـان**)، دەفەرمـوێ: ﴿وَأَنَّهُۥ خَلَقَ ٱلزَّوۡجَيۡنِ ٱلذَّكَرَ وَٱلۡأُنثَىٰ﴾، ئەمـە لەبـەر گەیانـدنی دوو مەبەسـتە:

**یەکەم:** بۆ ئەوەی خوا چاکەی خۆیمان لە جووتییەتییدا بیر بخاتەوە، کە پیاوان ڕەگەزی نێریان هەیەو ئافرەتان ڕەگەزیان مێینەیەو، ئەو نێرو مێیەش هۆگری یەکدین و پێکەوە گونجاون و تەواوکەری یەکدین، بە هۆی ئەو نێریی و مێییەشەوە، وەچەی مرۆڤایەتیی درێژەی دەبێ و بەردەوام دەبێ، لە ژیانی سەر زەویدا، واتە: خوا بسم الله الرحمن الرحیم وێڕای ئەوەی باسی دوو جووتەکە (**زَوْجَيْن**) دەکات، دواییش باسی نێرومێ ﴿ٱلذَّكَرَ وَٱلۡأُنثَىٰ﴾ دەکات، کە دووزەوجەکەش هەر نێرو مێن، بۆیەش خوا بسم الله الرحمن الرحیم ئەمە زەق دەکاتەوە کە ئەو دوو جووتە بریتین لە نێرو مێ ﴿ٱلذَّكَرَ وَٱلۡأُنثَىٰ﴾ تاکو ئەو چاکەو نیعمەتەی خۆی بخاتەوە بەر چاوی ئێمە، کە ئێمەی مرۆڤ بە هۆی ئەو هەبوونی هەردوو ڕەگەزی نێرو مێیەوە، هەم ژیانی کۆمەڵایەتییمان بەڕێوەدەچێ، بەو واتایەی پیاوان هۆگری ئافرەتانن و ئافرەتان هۆگری پیاوانن، هەم بەهۆی ئەو حاڵەتی جووتییەتییەشەوە، وەچەی بەشەر لەسەر زەوی بەردەوام دەبێ.

www.alibapir.com


**دووەم:** ئاماژەیە بۆ ئەوە کە هەر کام لە نێرو مێ، پشک و بەشیان هەیە لە دروستکردنی نوتفەدا، ئەو نوتفەیەی کە مرۆڤی لێ پێک دێ، وەک لە فەرمایشتی پێغەمبەریشدا ﷺ بە ڕاشکاویی هاتوە، کە دەفەرموێ: {**أَمَّا الشَّبَهُ إِذَا سَبَقَ مَاءُ الرَّجُلِ مَاءَ الْمَرْأَةِ، ذَهَبَ بِالشَّبَهِ، وَإِذَا سَبَقَ مَاءُ الْمَرْأَةِ مَاءَ الرَّجُلِ، ذَهَبَتْ بِالشَّبَهِ**} (**أخرجه أحمد: ١٢٠٧٦، وعبد بن حميد: ١٣٨٩، والبخاري: ٣٧٢٣، وابن حبان: ٧١٦١**).

واتە: بەڵام هۆکاری پێچوون (بە باب لە نێرایەتیی دا، یان بە دایک لە مێیایەتیی دا) هەرکات ئاوی پیاوەکە پێش ئاوی ژنەکە کەوت، منداڵەکە دەچێتەوە سەری و، ئەگەر ئاوی ژنەکەش پێش ئاوی پیاوەکە کەوت، منداڵەکە دەچێتەوە سەری (دەچێتەوە سەر ژنەکەو مێینە دەبێ).

ئەمە ئاماژەیە بۆ ئەوە، کە ئاوی پیاو {(**حَيْمَن**)ەکەی} دوو جۆرە: (X ،Y) بەڵام هی ئافرەت (XX)ە، ئنجا ئەگەر جۆری (حیمن)ەکەی پیاو جۆری (Y) بێ، هی ئافرەت دا کە هەمیشە (X)ە، یەک بگرێ، ئەوە نێر دەبێ و، ئەگەر حەیمەنەکەی پیاویش جۆری (X) بێ، لەگەڵ (X)ی ئافرەت دا، مێ دەردەچێ، مەبەست لە زاڵبوونەکەش وا پێدەچێ ئەوە بێ: ئایا ئاوی ئافرەتەکە وادەکات، تەنیا لەگەڵ جۆری (X)دا، یەک بگرێ و هێلکۆڵەی ئافرەت تەنها جۆری (X)ی، حەیمەن پەلکێش دەکات، یاخود ئاوی پیاوەکە زاڵ دەبێ، کە ئەگەر حەیمەنەکەی ئاوی پیاو جۆری (Y) بێ کوڕو، ئەگەر جۆری (X)یش بێ، کچ دەردەچێ، بەڵام کاتێک کە قورئان دابەزیوە، وا باوبووە ئەوەی کۆرپەلەی لێ دروست دەبێ، تەنیا ئاوی پیاوەو، ڕۆڵبینینی ئافرەت تەنیا ئەوەیە، کە ئاوی پیاو، لە نێو منداڵدانی ئافرەتدا، گەشە دەکات، بەڵام هەم ئەم ئایەتە موبارەکە، ئاماژەی پێدەکات و، هەم فەرمایشتەکەی پێغەمبەر ﷺ یش بە ڕاشکاویی دەیفەرموێ و، لە سوورەتی (**الحجرات**)یش داخوا ﷻ بە ڕاشکاویی دەیفەرموێ: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ إِنَّا خَلَقۡنَٰكُم مِّن ذَكَرٖ وَأُنثَىٰ ١٣﴾.

www.alibapir.com


**سـەرنجی دووەم:** کـە دەفەرمـوێ: ﴿ مِن نُّطْفَةٍ إِذَا تُمْنَىٰ ﴾، (إِذَا) بـۆ کات بـەکاردێ، چونکـە (إِذَا) (ظـرف زمـان) نـاوی کاتـەو، ئەمـە ئاماژەیـە بـەوە کـە هـەر لەگـەڵ ئـەو نوتفەیـە چـووە نێـو منداڵـدانی ئافرەتـەوە، یەکسـەر ئـەو کۆرپەلەیـە دەسـت بـە دروسـتبوون دەکات، واتـە: زینـدەوەری تـۆوی پیـاو کـە دەچێتـە نێـو هێلکۆڵـەی ئافرەتـەوەو، بـە هەردووکیـان (نُطْفَـة) پێکدێنـن، ئـەو (نُطْفَة)یـە دادەبـەزێ بـۆ نێـو منداڵـدان و، لـە ئەنجامـی ئـەوەدا ئـەو کۆرپەلەیـە دروسـت دەبـێ و، ئەگـەر خـوا مۆڵـەتی لەسـەربێ، دەسـت دەکات بـە گوزەرانـدنی قۆناغـەکانی: خوێنپـارە (عَلَقَـة) و زارجـوو (مُضْغَـة)، ئنجـا ئێسـقان (عظـام)، دوایـی بـە گۆشـت داپـۆشران و، ڕووح بـە بەرداکـران.

**سـەرنجی سـێیەم:** وشـەی (تُمْنَـى) بەکارهاتـوەو، ئەمـەش ئاماژەیـە بـەوە کـە ئـەو تـۆوەی پیـاو، دەدلۆپێـنرێ و دەڕژێتـە سـەر شـتێکی دیکـەی بەرانبـەری، چونکـە ڕژان، کـە دەفەرمـوێ: ڕژاندیـە سـەری، ئەمـە خوازیـاری ئەوەیـە شـتێکی دیکـەش هەبـێ، ڕژابێتـە سـەری، ئەمـەش ئاماژەیـە بـەوە کـە تـۆوی پیـاو دەڕژێتـە سـەر ئـاوی ئافـرەت، هێلکۆڵـەی ئافـرەت، کـە ئەویـش لـە نێـو ئـاوی ئافرەتدایـەو زینـدەوەری تـۆوی (الحیـوان المنـوي)ی پیـاو، کـە کورتەکـەی (حَیمـن)ە، لەگـەڵ هێلکۆڵـە (بُوَیْضـة) ی ئافـرەت دا، یەکدەگـرن و دروسـتکراوێکی دیکـەی سـێیەم کـە پێـی دەگوتـرێ: (نُطْفَـة) پێکدێنـن، کەواتـە: وشـەی دەڕژێـنرێ (تُمْنَـى) ئاماژەیـە، بـەوە کـە ئـاوی پیـاو دەڕژێتـە سـەر شـتێکی دیکـەو، دەڕژێتـە سـەر دروسـتکراوێکی دیکـەو دوایـی بـە هەردووکیـان ئـەو مرۆڤـە یـان لـێ پێـك دێ، بـە مۆڵـەتی خـوا.

ئێمـە لـە تەفسـیری سـووڕەتی (المؤمنـون)دا، بـە درێژیـی لـە بـارەی چۆنیەتیـی دروسـتکرانی مرۆڤـەوە لەلایـەن خـوای پـەروەردگارەوە، قسـەمان کـردوە.

ئێسـتاش دێینـە سـەر کورتـە باسـێک لـە بـارەی بەهرەمەنـد بـوونی مرۆڤـەوە، لـە چاکـەی جگەلـە خـۆی:

www.alibapir.com


كورتە باسێک لە بارەی بەهرەمەندبوونی مرۆڤەوە

لە چاكەی جگەلە خۆی

بەڕێـــــزان!

ئەم كورتە باسە لە سێ تەوەردا دەخەینەڕوو:

## تەوەری یەكەم: ڕاجیایی زانایان لە بارەی بەهرەمەندبوونی مرۆڤەوە لە كردەوەی جگەلە خۆی:

مشـتومڕو ڕاجیایـی زانایـان لـە بـارەی بەهرەمەنـد بـوونی مـرۆڤ لـە كـردەوەی جگەلـە خۆیـەوە، زۆرە، هـەر لـە سـەرەتاوە، چ لـە نێـو هاوەڵانـدا (خـوا لێیـان ڕازی بـێ)، دوایـی لـە نێـو تابیعیـن دا، تاكـو دەگاتـە ڕۆژگاری ئێمـە و، ئێسـتاش ڕاجیایـی و مشـتومڕ لـەو بارەیـەوە زۆرە، كـە ئایا مـرۆڤ، لـەلای خـوای پـەروەردگار، بـۆ قیامـەت و ڕۆژی دوایـی، لـە كـردەوەی چاكـی جگەلـە خـۆی بەهرەمەنـد دەبـێ، یـان نـا؟

بابزانین چۆن و بۆچی؟

ئـەو ئایەتـە موبارەكـەی دەفەرمـوێ: ﴿ وَأَن لَّيْسَ لِلْإِنسَٰنِ إِلَّا مَا سَعَىٰ ﴾، یەكێـک لـەو ڕاسـتییانەیە كـە لـە لاپـەڕەكانی مووسـاو ئیبراهیمـدا (عَلَيْهما الصَّلاَةُ وَالسَّلاَم) هـەن، كـە مـرۆڤ نابێتـە خـاوەنی هیـچ شـتێک، مەگـەر بەرهەمـی كۆشـش و هەوڵـدانی خـۆی بـێ.

ئنجـا هەندێـک لـە زانایـان وای لـێ حاڵیـی بـوون: كـە مـرۆڤ لـە كـردەوەی هیـچ كـەسی دیكـە بەهرەمەنـد نابـێ، تەنانـەت ئیـمام شـافیعیی (ڕەحمـەتی خـوای لـێ بـێ)، زانـراوە كـە گوتوویـەتی: كەسـێک قوڕئـان بخوێنـێ و پاداشـتەكەی بـۆ یەكـی دیكـە بـە دیاریـی بنێـرێ، پاداشـتەكەی نـاگات، بـەو كەسـەی بـۆی دەنێـرێ.

www.alibapir.com


ئێستاش با سەرنجی شەش جۆرە بۆچوونی زانایان بدەین، کە هەندێکیشیان پێک دەچن و دەچنەوە نێو یەکدی:

١- عیکریمە کە قوتابی عەبدوڵڵای کوڕی عەبباسە، (خوا لێیان ڕازی بێ) دەڵێ: ﴿ وَأَن لَّيْسَ لِلْإِنسَٰنِ إِلَّا مَا سَعَىٰ ﴾: (**حِكايَةٌ عَنْ شَرِيعَةٍ سَابقَةٍ فَلاَ تَلْزَمُ فـي شَرِيعَتِنَا**)، واتە: ئەمە گێڕانەوەی بەرنامەیەکی پێشووە و، لە شەریعەتی ئێمەدا پێویست و پابەندکەر نیە، (**أي: إن قَبُولَ عَمَلِ أَحَدٍ عَنْ غَيْرِهِ، مِن خَصَائِصِ هَذِهِ الأُمَّةِ**)، واتە: ئەوە کە کەسێک لە کردەوەی جگەلە خۆی بەهرەمەندبێ، لە تایبەتمەندییەکانی ئوممەتی پێغەمبەرە ﷺ، بەڵام ئەوەی خوا فەرموویەتی: لە لاپەڕەکانی مووساو ئیبراهیمدا هەیە، ئەوە بەنسبەت شەریعەتی ئەوانەوەیە.

من جارێ بەس ڕایەکان دێنم و قسەی خۆمیان لەسەر ناکەم.

٢- ڕەبیعی کوڕی ئەنەس، وشەی (**الإنسان**)ی، کە دەفەرموێ: ﴿ وَأَن لَّيْسَ لِلْإِنسَٰنِ إِلَّا مَا سَعَىٰ ﴿٣٩﴾ ﴾، بەوە مانا کردوە، کە مەبەست پێی ئینسانی بێبڕوایە، گوتوویەتی: بەڵام بابای بڕوادار، هەم لە کردو کۆششی خۆی بەهرەمەندە، هەم لە هی جگەلە خۆشی، مادام بیکاتە دیاریی و خەڵات و پێشکەشی بکات.

٣- هەندێ لە زانایان ئەم ئایەتەیان وا مانا کردوە، کە مرۆڤ لە کردەوەی جگەلە خۆی بەهرەمەند نابێ، ئەگەر کەسێک کردەوەکەی نەدات بەو کەسەی دەیەوێ لێی بەهرەمەند بێ: (**أَنَّهَا نَفَتْ أَنْ تَكُونَ لِلْإنسانِ فائِدَةُ ما عَمِلَهُ غَيْرُهُ، إذا لَمْ يَجْعَلِ السَّاعِي عَمَلَهُ لِغَيْرِهِ**)، ئەمەش شتێکی ڕوون و ئاشکرایە، کە ئەگەر کەسێک کردەوەکەی خۆی بە دیاریی نەدات بە کەسێک، ئەو کەسەی دووەم بەدڵنیایی بەهرەمەند نابێ لە کردەوەی کەسی یەکەم، مادام نەیداتێ، هەر کەسێک کردەوەکەی هی خۆیەتی.

٤- ئیبنو فەڕەس پێی وابووە ڕواڵەتی ئایەتەکە جێبەجێ دەکرێ و، هیچ کەس لە کردەوەی هیچ کەس بەهرەمەند نابێ، کەسێک بۆ خۆی کردەوەیەکی نەکرد بێ، با خەڵکێکی دیکە کردەوەی باش بکات: ڕۆژووی سوننەت دەگرێ و بۆی دەکاتە

دیاریی، حەج و عەمرە دەكات و بۆی هەدیە دەكات، قورئان دەخوێنێ و بۆی هەدیە دەكات، لێیان بەهرەمەند نابێ.

٥- (**القرطبي**) بۆچوونی وایە كە پاداشتی هەندێك لە كردەوان دەگات بە جگەلە ئەنجامدەرانی ئەو كردەوانە، واتە: بە گشتیی ئەوە بنەمایەكەو هەیە، بەڵام كە دێینە سەر وردەكارییەكان، زانایان ڕاجیاییان پەیدادەبێ، (**القرطبي**)[1] ئەو ڕایەی خۆی هێناوە، (**إبن عاشور**)یش بۆچوونەكەی وەک هی (**القرطبي**)یەو هەردووكیان لەم بۆ چوونەی پێنجەم دا دەیانهێنم، دەڵێ: (**واعْلَمْ أنَّ أدِلَّةَ لِحاقِ ثَوابِ بَعْضِ الأعْمالِ إلى غَيْرِ مَن عَمِلَها، ثابِتَةٌ عَلى الجُمْلَةِ، وإنَّما تَتَرَدَّدُ الأنْظارُ فِـي التَّفْصِيلِ أوِ التَّعْمِيمِ**)[2]، واتە: بەڵگەی ئەوە كە پاداشتی هەندێك لە كردەوەكان دەگات بە جگەلە خۆیان، مادام ئەو كەسەی كردەوەكەی ئەنجامداوە، بیكاتە دیاریی بۆ ئەو كەسە، ئەوە شتێكی چەسپاوە، بەڵام لە وردەكارییەكاندا ڕاجیایی هەیە.

٦- (الطبري) لە تەفسیرەكەی خۆیدا[3] دەڵێ: (**رُوِيَ عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ** رضي الله عنهما **أَنِ هَذِهِ الآيَةَ مَنْسُوخَةٌ، قَالَ: نَزَلَ قَوْلُهُ تعالى:** ﴿وَأَن لَّيْسَ لِلْإِنسَـٰنِ إِلَّا مَا سَعَىٰ ٣٩﴾، **فَأَنْزَلَ الله بَعْدَ هَذَا:** ﴿وَٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَٱتَّبَعَتْهُمْ ذُرِّيَّتُهُم بِإِيمَـٰنٍ أَلْحَقْنَا بِهِمْ ذُرِّيَّتَهُمْ ٢١﴾ **الطور، فَأَدْخَلَ اللَّهُ الأَبْنَاءَ الْجَنَّةَ بِصَلاَحِ الْآبَاءِ**)، ئیبنو عەبباس رضي الله عنهما (ئەمە وا لەو گێڕدراوەتەوە، ئنجا ئایا ڕاستە یان نا؟ نازانم، گوایە) گوتوویەتی: دوای ئەوەی ئەم ئایەتە هات و دابەزی: ﴿وَأَن لَّيْسَ لِلْإِنسَـٰنِ إِلَّا مَا سَعَىٰ ٣٩﴾، خوا ئەم ئایەتەی دابەزاند: ﴿وَٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَٱتَّبَعَتْهُمْ ذُرِّيَّتُهُم بِإِيمَـٰنٍ أَلْحَقْنَا بِهِمْ ذُرِّيَّتَهُمْ وَمَآ أَلَتْنَـٰهُم مِّنْ عَمَلِهِم مِّن شَىْءٍ ۚ كُلُّ ٱمْرِئٍۭ بِمَا كَسَبَ رَهِينٌ ٢١﴾ **الطور**، ئەوانەی بڕوایان هێناوەو وەچەكەشیان بە ئیمانەوە بە شوێنیان كەوتوون، وەچەكانیان بە وانەوە پەیوەست دەكەین و لە كردەوەی ئەوانیش كەم ناكەینەوە، هەركەسەو بارمتەی كردەوەی خۆیەتی.

---

(١) ج١٧، ص٩١.

(٢) التحرير والتنوير: ج١١، ص١٣٣.

(٣) جامع البيان: برقم: ٣٢٧٠٢.

www.alibapir.com


ئیبنو عەبباس خوا لە خۆی و بابی ڕازی بێ، دەڵێ: خوا ڕۆڵەکانی بە هۆی چاکی بابەکانەوە خستنە بەهەشتەوەو بەوانیەوە پەیوەست کردن.

ئەوان زاراوەی (**نسخ**)یان بەکارهێناوە بۆ تایبەتکردن (**تخصیص**)، یانی: تەعبیرێک بە گشتیی هاتوە، بەڵام تەعبیرێکی دیکە، چەمکی ئەو تەعبیرە گشتییەی تایبەت کردوە بە هەندێک لە تاکەکانیەوە، یاخود تەعبیرێک بە ڕەهایی هاتوەو تەعبیرێکی دیکە هاتوە، بەنددار (**مُقَیَّد**)ی کردوە بە هەندێک لە تاکەکانیەوە، مەرج نیە (**نسْخ**) مەبەست پێی ئەوە بێ کە حوکمەکەی لابردوە.

هەڵبەتە ئەوە لە حاڵێکدا کە ئەو گێڕدراوەیە لە عەبدوڵڵای کوڕی عەبباسیشەوە (خوا لە خۆی و بابی ڕازی بێ) ڕاست بێ.

کەواتە: بە گشتیی ئەم شەش بۆچوونە هەن، لە بارەی ئەو ئایەتە موبارەکەوە، ئەوە تەوەری یەکەم: مشتومڕو ڕاجیایی زانایان لەو بارەوە.

## تەوەری دووەم: بیست بەڵگە لەسەر بەهرەمەند بوونی مرۆڤ لە کردەوەی جگە لە خۆی:

زانایان زۆر بەڵگەیان هێناونەوە، بەڵام من کە تەماشای تەفسیرەکانم کرد، لە هەموویان کۆکەرەوەتر ئەوە بوو کە خاوەنی تەفسیری (**صفوة البيان لمعاني القرآن**)[1] هێناویەتی، ئەویش لە تەفسیری (**العلامة الجمل**)، لە پەراوێزەکەی لەسەر تەفسیری (**الجلالين**)، ئەویش لە ئیبنو تەیمییەوە ڕەحمەتی خوای لێ بێ، نەقڵی دەکات، منیش وێڕای هێنانی ئەو بیست (٢٠) بەڵگەیە، بە پێی پێویست ڕوونکردنەوەی خۆشمیان لەبارەوە دەدەم، ئەوانەیان کە بەپێویستیان بزانم، ئیبنو تەیمییە (**إبن تيمية**) گوتوویەتی: (**مَنِ اعْتَقَدَ أَنَّ الإِنْسَانَ لَا يَنْتَفِعُ إِلاَّ بِعَمَلِهِ فَقَدْ خَرَقَ الإِجْمَاعَ، وَذَلِكَ بَاطِلٌ مِنْ وُجُوهٍ**)، واتە: هەر کەسێ بڕوای وابێ: مرۆڤ

---

(١) تأليف: الشيخ حسين محمد مخلوف)، ط٣، ص (٦٧٨ و ٦٧٩).

www.alibapir.com



تەنیا لە کردەوەی خۆی بەهرەمەندە، ئەوە یەکدەنگیی زانایانی دڕیوەو لە یەکدەنگیی زانایان چۆتە دەرێ، ئەوەش پووچ و هەڵەیە لە چەند ڕوویێکەوە (بە چەند بەڵگەیەک):

**بەڵگەی یەکەم:** (**أَحَدُهَا: أَنَّ الإِنْسَان يَنْتَفِعُ بدُعَاء غَيْره، وهو انتِفَاعٌ بعَمَلِ الغَيْر**)، شتێکی سەلمێنراو و مسۆگەرە، کە مرۆڤ لە پاڕانەوەی جگەلە خۆی بەهرەمەندە، ئەوەش بەهرەمەند بوونە لە کردەوەی جگەلە خۆ.

بۆیەش هیچ بەڵگەی نەهێناونەوە، چونکە شتێکی زۆر ئاشکرایە، بۆ وێنە: خوا ﷻ لە سوورەتی (**الحشر**) دا باسی کۆچکەران دەکات، دوای باسی پشتیوانان دەکات، ئنجا دەفەرموێ: ﴿وَٱلَّذِينَ جَآءُو مِنۢ بَعْدِهِمْ يَقُولُونَ رَبَّنَا ٱغْفِرْ لَنَا وَلِإِخْوَٰنِنَا ٱلَّذِينَ سَبَقُونَا بِٱلْإِيمَٰنِ ١٠﴾، ئەوانەی لە دوای کۆچکەران و پشتیوانانەوە دێن (کە هەموو مسوڵمانان دەگرێتەوە، تاکو ئاخیر زەمان) دەڵێن: پەروەردگارمان! لە ئێمەو ئەو برایانەمان خۆشبە، کە بە ئیمانەوە پێشمان کەوتوون.

هەروەها هەرکام لە نووح ﷺ و ئیبراهیم ﷺ بۆ بڕواداران بە گشتیی دەپاڕێنەوەو، پێغەمبەری خاتەم ﷺ، بە هەمان شێوەو، مەگەر چۆن ئەگەرنا هەموو پێغەمبەران دوعایان کردوە بۆ بڕواداران بە گشتیی.

**بەڵگەی دووەم:** (**ثَانِيَهَا: أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ يَشْفَعُ لأَهْلِ المُوقِف فـي الحِسَابِ ثُمَّ لأَهْلِ الجَنَّةِ في دُخُولِهَا ثم في رفع درجاتهم**)، (شتێکی سەلمێنراوە) کە پێغەمبەر ﷺ بۆ خەڵک کە ڕادەوەستێنرێن، لە ڕۆژی لێپرسینەوەدا، تکا دەکات، تاکو دەست بە لێپرسینەوەو سزا و پاداشت بکرێ و، دوایش تکا دەکات بۆ بەهەشتییان کە بچنە نێو بەهەشتەوەو، دواییش تکا بۆ بەهەشتییان دەکات، تاکو بە هۆی تکا کردنی پێغەمبەرەوە ﷺ پلەیان بەرزتر بێتەوە.

ئەمیش لە فەرمووده ڕاستەکاندا کە بوخاریی و موسلیم هێناویانن، هاتووەو تەنانەت هەندێکیان ئەو ئایەتە موبارەکەی دەفەرموێ: ﴿أَن يَبْعَثَكَ رَبُّكَ مَقَامًا

مَحۡمُودٗا ﴿٧٩﴾ الإسراء، بەوە تەفسیر دەکەن و ئێمەش لە دوعای دوای بانگ دا دەڵێین: (وَابْعَثه مَقَاماً مَحْمُوداً الّذِي وَعَدته)، خوایە! ئەو پێگە تێدا ستاییشکراوەی گفتت پێیداوە، پێیبدە. (المقام المحمود) واتە: ئەو پێگەیەو پلەیەی پێغەمبەر ﷺ کە ستایشکراوەو هەموو مرۆڤایەتیی ستایشی دەکات، چونکە کارێک دەکات هەموو مرۆڤایەتیی لێی بەهرەمەند دەبێ، ئەویش ئەوەیە کە لە ڕۆژی کۆکرانەوەو بۆ لێپرسرانەوەدا، تکا دەکات دەست بکرێ بە لێپرسینەوەو، هەر کەسەو بە شوێنی خۆی بگات.

**بەڵگەی سێیەم:** (ثَالِثُهَا: أنه ﷺ يشفع لأهل الكبائر في الخروج من النار، وهذا انتفاع بسعي الغير)، کە پێغەمبەر ﷺ تکا دەکات بۆ خاوەنی گوناهە گەورەکان، تاکو لە ئاگر بێنە دەرێ و، ئەوەش بەهرەمەند بوونە لە کۆشش و کاری جگەلە خۆ.

ئەویش پێغەمبەری خوا ﷺ لە چەند فەرموودەیەک دا فەرموویەتی: هەرکەس ئەهلی ئیمان بێ، بەڵام گوناهبار بێ و، شایستەی سزادران بێ، دەسووتێنرێ و سزا دەدرێ، بەڵام دوایی پێغەمبەری خوا ﷺ تکایان بۆ دەکات و دەربازیان دەبێ.

**بەڵگەی چوارەم:** (رابعها: أن الملائكة يستغفرون ويدعون لمن في الأرض، وذلك منفعة بعمل الغير)، بێگومان فریشتەکانیش دەپاڕێنەوەو داوای لێبوردن دەکەن، بۆ ئەو خەڵکەی لەسەر زەوین و، ئەوەش بێگومان سوودمەند بوونە بەهۆی کردەوەی جگەلە خۆوە.

خوای پەروەردگار لە سووڕەتی (غافر)دا، دەفەرموێ: ﴿ٱلَّذِينَ يَحۡمِلُونَ ٱلۡعَرۡشَ وَمَنۡ حَوۡلَهُۥ يُسَبِّحُونَ بِحَمۡدِ رَبِّهِمۡ وَيُؤۡمِنُونَ بِهِۦ وَيَسۡتَغۡفِرُونَ لِلَّذِينَ ءَامَنُواْ ﴿٧﴾﴾، داوای لێبوردن (لە خوا) دەکەن بۆ بڕواداران، هەروەها لە سووڕەتی (الشورى)شدا، هاتووە کە فریشتەکان داوای لێبوردن دەکەن بۆ خەڵکی سەر زەوی: ﴿وَيَسۡتَغۡفِرُونَ لِمَن فِي ٱلۡأَرۡضِ ﴿٥﴾﴾.

**بەڵگەی پێنجەم:** (خامسها: أن الله تعالى يخرج من النار من لم يعمل خيراً قط «أي: من المؤمنين» بمحض رحمته، وهذا انتفاع بغير عملهم)، {ئەمەش لە فەرموودە

صەحیحەکانـدا هاتـوە} کە خوا ﷺ کەسانێک لە بڕواداران لە ئاگری دۆزەخ دەردێنـێ، هەرگیـز چاکەیەکیـان نەکـردوە، تەنیـا بـە ڕەحمـەتی خـۆی و، ئـەوەش بەهرەمەنـد بـوونی بڕوادارانـە، لـە کـردەوەی جگەلـە خۆیـان.

**بەڵگـەی شەشـەم:** (سادسـها: **أن أولاد المؤمنين يدخلـون الجنـة بعمـل آبائهـم، وذلـك انتفـاع بمحـض عمـل الغـير**)، ئەوەیـە کـە ڕۆڵـەکانی بـڕواداران دەچنـە بەهەشـتەوە، بـە هـۆی کـردەوەی بـاب و دایکیانـەوەو بەهرەمەندبوونـە لـە کـردەوەی جگەلـە خـۆ. وەک لـە سـووڕەتی (الطـور)دا خـوا دەفەرمـوێ: ﴿ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَٱتَّبَعَتْهُمْ ذُرِّيَّتُهُم بِإِيمَٰنٍ أَلْحَقْنَا بِهِمْ ذُرِّيَّتَهُمْ ﴿٢١﴾ ﴾، کـە پێشـتر مانامـان کـردوە.

**بەڵگـەی حەوتـەم:** (سـابعها: **قَـالَ اللـه تَعَـالَى في قصـة الغلامـين اليتيمـين:** ﴿ وَكَانَ أَبُوهُمَا صَٰلِحًا ﴿٨٢﴾ ﴾**الكهـف، فانتفعـا بصـلاح أبيهـما، وليـس مـن سـعيهما**)، خـوای بـەرز لـە بەسـەرهاتی دوو منداڵـە هەتیوەکـەدا دەفەرمـوێ: ﴿ وَكَانَ أَبُوهُمَا صَٰلِحًا ﴾ الكهـف، بابیـان مرۆڤێکـی بـاش بـوو، ئەوانیـش بەهرەیـان وەرگـرت لـە چاکیـی بابیـان و چاکیـی بابیشـیان کـردو کۆشـشی خۆیـان نیـە.

**بەڵگـەی هەشـتەم:** (ثامنهـا: **أَنَّ المَيِّـتَ يَنْتَفِـعُ بِالصَّدَّقَـة عَنْـهُ، وَبِالْعِتْـقِ، بِنَـصِ السُّـنَةِ وَالإِجْـمَاعِ، وَهُـوَ مِـنْ عَمَـلِ الغَـيْرِ**)، مـردوو بەهرەمەنـد دەبـێ لـەوە کـە خێـرو چاکـەی بـۆ بکـرێ، هەروەهـا کـە کۆیلـەی بـۆ ئـازاد بکـرێ {کاتی خـۆی کۆیلـە هەبـوون} ئەمـە هـەم بـە دەقـی سـوننەت و، هـەم بـە یەکدەنگیـی زانایـان و، ئـەو دووانـەش کـردەوەی جگەلـە کـردەوەی مردووەکـەن.

**بەڵگـەی نۆیـەم:** (تاسـعها: **أَنَّ الحَـجّ المَفْـرُوْض يَسْـقُطُ عَـنِ المَيِّـتِ، بِحَـجِ وَلِيِّـه بِنَـصِّ السُّـنَة، وهـو انْتِفَـاع بعَمَـلِ الغَـيْرِ**)، حەجـی فـەرز لەسـەر مـردوو لادەچـێ، ئەگـەر سەرپەرشـتیارەکەی حەجـی بـۆ بـکات، ئەمیـش بـە دەقـی سـوننەت هاتـوەو، ئـەوەش هـەر بەهرەمەنـد بوونـە لـە کـردەوەی جگەلـە خـۆ.

www.alibapir.com


**بەڵگەی دەیەم:** (عاشرها: **أَنَّ الحَجّ المَنْذُور أو الصَومَ المَنْذُور، يَسْقُطُ عَنِ المَيِّتِ بِعَمَل غَيْرِهِ، وهو انْتِفَاع بعَمَلِ الغَيْر**)، حەجێک کە لە خۆگیرابێ (نەزر کرابێ)و ڕۆژوویێک لە خۆ گیرا بێ، لەسەر مردوو لا دەچێ، ئەگەر جگەلە خۆی بۆی بکات، {ئەمەش بە دەقی سوننەت} ئەوەش هەر بەهرەمەند بوونە لە کردەوەی جگەلە خۆ.

**بەڵگەی یازدەیەم:** (حادي عشرها: **المَدِيْنُ قَدْ امْتَنَعَ ﷺ مِنَ الصَّلَاةِ عَلَيْهِ حَتَّى قَضَى دَيْنَهُ أَبُو قَتَادَة، وَقَضَى دَيْنَ الآخَرِ عَلي بن أَبِي طَالِب، وَانْتَفَع بِصَلَاة النَّبِي ﷺ وَهُوَ مِنَ عَمَلِ الغَيْرِ**)، بابایەکی قەرزدار هەبوو پێغەمبەر ﷺ نوێژی لەسەر نەکرد، تاکو قەتادە قەرزەکەی بۆ دایەوەو، یەکێکی دیکەش عەلی کوڕی ئەبی تاڵیب قەرزەکەی بۆ دایەوە خوا لە قەتادە و عەلی کوڕی ئەبی تاڵیب ڕازی بێ، پێغەمبەریش ﷺ دوای ئەوەی قەرزەکانیان بۆ درانەوە، نوێژی لەسەر کردن و، مسوڵمانەکانیش کە پێغەمبەری خوا ﷺ نوێژی لەسەر کردوون بە هرەمەند بوون و نوێژ لە سەر کردنەکەش کردەوەی یەکێکی دیکەیە.

**بەڵگەی دوازدەیەم:** (ثاني عشرها: **أَنَّ النَّبِي ﷺ قال لِمَن صَلَّى وَحْدَهُ: «أَلَا رَجُلٌ يَتَصَّدَقُ عَلَى هَذَا فَيُصَلِّي مَعَهُ» فَقَدْ حَصَلَ لَهُ فَضْلُ الجَمَاعَةِ بِفِعْلِ الغَيْرِ**)، پێغەمبەر ﷺ یەکێک بە تەنیا نوێژی دەکرد، فەرمووی: ئەرێ پیاوێک نیە، چاکەیەک لەگەڵ ئەمەدا بکات {خێرێکی پێ ببەخشێ و نوێژی لەگەڵدا بکات، بۆ ئەوەی نوێژەکەی ببێتە نوێژی بە کۆمەڵ} ئیدی کەسێک چوو نوێژی لەگەڵدا کرد کەواتە: خێر و پاداشتی نوێژی بە کۆمەڵی دەست کەوت، بە هۆی کردەوەی جگەلە خۆیەوە.

**بەڵگەی سێزدەیەم:** (ثالث عشرها: **أن الإنسان تبرأ ذِمَّتُهُ من ديون الغير، إذا قضاها عنه قاض، وذلك انتفاع بعمل الغير**)، مرۆڤ ئۆباڵی خاڵیی دەبێ، (واتە: قەرزی خەڵکی لەسەر نامێنێ)، ئەگەر قازیی و دادوەر لە جیاتی ئەو قەرزەکان بداتەوە، ئەوەش بەهرەمەند بوونە لە کردەوەی جگەلە خۆی.

**بەڵگەی چواردەم:** (**رابع عشرها: أن من عليه تبعات ومظالم، إذا حلِّل منها، سقطت عنه، وهذا انتفاع بعمل الغير**)، هەر کەسێک مافی کەسێکی لەسەر بێ، {بۆ وێنە: ستەمی لە کەسێک کرد بێ} هەرکات لێی ئازاد کرا لێی بوردرا، ئەو هەقانەی لەسەر لادەچن، ئەویش دیسان بەهرەمەند بوونە لە کردەوەی جگەلە خۆی.

**بەڵگەی پازدەیەم:** (**خامس عشرها: أن الجار الصالح ينفع في المحيا وفي الممات «كما جاء في الأثر»، وهذا انتفاع بعمل الغير**)، دراوسێی باش لە ژیان دا و لە دوای مردنیش، سوود دەگەیەنێ، وەک لە شوێنەواردا هاتووەو، ئەوەش بەهرەمەند بوونە لە کردەوەی جگەلە خۆی.

**بەڵگەی شازدەیەم:** (**سادس عشرها: أنَّ جَلِيْسَ أهل الذكر يُرْحَمُ بهم، وهو لم يكن معهم، ولم يجلس لذلك، بل لحاجة عَرَضَتْ له، والأعمال بالنِّيات، فقد انتفع بعمل غيره**)، کەسێک لەگەڵ کەسانێک دانیشتبێ یادی خوا بکەن، لەگەڵ ئەواندا بەزەیی لەگەڵ دەنوێنرێ، لەگەڵ ئەوەشدا یەکێک نەبووە لە وان و، بۆئەوەش نەچووە لەگەڵیاندا دابنیشێ [یادی خوا بکات، وەک لە فەرموودەی پێغەمبەردا هاتوە، بەڵکو ئیشێکی هەبووەو بەڵام رێی کەوتوەتە ئەو مەجلیسە} هەرچەندە کردەوەش بە نیەتە، کەچی بەهۆی کردەوەی ئەوانەوە کە یادی خوایان کردوە، ئەویش بەهرەمەند بووە.

**بەڵگەی حەڤدەم:** (**سابع عشرها: الصلاة على الميت، والدعاء له في الصلاة، انتفاع للميت بصلاة الحي عليه، وهو عمل غيره**)، نوێژکردن لەسەر مردوو و بۆ پاڕانەوەی لە نوێژدا، ئەوەش دیسان بەهرەمەند بوونی مردوویە لە نوێژی زیندوو لەسەری و نوێژی مردوو لەسەر مردووەکەش، کردەوەی جگەلە مردووەکەیە، کەچی لێشی بەهرەمەند بووە.

**بەڵگەی هەژدەیەم:** (**ثامن عشرها: أن الجمعة تحصل باجتماع العدد، وكذا الجماعة بكثرة العدد، وهو انتفاع للبعض بالبعض**)، نوێژی جومعە بە هۆی

www.alibapir.com


کۆبوونەوەی ژمارەیەک خەڵک پێک دێ، {لە دوو و سێ و چوارەوە تاکو چل و زیاتر ڕۆیشتوون} هەروەها نوێژی کۆمەڵیش لە ژمارەیەک پێک دێ، کە ئەویش بریتیە لە بەهرەمەند بوونی هەندێکیان لە هەندێکیان.

ئەگەر هەموویان پێکەوە کۆنەبنەوەو نوێژە بە کۆمەڵەکەیان و نوێژەی جومعەکەیان بۆ ناکرێ و، خێری نوێژی بە کۆمەڵ و جومعەیان، دەست ناکەوێ.

**بەڵگەی نۆزدەیەم:** (تاسع عشرها: **أنَّ الله تَعَالَى قَالَ لِنَبِيِّه** ﷺ: ﴿وَمَا كَانَ ٱللَّهُ لِيُعَذِّبَهُمْ وَأَنتَ فِيهِمْ ﴿٣٣﴾﴾، وَقَالَ: ﴿وَلَوْلَا رِجَالٌ مُّؤْمِنُونَ وَنِسَآءٌ مُّؤْمِنَٰتٌ لَّمْ تَعْلَمُوهُمْ أَن تَطَـُٔوهُمْ فَتُصِيبَكُم مِّنْهُم مَّعَرَّةٌۢ بِغَيْرِ عِلْمٍ لِّيُدْخِلَ ٱللَّهُ فِى رَحْمَتِهِۦ مَن يَشَآءُ ﴿٢٥﴾﴾، **فَقَدْ رَفَعَ الله تَعَالَى العَذَاب عَنْ بَعْضِ النَّاسِ بِسَبَبِ بَعْض، وَذَلِكَ انْتِفَاع بَعَمَلِ غَيْرِه**)، خوای بەرز بە پێغەمبەرەکەی خۆی ﷺ فەرمووە: ﴿وَمَا كَانَ ٱللَّهُ لِيُعَذِّبَهُمْ وَأَنتَ فِيهِمْ ﴿٣٣﴾﴾، خوا خەڵکی کۆمەڵگایەکەت هەتا تۆ لە نێویان دابی، سزایان نادات، هەروەها خوای بەرز فەرموویەتی: ئەگەر پیاوانێکی بڕوادارو ئافرەتانێکی بڕوادار نەبوونایە، کە ئێوە نەتاندەزانین، نەبادا زەبریان لێبدەن و بەهۆی وانەوە عەیبەو ئازارێکتان پێ بگات...

یانی: لەبەر ئەوە نەبووایە، خوا ڕووداوی حودەیبییەی بە جۆرێکی دیکە دەهێنایە پێش، کە صوڵح نەبێ و بەشەڕ بچنە نێو مەککەوە، بەڵام لەبەر ئەوە پیاوانێکی ئیماندار ئافرەتانێکی ئیماندار لە مەککەدا هەبوون، ئێوەش نەتاندەزانی و لەبەر دەست و پێیاندا دەچوون و دەفەوتان، لەبەر ئەوان خوای میهرەبان، صوڵحی حودەیبییەی هێنایە پێش.

کەواتـــە:

**أ-** ئەوە کە هەتا پێغەمبەری خوا ﷺ لە نێو خەڵکەکەدا بێ، خوا سزایان نادات، مانای وایە بەهرەیان وەرگرتوە لە بوونی پێغەمبەر ﷺ کە کردەوەی جگەلە خۆیانە.

www.alibapir.com


**ب-** هاوەڵانێ کە لە خزمەت پێغەمبەر ﷺدا بوون، بەهرەمەند بوون، کە شەڕیان بۆ نەیەتە پێش، بە هۆی ئەو پیاوو ئافرەتە بڕوادارانەوە کە لەو کاتەدا لە شاری مەککەدا بوون، بۆ ئەوەی لەبەر دەست و پێیاندا نەچن.

**بەڵگەی بیستەم و کۆتایی:** (**أَنَّ صَدَقَة الفِطْر تَجب على الصغير وغيره ممن يَمُونه الرجل، فإنه ينتفع بذلك من يُخرِج عنه ، ولا سعي له فيها**)، سەرفترە لەسەر بچووک و لەسەر جگەلە بچووکیش {ئەگەر شێت بێ و، گێل و نەخۆش بێ] مادام لەوانە بێ کە پیاو دەیانژیەنێ و مشووریان لێ دەخوات، ئنجا ئەو کەسەی زەکاتەکەی لە جیاتی دەدرێ، بەهرەمەند بووە، بێ ئەوەی بۆ خۆشی ڕۆڵی تێدا گێڕابێ و کۆششی بۆ کردبێ!

دوایی ئیبنو تەیمییە دەڵێ: (**وَمَنْ تَأَمَّلَ العِلْمَ، وَجَدَ انْتِفَاعِ الإنْسَانِ بِمَا لَمْ يَعْمَلْهُ مَا لاَ يَكَادُ يُحْصَى، فَكَيْفَ يَجُوزُ أَنَ تُتَأَوَّل الآيَةُ الكَرِيْمَةُ، عَلَى خِلاَفِ صَرِيْح الكِتَابِ وَالسُّنَّة، وَإِجِمْاعِ الأُمَّةَ؟!**) واتە: هەر کەسێک سەرنجی زانیاریی بدات، (واتە: زانیاریی شەرعیی) دەبینێ: هێندە حاڵەت هەن، لەوبارەوە کە مرۆڤ لە کردەوەی جگەلە خۆی بەهرەمەند دەبێ، کە نایەنە ژماردن، ئنجا چۆن دەبێ ئایەتەکە بە جۆرێ مانا بکرێ، کە پێچەوانەی دەلالەتی ڕاشکاوی قورئان و سوونەتی پێغەمبەر بێ ﷺ و، پێچەوانەی یەکدەنگیی و یەکڕایی تێکڕای زانایانی ئیسلام بێ؟!

واتە: ئەو ئایەتە دەبێ بە جۆرێکی دیکە مانا بکرێ، کە لەگەڵ ئەو بیست بەڵگەیەو، زیاتریش لەو بیست بەڵگەیەدا، تێکنەگیرێ، هەموو ئەوانەی یان لە قورئاندا هاتوون، یان لە سوونەتی پێغەمبەردا ﷺ و، ژمارەیەکیشیان یەکدەنگیی زانایانن، کە مرۆڤ لە کردەوەی جگەلە خۆی بەهرەمەند دەبێ.

کەواتە: کە خوا دەفەرموێ: ﴿ وَأَن لَّيْسَ لِلْإِنسَٰنِ إِلَّا مَا سَعَىٰ ﴿٣٩﴾ ﴾، مانای وانیە کە مرۆڤ لە کردەوەی جگەلە خۆی بە هیچ جۆرێک بەهرەمەند نابێ، بەڵکو

www.alibapir.com


ئـەوە مانایەكـی دیكـەی هەیـە، كـە پێشـتر شـتێكمان لـێ گـوت: بـەڵام لـە تـەوەری سـێیەمدا زیاتـر تیشـك دەخەینـە سـەر ئـەو ڕایـە، كـە چـۆن ئـەو ئایەتـە موبارەكـە لەگـەڵ ئـەو بیسـت (٢٠) بەڵگەیـەدا كـە هێنامانـەوەو هەموویـان بەڵگـەن لەسـەر ئـەوە كـە مـرۆڤ لـە كـردەوەی جگەلـە خـۆی بەهرەمەنـد دەبـێ، ئـەو ئایەتـە موبارەكـە چـۆن واتایەكـەی لەگـەڵ ئـەوەدا دەگونجـێ؟

## تەوەری سێیەم: چۆنیەتیی تەئویلكردن و گونجاندنی ئایەتی ژمارە (٣٩)ی سـووڕەتی (النجم)، لەگەڵ: بە هرەمـەند بوونی مـرۆڤ لە كردەوەی جگە لە خۆی دا:

ئـەو دوو ئایەتـە موبارەكـە: ﴿ وَأَن لَّيْسَ لِلْإِنسَٰنِ إِلَّا مَا سَعَىٰ ﴿٣٩﴾ وَأَنَّ سَعْيَهُۥ سَوْفَ يُرَىٰ ﴿٤٠﴾ ﴾، زانایـان هەوڵیانـداوە بـە چەنـد جۆرێـك واتایـان بكـەن، بـۆ ئـەوەی لەگـەڵ ئـەو ڕاسـتییانەی دیكـەدا، كـە دەقـەكانی دیكـە گرتوویانـە خۆیـان، تێـك نەگیرێـن، بەدڵنیاییش یەكێـك لـە نیشـانە هـەرە دیارەكانی فەرمایشـتی خـوا، ئەوەیـە كـە ئایەتەكانـی ناكۆكیـی و دژیەكیـی (تناقض)و تێكگیرانیـان لـە نێـوان دا نیـە، وەك دەفەرمـوێ: ﴿ وَلَوْ كَانَ مِنْ عِندِ غَيْرِ ٱللَّهِ لَوَجَدُوا۟ فِيهِ ٱخْتِلَٰفًا كَثِيرًا ﴿٨٢﴾ ﴾ النسـاء، ئەگـەر ئـەم (قورئـان)ە لـە لایـەن جگـە لـە خـواوە بووایـە، تێكگیـرانی زۆریـان تێـدا دەدی.

دوای سـەرنجدانم لـە قسـەو بیـروڕای زانایـان لەوبـارەوە، سـەرەنجام سـەرجەم شـەش جـۆرە بۆچوونـم كەوتنـە بەرچـاو:

### بۆچوونی یەكەم:

(القرطبـي) دەڵـێ: (قُلْـتُ: وَيَحْتَمِـلُ أَنْ يَكُـونَ قَوْلُـهُ: ﴿ وَأَن لَّيْسَ لِلْإِنسَٰنِ إِلَّا مَا سَعَىٰ ﴿٣٩﴾ ﴾، خَاصًّا فِي السَّيِّئَةِ، بِدَلِيلِ مَا فِي صَحِيحِ مُسْلِمٍ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رضي الله عنه، عَنْ النَّبِي ﷺ قَـالَ: قَـالَ اللَّـهُ عَـزَّ وَجَـلَّ: إِذَا هَـمَّ عَبْـدِي بِحَسَـنَةٍ وَلَـمْ يَعْمَلْهَـا، كَتَبْتُهَـا لَـهُ حَسَـنَةً، فَـإِنْ عَمِلَهَـا، كَتَبْتُهَـا لَـهُ عَـشْرَ حَسَـنَاتٍ إِلَى سَبْعِمِائَةِ ضِعْـفٍ، وَإِذَا هَـمَّ بِسَـيِّئَةٍ، وَلَـمْ يَعْمَلْهَـا لَـمْ

www.alibapir.com


أَكْتُبْهَا عَلَيْهِ، فَإِنْ عَمِلَهَا كَتَبْتُهَا سَيِّئَةً وَاحِدَةً} (أخرجه البخاري: ٧٠٦٢، ومسلم: ١٢٨، والترمذي: ٣٠٧٣، وقال: حسن صحيح، وابن حبان: ٣٨٠).

واتە: دەڵێم: دەگونجێ مەبەست لە فەرمایشتی خوا کە دەفەرموێ: ﴿ وَأَن لَّيْسَ لِلْإِنسَـٰنِ إِلَّا مَا سَعَىٰ ﴿٣٩﴾ ﴾، مرۆڤ تەنیا ئەوەی هەوڵی بۆ دەدات، لێی بەهرەمەندە، تایبەت بێ بە خراپەوە، کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: خوا (عزوجل) فەرموویەتی: ئەگەر بەندەکەم، ویستی چاکەیەک بکات، بەڵام نەیکرد، چاکەیەکی بۆ دەنووسم و ئەگەر چاکەکەی کرد، یەک بە دە (١٠/١) بۆی دەنووسم، تاکو حەوتسەدیش (٧٠٠) دەڕوات {بەپێی بەهێزیی نیازو مەبەستەکەی} و، ئەگەر ویستی خراپەیەک بکات و بە دڵی داهات، بەڵام نەیکرد، بۆی نانووسم، بەڵام ئەگەر خراپەکەی کرد، یەک خراپەی بۆ دەنووسم.

(القرطبي) وای لێکداوەتەوە کە لێرەدا تەنیا مەبەست پێی خراپەیەو، مرۆڤ تەنیا ئەوەی ئەنجامی دەدات، لە خراپە، لەسەری دەنووسرێ، بەڵام لە خراپەی جگە لە خۆی بۆ نایەت، بەڵام من بۆچوونەکەیم پێ بێهێزە، چونکە خوای دادگەر دەفەرموێ: ﴿ وَأَن لَّيْسَ لِلْإِنسَـٰنِ إِلَّا مَا سَعَىٰ ﴿٣٩﴾ ﴾، (ل)یش بۆ خاوەندارێتیی (تمليك)ەو، ئەویش بە زۆریی بۆ شتی باشە، ئنجا خوا نەیفەرمووە: (وأن لَيسْ عَلَى الإنْسَانِ إلاَّ مَا سَعَى). هیچ شتێک (لە تاوان) لە سەر مرۆڤ نیە، مەگەر ئەوەی هەوڵی بۆدابێ.

### بۆچوونی دووەم:

(وَقَالَ أَبُو بَكْرٍ الْوَرَّاقُ: ﴿ إِلَّا مَا سَعَىٰ ﴿٣٩﴾ ﴾، إِلَّا مَا نَوَى، بَيَانُهُ قَوْلُهُ ﷺ: يُبْعَثُ النَّاسُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ عَلَى نِيَّاتِهِمْ) (أخرجه أحمد: ٩٠٧٩، وابن ماجه: ٤٢٢٩، وأبو يعلى: ٦٢٤٧، وصحَّحه الألباني في صحيح الجامع: ٨٠١٤).

واتە: ئەبوو بەکری وەڕراق (کە یەکێکە لە زانایان) گوتوویەتی: ﴿ إِلَّا مَا سَعَىٰ ﴿٣٩﴾ ﴾، یانی: (إِلَّا مَا نَوَى)، مەگەر ئەوەی نیەتی لێ هێناوە، واتە: بۆ مرۆڤ هیچ

www.alibapir.com


بەهرە وەرگرتنێک نیە، مەگەر نیەتی لێ هینابێ (نیەتی لەو کردەوەیە هینابێ) ئەویش ئەو فەرمایشتەی پێغەمبەر ﷺ ڕوونی دەکاتەوە کە دەفەرموێ: لە ڕۆژی قیامەتدا، خەڵک بەپێی نیازو مەبەستیان زیندوو دەکرێنەوە.

کەواتە: کردەوەیەک کە مرۆڤ نیەتی لێ نەهێنابێ، بۆی نابێ، ئەگەرنا باسی ئەوە ناکات کە لە کردەوەی جگە لە خۆی بە هرەمەند نابێ کە بیکاتە دیاریی، بەڵکو خۆی تەنیا لەو کردەوانەی بەهرەمەند دەبێ (لە کردەوە چاکەکانی) کە نیەتی لێ هێنابێ و، نیازو مەبەستی بووبێ، ئەو کردەوە چاکە ئەنجام بدات بۆ خوا، بەڵام ئەگەر بەڵگەی بەو فەرمایشتەی پێغەمبەر هێنابایەوە، باشتر بوو، کە دەفەرموێ: {**إِنَّمَا الأَعْمَالُ بِالنِّيَّاتِ، وَإِنَّمَا لِكُلِّ امْرِئٍ مَا نَوَى**} (**أخرجه البخاري: ١**)، کردەوەکان، {واتە: کردەوە باشەکان} بە پێی نیازو مەبەستەکانن، بۆ هەر مرۆڤێک، بە پێی ئەوە کە نیازو مەبەستی لە دڵدا بووە، کردەوەکەی بۆ حیساب دەکرێ.

خاوەنی: (**صفوة البيان لمعاني القرآن**)، (**الشيخ حسين محمد مخلوف**)، لە تەفسیرەکەیدا[1] ئەو چوار ڕای دیکە دێنێ، وەک تەئویل کردن و، مانا لێکدانەوەی ئەو ئایەتە موبارەکە، بە جۆرێک کە لەگەڵ ئایەت و فەرمایشتەکان و بەڵگەکان دا، کە خستماننە ڕوو، تێکنەگیرێ.

### بۆچوونی سێیەم:

(**إِنَّ الآيَةَ عَامَّةٌ خُصِّصَتْ بِأُمُورٍ كَثِيرَةٍ مِمَّا ذُكِرَ**)، ئایەتەکە گشتییە، بەڵام تایبەت کراوە بە زۆر شت کە باسکران، واتە: ئایەتەکە بە گشتیی وایفەرمووە، بەڵام وەک بنچینەیەک هەیە، دەڵێ: (**مَا مِنْ عَامٍ إِلاَّ وَقَدْ خُصِّصَ**)، هیچ حوکمێکی گشتیی نیە، مەگەر تایبەت کراوە، ئنجا ئەو ئایەتە کە دەفەرموێ: ﴿وَأَن لَّيۡسَ لِلۡإِنسَٰنِ إِلَّا مَا سَعَىٰ ٣٩﴾، ئەمە گشتییە، بەڵام بەو ئایەتانەی دیکەو بەو فەرمایشتانەی پێغەمبەر ﷺ مانایەکەی تایبەت کراوە، واتە: تایبەت کراوە بە ئەوەوە کە مرۆڤ بەهرەمەند نابێ، مەگەر لە کردەوەی خۆی، جگە لە کردەوەی کەسانێک کە

---

(١) ص٦٧٩.

www.alibapir.com


هاوكاریی دەكەن و پێشكەشی دەكەن و بۆی دەنێرن، پاڕانەوەیە، حەج بۆ كردنە، ڕۆژوو بۆ گرتنە، قەرز بۆ دانەوەیە ...هتد.

## بۆچوونی چوارەم:

دەڵێ: (**إِنَّهَا مَخْصُوصَةٌ بِقَوْمِ مُوسَى وَإِبْرَاهِيْم لأَنَّهَا حِكَايَة عمَّا فِي صُحُفِهِما، أمَّا هَذِهِ الأمَّةُ فَلَهَا مَا سَعَتِ هِيَ، وَمَا سَعَى لَهَا غَيْرُهَا، بِدَلِيْل مَا ذُكِرَ، وَبِدَلِيْلِ قَوْلِه تَعَالَى: ﴿أَلْحَقْنَا بِهِمْ ذُرِّيَّتَهُمْ ﴿٢١﴾﴾ الطور، حَيْثُ أَدْخَلَ الأبْنَاء الجَنَّةَ بِصَلاحِ آبَائِهِمْ**) پێشتریش ئەم ڕایەمان هێنا، كە ئەم ئایەتە مووبارەكە تایبەتە بە گەلی مووساو ئیبراهیمەوە واتە: بە زاراوەی زانایانی (**أصول الفقه**)، لە بازنەی بەرنامەی پێش خۆمان (**شرع من قبلنا**) دایە، چونكە ئایەتەكە باسی ئەوە دەكات كە لە صوحوفی مووساو ئیبراهیمدا هاتوە {لە پەڕەكانی ئەواندا} بەڵام ئۆممەتی پێغەمبەری خاتەم ﷺ هەم ئەوەی بۆ خۆی كۆششی بۆ دەكات، لێی بەهرەمەندەو، هەم ئەوەش كە جگە لە خۆی كۆششی بۆ دەكات، مادام بیداتێ و پێشكەشی بكات، هەر لێی بەهرەمەندە، بە بەڵگەی ئەوە كە باسمان كردو، بە بەڵگەی قسەی خوای بەرزیش كە دەفەرموێ: ﴿أَلْحَقْنَا بِهِمْ ذُرِّيَّتَهُمْ ﴿٢١﴾﴾ **الطور**، وەچەكانیانمان بەوان گەیاند، كە ڕۆڵەكان خوا دەیانخاتە بەهەشتەوە، بە هۆی چاكیی دایك و بابیانەوە.

بەڵام بە مەرجێك ئەوانیش بڕوادار بن، كەواتە پەیوەستكردنیان بە باب و دایكیانەوە چۆنە؟ یانی: با ئەوان پلەشیان نزمتر بێ، لە بەهەشتدا، خوا دەیانگەیەنێ بە پلە بەرزەكانی لای باب و دایكیان.

## بۆچوونی پێنجەم:

(**إِنَّ سَعِي غَيْرِهِ لَمَا لَمْ يَنْفَعْهُ، إلاَّ مَبْنِيّاً عَلَى سَعِي نَفْسِه، وَهُوَ كَوْنِه مُؤْمِنَاً، كَانَ كَأَنَّهُ سَعِيُ نَفْسِه**)، هەوڵدان و كۆششی جگە لە خۆی، مادام سوودی پێ ناگەیەنێ، مەگەر بینا لەسەر كۆششەكەی خۆی، كە بریتیە لەوەی بڕوادار بێ، كەواتە: وەك

کۆششەکەی خۆی بێ، وایە، واتە: کەسێک بڕوادار نەبێ لە کردەوەی جگە لە خۆی بەهرەمەند نابێ، ئنجا بڕوا هێنانەکەش کردەوەی خۆیەتی، کەواتە: بەهۆی کردەوەی خۆیەوەیە، کە بڕوا هێنانە، لە کردەوەی جگە لە خۆی لە بڕوادارانی دیکە، کە بۆی بە دیاریی دەنێرن و پێشکەشی دەکەن و هاوکاریی دەکەن، بەهرەمەند دەبێ، کەواتە: وەک تەنیا لە کردەوەی خۆی بەهرەمەند بووبێ.

### بۆچوونی شەشەم:

**(إِنَّ الْمُرَادَ بِالإِنْسَانِ: الكَافِرُ، وَالْمَعْنَى: أَنَّهُ لَيْسَ لَهُ مِنَ الجَزَاءِ إِلَّا مَا عَمِلَ هُوَ، وَهَذَا هُوَ العَدْلُ، وَأَمَّا مِنْ بَابِ الفَضْلِ، فَجَائِزٌ أَنْ يَزِيْدَهُ الله مِنْ فَضْلِهِ مَا يَشَاء، وفِي الحَدِيْث الصَّحِيْح: إِذَا مَاتَ الإِنْسَانُ انْقَطَعَ عَمَلُهُ إلاَّ مِنْ ثلاَثَةِ: صَدَقَةٍ جَارِيَةٍ، أَوْ عِلْمٍ يُنْتَفَعُ بِهِ، أَوْ وَلَدٍ صَالِحٍ يَدْعُو لَهُ، أخرجه: البخاري، وَهَذَا كُلُّه تَفَضُّلٌ مِنْهُ تَعَالَى، كَمَا أن تَضْعِيْفَ الحَسَنَات فَضْلٌ مِنْهُ تَعَالَى).**

واتە: مەبەست لە ئینسان، ئینسانی بێبڕوایەو، مەبەست ئەوەیە کە تەنیا بەوەی کردوویەتی پاداشت دەدرێتەوە، ئەوەش دادگەرییە، هەروەک تەنیا لەسەر ئەوەی لە خراپە، کردوویەتی، سزا دەدرێ، ئەوەش وەک دادگەریی مامەڵەی خوا لەگەڵ نامسوڵماناندا، کە خوا ﷻ بە دادگەریی مامەڵەیان لەگەڵدا دەکات، نەک بە بەخشش و چاکەکاریی، بەڵام لەگەڵ بڕواداران دا، خوا بە چاکەکاریی و بەخشش مامەڵە دەکات، بۆیە لەلای خوا ئاسانە لە بەخششی خۆی بۆ هەر کەسێ بیەوێ، زیاد بکات {بە هۆی مسوڵمانانەوە کە دوعای بۆ دەکەن، دیاریی بۆ دەنێرن، هاوکاریی دەکەن} وەک لە فەرموودەی ڕاستی پێغەمبەریش دا ﷺ هاتووە دەفەرموێ: هەر کاتێک ڕۆڵەی ئادەم مرد، کردەوەکەی دەبڕێ، مەگەر لە سێ ڕێیانەوە: ١- چاکەیەکی بەردەوام و، ٢- زانیارییەک کە بەهرەی لێ وەربگیرێ و، منداڵێکی چاک کە بۆی بپاڕێتەوە، {دیسان چاکەی بەردەوام: مزگەوتی دروستکردوە، ڕێی چاک کردوە، خەستەخانەی دروست کردوەو،

قوتابخانەی دروست کردوە، هەر شتێک کە خەڵک بەهرەی باشی لێ وەربگرێ، تاکو ئەو شتە بمێنێ، ئەویش خێرو پاداشتی بۆ دەچێ. هەروەها زانیارییەک کە بەهرەی لێ وەردەگیرێ: قوتابیی پێگەیاندوون، بانگەوازی کردوە، کتێبی نووسیون، تاکو ئەو زانیارییە بمێنێ، ئەویش خێرو پاداشتی بۆ دەچێ.

منداڵی صاڵحیش کە بۆ باب و دایکی دەپاڕێتەوە، ئنجا ئەوانە هەرسێکیان و هاووێنەکانیشیان، مرۆڤ دوای خۆی بە هۆی ئەو جۆرە شتانەوە پاداشتی بۆ دەچێ} ئنجا ئەوەش هەمووی بەخششی خوای بەرزی مەزنە پەروەردگارە، هەروەک چۆن خوا بسم الله الرحمن الرحيم کە پاداشتی چاکەکانی چەند بەرانبەر دەکاتەوە، ئەویش هەر بەخششی خوای بەرزە.

### قسەیەکی کورتی بەندە لەوبارەوە:

پێم وایە کە خوا دەفەرموێ: ﴿ وَأَن لَّيْسَ لِلْإِنسَٰنِ إِلَّا مَا سَعَىٰ ﴿٣٩﴾ ﴾، واتە: ئینسان نابێتە خاوەنی جگە لە هەوڵ و کۆششەکەی خۆی، بەڵام هەوڵ و کۆششی جگە لە خۆی، بکەرەکەی جگە لە خۆی خاوەنیەتی، بەڵام ئەگەر ئەو خاوەنە، کردەوەکەی بکاتە دیاریی و خەڵات و هاوکاریی ئەو بڕوادارەی پێ بکات، با لە ئەسڵدا ئەو خاوەنیشی نەبێ، بەڵام لێی بەهرەمەند دەبێ، خواش نەیفەرمووە: لێی بەهرەمەند نابێ، فەرموویەتی: مرۆڤ تەنیا خاوەنی بەرهەمی هەوڵ و کۆششی خۆیەتی، بەڵام نەیفەرمووە: بەهرە وەرناگرێ لە هەوڵ و کۆششی جگە لە خۆی، مادام هاوکاریی بکەن و بە دیاریی بۆی بنێرن.

لە تۆڕە کۆمەڵایەتییەکان لەگەڵتانین
Stay in touch on social media
نحن معكم عبر مواقع التواصل الاجتماعي
ڕاگەیاندنی مەکتەبی مامۆستا عەلی باپیر
AliBapir/علی باپیر
archive.org/details/@alibapir
AliBapir/علی باپیر
AliBapir
www.alibapir.net
عربي - کوردی - English
کەناڵی ڕاگەیاندنی مەکتەبی مامۆستا عەلی باپیر
ڕاگەیاندنی مەکتەبی مامۆستا عەلی باپیر

www.alibapir.com


کورتە باسێک لە بارەی ئەستێرەی گەلاوێژەوە

خوا ﷻ فەرموویەتی: ﴿ وَأَنَّهُۥ هُوَ رَبُّ ٱلشِّعۡرَىٰ ﴿٤٩﴾ ﴾، یانی: یەکێک لە ڕاستییەکانی کە لە لاپەڕەکانی مووساو ئیبراهیمدا (عَلَيْهِمُ الصَّلَاةُ وَالسَّلَام) هاتوون، ئەوەیە کە خوا پەروەردگاری (شِعْرى)یە، کە بە کوردیی پێی دەڵێین: گەلاوێژ، ئەستێرەی گەلاوێژ، کوردەواریی خۆمان دەڵێن: (گەلاوێژ ئەنگوتوە) کاتێک لە کۆتایی هاوین دا بەرەو پاییز، کە ئەستێرەی گەلاوێژ دەردەکەوێ و ساڵ بەرەو فێنکیی دەچێ، هەندێک وایانزانیوە: ئەوە تیشکی ئەستێرەی گەلاوێژە دەگاتە ئێمەو تیشکەکەی بەلای ساردییدایە، بۆیە دنیا سارد دەبێ! بەڵام وانیەو کاتێک کەشی ساڵ، فێنک دەبێ و بەرەو پایز دەچێ، ئەو ئەستێرەیە ئەو کاتە دەردەکەوێ، نەک فێنک بوونی کەش و هەوا، کاریگەریی تیشکی ئەستێرەی گەلاوێژ بێ، گوایە ساردە! نەخێر، چونکە تیشکی ئەستێرەکان هەموویان گەرمە.

بێگومان خوا پەروەردگاری هەموو شتێکەو، خاوەنی تێکڕای ئەستێرەکانە، کەواتە: نهێنیی ئەوە چییە، کە بە تایبەت باسی (شِعْرى) ئەستێرەی گەلاوێژی کردوە؟ ئێمە لە سێ بڕگەدا باسی ئەستێرەی گەلاوێژ دەکەین، بۆچی خوا ﷻ بە تایبەت خاوەنداریێتیی خۆی بۆ ئەو ئەستێرەیە خستۆتەڕوو؟:

## ١- پێناسەیەکی ئەستێرەی گەلاوێژ:

(إبن عاشور) لە تەفسیرەکەی خۆی دا[1]، دەڵێ: (**الشِّعْرى: اسْمُ نَجْمٍ مِن نُجُومِ بُرْجِ الجَوْزاءِ شَدِيدُ الضِّياءِ ويُسَمّى: كَلْبَ الجَبّارِ؛ لِأنَّ بُرْجَ الجَوْزاءِ يُسَمّى الجَبّارُ عِنْدَ العَرَبِ أيْضًا، وسُمِّيَتِ الجَوْزاءَ لِشِدَّةِ بَياضِها في سَوادِ اللَّيْلِ تَشْبِيهًا لَهُ بِالشّاةِ**

(١) ج١١، ص١٥٠.

www.alibapir.com


**الجَوْزاءِ، وَهِيَ الشَّاةُ السَّوْداءُ الَّتِي وسَطُها أبْيَضُ، وَسُمِّي كَلْبَ الجَبّارِ لتَخَيُّلِ الجَبّارَ صَائِداً وَشِعْرَى يَتْبَعُه كَالْكَلِبِ وَقَدْ يَقُولُونَ: يَدُ الجَبَّار)**، (**شِعْرى**): ناوی ئەستێرەیەکە لە ئەستێرەکانی کەڵووی جەوزا، کە زۆر بە شۆقە، ئەو ئەستێرەیە پێشی دەگوترێ: (**كَلْبُ الجَبّار**)، سەگی جەببار، چونکە کەڵووی جەوزا لە لای گەلی عەرەب پێی دەگوترێ: (**جَبَّار**)، بۆیەش پێی دەگوترێ: کەڵووی (**الجوزاء**)، لەبەر ئەوەی لە کاتێکدا شەو زۆر ڕەشە، ئەو زۆر زۆر بە شۆقە، ئنجا چواندوویانە بە مەڕی جەوزائەوە، مەڕی جەوزائیش ئەو مەڕەیە کە ڕەش بێ، بەڵام لە نێوەڕاستیدا سپیەتیی هەبێ {واتە: شەویش کە زۆر تاریکەو، ئەو ئەستێرەی تێدا دەردەکەوێ، شێوەی ئەو مەڕەیە کە هەمووی ڕەشە، بەڵام خاڵی سپی تێدایە} بۆیەش بە (**شِعْرى**) گەلاوێژ گوتراوە: سەگی جەببار، چونکە وایانزانیوە جەببار ڕاوچییەو، (**شِعْرى**)، {ئەستێرەی گەلاوێژ}یش وەک سەگ دوای دەکەوێ بۆ ڕاوکردن، هەندێکیش گوتوویانە: (**يد الجَبَّار**)، دەستی جەببار.

## ٢- سەرەتای سەرهەڵدانی پەرستنی: گەلاوێژ لە نێو عەرەب دا:

لە فەرهەنگ و کلتووری عەرەبدا، بەو شێوەیە هاتوە، کە سەرەتا هۆزی (**خُزَاعَة**)، ئەستێرەی (**شِعْرى**)یان، پەرستوە، پیاوێک لە گەورەکانیان بە ناوی (**أبا كبشة**)، ئەو جۆرە پەرستنەی بۆ هێناون، بۆیەش عەرەبی قورەیش بە پێغەمبەری خاتەم موحەممەد ﷺ یان گوتوە: (**ابْنُ أبِي كَبْشَة**)، چونکە پێغەمبەری خوا ﷺ ئەو ئایین و پەیامەی خوای پەروەردگار هێنابووی، پێچەوانەی عادەتی ئەوان بوو، لە بت پەرستییداو دژی بت پەرستییەکەی ئەوان بوو، یان لەبەر ئەوەی (**أبو كبشة**)، لە باپیرانی پێغەمبەر بووە ﷺ لەسەری دایکیەوە، یان بۆ ئیخفاڵ کردنی خەڵکەکەیان کە بانگیان دەکات، گوایە: پێغەمبەر ﷺ بانگیان دەکات، بۆ پەرستنی (**شِعْرى**) ئەستێرەی گەلاوێژ، بەچی دەزانین کە قورەیش وایان بە پێغەمبەر گوتوە، گوتوویانە: (**إبْنُ أَبِي كَبْشَة**)؟ ئەبوو سوفیان و ئەوانەی

www.alibapir.com


لەگەڵیدابوون کاتێک هیرەقڵ باسی پێغەمبەری خوای لێ پرسین - وەک لە صەحیحی بوخارییدا[١] هاتوە - ئەوانیش وەڵامیان دایەوەو هیرەقل گوتی: ئەگەر ڕاست بکەن، ئەو (موحەممەد) ژێر پێی منیش دەگرێ، ئەبوو سوفیانیش گوتی: (**لَقَدْ أَمِرَ أَمْرُ ابْنِ أَبِي كَبْشَةَ، إِنَّه يَخَافُهُ مَلِكُ بَنِي الأَصْفَرِ!**)، کاری کوڕی ئەبی کەبشە وا گەورە بووە، تەنانەت حوکمڕانی ڕۆمەکانیش {ئەوان بە ڕۆمیان گوتوە: (**بَنو الأَصْفَرِ**)} لێی دەترسێ.

## ٣- چەند زانیارییەکی گەردوونیی لە بارەی ئەستێرەی گەلاوێژەوە:

**١-** بارستایی (**كتلة**)ی ئەستێرەی گەلاوێژ، بیست ئەوەندەی بارستایی خۆرە.

**٢-** تیشک و ڕووناکییەکەی گەلاوێژ، پەنجا هێندەی هی خۆرە.

**٣-** دووریی ئەستێرەی گەلاوێژ لێمانەوە: (١،٠٠٠،٠٠٠) ملیۆن هێندەی دووریی خۆرە لێمانەوە، ئنجا خۆر (١،٣٠٠،٠٠٠) جار لە زەوی گەورەترە لە ڕووی قەبارەوەو، (١٥٠،٠٠٠،٠٠٠)کم لە ئێمەوە دوورە، ئەستێرەی گەلاوێژ (١،٠٠٠،٠٠٠) هێندەی دووریی خۆر لێمانەوە دوورە، کەواتە:

ئەگەر بمانەوێ بزانین ئەستێرەی گەلاوێژ چەند کیلۆمەتر لێمانەوە دوورە؟ دەبێ: (١٥٠،٠٠٠،٠٠٠)کم - کە دووریی خۆرە لێمانەوە - جارانی (١،٠٠٠،٠٠٠)ی بکەین، کە ئەنجامەکەی ئاوادەبێ: (١،٠٠٠،٠٠٠ × ١٥٠،٠٠٠،٠٠٠)= سەدو پەنجا تریلیۆن کیلۆمەتر (١٥٠،٠٠٠،٠٠٠،٠٠٠،٠٠٠)کم لێمانەوە دوورە، یانی: (١٥٠) دوازدە سفری لە پێشەوە بن.

ئنجا بۆ ئەوەی بزانین بە ماوەی چەند ساڵان (ساڵی تیشکیی) تیشکی ئەستێرەی گەلاوێژمان دەگاتێ؟ دەبێ سەرەتا بزانین تیشک لە ساڵێکدا چەند کیلۆمەتر دەبڕێ، ئەویش بەوە دەبێ کە تیشک لە چرکەیەکدا: (٣٠٠،٠٠٠)

---

(١) أخرجه البخاري: ٢٧٨٢.

کم دەبڕێ، دەبێ ئەو (٣٠٠,٠٠٠)ە، جارانی (٦٠)ی بکەین، تاکو بزانین لە خولەکێکدا چەندە، (٣٠٠,٠٠٠ × ٦٠ = ١٨,٠٠٠,٠٠٠)کم، لە خولەکێکدا، ئنجا دوایی بۆ ئەوەی بزانین لە سەعاتێک دا تیشک چەند کیلۆمەتران دەبڕێ؟ (١٨,٠٠٠,٠٠٠) جارانی (٦٠) دەکەین، چونکە سەعاتێک شەست خولەکە، دەکاتە: (١,٠٨٠,٠٠٠,٠٠٠)کم، لە سەعاتێک دا، ئنجا جارێکی دیکە بۆ ئەوەی بزانین لە شەوو ڕۆژێکدا، تیشک چەند دەبڕێ: (١,٠٨٠,٠٠٠,٠٠٠ × ٢٤) = ٢٥,٩٢٥,٠٠٠,٠٠٠ کیلۆمەتر لە شەوو ڕۆژێکدا، ئنجا بۆ ئەوەی بزانین لە ساڵێکدا تیشک چەند دەبڕێ: (٢٥,٩٢٥,٠٠٠,٠٠٠ × ٣٦٥) دەکەین و دەکاتە: (٩,٤٦٠,٥٢٨,٠٠٠,٠٠٠)کم، (نۆ تریلیۆن و چوارسەدو شەست ملیارو، پێنج سەدو بیست و هەشت ملیۆن) کم، تیشک لە ساڵێکدا ئەوەندە دەبڕێ.

ئنجا بۆ ئەوەی بزانین تیشکی ئەستێرەی گەلاوێژ کە: (١٥٠,٠٠٠,٠٠٠,٠٠٠,٠٠٠) کم لە ئێمەوە دوورە، بە چەند دەگاتە ئێمە؟ دەبێ دابەشی ئەو کیلۆ مەترانەی بکەین، کە تیشک لە ساڵێکدا دەیانبڕێ، کەواتە: (١٥٠,٠٠٠,٠٠٠,٠٠٠,٠٠٠ ÷ ٩,٤٦٠,٥٢٨,٠٠٠,٠٠٠)کم، یەکسانە بە: (١٥) ساڵ و هەشت مانگ و، بە مانگ دەکاتە (١٩٣) مانگ و، بە ڕۆژیش دەکاتە: (٥،٧٨٧) شەوو ڕۆژ، لە حاڵێکدا کە تیشکی خۆر بە هەشت خولەک و (١٨) چرکە، دەگاتە ئێمە، کەچی تیشکی گەلاوێژ بە (١٥) ساڵ و هەشت مانگ، یان بە (١٩٣) مانگ، دەشتوانین بڵێین: بە (٥٧٨٧) شەو و ڕۆژ دەگاتە ئێمە، کەواتە: بۆیە خوا بسم الله الرحمن الرحيم بە تایبەتیی باسی ئەستێرەی گەلاوێژ دەکات.

لە تۆڕە کۆمەڵایەتییەکان لەگەڵتانین
Stay in touch on social media
نحن معكم عبر مواقع التواصل الاجتماعي
ڕاگەیاندنی مەکتەبی مامۆستا عەلی باپیر
AliBapir/عەلی باپیر
archive.org/details/@alibapir
AliBapir/عەلی باپیر
AliBapir
کەناڵی ڕاگەیاندنی مەکتەبی مامۆستا عەلی باپیر
www.alibapir.net
کوردی - عربي - English
ڕاگەیاندنی مەکتەبی مامۆستا عەلی باپیر

www.alibapir.com



### مەسەلەی سێیەم:

**هەروەها لە ڕاستییەکانی نێو لاپەڕەکانی مووساو ئیبراهیمدا (عَلَيْهِمُ الصَّلَاةُ وَالسَّلَام)، ئەوەیە کە خوا گەلانی عادی یەکەم و، ئەموودو، گەلی نووح و، گەلی لووطی وڵات ژێر و ژوور کراوی، فەوتاندوون:**

خوا دەفەرموێ: ﴿وَأَنَّهُۥٓ أَهۡلَكَ عَادًا ٱلۡأُولَىٰ ۝٥٠ وَثَمُودَاْ فَمَآ أَبۡقَىٰ ۝٥١ وَقَوۡمَ نُوحٖ مِّن قَبۡلُۖ إِنَّهُمۡ كَانُواْ هُمۡ أَظۡلَمَ وَأَطۡغَىٰ ۝٥٢ وَٱلۡمُؤۡتَفِكَةَ أَهۡوَىٰ ۝٥٣ فَغَشَّىٰهَا مَا غَشَّىٰ ۝٥٤ فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكَ تَتَمَارَىٰ ۝٥٥﴾.

## شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە حەوت بڕگەدا:

١)- ﴿وَأَنَّهُۥٓ أَهۡلَكَ عَادًا ٱلۡأُولَىٰ﴾، {هەر لەو ڕاستییانەی کە لە لاپەڕەکانی مووساو ئیبراهیمدا (عَلَيْهِمَا الصَّلَاةُ وَالسَّلَام) هاتوون، ئەوەیە کە} ئەو (خوا) خۆی گەلی عادی یەکەمی فەوتاندوە، بۆیەش گوتراوە: ﴿عَادًا ٱلۡأُولَىٰ﴾، کە هەم خوێندراوەتەوە: (عَاداً الأُولَى )، هەم خوێندراویشەتەوە: (عَاداً لُولَى)، لەبەر ئەوەی یەکەمین گەلی عەرەب بوون، باسکراون.

٢)- ﴿وَثَمُودَاْ فَمَآ أَبۡقَىٰ﴾، هەروەها ئەموودیش فەوتاندو هیچی لێ نەهێشتن، خوێنراوەتەوە: (ثَمُودَ)، بە (غَيْر مُنصرف)، هەروەها خوێندراویشەتەوە: (ثَمُوداً)، بە (منصرف)، یانی: خوا گەلی ئەموودیشی فەوتاندو هیچی لێ نەهێشتن.

٣)- ﴿وَقَوۡمَ نُوحٖ مِّن قَبۡلُ﴾، هەروەها (خوا) گەلی نووحیشی پێشتر فەوتاند.

٤)- ﴿إِنَّهُمۡ كَانُواْ هُمۡ أَظۡلَمَ وَأَطۡغَىٰ﴾، ئەوان ستەمکارترو یاخییتریش بوون، واتە: لە گەلانی دوای خۆیان، یاخود: هەر کام لەو سێ گەلە پێشووە، زۆر ستەمکارترو یاخییتر بوون لە گەلانی دوای خۆیان.

٥)- ﴿وَٱلۡمُؤۡتَفِكَةَ أَهۡوَىٰ﴾، هەروەها (شارە) هەڵگێردراوەکەشی بەردایەوە، (المُؤْتَفِكَةَ: مَفْعُولُ أَهْوى، أيْ: أَسْقَطَ، أيْ: جَعَلَهَا هَاوِيَةً ساقطة)، (المُؤْتَفِكَة)، سیفەتی وەصفکراوێکی

www.alibapir.com


قرتێندراوە، یانی: (وَالْمَدِيْنَة الْمُؤْتَفِكَة)، یاخود: (والقَرْيَة الْمُؤْتَفِكَة أَهْوَى)، (خوا) شارە، ئاوەدانییە هەڵگێردراوەکەشی بەردایەوە، یانی: پێشێ بەرزی کردەوەو دوایی بەریدایەوە.

٦)- ﴿ فَغَشَّىٰهَا مَا غَشَّىٰ ﴾، ئنجا دایپۆشی ئەوەی دایپۆشی، واتە: شتێک دایپۆشی کە لە وەسف نایەت، {(ما) (للتهويل)} (ما)ی سەر ﴿ مَا غَشَّىٰ ﴾ بۆ سامناک و بێڕەزا پێشاندانە، یانی: ئەوەی دایپۆشی نایەتە وەسف، مەبەست پێی ئەو بەردانەن کە بەسەریاندا بارێنراون، وەک فەرموویەتی: ﴿ وَأَمْطَرْنَا عَلَيْهِمْ حِجَارَةً مِّن سِجِّيلٍ ﴿٧٤﴾ ﴾ الحجر، لە بەردی کە لە قوڕی وشککراوە بوون، بە سەرماندا باراندن، (إبن عاشور) دەڵێ: (وَكَانَت الحِجَارَة بُرْكَانِيَّةً وَحِجَارَة خَاصَّة)، بەردی ئاگرپژێن، یاخود بەردی تایبەت بوون، دەڵێم: واباشترە تەعبیرەکەوەک خۆی تەفسیر بکرێ و، ئەوشتانەی خوا ﷻ وەک موعجیزە باسی کردوون، ئێمە پێمان شەرم نەبێ، وەک موعجیزە بیانخەینە ڕوو، نەک بیانخەینەوە چوارچێوەی دیاردە سروشتییەکان!

٧)- ﴿ فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكَ تَتَمَارَىٰ ﴾، لە بەرانبەر کام لە چاکەکانی پەروەردگارتدا، لە دوو دڵیی دای؟ یاخود: لە بارەی کام لە چاکەکانی پەروەردگارتەوە مشتومڕ دەکەی، ئەی مرۆڤ! لێرەدا مەبەست پێی مرۆڤێکە کە دەدوێنرێ، (ءَالآء)کۆی (إلى)یە، یان کۆی (أَلى) یەو بە مانای نعمەت دێ، (والتَّمارِي: التَّشَكُّكُ، وهو تَفاعُلٌ مِنَ المِرْيَةِ)، (تَمَارِي): کەوتنە دوو دڵیی (تَفَاعل)ەو لە (مِرْيَة)وە، هاتوە، دەگونجێ ڕووی دواندن لە پێغەمبەری خوا ﷺ بێ، واتە: تۆ لە کام لە چاکەکانی پەروەردگارتدا دوو دڵیی؟ دەشگونجێ بۆ کەسێکی دیاریی نەکراو بێ، یان ئەگەر بۆ پێغەمبەریش ﷺ بێ، واتە: لە بارەی کام لە چاکەکانی پەروەردگارتەوە، دەیانەوێ دوو دڵت بکەن و بتخەنە گومانەوە؟!

(الطبري) لە بارەی: ﴿ فَغَشَّىٰهَا مَا غَشَّىٰ ﴾، تەعبیرێکی جوان دێنێ، دەڵێ: (فَغَشَّى اللهُ الْمُؤْتَفِكَةَ مِنَ الحِجَارَةِ المَنْضودة المُسَوَّمَة، مَا غَشَّاهَا فَأَمْطَرَهَا إيَّاهُ مِنْ سِجِّيل)، خوا ﷻ شارە هەڵگێردراوەکەی داپۆشی بە بەردی ڕیزکراوی نیشانەدار کراو، ئەوەی کە دایپۆشی و بەردی لە قوڕی وشکراوەی بەسەردا باراندن.

لـە بـارەی: ﴿ فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكَ تَتَمَارَىٰ ﴾وە، (**الطـبري**) دەفەرمـوێ: (**فَبِـأَيِّ نِعْـمَاتِ رَبِّـكَ يَـا ابْـنَ آدَمَ! الَّتِـي أَنْعَمَهَـا عَلَيْـكَ تَرْتَـابُ وَتَشُـكُّ وَتُجَـادِلُ؟**)، بـە كام لـە چاكـەكانی پـەروەردگارت، ئـەی ڕۆڵـەی ئـادەم! كـە لەگـەڵ تۆیـدا كـردوون، لـە گومـان و دوو دڵیـی دای و مشـتومڕ دەكـەی؟

لە تۆڕە كۆمەڵایەتییەكان لەگەڵتانین
Stay in touch on social media
نحن معكم عبر مواقع التواصل الاجتماعي
ڕاگەیاندنی مەكتەبی مامۆستا عەلی باپیر
AliBapir/عەلی باپیر
archive.org/details/@alibapir
AliBapir/عەلی باپیر
AliBapir
كەناڵی
ڕاگەیاندنی مەكتەبی مامۆستا عەلی باپیر
www.alibapir.net
عربي - كوردی - English
ڕاگەیاندنی مەكتەبی مامۆستا عەلی باپیر

www.alibapir.com



## مەسەلەی چوارەم:

**پێغەمبەر ﷺ ترسێنەرێکە، وەک ترسێنەرە پێشووەکان، قیامەتیش نیزیکەو جگە لە خوا هیچ کەس لایناداات، بێبڕوایەکانیش کە لە ڕووی نکۆڵییلێکردنەوە سەریان لە فەرمایشتی خوا سوڕماوەو، پێی پێدەکەنن، لە جیاتی گریان و بێ ئاگاو خافڵاون، ئەوانە یەکجار نەفام و دواکەوتوون، بۆیە کڕنووش بۆ خوا ببەن و بیپەرستن:**

خوا دەفەرموێ: ﴿هَٰذَا نَذِيرٌ مِّنَ ٱلنُّذُرِ ٱلْأُولَىٰٓ ﴿٥٦﴾ أَزِفَتِ ٱلْـَٔازِفَةُ ﴿٥٧﴾ لَيْسَ لَهَا مِن دُونِ ٱللَّهِ كَاشِفَةٌ ﴿٥٨﴾ أَفَمِنْ هَٰذَا ٱلْحَدِيثِ تَعْجَبُونَ ﴿٥٩﴾ وَتَضْحَكُونَ وَلَا تَبْكُونَ ﴿٦٠﴾ وَأَنتُمْ سَٰمِدُونَ ﴿٦١﴾ فَٱسْجُدُوا۟ لِلَّهِ وَٱعْبُدُوا۟ ﴿٦٢﴾﴾.

## شیکرنەوەی ئەم ئایەتانە لە حەوت بڕگەدا:

١)- ﴿هَٰذَا نَذِيرٌ مِّنَ ٱلنُّذُرِ ٱلْأُولَىٰٓ﴾، ئەمە ترساندن و بێدارکردنەوەو وشیارکردنەوەیە لە ترساندن و بێدارکردنەوەکانی سەرەتا، (**النَّذِيرُ: حَقِيقَتُهُ المُخْبِرُ عَنْ حُدُوثِ حَدَثٍ مُضِرٍّ بِالمُخْبَرِ (بِالفَتْحِ) ويُطْلَقُ النَّذِيرُ عَلى الإنْذارِ، وهو خَبَرُ المُخْبِرِ**)، (نَذِیر): لە بنەڕەت دا بە مانای هەواڵدانە، لە بارەی ڕووداوێکەوە کە زیان دەگەیەنێ بە هەواڵ پێدراو، بەڵام بە مانای ئاگادارکردنەوەو ترساندنیش بەکاردێ، کە دەفەرموێ: ﴿هَٰذَا نَذِيرٌ مِّنَ ٱلنُّذُرِ ٱلْأُولَىٰٓ ﴿٥٦﴾﴾، زانایان چەند واتایەکیان بۆ لێکداونەوە:

١- مەبەست پێی قورئانە، ئەم قورئانەش ترساندن و وشیارکردنەوەیە، وەک ترساندن و وشیارکردنەوەکانی یەکەم، کە بە پێغەمبەرانی دیکەدا (**عَلَيْهِمُ الصَّلَاةُ وَالسَّلَامُ**) نێرراون.

٢- ئاماژەیە بۆ موحەممەد ﷺ واتە: ئەو پێغەمبەرەش هەر ترسێنەرێکە، چونکە (نَذِیر): وەک چۆن بە مانای ترساندن (إِنْذَار) دێ، بە مانای ترسێنەر (مُنْذِر)یش دێ، واتە: ئەم پێغەمبەرە ﷺ ترسێنەرو وشیارکەرەوەیەکە، وەک پێغەمبەرانی پێشوو.

www.alibapir.com


**٣-** مەبەست پێی ئەوەیە کە لەو ئایەتە موبارەکانەدا هاتوە، ئەم ڕایەش زیاتر پێ دەچێ ڕاست بێ، ئەوەی لەو ئایەتانەشدا هاتوە، هەر وریاکردنەوەو ترساندنێکە وەک ترساندنە پێشووەکان، کە لە بەرنامەی پێغەمبەرانی پێشوودا هاتوون، واتە: مانای ئەم فەرمایشتەش هەروەک مانای ئەو فەرمایشتانەیە کە لە بەرنامەی پێغەمبەرانی پێشوودا (عَلَيْهِمُ الصَّلَاةُ وَالسَّلَام)، هەبووە، وەک ئەو فەرموودەیەی پێغەمبەر ﷺ کە دەفەرموێ: {**إِنَّ مِمَّا أَدْرَكَ النَّاسُ مِنْ كَلَامِ النُّبُوَّةِ، إِذَا لَمْ تَسْتَحِ فَاصْنَعْ مَا شِئْتَ**} (**أخرجه أحمد: ١٧١٣١، والبخاري: ٥٧٦٩، وأبو داود: ٤٧٩٧، وابن ماجه: ٤١٨٣**). واتە: ئەوەی خەڵک لە فەرمایشتی پێغەمبەرانی پێشوو، پێیگەیشتوە، ئەوەیە: ئەگەر شەرمت نەکرد، هەرچی دەتەوێ بیکە.

کەواتە: خوا کە دەفەرموێ: ﴿هَٰذَا نَذِيرٌ مِّنَ ٱلنُّذُرِ ٱلْأُولَىٰٓ ﴿٥٦﴾﴾، واتە: ئەی بێبڕوایەکان! پەیامەکەی موحەممەد بەشتێکی ڕیز پەڕو داهێنراوو پەیدا کراو مەزانن، بەڵکو ئەوەی موحەممەد ﷺ هێناویەتی و، ئەوەی لە قورئاندا هەیە، هەر شێوەی ئەوەیە کە لە کتێبە پێشووەکان دایەو، لە پێغەمبەرانی پێشووەوە (**عَلَيْهِمُ الصَّلَاةُ وَالسَّلَام**) هاتوە.

دوایی خوا دەفەرموێ:

**٢)-** ﴿أَزِفَتِ ٱلْـَٔازِفَةُ﴾، نیزیککەوتوو وەنیزیک کەوت، (**الأَزِفَة**)، یەکێکە لە ناوەکانی ڕۆژی قیامەت،وەک خوا ﷻ دەفەرموێ:﴿وَأَنذِرْهُمْ يَوْمَ ٱلْـَٔازِفَةِ ﴿١٨﴾﴾غافر،لەڕۆژی (**الأزِفَة**)، بیانترسێنەو وریایان بکەوە، (**أزفت**) یانی: (**إقتربَت**)، نیزیککەوت (**الأزِفَة**)، یانی: نیزیک، واتە، ڕۆژی قیامەتی نزیک، نزیک کەوتەوە، (**وتَأْنِيثُ الآزِفَةُ بِتَأْوِيلِ الوَاقِعَةِ، أَوِ الحادِثَةِ، أي: وقَعَتِ الواقِعَةُ، وغَشِيَتِ الغاشِيَةُ، والعَرَبُ يَسْتَعْمِلُونَ التَّأْنِيثَ دِلالَةً عَلى المُبالَغَةِ فِي النَّوْعِ، ولَعَلَّهم راعَوْا أنَّ الأُنْثى مَصْدَرُ كَثْرَةِ النَّوْعِ**)، واتە: وشەی (**الأزِفَة**)، بۆیە بە مێینە (ی مەجازیی)، هاتوە، کە مانای (**واقِعَةُ وحادِثَةِ**)، ڕووداو و کارەسات دەگەیەنێ، عەرەبیش عادەتیان وایە حاڵەتی بە مێینە دانانی شتەکان بە مەجازیی

www.alibapir.com


بەکاردێنن، بۆ زێدەڕۆییکردن لە بارەی بە هێزیی شتێکەوە، ڕەنگە ڕەچاوی ئەوەیان کردبێ کە مێینە سەرچاوەی زۆربوونە.

٣)- ﴿لَيۡسَ لَهَا مِن دُونِ ٱللَّهِ كَاشِفَةٌ﴾، جگە لە خوا ﷻ کەس لابەر و لادەری نیە.

ئنجا کە دەفەرموێ: ﴿أَزِفَتِ ٱلۡأٓزِفَةُ ٥٧﴾، وەک چۆن مانای ئاخیر زەمانی گەورە دەگەیەنێ، مانای مردنیش هەر دەگەیەنێ، کە ئەویش ئاخیر زەمانی بچووکی هەر مرۆڤێکە (مَنْ مَاتَ فَقَدْ قَامَتْ قِيَامَتُهُ)، هەر کەسێ مرد، قیامەتی وی هاتوە.

کە دەفەرموێ: ﴿لَيۡسَ لَهَا مِن دُونِ ٱللَّهِ كَاشِفَةٌ ٥٨﴾، (**كَشْف**) بە مانای لابردنی شتێک دێ و، بە مانای دەرخستنی شتێکیش دێ، کەواتە: ئەو ئایەتە دوو مانای هەن:

**یەکەم:** هیچکەس ئاخیر زەمان لانادات، کە بێ، مەگەر خوا بۆ خۆی بیەوێ، خواش بەڵێنی داوەو ڕایگەیاندوە کە هەر دێ.

**دووەم:** هیچکەس کاتی ئاخیر زەمان نازانێ، کە پەردەی لەسەر لابدات و کاتەکەی بزانێ، تەنیا خوا ﷻ کاتەکەی دەزانێ.

٤)- ﴿أَفَمِنۡ هَٰذَا ٱلۡحَدِيثِ تَعۡجَبُونَ﴾، ئایا سەرتان لەم قسەیە سوڕدەمێنێ، ئەی بێبڕوایەکان!

کە دەفەرموێ: سەرتان لێ سوڕدەمێنێ، واتە: بە دوور و مەحاڵی دەزانن، چونکە زۆرجاران سەرسوڕمان نیشانەی بە دوور زانینی شتێکە، یان: نیشانەی بڕوا نەبوون بە شتێکە، وەک لە سوورەتی (**هود**)دا، فریشتەکان بە خێزانی ئیبراهیم (سارا خاتوون)یان گوت: ﴿أَتَعۡجَبِينَ مِنۡ أَمۡرِ ٱللَّهِ ٧٣﴾، ئایا کاری خوات پێ سەیرە! واتە: پێت دوورە کە ببێ، کاتێک بەڵێنیان پێدا: کوڕتان دەبێ، کە گوتی: نەزۆکم و مێردەکەشم پیرە!

٥)- ﴿وَتَضۡحَكُونَ وَلَا تَبۡكُونَ﴾، هەروەها پێدەکەنن و ناگرین، ئەی بێبڕوایەکان! لێرەدا مەبەست لە پێکەنین گاڵتە پێکردنە، واتە: گاڵتە دەکەن بە هەندێک لە

www.alibapir.com


فەرمایشتەكەی خوا، یان بە هەندێک لە فەرمایشتەكانی پێغەمبەری خواو پێتان سەیرە، چونكە لەگەڵ كلتوور و فەرهەنگی ئێوەداو، لەگەڵ بیری دواكەوتووانەی ئێوەدا تێک دەگیرێ؟

٦)- ﴿وَأَنتُمۡ سَٰمِدُونَ﴾، لە حاڵێكدا ئێوە، بێئاگان و خافڵاون، واتە: ئێوە حاڵێكی زۆر خراپتان هەیە، كە خافڵاو و بێ ئاگان و پێدەكەنن و گاڵتە دەكەن، لە جیاتی ئەوەی بگرین، ئەو ڕۆژە مەزنەش چاوەڕێتانە كە ڕۆژی دواییە.

٧)- ﴿فَٱسۡجُدُواْۤ لِلَّهِۤ وَٱعۡبُدُواْ۩﴾، كڕنووش بۆ خوا بەرن و بیپەرستن.

كە دەفەرموێ: ﴿فَٱسۡجُدُواْۤ لِلَّهِۤ وَٱعۡبُدُواْ۩﴾، ئەمە: (**تَفْرِيعٌ عَلَى الإِنْكَارِ وَالتَّوْبِيخِ الْمُفَرَّعَيْنِ عَلَى الإِنْذارِ بِالوَعِيدِ**)، ئەمە بنیاتنراوە لەسەر ئەو نكوڵیلێكردن و سەرزەنشتكردنە، كە ئەوانیش بنیاتنرابوون لەسەر ترساندن بە هەڕەشە، واتە: كە حاڵ بەو شێوەیە: ئێوە چ سزا و ئەشكەنجەیەک چاوەڕێتانە، چ سەرەنجامێكی ڕەش چاوەڕێتانە، كەواتە: بۆ ئەوەی لەو سەرەنجامە دژوارە سەلامەت بن، كڕنووش بۆ خوا بەرن و بەندایەتیی بۆ خوا بكەن، تەنیا بەوە دەربازتان دەبێ لەو سەرەنجامەی چاوەڕێتانە، ئەگەرنا تاكو ئێستا كردەوەكانتان بەرەو ئاكامێكی خراپیان بردوون و، ئەگەر بێت و وەرچەرخانێک دروست نەكەن لە ژیانی خۆتاندا و، واز لەوەی ڕابردووتان نەهێنن، كە بریتییە لە هاوبەش بۆ خوا دانان و، بێبڕوایی و كاری خراپ و دژایەتیی كردنی پێغەمبەر ﷺ و، نەگەڕێنەوە بۆ ڕاستە شەقامی خواو، بۆ بەندایەتیی بۆ كردنی و كڕنووش بۆ بردنی، ئاكامێكی خراپ چاوەڕێتانە.

هەڵبەتە زۆربەی زانایان ڕایان وایە، سەجدە بردن لێرەدا پێویستە، بەڵام ئیمام مالیک پێی وایە سەجدە بردن پێویست نیەو، هەندێک لە زانایانیش دەڵێن: ئەو سەجدە بردنانە، هەموویان سوننەت و پەسندن، هەندێكیش دەڵێن: هەموویان فەرزن و، هەندێكیشیان لە بارەی فەرز یان سوننەت بوونیانەوە، پۆلێنیان دەكەن و، بەشێكیان بە فەرزو بەشێكیشیان بە سوننەت و پەسند

www.alibapir.com

دادەنێـن. لـە کۆتایـی سـوورەتی (**الأعراف**)یـش دا باسـێکمان لـە بـارەی کڕنـووش بردنـەکانی قورئـان خوێندنـەوە کـردووە، نوقتەمـان تێـدا خسـتۆتە سـەر پێـت.

لێرەش دا کۆتایی بە تەفسیری سوورەتی (**النجم**)، دێنین.

خـوا بـە لوتـف و کەرەمـی خـۆی یارمەتیـمان بـدات، کـە زیاتر لـە فەرماییشـتەکەی تێبگەیـن، ئنجا دوای تێگەیشـتن تێیـدا پـێ بگەیـن و، تەوفیقیشـمان بـدات و کارمـان ئاسـان بـکات، کـە خەڵـک و دەوروبەریشـمان تـێ بگەیەنیـن و پـێ بگەیەنیـن، بـۆ ئـەوەی هـەم لـە دنیـادا ژیانێکـی بەختەوەرانـە بگوزەرێنیـن، هـەم لـە دوارۆژیشـدا سـەرفرازو شـادمان بیـن.

سُبحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ، أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ أَنْتَ، أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ.

Stay in touch on social media
AliBapir/عەلی باپیر
archive.org/details/@alibapir
AliBapir
www.alibapir.net
English - عربي - کوردی

## دەستپێک

بەڕێـــــزان!

ئەمڕۆ کـە (٥)ی شـەعبانی سـاڵی (١٤٤١)ی کۆچیـی، بەرانبـەر بـە: (٢٠٢٠/٣/٢٩)ی زایینییـە، خـوا پشـتیوان بـێ لـە شـاری هەولێـر دەسـت دەکەیـن، بـە تەفسـیرکردنی سـوورەتی (القمـر)و ڕوونکردنـەوەی چەمـک و واتـای ئایەتـە بـە پێزەکانی و، سـەرەتاش پێناسـەو نێوەڕۆکـی سـوورەتی (القمـر) دەکەیـن، بـۆ ئـەوەی بـەر لـەوەی بچینـە نێـو درێـژەی ڕوونکردنـەوەی چەمـک و واتـای ئایەتـە موبارەکـەکانی، نەخشـەی گشـتیی ئـەو سـوورەتە موبارەکـە لەبـەر چاومـان بـێ، هەروەهـا چوارچێوەکـەی و هێڵـە گشـتییەکانی، لـە حـەوت بڕگـەدا پێناسـەو نێوەڕۆکـی ئـەم سـوورەتە موبارەکـە دەخەینـەڕوو.

## پێناسە سوورەتی (القمر) و بابەتەکانی

### یەکەم: ناوی ئەم سوورەتە:

ئەم سوورەتە سێ ناوی بۆ بەکارهێنراون:

١- (سُورَةُ اقْتَرَبَتِ السَّاعَة).

٢- (سُورَةُ القَمَر).

٣- (سُورَةُ اقْتَرَبَت).

لـەو بـارەوەش ئـەم دەقـە هەیـە: {عَـنْ عُبَيْـدِ اللَّهِ بْـنِ عَبْـدِ اللَّـهِ أَنَّ عُمَـرَ بْـنَ الْخَطَّابِ رضي الله عنه سَـأَلَ أَبَا وَاقِدٍ اللَّيْثِيَّ: بِمَ كَانَ رَسُـولُ اللَّهِ ﷺ يَقْرَأُ فِي الْعِيدِ؟ قَالَ: كَانَ يَقْرَأُ بِقَافْ وَاقْتَرَبَـتْ} (أخرجـه أحمـد: ٢١٩٤٦، تعليـق شـعيب الأرنؤوط: حديـث صحيح).

www.alibapir.com


واتـە: عوبەیدوڵڵای کـوڕی عەبدوڵـڵا دەگێڕێتـەوە، کـە عومـەری کـوڕی خەتتـاب ﷺ پرسـیاری کـرد لـە ئەبـی واقیـدی لەیثیـی (کـە یەکێک بـووە لە هـاوەڵان)، ئایا پێغەمبـەری خـوا ﷺ لـە جەژندا، (واتـە: لە نوێژی جەژندا) چ سـوورەتێکی دەخوێند؟ (واتـە: جگـە لـە سـوورەتی فاتیحـە)، ئەویـش وەڵام دەداتـەوە (**قَـاف واقْتَرَبَـتِ**)، واتـە: لـە ڕکاتی یەکەمـدا لـە دوای سـوورەتی فاتیحـە، سـوورەتی قافـی دەخوێنـدو، لـە ڕکاتی دووەمیشـدا سـوورەتی ﴿اقْتَرَبَتِ السَّاعَةُ﴾ی، دەخوێنـد.

مەبەسـت ئەوەیـە کـە ئـەو نـاوە بەکارهاتـوەو ناوەکانـی دیکـەش، وەک دواییـش لـە هەندێـک دەقـی دیکـەدا دەیگەینـێ، بەکارهاتـوون.

## دووەم: کات و شوێنی دابەزینی:

لـە لای زۆربـەی هـەرە زۆری زانایـان، ئـەم سـوورەتە مەککەییـە، هەرچەنـدە هەندێـک لـە زانایـان ڕاجیاییەکـی کەمیـان هەبـووە، ئەگەرنـا زۆربـەی زانایـان یەکدەنگـن لەسـەر ئـەوە کـە ئـەو سـوورەتە مەککەییـە، بـە بەڵگـەی ئـەوەش کـە ڕیزبەندیـی لـە دابەزینـدا، ژمـارە (٣٧)ە، وەک دوایـی دەیگەینـێ، واش پێدەچـێ لـە نێوان سـاڵانی (٦ - ٨)ی، پێغەمبەرایەتیـی (بِعْثَـة)دا، واتـە: پێـش کۆچکـردن، دابەزیبـێ و، هەنـدێ شـوێنەواریش هـەن، دەلالـەت لەسـەر ئـەوە دەکـەن، بـۆ وێنـە، ئێمـە دوو شـوێنەواران دێنیـن:

**١- {عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﷺ قَالَ: كَانَ بَيْنَ نُزُولِ آيَة:** ﴿سَيُهْزَمُ الْجَمْعُ وَيُوَلُّونَ الدُّبُرَ ۝٤٥﴾ **وَبَيْنَ بَدْرٍ سَبْعُ سِنِيْنَ} (التحرير والتنوير: ج٢٧، ص١٦٦)**، واتە: عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس ﷺ گوتوویەتی: لە نێوان دابەزینی ئایەتی: ﴿سَيُهْزَمُ الْجَمْعُ وَيُوَلُّونَ الدُّبُرَ ۝٤٥﴾ {ئەو کۆمەڵە تۆکمەیە تێدەشکێن و پشت هەڵدەکەن}و، لە نێوان جەنگی بەدردا، حەوت ساڵ هەبوون.

(دیـارە بـە مەزەنـدەی خـۆی عەبدوڵڵای کـوڕی عەببـاس ﷺ وای دانـاوە، ئنجا ئەگـەر وابـێ کـە جەنگـی بـەدر لەسـاڵی دووەمـی کۆچییـدا بـووە، دەبـێ ئـەم

www.alibapir.com


سـوورەتە موبارەکـە، پێنـج سـاڵ پێـش کۆچـی پێغەمبـەر ﷺ بـۆ مەدینـە، واتـە: لـە سـاڵی هەشـتەمی پێغەمبەرایەتییـدا دابەزیـێ.

٢- {عن عَائِشَةَ أُمِّ المُؤْمِنِينَ رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهَا قَالَتْ: لَقَدْ نَزَلَ بِمَكَّةَ عَلَى مُحَمَّدٍ ﷺ وَإِنِّي لَجَارِيَةٌ أَلْعَبُ: ﴿بَلِ ٱلسَّاعَةُ مَوْعِدُهُمْ وَٱلسَّاعَةُ أَدْهَىٰ وَأَمَرُّ ۝٤٦﴾} (أخرجه البخاري: ٤٥٩٥)، واتە: عائیشە دایکی بڕواداران (خوا لێی ڕازی بێ)، دەڵێ: کاتێک ئەم ئایەتە موبارەکە دابەزیە سەر موحەممەد ﷺ لە مەککە، من کچێک بووم، یاریی و گەمەم دەکرد، {کچێکی پارچەڵە بووە، دەبێ شەش حەوت ساڵە بوو بێ} کە ئەمە دابەزی: ﴿بَلِ ٱلسَّاعَةُ مَوْعِدُهُمْ وَٱلسَّاعَةُ أَدْهَىٰ وَأَمَرُّ ۝٤٦﴾، بەڵکو کاتەکە (سَاعَة)، {ڕۆژی دوایی} بەڵێنگەیانەو، ڕۆژی دواییش بۆ ئەوان بێڕەزاترو تاڵترە.

هەندێـک لـە زانایانیـش گوتوویانـە: دابەزینـی ئـەم سـوورەتە پێنـج سـاڵان بـەر لـە کۆچکـردن بـووە بـۆ مەدینـە، ئنجـا قسـەکەی عەبدوڵـڵای کـوڕی عەبباسـیش (خـوا لـە خـۆی و بابـی ڕازی) بـێ، هـەروا دەگەیەنـێ.

## سێیەم: ژمارەی ئایەتەکانی:

بـە یەکدەنگیـی ژمێـەران، ژمـارەی ئایەتـەکانی ئـەم سـوورەتە: پەنجاو پێنـج (٥٥)ە و ڕاجیایـی لـەو بـارەوە نەبووە.

## چوارەم: ڕیزبەندیی لە موصحەف و دابەزین دا:

ڕیزبەندیـی لـە موصحەفـدا، ژمـارە پەنجـاو چـوارە (٥٤)ەو، لـە پێـش ئـەم سـوورەتەوە کـە لـە (**الفاتحة**)وە دێـی، پەنجـاو سـێ (٥٣) سـوورەتی دیکـە هـەن و، ئەمـە پەنجـاو چـوارەم (٥٤)میانـەو، لـە دابەزینیشـدا ژمارەکـەی سـی و حـەوت (٣٧)ە، واتـە: لـە پێـش ئـەم سـوورەتەدا سـی و شـەش (٣٦) سـوورەتی دیکـە دابەزیـون.

www.alibapir.com


## پێنجەم: نێوەڕۆکی:

نێوەڕۆکی ئەم سووڕەتەش، هەمان نێوەڕۆکی سووڕەتە مەککەییەکانە، لە باسکردنی بووناسیی و، خستنە ڕووی سێ پایە بنەڕەتییەکەی ئیمان: خواناسیی و خواپەرستیی و، دواڕۆژ ناسیی و، پێغەمبەر ناسی و باسی وەحیی، بەڵام لە پەنجاو پێنج (٥٥) ئایەتەکە، پانتاییەکی زۆری بۆ باسکردنی بەسەرهات و لە بەین چوونی هەر پێنج کۆمەڵگای: (گەلی نووح، گەلی عاد، گەلی ثەموود، گەلی لووط، گەلی فیرعەون)، تەرخانکراون و، جوگرافیای دابەشبوونی پانتایی ئایەتەکانی ئەم سووڕەتە، بەمجۆرەیە:

١- هەشت (٨) ئایەتی سەرەتا بۆ باسی ڕۆژی دوایی، بە هەردوو قۆناغی ئاخیر زەمان و، زیندووکرانەوەو، هەڵسێنرانەوەوە.

٢- سی و چوار (٣٤) ئایەت بۆ بەسەرهاتی پێنج گەلەکەو چۆنیەتیی فەوتێنرانیان، دوای سەرپێچییکردن و یاخییبوونیان لە پێغەمبەرەکانیان (**عَلَيْهِمُ الصَّلَاةُ وَالسَّلَامِ**).

٣- یازدە (١١) ئایەتی کۆتایی بۆ ترساندنی بێبڕوایانی ڕۆژگاری پێغەمبەر ﷺ و، خستنە ڕووی چەند ڕاستییەکی مەزنی پەیوەست بە خواناسییەوە.

٤- لە کۆتاییدا دوو ئایەت، باسی ئاکامی خێری پارێزکاران دەکەن.

کەواتە: (٨ + ٣٤ + ١١ + ٢ = ٥٥)، یانی: تەنیا دوو ئایەتی کۆتایی باسی مۆژدەو بەڵێنی خوای پەروەردگارن، بۆ پارێزکاران و سەرەنجامی خێریان، ئەگەرنا پەنجاو سێ (٥٣) ئایەتەکەی دیکە، هەموویان لە بارەی ڕۆژی دوایی و، زەبر وەشاندنی خوای دادگەرەوەن، لە گەل و کۆمەڵگە سەرکەش و یاخییەکان.

www.alibapir.com


## شەشەم: تایبەتمەندییەکانی:

ئەم سووڕەتەش کۆمەڵێک تایبەتمەندیی و جیاکەرەوەی هەن:

١- باسی لەتبوونی مانگ، تەنیا لەم سووڕەتەدا هاتوە، ئایەتی ژمارە یەک.

٢- باس و وەصفی کەشتییەکەی نووح بە: ﴿وَحَمَلْنَٰهُ عَلَىٰ ذَاتِ أَلْوَٰحٍ وَدُسُرٍ ﴿١٣﴾﴾، خاوەنی تەختەکان و بزمارەکان، تەنیا لەم سووڕەتەدا کەشتییەکەی نووح، پێکهاتەکەی باسکراوە، کە دوو شتی سەرەکیین: تەختە داری گەورەو، بزمار، گوڵمیخ و بزماری گەورە کە تەختەکانیان بێ بەستراونەوە.

٣- دووبارە بوونەوەی تەعبیری: ﴿ فَهَلْ مِن مُّدَّكِرٍ ﴾، چوارجاران لە ئایەتەکانی: (١٧و ٢٢و ٣٢و ٤٠)دا، ﴿ فَهَلْ مِن مُّدَّكِرٍ ﴾، واتە: ئایا کەسێکی بیرکەرەوە، کەسێکی پەند وەرگر هەیە؟

٤- دووبارە بوونەوەی تەعبیری: ﴿وَلَقَدْ يَسَّرْنَا ٱلْقُرْءَانَ لِلذِّكْرِ﴾، بە دڵنیایی قورئانمان ئاسانکردوە بۆ (ذكر)، واتە: بۆ خوێندنەوە، لەبەر کردن، لێ تێگەیشتن، لێوردبوونەوە، پەند لێوەرگرتن، ئەم تەعبیرە چوار جاران دووبارە بۆتەوە لە ئایەتەکانی: (١٧و ٢٢و ٣٢و ٤٠)دا.

٥- دووبارە بوونەوەی تەعبیری: ﴿فَكَيْفَ كَانَ عَذَابِى وَنُذُرِ ﴾، ئازاردانی من و ترساندنی من، {واتە: ئاکامی ترساندنی من} چۆن بوو؟ ئەمیش چوار جاران دووبارە بۆتەوە لە ئایەتەکانی: (١٦و ١٨و ٢١و ٣٠)دا.

٦- هاتنی تەعبیری: ﴿ سَيُهْزَمُ ٱلْجَمْعُ وَيُوَلُّونَ ٱلدُّبُرَ ﴾، کۆمەڵە تۆکمەکە تێکدەشکێن و پشت هەڵدەکەن و پاش دەکەنەوە، لە ئایەتی ژمارە چل و پێنج (٤٥)دا، کە ئاماژەیە بە تێکشکانی بێبڕوایەکان لە جەنگی بەدردا.

٧- چەند وشەیەک تەنیا لەم سووڕەتەدا هاتوون، کە من دە (١٠) وشەم هێناون و ئەگەر ورد سەرنج بدرێ، دەگونجێ زیاتریش بن، بەڵام ئەو دەیەم هەڵبژاردوون:

www.alibapir.com


١- ﴿جَرَادٌ مُّنتَشِرٌ ۝٧﴾، کوللەی بڵاو بووەوە.

٢- ﴿مُّنْهَمِرٍ ۝١١﴾، بە لووزە و، یان هەڵڕژاو، مەبەست پێی ئاوی هەڵڕژاوە لە ئاسمانەوە.

٣- ﴿جَزَآءً لِّمَن كَانَ كُفِرَ ۝١٤﴾، ئەوە پاداشت بوو، بۆ کەسێک کە سپڵەیی پێکرا، یان بێبڕوایی بەرانبەر کرا، کە نووحە ﷺ.

٤- ﴿مُّنقَعِرٍ ۝٢٠﴾، هەڵقەندراو لە ڕیشەوە، لە بیخەوە هێنراو.

٥- ﴿وَسُعُرٍ ۝٢٤﴾، کە لە ئایەتەکانی: (٢٤و ٤٧)دا هاتووە، (**سُعُر**)یش: دەگونجێ بە مانای مەینەتیی بێ و، دەگونجێ بە مانای شێتیی بێ و، دەشگونجێ بە مانای ئاگری بڵێسەداری دۆزەخ بێ.

٦- ﴿سَيَعْلَمُونَ غَدًا مَّنِ ٱلْكَذَّابُ ٱلْأَشِرُ ۝٢٦﴾، (**ٱلْأَشِرُ**): بابایەکی بە خۆنازی خۆپەسەندی خۆ پێ زۆر.

٧- ﴿مُّحْتَضَرٌ ۝٢٨﴾، لەلا ئامادە بوو، ئاوەکە کرابوو بە نۆرە، لە نێوان حوشترەکەی صالیح ﷺ و - کە وەک موعجیزە، خوا بۆ صالحیی نارد بوو - و گەلی **ثەموود** دا، هەر ڕۆژە دەبوو یەکێکیان ئاوی لێ بخۆنەوە، ئنجا دەفەرموێ: ﴿كُلُّ شِرْبٍ مُّحْتَضَرٌ ۝٢٨﴾، هەر نۆرە ئاوە دەبێ، خاوەنەکەی خۆی لەلای ئامادە بێ، تەنیا خاوەنەکەی خۆی بۆی هەبوو لەو نۆرە ئاوەدا بچێ و ئاوی لێبخواتەوە.

٨- ﴿كَهَشِيمِ ٱلْمُحْتَظِرِ ۝٣١﴾، وەک پووش و پەڵاشی تێکشکێنراوی بابای ئاغەڵدار، ﴿ٱلْمُحْتَظِرِ﴾، کەسێک ئاغەڵ (**حظیرة**)ی دروستکردوە بۆ ئاژەڵەکانی.

٩- ﴿أَدْهَىٰ وَأَمَرُّ ۝٤٦﴾، بێڕەزاترو تاڵتـرە.

١٠- ﴿مُّسْتَطَرٌ ۝٥٣﴾، نووسراو، لە (**سَطْر**)ەوە هاتووە، ﴿مُّسْتَطَرٌ﴾ و (**مُسَطَّر**)، هەردووکیان بە مانای بە دێڕ نووسراون.

www.alibapir.com



## حەوتەم: دابەشکردنی ئایەتەکان بۆ چەند دەرسێك:

ئێمە کۆی پەنجاو پێنج (٥٥) ئایەتەکەی ئەم سوورەتە موبارەکەمان، بۆ سێ دەرسان دابەش کردوون:

**دەرسی یەکەم:** ئایەتەکانی: (١ - ٨)، هەشت ئایەتی سەرەتا، باسی نیزیک کەوتنی ئاخیر زەمان و، لەت بوونی مانگ و، بەردەوام بوونی بێبڕوایان لەسەر بە جادوو دانانی نیشانەکانی خوا ﷻ و، گوێ نەدان بەم هەموو هەواڵ و باسانەی کە مایەی سڵەماندنەوەیانن و، حیکمەتی بە ئامانج گەیەنەرن، بۆ کەسێک مەبەستی بێ، کەچی بێ سوودن بۆ ئەو بێبڕوایانەی کەللەڕەق و نەسەلمێن و گوێ پێ نەدەرن، بۆیە فەرمانکردن بە پێغەمبەر ﷺ کە پشتیان تێبکات، تاکو تووشی ڕۆژێکی ترسناک دێن.

**دەرسی دووەم:** ئایەتەکانی: (٩ - ٤٢)، واتە: سی و چوار (٣٤) ئایەت، کە باسی گێڕانەوەی بەسەرهاتی پێنج لە پێغەمبەرانی خوا (عَلَيْهِمُ الصَّلَاةُ وَالسَّلَام) و گەلەکانیان دەکەن، پێغەمبەرەکان: (نووح و هوودو صاڵیح و لووط و مووسا)ن (عَلَيْهِمُ الصَّلَاةُ وَالسَّلَام)و، گەلە کانیشیان: گەلی نووح و، گەلی هوود کە عاد بووەو، گەلی صاڵیح کە ثەموود بووەو، گەلی لووط کە هەر بە ناوی خۆیەوە ناونراون و، گەلی فیرعەون کە مووسا ﵇ لەگەڵ هارٖوونی برای چوو ون بۆ هۆشداریی پێدانی فیرعەون و گەلەکەی، بۆ لە چەنگ دەرهێنانی گەلە چەوسێنراوەکەی خۆیان، کە فیرعەون دەیچەوساندنەوەو سۆغرەو بێگاری پێ دەکردن، کە سەرەنجام ئەو پێنج گەلە هەموویان بە سزاو بەڵای خوا فەوتێنراون، دەبووایە خەڵکی دیکە پەندیان لێ وەربگرێ و، وەک ئەوان نەکات تاکو وەک ئەوانی بەسەر نەیەت.

**دەرسی سێیەم:** ئایەتەکانی: (٤٣ - ٥٥)، کە سێزدە (١٣) ئایەتی کۆتایی سوورەتی (القمر)، دەگرێتە خۆی و، خوا ﷻ تێیاندا ڕوو دەکاتە بێبڕوایانی ڕۆژگاری

پێغەمبەرەکەی ﷺ و کۆمەڵگای ڕۆژگاری پێغەمبەر ﷺ، کە ئەوانیش لە گەڵ پێشووەکان، باشتر نین، واتە: لە ڕووی هێزو دەسەڵاتەوە، یان لە ڕووی سیفەتە مەعنەوییەکانەوە، لەوان باشتر نین، هەروەها ئەستۆ پاکیی و پاکانەشیان بۆ نەکراوە لەلایەن خواوەو لە کتێبەکانی خوای پەروەردگارداو، واش نیە کە خۆیان بە کۆمەڵێکی تۆکمە بزانن و بڵێن: ئێمە سەرکەوتوو دەبین، بۆیە با بزانن کە ئەگەر بەردەوام بن لەسەر بێبڕوایی و ستەم و خراپەو لادان و تاوان، ڕۆژێکی سەختیان لە پێشە، ئنجا باسکردنی کۆمەڵێک لە سیفەتەکانی خوا ﷻ، وەک:

أ- خوا هەموو شتێکی بە ئەندازەگیریی دروستکردوە.

ب- فەرمانی خوا تەنیا یەک وشەیەو چاو تروکانێکە، ئەوەش بۆ تێگەیشتنی ئێمەیە.

ج-خوا ﷻ گەلەهاوشێوەکانی کافرەکانی ڕۆژگاری پێغەمبەری کۆتایی ﷺ فەوتاندوون.

د- هەرچی کردوویانە هەموو تۆمار کراوەو پارێزراوە.

هـ- دواییش باسی ئاکام خێریی، پارێزکاران لە ڕۆژی دواییدا کە لە نێو باخ و کانیی و سەرچاوەو، لە خزمەت خوای حوکمڕانی ڕەهاو، خاوەن توانای بێ سنووردا، دەبن.

لە تۆڕە کۆمەڵایەتییەکان لەگەڵتانین
Stay in touch on social media
نحن معكم عبر مواقع التواصل الاجتماعي
ڕاگەیاندنی مەکتەبی مامۆستا عەلی باپیر
AliBapir/عەلی باپیر
archive.org/details/@alibapir
AliBapir/عەلی باپیر
AliBapir
کەناڵی ڕاگەیاندنی مەکتەبی مامۆستا عەلی باپیر
www.alibapir.net
کوردی - عربي - English
ڕاگەیاندنی مەکتەبی مامۆستا عەلی باپیر

www.alibapir.com



## پێناسەی ئەم دەرسە

ئەم دەرسەمان هەشت (٨) ئایەتی سەرەتای سووڕەتی (القمر) دەگرێتە خۆی، کە بریتین لە ئایەتەکانی: ( ١ - ٨)، تەوەری سەرەکیی ئەم هەشت ئایەتە، باسی ئاخیر زەمان و ئەو کارەساتانەیە کە تێیدا ڕوو دەدەن، هەروەها باسی کەللەڕەقیی و عینادیی بێبڕوایانە، بێبڕوایانی ڕۆژگاری پێغەمبەر ﷺ و، کۆمەڵگایەک کە پێغەمبەری خوا ﷺ سەرەتا لە نێویاندا ڕەوانکراوە، کە هەرچەندە لە قورئاندا بەسەرهاتی زۆر پڕ حیکمەتیان بۆ دەگێڕدرێنەوە، بەڵام بەهرەیان لێوەرناگرن، وەک پێویست.

پاشان فەرمانکردنی خوا ﷻ بە پێغەمبەر ﷺ کە وازیان لێ بێنێ و چاوەڕێ بێ، تاکو ڕۆژی دواییان بۆ دێتە پێش، کە خەڵک تێیدا لە گۆڕان دێنەوە دەرێ و، وەک کوللە دەپرژێن، ئەو کاتە بێبڕوایان دەڵێن: ئەمڕۆ ڕۆژێکی زۆر سەخت و دژوارە!

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

﴿ٱقۡتَرَبَتِ ٱلسَّاعَةُ وَٱنشَقَّ ٱلۡقَمَرُ ۝١ وَإِن يَرَوۡاْ ءَايَةٗ يُعۡرِضُواْ وَيَقُولُواْ سِحۡرٞ مُّسۡتَمِرّٞ ۝٢ وَكَذَّبُواْ وَٱتَّبَعُوٓاْ أَهۡوَآءَهُمۡۚ وَكُلُّ أَمۡرٖ مُّسۡتَقِرّٞ ۝٣ وَلَقَدۡ جَآءَهُم مِّنَ ٱلۡأَنۢبَآءِ مَا فِيهِ مُزۡدَجَرٌ ۝٤ حِكۡمَةُۢ بَٰلِغَةٞۖ فَمَا تُغۡنِ ٱلنُّذُرُ ۝٥ فَتَوَلَّ عَنۡهُمۡۘ يَوۡمَ يَدۡعُ ٱلدَّاعِ إِلَىٰ شَيۡءٖ نُّكُرٍ ۝٦ خُشَّعًا أَبۡصَٰرُهُمۡ يَخۡرُجُونَ مِنَ ٱلۡأَجۡدَاثِ كَأَنَّهُمۡ جَرَادٞ مُّنتَشِرٞ ۝٧ مُّهۡطِعِينَ إِلَى ٱلدَّاعِۖ يَقُولُ ٱلۡكَٰفِرُونَ هَٰذَا يَوۡمٌ عَسِرٞ ۝٨﴾

www.alibapir.com


## مانای دەقاودەقی ئایەتەکان

{بـە نـاوی خـوای بـە بەزەیـی بەخشـندە. کاتەکـە (ئاخیـر زەمـان) زۆر نیزیـک کەوتـەوەو، مانـگ لـەت بـوو ﴿١﴾ بـەڵام (بێبڕوایـان) ئەگـەر نیشـانەیەک (ی مـەزن) یـش ببینـن، ڕوووەردەگێـڕن و، دەڵێـن: (ئەمـە) جادوویەکی بەردەوامـە ﴿٢﴾ هەروەها (پەیامـی خوایـان) بـە درۆ دانـاو شـوێن ئارەزووەکانیـان کەوتـن و، هەمـوو کارێکیـش (سـەرەنجام) جێگیـر دەبـێ (و دەچەسـپێ) ﴿٣﴾ بـە دڵنیاییشـەوە ئـەوان (بێبڕوایـان) لـە هەواڵـەکان (ی پێشـووان)، هـی وایـان بـۆ هاتـوە کـە مایـەی سـڵەماندنەوەیە (لـە کوفـرو خراپـە) ﴿٤﴾ (ئـەم قورئانـە) حیکمەتێکـی تێـرو تـەواوە، (بـەڵام بـۆ کەسـانی ملهـوڕی نەسـەلمێن)، ترسـێنەران بـێ سـوودن ﴿٥﴾ ئنجـا (مـادام وایـە، ئـەی موحەممـەد!) پشـتیان تێبکـە (و چاوەڕێ بکـە)، ئـەو ڕۆژەی بانگکەر (خەڵـک) بەرەو لای شـتێکی ترسـناک و نامـۆ بانـگ دەکات ﴿٦﴾ (لـەو ڕۆژەدا بێبڕوایـان) چاوەکانیـان زەبـوون (و پـڕ تـرس و بیـم)ن، وەک کوللـەی پـرژو بـڵاو لـە گـۆڕەکان دێنـە دەرێ ﴿٧﴾ بـە خێرایـی بـەرەو لای بانگکەرەکـە مـل دەنێـن و، بێبڕوایـان دەڵێـن: ئەمـە ڕۆژێکـی زۆر سـەخت و دژوارە! ﴿٨﴾}.

## شیکردنەوەی هەندێک لە وشەکان

(﴿ٱقۡتَرَبَتِ ٱلسَّاعَةُ﴾): (**قَرُبَـتْ**) واتـە: نیزیککەوتـەوە، (**اقْتَرَبَـت: مُطَـاوِعُ قَرُبَـت، أي: قَرُبـتَ جِـدًّا**)، زۆر نیزیـک کەوتـەوە، چونکـە: (**زِيَـادَةُ المَبْنَـى تَـدُلُّ عَـلَى زِيَـادَة المعْنَـى**)، بێژەیـەک هەتـا پێکهاتـەو پیتـەکانی زیاتـر بـن، مانایەکەشـی بەهێزتـرە، (**اقْتَرَبَـت الساعة**)، واتـە: زۆر نیزیـک کەوتـەوە ئاخیـر زەمـان، وشـەی (**سَـاعَة**)، لێـرەدا بـە مانای ئـەو کاتەیـە، کـە ئـەم ژیـانی دنیـاو گەردوونـەی تێـدا کۆتایـی دێ، چونکـە جـاری واش

www.alibapir.com


هەیە (سَاعَة)، بە مانای کۆی ڕۆژی دوایی دێ و، جاری واش هەیە، بە مانای قیامەت دێ، بەڵام بە زۆریی بە مانای ئاخیر زەمان دێ.

(وَٱنشَقَّ ٱلْقَمَرُ): مانگ لەت بوو، (**الشَّقُّ: الخَرْمُ الوَاقِعُ فِي الشَّيْءِ، يُقَالُ: شَقَقْتُهُ بِنِصْفَيْنِ، وَالإنْشِقَاقُ: قُبُولُ الشَّقِّ**)، (شق): بریتیە لە لەتبوون، قڵیشان لە شتێکدا، دەگوترێ: (**شَقَقْتُهُ بِنِصْفَيْنِ**)، کردمە دوو نیوە، دوو لەتمکرد، (**انْشِقَاق**)یش لەسەر کێشی (**انْفِعَال**)ەو بریتیە لە قبووڵکردنی لەتبوون، یانی: (**شَقَقْتُهُ فَانْشَقَّ**)، لەتمکرد، ئەویش لەتبوو.

(مُّسْتَمِرٌّ): واتە: بەردەوام، (**المُرُورُ: المُضِيُّ وَالإجْتِيَازُ بِالشَّيْءِ**)، (**مُرُور**): بریتیە لە ڕەتبوون و تێپەڕبوون بە لای شتێکدا، (**مُسْتَمِرّ: مُدَاوِمٌ وَمُطَّرِدٌ، وَالإسْتِمْرَارُ فِي الشَّيْءِ مُرورٌ مِنْهُ بَعْدَ مُرُورٍ**)، (**مُسْتَمِرّ**)، بە مانای بەردەوام و لێککشاوە، وشەی (**اسْتِمْرَار**): بریتیە لە ڕۆیشتن بە لای شتێکدا، یان بە نێو شتێکدا، ڕۆیشتن لە دوای ڕۆیشتن.

(مُّسْتَقِرٌّ): (**القَارُّ: المُسْتَقِرُّ الثَّابِتُ فِي المَكَانِ**)، (**قَارّ**): بە مانای جێگیر، ئنجا (**مُسْتَقِر**)، واتە: زۆر چەسپاوو جێگیر.

(مُزْدَجَرٌ): (**طَرْدٌ وَمَنْعٌ عَنِ ارْتِكَابِ المَآثِمْ**)، دەرکردن و ڕێ لێگرتن لە گوناهان، کەواتە: (**مُزْدَجَر**)، واتە: شوێنی سڵەماندنەوە، یاخود چاوگە بە مانای سڵەماندنەوەو دوورخستنەوە.

(حِكْمَةٌ): (**راغب الأصفهاني**) ئاوای پێناسە کردوە: (**الحِكْمَةُ: إِصَابَةُ الحَقِّ بِالعِلْمِ وَالعَمَلِ، وَحِكْمَةُ اللهِ: مَعْرِفَةُ الأَشْيَاء وَإِيجَادُهَا عَلَى غَايَةِ الإِحْكَامِ، وَالحِكْمَةُ مِنَ الإِنْسَانِ: مَعْرِفَةُ المَوْجُودَاتِ وَفِعْلُ الخَيْرَاتِ**)، حیکمەت بریتیە لە پێکانی هەق لە ڕووی زانیاریی و کردەوەوە {جاری وایە مرۆڤ شتێک دەزانێ، بەڵام کە دێتە سەر جێبەجێ کردن، نایتوانێ، حیکمەت ئەوەیە هەم لە ڕووی زانیارییەوە شتەکە باش بزانێ، هەم لە ڕووی کردەوەوە چاکی جێبەجێ بکات}حیکمەتی

www.alibapir.com


خـواش بریتیـه لـه زانینـی شـتەکان و دروسـتکردنیان بەوپـەڕی ڕێـک و پێکیـی، بـەڵام حیکمـەت لـه مرۆڤـەوە، بریتیـه لـه ناسینی دروسـتکراوەکان و ئەنجامـدانی چاکـەکان.

(بَٰلِغَةٌ ): (**البُلُـوْغ وَالبَـلاَغُ: الإنْتِهَـاء إلى أَقْـصَى المَقْصِـد**)، (**بُلُـوغُ وبَـلاَغ**)، هەردووکیـان بـه مانـای گەیشـتنه کۆتایـی ئـەو پـەڕی ئامانـج و مەبەسـتێک، کەواتـه: (**حِكْمَـة بَالِغَـة**)، یانـی: حیکمەتـێ: کـه گەیشـتۆته ئەوپـەڕی ئامانجـی خـۆی.

(ٱلنُّذُرُ): (**النُّـذر: جَمْـعُ إنْـذَار، أو مُنْـذِر، وَالإنْـذَارُ: إخْبَـارٌ فِيْـهِ تَخْوِيْـفٌ**)، (**نُـذُرُ**) یـان کـۆی (**إنْـذَار**)ە، واتـه: ترسـاندن و ئاگادارکردنـەوە، یاخـود کـۆی (**مُنْـذِر**)ە، واتـه: ترسـێنەرو وریاکـەرەوە، ئنجـا (**إنْذَار**)یـش، بریتیـه لـه هـەواڵ پێدانێـک ترسـاندنی تێدابـێ.

(نُّكُرٍ ): (**النُّكْـرُ: الدَّهَـاءُ وَالأَمْـرُ الصَّعْـبُ، الَّـذِي لَا يُعْـرَفُ، نَكِـرَ نَـكَارَةً، فَهُـوَ مُنْكَـرٌ وَنُكْـرٌ**)، (**نُكْـر**): یـانی: بەڵایـەک و کارێکـی قـورس کـه نانـاسرێ و نامۆیـه، دەگوتـرێ: (**نَكِـرَ نَـكَارَةً**)، واتـه: نەنـاسراو بـوو، نەنـاسران.

(خُشَّعًا ): (**خُشَّـعاً**)، کـۆی (**خَاشِـع**)ە، (**خَاشِـع**)یش لـه (**خُشُـوع**)ەوە، هاتوه (**الخُشُـوعُ: الضَّرَاعَـةُ**)، واتـه: کڕووزانـەوەو ملکەچیـی، کەواتـه: (**خُشَّـعاً أَبْصَارُهُـمْ**)، چاوەکانیـان پـڕ تـرس و بیـم و دامـاوو کـزن.

(ٱلْأَجْدَاثِ): (**الأَجْدَاثِ: جَمْعُ جَدَث، وَهُوَ القَبْرُ**)، (**أَجْدَاث**)، یانی: گۆڕەکان.

(جَرَادٌ ): (**سُمِّيَ الجَـرَادُ جَـرَاداً، مِـنْ جَـرْدِهِ الأَرْض مِـنَ النَّبَـات**)، (**جَـرَاد**)، کولله، بۆیـه بـه کوللـه گوتـراوه (**جَـرَادٌ**)، چونکـه زەوی ڕووت دەکاتـەوە لـه ڕووەک و هەمـووی دەخـوات، تاکـی (**جَـرَاد**) بریتیـه لـه (**جَـرَادَة**)، کـه هـەم بـۆ مـێ و هـەم بـۆ نێریـش بـەکاردێ، واتـه: یـەک کوللـه.

(مُّهْطِعِينَ ): (**هَطَـعَ الرَّجُـلُ بِبَـصَرِه، أي: صَوَّبَـهُ**)، واتـه: پیاوەکـه چـاوی بڕیـه فـڵان شـته، بـه زۆری (**مُهْطِعِـيْن**)، بـه مانـای سـەر هەڵبڕیـن لـه کاتی خێـرا ڕۆیشـتندا،

www.alibapir.com


بەکاردەهێنرێ، کەواتە: (مُهْطِعِيْن)، بە مانای (مُسْرِعِيْن)، واتە: بە خێرایی ڕۆیشتوو، لەگەڵیشیدا گەردن بەرزکردنەوەو سەر هەڵێنان.

(عَسِرٌ): (العُسْرُ: نَقِيْضُ اليُسْرِ، يَوْمٌ عَسِرٌ وَعَسِير: يَتَصَعَّبُ فِيْهِ الأمُور)، (عَسِر) لە (عُسْر)ەوە هاتوە، (عُسْر)، پێچەوانەو دژی (يُسْر)ە، یانی: ئاسانیی و (عُسْر) یانی: زەحمەتیی، کەواتە: (يَوْمٌ عَسِيْر وَيَوْمٌ عَسِر)، واتە: هەم بە (ي)، هەم بە (كَسْرَة) بە ژێر: ڕۆژێکە کە کارەکان تێیدا وە زەحمەت دەکەون و قورس دەبن.

## هۆی هاتنە خوارەوەی ئایەتەکان

لە بارەی ئەم دوو ئایەتە موبارەکەوە: ﴿ٱقۡتَرَبَتِ ٱلسَّاعَةُ وَٱنشَقَّ ٱلۡقَمَرُ ۝١ وَإِن يَرَوۡاْ ءَايَةً يُعۡرِضُواْ وَيَقُولُواْ سِحۡرٞ مُّسۡتَمِرّٞ ۝٢﴾، زۆر شت هاتوە، بەڵام ئێمە ئەوەی کە لە ڕووی سەنەدەوە ڕاستە، یان بە ڕاستترمان هاتۆتە بەرچاو، بەپێی قسەی پسپۆڕانی ئەو بوارە، ئەوەمان هێناوە:

{عَنْ أَنَسٍ رضي الله عنه، قَالَ: «سَأَلَ أَهْلُ مَكَّةَ النَّبِيَّ ﷺ آيَةً، فَانْشَقَّ القَمَرُ بِمَكَّةَ مَرَّتَيْنِ، فنزلت: ﴿ٱقۡتَرَبَتِ ٱلسَّاعَةُ وَٱنشَقَّ ٱلۡقَمَرُ ۝١ وَإِن يَرَوۡاْ ءَايَةً يُعۡرِضُواْ وَيَقُولُواْ سِحۡرٞ مُّسۡتَمِرّٞ ۝٢﴾} (أخرجه عبدالرزاق في تفسيره، ج٢، ص٢٥٧، ومن طريقه مسلم في صحيحه: ٢١٥٩، لكن لم يسق لفظه، وأحمد في مسنده، ج٣، ص٦٥، وعبد بن حُميد: ١١٨٢، والترمذي في الجامع الصحيح: ٣٢٨٦، وقال: حديث حسن صحيح، ورواه الحاكم في المستدرك ج٢، ص٦٧٢، والبيهقي في دلائل النبوة: ج٢، ص٢٦٣، (وقال الحاكم هذا حديث صحيح على شرط الشيخين ولم يخرجاه بهذه السياقة، ووافقه الذهبي وَصَحَّحَهُ مؤلِّفا الإستيعاب في بيان الأسباب: ج٣، ص٣٠٠ -٣٠٢).

واتە: ئەنەسی کوڕی مالیک رضي الله عنه دەڵێ: خەڵکی مەککە داوایان لە پێغەمبەر ﷺ کرد، نیشانەیەکیان، بەڵگەیەکیان لەسەر ڕاستیی خۆی پێشان بدات، {ئەویش

www.alibapir.com


پاڕاوەتەوە لە خوای پەروەردگارو} مانگ لەتبوو، دوو جارانیش ئەوە ڕوویدا لە مەککە، ئیدی بەو بۆنەوە ئەو ئایەتە موبارەکە، یان ئەو چەند ئایەتە موبارەکە، هاتنەخوار.

شایانی باسە: ئێمە دوایی کورتە باسێک دەکەین، لە بارەی لەتبوونی مانگەوە، بۆیە لێرە هەروا بە خێرایی بەسەر هۆی هاتنە خوارەکەیدا، تێپەڕین، ئەگەرنا ئەو مەسەلەیە وردەکاریی و درێژەی زیاتری هەیە.

## مانای گشتیی ئایەتەکان

بەڕێـــــزان!

وەک لە خستنە ڕووی نێوەڕۆکی ئەم سووڕەتە موبارەکەدا، باسمانکرد، ئەم سووڕەتە سەرەتایەکەی هەمووی باسی ڕۆژی دواییە، بە تایبەت ئاخیر زەمان، هەروەها لە سێزدە ئایەتەکەی کۆتاییشدا، بە هەمان شێوە، ئنجا هەشت ئایەتەکەی سەرەتا لەگەڵ سێزدە ئایەتەکەی کۆتایی دەکەنە: بیست و یەک و، سی و چوار ئایەتیش لەم سووڕەتە موبارەکە، دەربارەی بەسەرهاتی پێغەمبەرانن (عَلَيْهِمُ الصَّلَاةُ وَالسَّلَام)، پێنج لە پێغەمبەران: (نووح و هوودو صالّیح و لووط و مووسا)، (عَلَيْهِمُ الصَّلَاةُ وَالسَّلَام) لەگەڵ گەلەکانیان، ئنجا ئەم هەشت ئایەتی سەرەتا، خوای زانای کارزان، تێیاندا باسی زۆر وەنیزیککەوتنی، کۆتایی هاتنی ئەم ژیانە دنیاییە، کە ئاخیر زەمانی پێ دەگوترێ، دەکات، کە وشەی (سَاعَة) لە قورئاندا، وەک ناوێکی ناسێنەر (عَلَمْ) بۆی بەکارهاتوە، هەروەها باسی لەتبوونی مانگ و، باسی ئەوە کە بێبڕوایەکان، هەرچەندە نیشانان ببینن، هەر بە جادووی بەردەوامی دادەنێن و، بە دوای ئارەزووی خۆیان دەکەون و، گوێ بەو هەموو حیکمەت و پەندو ئامۆژگارییانە نادەن، کە لە بەسەرهاتی پێغەمبەرانی پێشوودا (عَلَيْهِمُ الصَّلَاةُ وَالسَّلَام) و گەلەکانیان، کە خوا بۆی گێڕاونەوە، وەردەگیرێن.

www.alibapir.com


خـوا ﷽ دەفەرمـوێ: (﴿بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ﴾ ) بـە نـاوی خوای بە بەزەیی بەخشــندە، واتــە:

دەستپێکردنم بە ناوی خوایە، ئەوەش مەبەستی پێ ئەوەیە:

١ - ئەم کارە تەنها بۆ خوا دەکەم.

٢ - ئەم کارە بە پێی شەرعی خوا دەکەم.

٣ - ئەم کارە بە تواناو یارمەتیی خوای پەروەردگار دەکەم.

٤ - ئەم کارە بۆ هێنانەدی ڕەزامەندیی خوا ئەنجام دەدەم.

﴿ٱقۡتَرَبَتِ ٱلسَّاعَةُ وَٱنشَقَّ ٱلۡقَمَرُ﴾، (سَاعَة)، زۆر نیزیـک کەوتـەوەو مانـگ لەتبـوو، (سَـاعَة)، ئاخیـر زەمـان، ئـەو کاتـەی ئـەم ژیانـە دنیاییـەی تێـدا کۆتایـی پـێ دێ و، ئـەم گەردوونـە دەپێچرێتـەوە.

﴿وَإِن يَرَوۡاْ ءَايَةً يُعۡرِضُواْ وَيَقُولُواْ سِحۡرٌ مُّسۡتَمِرٌّ﴾، ئەگــەر نیشــانەیەک ببینــن، نیشــانەیەکی زۆر مــەزن و نــاوازەش ببینــن، پشــت هەڵدەکــەن، ڕووی لــێ وەردەچەرخێنــن و دەڵێــن: ئەمــە جادوویەکــی بەردەوامــەو درێــژەی هەیــە، ئــەم جـادووەی موحەممـەد ﷺ! حاشـای پێغەمبـەرو قوڕئـان و ئیسلام، ئنجا ئـەم ئایـەتی دووەم، بەڵگەیـە لەسـەر ئـەوە کـە مانـگ لـە ڕۆژگاری پێغەمبـەردا ﷺ لەتبـووە، چونکـە دەفەرمـوێ: ئەگـەر نیشـانەیەک ببینـن، پشـتی تێدەکـەن و ڕووی لێوەردەگێڕن و دەڵێـن: ئەمـە جادوویەکـی بەردەوامـە، ئێمـە دوایـی کورتـە باسـێک لـەو بـارەوە دەکەیـن، بۆیـە ئێسـتا بـە خێرایـی بەسـەر ئـەو ئایەتانـەدا ڕەت دەبیـن.

﴿وَكَذَّبُواْ وَٱتَّبَعُوٓاْ أَهۡوَآءَهُمۡ﴾، بـە درۆیـان دانا، واتە: پێغەمبـەری خاتەم ﷺو، ئـەو پەیامـەی کـە خـوا پێیـدا نـارد بـوو، لـە دوو توێـی قوڕئانـدا، بـە درۆیـان دانـا، ﴿وَٱتَّبَعُوٓاْ أَهۡوَآءَهُمۡ﴾، کەوتنـە شـوێن ئارەزووەکانیـان، واتـە: هـۆی بـە درۆ دانانیـان بـۆ پەیامـی خـوا، کـە بـە پێغەمبـەری خاتەمـدا ناردوویـەتی، ئـەوە بـوو، کـە بـە دوای

www.alibapir.com


ئارەزووەکانیـان دەکەوتـن و، ئـەو پەیامـەی خـواش لەگـەڵ ئـارەزووەکانی ئـەوان و، بەرژەوەندییـە ناشـەرعییەکانی سـەران و بڕیـار بـە دەسـتان و زلـە زلەکانیـان دا نەدەگونجـا، خەڵکەکـەی دیکـەش، وەک چـۆن بـا، لـە پـووش و پـەڵاش و قانگە لۆشـک دەداو ڕای دەماڵـێ، ئـاوا بـە دوای ئـەو سـەرزلانەیان کەوتبـوون، ئەوانیـش هـەر شـوێن ئـارەزووی خۆیـان دەکەوتـن و، چاویـان چـڕ داگرتبـوو لەسـەر بەرژەوەندییـە ناشـەرعییەکانیان، کـە بەهـۆی کوفـرو شـیرکەوە بۆیـان دابیـن دەبـوون، بـەڵام پەیامـی خـوا بـە یەکگرتـن و تەنیـا خـوا پەرسـتن، ئـەو بـەزم و بـازاڕە ناشـەرعییەی لـێ تێکـدەدان، لـەو کاتیشـدا ئـەوە وابـووەو، لـە ڕۆژگاری ئێستاشـدا هەروایە، ﴿وَكُلُّ أَمۡرٖ مُّسۡتَقِرّٞ﴾، هەمـوو کارێکیش جێگیـر دەبـێ، واتـە: هەمـوو کارێـک سـەرەنجام دەگاتـە ئـاکام و ئەنجامـی خـۆی.

﴿وَلَقَدۡ جَآءَهُم مِّنَ ٱلۡأَنۢبَآءِ مَا فِيهِ مُزۡدَجَرٌ﴾، بـە دڵنیایـی لـە هەواڵـەکان، هـی وایـان بـۆ هاتبـوو کـە مایـەی سـڵەماندنەوە بـوو، مایـەی ترسـاندنیان و دوورخسـتنەوەیان بـوو، لـە کوفـرو تـاوان و خراپـە.

﴿حِكۡمَةُۢ بَٰلِغَةٞ﴾، ئـەوەی بۆیـان هاتبـوو لـە هەواڵـە پێشـووەکان، زانیارییەکـی زۆر ڕاسـت و بـە سـوودو نیشـانە پێکـەر بـوو ﴿بَٰلِغَةٞ﴾، یـانی: گەیشـتبووە ئـەو پـەڕی ئامانجـی خـۆی، ﴿فَمَا تُغۡنِ ٱلنُّذُرُ﴾، بـەڵام ترسـاندنەکان، چ سـوودێکیان هەیـە! یاخـود: (مـا) لێرەدا لابـەرە (نافية)یـە، نـەک (مـا)ی پرسـیارکردن (مـا الإسـتفهامية)، واتـە: بـەڵام ترسـاندنەکان و ئـاگادار کردنـەوەکان سـوودیان نیـە، بۆیـە ئـەوان بەهرەمەنـد نەبـوون لـەو قوڕئانـە پـڕ حیکمەتـە.

﴿فَتَوَلَّ عَنۡهُمۡ﴾، کەواتـە: ئـەی موحەممـەد ﷺ! کـە حاڵیـان بـەو شـێوەیە، ڕوویـان لـێ وەرگێـڕەو پشـتیان تـێ بکـە، نـەک وازبێنـێ لـە ئاگادارکردنەوەیـان، بـەڵام یـانی: چاوەڕوانییـت لێیـان نەبـێ، یاخـود: ئەمـە هەڕەشـەیە بـۆ ئـەوان، واتـە: لێیـان گـەڕێ، چاوەڕێبـەو بـۆ ئێمەیـان لێگـەڕێ، ﴿يَوۡمَ يَدۡعُ ٱلدَّاعِ إِلَىٰ شَيۡءٖ نُّكُرٍ﴾، ئـەو

ڕۆژە کـە بانگکـەر بانـگ دەکات بـۆ شـتێکی نەنـاسراو، بـۆ شـتێکی زۆر سـامناک و نامـۆ، کـە مەبەسـت پێـی سـزای خوایـە لـە ڕۆژی دواییـدا.

﴿خُشَّعًا أَبْصَٰرُهُمْ﴾، چاوەکانیـان (هـی بێبڕوایـان) پـڕ تـرس و بیـم و لـەرزن، ﴿يَخْرُجُونَ مِنَ ٱلْأَجْدَاثِ كَأَنَّهُمْ جَرَادٌ مُّنتَشِرٌ﴾، وەک کوللـەی پـرژو بـڵاو لـە گـۆڕەکانیـان دێنـە دەرێ.

﴿مُّهْطِعِينَ إِلَى ٱلدَّاعِ﴾، زۆر بـە خێرایـی بـەرەو بانگکەرەکـە دەڕۆن، ئـەو بانگکـەرە، دەگونجـێ مەبەسـت پێـی ئیسـڕافیل بـێ ﷺ کە دووجـاران فـوو بـە کەڕەنادا دەکات، جـاری یەکەمیـان دەبێتـە هـۆی هاتنـی ئاخیـر زەمـان و، جـاری دووەم دەبێتە هـۆی زینـدوو کرانـەوە، کـە لێـرەدا مەبەسـت پێی جـاری دووەمـە، بە خێرایـی دەڕۆن لـە حاڵێکـدا کـە سـەریان بەرزکردۆتـەوەو ملیـان ڕاکێشـاوە، بـەرەو ئـەو بانگکـەرەی بانـگ دەکات، مـل دەنێـن، ﴿يَقُولُ ٱلْكَٰفِرُونَ هَٰذَا يَوْمٌ عَسِرٌ﴾، ئەوانـەی بێبـڕوان، دەڵێـن: ئەمـڕۆ ڕۆژێکـی زۆر قـورس و زەحمـەت و تووشـە، ڕۆژێکـی زۆر سـاماناکە، کاروبـار تێیـدا زۆر دژوارە، حاڵـی ئەوانیـش حاڵێکـی زۆر شـپرزو قـورس و زەحمـەت دەبـێ.

خـوا پەنامـان بـدات لـە مەینەتییـەکانی ئـەو ڕۆژەو، لـەو کەسـانەمان بگێـڕێ کـە لـەو ڕۆژەدا دڵنیـاو هێمـن دەبـن و، بێـترس و بیـم دەبـن، بەهـۆی ئـەو ئیـمان و تەقوایـەوە کـە لـە دنیـادا وەدەسـتی دێنـن.

لە ڕێگەی کۆمەڵایەتییەکان لەگەڵتانین
Stay in touch on social media
نحن معكم عبر مواقع التواصل الاجتماعي
ڕاگەیاندنی مەکتەبی مامۆستا عەلی باپیر
AliBapir/عەلی باپیر
archive.org/details/@alibapir
AliBapir/عەلی باپیر
AliBapir
کەناڵی ڕاگەیاندنی مەکتەبی مامۆستا عەلی باپیر
www.alibapir.net
کوردی - عربي - English
ڕاگەیاندنی مەکتەبی مامۆستا عەلی باپیر

www.alibapir.com


مەسەلە گرنگەکان

## مەسەلەی یەکەم:

**هەواڵدانی خوا عزوجل بە نزیککەوتنەوەی ئاخیر زەمان و، لەتبوونی مانگ و، بەردەوام بوونی بێبڕوایان لە پشت هەڵکردن و، بە جادوو دانانی هەر بەڵگەو نیشانەیەک کە پێغەمبەری خاتەم موحەممەد ﷺ بۆیان دێنێ و، شوێنکەوتنی ئارەزووەکانیان و گوێ نەدان، بەو هەموو هەواڵ و بەسەرهاتانەی خوا، کە وەک حیکمەتێکی هەرە باڵا بۆی باسکردوون و، بەهرەمەند نەبوونیان لەو هەموو ترسێنەرو ترساندنانە:**

خوا دەفەرمووێ: ﴿ٱقْتَرَبَتِ ٱلسَّاعَةُ وَٱنشَقَّ ٱلْقَمَرُ ﴿١﴾ وَإِن يَرَوْا۟ ءَايَةً يُعْرِضُوا۟ وَيَقُولُوا۟ سِحْرٌ مُّسْتَمِرٌّ ﴿٢﴾ وَكَذَّبُوا۟ وَٱتَّبَعُوٓا۟ أَهْوَآءَهُمْ ۚ وَكُلُّ أَمْرٍ مُّسْتَقِرٌّ ﴿٣﴾ وَلَقَدْ جَآءَهُم مِّنَ ٱلْأَنۢبَآءِ مَا فِيهِ مُزْدَجَرٌ ﴿٤﴾ حِكْمَةٌۢ بَٰلِغَةٌ ۖ فَمَا تُغْنِ ٱلنُّذُرُ ﴿٥﴾﴾.

## شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە هەشت بڕگەدا:

١)- ﴿ٱقْتَرَبَتِ ٱلسَّاعَةُ وَٱنشَقَّ ٱلْقَمَرُ﴾، کاتەکە (السَّاعَة)، زۆر وەنیزیک کەوت و مانگ لەت بوو، (**الإِقْتِرابُ أَصْلُهُ صِيغَةُ مُطَاوَعَة، وَهُنَا لِلْمُبالَغَةِ في القُرْبِ**)، ڕەژگەی بەرفەرمان بوون (**صِيغَة المُطاوَعَة**) ئەوەیە کارێک ڕوو لە شتێک بکات و، ئەو شتە ئامادەیی ببێ و جێبەجێ بکات، وەک دەگوترێ: (**أَمَرْتُهُ فَأْتَمَر**)، فەرمانم پێکرد، فەرمانەکەی جێبەجێ کرد، (**كَسَرْتُه فَانْكَسَر**)، شکاندم ئەویش شکا، بەڵام لێرەدا بۆ زێدەڕۆییکردنە لە زۆر نیزیککەوتنەوەدا، واتە: (ساعَة)، زۆر وەنیزیک کەوتەوە، (**ساعَة**)ش، وەک ناوێکی عەلەم بۆ ئاخیر زەمان، بۆ ئەو کاتەی ژیانی دنیای تێدا کۆتایی دێ، لە قورئاندا بەکارهاتوە، جاری واش هەیە بە مانای قیامەت دێ، بەڵام بە زۆریی بە

www.alibapir.com


مانای ئاخیر زەمان و، کاتی تێدا کۆتایی هاتنی ژیانی دنیایە، وەک پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: {**بُعِثْتُ أَنَا وَالسَّاعَةَ كَهاتَيْنِ، وَأَشَارَ بِسَبَّابَتِهِ وَالوُسْطى**} (**أخرجه البخاري: ٦٥٠٤، ومسلم: ٢٩٥١ عن أنس بن مالك**)، واتە: لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە رضي الله عنه هێناویانە، واتە: پێغەمبەر ﷺ ئاماژەی بە پەنجەی شایەتمانی و بە پەنجەی نێوە ڕاستی کردو فەرمووی: من و کاتەکە ئاوا پێکەوە هاتووین و پێکەوە جووتین.

واتە: لە دوای پێغەمبەری خاتەم ﷺ هیچ پێغەمبەری دیکە نایەن و، دنیا کۆتا هاتن لە ڕۆژگاری ئۆممەتی موحەممەددا دێ، کە دەفەرموێ: مانگ لەت بوو ﴿وَٱنشَقَّ ٱلۡقَمَرُ﴾، (**انْشَقَّ مُطَاوِعُ شَقَّهُ فَانْشَقَّ**)، واتە: لەتم کرد، ئەویش ئامادەیی لەتبوونی هەبوو.

٢)- ﴿وَإِن يَرَوۡاْ ءَايَةً يُعۡرِضُواْ﴾، ئەگەر نیشانەیەک ببینن {واتە: بێبڕوایانی ڕۆژگاری پێغەمبەری خوا ﷺ هەر نیشانەیەک ببینن} پشتی تێدەکەن و ڕووی لێوەردەگێڕن.

٣)- ﴿وَيَقُولُواْ سِحۡرٞ مُّسۡتَمِرّٞ﴾، دەڵێن: ئەوە جادوویەکی بەردەوامە، (**مُسْتَمِرٌّ: مُشْتَقٌّ مِنْ فِعْلِ مَرَّ الَّذِي هو مَجازٌ فِي الزَّوالِ، والسِّينُ والتّاءُ لِلتَّقْوِيَةِ فِي الفِعْلِ، أو مُشْتَقٌّ مِنَ المِرَّةِ بِكَسْرِ المِيمِ، أيِ القُوَّةِ، والسِّينُ والتّاءُ لِلطَّلَبِ، والمَعْنى: هَذا سِحْرٌ مَعْرُوفٌ مُتَكَرِّرٌ**)، (**مُسْتَمِرّ**) :

أ- یان داتاشراوە لە کرداری (مَرَّ)، واتە: تێپەڕی، لێرەدا مەبەست پێی لە بەینچوونە، (س و ت)سین و تایەکەش بۆ بەهێزکردنی کارەکە تێیدا زیادکراون.

ب- یاخود داتاشراوە لە وشەی (مِرَّة)ەوەیە کە، بە مانای: هێز دێ {(مَرَّة)ش، بە مانای جارێک دێ} سین و تایەکەش داواکردن دەگەیەنن، مەبەست ئەوەیە ئەمە جادوویەکی ناسراوی دووبارە بووەوەیە.

٤)- ﴿وَكَذَّبُواْ وَٱتَّبَعُوٓاْ أَهۡوَآءَهُمۡ﴾، بە درۆیان دانا و شوێن ئارەزووەکانیان کەوتن، چییان بە درۆ دانا؟ بەرکار (**مَفْعُول بِهِ**)ەکەی قرتێنراو (**مَحْذُوف**)ە، واتە: پێغەمبەریان

www.alibapir.com


بە درۆ دانا، قورئانیان بە درۆ دانا، ڕۆژی دواییان بە درۆ دانا، هەموویان دەگرێتەوە، ﴿وَٱتَّبَعُوٓاْ أَهۡوَآءَهُمۡ﴾ هەروەها کەوتنە شوێن ئارەزووەکانیان.

٥)- ﴿وَكُلُّ أَمۡرٖ مُّسۡتَقِرّٞ﴾، هەموو کارێکیش چەسپاوە، (**كُلُّ أَمْرٍ مُسْتَقِرٌّ**)، خوێندراویشەتەوە: (**كُلُّ أَمْرٍ مُسْتَقِرٍّ**)، هەر چۆن بێ (**مُسْتَقِر**)، ژێردار (**مكسور**) یان بۆردار (**مرفوع**) بێ، هەر ناوی بکەر (**اسْمُ فَاعِل**)ە، لە (**اسْتَقَرّ**) واتە: جێگیر بوو، نیشتەجێ بوو، واتە: هەر کارێک لە کارەکان بەرەو ئەو چارەنووس و سەرەنجامەی بۆی شایستەیە دەچێ و، کاری پێغەمبەریش ﷺ بەرەو ئەو ئاکام و سەرەنجامەی لێی دەوەشێتەوە دەچێ، کە بریتیە لە چەسپان و، بەردەوام بوون و، بە ئاکام گەیشتن، لەگەڵ ئەوەشدا کە بێبڕوایەکان بە درۆی دادەنێن و، پشتی لێ هەڵدەکەن و ناڕەحەتیی و گرفتارییانی بۆ دێننە پێش، بەڵام سەرەنجام هەر کارە دەگاتە ئەو سەرەنجامەی بۆی شایستەیە، وەک عەرەب دەڵێن: (**لَا يَصِحُّ إلاَّ الصَّحِيْح**)، هەر شتی ڕاست، ڕاست دەردەچێ، مەیدانی درۆیە کورتە، بەڵام ڕاستیی لە مەیدانی درێژدا تاقیی دەکرێتەوە، لێرەدا کە دەفەرموێ: ﴿وَكَذَّبُواْ وَٱتَّبَعُوٓاْ أَهۡوَآءَهُمۡ﴾، بە درۆیان دانا، واتە: پێغەمبەریان ﷺ بە درۆ دانا، قورئانیان بە درۆ دانا، ڕۆژی دواییان بە درۆ دانا، پەیامی خوایان بە گشتیی بە درۆ داناو، شوێن ئارەزووەکانیان کەوتن، وەک پێشتریش ئاماژەمان پێدا، کەواتە: شوێن ئارەزووان کەوتنە، وایان لێ دەکات پەیامی خوا بە درۆ دابنێن، نەک لەبەر ئەوەی عەقڵ و مەنتیق بەوە واداریان دەکات، بەڵکو شوێنکەوتنی ئارەزوو و، دابینکردنی بەرژەوەندییە ناشەرعییەکانیانە، وایان لێ دەکات بە دوای هەق نەکەون، چونکە ئەگەر شوێن ئەو پەیامە هەقە بکەون، کە خوا ناردوویەتی بە پێغەمبەر خاتەمدا، کە دەڵێ: دەبێ هەمووتان بەندەی خوا بن و، پێکەوە براو تەبا بن و، دەڵێ: ئێوە بۆ تاقیکرانەوە لەسەر زەویدا دانراون و ئێوە جێنیشینی خوان و، هەمووتان بەڕێزن لە لای خوا، ﴿وَلَقَدۡ كَرَّمۡنَا بَنِيٓ ءَادَمَ﴾ الإسراء: ٧٠، بۆیە کەس بۆی نیە، کەس بکاتە کۆیلەی خۆی و، کەس بۆی نیە کەس بکاتە خزمەتکارو قەرەواشی خۆی، بەڵکو دەبێ پێکەوە تەبابن، خوا نیعمەتەکانی بۆ

www.alibapir.com


هەمووان لەسەر زەویدا داناون: ﴿وَالْأَرْضَ وَضَعَهَا لِلْأَنَامِ ﴿١٠﴾﴾ الرحمن، ﴿هُوَ الَّذِي خَلَقَ لَكُم مَّا فِي الْأَرْضِ جَمِيعًا ﴿٢٩﴾﴾ البقرة، ئەگەر بە دوای ئەو پەیامە بکەون، ئەو بەزم و بازاڕە ناشەرعییەی دروستیان کردوە، چ زلە زلانی قوڕەیش، کاتی خۆی لە مەککەو، چ جوولەکەکان و سەرانی جوولەکەکان لە مەدینەو، سەرانی نەصرانییەکان لە شوێنەکانی دیکە و، چ خۆسەپێنەرانی ئێستا لەم ڕۆژگارەدا، حوکمڕانە خۆ سەپێنەرو بە زەبرو زۆرەکان، ئەگەر شوێن هەق بکەون و، مل بۆ هەق کەچ بکەن، لە ڕووی سیاسییەوە، ڕێی خۆ سەپاندنیان نامێنێ و، لە ڕووی ئابوورییەوە، ڕێی قۆرخکاریی و گەندەڵییان نامێنێ و، لە ڕووی کۆمەڵایەتییەوە، ڕێی خۆ پەسەندیان نامێنێ، کەواتە: ئەو بەزم و بازاڕەیان لێ تێک دەچێ.

٦)- ﴿وَلَقَدْ جَاءَهُم مِّنَ الْأَنبَاءِ مَا فِيهِ مُزْدَجَرٌ﴾، بەدڵنیاییی لە هەواڵەکان دا هی وایان بۆ هاتوە سڵەماندنەوەی تێدایە، وشەی (لَقَد)، (ل) بۆ سوێندە، یاخود: زەمینە خۆشکەرە بۆ سوێند (**مُمَهِّدَةٌ لِلْقَسَمِ**)، (**قَدْ**) بۆ ساغکردنەوەیە، واتە: زۆر بە دڵنیایی لە هەواڵەکاندا، کە بۆیان هاتوون، هی وایان بۆ هاتوە سڵەماندنەوەو دوور خستنەوەی تێدایە، بۆ ئەوان لە شیرک و کوفرو لادان و تاوان، (**الْمُزْدَجَرُ: مَصْدَرٌ مِيمِيٌّ، زَجَرَهُ، أي: نَهَرَهُ وَمَنَعَهُ، وَمَادَّةُ الإِفْتِعَالِ فِيهِ لِلْمُبالَغَةِ**)، (**مُزْدَجَر**): کە ئەصڵی خۆی (**الْمُسْتَجَر**) بووە، چاوگێکی میمییە لە (**زَجَرَهُ**)ەوە هاتوە، (**زَجَرَهُ**) واتە: دەری کردو ڕێی لێگرت، ڕێژگەی (**إِفْتِعَال**)یش تۆخیی واتایەکەی و زێدەڕۆیی تێدا کردنی و بەهێز کردنی دەگەیەنێ، واتە: لەو هەواڵانەدا کە بۆیان هاتوون، کە بریتیە لە هەواڵی بەسەرهاتی پێغەمبەران (**عَلَيْهِمُ الصَّلَاةُ وَالسَّلَام**)و گەلە پێشووەکان، هی وایان تێدایە، ﴿مَا فِيهِ مُزْدَجَرٌ﴾، مایەی سڵەماندنەوەو دوورخستنەوەو ڕێ لێگرتنی ئەوانە لە کوفرو شیرک و خراپە.

٧)- ﴿حِكْمَةٌ بَالِغَةٌ﴾، حیکمەتێکی گەیشتوو (بە ئەوپەڕی). کە دەفەرموێ: ﴿وَلَقَدْ جَاءَهُم مِّنَ الْأَنبَاءِ مَا فِيهِ مُزْدَجَرٌ ﴿٤﴾﴾، ئەم ﴿حِكْمَةٌ بَالِغَةٌ﴾ جێگرەوەی (مَا)یە، واتە: حیکمەتێکی وایان بۆ هات، کە گەیشتۆتە ئەو پەڕی ئامانجی

www.alibapir.com



خۆی، (**حِكْمَة**)یش، بە زۆر شێوە واتا کراوەو دەگونجێ بڵێین: (**إِصَابَةُ العَقْلِ وإتْقَانُ العَمَلِ**)، (**حكمة**) ئەوەیە عەقڵ بپێکێ و کردەوە ڕێک بێ، واتە: مرۆڤ هەق بناسێ و بەپێی ئەو هەقناسینەش بەڕێوەبچێ، (**البَالِغَةُ: الوَاصِلَةُ، أيْ: وَاصِلَةٌ إلى المَقْصُودِ مُفِيدَةٌ لِصَاحِبِها، بِمَا فِيْهِ مَانِعٌ لَهُ مِنْ ارْتِكَابِ مَا ارْتَكَبُوْه**)، (**بالِغَة**): بە مانای گەیشتوو بە ئامانج و بەسوود بۆ خاوەنەکەی، چونکە ڕێیان لێ دەگرێ لە ئەنجامدانی ئەو خراپانەی، ئەوان ئەنجامیان دەدان.

٨)- ﴿فَمَا تُغْنِ ٱلنُّذُرُ﴾، ترساندنەکان سوود ناگەیەنن، (ما)، دەگونجێ لابەرە (نافية) بێ، (**أيْ لَا تُغْنِي عَنْهُمُ النُّذُرُ بَعْدَ ذَلِكَ**)، یانی: ترساندنەکان و ئاگادار کردنەوەکان سوودیان پێ ناگەیەنن، لە دوای ئەو حیکمەتەی گەیشتۆتە ئەوپەڕی ئامانج و سنووری خۆی، بەڵام ئەوان هەر وەڵامیان نەدایەوەو نەسڵەمینەوە، هەرچەندە ئەو هەواڵانەیان بۆ هاتن، کە مایەی سڵەماندنەوەو دوورخستنەوەیان بوون، لە گوناهو لادان و تاوان، ﴿فَمَا تُغْنِ ٱلنُّذُرُ﴾ ترساندنەکان سوودیان نیە، یانی: (**فَمَا تُغْنِهِمْ النُّذُرُ**)، واتە: ترساندن و ئاگادار کردنەوەکان سوود بەوان ناگەیەنن.

دەشگونجێ: (ما) پرسیارکەرانە (**إسْتِفْهَامِية**)بێ، ﴿فَمَا تُغْنِ ٱلنُّذُرُ﴾ ترساندنەکان چ سوودێکیان پێ دەگەیەنن؟! یانی: (**ما الّذِي يُفِيْد النُّذُرُ هَـؤُلَاء المعَانِدين**)، ئەو کەللە ڕەقانە ترساندنەکان، چ سودێکیان پێ دەگەیەنن؟ (**أيَّ: غَنَاءِ تُغْنِي النُّذُرُ**)، ترساندنەکان چ کەلێنێکیان بۆ دەگرن و چ سوودێکیان پێ دەگەیەنن؟ واتە: (ما) ی پرسیارکردن (**الإسْتِفْهَامِية**)، بە مانای نکوڵییلێکردنە، واتە: هیچ سوودێکیان پێ ناگەیەنێ.

پێشتریش گوتمان: (**نُذُرُ**):

أ- یان کۆی (**نَذِيْر**)ە.

ب- یان کۆی (**مُنْذِر**)ە.

ج- یاخود کۆی (**إنْذَار**)ە، (**إنْذَار**)یش ناوی چاوگە.

(**نُذُرُ**)، لێرەدا سێ ئەگەری هەن:

١- لێرەدا دەگونجێ کۆی (**نَذِیْر**) بێ، بە مانای ترسێنەر، واتە: ترسێنەرەکان و وریاکەرەوەکان چ سوودێکیان پێدەگەیەنن؟ یاخود هیچ سوودیان پێ ناگەیەنن.

٢- یاخود کۆی (**مُنْذِر**)ە، یانی: ترسێنەر، (**نَذِیْر وَمُنْذِر**)، یەکەمیان لەسەر کێشی (**فَعِیْل**) و، ئەوەی دیکە لەسەر کێشی (**مُفْعِل**)، هەردووکیان ناوی بکەر (**اسْم فَاعِل**)ن، واتە: ترسێنەرو وریاکەرەوە.

٣- یاخود کۆی (**إِنْذَار**)ە، (**إِنْذَار**)یش، ناوی چاوگە واتە: ترساندن و وریاکردنەوە، کە ئەمە دڵدانەوەیە بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ کە تۆ کەمتەرخەم نی بەرانبەر بەوان و، ئەوەی پێویست بووە گەیاندووتە، بەڵام ئەوانە هیچ شتێک سوودیان پێ ناگەیەنێ ئەوەندە کەللەڕەق و نەسەلمێنن، کەواتە: تۆ ئەرکی سەرشانی خۆت بەرانبەر بە ئەوان ئەنجام داوەو، خەمیان لێ مەخۆ، چونکە وەک دوایی دێ، ئەمە زەمینە خۆشکردنە بۆ ئەوەی دوایی لە ئایەتی ژمارە (٦)دا دێ و، لە مەسەلەی دووەمدا دەیخەینەڕوو.

لە تۆڕە کۆمەڵایەتییەکان لەگەڵتانین
Stay in touch on social media
نحن معكم عبر مواقع التواصل الاجتماعي
AliBapir/عەلی باپیر
AliBapir/عەلی باپیر
archive.org/details/@alibapir
AliBapir
www.alibapir.net
کوردی - عربي - English

www.alibapir.com



### مەسەلەی دووەم:

**ئـەو ڕۆژە کـە بانگکـەر خەڵـک بـۆ لای شـتێکی ترسـناک و نامـۆ بانـگ دەکات و، بێبڕوایـان بـە چـاوی کـزو مـات و پـڕ تـرس و لـەرزەوە لـە گـۆڕەکان دێنـە دەرێ و، وەک کوللـەی پـرژو بـڵاو بـە خێرایـی بـەرەو لای بانگکەرەکـە مـل دەنێنـن و دەڵێـن: ئەمـڕۆ ڕۆژێکـی سـەخت و دژوارە:**

خـوا دەفەرمـوێ: ﴿ فَتَوَلَّ عَنْهُمْ يَوْمَ يَدْعُ الدَّاعِ إِلَىٰ شَيْءٍ نُّكُرٍ ﴿٦﴾ خُشَّعًا أَبْصَارُهُمْ يَخْرُجُونَ مِنَ الْأَجْدَاثِ كَأَنَّهُمْ جَرَادٌ مُّنتَشِرٌ ﴿٧﴾ مُّهْطِعِينَ إِلَى الدَّاعِ يَقُولُ الْكَافِرُونَ هَٰذَا يَوْمٌ عَسِرٌ ﴿٨﴾ ﴾.

### شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە شەش بڕگەدا:

١)- ﴿ فَتَوَلَّ عَنْهُمْ ﴾، ئنجا پشتیان تێبکە، پیتی (ف) لێرەدا (**تَفْرِيعٌ عَلَى «فَما تُغْنِ النُّذُرُ»**)، لە ڕابردوودا خوا فەرمووی: ترساندنەکان سوودیان پێ ناگەیەنن، یاخود ترساندنەکان، چ سوودێکیان پێ دەگەیەنن؟ وەک پرسیارکردنی نکووڵییلێکەرانە، ئنجا ئەمە بنیات دەنرێ لەسەر ئەوەی ڕابرد، ﴿ فَتَوَلَّ عَنْهُمْ ﴾، واتە: کە حاڵ بەو شێوەیە، تۆ پشتیان تێ بکەو وازیان لێ بێنە، (**أَيْ: أَعْرِضْ عَنْ مُجادَلَتِهِمْ، فَإِنَّهم لا تُفِيدُهُمُ النُّذُرُ، كَقَوْلِهِ:** ﴿ فَأَعْرِضْ عَن مَّن تَوَلَّىٰ عَن ذِكْرِنَا ﴾ **النجم، أَيْ إِنَّكَ قَدْ بَلَّغْتَ، فَما أَنْتَ بِمَسْئُولٍ عَنِ اسْتِجابَتِهِمْ**)، واتە: واز لە شەڕە قسەکردنیان لەگەڵ بێنە، چونکە ترساندنەکان سوودیان نیە بۆ ئەوان، ئەمە وەک فەرمایشتی خوایە: ﴿ فَأَعْرِضْ عَن مَّن تَوَلَّىٰ عَن ذِكْرِنَا وَلَمْ يُرِدْ إِلَّا الْحَيَاةَ الدُّنْيَا ﴿٢٩﴾ ﴾النجم، پشت هەڵبکە لەو کەسەی، پشتی لە بەرنامەو یادی ئێمە کردوەو، تەنیا ژیانی دنیای دەوێ، واتە: تۆ پەیامی خوات گەیاندوەو بەرپرسیار نی کە ئەوان وەڵام نادەنەوە.

٢)- ﴿ يَوْمَ يَدْعُ الدَّاعِ إِلَىٰ شَيْءٍ نُّكُرٍ ﴾، ئەو ڕۆژە بانگکەر بانگ دەکات بۆ شتێکی نەناسراو، بۆ شتێکی نامۆ، دەڵێ: (**نُكُرٍ: مُنْكَر فَظِيْع تُنْكِرُهُ النُّفُوسُ وتَكْرَهُهُ، والنُّكُرُ صِفَةٌ مثلُ: رَوْضَة أنفٌ، أيْ جَدِيدَةٌ**)، واتە: تۆ پشتیان تێبکەو لێیانگەڕێ بۆ ڕۆژێک

www.alibapir.com



کە بانگکەر بانگ دەکات، بۆ شتێکی نەناسراو کە نەفسەکان حەزی پێ ناکەن و، بۆ شتێکی ترسناک و بێزەزا، وشەی (**نُكر**)یش سیفەتە، وەك (**رَوْضة أُنُف أي: جَدِيْدَة**)، واتە: باغێکی تازە، ﴿شَىۡءٍ نُّكُرٍ﴾، (**شَيْءٍ**)، شتێک (**نكُر**)، سیفەتەکەیەتی: شتێکی نامۆو نەناسراو و سامڵێکراو.

ئایا مەبەست لە (**الدَّاعِ**)، کێیە؟ ﴿يَوۡمَ يَدۡعُ ٱلدَّاعِ﴾ خوای کاربەجێ باسی نەکردوە، بەڵام وا پێدەچێ مەبەست پێی ئیسڕافیل بێ، کە بۆ جاری دووەم فوو بەکەڕەنادا دەکات لە ڕۆژی دواییداو، دەبێتە هۆی زیندوو کرانەوەی مرۆڤەکان، چونکە دوایی باسی هاتنەدەریان لە گۆڕەکان دەکات، کەواتە: ئەوە فووی دووەمە، کە لە فەرمایشتی پێغەمبەردا هاتوە: ئیسڕافیل کە فوو بە کەڕەنادا دەکات، جاری یەکەم دەبێتە هۆی نەمان و تێکچوونی ژیانی دنیاو، هەڵوەشانەوەی گەردوون بەو سیستەمەی ئێستا هەیەو، جاری دووەم دەبێتە هۆی ئەوەی مرۆڤەکان زیندوو ببنەوەو عالەمێکی دیکە بێتە ئاراوە، وەک لە سوورەتی (**إبراهيم**)دا، دەفەرمویٚ: ﴿يَوۡمَ تُبَدَّلُ ٱلۡأَرۡضُ غَيۡرَ ٱلۡأَرۡضِ وَٱلسَّمَٰوَٰتُۖ وَبَرَزُواْ لِلَّهِ ٱلۡوَٰحِدِ ٱلۡقَهَّارِ ﴿٤٨﴾﴾، ئەو ڕۆژە کە نە زەوی وەک ئێستا دەمێنێ و، نە ئاسمانەکانیش و بۆ خوای تاکی ملکەچکەر دێنە گۆڕێ، وەک لە تەفسیری سوورەتی (**إبراهيم**)دا، باسمانکردوە.

٣)- ﴿خُشَّعًا أَبۡصَٰرُهُمۡ﴾، چاوەکانیان زەبوون و پڕ ترس و لەرزن. (**خُشَّع**)، خوێنراویشەتەوە: (**خَاشِعَاً أَبْصَارُهُم**)، (**خُشَّع**)، کۆی (**خَاشِع**)ە، (**خَشَعَ أي: ذَلَّ وَضَرَع**)، زەبوون و ملکەچ بوو، ترس و بیمی ڕێنیشت، کەواتە: (**خَاشِعَاً أَبْصَارُهُم**)، و ﴿خُشَّعًا أَبۡصَٰرُهُمۡ﴾، ئەگەر (**خَاشِع**) بێ، واتە: هەموویان چاویان پڕ ترس و لەرزە، وەک یەک چاو، بەڵام ئەگەر (**خُشَّعًا**) بێ، یانی: چاوی هەرکامێکیان پڕ ترس و لەرزە.

٤)- ﴿يَخۡرُجُونَ مِنَ ٱلۡأَجۡدَاثِ كَأَنَّهُمۡ جَرَادٞ مُّنتَشِرٞ﴾، لە گۆڕەکان دێنە دەرێ، وەک کوللەی پرژو بڵاون، (**جَرَاد**)یش، کۆی (**جَرَادَة**)یە، یانی: یەک کوللە بۆ نێرو بۆ مێ بەکاردێ.

www.alibapir.com



٥)- ﴿مُّهۡطِعِينَ إِلَى ٱلدَّاعِ﴾، ملیان ڕاکێشاوە بە خێرایی بەرەو بانگکەر دەچن. (**مُهْطِعِينَ: جَمْعُ المُهْطِعِ: المَاشِي سَرِيعًا مادًّا عُنُقَهُ**)، (**مُّهْطِعِينَ**)، کۆی (**مُهْطِعُ**)ە، ئەویش بە کەسێک دەڵێن بە خێرایی بڕواو ملی ڕاکێشا بێ (**وَهِيَ مِشْيَةُ مُذْعُورٍ غَيْرِ مُلْتَفِتٍ إلى الشَّيْءِ**)، ئەویش بریتیە لە ڕۆیشتنی بابایەک کە زۆر سامی ڕێنیشتبێ و، زۆر ترسا بێ و ئاوڕ لە هیچ شتێک نەداتەوە، ڕێک بەرەو ئەو شوێنە بڕوا کە بۆی بانگ دەکرێ، ﴿مُّهۡطِعِينَ إِلَى ٱلدَّاعِ﴾، واتە: بەرەو بانگکەرەکە دەڕۆن، ملیان ناوە زۆر بە خێرایی.

٦)- ﴿يَقُولُ ٱلۡكَٰفِرُونَ هَٰذَا يَوۡمٌ عَسِرٞ﴾، بێبڕوایەکان دەڵێن: ئەمڕۆ ڕۆژێکی سەخت و زەحمەتە، (**عَسِرٌ: صِفَةٌ مُشَبَّهَةٌ مِنَ العُسْرِ وهو الشِّدَّةُ والصُّعُوبَةُ أي: زَمان لِأُمُورٍ عَسِرَةٍ شَدِيدَةِ العُسْرِ**)، وشەی (**عَسِرٌ**)، صیفەتی چوێندراوە بە کردارەوە (**صِفَةٌ مُشَبَّهَةٌ بِالفِعْل**)، لە (**عُسْر**)ەوە، هاتوە ئەویش بریتیە لە سەختیی و ناڕەحەتیی، واتە: ئەمڕۆ ڕۆژی کارە ناڕەحەت و دژوارەکانە.

کە سەرنجی ئەم ئایەتە موبارەکانە دەدەین، دەبینین خوا ﷻ حەوت شتی ترسناکی باسکردوون، وەک (إبن عاشور) هێناونی، لە بارەی ئەو ڕۆژە سەختەوە کە ڕۆژی زیندوو کرانەوەو سزاو پاداشتە:

**یەکەم:** (**يدعُ الداع**) بانگکردنی بانگکەر، ئەمەش ئاماژەیە بەوە کە بانگ دەکرێن و ڕەپێچەک دەدرێن و ئامادە دەکرێن، بۆ سزادران.

**دووەم:** ﴿إِلَىٰ شَيۡءٖ نُّكُرٍ﴾، کە وشەی (**شَيْءٍ**)، یانی: شتێک، بانگ دەکرێن بۆ شتێک، ئەمەش ئەوە دەگەیەنێ کە شتێکی زۆر ترسناکە، بۆیە هەر بە وشەی (**شَيْءٍ**)، هێناویەتی و بە نەزانراو (**نکرة**)ش واتە: شتێکە زانیاریی دەوری نادات، هێندە گەورەو گرنگ و ترسناکە.

**سێیەم:** کە دەفەرموێ: ﴿شَيۡءٖ نُّكُرٍ﴾، (**شَيْءٍ**)، بە (**نُكُر**)، وەصفکراوە، (**نُكُر**)یش، واتە: نەناسراوو نامۆو ساملێکراوو بیملێکراو.

www.alibapir.com



**چوارەم:** کە دەفەرمویّ: ﴿خُشَّعًا أَبْصَـٰرُهُمْ﴾، (أي ذَلِيْلَةٌ خَائِفَةٌ)، واتە: چاویان زەبوونە پڕ ترس و لەرزە، وەک لە سووڕەتی (المعارج)دا، دەفەرمویّ: ﴿خَٰشِعَةً أَبْصَٰرُهُمْ تَرْهَقُهُمْ ذِلَّةٌ ﴿٤٤﴾﴾، چاوەکانیان پڕ ترس و لەرزن، ملکەچیی و زەبوونیی دێتە سەریان.

هەروەها لە سووڕەتی (الشورى)دا، دەفەرمویّ: ﴿وَتَرَىٰهُمْ يُعْرَضُونَ عَلَيْهَا خَٰشِعِينَ مِنَ ٱلذُّلِّ يَنظُرُونَ مِن طَرْفٍ خَفِيٍّ ﴿٤٥﴾﴾، دەیانبینی ڕادەنوێنرێن لەسەر ئاگری دۆزەخ، ملکەچن بەهۆی زەبوونییەوەو بە سیلە چاوێک (یاخود: بە چاوێکی مەیلەو نووقاو) تەماشا دەکەن لە ترسان، مرۆڤ ئەگەر لە شتێک زۆر بترسیّ، چاوی تێنابڕیّ و بەسیلەی چاو تەماشای دەکات.

**پێنج:** کە فەرموویەتی: ﴿كَأَنَّهُمْ جَرَادٌ مُّنتَشِرٌ﴾، چوێندراون بە کوللەی پرژو بڵاوەوە، ئەمەش هەم زۆرییەکەیان دەگەیەنیّ، هەم تێکەڵ پێکەڵییەکەیان دەگەیەنیّ، کوللە ئەگەر زۆربن، تێکەوە داوێن[1] و تێکەڵ و پێکەڵ دەبن.

**شەشەم:** کە دەفەرمویّ: (مُهْطِعِينَ)، (مُهْطِع)یش، کەسێکە بە خێرایی بڕواو، ملی بەرز کردبێتەوەو ڕاکێشا بیّ و، ئاوڕ لە هیچ شتێک نەداتەوە، ئەوەش کاتیّ دەبیّ ئەو کەسە زۆر داچڵەکیبیّ و ترسا بیّ و، سامی ڕێنیشتبیّ.

**حەوتەم:** کە بێبڕوایەکان دەڵێن: ﴿هَـٰذَا يَوْمٌ عَسِرٌ﴾ ئەمڕۆ ڕۆژێکی زۆر سەخت و دژوارە، وشەی (عَسِرٌ)یش (صِفَةٌ مُشَبَّهَةٌ بِالفِعْل)، سیفەتێکە شوبهێنراوە بە کردارەوەو لە (عُسر)ەوە هاتوە، (عُسر)، واتە: دژواریی و زەحمەتیی و ناڕەحەتیی.

---

(١) تێکەوە داوێن: بەیەکدا دێن و دەچن.

www.alibapir.com


## کورتە باسێک لە بارەی دژواریی ڕۆژی دواییەوە

بەڕێـــــزان!

لـە چەنـد ڕووێکـەوە، بـاسی دژواریـی و سـەختیی ئـەو ڕۆژە دەکەیـن، چونکـە ڕۆژی دوایـی دەگونجـێ لـە زۆر ڕووەوە، باسـی قورسـیی و دژواریـی و زەحمەتییەکەی بکەیـن، بـەڵام ئێمـە پێنـج بوارمـان لـە بـوارەکانی قورسـیی و دژواریـی و زەحمەتیـی ڕۆژی دوایـی، قۆناغـی دووەمـی ڕۆژی دوایـی، کـە بریتیـە لـە قۆناغـی هەڵسـانەوەو، زیندووکرانـەوەو، سـزاو پاداشـتدرانەوە، هێنـاون:

### ١- لەو ڕۆژەدا لیستی کردەوان دابەش دەکرێن و نهێنییەکان ئاشکرا دەکرێن:

وەک خوا ﷻ لە سوورەتی (**التكوير**)دا، دەفەرموێ: ﴿وَإِذَا ٱلصُّحُفُ نُشِرَتۡ ۝١٠﴾، ئـەو ڕۆژە کـە لاپـەڕەکان بڵاو دەکرێنـەوە، واتـە: لیسـتی کـردەوەکان بـڵاو دەکرێنەوە.

هەروەهـا لـە سـوورەتی (**الطـارق**)دا، دەفەرمـوێ: ﴿يَوۡمَ تُبۡلَى ٱلسَّرَآئِرُ ۝٩﴾، ئـەو ڕۆژەی نهێنییـەکان ئاشـکرا دەکرێـن و دەخرێنـە گـۆڕێ، ﴿فَمَا لَهُۥ مِن قُوَّةٖ وَلَا نَاصِرٖ ۝١٠﴾، مـرۆڤ نـە خـۆی توانـای هەیـە، لـەو ڕۆژە خـۆی ڕزگار بـکات، نـە هیـچ پشـتیوان و هـاوکارو یارمەتییدەرێکیشـی هەیـە.

کەواتـە: ئـەو ڕۆژەی لیسـتی کـردەوەکانی تێـدا بڵاودەکرێنـەوەو، هـەر کەسـە نامـەی کـردەوەی خـۆی دەدرێتـەوەو، ئـەو ڕۆژەی نهێنییەکانـی تێدا ئاشـکرا دەکرێن، بەدڵنیایـی ڕۆژێکـی سـەخت و دژوارە.

www.alibapir.com


**٢- هیچ گەورەو گچکەیەک نیە، کە تۆمار نەکرابێ، تەنانەت بە ئەندازەی گەردێکیش، یان گەردیلەیەکیش:**

وەک خوا بسم الله الرحمن الرحیم لە سووڕەتی (**الزلزلة**)دا، دەفەرموێ: ﴿فَمَن يَعْمَلْ مِثْقَالَ ذَرَّةٍ خَيْرًا يَرَهُ ﴿٧﴾ وَمَن يَعْمَلْ مِثْقَالَ ذَرَّةٍ شَرًّا يَرَهُ ﴿٨﴾﴾، واتە: هەر کەسە بە قەدەر گرانایی گەردیلەیەک، چاکەی کرد بێ دەیبینێتەوەو، هەر کەسێ بە قەدەر گرانایی گەردیلەیەک خراپەی کردبێ دەیبینێتەوە.

هەروەها لە سووڕەتی (**الكهف**)دا، خوا دەفەرموێ: ﴿يَٰوَيْلَتَنَا مَالِ هَٰذَا ٱلْكِتَٰبِ لَا يُغَادِرُ صَغِيرَةً وَلَا كَبِيرَةً إِلَّآ أَحْصَىٰهَا ﴿٤٩﴾﴾، بێبڕوایەکان گوتیان: هەی هاوار بۆ ئێمە، هەی سزای سەخت بۆ ئێمە! ئەم نووسراوە چییە؟ هیچ گچکەیەک و گەورەیەکی نەبواردوە، مەگەر سەرژمێری کردوە، واتە: وردو درشتی سەرژمێر کردوەو، تێیدا تۆمار کراوە لەو نووسراوەدا، نووسراوی هەرکامێکیان.

**٣- دژوارییەکی دیکەی ڕۆژی دوایی و ڕۆژی قیامەت، ئەوەیە هەر کەسە چی کردوە، دەیبینێتەوە، بە ئامادەکراویی، وێڕای نووسراویی:**

خوا بسم الله الرحمن الرحیم هەم باسی نووسینی کردوە، وەک دەفەرموێ: ﴿وَإِنَّ عَلَيْكُمْ لَحَٰفِظِينَ ﴿١٠﴾ كِرَامًا كَٰتِبِينَ ﴿١١﴾ يَعْلَمُونَ مَا تَفْعَلُونَ ﴿١٢﴾﴾ **الإنفطار**، واتە: بە دڵنیایی ئێوە چەند پارێزەرێکتان بەسەرەوەن، زۆر بەڕێزن و نووسەرن و، هەرچی ئێوە دەیکەن، دەیزانن، هەرچی ئێوە دەیکەن: لە نیەتی دڵ و خولیای مێشک و، دەربڕینی زمان و، کردەوەی ئەندامەکان، هەمووی دەزانن و هەمووشی تۆمار دەکەن.

ئنجا وێڕای نووسین، کردەوەکان بە ئامادەکراوییش دەبینرێنەوە، واتە: بە بەرجەستە کراویی، لە زۆر شوێنی قورئاندا، ئەو ڕاستییە خراوەتە ڕوو، کە ئێمە هەم لە تەفسیری سووڕەتی (**الكهف**)دا، لەو بارەوە، لە کاتی تەفسیرکردنی ئەو ئایەتە موبارەکەدا: ﴿وَوَجَدُوا۟ مَا عَمِلُوا۟ حَاضِرًا ﴿٤٩﴾﴾، ئەوەی کردبوویان بە ئامادەکراویی بینیانەوە، هەروەها لەکاتی تەفسیرکردنی ئەو ئایەتەی سووڕەتی

www.alibapir.com


(الجاثيـة)دا: ﴿إِنَّا كُنَّا نَسْتَنسِخُ مَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ ﴿٢٩﴾﴾، ئێمـە ئـەوەی ئێـوە دەتانکـرد، نوسـخەمان لەبـەر دەگرتـەوەو کۆپییـمان لـێ دەکـرد، لەوێشـدا کورتـە باسـێکمان کـردوە، لـە بـارەی بەرجەسـتەبوونی کردەوانـەوە، کـە هـەم ئـەو دوو ئایەتـە موبارەکـە تەعبیـری لـێ دەکـەن، هـەم ئـەو ئایەتـە موبارەکـەی دەفەرمـوێ: ﴿وَأَنَّ سَعْيَهُۥ سَوْفَ يُرَىٰ ﴿٤٠﴾﴾النجـم، هـەوڵ و کۆششـەکەی لەمـەودوا دەبینـرێ، واتـە: بەرهەمـی هـەوڵ و کۆششـەکەی بـە بەرجەسـتە کراویـی دەبیـنرێ، هەروەهـا ئـەوەی ئایەتەکـەی سـوورەتی (الزلزلـة)ش، کـە دەفەرمـوێ: ﴿فَمَن يَعْمَلْ مِثْقَالَ ذَرَّةٍ خَيْرًا يَرَهُۥ ﴿٧﴾ وَمَن يَعْمَلْ مِثْقَالَ ذَرَّةٍ شَرًّا يَرَهُۥ ﴿٨﴾﴾، هـەر کەسـێک گرانایی گەردێـک چاکـە بـکات، دەیبینێتـەوە، {واتـە: خـودی چاکەکـەی دەبینێتـەوە}و، هـەر کەسـێ گرانایـی گەردیلەیـەک خراپـە بـکات، دەیبینێتـەوە، واتـە: خـودی خراپەکـەی دەبینێتـەوە.

ئنجـا ئەگـەر ئێسـتا مـرۆڤ بتوانـێ کامیـرای شـێردراوە دابنـێ و، نهێنییـەکان بەهـۆی ئـەو کامیـرای شـێردراوەوە کەشـف بـن، وەک زۆرجـار کـە دزیـی دەکـرێ و کەتـن و خراپـە دەکـرێ، دوایـی بەهـۆی کامیـرای شـێردراوەوە، کـە دانـدراون: بکەرانی ئـەو دزییـە، یـان ئـەو کەتنـە، یـان ئـەو قەتڵـە، یـان ئـەو خراپەیـە، لەبـەر ئـەوەی وێنەیـان گیـراوە، کەشـف دەبـن، ئنجـا ئەگـەر مـرۆڤ بتوانـێ شـتی ئـاوا دروسـت بکات، دەبێ خوا ﷻ ئەو فریشتانەی تەرخانی کردوون بۆ پاراستنی کردەوەکانی مرۆڤـەکان، چ ئامێرێکـی وای دابنـێ کـە هەمـوو شـتەکانی مـرۆڤ، تۆمـار بـکات! چونکـە مـرۆڤ ئێسـتا بـەس دەتوانـێ قسـەکان تۆمـار بـکات و وێنـەکان بگـرێ، بـەڵام فریشـتەکان ئـەوەی نێـو دڵیـش تۆمـار دەکـەن وەک لـە فەرمایشـتی پێغەمبـەردا ﷺ هاتـوە: {وَإِذَا هَـمَّ بِسَيِّئَةٍ}[1] ئەگـەر بـە دڵیشـی دابـێ خراپـە بـکات، یـان بـە دڵیشـی

---

(١) {عَـنْ أَبِي هُرَيْـرَةَ رضي اللـه عنـه، قَـالَ: قَـالَ رَسُـولُ اللَّـهِ -صلى اللـه عليـه وسلم-: «قَـالَ اللَّـهُ عَـزَّ وَجَـلَّ إِذَا هَـمَّ عَبْـدِي بِسَـيِّئَةٍ فَلاَ تَكْتُبُوهَـا عَلَيْـهِ، فَـإِنْ عَمِلَهَـا فَاكْتُبُوهَـا سَـيِّئَةً، وَإِذَا هَـمَّ بِحَسَـنَةٍ فَلَـمْ يَعْمَلْهَـا فَاكْتُبُوهَـا حَسَـنَةً، فَـإِنْ عَمِلَهَـا فَاكْتُبُوهَـا عَـشْرًا»} أخرجـه البخـاري: ٧٠٦٢، ومسـلم: ١٢٨، والترمـذي: ٣٠٧٣، وابـن حبـان: ٣٨٠.

www.alibapir.com



دابێ چاكە بكات، فریشتەكان بەهۆی ئەو ئامێرەوە كە پێیانە، نێو دڵی مرۆڤیش دەخوێننەوەو تۆماری دەكەن، ئنجا بێگومان وەختێك مرۆڤ كردەوەكانی خۆی بە بەرجەستە كراویی بێنەوە بەرچاوی و بڵێن: ئەوە تۆی و دیاری و ناتوانی نكووڵیی بكەی! بە ڕاستیی مانای وایە ئەو ڕۆژە، ڕۆژێكی قورس و زەحمەت و دژوارە، بە تایبەتی بۆ ئەوانەی بە خراپەو ناڕەوا دەستیان دەچێتە: خوێن و نەفس و نامووس و ماڵ و سامان و هێمنیی و ئاساییشی خەڵكەوە.

**٤- ڕووی چوارەمی قورسیی و زەحمەتیی ڕۆژی دوایی و سزاو پاداشت، ئەوەیە كە هیچ قەرەبوو كردنەوەو چارەسەرێك نیە:**

با تەماشای ئەم ئایەتە موبارەكە بكەین كە دەفەرموێ: ﴿ وَٱتَّقُواْ يَوۡمٗا لَّا تَجۡزِي نَفۡسٌ عَن نَّفۡسٖ شَيۡـٔٗا وَلَا يُقۡبَلُ مِنۡهَا شَفَٰعَةٞ وَلَا يُؤۡخَذُ مِنۡهَا عَدۡلٞ وَلَا هُمۡ يُنصَرُونَ ﴿٤٨﴾ ﴾البقرة، خۆتان لە ڕۆژێك بپارێزن، هیچكەس بۆ هیچكەس هیچی پێ ناكرێ، هیچ شتێكی پێ ناكرێ {هیچكەس ناتوانێ هیچ شتێك لە هیچكەس دوور بخاتەوە} تكاكردنیشی لێ وەرناگیرێ و قەرەبوو و بەڵا گێڕەوەشی لێ وەرناگیرێ و ئەوان پشتیوانییش ناكرێن، واتە: هەموو ئەگەرەكانی كە مرۆڤ دەربازی ببێ، هەموویان لابراون، نە كەس هیچی بۆ كەس پێ دەكرێ، نە هیچكەس تكای بۆ دەكرێ، بەبێ مۆڵەتی خوا، نە هیچكەس هیچ قەرەبووی لێ وەردەگیرێ و، نە هیچكەسیش هیچ جۆرە پشتیوانییەكی لێ دەكرێ.

**٥- سەختیی و دژوارییەكی دیكەی ئەو ڕۆژە: ڕۆژی هەڵسانەوەو زیندووكرانەوە، ئەوەیە سزای خوا ﷻ هێندە سەختە، بابای تاوانبار خۆزگە دەخوازێ نیزیكانی خۆی بكاتە بەلاگێڕو قەرەبووی خۆی:**

وەك لە سووڕەتی (المعارج)دا، خوا ﷻ، جوان بۆمان وێنا دەكات دەفەرموێ: ﴿ يَوَدُّ ٱلۡمُجۡرِمُ لَوۡ يَفۡتَدِي مِنۡ عَذَابِ يَوۡمِئِذِۭ بِبَنِيهِ ﴿١١﴾ وَصَٰحِبَتِهِۦ وَأَخِيهِ ﴿١٢﴾ وَفَصِيلَتِهِ ٱلَّتِي تُـٔۡوِيهِ

www.alibapir.com


﴿وَمَن فِي الْأَرْضِ جَمِيعًا ثُمَّ يُنجِيهِ ﴿١٤﴾ كَلَّا إِنَّهَا لَظَىٰ ﴿١٥﴾ نَزَّاعَةً لِّلشَّوَىٰ ﴿١٦﴾ تَدْعُو مَنْ أَدْبَرَ وَتَوَلَّىٰ ﴿١٧﴾ وَجَمَعَ فَأَوْعَىٰ ﴿١٨﴾﴾،

﴿يَوَدُّ الْمُجْرِمُ لَوْ يَفْتَدِي مِنْ عَذَابِ يَوْمِئِذٍ﴾، واتە: لەو ڕۆژەدا بابای تاوانبار خۆزگە دەخوازێ لە سزاو ئازاری ئەو ڕۆژە ڕۆڵەکانی و هاوسەری و برای و ئەو کۆمەڵەی دەیگرنە خۆیان و تێکڕای ئەوانەی لە سەر زەوین، بیانکاتە بەلاگێڕەوەی خۆی دوایی ئەوە دەربازی بکات. کەواتە: ئەوانەی بابای تاوانبار حەز دەکات بیانکاتە بەلاگێڕی خۆی پێنج جۆرە کەسن:

١- ﴿بِبَنِيهِ﴾ ڕۆڵەکانی و جگەر گۆشەکانی، ڕۆڵەو جگەر گۆشە لە لای مرۆڤ، لە هەموو کەس خۆشەویستترن، کەچی ئەو تاوانبارە، بەر لە هەر کەس ئامادەیە جگەر گۆشەکانی خۆی بکاتە بەلاگێڕەوەو قەرەبووی خۆی، کە لە جیاتی وی سزا بدرێن.

٢- ﴿وَصَاحِبَتِهِ﴾، ژنەکەی، ئامادەیە هاوسەرەکەی خۆشی بکاتە بەلاگێڕەوە.

٣- ﴿وَأَخِيهِ﴾، برایەکەی، ئامادەیە برایەکەی خۆشی بکاتە بەلاگێڕەوەی خۆی.

٤- ﴿وَفَصِيلَتِهِ الَّتِي تُؤْوِيهِ﴾، ئەو کۆمەڵەی کە ئەو دەگرنە خۆیان، ئنجا ئەگەر عەشیرەتە، ئەگەر حیزبە، ئەگەر نەتەوەیە، ئەگەر هەر کۆمەڵێکە، کە ئەو سەر بەوانە سەر بەوە، ئامادەیە تێکرای کۆمەڵەکەی، سەرجەم خزم و عەشیرەتەکەی بکاتە بەلاگێڕەوەی خۆی.

٥- ﴿وَمَن فِي الْأَرْضِ جَمِيعًا ثُمَّ يُنجِيهِ﴾، بەڵکو ئامادەیە هەرچی کەسێک لەسەر زەوی هەیە، هەمووی بکاتە بەلاگێڕەوەو قەرەبووی خۆی، بەڵام دەربازی بێ، ئنجا لێرەدا لەبەر ئەوەی خوا بسم الله الرحمن الرحيم باسی بابای تاوانبار دەکات، لە کوێوە پێدا هاتووە؟ لەو کەسەوەی لێی نیزیکترە، جگەرگۆشە لە هەموو کەس لە مرۆڤ نزیکترەو، لە دوای ئەو ژن و هاوسەر، ئنجا برا، ئنجا خزم و قەوم، ئنجا دوایی هەموو خەڵکی سەرزەوی! بەڵام خوا دەفەرموێ: (كَلَّا)، نەخێر، ﴿إِنَّهَا لَظَىٰ﴾، ئەو ئاگری دۆزەخە بڵێسەدارە، ﴿تَدْعُو مَنْ

﴿أَدْبَرَ وَتَوَلَّىٰ ﴿١٧﴾ وَجَمَعَ فَأَوْعَىٰ ﴿١٨﴾﴾، ئەوکەسە بانگ دەکات کە پشتی هەڵکردووەو وازی هێناوەو ڕووی وەرچەرخاندوە، بەس خەریکی کۆکردنەوەی سەروەت و سامان و ژماردنی و پەزمەندە کردنی بووە، لەسەر حیسابی خوا لە خۆ ڕازییکردن، بۆیە لەو ڕۆژەدا هیچ شتێک دادی نادات.

خوا لە سەختیی و دژوارییەکانی ئەو ڕۆژە، بە میهرەبانیی کەرەمی خۆی بمانپارێزێ و، بمانخاتە نێو هێمنیی و ئاسایش و ئۆقرەییەوە.

لە تۆڕە کۆمەڵایەتییەکان لەگەڵتانین
Stay in touch on social media
نحن معكم عبر مواقع التواصل الاجتماعي
ڕاگەیاندنی مەکتەبی مامۆستا عەلی باپیر
AliBapir/عەلی باپیر
archive.org/details/@alibapir
AliBapir/عەلی باپیر
AliBapir
www.alibapir.net
کوردی - عربي - English
کەناڵی ڕاگەیاندنی مەکتەبی مامۆستا عەلی باپیر

www.alibapir.com



## كورتە باسێک لە بارەی لەتبوونی مانگەوە

بەڕێـــزان!

خوا ﷽ ئەم سوورەتە موبارەکەی بە باسکردنی دوو ڕووداوان دەست پێکردوە: ﴿ٱقۡتَرَبَتِ ٱلسَّاعَةُ وَٱنشَقَّ ٱلۡقَمَرُ﴾، کاتەکـە (السـاعَة)، زۆر نیزیـک کەوتـوەو، مانـگ لەتبوو، لـە بـارەی لەتبـوونی مانگـەوەش، ئێمـە ئـەم کورتـە باسـە لـە حـەوت بڕگـەدا دەخەینـەڕوو:

**بڕگەی یەکەم: لە بارەی موعجیزەکانـی پێغەمبەرەوە ﷺ زێدەڕۆیی و کەمتەرخـەمیی هەیە:**

أ- زێدەڕۆییەکە ئەوەیە کە سەرجەم موعجیزەکانی پێغەمبەری خوا ﷺ کە لە ژێر ناوونیشانی: (خَوَارِق العَادَة)، {یاسا دڕەکان} دان، هەموویان بە بەڵگەو موعجیزەی سەلمێنەری پێغەمبەرایەتیی موحەممەد ﷺ دابنرێن، ئەمە تێپەڕاندن و زێدەڕۆییە، بەڵێ پێغەمبەری خوا ﷺ شتی یاسا دڕ (خَارِق العَادَة)ی زۆر بووە، گومانی تێدانیە، لە کتێبەکانی سوننەت و سیرەتدا زۆرن، بەڵام ئایا ئەو یاسا دڕانەی پێغەمبەری خوا، مەبەستی پێ ئەوە بووە، ئیسپاتی پێغەمبەرایەتیی خۆییان پێ بکات؟ بێگومان نەخێر، چونکە یاسا دڕەکان لە نێو هاوەڵاندا خوا لێیان ڕازی بێ، بوون، کەواتە: بۆ زیاتر چەسپاندنی ئیمان، یان بۆ دەربازکردنیان لە تەنگانەیەک، وەک برسیەتیی و بێ ئاویی و، چارەسەرێک لە نەخۆشیی، زیاتر بۆ ئەوانە بووە، نەک بۆ ئەوەی وەک بەڵگە هێنانەوە لەسەر سەلماندنی ڕاستێتیی لە پێغەمبەرایەتییدا.

ب- کەمتەرخەمییەکەش بریتیە لە نکوڵییکردن لەوە کە پێغەمبەری خوا موحەممەد ﷺ بێجگە لە قورئان موعجیزەی دیکەی بووبن، بێگومان ئەوەش کەمتەرخەمیی و کورتهێنانە، چونکە پێغەمبەری خوا موحەممەد ﷺ وەک گوتمان: یاسا دڕی دیکەی - ئەگەر بە موعجیزەو دەستەوسانکەر دانەنرێن - زۆر بوون، بۆ وێنە:

www.alibapir.com



١- پێغەمبەری خوا ﷺ نەک جارێک، چەند جارێک خواردنێکی کەم لە بەردەم دا بووە، دوعای کردوەو خوا بەرەکەتی خستۆتێ، کە بەشی سێ چوار کەسان بووە، بەشی (٥٠٠ - ٦٠٠)، کەس زیاتریشی کردوە[١].

٢- هەروەها پێغەمبەری خوا ﷺ چەند جارێک ئاوێکی کەم، یان شوێنێک ئاوی تێدا نەبووە، تۆزێک ئاویان تێکردوە، ئاوەکەی زۆربووە، وەک لە صوڵحی حودەیبییەدا بیرێک ئاوی تێدا نەبووە، تۆزێ ئاویان تێکردوە، پێغەمبەریش ﷺ دوعای خوێندوەو، ئاو دەرقوڵیوەو هەرچی مەشکەو کوندەو دەفر بووە، پڕیان کردوە لە ئاو![٢]

٣- هەروەها لە جەنگی تەبووک دا پێغەمبەری خوا ﷺ دوعای کردوە، کاتێک هاوین بووە، هیچ هەورێک بە ئاسمانەوە نەبووە، پەڵە هەورێک هاتۆتە ئاسمان و بارانێکی زۆر بەخورزەم داباریوە، ئیدی هەموو شتیان پڕ کردوە لە ئاو و پێداویستیی خۆیان پێ جێبەجێ کردوە.[٣]

٤- هەروەها لە نێوان پەنجەکانی دا ئاو هەڵقوڵیوە.[٤]

٥- هەروەها کەسێک کە چاوی کوێر بووە لە جەنگدا، چاوەکەی لەسەر دەستی بووە پێغەمبەر ﷺ دوعای بۆ کردوە.[٥]

٦- هەروەها بنکە دار خورمایەک، کۆتەرەدار خورمایەک کە وتاری لە سەر دەدا، دوای ئەوەی مینبەرێکیان بۆ دروستکردو چووە سەر مینبەرەکە، هاوەڵان گوێیان لە دەنگی

---

(١) رواه البخاري: ١٠١٣،٣٥٧٨، ومسلم: ٨٩٧،٢٠٤٠.

(٢) السيرة النبوية لابن هشام ، ج٣ ص١٦٣،١٦٤.

(٣) هەمان سەرچاوە، ج٣ ص٢٩٧.

(٤) رواه البخاري: ٣٥٧٢ الى ٣٥٧٩، ومسلم: ٢٢٧٩،٣٠١٣،١٨٥٦.

(٥) المستدرك، والإصابة، أسد الغابة، ترجمة: قتادة بن النعمان رضي الله عنه.

ئەو کۆتەرە دارخورمایە بوو، وەک بە چکە حوشتر ناڵاندی و گریا، پێغەمبەریش ﷺ لەسەر مینبەرەکەی دابەزی و دەستی پێداهێنا، تاکو بێدەنگی کرد[١].

**٧-** چاکبوونەوەی لاقی (عبدالله بن عتيك) کە شکاوە، دوای دەست پێداهێنانی[٢]، کە من لە کتێبی حەوتەمی مەوسووعەی: **(الإسلام كما يتجلى في كتاب الله)**، بە ناوونیشانی: **(خاتم النبيين، موجز سيرته و براهين نبوته)**دا، ژمارەیەکی زیاتر لەو موعجیزانەم باس کردوون[٣]، بۆیە ئەوەش کورتهێنانە بگوترێ: پێغەمبەری خوا ﷺ تەنیا قورئانی هەبووە، وەک موعجیزە، نەخێر، غەیری قورئانیشی هەبووە، بۆیە ڕای ڕاست و میانجیی و بەڵگەدار ئەوەیە، کە بگوترێ: پێغەمبەری کۆتایی موحەممەد ﷺ تەنیا قورئانی وەک موعجیزەو بەڵگەی پێغەمبەرایەتیی خۆی بەکارهێناوە، ئەگەرنا یاسادڕی دیکەی زۆر بوون.

ئنجا ئەگەر مەبەست لە وشەی موعجیزە، شتێک بێ کە ئیسپاتی پێغەمبەرایەتیی پێ بکرێ، دەگونجێ بەو زاراوەیە بڵێین: موحەممەد تاکە موعجیزەکەی بریتی بوو لە قورئان، بەڵام ئەگەر مەبەست لە موعجیزە هەر شتێکی یاسادڕ بێ، بەدڵنیایی پێغەمبەری خوا ﷺ یاسادڕی زۆر بوون وەک ئاماژەمان پێدان، بەڵام پێغەمبەری کۆتایی تاکە شتێک کە بەکاری هێناوە، وەک بەڵگە بۆ سەلماندنی ڕاستیی خۆی لە پێغەمبەرایەتییدا، خوا تەنیا قورئانی پێداوە، لەو بارەوە، کە ئەوەش لە زۆر شوێنی قورئاندا، ئەو ڕاستییە دووبارە بۆتەوە، کە بێبڕوایەکان بیانوویان بە پێغەمبەری خاتەم دەگرت و دەیانگوت: بۆچی نیشانەو موعجیزەی وەک هی پێغەمبەرانی پێشووی پێ نەدراون؟ وەک گۆچانەکەی مووسا ﷺ کە دەبوو بە مارێکی گەورەو هەژدیهاو، دەستی کە دەئایسا وەک گڵۆپێکی زۆر بە شۆق، هەروەها عیسا کە مردووی زیندوو کردۆتەوەو، چەندان جۆرە نەخۆشیی چاککردوونەوەو، بە فەرمانی خوا و، لە قوڕ باڵندەی دروستکردووەو،

---

(١) رواه البخاري: ٣٥٨٣،٣٥٨٤،٣٥٨٥.

(٢) رواه البخاري: ٤٠٣٨،٤٠٣٩.

(٣) پازدە دانەم هێناون، بڕوانە: ص ٢٤٠-٢٤٣، ط٢ / ٢٠١٧م.

www.alibapir.com


فووی پێدا کردووەو بۆتە باڵندەو فڕیوە، هەروەها حوشترەکەی صاڵیح، کافرەکان لە زۆر شوێنی قورئاندا هاتووە، کە داوایان لە پێغەمبەری خاتەم کردووە موعجیزەی وەک هی پێغەمبەرانی پێشوویان بۆ بێنێ، بەڵام خوا هەرگیز وەڵامی ئەو داواکارییەی بێبڕوایانی نەداوەتەوە، بۆ وێنە:

أ- لە سوورەتی (**الأنبياء**)دا خوای باڵادەست دەفەرموێ: ﴿ بَلْ قَالُوٓاْ أَضْغَٰثُ أَحْلَٰمٍۭ بَلِ ٱفْتَرَىٰهُ بَلْ هُوَ شَاعِرٌ فَلْيَأْتِنَا بِـَٔايَةٍ كَمَآ أُرْسِلَ ٱلْأَوَّلُونَ ﴿٥﴾ ﴾، واتە: بەڵکو گوتیان: (ئەوە) وڕێنەکانی نێو خەونە، {قسەی تێکەڵ و پێکەڵی خەونە، یاخود: خەونی تێکەڵ و پێکەڵە} بەڵکو هەڵیبەستوە، بەڵکو ئەو شاعیرە، با نیشانەیەکمان بۆ بێنێ وەک چۆن پێشووەکان {پێغەمبەرانی پێشوو} ڕەوانە کراون {بە موعجیزەو بەڵگەوە}.

ب- لە سوورەتی (**الأنعام**)دا، خوا دەفەرموێ: ﴿وَقَالُواْ لَوْلَا نُزِّلَ عَلَيْهِ ءَايَةٌ مِّن رَّبِّهِۦ ۚ قُلْ إِنَّ ٱللَّهَ قَادِرٌ عَلَىٰٓ أَن يُنَزِّلَ ءَايَةً وَلَٰكِنَّ أَكْثَرَهُمْ لَا يَعْلَمُونَ ﴿٣٧﴾ وَمَا مِن دَآبَّةٍ فِى ٱلْأَرْضِ وَلَا طَٰٓئِرٍ يَطِيرُ بِجَنَاحَيْهِ إِلَّآ أُمَمٌ أَمْثَالُكُم ۚ مَّا فَرَّطْنَا فِى ٱلْكِتَٰبِ مِن شَىْءٍ ۚ ثُمَّ إِلَىٰ رَبِّهِمْ يُحْشَرُونَ ﴿٣٨﴾ ﴾، (واتە: بێبڕوایەکان) گوتیان: بۆچی نیشانەیەکی بۆ دانابەزێ لە پەروەردگاریەوە، (دەبوایە نیشانەیەکی بۆ دابەزێ، {وەک هی پێغەمبەرانی پێشوو، موعجیزەیەکی بەرهەست} بڵێ: بێگومان خوا توانایە کە نیشانەیەکی دیکە دابەزێنێ، بەڵام زۆربەیان نازانن.

واتە: زۆربەیان نازانن کە کاتی ئەو جۆرە موعجیزانە بەسەر چووە، ئنجا خوا سەرنجیان ڕادەکێشێ بۆ ئەوە، کە ئەگەر لە بەڵگە بگەڕێن، بەڵگە پڕی ئاسمان و زەوییە، دەفەرموێ: ﴿ وَمَا مِن دَآبَّةٍ فِى ٱلْأَرْضِ وَلَا طَٰٓئِرٍ يَطِيرُ بِجَنَاحَيْهِ إِلَّآ أُمَمٌ أَمْثَالُكُم ﴾، هیچ پێڕۆیەک لەسەر زەوی نیەو، هیچ باڵندەیەک بە دوو باڵەکانی نافڕێ، مەگەر کۆمەڵانی وەک ئێوەن، {کۆمەڵە دروستکراوی خوان} لەم کتێبەدا هیچ شتێکمان زایە نەکردوە، {هیچ شتێکمان نادیدە نەگرتوە، کە پێویست بێ، باس بکرێ، باس نەکرێ، یاخود: لە زانیاریی خوادا هیچ شتێک نیە نەبێ} دواییش هەموو ئەوانە بۆ لای پەروەردگاریان کۆدەکرێنەوە.

www.alibapir.com


واتـە: ئێـوە ئەگـەر لـە بەڵگە دەگەڕێـن، فەرمـوون تەماشـای دروسـتكراوەكانی خوا بكەن، ئەگەر مەبەسـتتان خواناسـییە، ئەگەر مەبەستیشـتان ناسـینی موحەممەدە ﷺ وەک پێغەمبـەری خـوا، تەماشـای قورئـان بكـەن، لـە زۆر جێـی دیكـەی قورئانـدا، خـوا ﷻ ئەو ڕاستییەی دووبارە كردۆتەوەو لە سوورەتی (العنكبوت) ئەو دوو ئایەتە موبارەكـە، بـە نموونـە دێنمـەوە: ﴿وَقَالُوا لَوْلَا أُنزِلَ عَلَيْهِ آيَاتٌ مِّن رَّبِّهِ ۖ قُلْ إِنَّمَا الْآيَاتُ عِندَ اللَّهِ وَإِنَّمَا أَنَا نَذِيرٌ مُّبِينٌ ﴿٥٠﴾ أَوَلَمْ يَكْفِهِمْ أَنَّا أَنزَلْنَا عَلَيْكَ الْكِتَابَ يُتْلَىٰ عَلَيْهِمْ ۚ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَرَحْمَةً وَذِكْرَىٰ لِقَوْمٍ يُؤْمِنُونَ ﴿٥١﴾﴾، واتـە: بێبڕوایـەكان گوتیـان: دەبووایـە نیشـانەكانی لـە پەروەردگاریـەوە دابەزنـە سـەری، {موعجیـزە بـەر هەسـتەكانی وەک هـی پێغەمبـەرانی پێشـوو} بڵـێ: بێگومـان نیشـانەكان تەنیـا لـەلای خـوان و، مـن تەنیـا ترسـێنەرو وشـیاركەرەوەیەكی ڕوون و ئاشـكرام، (یاخـود ڕوونكـەرەوەو ئاشـكراكەرم)، ئایـا بـۆ ئـەوان بـەس نیـە، كـە ئێمـە كتێبێكـمان دابەزاندۆتـە سـەر تـۆ، بەسـەریاندا دەخوێنرێتـەوە، لـەوەدا بەزەیـی و بیرخـەرەوە هەیـە، بـۆ كۆمەڵـێ بـڕوا بێنـن، واتـە: ئەگـەر لـە بـڕوا هێنـان بـن، ئێمـە قورئانمـان وەک موعجیـزە و بەڵگـەی سـەلمێنەری پێغەبەرایەتیـی تـۆ، بـۆ سـەرت دابەزانـدوە[1]

حیكمەتی ئەمەش ئەوەیە كە پێغەمبەرانی پێشوو (عَلَيْهِمُ الصَّلَاةُ وَالسَّلَامُ):

١- بۆ قۆناغەكانی دیكەی ژیانی بەشەر نێردراون، كە لە سەردەمی پێغەمبەری خاتەمدا ﷺ وردە وردە لە ڕووی هۆش و كامڵ بوونەوە بەرەو تێرو تەواویی چووە، ئەو كاتە مرۆڤایەتیی لە قۆناغی ساواییەوە نیزیكتربوو، بەشەر بە هاوكۆیی بەرەو كامڵ بوون تێگەیشتنی زیاتر دەچێ، بۆیە موعجیزەكانی كە بە پێغەمبەرانی (عَلَيْهِمُ الصَّلَاةُ وَالسَّلَامُ) پێش پێغەمبەری كۆتایش دراون، لە قەدەر خەڵكی ئەو ڕۆژگارانە بووە.

٢- هەر كام لەو پێغەمبەرانە بۆ كۆمەڵگایەكی دیارییكراو و بۆ كاتێكی دیارییكراو نێردراون، بۆیە موعجیزە و بەڵگەكەی هەر كام لە پێغەمبەران (عَلَيْهِمُ الصَّلَاةُ وَالسَّلَامُ) تایبەت بووە، بە خۆیەوەو بە قۆناغ و سەردەمی خۆیەوەو، كاتێک كە ئەو پێغەمبەرە

(١) رواه البخاري: ٣٥٧٢ الى ٣٥٧٩، ومسلم: ١٨٥٦،٣٠١٣،٢٢٧٩.

www.alibapir.com


بەڕێزە کۆچی دوایی کردوە، موعجیزەکەشی ڕۆیشتوە، چونکە دوای ئەو پێغەمبەرە، ئنجا خوا پێغەمبەرێکی دیکەی ناردوە، بۆ وێنە: بۆ گەلی عاد خوا هوودی ناردوەو، لە پێش هووددا بۆ گەلی مەدیەن شوعەیبی ناردوە، هەروەها بۆ (**أَصْحَابِ الأَيْكَةِ**)، ئنجا لە دوای گەلی عاد، بۆ گەلی ثەموود صالیحی ناردوە، هەروەها پێغەمبەران دیکە (**عَلَيْهِمُ الصَّلَاةُ وَالسَّلَامُ**)، پەیتا پەیتا هاتوون، هەر پێغەمبەرێکیش ڕۆیشتوە، موعجیزەکەشی لەگەڵ خۆی دا ڕۆیشتوە، بەڵام ئەگەر کەسێک بە دوای هەقدا گەڕابێ، پەکی نەکەوتوەو پێغەمبەرێکی دیکە هاتوەو موعجیزەیەکی دیکەی بۆ هاتوە، گونجاو لەگەڵ خەڵکی ئەو ڕۆژگارەی ئەو کاتەدا، بەڵام پێغەمبەری خاتەم موحەممەد ﷺ لەبەر ئەوەی بۆ تێکڕای بەشەر، بە پانایی زەمین و بە درێژایی زەمان نێردراوە، دەبووایە موعجیزەو بەڵگەکەشی بەردەوام بێ، نەک بە ژیانی خۆی کۆتایی پێ بێ، چونکە پێغەمبەری خاتەم موحەممەد ﷺ تەنیا بۆ گەلەکەی خۆی و، بۆ کۆمەڵگایەکەی خۆی نەنێردراوە، وەک خوا دەفەرموێ: ﴿وَمَآ أَرْسَلْنَٰكَ إِلَّا كَآفَّةً لِّلنَّاسِ بَشِيرًا وَنَذِيرًا ﴿٢٨﴾﴾ سبأ، واتە: ئێمە تۆمان نەناردوە، مەگەر بۆ تێکڕای خەڵکی موژدەدەرو ترسێنەر بی، هەروەها لە سووڕەتی (**الأعراف**)دا، دەفەرموێ: ﴿قُلْ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ إِنِّى رَسُولُ ٱللَّهِ إِلَيْكُمْ جَمِيعًا ﴿١٥٨﴾﴾، واتە: بڵێ ئەی خەڵکینە! من پێغەمبەری خوام وێکڕا و تێکڕا بۆ هەمووتان، بۆیە دەبووایە موعجیزە و بەڵگەکەشی کە سەلمێنەری ڕاستیی موحەممەدە لە بانگەشەی پێغەمبەرایەتییدا، بەردەوام بێ، ئەگەرنا ئەگەر پێغەمبەری خاتەم ﷺ ئەو شتانەی دیکەی کە یاسا دڕ بوون، کردبانی بە بەڵگەی پێغەمبەرایەتیی خۆی، ئێستا ئێمە چیمان کردبایە! بەڵام تاکە شتێک کە کردوویەتی بە بەڵگەی ئیسپاتی پێغەمبەرایەتیی خۆی، ئەم قورئانەیە، قورئانیش ئەوە لەبەر دەستی ئێمەشدا هەیە، بۆی خوا ﷽ دەفەرموێ: ﴿أَوَلَمْ يَكْفِهِمْ أَنَّآ أَنزَلْنَا عَلَيْكَ ٱلْكِتَٰبَ يُتْلَىٰ عَلَيْهِمْ ﴿٥١﴾﴾، ئایا بۆ ئەوان بەس نیە، کە ئێمە کتێبمان دابەزاندۆتە سەرت، بە سەریاندا بخوێنرێتەوە؟ بەس نیە بۆ ئەوان، یانی: بۆ ئیسپاتی پێغەمبەرایەتیی تۆ، کە تەحەددایان بکات: ئەگەر لافی ئەوە لێ دەدەن، موحەممەد ﷺ خۆی قورئانی هەڵبەستەوە، یان بۆ خۆی گوتوویەتی، فەرموون مەیدان مشکان نەیان کێلاوە: ﴿فَلْيَأْتُوا۟ بِحَدِيثٍ مِّثْلِهِۦٓ إِن كَانُوا۟ صَٰدِقِينَ ﴿٣٤﴾﴾ الطور، با قسەیەکی وەک وی بێنن، ئەگەر ڕاست دەکەن! ئنجا نەیانتوانی وەک قورئان بێنن، وەک

www.alibapir.com



ئەوەندە قورئانەی ئەو کاتە دابەزیوە، با وێنەی دە سوورەت بێنن: ﴿ فَأۡتُواْ بِعَشۡرِ سُوَرٖ مِّثۡلِهِۦ مُفۡتَرَيَٰتٖ ﴿١٣﴾ ﴾ هود، ئێوەش دە سوورەتی هەڵبەستراوی وەک بێنن! بەڵام ئەگەر نەیانتوانی: ﴿ قُلۡ فَأۡتُواْ بِسُورَةٖ مِّثۡلِهِۦ ﴿٣٨﴾ ﴾، کە هەم لە سوورەتی (یونس)دا هاتووەو هەم لە سوورەتی (البقرة)ش دا هاتوە، واتە: بڵێ: یەک سوورەتی وەک وی بێنن، بۆیە خوا دەفەرموێ: ﴿ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَرَحۡمَةٗ وَذِكۡرَىٰ لِقَوۡمٖ يُؤۡمِنُونَ ﴿٥١﴾ ﴾ العنکبوت، بە ڕاستیی لەوەدا، {لە دابەزاندنی خوای بەرز بۆ فەرمایشتی بەرزو بێ وێنەی خۆی دا} بەزەیی و، بیرخستنەوە هەیە، بۆ کۆمەڵێک بڕوا بێنن، کۆمەڵێکیش کە بڕوا نەهێنن و لە بڕوانەهێنانێ بن، وەک پێشینان دەڵێن: (ئەگەر دز دز بێ، تاریکە شەو زۆرە)، کەسێک لە بڕوا نەهێنانێ بێ[1]، هەر بڕوا ناهێنێ.

## بڕگەی دووەم: ڕووداوی لەتبوونی مانگ، وێڕای دەلالەتی ڕواڵەتی ئایەتەکە ژمارەیەک فەرموودەشی لەسەرن:

ڕواڵەتی ئایەتەکە ئەگەر باش سەرنج بدرێ، وەک ئێمە ئایەتەکەمان تەفسیر کردو ئایەتەکانی دوای ویش، زۆر ڕوونە کە مەبەست پێی ئەوەیە لەت بوونی مانگ، ڕووداوێکە و تێپەڕیوە، ئایەتەکان بەم شێوەیەن: ﴿ ٱقۡتَرَبَتِ ٱلسَّاعَةُ وَٱنشَقَّ ٱلۡقَمَرُ ﴾، ئاخیر زەمان زۆر نیزیکەوتۆتەوە و مانگیش لەت بوو، ﴿ وَإِن يَرَوۡاْ ءَايَةٗ يُعۡرِضُواْ وَيَقُولُواْ سِحۡرٞ مُّسۡتَمِرّٞ ﴾، ئەگەر نیشانەیەک ببینن (وەک لەت بوونی مانگ) پشت هەڵدەکەن و ڕوو وەردەگێڕن و دەڵێن: ئەوە جادوویەکی بەردەوامە، کەواتە: نیشانەیەکیان بینیوە، کە لەت بوونی مانگە، وێڕای دەلالەتی ڕواڵەت و ڕۆشنی ئایاتەکە، چەند دەقێکی فەرموودەش هەن، لە سوونەتی پێغەمبەردا ﷺ، کە ئێمە چواریانمان تێدا هەڵبژاردوون، ئەگەرنا زیاترن:

**١- {عَنْ أَنَسٍ رضي الله عنه: أَنَّ أَهْلَ مَكَّةَ سَأَلُوا رَسُولَ اللَّهِ ﷺ أَنْ يُرِيَهُمْ آيَةً، فأَرَاهُمُ القَمَرَ شِقَّتَيْنِ، حتَّى رَأَوْا حِرَاء بيْنَهُمَا} (أخرجه البخاري: ٤٨٦٧، ومسلم: ٢٨٠٢، والترمذي ٣٢٨٦، والنسائي**

---

(١) یانی: مەبەستی بێ بڕوا نەهێنێ.

www.alibapir.com


فـي التفسير: ٥٧٤، عن أنس، وأنس لم يدرك ذلك، ولكن سمعه من ابن مسعود، أوغيره ممن أسلم في مكة).

واتـە: ئەنەسـی کوڕی مالیـک ﵁ دەڵێ: خەڵکی مەککە، داوایـان لە پێغەمبەری خوا ﷺ کرد، نیشـانەیەکیان پێشـان بدات، (بەڵگەیەک لەسـەر ڕاسـتیی خۆی)، ئەویش مانگـی پێشـاندان، بـە دوو لەتیـی، {لـە کاتێـک دا مانـگ لـە شـەوی چـواردە دابـووە، داوای بەڵگەیەکیـان لێکـردوە، ئەویـش فەرموویـەتی چیتـان دەوێ؟ گوتوویانـە: مانگـمان بـۆ لـەت بکـە، ئەویـش لـە خـوای پـەروەردگار، پاڕاوەتـەوەو مانـگ لـەت بـووە} هەتـا ئەشـکەوتی حیڕایـان لـە نێـوان دا دتیـن {ئـەو چیایـەی ئەشـکەوتی حیـڕای تێدایـە، لـە نێـوان دوو لەتەکەکانـی بینییـان لەتێکـی لـەو لا بـووە، لەتێکـی لـەولا بـووە}.

ئەمـە ئەنەسـی کوڕی مالیک ﵁ گێڕاویەتەوە، کـە بێگومان ئەنەس لەو کاتەدا لـەوێ نەبـووەو، تەمەنـی فریـای ئـەوە نەکەوتـوە، بـەڵام لـە عەبدوڵـڵای کـوڕی مەسـعوود ﵁ و، لـە غەیـری ئەویشـی، لە هـاوەڵان (خـوا لێیان ڕازی بـێ)، کە لە مەککـە مسـوڵمان بـوون، بیسـتوە، هاوەڵانیـش کـە قسـەیەکیان لـە یەکـدی بیسـتوە، لەبـەر ئـەوەی متمانـەی سـەدا سـەدیان بـە یەکـدی بـووە، یەکسـەر ئـەو قسـەیەی لە یەکدییـان بیسـتوە، پاڵیانداوەتـە لای پێغەمبەری خوا ﷺ، هەشـیان بـووە گوتوویەتی: لـە فـڵان لـە هاوەڵانـم بیسـتوەو، ئەویـش لـە پێغەمبـەری ﷺ بیسـتوە، هەشـیانە یەکسـەر پاڵـی داوەتـە لای پێغەمبەر ﷺ.

**٢- {عَنِ ابْنِ مَسْعُودٍ ﵁، قَالَ: انْشَقَّ الْقَمَرُ عَلَى عَهْدِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ فِرْقَتَيْنِ؛ فِرْقَةً فَوْقَ الْجَبَلِ، وَفِرْقَةً دُونَهُ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: اشْهَدُوا} (أخرجه البخاري: ٣٦٣٦، ومسلم: ٢٨٠٠، والترمذي: ٣٢٨٥، والنسائي فـي التفسير: ٥٧٢)**

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی مەسعوود ﵁ دەڵێ: لە ڕۆژگاری پێغەمبەری خوادا ﷺ مانـگ بـوو بـە دوو بەشـەوە، پارچەیەکیان لە پشـت چیایەکـەوە بوو، پارچەیەکیشـیان لـە خـوار چیایەکـەوە بـوو {لە بەر چـاوی ئـەوان} پێغەمبـەری خـواش ﷺ فەرمووی: ببینـن، یاخـود شـاهێدیی بدەن.

www.alibapir.com


چونکە (اشْـهَدُوا)، هـەم بـە مەانـای تەماشـا بکـەن (أنظـرُوا) دێ، هـەم بـە مانـای شـاهێدیی بـدەن، دێ.

**٣- {عَنِ ابْنِ عُمَرَ رضي الله عنهما فِي قَوْلِه: ﴿ٱقْتَرَبَتِ ٱلسَّاعَةُ وَٱنشَقَّ ٱلْقَمَرُ﴾ قَالَ: كَانَ ذَلِكَ عَلَى عَهْدِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ انْشَقَّ فِرْقَتَيْنِ؛ فِرْقَةً مِن دُونِ الجَبَلِ، وفِرْقَةً خَلْفَهُ، فَقالَ النَّبِيُّ ﷺ: اللَّهُمَّ اشْهَدْ} (أخرجه مسلم: ٢٨٠١، والترمذي: ٣٢٨٨).**

واتـە: عەبدوڵـڵای کوڕی عومەر رضي الله عنهما لە بارەی فەرموودەی خواوە کە دەفەرموێ: ﴿ٱقْتَرَبَتِ ٱلسَّاعَةُ وَٱنشَقَّ ٱلْقَمَرُ﴾ دەڵـێ: ئـەوە لـە ڕۆژگاری پێغەمبـەری خـوادا ﷺ بـووە، مانـگ بـوو بـە دوو لـەت، لەتێکیـان لـە خـوار چیایەکـەوە بـووەو، لەتێکیـان لـە پشـتیەوە بـوو، پێغەمبـەری خـواش ﷺ فەرمـووی: ئـەی خوایە! شـایەد بە.

**٤- {عَنْ أَبِي عَبْدِ الرَّحْمَنِ السُّلَمِيِّ قالَ: خَطَبَنَا حُذَيْفَةُ بْنُ اليَمانِ بِالمَدائِنِ، فَحَمِدَ اللَّهَ وَأَثْنى عَلَيْهِ ثُمَّ قَالَ: ﴿ٱقْتَرَبَتِ ٱلسَّاعَةُ وَٱنشَقَّ ٱلْقَمَرُ﴾، أَلاَ وَإِنَّ السَّاعَةَ قَدِ اقْتَرَبَتْ، أَلاَ وَإِنَّ القَمَرَ قَدِ انْشَقَّ عَلَى عَهْدِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، أَلاَ وَإِنَّ الدُّنيَا قَدْ آذَنَتْ بِفِرَاقٍ، أَلاَ وَإِنَّ اليَوْمَ المِضْمَار، وغَداً السِّباق} (أخرجه الطبري: ٣٢٧٠٣، والحديث الصحيح بشواهده).**

واتـە: ئەبـوو عەبدوڕڕەحمانـی سـولەمیی دەڵـێ: حوزەیفەی کـوڕی یەمان رضي الله عنه وتـاری بـۆ دایـن، لـە مەدائیـن (سـەلمان پاکـی ئێسـتا، کـە لـە بەغدایـە)، ستایشـی خـوای کـردو، مەدحـی خـوای کـرد، دوایـی گـوتی: ﴿ٱقْتَرَبَتِ ٱلسَّاعَةُ وَٱنشَقَّ ٱلْقَمَرُ﴾ ئـەو ئایەتـەی خوێنـدەوە، دوایـی گـوتی: ئاگاداربـن! ئاخیـر زەمـان زۆر نیزیـک کەوتۆتـەوەو، ئاگاداربـن! مانـگ لـەت بـوو لـە ڕۆژگاری پێغەمبـەری خـوادا ﷺ و ئاگاداربـن! دنیـا خەریکـی خـوا حافیزییـە، ئەمڕۆ ڕۆژی خۆمانـدوو کردنـە، بەیانیـش ڕۆژی پێشـبڕکێیە.

(مِضْمَار) بـەو ڕۆژەیـان گوتـوەو بـەو کاتەیـان گوتـوە: کـە ئەسـپیان یان حوشـتریان تێـدا مەشـق پـێ کـردوەو برسـییان کـردوە، بۆئـەوەی کێشـی زیـادی، دابـەزێ، تاکـو دوایـی لـە پێشـبڕکێدا جەسـتەی سـووک بێـت و پێـش بکەوێتـەوە، مەبەسـتی ئـەوە

www.alibapir.com



بووە کە ئەمڕۆ لە دنیادا کاتی ئەوەیە کە هەوڵبدەین و کردەوەو کۆشش بکەین و، سبەینێش لە قیامەتدا پێشبڕکە دەکەین، داخۆ کێ کردەوەی چاکی زیاترە و کێ لە خوا نیزیکترە؟!

**بڕگەی سێیەم: زۆربەی جەماوەری زانایان، ڕایان وایە مانگ لە ڕۆژگاری پێغەمبەردا ﷺ لەت بووەو، هەموو تەفسیرەکان ئەوەیان هێناوە:**

بۆ وێنە: من قسەی دووان لە زانایان دێنم:

١- (إبن كثير) لە تەفسیرەکەی خۆیدا دەڵێ: (وَقَوْلُهُ تَعَالَى: ﴿وَٱنشَقَّ ٱلْقَمَرُ﴾، قَدْ كَانَ هَذَا فِي زَمَنِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ كَمَا وَرَدَ ذَلِكَ فِي الأَحَادِيثِ الْمُتَوَاتِرَةِ بِالأَسَانِيدِ الصَّحِيحَةِ. قَالَ: وَهَذَا أَمْرٌ مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ بَيْنَ الْعُلَمَاءِ أَنَّ انْشِقَاقَ الْقَمَرِ قَدْ وَقَعَ فِي زَمَنِ النَّبِيِّ ﷺ، وَأَنَّهُ كَانَ إِحْدَى الْمُعْجِزَاتِ الْبَاهِرَاتِ)[1].

واتە: قسەی خوای بەرز کە دەفەرموێ: ﴿وَٱنشَقَّ ٱلْقَمَرُ﴾ ئەوە لە ڕۆژگاری پێغەمبەری خوادا ﷺ بووە، وەک لە فەرمووده موتەواتیرەکاندا بە سەنەدە ڕاستەکان، هاتووەو، شتێکی یەکدەنگیی لەسەر کراوە، لە نێوان زانایاندا، کە مانگ لەتبوون لە ڕۆژگاری پێغەمبەردا ﷺ بووەو، یەکێک بووە لە موعجیزە ڕوون و ئاشکرایەکان.

هەڵبەتە کە دەڵێ: (فِي الأَحَادِيثِ الْمُتَوَاتِرَةِ)، ئەم قسەیەی زێدەڕۆییەو وا نیە، چونکە فەرموودەکان لەو بارەوە بە موتەواتیر لە قەڵەم نادرێن، وەک دوایی باس دەکەین، بەڵام لە کاردانەوەی ئەوانەدا کە نکوولییان کردوە لەوەی ئەوە ڕوویدابێ، هەندێک لە زانایان ئیددیعای ئەوەیان کردوە کە فەرموودەکان موتەواتیرن!

---

(١) المصباح المنير في تهذيب تفسير ابن كثير، ص١٣٣٦.

www.alibapir.com


**٢-** زانای دووەم کە لەو بارەوە قسەکەی وەک نموونە دێنین **(محمد الطاهر بن عاشور)**ە، لە تەفسیرەکەی خۆیدا[1] دەڵێ:

**(وكَثْرَةُ رُواةِ هَذَا الخَبَرِ تَدُلُّ عَلَى أَنَّهُ كَانَ خَبَرًا مُسْتَفِيضاً، وَقَالَ فِي شَرْحِ المَوَاقِفِ: هُوَ مُتَواتِرٌ، وفِي عِبارَتِهِ تَسَامُحٌ لِعَدَمِ تَوَفُّر شَرْطِ التَّوَاتُرِ، وَمُرَادُهُ: أَنَّهُ مُسْتَفِيضٌ).**

واتە: زۆریی گێڕەرەوەکانی ئەم هەواڵە، بەڵگەیە لەسەر ئەوە کە هەواڵێکی بڵاوو باوبووەو، لە کتێبی (**شَرْحِ المَواقِفِ**)دا[2]، دەڵێ: هەواڵێکی موتەواتیرە، بەڵام لە تەعبیرەکەیدا جۆرێ لە چاو پۆشیی هەیە، چونکە مەرجی تەواتور نەهاتۆتە دی، لە گێڕانەوەی ئەو ڕووداوەداو، مەبەستی ئەوەیە هەواڵێکی زۆر بڵاو بووە.

جۆرێک لە تەئویلی بۆ قسەکەی کردوەو، هەندێک لە زانایان زیاتر لە کاردانەوەی ئەوانەی دیکەدا، کە نکووڵییان کردوە لەوەی ڕوویدابێ، گوتوویانە: بەڵکو موتەواتریشە، موتەواتیریش بریتیە لەوە کە ژمارەیەک لە هاوەڵان (خوا لێیان ڕازی بێ) شتێکیان لە پێغەمبەر ﷺ بیستبێ، یان بینیبێ، کە ئەو ژمارە زۆرە بە عەقڵ و عادەت نەگونجێ لەسەر درۆ کۆببنەوە، ئنجا ئەو ژمارە زۆرە، بە ژمارەیەکی دیکەی دوای خۆیانیان گەیاندبێ و ئەوانیش هەروا، تاکو ئەو کاتەی دەقەکانی سوننەت نووسراونەوە، ئەم ڕووداوەش ئەو مەرجەی تێدا نەهاتۆتە دی، بەڵکو دەقەکان بە جۆری ئاحاد دادەنرێن، عەبدوڵڵای کوڕی مەسعوود رضي الله عنه بیستوویەتی و، ئەنەس لەوی بیستوەو، عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس و، حوزەیفەی کوڕی یەمان و، ئاوا تاک تاک بوون، نەک هەموویان شتێکیان نەقل کرد بێ، یان ژمارەیەکی وا کە نەگونجێ بەپێی عەقڵ و عادەت لەسەر درۆ کۆببنەوە، هەڵبەتە زانایان وایان پێناسەی تەواتور کردوە، ئەگەرنا مانای وانیە، ئەگەر یەکێک لە هاوەڵان، یان دووان لە هاوەڵان، شتێکیان بۆ ئێمە گواستەوە، بگوترێ: ئەگەری

---

(١) التحرير والتنوير: ج١١، ص(١٦٦)،

(٢) نووسەرەکەی (عَضُدالدين الإيجي)ە.

www.alibapir.com



هەیە ڕاست نەبێ! نا ئێمە وا ناڵێین، بەڵام کە گوتت: موتەواتیر، یانی: ئەو ڕووداوە یان ئەو قسەیە دڵنیایی پەیدا دەکات، بۆ هەر کەسێک پێی بگات، بۆ وێنە: قورئان بە شێوەی تەواتور بۆ ئێمە نەقڵ بووە، هەروەها ژمارەیەکی کەم لە فەرموودەکانی پێغەمبەر ﷺ کە زیاتر فەرموودەی کردەیین بەوجۆرە پێمان گەیشتوون و، زانایان لەو بارەوە مشت و مریان زۆرە، وەک لە کتێبی: (پێناسەو پێویستیی و گرنگیی ڕێبازی پێغەمبەر ﷺ)دا بە تەفصیل باسمان کردوە.

**بڕگەی چوارەم: هەندێک لە زانایانی پێشین و پاشین، گوتوویانە: مەبەست لە لەتبوونی مانگ لە ڕۆژی دواییدایە:**

ئێمە وەک ئەمانەتی عیلمیی، پێویستە هەر بابەتێک دەیخەینە ڕوو، وەک عادەتی خۆمان هەموو ڕایەکان لەو بارەوە بێنین، نەک هەر ئەو ڕایەی خۆمان پێمان خۆشە، با دوو وێنەش لەوبارەوە بێنمەوە:

**١-** زانای یەکەمیان: (القرطبي) دەڵێ: **(وَقَالَ قَوْمٌ: لَمْ يَقَعِ انْشِقَاقُ الْقَمَرِ بَعْدُ، وَهُوَ مُنْتَظَرٌ، أَيِ اقْتَرَبَ قِيَامُ السَّاعَةِ وَانْشِقَاقُ الْقَمَرِ، وَأَنَّ السَّاعَةَ إِذَا قَامَتِ، انْشَقَّتِ السَّمَاءُ بِمَا فِيهَا مِنَ الْقَمَرِ وَغَيْرِهِ. وَكَذَا قَالَ الْقُشَيْرِيُّ. وَذَكَرَ الْمَاوَرْدِيُّ: أَنَّ هَذَا قَوْلُ الْجُمْهُورِ، وَقَالَ: لِأَنَّهُ إِذَا انْشَقَّ مَا بَقِيَ أَحَدٌ إِلَّا رَآهُ، لِأَنَّهُ آيَةٌ وَالنَّاسُ فِي الْآيَاتِ سَوَاءٌ. وَقَالَ الْحَسَنُ: اقْتَرَبَتِ السَّاعَةُ فَإِذَا جَاءَتِ انْشَقَّ الْقَمَرُ بَعْدَ النَّفْخَةِ الثَّانِيَةِ. وَقِيلَ: ﴿وَانشَقَّ الْقَمَرُ﴾، أَيْ وَضَحَ الْأَمْرُ وَظَهَرَ، وَالْعَرَبُ تَضْرِبُ بِالْقَمَرِ مَثَلًا فِيمَا وَضَحَ، وَقِيلَ: انْشِقَاقُ الْقَمَرِ هُوَ انْشِقَاقُ الظُّلْمَةِ عَنْهُ بِطُلُوعِهِ فِي أَثْنَائِهَا، كَمَا يُسَمَّى الصُّبْحُ فَلْقَاً، لانْفِلَاقِ الظُّلْمَةِ عَنْهُ)**[1].

واتە: کۆمەڵێک گوتوویانە: جارێ لەتبوونی مانگ ڕووی نەداوەو چاوەڕێکراوە، بەڵکو مانای ئایەتەکە ئەوەیە کە هەڵسانی ئاخیر زەمان زۆر نیزیک بۆتەوە، هەروەها لەتبوونی مانگیش نزیک بۆتەوەو، قوشەیرییش هەر وای گوتوەو

---

(١ ) الجامع لأحكام القرآن:، ج١٧، ص(٩٩)،.

www.alibapir.com


ئەماوەردییش گوتوویەتی: ئەمە ڕای جەماوەری زانایانە، {قسەکەی ماوەردیی زێدەڕۆییە بە بۆ چوونی من، چونکە کە تەماشای تەفسیرەکان و کتێبەکانی سوننەت دەکەی، زۆرینە ڕایان وایە ئەو ڕوودواوە، ڕوویداوە، کەچی ئەماوەردییش دیسان، وەک چۆن بەرانبەرەکان گوتوویانە: ئەوە دەقێکی موتەواتیرە، ئەویش ئاوای گوتوە، بۆ ئەوەی بەرانبەرەکانی بێ دەنگ بکات} (ئەماوەردیی) گوتوویەتی: چونکە ئەگەر مانگ لەت بووبایە، هیچکەس نەدەما نەیبینێ، چونکە نیشانەیەکی گەورەیەو، خەڵکیش لە دیتنی نیشانەکاندا، یەکسانن، حەسەنی بەصریییش گوتوویەتی: ئاخیر زەمان نیزیک بۆتەوەو هەر کاتێک هات، ئەو کاتە مانگیش لەت دەبێ، دوای فووی دووەم، کە بە کەڕەنادا دەکرێ، هەروەها گوتراوە: ﴿وَٱنشَقَّ ٱلۡقَمَرُ﴾ واتە: کارەکە زۆر ڕوون بووەوەو دەرکەوت، عەرەب عادەتیان وایە، وێنە بە مانگ دێننەوە بۆ دەرکەوتنی شتێک {دەڵێن: (كَالْقَمَرِ فِي البَدْرِ)، وەک مانگە لە چواردەی دا} ڕایەکی دیکەش ئەوەیە، کە لەتبوونی مانگ بریتیە لە لەتبوونی تاریکیی لە مانگ، کاتێک هەڵدێ واتە: تاریکییە کە دڕ پێدەدا، هەر وەک چۆن بەرەبەیان پێی گوتراوە: (فلق)، لەبەر ئەوەی وەختێ بەرەبەیان دێ {خۆر بەرەو هەڵاتن دێ} دڕ بە تاریکیی دەدات.

**٢-** زانای دووەم: (جمال الدين القاسمي) دەڵێ: **(وَزَعَمَ ابْنُ كَثِيْر أَنَّ أَحَادِيْثَهُ مُتَوَاتِرَةٌ، إلاَّ أَنَّ الشِّهَابَ نَقَلَ عَنِ الإمَامِ الخَطَّابِيِّ أَنَّ مُعْجِزَاتِهِ ﷺ، غَيْرَ القُرْآنِ، لَمْ تَتَوَاتَرْ، وَالحِكْمَةُ فِيْهِ أَنَّهَا لَوْ تَوَاتَرْت كَانَتْ عَامَّةً، وَالمُعْجِزَة إِذَا عَمَّتْ، أَهْلَكَ اللهُ مَنْ كَذَّبَهَا، كَمَا جَرَتْ بِهِ العَادَةُ الإلهِيَّة، وَالنَّبِيُّ ﷺ بُعِثَ رَحْمَةً، وَأَمَّنَ اللهُ أُمَّتَهُ مِنْ عَذَابِ الإسْتِئْصَال، ثُمَّ قَالَ: وَسَبَبُ تَعَرُّضِهِمْ لِلتَوَاتِر طَعْنُ بَعْضِ المَلاَحِدَةِ بِأَنَّ القَمَر يُشَاهِدُهُ كُلُّ أَحَدٍ، فَلَوُ انْقَسَمَ قِطْعَتَيْنِ تَوَاتَرَ وَشَاعَ فِي جَمِيْعِ النَّاسِ، وَلَمْ يَخْفَ عَلَى أَحَدٍ)**[1].

واتە: (إبن كثير) پێی وایە، فەرموودەکانی لە بارەی لەتبوونی مانگەوە هاتوون، موتەواتیرن، [کە دەڵێ: (زَعَم)، یانی: ڕاست ناکات و نەیپێکاوە}، بەڵام شیهاب

---
(١ ) محاسن التأويل: ج٩، ص٢٦٠.

www.alibapir.com


کـە یەکێکـە لـە زانایـان لـە پێشــەوا (**خَطَّابِي**)یـەوە هێناویـەتی، کـە موعجیزەکانـی پێغەمبـەری خـوا ﷺ، جگـە لـە قورئان، هیچیـان موتەواتیـر نین {هیچیان بە شێوەی تەواتـور بـە ئێمـە نەگەیشـتوون} حیکمەتیـش لـەوەدا ئەوەیـە: ئەگـەر موعجیزەکانـی پێغەمبــەر ﷺ {چ لەتبــوونی مانــگ، چ ئــەوانی دیکــە} بــە تەواتــور گەیشــتبانایە، گشـتیی دەبـوون و، موعجیـزەش کاتێـک بـە گشـتیی خەڵـک بیزانـێ، هـەر کەسـێ بە درۆی دابنێ، خوا دەیفەوتێنێ، هەروەک یاساو عادەتی خوا ﷻ بەو شێوەیە بـەردەوام بـووە، پێغەمبـەری خاتەمیش ﷺ وەک بەزەیـی نێردراوە بـۆ مرۆڤایەتیـی و خــوا ئۆممەتەکـەی، {ئۆممەتەکـەی موحەممـەد ﷺ یـش هەمـوو مرۆڤایەتییـە تاکـو دنیـا بـە کۆتـا دێ، هەمـووی لەسـەر میلاکـی پێغەمبـەرە} دڵنیـا کـردوە کـە بـە سـزایەکی لـە ڕیشـە دەرهێنـەرو کۆتایـی پێهێنـەر، نایانفەوتێنـێ {دوایـی (**الخَطَّـابِي**)، گوتوویـەتی:} ئـەوەش کـە باسـی تەواتوریـان کـردوە، لەبـەر ئـەوە بـووە کـە هەندێـک لـە مولحیـدەکان نکووڵییـان لـە لەتبوونـی مانـگ کـردوە، [ئـەوان وەک تانـە دان لـە ئیسـلام]، گوتوویانـە: مانـگ هەمـوو کـەس دەیبینـێ و ئەگـەر دوو پارچـە بووبایـە، هەمـوو کـەس دەیبینـی و، هەواڵەکـە بـە نێـو هەمـوو خەڵکیـدا بڵاودەبـۆوەو، لـە هیـچ کـەس پەنهـان نەدەبـوو {لـە بەرانبـەر ئـەو قسـەیەدا، هەندێـک لـە زانایـان گوتوویانــە: نەخێــر موتەواتیــرە}.

## بڕگەی پێنجەم: کەسێ بڕوای بە لەتبوونی مانگ نەبێ، حوکمی چییە؟

(**جمال الدين القاسمي**) هەر لە تەفسیرەکەی خۆیدا، قسەیەکی جوان دەکات بە ڕای من، بۆیە قسەکە هەمووی دێنم دەڵێ:

**(وَلِي كَلِمَـةٌ هَـا هُنَـا لاَ بُـدَّ مِـن التَّنْبِيـه عَلَيْهَـا، وَهِـيَ أَنَّ الرَّمِـيَ بِالإِلْحَـادِ لِـمُنْكِرِ حَدِيْثٍ، غَـيْرُ مُجْمَـعٍ عَـلَى تَوَاتُـرِهِ، جِنَايَـة كُـبْرَى، وَزَلَّـةٌ عُظْمَـى، فَـإِنَّ بَـابَ التَّكْفِـيرِ وَالتَّضْلِيْـل، لَيْـسَ بِالأَمْـرِ القَلِيْـل، وَلأَجْلِـهِ صَنَّـفَ حُجَّـةُ الإِسْـلَام الغَـزَّالِي كِتَابَـهُ «فَيْصَـلُ التَّفْرِقَـة بَـيْنَ الإِسْـلَام وَالزَّنْدَقَـة»، وَدَفَـعَ بِحُجَجِـهِ أُوْلَئِـكَ المُتَعِصِّبِيْنَ الَّذِيْـنَ سَـهُلَ عَلَيْهُـم الرَّمِـيُ لِمَـنْ خَالَفَهُـم**

www.alibapir.com


بِالْزَّنْدَقَـة، وَلَعَمْرُ الحَـقِّ إنَّ هَـذَا مِـمَا فَـرَّقَ الكَلِمَـة، وَنَفَّـرَ حَمَلَـةَ العِلْمِ عَـنْ تَعَرُّفِ المَشَـارِبِ وَالآرَاءِ، حَتَّـى أَصْبَـحَ بَـابُ التَّوَسُّـعِ فِـي العِلْـمِ مُرْتَجّـاً، وَمُحِيْطُـهُ بَعْـدَ مَـدِّهِ مُنْحَـسِراً، إذْ هُجِـرَتْ كُتُـبُ الفِـرَقِ الأُخْـرَى بَـلْ أُحْرِقَـت، وَأُهِيْنَ مَـنْ يَتَأَثَّلُهَـا، وَرُمِـيَ بِالإبْتِـدَاعِ والتَّزَنْـدُقِ، كَـمَا يَمُـرُّ كَثِيْرٌ مِـنْ مِثْلِ هَـذَا بِمُطَالِـعِ كُتُـب التَّأَرِيْـخِ وَطَبَقَـاتِ الرِّجَـال، فَـلَا جَـرَمَ نُـسِيَتِ الأَقْـوَالُ البَاقِيَـة، وَعُـدَّتْ مِـنَ الشَّـاذِ غَـيْرِ المَقْبُـولِ. وَإذَا أُلْصِـقَ اسْـمُ الإلْحَـادِ بِقَائِلِهَـا فَـمَاذَا يَكُـونُ حَالُهَـا؟ وَهَـذَا، كَـمَا لَا يَخْفَـاكَ، حَيْـفٌ عَـلَى قَوَاعِـدِ العِلْـمِ، وَغُـلٌّ لِلأفْـكَار، نَعَـمْ! تَفَلَّـتَ مِنْهُـمْ عِلْـمُ الأُصُـولِ، فَلَـمْ تَـزَلِ الأَقْـوَالِ الغَرِيْبَـةُ تَـتَرَاءى عَـلَى صَفَحَاتِـه..... وَقَـدْ تَنَبَّـهَ كَثِيْرٌ مِـن المُحَقِّقِيْنِ لِـمَا ذَكَرْنَـاهُ، وَأَشَـارُوْا لَـهُ فِـي مَوَاضِـع، فَقَـرَّروا فِـي كُتُـبِ العَقَائِد أَنَّـهُ لَا يُكَفَّـرُ أَحَـدٌ مِـنْ أَهْـلِ القِبْلَـةِ، وَقَـالَ العَلَامَّـة الفَنَـارِيّ فِـي (الفُصُـول البَدَائِـع) : وَلَا يُضَلَّـل جَاحِـدُ الآحَـاد.

وَقَـالَ الإمَـامِ ابْـنُ تَيْمِيَـة: الصَّـوَابُ أَنَّ مَـنْ رَدَّ الخَـبَرَ الصَّحِيْـح، كَـمَا كَانَـتِ الصَّحَابَـة تَـردُّهُ، لاعْتِقَـادِ غَلَـطِ النَّاقِـلِ أو كَذِبِـهِ، أو لاعْتِقَـاد الـرَّاد أنَّ الدَّلِيْـل قَـدْ دَلَّ عَـلَى أَنَّ الرَّسُـولَ لَا يَقُـولُ هَـذَا، فَـإنَّ هَـذَا لَا يُكَفَّـرُ وَلَا يُفَسَّـقُ، وإنْ لَـمْ يَكُـنْ اعْتِقَـادُه مُطَابِقـاً، فَقَـدْ رَدَّ غَـيْرُ وَاحِـدٍ مِـنَ الصَّحَابَـة، غَـيْرَ وَاحِـدٍ مِـنَ الأَخْبَـار الَّتِـي هِـي صَحِيْحَـةٌ عِنْـدَ أَهْـلِ الحَدِيْـثِ)[١].

واتـە: لێـرەدا وتەیەکـم هەیـە پێویسـتە بیڵێـم و خەڵکـی لـێ ئـاگادار کەمـەوە، ئەویـش ئەوەیـە کـە تۆمەتبـار کـردن بـە ئیلحـاد (واتـە: لادان لـە دیـن و لـێ دەرچـوونی)، بـۆ کەسـێک کـە نکووڵیـی دەکات لـە فەرموودەیـەک، کـە یەکدەنگیـی لەسـەر موتەواتیربـوونی دروسـت نەبـووە، (هـەر لەبـەر ئـەوە تۆمەتبـار بکـرێ، بـە دەرچـوو لـە دیـن) تاوانێکـی گەورەیـەو هەڵەیەکـی مەزنـە، چونکـە کردنـەوەی دەرگای بـە کافردانـان و بـە گومـڕا دانـان، شـتێکی کـەم نیـە، هـەر بۆیـەش لـەو پێنـاوەدا (حجة الإسلام الغزالي)، کتێبەکـەی خـۆی بـە نـاوی (فَيْصَلُ التَّفْرِقَة بَيْنَ الإسْلَامِ وَالزَّنْدَقَـة)، واتـە: لێـک جیاکـەرەوەی نێـوان مسـوڵمانەتیی و زیندیقیـی، بـە بەڵگـەکانی

---

(١ ) محاسن التأويل: ج٩، ص٢٦١، ٢٦٢.

www.alibapir.com


بەرپەرچی ئەو دەمارگیرانەی داوەتەوە، کە بەلایانەوە ئاسانە، هەر کەسێ لە ڕایەکدا پێچەوانەیان بێ، بە زەندیق و لە دین دەرچوو، ناوزەدی بکەن و، سوێند بە هەق ئەوەی وایکرد وشەی مسوڵمانان جیاوازیی بکەوێتێ و، وایکرد کە هەڵگرانی زانیاریی هەوڵنەدەن بە دوای مەشرەبەکان و ڕایەکاندا بگەڕێن، هەتا وای لێهات: دەرگای فراوان بوون لە زانیاریی دا پێوەدراو، بازنەکەی دوای ئەوەی زۆر فراوان بوو، هاتەوە یەک و، کتێبی لایەنەکانی دیکە وازیان لێ هێنرا، بەڵکو سووتێنران و، هەر کەسێک ئەو کتێبانەی کۆ کرد بایەوەو هەڵگرتبایە سووکایەتیی پێ دەکراو، تۆمەتبار دەکرا بەوەی داهێنانی کردوە، لە دیندا، بەڵکو تۆمەتبار دەکرا بە دەرچوون لە دین و زەندەقە، وەک هەر کەسێک کتێبەکانی مێژوو و کتێبەکانی (**طبقات الرجال**)، {چینەکانی پیاوان} بخوێنێتەوە، ئەوەی زۆر بەرچاو دەکەوێ و، لە ئەنجامی ئەوەش دا قسەکانی دیکە، کە لە بارەی بابەتێکەوە هەن {قسە جیاوازەکانی دیکە کە پێچەوانەی ئەو ڕایە باوەکانن} لە بیر کران و بە قسەی ڕیزپەڕو ناپەسند دانران، ئنجا کاتێک بێژەری قسەیەک کە نەگونجاوە لەگەڵ ڕای گشتیی دا بە ئیلحاد ئەژمار بکرێ، دەبێ حاڵی چۆن بێ؟ ئەمەش بێگومان ستەمێکە بەرانبەر بە بنچینەکانی زانست و کۆتێکە بۆ بیر و زەینەکان، تەنیا زانیاریی (**أصول فقه**)، لەوە دەرباز بووە و، ئێستاش لەگەڵدا بێ قسە نامۆیەکان لەلاپەڕەکانی (**أصول فقه**)دا هەن.

هەندێک لە لێکۆڵەرەوانیش لەوەی باسمان کرد، ئاگادار بوونەوەو، لە چەند شوێنێکدا ئاماژەیان بەوە کردوەو، بۆیە لە کتێبەکانی عەقائیددا، {کتێبەکانی بیرکردنەوەی ئیسلامیی} هاتوەو چەسپاوە کە هیچکەس لەوانەی ڕوو لە قیبلە دەکەن بە کافر دانانرێن، بۆ وێنە: (**العلامَّة الفناري**)، لە کتێبەکەی خۆی (**الفصول البدائع**)دا، دەڵێ: کەسێک نکوولیی بکات لە فەرموودەیەکی ئاحاد {پێی وابێ پێغەمبەری خوا ﷺ نەیفەرمووە} بە گومڕا دانانرێ، هەروەها پێشەوا ئیبنو تەیمیە دەڵێ: قسەی ڕاست ئەوەیە: هەر کەسێک هەواڵێکی ڕاست بەرپەرچبداتەوە،

هـەروەک چـۆن هـاوەڵان خـوا لێیـان ڕازی بـێ، جـاری وابـوو بەرپەرچـی شـتێکیان دەدایـەوە، کـە یەکێکـی دیکـە لـە پێغەمبـەرەوە نەقڵـی دەکات، لەبـەر ئـەوەی پێیـان وابـوو بابـای گـوازەرەوە بـۆ ئـەو قسـەیە، بەهەڵـەدا چـووە، یـان پێیـان وابـوو ڕاسـت نـاکات، یـان لەبـەر ئـەوەی ئـەو کەسـەی ئـەو شـتە بەرپـەرچ دەداتـەوە، پێـی وابـێ: بەڵگـە ئـەوە دەگەیەنـێ کـە پێغەمبـەر ﷺ ئـەوەی نەفەرمـووە، کەسی وا نـە بە کافر و نـە بـە فاسـیقیش دادەنـرێ، هەرچەنـدە قەناعەتەکەشـی لەگـەڵ واقیعـدا گونجـاو نەبـێ، چونکـە زیاتـر لـە یەکێـک لـە هـاوەڵان، زیاتـر لـە یەکێـک لـە هەواڵەکانیـان، کـە ڕاسـتیش بـوون لـە لای زانایـانی فەرموودەنـاس بەرپەرچداونـەوەو قبووڵیـان نەکـردوون {پێیـان وابـووە ئـەو کەسـە نەیپێـکاوە، نـەک بزانـێ هـی پێغەمبـەرە ﷺ کەچـی نکووڵیـی لـێ بـکات، چونکـە بـەوە کافـر دەبـێ}.

### منیش لە کۆتایی ئەم بڕگەیەدا دەڵێم:

شـایانی باسـە: سـەرجەم ئـەو دەقانـەی سـوننەت کـە لـە بـارەی هاتنـی موحەممـەدی مەهدیـی و، هاتنـی دەججاڵ و، هاتنە خوارەوەی عیسـاوە ﷺ هاتـوون، هەموویـان دەقـی جـۆری ئاحـادن، هەڵبەتـە ڕەنگـە هەندێـک لـە زانایانیـش هەبـن بڵێـن: هەندێکیـان موتەواتیـرن، بـەڵام زۆربـەی زانایـان دەڵێـن: ئەوانـەش هەموویـان دەقـی ئاحـادن و هیـچ کامیـان موتەواتیـر نیـن، بۆیـە کەسـێک نکووڵیـی بـکات لـە یەکێـک لەوانـە، چونکـە لـە نێـو زانایانـدا کەسـانی وابـوون، دیسـان بـۆی بـە کوفـرو بـە فیسـق دانانـرێ، هەرچەنـدە هەنـدێ لەوانـەی زێدەڕۆیـی لـە بـواری پابەندیـی بـە دەقانـەوەدا دەکـەن، لەسـەر حیسـابی لـێ تێگەیشـتنیان، بـە ئاسـانیی لافـی یەکدەنگیـی زانایـان و، موتەواتیـر بـوونی هەندێـک دەقـان لـێ دەدەن، بـەڵام لـە ڕاسـتییدا دەبـێ هـەق چۆنـە وا بگوتـرێ و، لەبـەر دڵ ڕاگرتنـی کـەس، مـرۆڤ نـە تێپەڕێنـێ و نـە کورتـی بێنـێ.

www.alibapir.com


## بڕگەی شەشەم: ئایا پەکمان لەسەر ئەوە کەوتوە، موعجیزەی لەتبوونی مانگ لەگەڵ زانستی ڕۆژگاردا بگونجێنین؟

هەر ئەوەندە دەڵێم: کە هەر کام لە تەفسیری (**التحرير والتنوير**)ی (**إبن عاشور**)[1]، هەروەها تەفسیری نموونەی (ناصری مەکاریمی شیرازیی)[2]، زۆریان هەوڵداوە بە هەر شێوەیەک بێ ئەو ڕووداوە، لەگەڵ زانیاریی گەردووونناسیی تازەدا بگونجێنن، بەڵام پێم وایە ئەوە هەمووی زیادەیە، چونکە موعجیزە، یانی: شتێک پێچەوانەی باوو عادەتی خەڵک بێ و، زانایان بە (**خارق العادة**)، یاسادڕ، پێناسەی دەکەن، کەواتە: پێویست بەو سەر ئێشەیە ناکات.

## بڕگەی حەوتەم و کۆتایی: نەبینرانی لەتبوونی مانگ لە لایەن خەڵکی دنیاوەو نەقڵ نەکرانی، بەڵگەی نەبوونی نیە:

دەتوانین لەو بارەوە چەند بەڵگەیەک بێنینەوە:

١- هەمیشە مانگ لە لایەن نیوەی خەڵکی سەر زەوییەوە نابینرێ، چونکە مانگ بەس لە نیوەی خەڵکی سەر زەوییەوە دیار دەبێ.

٢- نیوەکەی دیکەش کە دەگونجێ ببینن، دەگونجێ بیبینین و دەشگونجێ زۆربەیان لە حاڵەتی خەودا بن، بە تایبەت کە مانگ دەکەوێتە چواردەو پازدەی.

٣- ئەوانەش کە بێدارن، دەگونجێ پەرچێک بێتە بەر دیدەیان، وەک هەور و تەم و تۆز و گەرد نەیبینن.

٤- ڕووداوە ئاسمانییەکان کاتێک سەرنجی خەڵک بە لای خۆیاندا دەکێشن، کە بڵێسە و دەنگ و سەدایەکیان هەبێ، بەڵام لەتبوونی مانگ، کەس ناڵێ: ئەو دەنگ و سەدایەی هەبووە.

---

(١) ج١١ ص ١٧٠،١٦٩.

(٢) ج٢٣ ص ١٣ - ١٦.

٥- لەو ڕۆژگارەدا (ڕۆژگاری پێغەمبەری خوا ﷺ) ئامێرەکانی تۆمارکردنی ڕووداوان و بڵاو کردنەوەیان وەک ئێستا نەبووە، برووسکە ئاسا بڵاوببنەوە، کەواتە: ئەوانەی دەڵێن: لەبەر ئەوەی خەڵک پێی نەزانیوە، بڕوای پێ ناکرێ، ئەو قسەیە قسەیەکی لۆژیکیی و زانستیی نیە.

لێرەش دا کۆتایی بەم کورتە باسە دێنین.

سُبحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ، أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إلاَّ أَنْتَ، أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ.

لە ڕێی کۆمەڵایەتییەکان لەگەڵتانین
Stay in touch on social media
نحن معكم عبر مواقع التواصل الاجتماعي
ڕاگەیاندنی مەکتەبی مامۆستا عەلی باپیر
عەلی باپیر/AliBapir
archive.org/details/@alibapir
عەلی باپیر/AliBapir
AliBapir
Google Play
App Store
www.alibapir.net
کوردی - عربي - English
کەناڵی
ڕاگەیاندنی مەکتەبی مامۆستا عەلی باپیر
ڕاگەیاندنی مەکتەبی مامۆستا عەلی باپیر

www.alibapir.com


## پێناسەی ئەم دەرسە

ئـەم دەرسـەمان ئایەتـەکانی: (٩ - ٤٢)، واتـە: سی و چـوار (٣٤) ئایـەت دەگرێتـە خـۆی، ئـەم دەرسـە، کورتەیـەک لـە بەسـەرهاتی پێنـج لـە پێغەمبـەرانی خـوا (عَلَيْهـمُ الصَّـلَاةُ وَالسَّـلَام)و، گەلەکانیـان و، چۆنیەتیـی فەوتێنرانیـانی تێـدا خراوەتـەڕوو، کـە بریتیـن لـە:

١- نووح و گەلەکەی، کە بە تۆفان فەوتێنران و نووح و، شوێنکەوتوانیشی بە سواری کەشتیی دەربازیان بووە.

٢- گەلی عاد، کە هوود ﷺ پێغەمبەریان بووە، بە بایەکی بەهێزی سارد فەوتێنراون.

٣- گەلی ثەموود، کە صالیح پێغەمبەریان بووە، بە هاڕژن و بلێسەیەکی بێڕەزا فەوتێنراون.

٤- گەلی لووط، کە لووط ﷺ پێغەمبەریان بووە، بە ژێراو ژوور کرانی شارەکەیان و، ناردنە سەری بایەک کە چەوو بەردی بەسەردا فڕێ داون، فەوتێنراون.

٥- گەلی فیرعەون، کە مووساو هاڕوون (عَلَيْهما الصَّلَاةُ وَالسَّلَام) پێغەمبەریان بوون، لە دەریای سووردا پاش دەربازکرانی مووساو هاڕوون و گەلە چەوسێنراوەکەیان بەنوو ئیسرائیل، خنکێنراون.

شـایانی گوتنیشـە: بۆیـە لێـرەدا ئێمـە ئـەو پێنـج بەسـەرهاتەمان پێکـەوە هێنـان و، بـە کورتییـش لـە بارەوەیانـەوە دەدوێیـن، چونکـە لـە کاتی تەفسـیرکردنی سـووڕەتەکانی دیکـەدا، لـە چەنـد شـوێنێکی تایبەتـدا، بـە درێژیـی قسـەمان لـە بـارەی هـەر کام لەو بەسـەرهاتانەوە کـردوە، هەروەهـا بەسـەرهاتی تێکـڕای ئـەو پێغەمبەرانـەی دیکـەش (عَلَيْهـمُ الصَّـلَاةُ وَالسَّـلَام) کـە ناویـان لـە قورئـادا هاتـوەو، بـە پێغەمبـەری کۆتاییـەوە

www.alibapir.com


بیست و پێنج (٢٥) کەسن، بە نسبەت ئەو پێنج پێغەمبەرەشەوە، لەم شوێنانەدا بە درێژیی بەسەرهاتەکانمانیان خستوونە ڕوو:

**١-** نووح ﷽ و گەلەکەی لە سوورەتی (**هوود**)دا، بەسەرهاتەکەیمان هێناوە.

**٢-** هوود ﷽ و گەلەکەی عاد، دیسان لە سوورەتی (**هوود**)دا، بەسەرهاتەکەیمان هێناوە.

**٣-** صاڵیح ﷽ و گەلەکەی ثەموود، لە سوورەتی (**الحجر**)دا، بەسەرهاتەکەیمان هێناوە.

**٤-** لووط ﷽ و گەلەکەی، لە سوورەتی (**هوود**)دا، دیسان بەسەرهاتەکەیمان هێناوە.

**٥-** فیرعەون و گەلەکەی و، مووساو هاڕوونی برای و گەلەکەیان، لە سەرەتای سوورەتی (**القصص**)داو لە سوورەتی (**الأعراف**)دا، بەسەرهاتەکەیانمان هێناوە، ئێمە بەسەرهاتی مووساو هاڕوون و گەلەکەیان و، فیرعەون و دارو دەستەکەیمان کردوە بە سێزدە ئاڵقە، پێنج ئاڵقەی سەرەتایان لە سوورەتی (**القصص**)داو، هەشت ئاڵقەکەی دواییشی لە سوورەتی (**الأعراف**)دا، هێناومانە.

﴿كَذَّبَتْ قَبْلَهُمْ قَوْمُ نُوحٍ فَكَذَّبُوا۟ عَبْدَنَا وَقَالُوا۟ مَجْنُونٌ وَٱزْدُجِرَ ﴿٩﴾ فَدَعَا رَبَّهُۥٓ أَنِّى مَغْلُوبٌ فَٱنتَصِرْ ﴿١٠﴾ فَفَتَحْنَآ أَبْوَٰبَ ٱلسَّمَآءِ بِمَآءٍ مُّنْهَمِرٍ ﴿١١﴾ وَفَجَّرْنَا ٱلْأَرْضَ عُيُونًا فَٱلْتَقَى ٱلْمَآءُ عَلَىٰٓ أَمْرٍ قَدْ قُدِرَ ﴿١٢﴾ وَحَمَلْنَٰهُ عَلَىٰ ذَاتِ أَلْوَٰحٍ وَدُسُرٍ ﴿١٣﴾ تَجْرِى بِأَعْيُنِنَا جَزَآءً لِّمَن كَانَ كُفِرَ ﴿١٤﴾ وَلَقَد تَّرَكْنَٰهَآ ءَايَةً فَهَلْ مِن مُّدَّكِرٍ ﴿١٥﴾ فَكَيْفَ كَانَ عَذَابِى وَنُذُرِ ﴿١٦﴾ وَلَقَدْ يَسَّرْنَا ٱلْقُرْءَانَ لِلذِّكْرِ فَهَلْ مِن مُّدَّكِرٍ ﴿١٧﴾ كَذَّبَتْ عَادٌ فَكَيْفَ كَانَ عَذَابِى وَنُذُرِ ﴿١٨﴾ إِنَّآ أَرْسَلْنَا عَلَيْهِمْ رِيحًا صَرْصَرًا فِى يَوْمِ نَحْسٍ مُّسْتَمِرٍّ ﴿١٩﴾ تَنزِعُ ٱلنَّاسَ كَأَنَّهُمْ أَعْجَازُ نَخْلٍ مُّنقَعِرٍ ﴿٢٠﴾ فَكَيْفَ كَانَ عَذَابِى وَنُذُرِ ﴿٢١﴾ وَلَقَدْ يَسَّرْنَا ٱلْقُرْءَانَ لِلذِّكْرِ فَهَلْ مِن مُّدَّكِرٍ ﴿٢٢﴾ كَذَّبَتْ ثَمُودُ بِٱلنُّذُرِ ﴿٢٣﴾ فَقَالُوٓا۟ أَبَشَرًا مِّنَّا وَٰحِدًا نَّتَّبِعُهُۥٓ إِنَّآ إِذًا لَّفِى ضَلَٰلٍ وَسُعُرٍ ﴿٢٤﴾ أَءُلْقِىَ ٱلذِّكْرُ عَلَيْهِ مِنۢ بَيْنِنَا بَلْ هُوَ كَذَّابٌ أَشِرٌ ﴿٢٥﴾ سَيَعْلَمُونَ غَدًا مَّنِ ٱلْكَذَّابُ ٱلْأَشِرُ ﴿٢٦﴾ إِنَّا

www.alibapir.com



مُرۡسِلُواْ ٱلنَّاقَةِ فِتۡنَةٗ لَّهُمۡ فَٱرۡتَقِبۡهُمۡ وَٱصۡطَبِرۡ ﴿٢٧﴾ وَنَبِّئۡهُمۡ أَنَّ ٱلۡمَآءَ قِسۡمَةُۢ بَيۡنَهُمۡۖ كُلُّ شِرۡبٖ مُّحۡتَضَرٞ ﴿٢٨﴾ فَنَادَوۡاْ صَاحِبَهُمۡ فَتَعَاطَىٰ فَعَقَرَ ﴿٢٩﴾ فَكَيۡفَ كَانَ عَذَابِي وَنُذُرِ ﴿٣٠﴾ إِنَّآ أَرۡسَلۡنَا عَلَيۡهِمۡ صَيۡحَةٗ وَٰحِدَةٗ فَكَانُواْ كَهَشِيمِ ٱلۡمُحۡتَظِرِ ﴿٣١﴾ وَلَقَدۡ يَسَّرۡنَا ٱلۡقُرۡءَانَ لِلذِّكۡرِ فَهَلۡ مِن مُّدَّكِرٖ ﴿٣٢﴾ كَذَّبَتۡ قَوۡمُ لُوطِۢ بِٱلنُّذُرِ ﴿٣٣﴾ إِنَّآ أَرۡسَلۡنَا عَلَيۡهِمۡ حَاصِبًا إِلَّآ ءَالَ لُوطٖۖ نَّجَّيۡنَٰهُم بِسَحَرٖ ﴿٣٤﴾ نِّعۡمَةٗ مِّنۡ عِندِنَاۚ كَذَٰلِكَ نَجۡزِي مَن شَكَرَ ﴿٣٥﴾ وَلَقَدۡ أَنذَرَهُم بَطۡشَتَنَا فَتَمَارَوۡاْ بِٱلنُّذُرِ ﴿٣٦﴾ وَلَقَدۡ رَٰوَدُوهُ عَن ضَيۡفِهِۦ فَطَمَسۡنَآ أَعۡيُنَهُمۡ فَذُوقُواْ عَذَابِي وَنُذُرِ ﴿٣٧﴾ وَلَقَدۡ صَبَّحَهُم بُكۡرَةً عَذَابٞ مُّسۡتَقِرّٞ ﴿٣٨﴾ فَذُوقُواْ عَذَابِي وَنُذُرِ ﴿٣٩﴾ وَلَقَدۡ يَسَّرۡنَا ٱلۡقُرۡءَانَ لِلذِّكۡرِ فَهَلۡ مِن مُّدَّكِرٖ ﴿٤٠﴾ وَلَقَدۡ جَآءَ ءَالَ فِرۡعَوۡنَ ٱلنُّذُرُ ﴿٤١﴾ كَذَّبُواْ بِـَٔايَٰتِنَا كُلِّهَا فَأَخَذۡنَٰهُمۡ أَخۡذَ عَزِيزٖ مُّقۡتَدِرٍ ﴿٤٢﴾

## مانای دەقا و دەقی ئایەتەکان

{لە پێش ئەواندا (کۆمەڵگای پێغەمبەری کۆتایی ﷺ لە مەککەو دەوروبەری) گەلی نووح (بە پەیامی خوا بێبڕوا بوون و) بە درۆیان دانا ﴿٩﴾ سەرەنجام بەندەکەمانیان بە درۆ داناو گوتیان: شێتەو (بە چەندان شێوە ئازاردراو) گەفی لێکرا ﴿١٠﴾ ئەویش لە پەروەردگاری پاڕایەوەو (گوتی: خوایە!) من بێ چارەم، ئنجا سەرم بخە (تۆڵەم بۆ بستێنە) ﴿١١﴾ ئێمەش یەکسەر دەروازەکانی ئاسمانمان بە ئاوێکی بەلووزەو هەڵڕژاو کردنەوە ﴿١٢﴾ هەروەها کانیی و سەرچاوەکانیشمان لە زەویدا تەقاندنەوەو دەرقوڵاندن، ئیدی ئاوەکە (لەسەرێ و خوارێوە) پێکگەیشت، بە شێوەیەک کە (پێشتر) ئەندازەگیریی کرابوو ﴿١٣﴾ ئەویش (و شوێنکەوتووانیشی) مان سواریی (کەشتییەکی) خاوەن تەختەکان و بزمارەکان کردو دەربازمانکردن ﴿١٣﴾ (ئەو کەشتییە) بەچاوەکانمان (لە ژێر چاودێریی و پارێزگارییماندا) دەڕۆیشت و، (ئەوەش) پاداشتی کەسێک بوو کە بێبڕوایی و سپڵەیی بەرانبەر کرابوو ﴿١٤﴾ بە دڵنیاییش ئەو (کەشتیی)ەمان وەک نیشانەو بەڵگەیەک هێشتەوە، ئنجا ئایا کەسی بیرکەرەوەو پەندوەرگر هەیە؟ ﴿١٥﴾ ئنجا ئایا (سزادان و) ئازارو ترساندنی

www.alibapir.com


من چۆن بوو! ﴿١٦﴾ بە دڵنیاییش قورئانمان بۆ بیرخستنەوەو لێ تێگەیشتنێ سێنا کردوە، ئنجا ئایا کەسی بیرکەرەوەو پەند وەرگر هەیە؟ ﴿١٧﴾ (گەلی) عادیش بە (هوود بێبڕوا بوون و) بە درۆیان دانا، ئنجا ئایا ئازارو (هەڕەشەو) ترساندنم چۆن بوو! ﴿١٨﴾ ئێمە بایەکی ساردی بەهێزمان نارده سەریان، لە ڕۆژێکی بەردەوام نەگبەتدا ﴿١٩﴾ خەڵکەکەی لە بیخەوە هەڵدەکەند، وەک کۆتەرە دارخورمای لە ڕیشەوە دەرکێشراو بوون ﴿٢٠﴾ ئنجا ئایا سەرەنجامی ئازارو ترساندن و هەڕەشەکەم چۆن بوو! ﴿٢١﴾ بە دڵنیایی قورئانیشمان بۆ بیرکەوتنەوە (ی ڕاستییان و پەندوەرگرتن) ئاسانکردوە، ئنجا ئایا کەسی بیرکەرەوەو پەندوەرگر هەیە؟ ﴿٢٢﴾ (گەلی) ثەموود (وریاکردنەوەو) ترساندنەکانیان بە درۆدانان ﴿٢٣﴾ ئنجا گوتیان: ئایا شوێن یەک مرۆڤ لە خۆمان بکەوین؟ کەواتە: ئێمە لە گومڕایی و شێتیی (و مەینەتیی) داین ﴿٢٤﴾ ئایا (پەیامی) بیرخەرەوە لە نێو ئێمە دابەزێنراوەتە سەر وی (صاڵیح)؟ بەڵکو ئەو درۆزنێکی خۆ پەسندە ﴿٢٥﴾ بێگومان سبەینێ دەزانن کێ درۆزنی خۆ پەسندە ﴿٢٦﴾ ئێمە حوشترە (تایبەتە) کەیان بە تاقیکردنەوە بۆ دەنێرین، ئنجا تۆش (ئەی صاڵیح!) چاوەڕێیان بکە (چییان بەسەر دێ) و خۆڕاگربە ﴿٢٧﴾ هەواڵیشیان پێ بدە (ئاگاداریان بکەوە) کە ئاوەکە (لە نێوان ئەوان و حوشترەکەدا) بەشکراوە، هەر نۆرە ئاوێک لەلا ئامادە بوویە (لە لایەن خاوەن نۆرەکەیەوە) ﴿٢٨﴾ ئیدی (خەڵکەکە) بانگی هاوەڵەکەیانیان کرد، ئەویش دەستبەکاربوو، ئنجا (حوشترەکەی) پەی کرد ﴿٢٩﴾ ئنجا ئازارو ترساندنی من سەرەنجامەکەی چۆن بوو؟ ﴿٣٠﴾ ئێمە یەک هاڕژن (ی بێڕەزا) مان نارده سەریان، یەکسەر بوونە پووش و پەڵاشی وردو خاشی بابای خاوەن ئاغەڵ ﴿٣١﴾ بە دڵنیاییش قورئانمان بۆ بیرکەوتنەوەو پەند لێوەرگرتن ئاسانکردوە، ئنجا ئایا کەسی پەندوەرگرو بیرکەرەوە هەیە؟ ﴿٣٢﴾ گەلی لووط ترساندنەکانی (پێغەمبەرەکەیان)یان بە درۆ دانان ﴿٣٣﴾ ئێمەش بایەکی بەردو چەو، فڕێدەرمان نارده سەریان (و هەموویان فەوتان)، جگە لە نزیکان (و شوێنکەوتووان)ی

لـووط (کـە) لـە بەرەبەیانـدا دەربازمانکـردن ﴿٣٤﴾ (ئـەوە) چاکەیـەک بـوو لەلایـەن ئێمـەوە، بـەو شـێوەیەش پاداشـتی کەسـێک دەدەینـەوە، سوپاسـگوزاریی کردبـێ ﴿٣٥﴾ بـە دڵنیاییـش ئـەو (لـووط) لـە زەبـری ئێمـە ترسـاندبوونی، کەچـی ئـەوان لـە دوو دڵیـی دابـوون لـە بـارەی ترسـاندن ( و هۆشـداریی)ەکەوە ﴿٣٦﴾ بێگومانیـش داوایـان لێکـرد، میوانەکانیـان بـە دەسـتەوە بـدات (بـۆ خراپـە لەگەڵکـردن)، ئێمـەش چاویانمان سـڕینەوە (و کوێـرو کوترمـان کـردن)، دەجـا بیچێـژن ئـازار ( و ئاکامـی) ترسـاندنی من! ﴿٣٧﴾ بـە دڵنیایـی بەیـانی زوو ئازارێکـی جێگیـرو بـەردەوام بەسـەریدادان ﴿٣٨﴾ (پێـمان گوتـن:) دەبیچێـژن ئـازار (و ئـاکام)ی ترسـاندنی مـن! ﴿٣٩﴾ بـە دڵنیاییـش قورئانـمان بـۆ بیرخسـتنەوەو پەندوەرگرتـن سـێنا کـردوە، ئنجا ئایـا کەسـی بیرکـەرەوەو پەندوەرگـر هەیـە؟ ﴿٤٠﴾ بێگومـان نیزیـکان و شـوێنکەوتووانی فیرعەونیـش وریـا کردنـەوەو ترسـاندن (ی مووسـایان) بـۆ هـات ﴿٤١﴾ (بـەڵام ئـەوان) هەمـوو نیشـانەکانمانیان بـەدرۆ دانـان، بۆیـە ئێمـەش (سـزامان دان و) گرتمانـن، گرتنـی زاڵێکـی توانـادار ﴿٤٢﴾}.



www.alibapir.com


## شیکردنەوەی هەندێک لە وشەکان

(وَٱزۡدُجِرَ): (الزَّجْرُ: طَرْدٌ بصَوْتٍ عَالٍ، زَجَرْتُهُ فَانْزَجَرَ، مُزْدَجَر: أَي طَرْدٌ ومَنْعٌ عَنْ ارْتِكَابِ المَآثِم، ازْدُجِرَ: طُرِدَ ومُنِعَ)، (زَجْر): بە مانای دەرکردنە بە دەنگێکی بەرز، بە کوردیی دەڵێین: تێوەخوڕین، دەگوترێ: (زَجَرْتُهُ فَانْزَجَرَ)، تێوەم خوڕیی و ئەویش سڵەمیەوە، (مُزْدَجَرٌ)، بریتیە لە دەرکردن و ڕێ لێگرتن لە گوناهو خراپە، (وازْدُجِرَ)، (طُرِدَ): دەرکرا (مُنِعَ): ڕێی لێگیرا، یاخود بە مانای گەفی لێکراو هەڕەشەی لێکرا.

(مُّنۡهَمِرٖ): بە خورزەم هەڵڕژاو (الهَمْرُ: صَبُّ الدَّمْع وَالمَاءِ، يُقَالُ: هَمَرَهُ فَانْهَمَرَ)، (هَمْر): بریتیە لە هەڵڕشتنی فرمێسک یاخود ئاو، دەگوترێ: (هَمَرَهُ فَانْهَمَرَ)، ڕژاندیی ئەویش هەڵڕژا.

(وَفَجَّرۡنَا ٱلۡأَرۡضَ عُيُونٗا): واتە: زەوییمان بە سەرچاوان تەقاندەوە، (الْفَجْرُ: شَقُّ الشَّيءِ شَقّاً وَاسِعَاً، كَفَجْرِ الإنْسَانِ السِّكْرَ، وَسِكْرُ النَّهْرِ: مَا يُسَدُّ بِهِ)، (فَجْر): بریتیە لە لەتکردنی شتێک بە لەتکردنی فراوان، لێککردنەوە، وەک ئەوەکە مرۆڤ ئەوەی بناوانی ڕووبار و جۆگەلەی پێگرتوە، لایبەرێ و ئەگەر شەقی بکات، ئنجا ئاوەکە دێ، (سِكْر النهر) ئەوەی بەری جۆگاو ڕووباری پێ دەگیرێ.

(أَلۡوَٰحٖ): (وَاحِدُ أَلْوَاح السَّفِيْنَة: لَوْح، وَاللَّوْحُ: مَا يُكْتَبُ فِيْهِ مِنَ الخَشَبِ وَنَحْوِهِ)، (أَلْوَاح) تاکەکەی (لَوْح)ە، کە لێرەدا مەبەست پێی ئەو تەختانەیە کە کەشتییەکەی نووحیان لێ دروست بوو بوو، (لَوْح) بە هەر شتێ، دەگوترێ لەسەری بنووسرێ، لە تەختەو لە بەردی تەنک و لە هەر شتێکی دیکە، بەڵام لێرەدا مەبەست لە (أَلْوَاح)، ئەو تەختانەن کە کەشتییەکەی نووحیان لێ دروست بووە.

www.alibapir.com


(وَدُسُرٍ): (**جَمْعُ دِسَار: مِسْمَار، وَأَصْلُ الدَّسْرِ: الدَّفْعُ الشَّدِيْدِ بِقَهْرِ**)، (**وَدُسُر**) كۆی (**دِسَار**)ە، (**دِسَار**)یش، بە مانای (**مِسْمَار**)، بە كوردیی دەڵێین: بزمار، وشەی (**دَسْر**): لە ئەصڵدا بە مانای پاڵپێوەنانێكی بەهێزە، بزماریش كە دایدەكوتی، دەبێ بە قووەت دایكوتی، بەدڵنیاییش مەبەست پێی بزماری بچووك نەبووەو مەبەست پێی گوڵمیخی گەورە بووە، كە ئەو تەختانەی پێكەوە پێ بەستراون.

(كُفِرَ): (**كُفِرَ بِهِ، أو صَارَ مَكْفُوراً**)، (**كُفِرَ**)، واتە: بێبڕوایی بەرانبەر كرا، پێی بێبڕوا بوون، یاخود بەرانبەری سپڵە بوون، سپڵەیی بەرانبەر كرا، (**صَارَ مَكْفُوراً**)، سپڵە بەرانبەر كراو، یان بێبڕوایی بەرانبەركراو، بوو.

(مُّدَّكِرٍ): (**أَصْلُهُ مُذْتَكِر: أُبْدِلَت التَّاء دَالاً مُهْمَلَةً، وَكَذَا الذَّالُ المُعْجَمَةُ وَأُدْغِمَتْ فِيْهَا، وَادَّكَر أي: تَذَكَّر**)، (**مُدَّكِر**)، لە ئەصڵدا (**مُذْتَكِر**)ە، دوایی تائەكە بۆتە دالی بێ نوختە، هەروەها ذالەكەش كە نوختەی هەیە، ئەویش كراوە بە (ت)، دوایی هەردووكیان تێكدا دەغمكراون و سەرەنجام بۆتە (**وَادَّكَر**)، یانی: بیری هاتەوە، یان بیری كردەوە، كەواتە: (**فهل من مُدَّكِر!**)، یانی: ئایا كەس هەیە پەندی لێوەربگرێ، یاخود: بیربكاتەوە؟

(وَنُذُرِ): بە مانای (**إنْذَار**)ە، واتە: ورياكردنەوەو ترساندن، كە دەگونجێ چاوگ بێ، دەشگونجێ (**نُذُر**)، كۆی (**إنْذَار**) بێ، واتە: (**إنْذَارَات**)، واتە: وریاكردنەوەكان و ترساندنەكان.

(صَرْصَرًا): (**بَارِدَةٌ شَدِيْدَةُ الصَّوْت**)، (**رِيْحٍ صَرْصَرٍ**)، واتە: بایەكی بەهێزی زۆر ساردو زۆریش دەنگ بەهێز.

(نَحْسٍ): (**أي: الشُّؤْمِ وَالشَّرُّ**)، واتە: نەگبەت و بێ خێر.

(مُّسْتَمِرٍّ): (**أي: دَائِمُ الشُّؤْم، اسْتَمِرَّ عَلَيْهِم بِنُحُوسَتِهِ**)، ﴿فِي يَوْمِ نَحْسٍ مُّسْتَمِرٍّ﴾، لە ڕۆژێكدا كە نەگبەتییەكەی و بێ خێرییەكەی بەردەوام بوو، (**مُسْتَمِرّ**)، بەردەوام،

www.alibapir.com


یانی: نەگبەتییەکەی بەردەوام بوو، ڕۆژەکە تاکو کۆتایی بۆ ئەوان هەر نەگبەتیی و بێخێریی بوو.

(تَنزِعُ ٱلنَّاسَ): (**أي تَقْلَعُهُمْ مِنْ أَمَاكِنِهِم**)، خەڵکی لە شوێنەکانی خۆیان دەردەکێشاو هەڵدەقەند.

(أَعۡجَازُ نَخۡلٍ): بنکەکانی خورما، کۆتەرەکانی دار خورما، (**أَعْجَاز: جَمْعُ عَجُز: مُؤَخَّرُ الشَّيء**، ﴿أَعۡجَازُ نَخۡلٍ﴾: **أَصلُها، أي: النَّخْلِ مَا عَدَا الفُرُوع**)، (**أعْجَاز**) کۆی (**عَجُز**)ە، کە بە مانای دواوەی هەر شتێکە، بەشی کۆتایی، ﴿أَعۡجَازُ نَخۡلٍ﴾ واتە: قەدو بنکەکانی دارخورما، واتە: دارخورما بەبێ لق و پۆپەکانی.

(مُّنقَعِرٍ): (**قَعَرَ النَّخْلَ: قَلَعَهَا مِنْ أَصْلِهَا، وقَعَرَ البِئْرَ: وَصَلَ إلى قَعْرِهَا**)، (**قَعَرَ النَّخْلَ**)، دارخورمایەکەی لە ڕیشەوە هەڵکێشا (**وَقَعَرَ البِئْرَ**)، گەیشتە بنی بیرەکە، کەواتە: (**مُنْقَعِر**)، یانی: دەرکێشراو هەڵکێشراو لە ڕیشەوە.

(لِلذِّكۡرِ): (**ذَكَرَ الشَّيءَ يَذْكُرُهُ ذِكْراً وَذُكْراً وَذِكْرَى وَتَذْكَار: حَفِظَهُ وَاسْتَحْضَرَه وجَرَى عَلَى لِسَانه بَعْد نِسْيَانِه، وَذَكَر الله: أَثْنَى عَلَيْهِ، وَذَكَر النِّعْمَة: شَكَرَهَا**)، وشەی (**ذِكْر**)، بە چەند واتایەک دێ، (**ذَكَرَ الشَّيء يَذْكُرُهُ**)، باسی شتەکەی کرد، باسی دەکات، ئنجا (**ذِكْراً وَذُكْراً وَذِكْرى وَتَذْكَاراً**)، هەر چواریان چاوگن واتە: باسکردن، یان یاد کردن، (**ذَكَرَه يَذْكُرُه**)، یانی: (**حَفِظَه**)، بە مانای لەبەری کرد (**واسْتَحْضَرَه**)، بە مانای وەبیر خۆی هێنایەوە، یادی کردەوەو، بە مانای باسی کرد (**وَجَرَى عَلَى لِسَانِه**)، بە سەر زمانی خۆیدا هێنا، دوای ئەوەی لە بیری چوو بۆوە، (**ذَكَرَ الله**)، ستاییشی خوای کرد، (**وَذَكَر النِّعْمَة**)، سوپاسی چاکەو نیعمەتەکەی کرد.

(يَسَّرۡنَا): (**يَسَرَ الشَّيءُ يَيْسَرُ يُسْراً: أي سَهُلَ وَلَانَ وَانْقَاد**)، (**يَسَرَ الشَّيءُ**)، شتەکە، کارەکە ئاسان بوو و نەرم بوو و ملکەچ بوو، کەواتە: (**يَسَّرْنَا**)، یانی: (**سَهَّلْنَا**) ئاسانمان کرد، سێنامان کرد.

www.alibapir.com


(**وَسُعُرٍ**): (**سُعِرَ أي: جُنَّ وَهُوَ مَسْعُور: أي مَجْنُون، السُّعْرُ: الحَرُّ، والجُنُونُ وَالسُّعُوُر: الجُنُون**)، (**سُعِرَ**) یانی: (**جُنَّ**)، شێت بوو، (**وَهُوَ مَسْعُورٌ**)، یانی: (**مَجْنُون**)، ئەو شێتە، بەڵام (**سُعْر**)، بە زەنە (**سکون**)ی عەینەکە، بە مانای (**حَرّ**) گەرمیی دێ، هەروەها بە مانای شێتییش هەر دێ، بەڵام (**سُعُر**)، تەنیا بە مانای (**جُنُون**)، شێتیی، دێ.

(**أَشِرٌ**): (**أَشَرَ يَأْشَرُ أَشَرَاً أي: مَرِحَ وَنَشِطَ وَبَطِرَ وَاسْتَكْبَر، فَهُوَ أَشِرٌ**)، (**أشِر**)، خۆپەسند، خۆ بەزلگر، چونکە (**أَشَرَ يَأْشَرُ أشَرَاً: أي مَرِحَ وَنَشِطَ**)، زۆر دڵخۆش بوو، زۆر چالاک بوو، (**بَطِرَ وَاسْتَكْبَر**)، بوغرا بوو، خۆی بەزلگرت (**فَهُوَ أشِرٌ**)، ئەو بوغرایە، خۆپەسندە.

(**فَارْتَقِبْهُمْ**): چاوەڕێیان بکە، (**ارْتَقَبَ الشَّيءَ ورقَبَهُ وَتَرَّقَبَهُ: انْتَظَرَهُ**)، (**رَقَبَهُ**)، یانی: (**ارْتَقَبَهُ**)، چاوەڕێی کرد، چاوەڕوانیی کرد، (**ارْتَقَبَ الشَّيءَ وَتَرَّقَبَهُ**)، هەردووکیان بە یەک واتان: چاوەڕێی کرد، بەڵام (**فَارتَقِبْهُم**)، یانی: زۆر بەهێزەوەو بە گرنگیی پێدانەوە چاوەڕێیان بکە.

(**وَاصْطَبِرْ**): خۆڕاگربە (**الإصْطِبَارُ: الصَّبْرُ القَوِيُّ**)، (**إصْطِبَار**): بریتیە لە خۆڕاگرتنێکی بەهێز، (**وَهُوَ كَالإرْتِقَابِ أَقْوَى دَلاَلَةً أي: إصْبِر صَبْرَاً لاَ يَعْتَرِيهِ مَلَلٌ وَلاَ ضَجَر**)، وەک چۆن (**رَقَبَهُ**)، یانی: چاوەڕێی کرد، بەڵام (**ارتَقَبَهُ**)، زۆر بە گرنگیی پێدانەوەو، بە هێزەوە، چاوەڕێی کرد، بە هەمان شێوە (**صَبَر**)، یانی: خۆی ڕاگرت، بەڵام (**اصْطَبِر**)، واتە: زۆر بەقوەتەوە خۆی ڕاگرت، کەواتە: (**اصْطَبِر**)، یانی: زۆر بە گرنگیی پێدانەوەو بە هێزەوە، خۆڕاگر بە، مانایەکەی بەهێزترە، واتە: خۆڕاگربە، بە خۆڕاگرتنێک کە ماندوو بوون و، بێزاریی بەسەردا نەیەت.

(**شِرْبٍ**): (**الشُّرْبُ: المَاءُ يُشْرَبُ**)، (**شِرْب**): ئاوێکە دەخورێتەوە، (**النَّصِيبُ مِنَ المَاء المَشْرُوُب**)، بەشێک لە ئاوێک کە دەخورێتەوە، (**الشِّرْبُ: وَقْتُ الشُّرْبِ**)، کاتی خواردنەوەی ئاو، کەواتە: (**شرب**) بە سێ واتایان دێ:

أ- ئاوێک کە دەخورێتەوە.

www.alibapir.com


**ب-** بەشێک لە ئاو کە دەخورێتەوە.

**ج-** کاتی ئاو خواردنەوە.

(مُّحْتَضَرٌ): (**اسْمُ مَفْعُولٍ مِنَ الحُضُورِ ضِدُّ الغَيْبَةِ، وَالمَعْنَى: مُحْتَضَرٌ عِنْدَهُ فَحُذِفَ المُتَعَلِّقُ بِحِضُورِهِ**)، (**مُحْتَضَر**): ناوی بەرکار (**اسْم مَفْعُول**)ە، لە (**حُضُور**)ەوە هاتوە، (**حُضُور**)، یانی: ئامادەبوون، کە پێچەوانەی (**غَيْبَة**)ە، واتە: نادیار بوون، مانای (**مُحْتَضَر**)یش، واتە: لەلا ئامادەبوو.

(فَتَعَاطَىٰ): (**العَطْوُ: التَّنَاوُلُ وَالمَعَاطَاةُ: المُنَاوَلَةُ، وَالإِعْطَاء: الإِنَالَة**)، (**عَطْوُ**)، بریتیە دەست پێگەیاندن، (**مَعَاطَاة**)، پێدان، (**إِعْطَاء**)، واتە: (**إِنَالَة**)، ئەوەیە شتێک وە کەسێک بدەی.

(فَعَقَرَ): (**عَقَرْتُهُ: أَصَبْتُ عُقْرَهُ، أي: أَصْلَهُ، وَعَقَرْتُ البَعِيْرَ: نَحَرْتُهُ، وَانْعَقَرَ البَعِيرُ: ضُرِبَت قَوَائِمُهُ**)، (**عَقَرْتُهُ**)، واتە: (**أَصَبْتُ عُقْرَهُ**)، واتە: لەڕیشەیم دا (**عَقَرْتُ البَعِيْرَ: نَحَرْتُه**)، حوشترەکەم سەر بڕی (**وَانْعَقَرَ البَعِيْرُ**)، وشترەکە چوار پێکانی پەل کران، پەیکران، لە چوار پێی درا، بۆ ئەوەی بکەوێ.

(صَيْحَةً): (**صَاحَ: صَوَّتَ بِقُوَّةٍ، صَاحَ عَلَيْهِ: زَجَرَهُ وَنَهَرَهُ، الصَّيْحَة وَالصِّيَاح: النَّفْخُ فِي الصُّور**)، (**صَيْحَة**): بە مانای هاڕژن، دەنگێکی زۆر بێڕەزا، دێ: (**صَاح: صَوَّتَ بِقُوَّةٍ**)، هاواری بەهێزەوە، دەنگێکی بەهێزی هات، (**صَاحَ عَلَيْهِ**)، واتە: تێوەی خوڕیی و لێی تووڕە بوو، (**صَيْحَة**)ش، بە مانای هاوار کردن و هاڕژن و دەنگ و چریکەو، فوو بەصووڕدا کردنیش دێ.

(كَهَشِيمِ ٱلْمُحْتَظِرِ): (**هَشَمَ الشَّيءَ الأَجوفَ أَو اليَابِسَ هشْمَاً: كَسَرَهُ**)، شتێکی بۆش، یان شتێکی وشکی هاڕی تێکیشکاند (**الهَشِيْمُ: المَهْشُومُ المُتَكَسِّرَ**)، (**هَشِيْم**): لەسەر کێشی (**فَعِيْل**)ە، بەڵام بە مانای (**مَفْعُوْل**)ە، تێکشکێنراوی وردو خاشکراو.

(ٱلْمُحْتَظِرِ): ئاغەڵ دروستکەر یان خاوەن ئاغەڵ، (**حَظَرَ الرَّجُلُ يَحْظُرُ حَظْرَاً**

www.alibapir.com


**وَحِظَـارَاً: إتَّخَـذَ حَظِـيْرَةً**)، (**حَظَـرَ الرَّجُـلُ**)، پیاوەکـە ئاغەڵـی دروسـتکرد (**حَظَـرَ الرَّجُـلُ يَحْظُرُ حَظْـرَاً وَحِظَـارَاً**)، (**حَظْـرَاً وَحِظَـارَاً**)، هەردووکیـان چاوگـن (**إتَّخَـذَ حَظِـيْرَةً**)، (**حَظِيْرَة**) ی دروسـتکرد، (**حَظِـيْرَة**)، چییـە؟ (**الحَظِـيْرَةَ: المَوْضِـعُ يُحـاطُ عَلَيْـهِ لِتَـأْوِيَ إلَيْهَـا المَاشِـيَةُ تَقِيْهَـا مِـنَ الـبَرْدِ وَالرِّيـحِ**)، (**حَظِـيْرَة**): بریتیـە لـە شـوێنێک دەورە بـدرێ، بـۆ ئـەوەی ئـاژەڵ بیچنەتـێ، (**خطـيرة**) ئـەو چـوار دیوارەیـە، کـە ئاغەڵـی پـێ دەڵێـن و ئـاژەڵان لـە سـەرماو لـە بـاو، ئەوانـە بپارێـزێ.

(حَاصِبًا): (**حَاصِـب: ذُو حَصْبَـاء، وَالرِّيْـحُ الشَّـدِيْدَةُ تَحْمِـلُ الحَصْبَـاء**)، (**حَاصِـب**): بـە مانـای خـاوەن (**حَصْبَـاء**)ە، (**حَصْبَـاء**)ش، یـانی: وردە بـەردو چـەو، کەواتـە: (**حَاصِـب**)، بایەکـی بەهێـزە کـە وردە بـەردو چـەو لەگـەڵ خـۆی دا ڕادەماڵـێ و فڕێیـان دەدات.

(بِسَحَرٍ): (**السَّـحَرُ: آخِـرُ اللَّيْـل قُبَيْـل الفَجْـرِ**)، (**سَـحَرْ**): بریتیـە لـە کۆتایـی شـەو پێـش بەرەبەیان.

(بَطْشَتَنَا): (**البَطْـش: الأَخْـذُ بِعُنـفٍ**)، (**بَطْـش**): بریتیـە لـە گرتنێکـی بەهێـز، پەلامـاردان، (**وَبَطَـشَ بِـهِ: أَمْسَـكَهُ بِقُـوَّةٍ**)، زۆر بـە توندیـی گـرتی.

(فَتَمَارَوْا): (**تَمَـارَى القَـوْمُ: تَجَادَلُـوا، وَتَمَـارَى فِـي الـشَّيءِ: شَـكَّ فِيْـه، وَالمِرْيَـةُ: الجَـدَلُ أو الشَّـكّ**)، (**تَمَـارَى القَـوْمُ**)، کۆمەڵەکـە پێکـەوە شـەڕە قسـەو مشـتومڕیان کـرد، بـەڵام (**تَمَـارَى فِـي الـشَّيءِ: شَـكَّ فِيْـه**)، تێیـدا دوو دڵ بـوو، چونکـە (**مِرِيَـة**): بـە مانـای دوو دڵیـی دێ و، بـە مانـای مشـتومڕیش دێ، بـەڵام (**فَتَـمَارَوْا بِالنُّـذُر**)، واتـە: تێیـدا دوو دڵ بـوون، لـە ترسـاندنەکاندا دوو دڵ بـوون، دەشـگونجێ بـە مانـای ئەوەبـێ: شـەڕە قسەیان لە بارەی ترساندنەکانی لووطەوە ﷺ کرد.

(رَاوَدُوهُ عَن ضَيْفِهِۦ): داوای تەسـلیمکردنی میوانەکانیـان لێکـرد، (**رَاوَدَهُ: خَادَعَـهُ وَرَاوَغَـهُ**)، ویسـتی فێڵـی لـێ بـکات و بـە پەنـاو پەسیواندا بـۆی بـێ، (**رَاوَدَ المَـرْأَةَ عَـنْ نَفْسِـهَا: طَلَـبَ أَنْ يَفْجُـرَ بِهَـا**)، داوای لـە ئافرەتەکـە کـرد خراپـەی لەگـەڵ بـکات، (**رَاوَدَهُ عَـنِ الأمْـرِ: دَارَاهُ وَطَلَـبَ مِنْـهُ فِعْلَـه**)، (**راوده**) یـانی: لـە بـارەی ئـەو کارەوە، مـودارای

لەگەڵدا کردو داوای لێکرد بیکات، کەواتە: (**رَاوَدُوهُ عَنْ ضَيْفِهِ**)، واتە: ویستیان بە فێڵ، یان بە شێوەیەکی ناڕەوا لووط ئیقناع بکەن و میوانەکانیان تەسلیم بکات، نەیانزانیوە کە فریشتەن و هاتوونە سەر شێوەی گەنجی جوان، تەماعیان تێکردوون، خراپەیان لەگەڵدا بکەن.

(فَطَمَسْنَآ أَعْيُنَهُمْ): چاویانمان سڕینەوە، (**طَمَسَهُ، أي: شَوَّهَهُ وَمَحَاهُ وَأَزَالَهُ**)، (**طَمْس**): بە مانای شێواندن و سڕینەوەو لابردن دێ، کەواتە: (**فَطَمَسْنَا أَعْيُنَهُم**)، چاوەکانیانمان سڕینەوە، لامانبردن و شێواندمانن.

(صَبَّحَهُم): (**أَتَاهُمْ وَقْتَ الصَّبَاحِ**)، لە کاتی بەرەبەیاندا بۆیان هات، سزایان بۆ هات.

(بُكۡرَةً): (**أي: أَوَّلُ النَّهَارِ**)، (**بُكْرَة**)، سەرەتای ڕۆژە.

(مُّقۡتَدِرٍ): (**قَوِيُّ الْقُدْرَة**)، زۆر بە توانا، توانادار.

لە تۆڕە کۆمەڵایەتییەکان لەگەڵتانین
Stay in touch on social media
نحن معكم عبر مواقع التواصل الاجتماعي
ڕاگەیاندنی مەکتەبی مامۆستا عەلی باپیر
AliBapir/عەلی باپیر
archive.org/details/@alibapir
AliBapir/عەلی باپیر
AliBapir
کەناڵی ڕاگەیاندنی مەکتەبی مامۆستا عەلی باپیر
www.alibapir.net
کوردی - عربي - English
ڕاگەیاندنی مەکتەبی مامۆستا عەلی باپیر

www.alibapir.com


## ماناى گشتيى ئايەتەكان

ئەو سى و چوار (٣٤) ئايەتە موبارەكە، مانا گشتييەكەيان هەر بە خێرايى دەكەين، چونكە وەک گوتمان: هەر كام لەم پێنج بەسەرهاتەى لێرەدا هاتوون: بەسەرهاتى نووح ﷺ وگەلەكەى و،بەسەرهاتى هوود ﷺ وگەلەكەى عادو،بەسەرهاتى صالْيح ﷺ وگەلەكەى ثەموودو،بەسەرهاتى لووط ﷺ وگەلەكەى و،بەسەرهاتى مووساو هاڕوون (عَلَيْهِما الصَّلاةُ وَالسَّلَام)و گەلەكەى خۆيان، بەنوو ئيسرائيل و، فيرعەون و دارو دەستەكەى، لە چەند شوێنێكى تايبەتدا، ئەو بەسەرهاتانەمان بە درێژيى باسكردوون، بۆيە لێرەدا بە خێرايى بەسەرياندا ڕەت دەبين.

﴿كَذَّبَتْ قَبْلَهُمْ قَوْمُ نُوحٍ فَكَذَّبُوا۟ عَبْدَنَا وَقَالُوا۟ مَجْنُونٌ وَٱزْدُجِرَ﴾، لە پێش ئەواندا واتە: لە پێش كۆمەڵگاى پێغەمبەرى خوادا ﷺ لە پێش بێبڕوايەكانى ڕۆژگارى پێغەمبەردا ﷺ، گەلى نووحيش بە درۆيان دانا، واتە: پەيامەكانى خوايان بە درۆ دانان، ﴿فَكَذَّبُوا۟ عَبْدَنَا﴾، بەندەكەى ئێمەيان بە درۆ دانا، پێى بێبڕوا بوون، ﴿وَقَالُوا۟ مَجْنُونٌ وَٱزْدُجِرَ﴾، گوتيان: شێتەو، دەستى لێوەشێنراوە، ياخود گوتيان: شێتەو، گەف و هەڕەشەيان لێ كردو ڕێگرييان لێكرد.

﴿فَدَعَا رَبَّهُۥٓ أَنِّى مَغْلُوبٌ فَٱنتَصِرْ﴾، ئەويش لە پەروەردگارى پاڕايەوە، بانگى پەروەردگارى كرد: من بێچارە و بێ دەستەڵاتم، تۆ سەرم بخە، ياخود تۆڵەم بۆ بكەوە.

﴿فَفَتَحْنَآ أَبْوَٰبَ ٱلسَّمَآءِ﴾، يەكسەر دەروازەكانى ئاسمان، دەروازەكانى سەرێمان كردنەوە، ﴿بِمَآءٍ مُّنْهَمِرٍ﴾، بە ئاوێكى هەڵڕژاو، بەلووزەو، بە خورزەم هەڵدەڕژا.

﴿وَفَجَّرْنَا ٱلْأَرْضَ عُيُونًا﴾، زەويشمان هەمووى بە كانيى و سەرچاوان تەقاندەوە، ﴿فَٱلْتَقَى ٱلْمَآءُ عَلَىٰٓ أَمْرٍ قَدْ قُدِرَ﴾، ئاوەكە لە حاڵەتێكدا كە ئەندازەگيريى كرا بوو،

www.alibapir.com


پێکگەیشت، واتە: ئاوی سەرێ کە هەڵدەڕژاو، ئاوی خوارێ کە دەردەقوڵی، ئەو دوو ئاوە یەکدییان گرتەوە، هەروەک یەک ئاو بووبن، چونکە دوای تێکەڵ بوونیان، هەمووی بووە یەک ئاو و، تۆفانی نووحی لێ پەیدا بوو.

﴿وَحَمَلْنَٰهُ عَلَىٰ ذَاتِ أَلْوَٰحٍ وَدُسُرٍ﴾، ئەویشمان هەڵگرت لەسەر خاوەنی تەختەکان و بزمارەکان، لەسەر شتێک کە خاوەنی تەختەو بزماران بوو، واتە: پێکهاتەکەی دوو شتی سەرەکیی بوون، تەختەدارو بزمار، بزماری گەورە، تەختەکانیان پێکەوە پێ بەسترابوون.

﴿تَجْرِى بِأَعْيُنِنَا﴾، بەچاوەکانی ئێمە دەڕۆیشت، واتە: لە ژێر چاودێریی ئێمەدا دەڕۆیی، بۆیەش (عَيْن) بە کۆ هاتوە، ﴿بِأَعْيُنِنَا﴾، واتە: ئێمە لە زۆر ڕووەوە، چاودێریی و سەرپەرشتیی نووح ﷺ و شوێنکەوتووانیمان دەکرد:

أ- لەو ڕووەوە کە سەلامەت بن.

ب- لەو ڕووەوە کە بێ ترس بن و دڵنیایان بکەینەوە.

ج- لەو ڕووەوە کە کەشتییەکە تێک نەشکێ.

د- لەو ڕووەوە کە دوژمنەکان لە بەین بچن و، هەتا دوایی، ﴿جَزَآءً لِّمَن كَانَ كُفِرَ﴾، ئەوەش هەمووی پاداشت بوو بۆ ئەو کەسەی بێبڕوایی بەرانبەر کرا بوو، یاخود سپڵەیی دەرهەق کرابوو، لە لایەن گەلە کافرەکەیەوە، واتە: پاداشت بۆ نووحی ﷺ سپڵەیی بەرانبەر کراو، یان بێبڕوایی بەرانبەر کراو.

﴿وَلَقَد تَّرَكْنَٰهَآ ءَايَةً فَهَلْ مِن مُّدَّكِرٍ﴾، بە دڵنیایی ئێمە کەشتییەکەمان، وەک نیشانەیەک بەجێهێشت، ئایا کەسی بیرکەرەوەو پەند وەرگر هەیە؟ ﴿فَكَيْفَ كَانَ عَذَابِى وَنُذُرِ﴾، ئنجا ئایا ئازاری من و، ئاگادارکردنەوەو ترساندنەکانی من، چۆن بوون؟ واتە: سەرەنجام و ئاکامەکەیان چۆن بوو؟ ﴿وَلَقَدْ يَسَّرْنَا ٱلْقُرْءَانَ لِلذِّكْرِ فَهَلْ مِن مُّدَّكِرٍ﴾، بە دڵنیایی قورئانیشمان بۆ لەبەر کردن و، بۆ لێ تێگەیشتن و، بۆ

www.alibapir.com


پەنـد لێوەرگرتـن، ئاسـانکردوە، ئنجـا ئایـا کەسـی لـێ تێگەیشـتوو و، بیـر کـەرەوە هەیـە، لێـی بەهرەمەنـد بـێ؟

ئنجا دێتە سەر باسی بەسەرهاتی هوود ﷺ و گەلەکەی عاد: ﴿ كَذَّبَتۡ عَادٞ ﴾، گـەلی عـاد بە درۆیان دانا، کێیان بـە درۆ دانا؟ هوودیان بە درۆ دانا ﷺ، بەڵام لەبـەر ئـەوەی لـە شـوێنەکانی دیکـە هاتـوە، لێـرە بـە پێویسـت نەزانـراوە، بـاس بکرێ، گـەلی عـاد هوودیـان بـە درۆ دانـاو پێـی بێبـڕوا بـوون، ﴿ فَكَيۡفَ كَانَ عَذَابِي وَنُذُرِ ﴾، ئنجـا ئایـا ئـازاری مـن و ترسـاندنەکانی مـن، سـەرەنجامەکەیان چـۆن بـوو؟ زۆر بێـڕەزا بـوو، ﴿ إِنَّآ أَرۡسَلۡنَا عَلَيۡهِمۡ رِيحٗا صَرۡصَرٗا فِي يَوۡمِ نَحۡسٖ مُّسۡتَمِرّٖ ﴾، ئێمـە بایەکـی زۆر بەهێـزی، زۆر سـاردی دەنـگ بەهێزمـان نـاردە سـەریان، لـە ڕۆژێکـی نەگبـەتی بەردەوامـدا، واتـە: ڕۆژەکـە نەگبەتیـی و بـێ خێرییەکـەی بـەردەوام بـوو، بـە نسـبەت ئەوانـەوە، ﴿ تَنزِعُ ٱلنَّاسَ ﴾، خەڵکەکـەی دەردەکێشـا لـە ڕیشـەوەی دەیهێنـان، ﴿ كَأَنَّهُمۡ أَعۡجَازُ نَخۡلٖ مُّنقَعِرٖ ﴾، وەک کۆتـەرە دارخورمـای لـە ڕیشـەوە دەرکێشراو و هەڵقەنـدراو، وا دەهاتنە بەرچـاو، واتـە: وەک چـۆن دارخورمـا لـق و پـۆپ و گەڵایەکـەی لـێ دەکرێتـەوەو، قەدەکـەی لـە زەوی دەردەکێشرێ و فـڕێ دەدرێ، ئەوانیـش بـەو شـێوەیە کەوتبـوون، ئـەوەش ئاماژەیـە بـەوە کـە ئـەوان خـاوەن کەلەشـی زل و قەبـە بـوون، ﴿ فَكَيۡفَ كَانَ عَذَابِي وَنُذُرِ ﴾، ئایـا ئـازاردانی مـن و ترسـاندنەکانی مـن، سـەرەنجامەکەیان چـۆن بـوو؟ بـە شـێوەیەک بـوو، کـە نایەتـە وەصفکـردن.

﴿ وَلَقَدۡ يَسَّرۡنَا ٱلۡقُرۡءَانَ لِلذِّكۡرِ ﴾، دووبـارەی دەکاتـەوە خـوای بـەرزی مـەزن: بـە دڵنیایـی قورئانمـان سـێنا کـردوە بـۆ خوێنـدن و لـێ تێگەیشـتن و، بـۆ پەنـد لـێ وەرگرتـن، ﴿ فَهَلۡ مِن مُّدَّكِرٖ ﴾، ئنجـا ئایـا کەسـی بیرکـەرەوەو پەندوەرگـر و ئامۆژگاریـی وەرگـر، هەیـە؟

دوایـی دێتـە سـەر باسـی بەسـەرهاتی ثەمـوود: ﴿ كَذَّبَتۡ ثَمُودُ بِٱلنُّذُرِ ﴾، گـەلی ثەموودیـش ترسـاندنەکان و وریاکردنەوەکانیـان بـە درۆ دانـان، ترسـاندنەکانی کـە صاڵیحی برایان ﷺ و پێغەمبەری خوا بۆی هێنابوون، ﴿ فَقَالُوٓاْ أَبَشَرٗا مِّنَّا وَٰحِدٗا نَّتَّبِعُهُۥٓ ﴾، گوتیـان: ئایـا دوای یـەک مـرۆڤ لـە خۆمـان بکەویـن؟ هەمـوو گەلـە

www.alibapir.com


کافرەکان ئەوەیان بە بیانوو گرتوە: چۆن دەبێ مرۆڤ ببێتە پێغەمبەر؟ بە زۆریی گوتوویانە: دەبێ پێغەمبەران فریشتە بن، یان گوتوویانە: بۆچی ئەوکەسە بۆتە پێغەمبەر، کە ئێمە لەو دەوڵەمەنترین و بە دەسەڵاتترین؟ چونکە خوا ﷻ پێغەمبەرانی (عَلَيْهِمُ الصَّلَاةُ وَالسَّلَام) لە خەڵکی ئاسایی و سادەو تێگەیشتوو ناردوون، پێغەمبەران لە زلە زلەکان و خۆ سەپێنەکان نەبوون، بەڵام خەڵکی مەعدەن پاک و چاک و، لە لووتکەی ڕەوشت بەرزیی و عەقڵ و تێگەیشتن دا بوون، بەڵام بە پێوەرو تەرازووی ئەوان، گوتوویانە: فڵانکەسی ئێمە کە سەرۆک عەشیرەتە، فڵانکەس کە گەورەیە، فڵانکەس کە دەوڵەمەنترە، ئەو شایستەترە، پێغەمبەر بێ! نەیانزانیوە لەلای خوا ﷻ پێوەر جۆرێکی دیکەیە، پێوەری خوا ﷻ تەماشای مەعدەن و نێوەڕۆک و چییەت و کەسایەتیی مەعنەویی مرۆڤەکان دەکات، نەک تەماشای سەروەت و سامان و دەستەڵاتێک کە بە زەبرو زۆرو بە حەرامیی، وەسەرێک نراوە، یان بە خۆسەپاندن پەیدا کراوە، ئەوە لەلای خوا هیچ ئیعتیبارێکی نیە، بەڵکو بە گوناهو تاوان لە قەڵەم دەدرێ.

ئنجا گوتیان: ﴿أَبَشَرًا مِّنَّا وَاحِدًا نَّتَّبِعُهُۥ﴾، ئایا یەک مرۆڤ لە خۆمان، شوێنی بکەوین؟ ﴿إِنَّآ إِذًا لَّفِى ضَلَٰلٍ وَسُعُرٍ﴾، ئەگەر وابکەین، کەواتە: ئێمە لە گومڕایی و لە شێتیی داین، یاخود لە مەینەتیی و ئازار داین، ﴿أَءُلْقِىَ ٱلذِّكْرُ عَلَيْهِ مِنۢ بَيْنِنَا﴾، ئایا لە نێو ئێمەدا بیرخەرەوە، ئامۆژگاریی، بەرنامەی خوا بۆ سەروی فڕێدراوە؟ ﴿بَلْ هُوَ كَذَّابٌ أَشِرٌ﴾، نەک خوا ﷻ ئەو چاکەو نیعمەتەی لەگەڵدا نەکردوە، بەڵکو ئەو درۆزنەو خۆ پەسەندو، خۆ بەزلگرە! ئەوان لە هەمبانەی خۆیاندا گوێزیان ژماردوە، خۆیان درۆزن بوون و، خۆ پەسەندو خۆ بەزلگر بوون، ویانزانیوە صالیحیش ؑ وەک ئەوانە، ﴿سَيَعْلَمُونَ غَدًا مَّنِ ٱلْكَذَّابُ ٱلْأَشِرُ﴾، خوا دەفەرموێ: بەیانی دەزانن واتە: لە کاتێکی زوودا دەزانن، کێ درۆزنەو کێ خۆپەسندە!

﴿إِنَّا مُرْسِلُوا۟ ٱلنَّاقَةِ فِتْنَةً لَّهُمْ فَٱرْتَقِبْهُمْ وَٱصْطَبِرْ﴾، ئێمە نێرەری حوشترەکەین، حوشترە تایبەتەکەین، وەک تاقیکردنەوە بۆ ئەوان، ئنجا چاوەڕێیان بکە، ئەی صالیح ؑ!

www.alibapir.com


زۆریش خۆڕاگربە، ﴿ وَنَبِّئْهُمْ أَنَّ ٱلْمَآءَ قِسْمَةٌۢ بَيْنَهُمْ ﴾، هەواڵیشیان پێ بدە، کە ئاوەکە لە نێوانیاندا دابەشەو دابەش دەکرێ، واتە: لە نێوان ئەوان و حوشترەکەدا، لە شوێنی دیکەدا هاتوە، کە حوشترەکە ڕۆژێک لە کانییەکە دەخواتەوەو، ئەوانیش ڕۆژێک لەو کانیی و سەرچاوەیان دەخۆنەوە، ﴿ كُلُّ شِرْبٍ مُّحْتَضَرٌ ﴾، هەر نۆرە ئاوێک لەلا ئامادەبوو دەبێ ﴿ مُّحْتَضَرٌ ﴾، ناوی بەرکار (**إسم مفعول**)ە، واتە: خاوەنەکەی خۆی ئەوەی نۆرەیەتی، لە لای ئامادە دەبێ و ئەوەی دیکە نایەت.

﴿ فَنَادَوْا۟ صَاحِبَهُمْ ﴾، هاوەڵەکەی خۆیانیان بانگ کرد، ﴿ فَتَعَاطَىٰ فَعَقَرَ ﴾، ئەویش دەستی پێکردو حوشترەکەی پەیکرد، واتە: چوار پەلی بڕی، یاخود سەری بڕی، ﴿ فَكَيْفَ كَانَ عَذَابِى وَنُذُرِ ﴾، ئنجا ئایا سزادانی من و ترساندنەکانی من کە بە صاڵیحدا ناردبوومان ﷺ ئاکام و سەرەنجامیان چۆن بوو؟ ﴿ إِنَّآ أَرْسَلْنَا عَلَيْهِمْ صَيْحَةً وَٰحِدَةً ﴾، ئێمە یەک هاڕژنی گەورەمان ناردە سەریان، ﴿ فَكَانُوا۟ كَهَشِيمِ ٱلْمُحْتَظِرِ ﴾، یەکسەر بوونە پووش و پەڵاشی تێکشکێنراوی بابای خاوەن ئاغەڵ، کە پووش و پەڵاش و کاو کۆت کۆ دەکاتەوە، بۆ ئاژەڵەکانی لە ئاغەڵەکەدا، بۆ ئەوەی بیخۆن، ئاوا بوونە پووش و پەڵاشێک کە دوای خورانی دەبێتە چەوەڵ، ﴿ وَلَقَدْ يَسَّرْنَا ٱلْقُرْءَانَ لِلذِّكْرِ فَهَلْ مِن مُّدَّكِرٍ ﴾، بە دڵنیایی قورئانمان ئاسانکردوە، بۆ لێتێگەیشتن و خوێندنەوەو لەبەر کردن و لێ بەهرەمەند بوون، ئنجا ئایا کەسی بیرکەرەوەو پەندوەرگر هەیە؟

ئنجا دێتە سەر باسی گەلی لووط: ﴿ كَذَّبَتْ قَوْمُ لُوطٍۭ بِٱلنُّذُرِ ﴾، گەلی لووطیش بێبڕوابوون بە ترساندنەکان، بە ئاگادارکردنەوەکان کە بە **لووطدا** ﷺ بۆمان نارد بوون، ﴿ إِنَّآ أَرْسَلْنَا عَلَيْهِمْ حَاصِبًا إِلَّآ ءَالَ لُوطٍ ۖ نَّجَّيْنَٰهُم بِسَحَرٍ ﴾، ئێمە بایەکی وردە بەرد فڕێدەرمان بۆ ناردن، بایەکی زۆر بەهێز کە وردە بەردو چەوی هەڵدەگرت و فڕێی دەدا، جگە لە نیزیکان و شوێنکەوتووانی لووط ﷺ کە بە سەحەر، پێش بەرەبەیان و لە کۆتایی شەودا، دەربازمان کردن، ﴿ نِّعْمَةً مِّنْ عِندِنَا ﴾، ئەوەش چاکەیەک بوو لە لایەن ئێمەوە، ﴿ كَذَٰلِكَ نَجْزِى مَن شَكَرَ ﴾، ئاواش پاداشتی کەسێک دەدەینەوە کە سوپاسگوزار بوو بێ، ﴿ وَلَقَدْ أَنذَرَهُم بَطْشَتَنَا ﴾،

www.alibapir.com



بە دڵنیایی لووطیش ﷺ لە زەبری ئێمە، وریای کردبوونەوەو هۆشداریی پێدابوون، ﴿ فَتَمَارَوۡاْ بِٱلنُّذُرِ ﴾، بەڵام ئەوان لە دوو دڵییدا بوون، لە ترساندنەکان و ئاگادارکردنەوەکان، یاخود مشتومڕیان کرد لە بارەی ئاگادارکردنەوەو ترساندنەکان.

﴿ وَلَقَدۡ رَٰوَدُوهُ عَن ضَيۡفِهِۦ ﴾، بە دڵنیایی ئەوان داوایان لێکرد، کە میوانەکانیان تەسلیم بکات، میوانەکان کە فریشتە بوون، لەسەر شێوەی گەنجی جوان، وایانزانی مرۆڤن، داوایان لێ کرد، تەسلیمیان بکات، بۆ ئەوەی خراپەیان لەگەڵ بکەن، ﴿ فَطَمَسۡنَآ أَعۡيُنَهُمۡ ﴾، ئێمەش چاوەکانیانمان سڕینەوە، کوێرو کوترمان کردن، ﴿ فَذُوقُواْ عَذَابِي وَنُذُرِ ﴾، پێشمانگوتن: بیچێژن ئازاری من و ترساندنەکانی من!

﴿ وَلَقَدۡ صَبَّحَهُم بُكۡرَةً عَذَابٞ مُّسۡتَقِرّٞ ﴾، بەیانی زوو سزاو ئازارێکی چەسپاو، ملی گرتن، بەسەریاندا هات، ﴿ فَذُوقُواْ عَذَابِي وَنُذُرِ ﴾، (پێمانگوتن:) بیچێژن ئازاری من و ترساندنەکانی من! ﴿ وَلَقَدۡ يَسَّرۡنَا ٱلۡقُرۡءَانَ لِلذِّكۡرِ فَهَلۡ مِن مُّدَّكِرٖ ﴾، بە دڵنیایی قورئانیشمان بۆ خوێندنەوە، بۆ لێتێگەیشتن، بۆ پەند لێوەرگرتن، ئاسانکردوە، ئایا کەسی بیرکەرەوەو پەند لێوەرگر هەیە؟!

ئنجا لە کۆتایی دا باسی فیرعەون و گەلەکەی دەکات: ﴿ وَلَقَدۡ جَآءَ ءَالَ فِرۡعَوۡنَ ٱلنُّذُرُ ﴾، بە دڵنیایی ترساندنەکان، هۆشدارییەکان {لە ڕێی مووسا ﷺ و، هاڕوونی برایەوە ﷺ} بۆ فیرعەون و دارو دەستەکەی بۆ نزیکانی فیرعەون و شوێنکەوتووانی فیرعەونیش چوون، ﴿ كَذَّبُواْ بِـَٔايَٰتِنَا كُلِّهَا ﴾، کەچی هەموو نیشانەکانی ئێمەیان بە درۆ دانان، کە مووسامان ﷺ وەک خوا لە سوورەتی (**الإسراء**)داو، لە سوورەتی (**النمل**)دا، فەرموویەتی: بە نۆ نیشانەی گەورەوە ناردبوومان: ﴿ وَلَقَدۡ ءَاتَيۡنَا مُوسَىٰ تِسۡعَ ءَايَٰتِۭ بَيِّنَٰتٖ ﴾**الإسراء**، نۆ نیشانەی ڕۆشنمان نۆ موعجیزەمان بە مووسا دابوون، بەڵام ئەوان هەموویانیان بە درۆ دانان، ﴿ فَأَخَذۡنَٰهُمۡ أَخۡذَ عَزِيزٖ مُّقۡتَدِرٍ ﴾، ئێمەش گرتمانن، گرتنی باڵادەست و زاڵێکی زۆر خاوەن توانا، واتە: وامانگرتن شایستەی ئێمە بێ، مەبەست لە گرتنیش لێرەدا سزادانە.

www.alibapir.com



مەسەلە گرنگەکان

## مەسەلەی یەکەم:

**بەسەرهاتی نووح ﷽ و گەلەکەی و، بەدرۆدانانی گەلی نووح بۆ پێغەمبەرەکەیان، نووح ﷽ و، تۆمەتبار کردنی بە شێتیی و، ڕێ لێگرتنی و، گەف لێکردنی، ئنجا پاڕانەوەی نووح لە خوا ﷽: بۆ سەرخستنی و تۆڵە ستاندنەوەی لە ناحەزەکانی و، سەرەنجام فەرمانکردنی خوا ﷽ بە کرانەوەی دەروازەکانی ئاسمان و هەڵڕژانی ئاوی بە خوڕو، دەرقوڵینی کانیی و سەرچاوە زۆرەکانی زەویی و، دەرباز کرانی نووح و ﷽ شوێنکەوتووانی (خوا لێیان ڕازی بێ)، لە کەشتییەکی لە تەختەکان و لە بزماران دروستکراوو، هێشتنەوەی ئەو کەشتییە، وەک نیشانەیەکی گەورە بۆ مرۆڤایەتیی و، ئاسانکردنی قوڕئانیش بۆ خوێندن و لەبەرکردن و لێتێگەیشتن:**

خوا دەفەرمووێ: ﴿كَذَّبَتْ قَبْلَهُمْ قَوْمُ نُوحٍ فَكَذَّبُوا عَبْدَنَا وَقَالُوا مَجْنُونٌ وَازْدُجِرَ ﴿٩﴾ فَدَعَا رَبَّهُ أَنِّي مَغْلُوبٌ فَانتَصِرْ ﴿١٠﴾ فَفَتَحْنَا أَبْوَابَ السَّمَاءِ بِمَاءٍ مُّنْهَمِرٍ ﴿١١﴾ وَفَجَّرْنَا الْأَرْضَ عُيُونًا فَالْتَقَى الْمَاءُ عَلَىٰ أَمْرٍ قَدْ قُدِرَ ﴿١٢﴾ وَحَمَلْنَاهُ عَلَىٰ ذَاتِ أَلْوَاحٍ وَدُسُرٍ ﴿١٣﴾ تَجْرِي بِأَعْيُنِنَا جَزَاءً لِّمَن كَانَ كُفِرَ ﴿١٤﴾ وَلَقَد تَّرَكْنَاهَا آيَةً فَهَلْ مِن مُّدَّكِرٍ ﴿١٥﴾ فَكَيْفَ كَانَ عَذَابِي وَنُذُرِ ﴿١٦﴾ وَلَقَدْ يَسَّرْنَا الْقُرْآنَ لِلذِّكْرِ فَهَلْ مِن مُّدَّكِرٍ ﴿١٧﴾﴾

## شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە پازدە بڕگەدا:

وەک پێشتریش گوتمان: ئێمە هەم لە مانای گشتیی ئەم سی و چوار ئایەتەدا، کە بەسەرهاتی پێنج لە پێغەمبەران (عَلَيْهِمُ الصَّلَاةُ وَالسَّلَامُ)و، گەلە یاخییەکانیان دەگرنە نێو خۆیان، هەم لێرەش لە مەسەلە گرنگەکان دا، ناچینە نێو وردەکارییەکانی بەسەرهاتی نووح ﷽ و گەلەکەی، هەروەها بەسەرهاتەکانی

www.alibapir.com



دیکەش، بەڵکو بایی ئەوەندەی لە ئایەتەکان، بە وردیی تێبگەین، شەرح و تەفسیری ئایەتەکان دەکەین، چونکە بەسەرهاتی هەر کام لەو پێغەمبەرانەمان (عَلَيْهِمُ الصَّلاَةُ وَالسَّلاَم) لە شوێنی دیکەی تەرخانکراودا، کە پێشتر ئاماژەمان پێداوە، باسکردوون.

**١)-** ﴿كَذَّبَتْ قَبْلَهُمْ قَوْمُ نُوحٍ﴾، لە پێش ئەواندا، گەلی نووح بە درۆیان دانا، **(هم)**ی **(قبلهم)** ئەو ڕاناوە بەپێی سیاق دەزانرێ کە بۆ کۆمەڵگای پێغەمبەر ﷺ دەچێتەوە، واتە: لە پێش ئەو کۆمەڵگایەی تۆشدا، کە تۆ بە درۆ دادەنێن و تۆمەتبارت دەکەن، بە جادووگەریی و شێتیی و شاعیریی و فاڵچیەتیی، گەلی نووحیش لە پێش ئەواندا و زۆر لە ڕۆژگارانی پێشوودا، بە درۆیان دانا، دیارە بەرکارەکەی قرتێنراوە، لەبەر ئەوەی بە سیاق و سەلیقە دەزانرێ، یانی: **(كَذَّبَت قَبْلَهُم قَوْمُ نُوحٍ نُوحَاً)**، کۆمەڵگاو گەلی نووح، نووحیان بە درۆ دانا، یاخود پەیامێک کە خوا ناردبووی، بە نووحدا، بە درۆیان دانا، هەڵبەتە گەلی نووح، بۆیە بە ناوی نووحەوە هەڵدراون، چونکە ناوێکی دیکەیان نەبووە، پێی بناسرێن، هەروەها گەلی لووطیش وەک دوایی دەیگەینێ بە هەمان شێوە، واتە: ئەو کۆمەڵگایانەی هیچ ناوێکی دیکەیان نەبووە، بۆ وێنە: وەک گەلی عادو، گەلی ثەموودو، گەلی مەدیەن، ئەوانەی ناوێکی ناسراو و باویان نەبووە، بۆیە خوای تاک و پاک هەر بە ناوی پێغەمبەرەکەیانەوە هەڵیان دەدات.

**٢)-** ﴿فَكَذَّبُوا عَبْدَنَا﴾، بەندەکەی ئێمەیان بە درۆ دانا، مەبەست (بەندەکەمان) نووحە بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ زانایان لەو بارەوە: ئایا بۆچی لێرەدا خوا بسم الله الرحمن الرحيم دووجاران وشەی **(كذّب)**ی هێناوە: ﴿كَذَّبَتْ قَبْلَهُمْ قَوْمُ نُوحٍ فَكَذَّبُوا عَبْدَنَا﴾؟ زۆریان قسە کردووەو بەگشتیی سێ وەڵامیان داونەوە:

**وەڵامی یەکەم:** هەندێک گوتوویانە: هی پێشێ، مەبەست پێی ئەوە بووە، کە قەناعەت و بڕوایان وابووە، نووح درۆ دەکات و ڕاست ناکات، حاشای نووح بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ.

هی دواییش مەبەست پێی ئەوەیە، کە ئەو قەناعەتەی بوویانە، ئاشکرایان کردووە.

www.alibapir.com


**وەڵامی دووەم:** هەندێکی دیکە گوتوویانە: ﴿كَذَّبَتْ قَبْلَهُمْ قَوْمُ نُوحٍ﴾، لە پێش ئەواندا گەلی نووح بە درۆیان دانا، یانی:(**كذبت قبلهم قوم نوح كلّ رسولٍ لِلّه**) یان (**كلَّ رسالات الله**) یانی: هەموو پێغەمبەرانی خوا، یان هەموو پەیامەکانی خوایان بە درۆ دانان، بەڵام هی دووەم کە دووبارەی دەکاتەوە: ﴿فَكَذَّبُواْ عَبْدَنَا﴾، بەندەکەی ئێمە کە نووحە ﷺ بە درۆیان دانا.

لە سووڕەتی (**الشعراء**)یش دا خوای زاناو شارەزا ئەوە زۆر دووبارە دەکاتەوە: ﴿كَذَّبَتْ عَادٌ ٱلْمُرْسَلِينَ ۝١٢٣﴾، ﴿كَذَّبَتْ ثَمُودُ ٱلْمُرْسَلِينَ ۝١٤١﴾، بێگومان هەر کامێک لەو گەلانە، یەک پێغەمبەریان بۆ هاتووەو بەس ئەویان بە درۆ داناوە، بەڵام لەبەر ئەوە پەیامی پێغەمبەران هەمووی لە نێوەڕۆکدا، یەکێکە، هەر کامێکیان، یەکێک لە پێغەمبەرانی بە درۆ دانابێ، مانای وایە هەموویانی بە درۆ داناوە، هەر بۆیەش ئەو جوولەکەو نەصرانییانەی بڕوا بە پێغەمبەری کۆتایی موحەممەد ﷺ ناهێنن، وەک بڕوایان بە مووساو عیساش نەهێنا بێ، چونکە مووساو عیسا (**عَلَيْهِما الصَّلَاةُ وَالسَّلَام**) هەواڵیان داوە بە گەلەکانی خۆیان، کە دوای ئەوان پێغەمبەری کۆتایی دێ، لە ئاخیر زەماندا، لە کۆتایی هەموو پێغەمبەران، یەک پێغەمبەر دێ و، دوای ئەو هیچ پێغەمبەری دیکە نایەن و، بڕوای پێ بێنن!

**وەڵامی سێیەم:** هەندێکیش گوتوویانە: بۆیە دووبارە بۆتەوە (**لإفَادَةِ تَوْكِيدِ التَّكْذِيب، مِثْلُ قَوْلِهِ تَعَالَى:** ﴿وَإِذَا بَطَشْتُم بَطَشْتُمْ جَبَّارِينَ ۝١٣٠﴾**الشعراء**، بۆ گەیاندنی جەختکردنەوەیە، وەک خوا فەرموویەتی: ﴿وَإِذَا بَطَشْتُم بَطَشْتُمْ جَبَّارِينَ ۝١٣٠﴾**الشعراء**، ئەگەر زەبرتان وەشاند، ملهوڕانە زەبر دەوەشێنن.

**٣)-** ﴿وَقَالُواْ مَجْنُونٌ وَٱزْدُجِرَ﴾، گوتیشیان: شێتەو گەفیشی لێکرا، ئنجا کە بە درۆیان دانا، دەبێ پاساوێک بێننەوە بۆ بە درۆ دانانەکەیان و بڕوا پێ نەهێنانەکەیان، بۆیە بە دووشتان تۆمەتباریان کرد، ﴿وَقَالُواْ مَجْنُونٌ وَٱزْدُجِرَ﴾، ئەم ڕستەیە دوو واتای هەن:

www.alibapir.com


**أ-** گوتیان: شێتەو دەستی لێوەشێنراوە، یانی: لەلایەن شەیتانەکانەوە هەڕەشەی لێکراوەو گەفی لێکراوەو تێکدراوە.

**ب-** یاخود: (**وَازْدُجِر**)، یانی: وێڕای ئەوەی تۆمەتباریان کرد بە شێتیی، گەف و هەڕەشەشی لێکرا، یان: ڕێشی لێگیرا، چونکە وەک پێشتر باسمان کرد: (**إِزْدِجَار**)، (**افْتِعَال**)ە، لە (**زَجَر: أي: هُدِّدَ وَمُنِعَ**)، هەڕەشەی لێکرا و ڕێی لێگیرا، کە پەیامی خوا بگەیەنێ، ئەمە هەمووی لێرەدابۆ دڵدانەوەی پێغەمبەری خاتەمە ﷺ بەوە کە تەنیا گەلەکەی تۆ نین، تۆ بە درۆ دادەنێنن، لەگەڵ ئەوەشدا تۆ لە لووتکەی ڕاستیی و پاکیی و ئەمینیی دای، بەڵکو ئەوەتا لە پێش ئەواندا گەلی نووحیش هەروا بووە، دوایی باسی کۆمەڵگایەکانی دیکەش دەکات، کەواتە: دڵت لە خۆت دانەمێنێ و، بزانە کە هەر ئەوە عادەت و نەریتی کۆمەڵگا بێبڕوایەکان بووە، کاتێک کە خوا پێغەمبەرانی (**عَلَيْهِمُ الصَّلاَةُ وَالسَّلاَم**) بۆ ناردوون، پێیان بێبڕوا بوون، دواییش بۆ پاساو دانەوەی بێبڕواییەکەی خۆیان، تۆمەتباریان کردوون بە چەند شتێک، کە ئەو پێغەمبەرانە (**عَلَيْهِمُ الصَّلاَةُ وَالسَّلاَم**) لە هەموو کەس لێیان دوورتر بوون، بەڵام بۆ چەواشەکردنی خەڵکەکەی خۆیان، دەبووایە شتێک هەر بڵێن.

٤)- ﴿فَدَعَا رَبَّهُۥٓ أَنِّي مَغْلُوبٌ فَٱنتَصِرْ﴾، لە پەروەردگاری پاڕایەوە، کەمن بێچارەم سەرم بخە! (**ف**)، کە چۆتە سەر (**دَعَا**)، ﴿فَدَعَا رَبَّهُۥٓ﴾، (**تَفْرِيْعٌ عَلَى السَّابِق**)، هەڵچنراوە لەسەر قسەی پێشوو، لقێکە لەوێ دەبێتەوە، یانی: لە ئەنجامی ئەوەدا، کە ئەوان وایانگوت، ئەویش لە پەروەردگاری پاڕایەوەو، پەروەردگاری بانگ کرد، ﴿أَنِّي مَغْلُوبٌ فَٱنتَصِرْ﴾، پاڕانەوەکەشی ئەوە بوو: من تێکشکاوم، بێچارەم، یارمەتییم بدە! (**فانْتَصِر**)، یانی: (**فَانْتَصِر لِي**)، ئەمیش دوو واتای هەن:

**أ-** (**انْصُرْنِي**) سەرم بخەو، پشتم بگرە.

**ب-** (**انتقم لي**) تۆڵەم بۆ بستێنەوە، لەوانەی بە ناهەق تۆمەتبارم دەکەن و دژایەتییم دەکەن.

www.alibapir.com


٥)- ﴿فَفَتَحۡنَآ أَبۡوَٰبَ ٱلسَّمَآءِ بِمَآءٖ مُّنۡهَمِرٖ﴾، یەکسەر دوای پاڕانەوەکەی وی دەروازەکانی ئاسمانمان کردنەوە بە ئاوێکی هەڵڕژاو. (ف) کە چۆتە سەر (فَتَحْنَا)، دوو ئەگەری هەن:

أ- (فَاء التَّعْقِيْب)ە، واتە: یەکسەر بە دوای پاڕانەوەکەی ئەودا، ئێمەش دەروازەکانی ئاسمانمان کردنەوە بە ئاوێکی هەڵڕژاو، بە ئاوێکی بە خورزەم و لووزەو، کە لەسەرێوە دەهاتە خوار.

ب- یاخود ئەویش بۆ (تَفْرِيْع)ە، واتە: بینا لەسەر ئەوەی ئەو پاڕایەوە، ئێمەش دەروازەکانی ئاسمانمان بە ئاوێکی هەڵڕژاو کردنەوە.

﴿بِمَآءٖ مُّنۡهَمِرٖ﴾، (المُنْهَمِر المُصَبَّب)، هەڵڕژاو بە خورزەم، یان بە خوڕ داباریو، ئنجا کە خوا ﷻ باسی کردنەوەی دەرگاکانی ئاسمان دەکات، ئەمە وێنە هێنانەوەیەکە بەوە، کە ئەو ئاوە وەک سوپایەک وابێ، لە پشت دەروازەوە، چاوەڕێ بن، دەروازە بکرێتەوەو ئەوانیش هێرش بێنن.

٦)- ﴿وَفَجَّرۡنَا ٱلۡأَرۡضَ عُيُونٗا﴾، زەوییشمان هەمووی بە سەرچاوان تەقاندەوە، (التَّفْجِير: إِسَالَةُ المَاءِ تَفَجَّرَ المَاءُ، أي: سَالَ)، (تفجير)، بە مانای ڕژاندنی ئاوە، (تَفَجَّر المَاءُ، أي سَال المَاء)، ئاوەکە ڕژا.

٧)- ﴿فَٱلۡتَقَى ٱلۡمَآءُ عَلَىٰٓ أَمۡرٖ قَدۡ قُدِرَ﴾، ئاوەکە پێکگەیشت، بە شێوەیەک کە پێشتر ئەندازەگیریی کرابوو. کە دەفەرموێ: ﴿فَٱلۡتَقَى ٱلۡمَآءُ﴾، بێگومان دوو ئاو بوون: ئاوی سەرێ و ئاوی خوارێ، بەڵام بۆیە خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿فَٱلۡتَقَى ٱلۡمَآءُ﴾، ئاوەکە پێکگەیشت، چونکە سەرەنجام بۆتە یەک ئاو، یاخود هەر یەک جۆرە ئاو بووە، ئەوەی لەسەرێ داباریوەو ئەوەی لە خوارێوە دەرقوڵیوە، هەمووی هەر یەک ئاو بووە، لە ڕیشەو چییەت دا، دواییش هەمووی بۆتە یەک شت، کە بریتی بووە لەو لافاوو تۆفانەی نووح ﷺ. کە دەفەرموێ: ﴿فَٱلۡتَقَى ٱلۡمَآءُ﴾، ئاوەکە پێکگەیشت ﴿عَلَىٰٓ أَمۡرٖ قَدۡ قُدِرَ﴾، یانی: لەسەر حاڵێک و بە شێوەیەک کە پێشتر ئەندازەگیریی کرابوو.

www.alibapir.com



شارەزایانی زمانی عەرەبیی دەڵێن: بۆیە خوا ﷻ لێرەدا دەفەرموێ: ﴿فَٱلْتَقَى ٱلْمَآءُ﴾، چونکە ئەو دوو ئاوەی چوواندوون بە دوو کۆمەڵە سوپاوە، یەکێکیان لە لایەکڕا دێ و، ئەوی دیکەش لە لایەکی دیکەوە، دوایی هەردووکیان یەک دەگرن و یەک دەست دەبن، چونکە ئەو ئاوەی لەسەرێوە هەڵڕژاوەو ئەوەی لە زەویەوە دەرقوڵیوە، هەمووی بۆ یەک ئامانج بووە، ئەویش ئەوە بوو کە تۆفانێکیان لێ پێک بێ و ئەو خەڵکە یاخیی و سەرکەشەی گەلی نووح ﵇ کە نووحیان بە درۆ دادەناو بڕوایان پێ نەدەکرد، بەو تۆفانە بفەوتێن، کە لە نێویاندا ژنەکەشی بوو، هەروەها کوڕەکەشی بوو، کوڕەکەی لە سووڕەتی (**هود**)دا، باسکراوە: ﴿وَنَادَىٰ نُوحٌ ٱبْنَهُۥ وَكَانَ فِى مَعْزِلٍ يَٰبُنَىَّ ٱرْكَب مَّعَنَا وَلَا تَكُن مَّعَ ٱلْكَٰفِرِينَ ﴿٤٢﴾ قَالَ سَـَٔاوِىٓ إِلَىٰ جَبَلٍ يَعْصِمُنِى مِنَ ٱلْمَآءِ ۚ قَالَ لَا عَاصِمَ ٱلْيَوْمَ مِنْ أَمْرِ ٱللَّهِ إِلَّا مَن رَّحِمَ ۚ وَحَالَ بَيْنَهُمَا ٱلْمَوْجُ فَكَانَ مِنَ ٱلْمُغْرَقِينَ ﴿٤٣﴾﴾، لێرەدا باسی سەرەنجامی کوڕەکەی دەکات و، لە سووڕەتی (**التحريم**)یشدا، خوا ﷻ باسی هەرکام لە خێزانی نووح و لووط دەکات: ﴿ضَرَبَ ٱللَّهُ مَثَلًا لِّلَّذِينَ كَفَرُوا۟ ٱمْرَأَتَ نُوحٍ وَٱمْرَأَتَ لُوطٍ ۖ كَانَتَا تَحْتَ عَبْدَيْنِ مِنْ عِبَادِنَا صَٰلِحَيْنِ فَخَانَتَاهُمَا فَلَمْ يُغْنِيَا عَنْهُمَا مِنَ ٱللَّهِ شَيْـًٔا وَقِيلَ ٱدْخُلَا ٱلنَّارَ مَعَ ٱلدَّٰخِلِينَ ﴿١٠﴾﴾، لێرەدا کە نووح ﵇ لە خوا پاڕاوەتەوە: ﴿فَدَعَا رَبَّهُۥٓ أَنِّى مَغْلُوبٌ فَٱنتَصِرْ ﴿١٠﴾﴾، (**مَغْلُوبٌ**)، واتە: تێکشکاوو بێچارەو بێ دەستەڵات، لێرەدا نووح ﵇ نائومێدییەکەی خۆی لەوەدا کە وەڵامی بدەنەوەو بە دەنگیەوە بێن، چواندوە بە حاڵی جەنگاوەرێکەوە کە لەگەڵ دوژمنێکدا، دەستەو یەخە دەبێ و دوژمنەکەی زەفەری پێدەبات و بەڕوەستی[1] دوژمنەکەی و بەرانبەرەکەی نایەت، نووحیش دوای نۆ سەدو پەنجا ساڵ تێکۆشان. هەرماوە لە مەیداندا ئامادە نیە، مەیدان چۆڵ بکات، بۆیە پێویستیی بە هاوکاریی و یارمەتیی و پشتگیریی خوا هەیە ﷻ.

ئنجا ئایا کە ئەو ئاوە بەو شێوەیە هاتە خوارو ئەو تۆفانەی لێ دروست بوو، نووح ﵇ و شوێنکەوتووەکانی چارەنووسیان چۆن بوو؟

---

(١) بەڕوەستی نەهات: پێی نەوێرا.

www.alibapir.com


٨)- ﴿وَحَمَلْنَٰهُ عَلَىٰ ذَاتِ أَلْوَٰحٍ وَدُسُرٍ﴾، هەروەها ئەویشمان (نووحیشمان) هەڵگرت، لەسەر خاوەنی تەختەکان و بزمارەکان.

تەنیا لێرەدا خوا ﷻ کەشتییەکەی نووح، کە بە (فُلْك)یش ناوی هێناوە: ﴿ٱلْفُلْكِ ٱلْمَشْحُونِ ﴿٤١﴾﴾یس، هەروەها بە (سَفِيْنَة)ش ناوی هێناوە، ﴿فَأَنجَيْنَٰهُ وَأَصْحَٰبَ ٱلسَّفِينَةِ ﴿١٥﴾﴾العنكبوت، بەڵام لێرە بە: ﴿ذَاتِ أَلْوَٰحٍ وَدُسُرٍ﴾، وەسفی کردوە (ذَاتِ)، یانی: (صَاحِبة)، خاوەن، مێینەی مەجازییە، (ألْوَاح)، تەختەکان، کۆی (لَوْح)ە، کە بە مانای تەختە دێ، چ ئەو تەختەیەی کەشتیی لێ دروست دەکرێ، چ ئەوەی لەسەری دەنووسرێ، (دُسُر)یش کۆی (دَسَار)ە، واتە: بزمار، یاخود پەت و گوریسی بەهێز، هەندێکیش وایان لێکداوەتەوە، کەواتە: نووح ﷺ مان سواری خاوەن تەختەکان و بزمارەکان کرد، یانی: کەشتییەک کە پێکهاتبوو، لە تەختان و لە بزماران، کە تەختەکانیان پێکەوە بەستبوونەوە.

وای تێدەگەم کە لێرەدا خوا ﷻ دەیەوێ بۆمان باس بکات، کە کەشتییەکەی نووح لەچی پێکهاتوە؟ ئەمە ڕێنماییشە بۆ مرۆڤەکان کە کەشتیی ئا ئەوە پێکهاتە سەرەکییەکەیەتی، یەکەم: تەختەدارەکان. دووەم: بزمارەکان کە تەختەکان پێکەوە ببەستنەوە، یان (دُسُر) واتە: پەت و گوریسەکان، چونکە (دَسَار)، کە بە (دُسُر)، کۆدەکرێتەوە، هەم بەمانای بزمار دێ و، هەم بە مانای پەتێکی مەحکەم دێ، هەر شتێک کە تەختەکان پێکەوە ببەستێتەوەو پێکیانەوە گرێ بدات.

٩)- ﴿تَجْرِي بِأَعْيُنِنَا﴾، بەچاوەکانی ئێمە دەڕۆیی، لێرەدا خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿تَجْرِي بِأَعْيُنِنَا﴾، لە جێی دیکەش وشەی (عَيْنِي) هاتوە، لە سووڕەتی (طه)دا: ﴿وَلِتُصْنَعَ عَلَىٰ عَيْنِيٓ ﴿٣٩﴾﴾، بۆ ئەوەی لەسەر چاوی من، پەروەردە بکرێی، هەروەها بۆ پێغەمبەری خاتەم ﷺ بەکۆ (أعين) هێناویەتی لە کۆتایی سووڕەتی (طور)دا: ﴿فَإِنَّكَ بِأَعْيُنِنَا ﴿٤٨﴾﴾، ئنجا کە خوا ﷻ (عَيْن)ی بە تاک و بەکۆ (مفرد وجمع) هێناوە، مەبەست پێی سیفەتێکی خوای پەروەردگار نیە، بەڵکو ئەمە تەعبیرێکی مەجازییە، ئەگەرنا

www.alibapir.com


ناگونجێ لە شوێنێ یەک چاو بێ، لە شوێنێک کۆمەڵە چاوێک! بەڵکو ئەوە تەعبیرێکی مەجازییەو خەڵک بەکاری دێنن، دەڵێن: تۆ چاوی منی، یان: چاوم لە تۆیە، یانی: ئاگاداری تۆم و دەتپارێزم و، چاودێرییت دەکەم، بۆیەش بە کۆ (**جمع**) هێناویەتی، تاکو بەهێزیی مانای چاودێرییەکە دەربخات، چونکە هەمیشە کۆ (**جَمع**) تەعبیر لەهێز دەکات، یاخود لەبەرئەوەی خوا کۆمەڵێک جۆرە چاودێریی بۆ نووح کردوون، نووح و ئەوانەی لەگەڵی بوون:

**أ-** چاودێریان بووە کەشتییەکەیان، نغرۆ نەبێ.

**ب-** چاودێریان بووە کە دەرباز بن.

**ج-** چاودێریان بووە، کە دوایی لە شوێنێکی باش بنیشنەوە.

**د-** چاودێریان بووە کە لە نێو کەشتییەکەدا چۆن بگوزەرێنن؟ خوا کۆمەڵێک چاودێریی و ئاگاداریی تایبەتیی بۆ ڕەخساندوون، واتە: کەشتییەکە دەڕۆیی بە چەند جۆرێک لە چاودێریی و پاراستن و ئێشکگرتنی ئێمە، ئەوە مانا بنەڕەتییەکەیەتی، هەندێکیش گوتوویانە: (**بِأَعْيُنِ أَوْلِيَائِنَا مِنَ المَلَائِكَة**)، لە ژێر چاودێریی دۆستەکانمان لە فریشتەکاندا، فریشتەکان ئاگایان لێ بووە، بەدڵنیاییی فریشتەکان بە فەرمانی خوا، خوا هەر کارێ پێیان بسپێرێ، ئەنجامی دەدەن، بەڵام ئەوانیش کە سەربازی خوای پەروەردگارن، کارەکە هەر دەگەڕێتەوە بۆ خوا.

**١٠)-** ﴿جَزَآءً لِّمَن كَانَ كُفِرَ﴾، ئەوەش پاداشتدانەوە بوو بۆ کەسێک سپڵەیی بەرانبەر کرابوو، یاخود: بێبڕوایی بەرانبەر کرا بوو، واتە: ڕۆیشتنی کەشتییەکە، بەو شێوەیەو، دەربازبوونی سواربووانی کەشتییەکە، نووح ئەوخاوو خێزانەی لەگەڵی بوون و، ئەو بڕوادارانەی لە خزمەتی دابوون، ئەوە پاداشت بوو بۆ کەسێک کە کوفری بەرانبەر کرابوو، کوفریش یان مەبەست پێی بێبڕواییە، یان مەبەست پێی سپڵەیی (**كُفْرَان**)ە، بێگومان هەر کام لە پێغەمبەران (**عَلَيْهِمُ الصَّلَاةُ وَالسَّلَام**) نیعمەتێکی هەرە بەرزی خوای بەخشەرەو، کەسێک بڕوای پێ نەهێنێ، مانای وایە سپڵەیی بەرانبەر بەو نیعمەتەی خوای میهرەبان کردوە، هەروەها پێغەمبەران (**عَلَيْهِمُ الصَّلَاةُ**

www.alibapir.com



وَالسَّلَام) خوا ناردوونی بۆ ئەوەی بڕوایان پێ بهێنرێ، بۆیە کەسێک پێیان پێ بێبڕوا بێ، بێگومان تووشی سزا دەبێ، ئەو پێغەمبەرەش ﷺ لەسەر ئەوە کە بەرانبەرەکانی پێی بێبڕوا دەبن، یاخود لە بەرانبەریدا، سپڵەو نا سوپاس دەبن، پاداشت دەدرێتەوە، وەک چۆن بەرانبەرەکانیشی سزا دەدرێن.

**١١)-** ﴿وَلَقَد تَّرَكْنَٰهَآ ءَايَةً﴾، بە دڵنیایی ئێمە کەشتییەکەمان، وەک نیشانەیەک بەجێهێشت.

لێرەدا ڕوونکەرەوانی قورئـــان:

**أ-** هەندێکیان دەڵێن: ڕاناوی (**تَرَكْنَاهَا**)، دەچێتەوە بۆ کەشتییەکە یانی: (**تَرَكْنَا السَّفِيْنَة آية**).

**ب-** هەندێکیش دەڵێن: دەچێتەوە بۆ بەسەرهات (**قصّة**)ی نووح، هەڵبەتە هەردووکیشیان: کەشتییەکە و بەسەرهاتەکە: بەڵگەو نیشانەی ڕاستیی نووح ﷺ و، بەڵگەو نیشانەی ئەوەبوون کە خوا ﷻ لەسەر دۆستەکانی خۆی وەدەنگ دێ، هەم کەشتییەکەی نووح و هەم بەسەرهاتەکەی هێڵدراونەوە، پێم وانیە هیچ گەل و کۆمەڵگایەک هەبێ لەسەر گۆی زەوی، کە باسی تۆفانی نووح نەبێ، لە کتێبە مێژووییەکانیاندا، هی میزۆپۆتامیاو هی میسرو هی شام، سەرجەم ئەو شارستانییەتانەی بوون: ئەکەدییەکان و سۆمەرییەکان و ئاشوورییەکان و بابلییەکان، هەروەها ئەوانەی هیندو چین و ئێران لە نێو هەموویان دا، باسی تۆفانی نووح بووە، لەبەر ئەوەی تۆفانی نووح، وەک پێشتر باسمانکردوە لە تەفسیری سووڕەتی هوودا کە بەسەرهاتی نووحمان ﷺ، بە تەفصیل هێناوە، وا پێدەچێ ئیقلیمگیربوو بێ، دنیا گرەوە بووبێ، بۆیە لە کەلەپووری مێژووی هەموو گەلاندا، باسی بەسەرهاتی تۆفانەکەی نووح ﷺ و کەشتییەکەی کراوە.

**١٢)-** ﴿فَهَلْ مِن مُّدَّكِرٍ﴾، ئنجا ئایا کەسی بیرکەرەوەو پەند وەرگر هەیە؟! یانی: (**هَلْ مِنْ مُتَذَكِّرٍ! أو: هَلْ مِنْ مُتَفَكِّرٍ! أو هَلْ مِنْ مُتَّعِظٍ**)، (**مُدَّكِر**)، لە بنەڕەت دا (**مُتَذَكِّر**) ەو، پێشتریش گوتمان: (**مُدَّكِر**)، دەگونجێ بە مانای: وەبیرهاتووەوە بێ، کەسێک کە

www.alibapir.com


شتێکی وەبیر دێتەوە، یاخود بە مانای: بیرکەرەوە بێ، یانی: کەسێک کە بیر دەکاتەوە لە شتێک، یاخود: بەمانای: پەند وەرگر (مُتَّعِظ) بێ، هەرسێکیان گونجاون، ئایا کەس هەیە؟ ئەمە پرسیارکردنی نکوڵییلێکردنە واتە: کەسی وانەبوو پەند وەربگرێ و بیر بکاتەوەو لەوڕاستییانە پەندوەربگرێ، کەخوا ﷻ لەناخ‌وزگماکی مرۆڤدادایناون و پێغەمبەران (عَلَيْهِمُ الصَّلَاةُ وَالسَّلَامَ) هاتوون، لە ڕێی وەحیی خواوە، ئەو ڕاستییانە بیر خەڵک بخەنەوە، کە ئەصڵەکەیان لە زگماک و لە ناخیاندا هەیە.

**١٣)-** ﴿ فَكَيْفَ كَانَ عَذَابِي وَنُذُرِ ﴾، ئنجا ئایا ئازاری من و ترساندنەکانی من، چۆن بوون! (نُذُر) کۆی (نَذِيْر)ە کە یان چاوگ (مصدر)ە و بە مانای (إِنْذَار)ە، واتە: وریا کردنەوەو ترساندن، یان بە مانای (منذر)ە، یانی: ورياكەرەوەو ترسێنەر، لێرەدا مەبەست ئەوەیە: ئایا سەرەنجامی ترساندن و ئاگادارکردنەوەکانی من چۆن بوو؟ یان: سەرەنجامی سزادانەکەی من چۆن بوو؟ بێگومان زۆر بێڕەزا بوو، بۆیە خوای بەرز بەوشێوەیە دەیفەرموێ،واتە:لەوەصف نایەت،خوا ﷻ چۆن ئەوانەی سزادا،دوای ئەوەی ئاگاداری کردنەوەو ترساندنی، سزادانەکەی زۆر جێی سەرسوڕمان بوو!

لێرەدا کە دەفەرموێ: ﴿ وَلَقَد تَّرَكْنَٰهَآ ءَايَةً ﴾، هەرچەندە ئێمە لە تەفسیری سوورەتی (العنكبوت)یشدا، لەو شوێنەی دەفەرموێ: ﴿ فَأَنجَيْنَٰهُ وَأَصْحَٰبَ ٱلسَّفِينَةِ وَجَعَلْنَٰهَآ ءَايَةً لِّلْعَٰلَمِينَ ۝١٥ ﴾، واتە: خۆی و هاوەڵانی کەشتییەکەمان دەرباز کردن و کردمانە نیشانە بۆ جیهانییان، ئنجا ئەگەر ڕاناوی (ها) لە: ﴿ وَلَقَد تَّرَكْنَٰهَآ ءَايَةً ﴾دا، ئەگەری ئەوە هەبێ، مەبەست پێی بەسەرهاتەکەی نووح بێ ﷺ، کە ئەوە دووریشەو گونجاو نیە لەگەڵ ڕەوت (سیاق)ەکەدا، کە هەمووی باسی کەشتییەکەیە: ﴿ وَحَمَلْنَٰهُ عَلَىٰ ذَاتِ أَلْوَٰحٍ وَدُسُرٍ ﴾، ﴿ تَجْرِي بِأَعْيُنِنَا ﴾، ﴿ وَلَقَد تَّرَكْنَٰهَآ ﴾، چونکە ڕاناو (ضمیر) دەبێ بۆ نیزیکترین باسکراو (أَقْرَب مَذْكُور)، بچێتەوەو نزیکترین باسکراویش کەشتییەکەیە، بەڵام ئەگەر لێرە ئەگەرێکی هەبێ، کە مەبەست پێی بەسەرهاتەکە بێ، لە سوورەتی (العنكبوت)دا، کە خوا دەفەرموێ: ﴿ وَلَقَدْ أَرْسَلْنَا نُوحًا إِلَىٰ قَوْمِهِۦ فَلَبِثَ فِيهِمْ أَلْفَ سَنَةٍ إِلَّا خَمْسِينَ عَامًا فَأَخَذَهُمُ ٱلطُّوفَانُ

www.alibapir.com



﴿وَهُمۡ ظَٰلِمُونَ ﴿١٤﴾ فَأَنجَيۡنَٰهُ وَأَصۡحَٰبَ ٱلسَّفِينَةِ وَجَعَلۡنَٰهَآ ءَايَةٗ لِّلۡعَٰلَمِينَ ﴿١٥﴾﴾، واتە: خۆی و هاوەڵانی کەشتییەکەمان دەرباز کردو، کردمان بە نیشانەیەک بۆ جیهانییان، لەوێدا زۆر بە ڕوونیی و ڕاشکاویی، دیارە کە ڕاناوەکە بۆ کەشتیی (سفینة) دەچێتەوە و لەوێ بە درێژیی لەو بارەوە دواین، هەروەها لە سووڕەتی (هود)یشدا کە باسی بەسەرهاتی نووحمان ﷺ کردوە، وردترو ڕوونتر لە بارەی بەسەرهاتی نووح و لە بارەی کەشتییەکەشەوە دواوین، کە ئێستاش شوێنەوارەکەی لەسەر چیای جوودیی هەر ماوە، بەڵام با لێرەش ئەو قسەیەی (الطبري) بێنین، کە لە تەفسیرەکەی خۆیدا[1]، دەڵێ:

(**وَلَقَدْ تَرَكْنَا السَّفِينَةَ الَّتِي حَمَلْنَا فِيهَا نُوحاً وَمَنْ كَانَ مَعَهُ آيَةً، يَعْنِي عِبْرَةً وَعِظَةً لِمَنْ بَعْدَ قَوْمِ نُوحٍ مِنَ الْأُمَمِ لِيَعْتَبِرُوا وَيَتَّعِظُوا، فَيَنْتَهُوا عَنْ أَنْ يَسْلُكُوا مَسْلَكَهُمْ فِي الْكُفْرِ بِاللَّهِ، وَتَكْذِيبِ رُسُلِهِ، فَيُصِيبَهُمْ مِثْلُ مَا أَصَابَهُمْ مِنَ الْعُقُوبَةِ**)، واتە: کەشتییەکە کە نووح ﷺ و ئەوانەی لەگەڵی دا بوون، تێیاندا هەڵگرتبوون، کردمانە نیشانەیەک، واتە: پەندێک و ئامۆژگارییەک بۆ ئەوانەی لە دوای گەلی نووحەوە دێن، لە نەتەوەکان تاکو پەند وەربگرن و، ئامۆژگاریی بکرێن و، واز لەوە بێنن کە هەمان ڕێی گەلی نووح بگرن، لە بێبڕوایی بەرانبەر بە خواو، بە درۆ دانانی پێغەمبەرەکانی (**عَلَيْهِمُ الصَّلَاةُ وَالسَّلَامُ**)و، سەرەنجام هەمان سزا کە بەسەر وان هات، بەسەر ئەوانیش بێ.

ئنجا (**الطبري**) دوو قسان دێنێ هەردووکیان لە قەتادەوە، کە یەکێکە لە زانایانی تابیعین:

**یەکەم:** (عَنْ قَتَادَةَ قَوْلُه تَعَالَى: ﴿وَلَقَد تَّرَكۡنَٰهَآ ءَايَةٗ﴾، قَالَ: «**أَبْقَاهَا اللَّهُ بِبَاقَرْدَى مِنْ أَرْضِ الْجَزِيرَةِ، عِبْرَةً وَآيَةً، حَتَّى نَظَرَتْ إِلَيْهَا أَوَائِلُ هَذِهِ الْأُمَّةِ نَظَرًا، وَكَمْ مِنْ سَفِينَةٍ كَانَتْ بَعْدَهَا قَدْ صَارَتْ رَمَادًا**»)، (**أخرجه: الطبري: ٣٢٨٤٤**).

---

(١ ) جامع البيان: ج٢٧، ص١٠٠.

www.alibapir.com


واتـە: قەتـادە (کـە یەکێکـە لـە زانـا زۆر موعتەبـەرەکانی ڕوونکردنـەوەی قورئـان) دەڵـێ: کـە خـوا دەفەرمـوێ: ﴿ وَلَقَد تَّرَكْنَٰهَآ ءَايَةً ﴾، کەشتییەکەمان، وەک نیشـانەیەک و بەڵگەیەک، هێشتەوە خوا ﷻ لە (باقەردا) {ئەو کاتە دێیەک بووە}[1] لەسەر زەمینـی جەزیـرە، {ئێسـتاش شـارێک لـە کوردسـتانی تورکیـا هـەر بەنـاوی جەزیـرەوە هەیـە} وەک پەندێـک و نیشـانەیەک بەجێهێشـت، تاکـو سـەرەتاکانی ئۆممەتـی پێغەمبـەر ﷺ تەماشـایان کـردوە، وەک تەماشـا کـردن، چەنـدان کەشـتیی دیکـەش، دوای وی هەبـوون، بوونـە خۆڵەمێـش و شـوێنەواریان نەمـاوە {بـەڵام خوا شـوێنەواری ئـەو کەشـتییەی هێشـتۆتەوە}.

**دووەم:** (عَنْ قَتَادَةَ، فِي قَوْلِهِ: ﴿ وَلَقَد تَّرَكْنَٰهَآ ءَايَةً فَهَلْ مِن مُّدَّكِرٍ ﴿١٥﴾ ﴾، قَالَ: «أَلْقَى اللَّهُ سَفِينَةَ نووح عَلَى الْجُودِيِّ حَتَّى أَدْرَكَهَا أَوَائِلُ هَذِهِ الْأُمَّةِ»)، (أخرجه الطبري: ٣٢١٤٥).

خـوا کەشـتیی نووحـی لەسـەر چیـای جوودیـی فڕێـدا، هەتـا سـەرەتایەکانی ئـەم ئۆممەتـە {جیـلی هـاوەڵان و دوای ئـەوان} دیتوویانـە.

لـەو سـەرچاوانەدا کـە ئامـاژەم پێـدان، بـە تایبـەت لـە تەفسـیری سـوورەتی (هـود) دا، بـە تەفصیـڵ باسـمکردوە، کـە بـە مانگـە ئاسـمانییەکان وێنـەی گیـراوەو، ئەنـدازەی کەشـتییەکە چەنـدەو چۆنـە؟ هەرچەنـدە کاتی خـۆی خوا فەرموویـەتی تەختە بـووە، بەڵام ئێسـتا وەک بـەردی لێهاتـوە بـە تێپەڕینـی کات و، پسـپۆڕانی زەویناسـیی (جیۆلۆجیـا) دەڵێـن: بـەلای کەمـەوە ئـەو کەشـتییە سـەد هـەزار (١٠٠٠٠٠) سـاڵی بەسـەردا تێپەڕیوە!

**١٤)-** ﴿ وَلَقَدْ يَسَّرْنَا ٱلْقُرْءَانَ لِلذِّكْرِ فَهَلْ مِن مُّدَّكِرٍ ﴾، بە دڵنیایی قورئانمان ئاسانکردوە بۆ (**ذِكْر**)، ئایا کەس نیە، لێی تێبگات، پەندی لێوەربگرێ، بیری لێ بکاتەوە؟! (**ذِكْر**)، پێنج واتای هەن:

---

(١) کاردۆخ، کاردۆ، دەکەوێتـە خـوارووی دەریاچـەی (وان) خـوارووی ڕۆژئـاوای دیاربەکـر، لـە تورکیـا (کوردسـتانی باکـوور)، کـە لـە (باقـەردا) وە گـۆڕاوە.
بڕوانە: ویکیپیدیا و مەوسوعەی (عریق).

www.alibapir.com


**یەکەم:** لەبەر کردن (الحِفظ).

**دووەم:** وەبیر خۆ هێنانەوە دوای لە بیرچوونەوە (الإستحضار بَعْدَ النِّسْيَان).

**سێیەم:** باسکردن واتە: بەسەر زماندا هێنان.

**چوارەم:** تێگەیشتن.

**پێنجەم:** پەندوەرگرتن.

کەواتـە: کـە دەفەرمـوێ: ﴿ وَلَقَدْ يَسَّرْنَا ٱلْقُرْءَانَ لِلذِّكْرِ ﴾، بـە دڵنیایـی قورئانمـان ئاسـانکردوە بـۆ (ذِكْر)، واتـە: بـۆ لەبەرکـردن و، بـۆ هێنانەوەبیـر خـۆو، بـۆ باسـکردن بـە زمـان و، بـۆ لێتێگەیشـتن و، بـۆ پەنـد لێوەرگرتـن.

لێـرەدا بـە پێویسـتی دەزانـم بـۆ ڕوونکردنـەوەو چەمـک و واتـای ئـەو ئایەتـە موبارەکـە، کـە خـوا دەفەرمـوێ: قورئانمـان ئاسـانکردوە بـۆ (ذِكْر)، بـەو پێنـج واتایانەی باسـمکردن، چەنـد قسـەیەک لـە (إبـن عاشـور)ەوە[1] بێنـم:

دەڵـێ: (التَّيْسِـيرُ: إيجـادُ اليُـسْرِ فِي شَيْءٍ، واليُـسْرُ: السُّـهُولَةُ، وعَـدَمُ الكُلْفَـةِ فِي تَحْصِيـلِ المَطْلُـوبِ مِـن شَيْءٍ، وإذْ كانَ القُـرْآنُ كَلامًـا فَمَعْنـى تَيْسِـيرِهِ يَرْجِـعُ إلى تَيْسِـيرِ مـا يُـرادُ مِـنَ الـكَلامِ، وهـو فَهْـمُ السّـامِعِ المَعـانِيَ الَّتِـي عَنَاهَـا المُتَكَلِّـمُ بِـهِ دُونَ كُلْفَـةٍ عَـلى السَّـامِعِ، ولاَ إغْـلاقٍ كَـما يَقُولُـونَ: يَدْخُـلُ لِـلْأُذُنِ بِـلا إذْنٍ. وهَـذا اليُـسْرُ يَحْصُـلُ مِـن جانِـبِ الألْفـاظِ وجانِـبِ المَعـانِي؛ فَأَمَّـا مِـنْ جَانِـبِ الألْفـاظِ، فَذَلِـكَ بِكَوْنِها فـي أَعْـلَى دَرَجَـاتِ فَصَاحَـةِ الكَلِـماتِ وفَصَاحَـةِ التَّراكِيـبِ، أيْ: فَصَاحَـةِ الـكَلامِ، وانْتِظـامِ مَجْمُوعِهـا، بِحَيْـثُ يَخِـفُّ حِفْظُهـا عَـلى الألْسِـنَةِ. وَأَمَّـا مِـن جانِـبِ المَعـانِي، فَبِوُضُـوحِ انْتِزاعِهـا مِـنَ التَّراكِيـبِ ووَفْـرَةِ مـا تَحْتَـوِي عَلَيْـهِ التَّراكِيـبُ مِنْهَـا، مِـنْ مَغـازِي الغَـرَضِ المَسُـوقَةِ هـي لَـهُ، وبِتَوَلُّـدِ مَعـانٍ مِـن مَعـانٍ أُخَـرَ، كُلَّـما كَـرَّرَ المُتَدَبِّرُ تَدَبُّرَهُ فِي فَهْمِهـا، ووَسـائِلُ ذَلِـكَ لا يُحِيـطُ بِهـا الوَصْفُ، وقَـدْ تَقَـدَّمَ بَسْـطُها فِي المُقَدِّمَـةِ العـاشِرَةِ مِـن مُقَدِّمـاتِ هَـذا التَّفْسِـيرِ، ومِـن أهَمِّهـا إيجـازُ

---

(١) ج١١، ص١٨٨.

www.alibapir.com


**اللَّفْظِ، لِيُسْرِعَ تَعَلُّقُهُ بِالحِفْظِ، وإجْمالُ المَدْلُولاتِ لِتَذْهَبَ نُفُوسُ السَّامِعِينَ فِي انْتِزاعِ المَعانِي مِنها كُلَّ مَذْهَبٍ يَسْمَحُ بِهِ اللَّفْظُ والغَرَضُ والمَقامُ، ومِنها الإطْنابُ بِالبَيانِ، إذا كانَ فِي المَعانِي بَعْضُ الدِّقَّةِ وَالخَفَاءِ).**

واتە: کە خوا دەفەرموێ: ﴿ وَلَقَدْ يَسَّرْنَا ٱلْقُرْءَانَ لِلذِّكْرِ فَهَلْ مِن مُّدَّكِرٍ ﴿١٧﴾ ﴾، بە دڵنیایی ئێمە قورئانمان ئاسانکردوە بۆ (**ذِکْر**)، ئایا کەس نیە، بۆ لێی تێبگات و لێی وردبێتەوەو بیری لێ بکاتەوە؟ ئاسانکردن (**تیسیر**) بریتیە لە ئاسانیی لە شتێکدا، ئاسانییش بریتیە لە سێنایی و زەحمەت پێوە نەکێشان، لە وەدەست هێنانی ئامانج، لەو شتەدا، مەبەستیش لە ئاسانکردنی قورئان، ئاسانکردنی ئەوەیە کە لە قسە دەویسترێ، ئەوەی لە قسەش دەویسترێ، بریتیە لە تێگەیشتنی بابای بیسەر، لەو مانایانەی قسەبێژ، مەبەستی بوون، بێ ئەوەی بابای بیسەر زۆر ئەرک بکێشێ و، بێ ئەوەی لێی بئاڵقێ و لێی داخراو بێ، وەک دەڵێن: بەبێ مۆڵەت دەچێتە نێو گوێ، (واتە: بە ئاسانیی مرۆڤ لێی حاڵیی دەبێ)، ئنجا ئەو ئاسانییە کە خوا ﷻ دەفەرموێ: قورئانمان ئاسانکردوە، دوو بواری هەن:

أ- لە بواری بێژەکانی دا.

ب- لە بواری واتاکانی دا.

لە بواری بێژەکانی دا، بەوە کە بێژەکانی قورئان لە پلە هەرە بەرزەکانی ڕەوانیی و پاراوییدان، هەم لە ڕووی وشەکان و، هەم لە ڕووی پێکهاتەی وشەکان و، هەم لە ڕووی ئەوەوە کە هەمووی پێکەوە، ڕێک و پێکەو بە شێوەیەکە کە زمانەکانیش بە ئاسانیی ئەو بێژانەیان بۆ دەگوترێن و، بۆشیان لەبەر دەکرێن.

لە ڕووی واتاکانیشەوە، بەوە کە بە ئاسانیی ئەو واتایانە لە پێکهاتەکانی وشەکان وەردەگیرێن، واتە: ڕستەکانی و بڕگەکانی، مانای زۆریان تێدان، لەو مەبەستانەی کە بێژەکان بۆیان هاتوون، وەردەگیرێن و، هەندێک ماناش لە هەندێکی دیکەیان وەردەگیرێن و، هەتا بابای ڕاماو ڕامێنێ، مانای دیکەی

زیاتری وەدەست دێن، کە ئامرازەکانی ئەوەش هێندە زۆرن، ناگونجێ هەموویان باسبکرێن، بەڵام لە هەموویان گرنگتر بریتیە لە: کورتیی بێژەکان (**إيجاز**)، بۆ ئەوەی بە ئاسانیی لەبەر بکرێن و، پاشان بە کورتیی و پوختیی گوتنی واتایەکان، بۆ ئەوەی بیسەرەکان، زەینیان بە هەمولایەکدا بچێ، بۆ وەرگرتنی ئەو واتایانە {نەک یەک واتای دیارییکراویان هەبێ، لەوێ بوەستێ} ئەویش بەپێی ئەوە کە بێژەکەو زمانی عەرەبیی و شێوازی عەرەبیی و ئەو مەبەست و ئامانجە، کە قسەکەی بۆ گوتراوە، ڕێی پێ دەدەن، هەروەها لە شێوازەکانی ئەو ڕەوانبێژیی و زۆر گەیاندنی واتایە، بریتیە لە بە درێژیی قسەکردن (**إطْنَاب**)، ئەگەر لە شوێنێکدا، پەنهانیی یاخود وردیی، واتا هەبێ و، پێویست بەوە بکات ئەو شێوازە بەکار بێ.

واتە: لە جیاتی دوو وشە بەکاربهێنرێن، چوار وشە بەکاربهێنرێن و ئەوەش بەپێی حاڵ و مەقام دەگۆڕێ، ئەگەرنا یاساو بنەمای گشتیی لە قورئاندا بریتیە لە بە کورتیی و پوختیی دوان و، بێژەی کەم و واتای زۆر.

Stay in touch on social media
AliBapir/عەلی باپیر
archive.org/details/@alibapir
AliBapir
www.alibapir.net

www.alibapir.com



## مەسەلەی دووەم:

**گەلی عادیش پێغەمبەری خوا هوود ﷺ و پەیامەکەییان بە درۆ دانا، بۆیە خـوای دادگـەرو باڵادەسـت بایەکـی زۆر بەهێـزو سـاردی لـە کاتێکـی نەگبەتـدا نـاردە سـەریان، سـەرەنجام لـە بەینـی بـردن، وەک کۆتـەرە دارخورمـای لـە ڕیشـەوە هەڵکەنـدراو، کەوتـن و سـزاو ترسـاندنی خـواش زۆر بێـڕەزا بـوو، قوڕئانیـش لـە هەمـوو ڕوویێکـەوە بـۆ خەڵکـی خـۆی ئاسـانکراوە، بیخوێنـن، لەبـەری بکـەن، لێـی تێبگـەن، پەنـدی لێوەربگـرن و کاری پـێ بکـەن:**

خـوای زانـاو توانـا دەفەرمـوێ: ﴿ كَذَّبَتْ عَادٌ فَكَيْفَ كَانَ عَذَابِي وَنُذُرِ ﴿١٨﴾ إِنَّآ أَرْسَلْنَا عَلَيْهِمْ رِيحًا صَرْصَرًا فِي يَوْمِ نَحْسٍ مُّسْتَمِرٍّ ﴿١٩﴾ تَنزِعُ ٱلنَّاسَ كَأَنَّهُمْ أَعْجَازُ نَخْلٍ مُّنقَعِرٍ ﴿٢٠﴾ فَكَيْفَ كَانَ عَذَابِي وَنُذُرِ ﴿٢١﴾ وَلَقَدْ يَسَّرْنَا ٱلْقُرْءَانَ لِلذِّكْرِ فَهَلْ مِن مُّدَّكِرٍ ﴿٢٢﴾ ﴾.

## شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە شەش بڕگەدا:

**١)-** ﴿ كَذَّبَتْ عَادٌ فَكَيْفَ كَانَ عَذَابِي وَنُذُرِ ﴾، گەلی عاد بە درۆیان دانا، ئنجا ئایا ئازارو ترساندنەکانم چۆن بوون؟ بەرکارەکەی قرتێنراوە، یانی: (**كَذَّبَتْ عَادٌ هُوداً**)، یاخود (**كَذَّبَتْ عَادٌ رسالات الله، أو رِسَالَةَ الله**)، گەلی عاد هوودیان بە درۆ دانا، یاخود: گەلی عاد پەیامەکانی خوا، یان پەیامی خوایان بە درۆ دانا، ﴿ فَكَيْفَ كَانَ عَذَابِي وَنُذُرِ ﴾، ئنجا ئایا سزادانی من، ئازاردانی من و ترساندن و ئاگادار کردنەوەکانی من چۆن بوون؟ واتە: دەرەنجامی سزادانی خواو دەرەنجامی ئاگادارکردنەوەو ترساندنەکانی خوا، هێندە بێڕەزابوو، کە جێی سەرسوڕمانەو نایەتەوەصفکردن، ئنجا خوا ﷻ باسی دەکات:

**٢)-** ﴿ إِنَّآ أَرْسَلْنَا عَلَيْهِمْ رِيحًا صَرْصَرًا ﴾، ئێمە بایەکی زۆر بەهێزو ساردمان کە دەنگێکی بەهێزیشی هەبوو، ناردە سەریان، (**صَرْصَراً: الشَّدِيْدَةُ القَوِيَّة البَارِدَةُ لَهَا صَوْت**)، (**صرصر**) زۆر بەهێزو سەخت، زۆر سارد کە دەنگیشی لێ بێ، (**الطبري**) وشەی (**صَرْصَراً**) ئاوا

www.alibapir.com



مانا دەکات: (**رِيْحاً باردة**)[١]، بایەکی زۆر سارد، هەر (**الطبري**)، دەڵێ: (**صَرْصَراً: شديدة**)[٢] (**صَرْصَراً**)، واتە: زۆر پتەو و توند، بەڵام زۆربەی زانایان بەو سێ وەصفە (**صَرْصَراً**)یان وەسف کردوە: أ- زۆر توند، ب- زۆر سارد، ج- دەنگێکی بەهێزیشی هەبێ.

**٣)**- ﴿فِي يَوْمِ نَحْسٍ مُّسْتَمِرٍّ﴾، لە ڕۆژێکی نەگبەتی بەردەوامدا، واتە: ڕۆژێک کە نەگبەتیی تێیدا بەردەوام بێ، وشەی (**نَحْس**)، یانی: حاڵ خراپیی، بە کوردیی دەڵێین: نەگبەت، بێ خێرو شووم، (**الطبري**) لە (**الضَّحَّاك**)ەوە[٣]، ئاوا مانای ﴿يَوْمِ نَحْسٍ مُّسْتَمِرٍّ﴾، دەکات: (**فـي يَوْم شَرٍّ وَشُؤْم، اسْتَمَرَّ بِهِمُ الْبَلاَءُ وَالْعَذَاب فِيهِ إِلَى أَنْ وَافَى بِهِم جَهَنَّمَ**)، لە ڕۆژێکدا کە بەڵاو ئازار تێیدا بەردەوام بوو، تاکو گەیاندنی بە دۆزەخ.

مەبەست پێی دۆزەخە لە قۆناغی بەرزەخدا.

وشــەی (**مُسْـتَمِرّ**)، ئاوەڵنـاوی (**نَحْـس**)ە، ﴿فِي يَوْمِ نَحْسٍ مُّسْتَمِرٍّ﴾، یـانی: ڕۆژێـک کـە نەگبەتیـی و شـوومییەکەی بـەردەوام بـوو.

**٤)**- ﴿تَنزِعُ ٱلنَّاسَ كَأَنَّهُمْ أَعْجَازُ نَخْلٍ مُّنقَعِرٍ﴾، خەڵکی دەردەکێشا، هەڵدەکێشا، وەک کۆتەرە دارخورمایە هەڵکەندراوەکان بن. (**النَّزْعُ: الإِزَالَةُ بِعُنْفٍ**)، (**نزع**) ئەوەیە بە هێز شتێک لابەری و هەڵیکێشی، ﴿تَنزِعُ ٱلنَّاسَ كَأَنَّهُمْ أَعْجَازُ نَخْلٍ مُّنقَعِرٍ﴾، خەڵکی دەردەکێشاو هەڵدەکێشاو بە توندیی لای دەبردن، وەک بنکە دارخورماو، کۆتەرە دارخورمای لە ڕەگەوە دەرکێشراو بوون، (**أعْجَاز**)، کۆی (**عَجُز**)ە، کە بریتیە لە کۆتایی هەر شتێک، ﴿أَعْجَازُ نَخْلٍ﴾، (**نَخْل**)یش، ناوی کۆیە بۆ دارخورما، کە تاکەکەی (**نَخْلَة**)یە، وەک کۆتەرە دارخورمایەکان، کە هەڵکێشراون و دەرکێشراون، ئاوا کەوتبوونە گۆڕێ، ﴿أَعْجَازُ نَخْلٍ﴾، (**الأَعْجَازُ: جَمْعُ عَجُزٍ، وَأَعْجَازُ نَخْلٍ: أُصُولِ النَّخْلِ، وشُبِّهَ النَّاسُ المَطْرُوحُونَ عَلى الأَرْضِ، بِأُصُولِ النَّخِيلِ المَقْطُوعَةِ الَّتِي تُقْلَعُ مِن مَنابِتِها لِمَوْتِها، إذْ تَزُولُ فُرُوعُها**

---

(١ ) برقم: ٣٢٨٥٤.

(٢ ) برقم: ٢٨٥٠٩.

(٣ ) برقم: ٣٢٨٦٣ .

**ويَتَحاتُّ ورَقُها، فَلا يَبْقى إلاَّ الجُذُوعُ الأَصْلِيَّةُ**)، (**أَعْجازُ**)، کۆی (**عَجُز**)ە، واتە: کۆتایی وبنکی هەر شتێک،ئنجا (**أَعْجازُ نَخْل**)، یانی: بنک و کۆتەرە دار خورمایەکان، گەلی عاد کە لەسەر زەوییەکە کەوتوون و بایەکە لێیداون، چوێنراون بە بنکی دارخورماوە، کە لەو شوێنەی لێی ڕواوە هەڵدەکەنرێ، لەبەر ئەوەی وشک بووە، ئنجا لقەکانی لێیدەبنەوەو گەڵایەکەی لێی دەبێتەوەو، تەنیا قەدە ئەصڵییەکەی دەمێنێتەوە.

منیش دەڵێم: (**رُبَّمَا سَبَبُ تَشْبِيهِهِمْ بأُصُولُ النَّخْلِ، هو طُولُ أَجْسَامِهِمْ وَضَخامَتُهَا!**)، ڕەنگە هۆکاری چوێنرانیان بەبنک و کۆتەرە دارخورماوە، لەبەر ئەوەبێ کە گەلی عاد زۆر باڵا بەرز و قەبەو بە کەلەش بوون و، دارخورماش زۆر بەرزە.

(**مُنْقَعِر: اسْمُ فاعِلِ انْقَعَرَ، مُطَاوِعُ قَعَرَهُ، أي: بَلَغَ قَعْرَهُ بِالحَفْرِ، وَرُوعِيَ فِي إِفْرَادِهِ وتَذْكيره صُورَةُ لَفْظِ النَّخْلِ دُونَ عَدَدِ مَدْلُولِهِ، خِلافًا لِما فِي قَوْلِهِ تَعالى:** ﴿كَأَنَّهُمْ أَعْجَازُ نَخْلٍ خَاوِيَةٍ ﴿٧﴾﴾الحاقة).

وشەی (**مُنْقَعِر**)، ناوی بکەر (**اسْم فاعِل**)ە، لە ڕووی زمانی عەرەبییەوە، لە (**انْقَعَرَ**)ەوە هاتوە، (**انْقَعَرَ**)ش (**مُطاوِع**)ی، (**قَعَرَه**)یە، دەگوترێ: (**قَعَرْتُهُ فَانْقَعَرَ**) هەڵم قەند، هەڵقەنرا، (**قَعَرَهُ**)، گەیشتە بنی، {بیرێکی هەڵقەند، چاڵێکی هەڵقەند، گەیشتە بنەکەی} بۆیەش بە تاک و بە نێرینە هاتوە، (**مُنْقَعِر**) لەبەر ئەوەی وێنەی بێژەی (**نَخْل**)، ڕەچاو کراوە، نەک ژمارەی واتای (**نَخْل**)، بێژەی (**نَخْل**)، تاکەو نێریشە، لە ڕووی زمانی عەرەبییەوە، واتە: نێرینەی مەجازیی، ئنجا (**مُنْقَعِر**)یش، دەگەڕێتەوە بۆ (**نَخْل**)، نەک واتای (**نَخْل**)، بە پێچەوانەی ئەوەوە کە لە شوێنێکی دیکە دەفەرموێ: ﴿كَأَنَّهُمْ أَعْجَازُ نَخْلٍ خَاوِيَةٍ ﴿٧﴾﴾الحاقة، ئەوان وەک بنکە دارخورما کەوتووەکان بوون.

لێرەدا (**خَاوِيَة**)، کە سیفەتی (**أَعْجازُ نَخْل**)یە، حاڵەتی مانایەکەی تێدا ڕەچاو کراوەو دارخورمایەکانیش کۆ بوون، بۆیە سیفەتەکەیانی، کە (**خَاوِيَة**)یە {یانی: (**سَاقِطَة**)} کەوتووەکان، بە مێینەی مەجازیی، هێناوە.

www.alibapir.com



٥)-﴿ فَكَيْفَ كَانَ عَذَابِي وَنُذُرِ ﴾، {خوا ﷻ جارێکی دیکە دووبارەی دەکاتەوەو دەفەرموێ:} ئنجا سزا و ئازاردانی من و، ترساندنەکانی من، چۆن بوون، واتە: سەرەنجامی ترساندنەکانم و سزادانەکەم چۆن بوو؟ یانی: هێندە بێڕەزاو گەورە بوو، وەسف ناکرێ.

٦)-﴿ وَلَقَدْ يَسَّرْنَا الْقُرْآنَ لِلذِّكْرِ فَهَلْ مِن مُّدَّكِرٍ ﴾ {جارێکی دیکە خوا ﷻ ئەم ڕستە موبارەکەش دووبارە دەکاتەوە، وەک چۆن ئەوەی پێشێشی دووبارە کردەوە، دەفەرموێ:} بە دڵنیاییی قورئانمان بۆ لەبەر کردن، بۆ خوێندن، بۆ لێتێگەیشتن، بۆ پەند لێوەرگرتن، بۆ بیرلێکردنەوە، ئاسانکردوە، ئایا کەس نیە بێ، لێی تێبگات، پەندی لێوەربگرێ و لێی بەهرەمەند بێ؟!

هەرچەند پێشتریش چەمک و واتای ئەم ئایەتە موبارەکەمان ڕوونکردەوە، لە زاری (**إبن عاشور**)ەوە ڕەحمەتی خوای لێ بێ، بەڵام لێرەش ئەم ڕوونکردنەوەیە لە (**الطبري**)یەوە، دێنین، کە لە تەفسیرەکەیدا هێناویەتی، دەڵێ:

(**وَلَقَدْ سَهَّلْنَا الْقُرآن: بَيَّنَاهُ وَفَصَّلْنَاهُ لِلذِّكْرِ، لِمَنْ أَرَادَ أَنْ يَتَذَكَّر وَيَعْتَبِرَ وَيَتَّعِظَ وَهَوَّنَّاهُ، عَنْ مُجَاهِد قَوْلُهُ:** ﴿ يَسَّرْنَا الْقُرْآنَ لِلذِّكْرِ ﴾، **قَالَ هَوَّنَّاهُ**)[1]، واتە: بە دڵنیاییی ئێمە قورئانمان سێنا کردوە، واتە: ڕوونمان کردۆتەوەو یەکلامان کردۆتەوە بۆ زیکر، واتە: بۆ هەر کەس بیەوێ، بیری بکەوێتەوەو پەند وەربگرێ و ئامۆژگاریی وەربگرێ و ئاسانمان کردوە، لە موجاهیدەوە هاتوە لە بارەی فەرمایشتی خواوە کە دەفەرموێ: ﴿ وَلَقَدْ يَسَّرْنَا الْقُرْآنَ لِلذِّكْرِ ﴾، (**قَالَ هَوَّنَّاهُ**)، واتە: سێناو ئاسانمان کردوە.

بێگومانیش قورئان وایەو بۆ لەبەر کردن، بۆ خوێندن، بۆ لێتێگەیشتن، بۆ پەند لێوەرگرتن، هیچ قسەیەک نیە بە قەدەر قورئان ئاسان بێ، بەڵام بێگومان بۆ خەڵکی خۆی، هەروەها بۆ لێوەرگرتنی یەکجار زۆر لە ماناو مەبەست و حیکمەت، بەڵکو بێ سنوور، واتاو مەبەستی گەورەو گرنگی گرتوونە خۆی و، هەرچی ژیانی بەشەر پێویستیی پێیەتی و پەکی لەسەر وەحیی خوا کەوتوە،

---

(١ ) برقم: ٣٢٨٤٩.

www.alibapir.com


خـوا خسـتوویەتە نێـو قورئانـەوە، ئنجا کـە خـوا دەفەرمـوێ: ﴿مَّا فَرَّطْنَا فِي الْكِتَابِ مِن شَيْءٍ ﴿٣٨﴾﴾ الأنعام، ئەگـەر مەبەسـت لـە (كِتَاب) قورئـان بـێ، واتـە: هیـچ شـتێکمان زایـە نەکـردوە لـە قورئـان دا کـە تێیـدا نەبـێ، واتـە: هیـچ شـتێک کـە ژیـانی بەشـەر پێویسـتیی پێـی بـێ و پەکـی لەسـەر وەحیـی خـوا کەوتبـێ، بـەڵام ئـەوەی لـە مەودای عەقڵی بەشـەردا بێ و، بەشـەر خۆی بتوانێ دەرکی بکات، خوا بسم الله الرحمن الرحيم کتێبـی خـۆی پـێ قەڵەباڵـغ نەکـردوە؛ سـەیارە چـۆن دروسـت دەکـرێ؟ فرۆکـە چـۆن دروسـت دەکـرێ؟ ڕێ و بـان و خانووبـەرەو ...هتـد، ئـەوە هەمـووی لـە مـەودای عەقڵـی بەشـەردایە، بۆیـە خـوا بـاسی نەکـردوە.

بـەڵام زیاتـر وایێدەچـێ: ﴿مَّا فَرَّطْنَا فِي الْكِتَابِ مِن شَيْءٍ ﴿٣٨﴾﴾ الأنعام، مەبەسـت لـە (كِتَاب)، زانیاریـی بـێ سـنووری خـوای زاناو شـارەزا بـێ، بەڵام ئـەم ئایەتـە موبارەکەی دەفەرمـوێ: ﴿وَنَزَّلْنَا عَلَيْكَ الْكِتَابَ تِبْيَانًا لِّكُلِّ شَيْءٍ وَهُدًى وَرَحْمَةً وَبُشْرَىٰ لِلْمُسْلِمِينَ ﴿٨٩﴾﴾، ئەمـە بێگومـان مەبەسـت پێـی قورئانـە، دەفەرمـوێ: کتێبـمان بـۆ سـەر تـۆ دابەزانـدوە، ڕوونکەرەوەیـە بـۆ هەمـوو شـتێک و، ڕێنمایـی و بەزەیـی و مـوژدەو دڵخۆشـییە بـۆ مسـوڵمانان.

ئنجا ئەگـەر یەکێـک بڵـێ: کـوا قورئـان هەمـوو شـتێکی تێدایـە؟ فڵان شـتە چـۆن دروسـت بکەیـن و، فـڵان شـتە چـۆن دروسـت بکەیـن، یـان فـڵان شـتە چـۆن بکەیـن؟ وەڵامەکـەی ئەوەیـە کـە باسـمان کـرد، هـەر شـتێک پەکـی لەسـەر وەحیی خـوا کەوتبێ، خـوا خسـتوویەتە نێـو کتێبەکـەی خۆیـەوەو، هـەر شـتێک ژیـانی بەشـەر پێویسـتیی پێـی بـێ، کـە ژیانێکـی مرۆڤانـەو، ڕێـک و ڕاسـت لەسـەر ئاسـتی تـاک و خێـزان و دەوڵـەت و کۆمەڵـگاو لەسـەر ئاسـتی مرۆڤایەتییـش، بگوزەرێنـێ، ژیانێک کە شایسـتەی مـرۆڤ بـێ، خـوا خسـتوویەتە نێـو قورئانـەوە، چ لـە ڕووی بوونناسـییەوەو، لـە ڕووی ئیـمان و عەقیـدەوەو، لـە ڕووی تەقـواو تەزکییـەوەو، لـە ڕووی عیبادەتـەوەو، لـە ڕووی هەڵسـوکەوتەوەو، لـە ڕووی ڕەوشـتەوەو، لـە ڕووی بەڕێوەبـردنی کۆمەڵـگاوەو، لـە ڕووی پەیوەندییـەکان و، لـە ڕووی جەنـگ و ئاشـتییەوە، لـە هەمـوو ڕوویەکـەوە.

www.alibapir.com



کاتی خـۆی ئێمـە لـە تەفسـیری ئـەم ئایەتـە لـە سـووڕەتی (**النحـل**)دا، ئـەو بەسـەرهاتەمان لـە شـێخ (موحەممـەد عەبـدە)وە هێنـا، لێـرەش دووبـارەی دەکەینـەوە: کاتی خـۆی شـێخ (موحەممـەد عەبـدە) لـە فەڕەنسـا دوورخـراوە بـووە، حکوومـەتی میسر دووری خسـتۆتەوە، یەکێـک لـە زانـا فەڕەنسییەکان، لێـی دەپرسـێ: ئێـوە دەڵێـن: قوڕئـان هەمـوو شـتێکی تێدایـەو ئـەم ئایەتـەی بـۆ دێنێتـەوە: ﴿وَنَزَّلْنَا عَلَيْكَ الْكِتَابَ تِبْيَانًا لِّكُلِّ شَيْءٍ ﴿٨٩﴾﴾، کتێبـمان دابەزاندۆتـە سـەرت ڕوونکەرەوەیـە بـۆ هەمـوو شـتێک،

لێـرەدا دەڵێـم: ئایـا ئێردەبێـک[1] گەنـم، یـان ئـارد (ئێردەبێـک هێنـدەی فـەردە گەنمێـک دەبـێ)، چەنـد نانـی تێدایـە؟ کـوا لـە قوڕئانـدا ئەوە هەیـە! شـێخ موحەممەد عەبـدەش دەڵـێ: بـا ئەوەشـی تێدایە لـە قوڕئاندا.

دەڵێ: کوا لە کوێدایە؟

دەڵـێ: قوڕئان دەفەرمـوێ: ﴿فَسْـَٔلُوٓا۟ أَهْلَ ٱلذِّكْرِ إِن كُنتُمْ لَا تَعْلَمُونَ ﴿٧﴾﴾الأنبياء، ئەگـەر نازانـن لـە شـارەزایان بپرسـن، دەچیـن لـە نانەوایـەک دەپرسـین، ئـەرێ ئێردەبە دەغڵێـک چەنـد نـانی تێدایـە؟ ئەویـش پێـمان دەڵێ.

ئەویش دەڵێ: تۆ دەڵێی: قوڕئان هەموو شتێکی تێدایە!

ئەویـش دەڵـێ: قوڕئـان پێـت دەڵـێ: بـۆ شـارەزایی دەربـارەی هـەر شـتێک لـە خەڵکـی خـۆی بپرسـە، قوڕئـان ڕێنمایـی تێدایـە، بـۆ هـەر شـتە چـۆن پێـی بگـەی؟ ئێمـەش بـۆ ئـەوەی بزانیـن ئێردەبـە دەغڵێـک، چەنـد نـانی تێـدان؟ لـە نانەوایـەک دەپرسـین، ئـەو پسـپۆڕو شـارەزایە، قوڕئانیـش وامـان ڕێنمایـی دەکات و دەڵـێ: بـۆ هـەر شـتە لـە خەڵکـی پسـپۆڕو شـارەزای خـۆی بپرسـن!

---

(١) الإردب: مكيـال يَتسـعُ أربعـة وعشريـن صاعـاً. المعجم الوسـيط، ص ١٣. واتـە: هـەر (صـاع) چـوار مسـتە، کەواتـە: ٢٤×٤=٩٦ مسـت ئێردەبێکە، واتـە: فەردەیەکـی دەوری سـەد (١٠٠) کیلۆیی.

www.alibapir.com


## مەسەلەی سێیەم:

**گـەلی ثەموودیـش پێغەمبەرەکـەی خۆیـان صاڵیحیـان بـە درۆ دانـاو پەیامـی خوایـان ڕەتکـردەوەو، خۆیـان بەزلگـرت و پێیـان وابـوو صاڵیـح وەک مرۆڤێـک شایستەی پێدا نێردرانی پەیامـی خـوا نیـەو، بـە درۆزن و بوغـڕاو خـۆ پەسـندیان دانـاو، ئـەو حوشـترەش کـە خـوا وەک بەڵگـەو موعجیزەیـەک بـە شـێوەیەکی تایبـەت بـۆ صاڵیحـی ڕەخسـاند بـوو، پەییـان کـرد (چـوار پەلیـان بڕی و کوشـتیان) سـەرەنجام خـوا هاڕژنێکـی بێـڕەزای نـاردە سـەریان و، وەک پـووش و پەڵاشـی نێـو ئاغەڵیـان لێهـات، کـە بابـای ئاڵفداکـەر بـۆ ئـاژەڵان لـە ئاغەڵـدا خـڕی دەکاتـەوە:**

خـوا دەفەرمـوێ: ﴿كَذَّبَتْ ثَمُودُ بِالنُّذُرِ ﴿٢٣﴾ فَقَالُوا أَبَشَرًا مِّنَّا وَاحِدًا نَّتَّبِعُهُ إِنَّا إِذًا لَّفِي ضَلَالٍ وَسُعُرٍ ﴿٢٤﴾ أَؤُلْقِيَ الذِّكْرُ عَلَيْهِ مِن بَيْنِنَا بَلْ هُوَ كَذَّابٌ أَشِرٌ ﴿٢٥﴾ سَيَعْلَمُونَ غَدًا مَّنِ الْكَذَّابُ الْأَشِرُ ﴿٢٦﴾ إِنَّا مُرْسِلُو النَّاقَةِ فِتْنَةً لَّهُمْ فَارْتَقِبْهُمْ وَاصْطَبِرْ ﴿٢٧﴾ وَنَبِّئْهُمْ أَنَّ الْمَاءَ قِسْمَةٌ بَيْنَهُمْ كُلُّ شِرْبٍ مُّحْتَضَرٌ ﴿٢٨﴾ فَنَادَوْا صَاحِبَهُمْ فَتَعَاطَىٰ فَعَقَرَ ﴿٢٩﴾ فَكَيْفَ كَانَ عَذَابِي وَنُذُرِ ﴿٣٠﴾ إِنَّا أَرْسَلْنَا عَلَيْهِمْ صَيْحَةً وَاحِدَةً فَكَانُوا كَهَشِيمِ الْمُحْتَظِرِ ﴿٣١﴾ وَلَقَدْ يَسَّرْنَا الْقُرْآنَ لِلذِّكْرِ فَهَلْ مِن مُّدَّكِرٍ ﴿٣٢﴾﴾.

## شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە شازدە بڕگەدا:

١)- ﴿كَذَّبَتْ ثَمُودُ بِالنُّذُرِ﴾، گەلی ثەموود ترساندنەکانیان، بە درۆ دانان، وشەی (ثَمُود)، حاڵەتە ئیعرابییەکەی ناگۆڕێ (مَمْنُوعٌ مِنَ الصَّرْف)، هۆکارەکەشی دووانن: (العَلَمِيَّةُ وَالتَّأنِيْثُ المَعْنَوِي)، عەلەم بوون و، مێینەی مەعنەوی بوون، چونکە (ثَمُود)، ناوی هۆزێک بووەو، لە ماناش دا مێینەیە لەبەر ئەوەی مانای (قبيلة)یە، ﴿كَذَّبَتْ ثَمُودُ بِالنُّذُرِ﴾، بۆیە ناڵێین: (ثَمُودٌ)، چونکە (غَيْر مُنْصَرِف)ە، گەلی ثەموود ئاگادار کردنەوەکانی خوایان بسم الله الرحمن الرحيم (کە بە صاڵیحدا نارد بوونی) بە درۆ دانان.

www.alibapir.com



(إبـن عاشـور) لێـرەدا ڕوونکردنەوەیـەک دەدات، لـە تەفسـیرەکەی خـۆی دا[1] و دەڵـێ: (والنُّـذُرُ: جَمْـعُ نَذِيـرٍ الَّـذِي هـو اسْـمُ مَصْـدَرِ أَنْـذَرَ، أَيْ كَذَّبُـوا بِالإنْـذاراتِ الَّتِـي أَنْذَرَهُـمُ اللَّـهُ بِها عَـلى لِسانِ رَسُولِهِ، ولَيْـسَ النُّـذُرُ هُنا بِصالِحٍ لِحَمْلِهِ عَـلى جَمْعِ النَّذِيـرِ بِمَعْنـى المُنْـذِرِ، لِأنَّ فِعْلَ التَّكْذِيـبِ إذا تَعَـدّى إلى الشَّـخْصِ المَنسُوبِ إلى الكَـذِبِ تَعَـدّى إلى اسْـمِهِ بِـدُونِ حَـرْفٍ، قـالَ تَعـالى: ﴿فَكَذَّبُوا۟ رُسُلِى ﴿٤٥﴾﴾ السَّـبأ، وقـالَ: ﴿وَإِن يُكَذِّبُوكَ ﴿٤٢﴾﴾ الحـج، وإذا تَعَـدّى إلى الـكَلامِ المُكَـذَّبِ، تَعَـدّى إلَيْـهِ بِالباءِ، قـالَ: ﴿وَكَذَّبْتُم بِهِۦ ﴿٥٧﴾﴾ الأنعـام، وقـالَ: ﴿وَكَذَّبَ بِهِۦ قَوْمُكَ وَهُوَ ٱلْحَقُّ ﴿٦٦﴾﴾ الأنعـام، وقـالَ: ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ كَذَّبُوا۟ بِـَٔايَٰتِنَا ﴿٤٠﴾﴾ الأعـراف، وهَـذا بِخِـلافِ قَوْلِهِ: ﴿كَذَّبَتْ ثَمُودُ ٱلْمُرْسَلِينَ ﴿١٤١﴾﴾، فـي سُـورَةِ الشُّـعَراءِ. والمَعْنـى: أنَّهـم كَذَّبُـوا إنْـذاراتِ رَسُـولِهِمْ، أيْ جَحَدُوهـا ثُـمَّ كَذَّبُـوا رَسُولَهم).

ڕوونکردنەوەیەکـی جوانـە، بۆیـە بـە باشـم زانی بیهێنـم و تەنیـا ئەمـەی ئێـرەش ناگرێتـەوە، بەڵکـو لـە هـەر شـوێنێکی دیکەشـدا هاتبـێ، ئـەو ڕوونکردنەوەیـەی (إبـن عاشـور) هێناویـەتی، بەسـەریدا دەچەسـپێ، (نُـذُر)، کـۆی (نَذِيـر)ە، کـە بریتیـە لـە نـاوی چاوگـی (أنْـذَر)، {واتـە: ترسـاندی یاخـود ئـاگاداری کـردەوە (فَهُـوَ نَذِيـرٌ)، ئـەو ترسـێنەرە، یـان (أَنْـذَرَهُ نَذِيـرًا، أي: إنْـذارًا)، بـە مانـای ئاگادارکردنـەوەو ترسـاندن} لێـرەدا ﴿كَذَّبَتْ ثَمُودُ بِٱلنُّذُرِ﴾ (أيْ: كَذَّبُـوا بِالإنْـذَارَاتِ الَّتِـي أَنْذَرَهُـمُ اللَّـهُ بِهَـا)، واتـە: گـەلی ثەمـوود ئـەو ترسـاندنانەی خـوا ﷻ ئـەوانی پـێ ترسـاندن و پـێ وریـا کردنـەوە، بـە درۆیـان دانـان، لێرەدا وشـەی (نـذُر)، گونجـاو نیـە، بڵێیـن: کـۆی (نَذِيـر) ی، بـە مانـای (مُنْـذِر)ە، {(مُنْـذِر)، واتـە: کەسـێکی ئاگادارکـەرەوە} چونکـە بـە درۆ دانـان، ئەگـەر پاڵبدرێتـە لای کەسـێک کـە بـە درۆ دانـدراوە، ئـەو کاتـە بەبـێ پیـت بـەرکار دەخـوازێ، بـۆ وێنـە: ﴿فَكَذَّبُوا۟ رُسُلِى ﴿٤٥﴾﴾، پێغەمبـەرانی منیـان بـە درۆ دانـان، هەروەهـا: ﴿وَإِن يُكَذِّبُوكَ ﴿٤٢﴾﴾، ئەگـەر تـۆ بـە درۆ دابنێـن، بـەڵام ئەگـەر وشـەی (تکذیـب)، بـەرکار بخـوازێ و بەرکارەکـەی بریتـی بـێ لـە قسـەیەک کـە بـە درۆ

---

[1] التحرير والتنوير: ج١١، ص(١٩٥ - ١٩٦).

www.alibapir.com


داندراوە، ئەو کاتە پێویستیی بەوە هەیە بە پیتی (ب)، ئەو بەرکارە بخوازێ، وەک ﴿وَكَذَّبْتُم بِهِۦ ۝٥٧﴾، {ئەو قسەیەتان بە درۆ دانا، ئەو قورئانەتان بە درۆ دانا} یان ﴿وَكَذَّبَ بِهِۦ قَوْمُكَ وَهُوَ ٱلْحَقُّ ۝٦٦﴾ {گەلەکەت بە درۆیان دانا، لە حاڵێکدا هەقیشە} ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ كَذَّبُوا۟ بِـَٔايَـٰتِنَا ۝٤٠﴾ {بە دڵنیاییی ئەوانەی کە ئایەتەکانی ئێمەیان بە درۆ دانان} بەڵام لێرەدا هەڵاواردنێک هەیە، لە سووڕەتی (الشعراء)دا، کە دەفەرموێ: ﴿كَذَّبَتْ ثَمُودُ ٱلْمُرْسَلِينَ ۝١٤١﴾ {ئەمـوود پێغەمبەرانیان بە درۆ دانان}[1] لێرەدا نەیفەرمووە: (**كَذَّبَتْ ثَمُود بِالْمُرْسَلِيْن**)، لێرەدا یانی: (**كَذَّبُوا إِنْذاراتِ رَسُولِهِمْ، أيْ: جَحَدُوها ثُمَّ كَذَّبُوا رَسُولَهم**)، گەلی ئەموود ئەو ئاگادارکردنەوەو ترساندنانەی پێغەمبەران (**عَلَيْهِمُ الصَّلَاةُ وَالسَّلَامُ**) هێنابوویانن، نکووڵییان لێکردن، دواییش پێغەمبەرەکەی خۆشیانیان بە درۆ دانا.

واتە: لە ئەصڵی زمانی عەرەبییدا (**نُذُر**)، کە کۆی (**نَذِیر**)ە، دەگونجێ بە مانای (**مُنْذِر**) بێ، واتە: کەسێک کە وریای کردوونەوەو ترساندوونی، دەشگونجێ (**نَذِیر**)، بە مانای (**إِنْذار**) بێ، واتە: ترساندن و ئاگادارکردنەوەو چاوگ بێ، لە ئەصڵی زمانی عەرەبییدا هەردووک واتایەکەی هەن، بەڵام لێرە لەبەر ئەوەی بە پیتی (**ب**)، بەرکارەکەی خواستوە، بەس بە مانای چاوگ (**مصدر**)ە (**إنذار**)، نەک بە مانای ترسێنەر (**منذر**) کەسێک کە ترساندوونی.

**٢)-** ﴿فَقَالُوٓا۟ أَبَشَرًا مِّنَّا وَٰحِدًا نَّتَّبِعُهُۥٓ﴾، گوتیان: ئایا یەک مرۆڤ لە خۆمان بە دوای بکەوین؟ لێرەدا پرسیارکردنەکە بۆ نکووڵیلێکردنە، ئنجا کە گوتوویانە: ﴿أَبَشَرًا مِّنَّا وَٰحِدًا﴾، ئایا مرۆڤێک تاک لە خۆمان؟ وشەی (**وَاحِداً**)، دوو واتای هەن:

**أ-** تەنیایەو کەسی لەگەڵ نیە.

**ب-** تاکێکە وەک هەموو تاکەکان، واتە: هیچ ئیمتیازێکی بەسەر ئێمەدا نیە.

---

[1] هەروەها ئەو تەعبیرە بۆ هەرکام لە: گەلی نووح، گەلی عاد، گەلی لووط، گەلی شوعەیبیش، هاتوە.

www.alibapir.com


٣)- ﴿إِنَّآ إِذًا لَّفِى ضَلَٰلٍ وَسُعُرٍ﴾، ئەگەر ئێمە بە دوای بکەوین، کەواتە: لە گومڕاییدایین و لە شێتییدایین، یانی: ئێمە گومڕاو سەرگەردانین و شێتین، چونکە (ضَلَاَل: أي الخَطَأُ وَعَدَمُ الإهْتِدَاء)، هەڵەو بە ڕێ نەزانین، (سُعُر)یش، بە مانای شێتیی (جُنُوُن) دێ، (مَسْعُور) یانی: (مَجْنُون)، شێت، یاخود (سُعُر)، بە مانای ئازارو سزاو مەینەتیی دێ.

٤)- ﴿أَءُلْقِىَ ٱلذِّكْرُ عَلَيْهِ مِنۢ بَيْنِنَا﴾، ئایا لەنێو ئێمەدا (ذِكر)، بۆ وی فڕێدراوە، هاویشتراوەتە سەر وی؟ واتە: لە ئاسمانەوە بۆ سەر وی دابەزیوە، لە حاڵێک دا ئێمە لەو شایستەترین، ئەو چییە تاکو ببێتە پێغەمبەری ئێمەو وریا کەرەوەو ترسێنەری ئێمە، ببێتە ڕابەرو سەرمەشقی ئێمە؟!

هەمیشە گەلە کافرەکان پێغەمبەرانیان (عَلَيْهِمُ الصَّلَاةُ وَالسَّلَام) بە پێوەری خۆیان، پێواون، پێوەری ئەوانیش ئەوە بووە: کێ دەستەڵاتی زیاترە؟ کێ سەروەت و سامانی زیاترە؟ کێ قەبەترە؟ کێ خزم و خەڵکی زیاترە؟ بەڵام پێوەر لەلای خوا ﷻ خودی مرۆڤەکان و ناخ و چییەت و مەعدەن و کەسایەتییانە، چونکە بە زۆریی سەروەت و سامان، ئێستاش و ئەو کاتیش، بە شێوەی ناشەرعیی وەسەرێک نراوەو، دەستەڵات بە زۆریی بەخۆ سەپاندن بووەو، خەڵک و قەڵەباڵغیی بە زۆریی لە دەستەڵات و لە سەروەتەکە خڕ بۆتەوە، ئەوەش نەک ئیمتیاز نیە، بەڵکو نیشانەی نوقسانیی بوون بۆ ئەو خەڵکانە، بەڵام ئەوەی جێی سەرنجی خوا ﷻ بووە: ﴿ٱللَّهُ أَعْلَمُ حَيْثُ يَجْعَلُ رِسَالَتَهُۥ ١٢٤﴾ الأنعام، خوازاناترە پەیامی خۆی لە کوێ دادەنێ، کێ عەقڵی باشتر بووەو، ناخی پاکتر بووەو، مەعدەنەکەی چاکتر بووەو، بۆ خوا سوڵحاوتر بووە، سافتر و ڕێکتر بووە، خوا ﷻ ئەوانەی کردوە بە پێغەمبەری خۆی، لەدوای پێغەمبەرانیش خوا ﷻ هەر ئەوانە دەکات بە جێنشینی پێغەمبەران، کە بە سیفەتە پەسندە مەعنەوییەکان لە خەڵکی دیکە جیادەبنەوەو، لە ڕووی مەعنەوییەوە لە خەڵکی دیکە چاکترن و، ڕەوشتیان بەرزترەو، ناخیان پاکترەو بۆ خەڵک دڵسۆزترن و، عەقڵیان بەهێزترە!

www.alibapir.com


﴿ أَءُلْقِيَ ٱلذِّكْرُ عَلَيْهِ مِنۢ بَيْنِنَا ﴾، ئایا لە نێو ئێمەدا (ذِكر)، {بیرخستنەوە، یاخود پەیامی خوا} دابەزێنراوەتە سەر وی، فرێدراوەتە سەر وی؟!

٥)- ﴿بَلْ هُوَ كَذَّابٌ أَشِرٌ﴾، بەڵکو ئەو درۆزنێکی خۆپەسندە، [یان خۆ بەزلگرە]، (كَذَّاب أي: كَثِيْرُ الكَذِبْ)، واتە: زۆر درۆکەر، بە کوردیی دەڵێین: درۆزن، (أشِر أي: فَرِحٌ وَبَطِرٌ وَمُعْجَبٌ بِنَفْسِه، وَمُدَّعٍ مَا لَيْسَ فِيْهِ)، (أشِر): لە زمانی عەرەبییدا دەبێتە زۆر دڵخۆش، لە خۆ ڕازیی و شانازیی بەخۆوەکەر، بە خۆ سەرسام و، لاف لێدەر بە شتێک، کە ئەو شتەی تێدا نەبێ، حاشای صاڵیح ﷺ کە پێچەوانەی هەموو ئەو سیفەتە خراپانە بووە، بۆیە خوا ﷻ دەفەرموێ:

٦)- ﴿سَيَعْلَمُونَ غَدًا مَّنِ ٱلْكَذَّابُ ٱلْأَشِرُ﴾ لە مەودوا دەزانن کێ درۆزنی خۆپەسندو لە خۆڕازییە! (سَيَعْلَمُونَ)، خوێندراویشەتەوە: (سَتَعْلَمُون)، بەشێوەی دواندنی ڕووبەڕوو، نەک بە شێوەی دواندنی نادیار، ﴿سَيَعْلَمُونَ غَدًا﴾، بەیانی دەزانن، ﴿مَّنِ ٱلْكَذَّابُ ٱلْأَشِرُ﴾، کێیە درۆزنی لە خۆڕازیی! ئەمە بێگومان گوتراوی قسەیەکی قرتێندراوە: گوتمان: بەیانی دەزانن، (غَداً: زَمَن المُسْتَقْبَلِ القَرِيْب)، مەبەست لە (غداً)، کە بە کوردیی دەبێتەوە: بەیانی و، سبەینێ، یانی: کاتی داهاتوویەکی نیزیک.

٧)- ﴿إِنَّا مُرْسِلُوا۟ ٱلنَّاقَةِ فِتْنَةً لَّهُمْ﴾، ئێمە نێرەری حوشترەکەین، وەک تاقیکردنەوە بۆیان، ئەمە ڕوونکردنەوەی ئەوەیە، کە بەسەریان دێ و، سەرەتاو دەستپێکی بەڵایەکەیانە.

(نَاقَةِ): (أل)ەکەی، (أل)ی ناساندنە، واتە: حوشترە زاندراوو ناسراوەکە کە حوشترێکی تایبەت بووە، ﴿فِتْنَةً لَّهُمْ﴾، حوشترەکە تاقیکردنەوەیە بۆ ئەوان.

٨)- ﴿فَٱرْتَقِبْهُمْ وَٱصْطَبِرْ﴾، ئەی صاڵیح! تۆش چاوەڕێیان بەو خۆڕاگربە، (الإِرْتِقابُ: الإنْتِظار)، (إرْتِقاب)، بە مانای چاوەڕێکردنە، (ارْتَقَبَ مِثْلُ: رَقَبَ، وهو أبْلَغُ دَلالَةً مِن رَقَبَ، لِزِيادَةِ المَبْنى فِيهِ)، (ارْتَقَبَ): بە مانای (رَقَبَ)یە، (رَقَبَ)، یانی: چاوەڕێی کرد، یان چاودێریی کرد، بەڵام (ارْتَقَبَ)، لە (رَقَبَ)، مانایەکەی بەهێزترە، لەبەر ئەوەی پیتەکانی زیاترن.

www.alibapir.com


٩)- ﴿وَنَبِّئۡهُمۡ أَنَّ ٱلۡمَآءَ قِسۡمَةُۢ بَيۡنَهُمۡ﴾، هەواڵیشیان پێ بدە، کە ئاو دابەش کراوە لە نێوانیاندا، (أي: بَيْنَ أَهْلِ القَرْيَةِ وَالنَّاقَةِ بِتَغْلِيْبِ ضَمِيْرِ العُقَلاَءِ)، (بَيْنَهُمْ)، لێرەدا ڕاناوی خاوەن عەقڵان، زاڵکراوە بەسەر هی ئەوانەدا کە عەقڵ و هۆشیان نیە، کە حوشترەکەیە، واتە: ئاوەکە دابەشکراوە لە نێوانیاندا.

دوایی باسی چۆنیەتیی دابەشکردنەکە دەکات:

١٠)- ﴿كُلُّ شِرۡبٖ مُّحۡتَضَرٞ﴾، هەر نۆرە ئاوێک، لەلا ئامادە بوویە، واتە: هەر نۆرە ئاوێک، هەر بەشە ئاوێک، خاوەنی خۆی لە لای ئامادە دەبێ و، ئەوی دیکە لەو کاتەدا نایەت، (قِسْمَةٌ بَيْنَهُمْ: مَقْسُومٌ، فَهُوَ مِنَ الإِخْبَارِ بِالمَصْدَرِ لِلتأْكِيدِ والمُبالَغَةِ) یانی: هەواڵیان پێبدە کە ئاوەکە دابەشکراوە لە نێوانیاندا، ئەمە لە جۆری هەواڵپێدانە بە چاوگ، بۆ زیاتر جەختکردنەوەو زێدەڕۆییکردن، واتە: دەبێ بزانن کە ئاوەکە دابەش دەکرێ لە نێوانیاندا ﴿كُلُّ شِرۡبٖ مُّحۡتَضَرٞ﴾، (شِرْب: النَّصِيْبُ مِنَ شِرْبُ المَاء)، پشک و بەش لە خواردنەوەی ئاو، نۆرە ئاو، (المُحْتَضَرُ: اسْمُ مَفْعُولٍ مِنَ الحُضُورِ، وَهُوَ ضِدُّ الغَيْبَةِ، والمَعْنى: مُحْتَضَرٌ عِنْدَهُ)، وشەی (مُحْتَضَر): ناوی بەرکارە، لە وشەی (حُضُور)ەوە هاتوە، (حُضُور)یش واتە: ئامادە، پێچەوانەی (غَيْبَة)یە، بە مانای نا ئامادە، نادیار (أي مُحْتَضَرٌ عِنْدَهُ)، هەر نۆرە ئاوێک لە لا ئامادە بوویە، واتە: خاوەنی خۆی لەلای ئامادە دەبێ و ئەوەی دیکە نابێ لەو کاتەدا لەوێ بێ.

١١)- ﴿فَنَادَوۡاْ صَاحِبَهُمۡ﴾ {گەلی ثەموود} هاوەڵەکەی خۆیانیان بانگ کرد، بۆچی فەرموویەتی: (صاحبهم)؟ (صَاحِبَهُمْ: الَّذِي صَحِبُوهُ ورضوهُ)، واتە: هاوەڵەکە کە دەیانناسیی و هاوەڵیان بوو و لێی ڕازی بوون بە کارەکەی و کردیانە نوێنەری خۆیان، کە هەندێک دەڵێن: ناوی {قوودداری کوڕی سالیف} بووە، بەڵام لە هیچ سەرچاوەیەکی متمانە پێکراودا نەهاتوە، هەروەها هەندێک گوتوویانە: (أحَيْمِر)، بابایەکی سوورکار بووە، ئەوەش دیسان لە هیچ سەرچاوەیەکدا نەهاتوە، گرنگ ئەوەیە کەسێک بووە لە هەموویان خراپتر بووە، بۆیە لەویان ڕا بینیوە، دەست بۆ

www.alibapir.com


ئەو حوشترە درێژ بكات، كە خوا ﷻ بە تایبەت لە گاشە بەردێک، لە چیایەک بۆ صاڵیح هێناویەتەدەر، لەسەر داوای خەڵكەكە كە داوای موعجیزەیان لێ كرد، وەک كاتی خۆی لەبەسەرهاتی صاڵیح ﷺ و گەلەكەی ثەموودا، باسمانكردوە لە سوورەتی (الحجر)دا.

**١٢)-** ﴿فَتَعَاطَىٰ فَعَقَرَ﴾ دەستی گەیاندێ و پەی كرد (عَطَى يَعْطُوا أي: تَنَاوَل)، (عَطَى يَعْطُوا)، واتە: دەستی گەیاندێ وەریگرت، ئنجا مەبەست ئەوەیە شمشێری وەرگرت، چەقۆی وەرگرت، یاخود دەستی پێكرد، ﴿فَتَعَاطَىٰ فَعَقَرَ﴾، (عَقَر)، پەی كرد، نەیفەرموە: (نَحَر)، (ذَبَح)، چونكە: (نَحْر)، بە مانای سەربڕینی حوشترەو (ذَبْح)، سەربڕینی جگە لە حوشترە، بەڵام (عَقْر)، ئەوەیە حوشتر پەی بكرێ، واتە: لە پەلەكانی - بە تایبەت لە پاشووەكانی -بدرێ، حوشتر ئەگەر لە لاقەكانی پشتەوەی درا، دەكەوێ و سەربڕینی ئاسان دەبێ، بۆچی خوای تاک و پاک فەرموویەتی: (فَتعَاطَى)؟! پسپۆڕانی ڕەوانبێژیی گوتوویانە: بۆئەوەی ترسانی خەڵكەكەو دڵ لە دڵدانیان بچوێنرێ بە خەڵكێكەوە كە هەر كامێكیان، بەوی دیكەیان، بڵێ: تۆ بیكە، ئەویش بڵێ تۆ بیكە، یان هەركامیان ئاماژە بۆ ئەوەی دیكە بكات، چونكە ترساون و زانیویانە بەڵایان بەسەر دێ، یاخود بە لای كەمەوە ئەگەریان داناوە، بەڵایان بەسەر بێ.

(**العَقْرُ: أَصْلُهُ ضَرْبُ البَعِيرِ بِالسَّيْفِ عَلَى عَرَاقِيبِهِ لِيَسْقُطَ إلى الأرْضِ جَاثِياً فَيَتَمَكَّنَ النَّاحِرُ مِن نَحْرِهِ**)، (عَقْر): لەبنەڕەت دا بریتیە لەوە كە لە پاشووەكانی حوشتر بدرێ، تاكو بكەوێتە سەر زەوی و بەسەر چۆكدا بكەوێ و، بابای سەربڕ ئاسانتر بتوانێ سەری ببڕێ.

**١٣)-** ﴿إِنَّآ أَرْسَلْنَا عَلَيْهِمْ صَيْحَةً وَٰحِدَةً﴾، ئێمە یەک هاڕژن (یاخود: یەک بڵێسە)ی گەورەمان ناردە سەریان، لێرەدا بە (صَيْحَة) هێناویەتی، واتە: هاڕژن و دەنگێكی زۆر زەبەلاح، بەڵام لە هەندێک شوێن دا فەرموویەتی: (صاعقة): ﴿فَأَخَذَتْهُمْ صَٰعِقَةُ ٱلْعَذَابِ ٱلْهُونِ ۝١٧﴾ فصلت، (صاعقة)، واتە: بڵێسەیەک ئاگر، لە شوێنی دیكەش دەفەرموێ:

www.alibapir.com


(طاغية): ﴿فَأَمَّا ثَمُودُ فَأُهْلِكُوا بِالطَّاغِيَةِ ﴿٥﴾﴾ الحاقة، (الطَّاغِيَة)، بەڵایەکی لە سنوور دەرچوو، لە شوێنی دیکەش دەفەرموێ: (الرَّجفة): ﴿فَأَخَذَتْهُمُ الرَّجْفَةُ ﴿٧٨﴾﴾ الأعراف، (رَجْفَةٌ)، لەرزینەوە، ئنجا ئەگەر کەسێک سادەو سەرکێڵ و نە شارەزا بێ، دەڵێ: ئایا چۆنە خوا چوار وشەی بەکارهێناون؟

لە شوێنێک دەفەرموێ: (صَيْحَةٌ)و، لە شوێنێک دەفەرموێ: (صَاعِقَةٌ)و، لە شوێنێک دەفەرموێ: (طاغِيَة)و، لە شوێنێک دەفەرموێ: (رَجْفَةٌ)، بەڵکو لە سووڕەتی (الشمس)دا، وشەیەکی دیکەی پێنجەمیش هاتووە: ﴿فَدَمْدَمَ عَلَيْهِمْ رَبُّهُم بِذَنبِهِمْ فَسَوَّاهَا ﴿١٤﴾﴾، (فَدَمْدَمَ)، یانی: (زلزل)؟

دەڵێین: ئەوانە هەموویان یەکن، بەڵام خوا ﷻ بەپێی کەش و سیاقەکان هەرجارە وشەیەکی هەڵبژاردووە، هەموویان تەعبیر دەکەن لە یەک ڕاستیی، بەڵام هەر وشەیەکیان تەعبیر دەکات لەلایەکی ئەو ڕاستییە، وەک کەسێک زاناش بێ و ئازاش بێ و خێرخوازیش بێ و خوا پەرستیش بێ، یەکێک بڵێ: فلانکەس زۆر خواپەرستە، ئەوەی دیکە بڵێ: زۆر ئازایە، ئەوەی دیکە بڵێ: زۆر سەخییە، ئەوەی دیکە بڵێ: زۆر زانایە، ئەوانە هەموویان وەسفی یەک کەسن و هەر کامێکیان وەسفی لایەنێکی دەکات، لێرەشدا خوا ﷻ ئەو بەڵایەی گەلی ثەموودی پێ فەوتاندوە، ناوی لێناوە: هاڕژن هاڕژنێکی گەورە، ئەو هاڕژن و دەنگە گەورەیەش، لە بلێسەیەکی ئاگرەوە بووەو، سزایەک بووە لە سنوور دەرچووەو، لەرزینەوەی لێ پەیدا بووەو، سەرەنجام حاڵەتێکی بوومەلەرزەش بووە، کەواتە: هەموو ئەو وەصفانە دەگەڕێنەوە بۆ ئەو سزایەو هەر کامێکیان لە ڕوویەکەوە باسی دەکات.

١٤)- ﴿فَكَانُوا كَهَشِيمِ الْمُحْتَظِرِ﴾، سەرەنجام بوونە پووش و پەڵاشی تێکشکێنراوی بابای خاوەن ئاغەڵ، یان ئاغەڵ دروستکەر، (**الهَشِيمُ: مَا يَبُسَ وَجَفَّ مِنَ الكَلأ ومِنَ الشَّجَرِ، وهو مُشْتَقٌّ مِنَ الهَشْمِ وهو الكَسْرُ**)، (**هَشِيمُ**)، هەر شتێکی وشکە لە پووش و پەڵاش

www.alibapir.com



و دارو درەخت، کە تێک دەشکێنرێ و، لە (هَشْمِ)ەوە هاتوە، یانی: (كَسْرُ)، شکاندن، (المُحْتَظِر: مُفْتَعِلٌ مِنَ الحَظِيرَةِ، أيْ مُتَكَلِّفٌ عَمَلِ الحَظِيرَةِ)، (محتظر) کەسێکە (حَظِيرَة)، دروست دەکات، واتە: ئاغەڵ، کە پووش و پەڵاش و چڵوێی تێ دەکات، بۆ ئاژەڵەکانی.

لە سوورەتی (الشعراء)دا، خوا ﷻ ئاوا باسی گەلی ثەموود دەکات، کە صاڵیح پێی گوتن: ﴿قَالَ هَٰذِهِۦ نَاقَةٌ لَّهَا شِرْبٌ وَلَكُمْ شِرْبُ يَوْمٍ مَّعْلُومٍ ﴿١٥٥﴾ وَلَا تَمَسُّوهَا بِسُوٓءٍ فَيَأْخُذَكُمْ عَذَابُ يَوْمٍ عَظِيمٍ ﴿١٥٦﴾ فَعَقَرُوهَا فَأَصْبَحُوا۟ نَٰدِمِينَ ﴿١٥٧﴾ فَأَخَذَهُمُ ٱلْعَذَابُ ﴿١٥٨﴾﴾، واتە: ئەمە حوشترێکە، نۆرە ئاوێکی هەیە، ئێوەش نۆرە ئاوی ڕۆژێکی دیاریکراوتان هەیە، بە خراپە دەستی بۆ مەبەن، ئەگەرنا سزایەکی بە ئێشتان تووش دەبێ، کەچی ئەوان پەییان کرد، سەرەنجام پەشێمان بوونەوەو، سزاو ئازارگرتنی.

سەرەنجام خوا دەفەرموێ:

١٥)- ﴿وَلَقَدْ يَسَّرْنَا ٱلْقُرْءَانَ لِلذِّكْرِ﴾، بە دڵنیایی قورئانمان بۆ خوێندن و لەبەر کردن و، لێتێگەیشتن و پەند لێوەرگرتن، ئاسانکردوە.

١٦)- ﴿فَهَلْ مِن مُّدَّكِرٍ﴾، ئنجا ئایا کەس هەیە بیری لێ بکاتەوەو لێی تێبگات و، پەندی لێوەربگرێ؟! ئەو پرسیارکردنەی خوای موتەعال بەنسبەت ئەوانەوە، واتە: کەم کەسی وا هەیە و کەم کەس هەبووە بە درێژایی مێژوو، قەدری کتێبەکانی خوا وەک پێویست بزانێ، خوا لەو کەسانەمان بگێڕێ کە قەدری کتێبی خواو، فەرمایشتی خوا وەک پێویست دەزانن و لێی بەهرەمەند دەبن.

لە کۆتایی بەسەرهاتی گەلی ثەموود و صاڵحی برایان ﷺ دا، دوو مەسەلە هەبوون، بە پێویستم زانی بیانخەمەڕوو:

١- وشەی (المُحْتَظِرِ) لەسەر کێشی ناوی بکەر (اسْمُ فَاعِلِ)، دەبێتە (صَاحِبُ الحَظِيْرَة)، خاوەنی ئاغەڵ، خاوەنی ئەو شوێنەی گژو گیاو لەوەڕی بۆ ئاژەڵ تێدا کۆ دەکرێتەوە، بەڵام هەندێک لە زانایان بە (المُحتَظَر)یان، خوێندوّتەوە، وەک: حەسەنی بەصرایی و قەتادە و ئەبوو عالیە، کە بە: (كَهَشِيْمِ المُحْتَظَر)یان خوێندوّتەوە، ئەو کاتە

www.alibapir.com


(**محتظر**) دەبێتە ناوی بەرکار (**إسم مفعول**)و بە مانای (**حَظِيْرَة**) دێ، واتە: خودی ئاغەڵەکە، (**كَهَشِيْم المُحْتَظَر**)، واتە: پووش و پەڵاشی تێکشکێنراوی نێو ئاغەڵ، بەڵام خوێندنەوەی باو ئەوەیە کە بە: (**المُحْتَظِر**) بخوێندرێتەوە.

**٢**-فەرمایشتێک لەبارەی حوشترەکەی پێغەمبەر صاڵیحەوە عليه السلام هەیە، بەپێویستم زانی بیهێنم:

{**عَن جَابِر بن عبد الله** رضي الله عنهما**، قَالَ: لَمَا نَزَلْنَا الحِجْرَ فِي مَغْزَى رَسُولِ الله** صلى الله عليه وسلم **تَبُوكَ، قَالَ: «أَيُّهَا النَّاسُ! لاَ تَسْأَلُوا عَن هَذِهِ الآيَاتِ، هَؤُلاَءِ قَوْمُ صَالِحٍ، سَأَلُوا نَبِيَّهُم أَن يَبْعَثَ اللَّهُ لَهُم نَاقَةً، فَبَعَثَ اللَّهُ لَهُم نَاقَةً، فَكَانَتْ تَرِدُ مِن ذَلِكَ الفَجِّ، فَتَشْرَبُ مَاءَهُم يَوْمَ وُرُودِهَا، وَيَحْلِبُونَ مِنْهَا مِثْلَ الَّذِي كَانُوا يَشْرَبُونَ مِنْهَا يَوْمَ غِبِّهَا**} (**أخرجه أحمد: ج٣، ص٢٩٦، وابن حبان: ٦١٩٧، والحاكم في المستدرك: ٣٢٤٨، ٤٠٧٠، وقال الهيثمي في المجمع: ج٦، ص١٩٤، رواه البزار والطبراني في الأوسط وأحمد بنحوه، ورجالُ أحمدٍ رجال الصحيح**).

واتە: جابیری کوڕی عەبدوڵڵا (خوا لە خۆی و بابی ڕازی بێ)، دەڵێ: کاتێک لە ناوچەی حیجر دابەزین، لە کاتی غەزای پێغەمبەری خوادا صلى الله عليه وسلم بەرەو تەبووک، فەرمووی: ئەی خەڵکینە! داوای ئەو موعجیزەو نیشانانە مەکەن (وەک هی گەلانی ڕابردوو) ئەمانە گەلی صالیح بوون، داوایان لە پێغەمبەرەکەیان کرد، حوشترێکیان بۆ بڕەخسێنێ، خواش عزوجل حوشترەکەی بۆ ڕەخساندن، کە لەم دۆڵەوە دەهاتە سەر ئاو {پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم ئاماژەی کردوە بە شیوێک و دۆڵێک} و، لە ئاوەکەیانی دەخواردەوە، لەو ڕۆژەدا کە نۆرەی ئاوی بوو، (نۆرەی ئاو خواردنەوەی بوو)، ئەو ڕۆژەش کە نۆرە ئاوی نەدەبوو، بە ئەندازەی ئەوە، کە ئاوی دەخواردەوە، شیریان لێی دەدۆشی.

پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم ئاماژە بەوە دەکات کەچی ئەو موعجیزەو نیشانەیەی خوا کە داوایان کردبوو، دوایی هەر خۆشیان دەست درێژییان کردە سەری، کە پێغەمبەرەکەیان صالیح عليه السلام وەک موعجیزە پێیدرابوو، بەس خۆشیان لێی بەهرەمەند بوون! سەرەنجام ئەو بەڵایەیان بەسەر خۆیان هێنا!

www.alibapir.com



## مەسەلەی چوارەم:

**بێبڕوایی گەلی لووط بە پێغەمبەرەکەیان، لووط ﷺ و، هۆشدارییەکەی و، بەردەوام بوونیان لەسەر تاوانی نێربازیی و تەماعکردنیانە فریشتە میوانەکانی لووط ﷺ و، سەرەنجام کوێرو کوتر کرانیان، دوای دەربازکرانی لووط و نیزیکانی پێش بەرەبەیان و، دەمەو بەیانی زووش، نێردرانی بایەکی بەهێزی بەردو چەو ڕامالەرو قەلاچۆکران و بنبڕکرانیان:**

خوا دەفەرمووێ: ﴿كَذَّبَتْ قَوْمُ لُوطٍ بِالنُّذُرِ ﴿٣٣﴾ إِنَّا أَرْسَلْنَا عَلَيْهِمْ حَاصِبًا إِلَّا آلَ لُوطٍ نَجَّيْنَاهُمْ بِسَحَرٍ ﴿٣٤﴾ نِعْمَةً مِنْ عِنْدِنَا كَذَلِكَ نَجْزِي مَنْ شَكَرَ ﴿٣٥﴾ وَلَقَدْ أَنْذَرَهُمْ بَطْشَتَنَا فَتَمَارَوْا بِالنُّذُرِ ﴿٣٦﴾ وَلَقَدْ رَاوَدُوهُ عَنْ ضَيْفِهِ فَطَمَسْنَا أَعْيُنَهُمْ فَذُوقُوا عَذَابِي وَنُذُرِ ﴿٣٧﴾ وَلَقَدْ صَبَّحَهُمْ بُكْرَةً عَذَابٌ مُسْتَقِرٌّ ﴿٣٨﴾ فَذُوقُوا عَذَابِي وَنُذُرِ ﴿٣٩﴾ وَلَقَدْ يَسَّرْنَا الْقُرْآنَ لِلذِّكْرِ فَهَلْ مِنْ مُدَّكِرٍ ﴿٤٠﴾﴾.

## شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە پازدە بڕگەدا:

١)- ﴿كَذَّبَتْ قَوْمُ لُوطٍ بِالنُّذُرِ﴾، گەلی لووط‌یش بە ترساندنەکان (یان بە ترساندنی خوا ﷻ) بێبڕوابوون، (نُذُر)، کۆی (نَذِيْر)ە، هەرچەندە دەشگونجێ بەمانای (نَذِيْر)ی واتا (مُنْذِر) ناوی بکەر (اسْمُ فَاعِل) بێ، بەڵام لێرەدا هەر بە مانای (إِنْذَار)ە، واتە: ترساندن و وریا کردنەوە، ئنجا ئەگەر مانایەکەی کۆ (جمع)ش بێ، یانی: (إِنْذَارَات) ترساندنەکان و ئاگادارکردنەوەکانی خوا ﷻ، چونکە پێشتریش باسمان کرد، کەوشەی (كَذَّبَ)، کاتێک بەرکار (مفعول) دەخوازێ، ئەگەر ئەو بەرکارە خودی شتە بە درۆ دانراوەکە بێ، پێویستیی بە پیتی (ب) دەکات، بەڵام ئەگەر ئەو کەسە بێ کە بە درۆ دادەنرێ، ئەو کاتە بۆ بەرکار خواستنی حەوجێی (ب) نیە، بۆیە لێرەدا ئەو ئەگەرە نیە، کە مەبەست لە (نُذُر)، ترسێنەران و وریاکەرەوان بن، کە پێغەمبەرانن (عَلَيْهِمُ الصَّلَاةُ وَالسَّلَام)، بەڵکو مەبەست وریاکردنەوەی خواو، ترساندنی خوایە، ئەگەر (نذر) چاوگ بێ، یاخود: ترساندنەکانی خواو وریاکردنەوەکانی خوایە، کە بە لووط دا ﷺ، بۆ

www.alibapir.com


گەلەكەی نێررابوون، ئەگەر (نذر) كۆی (إنذار) بێ، بۆیەش لە قورئاندا، خوا گەلەكەی **لووطی** پاڵداوەتە لای لووط ﷺ، چونكە ناوێكی دیكەیان نەبووە، لە لای گەلی عەرەب، كە لەو كات و ساتەدا پێی بناسرێن، بۆ وێنە: گەلی عاد، ناویان عاد بووە، گەلی ثەموود ناویان ثەموود بووە، گەلی مەدیەن ناویان مەدیەن بووە، یان (**أَصْحَاب الأَيْكَة**)، بەڵام گەلی **لووط** ناوێكی دیكەیان نەبووە، بۆیە بەهۆی پێغەمبەرەكەیانەوە كە لووطـە ﷺ ناسێنراون.

**٢)-** ﴿إِنَّآ أَرْسَلْنَا عَلَيْهِمْ حَاصِبًا﴾، ئێمە بایەكی چەو ڕامالەرمان نارده سەریان، (**الحَاصِبُ: الرِّيحُ الَّتِي تَأْتِي بِالحِجَارَةِ وَالحَصْبَاء، وَالمُرَادُ بِهِ: الرِّيحُ الَّتِي رَمَتْهُمْ بِسِجِّيْلٍ مَنْضُود، وَالحَاصِبُ: الرِّيحُ الَّتِي تَحْصِبُ، أَيْ: تَرْمِي بِالحَصْباءِ**)، ﴿إِنَّآ أَرْسَلْنَا عَلَيْهِمْ حَاصِبًا﴾، ئێمە (**حاصب**)مان نارده سەریان، (**حَاصِب**) كە بە نەزانراو (**نَكِرَة**)، هاتووە، واتە: بایەك كە بەردو چەوی فڕێ دەدات (**حَصَبة**)، یانی: بەردی پێ دادا، بەردووچكە، ئنجا (**حَاصِب**) كە ئەو بایەیە بەردو چەو هەڵدەگرێ و فڕێی دەدات، لێرەدا دەگونجێ مەبەست پێی ئەوە بێ، كەخوا ﷻ باسی دەكات: ﴿حِجَارَةً مِّن سِجِّيلٍ مَّنضُودٍ﴾ هود، بەردێك كەلە قوڕی وشك كراوە بوو، ڕیز بەستوو، یان: ﴿مُّسَوَّمَةً﴾ نیشانەدار كراو، بوو، دەگونجێ مەبەست پێی ئەوە بێ و، دەشگونجێ مەبەست پێی ئەوە بێ كە ئەو بایە هێندە بەهێز بووە، هەموو شتێكی ڕامالیوە، ئنجا ئەگەر هەردوو مەبەستەكەش هەبن، لە یەك كاتدا، تێك ناگیرێن، چونكە گەلی **لووط** هەم بەردیان بەسەردا بارێنرا، بەردێ كە لە قوڕی وشك كراوە، دروست بوو بوو، (**سِجِّيْل**) (سەنگی گڵ)[1]ە، یانی: بەردی لە قوڕ دروستكراو، بایەكەش دیارە بەهێز بووەو هەموو شتێكی ڕامالیوە.

**٣)-** ﴿إِلَّآ ءَالَ لُوطٍ﴾، جگە لە ئالی لووط، واتە: شوێنكەوتووەكانی **لووط**، خەڵكە تایبەتەكەی **لووط**، چونكە (**آل الرَّجُلُ أي: أَتْبَاعُهُ وَخَاصَّتَهُ**)، (**آل الرَّجُل**)، واتە: ئەوانەی شوێنكەوتووی پیاوێكن و تایبەتن، زۆر لێیەوە نزیكن، لە ڕووی ئیمان و عەقیدەو

---

(١) لـە شـوێنی دیكـەدا بەدرێـژی باسـی (سـجیل)مان كـردوە، كـە لـە (سـنگ گل)ی فارسـیی و كوردییـەوە هاتـوە.

www.alibapir.com


هەڵسوکەوت و ئاکارەوە، کە مەرج نیە، تەنیا بۆ مەدح بێ، خوا عزو جل باسی ئالی فیرعەون دەکات، ئەوانەی کە بە ڕاستیی لەگەڵ فیرعەون دابوون: ﴿أَدْخِلُوٓاْ ءَالَ فِرْعَوْنَ أَشَدَّ ٱلْعَذَابِ ﴿٤٦﴾﴾ **غافر**، باسی ئالی نووح ﷺ و، ئالی ئیبراهیم ﷺ دەکات: ﴿إِنَّ ٱللَّهَ ٱصْطَفَىٰٓ ءَادَمَ وَنُوحًا وَءَالَ إِبْرَٰهِيمَ وَءَالَ عِمْرَٰنَ عَلَى ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿٣٣﴾﴾ **آل عمران**، واتە: ئەوانەی بە ساغیی لەگەڵ نووح و ئیبراهیم دابوون (**عَلَيْهما الصَّلَاةُ وَالسَّلَام**)، وشەی (آل)یش تەنیا پاڵ دەدرێتە لای شەخص، بەڵام (**أهل**) پاڵدەدرێتە لای ماڵ، کە لە دوو شوێندا لە قورئاندا: (**أَهْل البَيْت**) هاتوە، جارێکیان لە سوورەتی (**الأحزاب**)دا، کە وەصفی هاوسەرانی بەڕێزی پێغەمبەرە ﷺ و، جارێکیان لە سوورەتی (**هود**)دا، کە مەبەست پێی هاوسەری ئیبراهیمە ﷺ، بەس ئەو دوو جارە بە (**أَهْلَ البَيْت**) هاتوە، کە مەبەست پێیان هاوسەرە!

هەر بۆیە شیعە کە پێیان وایە: (**آل النَّبِي**)، یانی: (**أَهْل البَيْت**)، ڕاست نیە، بەڵکو ئەهلی پیاو، واتە: ژن و خێزانەکەی، بەڵام ئالی کەسێک واتە: شوێنکەوتووانی ئەو کەسەو، پێشتریش گوتمان: (آل) تەنیا بۆ مەدح نیە، بەڵکو جاری وایە بۆ زەممە: ﴿أَدْخِلُوٓاْ ءَالَ فِرْعَوْنَ أَشَدَّ ٱلْعَذَابِ ﴿٤٦﴾﴾ **غافر**، ئالی فیرعەون (فیرعەون و شوێنکەوتووانی) بخەنە نێو سەختترین سزاوە، کەواتە: لێرە کە دەفەرموێ: ﴿إِلَّآ ءَالَ لُوطٍ﴾، جگە لە شوێنکەوتووانی لووط ﷺ، هەڵبەتە دەشگونجێ خزمانی کەسێک، شوێنکەوتووانیشی بن و، دەشگونجێ خزمەکانی شوێنی نەکەون، وەک ئەبوو لەهەب مامی پێغەمبەر بوو ﷺ، شوێنیشی نەکەوت، هەروەها ئازەر بابی ئیبراهیم بوو ﷺ، و کەنعان کوڕی نووح بوو و، هەردوو ژنی نووح و لووط هاوسەری ئەو دوو پێغەمبەرە پایە بەرزە بوون، بەڵام بە ئالی ئەوان لە قەڵەم نادرێن، چونکە شوێنکەوتوویان نەبوون.

٤)- ﴿نَّجَّيْنَٰهُم بِسَحَرٍ﴾، ئێمە نیزیکانی لووطمان، شوێنکەوتووانی لووطمان پێش بەرە بەیان دەربازکردن، (**سَحَر: آخِرُ اللَّيْلِ، وَجَاءَ مُنْصَرِفَاً لأَنَّهُ نَكِرَة**)، بۆیەش دەفەرموێ: ﴿نَّجَّيْنَٰهُم بِسَحَرٍ﴾، ئێمە کاتی سەحەر، لە کۆتایی شەودا دەربازمان کردن، یانی: حاڵەتی گۆڕانی

www.alibapir.com


چۆتە سەرو تەنوینی قبووڵکردوە، لەبەر ئەوەی مەبەست پێی سەحەرێکی دیارییکراو نەبووە، بەڵکو مەبەست پێی کۆتایی شەو بووە، نەک کۆتایی شەوێکی دیارییکراو، ئەگەر مەبەست پێی کۆتایی شەوێکی دیارییکراو بووایە ئەو کاتە لەبەر ناوی عالەم بوون و کێش (**العَلَميَّة والوزن**) دەبوو بە (**غَيْرَ مُنْصَرِف**)و دەیفەرموو: (**نَجَّيْنَاهُمْ بِسَحَر**).

٥)- ﴿نِّعۡمَةٗ مِّنۡ عِندِنَاۚ﴾، ئەوە چاکەیەک بوو لە لایەن ئێمەوە لەگەڵ لووط ﷺ و شوێنکەوتووەکانیمان دا کرد، لێرەدا (**نِعْمَةً**)، کە (**مَنْصُوب**)ە، لەسەر حاڵبوون (**الحاليّة**) (**مَنْصُوب**)ە، کە حاڵە بۆ ڕاناوی قسە بێژ، واتە: (**إِنْعَاماً مِنَّا**)، وەک چاکە لەگەڵدا کردنێک لە ئێمەوە، لە حاڵێکدا ئێمە چاکەمان لەگەڵدا کردبوون، دەربازمان کردن.

٦)- ﴿كَذَٰلِكَ نَجۡزِي مَن شَكَرَ﴾، بەو شێوەیە هەر کەسێک سوپاسگوزاریی بکات، پاداشتی دەدەینەوە، یانی: وەک ئەو پاداشتدانەوەیە کە پاداشتی لووط ﷺ شوێنکەوتوانیمان دایەوە، بەهەمان شێوە هەر کەسێک سوپاسگوزاریی بکات، ئێمە پاداشتی دەدەینەوە و لە فریای دێین و پشتی دەگرین، چونکە خوا ﷻ بە پێی سیستەم و یاسا لەگەڵ بەندەکانیدا مامەڵە دەکات، ئەو سیستەم و یاسایانەی بۆ خۆی داناون و، هەر شایستەی دادگەریی و کاربەجێی و میهرەبانیی خوای پەروەردگارن.

٧)- ﴿وَلَقَدۡ أَنذَرَهُم بَطۡشَتَنَا﴾، بە دڵنیایی لە زەبری ئێمە ترساندبوونی و هۆشداریی پێدابوون، واتە: لووط ﷺ هۆشداریی پێدابوون کە ئەگەر لەسەر ئەو حاڵەتانە بەردەوام بن، لەسەر ئەو گوناهو تاوانە، خوا زەبرتان لێ دەوەشێنێ، یانی: لووط ﷺ هۆشداریی پێدابوون و ترساند بوونی، لە زەبر (**بَطْش**)ی ئێمە، (**بَطْشَة**)ش جارێکە لە (**بَطْش**)، (**بَطْش**)یش، بریتیە لە گرتنی توند و سەخت بۆ سزا دان، یان شێوەی ئەوە.

٨)- ﴿فَتَمَارَوۡاْ بِٱلنُّذُرِ﴾، بەڵام ئەوان دوو دڵ بوون لەو ترساندنە، یان لە ترساندنەکان، وەک گوتمان: (**نُذُر**) یان کۆی (**إِنْذَار**)ە، یان کۆی (**نَذِيْر**)ە، بە مانای چاوگ: ترساندن (**إِنْذَار**).

www.alibapir.com


(تَمَارَوا)، (التَّمارِي: تَفَاعُلٌ مِنَ المِرَاءِ وَهُوَ الشَّكُّ، وصِيغَةُ المُفاعَلَةِ لِلْمُبالَغَةِ، وَضُمِّنَ تَمَارَوْا مَعْنَى: كَذَّبُوا فَعُدِّيَ بِالبَاءِ)، وشەی (تَمَارِي): لەسەر کێشی (تَفاعُل) ە، لە (مِراءِ)ەوە هاتوە، یانی: دوو دڵیی، [نەک گومان کە (ظنّ)ە، بەڵام (شَكٌّ) و (رَيْب)، یانی: دوو دڵیی]، ڕێژگەی (مُفاعَلَةِ)ش لە ئەصڵدا بۆ بەشداریی و هاوبەشییە، بەڵام لێرەدا بۆ زێدەڕۆیی و تۆخکردنەوەی واتایەکەی بەکارهاتوەو، وشەی (تَمَارَوْا)، مانای (كَذَّبُوا)شی، خراوەتە نێو، بۆیە بە (ب)، بەرکاری خواستوە: ﴿فَتَمَارَوْا بِٱلنُّذُرِ﴾ ئەگەرنا، ئەگەر بەس مەبەست پێی کەوتنە دوو دڵیی بووایەو مانای بە درۆ دانانی نەخرابایە نێو، بۆ خۆی بەرکاری دەخواست پێویستیی بە (ب) نەدەکرد، بەڵام لێرەدا: ﴿فَتَمَارَوْا بِٱلنُّذُرِ﴾ واتە: کەوتنە دوو دڵییەوە لە ترساندنەکان و بە درۆشیان دانان.

٩)- ﴿وَلَقَدْ رَاوَدُوهُ عَن ضَيْفِهِۦ﴾، بە دڵنیایی ئەوان دەورو خولی هەڵاتن، لە بارەی میوانەکانی، (المُراوَدَةُ: مُحاوَلَةُ رِضى الكارِهِ شَيْئًا بِقَبُولِ ما كَرِهَهُ، وهي مُفاعَلَةٌ مِن: رَادَ يَرُودُ رَوْدًا أي: ذَهَبَ ورَجَعَ في أمْرٍ وضُمِّنَ راوَدُوهُ مَعْنى «دَفَعُوهُ وصَرَفُوهُ» فَعُدِّيَ بـ «عَنْ»، ويَتَعَلَّقُ قَوْلُهُ: ﴿عَن ضَيْفِهِۦ﴾، بِفِعْلِ ﴿رَاوَدُوهُ﴾، بِتَقْدِيرِ مُضافٍ، أيْ: عَنْ تَمْكِينِهِمْ مِن ضُيُوفِهِ)، واتە: وشەی (مُراوَدَة): هەوڵدانە بۆ ڕازییکردنی کەسێک کە شتێکی پێ ناخۆشە، بەوە کە ئەوەی پێی ناخۆشە قبووڵی بکات، ئەویش لەسەر کێشی (مُفَاعَلَة)یە، لە (رَادَ يَرُودُ رَوْدًا)، ئەگەر کەسێک بێت و بچێت لە شتێکدا، دەگوترێ: (رادَ يَرُودُ رَوْدًا)، وشەی: ﴿رَاوَدُوهُ﴾ش مانای (دَفَعُوهُ وصَرَفُوهُ)، [پاڵیان پێوە ناو لایاندام شی خراوەتە نێو، بۆیە بە (عَن)، بەرکاری خواستوە، ﴿رَاوَدُوهُ عَن ضَيْفِهِۦ﴾، ﴿عَن ضَيْفِهِۦ﴾یش پەیوەست دەبێتەوە بە کرداری ﴿رَاوَدُوهُ﴾ ئەویش بە تەقدیر کردنی پاڵدراوێک (أي: رَاوَدُوهُ عَنْ تَمْكِينِهِمْ مِنْ ضُيُوفِهِ)، هەوڵیان لەگەڵدا کە میوانەکانی تەسلیمی ئەوان بکات، واتە: کارێکی وا بکات، ئەوان بتوانن خراپە لەگەڵ میوانەکانی دا بکەن.

ئەو فریشتانەی چوونە ماڵی لووط ﷺ، لەسەر شێوەی گەنجی جوان بوون، گەلی لووط وایانزانی مرۆڤن و، عادەتیان وابوو دەستدرێژییان دەکردە سەر هەر

www.alibapir.com


کەسێکی غەریب و نەناسراو، ئەوانیش لەسەر شێوەی گەنجی جوان بوون، ئیدی خەڵکە ڕەوشت نزمەکە بەو خەیاڵە چوو بوون، بەڵام بەسەر شتێکی دیکەدا کەوتن!

١٠)- ﴿فَطَمَسْنَآ أَعْيُنَهُمْ﴾، چاوەکانیانمان سڕینەوە، (طَمَسْنَا):

أ- هەم بە مانای (مَحَوْنَا) هاتوە، واتە: سڕیمانەوە.

ب- هەم بە مانای (أَزَلْنَا)، لامانبردن.

ج- هەم بە مانای (أَعْمَيْنَا)، کوێرمان کردن، وشەی: (طَمْس)، بە مانای (مَحْو)، سڕینەوەو، لابردنی شوێنەواری شتێک دێ، بۆیە زانایان بە چەند تەعبیرێک مانای ئەو ڕستە قورئانییەیان کردوە:

١- (أَذْهَبَ الله نُورَ أَبْصَارِهِمْ مَعَ بَقَاءِ الأَعْيُنِ)، خوا ڕۆشنایی چاوەکانی لا بردن، لەگەڵ ئەوەش دا چاویان مابوون.

٢- (طَمَسْنَا أَعْيُنَهُمْ، أي: صَيَّرْنَا أَعْيُنَهُم مَمْسُوحَةً، لا يُرى لَها شِقٌّ كَمَا تَطْمَسُ الرِّيحُ الأَعْلَامَ بِمَا تُسْفِي عَلَيْهَا مِنَ التُّرابِ)، واتە: دەم و چاویانمان سڕینەوەو شوێنی چاویشیان لێ نەمابوو، وەک چۆن شوێنێک هەبێ و با گڵی بەسەردا بکات و بیسڕێتەوە.

گرنگ ئەوەیە (طَمَسْنَا أَعْيُنَهُمْ)، یانی: چاویانمان سڕینەوە، ئنجا ئایا چاوەکان هەر ماون، بەڵام کوێر کراون؟ یاخود لە بنەڕەتەوە چاوەکانیان لە ڕوویان دا سڕاونەوەو لووس بووە؟ هەردوو واتایەکە دەگرێتەوە.

١١)- ﴿فَذُوقُواْ عَذَابِي وَنُذُرِ﴾، دەجا بیچێژن ئازاری من و ترساندنەکەم! ئەمە لە قورئاندا زۆرەو: (مَقُوْلُ قَوْلٍ مَحْذُوف)، گوتراوی قسەیەکی قرتێندراوە، کە بە سیاق و سەلیقە دەزانرێ، واتە پێمان گوتن: بیچێژن ئازاری من و (ئەنجامی) ترساندنەکانی من (کە گوێتان پێ نەدان).

www.alibapir.com


١٢)- ﴿وَلَقَدۡ صَبَّحَهُم بُكۡرَةً عَذَابٞ مُّسۡتَقِرّٞ﴾، بە دڵنیایی دەمەوبەیان ئازارێكی جێگیر گرتنی، (صَبَّحَهُم)، (التَّصْبِيحُ: الكَوْنُ فِي زَمَنِ الصَّباحِ، وَهُوَ أَوَّلُ النَّهَارِ، وَالبُكْرَةُ: أَوَّلُ النَّهَارِ، وَهُوَ وَقْتُ الصُّبْحِ، كَمَا قَالَ تَعَالَى: ﴿إِنَّ مَوۡعِدَهُمُ ٱلصُّبۡحُۚ أَلَيۡسَ ٱلصُّبۡحُ بِقَرِيبٖ ٨١﴾ هود)، (تَصْبِيح): ئەوەیە كەسێك بكەوێتە بەیانیی، بەیانییش سەرەتای ڕۆژە، (بُكْرَة)ش سەرەتای بەیانییەو سەرەتای ڕۆژە، وەك خوا ﷻ لە سووڕەتی (هود)دا دەفەرموێ: ﴿إِنَّ مَوۡعِدَهُمُ ٱلصُّبۡحُۚ أَلَيۡسَ ٱلصُّبۡحُ بِقَرِيبٖ ٨١﴾، ژوانگەیان (كاتی دیارییكراویان) دەمەو بەیانە، ﴿أَلَيۡسَ ٱلصُّبۡحُ بِقَرِيبٖ﴾، ئایا بەیانیی نزیك نیە، بۆ سزادانیان؟

كە دەفەرموێ: ﴿عَذَابٞ مُّسۡتَقِرّٞ﴾، (عَذَاب): ئازار، سزا، (مُسْتَقِرّ): نیشتەجێ و چەسپاو، ناوی بكەر (اسْمُ فَاعِل)ە، لە: (اسْتَقَرّ)، واتە: چەسپا، (والمُسْتَقِرُّ: الثَّابِتُ الدَّائِمُ الَّذِي يَجْرِي عَلَى قُوَّةٍ وَاحِدَةٍ لَا يُقْلِعُ حَتَّى اسْتَأْصَلَهُم)، واتە: ئەو ئازارە چەسپاو و بەردەوام بوو، لەسەر یەك هێز دەڕۆیشت و وازی نەدەهێنا و كۆتایی نەدەهات (نەك هەروا گڕو فڕ بێ) بەردەوام بوو، هەتابنبڕی كردن.

١٣)- ﴿فَذُوقُواْ عَذَابِي وَنُذُرِ﴾، (پێمان گوتن) بیچێژن ئازاری من و ترساندن و هۆشداریی من، واتە: شوێنەواری ترساندنی من، یان: ترساندنەكانی من.

١٤)- ﴿وَلَقَدۡ يَسَّرۡنَا ٱلۡقُرۡءَانَ لِلذِّكۡرِ﴾، بە دڵنیایی قورئانیشمان ئاسان كردوە بۆ (ذِكْر)، وەك پێشتر باسمانكرد، واتە: بۆ خوێندنەوەو لێتێگەیشتن و بیركردنەوەو پەندوەرگرتن و كار پێكردن.

١٥)- ﴿فَهَلۡ مِن مُّدَّكِرٖ﴾، ئنجا ئایا كەسێكی بیركەرەوە، كەسی پەند وەرگر، كەسی خوێنەرەوە، هەیە؟!.

(فَذُوقُوا: اسْتُعْمِلَ الذَّوْقُ فِي الإِحْسَاسِ بِالعَذَابِ، لأَنَّهُ أَقْوَى أَنْوَاعِ الإِحْسَاس)، بۆیە وشەی (ذَوْق) چێژتن بەكار هێنراوە (سزایەكەم بچێژن) چونكە چێژتن بە زمان، بە هێزترین جۆرەكانی هەستكردنە، بۆیە خوا ﷻ لێرەش و لە زۆر جێی دیكەی قورئانیش دا، وشەی چێژتن و تامكردن بە كاردێنێ بۆ سزا، واتە: ئەو سزایەی باش هەستی پێ دەكەن، وەك چۆن شتێك كە دەیخۆی، تامی دەكەی و دەیچێژی.

www.alibapir.com



## مەسەلەی پێنجەم و کۆتایی:

**هەروەها دارو دەستەو شوێنکەوتووانی فیرعەونیش ترساندن و وریا کردنەوەکانیان بۆ هاتن، لە ڕێی مووسا ﷺ و، هاڕوونی برایەوە ﷺ، کەچی تێکڕای نیشانەو بەڵگەکانی خوایان بە درۆ دانان و، سەرەنجام زۆر بە توندیی سزای دان:**

خوا دەفەرموێ: ﴿وَلَقَدْ جَآءَ ءَالَ فِرْعَوْنَ ٱلنُّذُرُ ﴿٤١﴾ كَذَّبُوا۟ بِـَٔايَـٰتِنَا كُلِّهَا فَأَخَذْنَـٰهُمْ أَخْذَ عَزِيزٍ مُّقْتَدِرٍ ﴿٤٢﴾﴾.

## شیكردنەوەی ئەم دوو ئایەتە، لە سێ بڕگەدا:

١)- ﴿وَلَقَدْ جَآءَ ءَالَ فِرْعَوْنَ ٱلنُّذُرُ﴾، بە دڵنیاییی شوێنکەوتووانی فیرعەونیش، ترساندنەکانیان بۆ هاتن، یاخود: ترساندن و هۆشداریی منیان بۆ هات، لە ڕێی مووسا و هاڕوونی برایەوە، صەڵات و سەلامی خوایان لەسەر بێ.

پێشتریش گوتمان: (نُذُر)، کۆی (نَذِیر)ە، بە مانای (إنْذَار)، ترساندن، بەڵام وەک چۆن دەگونجێ (نذر) ناوی چاوگ بێ، دەشگونجێ بۆ کۆ بێ، واتە: ئاگادارکردن و ترساندنەکانی من، بۆیەش لێرەدا بە کۆ هاتوە، چونکە مووسا ﷺ زۆر ئەو ترساندنەی خوای بۆ دووبارە کردنەوەو، یەک ترساندن نەبوو، بەڵکو وەک چەند ترساندنێک بوو.

٢)- ﴿كَذَّبُوا۟ بِـَٔايَـٰتِنَا كُلِّهَا﴾، بە هەموو نیشانەکانی ئێمە، بێبڕوا بوون، هەموو نیشانەکانی ئێمەیان بە درۆ دانان، نیشانەکانیش ئەوەی خوا ﷻ بۆ ئێمەی خستوونە ڕوو، نۆ نیشانە بوون: ﴿وَلَقَدْ ءَاتَيْنَا مُوسَىٰ تِسْعَ ءَايَـٰتٍۭ بَيِّنَـٰتٍ ۖ فَسْـَٔلْ بَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ إِذْ جَآءَهُمْ فَقَالَ لَهُۥ فِرْعَوْنُ إِنِّى لَأَظُنُّكَ يَـٰمُوسَىٰ مَسْحُورًا ﴿١٠١﴾﴾ الإسراء، واتە: بە دڵنیایی ئێمە نۆ نیشانەمان، نۆ بەڵگەمان بە مووسا دابوون (ئەی موحەممەد ﷺ!) لە وەچەی ئیسرائیل بپرسە؟ کاتێک مووسا هات بۆ لایان، بە نیشانەکانەوە، ئنجا فیرعەون پێیگوت: ئەی

www.alibapir.com


مووسا! پێم وایە تۆ جادووت لێ کراوە! هەڵبەتە مووساش ﷺ وەڵامی داوەتەوە، پێغەمبەرانی خوا علیهم السلام هیچ کاتێک دانەماون، بێ وەڵام بن، بەڵام لە قەدەر خۆیان وەڵامیان داوەتەوەو، خۆیان نەبردۆتە ئاستی بەرانبەرەکانیان!

کە دەفەرموێ: بە هەموو نیشانەکانمان بێبڕوا بوون، واتە: ئەو نۆ نیشانەیە، یاخود هەر نیشانەیەکی دیکە، کە خوا ﷻ لە ڕیزی ئەو نۆیانەدا باسی نەکردوە.

**٣)-** ﴿فَأَخَذْنَٰهُمْ أَخْذَ عَزِيزٍ مُّقْتَدِرٍ﴾، ئێمەش گرتامانن، گرتنی باڵا دەستێکی خاوەن توانای بێ سنوور، **(الأَخْذُ: مُسْتَعَارٌ لِلإِنْتِقَامِ)**، **(أَخْذ)**: گرتن، خوازراوەتەوە بۆ تۆڵە ستاندنەوە، سزادانەکەی خواش بریتی بووە لەوە کە فیرعەون خۆی و سوپاکەی لە دەریای سووردا - کە ئەو کاتە پێیان گوتوە: **(بَحْرُ القُلْزُم)** - نغرۆ کران، وەک لە شوێنی خۆیدا بەسەرهاتەکەیمان بە تەفصیلی هێناوە.

خوا ﷻ لێرەدا دوو سیفەتی بۆ خۆی بەکارهێناون: ﴿عَزِيزٍ مُّقْتَدِرٍ﴾:

**(العَزِيزُ: الَّذِي لاَ يُغْلَبُ، المَنِيعُ الجَانِب)**، **(عَزِيز)**: ئەو کەسەیە کە بەرانبەرەکەی پێی نەوێرێ و، بەرانبەرەکەی لە بەرامبەریدا، دەستوەکەری پێ نەکرێ و هیچ کارە بێ.

**(المُقْتَدِر)**، **(قَدِير وَقَادِر)**یش هەن: **(قَادِر)** توانا، **(قَدِير)**یش ڕێژگەی زێدە ڕۆییەتی، بەڵام **(المُقْتَدِر)**، یانی: زۆر بە توانا، چونکە **(زِيَادَةُ المَبْنَى تَدُلُّ عَلَى زِيَادَةِ المَعْنَى)** زێدەیی پێکهاتە، زێدەیی واتە دەگەیەنێ.

شایانی باسە: ئەو پێنج بەسەرهاتە: بەسەرهاتی نووح ﷺ و، گەلی هوودو، گەلی صاڵیح و، گەلی لووط، هەروەها فیرعەون، کە مووسا و هاڕوون، بۆلای چوون، وێڕای شوعەیب ﷺ کە ئەویش بۆ لای گەلی مەدیەن و **(أَصْحَابُ الأَيْكَة)**، ڕەوانە کراوە، ئەم شەشە، لە زۆر شوێنی قورئاندا بەسەرهاتەکانیان باسکراون، بۆ وێنە:

www.alibapir.com


لـه سـووڕەتی (**الأعـراف**)داو لـه سـووڕەتی (**الشـعراء**)دا، بـەڵام لێرەدا، تەنیا باسی شـوعەیب نەکـراوەو، لـه چەنـد شـوێنێکی دیکـەی قورئانـدا، هـەر شەشـیان پێکـەوە باسـکراون، بەسـەرهاتی ئـەو گەلـە یاخییانـەی ئـەو پێغەمبەرانەیـان (**عَلَيْهِـمُ الصَّلَاةُ وَالسَّـلَامُ**) بـۆ چـوون و وەڵامیـان نەداونـەوە، سـەرەنجام تووشـی سـزا بـوون، ئـەو گەلانـەش بـە چەنـد شـتێک سـزا دراون: ئـاو، بـا، هـاڕژن و دەنـگ، ئاگـرو بڵێسـە، گڵـی بەردییـن:

**١و٢-** گەلی نووح و، فیرعەون و گەلەکەی بە (ئاو)؛ خوا گەلی نووحی بە تۆفان لە بەین بردوەو، فیرعەون و گەلەکەشی لە دەریای سووردا خنکاندوون.

**٣-** گەلی عادیش بە بایەکی بە هێز فەوتێنراون.

**٤-** هەروەها بۆ فەوتانی گەلی (لوط)یش باسی با کراوە: ﴿إِنَّآ أَرۡسَلۡنَا عَلَيۡهِمۡ حَاصِبًا ٣٤﴾، (**حاصب**) بایەکی بە هێزە کە وردە بەردو چەو، لەگەڵ خۆی ڕادەدا.

**٥-** هەروەها گەلی ثەموودیش لە سزادانەکەیاندا، هەم باسی هاڕژن و چریکە کراوە، هەم باسی بڵێسە ئاگر کراوە.

**٦-** گەلی لووطیش وێڕای با، خوای دادگەر باسی ئەوەشی کردوە کە بەرزی کردوونەوە، دوایی بەریداونەوەو بەردی لە قوڕی وشک بووی بەسەردا باراندوون، کەواتە: ئەو چوار شتانەی مرۆڤ زۆر پێویستیی پێیان هەیە: ئاوو باوو ئاگرو گڵ، خوا ﷽ هەرکام ئەو چوار شتانەی کردوون، بە هۆکاری سزادان و لە بەینبردنی گەلە یاخییەکان!!

**سُبحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ، أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إلاَّ أَنْتَ، أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ.**

www.alibapir.com



## پێناسەی ئەم دەرسە

ئـەم دەرسـەمان لـە سـێزدە (١٣) ئایـەت پێـک دێ، ئایەتەکانـی: (٤٣ - ٥٥)، سـێزدە ئایەتـی کۆتایـی سـووڕەتی (القمـر)، تـەوەری سـەرەکیی ئـەو سـێزدە ئایەتـە، بـە تووڕەیـی و سەرزەنشـتەوە دواندنـی بێبـڕواو هـاو بـەش پەرسـتانی ڕۆژگاری پێغەمبـەری کۆتاییـە ﷺ بـە پلـەی یەکـەم و، دواتریـش بێبڕوایانـی دیکـە لـە هەموو کۆمەڵگاکانـدا، تاکـو دنیـا کۆتایـی دێ.

سەرەتا خوا ﷻ بەپرسیاری نکووڵیلێکەرانە دەفەرموێ، ئایا بێبڕوایەکانی ئێوە، ئـەی خەڵکـی ڕۆژگاری پێغەمبـەر ﷺ لـە مەککـەو دەوروبـەری! باشـترن، لـەو گەلـە فەوتاوانـە، واتـە: لـەوان بـە هێزتـر بـوون، یاخـود لـە ڕووی ئـاکارەوە، باشـتر بـوون، یاخـود ئێـوە لـە کتێبانـدا بوردرانتـان هەیـە، لـە سـزادران؟ ئایـا پاکانەتـان بـۆ کـراوەو سـزا نادرێـن، یـان کافرەکانـی ڕۆژگاری ئێـوە، باشـتر بـوون، لـەو کافـرە پێشـووانەی خـوا سـزای داون؟ یـان ئایـا دەڵێـن: ئێمـە کۆمەڵـی تۆکمـەو سـەرکەوتووین؟ ئـەو سـێ ئەگـەرەش هیچیـان ڕاسـت نیـن، بەڵکـو ئـەو کۆمەڵـە تۆکمەیـە دەشـکێنرێن و پـاش دەکەنـە بەرامبەریـان.

دوایی خوا ﷻ باسی ڕۆژی دوایی دەکات، کە بێزەزاترو تاڵتریشـە، کاتێک تاوانبـاران لـە گومڕایـی و ئێـش و ژانـدا دەبـن، لەسـەر ڕووان لـە ئاگـردا ڕادەکێشرێـن و، پێیـان دەگوتـرێ: سـزای دۆزەخ بچێـژن!

دوایـی خـوای بـەرزو مـەزن، پێنـج لـە نیشـانەو دیاردەکانـی باڵادەسـتیی خـۆی دەخاتـەڕوو:

١- هەموو شتێکمان بە ئەندازەگیریی دروستکردوە.

٢- کاری ئێمە تەنیا چاوترووکانێکی دەوێ.

www.alibapir.com



**٣-** گەلە پێشووەکانمان فەوتاندوون، ئایا کەسی بیرکەرەوەو، پەندوەرگرتان هەیە، پەندیان لێوەربگرێ؟!

**٤-** هەرچی کردوویانە لە لیستاندا تۆمار کراوە، بە هەموو شێوەکانی تۆمار کردن.

**٥-** تێکڕای گچکەو گەورەی کردەوەو ڕەفتاری مرۆڤان، نووسراوەو تۆمارکراوە.

لە کۆتاییشدا ڕاگەیەنراوە کە پارێزکاران لە نێو باخ و کانیی و سەرچاوەو ڕووباراندان و، لە خۆشترین جێگاو ڕێگادا، لە خزمەت خوادا بسم الله الرحمن الرحيم کە حوکمڕانێکی توانادارە.

خوا بە لوتف و کەڕەمی خۆی ئەوە بە قسمەت ئێمەش بکات.

﴿ أَكُفَّارُكُمْ خَيْرٌ مِّنْ أُوْلَـٰٓئِكُمْ أَمْ لَكُم بَرَآءَةٌ فِى ٱلزُّبُرِ ﴿٤٣﴾ أَمْ يَقُولُونَ نَحْنُ جَمِيعٌ مُّنتَصِرٌ ﴿٤٤﴾ سَيُهْزَمُ ٱلْجَمْعُ وَيُوَلُّونَ ٱلدُّبُرَ ﴿٤٥﴾ بَلِ ٱلسَّاعَةُ مَوْعِدُهُمْ وَٱلسَّاعَةُ أَدْهَىٰ وَأَمَرُّ ﴿٤٦﴾ إِنَّ ٱلْمُجْرِمِينَ فِى ضَلَـٰلٍ وَسُعُرٍ ﴿٤٧﴾ يَوْمَ يُسْحَبُونَ فِى ٱلنَّارِ عَلَىٰ وُجُوهِهِمْ ذُوقُواْ مَسَّ سَقَرَ ﴿٤٨﴾ إِنَّا كُلَّ شَىْءٍ خَلَقْنَـٰهُ بِقَدَرٍ ﴿٤٩﴾ وَمَآ أَمْرُنَآ إِلَّا وَٰحِدَةٌ كَلَمْحٍۭ بِٱلْبَصَرِ ﴿٥٠﴾ وَلَقَدْ أَهْلَكْنَآ أَشْيَاعَكُمْ فَهَلْ مِن مُّدَّكِرٍ ﴿٥١﴾ وَكُلُّ شَىْءٍ فَعَلُوهُ فِى ٱلزُّبُرِ ﴿٥٢﴾ وَكُلُّ صَغِيرٍ وَكَبِيرٍ مُّسْتَطَرٌ ﴿٥٣﴾ إِنَّ ٱلْمُتَّقِينَ فِى جَنَّـٰتٍ وَنَهَرٍ ﴿٥٤﴾ فِى مَقْعَدِ صِدْقٍ عِندَ مَلِيكٍ مُّقْتَدِرٍۭ ﴿٥٥﴾ ﴾

## مانای دەقا و دەقی ئایەتەکان

{(ئـەی خەڵکـی مەککـەو دەوروبـەری!) ئایا بێبڕوایەکانـی ئێـوە، لـەو (کۆمەڵـگا فەوتێنراو)انـە (ی پێشـوو) باشـترن، یـان پاکانەتـان بـۆ کـراوە، لـە کتێبـەکان (ی خـوا) دا (کـە سـزانادرێن)؟ ﴿٤٣﴾ یـان ئایـا دەڵێـن: ئێمـە کۆمـەڵ و تۆکمـەو سـەرکەوتووین (بەسـەر بەرانبەرمـان دا)؟ ﴿٤٤﴾ بـە دڵنیایـی کۆمەڵەکەیـان تێـک دەشـکێنرێن و پـاش دەکەنـەوە ﴿٤٥﴾ بەڵکـو ڕۆژی دوایـی بەڵێنگەیانـە و ڕۆژی دواییـش، بێڕەزاترو تاڵتریشـە ﴿٤٦﴾ بـە دڵنیایـی تاوانبـاران لـە گومڕایـی و ئـازار (ی ئاگـر)دان ﴿٤٧﴾ ئەو ڕۆژەی لەسـەر ڕوویـان لـە ئاگـر(ی دۆزەخ)دا ڕادەکێشرێـن، (پێیـان دەگوترێ:) بیچێـژن، تووشـبوونی (ئاگـری) سـەقەڕ ﴿٤٨﴾ بێگومـان ئێمـە هەموو شـتێکمان بـە ئەندازە دروسـتکردووە ﴿٤٩﴾ فەرمانیشـمان (بـۆ هێنانـە دی شـتێک) بـەس یـەک (وشـەی)ە، وەک چـاو تروووکانێکـە ﴿٥٠﴾ بـە دڵنیایـی ئـەی بێبڕوایینـە! کۆمەڵـە هاوشـێوەکانتانمان لـە نێـو بـردوون، ئنجـا ئایـا کەسـی بیرکـەرەوەو پەندوەرگـر هەیـە؟! ﴿٥١﴾ هـەر شـتێک کردووشـیانە لـە نووسراواندایـە، (تۆمـار کـراوە) ﴿٥٢﴾ هەمـوو بچـووک و گەورەیەکیـش (لـە کـردارو ڕەفتاریـان) نـووسراوە ﴿٥٣﴾ بـە دڵنیایـی پارێـزکاران لـە نێـو بـاخ و ڕووبارانـدان ﴿٥٤﴾ لـە جێـگاو ڕێگایەکـی دڵپەسـند دا، لـە لای حوکمڕانـی توانـادەرو باڵادەسـت ﴿٥٥﴾}.

لە تۆڕە کۆمەڵایەتییەکان لەگەڵتانین
Stay in touch on social media
نحن معكم عبر مواقع التواصل الاجتماعي
ڕاگەیاندنی مەکتەبی مامۆستا عەلی باپیر
AliBapir/عەلی باپیر
archive.org/details/@alibapir
AliBapir/عەلی باپیر
AliBapir
Google Play
App Store
www.alibapir.net
کوردی - عربي - English
کەناڵی
ڕاگەیاندنی مەکتەبی مامۆستا عەلی باپیر
ڕاگەیاندنی مەکتەبی مامۆستا عەلی باپیر

www.alibapir.com


## شیكردنەوەی هەندێك لە وشەكان

(بَرَآءَةٌ): (**أَصْلُ البُرْءِ وَالبَرَاءَةِ وَالتَبَرِّي: التَقَصِّي مِمّا يُكْرَه مُجَاوَرَتُهُ**)، هەر كام لە (**بُرْء، بَرَاءَة، تَبَرِّي**)، بریتیە لە دووریی لە شتێك، كە مرۆڤ پێی ناخۆش بێ، لێی نزیك بێ، (**بَرَاءَة**)، بە كوردیی دەبێتە پاكانەو ئەستۆپاكیی.

(فِي ٱلزُّبُرِ): لێرەدا (**زُبُر**) كۆی (**زَبُور**)ە، وەك چۆن (**كُتُب**) كۆی (**كِتَاب**)ە، كە مەبەست پێی كتێبە ئاسمانییەكانە، كتێبەكانی خوا.

(مُّنتَصِرٌ): سەركەوتوو، یاخود تۆڵەستێن، (**النَّصْرُ وَالنُّصْرَةُ: العَوْنُ وَالإِنْتِصَارُ: طَلَبُ النَّصْرَةِ، وَانْتَصِر، أي: امْتَنَعَ مِنْ ظَالِمِه، وَانْتَصَرَ، أي: انْتَقَم**)، (**نَصْر ونُصْرَة**)، بە مانای یارمەتیی، دێن (**إِنْتِصَار**)، واتە: داوای یارمەتییكردن، (**انْتَصَر**)، وایكرد ئەو كەسەی دەیەوێ ستەمی لێ بكات، نەهێڵێ ستەمی لێ بكات، هەروەها (**انْتَصَر**)، بە مانای (تۆڵەی ستاندەوە)ش دێ.

(سَيُهْزَمُ ٱلْجَمْعُ): ئەو كۆمەڵەی دەڵێن: ئێمە كۆمەڵكی تۆكمەین، تێكدەشكێنرێن، (**هَزَمَ العَدُوَّ: كَسَرَهُ**)، دوژمنەكەی شكاند (**وَأَصْلُ الهَزْمِ: كَسْرُ الشَّيءِ اليَابِسِ حَتَّى يَنْحَطِمَ، وَمِنْهُ الهَزِيمَةُ، لأنَّهُ كَمَا يُعَبَّرُ عَنَهُ بِذَلِكَ، يُعَبَّرُ عَنْهُ بِالحَطْمِ وَالكَسْرِ**)، (**هَزْم**): لە ئەصڵدا ئەوەیە شتێكی وشك بشكێنرێ، هەتا تێك دەشكێ و وردو خاش دەبێ، وشەی (**هَزِيمَة**)، لەوەوە هاتوە، چونكە (**هَزِيمَة**) واتە: تێكشكانی دوژمن، هەروەك بە وردو خاش بوون و شكاندنیش تەعبیر كراوە لە: شكان، شكانی دوژمن، شكانی كەسێك و هێزێك.

(ٱلدُّبُرَ): (**دُبرُ الشَّيءِ: خِلَافُ القُبُلِ، وَجَمْعُهُ: أَدْبَار**)، واتە: پشتەوە بە (**أَدْبَار**)، كۆدەكرێتەوە، واتە: پشتەوەكان پێچەوانەی پێشەوەیە.

www.alibapir.com


(أَدْهَىٰ): (دَهَـاهُ: أَصَابَـهُ بِدَاهِيَـةٍ، وَالدَّاهِيَـةُ: الأَمْرُ الْمُنْكَرِ العَظِيْـمُ، وَدَوَاهِـي الدَّهْـرِ: مَا يُصِيبُ النَّـاسَ مِـن عِظَـمِ النـوب، وَالدَّهَـى: الْمُنْكَـر: غَـرْبٌ دَهـي، أي: ضَخْـم)، (أَدْهَـى)، واتـە: بێڕەزاتـر، (دَهَـاهُ: أَصَابَـهُ بِدَاهِيَـةٍ)، (دهـاهُ) تووشـی بەڵایەکـی بێـڕەزای کـرد، (دَاهِيَـة): بریتیـە لـە کارێکـی نامـۆی مـەزن، (وَدَوَاهِـي الدَّهْـرِ)، ئـەو شـتانەن، ئـەو بەڵایانـە تـووشی خەڵکـی دێـن، (دَهَـى)، بـە مانـای نەنـاسراو نامـۆ دێ، دەگوتـرێ: (غَـرْبٌ دَهـي)، واتـە: دۆڵچەیەکـی گـەورە کـە ئـاوی پـێ هەڵدەهێنجـرێ.

(وَأَمَرُّ): (مَـرَّ الـشَّيءُ وَأَمَـرَّ: صَـارَ مُـرّاً)، واتـە: شـتەکە تـاڵ بـوو لـە ڕووی تامـەوە، دوایـی تاڵیـی تـام بەکاردەهێـنرێ بـۆ تاڵیـی سـزا، یـەک بـە یەکێکـی دی دەڵـێ: تـاڵاوت پـێ دەچێـژم.

(وَسُعُرٍ): (السُّـعْرُ: الحَـرُّ، شَـهْوَةٌ مَـعَ جُـوعٍ، السُّـعُرُ: الجُنُـون)، (سُـعُر): بـە مانـای گەرمیـی دێ، بـە مانـای ئارەزووکـردن و برسـیەتیی دێ و، بـە مانـای شـێتییش دێ، بـەڵام (سُـعْر)، تەنیـا بـە مانـای شـێتیی دێ.

(يُسْحَبُونَ): (سَـحْبُ الـشَّيءِ: جَـرُّهُ عَـلَى الأَرْض)، (سَـحْب): ئەوەیـە شـتێک لەسـەر زەوی ڕابکێشـی.

(سَقَرَ): (سَـقَرَ يَسْـقُرُ سَـقْراً، أي: بَعُـدَ، وَالسَّـقْرُ: حَـرُّ الشَّـمْسِ، وَحَـرُّ جَهَنَّـم)، دەگوتـرێ: (سَـقَرَ يَسْـقُرُ سَـقْراً)، دوورکەوتـەوە، دوور دەکەوێتـەوە، دوورکەوتنـەوە، (سَـقَر)، بـە مانـای گەرمیـی خـۆر دێ و، بـە مانـای گەرمیـی دۆزەخیـش دێ.

(بِقَدَرٍ): (القَـدْرُ: الـمِقْدَارُ، القَـدَرُ: مِقْـدَارُ الـشَّيءِ وَحَالاَتُـهُ المقَـدَّرَة)، (قَـدْر): بـە مانـای ئەنـدازە دێ، (قَدَر)یـش، دیسـان بـە مانـای ئەنـدازەی شـتێک دێ و، حاڵەتـە ئەندازەگیـر ییکراوەکانـی، دێ.

(كَلَمْحِۭ بِٱلْبَصَرِ): (لَمَـحَ البَـصَرُ إلى الـشَّيءِ لَمْحَـاً وَتَلْمَاحَـاً: امْتَـدَّ إلى الـشَّيءِ، وَلَمَحَـهُ بِبَـصَرِهِ: صَوَّبَـهُ إِلَيْـهِ وَأَبْـصَرَهُ بنَظِـرٍ خَفِيْـفٍ، وَأَلْمَـحَ الـشَّيءِ: أَبْـصَرَهُ بنَظَرِ خَفِيْفٍ)، وشـەی

www.alibapir.com


(لَمَحَ البَصَرُ إلى الشَّيءِ لَمْحَاً وَتَلْمَاحَاً)، واتە: سەرنجی دایە ئەو شتە، (لَمَحَهُ بِبَصَرِهِ)، واتە: چاوی لێکرد، بە شێوەیەکی سووک بینی، (أَلْمَحَ الشَّيءِ)، واتە: بە تیلە چاوێک، بە سیلە چاوێک، تەماشای کرد، یاخود بە شێنەیی بینی، نەک چاوی تێ ببڕێ بە زۆریی.

(أَشْيَاعَكُمْ): (شَايَعَهُ مُشَايَعَةً وَشِيَاعَاً: تَبِعَهُ، وصَحِبَهُ، وَأَمَدَّهُ)، (شَايَعَهُ مُشَايَعَةً وَشِيَاعَاً)، واتە: شوێنی کەوت و، لەگەڵی دابوو و، هاوکاریی کرد، (الأَشْيَاعُ: الأَمْثَالُ وَالأَشْبَاه)، (أَشْيَاع) کۆی (شِيْعَة)یە، (شِيْعَة)ش، یانی: کۆمەڵ، (أَشْيَاع وَشِيَع)، هەردووکیان کۆن، واتە: کۆمەڵەکان، کە لێرەدا (أَشْيَاعَكُمْ)، یانی: ئەو کۆمەڵ و گرووپانەی هاوشێوەی ئێوە بوون، ئەوانەمان فەوتاندوون.

(فِي ٱلزُّبُرِ): (زَبَرَ الكِتَابَ أي: كَتَبَهُ، وَالزَّبُورُ: الكِتَابُ المَزْبُوْر)، بەڵام لێرە (فِي ٱلزُّبُرِ)، واتە: (فِي الكُتُب)، هەرچی کە کردوویانە لە کتێبان دا، لە نووسراوان دا، لە لیستاندا، تۆمار کراوە، (كَتَبَهُ)، واتە: (زَبَرَهُ)، نووسی، (زَبُور)، بە مانای کتێبێکی نووسراو، دێ.

(مُّسْتَطَرٌ): بە دێڕ نووسراو، چونکە (السَّطْرُ: الصَّفُّ مِنْ كُلِّ شَيءٍ، سَطْرٌ مِنْ كِتَابَةِ، اسْتَطَرَ الكِتَابَ: سَطَرَهُ)، (سَطر): بە مانای شتێک دێ ڕیز کرابێ، دێڕی نووسین (اسْتَطَرَ الكِتَابَ)، کتێبەکەی نووسی، (سَطَرَهُ)، نووسی، بەڵام (اسْتَطَره)، واتە: بە گرنگیی پێدانەوەو بە چاکیی نووسی.

(وَنَهَرٍ): (النَّهَرُ: المَاءُ العَذْبُ، وَالنَّهْرُ: السَّعَةُ وَالضِّيَاء)، وشەی (نَهَر، وَنَهْر)، هەردووکیان بە مانای ئاوی شیرین، دێن، ڕووباریش بە زۆریی هەر ئاوی شیرینە، مەگەر ڕووبارێک دروست بکرێ، لە ئاوی سوێرەوە هەڵببەسترێ، (نَهَر)، بە مانای فراوانیی و ڕۆشناییش دێ.

(مَقْعَدِ صِدْقٍ): (الْمَقْعَدُ: اسمُ مَكَان الْقُعُودِ، وَالْقُعُودُ: هُنَا بِمَعْنَى الإِقَامَةِ الْمُطْمَئِنَّةِ)، (مَقْعَد): ناوی شوێنی دانیشتنە، لێرەشدا دانیشتن بە مانای نیشتەجێ بوون و

www.alibapir.com


سـەقامگیر بوونێکـی ئۆقـرە گرانەیـە، کـە دەفەرمـوێ: ﴿ فِي مَقْعَدِ صِدْقٍ ﴾(الصِّـدْقُ: أَصْلُـهُ مُطَابَقَـةُ الْخَـبَرِ لِلْوَاقِـعِ، ثُـمَّ شَـاعَتْ لَـهُ اسْـتِعْمَالَاتٌ نَشَـأَتْ عَـنْ مَجَـازٍ، أَوِ اسْـتِعَارَةٍ، تَرْجِـعُ إِلَى مَعْنَـى مُصَادَفَـةِ أَحَـدِ الـشَّيْءَ عَـلَى مَـا يُنَاسِـبُ كَـمَالَ أَحْـوَالِ جِنْسِـهِ، فَيُقَـالُ: هُـوَ رَجُـلُ صِـدْقٍ، أَيْ تَمَـامُ رُجْلَـةٌ)، (صِدْق): لـە ئەصڵـدا بریتیـە لـەوە کـە هەواڵێـک پـڕ بـە پێستی واقیـع بـێ و لەگـەڵ واقیعـدا ڕاسـت بێتـەوە، دوایـی زۆر جـۆرە بەکارهێنانـی دیکـەی بـۆ پەیـدا بـوون، بـە شـێوەی مەجـاز یاخـود خواسـتنەوەو، هەموویـان دەگەڕێنـەوە بـۆ ئـەوە، کەسـێک شـتێکی لـێ هەڵکـەوێ، کـە ئـەو شـتە لـە حاڵەتێکـی تێـرو تـەواوی هەبـێ، لـە شـێوەی جینسـی خـۆی، بـۆ وێنـە دەگوتـرێ: (هـو رَجُـلٌ صِـدْقٌ)، ئـەو پیاوێکـە تـەواوی پیاوەتیـی و مەردایەتیـی تێدایـە، ﴿مَقْعَدِ صِدْقٍ ﴾ شـوێنێک کـە شـوێنێکی زۆر تێـرو تـەواو، پـڕ خێـر و خۆشـیی و نـازو نیعمەتـە.

## هۆی هاتنەخوارەوەی ئایەتەکان

**١)-** هۆی هاتنە خواری ئەم ئایەتە موبارەکە، کە دەفەرموێ: ﴿ بَلِ ٱلسَّاعَةُ مَوۡعِدُهُمۡ وَٱلسَّاعَةُ أَدۡهَىٰ وَأَمَرُّ ﴿٤٦﴾ ﴾، لەو بارەوە ئەم دوو گێڕدراوەیە هەن:

**أ- {عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رضي الله عنه، قَالَ: جَاءَ مُشْرِكُو قُرَيْشٍ يُخَاصِمُونَ رَسُولَ اللهِ ﷺ فِي الْقَدَرِ، فَأَنْزَلَ اللَّهُ تَعَالَى: ﴿ يَوۡمَ يُسۡحَبُونَ فِي ٱلنَّارِ عَلَىٰ وُجُوهِهِمۡ ذُوقُواْ مَسَّ سَقَرَ ﴿٤٨﴾ ﴾} (أخرجه مسلم في صحيحه: ٢٠٤٦، ٢١٥٦).**

واتـە: ئەبـوو هورەیـرە رضي الله عنه دەڵێ: هاوبـەش بۆ خوا دانـەرەکانی قورەیش، هاتنە خزمـەت پێغەمبـەری خـوا ﷺ مشتومڕیان لەگەڵـدا دەکـرد، لـە بـارەی قـەدەرەوە، خـوای بەرزیـش ئـەم ئایەتـەی نـاردە خـوار: (ئـەو ڕۆژەی لەسـەر ڕوویـان لـە ئاگـردا ڕادەکێشرێـن و پێـان دەگوتـرێ: بیچێـژن سـزای سـەقەر، ئێمـە هەمـوو شـتێکمان بـە ئەندازەگیریـی دروسـتکردوە).

www.alibapir.com


ب- {عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنَ عَمْرِو بْنِ الْعَاصِ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، قَالَ: مَا نَزَلَت هَذِهِ الآيَة: ﴿إِنَّ ٱلْمُجْرِمِينَ فِى ضَلَٰلٍ وَسُعُرٍ ﴿٤٧﴾ يَوْمَ يُسْحَبُونَ فِى ٱلنَّارِ عَلَىٰ وُجُوهِهِمْ ذُوقُوا۟ مَسَّ سَقَرَ ﴿٤٨﴾ إِنَّا كُلَّ شَىْءٍ خَلَقْنَٰهُ بِقَدَرٍ ﴿٤٩﴾﴾، إلاَّ فـي أَهْل القَدر} (أخرجه البخاري: فـي «خلق أفعال العباد»: ج٥٤، ص١٦٦، والبزَّار: ٢٢٦٥، الإستيعاب فـي بيان الأسباب، نقول: وهذا إسناد ضعيف، وذكره السيوطي فـي الدرِّ المنثور: ج٧، ص٦٨٣، وزاد نسبته لابن المنذر، وقال: بسند جيِّد، وكذا قال شيخنا أبو عبدالرحمن الألباني رحمه الله فـي «الصَّحيحة»: ج٤، ص٥٣).

واتـە: عەبدوڵڵای کـوڕی عەمـڕی کـوڕی عـاص رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا دەڵـێ: ئـەم ئایەتانـە {کـە خوێندماننـەوە} لـە بـارەی ئەهـلی قـەدەرەوە، (واتـە: ئەوانـەی نکوڵییـان کـردوە لـەوەی خـوا هەمـوو شـتێکی ئەندازەگیریـی کـرد بـێ)، هاتوونـە خـوار.

٢)- هۆی هاتنە خوارەوەی ئەو ئایەتەی دەفەرموێ: ﴿ذُوقُوا۟ مَسَّ سَقَرَ ﴿٤٨﴾ إِنَّا كُلَّ شَىْءٍ خَلَقْنَٰهُ بِقَدَرٍ ﴿٤٩﴾﴾:

{عَنْ عَطَاءِ بْنِ أَبِي رَبَاحٍ قَالَ: أَتَيْتُ ابْنَ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا وَهُوَ يَنْزِعُ مِنْ زَمْزَمَ، وَقَدِ ابْتَلَّتْ أَسَافِلُ ثِيَابِهِ، فَقُلْتُ لَهُ: قَدْ تُكُلِّمَ فِي الْقَدَرِ، فَقَالَ: أَوَ فَعَلُوهَا؟ قُلْتُ: نَعَمْ، قَالَ: فَوَاللهِ مَا نَزَلَتْ هَذِهِ الْآيَةُ إِلاَّ فِيهِمْ: ﴿ذُوقُوا۟ مَسَّ سَقَرَ ﴿٤٨﴾ إِنَّا كُلَّ شَىْءٍ خَلَقْنَٰهُ بِقَدَرٍ ﴿٤٩﴾﴾، أُولَئِكَ شِرَارُ هَذِهِ الأُمَّةِ، فَلاَ تَعُودُوا مَرْضَاهُمْ، وَلاَ تُصَلُّوا عَلَى مَوْتَاهُمْ، إِنْ رَأَيْتُ أَحَدًا مِنْهُمْ، فَقَأْتُ عَيْنَيْهِ بِأُصْبُعَيَّ هَاتَيْنِ} (الإستيعاب فـي بيـان الأسباب: ج٣، ص: ٣٠٨، أخرجـه ابـن حاتـم فـي تفسيره كـما في تفسير القرآن العظيـم: ج٤، ص ٢٨٦ و ٢٨٧، وابـن بطـة فـي الإبانـة، ج٢، ص ١٢١ و ١٢٢، برقـم:١٥٥٠، واللالـكائي فـي «شرح أصـول إعتقـاد أهـل السـنة والجماعـة»: ٩٤٨، والبيهقـي في الكـبرى، ج١٠، ص٢٠٥، قلنـا: وَهَـذَا سند حَسَـنٌ، وَرِجَالُـهُ ثِقَـاتٌ).

واتـە: عەتائـی کـوڕی ئەبـی ڕەبـاح دەڵـێ: چوومـە لای عەبدوڵڵای کـوڕی عەببـاس رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، لـەو کاتـەدا ئاوی لە زەمزەم هەڵدەهێنجاو داوێنی پۆشـاکەکەی تەڕ بوو بوو {بەهـۆی ئاوەکـەوە} پێمگـوت: لـە بـارەی قـەدەرەوە قسـە کـراوە، گـوتی: ئەوەیـان کـرد؟ گوتـم: بەڵـێ، گـوتی: بـە خـوا ئـەم ئایەتـە هـەر لـە بـارەی ئەوانـەوە هاتۆتـە

www.alibapir.com


خـوار: ﴿ ذُوقُواْ مَسَّ سَقَرَ ﴿٤٨﴾ إِنَّا كُلَّ شَيۡءٍ خَلَقۡنَٰهُ بِقَدَرٖ ﴿٤٩﴾ ﴾، واتـە: بیچێـژن تـووش بـوونی ئاگـری دۆزەخ، ئێمـە هەمـوو شـتێکمان بـە ئەندازەگیریـی دروسـتکردوە، ئەوانـە خراپتریـنی ئـەم ئوممەتـەن، (ئوممـەتی ئیسـلامن)، [واتـە: ئەوانـەی بڕوایـان بـەوە نیـە، خـوا هەمـوو شـتێکی لـە ئەزەلـەوە ئەندازەگیریـی کـردوە} سـەردانی نەخۆشـیان مەکـەن و، نوێـژ لەسـەر مردوویـان مەکـەن، ئەگـەر یەکێـک لەوانـە ببینـم، هـەردووک چـاوی بـەم دوو پەنجانـەم کوێـر دەکـەم، {هەڵبەتـە مەبەسـتی ئـەوە بـووە کـە ئەوانە شایسـتەی سـزادرانن}.

## مانای گشتیی ئایەتەکان

خوا ﷻ لە کۆتایی ئەم سوورەتە موبارەکەدا، ڕوو دەکاتە خەڵکی ڕۆژگاری پێغەمبـەر ﷺ، دوای ئـەوەی بەسـەرهاتی ئەو پێنـج گەلە کە پێغەمبەرەکانیـان (عَلَيْهِمُ الصَّلَاةُ وَالسَّلَامُ)، هۆشـداریی و ترسـاندنەکانی خوایـان پێڕاگەیانـدوون، پەیامـی خوایـان پـێ ڕاگەیانـدوون، کـە واز بێنـن لـە پەرسـتنی جگـە لـە خـواو، واز بێنـن لـە سـتەم و، لـە نێـو یەکدییـداو، واز بێنـن لـە ڕەوشـتی خـراپ و، واز بێنـن لـە تـاوان و لادان، بـەڵام بـە قسـەی پێغەمبەرانیـان نەکـردوەو، هۆشـدارییەکەی پێغەمبەرانیـان بـە درۆ دانـاوە، خـوا سـزای داون، لـە کۆتاییـدا خـوا ڕوو دەکاتـە خەڵکـی ڕۆژگاری پێغەمبـەر ﷺ و دەفەرموێ:

﴿ أَكُفَّارُكُمۡ خَيۡرٞ مِّنۡ أُوْلَٰٓئِكُمۡ ﴾، ئایـا کافـرەکانی ئێـوە لەوانـە چاکـترن، واتـە: ڕەوشـت و ئاکاریـان جوانـترە، یاخـود توانایـان زیاتـرە، ﴿ أَمۡ لَكُم بَرَآءَةٞ فِي ٱلزُّبُرِ ﴾، یـان ئایا ئێـوە لـە کتێبـەکانی خـوادا ئەسـتۆ پاکیـی و پاکانەتـان بـۆ کـراوەو، دەبوێردرێـن، و سـزا نادرێـن؟

﴿ أَمۡ يَقُولُونَ نَحۡنُ جَمِيعٞ مُّنتَصِرٞ ﴾، یاخــود دەڵێــن: ئێمــە کۆمەڵێکیــن، تۆکمەیــن و ســەرکەوتووین و تۆڵــە دەســتێنین، لــە بەرانبەرمــان؟! ئایــا کام لــەو ســێ ئەگــەرە هەیـە: ئایا ئـەو کافرانـە چاکـترن؟ یـان ئەسـتۆ پاکییـان بـۆ کـراوە؟ یاخـود کۆمەڵێکـی

www.alibapir.com


تۆكمه‌ن و كه‌س زه‌فه‌ریان پێ نابات؟ خواش ﷽ ئه‌و پرسیارانه هه‌موویان به شێوه‌ی پرسیاری نكوولیلێكردن ده‌كات، واته‌: هیچ كامیان وانین.

بۆیه ده‌فه‌رموێ: ﴿ سَيُهْزَمُ ٱلْجَمْعُ ﴾، ئه‌و كۆمه‌ڵه توندو تۆكمه‌یه (كه خۆیان پێ زۆر تۆكمه‌و خڕو پڕه) تێكده‌شكێن، ﴿ وَيُوَلُّونَ ٱلدُّبُرَ ﴾، پشتیشیان ده‌كه‌نه لایه‌نی به‌رانبه‌ران، ئنجا سزای خوایه‌، هه‌ر شتێكه‌.

﴿ بَلِ ٱلسَّاعَةُ مَوْعِدُهُمْ ﴾، به‌ڵكو ژوانگه‌یان، به‌ڵێنگه‌یان ڕۆژی دواییه‌، ﴿ وَٱلسَّاعَةُ أَدْهَىٰ وَأَمَرُّ ﴾، ڕۆژی دواییش به‌ هه‌ردوو قۆناغی ئاخیر زه‌مان و قیامه‌ته‌وه‌، سه‌ختتره‌و تاڵتریشه‌.

﴿ إِنَّ ٱلْمُجْرِمِينَ فِى ضَلَٰلٍ وَسُعُرٍ ﴾، به‌ دڵنیایی تاوانباران له‌ نێو گومڕاییدان و له‌ شێتیی و مه‌ینه‌تیی دان، یاخود: له‌ دنیادا له‌ گومڕاییدان و له‌ ڕۆژی دواییدا، له‌ نێو ئاگرو سزای خوادان.

﴿ يَوْمَ يُسْحَبُونَ فِى ٱلنَّارِ عَلَىٰ وُجُوهِهِمْ ﴾، ئه‌و ڕۆژه‌ كه‌ له‌سه‌ر ده‌م و چاویان به‌ نێو ئاگردا ڕاده‌كێشرێن، ﴿ ذُوقُوا۟ مَسَّ سَقَرَ ﴾ (پێیان ده‌گوترێ:) بیچێژن! تووشبوونی، سه‌قه‌ر، تووشبوونی ئاگری دۆزه‌خ، كه‌ یه‌كێك له‌ ناوه‌كانی بریتیه‌ له‌: (سَقَرَ).

﴿ إِنَّا كُلَّ شَىْءٍ خَلَقْنَٰهُ بِقَدَرٍ ﴾، به‌ دڵنیایی ئێمه‌ هه‌موو شتێكمان به‌ ئه‌ندازه‌ دروستكردوه‌، كه‌واته‌: ژیانی به‌شه‌ریش سیستم و ئه‌ندازه‌و ڕێك و پێكیی تێدایه‌، بۆیه‌ نابێ مرۆڤه‌كان له‌ دوای ژیانی دنیا، وه‌ك به‌رزه‌كی بانان بۆی ده‌ربچن، به‌ڵكو ده‌بێ چاكه‌كاران پاداشت بدرێنه‌وه‌و خراپه‌كاران سزا بدرێن، ئه‌ندازه‌گیریی و سیستم و ڕێك و پێكیی له‌ دروستكراوی خوادا، ئه‌وه‌ ده‌خوازێ كه‌ ده‌بێ ڕۆژی دوایی هه‌بێ و، ئه‌نجام و به‌رهه‌می شێوه‌ی ژیان و كرده‌وه‌كانی مرۆڤه‌كان، له‌وێدا به‌رجه‌سته‌ ببێ، هه‌ر كه‌سه‌ به‌ سزا، یاخود پاداشتی پڕ پێستی خۆی بگات.

﴿ وَمَآ أَمْرُنَآ إِلَّا وَٰحِدَةٌ كَلَمْحٍۭ بِٱلْبَصَرِ ﴾، فه‌رمانی ئێمه‌ش ته‌نیا یه‌كه‌، وه‌ك چاو تروووكانێك، واته‌: یه‌ك وشه‌یه‌، بۆیه‌ش به‌ مێینه‌ (**مؤنث**)، هێناویه‌تی یانی: (**إلاَّ**

www.alibapir.com


كَلِمَة وَاحِدَة)، وەک لە شوێنی دیکە دەفەرموێ: ﴿إِنَّمَآ أَمۡرُهُۥٓ إِذَآ أَرَادَ شَيۡـًٔا أَن يَقُولَ لَهُۥ كُن فَيَكُونُ ٨٢﴾، فەرمانی خوا کە شتێکی ویست، بەس ئەوەیە پێی بفەرموێ: ببە، یەکسەر دەبێ، هەڵبەتە ئەوەش بۆ نیزیک خستنەوەیە لە عەقڵی ئێمە، ئەگەرنا خوا ﷻ بەشتەکەش نافەرموێ: ببە، چونکە شتێک نەبێ، فەرمانی پێ ناکرێ، بەڵام لەبەر ئەوەی لە عەقڵی ئێمەدا وشەی ببە (كُن)، لە هەموو شتێک کورتترەو ئاسانترە، واتە: چۆن ئاسانە، خوا بەو شێوەیە فەرمانەکانی خۆی جێبەجێ دەکات، بە چاوتروووکانێک.

﴿وَلَقَدۡ أَهۡلَكۡنَآ أَشۡيَاعَكُمۡ﴾، بە دڵنیایی ئێمە (ئەی بێبڕوایانی ڕۆژگاری پێغەمبەرو ڕۆژگارەکانی دیکە!) گرووپە هاو وێنەکانی ئێوەمان فەوتاندوون لە ڕابردوودا، ﴿فَهَلۡ مِن مُّدَّكِرٖ﴾، ئنجا ئایا کەس هەیە، بیربکاتەوەو پەند وەربگرێ و، وەک ئەوان نەکات، تاکو وەک ئەوانی بەسەر نەیەت؟!

﴿وَكُلُّ شَيۡءٖ فَعَلُوهُ فِي ٱلزُّبُرِ﴾، هەرچی کردووشیانە لە کتێبانداو، لە لیستاندا تۆمار کراوەو نووسراوە، بە هەموو شێوەکانی تۆمار کردن، نەک تەنیا بە نووسین، بەڵکو بە وێنەو دەنگ و ... هتد.

﴿وَكُلُّ صَغِيرٖ وَكَبِيرٖ مُّسۡتَطَرٌ﴾، هەموو گچکەیەک و گەورەیەکیش نووسراوەو تۆمار کراوە.

لە کۆتاییدا خوا دەفەرموێ: ﴿إِنَّ ٱلۡمُتَّقِينَ فِي جَنَّٰتٖ وَنَهَرٖ﴾، بە دڵنیایی پارێزکاران لە نێو باغ و بێستانەکان و، لە نێو جۆگەلەو ڕووبارەکاندان، بێگومان وانیە، بچن نێو جۆگایەکەوە! یانی: لە شوێنێکن کە باغ و گوڵزاری لێیەو، کانیی و سەرچاوەو ڕووبارو جۆگەلەی لێ هەڵبەستراون.

﴿فِي مَقۡعَدِ صِدۡقٍ﴾، لە شوێنێکی زۆر دڵپەسندیان، لە جێگاو ڕێگایەکی زۆر پەسندو خۆش، ﴿عِندَ مَلِيكٖ مُّقۡتَدِرِۭ﴾، لە لای حوکمڕانێکی زۆر توانادار، کە خوای بەرزی مەزنە ﷻ

www.alibapir.com



مەسەلە گرنگەكان

## مەسەلەی یەكەم:

**پرسیاركردنی نكوڵیلێكەرانە لە خەڵكی ڕۆژگاری پێغەمبەر ﷺ، كە: ئایا كافرانی ئەوان، لە بێبڕوایانی گەلە پێشووەكان باشترن، بەهێزترن، یاخود ئاكارو ڕەفتاریان جوانترە، یان پاكانەیان لە كتێبەكانی خوادا بۆ كراوە، ئەستۆ پاكییان بۆ كراوە، كە سزا نادرێن؟ هەروەها خوڕینیان بەهێزو تۆكمەییانەوە، ئایا پێیان وایە كۆمەڵێكی تۆكمەو توندو تۆڵن و زاڵ دەبن؟ ئنجا هەواڵ پێدانیان كە ئەو كۆمەڵە تێكدەشكێن و پاش دەكەنەوە، ڕۆژی دواییش كە بەڵێنگەیانە، بێڕەزاترو تاڵتریشە، چونكە تاوانباران لە گومڕایی و مەینەتیی و لە دۆزەخدان، لە ئاگردا لەسەر دەم و چاویان ڕادەكێشرێن:**

خوا دەفەرموێ: ﴿ أَكُفَّارُكُمْ خَيْرٌ مِّنْ أُولَٰئِكُمْ أَمْ لَكُم بَرَاءَةٌ فِي الزُّبُرِ ﴿٤٣﴾ أَمْ يَقُولُونَ نَحْنُ جَمِيعٌ مُّنتَصِرٌ ﴿٤٤﴾ سَيُهْزَمُ الْجَمْعُ وَيُوَلُّونَ الدُّبُرَ ﴿٤٥﴾ بَلِ السَّاعَةُ مَوْعِدُهُمْ وَالسَّاعَةُ أَدْهَىٰ وَأَمَرُّ ﴿٤٦﴾ إِنَّ الْمُجْرِمِينَ فِي ضَلَالٍ وَسُعُرٍ ﴿٤٧﴾ يَوْمَ يُسْحَبُونَ فِي النَّارِ عَلَىٰ وُجُوهِهِمْ ذُوقُوا مَسَّ سَقَرَ ﴿٤٨﴾ ﴾

## شیكردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە نۆ بڕگەدا:

١)- ﴿ أَكُفَّارُكُمْ خَيْرٌ مِّنْ أُولَٰئِكُمْ ﴾، ئایا بێبڕوایانتان لەوانە (كە باسكران) باشترن! ڕووی دواندن لە كۆمەڵگای پێغەمبەرە ﷺ، هەندێكیش لە ڕوونكەرەوان دەڵێن: ڕووی دواندن لە كافرەكانی ڕۆژگاری پێغەمبەر بووە، بەڵام مادام دەفەرموێ: ﴿ أَكُفَّارُكُمْ خَيْرٌ مِّنْ أُولَٰئِكُمْ ﴾، ئایا بێبڕوایەكانی ئێوە، لەوانەی ڕابردوو چاكترن؟ دیارە ڕووی دواندن لە هەموو كۆمەڵگایەكەیە، بە مسوڵمان و نامسوڵمانەوەو، پرسیاركردنەكەش پرسیاركردنی سەرزەنشتكەرانەیە، كە دەفەرموێ: ﴿خَيْرٌ مِّنْ أُولَٰئِكُمْ ﴾، یانی: لە ڕووی

www.alibapir.com


هێزو تواناوە، ئایا کافرەکانی ئێوە هێزو توانایان زیاترە، لە هی گەلە پێشووەکان، یاخود لە ڕووی ڕەوشت و ئاکاری جوانەوە، وەک سەخاوەت و ئازایەتیی و نەجابەت و عەقڵ و مەعریفەت، ئایا ئێوە باشترن لەوان؟

٢)- ﴿أَمۡ لَكُم بَرَآءَةٞ فِي ٱلزُّبُرِ﴾، یان ئایا پاكانەتان بۆ كراوە لە كتێبەكان (ی خوا)دا، كە ئێوە سزا نادرێن؟ **(زُبُر)**، كۆی **(زَبُور)**ە، **(زَبُور)**یش، بە مانای **(مزبور)** دێ، یانی: نووسراو، كە مەبەست پێی كتێبە ئاسمانییەكانە، كتێبەكانی خوا، ئایا لە كتێبەكانی خوادا پاكانەتان بۆ كراوە، كە سزا نادرێن؟

ئنجا خوای كاربەجێ لە دواندنی ڕووبەڕووەوە، شێوازەكە دەگۆڕێ، بۆ دواندنی نادیار:

٣)- ﴿أَمۡ يَقُولُونَ نَحۡنُ جَمِيعٞ مُّنتَصِرٞ﴾، یان ئایا ئەوانە دەڵێن: ئێمە كۆمەڵێكین و سەركەوتووین؟ ئەمانە هەموویان بۆ سەرزەنشتكردنن، واتە: هیچ كام لەو سێ ئەگەرە نین:

نە ئەوەیە ئێوە لە ئەوان چاكتر بن، نە ئەوەیە ئەستۆ پاكییتان بۆ كرا بێ و پاكانەتان بۆ كرا بێ، لە كتێبەكانی خوادا، نە ئەوەشە ئێوە كۆمەڵێك بن، كەس زەفەرتان پێ نەبات و، تۆڵە بستێنن و، بەسەر بەرانبەرتاندا زاڵ بن.

كەواتە: مادام وایە، بڕوا بێنن و بگەڕێنەوە بۆ هەق، بۆ ئەوەی تووشی هەمان سەرەنجام نەبن، كە بێبڕوایەكانی پێش ئێوە تووشی بوون.

٤)- ﴿سَيُهۡزَمُ ٱلۡجَمۡعُ وَيُوَلُّونَ ٱلدُّبُرَ﴾، بە دڵنیایی ئەو كۆمەڵە {كە بە تۆكمەو خڕو پڕو بە شێوەیەك خۆیان دەبینن، هەموو پێكەوەن} ئەوانە تێك دەشكێن و پشت هەڵدەكەن، ﴿سَيُهۡزَمُ ٱلۡجَمۡعُ﴾، **(الجَمْع)**، كۆمەڵە خەڵكەكەی دەیانگوت: ﴿نَحۡنُ جَمِيعٞ﴾، ئێمە هەموومان پێكەوەین، واتە: هیچ كەسمان لێ هەڵنەوێردراوە، یان: ئێمە تۆكمەو توندو تۆڵین، كە خوا دەفەرموێ: ﴿سَيُهۡزَمُ ٱلۡجَمۡعُ﴾، (أل)ی سەر

www.alibapir.com


(جَمْع)، بۆ (عَهد)ەو، بۆ ناساندنە، واتە: کۆمەڵەکە، ئەو کۆمەڵەی خۆیان پێ زۆر تۆکمەو توندو تۆڵە، تێدەشکێن، ﴿وَيُوَلُّونَ ٱلدُّبُرَ﴾ پشتیش هەڵدەکەن، لێرەدا بە تەعبیری: پشت هەڵدەکەن و پاش دەکەنەوە، وێناکراون و چوێنراون بە کەسێکەوە کە لە شەڕێدا تێک دەشکێ و پشت دەکاتە دوژمن و ڕادەکات.

٥)- ﴿بَلِ ٱلسَّاعَةُ مَوْعِدُهُمْ﴾، بەڵکو کاتەکە (سَاعَة)، بەڵێنگەیانە، ئەو کات و شوێنەیە بۆیان دیارییکراوە، (سَاعَة) لێرەدا مەبەست پێی ڕۆژی دواییەو، عەلەمە بۆ ڕۆژی دوایی هەمووی بە گشتیی، هەم ئاخیر زەمان، هەم قیامەت و لێپرسانەوە، بە تایبەت لێرەدا مەبەست پێی قیامەتە، چونکە لەوێدا سزاو پاداشت دێتە پێشێ، بۆیە دەفەرموێ:

٦)- ﴿وَٱلسَّاعَةُ أَدْهَىٰ وَأَمَرُّ﴾ کاتەکە (ی قیامەت)یش بێزەزاتریشەو تاڵتریشە، **(أدْهَى)**، لە (**دَاهِيَة**)ەوە هاتوە، **(اسْمُ تَفْضِيْلٍ مِنْ دَهَاهُ إذَا أَصَابَهُ بِدَاهِيَةٍ، وَهِيَ الأمْرُ المُنْكَرُ العَظِيْم)**، **(أدْهَى)**، ناوی هەڵبژاردن (**تَفْضِيْل**)ەو لە (**دَهَاهُ**)، هاتوە ئەگەر تووشی داهییەک بوو، (**دَاهِيَة**)ش، بریتیە لە کارێکی نامۆی مەزن، کە زۆر بێزەزا بێ و مرۆڤ نەتوانێ تەحەممولی بکات.

**(أَمَرّ)**یش ناوی هەڵبژاردن (**تَفْضِيْل**)ە، لە (**مُرّ**)ەوە هاتوە، واتە: تاڵترو ناخۆشتریشە، ئنجا خوا ﷻ وێنای دەکات کە لەو ڕۆژەدا چییان لێ دێ؟ دەفەرموێ:

٧)- ﴿إِنَّ ٱلْمُجْرِمِينَ فِي ضَلَـٰلٍ وَسُعُرٍ﴾، مسۆگەر تاوانباران لە گومڕایی و ئاگردان.

ئەمە سێ واتای هەن:

أ- تاوانبارەکان لە دنیادا لە گومڕایی دان و، لە دواڕۆژدا لە ئاگردان.

ب- تاوانباران لە ڕۆژی دواییدا لە زیانبارییدان و، لە نێو ئاگرێکی بڵێسەدار دان.

ج- تاوانباران لە دنیادا، لە گومڕایی و شێتیی و مەینەتیی دان.

٨)- ﴿يَوۡمَ يُسۡحَبُونَ فِي ٱلنَّارِ عَلَىٰ وُجُوهِهِمۡ﴾، ئەو ڕۆژە كە لەسەر ڕوویان لە ئاگردا، ڕادەكێشرێن، لە پەو ڕوو لە ئاگردا ڕادەكێشرێن.

٩)- ﴿ذُوقُواْ مَسَّ سَقَرَ﴾، (پێیان دەگوترێ:) تووشبوونی سەقەر بچێژن! (**يُقَال لَهُم**)، **أو** (**نَقُولُ لَهُم**)، پێیان دەگوترێ، یان: پێیان دەڵێین: بیچێژن تووشبوونی (**سَقَرَ**)، (**سَقَرَ**)یش یەكێكە لە ناوەكانی دۆزەخ، (**ذَوْق**): بە مانای چێژتنی بە زمانە، لەبەر ئەوەی شتێك بەزمان بتامێنی وبیچێژی، هەستێكی زۆر بەهێزە، بۆیە خوا بسم الله الرحمن الرحيم هەستكردن بە گەرمای ئاگری ناوناوە: (**ذَوْق**)، چێژتن.

لە ڕێگەی تۆڕە كۆمەڵایەتییەكان لەگەڵتانین
Stay in touch on social media
نحن معكم عبر مواقع التواصل الاجتماعي
ڕاگەیاندنی مەكتەبی مامۆستا عەلی باپیر
AliBapir/عەلی باپیر
archive.org/details/@alibapir
AliBapir/عەلی باپیر
كەناڵی ڕاگەیاندنی مەكتەبی مامۆستا عەلی باپیر
AliBapir
www.alibapir.net
كوردی - عربي - English
ڕاگەیاندنی مەكتەبی مامۆستا عەلی باپیر

www.alibapir.com


## مەسەلەی دووەم:

**خـوا هەمـوو شـتێکی بـە ئەندازەگیریـی دروسـتکردوەو، فەرمانیشـی بـە ئەنجامدانی کارێک، یەک وشەیە، وەک چاوترووکانێک، کە لێرەدا خوا ﷻ بە پێـی عەقڵـی ئێمـە، دەماندوێنـێ:**

خوا دەفەرموێ: ﴿إِنَّا كُلَّ شَيْءٍ خَلَقْنَاهُ بِقَدَرٍ ﴿٤٩﴾ وَمَا أَمْرُنَا إِلَّا وَاحِدَةٌ كَلَمْحٍ بِالْبَصَرِ ﴿٥٠﴾﴾.

## شیکردنەوەی ئەم دوو ئایەتە، لە دوو بڕگەدا:

١)- ﴿إِنَّا كُلَّ شَيْءٍ خَلَقْنَاهُ بِقَدَرٍ﴾، بە دڵنیایی ئێمە هەموو شتێکمان بە ئەندازەگیریی هێناوەتە دی، ﴿كُلَّ شَيْءٍ﴾، (**مَنْصُوبٌ بِفِعْلٍ مُقَدَّرٍ يَدُلُّ عَلَيْهِ خَلَقْنَا، أي خَلَقْنَا كُلَّ شَيءٍ خَلَقْنَاهُ بِقَدَر، وَالبَاءُ للمُصَاحَبَةِ، أي: مُصَاحِباً لِقَدَر**)، کە دەفەرموێ: ﴿إِنَّا كُلَّ شَيْءٍ خَلَقْنَاهُ﴾، ﴿كُلَّ شَيْءٍ﴾ (**كُلَّ**)، مەنصووبەو پاڵدەدرێتە لای (**شَيْء**)، ﴿كُلَّ شَيْءٍ﴾ بە کردارێکی مەزەننەکراو مەنصووبەکە (**خَلَقْنَاه**)ی دوایی، دەیگەیەنێ، یانی: (**إنَّا خَلَقْنَا كُلَّ شَيءٍ خَلَقْنَاهُ بِقَدَر**)، ئێمە هەموو شتێکمان دروستکردوە، دروستمانکردوە بە ئەندازە، (**ب**)ی (**بِقَدَر**)، بۆ هاوەڵێتییە، واتە: کە دروستمانکردوە، هەمیشە ئەندازەگیریی و نەخشەشی لەگەڵدا بووە.

٢)- ﴿وَمَا أَمْرُنَا إِلَّا وَاحِدَةٌ كَلَمْحٍ بِالْبَصَرِ﴾، فەرمانیشمان تەنیا یەکێکە وەک چاوترووکانێک، وشەی: (**وَاحِدَةٌ**) سیفەتی وەسفکراوێکی قرتێندراوە، یانی: (**كَلِمَة وَاحِدَة**)، یەک وشە کە بریتیە لە (**كُن**)، ببە، یاخود: (**مَرَّة وَاحِدَة**)، یەکجار، یەکجار فەرمانی پێ بکەین، پێویست بە دووبارە کردنەوە ناکات.

کـە دەفەرمـوێ: ﴿كَلَمْحٍ بِالْبَصَرِ﴾، ئەمـە لێـرەدا وێچوانـدنی خێرایـی، ئەنجامـدانی خـوای باڵادەسـتە بـۆ کارەکانی، بـە تـرووکانی چـاو، چـاو کـە بـە خێرایـی دەترووکـێ، هەڵبەتـە نـەک بۆ ئەوە کە خوا ﷻ بەو ئەندازەکاتەی چاوی تێدا دەترووکێ، کارەکانی ئەنجام دەدات، بەڵکو مەبەست ئەوەیە، کە خوا ﷻ بۆ ئەنجامدانی

www.alibapir.com


کارەکانی پێویستیی بە کات نیە، چونکە خودی کات و شوێن، دروستکراوی خوای بەرزن، بۆیە لە سوورەتی (النحل)دا، دەفەرموێ: ﴿وَمَآ أَمۡرُ ٱلسَّاعَةِ إِلَّا كَلَمۡحِ ٱلۡبَصَرِ أَوۡ هُوَ أَقۡرَبُ ٧٧﴾، کاری کاتەکە (ساعَة) {ڕۆژی دوایی} وەک چاوترووکانێک، یاخود نیزیکتریشە، لەبەر ئەوەی لەوێ باسی هاتنی ڕۆژی دوایی دەکات.

بەڵام لێرەدا وشەی: ﴿أَوۡ هُوَ أَقۡرَبُ﴾ {یان: ئەو نیزیکتریشە}ی لەگەڵدا نیە، چونکە مەبەست تەنیا گەیاندنی ئەوەیە، کە خوا بسم الله الرحمن الرحیم کارەکانی خۆی زۆر بە خێرایی ئەنجام دەدا، بەڵام ئێمە لە چاوترووکان (لمح البصر) خێراترمان نیەو، لە گوتنی وشەی (ببە)مان، خێراتر نیە.

چۆنیەتیی پەیوەستبوونی ئەم ئایەتانە، بە ئایەتەکانی پێشەوە، بە تایبەتی ئەم دوو ئایەتە (٤٩ - ٥٠)، کە خوا بسم الله الرحمن الرحیم دەفەرموێ: ئێمە هەموو شتێکمان بە ئەندازە دروستکردوە: ﴿إِنَّا كُلَّ شَيۡءٍ خَلَقۡنَٰهُ بِقَدَرٖ﴾، ئایا ئەمە چ پەیوەستییەکی هەیە، بە ئایەتەکانی پێشەوەوە؟! دەڵێین: خوا بسم الله الرحمن الرحیم کە بۆمان باسی هاتنی ڕۆژی دوایی و، تێدا سزادرانی بێبڕوایان و، تێدا پاداشتدرانەوەی چاکەکاران و پارێزکاران، دەکات، دەیەوێ لێمان حاڵیی بکات کە هەموو شتێکی بە ئەندازەگیریی دروستکردوە، ئەگەر تەماشای گەردوون و، جەستەی خۆمان بکەین، دەبینین هەموو شتێک لەجێی خۆیدایە، ژیانی مرۆڤیش کە لەم سەر زەوییە دەیگوزەرێنێ، مرۆڤەکان هەندێکیان چاکەکارن و هەندێکیان خراپەکارن، هەندێکیان خاوەنی چاکەو پارێزن و، هەندێکیان خاوەنی تاوان و خراپەن، بەڵام هەموویان وەک یەک دەمرن و کۆتاییان پێ دێ، ئنجا ئەگەر هاتباو ڕۆژی دوایی و سزاو پاداشت نەبووایە، ئەوە پێچەوانەی ئەو سیستەم و ڕێک و پێکییەیە، کە لە هەموو دروستکراوەکانی خوادا هەیە، بۆیە خوا بسم الله الرحمن الرحیم دەفەرموێ: ئێمە هەموو شتێکمان بە ئەندازەگیریی دروستکردوە، کەواتە: ئەی مرۆڤەکان! نابێ ژیانی ئێوەش لە سیستەم و ڕێک و پێکیی و ئەندازەگیریی خاڵیی بێ، بۆیە ئەم ژیانە دنیاییەتان قۆناغێکی دیکەو ژیانێکی دیکەی بە دوادا دێ.

www.alibapir.com


**مەسەلەی سێیەم:**

**هەڕەشە کردن لە بێبڕوایان کە خوا کۆمەڵ و گرووپە هاومەشڕەبەکانیانی فەوتاندوون، لە ڕابردوودا، هەرچی کردووشیانە لە لیستاندا تۆمار کراوە بە وردو درشتەوە:**

خوا دەفەرموێ: ﴿ وَلَقَدْ أَهْلَكْنَآ أَشْيَاعَكُمْ فَهَلْ مِن مُّدَّكِرٍ ﴿٥١﴾ وَكُلُّ شَىْءٍ فَعَلُوهُ فِى ٱلزُّبُرِ ﴿٥٢﴾ وَكُلُّ صَغِيرٍ وَكَبِيرٍ مُّسْتَطَرٌ ﴿٥٣﴾ ﴾.

## شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە چوار بڕگەدا:

**١)-** ﴿ وَلَقَدْ أَهْلَكْنَآ أَشْيَاعَكُمْ ﴾، بە دڵنیایی ئێمە هاوشێوەکانی ئێوەمان فەوتاندوون، لە ڕابردوودا، (**أَشْيَاعَكُمْ أي: أَمْثَالَكُم وَأَشْبَاهَكُم**)، ئەوانەی هاو وێنەکانی ئێوەو هاوشێوەکانی ئێوەن، (**أَشْيَاع**)، کۆی (**شِيْعَة**)یە، هەروەها (**شِيَع**)یش: ﴿ فِى شِيَعِ ٱلْأَوَّلِينَ ﴿١٠﴾ ﴾ الحجر، ئەویش کۆی (**شِيَعَة**)یە، یانی: کۆمەڵ، کۆمەڵە خەڵکێک کە لەگەڵ کەسێکدا هاوڕان و، لەگەڵیدا دەڕۆن و پشتگیریی دەکەن، ﴿ وَلَقَدْ أَهْلَكْنَآ أَشْيَاعَكُمْ ﴾ واتە: ئەو کۆمەڵانەی لە پێش ئێوەدا بوون، وەک پشتگیریی ئێوەیان کرد بێ، لەسەر کوفرو شیرک، ئەوانەمان فەوتاندوون، ئەمەش دووبارە گەڕانەوەیە، لە شێوەی دواندنی نادیارەوە، بۆ شێوەی دواندنی ڕووبەڕوو، کە بە (ل) و (قد) جەختی لەسەر کراوەتەوە، کەدیارەخوا ﷻ کەلەپێشووەکانی فەوتاندوون، بەڵام جەختکردنەوەکەبۆئەوەیە: کە ئێوە ئەی کافرەکانی ڕۆژگاری پێغەمبەر ﷺ! وەک نکوولیی بکەن لەوەی گەلە پێشووەکان فەوتابن و نەمابن، بۆیە پێویستیی بەوە کردوە، بۆیان جەخت بکاتەوە.

**٢)-** ﴿ فَهَلْ مِن مُّدَّكِرٍ ﴾، ئایا هیچ بیرکەرەوەیەک، هیچ پەند وەرگرێک هەیە؟

ئەمە لێرەدا پرسیارکردنی نکوڵیلێکەرانەیە، واتە: بە گشتیی پەند وەرگرێک و بیرکەرەوەیەک و ئامۆژگاریی قبووڵکەرێک نەبوو، کە پەند لە ڕابردووان وەربگرێ، هەڵبەتە مەبەست پێی بێبڕوایانی ڕۆژگاری پێغەمبەرە ﷺ.

www.alibapir.com


٣)- ﴿ وَكُلُّ شَيْءٍ فَعَلُوهُ فِي الزُّبُرِ ﴾، هەرچی کردووشیانە لە لیستاندا، لە نووسراواندا، تۆمار کراوە، (**الزُّبُر: جَمْعُ زَبُور أي: كِتَاب، مُشْتَقَّةٌ مِنَ الزَّبْرِ وَهُوَ الكِتَابَةُ**)، (**زُبُر**) کۆی (**زَبُور**)ە، (**زَبُور**)یش، بە مانای (**كِتَاب**)ە، کە لە (**زَبْر**)ەوە هاتوە، (**زَبْر**)، یانی: نووسین (**كِتَابَة**)، کە دەفەرمویٚ: ﴿ وَكُلُّ شَيْءٍ فَعَلُوهُ فِي الزُّبُرِ ﴾، هەرچی کردوویانە لە کتێباندا نووسراوە، بۆچی بە کۆ هێناویەتی؟ چونکە هەر کامێکیان لیستێکی تایبەتیی خۆی هەیەو، هەر کامێکیان دۆسیەیەکی تایبەتیی خۆی هەیە، کردەوەکانی تێدا تۆمار دەکرێن.

٤)- ﴿ وَكُلُّ صَغِيرٍ وَكَبِيرٍ مُسْتَطَرٌ ﴾، هەموو بچووکێک و گەورەیەک نووسراوە، پێشیٚ دەفەرمویٚ: هەرچی کردوویانە لە لیستاندا تۆمار کراوە، دوایی دەفەرمویٚ: هەموو بچووکێک و گەورەیەک، ئەمە جۆرێکە لە (**إطْنَاب**)، بە درێژیی قسەکردن، لەبەر ئەوەی مەقامەکە وا دەخوازیٚ، وشەی (**مُسْتَطَر: اسْمُ مَفْعُولٍ مِن سَطَرَ أي: كَتَبَ سُطُوراً، وَكِتَابٍ مَسْطُور**)، (**مُسْتَطَرٌ**)، ناوی بەرکار (**مَفْعُول**)ە، واتە: نووسراو، لە (**سَطَرَ**)ەوە هاتوە، (**سَطَرَ**)، واتە: دێڕی نووسین، دەگوترێ: ﴿ وَكِتَابٍ مَسْطُورٍ ﴿٢﴾ ﴾ **الطور**، یانی: کتێبێکی نووسراو، کە دەفەرمویٚ: ﴿ وَكُلُّ صَغِيرٍ وَكَبِيرٍ مُسْتَطَرٌ ﴾، هەموو بچووکێک و هەموو گەورەیەک نووسراوە، بچووک مەبەست پێی ئەو شتەیە، کە خەڵک گوێی پێ نادات و نادیدەی دەگرێ، گەورەش ئەو شتەیە کە پێچەوانەی بچووکە واتە: شتێک کە جێی بایەخی خەڵک بێ، یانی: چ ئەو شتانەی خەڵک بە بچووک تەماشایان دەکەن، چ ئەوانەی بە گەورەیان تەماشایان دەکەن، هەموویان نووسراون.

ئنجا هەندێک لە زانایان دەڵێن: ئەو شتانەی پاداشت و سزایان پێوە پەیوەست دەبێ، نووسراون، بەڵام شتێک پاداشت و سزای پێوە پەیوەست نەبێ، وەک هەڵسوکەوتە ئاساییەکانی مرۆڤان، فریشتەکان، ئەوانە نانووسن، هەندێک لە زانایانیش دەڵێن: هەموو شتێک دەنووسن، چ ئەوەی سزای بکەوێتە سەرو، چ ئەوەی پاداشتی پێوە پەیوەست بێ، چ سزاو پاداشتیشیان پێوە پەیوەست نەبێ.

## مەسەلەی چوارەم و کۆتایی:

**باسی سەرەنجامی پڕ خێرو خۆشیی پارێزکاران و ڕاگەیاندنی ئەو ڕاستییە کە پارێزکاران، لە نێو باخ و گوڵزارو کانیی و ڕووباران داو، لە جێگاو ڕێگایەکی دڵپەسەندو، لە خزمەت خوای حکومڕانی باڵا دەست و توانادان:**

خوا دەفەرموێ: ﴿ إِنَّ الْمُتَّقِينَ فِي جَنَّاتٍ وَنَهَرٍ ﴿٥٤﴾ فِي مَقْعَدِ صِدْقٍ عِندَ مَلِيكٍ مُّقْتَدِرٍ ﴿٥٥﴾ ﴾.

## شیکردنەوەی ئەم دوو ئایەتە، لە سێ بڕگەدا:

١)- ﴿ إِنَّ الْمُتَّقِينَ فِي جَنَّاتٍ وَنَهَرٍ ﴾، بە دڵنیایی پارێزکاران لە نێو باخان و ڕووباراندان، (جَنَّات)، کۆی (جَنَّة)یە، یانی: باخ، ئەویش ئەوەیە کە هەم درەختی تێدابن، هەم سەوزایی کشت و کاڵ و گوڵ و گوڵزاری تێدابێ، (نَهَر)یش، بە مانای ڕووبارەو، ڕووباریش مەرج نیە، تەنیا بە چەمکە باوەکەی ئێستا بێ، ڕووبارێکی وەک دیجلەو فوڕات و نیل! بەڵکو (نهر) بە ئاوی زۆری جۆگەلەش دەگوترێ.

واتە: لە شوێنێکدان، کە جێ و ڕێگاکانیان، هەم گوڵ و گوڵزارو باخ و باخاتە، هەم کانیی و سەرچاوەو ڕووباریشە.

کە دەفەرموێ: ﴿ إِنَّ الْمُتَّقِينَ ﴾، (مُتَّقِيْن)، کۆی (مُتَّقِي)یە، (مُتَّقِي)، خۆپارێز، کەواتە: خۆیان پاراستوەو بە هەوڵ و توانای خۆیان، کاریان لەسەر خۆیان کردوە، خۆیان بپارێزن لەو شتانەی خوا پێی ناخۆشن، بۆیە سەرەنجامیان ئاوایە، (نهْر) و (نَهَر)، چ بە زەنە (سکون)، چ بە سەر (فتحة)، هەردووکیان بە مانای ئاوی شیرین، دێن، ڕووبارێک و جۆگەلەیەک، ئاوی شیرینی لێوە بێ.

٢)- ﴿ فِي مَقْعَدِ صِدْقٍ ﴾، لە جێگاو ڕێگایەکی پەسەنددا، خانوو و بەرەیەکی دڵگیر، (مَقْعَد)، ناوی شوێنە واتە: شوێنی نیشتەجێ بوون، لێرەدا مەبەست لە شوێنی دانیشتن، واتە: شوێنی نیشتەجێ بوونێکی بە ئۆقرەو ئۆخژنەوەو بە ئارامیی، (صِدْق)

www.alibapir.com


یش، وەک پێشتر گوتمان: لە ئەصڵدا ئەوەیە هەواڵێک لەگەڵ واقیعدا ڕاست بێتەوە، بەڵام دوایی بۆ زۆر واتای دیکە بەکارهاتوە، بۆ وێنە: کە دەگوترێ: (رَجُلٌ صِدْقٌ)، یان (رَجُلُ صِدْقٍ)، واتە: پیاوێک کە تەواوی پیاوەتیی تێدایە، ﴿فِي مَقْعَدِ صِدْقٍ﴾ یانی: جێگاو ڕێگایەکی دڵپەسەندو باش.

٣)- ﴿عِندَ مَلِيكٍ مُّقْتَدِرٍ﴾، لە لای حوکمڕانێکی توانادار، (مَلِيْك)، (فَعِيْل)ە، بە مانای (مَالِك) دێ، کە لێرەدا بۆ زێدەڕۆییە، (مليك) مانایەکەی بەهێزترە لە (مَلِك)، (مُقْتَدِر) یش، مانایەکەی بەهێزترە لە (قَادِر) و (قَدِيْر)، (مَلِيْك)، و (مُقْتَدِر)یش، هەردووکیان بە نەزانراو (نكرة) هاتوون، ئەمە بۆ مەزن پێشاندانە واتە: حکومڕانێک و توانادارێک کە لە سەرووی وەصفکردن و، لە سەرووی ئەوەوەیە مرۆڤ بتوانێ، وەک پێویست دەرکی بکات.

کەواتە: خوا ﷻ لە کۆتایی ئەم سووڕەتە موبارەکەدا - کە ئەم سووڕەتە موبارەکە، جگە لەم دوو ئایەتە، هەمووی باسی سزاو جەزرەبەو تۆڵەستاندنەوەی خوا بوو ﷻ، لە بێبڕوایان - بەڵام لەم دوو ئایەتەی کۆتایی ئەم سووڕەتە موبارەکەدا، باسی سەرەنجامی پڕخێرو خۆشیی پارێزکاران دەکات، بۆیە بە پارێزکارانیش دەیانناسێنێ، چونکە پێش هەموو شتێک، دەبێ مرۆڤ خۆی لە کوفرو شیرک و ئیلحاد بپارێزێ، ئنجا دێتە نێو بازنەی ئیمان و ئیسلام و خوا بە یەکگرتنەوە، ئنجا دوایی دەبێ خۆی لە گوناهو تاوان و سەرپێچیی بپارێزێ، بۆ ئەوەی بێتە نێو بازنەی تاعەت و فەرمانبەریی و، دوایی خۆی لە وردە گوناهان بپارێزێ، بۆ ئەوەی بێتە نێو بازنەی زیاتر بۆ خوا صوڵحان، کەواتە: پارێزکار (مُتَّقِي) کەسێکە خۆی دەپارێزێ لە کوفرو شیرک و ئیلحاد، دوایی خۆی دەپارێزێ لە گوناهی گەورە، دوایی خۆی دەپارێزێ لە هەموو ئەو شتانەی خوا پێی ناخۆشن، واتە: پارێزکار تەنیا یەک حاڵەتی نیەو، تەقوا تەنیا یەک پلە نیە، بەڵکو زۆر پلەیە.

بۆیەش خوا بسم الله الرحمن الرحيم لە کۆتایی ئەم سوورەتەدا باسی پاداشتی پارێزکارانی کردوە، تاکو بزانرێ کە هەر کەسێ خۆی بپارێزێ لەوەی ئەو گەلە پێشووانە خۆیانیان لێ نەپاراستوە، لە کوفرو شیرک و بە درۆ دانانی پێغەمبەران (**عَلَيْهِمُ الصَّلَاةُ وَالسَّلَامُ**) و، لە بە درۆ دانانی ترساندنەکانی خواو، هۆشداریی پێدانەکانی خوا، هەر کەسێ خۆی لەوانە بپارێزێ و ئەهلی تاعەت بێ، ئەوە سەرەنجامەکەی ئەوەیە کە لە خزمەت خوای پەروەردگاردا، لە جێگاو ڕێگایەکی دڵ پەسند، لە نێو کۆشک و تەلارو جۆگەو ڕووبارو باخ و گوڵ و گوڵزاردا دەبێ.

خوای پەروەردگار ئێمە لەو کەسانە بگێڕێ، بە لوتف و کەرەمی خۆی و، سەرەنجامی هەموولایەکمان خێر بکات.

لێرەش دا دێینە کۆتایی تەفسیری سوورەتی (**القمر**)، بەڵام دوای: {کورتە باسێک لە بارەی ئەندازەگیریی خواوە لە دروستکراوەکانیدا} کە لە (٢٥) خاڵدا باسی هەندێک نموونە دەکەین: چۆن خوا بسم الله الرحمن الرحيم دروستکراوەکانی خۆی هەموویان، بەو پەڕی ڕێک و پێکیی و ئەندازەگیرییەکی ورد دروستکردوون.

لە ڕێگەی تۆڕە کۆمەڵایەتییەکان لەگەڵتانین
Stay in touch on social media
نحن معكم عبر مواقع التواصل الاجتماعي
ڕاگەیاندنی مەکتەبی مامۆستا عەلی باپیر
AliBapir/عەلی باپیر
archive.org/details/@alibapir
AliBapir/عەلی باپیر
AliBapir
www.alibapir.net
کوردی - عربي - English
کەناڵی ڕاگەیاندنی مەکتەبی مامۆستا عەلی باپیر
ڕاگەیاندنی مەکتەبی مامۆستا عەلی باپیر

www.alibapir.com


## کورتە باسێک لە بارەی
## ئەندازەگیریی خواوە لە دروستکراوەکانیدا[1]

بەڕێـــزان!

ئـەم باسـە لەبـەر ڕۆشـنایی ئـەو ئایەتـە موبارەکـەی سـووڕەتی (**القمـر**)دا دەخەینـەڕوو: ﴿إِنَّا كُلَّ شَيْءٍ خَلَقْنَٰهُ بِقَدَرٍ ﴿٤٩﴾﴾، واتـە: ئێمـە هەمـوو شـتێکمان بـە ئەنـدازە دروسـتکردوە.

هەڵبەتەئەوڕاستییەش لەزۆرجێی دیکەی قورئـاندا، خـوا ﷻ ڕایگەیاندوە، بۆ وێنە:

أ- لە سەرەتای سووڕەتی (**الفرقان**)یشدا دەفەرموێ: ﴿تَبَارَكَ ٱلَّذِى نَزَّلَ ٱلْفُرْقَانَ عَلَىٰ عَبْدِهِۦ لِيَكُونَ لِلْعَٰلَمِينَ نَذِيرًا ﴿١﴾ ٱلَّذِى لَهُۥ مُلْكُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَلَمْ يَتَّخِذْ وَلَدًا وَلَمْ يَكُن لَّهُۥ شَرِيكٌ فِى ٱلْمُلْكِ وَخَلَقَ كُلَّ شَيْءٍ فَقَدَّرَهُۥ تَقْدِيرًا ﴿٢﴾﴾، مەبەستمان ئەو ڕستەی دواییە: ﴿وَخَلَقَ كُلَّ شَيْءٍ فَقَدَّرَهُۥ تَقْدِيرًا﴾ (خوا) هەموو شتێکی هێناوەتە دی و، بە ئەندازەگیرییەکی تێرو تەواو، ئەندازەگیریی بۆ کردوە.

ب- هەروەها لە سووڕەتی (**الأعلى**)دا، کە دەفەرموێ: ﴿سَبِّحِ ٱسْمَ رَبِّكَ ٱلْأَعْلَى ﴿١﴾ ٱلَّذِى خَلَقَ فَسَوَّىٰ ﴿٢﴾ وَٱلَّذِى قَدَّرَ فَهَدَىٰ ﴿٣﴾﴾، ناوی پەروەردگاری بەرزت بە پاک بگرە، ئەو زاتەی هەموو شتێکی هێناوەتە دی و ڕێک و پێک دروستی کردوەو، ئەو زاتەی هەموو شتێکی ئەندازەگیریی کردوە و ڕێنمایی کردوە.

---

(١) سـەرچاوەمان بـۆ ئـەم کورتـە باسـە، کـە خـوا پشـتیوان بـێ لـە سـی و پێنـج خـاڵ دا، دەیخەینـەڕوو، بـە کورتیـی و گوشراویـی، تەفسـیرەکەی دکتـۆر (محمـد راتـب النابلسي)یـە، بـەڵام بـە پوختکردنـەوەو ڕوونکردنـەوەو داڕشـتنەوەی خـۆم و، سـووکە دەسـتکارییەکەوە، یەکسـەریش کـە تەفسـیرەکەی ئـەو بـە عەرەبییـە، بـە کوردیـی واتایەکـەی دێنـم.

www.alibapir.com


سـەرەتا بـا وێنەیـەک بێنینـەوە: پلاکێکـی کارەبایـی کـە بـۆ گڵۆپێـک دانـراوە، یـان بـۆ پانکەیـەک، یـان بـۆ هـەر شـتێک، ئـەو پلاکـە کـە لـە ژوورێکـدا دادەنـرێ، دەگونجـێ لـە سـەقفەکەیدا دابـنرێ، دەگونجـێ لـە زەوییەکەیـدا دابـنرێ، دەگونجـێ لـە دیوارەکەیـدا، لـە دیوارەکەشـدا، دەگونجـێ زۆر بـەرز بـێ و، دەگونجـێ زۆر نـزم بـێ و، بـۆی دابێیـەوەو، دەشـگونجێ بـە شـێوەیەک بـێ پێویسـت نـەکات، خـۆت ئەزیـەت بـدەی بـۆ دەسـت پێگەیانـدنی و یەکسـەر دەسـتی بگەیەنیـە، ئنجـا کاتێـک دەچیـە ژوورێکـەوەو دەبینـی ئـەو پلاکـە بـە شـێوەیەک دانـراوە، پێویسـت نـەکات بـۆی بچیـە سـەر شـتێکی بڵنـد، یـان بـۆی بـە پەیـژە هەڵگەڕێـی بـۆ ئـەوەی دەسـتی بگاتـێ، یـان زۆر بـۆی دابێیـەوە، بەڵکـو ڕێـک لـە ئاسـتیی دەسـتی مـرۆڤ دا دانـراوە، دەزانـی کەسـێکی لێـزان دایـناوە، کـە ئەندازەگیریـی ئاسـتی پلاکەکـەو جەسـتەی مرۆڤـی کـردوە، هەروەهـا لـە ڕووی سـەلامەتییەوەش دووربینیـی کـردوە، وەک: ئـەو پلاکـە منداڵێکـی بچـووک دەسـتی نەیگاتـێ، تەلـە سـاردو گەرمـەکانی وایەرەکـە زۆر بـاش داپـۆشراون و...هتـد، هەمـوو ئەوانـە سـەرنجی تـۆ ڕادەکێشـن و دەزانی کـە کەسـێک هەمـوو ئـەو شـتانەی ئەندازەگیریـی کـردوون و ئـەو پلاکـەی لـەوێ دانـاوە.

کەواتـە: هەمیشـە ئەندازەگیریـی و ڕێـک و پێکیـی و وردەکاریـی لـە شـتەکاندا، سـەرنجمان ڕادەکێشـێ بـۆ ئـەو حیکمـەت و زانیاریـی و میهرەبانیـی و کارامەییـەی دروسـتکەرەکەی کـە تێیاندایـە، ئێسـتاش باسـەرنجی کۆمەڵێـك لـە دروسـتکراوانی پـڕ وردەکاریـی خـوا بدەیـن:

١- قەبارەی زەوی کە یەک لەسەر ملیۆنێک و سێسەد هەزار (١/١٣٠٠٠٠٠) جاری قەبارەی خۆرە، ئنجا بارستایی و قەبارەی زەوی، ئەگەر لەوەی هەیە گەورەتر بووایە، کێشی شتەکانیش لەسەری قورستر دەبوو، ئەگەر بچووکتریش بووایە، کێشی شتەکانیش سووکتر دەبوو، بۆیەش ئەوانەی چوونە سەر مانگ هەنگاوێکیان هەڵدێنا چەند مەترێک بەرز دەبوونەوە، چونکە لەوێ کێشی شتەکان، یەک لەسەر شەشی کێشی شتەکانە لەسەر زەوی، واتە: ئەگەر لێرە شتێک شەش کیلۆ بێ، لەسەر مانگ یەک

کیلۆیە، مرۆڤێک لێرە حەفتا کیلۆ بێت، لەوێ دەبێتەوە دوازدە کیلۆ کەمتریش، بە پێچەوانەوەش ئەگەر قەبارەو بارستایی زەوی لە هی ئێستای گەورەتر بووایە بۆ وێنە: دوو هێندە بووایە، ئەو کاتە کێشی شتەکان، دوو هێندەی لێ دەهات، کەواتە: بارستایی و قەبارەی زەوی بە ئەندازەگیریی دانراون، لە قەدەر گونجان لەگەڵ جەستەی مرۆڤ و، ئەو ژیانەدا کە مرۆڤ لەسەر زەوی دەیگوزەرێنێ.

٢- زەوی هەر بیست و چوارسەعات جارێک، خولێک بە دەوری خۆیدا دەخوات، ئەندازەی خێراییەکەی بریتیە لە سی (٣٠)کم لە خولەکێکدا، مانای وایە: (١٨٠٠)کم، لە سەعاتێکدا دەبڕێ، ئنجا ئەگەر هاتباو ئەو سووڕانەوەیەی زەوی، لەوە خێراتر بووایە، بۆ وێنە: لە ماوەی دوو سەعاتدا بە دەوری خۆیدا خولابایەوە، ئەو کاتە شەو دەبوو بە سەعاتێک و ڕۆژ دەبوو بە سەعاتێک، هەروەها ئەگەر سستتر بووایە بۆ وێنە: چل و هەشت سەعات، بووایە، ئەو کاتە ڕۆژ دەبوو بە بیست و چوار (٢٤) سەعات، شەویش دەبوو بە بیست و چوار سەعات، کە لە هەردوو حاڵاندا، ژیانی بەشەر بەو شێوەیەی کە ئێستا هەیە نەدەبوو، بگرە ژیانی بەشەر هەر نەدەبوو! ئێستا هەندێک لە جەنگەڵستانەکان گڕ دەگرن و دەئایسێن لە ئەنجامی بەهێزیی تیشکی خۆردا، ئەو کاتە دەبێ چییان لێهاتبایە! هەروەها شەویش ڕووی زەوی کە بیست و چوار سەعات تیشکی خۆر لێی نەدەدا، دەبووە بەستەڵەک.

٣- زەوی لە سووڕانەوەی بە دەوری خۆردا، شەست (٦٠) هێندەی سووڕانەوەی بە دەوری خۆیدا، خێرایە، واتە: ئەگەر لە سووڕانەوەی بە دەوری خۆیدا لە خولەکێکدا سی (٣٠)کم دەبڕێ، لە سووڕانەوە بە دەوری خۆردا، لە چرکەیەکدا (٣٠)کم دەبڕێ، واتە: شەست (٦٠) هێندە خێرایەو، زەوی بە (٣٦٥) ڕۆژ سووڕێک بە دەوری خۆردا دەکات، ئنجا دایبنێ لە جیاتی (٣٦٥) ڕۆژ، واتە: ساڵێک بە دەوری خۆردا بخولێتەوە، بەسەد (١٠٠) ساڵ، جارێک بە دەوری دا خولابایەوە، ئەو کاتە بێگومان چوار وەرزەکانمان نە دەبینین و ئەگەر چوار وەرزەکان بیندراباشنایە، بەشێوەی هاوکۆ (**معدّل**) هەرکامیان ماوەی بیست و پێنج ساڵی دەخایاند، نەک مرۆڤ ساڵانە چوار کەشەکان ببینێ!

٤- سورگەی زەوی لە سووڕانەوەی بە دەوری خۆردا بە: (٢٣,٥) پلە لارە، واتە: ڕێک نیەو مەیلەو لارە، ئنجا ئەو لارییەی سورگەی زەوی لە سووڕانەوەی بە دەوری خۆردا، دەبێتە هۆی پەیدابوونی چوار وەرزەکان، ئەو لایەی کە نزیکتر دەبێ، لە خۆرەوە دەبێتە هاوین و، ئەولایەی دوورترە دەبێتە زستان، ئەملاو لاشیان، دەبنە بەهارو پایز، بەو شێوەیە چوار کەشەکانی ساڵ بەسەر گۆی زەویدا دابەش دەبن، کە بێگومان ئەگەر سورگەکەی بە شێوەیەکی ڕێک بووایەو، ئەو لارییەی تێدا نەبووایە، ئەو کاتە چوار کەشەکان نەدەمان، یان زستان دەبوو، یان هاوین.

٥- زەوی کە دەسووڕێتەوە بە دەوری خۆردا، ئەویش دیسان بە شێوەیەکی هێلکەیی و ئیهیلیجیی دەخولێتەوەو، جەمسەرێکی کورتەو جەمسەرێکیشی درێژە، کاتێک دەگاتە جەمسەرە کورتەکەو، ماوەی نێوان زەوی و خۆر کەم دەبێتەوە، ئەگەری ئەوەی هەیە زەوی خۆر ڕایکێشێ و بەخۆیەوە بنووسێنێ، بۆیە لەو کاتەدا کە زەوی دەگاتە جەمسەرە کورتەکەی، خێراییەکەی زیاتر دەبێ، کە ئەویش پاڵ بە خۆرەوە بنێ و پێوەی نە نووسێ و، کاتێک دەگاتە جەمسەرە درێژەکە، جەمسەرە دوورەکەش، لەو کاتەشدا، ئەگەری ئەوە هەیە زەوی لە مەودای هێزی کێشندەی خۆر بچێتە دەرێ، بۆیە لەوێ سووڕانەوەکەی سستتر دەبێتەوەو، ڕاکێشانی زەوی بۆی بێهێزتر دەبێ، بۆ ئەوەی دەرنەچێ! ئنجا هەر ئەوەشە دەبێتە هۆی کورتیی و درێژیی شەوو ڕۆژان، کەخوا ﷽ لەچەندشوێنان لەقورئان دائاماژەی پێدەکات: ﴿ يُولِجُ ٱلَّيۡلَ فِي ٱلنَّهَارِ وَيُولِجُ ٱلنَّهَارَ فِي ٱلَّيۡلِ ﴿٢٩﴾ ﴾ لقمان، واتە: شەو دەخاتە نێو ڕۆژێ و ڕۆژێ دەخاتە نێو شەوێ.

٦- دووریی زەوی لە خۆرەوە بە سەدو پەنجا ملیۆن (١٥٠,٠٠٠,٠٠٠) کیلۆمەتر دانراوەو ئەگەر زەوی لە خۆرەوە نزیکتر بووایە، هەموو شتێک دەسووتاو دەبوو بە قەرەبرووت و خۆڵەمێش، ئەگەر دوورتریش بووایە، بێگومان هەرژیانداری لەسەریەتی، ڕەق دەبۆوەو، سەر زەوی دەبوو بە بەستەڵەک و ژیانی لەسەر نەدەبوو.

www.alibapir.com



٧- هەروەها قەبارەی مانگیش دیسان بە ئەندازەیەکی دیارییکراو دانراوە، کە بە ئەندازەی سێیەک (١/٣)ی قەبارەی زەوییەو، مانگ بە (٢٧) شەوو یەک لەسەر دووی شەوێک، خولێک بە دەوری زەویدا دەدات، واتە: لە هەموو مانگاندا خولێک بە دەوری زەویدا دەدات، کە پێشێ، وەک دەمە داسێک دەردەکەوێ و پێی دەگوترێ: (هلال) دوایی وردە وردە گەورە دەبێ، گەورە دەبێ تاکو دەبێتە بەدر لە: (١٤ و ١٥ و ١٦)دا، دوایی وردە وردە بچووک دەبێتەوە، تاکو وەک دەمە داسێکی لێ دێتەوەو دووبارە ون دەبێتەوە، بە هۆی ئەوەوەش ئێمە دەزانین ئەو شەوە چ شەوێکە، ئەگەرنا شەوەکان بەهۆی خۆرەوە نازانرێن، چونکە ڕۆژەکان هەموویان وەک یەکن، بەڵام شەوەکان بەهۆی مانگەوە دەزانین، ئەو شەوە سەرەتای مانگە، یان نێوەڕاستیەتی، یان کۆتاییەتی؟

ئنجا با دابەزین بۆ سەر ڕووکاری زەوی:

٨- دوورگەکانی زەوی (جزر الأرض)، ئەو دوورگانەی لە نێو دەریاکاندا هەن، زۆر ڕۆڵان دەگێڕن، یەکیان ئەوەیە کە پەیوەندییان بە هەڵکردنی باو جووڵەکردنیەوە هەیە.

٩- هەروەها چیاکانیش زۆر بە شێوەیەکی وردەکارییانە دابەش بوون بەسەر گۆی زەویدا، تاکو هەم هاوسەنگیی زەوی ڕابگرن، هەم وەک چۆن پەیکەری ئێسکیی لە جەستەی مرۆڤدا، جەستەی مرۆڤ ڕادەگرێ، چیایەکانیش بەو شێوەیەو، توێژاڵی سەرەوەی زەوییان زۆر مەحکەم کردوە، هەربۆیەش خوا ﷽ چیایەکانی بەسینگ و گوڵمیخ ناو بردوون: ﴿وَٱلْجِبَالَ أَوْتَادًا ۝٧﴾، هەروەها دەفەرموێ: ﴿وَأَلْقَىٰ فِى ٱلْأَرْضِ رَوَٰسِىَ أَن تَمِيدَ بِكُمْ ۝١٠﴾ **لقمان**، واتە: چیا قورسەکانمان فڕێدانە نێو زەوی، بۆ ئەوەی نەتانجووڵێنی، ئەو توێکڵەی زەوی، بە هۆی چیایەکانەوە زۆر قایم و مەحکەم بووە، زانایانیش دەڵێن: هەر چیایەک کە ئێمە دەیبینین، چەندەی بە دەرەوەیە، هەندێ دەڵێن: حەوت (٧) هێندەو، هەندێک دەڵێن: (١٠ - ١٥)، هێندەشی لە زەوی دایە، بۆ وێنە: چیای هیمالایە کە (٨٨٦٤)م، بەرزە، (١٠ - ١٥)، هێندەشی بە ناخی زەویدا چۆتە خوار!

**١٠-** دەریا و ئۆقیانووسەکانیش، کە چوار لەسەر پێنج (٤/٥)ی پانتایی زەوی دادەپۆشن، ئەو بەرگە ئاوییەی زەوییش، ژیانی هەموو ژیاندارانی پێوە بەستراوە، چونکە هەرچی ئاوی شیرینە، تەنیا لەو بەرگە ئاوییە پەیدا دەبێ.

**١١-** لەسەر ڕووکاری زەوی بیابانەکانیش هەن، کە دەبنە هۆی ئەوەی هەوا گەرم بێ، ئنجا کە هەوا گەرم دەبێ دەکشێ و، بەهۆی ئەوەوەش جوولەی تێدا پەیدادەبێ و، لەوێ فشاری هەوا کەم دەبێ، بەڵام لە ناوچە جەمسەرییەکان (**المناطق القطبية**)دا هەوا ساردەو چڕەو زیاتر هاتۆتەوە یەک و فشاری هەوا بەرزە، لە ناوچە بیابانەکانیش دا فشاری هەوا کەمە، بۆیە لە ئەنجامی ئەو دوو جۆرە فشارەدا، بایەکان پەیدا دەبن و، با لە هەردوو جەمسەرەکانی زەوییەوە واتە: جەمسەری باکوور و باشوور، بەرەو هێڵی یەکسانیی (**خط الإستواء**) دێ.

**١٢-** گریمان زەوی لە جووڵە کەوتبایە و ئەو خولانەوەیەی بە دەوری خۆیدا دەیکات، لە بەرانبەر خۆردا، کە دەبێتە هۆی پەیدا بوونی شەوو ڕۆژ، ئەگەر زەوی ئەو جووڵەیەی نەبووایە، ئەو ڕووەی زەوی کە بەرەو خۆر دەبوو، پلەی گەرمیی تێیدا دەبوو بە (١٥٣) پلە، لە سەرووی سفرەوە، کە ئاو لە سەد (١٠٠) دەکوڵێ! بەڵام گەرمیی زەوی (+١٥٣) پلە لە سەرووی سفرەوە دەبووا بەڵام ئەو ڕووەی پشتی لە خۆرە، دەبوو بە (-٢٧٠) پلەی ژێر سفر! ئەمەش پێی دەگوترێ: سفری موتڵەق، لە حاڵێکدا کە ئێستا پلەی گەرمیی زەوی بە زۆریی لە نێوان (١٠ - ٤٠)، دایەو، هەر ئەوەش لەگەڵ مرۆڤدا دەگونجێ و، مروڤ تەحەممولی ئەوەندە دەکات.

**١٣-** هەروەها بەرگە هەوای دەوری زەوی، وەک جاری دیکەش باسمان کردوە، ئەویش زۆر بە ئەندازەگیریی دانراوە، بۆ وێنە: گازی ئۆکسجین (٢١٪)ی بەرگە هەوا پێکدێنێ، بەڵام نایترۆجین (٧٨٪) پێکدێنێ و، دووەم ئۆکسیدی کاربۆن: (٠٣٪) پێکدێنێ، ئنجا ئەگەر گازی ئۆکسجین ڕێژەکەی (٢١٪) زیاتر بووایە، کە ئۆکسجین یارمەتیی سووتان دەدات، بۆ وێنە: ئەگەر ڕێژەکەی (٣٠٪) بووایە، ئەگەر دەنکە

www.alibapir.com


شقارتەیەکت لێ دابایە، لە ئەنجامی تیشکی خۆردا، دنیا گڕی دەگرت و، ئەگەر کەمتریش بووایە، هەرچی ژیاندارە نەک هەر مرۆڤ، هەموو ژیانداران تووشی تەنگە نەفەسیی و خنکان دەبوون، چونکە هەموویان بە ئۆکسجین دەژین.

**١٤-** ئنجا با تەماشای هەڵمی ئاو بکەین: هەڵمی ئاو بە شێوەیەکە هەوا بتوانێ هەڵیبگرێ، ئەو هەڵمی ئاوە کە تیشکی خۆر لە ئاوی ئۆقیانووسەکان دەدات و گەرمی دەکات، هەڵمی لەسەر پەیدادەبێ، ئنجا هەوا ئەو هەڵمی ئاوە دەگوازێتەوە، لە ئەنجامی ئەو جووڵەیەی با دا، کە وەک گوتمان: لە بیابانەکاندا هەوا گەرم دەبێ و چڕییەکەی کەم دەبێتەوەو، لە بەستەڵەکەکانی سەروو و خوارووی دنیاش، چڕیی هەوا زۆرە، ئنجا لە ئەنجامی چڕیی لەوێ و، کەمیی چڕیی لە شوێنە گەرمە سێرەکاندا، هەوا دەجووڵێ و دەبێتە هۆی ئەوەی (با) لە سەر ڕووی ئۆقیانووسەکان پەیدا بێ و، هەڵمەکە لەگەڵ خۆی هەڵبگرێ و، ئەو بایەش هەڵمەکە لە گەڵ خۆی دەبات و، لە شوێنێک دا کە پلەی گەرمیی نزم دەبێتەوە، گەردەکانی هەڵم کە پێشێ پرژو بڵاوبوون، لە ئەنجامی ئەو پلە ساردەدا، لەوێ گەردەکان لە یەک نیزیک دەبنەوەو، دڵۆپە پێک دێنن، دڵۆپەی ئاو، یان دڵۆپەی بەفر، یاخود دڵۆپەی تەرزە، سەرەنجام ئێمە ئاوی شیرینمان لەوەوە دەست دەکەوێ، وەک خوا دەفەرموێ: ﴿وَأَنزَلْنَا مِنَ ٱلْمُعْصِرَٰتِ مَآءً ثَجَّاجًا ﴿١٤﴾﴾ النبأ، واتە: ئێمە لە هەورە گوشراوەکانەوە ئاوێکی بە خورزەممان دابەزاندوە، بۆیەش خوا ناو لە هەورەکان دەنێ (**مُعْصِرَات**)، کە لێرەدا (**مُعْصِرَات**)، لەسەر کێشی (**مُفْعِلَة**)یە، بەڵام بە مانای (**مفعولة**)یە، واتە: گوشراوەکان، چونکە: وەک چۆن قوماشێک یان ئیسفنجێک لەسەر ئاوێک دادەنێین و ئاو هەڵدەگرێ، دوایی کە ڕایدەپازنین و دەیگووشین، ئاوەکەی لێ دێتە خوار، هەورەکانیش هەر بەو شێوەیەن و، ئەوانیش ئاویان لە خۆیاندا هەڵگرتوە، بەڵام ئایا هەموو هەورێک ئاوی پێوەیە، باران و بەفرو تەرزە؟ نەخێر، بەڵکو تەنیا هەورە متوربووەکانن ئاویان پێوەیەو، نیشانەی متوربەبوونیش پەیدابوونی برووسکەو هەورە تریشقەکانن و، ئەوان لە ئەنجامی متوربە بوونی هەورەکاندا پەیدادەبن،

www.alibapir.com



به زۆریی وایه هه‌ر هه‌ورێک هه‌وره تریشقه‌و برووسکه‌ی له‌گه‌ڵ دابێ، مانای وایه متوربه بووه‌و، ئاوی پێوه‌یه.

ئنجا با بێینه نێو دنیای ڕووه‌که‌کانه‌وه: جۆره‌کانی ڕووه‌ک هه‌ر کامێکیان سیستمێکی تایبه‌تی هه‌یه، بۆ وێنه:

**١٥-** دانه‌وێڵه گه‌نم و جۆو نیسک و نۆک و ماش و برنج و زوڕات و ...هتد، ئه‌گه‌ر سه‌رنجیان بده‌ین، ده‌بینین: له یه‌ک کاتدا هه‌مووی پێ ده‌گات، یانی: په‌ڵه گه‌نمێک، په‌ڵه جۆیه‌ک، په‌ڵه مه‌ره‌زه‌یه‌ک، په‌ڵه هه‌رزنێک، په‌ڵه نیسکێک، په‌ڵه نۆکێک، هه‌مووی به‌یه‌که‌وه پێ ده‌گات، چونکه ئه‌گه‌ر ئێستا هه‌ندێک و، دوای ده ڕۆژی دیکه هه‌ندێک و، دوای مانگێکی دیکه، هه‌ندێک و، دوای دوو مانگی دیکه، هه‌ندێک پێ بگات! چۆن ئه‌وبه‌رهه‌مه‌هه‌ڵده‌گیرایه‌وه؟ به‌ڵام خوای کاربه‌جێ بسم الله الرحمن الرحيم وای داناوه هه‌مووی پێکه‌وه پێ بگات، به‌ڵێ هه‌ندێکی پێش هه‌ندێکی زه‌رد ده‌بێ و، دوایی ئه‌وی دیکه ...، به‌ڵام گرنگ ئه‌وه‌یه هه‌مووی له کاتێکی مه‌یله‌و نیزیکدا، پێکه‌وه پێ ده‌گات.

**١٦-** به‌ڵام میوه‌و سه‌وزه و ته‌ڕه‌کاره‌کان له ماوه‌ی دوور دوور و لێکدابڕاودا پێده‌گه‌ن، بۆ وێنه: بێستانی شووتیی و کاڵه‌ک، یان ترۆزیی و خه‌یار، یان سه‌وزه، یان میوه‌کانی: خورماو خۆخ و گێلاس و هه‌نجیرو هه‌نارو هه‌رمێ و ترێ و به‌هێ و...هتد، هه‌موو ئه‌وانه هه‌رکامیان وێکڕاو پێکه‌وه پێناگات، ئه‌گه‌ر هه‌مووی به‌یه‌که‌وه پێ گه‌یبایه، ئه‌و باخه‌وانه یاخود ئه‌و خاوه‌نی میوه‌یه، یاخود ئه‌و خاوه‌ن ته‌ڕه‌کاره، یان ئه‌و خاوه‌ن سه‌وزه‌یه، لێی خه‌سار ده‌بوو، به‌ڵام هه‌ندێکی ئێستا پێده‌گات و، هه‌ندێکی دوای ده ڕۆژی دیکه‌و، هه‌ندێکی دوای مانگێکی دیکه‌و، هه‌یه له ساڵێکدا چه‌ند جار به‌ر ده‌دات، بگره شووتیی و کاڵه‌ک و، ترۆزیی و خه‌یار بۆ ماوه‌ی دوو سێ مانگان هه‌ر چه‌ند ڕۆژ چینێک به‌رده‌ده‌ن، بۆیه گوتراوه: چینی بێستان، تاکو هه‌مووی به یه‌که‌وه پێ ناگات و خه‌ساربێ، به‌ڵکو ماوه ماوه پێده‌گات بۆ ئه‌وه‌ی خاوه‌نه‌که‌ی بتوانێ لێی به‌هره‌مه‌ند بێ.

**١٧-** ئنجا لەلایەکی دیکەوەش: میوەو تەڕەکارو سەوزەکان، ئەگەر سەرنج بدەین: هەر کەمێکیان لە کاتی خۆیداو لە کەشی خۆیدا پێدەگات، پرتەقاڵ و لیمۆ و نارنج و ئەوانە لە کەشی زستاندا، چونکە مرۆڤ لە کەشی زستاندا، زیاتر ئەگەری هەیە سەرمای ببێ، بۆیە پێویستیی بە ڤیتامین (C) زیاتر دەکات، کە لەو شتانەدا هەیە، تاکو تواناو هێزی لە بەرانبەر نەخۆشییەکانی سەرمادا زیاتر بێ، بەڵام تەڕەکاری وەک شووتیی و کاڵەک و ترۆزیی و خەیارو ئەوانە، زیاتر لە هاویندا پێدەگەن، چونکە لە هاویندا کە کەش و هەوا گەرمە، مرۆڤ ئەندازەیەکی زۆر لە ئاوی جەستەی دەڕوات و، پێویستیی بەو میوەو تەڕەکارانەیە قەرەبووی بکاتەوە.

با بێینە نێو جیهانی ئاژەڵان، بۆ وێنە:

**١٨-** مانگایەک چەند بەرانبەری ئەوە شیرت دەداتێ، کە دەیخوات، چونکە ئەگەر هاتباو ئەوەندە شیرەی لێی دەدۆشرێ، هەر بار تەقای ئەو خواردنەبووایە کە دیخواردو، ئەو مەسرەفەی لێی دەکرا، کەس مانگای ڕانەدەگرت، هەروەها ئەگەر مریشک، مانگانە، یان هەر بە دە (١٠) ڕۆژان هێلکەیەکی دابایەنێ، یان مراویی و قازو قەل، ئەوانە کەس بە خێوی نەدەکردن، بەڵام هەرکامیان هەموو ڕۆژێ هێلکەیەکت دەداتێ و، ساڵانە چەند جارێک - ئەگەر کورک بێ - ژمارەیەک جووچکەت دەداتێ، بۆ ئەوەی مەسرەفێک کە لێی دەکرێ، کەمتر بێ لە بەرهەمێک کە لێی وەدەست دێ.

**١٩-** پەڕەورە چڕنووکدارو دەندووک بە قولابەکان، وەک: بازو، شەهێن و، خەرتەل ... هتد، ئەوانە خواردنیان بریتیە لە باڵندە بچووکەکان، بۆیەش ژمارەیان کەمەو، ئەگەر هاتباو ئەو گۆشتخۆرانە ژمارەیان زۆر بووایە، باڵندە بچووکەکان و چۆلەکەو پاسارییی هەموو ئەو باڵندانەی دیکە کە بچووکن و ڕاویان دەکەن، بەدڵنیاییی هیچیان لێ نەدەهێشتن، بەڵام ئەوانە ژمارەیان و وەچەیان کەمە، بەس تەمەنیان زۆرە، ئنجا ئەگەر هێلکەیان زۆر بووایەو بێچوویان زۆر بووایە، باڵندە بچووکەکانیان کۆتاییی پێ دەهێنا، بەڵام خوا بسم الله الرحمن الرحيم ژمارەی کەم کردوون و، شوێنەکانیشیان کە تێیان

www.alibapir.com



دا دەبن، دیارییکراون و، هێلکەو ترووکانی هێلکەکانیشیان هەمووی دیارییکراوو بە ئەندازەیە.

**٢٠-** ئەگەر لە جیهانی مەگەزان (عالم الحشرات)یشدا وەك نموونەیەك: مێشە ڕەشە کە بە ملیۆنان گەرا دادەنێ و لە هەموو شوێنانیشدا دەژیی، بەڵام تەمەنی تەنیا دوو هەفتەیە، ئنجا ئەگەر هاتباو مێش چەند مانگێک ژیابایە، چ جای چەند ساڵێک، دنیا پڕ دەبوو لە مێش، بەڵام تەمەنی ئەوپەڕەکەی دوو هەفتەیەو دوایی دەمرێ.

**٢١-** ئنجا با بگوازینەوە بۆ وردتر لە مێش: بەکتریاو میکرۆبەکان کە لە هەموو دروستکراوەکانی خوا زیاترن و، لە هەموویان زیاتر زاووزێ و گەشە دەکەن، بەڵام لە هەموویان تەمەنیان کەمترە و سەرما دەیانکوژێ و، گەرما دەیانکوژێ و، ترشەڵۆکی گەدە دەیانکوژێ، ئەو ماددانەی بەکاردەهێنرێن لە دژە میکرۆب و بەکتریا، دەیانکوژن، بەڵکو جاری وا هەیە هەواش دەیانکوژێ، چونکە مادام ژمارەیان زۆرە، دەبێ دژیشیان زۆر بن، تاکو دۆخەکە هاوسەنگ بێتەوە.

**٢٢-** هەروەها با سەرنجی دوو جۆرە سەرەکییەکەی مار بدەین:ماری بچووک ژەهرەکەی زۆر کاریگەرەو، زۆر خێرایەو چەکەکەی کە بەرگریی پێ لە خۆی دەکات، بریتیە لە پێوەدان و ڕاکردن، بەڵام مارە گەورەکان ژەهرەکەیان بێ هێزە، بەڵام زۆر گەورەن و ماسوولکەکانیان بەهێزن، جاری وایە ماری گەورە لەگەڵ پشیلەو ڕێویی و ژیاندارانی دیکەدا بە شەڕ دێ، مارە گەورەکان هێزیان لە ماسوولکەکان و لە گەورەیی کەلەشیان دایە، بەڵام مارە بچووکەکان هێزیان لە ڕاکردن و لە ژەهری بە قوەت دایە.

**٢٣-**ئاژەڵەکێوییەکان، دەبینین خوا ﷽ زۆر جۆرە شێوازی بەرگریی لە خۆکردنی بۆ ڕەخساندوون:

**أ-** هەیانە بەهۆی ڕاکردنەوە، بەرگریی لە خۆی دەکات.

www.alibapir.com


ب- هەیانە وەک کیسەڵ بەهۆی قەپێلک و قەپاغەکەیەوە، بەرگریی لە خۆی دەکات.

ج- هەیانە بەوە کە ڕەنگی خۆی دەگۆڕێ، وەک: (**حرباء**)، عەرەب دەڵێن: (**یتلّون تلوّن الحرباء**)، (**حرباء**) جۆرە ژیاندارێکە لە هەر شوێنێک بێ، ڕەنگی خۆی وەک ئەوێ لێ دەکات، ئەگەر لە سەر بەردێک بێ، ڕەنگی خۆی وەک بەرد لێ دەکات، لە شوێنێکی سەوز بێ، ڕەنگی خۆی سەوز دەکات، لە شوێنێکی سوور بێت، ڕەنگی خۆی سوور دەکات.

٢٤- ماسییەکانیش خوای کاربەجێ شێوازی دیکەی بەرگریی لە خۆکردنی بۆ ڕەخساندوون:

أ- ماسی هەیە چەکەکەی بریتیە لە لێدانی کارەبایی بە هێزی (٤٠٠٠) ڤۆڵت، بۆیە هەر شتێک تووشی بێ، ئەو هێزە کارەباییەی لێ دەداو دەیکوژێ.

ب- بەڵام هەندێک لە ماسییەکان کە ئەو هێزە کارەباییەیان نیە، دەتوانن تەم ومژێکی وەک هەوری ڕەش پەیدابکەن بە دەوری خۆیانداو، سەرەنجام خۆیان پەنهان دەکەن، بێ ئەوەی ئەو ڕاوچییەی بەدوایدا دەگەڕێ، - بە زۆریی لە ژیاندارانی دەریا - بیدۆزێتەوە و، بە هۆی ئەو هەورە ڕەش و دووکەڵەوە، کە لە دەوری خۆی پەیدای دەکات، خۆی پەنهان دەکات و ڕا دەکات.

ئێستاش دەگوازینەوە بۆ جەستەی مرۆڤ:

٢٥- هێلکۆڵە کە لە ئاوی ئافرەتدا هەیەو، حەیمەنیش لە تۆوی پیاودا هەیەو، لە هەردووکیان (**نطفة**) پێک دێ و دەپیتێ (**تلقیح**) دەبێ و دەچێتە نێو منداڵدانەوەو خۆی بە منداڵدان هەڵدەواسێ و لە کاتەش دا نوتفە حاڵەتی گۆشت خواردنی هەیە! چونکە خۆی لە دیواری منداڵدانەکە گیر دەکات، خۆی تێدەچەقێنێ و دەیدڕێ و، سەرەنجام ئەو شوێنە بۆی دەبێتە گۆمیلکەیەکی خوێن و، خواردن و خۆراکی لەسەر ئەو خوێنەیە، بۆیەش ئافرەت کە دووگیان دەبێ و منداڵی وەسک دەکەوێ، خوێنی حەیزی نامێنێ، چونکە خوێنەکە لەوێدا حەپس دەبێ و، ئەو نوتفەیە لە سەری

www.alibapir.com


گەشە دەکات، بەڵام دوایی کە ئەو کۆرپەلەیە گەورە دەبێ و ناگونجێ چیدیکە خۆین بخوات، ئنجا پەتی نێوک (الحَبْلُ السُّرِّي)، بۆ پەیدا دەبێ بە هۆی ئەو پەتی نێوکەوە خواردنی بۆ دێ و، ئەویش زۆر لەگەڵ جەستەیدا گونجاوە، دوای ئەوەش کە لە دایک دەبێ، ئنجا ئەوە دوو مەمکەکەی دایکی بەشیرەوە چاوەڕێی دەکەن، ئەویش لە سەرەتاوە لە چەند ڕۆژی سەرەتادا، ماددەیەکی شلی سپی زەردباوە کە (ژك)ی پێدەگوترێ، نەک شیر، ئەو ماددەیەش بەرهەڵستییەکی زۆر بەهێز لە جەستەی ئەو کۆرپەلەیەدا دروست دەکات، لە بەرانبەر میکرۆب و ڤایرۆس داو، بە شێوەیەکیشە ئەو چەورییەی لە نێو ڕیخۆڵەکانی ئەو منداڵەو لە نێو کۆئەندامی هەرسیدا هەیە، بیتوێنێتەوە، تاکو ڕێگا خۆش بکات بۆ ئەوەی لەمەودوا شیر بخوات و خواردن هەرس بکات، دوایی شیری ئەو دایکە لە ڕۆژانی دواییدا وردە وردە شێوەکەی دەگۆڕێ و، بەشێوەیەک دەبێ، کە پێ بە پێ لەگەڵ قۆناغی تەمەنی ئەو منداڵەدا، بگونجێ، کەواتە: کە خوا دەفەرموێ: ﴿إِنَّا كُلَّ شَيْءٍ خَلَقْنَٰهُ بِقَدَرٍ ﴾، مەبەست هەموو ئەو ئەندازەگیرییەیە کە لە هەموو شتێک دا هەیە.

**٢٦-** لووی نەخامیی (الغدة النخامية) کە پێی دەگوترێ: پادشای غوددەکان و، بەسەر هەموو کەرە ڕژێنەکاندا زاڵە، کە لە جەستەدا هەن، غوددەی نەخامیی دوازدە (١٢) هۆڕمۆن دەر دەکات و، چەقی کۆنترۆڵکردنی هەموو شلەمەنییەکانی نێو جەستەیە، هەروەها چەقی کۆنترۆڵکردنی گەرمیی نێو جەستەیە، ئەگەر بێت و هاوسەنگیی ئەو شلەمەنییانەی نێو جەستەی مرۆڤ تێکبچێ، ئەو کاتە مرۆڤ هەر نابێ، یان ژیانی بە جۆرێکی دیکە دەبێ، چونکە جاری وا هەیە لە ئەنجامی چاک کارنەکردنی غوددەی نەخامییدا، پلەی گەرمیی جەستە بۆ چل (٤٠) پلە بەرز دەبێتەوە، کە مرۆڤ تەحەممولی ناکات و دەمرێ.

**٢٧-** چەسپاوی ڕێژەی کلۆری صۆدیۆم: لە نێو جەستەی مرۆڤدا، ئەگەر ڕێژەی کلۆری سۆدیۆم لە خوێندا، لە سەرووی (١٠٠٠/٨) بێ، مرۆڤ دەمرێ و، ئەگەر کەمتر لە (١٠٠٠/٧) یش بێ هەر دەمرێ، کەواتە: دەبێ (٧,٥) بێ، یانی: بگاتە (٨) هەر دەمرێ، بێتەوە خوار بۆ (٧) هەر دەمرێ!

www.alibapir.com


**٢٨-** ڕێژەی خوێ لە خوێن: ئەندازەی خوێ لە خوێندا، دەبێ لە نێوان: (٧ - ٨/١٠٠٠) بێ، ئەگەر لەوە كەمتر بێ یان زیاتر بێ دیسان مرۆڤ هەر دەمرێ، هەروەها كۆئەندامی گورچیلەكان زۆر بە شێوەیەكی سەرسوڕهێنەر ڕێژەی وردیان بۆ دانراوەو، ئەم مەسەلەی خوێ و كلۆرەش هەموو پەیوەندیی هەیە بە گورچیلەكانەوە.

**٢٩-** مرۆڤ لە نێو خوێنیدا، خوای پەروەردگار هەندێك ماددەی داناون، دەبنە هۆی ئەوە كە دەمارەكانی لە هەندێك كاتی پێویستدا بگرن و وەك پەرچێك بێنە ڕێی خوێنەكە، بۆ وێنە: مرۆڤ كاتێ هەڵدەستێ، كە ڕاكشاوە، بەڵام دەیەوێ هەڵبستێ، پێشتر ئەو ماددانەی لە خوێنەكەدا هەن، گرتوویانە، لەوكاتەدا بەری دەدەن بۆ ئەوەی یەكسەر خوێن بچێ بۆ مێشك و حەڕەكەت بكات، كە ئەگەر هەر لە خوارێ بمێنێتەوەو نەچێ بۆ سەرێ، مرۆڤ گێژ دەبێ و هەر ناتوانێ هەڵبستێ.

**٣٠-** مرۆڤ كاتێك دیمەنێكی ترسناك دەبینێ، ئەو وێنەیە یەكسەر لە چاوەوە دەگوازرێتەوە بۆ مێشك و، مێشك فەرمان دەكات بە غوددەی نەخامیی، كە پادشای غوددەكانە، كە هەڵسوكەوت بكات و، غوددەی نەخامییش فەرمان دەكات بە غوددەی كەزەریی (**كظري**)، كە لەسەرووی گورچیلەكانەوەیە و ئەویش فەرمان دەكات بە دڵ، كە خێراتر لێ بدات، دیسان ڕژێنی (**كظري**)، فەرمان دەكات بە بۆڕییەكانی خوێن، كە تەسك ببنەوەو، فەرمان دەكات بە جگەر كە شەكری زیاتر فڕێ بدات و، فەرمان دەكات بە هۆڕمۆنی خەست بوونەوەی خوێن، كە ئەو ماددەیە دەربكات و، فەرمان دەكات بە سییەكان كە خێراتر ئۆكسجین هەڵبمژن، ئەوەش هەمووی لە چەند چركەیەكدا!

**٣١-** با تەماشایەكی جگەر بكەین:

لە جگەردا هۆڕمۆنی خەستكردنەوەی خوێن هەیەو، هۆڕمۆنی ڕوونكردنەوەی خوێنیش هەیە، ئنجا ئەو دوو هۆڕمۆنە كە یەكێكیان دەبێتە هۆی خەستكردنەوەی خوێن و، یەكیشیان دەبێتە هۆی ڕوونكردن و شلكردنەوەی، ئائەوە، زۆر بە

هاوسەنگیی بەڕێوە دەچێ و، ئەگەر بێت و هۆڕمۆنی خەستکردنەوەی خوێن زیاتر بێ، لەو ڕێژەیەی پێویستە، مانای وایە خوێن لە جەستەی مرۆڤدا وەک قوڕێکی لێ دێ و ناتوانێ حەڕەکەت بکات و خەست دەبێتەوەو مرۆڤە کە دەمرێ، زۆرکەس لە ئەنجامی خەستبوونەوەی خوێنیدا دەمرێ، کە خوێن خەست بۆوە باش جووڵە ناکات، بە تایبەتی بۆ مێشک.

هەروەها ئەگەر هۆڕمۆنی شلکردنەوەی خوێن زیاتر بێ، مرۆڤ هەر شوێنێکی بەسادەیی بریندار بێ، خوێنەکەی هەر لێ دەڕژێ و دێ و بە هیچ شتێک ناگیرێتەوە، بەڵام خوا ﷻ بە ئەندازە دایناوەو، ئەو خەستکردنەوەو ڕوونکردنەوەی خوێن، لە ئەندازەی خۆی تێناپەڕێ.

**٣٢-** با تەماشایەکی چاو بکەین:

خوای کاربەجێ دیتنی چاوی زۆر بە ئەندازەگیرییەکی سەرسوڕهێنەر، داناوە، بۆ وێنە: تۆ سەیارەیەک دەبینی بەڕێدا دەڕوا، دەتوانی زۆر بە وردیی ببینی، کاتێک دەڕوا، کاتێک دەوەستێ، دوور دەکەوێتەوە، نیزیک دەکەوێتەوە، بەڵام هیچ کامیڕایەک بەو شێوەیە نیە، کاتێک شتێک نزیک دەکەوێتەوە، ئەویش یەکسەر عەدەسەکەی بە جۆرێک لێ بکات لەگەڵ نزیک کەوتنەوەی ئەو دیمەنەدا، بگونجێ و، کاتێک دوور دەکەوێتەوەو، کاتێک دەجووڵێ و، کاتێک دەوەستێ! بەڵام ئەوانە هەموویان خوا ﷻ لە نێو چاودا داینـاون، کە لە جیسمێکی بلوورییدایە، هەمووی سێ مایکرۆنە {سانتیمێک، سەد (١٠٠) مایکرۆنە} زۆر زۆر بچووک، ئەو هەموو دیتن و وێنەگرتن و دیمەن گەورەکردن و بچووککردنەوەی شەبەکییەو حەواڵەکردنی وێنەکان بۆ مێشک، بۆ ئەوەی مێشک لێی تێبگات ئەو وێنانە چین؟ ئەوە هەمووی لەوێدا ئەنجام دەدرێ و، هەمووشی لە زۆر لە کەمتر لە چرکەیەکدا!!

www.alibapir.com


**٣٣-** مەسەلەی داخراویی چاوو کراوەیی گوێ:

گوێ هەمیشە کراوەیە، بەڵام چاو خوا ﷻ دەروازەی بۆ داناوە، جگە لە برۆیەکان و برژانگەکان، پێڵووەکانی چاویشی داناون، چونکە دەنگەکان دێن و دەبڕێنەوە، بەڵام دیمەنەکان دەبینرێن و دەمێننەوە، ئنجا ئەوەی کە دێت و دەبڕێتەوە، ئەگەر گوێش وەک چاو داخرابایەو، دوایی کرابایەوە، دەنگێک هاتبایە دوایی لە مێشکەوە فەرمان هاتبایە بۆ گوێ، ئەی گوێ! دەروازەکەت بکەوە تاکو گوێت لێبێ، بەڵام تازە دەنگەکە تێپەڕیوە، بەڵام دیمەنەکان کە دەبینرێن، وانین و هەمیشە دەمێنن و بەردەوامن، بۆیە دەگونجێ چاو دابخەی و دوایی بیکەیەوەو دیمەنەکە ببینی، بەڵێ خوا ﷻ هیچ دەروازەی بۆ گوێ دانەناوە، بەڵکو هەر دەنگێک بێ لە کاتی خەوتنیشدا، دەیبیستێ، مرۆڤ چۆن خەبەری دەبێتەوە؟ بە زۆریی لە ڕێی بیستنەوە خەبەری دەبێتەوە، چونکە چاوی هیچ نابینێ، بەڵام گوێی کراوەیەو، گوێی لە دەنگێک دەبێ و خەبەری دەبێتەوە.

**٣٤-** با تەماشای دڵ بکەین:

دڵیش زۆر ئەندازەگیرییەکی وردی بۆ کراوە، بۆ وێنە: تۆ لە کاتێکدا بالیفێک، سەرینێک، هەڵدەگری، لێدانی دڵ هێندەی قورسایی، ئەو سەرین و باڵنجە کە مێشک پێشتر ئەندازەگیریی دەکات، دەبێ و ئەوەندە، هێز بەکاردێنێ، بۆیە جاری وایە مرۆڤ دەست دەداتە شتێکی قورس، بەڵام دەبینێ سووکە، ئەوە مێشک پێشتر بەهەڵە ئەندازەگیریی کردوە بۆ وێنە: دەڵێ: ڕەنگە دە (١٠) کیلۆ ببێ، بەڵام تەماشا دەکات کیلۆیەکەو، مرۆڤ زۆر سووک بەدەستیەوە دێ، بەپێچەوانەوەش: جاری وایە دەست دەدەیە شتێک وا دەزانی سووکە، بەڵام قورسە و دادەنوێیەوە، چونکە مێشک فەرمانی نەکردوە بە دڵ، ئەوەندە هێزە بداتە جەستەو، مێشک فەرمانی نەکردوە بە ماسوولکەکان و بە ئەندامەکانی جەستە،

کـە لـە قـەدەر ئەوەنـدە قورسـاییە تیـن بدەنـە خۆیـان، ئنجـا ئێمـە لـە دنیـای میکانیکـدا، هیـچ جووڵێنەرێکـمان نیـە، بەپێـی ئـەو بـارە قورسـەی هەڵیدەگـرێ، خۆی بگۆڕێ، بەڵام خوا بسم الله الرحمن الرحيم ئەوەی لە جەستەی مرۆڤدا داناوەو، دڵ، هەروەها مێشـک کـە فەرمانەکـە دەنێـرێ و، دڵ بـە ئەنـدازەی ئـەوە خوێـن دابـەش دەکات، بەسـەر جەسـتەدا، بـە ئەنـدازەی ئـەو کارەی پێـی هەڵدەسـتێ، بـۆ وێنـە: ئەگـەر بزانـێ پەنجـا (٥٠) کیلـۆ دەسـت دەدەیـە، دڵ، لـە قـەدەر ئەوەنـدە هێـز دەداتـە جەسـتەو، خێرایـی خـۆی لـە لێـدان زیـاد دەکات، بـۆ ئـەوەی خوێنـی زیاتـر دابـەش بـکات بەسـەر جەسـتەداو، ماسـوولکەکان زیاتـر پێویسـتییان بـەوزە دەبـێ.

**٣٥-** با تەماشای کەللە سەری مرۆڤ بکەین:

ئێمـە هیـچ بەردێکـمان چنـگ ناکـەوێ بـە قـەدەر دوو چەنـگ بێ، بـە قـەدەر کاڵەکێ شـووتییەکی بچـووک بـێ، بـەڵام چـوار کانیـی و سـەرچاوەی تێدابـن، ئـاوی هـەر کام لـەو کانیـی و سـەرچاوانە جیـا بـێ، لەوی دیکـە، بەڵام ئـەوە کەللەسـەری مرۆڤەو بەو شێوەیە:

**١-** کەللەسەری مرۆڤ، ئاوی شیرین لە زاری مرۆڤدا دروست دەکات، کە تۆ خواردن دەخۆی، بەهۆی ئەو لیکەوە، پارووە خواردنەکە سەروبەر دەبێ و، بەکەڵکی ئەوە دێ، قووت بدرێ.

**٢-** پاشان ئاوی چاو سوێرە، ئەو ئاوە سوێرەش بۆ چاو باشە، چونکە چاو زیاتر لە ماددەیەکی چەوریی دروستبووە، پێویستیی بەوەیە هەمیشە لە نێو ئاوی سوێر دابێ، وەک چۆن تۆ شتێک هەبێ لە نێو خوێاوکی دەکەی، بۆ ئەوەی بەکتریاو میکرۆب لێی نەداو بۆگەن نەبێ، خواش بسم الله الرحمن الرحيم ئاوی چاوی سوێر کردوە، تاکو بەردەوام ئەو چاوە بشواتەوە، نەک تەنیا لەو کاتانەدا کە مرۆڤ دەگری، بەبێ گریانیش هەمیشە ئاوی سوێر لە چاودا هەیەو، چاو بەردەوام دەشۆردرێ.

**٣-** بەڵام ئاوی نێو لووت جۆرێکی دیکەیەو تامەکەی مزرە، چونکە مرۆڤ لە ڕێی لووتەوە هەناسە هەڵدەکێشێ و، زۆر تۆزو خۆڵ و میکرۆب لە ڕێی لووتەوە دەچن،

www.alibapir.com


ئنجا خوا ﷻ دوو شتی لە نێو لووتدا داناون: هەم مووەکانی داناون، کە زۆر لەو تۆزو خۆڵە دەگرنەوە، پاشان ئەو ئاوە لینجەشی داناوە کە مزرە، بۆ ئەوەی هەرچی مووەکان نەیانتوانی بیگرنەوە، ئەو ئاوە لینجە بیگرێتەوەو، چڵم لە ئەنجامی ئەوەدا پەیدادەبێ، بۆیە ڕەنگی چڵمیش بەپێی ئەو ژینگەیەی مرۆڤ تێیدا دەژی، دەبێ، ئەگەر هەوایەکەی ڕەش بێ، ڕەنگی چڵمەکەش ڕەش دەبێ و، ئەگەر جۆرێکی دیکە بێ، جۆرێکی دیکە، بەڵام بەزۆریی زەردە، چونکە ئاوەکە بۆ خۆی لە ئەنجامی کارلێک لەگەڵ ئەو تۆزو خۆڵ و شتانەدا، زەرد دەبێ.

٤- ئاوێکی دیکەش هەیە لە کەللەی سەردا، ئاوی گوێ کە زۆر تاڵە، ئاوی گوێ بۆچی تاڵە؟ چونکە زۆر کەس قەڵس دەبێ بە چڵکی گوێ و، نازانێ بۆیە خوای میهرەبان و کارزان لەوێیدا داناوە، لەبەر ئەوەی ئەو شتانەی لە ڕێی گوێوە دەچن، زیندەوەرێک، میکرۆبێک، بەکتریایەک ئەو ئاوە تاڵە، دەیکوژێ، چونکە گوێ هیچ دەروازەی نیەو لە حاڵێک دا تۆ ئاگاشت لێ نیەو خەوتووی، بەڵام ئەو ئاوە تاڵە دەیکوژێ و ناهێڵێ بگاتە نێو لای پەردەی گوێ و شوێنە هەستیارەکانی گوێ، بۆیە ئەو ئاوە تاڵە هەمیشە هەیەو، ئەگەر ئینسان بیری لێ بکاتەوە: گریمان ئاوی تاڵی گوێ لە نێو زاردا بووایە، یان ئاوی سوێری چاو لە نێو لووت دابووایە، یان ئاوی مزری لووت لە نێو چاودا بووایە، بەدڵنیایی ئەوە دەبووە نەخۆشییەکی چارەسەر نەکراو، بەڵام خوا ﷻ لەو کەللەسەرەی مرۆڤدا، ئەو چوار جۆرە کانیی و سەرچاوەیەی داناون، هەر کامێکیان جۆرە ئاوێکە، کە لەگەڵ ئەو ئەرکەی ئەو ئەندامە دەیبینێ، گونجاو و پڕبەپێستن.

**سُبحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ، أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إلاَّ أَنْتَ، أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ.**

www.alibapir.com


دەستپێک

بەڕێـــزان!

ئەمڕۆ کە (٩)ی شەعبانی ساڵی (١٤٤١) کۆچییە، بەرانبەر (٢٠٢٠/٤/٢) زایینی، لە شاری دێرینی هەولێر، دوای خواستنی کۆمەک و یارمەتیی لە خوای بەرزو مەزن و کارزان و میهرەبان، دەست دەکەین بە تەفسیرکردنی سووڕەتی (**الرَّحْمَنِ**).

پێناسەی سووڕەتی (الرحمن)و بابەتەکانی

## یەکەم: ناوی ئەم سووڕەتە:

ئەم سووڕەتە هەر بەم ناوە ناسراوە: (**سُورَةُ الرَّحْمَنِ**)، جاری واش هەیە هەر بە: (**الرَّحْمَنِ**) ناوی هاتوە، بەڵام بە زۆریی بە (**سُورَةُ الرَّحْمَنِ**) ناوی هاتوە، لەو بارەوە ئەم دەقە هەیە:

{**عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ الله** رضي الله عنهما، **قَالَ: خَرَجَ رَسُولُ اللَّهِ** ﷺ **عَلَى أَصْحَابِهِ، فَقَرَأَ عَلَيْهِمْ سُورَةَ الرَّحْمَنِ مِنْ أَوَّلِهَا إِلَى آخِرِهَا، فَسَكَتُوا، فَقَالَ: لَقَدْ قَرَأْتُهَا عَلَى الجِنِّ لَيْلَةَ الجِنِّ، فَكَانُوا أَحْسَنَ مَرْدُودًا مِنْكُمْ، كُنْتُ كُلَّمَا أَتَيْتُ عَلَى قَوْلِهِ:** ﴿فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ ١٣﴾ **الرحمن، قَالُوا: لاَ بِشَيْءٍ مِنْ نِعَمِكَ رَبَّنَا نُكَذِّبُ، فَلَكَ الحَمْدُ»**} (**أخرجه الترمذي: ٣٧٢٩١، والحاكم: ج٢، ص٤٧٤، وابن عدي: ج٣، ص٢١٩، والواحدي في الوسيط: ج٤، ص٢١٩، والبيهقي في الدلائل: ج٢، ص٢٣٢ عن جابر، وَصَحَّحَهُ الألباني في صحيح سنن الترمذي: ج٣، ص١١٢**).

واتە: جابیری کوڕی عەبدوڵڵا رضي الله عنهما، دەڵێ: ڕۆژێک پێغەمبەری خوا ﷺ هاتەدەر بۆ لای هاوەڵانی، سووڕەتی (**الرَّحْمَنِ**)ی لە سەرەتاوە تاکو کۆتایی

www.alibapir.com


بەسەردا خوێندنەوە، ئەوانیش بێ دەنگ بوون، (بێ دەنگ بوون و گوێیان گرتبوو، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: بۆچی دەتانبینم بێ دەنگن؟) ئەم سوورەتەم بەسەر جندا خوێندەوە لە شەوی جندا {کە پێشتر باسمانکردوە لە تەفسیری سوورەتی (**الأحقاف**)دا} لە ئێوە باشتر هەڵوێستیان بوو، وەڵامیان هەبوو، هەر جارێک فەرموودەی خوا: ﴿ فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ ﴿١٣﴾ ﴾**الرحمن**م، دەخوێند، {ئەی جند و مرۆڤ! بە کام لە چاکەکانی پەروەردگارتان بێبڕوان، نکوولیی لە کامیان دەکەن؟} دەیانگوت: نکوولیی لە هیچکام لە چاکەکانت ناکەین ئەی پەروەردگارمان! ستایش بۆ تۆ.

## دووەم: شوێنی دابەزینی:

هەرچەندە ڕاجیاییەک لە بارەی شوێنی دابەزینیەوە هەیە، بەڵام بێگومان ئەو ڕایە بەهێزترە کە دەڵێ: مەککەییە، هەم بەپێی سرووشت و نێوەڕۆکی، کە هەمان نێوەڕۆکی قورئانی مەککەییەو، هەم بە پێی ئەوەش کە لە چەند دەقێکدا هاتوە: پێغەمبەری خوا ﷺ لە شەوی جند (**ليلة الجن**)دا، بەسەر جندانی دا خوێندۆتەوە، یان لە نوێژی بەیانیدا لە (**نَخْلَة**)، خوێندوویەتی، (**القرطبي**) گوتوویەتی: (**وَصَحَّ أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَامَ يُصَلِّي الصُّبْحَ بِنَخْلَةَ، فَقَرَأَ سُورَةَ (الرَّحْمَنِ) وَمَرَّ النَّفَرُ مِنَ الْجِنِّ فَآمَنُوا بِهِ**)[1]، واتە: بە سەنەدێکی[2] ڕاست هاتوە کە پێغەمبەر ﷺ نوێژی بەیانی کردوە لە (**نَخْلَة**) {شوێنێکە لە نزیک مەککە} سوورەتی (**الرَّحْمَنِ**)ی خوێندوە، ئەو کۆمەڵەش لە جند بەلایدا تێپەڕیون و بڕوایان پێی هێناوە.

---

(١) الجامع لأحكام القرآن: ج: ١٧، ص: ١١٧.

(٢) (القرطبي) سەنەدەکەی نەهێناوە و خوا یاربێ لە کاتی تەفسیرکردنی سوورەتی (الجن)دا دەیهێنین.

www.alibapir.com


هەروەها لەو بارەوە ئەم دەقەش هەیە، کە دیسان (القرطبي)[1] لە تەفسیرەکەیدا هێناویەتی، هەرچەندە دیسان دیاریی نەکردوە لە چ سەرچاوەیەک وەریگرتوە، بەڵام (القرطبي) بۆ خۆی زانایەکی موعتەبەرەو، تەفسیرەکەشی تاڕادەیەکی زۆر، متمانە پێکراوە،

شایانی باسیشە: ئەو دەقە (السيرة النبوية لابن هشام)یش، هێناویەتی:

{رَوَى عُرْوَةُ بْنُ الزُّبَيْرِ رضي الله عنهما، قَالَ: أَوَّلُ مَنْ جَهَرَ بِالْقُرْآنِ بِمَكَّةَ بَعْدَ النَّبِيِّ ﷺ ابْنُ مَسْعُودٍ، وَذَلِكَ أَنَّ الصَّحَابَةَ قَالُوا: مَا سَمِعَتْ قُرَيْشٌ هَذَا الْقُرْآنَ يُجْهَرُ بِهِ قَطُّ، فَمَنْ رَجُلٌ يُسْمِعُهُمُوهُ؟ فَقَالَ ابْنُ مَسْعُودٍ: أَنَا، فَقَالُوا: إِنَّا نَخْشَى عَلَيْكَ، وَإِنَّمَا نُرِيدُ رَجُلًا لَهُ عَشِيرَةٌ يَمْنَعُونَهُ، فَأَبَى، ثُمَّ قَامَ عِنْدَ الْمَقَامِ، فَقَالَ: ﴿بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ﴾ ﴿الرَّحْمَٰنُ ﴿١﴾ عَلَّمَ الْقُرْآنَ ﴿٢﴾﴾ الرحمن، ثُمَّ تَمَادَى رَافِعًا بِهَا صَوْتَهُ وَقُرَيْشٌ فِي أَنْدِيَتِهَا، فَتَأَمَّلُوا وَقَالُوا: مَا يَقُولُ ابْنُ أُمِّ عَبْدٍ؟ قَالُوا: هُوَ يَقُولُ الَّذِي يَزْعُمُ مُحَمَّدٌ أَنَّهُ أُنْزِلَ عَلَيْهِ، ثُمَّ ضَرَبُوهُ حَتَّى أَثَّرُوا فِي وَجْهِهِ}[2].

واتە: عورِوەی کوڕی زوبەیر رضي الله عنهما، (بێگومان لە بابی بیستوە، ئەگەرنا عورِوە ئەو کاتە تەمەنی هێندە نەبووە)، دەڵێ: یەکەمین کەس کە لە مەککە لە دوای پێغەمبەر ﷺ قورئانی بە ئاشکرا خوێند، عەبدوڵلای کوڕی مەسعوود رضي الله عنه بووە، ئەویش ئەوەبوو هاوەڵان گوتیان: هۆزی قورەیش هەرگیز گوێیان لەو قورئانە نەبووە بە دەنگی بەرز بخوێندرێ، چ پیاوێک هەیە، بچێ پێیان ببیستێنێ؟ عەبدوڵلای کوڕی مەسعوود گوتی: من! گوتیان: ئێمە مەترسییمان لێت هەیە، ئێمە پیاوێکمان دەوێ خزم و عەشیرەتێکی هەبن، بەرگریی لێ بکەن، ئەویش ڕازی نەبوو، دوایی هەڵسا چووە لای مەقام، {مەقامی ئیبراهیم} وەستاو، گوتی: ﴿بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ﴾ ﴿الرَّحْمَٰنُ ﴿١﴾ عَلَّمَ الْقُرْآنَ ﴿٢﴾﴾ الرحمن، بە ناوی خوای

---

(١) الجامع لأحكام القرآن: ج: ١٧، ص: ١١٧.

(٢) السيرة النبوية لابن هشام، ج١ ص ١٥٨ ، ١٥٩، ط ٢٠٠٦م دار ابن الهيثم.

www.alibapir.com


بـە بەزەیـی بەخشـندە، خـوای بـە بەزەیـی، قورئـانی فێـر کـردوە، دوایـی لەسـەری بـەردەوام بـوو دەنگـی پـێ بـەرز کـردەوەو، قورەیشـیش کـە لـە کـۆڕو مەجلیسـەکانی خۆیاندابـوون، ڕامـان و گوتیـان: ئـەوە (إبـن أُمِّ عَبْـد)، دەڵـێ: چـی؟ {بـە عەبدوڵڵای کـوڕی مەسـعوودیان دەگـوت: (إبـن أُمِّ عَبْـد) واتـە: کـوڕی دایکـی کۆیلـە، وەک بـە کـەم تەماشـا کـردن} گوتیـان: ئـەوە ئـەو شـتە دەڵـێ: کـە موحەممـەد ﷺ پێـی وایـە بـۆی لـە سـەری دابەزێنـدراوە، ئیـدی بـۆی هەڵسـان لێیانـدا هەتـا شـوێنەواری لـە دەم و چاویـدا پەیداکـرد، {دەم و چاویـان بـە خوێنـدا هێنـاوە}.

ئنجـا ئەمـەش بەڵگەیـە لەسـەر ئـەوە کـە ئـەم سـوورەتە لـە مەککـە دابەزیـوەو، بـە نسـبەت کاتی دابەزینیـشی، بـە پێـی ئـەوە کـە ڕیزبەندیـی لـە دابەزینـدا چـل و سـێ (٤٣)ی بـۆ دانـراوە، واپێدەچـێ لـە دەوری سـاڵانی شـەش تاکـو نـۆ (٦ - ٩) لـەو ماوەیـەدا دابەزیبـێ، چونکـە ڕیزبەندییەکـەی بەمەزەنـدە لـە بەرانبـەر ئـەو سـاڵانە دایـە.

## سێیەم: ژمارەی ئایەتەکانی:

زانایـان سـێ جـۆرە ژمارەیـان بـۆ ئایەتـەکانی ئـەم سـوورەتە موبارەکـە دانـاون: (٧٦، ٧٧، ٧٨)، بـەڵام زیاتـر ژمـارەی (٧٨) تەبەننیـی کـراوە لـەو موصحەفانەی لـەو دەڤەرەی ئێمـەدا، بـاون، بۆیـەش ئـەوە دەڵێـم، چونکـە لـە هەندێـک لـە تەفسـیرەکاندا، بـە تایبـەت ئـەو تەفسـیرانەی هـی وڵاتـانی ئەفریقییـان، وەک: لیبیـاو سـوودان و مەغریب و جەزائیـرو تونـس، هەیانـە ژمـارە (٧٦)ی تەبەننیـی کـردوەو، هەیـە ژمـارە (٧٧)، پێشـتریش زۆرجـار گوتوومانـە کـە کەمیـی و زۆریـی ژمـارەی ئایەتـەکان دەگەڕێتـەوە بـۆ کورتیـی و درێژیـی ڕسـتەکان و، شـوێنی وەسـتانی قورئـان خوێنـەکان، لـە کـوێ وەسـتاون، واتـە: بـۆ وێنـە هەندێکیـان گوتوویانـە: ﴿ٱلرَّحْمَٰنُ ۝١ عَلَّمَ ٱلْقُرْءَانَ ۝٢﴾ **الرحمـن**، هەمـووی یـەک ئایەتـە، بـەڵام زۆربەیـان گوتوویانـە: ﴿ٱلرَّحْمَٰنُ﴾ ئایەتێکـەو ﴿عَلَّمَ ٱلْقُرْءَانَ﴾ ئایەتێکـی دیکەیـە.

www.alibapir.com


## چوارەم: ڕیزبەندیی لە موصحەف و دابەزیندا:

لـە موصحەفـدا ژمـارە پەنجـاو پێنـج (٥٥)ەو، لـە ڕیزبەندیـی دابەزینـدا، وەک پێشـتریش ئاماژەمـان پێـدا ژمـارە چـل و سـێ (٤٣)ی بـۆ دانـراوە، پێـش سـوورەتی **(فاطـر)**و دوای سـوورەتی **(الفرقـان)** دابەزیـوە، بـەڵام جۆرێـک لـە ڕاجیایـی لـەوەدا هەیـەو **(الجعـبري)** کـە یەکێکـە لـە زانایـان، ژمـارە (٩٨)ی بـۆ دانـاوە، ئنجـا ئەگـەر ژمـارە (٩٨) بێـت، دەبـێ مەدینەیـی بـێ، چونکـە بـە هەمـوو حیسـابان سـوورەتە مەککەییـەکان لـە (٨٦) تاکـو (٩٠) تێناپـەڕن و، ئـەوانی دیکـە ئـەو (٢٤)ە، یاخـود ئـەو (٢٨)ە، لـە مەدینـە دابەزیـون، بـەڵام پێـم وایـە **(الجعـبري)** نەیپێـکاوە، چونکـە بەپێـی ئـەوەی باسـمانکردو بەپێـی ئـەو دەقانـەی هێنامانـن، سـوورەتی **(الرحمـن)** لـە مەککـەدا خوێنـدراوەو، عەبدوڵـلای کوڕی مەسـعوودیش ﵁ کـە پیاوێکی زۆر بلیمـەت بـووە لـە شـارەزایی لـە قوڕئانـدا، لەسـەر خوێندنی ئـەو سـوورەتە، لێـدراوەو ئـازار دراوەو، دەم و چـاوی بـە خوێنـدا هێـنراوە.

## پێنجەم: نێوەڕۆکی:

ئـەم سـوورەتەش وەک سـەرجەم سـوورەتە مەککەییـەکان: بـاسی بوونناسـیی تێدایـە: ئـەم گەردوونـە چییـە؟ مـرۆڤ چییـە؟ جنـد چییـە؟ بۆچـی دروسـتکراون؟ ئـەم گەردوونـە سـەرەنجامەکەی چۆنـە؟ ژیـانی مـرۆڤ حیکمەتەکـەی چییـەو سـەرەنجامەکەی چۆنـە؟

هەروەهـا بـاسی ئیـمان و عەقیـدەی تێداکـراوە بـە گشـتیی و، جگـە لـە ئاماژەیـەک بـە فێرکـردنی قوڕئـان لـە ئایـەتی ژمـارە دوو دا، وەک سـەر ڕشـتەی چاکـەکانی خـوا، تێکـڕای ئایەتـەکانی دیکە باسی سیفەتە بـەرزو ناوازەکانی خـوان ﷽ لە میانی خسـتنەڕووی چاکـەو نیعمەتەکانیـدا، چ لـە دنیـاو چ لـە دواڕۆژدا.

www.alibapir.com


ئنجا لەبەر ئەوەی لەم سوورەتەدا، ژمارەیەکی زۆر لە چاکەکانی خوا بسم الله الرحمن الرحيم باسکراون، چاکەکانیش پەیوەندییان بە هەر کام لە جندو مرۆڤەوە هەیە، بۆیە سی و یەک (٣١) جار، ڕستەی: ﴿فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ﴾، ئەی مرۆڤ و جند! نکوولّیی لە کام لە چاکەکانی پەروەردگارتان دەکەن، بە کام لە چاکەکانی پەروەردگارتان بێبڕوان، بە درۆیان دادەنێن؟ دووبارە بۆتەوەو، پێم وایە لەم سوورەتەدا زۆرترین پانتایی بۆ باسکردنی بەهەشت تەرخانکراوە، کە بریتیە لە: سی و سێ (٣٣) ئایەت، ئایەتەکانی: (٤٦ - ٧٨)و، نەمبینیوە لە هیچ سوورەتێکی دیکەدا بە دوای یەکدا، ئەوەندە پانتاییە بۆ باسی بەهەشت تەرخان کرابێ.

کەواتە: دەتوانین بڵێین: تەوەری سەرەکیی ئەم سوورەتە، باسی خوای بەرزو بێ وێنەیەو باسی چاکەکانی خوایەو، باسی ڕۆژی دواییە، هەردووک قۆناغی ئاخیر زەمان و قیامەت، پاشان باسێکی دۆزەخ و، سزای بێبڕوایان و مەینەتییەکانی کە بەسەر بێبڕوایان دێن، لە قیامەتدا، دوایی پانتاییەکی زۆر بۆ باسی بەهەشت و نازو نیعمەتەکانی تەرخانکراوە، کە بۆ هەر کام لە بڕوادارانی جندو مرۆڤ دانراوە.

## شەشەم: تایبەتمەندییەکانی:

ئێمە هەشت (٨) تایبەتمەندییمان بۆ ئەم سوورەتی (**الرحمن**)ە، لەبەر چاو گرتوون:

**١)**- ئەم سوورەتە تاکە سوورەتێکە لە هەموو قوڕئاندا بە یەکێک لە ناوەکانی خوا دەستی پێکرد بێ: ﴿ٱلرَّحۡمَٰنُ ۝١﴾، کە دوایی باسی دەکەین، ﴿ٱلرَّحۡمَٰنُ﴾، لێرەدا یان نیهادەو گوزارەکەی لە دوایی دێ: ﴿ٱلرَّحۡمَٰنُ﴾ نیهاد (**مبتدأ**)ەو: ﴿عَلَّمَ ٱلۡقُرۡءَانَ﴾ و ئەوانی دیکە تێکڕا دەبن بە گوزارە (**خبر**)، یاخود: ﴿ٱلرَّحۡمَٰنُ﴾، گوزارە (**خبر**)یەو، نیهادەکەی بۆ مەزەننە دەکرێ، واتە: (**هو الرحمن**) یان (**ألله الرحمن**).

**٢)**- تەنیا لەم سوورەتەدا ڕستەی: ﴿فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ﴾، هاتوەو سی و یەک (٣١) جاریش دووبارە بۆتەوە.

www.alibapir.com


**٣)-** لەم سووڕەتەدا زۆرترین پانتایی بۆ باسی بەهەشت تەرخانکراوە، کە دەتوانین بڵێین: سی و دوو (٣٢) ئایەتن: ئایەتەکانی (٤٦ - ٧٧)، لەبەر ئەوەی ئایەتی کۆتایی: ﴿ تَبَٰرَكَ ٱسۡمُ رَبِّكَ ذِي ٱلۡجَلَٰلِ وَٱلۡإِكۡرَامِ ٧٨ ﴾ **الرحمن**، ناگەڕێتەوە بۆ باسی بەهەشت.

**٤)-** ئەوەندەی لەم سووڕەتەدا، مرۆڤ و جند پێکەوە دوێنراون، لە هیچ سووڕەتێک دا ئەوە نیە، کە سەرجەم سی و پێنج (٣٥) جار، مرۆڤ و جند پێکەوە دوێنراون، سی و یەک (٣١) جار: ﴿ فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ ﴾ و جارێک: ﴿ أَيُّهَ ٱلثَّقَلَانِ ٣١ ﴾، ئەوە سی و دوو (٣٢)و، جارێک: ﴿ يَٰمَعۡشَرَ ٱلۡجِنِّ وَٱلۡإِنسِ ٣٣ ﴾، ئەمە سی و سێ (٣٣)و، جارێک: ﴿ يُرۡسَلُ عَلَيۡكُمَا شُوَاظٞ مِّن نَّارٖ وَنُحَاسٞ ٣٥ ﴾، ئەمە سی و چوار (٣٤)و، جارێکیش: ﴿ فَلَا تَنتَصِرَانِ ٣٥ ﴾، ئەمە سی و پێنج (٣٥)، واتە: لەم سووڕەتەدا (٣٥) جار، خوا بسم الله الرحمن الرحيم ڕووی کردۆتە هەردوو کۆمەڵی مرۆڤ و جندو، پێکەوە دواندوونی.

**٥)-** تەنیا لەم سووڕەتەدا، لە سێ ئایەتی بە دوای یەکدا، وشەی: **(الميزان)** هاتوە، هەر جارەی بە مانایەک، ئایەتەکانی: (٧، ٨، ٩)، وەک دوایی باسی دەکەین، نەمبینیوە بەم شێوەیە لە تەفسیرەکاندا باسکرا بێ، زانایان لە بارەی ئەو سێ وشەی: **(الميزان)** ەوە، کە هاتوون، زۆر قسەیان کردوەو، دوایی قسە لەو بارەوە دەکەین، بەڵام پێموایە **(الميزان)**ی یەکەم مەبەست پێی ئەندازەگیریی و هاوسەنگیی دانانە لە نێو هەموو گەردووندا، **(الميزان)**ی دووەم مەبەست پێی دانانی شەریعەت و بەرنامەی دادگەرانەی خوایە لە ژیانی بەشەرداو، **(الميزان)**ی سێیەم مەبەست پێی ئەو تەرازوو و پێوەرانەیە کە خەڵک شتیان پێ هەڵدەسەنگێنێ و دەکێشێ و دەپێون، واتە: هی یەکەمیان: تەرازووی گەردوونییەو، هی دووەمیان: تەرازووی شەرعییەو، هی سێیەمیان: تەرازووی ئامرازییە، **(الميزان الكوني، والميزان الشرعي، والـميزان الآلي)**.

**٦)-** تەنیا لەم سووڕەتەدا، ئاماژە بە چوونە بەهەشتی جندان کراوە، هەڵبەتە لە شوێنەکانی دیکەی قورئاندا، خوا بسم الله الرحمن الرحيم بە هێماو ئاماژە باسی ئەوەی کردوە کە سزاو پاداشت چاوەڕێی هەر کام لە مرۆڤ و جند دەکەن، بەڵام تەنیا لەم سووڕەتەدا بە

www.alibapir.com


ڕاشكاویی باسی ئەوە كراوە، كە جندیش دەچنە بەهەشت، ئەویش ئەوەیە كە خوا لە هەردوو ئایەتی: (٥٦) و (٧٤)دا، لە بارەی حۆرییەكانی بەهەشتەوە دەفەرموێ: ﴿فِيهِنَّ قَٰصِرَٰتُ ٱلطَّرْفِ لَمْ يَطْمِثْهُنَّ إِنسٌ قَبْلَهُمْ وَلَا جَآنٌّ ﴿٥٦﴾﴾، ئافرەتانێكی نیگای خۆ كورتكەرەوەیان تێدان، كە لە پێش وان دا {كە دەچنە بەهەشت} ئەو حۆرییانە جندو مرۆڤ دەستكارییان نەكردوون {نەچوونە لایان و لەگەڵیان دا جووت نەبوون}.

**٧)**- تەنیا لەم سوورەتەدا، باسی دوو جووتە بەهەشت {واتە: چوار دانە بەهەشت} كراوە، لە هەموو قورئاندا باسی بەهەشت (**جنة**) یان بەهەشتەكان (**جنات**) كراوە، بەڵام لەم سوورەتەدا باسی دوو جووتە بەهەشت (**جنتین**) كراوە، كەواتە: دەبن بە چوار، ئەویش لە ئایەتەكانی: (٤٦ - ٧٦)دا.

**٨)**- چەند وشەیەك تەنیا لەم سوورەتەدا هاتوون:

**١**- وشەی ﴿لِلْأَنَامِ ﴿١٠﴾﴾، واتە: خەڵك، یان دروستكراوان.

**٢**- وشەی ﴿كَٱلْفَخَّارِ ﴿١٤﴾﴾، واتە: خەزەف یان سواڵەت، واتە: قوڕێك كە وشك دەكرێتەوەو دەسووتێنرێ.

**٣**- وشەی ﴿كُلَّ يَوْمٍ هُوَ فِى شَأْنٍ ﴿٢٩﴾﴾ واتە: لە هەموو كاتانداو لە هەموو ڕۆژاندا ئەو (خوا) خەریكی كارێكە.

**٤**- وشەی ﴿أَيُّهَ ٱلثَّقَلَانِ ﴿٣١﴾﴾ واتە: ئەی دوو قورسەكان، واتە: ئەو دوو دروستكراوەی كە سەر زەوییتان قورس كردوە، كە مەبەست پێیان مرۆڤ و جندن.

**٥**- وشەی ﴿شُوَاظٌ مِّن نَّارٍ ﴿٣٥﴾﴾ واتە: بڵێسەیەك لە ئاگر.

**٦**- وشەی ﴿وَرْدَةً كَٱلدِّهَانِ ﴿٣٧﴾﴾ گوڵێكی داگیرساو (**وَرْدَةً**) بە مانای گوڵە، بەڵام بە مانای سوور بوونەوەش دێ، (**كَالدِّهَان**) بە مانای چەرمی سوور دێ و، بە مانای كانزای تواوەش دێ.

www.alibapir.com


٧- وشەی ﴿ذَوَاتَآ أَفۡنَانٖ ٤٨﴾ واتە: هەردووکیان خاوەن لق و پۆپ و چڵ، یان خاوەن جۆرن، (أفنان) یان کۆی (فن)، یان کۆی (فنن)ە.

٨- وشەی ﴿لَمۡ يَطۡمِثۡهُنَّ ٥٦﴾، واتە: بە خوێنیدا نەهێناون، مەبەست پێی لەگەڵ جووت بوونە.

٩- وشەی ﴿مُدۡهَآمَّتَانِ ٦٤﴾ واتە: سەوز و تۆخی ڕەشباو، واتە: لەبەر تۆخییان سەوزییەکە مەیلەو ڕەش دەنوێنێ، ئەو دوو باخە هێندە سەوزن.

١٠- وشەی ﴿نَضَّاخَتَانِ ٦٦﴾ واتە: بە فیچقە ئاوەکەیان لێ دەردەچێ زۆر بە توندیی.

١١- وشەی ﴿رَفۡرَفٍ خُضۡرٖ ٧٦﴾ (رَفْرَفٍ) بەوە دەگوترێ: کە ڕادەخرێ، (خضر) واتە: سەوز، واتە: ڕایەخی سەوز.

١٢- وشەی ﴿وَعَبۡقَرِيٍّ حِسَانٖ ٧٦﴾ (عبقري) واتە: شتی ناوازە، (حسان)یش کۆی (حَسْنی)یە، واتە: زۆر جوان، جوانەکان، ئەویش هەر ناوە بۆ ڕایەخ و فەرش کە ڕادەخرێ.

## حەوتەم: دابەشکردنی ئایەتەکان بۆ چەند دەرسێك:

ئێمە کۆی حەفتاو هەشت (٧٨) ئایەتەکەی ئەم سوورەتە موبارەکە، بۆ سێ دەرسان دابەش دەکەین:

**دەرسی یەکەم:** لە ئایەتەکانی: (١ - ٣٠) پێک دێ، لەو سی (٣٠) ئایەتەدا، خوای بە بەزەیی بیست (٢٠) لە چاکەکانی خۆی دەخاتەڕوو، هەروەها هەشت (٨) جاران لە میانی خستنە ڕووی ئەو نیعمەتانەدا، ئەم ڕستەیەی فەرمووە: ﴿فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ﴾، واتە: ئەی جند مرۆڤ! نکوولیی لە کام لە چاکەکانی پەروەردگارتان دەکەن! دوایی سێ سیفەتی بەرزو بێ وێنەی خۆی دەخاتەڕوو، کە بریتین لە: هەرماو (أبدي) بوونی خواو، ئاتاجیی تێکڕای خەڵکی ئاسمانەکان

www.alibapir.com


و زەوی بـۆ خـواو، بەردەوام لە کاردابوونی خـوا ﷻ بۆ بەڕێوەبردنی کاروباری دروسـتکراوەکان و گـەردوون.

**دەرسـی دووەم:** لـە پـازدە (١٥) ئایەتـەکانی: (٣١ - ٤٥) پێـک دێ و، هەمووشـیان بـاسی ڕۆژی دوایـیـن، هـەم قۆناغـی ئاخـیر زەمـان، هـەم قۆناغـی قیامـەت، بـە تایبـەتی بـاسی سـزاو ئـازارو مەینەتیـی بێبڕوایـان لـە ڕۆژی دواییـدا.

ئنجا لەو پازدە (١٥) ئایەتەشدا، خوا ﷻ حەوت جاران: ﴿ فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ ﴾ی، دووبـارە کردۆتـەوە، واتـە: لـە سـی (٣٠) ئایـەتی یەکەمـدا، هەشـت (٨) جـارو، لـە پـازدە (١٥) ئایـەتی دووەمـدا حـەوت (٧) جـار، ئـەوە پـازدە (١٥) جـار، کـە هەموویـان پەیوەندییـان هەیـە بـە: قۆناغـی ژیـانی دنیـاو، ئاخیـر زەمـان و قیامەتـەوەو، شـازدە (١٦) جارەکـەی دیکـەش هەموویـان پەیوەسـتن بـە بـاسی بەهەشتەوە، واتە: خوا ﷻ لە باسکردنی قۆناغی ژیانی دنیاو، قۆناغی بەرزەخ و، ئاخیـر زەمـان و قیامـەت (ڕۆژی دوایـی)دا، پـازدە (١٥) جـاران ڕسـتەی: ﴿ فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ ﴾، هێنـاوە، بـەڵام لـە بـاسی نـازو نیعمەتـەکانی دوو جووتـە بەهەشـتەکەدا، واتـە: هـەر چـوار بەهەشـتەکە کـە بـۆ بـڕواداران و پارێـزکارانی مـرۆڤ و جنـدی دانـاون، شـازدە (١٦) جـاران، ئـەو ڕسـتە موبارەکـەی دووبـارە کردۆتـەوە، ئەمـەش ئـەوەی لێوەردەگیرێ کە نازو نیعمەتەکانی خـوا ﷻ بە پلەی یەکەم و بـە شـێوەیەکی بنەڕەتیـی لـە ڕۆژی دواییـدا بەرجەسـتە دەبـن، ئەویـش لـە ژیـانی بەهەشـتدا بەرجەسـتە دەبـن بـۆ بـڕواداران.

**دەرسـی سـێیەم:** لـە سی و یـەک (٣١) ئایەتـەکانی: (٤٦ - ٧٨)، پێـک دێ، ئایەتـەکانی کۆتایـی ئـەم سـوورەتە کـە هەموویـان بـاسی سـەرەنجامی خێـری کەسـانی دڵ پـڕ بیـم و سـامن، بەرانبـەر بـە پایـەی بـەرزی پەروەردگاریـان، ئـەو سـەرەنجامە خێـرەش لـە بەهەشـتەکانی خـوادا بەرجەسـتەیەو، ئێـرەش تاکـە شـوێنێکە لـە هەمـوو قورئانـدا، خـوا بـاسی چـوار بەهەشـت، واتـە: دوو جووتـە بەهەشـت دەکات.

www.alibapir.com



## پێناسەی ئەم دەرسە

ئـەم دەرسـەمان لـە سـی (٣٠) ئایـەتی سـەرەتای سـوورەتی (**الرحمـن**) پێکـد دێ، ئایەتـەکانی: (١ - ٣٠)، خـوای کارزان و میهرەبـان لـەو سـی ئایەتـە موبارەکـەدا، پـاش ناوهێنـانی خـۆی بـە (**الرحمـن**) واتـە: خـاوەنی ئەوپـەڕی بەزەیـی، بیسـت (٢٠) لـە چاکـەو نیعمەتـە جـۆراو جـۆرەکانی خـۆی دەخاتـە ڕوو، کـە ئەمانـەن:

**١)**- فێرکردنی قورئان، فێری پێغەمبەری خوای ﷺ کردوە، فێری مرۆڤەکان و جندەکانی کردوە، یان بە گشتیی هەم فێری پێغەمبەر ﷺو، هەم فێری هەموو ئەوانەی کردوە کە شوێنی دەکەون لە مرۆڤ و جند.

**٢)**- دروستکردنی مرۆڤ.

**٣)**- قسە فێرکردنی، یاخود فێرکردنی مرۆڤ، کە چۆن ئەوەی لە دڵیدایە، ئەو نیازو مەبەستانە دەرببڕێ، چ بە قسەو چ بە نووسین، چ بە ئاماژە، بە چ هەرشێوازێکی دیکە.

**٤و٥)**- دروستکردنی خۆرو، مانگ بە ئەندازەو وردەکاریی.

**٦و٧)**- کڕنووش بردنی ڕووەکی پان ڕاخراوو، دارو دەرختی بەرز هەڵچوو.

**٨و٩)**- دروستکردنی ئاسمان بە بەرزیی و، دانانی تەرازوو لە ئاسماندا، لە گەردوون دا.

**١٠)**- دانانی زەوی بۆ دروستکراوەکان، هەموو ئەوانەی لەسەری دەژین، لە مرۆڤ و جندو هەموو ئەوانەی خاوەنی هەست و هۆشن.

**١١و١٢)**- لە زەوییدا دروستکردنی میوەو، دارخورمای خاوەن کیف بۆ هێشوەکانی.

**١٣و١٤)**- هەروەها لە زەویدا ڕوواندنی دانەوێڵەی خاوەن پووش و گیا، دانەوێڵەکە بۆ مرۆڤەکان و، پووش و گیایەکەش بۆ ئاژەڵەکانیان و، ڕووەکە بۆنخۆشەکان.

**١٥)-** دروستکردنی مرۆڤ لە قوڕی وشک هەڵاتووی خەزەف ئاسا، وەک سواڵەت.

**١٦)-** دروستکردنی جند لە بڵێسەی ئاگرێکی ساغ و بێ دووکەڵ.

**١٧)-** دانانی هەردووک ڕۆژهەڵات و هەردووک ڕۆژئاوایەکانی هاوین و زستان.

**١٨)-** تێکەڵکردنی دوو دەریای سوێرو شیرین، بەڵام بەبێ ئاوێتەی یەکدیی بوون، بەهۆی پەردەو نێوانێکەوە کە خستوویەتە نێوانیانەوە.

**١٩)-** دەرهێنانی گەوهەرو مرواریی لە دەریا.

**٢٠)-** کەشتییە بەرزە چیا ئاسایەکان و، بە دەریادا ڕەخسێنرانی ڕۆیشتنیان لەلایەن مرۆڤەکانەوە، بەو توانایەی خوا پێیداون و، بەو کەرەستانەی خوا بۆی ڕەخساندوون.

لە کۆتاییشدا خوای باڵا دەست ئەو ڕاستییەی ڕاگەیاندوە، کە هەر کەس لەسەر زەوییە، لە جندو مرۆڤ دەمرن، تەنیا ڕووی بەرزو بێ وێنەی خوا، دەمێنێ. دوایی دوو ڕاستیی دیکەی یەکجار مەزنی ڕاگەیاندوون:

**١)-** هەر کەس لە ئاسمانەکان و لە زەویدایە، لە خاوەن هەست و هۆشان، لە مرۆڤ و جندو فریشتەو هەر دروستکراوێکیش کە بەس خوا خۆی دەزانێ، داوا لە خوا دەکەن و لێی دەپاڕێنەوە، بە هەموو شێوەکانی لێپاڕانەوە، بە زمانی حاڵ یان بە زمانی وتار.

**٢)-** بەردەوام خوای بەرزو مەزن لە کاردایە بۆ بەڕێوەبردنی دروستکراوەکانی.

لە تۆڕە کۆمەڵایەتییەکان لەگەڵتانین
Stay in touch on social media
نحن معكم عبر مواقع التواصل الاجتماعي
ڕاگەیاندنی مەکتەبی مامۆستا عەلی باپیر
AliBapir/عەلی باپیر
archive.org/details/@alibapir
AliBapir/عەلی باپیر
AliBapir
کەناڵی ڕاگەیاندنی مەکتەبی مامۆستا عەلی باپیر
www.alibapir.net
کوردی - عربي - English
ڕاگەیاندنی مەکتەبی مامۆستا عەلی باپیر

www.alibapir.com


بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ

﴿ٱلرَّحْمَٰنُ ﴿١﴾ عَلَّمَ ٱلْقُرْءَانَ ﴿٢﴾ خَلَقَ ٱلْإِنسَٰنَ ﴿٣﴾ عَلَّمَهُ ٱلْبَيَانَ ﴿٤﴾ ٱلشَّمْسُ وَٱلْقَمَرُ بِحُسْبَانٍ ﴿٥﴾ وَٱلنَّجْمُ وَٱلشَّجَرُ يَسْجُدَانِ ﴿٦﴾ وَٱلسَّمَآءَ رَفَعَهَا وَوَضَعَ ٱلْمِيزَانَ ﴿٧﴾ أَلَّا تَطْغَوْا۟ فِى ٱلْمِيزَانِ ﴿٨﴾ وَأَقِيمُوا۟ ٱلْوَزْنَ بِٱلْقِسْطِ وَلَا تُخْسِرُوا۟ ٱلْمِيزَانَ ﴿٩﴾ وَٱلْأَرْضَ وَضَعَهَا لِلْأَنَامِ ﴿١٠﴾ فِيهَا فَٰكِهَةٌ وَٱلنَّخْلُ ذَاتُ ٱلْأَكْمَامِ ﴿١١﴾ وَٱلْحَبُّ ذُو ٱلْعَصْفِ وَٱلرَّيْحَانُ ﴿١٢﴾ فَبِأَىِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ ﴿١٣﴾ خَلَقَ ٱلْإِنسَٰنَ مِن صَلْصَٰلٍ كَٱلْفَخَّارِ ﴿١٤﴾ وَخَلَقَ ٱلْجَآنَّ مِن مَّارِجٍ مِّن نَّارٍ ﴿١٥﴾ فَبِأَىِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ ﴿١٦﴾ رَبُّ ٱلْمَشْرِقَيْنِ وَرَبُّ ٱلْمَغْرِبَيْنِ ﴿١٧﴾ فَبِأَىِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ ﴿١٨﴾ مَرَجَ ٱلْبَحْرَيْنِ يَلْتَقِيَانِ ﴿١٩﴾ بَيْنَهُمَا بَرْزَخٌ لَّا يَبْغِيَانِ ﴿٢٠﴾ فَبِأَىِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ ﴿٢١﴾ يَخْرُجُ مِنْهُمَا ٱللُّؤْلُؤُ وَٱلْمَرْجَانُ ﴿٢٢﴾ فَبِأَىِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ ﴿٢٣﴾ وَلَهُ ٱلْجَوَارِ ٱلْمُنشَـَٔاتُ فِى ٱلْبَحْرِ كَٱلْأَعْلَٰمِ ﴿٢٤﴾ فَبِأَىِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ ﴿٢٥﴾ كُلُّ مَنْ عَلَيْهَا فَانٍ ﴿٢٦﴾ وَيَبْقَىٰ وَجْهُ رَبِّكَ ذُو ٱلْجَلَٰلِ وَٱلْإِكْرَامِ ﴿٢٧﴾ فَبِأَىِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ ﴿٢٨﴾ يَسْـَٔلُهُۥ مَن فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ كُلَّ يَوْمٍ هُوَ فِى شَأْنٍ ﴿٢٩﴾ فَبِأَىِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ ﴿٣٠﴾﴾.

## مانای دەقا و دەقی ئایەتەکان

{بە ناوی خوای بە بەزەیی بەخشندە. (خوای) بە بەزەیی ﴿١﴾ قورئانی فێر کردوە ﴿٢﴾ مرۆڤی دروستکردوە (لە باشترین شێوەدا) ﴿٣﴾ ڕوونکردنەوەی (مەبەستی) فێر کردوە ﴿٤﴾ خۆرو مانگ بە ژمارە (و ئەندازەگیریی دروستکراو)ن ﴿٥﴾ ڕووەکی ڕاخراو درەخت کڕنووش (بۆ خوا) دەبەن ﴿٦﴾ ئاسمانی بەرزکردۆتەوەو تەرازووی (هاوسەنگیی تێدا) داناوە ﴿٧﴾ تاکو لە تەرازوو (ی شەریعەت)دا سەر کێشیی نەکەن ﴿٨﴾ دادگەرانەش کێشان (و پێوان) بکەن و، لە تەرازوودا داشکان مەکەن ﴿٩﴾ (خوا) زەویشی بۆ خەڵکی (لە مرۆڤ و جند) داناوە (کە ژیانی

دنیای لەسەر بگوزەرێنن) ﴿١٠﴾ میوە (ی جۆراو جۆر)و دارخورما خاوەن کیفەکانی (کە هێشووە خورمایەکانیان گرتوونە خۆیان) تێیدان ﴿١١﴾ هەروەها (جۆرەکانی) دانەوێڵەی خاوەن پووش و کاو ڕیحانە (و گوڵ و گیا بۆنخۆشەکان)ی تێدان ﴿١٢﴾ ئنجا ئایا (ئەی جندو مرۆڤ!) نکووڵیی لە کام لە چاکەکانی پەروەردگارتان دەکەن؟ ﴿١٣﴾ (خوا) مرۆڤی لە (قوڕێکی وشکی) زرینگەداری وەک سواڵەت دروستکردوە ﴿١٤﴾ جندیشی لە بڵێسەی ئاگر دروستکردوە ﴿١٥﴾ ئنجا ئایا (ئەی جندو مرۆڤ!) نکووڵیی لە کام لە چاکەکانی پەروەردگارتان دەکەن؟ ﴿١٦﴾ (خوا) پەروەردگاری دوو ڕۆژهەڵاتەکان (ی هاوین و زستان)و دوو ڕۆژئاوایەکانە ﴿١٧﴾ ئنجا ئایا (ئەی جندو مرۆڤ!) نکووڵیی لە کام لە چاکەکانی پەروەردگارتان دەکەن؟ ﴿١٨﴾ (خوا) دوو دەریایەکانی بەرهەڵدا کردوون، پێک دەگەن ﴿١٩﴾ بەربەستێکیان لە نێوان دایە سنوور بە لای یەکدا ناشکێنن ﴿٢٠﴾ ئنجا ئایا (ئەی جندو مرۆڤ!) نکووڵیی لە کام لە چاکەکانی پەروەردگارتان دەکەن؟ ﴿٢١﴾ گەوهەرو مرواریيان لێ دێنەدەرێ ﴿٢٢﴾ ئنجا ئایا (ئەی جندو مرۆڤ!) نکووڵیی لە کام لە چاکەکانی پەروەردگارتان دەکەن؟ ﴿٢٣﴾ هەروەها (کەشتییە لەسەر ئاو) دروستکراوە ڕۆیشتووەکانی وەک چیاکانیش هەر هی وین ﴿٢٤﴾ ئنجا ئایا (ئەی جندو مرۆڤ!) نکووڵیی لە کام لە چاکەکانی پەروەردگارتان دەکەن؟ ﴿٢٥﴾ هەموو ئەوانەی لەسەرنی (لەسەر زەوی) لە نێوچوون ﴿٢٦﴾ (بەس) ڕووی پەروەردگاری خاوەن شکۆو ڕێزلێگرتن و چاکەکارت دەمێنێ ﴿٢٧﴾ ئنجا ئایا (ئەی جندو مرۆڤ!) نکووڵیی لە کام لە چاکەکانی پەروەردگارتان دەکەن؟ ﴿٢٨﴾ (خوا) هەر کەس کە لە ئاسمانەکان و زەوی دایە، داوای لێ دەکات و هەر ڕۆژە ئەو (لە کردنی) کارێک دایە ﴿٢٩﴾ ئنجا ئایا (ئەی جندو مرۆڤ!) نکووڵیی لە کام لە چاکەکانی پەروەردگارتان دەکەن؟! ﴿٣٠﴾}.

www.alibapir.com


## شیکردنەوەی هەندێک لە وشەکان

(ٱلۡبَيَانَ ): (البَيَانُ: الكَشْفُ عَنِ الشَّيءِ، وَهُوَ أَعَمُّ مِنَ النُّطْقِ)، (بَيَان): بریتیە لە دەرخستنی شتێک، وشەی (بَيَان) کە دەفەرموێ: ﴿عَلَّمَهُ ٱلۡبَيَانَ﴾، گشتییترە لە دوان و قسەکردن، بەڵکو ئاماژەش دەگرێتەوەو نووسینیش دەگرێتەوە، هەموو ئەو شێوە دەربڕینانەی دیکەش، بۆ وێنە: هونەری تەشکیلییش دەگرێتەوە، هەموو ئەو شێوازانەی کە خەڵک پێیان لە یەکدی تێدەگەن.

(بِحُسۡبَانٖ ): (الحِسَابُ: إِسْتِعْمَالُ العَدَدِ، حَسَبْتُ وَأَحْسُبُ حِسَاباً وَحُسْبَاناً)، (حُسْبَان) واتە: (حِسَاب)، (حِسَاب)یش بریتیە لە بەکارهێنانی ژمارە، دەگوترێ: (حَسَبْتُ وَأَحْسُبُ حِسَاباً وَحُسْبَاناً) واتە: ژماردم، دەیژمێرم، ژماردن، کەواتە: (حُسْبَان) چاوگە بە مانای ژماردن، دواییش ئەم ژماردنە دەخوازرێتەوە بۆ مانای دیکەش، بۆ وێنە ئەندازەگیریی، یان وردەکاریی، وەک لە ئاخاوتنی خۆمان دا دەڵێین: هەموو شتێک بە حیساب و کیتابە، واتە: بە وردەکاریی.

(وَٱلنَّجۡمُ): (أَصْلُ النَّجْمِ: الكَوْكَبُ الطَّالِعُ، وَالجَمْعُ: نُجُوم)، وشەی (نَجْم) لە ئەصڵی زمانی عەرەبییدا بریتیە لەو ئەستێرەیەی دەردەکەوێ، وشەی (نَجْم) بە (نُجُوم) کۆ دەکرێتەوە، (نَجَمَ: طَلَعَ نُجُوماً وَنَجْماً فَالنَّجْمُ مَصْدَرٌ، وَاسْمٌ، وَمِنْهُ شُبِّهَ بِهِ طُلُوعُ النَّبَاتِ وَالرَّأْيِ)، (نَجَمَ) واتە: هەڵهات، دەرکەوت، (نُجُومَ وَنَجْماً) هەردووکیان چاوگن، (فَالنَّجْمُ مَصْدَرٌ وَاسْمٌ)، (نَجَمَ): هەم چاوگەو، هەم ناویشە، (نَجَمَا نَجْماً)، واتە: (طَلَعَ طُلُوعَاً)، لەویشەوە دەرکەوتنی ڕووەک، هەروەها دەرکەوتنی بیرو بۆچوونێک، دەڵێ: (نَجَمَ رَأْيُهُ عَنْ كَذَا) یان (نَجَمَ النَّبَاتُ) واتە: ڕووەکە کە دەرکەوت و بە زەویدا ڕاخرا.

(وَٱلشَّجَرُ ): (الشَّجَرُ مِنَ النَّبَاتِ مَالَهُ سَاقٌ، شَجَرَةٌ وَشَجَرٌ، نَحْو: ثَمَرَةَ وَثَمَر)، (شَجَرْ): لە ڕووەک ئەوەیە، قەدی هەبێ و بەرزبێتەوە، تاکەکەی (شَجَرَة)یە، ناوە کۆیەکەی

www.alibapir.com


(شَجَر)ە، هەڵبەتە بە (أشْجَار)یش کۆ دەکرێتەوە، وەک (ثَمَرَة وَثَمَر) یەک میوەو میوە بە گشتیی.

(ٱلْمِيزَانَ): (الوَزْنُ: مَعْرِفَةُ قَدْرِ الشَّيءِ، وَزَنْتُهُ وَزْناً وَزِنَةً، وَالمِيْزَانُ آلَةُ الوَزْن)، (وَزْن): بریتیە لە زانینی ئەندازەی شتێک، دەگوترێ: (وَزَنْتُهُ وَزْناً وَزِنَةً) واتە: کێشام، هەڵمسەنگاند، (مِيْزَان)یش ئامێری پێ هەڵسەنگاندنە، بە کوردیی دەڵێین: تەرازوو (مِيْزَان)، بەڵام چەمک و واتایەکەی گشتییترە لەوەی تەنیا ئەو تەرازووەی ئێمە بەکاری دێنین، بگرێتەوە، بەڵکو جاری وا هەیە (مِيزَان) بە مانای هاوسەنگیی دێ و، جاری وایە بە مانای ڕێک و ڕاستیی شتێک دێ و، بە مانای هەڵسەنگاندن دێ، نەک هەر هەڵسەنگاندنی شتی مادديی و بەرجەستە، بەڵکو شتی مەعنەویی و نابەرهەستیش.

(بِٱلْقِسْطِ): (القِسْطُ: النَّصِيْبُ بِالْعَدْلِ، كَالنَّصَفِ وَالنَّصَفَةِ، وَالقِسْطَاسُ: المِيْزَانُ وُيُعَبَّرُ بِهِ عَنِ العَدَالَةِ كَمَا يُعَبَّرُ بِهِ عَنِ المِيْزَان)، وشەی (قِسْط) بە مانای پشک و بەشێک دێ کە دادگەرانە دابەشکرابێ، وەک (نَصَفُ ونَصَفَة) ئەوانیش هەردووکیان بە مانای دابەشکردنێکی دادگەرانەو بە ویژدانانەن، (قِسْطَاس) واتە: تەرازوو (مِيْزَان)، تەعبیر بە تەرازوو دەکرێ لە دادگەریی، هەروەک تەعبیر بە دادگەرییش دەکرێ لە جیاتی تەرازوو، ئەو شتەم بە تەرازوو بۆ بکێشەو، با ئەو شتە بە تەرازوو بێ، واتە: بە دادگەریی بێ، یان بە ڕێک و ڕاستیی.

(وَلَا تُخْسِرُوا۟ ٱلْمِيزَانَ): واتە: هەڵسەنگاندن، یان کێشان، یان تەرازووەکە کەم مەکەن، (الخُسْرُ وَالخُسْرَانُ: انْتِقَاصُ رَأْسِ المَالِ)، وشەی (خُسْرُ) و (خُسْرَان) هەردووکیان چاوگن بە مانای کەم بوون لە دەستمایەن، (وَالإِخْسَارُ: جَعْلُ الغَيْرِ خَاسِراً، وَالخَسَارَةُ: النَّقص)، (إِخْسَار) لەسەر کێشی (إِفْعَال)ە، ئەوەیە تۆ ئەوی دیکە تووشی زیان بکەی، (خَسَارة)ش بە مانای کەم و کوڕیی و، لێ کەمکردن دێ.

www.alibapir.com



(لِلْأَنَامِ): (الخَلْقُ)، (أَنَام) زۆربەی ڕوونکەرەوانی قورئان دەڵێن: بە مانای دروستکراوانە لەسەر زەوی بە گشتیی، واتە: مرۆڤ و جندو ئەوانەی خاوەن هەست و هۆشن، هەردووکیان دەگرێتەوە، هەندێکیشیان گوتوویانە: (أنام) تایبەتە بە مرۆڤەکانەوە، بەڵام ڕای یەکەم ڕاسترە.

(ٱلْأَكْمَامِ): (جَمْعُ كُمْ: كُلُّ مَا يُغَطِّي، وَيَدْخَلُ فِيْهِ لِحَاؤُهَا وَلِيْفُهَا وَنَوَاهَا)، بە نسبەت دارخورماوە، (أَكْمَام) کۆی (كُمْ)ە، (كُمْ)یش هەر شتێک کە شتێک داپۆشێ، کە بە نسبەت دارخورماوە: پووش و پەڵاشەکەی و نێوکەکانیشی دەگرێتەوە، هەروەها دەشگونجێ (أكْمَام) کۆی (كِم) بێ، کە بەو توورەگەو کیفە دەگوترێ، هێشووە دارخورمای لێ دێتە دەرێ، کە (كُفَرى)شی پێ دەڵێن، (فَإنَّـهُ يَكُونُ فِي وِعَاءٍ فَيُنْشَقُّ فَيَخْرُجُ مِنْهُ الطَّلْع)، پێشێ هێشووە دارخورما لە نێو کیفێکدا دەبێ، دوایی ئەو کیفە دەدڕێ و هێشووەکەی لێ دێتە دەرێ، (راغب الأصفهاني) گوتوویەتی: (الكُمُّ: مَا يُغَطِّي اليَدَ مِنَ القَمِيْصِ، وَالكِمُّ مَا يُغَطِّي مِنَ الثَّمَرَةَ)، (كُمْ): ئەوەیە کە دەست دادەپۆشێ لە کراس، واتە: قۆڵ، بەڵام (كِم): بریتیە لەوەی میوە دادەپۆشێ، هەر کیفێک، هەر بەرگێک، هەرچەندە زیاتر بە هی هێشووە دارخورما، دەگوترێ، بەڵام هەندێک لە میوەکانی دیکەش لە جۆرێک لە توورەکەو کیف دان و بە هی هەموویان دەگوترێ: (كِم)و بە (أكْمَام) کۆ دەکرێتەوە.

(وَٱلْحَبُّ): (الحَبُّ وَالحَبَّةُ مِنَ الحِنْطَةِ وَالشَّعِيْرِ وَنَحْوِهِمَا مِنَ المَطعُومَاتِ، وَالحِبُّ وَالحِبَّةُ فِي بُزُورِ الرَّيَاحِيْن) وشەی (حَبُّ) و (حَبَّةُ) بۆ گەنم و جۆو هاوێنەکانیان، لە خواردنەکان (ئەوانەی دەخورێن)، بەڵام (حِبُّ) و (حِبَّةُ) بۆ تۆوی گژوگیا بۆنخۆشەکان {ڕیحانەو گوڵ و ئەوانە} کە دەچێنرێن، (حَبّ) ناوی کۆیە، بەڵام (حَبّة) بۆ تاکێکە، هەروەک (حِبّ)یش لەگەڵ (حِبَّة)دا بە هەمان شێوە.

(ٱلْعَصْفِ): (العَصْفُ وَالعَصِيْفَةُ: الَّذِي يُعْصَفُ مِنَ الزَّرْعِ)، (عَصْف) و (عَصِيْفَة)، ئەوەیە کە لە ڕووەک دەدروێتەوە، واتە: قەدەکەی و گیایەکەی، (وَيُقَالُ لِحُطَامِ الزَّرْعِ المتَكَسّر: عَصْفٌ، وَرِيْحٌ عَاصِفٌ وَعَاصِفَةٌ: تَكْسِرُ الشَّيء)، پووش و پەڵاش و لاسک

www.alibapir.com


و قەدی کشتوکاڵ، ئنجا گەنم و جۆیە، نیسک و نۆکە، هەرچییە پووش و پەڵاشەکەی کە تێکدەشکێ، پێی دەگوترێ: (عَصْف) هەروەها دەگوترێ: (رِيْحٌ عَاصِفٌ، ورِيْحٌ عَاصِفَةٌ)، بایەک کە شتەکان تێکدەشکێنێ، یان پووش و پەڵاش ڕادەماڵێ.

(وَٱلرَّيۡحَانُ): (مَالُهُ رَائِحَة وَقِيْلَ: الرَّيْحَان: الرِّزْق)، (رَيْحَان): ئەوەیە بۆنی خۆشیی هەبێ، ڕیحانە گیایەکی بۆنخۆشە، یان هەموو گژوگیا بۆنخۆشەکان، هەندێکیش گوتوویانە: (رَيْحَان) بە مانای بژیوە بە گشتیی، بەڵام مانای یەکەمیان بەهێزترە.

(صَلۡصَٰلٍ): (أَصْلُ الصَّلْصَالِ: تَرَدُّدُ الصَّوْتِ مِنَ الشَّيءِ اليَابِس)، وشەی (صَلْصَال) لە ئەصڵدا دەنگ هاتنە لە شتێکی وشک، هەروەها هەر شتێک زرینگەو دەنگی بێت لە ئەسڵدا مانای ئەوەیە، بەڵام دوایی وشەی (صَلْصَال) بەکارهێنراوە بۆ: (الطِّيْنُ الجَاف وَقِيْلَ: المُنْتِن مِنَ الطِّيْن)، هەم بە قوڕی وشک بۆوە دەگوترێ: (صَلْصَال)و، هەم بە قوڕی بۆنکردووش دەگوترێ، بەڵام ئەگەر قوڕی بۆنکردووش بێ، دەبێ وشک بووبێتەوەو کە پەنجەت لێدا یان شتێکی پێکەوت، زرینگەی بێ، لە فەرمایشتی پێغەمبەردا ﷺ هاتوە کە باسی چۆنیەتیی وەحیی بۆ هاتنی دەکات، دەفەرموێ: {أَحْيَانًا يَأْتِينِي فِي مِثْلِ صَلْصَلَةِ الْجَرَسِ}، (أخرجه مالك: ٤٧٥، وأحمد: ٢٥٢٩١، والبخاري: ٣٠٤٣، ومسلم: ٢٣٣٣، والترمذي: ٣٦٣٤) واتە: جاری واش هەیە وەک زرینگەی جەڕەس، زرینگەی زەنگوڵ (کە دێتە بەر گوێم) بۆم دێ.

(كَٱلۡفَخَّارِ): (الفَخَّارُ: الجِرَارُ وَذَلِكَ لِصَوْتِهِ إِذَا نُقِرَ كَأَنَّمَا تُصُوِّرَ بِصُورَةِ مَنْ يُكْثِرُ التَّفَاخُرَ)، (فَخَّار): بە دیزەو گۆزەو ئەوانە دەگوترێ، ئەویش لەبەر ئەوەی کاتێک پیتکە[1]و پەنجەی لێ بدەی دەنگی دێ، وەک کەسێک وێنا کراوە (لەبەر ئەوەی دەنگی زۆر دێ) زۆر شانازیی بکات، (فَخَّار) بە کوردیی دەڵێین: سواڵەت، جاری واش هەیە خەزەفیش بەکاردەهێنرێ، کە بریتیە لە قوڕی وشککراوەی سووتێنراو بە جۆرێک کە وەک قوڕی وشک بووەوەی ئاسایی نەبێ، کە ئاوی گەیشتێ بتوێتەوەو ببێتەوە بە قوڕ.

---

(١) پیتکە: سەرە پەنجە.

www.alibapir.com



(ٱلْجَآنَّ): (أَصْلُ الجَنِّ: سَتْرُ الشَّيءِ، وَالجِنَّةُ: جَمَاعَةُ الجِنِّ، وَالمُرَادُ بِهِ إِبْلِيْس، وَمَا خَرَجَ عَنْهُ مِنَ الشَّيَاطِيْنِ)، وشەی (جَانّ) لە (جَنَ)ەوە هاتوە، (أَصْلُ الجَنِّ: سَتْرُ الشَّيءِ)، بریتیە لە داپۆشینی شتێک {(جُنَّة) پۆشەر، قەڵغان، (مَجْنُون) بۆیە وای پێدەگوترێ: چونکە عەقڵەکەی داپۆشراوە، (جَنِيْن) بۆیە وای پێدەگوترێ: چونکە لە نێو هەناوی دایکیدا پەنهانەو، (جِنّ)یش بۆیە وایان پێدەگوترێ: چونکە پەنهانن و نابینرێن} (الجِنَّةَ: جَمَاعَةُ الجِن) (جِنَّة) واتە: کۆی جندان، (جَانّ): لێرەدا مەبەست پێی ئیبلیس و هەموو ئەوانەیە کە لێی پەیدابوون لە شەیتانان، بەڵام دەبێ بزانرێ: کە جند هەموویان شەیتان نین، بەڵکو شەیتان لە مرۆڤانیش هەن و، لە جندانیش هەن، هەروەک بڕوادارو پارێزکارانیش لە مرۆڤانیش هەن و لە جندانیش هەن.

(مَّارِجٍ): (المَارِجُ: المُخْتَلِطُ اسْمُ فَاعِلٍ بِمَعْنَى إِسْمِ المَفْعُولِ مِثْلُ دَافِقٍ، وَمِثْلُ عِيْشَةٍ رَاضِيَة)، (مارِج)بە مانای تێکەڵ دێ، ناوی بکەرەو بە مانای ناوی بەرکارە، وەک (دَافِق) کە لەسەر کێشی (فَاعِل)ە، بەڵام بە مانای (مَدْفُوق)ە، واتە: فیچقە کراو، (عِيْشَة رَاضِيَة) واتە: (عِيْشَة مَرْضِيَّة)، (رَاضِية) لەسەر کێشی (إِسْم فَاعِل)ە، ژیانێکی ڕازیی، بەڵام مەبەست پێی ژیانێکە خاوەنەکەی پێی ڕازی بێ، واتە: (عِيْشَة مَرْضِيَّة)، ئنجا کە دەفەرموێ: ﴿وَخَلَقَ ٱلْجَآنَّ مِن مَّارِجٍ مِّن نَّارٍ﴾، واتە: جندی لە تێکەڵەیەک لە ئاگر دروستکردوە، یانی: ئاگرەکە هەندێک پێکهاتەی دیکەشی لەگەڵ دان، هەندێکیش گوتوویانە: (مَارِج) بە مانای بڵێسەی ئاگری بێ دوو کەڵ دێ، دەگوترێ: (مَرَجَ أَمْرُهُمْ: إِخْتَلَطَ، وَأَمْرٌ مَرِيْج: مُخْتَلِط)، (مَرَجَ أَمْرُهُمْ) واتە: کارەکەیان تێکەڵبوو، (وَأَمْرٌ مَرِيْج)، کارێکی تێکەڵ.

(مَرَجَ): (المَرْجُ: الخَلْطُ)، (مَرْج) بە مانای تێکەڵکردن دێ، بەڵام (مَرَج) بە مانای تێکەڵیی، ﴿مَرَجَ ٱلْبَحْرَيْنِ يَلْتَقِيَانِ﴾، واتە: دوو دەریایەکەی تێکەڵکردوون، بەری هەڵداونە لای یەک، هەندێکیش گوتوویانە: (مَرَجَ البَحْرَيْن: أَرْسَلَهُمَا) واتە: ناردوونیە لای یەک، بەڵام کە ناردوونیە لای یەک، پێکگەیشتوون.

www.alibapir.com


(بَرۡزَخٞ ): (البَرْزَخُ: الحَاجِزُ وَالحَدّ بَيْنَ الشَّيْئَيْنِ وَقِيْل: أَصْلُه «بَرْزَه» فَعُرِب)، (بَرْزَخ) بە نێوانێک و سنوورێک کە لە نێوانی دوو شتاندایە، هەندێکیش گوتوویانە: (بَرْزَخ) لە ئەصڵدا لە (بَرْزَه)ەوە هاتوە، (بەرزە) وشەیەکی کوردییە، چونکە فارسیش ئێستا ئەو وشەیە بەکارناهێنن، فارس لە جیاتی بەرز دەڵێن: (بُلند)، بەڵام دوایی لە جیاتی (ه)ەیەکە، بزوێنەکەی کۆتایی (خ)یان داناوەو بۆتە (بَرْزَخ) چونکە ئەم وشەیە ناوێکی جامیدەو، نەزاندراوە هی چی دیکەی لێ بتاشرێ و ئیشتیقاق بکرێ.

(ٱللُّؤۡلُؤُ): (تَلَأْلَأَ الشَّيءُ: لَمَعَ، لَمَعَان اللّؤْلُؤ، وَجَمْع اللّؤْلُؤ: لَآلِيء)، (لؤْلُؤ) (تلألأ الشَّيء) واتە: شتەکە درەوشایەوە، وەک چۆن گەوهەر دەدرەوشێتەوەو ئاوا درەوشایەوە، کۆی (لؤْلؤ)یش (لآلِيء)ە، (لؤْلؤ)یش بە کوردیی دەگوترێ: گەوهەر، ڕەنگە مرواریشی پێ بگوترێ.

(وَٱلۡمَرۡجَانُ ): (المَرْجَان: صِغَارُ اللّؤْلُؤ) {ئەوەش ڕایەکە} واتە: مەرجان وردە گەوهەرە، بەڵام (مَرْجَان) وەک دوایی باس دەکەین، لە (لؤْلؤ) جیایە، (لؤْلؤ) بەشێوەیەک دروست دەبێ و (مَرْجَان) بە شێوەیەکی دیکە، بۆیە ئەوە ڕاستە کە (مرجان) (نَوْعٌ مِنَ الحَجَر البَحْرِي)، مرواریی جۆرێکە لە بەردی نێو دەریا، بەڵام ژیاندارێک دروستی دەکات، گوتراوە: (حَيْوَان بَحْرِي ذو أَصَابِعَ دَقِيْقَة)، ژیاندارێکی دەریاییە پەنجە باریکەڵەی هەن، دوایی ئەو ماددەیەی دەری دەکات ڕەق دەبێ، وەک بەردی لێ دێ و ڕەنگێکی سووری هەیە، دواییش زیاتر باسی (لؤْلؤ) و (مَرْجَان) دەکەین.

(ٱلۡمُنشَـَٔاتُ): کەشتییە ڕۆیشتووە دروستکراوەکان، (المُنْشَئَات: بِفَتْحِ الشِّيْن: إسْمُ مَفْعُول، إذَا أُوجِد وَصُنِعَ، أي: الَّتِي أَنْشَأَهَا النَّاسُ، وَالمُنْشِئَات بِكَسْرِ الشِّيْن مِنْ أَنْشَأَ السَّيْرَ: أَسْرَعَ أي: الَّتِي يَسِيْر بهَا النَّاسِ سَيْراً سَرِيْعَاً)، ﴿وَلَهُ ٱلۡجَوَارِ ٱلۡمُنشِـَٔاتُ فِي ٱلۡبَحۡرِ كَٱلۡأَعۡلَٰمِ﴾، خوێنراویشەتەوە: (لَهُ الجَوَارُ المُنْشِئَات فِي البَحْر كَالأعْلَام)، (مُنْشَئَات) بە سەر (فتحة)ی شینەکە، ناوی بەرکارە، واتە: پەیداکراوو دروستکراوەکان، کەشتییە

www.alibapir.com


دروستکراوەکان، کە خەڵک دروستیان دەکەن {بەڵام هەر هی خوان، لەبەر ئەوەی هەم مرۆڤەکان کە دروستیان کردوون و، هەم کەرەستەی کەشتییەکانیش هەمووی هی خوایە}. (**مُنْشِئَات**)یش خوێندراوەتەوە کە لە (**أَنْشَأَ السَّيْرَ: أَسْرَعَ**) واتە: بەخێرایی ڕۆیشت، واتە: ئەو کەشتییانەی خەڵک بە خێرایی پێیان دەڕوات.

(كَالْأَعْلَامِ): (**جَمْعُ عَلَمْ وَهُوَ الجَبَل**)، (**أَعْلَام**) کۆی (**عَلَم**)ەو بە مانای چیا دێ، لەبەر ئەوەی چیا لە دوور ڕا دیارە، وەک ئاڵایەک، (**عَلَم**) (ئاڵا)ش واپێدەچێ هەر لەوەوە هاتبێ لە ناوی چیاوە.

(فَانٍ): (**فَان: إِسْمُ الفَاعِل لِزَمَانِ الإِسْتِقْبَال: أي صَائِرٌ إلى الفَنَاء**)، ﴿ كُلُّ مَنْ عَلَيْهَا فَانٍ ﴾، (**فَنَى، يَفْنِي، فَهُوَ فَانٍ**)، واتە: لە بەین چوو، لە بەین دەچێ، ئەو لە بەین چوویە، واتە: هەرچی لەسەر زەوییە، لە خاوەن عەقڵ و هۆشان، کە مرۆڤ و جند دەگرێتەوە، هەموویان فەوتاون، لێرەدا (**فَانٍ**) ناوی بکەرە، بەڵام بۆ کاتی داهاتوو بەکارهێنراوە، واتە: لە داهاتوودا دەفەوتێن و هیچیان نامێنن.

(وَجْهُ): ﴿ وَيَبْقَى وَجْهُ رَبِّكَ ﴾، (**وَجْهُ: ذَات، صِفَةٌ لله تَعَالَى، الجَارِحَةُ ثُمَّ اسْتُعْمِلَ فِي مُسْتَقْبِلِ كُلِّ شَيءٍ وَأَشْرَفِه وَمَبْدَئِه: يُقَالُ وَجْهُ النَّهَار**)، وشەی (**وَجْهُ**) وەک دواییش باسی دەکەین، زانایان بە مانای (زاتی خوا)یان لێکداوەتەوە، ﴿ وَيَبْقَى وَجْهُ رَبِّكَ ﴾، واتە: زاتی پەروەردگارت دەمێنێتەوە، هەندێکیش گوتوویانە: (**وَجْهُ**) سیفەتێکی خوای بەرزە، سیفەتەکانی خواش وەک خوان، وەک چۆن خوا زاتەکەی نازانین چۆنە، بەهەمان شێوە سیفەتەکەشی نازانین چۆنە، (**لَيْسَ كَمِثْلِه شَيء: أي ذَاتَاً وَصِفَةً**)، خوا هەم زاتی، هەم سیفەتەکانی، شتێک وەک زاتی خواو وەک سیفەتی خوا نیە، وشەی (**وَجْهُ**) لە ئەسڵدا بە مانای ئەندامە، ئەو ئەندامەی دەزانین، بۆ وێنە: ڕووی مرۆڤ، دوایی بەکارهێنراوە بۆ پێشوازییکەری هەر شتێک، بەڕێزترین و سەرەتای هەر شتێک، دەگوترێ: (**وَجْهُ المَسْأَلَة**) واتە: ئەو پرسە ڕووە ڕاستەکەی بەو شێوەیە، هەروەها دەگوترێ: (**لَا أَرَى لِهَذِهِ القَضِيَّةِ وَجْهَاً**)،

www.alibapir.com



ئـەم بابەتـە هیـچ ڕووێکـی نابینـم، واتـە: نابینـم ڕوویەکـی ڕاسـت و چاکـی هەبـێ، یـان دەگوتـرێ: (وَجْـهُ النَّهَـار) واتـە: سـەرەتای ڕۆژ کـە دەردەکـەوێ.

(ٱلۡجَلَٰلِ): (الجَـلاَلُ: العَظَمَـةُ، وَالجَلاَلَـةُ: عِظَـمُ القَـدْرِ، وَالجَـلاَلُ بَغَـيْرِ الهَـاء: التَّنَاهِـي فِي ذَلِـكَ: وَالجَلِيْـلُ: العَظِيْـمُ القَـدْرِ)، (جَـلاَل): بـە مانـای مەزنیـی دێ، (وَالجَلاَلَـةُ: عِظَـمُ القَـدْرِ) واتـە: مەزنیـی ئەنـدازە، یـان مەزنیـی ڕێـزو پێگـە، بـە نسـبەت خـوای پـەروەردگارەوە، وشـەی (جَـلاَل) بەبـێ (ة) واتـە: ئەوپـەڕی مەزنیـی و پایـە بەرزیـی، هەروەهـا (الجَلِيْـلُ: العَظِيْـمُ القَـدْرِ) واتـە: زۆر پایـە بـەرز و پایـە مـەزن، وەک بـۆ خـوا شایسـتەیە.

(وَٱلۡإِكۡرَامِ): (المُنْعِـمُ عَلَـى عِبَـادِهِ) (إِكْـرَام) بـە مانـای ڕێزلێگرتـن دێ، بـەڵام لێـرەدا یـانی: چاکـەکار لەگـەڵ بەنـدەکانی دا، (الإِكْـرَامُ وَالتَّكْرِيْـمُ: أَنْ يُوصَـل إِلى الإِنْسَـان إِكْرام أَي: نَفْـعٌ لَا يَلْحَقُـهُ فِيْـهِ غَضَاضَـةٌ)، وشـەی (إِكْـرَامُ وتَكْرِيْـم): ئەوەیـە کـە ڕێزگرتنێـک بگاتـە مـرۆڤ، سـوودێک کـە هیـچ کەمیـی تێدانەبـێ، کەواتـە: ﴿ذُو ٱلۡجَلَٰلِ وَٱلۡإِكۡرَامِ﴾، واتـە: خـاوەنی شـکۆو پایەبەرزیـی و خـاوەنی میهرەبانیـی و چاکەکاریـی و بەخشـین.

(كُلَّ يَوۡمٍ هُوَ فِي شَأۡنٖ): وشـەی (يَـوْم) بـە مانـا باوەکـەی کـە ئێمـە بـەکاری دێنیـن، بەکارنایـەت، (يَـوْم) بـە مانـای شـەو ڕۆژێـک، واتـە: بیسـت و چـوار سـەعات، لێـرەدا (يَوْم) بە مانای موتڵەقی کات دێ، واتە: لە هەموو کاتاندا خوا بسم الله الرحمن الرحيم لە کاردایە، (الشَّـأْنُ: الـشَّيءُ العَظِيْـم، وَالحَـدَثُ لـهَامّ مِـنْ مَخْلُوقَـاتٍ وَأَعْـمَالٍ مِـنَ السَّـمَاوَاتِ وَالأَرْض)، واتە: خوا بسم الله الرحمن الرحيم هەمیشەو بەردەوام کار دەکات و لە دروستکراوەکان دەهێنێتە دی و، لـە کـردەوەکان ئەنجـام دەدات لـە ئاسـمانەکان و زەویـدا.

www.alibapir.com


## مانای گشتیی ئایەتەکان

خـوا ﷽ دەفەرمـوێ: (بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ ) بـە نـاوی خوای بە بەزەیی بەخشـــندە، واتـــە:

دەستپێکردنم بە ناوی خوایە، ئەویش مەبەستی ئەوەیە:

**١** - ئەم کارە تەنها بۆ خوا دەکەم.

**٢** - ئەم کارە بە پێی شەرعی خوا دەکەم.

**٣** - ئەم کارە بە تواناو یارمەتیی خوای پەروەردگار دەکەم.

**٤** - ئەم کارە بۆ هێنانەدی ڕەزامەندیی خوا ئەنجام دەدەم.

﴿ ٱلرَّحۡمَٰنُ ﴾، واتـە: بـە بەزەیـی، ئنجـا بـە بەزەیـی (**الرحمن**): یـان نیهـاد (**مُبْتَـدَأ**)و گـوزارە (**خَبَر**)ەکـەی دوایـی دێ، یاخـود گـوزارە (**خبر**)یـەو، نیهـاد (**مُبْتَدَأ**)ەکـەی پێشـتر هاتـوە، واتـە: (**هـو الرَّحْمَـن**) یـان (**أللـه الرَّحْمَـن**) ئـەو بـە بەزەییـە، یـان: خوا بـە بەزەییە.

﴿ عَلَّمَ ٱلۡقُرۡءَانَ ﴾، قورئـانی فێرکـردوە، بـەڵام کێـی فێـری قورئـان کـردوە؟ وشـەی (**عَلَّـمَ**)، دوو بـەرکاران دەخـوازێ و (**القُـرْآن**) بـەرکاری دووەمـە، واتـە: (**علَّـم النَّبِـيَّ القُـرْآن**) پێغەمبـەری فێـری قورئـان کـردوە، یاخـود: (**علَّـم الإنسـانَ القُـرْآن**) یـان (**علَّـم النـاسَ القُـرْآن**) یـان (**علَّـم الإنـس والجـنَّ القُـرْآن**)، مرۆڤـی فێـری قورئـان کـردوون، مرۆڤـەکانی فێـری قورئـان کـردوون، مـرۆڤ و جنـدی فێـری قورئـان کـردوون، هەموویـان دەگرێتـەوە.

﴿ خَلَقَ ٱلۡإِنسَٰنَ ﴾، مرۆڤـی هێناوەتـە دی، ئەمانـە هەموویـان نیعمـەتی خـوای پـەروەردگارن، بۆیـەش خوا ﷽ لێکی دابڕیون و، بـە (**و**)ی بادانەوە (**عاطفة**) نەیگێڕاونـەوە سـەر یەکـدی، چونکـە هـەر کامێکیـان چاکەیەکـی سـەربەخۆیە.

www.alibapir.com


﴿ عَلَّمَهُ ٱلْبَيَانَ ﴾، ڕوونکردنـەوەی فێـر کـردوە، یـانی: مرۆڤـی فێـر کـردوە چـۆن مەبەسـتەکانی خـۆی ڕوون بکاتـەوە؟ ئـەوەی لـە دەروونیدایـە دەری ببـڕێ، چ بـە قسـە، چ بـە نووسـین، چ بـە ئامـاژە.

﴿ ٱلشَّمْسُ وَٱلْقَمَرُ بِحُسْبَانٍ ﴾، خـۆرو مانـگ بـە ژمێـرەن، یـانی: بـە وردەکاریـی و ڕێـک و پێکیـی و بـە ئەنـدازە، دروسـتکراون.

﴿ وَٱلنَّجْمُ وَٱلشَّجَرُ يَسْجُدَانِ ﴾، ڕووەک و درەختیـش کڕنـووش دەبـەن، (**نَجْم**) وێڕای ڕووەک (**نبـات**) دەگونجـێ بـە مانـای ئەسـتێرەش بـێ، وەک لـە زمـانی عەڕەبییـدا هـەردوو واتایەکـەی هـەن، بـەڵام لێـرەدا بەپێـی ڕەوت (**سـیاق**)ەکە کـە لەگـەڵ (**شجر**)دا هاتـوە، ئـەوەش لەگـەڵ درەختـدا کـە بـەرز هەڵدەچـێ، گونجـاوە باسـبکرێ بریتیـە: لـەو ڕووەک و گژوگیایـەی بـەرز نابێتـەوەو قـەدو لـق و پۆپـی نیـە، بەڵکـو لـە زەویـدا پـان دەبێتـەوە.

﴿ وَٱلسَّمَآءَ رَفَعَهَا وَوَضَعَ ٱلْمِيزَانَ ﴾، ئاسـمانی بەرزکردۆتـەوە، واتـە: گـەردوونی زۆر بـە بەرزیـی خوڵقانـدوە، دوایـی ئێمـە هـەم لـە بـارەی ئەندازەگیرییـەکانی کـە لـە خـۆرو زەوی و مانگـدا ڕەچـاو کـراون، هـەم لـە بـارەی بـەرز کرانـەوەی ئاسـمانەوە، ئـەوەی تاکـو ئێسـتا زانایـان پێنگەیشـتوون، لـەو بـارەوە کورتـە باسـێک دەخەینـە ڕوو.

ئاسـمانی بەرزکردۆتـەوە (وَٱلسَّمَآءَ رَفَعَهَا)، واتـە: بـە بەرزیـی خوڵقاندوویـەتی، نـەک پێشـێ نـزم بووبـێ و دوایـی بـەرزی کردبێتـەوە، زیاتـر واپێدەچـێ بـە مانـای: {بەبەرزیـی دروسـتی کردوە}بـێ، دەشـگونجێ ئـەو واتایـەش بگرێتـەوە: {وردە وردە بـەرزی کردۆتـەوە} کـە ئەمـە لەگـەڵ ئـەو بیـردۆزە زانسـتییەش دا، گونجـاوە کـە دەڵـێ: گـەردوون لێـک دەکشـێ، وەک لـە سـووڕەتی (**الذاریـات**)دا باسـمانکرد: ﴿ وَٱلسَّمَآءَ بَنَيْنَٰهَا بِأَيْيْدٍ وَإِنَّا لَمُوسِعُونَ ﴿٤٧﴾ ﴾، واتـە: ئاسـمانمان بەهێـز دروسـتکردوەو ئێمـە فراوانکەرینـی.

﴿ وَوَضَعَ ٱلْمِيزَانَ ﴾، تەرازووشی داناوە.

www.alibapir.com


تـەرازوو (**میـزان**)، هـەم بـە مانـای ئـەو ئامێـرە دێ کـە شـتی پـێ هەڵدەسـەنگێنن، جـاری واش هەیـە (**میـزان**) بـە مانـای مەجازییەکـەی دێ، یاخـود هـەر مانـا ڕاستەقینەکەشـی ئەوەیـەو، وەک چـۆن تـەرازوو (**میـزان**) بـە مانـای ئـەو ئامێـرە بەکارهێـنراوە، بـۆ هاوسـەنگیی و دادگەریـی و ڕێـک و پێکییـش بەکارهێـنراوە، ئـەو شـتە بـە تەرازوویـە، واتـە: ڕێـک و پێـک و هاوسـەنگە.

﴿ أَلَّا تَطْغَوْاْ فِى ٱلْمِيزَانِ ﴾، فەرمـانی پێکـردوون: سەرکێشـیی مەکـەن، لـە تـەرازوودا، وەک دوایـی باسـی دەکەیـن، واپێدەچـێ لێـرەدا (**میـزان**) مەبەسـت پێـی تـەرازووی شـەریعەت بـێ.

﴿ وَأَقِيمُواْ ٱلْوَزْنَ بِٱلْقِسْطِ ﴾، کێـش (کێشـان) بـە دادگەرانـە بەرپـا بکـەن، ﴿ وَلَا تُخْسِرُواْ ٱلْمِيزَانَ ﴾، ئـەو تـەرازووەی شـتی پـێ هەڵدەسـەنگێنن، کەمـی مەکـەن، واتـە: تـا تـەرازووی شـت پـێ کێشـانی بەرانبەرەکانتـان، کـەم مەکـەن.

﴿ وَٱلْأَرْضَ وَضَعَهَا لِلْأَنَامِ ﴾، خـوا زەویـشی دانـاوە بـۆ دروسـتکراوەکان، هەمـوو ئەوانـەی لەسـەر زەوی دەژیـن، لـە مـرۆڤ و جنـد، زەوی چـی تێدایـە؟

﴿ فِيهَا فَٰكِهَةٌ وَٱلنَّخْلُ ذَاتُ ٱلْأَكْمَامِ ﴾، میـوەی تێدایـە {هەمـوو جـۆرەکانی میـوە}و، دارخورمـای خـاوەن کیفـەکانی تێدایـە، ئـەو کیفانـەی دوایـی هێشـووەکانیان لـێ دێنـە دەرێ، بۆیـە بـاسی میـوە (**فاکهـة**)ی کـردوە بـە تـاک واتـە: هەمـوو جـۆرەکانی میـوە، بـۆ خورمـاش نـەک بـاسی (**تمـر**) بـکات، بەڵکـو بـاسی دارخورمـای کـردوە، چونکـە ئـەوە زۆر سەرسـوڕهێنەرە، ئـەو دارخورمایـە کـە هێنـدە بـەرز هەڵدەچـێ و، ئـەو هێشـووە گەورانـەی پێـوەن و، ئـەو هێشـوانەش لـە توورەکـەو کیفانـدان، دوایـی توورەکـەو کیفـەکان دەدڕێـن و هێشـووەکانیان لـێ دێنـە دەرێ!

﴿ وَٱلْحَبُّ ذُو ٱلْعَصْفِ وَٱلرَّيْحَانُ ﴾، هەروەهـا دانەوێڵـەی خـاوەن پـووش و گیـاو، ڕیحانـە (**الرَّیْحَـان**) واتـە: گژوگیـا بۆنخۆشـەکان، یـان ڕیحانـە کـە گیایەکـی بۆنخۆشـیی تایبەتـە، ئـەوەش هـەر لـە زەویـدا هـەن، ﴿ فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ ﴾، ئنجـا ئایـا

www.alibapir.com


ئێوە بە کام لە چاکەکانی پەروەردگارتان بێبڕوان، ئەی مرۆڤ و جند؟ یاخود ئایا نکووڵیی لە کام لە چاکەکانی پەروەردگارتان دەکەن؟

﴿ خَلَقَ ٱلْإِنسَٰنَ مِن صَلْصَٰلٍ كَٱلْفَخَّارِ ﴾، مرۆڤی دروستکردوە لە قوڕێکی وشک بووەوەی، وەک سواڵەت و خەزەف، بەدڵنیایی مەبەست لە مرۆڤ (إنسان) لێرەدا ئادەمە.

﴿ وَخَلَقَ ٱلْجَآنَّ مِن مَّارِجٍ مِّن نَّارٍ ﴾، هەروەها جانییشی لە بڵێسەی ئاگر، یاخود لە ئاگرێکی تێکەڵ دروستکردوە، ﴿ فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ ﴾، ئنجا ئایا نکووڵیی لە کام لە چاکەکانی پەروەردگارتان دەکەن، ئەی مرۆڤ و جند؟!

﴿ رَبُّ ٱلْمَشْرِقَيْنِ وَرَبُّ ٱلْمَغْرِبَيْنِ ﴾، پەروەردگاری هەردوو ڕۆژهەڵاتەکان و هەردوو ڕۆژئاوایەکانە، واتە: هەردوو ڕۆژهەڵاتەکانی هاوین و زستان، کە لە چاوی ئێمەدا خۆر لە زستاندا جیایە لە هی هاوین، هەروەها: ﴿ وَرَبُّ ٱلْمَغْرِبَيْنِ ﴾، پەروەردگاری هەردوو ڕۆژئاوایەکان، دیسان هی هاوین و زستان، ﴿ فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ ﴾، ئنجا ئایا نکووڵیی لە کام لە چاکەکانی پەروەردگارتان دەکەن، ئەی مرۆڤ و جند؟!

﴿ مَرَجَ ٱلْبَحْرَيْنِ يَلْتَقِيَانِ ﴾، دوو دەریایەکانی تێکەڵکردوون، یان بەرهەڵدای لای یەکی کردوون، پێک دەگەن، ﴿ بَيْنَهُمَا بَرْزَخٌ لَّا يَبْغِيَانِ ﴾، بەڵام پەردەیەکیان لە نێواندا هەیە، کە سنوور شکێنیی ناکەن، واتە: هیچ کامیان بەسەر ئەویدیکەدا زاڵ نابێ، نە ئاوی سوێر بەسەر هی شیرین دا زاڵ دەبێ، کە ئێمە ئاوی شیرینمان نەمێنێ، چونکە ئاوی شیرین زۆر کەمترە لە هی سوێر، نە ئاوی شیرینیش هێندە زۆرە کە بەسەر ئاوی سوێردا زاڵ بێ، چونکە هەر کامێکیان ئەرکی خۆی هەیە، ﴿ فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ ﴾، ئنجا ئایا نکووڵیی لە کام لە چاکەکانی پەروەردگارتان دەکەن، ئەی مرۆڤ و جند؟!

﴿ يَخْرُجُ مِنْهُمَا ٱللُّؤْلُؤُ وَٱلْمَرْجَانُ ﴾، لەو دوو ئاوە، لەو دوو دەریایە {ئاوی سوێرو شیرین} گەوهەرو مرواریيان لێ دێتە دەرێ {لەو بارەشەوە دوایی کورتە باسێک

www.alibapir.com


دەكەیــن} ﴿ فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ ﴾، ئنجـا ئایـا نكوولّیـی لـە كام لـە چاكـەكانی پەروەردگارتـان دەكـەن، ئـەی مـرۆڤ و جنـد؟!

﴿ وَلَهُ ٱلْجَوَارِ ٱلْمُنشَـَٔاتُ فِى ٱلْبَحْرِ كَٱلْأَعْلَٰمِ ﴾، هەروەهـا بـەس هـی خـوان، كەشـتییە ڕۆیشـتووە دروسـتكراوەكان لـە دەریـادا، كـە وەک چیایانــن، بـەس هـی خـوان ﴿ ٱلْمُنشَـَٔاتُ ﴾، خوێنراوەتـەوە، واتـە: دروسـتكراوەكان (**المصنوعـات**)، هەروەهـا (**المنشِـئات**)یش خوێنراوەتـەوە، واتـە: (**المُسْرِعـات**) یـانی: ئەوانـەی مرۆڤـەكان بـە خێرایـی پێیـان دەڕۆن، (**جوار**)یـش سـیفەتی وەسـفكراوێكی قرتێـنراوە، واتـە: (**ولـە السـفن الجـوار**)، كەشـتییە ڕۆیشـتووەكان كـە بـە دەریـادا دەڕۆن و دوایـی مرۆڤـەكان دروسـتیان دەكـەن، ئەوانیـش هـەر هـی خـوان، یاخـود زۆر بـە خێرایـی دەڕۆن لـە دەریـادا، وەک چیایانـن، ئەوانیش هـەر هـی خـوان، ﴿ فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ ﴾، ئنجـا ئایـا نكوولّیـی لـە كام لـە چاكـەكانی پەروەردگارتـان دەكـەن، ئـەی مـرۆڤ و جنـد؟!

﴿ كُلُّ مَنْ عَلَيْهَا فَانٍ ﴾، هەرچـی و، هــەر كەسـێک كـە لەسـەریەتی واتـە: لەسـەر زەوییـە لـە نێـو چوویـە، مردوویـە.

﴿ وَيَبْقَىٰ وَجْهُ رَبِّكَ ذُو ٱلْجَلَٰلِ وَٱلْإِكْرَامِ ﴾، تەنیـا ڕووی پـەروەردگاری خـاوەن پێگـەی بـەرزو خـاوەن ڕێـزو چاكـەو بەخششـت، دەمێنێتـەوە، ﴿ فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ ﴾، ئنجـا ئایـا نكوولّیـی لـە كام لـە چاكـەكانی پەروەردگارتـان دەكـەن، ئـەی مـرۆڤ و جنـد؟!

﴿ يَسْـَٔلُهُۥ مَن فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ﴾، هـەر كـەس كـە لـە ئاسـمانەكان و زەویـدا هەیـە (لـە فریشـتەو جنـدو مـرۆڤ) داوای لـێ دەكـەن (بـە زمـانی حـاڵ، یـان بـە زمـانی وتـار).

﴿ كُلَّ يَوْمٍ هُوَ فِى شَأْنٍ ﴾، لـە هەمـوو كاتانـدا، ئـەو لـە كاردایـە (و، سەرپەرشـتیی دروسـتكراوەكانی خـۆی دەكات) ﴿ فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ ﴾، ئنجـا ئایـا نكوولّیـی لـە كام لـە چاكـەكانی پەروەردگارتـان دەكـەن، ئـەی مـرۆڤ و جنـد؟!

ئێمـەش دەڵێیـن: (**لَا نُكَـذِّبُ بِـأَيِ مِـنْ آلَاءِكَ يَـا رَبَّنَـا وَلَـكَ الحَمْـدُ**)، ئێمـە نكوولّیـی لـە هیـچ كام لـە چاكـەكانی تـۆ ناكەیـن، پەروەردگارمـان! سـتاییش و شـوكرانەش هـەر بـۆ تـۆ.

www.alibapir.com


مەسەلە گرنگەکان

## مەسەلەی یەکەم:

**ناساندنی خوای بەرزی مەزن بە سەرچاوەی بەزەیی و، خستنە ڕووی چواردە لە چاکەو بەخششەکانی لە ژیانی مرۆڤ و جندا، وەک فێرکردنی قورئان و، هێنانە دی مرۆڤ و، ڕوونکردنەوەی مەبەستی خۆی فێرکردنی و، بە ئەندازەگیریی دروستکردنی خۆرو مانگ و ... هتد، لە کۆتایی دا ڕوو کردنە مرۆڤ و جند بەسەر زەنشتەوەو پرسیارکردن: ئایا نکوولیی لە کام لە چاکەکانی خوا دەکەن؟!:**

خوا دەفەرموێ: ﴿ٱلرَّحْمَٰنُ ﴿١﴾ عَلَّمَ ٱلْقُرْءَانَ ﴿٢﴾ خَلَقَ ٱلْإِنسَٰنَ ﴿٣﴾ عَلَّمَهُ ٱلْبَيَانَ ﴿٤﴾ ٱلشَّمْسُ وَٱلْقَمَرُ بِحُسْبَانٍ ﴿٥﴾ وَٱلنَّجْمُ وَٱلشَّجَرُ يَسْجُدَانِ ﴿٦﴾ وَٱلسَّمَآءَ رَفَعَهَا وَوَضَعَ ٱلْمِيزَانَ ﴿٧﴾ أَلَّا تَطْغَوْا۟ فِى ٱلْمِيزَانِ ﴿٨﴾ وَأَقِيمُوا۟ ٱلْوَزْنَ بِٱلْقِسْطِ وَلَا تُخْسِرُوا۟ ٱلْمِيزَانَ ﴿٩﴾ وَٱلْأَرْضَ وَضَعَهَا لِلْأَنَامِ ﴿١٠﴾ فِيهَا فَٰكِهَةٌ وَٱلنَّخْلُ ذَاتُ ٱلْأَكْمَامِ ﴿١١﴾ وَٱلْحَبُّ ذُو ٱلْعَصْفِ وَٱلرَّيْحَانُ ﴿١٢﴾ فَبِأَىِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ ﴿١٣﴾﴾.

## شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە حەڤدە بڕگەدا:

**١)-** ﴿ٱلرَّحْمَٰنُ﴾، بە بەزەیی، ئەمە لەلای زۆربەی هەر زۆری ژمێرەرانی ئایەتەکانی قورئان، ئەم وشەیە بە تەنیا ئایەتێکی سەربەخۆیە، کە وەک پێشر گوتمان: یان گوزارەی نیهادێکی قرتێنراوە: (**خَبَرٌ مُبْتَدَأٍ مَحْذُوف**) وەک (**ألله الرَّحْمَن**)، یاخود (**هو الرَّحْمَن**)، یان بە پێچەوانەوە: نیهادێکە گوزارەکەی قرتێنراوەو، بە پێی ئەوە کە مەقام دەیخوازێ، بۆی دادەنرێ، بۆ وێنە: (**الرَّحْمَن**)، دەبێتە نیهاد (**مُبْتَدَأ**)ە، ئنجا ئەوانی دوایی دێن، ﴿عَلَّمَ ٱلْقُرْءَانَ ﴿٢﴾ خَلَقَ ٱلْإِنسَٰنَ ﴿٣﴾﴾، هەموویان دەبن بە گوزارە (**خَبَر**)ی، (**الرَّحْمَن**)یش یەکێکە لە دوو ناوە زۆر ناودارەکەی خوا بسم الله الرحمن الرحيم و، زۆر

www.alibapir.com



لە زانایان دەڵێن: خوا دوو ناوی عەلەمی هەن: یەکەم: (أَللّه)، دووەم: (الرَّحْمَن)، وەک لە سوورەتی (الإسراء)دا، دەفەرموێ: ﴿قُلِ ٱدۡعُواْ ٱللَّهَ أَوِ ٱدۡعُواْ ٱلرَّحۡمَٰنَۖ أَيّٗا مَّا تَدۡعُواْ فَلَهُ ٱلۡأَسۡمَآءُ ٱلۡحُسۡنَىٰۚ وَلَا تَجۡهَرۡ بِصَلَاتِكَ وَلَا تُخَافِتۡ بِهَا وَٱبۡتَغِ بَيۡنَ ذَٰلِكَ سَبِيلٗا ١١٠﴾، بڵێ: لە (أَللّه) بپاڕێنەوە، یان لە (الرَّحْمَن)، [واتە: بڵێن: (يَا أَللّه) یان بڵێن: (يَا رَحْمَان)] هەر کامێکیان بڵێن، خوا ناوە هەرە چاکەکانی هەن.

هەروەها لە سوورەتی (الفرقان)دا دەفەرموێ: ﴿وَإِذَا قِيلَ لَهُمُ ٱسۡجُدُواْۤ لِلرَّحۡمَٰنِ قَالُواْ وَمَا ٱلرَّحۡمَٰنُ أَنَسۡجُدُ لِمَا تَأۡمُرُنَا وَزَادَهُمۡ نُفُورٗا ٦٠﴾، واتە: ئەگەر پێیان بگوترێ: کڕنووش بەرن بۆ (الرَّحْمَن) دەڵێن: (رَحْمَن) چییە؟ ئایا کڕنووش بەرین بۆ ئەوەی تۆ فەرمانمان پێدەکەی، هەر زیاتریش دەیانسڵەمێنێتەوە.

هەروەها لە سوورەتی (الفرقان)دا، خوا ﷻ بەندەکانی پاڵداوەتە لای خۆی: ﴿وَعِبَادُ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلَّذِينَ يَمۡشُونَ عَلَى ٱلۡأَرۡضِ هَوۡنٗا وَإِذَا خَاطَبَهُمُ ٱلۡجَٰهِلُونَ قَالُواْ سَلَٰمٗا ٦٣﴾.

وشەی (الرَّحْمَن) لە قورئاندا زۆر دووبارە بۆتەوە، هەڵبەتە کەمتر لە وشەی (أَللّه)، بەڵام بە ڕێژەیەکی زۆر دووبارە بۆتەوەو لە هەموو (بِسْمِ اللّه)یەکدا (الرَّحْمَن الرَّحِيْم)ی تێدان، بەڵام (الرَّحْمَن) بەجیاش هاتوە.

لێرەدا خوا سەرەتا ناوی خۆی دێنێ، وەک لە تایبەتمەندییەکانی ئەم سوورەتەدا، گوتمان ئەمە تاکە سوورەتێکە کە بە یەکێک لە ناوەکانی خوا دەست پێدەکات کە بریتیە: لە ناوی (الرَّحْمَن)، دوایی خوا ﷻ هەواڵ دەدا لە بارەی ئەو (الرَّحْمَن)ەوە، ئەو خاوەن بەزەیی بێ سنوورەوە، بە چوار سیفەت کە با نادرێنەوە سەریەک: ﴿ٱلرَّحۡمَٰنُ ١ عَلَّمَ ٱلۡقُرۡءَانَ ٢ خَلَقَ ٱلۡإِنسَٰنَ ٣ عَلَّمَهُ ٱلۡبَيَانَ ٤ ٱلشَّمۡسُ وَٱلۡقَمَرُ بِحُسۡبَانٖ ٥﴾، دواییش چواری دیکە بە پیتی بادانەوە (حَرف العَطف) بادەداتەوە سەریەک: ﴿ٱلشَّمۡسُ وَٱلۡقَمَرُ بِحُسۡبَانٖ ٥ وَٱلنَّجۡمُ وَٱلشَّجَرُ يَسۡجُدَانِ ٦ وَٱلسَّمَآءَ رَفَعَهَا وَوَضَعَ ٱلۡمِيزَانَ ٧ أَلَّا تَطۡغَوۡاْ فِي ٱلۡمِيزَانِ ٨﴾، ئەو چوار سیفەتەش بەواوی بادانەوە (واو العطف) دەگێردرێنەوە سەر یەک، کە

www.alibapir.com



دوایـی حیكمەتەكـەی دەخەینـە ڕوو، ئنجـا یەكەمیـن سـیفەت كـە خـوا لـە بـارەی (الرَّحْمَـن)ەوە هەواڵـی پـێ دەدات، ئەوەیـە كـە دەفەرمـوێ:

٢)- ﴿عَلَّمَ ٱلْقُرْءَانَ﴾، قورئانی فێر كردوە، گومان لەوەدانیە كە كرداری (عَلَّم)، لەو كردارانەیە دوو بەركار (**مفعول به**)ان دەخوازێ و، (**القُرْآن**) بەركاری دووەمەو هی یەكەمیان قرتێنراوە، واتە: (**عَلَّم الرَّسُولَ القُرْآن**)، یاخود: (**عَلَّم الإنْسَانَ القُرْآن**)، یان: (**عَلَّم الإنْسَ وَالجِنَّ القُرْآن**)، پێغەمبەری ﷺ فێری قورئان كردوە، مرۆڤی فێری قورئان كردوە، جندو مرۆڤی فێری قورئان كردوون، هەندێكیش گوتوویانە: (**القُرْآن**) بەركاری یەكەمەو بەركاری دووەم قرتێنراوە، (**فخرالدين الرازي**) ڕایەكی وای هەیە، بەڵام بەدڵنیایی ئەو ڕایە ڕاستترە كە (**القُرْآن**) دەبێتە بەركاری دووەم.

ئنجا لێرەدا كە خوا ﷻ فێركردنی قورئانی لە دوای ناوهێنانی خۆی بە (**الرَّحْمَن**) واتـە: خـاوەن ئەوپـەڕی بەزەیـی و، بەخشـین و، كـەرەم، باسـكردوە، مانـای وایـە، فێربـوونی قورئـان و شـارەزا بـوون لـە قورئـان، سـەر ڕشـتەی چاكـەو نیعمەتـەكانی خوای خاوەن بەزەییەو، لە هەموو نیعمەتەكانی دیكەی خوا ﷻ گەورەترە.

یەكێـك بـۆی هەیـە بڵـێ: ئـەدی ئیـمان؟ دەڵێیـن: ئیمانیـش هـەر بەهـۆی قورئانەوە پەیـدا دەبـێ، هـەروەك ئیسـلامیش بـە هـۆی قورئانـەوە پەیدادەبـێ، بێگومان لـە ڕووی ڕیزبەندیـی بوونیـی (**الترتيـب الوجودي**)یـەوە) دروسـتكرانی مـرۆڤ لـە پێـش فێربـوونی قورئانەوەیـە، بـەڵام لەبـەر ئـەوەی مـرۆڤ لەسـەر بوونەكـەی خـۆی قـەرزار دەبێتـەوە، ئەگـەر بڕوا بە قورئان نەهێنێ و شـوێن قورئـان نەكەوێ، بۆیە خوا ﷻ ئەوەی گرنگـترە پێشیخسـتوە، ئەگەرنـا بێگومـان ئەگـەر مـرۆڤ خۆی نەبـێ، چۆن شـوێن قورئان دەكـەوێ؟ لـە ڕووی ڕیزبەندیـی كاتییـەوە واتـە: ڕیزبەندیـی بوونییـەوە، دروسـتبوونی مـرۆڤ لـە پێشـەوەیە، بـەڵام لـە ڕووی ڕیزبەندیـی پلـەو پایـەو گرنگییـەوە، فێركـردنی قورئـان و فێربـوونی قورئـان لـە پێشـەوەیە، بۆیـە دوایـی دەفەرمـوێ:

٣)- ﴿خَلَقَ ٱلْإِنسَـٰنَ﴾، مرۆڤی هێناوەتە دی، ئەمەش زەمینە خۆشكەرە بۆ ئەو هەواڵەی دوایی دەفەرموێ: ﴿عَلَّمَهُ ٱلْبَيَانَ﴾، مرۆڤی دروست كردوەو ڕوونكردنەوەی مەبەستەكانی خۆی فێر كردوە، لە دروستكردنی مرۆڤدا دوو دەلالەت هەن:

www.alibapir.com


**یەکەم:** کە مرۆڤ هێندراوەتە دی، کەواتە: بەدیهێنەرێکی هەیە.

**دووەم:** وەدیهێنرانی مرۆڤ، گەورەترین چاکەی خوایە لەسەر مرۆڤ.

ئنجا دوای ئەوە دەفەرموێ:

٤)- ﴿عَلَّمَهُ ٱلۡبَيَانَ﴾ ڕوونکرنەوەی فێرکردوە، (البَیَان) لە ئەصڵدا بە مانای ڕوونکردنەوە دێ، (البَیَان: الکَشْفُ)، (البَیَان: الإعْرَابُ عَمَّا فِي الضَّمِيْر مِنَ الـمَقَاصِدِ وَالأغْرَاضِ، وَمِنْهُ النُّطْقُ وَالكِتَابَةُ وَالإشَارَةُ وَالحَرَكَات المُخْتَلِفَة الـمُؤَدِّيَة للغَرَضِ المَذْكُوْر)، (بَیَان): بریتیە لە خستنە ڕوو و، دەربڕینی ئەوەی لە دەروونندا هەیە، لە نیازو مەبەستەکان، لەو ڕوونکردنەوەیەش قسەکردن و، نووسینەو، ئاماژەکردنە و، هەموو ئەو جووڵە جۆراو جۆرانەن، کە ئەو مەبەستە دێننە دی، جاری وایە خەڵك ئەوەی لە وێنەیەکی کاریکاتێرییدا، یان لەوێنەیەکی لە هونەری تەشکیلییدا دەیخوێننەوە، یان لە نواندندا تێیدەگەن، لە هیچی دیکەدا تێیناگەن، کەواتە: هەموو ئەو شێوانەی مرۆڤ بەکاریان دێنێ بۆ دەربڕینی نیازو مەبەستەکانی نێو دڵی، وشەی (بَیَان) هەموویان دەگرێتەوە.

شایانی باسە: کە خوا بسم الله الرحمن الرحيم دەفەرموێ: ﴿خَلَقَ ٱلۡإِنسَٰنَ﴾، ئەوە کە خوا مرۆڤی هێناوەتە دی، بێگومان شتێکی ئاشکرایە بۆ هەموو خاوەن عەقڵێک، چونکە هەموو دروستکراوێک دەبێ دروستکەرێکی هەبێ، هەموو پەیداکراوێک دەبێ پەیداکەری هەبێ، بەڵام کە خوا دوای باسی خۆی، وەک سەرچاوەی هەموو بەزەیی و بەخششێک، باسی دروستکردنی ئینسان دەکات، بۆ ئەوەیە: ئەی مرۆڤ! لە بیرت نەچێتەوە کە تۆ وەدیهێنراو و پەیداکراوی خواو چاکە لەگەڵداکراوی خوای بسم الله الرحمن الرحيم.

ئنجا لێرە کە دەفەرموێ: ﴿عَلَّمَهُ ٱلۡبَيَانَ﴾، خوا ڕوونکردنەوەی فێری مرۆڤ کردوە، بێگومان خوا چاکەو نیعمەتی زۆرن لە ژیانی بەشەردا، بەڵام لێردا تەنیا (بَیان) واتە: ڕوونکردنەوەی نیازو مەبەستەکانی، باسکردوە، چونکە بە ڕاستیی

www.alibapir.com


مرۆڤ ئەگەر ئەو توانایەی نەبووایە، مەبەستەکانی نێو دڵی خۆی ڕوون بکاتەوە، ئەو کاتە ژیانی کۆمەڵایەتیی مرۆڤ دروست نەدەبوو، بەرەو پێش چوون و، شارستانیی نەدەهاتە ئاراوە، وەک چۆن ئاژەڵ و بەستەزمانەکان لە یەک دۆخدا دەمێننەوە، لەبەر ئەوەی توانای لێک حاڵیی بوونیان نیە، بەو شێوەیەی پێویستە، ئەگەرنا ئەوانیش بە جۆرێک لە جۆرەکان، هەندێک شتی سەرەتایی لە یەکدی تێ دەگەن، بولبول و چۆلەکەو پاساریی کە دەجریوێنن، دڕندەیەکی دیکە کە دەنگێکی لێ دێ، شێر کە دەنەڕێنێ، گوێدرێژ کە دەزەڕێنێ، مانگا کە دەبۆڕێنێ، مەڕو بزن کە دە باعێنن، هەموو ئەوانە بە جۆرێک لە جۆرەکان هەندێک شتی سەرەتایی لە یەک تێدەگەن، بەڵام بێگومان ئەوە زۆر جیایە لە دەربڕینی ئەو مەبەستە قووڵانەی مرۆڤ بەهۆی بەیانەوە، ئنجا چ دوان و قسەکردنە، چ نووسینە، چ ئاماژەیە، چ هەموو حاڵەتەکانی دیکەی دەربڕینە، پێی لێک تێدەگەن.

لە سەرەتای سووڕەتی (**النحل**)دا خوا ﷻ باسی ئەوە دەکات کە توانای بە مرۆڤ داوەو مرۆڤی هێناوەتە دی، کەچی دوایی مرۆڤ ئەو توانای دەربڕینەی بەکارهێناوە لە دژی خواو لە دژی هەق، وەک دەفەرموێ: ﴿ خَلَقَ ٱلْإِنسَٰنَ مِن نُّطْفَةٍ فَإِذَا هُوَ خَصِيمٌ مُّبِينٌ ﴿٤﴾ ﴾ **النحل**، واتە: مرۆڤی لە نوتفە هێناوەتە دی، کەچی ئەو بۆتە مشت و مڕ کەرێکی ڕوونکەرەوە (بۆ مەبەستی خۆی) یان: مشتومڕکەرێکی ڕوون و ئاشکرا، بەڵام مشت و مڕ کردنەکەی لە دژی هەقەو، لە دژی ئەو خوایەیە، کە هێناویەتە دی و، لە دژی پەیامی ئەو خوایەیە کە بۆی ناردوە، تاکو وەک چۆن چاکەی لەگەڵدا کردوەو هێناویەتە دی و، ئەو هەموو نیعمەتانەی پێداون، ئەو چاکە مەعنەوییەشی لەگەڵدا بکات کە بە شێوەیەک بژی شایستەی مرۆڤ بێت، شایستەی ئەو کەسە بێ، کە خوا کردوویەتی بە ڕێزلێگیراوی خۆی و، جێنشینی خۆی و، هەڵگری سپاردەی خۆی.

www.alibapir.com



٥)- ﴿ ٱلشَّمۡسُ وَٱلۡقَمَرُ بِحُسۡبَانٖ ﴾، خۆر و مانگیش بەژمێرە (و ئەندازەگیریی)ن، وەک پێشتر ئاماژەمان پێدا، ئەم چوارە خوا بسم الله الرحمن الرحيم هەر چواری بەبێ (و)ی گێڕانەوە (**واو العَاطِفَة**) خستوونە ڕوو:

**یەکەم:** (**عَلَّم القُرْآن**)، **دووەم:** (**خَلَقَ الإنْسَان**)، **سێیەم:** (**عَلَّمَهُ البَيَان**)، **چوارەم:** (**الشَّمْسُ وَالقَمَرُ بِحُسْبَانٍ**).

خۆرو مانگیش بە ژمێرە بە ئەندازەگیریی، واتە: بە ئەندازەگیریی خوای موتەعال دروستکراون، لەبەر ئەوەی هەر کامێکیان نیعمەتێکی سەربەخۆیەو، لەبەر زێدە گرنگیی پێدان و بایەخ پێدان، بۆیە خوا بسم الله الرحمن الرحيم هەر کامێکیانی سەربەخۆ باسکردوە، نەک بە (و) بیانگێڕێتەوە سەریەکدیی، وەک نیعمەتەکانی دیکە کە دوایی دێن، کە دەفەرموێ: ﴿ بِحُسۡبَانٖ ﴾، (**أي بِحُسْبَانِهِ: حُسْبَانُ الرَّحْمَن وَضَبْطُهُ، وَالحُسْبَانُ مَصْدَرُ حَسَبَ يَحْسُبُ حِسَاباً**)، (**حُسْبانْ**) چاوگە، چاوگی (**حَسَبَ يَحْسُبُ حِساباً**)یە، واتە: ژماردی، دەیژمێرێ، ژماردن، کە دەفەرموێ: ﴿ ٱلشَّمۡسُ وَٱلۡقَمَرُ بِحُسۡبَانٖ ﴾، (**أي كَائِنَان بِحُسْبَان**)، واتە: پەیداکراون بە ئەندازەگیریی خوا بسم الله الرحمن الرحيم، بەو وردەکارییەی خوا پێی هێناونە دی، (**حُسْبان**)یش کینایەیە لە ڕێک و پێکیی ڕۆیشتنیان، بە ڕێک و پێکییەکی بەردەوام، کە ژماردنی خەڵک بە جووڵەی مانگ و ڕۆژ، ناڕێکیی تێناکەوێ، هەروەها ئەوە کە ژوانگەکان و بەڵێنگەکان دادەنێن، بەپێی جووڵەی مانگ و خۆران ناڕێک نابێ، بیهێنە بەرچاوی خۆت: ئەگەر ڕۆژێک دوازدە سەعات باو، ڕۆژێکیان پازدە سەعات بووایە، بۆ وێنە: شەوێک شەش سەعات بووایەو، شەوێکێش شازدە سەعات بووایە، یان ڕۆژێک خۆر لەو کاتانەدا کە هەڵدێ، ڕۆژێک دوو سەعات پێشکەوتبایە، یان چوار سەعات دواکەوتبایە، یان هەر جووڵەی مانگ بە دەوری زەویدا، پێشکەوتن و دواکەوتنی تێدابایە، ئەو کاتە کەس نەیدەزانی چی دەکات و چۆن دەکات و ژوانگەکان و بەڵێنگەکان چۆن دادەنێ؟!

www.alibapir.com



ئێمـە دوایـی لـە کورتـە باسـێکدا بـاسی ئـەو ئەندازەگیرییانە دەکەیـن، کە بـۆ هەرکام لـە: خـۆر و زەوی و مانـگ، دانـدراون، هەروەهـا لـە ئایـەتی دواتـردا کـە دەفەرمـوێ: ﴿ وَٱلسَّمَآءَ رَفَعَهَا ﴾، ئاسـمانی بەرزکردۆتـەوە، یـان بە بەرزیی خولّقاندوویـەتی، تەرازووشی تێـدا دانـاوە، لـە کورتـە باسـێکدا ئامـاژە بـە بەرزکرانـەوەی ئاسـمانیش دەکەیـن.

٦)- ﴿ وَٱلنَّجْمُ وَٱلشَّجَرُ يَسْجُدَانِ ﴾، نەجم و درەختیش کڕنووش دەبەن، ئایا (نَّجْم) مەبەست پێی چییە؟

أ- دەگونجێ مەبەست پێی ئەستێرە بێ، (النَّجم: إسْمُ جَمْعٍ للنُّجُوم)، نەجم ناوی کۆیە بۆ ئەستێرەکان.

ب- یاخود ناوی ئەو ڕووەک و گژوگیایەبێ کە قەدی نیە بەرزبێتەوەو بە زەوییەوە دەنووسێ، ئنجا تەڕەکارو کاڵەک و شووتیی و ترۆزیی و خەیارو ..هتدە، یان گژوگیای دیکەیە، ئەوەی لاسک قەدی نیە بەرزبێتەوە، وەک جۆرەکانی دانەوێڵە، ئەوانە هەموویان وشەی (نجم)یان بۆ بەکاردێ، واتە: ئەو ڕووەکانەی بە زەویدا، پان دەبنەوە.

ج- دەشگونجێ (نجم) ناو بێ بۆ یەک ئەستێرەی تەنیا.

بەڵام بەپێی ئەوە کە خوا ﷻ (شجر)ی باسکردوە کە ئاشکرایە مەبەست پێی درەختـە، ئـەو درەختـەی یـان ئـەو ڕووەکـەی بـەرز دەبێتـەوەو قـەدو لـق و پۆپـی هەیـە، ئنجـا ئـەوەی لەگـەڵ درەختـدا گونجـاوە، بریتیـە لـەو ڕووەکـەی بـە زەویـدا پـان دەبێتـەوە، واتـە: ڕووەکـی بـەرز هەڵچـوو، وەک دارو درەختـەکان و، ڕووەکـی نیزیـک لـە زەوییـەوەو بـە زەوییـەوە پـان بـووەوەی خوڵقانـدوون و، هەردووکیـان کڕنـووش دەبـەن، واتـە: ملکەچـن بـۆ ئـەو سیسـتەمەی خـوا بـۆی دانـاون و، ملکەچـن بـۆ بـەو شـێوە بەڕێوەچوونـەی خـوا بـۆی دیاریـی کـردوون.

لـە بـارەی ئـەو کڕنـووش بردنـەی ڕووەکـی نـزم لـە زەوی، یـان پـان بـووەوەی بـە زەوی داو، دارو درەختـەوە، زانایـان گوتوویانـە:

www.alibapir.com


(السُّجُودُ: يُطْلَقُ عَلَى وَضْعِ الْوَجْهِ عَلَى الْأَرْضِ بِقَصْدِ التَّعْظِيمِ، وَيُطْلَقُ عَلَى الْوُقُوعُ عَلَى الْأَرْضِ مَجَازًا مُرْسَلًا بِعَلَاقَةِ الْإِطْلَاقِ، أَوِ اسْتِعَارَةً، وَمِنْهُ قَوْلُهُمْ: «نَخْلَةٌ سَاجِدَةٌ» إِذَا أَمَالَهَا حِمْلُهَا، فَسُجُودُ نُجُومِ السَّمَاءِ: نُزُولُهَا إِلَى جِهَاتِ غُرُوبِهَا، وَسُجُودُ نَجْمِ الْأَرْضِ: الْتِصَاقُهُ بِالتُّرَابِ كَالسَّاجِدِ، وَسُجُودُ الشَّجَرِ: تَطَأْطُؤُهُ بِهُبُوبِ الرِّيَاحِ وَدُنُوُّ أَغْصَانِهِ لِلجَانِينَ لِثِمَارِهِ وَالْخَابِطِينَ لِوَرَقِهِ، وَقَدْ شَبَّه تَعَالى (ارتسامَ ظِلِّه) عَلَى الْأَرْضِ بِالسُّجُودِ، كَمَا قَالَ تَعَالَى: ﴿وَلِلَّهِ يَسْجُدُ مَن فِي السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ طَوْعًا وَكَرْهًا وَظِلَالُهُم بِالْغُدُوِّ وَالْآصَالِ ﴿١٥﴾﴾ الرعد).

واتە: وشەی (سُجُودُ) بەکاردەهێنرێ بۆ ڕووخستنە سەر زەوی، بە مەبەستی بە مەزەنگرتنی خوا ﷻ و، بەکاردەهێنرێ بۆ کەوتنە سەر زەوی بە مەجازی مورسەل یاخود بە خواستنەوە، دەگوترێ: (نَخْلَةٌ سَاجِدَةٌ)، ئەگەر ئەو بارەی لێیەتی و، ئەو خورمایانەی هەڵیگرتوون، شۆڕی بکاتەوە: دارخورمایەکی کڕنووش بردو، کڕنووش بردنی ئەستێرەکانی ئاسمانیش ئەوەیە کە بەرەو شوێنی ئاوابوونیان دەکشێن و، کڕنووش بردنی ئەو ڕووەکەش کە بە زەوییەوە نووساوە، بریتیە لە بە زەوییەوە نووسانی و، کڕنووش بردنی درەختیش بریتیە لەوەی کاتێک با هەڵ دەکات و بەو لاو لادا دەینووشتێنێتەوە، لق و پۆپەکانی دەجووڵێن و شۆڕدەبنەوە، هەروەها لق و پۆپەکانی کە شۆڕدەبنەوە بۆ کەسانێک کە میوەکەی لێ دەچنن و، کەسانێک کە گەڵایەکەی لێ دەوەرێنن بۆ ئاژەڵەکانیان، خوا ﷻ سێبەری شتەکانی لەسەر زەوی، بە کڕنووش ناوهێناوە، وەک لە سوورەتی (الرعد)دا دەفەرموێ: ﴿وَلِلَّهِ يَسْجُدُ مَن فِي السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ طَوْعًا وَكَرْهًا وَظِلَالُهُم بِالْغُدُوِّ وَالْآصَالِ ﴿١٥﴾﴾، واتە: هەرچی لە ئاسمانەکان و زەویدا هەیە، بە پێخۆشبوون و پێناخۆش بوونەوە، کڕنووش بۆ خوا دەبەن، هەروەها سێبەرەکانیشیان لە بەیانیان و ئێواراندا.

سێبەری شتەکان کە بەیانیان کە خۆر لە خۆرهەڵاتەوە هەڵدێ و، سێبەرەکانیان لەلای ڕاستن،[١] دوایی کە خۆر بەرەو ئاوابوون دەچێ، سێبەرەکانیان دەکەونە لای چەپ، خوا ئەو جووڵەی سێبەری درەختانی، بە کڕنووش ناو هێناوە.

---

(١) ئەوە لە کاتێک دا مرۆڤ ڕووبە ڕووگە (قبلة) بوەستێ.

www.alibapir.com


ئنجا دێتە سەر باسی ئەو چوار شتانەی دیکە:

٧)- ﴿ وَٱلسَّمَآءَ رَفَعَهَا ﴾، خوا ئاسمانی بەرز کردۆتەوە، یاخود: (خَلَقَهَا مُرْتَفِعَةً)، خوا ئاسمانی بە بەرزیی دروستیکردوە، وەک کەسێک کە بە بابای بەرگدروو دەڵێ: قۆڵەکەیم بۆ فراوان بکە، واتە: کە دەیدرووی، با قۆڵەکەی فراوان بێ، نەک دوای ئەوەی درووت، ئنجا قۆڵەکەی فراوان بکەی، یان پێی دەڵێ: با دەلینگەکەی ئاوابێت، واتە: هەر لە کاتی دروونەکەیدا با بەو شێوەیە بێ، کەواتە: ﴿ وَٱلسَّمَآءَ رَفَعَهَا ﴾، واتە: خوا کە ئاسمانی دروستکردوە، بە بەرزیی دروستیکردوە، هەروەها ئەو واتایەش دەگرێتەوە: (رَفَعَهَا) واتە: وردە وردە خوا ئاسمانی بەرزکردەوەو بەرزی دەکاتەوە، بە ڕابردووی هێناویەتی، ئەمەش ئەو بیردۆزەیە پشتڕاست دەکاتەوە، کە دەڵێ: ئەم گەردوونەی ئێمە هەمووی لە تاکێکی گەردوونییەوە (سینگولاریتیی - Sungolarty) هاتوە، تەقیوەتەوەو، بەردەوام ئەو گەردوونە لێک دەکشێ، وەک خوا لە سوورەتی (الذاريات)یشدا ئاماژەی پێ دەکات: ﴿ وَٱلسَّمَآءَ بَنَيْنَٰهَا بِأَيْيْدٍ وَإِنَّا لَمُوسِعُونَ ﴿٤٧﴾ ﴾، واتە: ئاسمانمان {واتە: هەموو گەردوونمان ئەوەی کە بۆ ئێمە دیارە} بە هێز دروستکردوەو ئێمە لێک کێشەرەوەینی، فراوانکەرینی.

٨)- ﴿ وَوَضَعَ ٱلْمِيزَانَ ﴾ (خوا) تەرازووشی داناوە، (الميزَانُ: أَصْلُهُ اسْمُ آلَةِ الوَزْنِ، وَالوَزْنُ تَقْدِيرُ تَعَادُلِ الأَشْياءِ وضَبْطُ مَقادِيرِ ثِقَلِها، وَيُسْتَعَارُ المِيزَان لِلعَدْلِ وَالإتِّزَان)، (مِيزان) لە بنەڕەت دا ئامێری کێشانە، کێشانیش بریتیە لەوە کە ئەندازەگیریی شتەکان و هاوسەنگییان، ڕابگیرێ و کۆنترۆڵی ئەندازەی قورسییەکەیان بگرێ، وشەی (مِيزان) خوازراوەتەوەش بۆ دادگەریی و هاوسەنگیی، کەواتە: ﴿ وَوَضَعَ ٱلْمِيزَانَ ﴾، چونکەلەدوای: ﴿ وَٱلسَّمَآءَ رَفَعَهَا ﴾،هاتوە،واتە:خوا بسم الله الرحمن الرحيم ئاسمانی‌بەرزخوڵقاندوەو، تەرازووشی تێدا داناوەو، هاوسەنگیی تێدا داناوەو، وردەکاریی و ئەندازەگیریی تێدا داناوە، نەک بەو واتایە: کە ئاسمانی بەرزکردۆتەوەو تەرازووشی داناوە، چونکە تەرازووی کە ئێمە شتی پێ دەکێشین، خۆمان دروستمان کردوەو خوا بسم الله الرحمن الرحيم ڕاستەوخۆ داینەناوە، ئەو تەرازووەی کە دانراوە لە ئاسماندا، واتە: لە گەردووندا، بریتیە لەو

www.alibapir.com



هاوسەنگیی و ئەندازەگیرییەو لەو وردەکارییەی کە ئەگەر وانەبووایە، بەڕێوە نەدەچوو، کە ئەوپەڕی وردەکاریی و هاوسەنگیی و، ڕێک و پێکیی لە گەردووندا هەیەوەک خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ٱلَّذِى خَلَقَ سَبْعَ سَمَٰوَٰتٍ طِبَاقًا ۖ مَّا تَرَىٰ فِى خَلْقِ ٱلرَّحْمَٰنِ مِن تَفَٰوُتٍ ۖ فَٱرْجِعِ ٱلْبَصَرَ هَلْ تَرَىٰ مِن فُطُورٍ ﴿٣﴾﴾ الملك، واتە: ئەو کەسەی حەوت چینە ئاسمانی دروستکردوون، لە دروستکراوی (خوای) بە بەزەییدا ناڕێکیی نابینی، چاو بگێڕە جار لە دوای جار بزانە ناڕێکیی دەبینی! نایبینی.

٩)- ﴿أَلَّا تَطْغَوْا۟ فِى ٱلْمِيزَانِ﴾، تاکو سەرکێشیی نەکەن لە تەرازوودا، (أَلَّا) ئەصڵی خۆی (أَنْ لَا)یە، ئنجا زانایان دەڵێن: (أَنْ)، دەگونجێ: (أَنْ التَّفْسِيرِية) بێ و دەشگونجێ: (أَنْ المَصْدَرِيَّة) بێ، ئەگەر بۆڕوونکردنەوە بێ واتە: خوا ﷻ بۆیە گەردوونی بە ڕێکیی خوڵقاندوە، تاکو ئێوەش سەرکێشیی و یاخیی بوون نەکەن لە تەرازوودا، چەمکی ئەو تەرازووەش، دوایی ڕوون دەکەینەوە. بەڵام ئەگەر (أن) چاوگیی بێ، (بِتَقْدِيْر لَام الجَرِّ مَحْذُوفَةً قَبْلِهَا)، واتە: (لِئَلَّا تَطْغُوْا فِي الـمِيْزَان)، بۆ ئەوەی لە تەرازوودا سەرکێشیی نەکەن، واتایەکەی ئاوای لێدێتەوە: خوا ئاسمانی بەرزکردۆتەوە، یان بە بەرزیی خوڵقاندوویەتی و، تەرازووشی تێدا داناوە، نەبادا ئێوەش لە تەرازوودا سەرکێشیی بکەن.

١٠)- ﴿وَأَقِيمُوا۟ ٱلْوَزْنَ بِٱلْقِسْطِ﴾، کێشانیش دادگەرانە بەرپا بکەن، (القِسْط: العَدْل) دادگەرانە، (الإِقَامَةُ: جَعْلُ الشَّيْءِ قَائِمَاً، وَهُوَ تَمْثِيلٌ لِلْإِتْيَانِ بِهِ عَلَى أَكْمَلِ وَجْه)، (إِقَامَة) واتە: شتێک بەرپابکەی و ڕای بوەستێنی، مەبەست ئەوەیە بە چاکیی و بە باشترین شێوە ئەوکارە جێبەجێ بکەی، واتە: بە باشترین شێوە کێشان بکەن بە دادگەرانە.

١١)- ﴿وَلَا تُخْسِرُوا۟ ٱلْمِيزَانَ﴾، کەمیی لە تەرازوو، یان: کەمیی لە کێشاندا مەکەن، (الإِخْسَارُ: جَعْلُ الغَيْرِ خَاسِرَاً وَالخَسَارُ: النَّقْصُ)، (إِخْسَار) لەسەر کێشی (إِفْعَال)، ئەوەیە تۆ ئەویدیکە زیانبار بکەی، (خَسَارَة) واتە: کەمیی، (أَي: لَا تَجْعَلُوْا صَاحِبَ الحَقِّ خَاسِرَاً مَغْبُونَاً)، خاوەن هەقەکە زیانبارو ماف فەوتاو مەکەن.

www.alibapir.com


## مەبەست لە وشەی (المیزان) لە هەرسێك ئایەتی: (٧ و ٨ و ٩) دا:

بەر لەوەی بڕگەكانی دیكەی ئەم مەسەلەی یەكەمە تەواو بكەین، هەڵوەستەیەك دەكەین لە بەردەم ئەوەدا، كە خوا سێ جاران لە سێ ئایەتی بە دوای یەكدا، وشەی (مِیْزَان)ی هێناوە:

١- پێشێ دەفەرموێ: ﴿وَوَضَعَ ٱلۡمِيزَانَ﴾.

٢- دوایی دەفەرموێ: ﴿أَلَّا تَطۡغَوۡاْ فِي ٱلۡمِيزَانِ﴾.

٣- پاشان دەفەرموێ: ﴿وَأَقِيمُواْ ٱلۡوَزۡنَ بِٱلۡقِسۡطِ وَلَا تُخۡسِرُواْ ٱلۡمِيزَانَ﴾.

زانایان زۆریان قسە كردوە لە بارەی ئەو سێ وشەی (المِيْزَان)ەوە، كە لێرەدا هاتوون:

أ- هەندێكیان وایان داناوە كە هەرسێكیان بە مانای ئامێری كێشانی شتانن: (**آلة وَزن الأشياء**).

ب- هەندێكی دیكەیان گوتوویانە: هەر سێكیان بە مانای دادگەریین، چونكە میزان بە مانای دادگەریش دێ.

بەڵام دوای سەرنجدانی زۆر، وا حاڵییم كە ئەم سێ وشەیەی (**المِيْزَان**)، لە هەرسێك لە ئایەتەكاندا هەرجارە بە چەمكێك هاتوە:

أ- ﴿وَٱلسَّمَآءَ رَفَعَهَا وَوَضَعَ ٱلۡمِيزَانَ﴾، خوا ئاسمانی بەرزكردۆتەوە، بە بەرزیی خوڵقاندوویەتی و، تەرازووی داناوە، واتە: لەو ئاسمانە بەرزەدا تەرازووی داناوە، هاوسەنگیی داناوە، كە وەک دوایی باسی دەكەین، ئەو هەموو كەهكەشانانە كە تاكو ئێستا زانایان بە مەزەندە دەڵێن: یەک تریلیۆن (١٠٠٠,٠٠٠,٠٠٠,٠٠٠) كەهكەشان، لەو گەردوونەدا كە ئەوان بۆیان بینراوە، هەن و، هەمووشیان واپێدەچێ لە سنووری ئاسمانی یەكەم دابن، بەڵام هەموویان زۆر بەڕێكیی و وەک سەعات بەڕێوە دەچن،

www.alibapir.com


هەروەها دووریی خۆرو مانگ و زەوی و قەبارەیان و بارستاییان و کێشیان و تیرەیان و بازنەیان هەمووی، بە ئەندازە دانراوە، کەواتە: ئەم (**مِیْزان**)ی یەکەم، مادام لە دوای باسی بەرزکرانەوەی ئاسمان هاتوە، یان بە بەرزیی دروستکردنی ئاسمان، مانای وایە پەیوەندیی بە ئاسمانەوە، بە گەردوونەوە هەیە، کەواتە: ئەم (**مِیْزَان**)ە، بریتیە لە تەرازووی گەردوونیی (**المِیْزَان الكَوْنِي**).

ب- ﴿ أَلَّا تَطْغَوْا۟ فِى ٱلْمِيزَانِ ﴾، ئەوەی پەیوەندیی بە ئێرەوە هەیە، ئەوەیە کە (**تطغوا**) لە (**طُغْيَان**) هاتوەو، ئەویش بە مانای سەرکێشیی و سنوور شکاندن و یاخیبوون دێ، واتە: ئێوەش سەرکێشیی و یاخیبوون مەکەن لە تەرازوودا، ئەم تەرازووەی دووەم، کە نابێ ئێمە سەرکێشیی تێدا بکەین، واپێدەچێ مەبەست پێی تەرازووی شەریعەت (المیزان الشرعي) بێ، خوای پەروەردگار ناویشی لە شەریعەت ناوە تەرازوو، وەک دەفەرموێ: ﴿ لَقَدْ أَرْسَلْنَا رُسُلَنَا بِٱلْبَيِّنَـٰتِ وَأَنزَلْنَا مَعَهُمُ ٱلْكِتَـٰبَ وَٱلْمِيزَانَ لِيَقُومَ ٱلنَّاسُ بِٱلْقِسْطِ ﴿٢٥﴾ ﴾ **الحدید**، واتە: پێغەمبەرانمان بە بەڵگە ڕوون و ئاشکرایەکانەوە ناردوون و کتێب و تەرازووشمان لەگەڵ ناردوونە خوار، تاکو خەڵک بە دادگەریی بەڕێوەبچێت.

کەواتە: مەبەست لە دابەزینی تەرازوو واتە: دابەزاندنی شێوەی بەڕێوەچوونی مرۆڤەکان کە لە دوو توێی بەرنامەکەی خوادا هەیە، بە شێوەیەکی دادگەرانە.

هەروەها لە سووڕەتی (**الشورى**)دا دەفەرموێ: ﴿ ٱللَّهُ ٱلَّذِىٓ أَنزَلَ ٱلْكِتَـٰبَ بِٱلْحَقِّ وَٱلْمِيزَانَ ۗ وَمَا يُدْرِيكَ لَعَلَّ ٱلسَّاعَةَ قَرِيبٌ ﴿١٧﴾ ﴾، واتە: خوا بسم الله الرحمن الرحيم ئەو زاتەیە کە قورئانی بە حەق دابەزاندوەو، تەرازووشی دابەزاندوە {تەرازووەکەش هەر لە نێو قورئاندا هەیە} کەواتە: (**مِیْزَان**)ی دووەم، مادام خوا ئێمە دەدوێنێ، دەفەرموێ: بۆیە گەردوونم بەو شێوە ڕێک و پێکە دروست کردوە، کە ئێوەش نەبنە دەنگێکی ڕیزپەڕ و دەگمەن و، دەرچوو لە کۆڕسی بوونەوەردا، ئەم بوونەوەرە هەمووی بە ڕێک و پێکیی و بە تەرازوو داندراوە، تەرازووی شەریعەتیشم بۆ ئێوە ناردوە، بۆیە ئێوەش نابێ لە تەرازووی شەریعەت دا یاخیبوون و سەرکێشیی بکەن.

www.alibapir.com



ج- ﴿ وَأَقِيمُواْ ٱلْوَزْنَ بِٱلْقِسْطِ وَلَا تُخْسِرُواْ ٱلْمِيزَانَ ﴾، کێشان بە دادگەرانە بکەن و، کەمیی مەکەن لە تەرازوودا، ئەمەش مادام باسی کێشانەو، کێشان بە دادگەریی و، خوا ڕێگرییان لێ دەکات، لە کەمکردن لە تەرازوودا، کەواتە: (**میزان**) مەبەست پێی تەرازووی ئامێرە (الميزان الآلي).

کەواتە: (**مِيْزَان**)ی یەکەم تەرازووی گەردوونییەو، هی دووەم تەرازووی شەرعییەو، هی سێیەمیشیان تەرازووی ئامێرییە، واتە: (**المِيْزَان الكَوْنِيُّ، وَالمِيْزَان الشرعِيُّ، وَالمِيْزَان الآلِيُّ**)، پێم وایە ئەمە باشترین مانا لێکدانەوەی ئەو سێ وشەی (**المِيْزَان**)ەیە، کە لە سێ ئایەتی بە دوای یەکدا خوای موتەعال هێناونی و دووبارەی کردونەوە.

**١٢)**- ﴿ وَٱلْأَرْضَ وَضَعَهَا لِلْأَنَامِ ﴾ هەروەها {لە چاکەکانی خواو لە کارەکانی خوا، کە ئەنجامی داون، ئەوەیە کە} زەویشی داناوە بۆ دروستکراوەکان، (**أَنَام**) واپێدەچێ بە مانای (**الخَلْق**) بێ، واتە: دروستکراوەکان کە جندو مرۆڤ دەگرێتەوە، چونکە بە کردەوە ئەوانەی لەسەر زەوی دەژین مرۆڤ و جندن، لە خاوەن عەقڵان و خاوەن هەست و هۆشان، لەوانەی خوا دایناون، بۆ تاقیکردنەوە.

ئنجا ئایا چی تێدایە ئەو زەوییە؟

**١٣)**- ﴿ فِيهَا فَٰكِهَةٌ ﴾، میوەی تێدایە، واتە: هەموو جۆرە میوەیەکی تێدایە، چونکە خوا ﷻ (**فاكهة**)ی بەنەزانراو (**نكرة**) هێناوە، یانی: هێندەی میوە تێدان، ئێوە بۆتان دەرک ناکرێن ئەوەندە جۆری زۆرن، چونکە جاری وا هەیە شتێک کە بە نەناسراو (**نكرة**) دێ، مەبەست پێی دەرخستنی مەزنیی و گەورەیی و، بێڕەزاییەتی، جاری واش هەیە مەبەست پێی: بچووکیی و کەمیی پێشاندانیەتی و، بەپێی سیاق ئەوە دەزانرێ، (**وَالْفَاكِهَةُ: اسْمٌ لِمَا يُؤْكَلُ تَفَكُّهاً لَا قُوتًا، مُشْتَقَّةٌ مِنْ فِكَه إِذَا فَرِحَ، إِذَا طَابَتْ نَفْسُهُ**)، (**فَاكِهَة**): ئەوەیە کە هەر لەبەر چێژ وەرگرتن دەخورێ، نەک وەک بژیوو، داتاشراوە لە وشەی (**فَكِه: فَرِحَ**) واتە: دڵخۆشبوو، نەفسی خۆش بوو، بۆچی خوا ﷻ باسی (**فَاكِهَة**)

www.alibapir.com


دەکات، پێش ئەوەی باسی ئەوە بکات کە مرۆڤ پێی دەژی؟! دەڵێین: لە ڕاستییدا لێرەداخوا ﷻ ئەو ڕیزبەندییەی ڕەچاو نەکردوە، چ شتێک لە پێش چ شتێکەوەیەو چ شتێک بۆ مرۆڤ گرنگترە؟ بەڵکو لێرەداخوا ﷻ باسی دروستکراوەکانی خۆی و چاکەکانی خۆی دەکات لە ژیانی ئێمەدا، هەڵبەتە دواییش دێتە سەر باسی دانەوێڵەو شتەکانی دیکە.

١٤)- ﴿وَٱلنَّخۡلُ ذَاتُ ٱلۡأَكۡمَامِ﴾، هەروەها {لە زەویدا هەیە} دارخورما خاوەن کیف و توورەکەکان، (أَكْمَام) یان کۆی (كُمّ)ە، یان کۆی (كِمّ)ە، کە هەندێ لە زانایان دەڵێن: (كُمّ) و (كِمّ) هەردووکیان بە مانای کیف و توورەکەن کە هێشووی دارخورمایان تێدایە، هەندێکیش گوتوویانە: (كُمّ) بە مانای قۆڵەو، (كِمّ) بە مانای ئەو توورەکەو کیفە دێ، کە هێشووی دارخورمای تێدایە، لێرەدا: ﴿وَٱلنَّخۡلُ ذَاتُ ٱلۡأَكۡمَامِ﴾، (**هَذَا وَصْفٌ لِلتحْسِينِ فهواعْتِبَارٌ بِأَطْوَارِ النَّخْلِ وَامْتِنَانٌ بِجَمَالِهِ وَحُسْنِهِ**)، کە خوا ﷻ باسی میوە دەکات، دوایی باسی دارخورمای خاوەن کیف و بەرگ دەکات، ئەمە بۆ جوان پێشاندانە، کە دارخورما بە چەند قۆناغێکدا دەڕوات، خوا چاکەی خۆی لە دارخورمادا بیر ئێمە دێنێتەوە، کە جوانیی و ڕەونەقێکی زۆری تێدایە، کاتێک کە کیفەکەی وردە وردە دەردەکەوێ، دوایی کیفەکە دەدڕێ و هێشووەکان لێی دێنە دەرێ.

(**نَخْل**) ناوی کۆیەو، تاکەکەی بریتیە لە (**نَخْلَة**) واتە: یەک دارخورما، باسی خورما (**تَمر**)ی نەکردوە کە بریتیە لە میوەی دارخورما، چونکە میوەی دارخورما بە یەک قۆناغدا ناڕوات و بە چەندان قۆناغدا دەڕوات، کە لە زمانی عەرەبییدا هەمووی ناوی هەیە: (**بُسْر**) هەیەو، (**رُطب**) هەیەو، ئنجا دوایی (**تَمر**) ... بە چەند قۆناغێکدا دەڕواو، ئنجا ئەو بەهرەیەی لە دارخورما وەردەگیرێ، تەنیا خورمایەکەی نیە، بەڵکو بۆ زۆر شتی دیکەش بەهرەی لێوەردەگیرێ.

١٥)- ﴿وَٱلۡحَبُّ ذُو ٱلۡعَصۡفِ﴾، هەروەها (لە زەویدا هەیە) دانەوێڵەی خاوەن پووش و گیا.

www.alibapir.com


**١٦)- ﴿وَٱلرَّيۡحَانُ﴾**، هەروەها ڕەیحانیش، (رَيْحانٌ) واتە: چ ئەو ڕەیحانەی دەزانین گیایەکی بۆنخۆشە، چ هەموو گیا بۆنخۆشەکان، (**والرَّيْحانُ: مَا لَهُ رَائِحَةٌ زَكِيَّةٌ مِنَ الْأَزْهَارِ وَالْحَشَائِشِ وَهُوَ فَعْلَانٌ مِنَ الرَّائِحَةِ**)، (**ريحان**) یانی: هەموو ئەو گوڵ و گیایانەی بۆنی خۆشیان هەیە، لەسەر کێشی (**فَعْلَان**)ە و لە (**رَائِحَةٌ**)ەوە هاتوە، واتە: بۆن، بۆنی خۆش، (**حَبّ**)یش بریتییە لەو شتەی هێشوو و گوڵی هەن، وەک گوڵە گەنم، گوڵە جۆ، گوڵە مەرەزە، گوڵە هەرزن، (**الْحَبُّ الَّذِي لِنَبَاتِهِ سَنَابِلُ وَلَهَا وَرَقٌ وَقَصَبٌ فَيَصِيرُ تِبْنًا، وَذَلِكَ الْوَرَقُ وَالْقَصَبُ هُوَ الْعَصْفُ، أَيِ الَّذِي تَعْصِفُهُ الرِّيَاحُ**)، (**حَبّ**): دانەوێڵە، بەو ڕووەکە دەگوترێ: کە گوڵان دەردەکات، {گوڵە گەنم، گوڵە جۆ، گوڵە هەرزن، گوڵە مەرەزە} هەروەها بەرگیشی هەیەو قەدو لقی هەیە، کە دوایی دەبێ بە پووش و پەڵاش، دەبێ بە ئاڵف و کاو لەوەڕ بۆ ئاژەڵەکانیان، هەروەها دانەوێڵەکەش دەبێتە خۆراک بۆ خۆیان.

(**عَصْفُ**) بریتییە لەوەی دوایی دەبێتە پووش و پەڵاش ئەو بەرگ و گیایەی گوڵە گەنمەکەی لە خۆی وەرگرتوە، یان قەدەکەی کەلەسەری وەستاوە.

هەندێکیش گوتوویانە: ڕەیحان مەبەست پێی گیای بۆنخۆش و ئەوانە نیە، بەڵکو مەبەست پێی بژیوە، بەڵام مانای دیارتری ڕەیحان بریتییە لە گیایەکی بۆنخۆشی دیارییکراو کە ڕیحانە، یاخود هەموو گیا بۆنخۆشەکانن.

لە کۆتاییدا خوا دەفەرموێ:

**١٧)- ﴿فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ﴾** ئنجا ئەی مرۆڤ و جند! نکووڵیی لە کام لە چاکەکانی پەروەردگارتان دەکەن؟ پیتی (**ف**) لێرەدا: (**الْفَاءُ لِلتَّفْرِيعِ عَلَى مَا تَقَدَّمَ مِنَ الـمِنَنِ**)، واتە: بینا لەسەر ئەوەی باسکرا لە چاکەکانی خوا، ئایا ئێوە نکووڵیی لە کام لەو چاکانەی خوا، دەکەن و بەڕاستیان نازانن؟ وشەی (**أَيٌّ**) پرسیارکردنە بۆ دیارییکردنی یەکێک لەو جینسەی پاڵی دەدرێتە لا، بەڵام لێرەدا بەکارهێنراوە بۆ چەسپاندن، واتە: بۆتان نیە نکووڵیی لە هیچ کام لەو چاکانەی خوای پەروەردگار بکەن.

www.alibapir.com


**(تَكْذِيْـب)** بـە مانـای بـە درۆ دانانـە، بـەڵام لێـرەدا بـە مانـای نکووڵیلێکـردن و نەسـەلماندن دێ، **(آلاءِ)** کـۆی **(إلى)**یـە، یـان کـۆی **(أَلـى)** هەردووکیـان بـە مانـای چاکـەو نیعمەتـن، لێـرەدا کـە ڕانـاوی دووان بـە کارهێـنراوە: ﴿ فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا ﴾، زۆربـەی زانایـان دەڵێـن: مەبەسـت پێـی مـرۆڤ و جنـدە، چونکـە دوایـی خـوای بـێ وێنـە وێـڕای ئـەوەی ئـەو تەعبیـرە سی و یـەک (٣١) جـار دووبـارە دەکاتـەوە، دواییـش خـوا زۆر بـە ڕوون و ئاشـکراویی بانگـی مـرۆڤ و جنـد دەکات: ﴿ يَٰمَعْشَرَ ٱلْجِنِّ وَٱلْإِنسِ ﴾، بۆیـە زۆربـەی هـەر زۆری زانایـان دەڵێـن: مەبەسـت پێـی ئـەو دوو کۆمەڵـە مەخلووقـەن کـە مـرۆڤ و جنـدن، بـەڵام هەندێکیـان گوتوویانـە: مەبەسـت پێـی نێـرو مێـی مرۆڤانـن و، هەندێکیـان گوتوویانـن: مەبەسـت پێـی بـەس مرۆڤـن، بـەڵام ئـەوە بـۆ جەختکردنـەوەی بانگکردنەکەیـە، وەک: **(لَبَّيْـكَ وَسَـعْدَيْكَ)** واتـە: دووجـار لـە خزمـەت دام و، دووجـاران تـۆ بەختـەوەر دەکـەم، بـەڵام هـەر ئـەوە ڕای ڕاسـتە کـە مەبەسـت پێـی مـرۆڤ و جنـدە.

**(محمـد الطاهـر بـن عاشـور)** کـە توێژەرەوەیەکـی باشیشـە، بـەڵام هەندێـک جـاران، ڕاو بـۆ چـوونی وای هـەن، بـە کەڵکـی هیـچ نایـەن، یەکێـک لەوانـەش ئـەو ڕایەیـەتی، کـە دەڵـێ: **(وَقَـالَ جُمْهُـورُ الْمُفَسِّرِيـنَ: هُـوَ خِطَـابٌ لِلْإِنْـسِ وَالْجِـنِّ، وَهَـذَا بَعِيـدٌ لِأَنَّ الْقُرْآنَ نَـزَلَ لِخَطَـابِ النَّـاسِ وَوَعْظِهِـمْ، وَلَـمْ يَـأْتِ لِخِطَـابِ الْجِـنِّ، فَـلَا يَتَعَـرَّضُ الْقُـرْآنُ لِخِطَابِهِـمْ)**[1]، واتـە: زۆربـەی توێـژەرەوان دەڵێـن: لێـرەدا ڕووی دوانـدن لـە مـرۆڤ و جنـدە، بـەڵام ئەمـە دوورە، چونکـە قوڕئـان تەنیـا بـۆ دوانـدنی خەڵـک و ئامۆژگاریـی کردنیـان هاتـوە، نـەک بـۆ دوانـدنی جنـد، بۆیـە قوڕئـان بـاسی ئـەوان نـاکات و نایاندوێنـێ!

بـەڵام وەک گوتـراوە: **(لِـكُلِّ عَالِـمٍ هَفْـوَةٌ وَلِـكُلِّ حصَـانٍ كبـوة)**، هەمـوو زانایـەک هەڵـە یەکـی دەبـێ و، هەمـوو هەمـوو ئەسـپێکی چـاک، جارێـک سـاتمە دەکات، ئەمەش بەسەر **(إبن عاشور)**دا، دەچەسپێ، چونکە زۆر ئاشکرایە، خوا ﷽ لێرەدا

---

(١) التحرير والتنوير: ج٢٧، ص٢٤٤.

www.alibapir.com


جنـدو مـرۆڤ دەدوێنـێ و، ئـەوەش کـە دەڵـێ: قورئـان تەنیا بـۆ دوانـدنی مرۆڤـانـان هاتـوەو حەقـی بەسـەر جنـدەوە نیە، هـەر ڕایەکـی زۆر سـەیرە، چونکـە سـوورەتێک لـە قورئانـدا هـەر بـە نـاوی سـوورەتی (**الجـن**)ەوە هاتـوە، هەروەهـا لـە زۆر جێـی دیکـەی قورئـان دا خـوا بـاسی جنـدی کـردوە، بـۆ نموونـە:

أ- ﴿وَإِذْ صَرَفْنَآ إِلَيْكَ نَفَرًا مِّنَ ٱلْجِنِّ يَسْتَمِعُونَ ٱلْقُرْءَانَ فَلَمَّا حَضَرُوهُ قَالُوٓاْ أَنصِتُواْ ۖ فَلَمَّا قُضِىَ وَلَّوْاْ إِلَىٰ قَوْمِهِم مُّنذِرِينَ ﴿٢٩﴾﴾ **الأحقاف**، یادبکەوە کاتێک کۆمەڵێک لە جندمان بۆ لای تۆ ناردن، کە گوێ لە قورئان بگرن...

ب-هەروەهاخوا ﷻ لەسوورەتی(**الأنعام**)دافەرموویەتی:﴿يَـٰمَعْشَرَ ٱلْجِنِّ وَٱلْإِنسِ أَلَمْ يَأْتِكُمْ رُسُلٌ مِّنكُمْ يَقُصُّونَ عَلَيْكُمْ ءَايَـٰتِى وَيُنذِرُونَكُمْ لِقَآءَ يَوْمِكُمْ هَـٰذَا ۚ قَالُواْ شَهِدْنَا عَلَىٰٓ أَنفُسِنَا ۖ وَغَرَّتْهُمُ ٱلْحَيَوٰةُ ٱلدُّنْيَا وَشَهِدُواْ عَلَىٰٓ أَنفُسِهِمْ أَنَّهُمْ كَانُواْ كَـٰفِرِينَ ﴿١٣٠﴾﴾، ئەی کۆمەڵی جندو مرۆڤ! ئایا لە خۆتان پێغەمبەرانتان بۆ نەهاتن، ئایەتەکانمیان بەسەردا دەخوێندنەوەو... ئنجا بەڵێ پێغەمبەران (**عَلَيْهِمُ الصَّلاَةُ وَالسَّلاَم**) بە ڕای زۆربەی هەرەزۆری زانایان هەموویان لە مرۆڤان بوون، بەڵام بێگومان بۆ جندیش بوون، مادام خوا ﷻ بە جند دەفەرموێ: ئایا پێغەمبەرانتان بۆ نەهاتن؟!

کەواتـە: جندیـش وەک ئێمـەی مـرۆڤ ئەرکـدار (**مُكلَّـف**)ن و، ئەوانیـش پێویسـتە بـە دوای ڕێـی ڕاسـت بکـەون و، پێغەمبـەران ئەوانیشـیان دوانـدوون، نـەک بـەس پێغەمبـەری خاتەمیـش ﷺ بەڵکـو هەمـوو پێغەمبـەرەکانی دیکـەش (**عَلَيْهِـمُ الصَّـلاَةُ وَالسَّـلاَم**)، بـۆ هەمـوو مرۆڤـەکان هاتـوون و بـۆ هەمـوو جندەکانیـش هاتـوون، بۆیـە ئـەو قسـەیەی (**إبـن عاشـور**) لـەو نەدەوەشـایەوە، بـەڵام بـە هەرحـاڵ بەشـەرە، شـتی سـەیرو بـە کەڵـک نەهاتـووشی جـاری وا هەیـە، بـە زاردا دێ.

کۆتایـی ئـەو مەسـەلەیەمان بـەو فەرمایشـتەی پێغەمبەرمـان دێنیـن ﷺ، کـە پێشـتریش هێنامـان:

{عَنِ ابْنِ عُمَرَ رضي الله عنهما، قَالَ: إِنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ: قَرَأَ سُورَةَ الرَّحْمَنِ، أَوْ قُرِئَتْ عِنْدَهُ، فَقَالَ: «مَا لِي أَسْمَعُ الْجِنَّ أَحْسَنَ جَوَابًا لِرَبِّهَا مِنْكُمْ؟» قَالُوا: مَاذَا يَا رَسُولَ اللَّهِ؟ قَالَ: مَا أَتَيْتُ عَلَى قَوْلِ اللَّهِ: ﴿فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ﴾؟ إِلَّا قَالَتِ الْجِنُّ: لَا بِشَيْءٍ مِنْ نِعْمَةِ رَبِّنَا نُكَذِّبُ} (أخرجه الترمذي: ٣٣٠٢، وَصَحَّحَهُ الألباني فِي صحيح سنن الترمذي).

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی عومەر رضي الله عنهما دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ سوورەتی (الرَّحْمَنِ)ی خوێندەوە، یاخود بەسەریدا خوێنرایەوە، فەرمووی: ئەوە بۆچی جند وەڵامیان لە ئێوە باشتر بوو بۆ وەڵامدانەوەی ئەو پرسیارەی پەروەردگاریان ﷻ؟ ئەوانیش گوتیان: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ چۆن؟ فەرمووی: هیچ جارێک ئەو فەرمایشتەی خوام دووبارە نەدەکردەوە: ﴿فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ﴾، ئەی مرۆڤ و جند! نکووڵیی لە کام لە چاکەکانی پەروەردگارتان دەکەن؟ مەگەر جندەکان دەیانگوت: (لَا بِشَيْءٍ مِنْ نِعْمَةِ رَبِّنَا نُكَذِّبُ)، هیچ کام لە چاکەکانی پەروەردگارمان نکووڵیی لێ ناکەین و دان بە هەموویان دا دێنین.

خوای پەروەردگار ئێمەش لەو کەسانە بگێڕێ کە هەمیشە چاکەکانی خوا ﷻ، وەک بۆ خوا شایستەیە، ستاییش و سوپاسی خوایان لەسەر بکەین، بۆ ئەوەی لە سپڵەیی و بێ ئەمەکیی دووربین.

لە تۆڕە کۆمەڵایەتییەکان لەگەڵتانین
Stay in touch on social media
نحن معكم عبر مواقع التواصل الاجتماعي
ڕاگەیاندنی مەکتەبی مامۆستا عەلی باپیر
عەلی باپیر/AliBapir
archive.org/details/@alibapir
عەلی باپیر/AliBapir
AliBapir
Google Play
App Store
کەناڵی ڕاگەیاندنی مەکتەبی مامۆستا عەلی باپیر
www.alibapir.net
کوردی - عربي - English
ڕاگەیاندنی مەکتەبی مامۆستا عەلی باپیر

www.alibapir.com


## کورتە باسێک لە بارەی فراوانیی و بەرزکرانەوەی ئاسمان و، هاوسەنگیی نێوان خۆرو زەوی و مانگەوە:

بەڕێـــــزان!

ئەم کورتە باسەش لە پێنج بڕگەدا پێشکەش دەکەین:

**بڕگـەی یەکـەم:** بـاسی فراوانیـی و بەرزکرانـەوەی ئاسـمان لـە قوڕئـان داو، لـە بەرتیشـکی زانسـتیی تـازەدا.

**بڕگـەی دووەم:** بـاسی خـۆر دەکەیـن، لـە چـوار خاڵـدا: هـەم تیرەکـەی، هـەم چێوەکـەی، هـەم قەبارەکـەی، هـەم بارسـتاییەکەی.

**بڕگەی سێیەم:** باسی زەوی دەکەیـن لـە چـوار خـاڵ دا: تیرەکـەی و چێوەکـەی و قەبارەکـەی و بارسـتاییەکەی.

**بڕگـەی چـوارەم:** بـاسی مانـگ دەکەیـن ئەویـش: تیرەکـەی و، چێوەکـەی و، قەبارەکـەی و بارسـتاییەکەی و، دووریـی مانـگ لـە زەوی.

**بڕگەی پێنجـەم:** بـەراوردی نێـوان خـۆرو زەوی و مانـگ دەکەیـن، کـە چـۆن خـوا بسم الله الرحمن الرحيم ئەندازەگیرییەکی زۆر وردی بۆ داناون، کە ئەگەر وانەبووایە ژیانی مرۆڤ و ژیانـدارانی دیکـەش لەسـەر زەوی، نەدەگونجا پەیدابـێ.

## بڕگەی یەکـەم: فراوانیـی و بەرزکرانـەوەی ئاسـمان لـە ڕوانگـەی قوڕئانـەوەو لـە بەرتیشـکی زانسـتیی تـازەدا:

خـوای کاربەجـێ لـە چەنـد شـوێنێکدا، بـاسی فراوانیـی ئاسـمانی کـردوە، هەڵبەتـە وشـەی ئاسـمان (سـماء) بـە زاراوی زانسـتی ئـەم ڕۆژگارە، یانـی: گـەردوون، کـە بـە

www.alibapir.com


ئینگلیزیـی (Universe)ی پـێ دەڵێـن، واتـە: (بوونـەوەر - **الکـون**) بـەڵام بێگومـان چەمکـی (Universe) گـەردوون، زۆر تەسـکترە لـە چەمـک و نێوەڕۆکـی وشـەی ئاسمان، کە خوا ﷻ بەکاری هێناوە، بەڵکو هەر لە سنووری ئاسمانی یەکەمیش تەسکترە، چ جای حەوت ئاسمانەکان، چونکە خوا ﷻ جاری وایە وشەی **(السماء)** بەکاردێنـێ و، جـاری وا هەیـە وشـەی **(سبع سموات)** بەکاردێنـێ، ئنجـا کـە **(السـماء)** بەکاردێنـێ واتـە: هەمـوو ئـەوەی لـە سـەرووی ئێمەوەیـەو، کـە حـەوت ئاسـمانەکان بەکاردێنـێ واتـە: ئـەو حـەوت چینـە ئاسـمانەی لـە سـەرووی ئێمـەوەن و، کـە **(السـماء الدنیـا)** بەکاردێنـێ، کـە دەفەرمـوێ: ﴿وَزَيَّنَّا ٱلسَّمَآءَ ٱلدُّنۡيَا بِمَصَٰبِيحَ وَحِفۡظٗاۚ ذَٰلِكَ تَقۡدِيرُ ٱلۡعَزِيزِ ٱلۡعَلِيمِ ١٢﴾ **فصلت**، واتـە: ئاسـمانی نیزیکـتر لـە ئێوەمـان بەچرایـان ڕازاندۆتـەوەو بـۆ پاراستنیشـیان، ئـەوەش ئەندازەگیریـی زاڵـی زانایـە. **(الدنیـا)** مێینـەی مەجازیـی **(المؤنـث المجـازي)** **(الأدنى)**یـە، واتـە: نیزیکـتر لـە ئێـوە **(الأقـرب)**، ئاسـمانی نزیکـتر لـە ئێوەمـان ڕازاندۆتـەوە بـە چرایـان، کەواتـە: هەرچـی دەبینرێـن لـە ئەسـتێرەکان و کەهکەشـانەکان و گەلـە کەهکەشـانەکان، هەمـوو ئـەوە بەپێـی ئـەو ئایەتـە موبارەکـە، دەکەوێتـە سـنووری ئاسـمانی نیزیکـتر لـە ئێمـەوە، ئاسـمانی یەکەمـەوە بـە نسـبەت ئێمـەوە، یانی: کـە بـەرەو سـەر دەچیـن، ئنجـا لـە سـەرووی ئەویشـەوە شـەش ئاسـمانی دیکـە هـەن، ناشـزانین سـنووری ئـەو ئاسـمانی یەکەمـەش لـە کـوێ کۆتایـی پـێ دێ!

بەڵـێ خـوای پـەروەردگار لـە چەنـد شـوێنێکی قوڕئـان دا، بـاسی بەرزکرانـەوەو فراوانیـی ئاسـمانی کـردوە، بـۆ نموونـە:

١- دەفەرموێ: ﴿وَٱلسَّمَآءَ رَفَعَهَا وَوَضَعَ ٱلۡمِيزَانَ ٧﴾ **الرحمن**، واتە: خوا ئاسمانی بەرزکردۆتەوە، یان بە بەرزیی دروستی کردوەو تەرازووشی داناوە، وەک پێشتریش گوتمان: واپێدەچێ مەبەست لەو تەرازووە، ئەو هاوسەنگیی و ئەندازەگیرییە بێ، کە خوا ﷻ لە نێو گەردوون دا بەگشتیی و یەک یەکی دروستکراوەکانی خۆیدا دایناوە، هەڵبەتە زەوی ئێمە بەشێکی زۆر بچووکە لە هەموو گەردوون، چونکە زەوی

www.alibapir.com


یەکێکە لە نۆ خڕۆکە کە بە دەوری خۆردا دەخولێنەوە، خۆریش بۆ خۆی یەکێکە لە ئەستێرەکانی کەهکەشانی کاکێشان **(مجرة درب التبّان)** کە فارس پێی دەڵێن: (ڕاهی شیری) ڕێی شیریی و، کورد پێی دەڵێن: (ڕێی کاکێشان)و، ئینگلیز پێی دەڵێن: (Milk way)، وایانزانیوە ئەوە ڕێیەکە، خەڵک پێیدا ڕۆیشتوەو شیری لێ ڕژاوەو، هەندیکیان گوتوویانە: ڕێیەکە خەڵک پێیدا ڕۆیشتوەو کایان پێدا کێشاوەو کای لێ ڕژاوە، ئەو سپیاییەی دەبینرێ! نەیانزانیوە ئەوانە هەموویان ئەستێرەی زۆر دوورن و بە زەحمەت تیشکەکەیان دەگاتە ئێمەو، لە دوورەوە سپیی دەچن، ئنجا خۆری ئێمە یەکێکە لە ئەستێرەکانی کەهکەشانی کاکێشان کە زانایان دەڵێن: بە مەزەندە یەک تریلیۆن واتە: یەک هەزار ملیار (١٠٠٠,٠٠٠,٠٠٠,٠٠٠) ئەستێرە لە نێو کەهکەشانی کاکێشاندا هەن، یەکێک لەو ئەستێرانەش خۆری ئێمەیە، ئنجا ئێستا زانایان دەڵێن: یەک تریلیۆن بەڵکو هەندێک دەڵێن: مەزەندە دەکرێ دوو تریلیۆن کەهکەشان لە هەموو گەردووندا، واتە: لەو بەشەی گەردوون کە هاتۆتە بەرچاوی تەلسکۆبەکان، هەبن، کەهکەشان **(مجرة)** بە ئینگلیزیی پێی دەڵێن: (Galaxy - گالاکسیی).

**٢-** هەروەها لە سوورەتی **(الذاريات)**دا، خوا دەفەرموێ: ﴿وَٱلسَّمَآءَ بَنَيۡنَٰهَا بِأَيۡيْدٖ وَإِنَّا لَمُوسِعُونَ ﴿٤٧﴾﴾، ئاسمانمان بە هێز دروست کردوەو، ئێمە فراوانکەرین، یاخود بە فراوانیی دروستمان کردوە، هەردوو واتایەکەی هەن، **(لَمُوسِعُون)** :

**أ-** واتە: بەردەوام فراوانی دەکەین، نوێترین بیردۆزەی گەردوونییش وا دەڵێ.

**ب-** یاخود بە فراوانیی دروستمان کردوە، هەروەک ﴿وَٱلسَّمَآءَ رَفَعَهَا﴾، دیسان دەگونجێ مەبەست پێی ئەوە بێ بە بەرزیی دروستی کردوە، دەشگونجێ مەبەست ئەوە بێ خوا ئاسمانی دروستکردوەو بەردەوام بەرزی دەکاتەوە، فراوانی دەکات.

**٣-** لە سوورەتی **(النازعات)**دا، خوا دەفەرموێ: ﴿ءَأَنتُمۡ أَشَدُّ خَلۡقًا أَمِ ٱلسَّمَآءُۚ بَنَىٰهَا ﴿٢٧﴾ رَفَعَ سَمۡكَهَا فَسَوَّىٰهَا ﴿٢٨﴾ وَأَغۡطَشَ لَيۡلَهَا وَأَخۡرَجَ ضُحَىٰهَا ﴿٢٩﴾ وَٱلۡأَرۡضَ بَعۡدَ ذَٰلِكَ دَحَىٰهَآ ﴿٣٠﴾ أَخۡرَجَ مِنۡهَا مَآءَهَا وَمَرۡعَىٰهَا ﴿٣١﴾ وَٱلۡجِبَالَ أَرۡسَىٰهَا ﴿٣٢﴾ مَتَٰعٗا لَّكُمۡ وَلِأَنۡعَٰمِكُمۡ ﴿٣٣﴾﴾، خوا بە پرسیارکردنەوە دەپرسێ،

www.alibapir.com


پرسیارکردنی نکووڵییلێکەرانە **(الإستفهام الإنكاري)**، یان پرسیارکردنی چەسپێنەرانە **(الإستفهام التقريري)** دەفەرمویٚ: ئایا دروستکردنی ئێوە قورسترە، یان سەختترە، یاخود ئاسمان؟ **(بناها)** خوا بینای کردوە، ﴿رَفَعَ سَمۡكَهَا فَسَوَّىٰهَا﴾، بەرزییەکەی بڵیندکردوەو، رێکیخستوە، ﴿وَأَغۡطَشَ لَيۡلَهَا وَأَخۡرَجَ ضُحَىٰهَا﴾، شەوەکەی تاریک داهێناوە و رۆژەکەشی رووناک کردوە، ﴿وَٱلۡأَرۡضَ بَعۡدَ ذَٰلِكَ دَحَىٰهَآ﴾، دوای ئەوە زەویشی هێلکەیی هەڵخستوە، ﴿أَخۡرَجَ مِنۡهَا مَآءَهَا وَمَرۡعَىٰهَا﴾، ئاوەکەی لێ دەرهێناوە، هەروەها لە وەرگاکانی لێ دەرهێناون، ﴿وَٱلۡجِبَالَ أَرۡسَىٰهَا﴾، چیایەکانیشی تێدا داکوتاون، ﴿مَتَٰعٗا لَّكُمۡ وَلِأَنۡعَٰمِكُمۡ﴾، بۆ گوزەران و ڕابواردنی خۆتان و ئاژەڵەکانتان {ئاوا زەوی پڕکردوە لە نازو نیعمەت}.

٤-لە سوورەتی **(الأنبياء)**دا، خوا ﷻ دەفەرمویٚ: ﴿أَوَلَمۡ يَرَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوٓاْ أَنَّ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضَ كَانَتَا رَتۡقٗا فَفَتَقۡنَٰهُمَاۖ وَجَعَلۡنَا مِنَ ٱلۡمَآءِ كُلَّ شَيۡءٍ حَيٍّۚ أَفَلَا يُؤۡمِنُونَ ٣٠﴾، واتە: ئایا ئەوانەی بێبڕوان نابینن، نازانن، کە ئاسمانەکان و زەوی پێکەوە لکابوون، لێکمان جیاکردنەوەو، هەموو زیندەوەرێکیشمان (هەموو ژیاندارێکیشمان) لە ئاو هێناوەتە دی! ئایا بڕواناهێنن؟ ئەمەش ئاماژەیە بە نوێترین بیردۆزەی گەردووینی کە ئێستا باوەو پێی دەگوترێ: (Big Bang) تەقینەوەی گەورە، کە دەڵێن: ئەم گەردوونە هەمووی لە یەک تاکی گەردوونییەوە هاتوە، کە پێی دەگوترێ: هێلکەی گەردوونیی **(البيضة الكونية)**، پێشی دەگوترێ: تۆوی گەردوونیی **(البذرة الكونية)** وپێشی دەگوترێ: تاکەکە **(المفردة)**و، بە ئینگلیزیی پێی دەگوترێ: سینگولارتیی (Singularity)، ئنجا کە ئەوە تەقیوەتەوە، لەو کاتەوە بەردەوام گەردوون لێک دەکشێ، ئنجا کە خوا ﷻ دەفەرمویٚ: ئاسمانەکان و زەوی پێکە لکاوبوون و لێکمان جیاکردوونەوە، ئاماژەیە بەو مەسەلەیەو، ئێمە لە تەفسیری سوورەتی **(فصلت)**دا، کورتە باسێکی تاڕادەیەک تێرو تەسەلمان لە بارەی گەردوون و چۆنیەتیی دروست بوونی گەردوونەوە کردوەو، ئێستا باسی ئەوە ناکەین، تەنیا ویستمان ئاماژە بەوە بکەین، کە لە قورئاندا خوا ﷻ ئاماژەی کردوە بە فراوانیی گەردوون و فراوان بوونی گەردوونیش.

www.alibapir.com


ئنجا ئەگەر تەماشایەکی گەردوون بکەین، لەبەر ڕۆشنایی ئەوەدا کە زانستی گەردووونناسیی و زانستی فیزیا لەم ڕۆژگارەدا پێیگەیشتوە، دەگەینە ئەم ئەنجامانە:

**١)- تەمەنی گەردوون:** زانایان بە سێزدە ملیارو هەشتسەد ملیۆن (١٣،٨٠٠،٠٠٠،٠٠٠) ساڵ تەمەنی گەردوون مەزەندە دەکەن، واتە: دەڵێن: لەو کاتەوە کە سینگۆلارتی (Singularity) تەقیوەتەوە، تاکو ئێستا: سێزدە ملیارو هەشتسەد ملیۆن ساڵی پێچووەو، ئەوەندە تەمەنی گەردوونە.

**٢)- تیرەی گەردوون:** ئەگەر بمانەوێ تیرەی گەردوون بزانین، واتە: بزانین لەمسەر بۆ ئەوسەری گەردوون چەندە؟ دەبێ جاری بزانین ساڵی تیشکی چەندە؟ چونکە تەمەنی گەردوون سێزدە ملیارو هەشتسەد ملیۆن ساڵە، ئنجا بۆ ئەوەی بزانین لەمسەر بۆ ئەوسەری گەردوون واتە: تیرەی گەردوون چەند کیلۆمەترە؟ دەبێ بزانین ساڵی تیشکی چەندەو تیشک لە ساڵێکدا چەند کیلۆمەتران دەبڕێ؟ دوایی ئەنجامەکەی جارانی تەمەنی گەردوون بکەین، بۆ ئەوەی تیرەی گەردووونمان بە کیلۆمەتر بۆ دەربچێت.

ساڵی تیشکیی (**السنة الضوئية**) ئەو ماوەیە کە تیشک لە ماوەی ساڵێکدا دەیبڕێ، پێشتریش باسمان کرد کە تیشک لە چرکەیەکدا سێسەد هەزار (٣٠٠،٠٠٠) کیلۆمەتر دەبڕێ، کەواتە: بۆ ئەوەی بزانین تیشک لە ساڵێکدا چەند دەبڕێ دەبێ:

أ)- ئەو سێسەد هەزار (٣٠٠،٠٠٠) کیلۆمەترە کە تیشک لە چرکەیەکدا دەیبڕێ، جارانی شەستی بکەین، بۆ ئەوەی بزانین لە خولەکێکدا چەند دەبڕێ؟ سێسەد هەزار (٣٠٠،٠٠٠) جارانی شەست (١٨٠٠٠٠٠٠=٦٠×٣٠٠٠٠٠) کلم، یەکسانە بە هەژدە ملیۆن کیلۆمەتر لە خولەکێکدا، خۆر هەژدە ملیۆن کیلۆمەتر لە خولەکێک دا دەبڕێ.

ب)- ئنجا بۆ ئەوەی بزانین تیشک لە سەعاتێکدا چەند دەبڕێ؟ هەژدە ملیۆن (١٨،٠٠٠،٠٠٠) کیلۆمەتر جارانی شەست دەکەین، واتە: شەست دەقیقە، بۆ ئەوەی

www.alibapir.com

بزانین لە سەعاتێکدا چەند دەبڕێ؟ (١٨٠٠٠,٠٠٠×٦٠=١٠,٨٠,٠٠٠,٠٠٠) دەکاتە ملیارێک و هەشتا ملیۆن کیلۆمەتر لە سەعاتێک دا.

**ج)-** ئنجا بۆ ئەوەی بزانین لە بیست و چوار سەعاتدا واتە: لە شەو ڕۆژێکدا تیشک چەند کیلۆمەتر دەبڕێ، ماوەی چەند کیلۆمەتر؟ دەبێ بڵێین: ملیارێک و هەشتا ملیۆن کیلۆمەتر جارانی بیست و چوار سەعات، دەکاتە (١٠,٨٠,٠٠٠,٠٠٠=٢٥,٩٢٠٠٠٠٠٠٠) کلم بیست و پێنج ملیارو نۆسەدو بیست ملیۆن کیلۆمەتر لە شەو ڕۆژێکدا.

**د)-** ئنجا بۆ ئەوەی بزانین تیشک لە ماوەی ساڵێکدا چەند دەبڕێ؟ دەبێ بیست و پێنج ملیارو نۆسەدو بیست ملیۆن، جارانی سێسەدو شەست و پێنج ڕۆژ بکەین (٢٥,٩٢٠٠٠٠٠٠٠=٩٤٦٠٥٢٨٠٠٠٠٠٠)، کە دەکاتە: نۆ تریلیۆن و چوار سەدو شەست ملیارو پێنج سەدو بیست و هەشت ملیۆن کیلۆمەتر لە ساڵێکدا، واتە: بە نزیکخراوەیی دەڵێین: نۆ تریلیۆن و نیو کیلۆمەتر تیشک لە ساڵێکدا دەیبڕێ.

**هـ)-** ئنجا ئەمە جارانی تەمەنی گەردوون دەکەین: نۆ تریلیۆن و چوار سەدو شەست ملیار و پێنجسەدو بیست و هەشت ملیۆن کیلۆمەتر جارانی: سێزدە ملیارو هەشتسەد ملیۆن (٩,٤٦٠,٥٢٨,٠٠٠,٠٠٠×١٣,٨٠٠,٠٠٠,٠٠٠=٨,٨×$١٠^{٢٣}$) [هەشت پۆینت هەشت جارانی دە توان بیست و سێ]، کیلۆمەتر.

ئەگەر بە زمانێکی سادەتر بیڵێین، دەڵێین: هەشتاو هەشت ملیۆن ملیۆن ملیۆن ملیۆن، واتە: واتە: هەشتاو هەشت بیست و چوار سفری هەبێ، ئەوەندە کیلۆمەترە تیرەی مەزەندەکراوی گەردوونە[1]، هەڵبەتە زانایان دەڵێن: لە کاتێکدا ئەو مەزەندەیەش دەکرێ کە ئێمە خۆمان داناوە لە نێوەڕاستی گەردووندین و وامان داناوە کە گۆی زەوی دەکەوێتە نێوەڕاستی گەردوونەوە، بەڵام ئەگەر ئەم

---

(١) بۆیە تەمەنی گەردوون جارانی کیلۆمەترەکانی بڕاوی ساڵی تیشکیی دەکرێن، بە مەنەی ئەوە کە گەردوون هەر لە سەرەتای دەستپێك و سەرهەڵدانیەوە کە سینگولاریتیی تەقیوەتەوە، بەخێرایی تیشك لێککشاوە و، بێگومان ئەو ژمارە و ڕایانەش هەموویان مەزەنەیی و نزیکراوەیی (تقريبي)ن.

www.alibapir.com


گۆی زەوی ئێمـە لـە سـووچێکی گـەردوون دا بـێ، مانـای وایـە ئەنـدازەی تیرەکـەی زۆر زیاتـرە، هەڵبەتـە ئەویـش هەمـووی ئەوەیـە کـە تاکـو ئێسـتا تەلسـکۆبەکان بینیویانـن و دەیبینـن، ئەویـش بـە مەزەندەکـردن، لـەو تیرەیـەدا وەک پێشـتر گوتمـان دوو تریلیـۆن کەهکەشـان (گالاکسـیی) مەزەنـدە دەکـرێ هەبـن، واتە: دوو هـەزار ملیار کەهکەشـان!

**٣- قەبـارەی گـەردوون:** قەبـارەی گـەردوون مەزەنـدە کـراوە بـە: سـێ پۆینـت پەنجـاو هەشـت پۆینـت سـێ جـارانی دە تـوان هەشـتا مەتـر سـێجا (٣,٥٨×١٠^٨٠)م٣، ئەگـەر بیکەینـە کیلۆمەتـر سـێجا، دەبـێ بڵێیـن: پەنجـاو هەشـت پۆینـت سـێ جـارانی دە تـوان حەفتـاو حـەوت (٣,٥٨×١٠^٧٧کلـم٣) واتـە: سێسـەدو پەنجـاو هەشـت، حەفتـاو حـەوت سـفری هەبـێ، ئەوەنـدە کیلۆمەتـر سـێجا قەبـارەی گـەردوونی مەزەنـدە کـراوە.

**٤- بارسـتایی (کپافـە)ی گـەردوون:** بارسـتایی گـەردوون و قورسـاییەکەی، مەزەندە دەکـرێ بـە یـەک پۆینـت چـل و شـەش، جـارانی دە تـوان پەنجـاو سـێ کیلۆگـرام (١\١٤٦×١٠^٥٣) کلغـم ئەگـەر بیکەیـن بـە تـەن دەبـێ بڵێیـن: یـەک پۆینـت چل وشـەش جـارانی دە تـوان پەنجـا تـەن، ئەمـە کێـشی مەزەندەکـراوی گەردوونـە، ئەوانـەش هەموویـان ژمارەیەکـن لـە خەیاڵـی مرۆڤیشـدا بـە زەحمـەت جێیـان دەبێتـەوە، چ جـای بتوانـێ لەسـەر کاغـەز بیاننووسـێ.

### بڕگـەی دووەم: خـــۆر:

ئەویش بە کورتیی لە چوار بڕگەدا باس دەکەین:

**١)-** تیرەی خۆر، واتە: لەمسەر بۆ ئەو سەری خۆر: بە ملیۆنێک و چوار سەد هەزار کیلۆمەتر مەزەندە کراوە: (١,٤٠٠,٠٠٠).

**٢)-** چێوە (**دائرة**)ی خۆر، بازنەکەی، بە چوار ملیۆن و سێسەدو حەفتاو نۆ هەزار (٤,٣٧٩,٠٠٠) کیلۆمەتر مەزەندە دەکرێ.

www.alibapir.com



**٣)-** قەبارە (**حجم**)ی خۆر: زۆر زۆرە بە یەک پۆینت چل و یەک جارانی دە توان هەژدە کیلۆمەتر سێجا (١,٤١×$١٠^{١٨}$کلم$^{٣}$) واتە: سەدو چل و یەک هەژدە سفری لە پێشەوە بێت، واتە: یەک ملیۆن ملیۆن ملیۆن کیلۆمەتر سێجا.

**٤)-** بارستایی خۆر و قورساییەکەی: یەک پۆینت نۆ هەزارو هەشت سەدو هەشتاو چوار (١,٩٨٨٤) جارانی دە توان سی ($١٠^{٣٠}$) کیلۆگرام، یاخود یەک پۆینت نۆ هەزارو هەشتسەدو هەشتاو چوار، جارانی دە توان بیست و حەوت تەن (١/٥٨٨٤×$١٠^{٢٧}$تەن)، خۆریش سێسەدو سی و سێ هەزار جار هێندەی زەوی قورسەو، بە نسبەت قەبارەکەشی: خۆر ملیۆنێک و سێسەد هەزار (١,٣٠٠,٠٠٠) جار هێندەی زەوییە، واتە: (١,٣٠٠,٠٠٠) زەوی وەک ئێمە لە نێو خۆردا جێگایان دەبێتەوە!

### بڕگەی سـێیەم: زەوی:

ئەمیش لە چوار خاڵ دا باس دەکەین:

**أ)-** تیرە (**قطر**)ی زەوی: دوازدە هەزارو حەوتسەدو چل و دوو (١٢,٧٤٢) کیلۆمەترەو، نیوە تیرە (**نصف القطر**)کەی: شەش هەزارو سێسەدو حەفتاو یەک (٦٣٧١) کیلۆمەترە، نیوە تیرەکەی واتە: لە نێوە ڕاستیی زەویەوە بۆ ئەولا، یاخود بۆ ئەولا، ئەوە نیوەتیرەکەیەتی، بەڵام لەو سەر بۆ ئەوسەری زەوی، چ لە ڕۆژهەڵاتەوە بۆ ڕۆژئاوا، چ لە باکوورەوە بۆ باشوور، تیرەی زەوی (١٢,٧٤٢) کیلۆمەترە.

**ب)-** چێوە (**محیط، دائرة**)ی زەوی: واتە: بازنەکەی، بریتیە لە چل هەزارو حەفتاو پێنج (٤٠٠٧٥) کیلۆمەترە.

**ج)-** قەبارەی زەوی: بریتیە لە یەک پۆینت هەشتاو سێ جارانی دە توان دوازدە کیلۆمەتر سێجا (١/٨٣×$١٠^{١٢}$کلم$^{٣}$) واتە: سەدو هەشتاو سێ، دوازدە سفری لە پێشەوە بێ، ئەوەندە کیلۆمەتر سێجا.

www.alibapir.com


د)- بارستایی زەوی: واتە: کێشی زەوی، بریتیە لە پێنج پۆینت نەوەدو حەوت جارانی دە توان بیست و چوار کیلۆگرام یاخود: پێنج پۆینت نەوەدو حەوت جارانی دە توان بیست و یەک (٥/٩٧×١٠^٢٢ تەن) تەن، ئەوەندە کێشی زەوییە، شایانی باسە: قەبارەی زەوی پەنجا هێندەی هی مانگە، واتە: پەنجای وەک مانگ لە نێو قەبارەی زەویدا جێیان دەبێتەوە، چونکە مانگ قەبارەکەی بریتیە لە سەدا دوو (٢٪)ی قەبارەی زەوی.

## برگەی چوارەم: مـــانگ:

ئەمیش لە پێنج خاڵ دا دەخەینەڕوو:

أ)- تیرەی مانگ: سێ هەزارو چوار سەدو حەفتاو چوار (٣٤٧٤) کیلۆمەترە لەو سەر بۆ ئەوسەری مانگ.

ب)- چێوەی مانگ: دە هەزارو نۆ سەدو بیست و یەک (١٠٩٢١) کیلۆمەترە، چوار دەوری مانگ.

ج)- قەبارەی مانگ: دوو پۆینت هەزارو نۆ سەدو پەنجاو هەشت، جارانی دە توان دە کیلۆمەتر سێجا (٢/١٩٥٨×١٠^١٠ کلم٣)، کە سەدا دووی قەبارەی زەوییە.

د)- بارستایی مانگ: حەوت پۆینت سێسەدو چل و دوو، جارانی دە توان بیست و دوو کیلۆگرام، یاخود: حەوت پۆینت سێسەدو چل و دوو، جارانی دە توان نۆزدە (٧/٣٤٢×١٠^١٩ تەن) تەن، ئەوەندە قورساییەکەیەتی.

هـ)- دووریی مانگ لە زەوی لە نێوان سێسەدو شەست هەزار (٣٦٠٠٠٠) کیلۆمەتر تاکو سێسەدو هەشتاو چوار هەزار (٣٨٤٠٠٠) کیلۆمەتردا، مەزەندە دەکرێ، لەبەرئەوەی مانگ کە بە دەوری زەوی دا دەخولێتەوە، هەندێک جار لێی نیزیک دەبێتەوەو هەندێک جاریش لێی دووردەکەوێتەوە.

www.alibapir.com


## بڕگەی پێنجەم: بەراوردی نێوان خۆرو زەوی و مانگ:

**١)**- زەوی: سەدو پەنجا ملیۆن (١٥٠,٠٠٠,٠٠٠) کیلۆمەتر لە خۆرەوە دوورە.

**٢)**- مانگ: لە نێوان سێسەدو شەست هەزار (٣٦٠,٠٠٠) تاکو سێسەدو هەشتاو چوار هەزار (٣٨٤,٠٠٠) کیلۆمەتر لە زەوییەوە دوورە.

**٣)**- مانگ: یەک لەسەر چوارسەدی (١/٤٠٠) دووریی خۆر لێمانەوە دوورە، واتە: خۆر چوار سەد (٤٠٠) هێندەی دووریی مانگ لە زەوییەوە دوورە، ئنجا لێرەدا وردەکاریی و ئەندازەگیریی سەرسوڕهێنەری خوای کارزان و کاربەجێ و، خاوەن توانای بێ سنوورو میهرەبانیی ڕەها، بۆ ئێمە دەردەکەوێ: ئێمە هەر کام لە مانگ و خۆر، بە ئەندازەی یەک دەبینین، بە قەدەر کەلە بێژینگێک، کەچی خۆر نەک هەر زۆر لە مانگ گەورەترە، بەڵکو خۆر ملیۆنێک و سێسەد هەزار (١٣٠٠,٠٠٠) جار هێندەی زەوییە، بەڵام لەبەر ئەوەی دووریی خۆر لە ئێمەوە، چوار سەد هێندەی دووریی مانگە لە ئێمەوە، بۆیە ئەوەندە دێتە بەرچاو.

**٤)**- چێوەی خۆر: واتە: بازنەکەی بریتیە لە سەدو نۆ پۆینت دوو، هێندەی چێوەی زەوی، چونکە چوار ملیۆن و سێسەدو حەفتاو نۆ (٤,٣٧٩,٠٠٠) هەزار کیلۆمەتر دابەشی چل هەزارو حەفتاو پێنج (٤٠,٠٧٥) کیلۆمەتر کە چێوەی زەوییە، دەکاتە سەدو نۆ پۆینت دوو (٤٣٧٩٠٠٠÷٤٠,٠٧٥=١٠٩,٢).

**٥)**- تیرەی خۆر: سەدو نۆ پۆینت هەشت (١٠٩/٨) هێندەی تیرەی زەوییە، چونکە ملیۆنێک و چوار سەد (١,٤٠٠,٠٠٠) هەزار دابەشی دوازدە هەزارو چوار سەدو حەفتاو دوو، یەکسانە بە سەدوو نۆ پۆینت هەشت ١٤٠٠٠٠٠÷١٢٤٧٩=١٠٩/٨).

**٦)**- چێوەی زەوی: بازنەی زەوی، سێ و دوو لەسەر سێ هێندەی چێوەی مانگە، چونکە چل هەزارو حەفتاو پێنج (٤٠٠٧٥) کیلۆمەتر دابەشی دە هەزارو نۆ سەدو بیست ویەک (١٠٩٢١) کیلۆمەتر، یەکسانە بە سێ پۆینت شەست و حەوت (٤٠٠٧٥÷١٠٩٢١=٣/٦٧) واتە: سێ و دوو لەسەر سێ.

www.alibapir.com


٧)- ئێمە لە تیشکی خۆر: یەک لەسەر بیست ملیۆن بەش (٢٠,٠٠٠,٠٠٠/١) بەشێکمان پێ دەبڕێ، واتە: تیشکی خۆر تەنیا یەک لەسەر بیست ملیۆن بەشێکی دەگاتە ئێمە، ئنجا ئەگەر زەوی لە خۆر نزیکتر بووایەو، لە جیاتی یەک لەسەر بیست ملیۆن (٢٠,٠٠٠,٠٠٠/١)، بۆ وێنە: دە لەسەر بیست ملیۆن (٢٠,٠٠٠,٠٠٠/١٠) یان پەنجا لەسەر بیست ملیۆن (٢٠٠٠٠٠٠٠/٥٠) لە تیشکی خۆرمان گەیشتبایە، بێگومان ئەوکاتە زەوی هەمووی هەڵدەپڕووکا.

٨)- زەوی وەک پێشتریش باسمان کردوە، بە نزیککراوەیی بە خێرایی سی (٣٠) کیلۆمەتر لە خولەکێکدا بە دەوری خۆیدا دەخولێتەوە، کە دەکاتە هەزارو هەشتسەد (٣٠×٦٠=١٨٠٠) کیلۆمەتر، زەوی دەیبڕێ لە سووڕانەوەی بە دەوری خۆیدا، بەڵام خێرایی سووڕانەوەی بە دەوری خۆردا شەست هێندەیە، واتە: لە چرکەیەکدا زەوی سی (٣٠) کیلۆمەتر دەبڕێ لە سووڕانەوەی بە دەوری خۆردا، بێگومان خولەکێکیش شەست چرکەیە، کەواتە: زەوی شەست هێندە خێراتر لە خولانەوەی بە دەوری خۆیدا بە دەوری خۆردا دەخولێتەوە و، دەکاتە سەدو هەشت هەزار کیلۆمەتر لە سەعاتێکدا (٣٠×٦٠×٦٠=١٠٨٠٠٠).

٩) هەروەها زەوی بە خێراییەکی زیاتریش لەگەڵ خۆرو کۆمەڵەکەیدا بە دەوری داڵی ڕاوەستاو (النَّسْر الجاثي)دا دەخولێتەوە، دوایی بە خێراییەکی دیکە لەگەڵ داڵی ڕاوەستاویشدا، دیسان بە نێو چەقی کەهکەشان دا دەخولێتەوەو، ئەوە چوار خولانەوەو، سووڕانەوەیەکی دیکەی پێنجەمیشی لەگەڵ هەموو کەهکەشانەکەدا، کەهکەشانی ڕێی کاکێشان بە دەوری چەقێکی دیکەدا دەخولێتەوە، واتە: بەلای کەمەوە زەوی پێنج سووڕانەوەی هەن:

١- خولانەوەیەکیان بە دەوری خۆیدا.

٢- سووڕانەوەیەک بە دەوری خۆردا.

٣- سووڕانەوەیەک لەگەڵ خۆر بە دەوری داڵی ڕاوەستاودا.

٤- سووڕانەوەیەک بە دەوری چەقی کەهکەشان دا.

٥- سووڕانەوەیەک لەگەڵ کەهکەشان دا بە دەوری چەقێکی دیکەدا!!

www.alibapir.com

کەچی ئێمە هەست بە هیچ کام لەو سووڕانەوانەی زەوی ناکەین.

**١٠)** بێگومان هەرکام سووڕانەوەی زەوییش پێویستن:

**أ-** جارێ هی بە دەوری خۆیدا، زەوی ئەگەر بە دەوری خۆیدا نە خولابایەوە، شەوو ڕۆژ پەیدا نەدەبوون و، ئەگەر زەوی وەستاو بووایە ئەو دیوەی دەکەوتەڕووی خۆر، گەرمییەکەی لە سەدو پەنجا (١٥٠) پلەی گەرمیی زیاتر دەبوو، واتە: هەموو شتێک دەسووتاو، ئەو دیوەش کە پشتی لە خۆر دەبوو، دەیبەست و دەبوو بە دوو سەدو حەفتاو دوو (٢٧٢) پلە لە ژێر سفرەوەو، دەبوو بە بەستەڵەک و سفری موتڵەق.

هەروەها ئەگەر خولانەوەکەشی بە دەوری خۆیدا لەوەی ئێستا هەیە، خێراتر بووایە، شەوو ڕۆژ کورتتر دەبوون و، ئەگەر سستتر بووایە، شەوو ڕۆژ درێژتر دەبوون، لە هەردوو حاڵانیشدا ژیانی مرۆڤ وەک ئێستا ڕێک نەدەبوو، یان هەر نەدەبوو.

**ب-** هەروەها زەوی ئەگەر بە دەوری خۆردا نەخولابایەوە، چوار کەشەکانی ساڵ دروست نەدەبوون، چوار کەشەکان: زستان و بەهارو پاییزو هاوین، ئەو چوار کەشانە دروست نەدەبوون، چونکە لە ئەنجامی سووڕانەوەی زەوی بە دەوری خۆردا، بە سوڕگەیەک کە بە بیست و سێ پلەو نیو (٢٣/٥) لارە، نەک بەشێوە ڕێک بە دەوری خۆردا، بەڵکو لارەو لە هەندێک کاتان دا، هەندێک شوێنی نیزیکتر دەکەوێتەوە لە خۆر، ئەوە گەرمتر دەبێت و دەبێتە هاوین و، ئەو شوێنەی دوورترە دەبێتە زستان، ئنجا ئەگەر ئەو لارییەی لە سوڕگەکەیدا هەیە، لە کاتی خولانەوەیدا نەبووایە، چوار کەشەکانی ساڵ لەسەر زەوی دروست نەدەبوون.

کەواتە: کە خوا دەفەرموێ: ﴿ ٱلشَّمْسُ وَٱلْقَمَرُ بِحُسْبَانٍ ۝٥ وَٱلنَّجْمُ وَٱلشَّجَرُ يَسْجُدَانِ ۝٦ وَٱلسَّمَآءَ رَفَعَهَا وَوَضَعَ ٱلْمِيزَانَ ۝٧ أَلَّا تَطْغَوْا۟ فِى ٱلْمِيزَانِ ۝٨ ﴾ خوا بسم الله الرحمن الرحيم لێرەو لە چەند شوێنی دیکەدا باسی بەرزکرانەوەی ئاسمان و فراوانکردنی ئاسمان دەکات، ئەوەتا ئێستا زانست کە بەرەو پێشەوە چووە، مرۆڤ دەزانێ، خوا بسم الله الرحمن الرحيم چی فەرمووە! بۆیە کۆتایی زانست سەرەتای وەحییە، نەک وەک هەندێک

www.alibapir.com



خەڵکی نەزان یان خۆ نەزانکەر، پێیان وایە ئەگەر زانست بەرەو پێشەوە بچێ، ئایین دەکەوێتە ژێر پرسیار! ئایین[1] ئەگەر وەحیی ساغ بێ و فەرمایشتی خوا بێ، زانست باسی دروستکراوی خوا دەکات و، وەحییش فەرمایشتی خوایە، ئنجا هەتا دروستکراوی خوا زیاتر بزانرێ زیاتر لەگەڵ فەرمایشتی خوادا دەگونجێ و زیاتر دەردەکەوێ خوا ﷻ چی فەرمووە؟ هەتا زانست پتر بەرەو پێشەوە بچێ، دروستکراوەکانی خوا زیاتر دەناسرێن و، کە زیاتریش ناسران و زانران و زانیارییمان زیاتر لە بارەیانەوە هەبوو، ئەو فەرمایشتەی خوا کە لە بارەی دروستکراوەکانی خۆیەوە فەرموویەتی، زیاتر بۆمان دەردەکەوێ، بۆ وێنە:

١- خوا فەرموویەتی: ئێمە ئاسمانمان بەرزکردۆتەوە (وَٱلسَّمَآءَ رَفَعَهَا) الرحمن.

٢- یان دەفەرموێ: ئاسمان لێک دەکێشینەوە: ﴿وَٱلسَّمَآءَ بَنَيْنَٰهَا بِأَيْيْدٍ وَإِنَّا لَمُوسِعُونَ ﴿٤٧﴾﴾ الذاريات.

٣- یان دەفەرموێ: ئایا نابینن کە ئاسمانەکان و زەوی یەک بوون و دوایی لە یەکمان جیاکردنەوە، ﴿أَوَلَمْ يَرَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوٓا۟ أَنَّ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ كَانَتَا رَتْقًا فَفَتَقْنَٰهُمَا ﴿٣٠﴾﴾ الأنبياء.

٤- هەروەها کە دەفەرموێ: ﴿ٱلشَّمْسُ وَٱلْقَمَرُ بِحُسْبَانٍ ﴿٥﴾﴾، خۆرو مانگ بە حیساب و بە ژمارەو بە ئەندازەگیریی دانراون، ئێستا کە زانست بەرەو پێش چووە، چاک دەزانین ئەو حیساب و وردەکارییەی لە خۆرو مانگ دا ڕەچاو کراوە چییەو چۆنە؟!

٥- هەروەها خوا ﷻ کە دەفەرموێ: ﴿أَلَمْ نَجْعَلِ ٱلْأَرْضَ مِهَٰدًا ﴿٦﴾﴾ النبأ، واتە: ئایا زەوییمان بۆ نەکردوون بە بێشکەو لانکە! لانکەو بێشکە و منداڵی گچکە تێدەهایشترێ و ڕادەژێنرێ، خواش زەوی تەشبیە کردوە بە لانکە بێشکە جۆڵانە، واتە: ئەو زەوییە ئێوە ڕادەژێنێ: بە دەوری خۆیدا دەخولێتەوەو بە دەوری خۆردا

---

(١) ئایین بەمانا باوەکەی کە بەرنامەی خوایە، نەک بە مانا زمانەوانییەکەی کە هەر بەرنامەیەکە چ خوا کرد بێ، چ مرۆڤکرد.

www.alibapir.com


دەخولێتەوەو پێنج جۆرە سووڕانەوەی هەن، وەک چۆن لانکەو بێشکەیەک ئەو منداڵەی تێیهاویژراوە، دەیجووڵێنێ، بەڵام نایکەوێنێ، ئەو زەوییەش لە ژێر ئێوەدا، چەندان خولانەوەو سووڕانەوەی هەن، بەڵام ناشتانکەوێنێ.

کەواتە: تاکو زانست بەرەو پێشەوە بچێ، وردەکارییەک کە خوا لە دروستکراوەکانی خۆیدا داناوە، زیاتر دەردەکەوێ، ئەو فەرمایشتەی خواش کە باسی دروستکراوەکانی خۆی دەکات و، باسی وردەکارییەک دەکات کە خوا ڕەچاوی کردوە لە دروستکراوەکانی خۆیدا، پتر تێیدەگەین و قەدری دەزانین، وەک خوا دەفەرمووێ: ﴿صُنْعَ اللَّهِ الَّذِي أَتْقَنَ كُلَّ شَيْءٍ إِنَّهُ خَبِيرٌ بِمَا تَفْعَلُونَ ﴿٨٨﴾﴾ **النمل**، واتە: دروستکراوی خوا کە هەموو شتێکی بە ئەوپەڕی وردەکاریی دروستکردوە، دیسان کە دەفەرمووێ: ﴿إِنَّا كُلَّ شَيْءٍ خَلَقْنَاهُ بِقَدَرٍ ﴿٤٩﴾﴾ **القمر**، واتە: ئێمە هەموو شتێکمان بە ئەندازەگیریی دروستکردوە.

بەڵێ تاکو زانیاریی و هۆشیارییمان زیاتر بێ و، عەقڵمان دەوڵەمەندتر بێ بە شارەزایی، زیاتر قەدری فەرمایشتی خوا دەزانین و باشتر لە فەرمایشتەکەی خوا حاڵیی دەبین، کە لە بارەی دروستکراوەکانی خۆیەوە فەرموویەتی.

بۆیە من پێم وایە بەڕاستیی لەسەر مسوڵمانان فەرزە کە لە زانیاریی ڕۆژگاریی خۆیان، شارەزابن، چ لە بارەی گەردووناسییەوە، لە بارەی فیزیاو کیمیاوە، لە بارەی زەوی ناسییەوە، لە بارەی زیندەوەرزانییەوە، لە بارەی کۆرپەلە زانییەوە، لە بارەی کۆمەڵناسییەوە، دەبێ لە هەموو بارەکانەوە هەوڵبدەن زانیاریی ڕۆژگاری خۆیان باش بزانن، بۆ ئەوەی باشتر پێی لە قورئان تێ بگەن، چونکە قەدری زێڕ لەلای زێڕنگەرەو، کەسێک باش لە فەرمایشتی خوا تێدەگات، بەتایبەت ئەو فەرمایشتەی لە بارەی دروستکراوەکانی خواوە دەدوێ، کە دروستکراوەکانی خوا چاک بزانێ و، پێیان ئاشنابێ و، بە وردەکارییەکانیان زانابێ.

www.alibapir.com


## مەسەلەی دووەم:

**باسی شەشی دیکە لە چاکەکانی خوای بە بەزەیی کە بریتین لە: دروستکردنی مرۆڤ لە قوڕی وشک بووەوەو، جند لە ئاگری بێ خڵتە، یان ئاگری تێکەڵ و، ڕەخساندنی دوو ڕۆژهەڵات و دوو ڕۆژئاوا لەسەر زەوی و، تێکەڵکردنی دوو دەریایەکان بەبێ ئاوێتەی یەکدیی بوون، بە هۆی پەردەیەکەوە لە نێوانیانداو، دەرهاتنی گەوهەرو مرواریی لەو دوو دەریایە کە مەبەست پێیان ئاوی سوێرو شیرینەو، کەشتییە دروستکراوەکانی وەک چیا بەرزەکان، کە ئەوانیش خوا بسم الله الرحمن الرحيم هەر بە موڵکی خۆی دایاندەنێ، هەرچەندە مرۆڤەکان دروستیان دەکەن، چونکە هەم مرۆڤەکان دروستکراوی خوان و، هەم ئەو کەرستەیەش کەشتییەکانی پێ دروست دەکەن، هەموویان دروستکراوی خوان:**

خوا دەفەرمووێ: ﴿ خَلَقَ ٱلْإِنسَـٰنَ مِن صَلْصَـٰلٍ كَٱلْفَخَّارِ ﴿١٤﴾ وَخَلَقَ ٱلْجَآنَّ مِن مَّارِجٍ مِّن نَّارٍ ﴿١٥﴾ فَبِأَىِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ ﴿١٦﴾ رَبُّ ٱلْمَشْرِقَيْنِ وَرَبُّ ٱلْمَغْرِبَيْنِ ﴿١٧﴾ فَبِأَىِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ ﴿١٨﴾ مَرَجَ ٱلْبَحْرَيْنِ يَلْتَقِيَانِ ﴿١٩﴾ بَيْنَهُمَا بَرْزَخٌ لَّا يَبْغِيَانِ ﴿٢٠﴾ فَبِأَىِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ ﴿٢١﴾ يَخْرُجُ مِنْهُمَا ٱللُّؤْلُؤُ وَٱلْمَرْجَانُ ﴿٢٢﴾ فَبِأَىِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ ﴿٢٣﴾ وَلَهُ ٱلْجَوَارِ ٱلْمُنشَـَٔاتُ فِى ٱلْبَحْرِ كَٱلْأَعْلَـٰمِ ﴿٢٤﴾ فَبِأَىِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ ﴿٢٥﴾ ﴾.

## شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە دوازدە بڕگەدا:

لە سێزدە ئایەتی پێشوودا خوا بسم الله الرحمن الرحيم باسی چواردە لە چاکەو نیعمەتەکانی خۆی کرد، ئنجا دوای باسکردنی چواردە لە چاکەو نیعمەتەکانی، فەرمووی: ﴿ فَبِأَىِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ ﴾، ئەی جندو مرۆڤ! نکوولیی لە کام لە چاکەکانی پەروەردگارتان دەکەن و دانیان پێدا ناهێنن؟ ئنجا دووبارە خوا بسم الله الرحمن الرحيم دەست دەکاتەوە بە ژماردنی ژمارەیەکی دیکە لە چاکەو نیعمەتەکانی خۆی کە شەش دانەن:

www.alibapir.com


## چاکەی یەکەم:

**١)-** ﴿خَلَقَ ٱلۡإِنسَٰنَ مِن صَلۡصَٰلٖ كَٱلۡفَخَّارِ﴾، مرۆڤی هێناوەتە دی لە (صَلْصَال) ێک کە وەک فەخخارە، (صَلْصَال) هەموو زانایان دەڵێن: **(الطِّينُ الْيَابِسُ)**، قوڕی وشک بووەوە، بە جۆرێک کە ئەگەر شتێکی لێ بدەی، زرینگەی لێ بێ، چونکە (صَلْصَلَة) بە مانای زرینگە دێ.

لە تەفسیری: ﴿صَلۡصَٰلٖ كَٱلۡفَخَّارِ﴾دا، **(الطبري)** لە تەفسیرەکەی خۆیدا هێناویەتی دەڵێ: **(خَلَقَ اللَّهُ الْإِنْسَانَ، وَهُوَ آدَمُ مِنْ صَلْصَالٍ: وَهُوَ الطِّينُ الْيَابِسُ الَّذِي لَمْ يُطْبَخْ، فَإِنَّهُ مِنْ يُبْسِهِ لَهُ صَلْصَلَةٌ إِذَا حُرِّكَ وَنُقِرَ كَالْفَخَّارِ؛ يَعْنِي أَنَّهُ مِنْ يُبْسِهِ وَإِنْ لَمْ يَكُنْ مَطْبُوخًا، كَالَّذِي قَدْ طُبِخَ بِالنَّارِ)، (أخرجه: الطبري: ج٢٧، ص١٣١، عن قتادة: ٣٣٠٢٨، عن ابن عباس: ٣٣٠٢١)**

واتە: خوا ﷻ مرۆڤی کە مەبەست پێی ئادەمە، لە صەڵصاڵ دروستکردوە، **(صَلْصَال)**یش مەبەست پێی قوڕێکی وشک بووەوەیە کە سوور نەکراوەتەوە، بەڵام هێندە وشکە کە وەک خەزەف زرینگەی لێ دێ، ئەگەر بجووڵێنرێ و پەنجەی لێبدرێ، **(فَخَّار)**یش بریتیە لەو قوڕەی بە ئاگر سووتێنراوە {وەک خشتی سوورەوە کراو و دیزەو گۆزە کە سوور دەکرێنەوە}.

**٢)-** ﴿وَخَلَقَ ٱلۡجَآنَّ مِن مَّارِجٖ مِّن نَّارٖ﴾، (خوا ﷻ) جاننیشی هێناوەتە دی، لە (مَارِج) لە ئاگر، (مَارِج: **اللَّهَبُ الخَالِص**)، (مارج) بە شەش واتایان لێکیان داوەتەوە:

١- **(اللَّهَبُ الْمُخْتَلَطُ بِسَوَاد)**، بڵێسەیەک کە تیکەڵ بوو بێ لەگەڵ ڕەشایی دا.

٢- **(خَالِصُ النَّار)** ئاگرێکی بێ خڵتە.

٣- **(لَهَب النَّار)** بڵێسەی ئاگر.

٤- **(مَا اخْتلط بَعْضُه بِبَعْض)** ئەو بڵێسەیەی هەندێکی لەگەڵ هەندێکی تێکەڵ بووە.

٥- **(أحْسَنُ النَّار)** باشترین جۆری ئاگر، واتە: بەهێزترینی.

www.alibapir.com


٦- (**اللَّهَبُ الأَصْفَرُ وَالأَخْضَرُ الَّذِي يَعْلُو النَّار إِذَا أُوقِدَت**) ئەو بڵێسە زەردو سەوزەی لەسەر ئاگرەکە، بەرز دەبێتەوە کاتێک دادەگیرسێنرێ.

(**الطبري**) لە تەفسیرەکەی خۆی دا ئەم ڕایانەی هێناوە[1].

دەربارەی مانای وشەی (**جانّ**)یش دوو ڕا هەن:

أ- هەندێک دەڵێن: (**الجانّ أبو الجن**) وەک چۆن ( **آدم أبو الإنس**) ئادەم بابی مرۆڤانە، جاننیش بابی جندانە.

ب- هەندێکیش دەڵێن: (**جانّ**) کۆی (**جِنّ**)، بەڵام ڕای یەکەمیان ڕاستتر پێدەچێ کە (**جانّ**) لە بەرانبەر ئادەم بێ و، ئادەم بابی مرۆڤانەو، جاننیش (کە ئیبلیسە) بابی کۆمەڵی جندە.

٣)- ﴿فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ﴾، ئەی جندو مرۆڤ! لە کام لە چاکەکانی پەروەردگارتان نکووڵیی دەکەن و بە درۆی دادەنێن و بڕوای پێناهێنن؟ شایانی باسە: (**الطنطاوي**) لە تەفسیرەکەی خۆیدا ڕایەک دێنێ، پێم باش بوو ئاماژەیەکی پێ بکەم، لە بارەی ئەوەوە کە دەفەرموێ: ﴿خَلَقَ ٱلۡإِنسَٰنَ مِن صَلۡصَٰلٖ كَٱلۡفَخَّارِ﴾، دەڵێ: (**وَهَذَا إِيْضَاحٌ لِخَلْق الإنْسَانِ، وَبَيانِه، أَنَّهُ كَمَا أَنَّ الطِّيْنَ المَطْبُوخ مُرَكَّبٌ مِنْ مَادَةٍ أَرْضِيَةٍ وَحَرَارَةٍ سَوَّتْهُ وَأَنْضَجَتْهُ لِتَحفظَ كِيَانَهُ؛ هَكَذَا هَذَا الإنْسَانُ لَهُ شَهْوَةُ الطَّعَامِ وَالشَّرَابِ وَالتَّزَاوجِ، وَلَهُ قُوَّةٌ غَضَبِيَّةٌ ثَوَّرَتْهُ الشَّجَاعَة، وَهَذِهِ فِي الإنْسَانِ تُقَابِلُ طَبْخَ الطِّيْنِ لِيَصِيرَ فَخَّاراً، إِذْ لَا بَقَاءَ للطِّيْنِ بِغَيْرِ طَبْخٍ بِالنَّارِ لِتَسْتَمْسِكَ أَجْزَاؤُهُ وَيَبْقَى بِنَاؤُهُ**)[2].

واتە: کە خوا دەفەرموێ: ﴿خَلَقَ ٱلۡإِنسَٰنَ مِن صَلۡصَٰلٖ كَٱلۡفَخَّارِ﴾، ئەمە ڕوونکردنەوەیە بۆ دروستبوونی مرۆڤ و پێکهاتەکەی، هەروەک چۆن قوڕی سوورکراوە لە خاکی زەوی و گەرمایییەک پێکهاتووەو، گەرماییەکەیە ئەو قوڕە

---

(١ ) ج: ٢٧، ص: ١٣٢، ١٣٣.

(٢ ) الجواهر: ج: ٢٤، ص: ١٩.

www.alibapir.com


بەهێز دەکات و پێی دەگەیەنێ {قوڕ ئەگەر بەس خۆی بێ، هەڵدەوەرێ، بەڵام کاتێک دەسووتێنرێ بە شێوەیەکی تایبەت، دیزەو گۆزەی لێ دروست دەکرێ، شەربەو کووپەی لێ دروست دەکرێ، خشتەی سووری لێ دروست دەکرێ و پتەو دەبێ} بە هەمان شێوە مرۆڤیش ئارەزووی خواردن و خواردنەوەی هەیەو، ئارەزووی هاوسەرگیریی هەیەو، هێزێکی تووڕە بوونی هەیە، کە ئازایەتیی تێیدا پەیدادەکات، ئەم سیفەتانەش لە مرۆڤ دا دەکەونە بەرانبەر سوور کردنەوەی قوڕ، بۆ ئەوەی ببێتە خەزەف، قوڕیش بەبێ سوور کرانەوە بە ئاگر ناتوانێ بمێنێتەوە، {بەڵکو شی دەبێتەوە بۆ گڵ و خۆڵ} بەڵام کە سوور کرایەوە، خۆی ڕادەگرێ.

ئێستا ئێمە زۆر ڕووداوی مێژوویی چۆن دەزانین؟ بێگومان بەهۆی ئەو کووپەو شەربەو گۆزەو دیزەو شتانەوە کە لە قوڕی سوورەوە کراو، مرۆڤ دروستی کردوون و، ئەو نووسینانەی لەسەریان نووسراون.

واتە: وەک چۆن قوڕەکە بەهۆی ئاگرەکەوە خۆی ڕادەگرێ و پتەو دەبێ، مرۆڤیش بەهۆی ئەو سیفەتانەوە کە خوا تێیدا داناون، دەمێنێتەوەو بەردەوام دەبێ.

هەرچەندە ڕواڵەتی ئایەتەکە زیاتر ئەوە دەگەیەنێ کە دروستکرانی ئادەم ﷺ، بە چەند قۆناغێکدا تێپەڕیوەو، گڵ و ئاو تێکەڵ کراوەو بۆتە قوڕ، قوڕەکە ماوەتەوە ڕەش داگەڕاوەو بۆنی کردووەو، دوایی وشک بۆتەوە، وەک خوای زاناو شارەزا فەرموویەتی وەک خەزەف (**فخار**)ی لێهاتووە.

## چاکەی دووەم:

ئنجا خوا ﷻ لە دوای ئەوە دەفەرموێ:

٤)- ﴿ رَبُّ ٱلۡمَشۡرِقَيۡنِ وَرَبُّ ٱلۡمَغۡرِبَيۡنِ ﴾، پەروەردگاری دوو ڕۆژهەڵاتەکان و پەروەردگاری دوو ڕۆژئاوایەکانە.

www.alibapir.com


زانایـان لـەو بـارەوە زۆر قسـەیان کـردوە، کـە مەبەسـت لـە دوو ڕۆژهـەڵات و دوو ڕۆژئاوایـەکان چییـە؟ بـەڵام ئـەوەی زیاتـر دێـتە زەینـەوە، یـانی: دوو ڕۆژهەڵاتـەکانی زەوی و دوو ڕۆژئاوایـەکانی زەوی، چونکـە زەوی بـە دەوری خـۆردا دەخولێتـەوە، هەرچەنـدە بەچـاو وادیـارە خـۆر بـە دەوری زەویـدا دەخولێتـەوە، بـەڵام لـە ڕاسـتییدا زەوی بـە دەوری خۆیـدا دەخولێتـەوە لـە بەرانبـەر خـۆردا، وێـڕای ئـەوەی بـە دەوری خۆریـش دا دەخولێتـەوە، لـە سـووڕگەیەکی بیسـت و سـێ پلـەو نیـو لاردا، هەڵبەتـە هـەر ڕۆژەش خـۆر لـە خاڵێـک هەڵـدێ و، لـە خاڵێکیـش ئـاوا دەبـێ، واتـە: هـەر ڕۆژە خـۆر خاڵـی هەڵهاتنـی و خاڵـی ئاوابـوونی جیایـە لـەوی دیکـە، بـەڵام بـە گشـتیی دەگونجـێ بڵێیـن: لە کـەشی زسـتاندا خۆرهەڵاتنـەکانی خـۆر بـۆ زەوی (نوقتـەکانی لێـوە هەڵهاتنـی) و نوقتـەکانی لێـوە ئاوابـوونی جۆرێکـن و، لـە کـەشی هاوینـدا جۆرێکـی دیکـەن، هـەروەک لـە کـەشی بەهـاردا جۆرێکـن و، لـە کـەشی پاییـزدا جۆرێکـی دیکـەن، بۆیـە لـە شـوێنێک دەفەرمـوێ: ﴿ رَبِّ ٱلْمَشَٰرِقِ وَٱلْمَغَٰرِبِ ﴿٤٠﴾ ﴾ **المعـارج**، واتـە: پـەروەردگاری ڕۆژهەڵاتـەکان و ڕۆژئاوایـەکان، لـە شـوێنێکی دیکەش دەفەرموێ: ﴿ رَبُّ ٱلْمَشْرِقِ وَٱلْمَغْرِبِ ﴿٢٨﴾ ﴾ **الشـعراء**، واتـە: پەروەردگاری ڕۆژهـەڵات و ڕۆژئـاوا (بەگشـتیی و وەک تێکـڕاو جینـس)، بەڵکـو لـە هـەر سـەعاتێک دا خـۆر خۆرهەڵاتێکـی هەیـەو خۆرئاوایەکـی هەیـە، لەبـەر ئـەوەی زەوی خـڕەو هـەر چـوار دەوری زەوی دەبێتـە خاڵـی خۆرهەڵاتـن و، بەرانبەرەکـەشی دەبێتـە خاڵـی خـۆر ئاوابـوون.

٥)- ﴿ فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ ﴾، ئەی مرۆڤ و جند! نکووڵیی لە کام لە چاکەکانی پەروەردگارتان دەکەن؟

دوای دروسـتکردنی مـرۆڤ و جنـد، وەک یەکەمیـن چاکـە، ئنجـا بـاسی دوو ڕۆژهـەڵات و دوو ڕۆژئاواییـەکان دەکات، وەک چاکـەی دووەم، ئنجـا دێتـە سـەر بـاس.

### چاکەی سێیەم:

٦)- ﴿ مَرَجَ ٱلْبَحْرَيْنِ يَلْتَقِيَانِ ﴾، دوو دەریایەکەی بەرهەڵدای یەکدی کردوون، پێک دەگەن، (مَرَج) بە مانای (أرْسَلَ) دێ و بە مانای (خَلَطَ)ش دێ، واتە: دوو دەریاکانی ناردوون، یاخود تێکەڵ کردوون، (يَلْتَقِيَان) پێک دەگەن، بەڵام:

www.alibapir.com


## چاكەی چوارەم:

٧)- ﴿بَيۡنَهُمَا بَرۡزَخٞ لَّا يَبۡغِيَانِ﴾، لە نێوانیاندا پەردەیەک هەیە، نێوانێک هەیە سنوورشكێنیی ناكەن، دەستدرێژیی ناكەن بۆ سەر یەكدی، واتە: هیچكامیان بەسەر ئەوی دیكەدا زاڵ نابێ، نە دەریای سوێر بەسەر ئاوی شیریندا زاڵ دەبێ، كە ئاوی شیرین نەمێنێ و هەمووی سوێر هەڵگەڕێ! نە هی شیرین بەسەر هی سوێردا زاڵ دەبێ، چونكە ئاوی شیرین زۆر بچووكە لە چاو هی سوێر، هیچ كامیان بەسەر ئەوی دیكەدا زاڵ نابێ، لەبەر ئەوەی پەردەیەكیان لە نێواندا هەیەو سنوورشكێنیی بۆ لای یەكدی ناكەن، كە دەفەرموێ: ﴿مَرَجَ ٱلۡبَحۡرَيۡنِ يَلۡتَقِيَانِ﴾، دوو دەریایەكان بێگومان مەبەست پێیان ئاوی سوێرو شیرینە، هەندێكی دیكە گوتوویانە: مەبەست پێیان دوو دەریای سوێرە، فڵان دوو دەریا، یان فڵان دوو دەریا، بەڵام لە ڕاستییدا وانیەو مەبەست پێیان دوو ئاوی سوێرو شیرینە، كە ئەوە تەنیا لێرەش نەهاتوەو لە چەند شوێنی دیكەش لە قوڕئاندا باسكراوە (**البحرين أي: البَحْر العَذْب وَالبَحْر المَالِح**) دەریای شیرین، دەریای سوێر، (**مَرَج**) بە مانای (**أَرْسَلَ**) (ناردوویەتی) و بە مانای (**خَلَطَ**) (تێكەڵیكرد)یش دێ، (**يَلْتَقِيَان**) پێک دەگەن، (**يَتَّصِلَان بِحَيْث يَصُبُّ أَحَدُهُمَا فِي الأَخَر**)، واتە: پەیوەست دەبن بە جۆرێک یەكیان دەڕژێتە نێوە ئەوی دیكەیانەوە، كە هەر ئاوی شیرینە دەچێتەوە نێو ئاوی سوێرو، ئەگەر ئاوی سوێر هاتبایە نێو ئاوی شیرین، ئاوی شیرین نەدەما، چونكە ئاوی سوێر زۆر زۆرەو، ئاوی شیرین تۆزێكە لە ئاوی سوێر، ئاوە شیرینەكەش دوای ئەوەی مرۆڤ كارو پێداویستییەكانی خۆی پێ جێبەجێ كرد، ئنجا خواردن و خواردنەوەیە، ئاودێرییە، شتن و شوارە، لەم ڕۆژگارەش دا دروستكردنی وزەی كارەبایە، هەرچی هەیە، ئەوەی لێی زیادبوو دەچێتەوە نێو ئاوی سوێر.

﴿بَيۡنَهُمَا بَرۡزَخٞ لَّا يَبۡغِيَانِ﴾، (**البَرْزَخُ: الفَاصِلُ الحَاجِب**)، نێوان و پەردەیەک، پێشتریش گوتمان: (**بَرْزَخ**) لە (**بَرْزَة**)وە هاتوە، یانی: شوێنێكی بەرزایی، كە مەبەست پێی نێوان و دیوارێكە، (**لا يَبْغِيَان: لَا يَغْلِبُ أَحَدُهُمَا عَلَى الأخَر**)، یەكیان بەسەر ئەویدیكەدا زاڵ نابێ، واتە: وانیە ئاوی سوێر ئاوی شیرین نەهێڵێ، یاخود ئاوی شیرین ئاوی سوێر نەهێڵێ، هەر كامێكیان ئەركی خۆی هەیە.

www.alibapir.com


زانایان لە بارەی ئەوەوە کە: ئایا مەبەست لە: {سنوورشکێنیی بۆ لای یەکدی ناکەن و بە سەریەکدیدا، زاڵنابن}و مەبەست لە پەردەکە چییە؟ زۆر قسەیان کردوون و بە هێزترینیان ئەوەیە کە مەبەست لە سنوورشکێنیی بۆ لای یەکدی ناکەن، یانی: نە ئاوی سوێر وا دەکات، ئاوی شیرین نەمێنێ و کۆتایی پێبهێنێ، هەمووی لە نێو خۆیدا جێ بکاتەوە، نە ئاوی شیرینیش وا دەکات کە کۆتایی بە ئاوی سوێر بهێنێ.

مەبەست لەو بەرزەخ و پەردەیەش:

أ- هەندێک گوتوویانە: بۆ هەر کام لە ئاوی شیرین و ئاوی سوێر، پێکهاتەیەکی تایبەت هەیەو مەبەست پێی جیاوازیی پێکهاتەکەیانە.

ب- هەندێک گوتوویانە: مەبەست ئەوەیە کە ئاستی ئاوی شیرین هەمیشە بەرزترە لە ئاستی ئاوی سوێر، گومانیشی تێدانیە کە ئاوی شیرین بەرهەم ئەنجامی ئەو باران و بەفرو تەرزەیە، کە لە هەڵمی دەریا دروست دەبێ، کە تیشکی خۆر لەسەر دەریا پەیدای دەکات و با دەیهێنێ، دەبێتە باران و بەفرو تەرزەو لە شوێنە بەرزەکان، دەبارن، چونکە شوێنە بەرزەکانی زەوی ساردن و ئاوی شیرین لە شوێنە بەرزەکانە، لە شوێنی بەرزەوە ئاو شۆڕ دەبێتەوەو دەچێتەوە نێو ئاوی سوێر، ئاستی جوگرافیی ئاوی شیرین هەمیشە بەرزترە لە ئاستی ئاوی سوێر، مەبەست لەو بەرزەخە، ئەوەیە، ئنجا ڕای دووەم زیاتر شتێکی واقیعیی و زانستییەو ڕاستیشە کە پێکهاتەی ئاوی شیرین و ئاوی سوێر لە یەک جیان، بەڵکو زانایانی هاوچەرخ دەڵێن: پێکهاتەی هەر کام لە دەریایەکانیش لە یەک جیان، وەک ئۆقیانووسی هیندیی و، ئۆقیانووسی ئەتڵەسیی، هەروەها دەریای عەرەبیی و، دەریای سپیی نێوەڕاست و، دەریای سوورو، دەریای ڕەش، هەموو ئەوانە هەر کامێکیان پێکهاتەیەکی جیا لەوی دیکەی هەیە.

٨)- ﴿فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ﴾، ئایا نکوولیی لە کام لە چاکەکانی پەروەردگارتان دەکەن، ئەی مرۆڤ و جند؟!

www.alibapir.com


## چاکەی پێنجـەم:

**٩)-** ﴿ يَخْرُجُ مِنْهُمَا ٱللُّؤْلُؤُ وَٱلْمَرْجَانُ ﴾، لەو دوو دەریایە (لەو ئاوی سوێرو شیرینە) گەوهەر و مرواریی دێنە دەرێ، (لُؤْلُؤ) بە کوردیی گەوهەری پێ دەڵێین و (مَرْجَان)یش مرواریی پێ دەڵێین، (يَخرُجُ) خوێنراوەتەوەو (يُخْرَجُ)ش خوێندراوەتەوە، (يَخرُجُ): دێتەدەر، (يُخرَجُ): دەردەهێنرێ.

زانایان لەو بارەوە کە خوا ﷻ گەوهەرو مرواریی پاڵداوەنە لای هەر کام لە ئـاوی سـوێرو شـیرین، لـە حاڵێکـدا تەنیـا لـە ئـاوی سـوێر پەیدادەبـن!! گوتوویانـە:

**أ-** لەبەر ئەوەی ئاوی سوێرو شیرین بەسەریەکەوەن، بۆیە وەک یەک ئاوو دەریان، هەرچەندە تەنیا لە ئاوی سوێر پەیدا دەبن، بەڵام پاڵیداونە لای هەردووکیان.

**ب-** ڕایەکی دیکەش ئەوەیە کە ئاوی شیرین لە چاو ئاوی سوێر شتێکی زۆر کەمە، بۆیە خوا ﷻ حیسابی زۆرەکەی کردوە، کە ئاوە سوێرەکەیە.

**ج-** ڕایەکی دیکەش ئەوەیە کە گەوهەرو مرواریی، هەم لە ئاوی سوێردا هەن و دەردەهێنرێن، هەم لە ئاوی شیریندا.

**د-** ڕایەکی دیکەش ئەوەیە کە بەدڵنیایی بناغەی ئاوی شیرینیش هەر ئاوی سوێرە، بۆیە خوا ﷻ باسی هەردووکیان دەکات، بەڵام ئەمە وەک زاڵکردنی ئاوی سوێرە، بەسەر هی شیریندا، چونکە ئەسڵی ئاوی شیرین هەر ئاوی سوێرە، ئێمە ئاوی شیرینمان هەر لە ئاوی ئۆقیانووسەکانەوە بۆ پەیدا دەبێ، کە هەڵمی دەریایە بەرزدەبێتەوەو دێتە شوێنە بەرزەکان و هەور دروست دەبێ، باران و بەفرو تەرزە دێتە خوار، کەواتە: ئاوی شیرینمان هەر لە ئاوی سوێرەوە بۆ پەیدادەبێ.

ئێمە دوایی ڕوونکردنەوەیەک لە بارەی هەر کام لە گەوهەرو مرواریییەوە دەدەین.

**١٠)-** ﴿ فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ ﴾، ئنجا ئایا نکووڵیی لە کام لە چاکەکانی پەروەردگارتان دەکەن، ئەی جندو مرۆڤ!

## چاكەی شەشەم:

١١)- ﴿وَلَهُ ٱلۡجَوَارِ ٱلۡمُنشَـَٔاتُ فِى ٱلۡبَحۡرِ كَٱلۡأَعۡلَٰمِ﴾، ڕۆیشتووە دروستكراوەكان لە دەریادا وەک چیا بەرزەكان، هی خوان، بێگومان مەبەست لە ڕۆیشتووەكان كەشتییەكانە، واتە: (**السُّفُنُ الجَوارِي**)، كەشتییە ڕۆیشتووەكان، (**المُنْشَئَات**)، واتە: (**المَصْنُوعَات**) كە دروستكراون و هێندراونە دی، مرۆڤەكان دروستیان دەكەن، (**كَالأَعْلَام**)، (**أَعْلَام**) كۆی (**عَلَم**)ە، واتە: چیای بەرز، واتە: كەشتییەكانیش كە مرۆڤەكان دروستیان دەكەن و بە دەریادا دەڕۆن، وەک چیا بەرزەكان، ئەوانیش هەر هی خوای پەروەردگارن و، نیعمەتی خوان بۆ ئێوەی ڕەخساندوون، هەم مرۆڤەكە كە كەشتییەكە دروست دەكات، هەم كەرەستەكە كە كەشتییەكەی لێ دروست دەكرێ، هەمووی هەر دروستكراوی خوایە.

وشەی (**مُنْشَئَات**) لەسەر كێشی (**مُفْعَلَات**)ەو دەبێتە ناوی بەركار (**اسم مفعول**) دروستكراوەكان، خوێنراویشەتەوە: (**المُنْشِئَات**) یانی: دروستكەرەكان، لێرەدا واتە: (**الَّتِي رَفَعَت قُلُوعَهَا**)، ئەوانەی كە قەڵایەكانیان بەرزكردوونەوە، یانی: چادرەكانیان بەرزكردوونەوە، یان (**مُنشِئات**) (**مِنْ أَنْشَأَ السَّيْرَ: أَسْرَعَ أَي الَّتِي يَسِيْرُ بِهَا النَّاسُ سَيْراً سَرِيْعَاً**)، (**مُنشِئات**) لە (**أَنْشَأَ السَّيْرَ**)ەوە هاتووە، واتە: بە خێرایی ڕۆیشت، ئەو كەشتییانەی خەڵک بە خێرایی لە دەریادا پێیان دەڕۆن، شایانی باسە: ئێستا لەم ڕۆژگارەدا كەشتیی وا دروست كراوە، (٥٦٤٠٠٠) تەن نەوت هەڵدەگرێ، یەک تەن هەزار كیلۆیە، كەواتە: (١٠٠٠×٥٦٤,٠٠٠=٥٦٤,٠٠٠,٠٠٠) كیلۆ.

لە تۆڕە كۆمەڵایەتییەكان لەگەڵتاین
Stay in touch on social media
نحن معكم عبر مواقع التواصل الاجتماعي
ڕاگەیاندنی مەكتەبی مامۆستا عەلی باپیر
AliBapir/عەلی باپیر
archive.org/details/@alibapir
AliBapir/عەلی باپیر
كەناڵی ڕاگەیاندنی مەكتەبی مامۆستا عەلی باپیر
AliBapir
www.alibapir.net
عربي - كوردی - English
ڕاگەیاندنی مەكتەبی مامۆستا عەلی باپیر

## پێناسەی (لؤلؤ) و (مرجان) و سەرنجدانێکی زەوی :

**١٢)-** ﴿ فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ ﴾، ئایا نکوولّیی لە کام لە چاکەکانی پەروەردگارتان دەکەن، ئەی مرۆڤ و جند؟!

لە بارەی (**لؤلؤ ومرجان**)ەوە، پێناسەیەکی گەوهەرو مرواریی و سەرنجدانێکی زەوی بە باشم زانی کە ئەم ڕوونکردنەوەیە لە دکتۆر (**محمد راتب النابلسي**)ەوە، بێنم لە تەفسیرەکەی دا[1] ئاوا پێناسەی (**لؤلؤ**) دەکات:

### أ- گـەوهــــەر (اللؤلؤ):

دەڵێ: (**فِي البَحْرِ حَيْوَانٌ اسْمُهُ المَحَارُ، وَهُوَ حَيْوَانٌ بَحْرِيٌّ هُلَامِيٌّ رَخْوِيٌّ لَهُ طِبَاعٌ خَاصَّةٌ وَلَهُ أَجْهِزَةٌ دَقِيقَةٌ جِدّاً، وَغِلَافُهُ الصَّدَفُ، أَي: صَفِيْحَتَانِ كِلْسِيَّتَانِ قَاسِيَّتَانِ جِدّاً، وَلَوْ دَخَلَت حَبَّةُ رَمْلٍ عُنْوَةً إِلى مَمْلَكَةِ هَذَا الحَيْوَان، لَدَافَع هَذَا الخَطَرَ بِإِفْرَازِ مَادَةٍ كِلْسِيَّةٍ فُسْفُورِيَّةٍ عَلَى هَذِهِ الحَبَّةِ مِنَ الرَّمْلِ لِيَحْمِي نَفْسَهُ، وَيُهَاجِمُ أَعْدَاءَه، فَيُصْنَعُ اللُّؤْلُؤ، وَهُوَ لاَ يَدْرِي أَن هَذِهِ المَادَّةِ الفُسْفُورِيَةِ الكِلْسِيَّة الَّتِي يَفْرِزُهَا عَلَى حَبَّةِ الرَّمْلِ، هِيَ اللُّؤْلُؤة**).

واتە: لە دەریادا ژیانداریک هەیە، پێی دەگوترێ: (**مَحَار**) ژیانداریکی دەریایی گۆشت نەرم و شلە، هەندێک سروشتیی تایبەتی هەن و، هەندێک کۆئەندامی زۆر وردی هەن، دەچێتە نێو قۆزاخەیەکەوە، بەروپشتێکی هەن لە ماددەی کلسیی زۆر ڕەق دروست بوون، (ئەو ژیاندارە دەچێتە نێو ئەو قۆزاخەیەوە)، کاتێک دەنکە لمێک دەچێتە نێو ئەو جێی و شوێنەی ئەو ژیاندارەوە ماددەیەکی کلسیی فۆسفۆڕیی دەردەدات، بۆ بەرگریی لە خۆ کردن و، دەوری ئەو دەنکە لمە دەدات بۆ خۆ پاراستنی و هێرشکردنە سەر دوژمنەکانی، بەڵام ئەو نازانێ کە ئەو ماددە فۆسفۆڕییە کلسییەی دەری دەدات بە دەوری ئەو دەنکە لمەوە، دەبێتە ئەو گەوهەرە!

---

(١) ج ٩، ص: ١٥٨.

www.alibapir.com


### ب- مەرجـــان (المرجـان):

**(هُـوَ حَيْـوَانٌ يَعِيْـشُ فِي البِحَـارِ وَيَتَكَاثَـرُ بِاللإتِّصَـالِ، أي: أنَّ ذُرِّيَتَـهُ لَا تَنْفَصِـلُ عَنْـهُ، فَيَنْمُو شَيءٌ لَا يُصَـدَّقُ، لِذَلِـكَ نَجِـدُ فِي اسْـتَرَالِيَة رَصِيْفَـاً مِـنَ المَرْجَـانِ طُوْلُـه أكْثَـرُ مِـن (١٦٠٠) كـم، وَعُرْضُـهُ (٥٠) كـم تَقْرِيْبَـاً، وَالبَحْـرُ الأحْمَـرُ كُلُّـهُ صُخُـورٌ مَرْجَانِيَّـة).**

لـە بـارەی مەرجانـەوە دەڵـێ: ژیاندارێکـە لـە دەریاکانـدا دەژی و، بـە هـۆی زاوزێـوە زیـاد دەکات، وەچەکـەی لێـی جیانابێتـەوە، بەڵکـو هـەر پێیـەوە پەیوەسـتە، ئیـدی زیـاد دەکات، بەشـێوەیەکی سەرسـوڕهێنەر، بۆیـە لـە ئوسـتوڕاڵیا شۆسـتەیەکی مەرجانیـی هەیـە، درێژییەکـەی هـەزارو شەسسـەد (١٦٠٠) کیلۆمەتـرەو، پانییەکـەشی پەنجا (٥٠) کیلۆمەتـرەو، دەریـای سـوور هەمـووی لـەو بـەردە مەرجانییانـە پێـک دێ.

کەواتـە: مەڕجـان ژیانـدارە بـەڵام دوایـی زۆر دەبێـت و وەچەکـەی هـەر بـە خۆیـەوە پەیوەسـتەو، بـە پێکـەوە بـە نووسـاویی وەک چیایـەک پێکـەوە دەبـن و ئەوانـەی دەمـرن ڕەق دەبـن و دەبنـە بـەردو سـەرەنجام دەبنـە مەڕجـان، مەڕجـان بـە کوردییـش وێـڕای مرواریـی مەرجـانی پـێ دەڵێیـن و جـۆرە بەردێکـی زۆر بـە نرخـە، ڕەنگـی سـووری هەیـەو، ڕەنگـی شـینی هەیـەو، ڕەنگـی جـۆراو جـۆری هەیـە.

### ج- سەرنجـــدانێکی زەوی:

لێـرەدا بـە باشـم زانی وێنـا کردنێک لـە **(طنطـاوي)** بخوازمـەوە، کە لە تەفسـیرەکەی خـۆی دا[1] وێنایەکـی جـوان دەکات بـۆ گۆی زەوی و، دەریایـەکانی و ڕووبارەکانی.

دەڵـێ: ئـاوی سـوێرو شـیرین تێکەڵـن و لێـک جیانابنـەوە، چونکـە ڕووبـارەکان و جۆگەلـەکان لـە ئـاوی بارانـن {دەبووایـە گوتبـای: لـە ئـاوی بـاران و بەفـرو تـەرزە دروسـت دەبـن} ئەوانیـش لـە هەڵمـی ئـاو دروسـت دەبـن، هەڵمـی ئاویـش لـە ئۆقیانووسـەکان، لـە دەریـای سـوێر دروسـت دەبـن، دواییـش جارێکـی دیکـە ئـاوە

---

(١ ) الجواهر: ج٢٧، ص٢١.

شـیرینەکە کـە مـرۆڤ پێویسـتیی پێـی نامێنـێ، دەچێتـەوە نێـو دەریـا سـوێرەکە، کەواتـە: ئـاوی سـوێر و ئـاوی شـیرین و هەڵمـی ئـاو، هەروەهـا ڕووبـارو جۆگەلـەکان کـە لێیـان پێکدێـن، هەمـووی وەک یـەک تۆپـە کـە دەوری زەوی داوە، واتـە: هەرچـی جـۆری ئـاوە، هەمـووی دەوری زەوی داوە، کـە حـەوت لەسـەر دە (١٠/٧)ی پانتایـی زەوی {گوتبـای: چـوار لەسـەر پێنـج (٥/٤) باشـتربوو} دادەگـرێ، ئنجـا ئـەو دەریایانـە لـە هـەر شـوێنە ناوێکـی تایبەتییـان هەیـە: دەریـای ڕۆم، دەریـای سـوور، دەریـای فـارس، دەریـای هینـد، دەریـای چیـن، ئۆقیانـووسی هادیـی، ئۆقیانـووسی باسـفیک و، ئۆقیانـووسی بەڵتیـق {ئـەو کاتـە ناوەکانیـان وابـوون} کـە ئەوانـە ئەسـڵی ئـاون.

ئنجـا کاتێـک تـۆ تەماشـای زەوی دەکـەی؛ لەلایەکـەوە بـە بەرگـە هەوا داپۆشراوە، دواییـش بـە بەرگێکـی ئاویـی داپـۆشراوە، لەسـەرووی ئاوەکەشـەوە، ئنجـا هەڵمـی ئـاو هەیـە لەسـەر دەریـاکان، کـە بـەردەوام لـەو هەڵمـە ئـاوەش هـەورەکان دروسـت دەبـن، هـەورەکان هـەر هەڵمـی ئـاون دەچـن بـۆ شـوێنی سـارد، لـەوێ پارچـە پارچـەکانی هەڵـم لێـک نزیـک دەبنـەوە، دڵۆپـە پێـک دێنـن، ئەگـەر زۆر سـارد بـێ دەبێتـە بەفـر، ئەگەرنـا تـەرزە، ئەگەرنـا بـاران، ئنجـا ئەگـەر لەلایەکـەوە تەماشـای دەریـا بکەیـن، کـە زۆربـەی هـەرە زۆری زەوی داپۆشـیوەو، لەلایەکـەوە تەماشـای ڕووبـارەکان و زێ و جۆگەلـەکان بکەیـن و، دەبینیـن، ڕووبـارەکان سـەرچاوەکەیان لـە چیاکانـە، بـەڵام شـوێنی ڕژانیـان دەچێتـەوە نێـو دەریـا، واتـە: لـە چیایەکانـەوە دێـن و دەڕژێنـە نێـو دەریـا، ئـاوی چیایەکانیـش لـە ئەسـڵدا هەڵمـی ئـاو بـووە، بۆتـە هـەورو باریـوە، بۆیـە دەریـا وەک درەختێـک وایـە، ڕووبارەکانیـش لقەکاننـی کـە بـە وشـکایی دا بڵاودەبنـەوەو، هـەر ڕووبارێـک وەک لقێکـە، ئنجـا هـەر جۆگەلەیـەک، یـان هـەر شـاجۆگەیەک کـە لـە ڕووبارێـک هەڵدەبەسـترێ، وەک دەمـاری گەڵایەکـەو، هـەر مەزرایەکیـش کـە بـەو شـا جۆگـەو جۆگانـە ئـاو دەدرێ، وەک گەڵایەکـی ئـەو درەختـە، یاخـود بەشـێک لـەو گەڵایـە وایـە.

www.alibapir.com


### مەسەلەی سێیەم:

**ڕاگەیانـدنی ئـەو ڕاسـتییە، کـە هـەر کـەس لەسـەر زەویـە دەمـرێ و، تەنیـا زاتی بـەرزی بـێ وێنـەی خـوا دەمێنـێ و، هەمـوو ئەوانـەی کـە لـە ئاسـمانەکان و زەوی دان، داوا لـە خـوا دەکـەن و، هەمیشـەو بـەردەوام خـوا کاری دروسـتکراوەکانی خـۆی بەڕێـوە دەبـات:**

خــوا دەفەرمــوێ: ﴿ كُلُّ مَنْ عَلَيْهَا فَانٍ ﴿٢٦﴾ وَيَبْقَىٰ وَجْهُ رَبِّكَ ذُو الْجَلَالِ وَالْإِكْرَامِ ﴿٢٧﴾ فَبِأَيِّ آلَاءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ ﴿٢٨﴾ يَسْأَلُهُ مَن فِي السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ كُلَّ يَوْمٍ هُوَ فِي شَأْنٍ ﴿٢٩﴾ فَبِأَيِّ آلَاءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ ﴿٣٠﴾ ﴾.

## شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە شەش بڕگەدا:

**١)-** ﴿ كُلُّ مَنْ عَلَيْهَا فَانٍ ﴾، هەر کەسێک کە لەسەریەتی، لە نێوچوویە، بێگومان ڕاناوی (ها) بۆ زەوی دەچێتەوە، چونکە پێشتر باسی زەوی کراوە، هەر کەسێک کە لەسەر زەوییە، لە ژیاندارانی خاوەن هۆش، کە مرۆڤ و جند دەگرێتەوە، هەموویان دەمرن، وشەی (فَان: فَنَى، يَفْنِي فَهُوَ فَان)، (فَنَى) لە بەین چوو، (يَفْنِي) لە بەین دەچێ، (فَهُوَ فَان) ئەو لە بەین چوویە.

**٢)-** ﴿ وَيَبْقَىٰ وَجْهُ رَبِّكَ ذُو الْجَلَالِ وَالْإِكْرَامِ ﴾، ڕووی پەروەردگاری خاوەن شکۆو بەخشش و بەزەیی دەمێنێتەوە.

بۆچـی فەرموویـەتی: ﴿ كُلُّ مَنْ عَلَيْهَا فَانٍ ﴾و نەیفەرمووە: (**كُلُّ مَا عَلَيْهَا**): لـە حاڵێـک دا ژیانـداران و زینـدەوەران و پەڕەورانیـش تێکـڕا هــەر دەفەوتێــن؟! وەڵامەکـەی ئەوەیە کە: خوا بسم الله الرحمن الرحيم (مَنْ)ی بەکارهێناوە کە بۆ خاوەن عەقڵان بەکاردێ و تەنیا جنـدو مـرۆڤ دەگرێتـەوە، چونکـە سـوورەتەکە هەمـووی دوانـدنی هـەردوو کۆمەڵـی مـرۆڤ و جنـدەو، بـاسی ژیانـداران و دروسـتکراوەکانی دیکـە نیـە.

www.alibapir.com


کە دەفەرمـوێ: ﴿ وَيَبۡقَىٰ وَجۡهُ رَبِّكَ ذُو ٱلۡجَلَٰلِ وَٱلۡإِكۡرَامِ ﴾، وشـەی (**وَجْـهُ**) زۆربـەی توێـژەرەوان بـە خـود (**ذَات**)یـان لێکداوەتـەوە، واتـە: زاتی پـەروەردگارت دەمێنێتـەوە، دیارە (**وَجْه**) لـە ئەسـڵدا بـەو ئەندامە دەگوترێ کـە دەیزانیـن: ڕوو، دەم و چـاو، (**الوَجْهُ: مَا يُسْتَقْبَلُ بِهِ الغَيْرُ وَهُوَ فِي اللهِ تَعَالَى صِفَاتُه الكَرِيمَة الَّتِي تَتَوَسَّطُ بَيْنَهُ وَبَيْنَ خَلْقِهِ، فَتَنزِلُ بِهَا عَلَيْهِمْ بَرَكَاتُهُ وَفيوضَاتُه**)، (**وَجْـهُ**) (ڕوو) ئەوەیـە کـە جگـە لـە خـۆی پـێ ڕوو بـە ڕووبـێ، بـەڵام بـە نسـبەت خـوای بـەرزەوە مەبەسـت پێی ئـەو سیفەتە بـێ وێنانەی خـوان، کـە دەکەونـە نێـوان خـواو دروسـتکراوەکانی و لـە ڕێـی سـیفەتەکانیەوە خێـرو بەرەکـەت و چاکـەی وی دەڕژێ بەسـەر دروسـتکراوەکانی دا {بەهـۆی ویسـتەکەیەوەو، بەهـۆی زانیارییەکەیـەوەو، بەهـۆی حیکمەتیـەوەو، بەهـۆی بەزەییـەوە}.

کەواتـە: (**وَجْـهُ**) مەبەسـت پێـی سـیفەتەکانی خـوای پـەروەردگارە، بـەڵام ئەگـەر بشـڵێین: (**وَجْه**) سـیفەتێکی خوایە ﷻ کە ئێمە نازانین چۆنە هەر گونجاوە، بـەڵام بەدڵنیایـی مەبەسـت پێـی ئـەو واتـا ڕواڵەتییـەی نیـە، کـە بـۆ دروسـتکراوەکان بـەکاردێ، دەشـگونجێ بڵێیـن: (**وَجْـهُ**) زاتی خـوای پـەروەردگارە.

﴿ ذُو ٱلۡجَلَٰلِ وَٱلۡإِكۡرَامِ ﴾، پێشـتریش باسـمان کـرد کـە (**جَـلَال**) واتـە: هەیبـەت و دەسـەڵات و باڵادەسـتیی و پایـە بەرزیـی، (**إِكْرَام**)یـش لـە ئەسـڵدا واتـە: ڕێزلێگرتـن وچاکەکاریی و میهرەبانیی و بەخشندەیی خوا ﷻ، ئنجا خوا ﷻ لێرەداکە دەفەرمـوێ: ﴿ وَيَبۡقَىٰ وَجۡهُ رَبِّكَ ذُو ٱلۡجَلَٰلِ وَٱلۡإِكۡرَامِ ﴾، ڕووی پـەروەردگاری خـاوەن هەیبـەت و پایەبەرزیـی و خـاوەن ڕێـز لێگرتـن و بەخشـین و میهرەبانییـت، دەمێنـێ.

**٣**)- ﴿ فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ ﴾، ئنجا ئەی جندو مرۆڤ! نکووڵیی لە کام لە چاکەکانی پەروەردگارتان دەکەن؟!

زانایان وشەی (جلال) و (إكرام)یان ئاوا لێکداونەوە:

أ- (**الجَلَال: العَظَمَةُ، وَفِيْهِ مَعْنَى الإِعْتِلَاءِ وَالتَّرَفُّعِ المَعْنَوِيّ عَلَى الغَيْرِ، كَالْعلُوِّ وَالعَظَمَةِ وَالكِبْرِيَاءِ وَالإِحَاطَةِ وَالغِنَى وَالغَلَبَةِ وَالقَهر**)، (**جَلَال**) بە مانای مەزنیی دێ و، بە مانای

www.alibapir.com


باڵا دەستیی و، بەرزبوونەوەی مەعنەویی بەسەر جگەلە خۆیدا، وەک بەرزیی و مەزنیی و، گەورەیی و، دەورەدان و، بێ نیازیی و، باڵا دەستیی و، ملپێکەچکردن {هەموو ئەوانە دەگرێتە نێو خۆی}.

**ب-** (**الإِكْرَام: إِفْعَالٌ مِنَ الكَرَمِ وَالعَطَاء وَالسَّخَاءُ وَالجُوُد، وَفِيْهِ مَعْنَى البَهَاءِ وَالحُسْنِ الَّذِي يَجْذِبُ الغَيْرَ، وَيُوَلِهُهُ، كَالْعِلْمِ وَالرَّحْمَةِ وَالقُدْرَةِ وَالجُودِ وَالجَمَالِ وَالعَطَاء، وَتُسَمَّى صِفَاتِ الجَمَال**)، (**إِكْرَام**) لەسەر کێشی (**إِفْعَالٌ**)ەو لە (**كَرَم**)ەوە هاتوە، کە بریتیە لە بەخشین و پێدان، ئەویش بەمانای ئەو جوانییەیە کە سەرنجی جگەلە خۆی ڕادەکێشێ و شەیدای دەکات، وەک زانیاریی و، بەزەیی و، دەسەڵات و، بەخشش و، جوانیی و، پێدان، هەموو ئەوانەش بەسیفەتەکانی جوانیی (**جمال**) ناو دەبرێن.

کەواتە: ﴿ذُو ٱلْجَلَٰلِ وَٱلْإِكْرَامِ﴾، ناوێکە لە ناوە چاکەکانی خوا ﷻ کە کۆکەرەوەیە بۆ هەموو سیفەتەکانی هەیبەت و دەستەڵات و هەیمەنەی خواو، هەموو سیفەتەکانی بەخشش و کەڕەم و بەزەیی خوا ﷻ.

٤)- ﴿يَسْـَٔلُهُۥ مَن فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ﴾، هەر کەس کە لە ئاسمانەکان و زەویدا هەیە، داوای لێ دەکات، (**مَنْ**) دیسان بۆ خاوەن عاقڵان دەچێتەوە، کە ئەمجارە فریشتەکانیش دەگرێتەوە، کە فریشتەکان نیشتەجێی ئاسمانەکانن و، لەسەر زەویش مرۆڤ و جند هەن، هەموو ئەوانەی لە ئاسمانەکان دا و لەسەر زەوی نیشتەجێن، داوا لە خوا دەکەن، واتە: داوای لێ دەکەن، بە زمانی حاڵ یان بە زمانی وتار، بۆ هەموو پێداویستییەکانی خۆیان.

٥)- ﴿كُلَّ يَوْمٍ هُوَ فِى شَأْنٍ﴾، هەموو ڕۆژێک ئەو لە کارێکدایە، بۆ مانای (**يَوْمٍ**) لە زمانی عەرەبییدا ئێمە دەڵێین: ڕۆژ، بەڵام لە ئەسڵدا لە زمانی عەرەبییدا (**يوم**) واتە: کات، واتە: هەموو کاتێک خوا لە کارێکی تایبەت دایە، چونکە (**شَأْن**) بە نەزانراو (**نكرة**) هاتوە، واتە: کاری جیاواز لەوەی پێشێ، بۆ ئێمە هەر کاتێک کە تێدەپەڕێ، خوا کارێکی دیکە دەکات، دوای تۆزێکی دیکە تیشکی زیاتر دەخەینە سەر چەمک و واتای ئەم ئایەتە موبارەکە.

www.alibapir.com


٦)- ﴿ فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ ﴾، ئایا ئێوه ئەی مرۆڤ و جند! به کام له چاکەکانی پەروەردگارتان بێبڕوان، نکوولّیی له کام له چاکەکانی پەروەردگارتان دەکەن؟

(يَـومٍ) بـه مانـای (کات) دێ، بـەڵام (شَـأن) بـه مانـای (حـاڵ) دێ و، بـه مانـای کار دێ، واتـه: لـه هەمـوو کاتێکـدا خـوا لـه کارێکـی جیـا لـەوەی پێشـێ دایـه، یـان لـه کارێکـی تایبەتدایـه، کـه مەبەسـت پێـی سەرپەرشـتییکردنی دروسـتکراوەکان و بەڕێوەبردنیـەتی بۆیـان.

(إبـن عجيبـة) لـه تەفسـیرەکەی خـۆی[1]دا، بـۆ ڕوونکردنـەوەی چەمکـی ئـەم ئایەتـه موبارەکـه: ﴿ يَسْئَلُهُۥ مَن فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ۚ كُلَّ يَوْمٍ هُوَ فِى شَأْنٍ ﴿٢٩﴾ ﴾**الرحمـن**، واتـه: هـەر کـەس کـه لـه ئاسـمانەکان و زەویدایـه، داوای لـێ دەکات، هـەر کاتـه ئـەو لـه کارێکدایـه، گوتوویـەتی:

(﴿ يَسْئَلُهُۥ مَن فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ۚ كُلَّ يَوْمٍ هُوَ فِى شَأْنٍ ﴿٢٩﴾ ﴾**أي: مِـنْ مَلَـكٍ، وَإِنْـس، وَجِـنٍّ، وَغَيْرِهِـم، لاَ غِنَـى بِأَحَـدٍ مِنْهُـمْ عَنْـهُ سُبْحَانَهُ، كُلُّهـم يَسْـأَلُهُ حَاجَتَـهُ، إمَّـا بِلِسَـانِ مَقَالِـهِ، وَإِمَّـا بِلِسَـانِ حَالِـهِ، أَهْـلُ السَّـمَوَاتِ يَسْـأَلُهُ قُـوْتَ أَرْوَاحِهِـمْ، وَأَهْـلُ الأَرْضِ قُـوتَ أَشْبَاحِهِم وَأَرْوَاحِهِـم**).

(**قَـالَ أَبُـو السُّـعُود: فَإِنَّهُـم كَافَّـة مِـن حَيْـثُ حَقَائِقِهُـم المُمْكِنَـة، بِمَعْـزِلٍ عَـن اسْـتِحْقَاقِ الوُجُـودِ، ومَـا يَتَفَـرَّعُ عَلَيْـهِ مِـنَ الكَمَالَاتِ بَأسْرِهِ، بِحَيْثُ لَـوْ انْقَطَـعَ مَا بَيْنَهُـمْ وَبَيْنَ العِنَايَةِ الإِلَهِيَّـةِ مِـنَ العِلاَقَـةِ .. لَـمْ يَشُـمُّوا رَائِحَـةِ الوُجُـوْد أَصْـلًا، فُهُـم فِي كُل آنٍ مُسْـتَمِرُّونَ عَـلَى الإِسْـتِدْعَاءِ وَالسُّـؤَال**).

واته: ئەوانەی داوا له خوا ﷻ دەکەن، له فریشتەو مرۆڤ و جندو جگەله ئەوانیش، هیچ کامیان بێ نیاز نیه، له خوا ﷻ، هەر کامێکیان داوای پێداویستیی خـۆی لـێ دەکات یـان بـه زمـانی وتـار، یـان بـه زمـانی حـاڵ و، ئەهـلی ئاسـمانەکان

---

(١ ) (البحر المديد في تفسير القرآن المجيد) ج٧، ص(٢٧٣، ٢٧٤).

www.alibapir.com



داوای بژیـوی ڕووحیـانی لـێ دەکـەن، بـەڵام ئەهـلی زەوی داوای بژیـوی جەسـتەو ڕووحەکانیـانی لـێ دەکـەن.

(**إبن عجيبة**) ئـەو قسـانە لـە (**أبـو السـعود**)ەوە دێنـێ، ئەویـش ڕوونکەرەوەیەکـی نـاوداری قورئانـەو دەڵـێ: مرۆڤـەکان تێکـڕا لـەو ڕووەوە کە چییـەت (**ماهيـة**)ی ئەوان بریتیـە لـە بـوون گونجاویـی {واتـە: دەگونجـا هەبـن و دەگونجـا نەبـن} لـەو ڕووەوە کـە بوونەکەیـان لەخـوای پەروەردگارەوەیـە، هەروەهـا هەمـوو ئـەو شـتانەی دیکـە کە لە بوونەوە سەرچاوە دەگرن، هەموو ئەو چاکانە، کە ئەگەر خوا ﷻ تاوێک پەیوەندیـی لێیـان دابـڕێ، هـەر بوونەکەشـیان نامێنـێ، چ جـای ئـەو شـتانەی دیکـە کـە هەیانـن، بۆیـە بـەردەوام لـە چاوەڕوانیـی بەزەیـی و بەخشـشی خـوای میهرەبانـن.

## لە کۆتایی ئەم دەرسەماندا ئەم دوو دەقە دێنین:

**١)-** پێغەمبەر ﷺ گوێبیستی کەسێک بوو دەیگوت: {**يَا ذَا الْجَلَالِ وَالْإِكْرَامِ**}[1]، واتە: ئەی خاوەن جەلال و ئیکرام، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: وەڵامت درایەوە، داوابکە! یانی: مادام بەو دوو سیفەتە بەرزە بانگی خوات کردوە، دوعایەکەت قبووڵ بووە.

**٢)-** {**عَنْ أَبِي الدَّرْدَاءِ** رضي الله عنه، **عَنِ النَّبِيِّ** ﷺ **فِي قَوْلِهِ تَعَالَى:** ﴿كُلَّ يَوْمٍ هُوَ فِي شَأْنٍ ﴿٢٩﴾﴾ **الرحمن، قَالَ: مِنْ شَأْنِهِ أَنْ يَغْفِرَ ذَنْبًا، وَيُفَرِّجَ كَرْبًا، وَيَرْفَعَ قَوْمًا، وَيَخْفِضَ آخَرِينَ**} (**أخرجه ابن ماجه: ٢٠٢، والطبراني في الشاميين: ٢٢٠٢ ، وابن حبان: ٦٨٩**).

---

(١) {عَنْ أَبِي الْوَرْدِ عَنِ اللَّجْلَاجِ حَدَّثَنِي مُعَاذٌ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ أَتَى عَلَى رَجُلٍ وَهُوَ يُصَلِّي وَهُوَ يَقُولُ فِي دُعَائِهِ: اللَّهُمَّ إِنِّي أَسْأَلُكَ الصَّبْرَ، قَالَ: سَأَلْتَ الْبَلَاءَ فَسَلِ اللَّهَ الْعَافِيَةَ، قَالَ: وَأَتَى عَلَى رَجُلٍ وَهُوَ يَقُولُ: اللَّهُمَّ إِنِّي أَسْأَلُكَ تَمَامَ نِعْمَتِكَ، فَقَالَ ابْنَ آدَمَ! هَلْ تَدْرِي مَا تَمَامُ النِّعْمَةِ؟ قَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ دَعْوَةٌ دَعَوْتُ بِهَا أَرْجُو بِهَا الْخَيْرَ، قَالَ: فَإِنَّ تَمَامَ النِّعْمَةِ فَوْزٌ مِنَ النَّارِ وَدُخُولُ الْجَنَّةِ، وَأَتَى عَلَى رَجُلٍ وَهُوَ يَقُولُ: يَا ذَا الْجَلَالِ وَالْإِكْرَامِ! فَقَالَ قَدْ اسْتُجِيبَ لَكَ، فَسَلْ} أخرجه أحمد: ٢٢١٠٩، تعليق شعيب الأرنؤوط : إسناده حسن.

واتە: ئەبوو ددەرداء ﵁، لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە، دەربارەی فەرمایشتی خـوا: ﴿كُلَّ يَوۡمٍ هُوَ فِي شَأۡنٖ ٢٩﴾ **الرحمـن**، لـە هـەر کاتێـکدا خـوا لـە کارێکدایـە، پێـی گوترا: ئەو کارە چییە کە خوا ﷻ بەردەوام ئەنجامی دەدات؟ فەرمووی: لە کاری خـوا ئەوەیـە کـە لـە گوناهێـک دەبـوورێ و، دەرووێـک دەکاتـەوە لـە خەفەتێـک {کەسێک خەفـەت و مەینەتییەکـی هەیـە، دەرووی لـێ دەکاتـەوە} کۆمەڵێـک بـەرز دەکاتـەوە {بەهـۆی تاعەتـەوە}و، کۆمەڵێـک نـزم دەکاتـەوە {بـە هـۆی گوناهـەوە}.

واتە: کارەکانی خوا ﷻ ئەو کارانەن کە لە دروستکراوەکاندا هەن، مراندن و ژیانـدن و، بەرزکردنـەوەو نزمکـردن و، هەژاریـی و نەداریـی، سـاغیی و نەخۆشـیی و، پێـدان و پێنـەدان، سەرخسـتن و ژێـر خسـتن ... هتـد، بـەڵام پێغەمبـەر ﷺ ئـەو چـوارەی وەک نموونـە لـە کارەکانی خـوای بـەرزی مـەزن هێناونـەوە.

سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ، أَشْهَدُ أَنَّ لاَ إِلَهَ إِلاَّ أَنْتَ، أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ.

لە تۆڕە کۆمەڵایەتییەکان لەگەڵتانین
Stay in touch on social media
نحن معكم عبر مواقع التواصل الاجتماعي
ڕاگەیاندنی مەکتەبی مامۆستا عەلی باپیر
AliBapir/عەلی باپیر
archive.org/details/@alibapir
AliBapir/عەلی باپیر
AliBapir
Google Play
App Store
کەناڵی ڕاگەیاندنی مەکتەبی مامۆستا عەلی باپیر
www.alibapir.net
کوردی - عربي - English
ڕاگەیاندنی مەکتەبی مامۆستا عەلی باپیر

www.alibapir.com



## پێناسەی ئەم دەرسە

بەڕێـــزان!

ئـەم دەرسـە لـە پـازدە (١٥) ئایـەت پێـک دێ، ئایەتـەکانی: (٣١ - ٤٥)، هەمووشـیان تەرخانکـراون بـۆ بـاسی ڕۆژی دوایـی، بـە هـەردوو قۆناغـی ئاخیـر زەمـان و قیامـەت و هەڵسـانەوەوە، هەروەهـا بـێ چارەیـی مـرۆڤ و جنـد، لـە بەرانبـەر دەسـەڵاتی بێ سنووری خوادا ﷻ و، ئەو گرفتاریی و مەینەتییە سەختەی لەو ڕۆژەدا بۆ تاوانبـاران دێتـە پێـش، کـە تاوانبـاران بـە نیشـانەیان دەناسرێنـەوەو، پرسـیاریان لـێ ناکـرێ لـە بـارەی تاوانەکانیانـەوەو، تووکـی پێشەسـەرو پێیەکانیـان پێکـەوە دەگیرێـن و فـڕێ دەدرێنـە نێـو دۆزەخـەوەو، لـە وێشـدا لـە نێـو ئاگـری بڵێسـەدارو ئـاوی کوڵیـوو داغ دا دێـن و دەچـن!

﴿ سَنَفْرُغُ لَكُمْ أَيُّهَ الثَّقَلَانِ ﴿٣١﴾ فَبِأَيِّ آلَاءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ ﴿٣٢﴾ يَا مَعْشَرَ الْجِنِّ وَالْإِنسِ إِنِ اسْتَطَعْتُمْ أَن تَنفُذُوا مِنْ أَقْطَارِ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ فَانفُذُوا ۚ لَا تَنفُذُونَ إِلَّا بِسُلْطَانٍ ﴿٣٣﴾ فَبِأَيِّ آلَاءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ ﴿٣٤﴾ يُرْسَلُ عَلَيْكُمَا شُوَاظٌ مِّن نَّارٍ وَنُحَاسٌ فَلَا تَنتَصِرَانِ ﴿٣٥﴾ فَبِأَيِّ آلَاءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ ﴿٣٦﴾ فَإِذَا انشَقَّتِ السَّمَاءُ فَكَانَتْ وَرْدَةً كَالدِّهَانِ ﴿٣٧﴾ فَبِأَيِّ آلَاءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ ﴿٣٨﴾ فَيَوْمَئِذٍ لَّا يُسْأَلُ عَن ذَنبِهِ إِنسٌ وَلَا جَانٌّ ﴿٣٩﴾ فَبِأَيِّ آلَاءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ ﴿٤٠﴾ يُعْرَفُ الْمُجْرِمُونَ بِسِيمَاهُمْ فَيُؤْخَذُ بِالنَّوَاصِي وَالْأَقْدَامِ ﴿٤١﴾ فَبِأَيِّ آلَاءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ ﴿٤٢﴾ هَٰذِهِ جَهَنَّمُ الَّتِي يُكَذِّبُ بِهَا الْمُجْرِمُونَ ﴿٤٣﴾ يَطُوفُونَ بَيْنَهَا وَبَيْنَ حَمِيمٍ آنٍ ﴿٤٤﴾ فَبِأَيِّ آلَاءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ ﴿٤٥﴾ ﴾.

www.alibapir.com


## مانای دەقا و دەقی ئایەتەکان

{ئەی دوو (کۆمەڵە) قورسەکان (ی جندو مرۆڤ) لە مەودوا بۆ (سزادان)تان یەکلایی (و دەستخاڵیی) دەبینەوە ﴿٣١﴾ ئنجا ئایا (ئەی جندو مرۆڤ!) نکووڵیی لە کام لە چاکەکانی پەروەردگارتان دەکەن؟ ﴿٣٢﴾ ئەی کۆمەڵی جندو مرۆڤ! ئەگەر توانیتان لە تەنیشت و لایەکانی ئاسمانەکان و زەوی بچنە دەرێ، دەربچن (بەڵام) بەبێ تواناو دەستەڵات دەرناچن (ئەو دەستەڵات و توانایەشتان نیە) ﴿٣٣﴾ ئنجا ئایا (ئەی جندو مرۆڤ!) نکووڵیی لە کام لە چاکەکانی پەروەردگارتان دەکەن؟ ﴿٣٤﴾ بڵێسەی ئاگرو مس تان بەسەردا دەنێردرێ و سەرکەوتوو نابن (لە هەوڵی دەرچوونتان دا) ﴿٣٥﴾ ئنجا ئایا (ئەی جندو مرۆڤ!) نکووڵیی لە کام لە چاکەکانی پەروەردگارتان دەکەن؟ ﴿٣٦﴾ ئنجا هەر کات (لە ئاخیر زەمان دا) ئاسمان لەت و پەت بوو و سوور هەڵگەڕا، وەک ڕۆن(ی گەرم و داغ) ﴿٣٧﴾ ئنجا ئایا (ئەی جندو مرۆڤ!) نکووڵیی لە کام لە چاکەکانی پەروەردگارتان دەکەن؟ ﴿٣٨﴾ لەو ڕۆژەدا (کە قیامەت دێ بە دوای ئاخیر زەمان دا) مرۆڤ و جند لە بارەی گوناهەکانیانەوە پرسیاریان لێ ناکرێ ﴿٣٩﴾ ئنجا ئایا (ئەی جندو مرۆڤ!) نکووڵیی لە کام لە چاکەکانی پەروەردگارتان دەکەن؟ ﴿٤٠﴾ تاوانباران بە نیشانەیان دەناسرێن، ئنجا تووکی پێشەسەرو پێیەکان (ی تاوانباران پێکەوە) دەگیرێن (بۆ فڕێدرانە نێو دۆزخەوە) ﴿٤١﴾ ئنجا ئایا (ئەی جندو مرۆڤ!) نکووڵیی لە کام لە چاکەکانی پەروەردگارتان دەکەن؟ ﴿٤٢﴾ (دەگوترێ:) ئەمە ئەو دۆزەخەیە کە تاوانباران بە درۆیان دادەنا (و نکووڵییان لە بوونی دەکرد) ﴿٤٣﴾ (ئێستاش تاوانباران) لە نێوانی وی و لە نێوان ئاوێکی کوڵیوو داغ دا دەسووڕێن (دێن و دەچن و هەرجارە بە یەکیان سزادەدرێن) ﴿٤٤﴾ ئنجا ئایا (ئەی جندو مرۆڤ!) نکووڵیی لە کام لە چاکەکانی پەروەردگارتان دەکەن؟ ﴿٤٥﴾}.

www.alibapir.com



## شیکردنەوەی هەندێک لە وشەکان

(سَنَفْرُغُ لَكُمْ): (الفَـرَاغُ: خِـلَافُ الشُّـغْلِ، وَقَـدْ فَـرَغَ فَرَاغـاً وَفُرُوغـاً، وَهُـوَ فَـارِغٌ، سـأفرغ لـك أي: سَـأَجِدُّ فِي أَمْـرِكَ وأُعَاقِبُـك)، وشـەی (فَـرَاغ) پێچەوانـەی سـەرقاڵیی و دەسـتگیراوییە، دەگوتـرێ: (فَـرَغَ فَرَاغـاً وَفُرُوغـاً، وَهُـوَ فَـارِغٌ)، واتـە: فڵانکـەس کاری نەما، دەسـتی بەتـاڵ بـوو، دەسـتی خاڵیـی بـوو، (سَأَفْرُغُ لَـكَ) واتـە: زۆر بـە جیددیـی بایـەخ بـە کارەکـەی تـۆ دەدەم و سـزات دەدەم، کەواتـە: (سَنَفْرُغُ لَكُمْ أَيُّهَ ٱلثَّقَلَانِ!) خوا بسم الله الرحمن الرحيم دەفەرموێ: ئەی جندو مرۆڤ! لە مەودوا بە جیددیی خەریکی کاروباری ئێـوە دەبـم، کـە مەبەسـت پێـی ڕۆژی دواییـەو هێنرانـە پێـشی سـزاو پاداشـتە.

(أَيُّهَ ٱلثَّقَلَانِ): ئـەی دوو قورسـەکان، (ثَقَـل) بـە مانـای قورسـایی دێ، (ثَقَـلَان) واتـە: دوو قورسـەکان، (الثِّقَـلُ: وَالخِفَّـةُ مُتَقَابِـلَان، وَثقـلان تَثْنِيَـةُ ثَقَـل، وَهَـذَا المُثَنَّـى اسْمٌ مُفْـرَدٌ لِمَجْمُـوع الإنْـسِ وَالجِـنِّ)، (ثِقَـل) قورسـیی، (خِفَّـة) سـووکیی و ئەوانـە پێکـەوە بـەراورد دەکرێـن، ئنجـا کـە (ثَقَـل) کـراوە بـە دووان (ثَقَـلَان)، ئـەم دووانەیـە ناوێکـی تاکـە بـۆ کـۆی جنـدو مـرۆڤ، کەواتـە: (الثَّقَـلَان، الثَّقَلَيْن) واتـە: دوو کۆمەڵـە قورسـەکان کـە مەبەسـت پێـی مـرۆڤ و جنـدن.

(يَٰمَعْشَرَ): (الـمَعْشَرُ: إسْـمٌ للجَمْـعِ الكَثِـير الَّـذِي يُعَـدُّ عَـشْرَةً عَـشْرَةً دُونَ أَحَـاد)، (مَعْـشَر) نـاوە بـۆ کۆمەڵێکـی زۆر کـە دە دە دەژمێردرێـن، نـەک یـەک یـەک، واتـە: لەبـەر زۆرییـان ناگونجـێ یـەک یـەک بژمێردرێـن.

(أَن تَنفُذُواْ): کـە دەربچـن، (نَفَـذَ السَّـهْمُ فِي الرَّمِيَّةِ نُفُوذاً وَنَفَاذاً، وَالـمِثْقَبُ فِي الخَشَـبِ: خَـرَقَ إلى الجِهَـةِ الأُخْـرَى)، دەگوتـرێ: تیرەکـە لـە بـۆ هاوێژراوەکـە (لـە نێچیرەکـە) دەرچـوو، (نُفُـوذاً وَنَفَـاذاً) بـە دەرچـوون، (والمِثْقَـبُ فِي الخَشَـبِ) {(مِثْقَـب) ئەوەیـە داری پـێ کـون دەکـەن} کونکەرەکـەش لـە تەختەکـە دەرچـوو، (خَـرَقَ إلى الجِهَـةِ

www.alibapir.com



**الأُخْرَى)** واتـە: لەملایـەوە دڕی و كـونی كـرد، بـۆ دیوەكـەی دی، واتـە: دەڕاو دیـوی كـرد، ئنجـا كـە دەفەرمـوێ: ئـەی كۆمەڵـی جنـدو مـرۆڤ! ئەگـەر توانیتـان لـە لاو تەنیشـتەكانی ئاسـمانەكان و زەوی دەربچـن، بێگومـان مەبەسـت ڕاكـردن و هەڵاتنـە، **(النُّفُـوذُ والنَّفَـاذُ: جَـوازُ شَيء عَـن شَيءٍ وَخُرُوجُـه مِنْـهُ)**، **(نُفُـوذ ونَفَـاذ)** هەردووكیـان بـە مانـای ڕەتبـوونی شـتێكە بـە نێـو شـتێک داو لـێ دەرچوونیـەتی، **(منفذ)**یـش **(المَمَـرُّ النَّافِـذُ)**، یـانی: ئـەو پێـدا ڕۆیشـتووەی دەڕاو دیـوە شـوێنی پێداڕۆیشـتن.

(أَقْطَارِ): **(جَمْـعُ قُطْـر: وَهُـوَ الجَانِـب، وَالقُطْـرُ: النَّاحِيَّـة الوَاسِـعَةُ فِي المَكَان الأَوْسَـع)**، **(أَقْطَار)** كـۆی **(قُطْر)**ە، كـە بـە مانـای لا تەنیشـت و لایەكـی فـراوان دێ، لە شـوێنێكی فراوانـتر.

(بِسُلْطَانٍ): **(السَّـلاطَةُ: التَّمَكُّـنُ مِـنَ القَهْـرِ، وَسُـمِّيَ الحُجَّـةُ سُـلْطَاناً، وَسَـلاطَةُ اللِّسَـانِ: القُـوَّة فِي المَقَـالِ، إلاَّ بِسُـلْطَان: إلاَّ بِمُلْـك وَلَيْـسَ لَكُـم مُلْـك)**، **(سَـلا طَـة)** دەسـترۆیشـتوویی لـە ڕووی دەسـتەڵاتەوە، بەڵگـەش پێـی گوتـراوە: **(سُـلْطَان)** {لەبـەر ئـەوەی دەسـەڵاتی هەیـە بەسـەر عەقڵـی بەرانبەرەكـەداو} **(وَسَـلاطَةُ اللِّسَـانِ)** دەگوترێ: فڵانكەس **(سَـلِيْطُ اللِّسَـانِ)** زمـانی تیـژە، لەبـەر ئـەوەی لـە دوان دا قسـەزانە {قسـەكەی تیـژەو دەبـڕێ} كەواتـە كـە دەفەرمـوێ: **(لَا تنْفـذُون إلاَّ بِسُـلْطَان)**، واتـە: مەگـەر بـە حوكمڕانیـی و بـە دەسترۆیشـتوویەتی دەربچـن و ئەوەشـتان نیـە، كەواتـە: ناتوانـن دەربچـن و لـە دەستی خوا بسم الله الرحمن الرحيم ڕابكەن.

(شُوَاظٌ): **(الشُّـوَاظُ: اللَّهَـبُ الَّـذِي لَا دُخَـان فِيْـه)**، **(شُـوَاظٌ)** ئەو بڵێسـەیە كـە دووكەڵی تێدانیـە، واتە: بڵێسـەی ئاگـری ڕووت.

(وَنُحَاسٌ): **(اللَّهِيْـبُ بِـلَا دُخَـان)**، **(لهيـب)** یـانی: گڕێـک كـە دوو كەڵـی تێدانیـە، بـەڵام بـە مانـای مسـیش دێ، **(النحـاس: الصُّفْـرُ وَهُـوَ القِطْـرُ)**، **(صُفـر)** واتـە: مـس، كـە ئـەم مانایەیـان لێرەدا گونجاوتـرە، واتـە: ئەگـەر ئێـوە بتانـەوێ دەربچـن، هـەم بڵێسـەی ئاگـر، هـەم مسـی قاڵكراوەتـان بەسـەردا دەنێـررێ. واتـە: ئـەو كانزایانـەی لـە پارچـە

www.alibapir.com


ئەستێرەو خڕۆکەکاندا هەن، کە لە شێوەی نەیزەک و بڵێسەدا بەرەو زەوی دێن. هەروەها (نُحَاسٌ) بە (دووکەڵ)ی بێ خڵتەش گوتراوە، بەڵام زیاتر مانای مس دەگەیەنێ لەم سیاقەدا.

(وَرۡدَةً ): (وَاحِدَةُ الوَرْد) واتە: گوڵ، یەک گوڵ، (وَهُوَ زَهْرٌ أحْمَر مِن شَجَرةٍ دَقِيْقَة ذَاتِ أغْصَانٍ شَائِكَة)، ئەویش بریتیە لە گوڵێکی سوور لە درەختێک کە گەڵاکانی وردن و لقەکانی دڕکاویین، لە کوردیی دا گوڵەباغی پێ دەگوترێ.

(كَٱلدِّهَانِ): (الدِّهَانُ: دُرْدِيُّ الزَّيْتِ، وَالدِّهَانُ: الأدِيمُ الأحْمَرُ، وَالدِّهَانُ: الدُّهْن)، (دِهَان) بە سێ واتایان هاتوە:

أ- هەم بە مانای تڵتی ڕۆنی زەیت (دُرْدِيّ) هاتوە.

ب- هەروەها بە مانای پێست و چەرمی سووریش هاتوە.

ج- دیسان بە مانای ڕۆن بە گشتیی، یان ڕۆنی داغ کراو و، قاڵبۆوەوەش هاتوە. یانی: ئاسمان ڕەنگەکەی بەو شێوەیەی لێ دێ.

(بِٱلنَّوَٰصِى ): (جَمْعُ نَاصِيَة: وَهِيَ شَعْرُ مُقَدَّمِ الرَّأسِ)، تووکی پێشەسەر پێی دەگوترێ: (ناصِيَة)، کە بە (نَواصِي) کۆ دەکرێتەوە واتە: پێشەسەرەکان.

(حَمِيمٍ): (الحَمِيْمِ: المَاءُ الشَّدِيْدُ الحَرَارَة)، ئاوێکی کە زۆر گەرم بێ، واتە: ئاوی کوڵاوو داغ.

(ءَانٍ): (انْتَهَى حَرُّهُ عَلَي حَتَّى انْتَهَى غَلْيهُ، آنٍ: الحَاضِر)، (آنٍ) بە مانای گەرمییەکەی کۆتایی هاتوە، واتە: کوڵاوە تاکو گەیشتۆتە قۆناغی کۆتایی، کە ئاو لە پلەی سەدی گەرمیی دا دەکوڵێ و دوایی دەبێتە هەڵم و نامێنێ.

www.alibapir.com


## مانای گشتیی ئایەتەکان

وەک پێشتریش گوتمان: ئەم پازدە ئایەتە هەموویان لە بارەی باس و خواسی قیامەتەوەن، بەڵام سەرەتا خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿سَنَفْرُغُ لَكُمْ أَيُّهَ ٱلثَّقَلَانِ﴾، بە دڵنیایی بۆتان یەکلایی دەبینەوە ئەی دوو قورسەکان! کە مەبەست پێیان مرۆڤ جندە، ئەی کۆمەڵێ مرۆڤ و جند! بۆتان یەکلایی دەبینەوەو، دەست خاڵیی دەبین، واتە: زۆر بە جیددیی لێتان[1] وەخۆ دەکەوین. دوایی لە مەسەلە گرنگەکانیشدا زیاتر تیشک دەخەینە سەر ئەم وشەیە.

بێگومان خوا ﷻ: (**لا يُشْغُلُه شَأْنٌ عَن شَأْن**)، هیچ کارێک لە کارێکی دیکە دەستگیراو و سەرقاڵی ناکات، بگوترێ: لەبەر ئەوەی خەریکی فڵان کارەیە، فڵان کارەی بۆ ناکرێ! بەڵکو خوا ﷻ لە یەک تاودا، بێ ئەژمار کاران ئەنجام دەدا، لە بارەی دروستکراوەکانی خۆیەوە کە بەس خۆی بە ژمارەیان زانایەو، تەنیا خۆی بە کاروباریان ئاگادارە لە ئاسمانەکان و لە زەویداو، لە دەرەوەی ئاسمانەکان و زەویش دا، وەک فەرموویەتی: ﴿وَمَا يَعْلَمُ جُنُودَ رَبِّكَ إِلَّا هُوَ ۚ وَمَا هِيَ إِلَّا ذِكْرَىٰ لِلْبَشَرِ ﴿٣١﴾﴾ **المدثر**، جگە لە خۆی سەربازەکانی پەروەردگارت نازانێ، بەڵام لێرەدا: ﴿سَنَفْرُغُ لَكُمْ أَيُّهَ ٱلثَّقَلَانِ﴾، واتە: بۆتان دەستخاڵیی دەبینەوە، چونکە کەسێک بیەوێ خەریکی کارێک بێ، کارەکانی دیکە واز لێ دێنێ، بۆ ئەوەی ئەو کارەی دیکە کە ڕووی تێ دەکات، بە جیددیی ئەنجامی بدات، واتە: ئێمە بە جیددیی، خەریکی جێبەجێکردنی کاری ئێوە دەبین، کاری ئەو دوو کۆمەڵەی جندو مرۆڤیش بریتیە لە سزاو پاداشت بۆ هێنانە پێشیان، ﴿فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ﴾، ئنجا ئەی کۆمەڵی جندو مرۆڤ! ئایا نکوولیی لە کام لە چاکەکانی پەروەردگارتان دەکەن؟ کە ڕۆژێکی داناوە تایبەت بۆ لێپرسینەوەی ئێوە، بۆ سزاو پاداشت بەسەردا

---

(١) لێی وەخۆکەوت: گرنگیی پێدا، مشووری لێخوارد.

www.alibapir.com



چەسپاندنتان، تاکو دادگەریی خوا ﷻ بچەسپێ و، چاکان پاداشت بدرێنەوەو، خراپەکارانیش سزا بدرێن، ئنجا ئایا کەس توانای ڕاکردن و هەڵاتنی هەیە لەو ڕۆژەداو، کەس توانای دەربازبوون و قوتار بوونی هەیە؟ نەخێر.

خوا دەفەرموێ: ﴿ يَٰمَعۡشَرَ ٱلۡجِنِّ وَٱلۡإِنسِ ﴾، ئەی کۆمەڵی زۆری جندو مرۆڤان! ﴿ إِنِ ٱسۡتَطَعۡتُمۡ أَن تَنفُذُواْ مِنۡ أَقۡطَارِ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ ﴾، ئەگەر توانیتان لە کەلێن و لایەکانی، لە گۆشەو کەنارەکانی ئاسمانەکان و زەوی دەربچن، تاکو ڕابکەن و هەڵبێن، ﴿ فَٱنفُذُواْ ﴾، دەربچن، بڕۆن، ﴿ لَا تَنفُذُونَ إِلَّا بِسُلۡطَٰنٖ ﴾، ناتوانن دەربچن و، قوتار بن، مەگەر بە حوکمڕانیی و دەستەڵات {ئەو حوکمڕانیی و دەستەڵاتەشتان نیە} کەواتە: ئەی مرۆڤ و جند کە لە دنیادا دەژین! خۆتان ئامادە بکەن بۆ ئەو ڕۆژەی لە دەستی خوا قوتار نابن و، خواش ﷻ زۆر بە جیددیی خەریکی لێپرسینەوەو سزاو پاداشتی ئێوە دەبێ، خۆتان بۆ ئەو ڕۆژە ئامادە بکەن، کە ناشتوانن لە گۆشەو لایەکانی ئاسمانەکان و زەوییەوە دەربچن و، لە خوا ڕابکەن و قوتارتان نابێ، ﴿ فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ ﴾، ئنجا ئایا ئەی کۆمەڵی جندو مرۆڤ! نکووڵیی لە کام لە چاکەکانی پەروەردگارتان دەکەن و دانی پێدا ناهێنن؟ ئنجا لەسەر باسی ئەوە بەردەوام دەبێ کە ئەگەر بیانەوێ ڕابکەن، لەتەنیشت و لایەکانی ئاسمانەکان و زەوی، لە گۆشەو کەنارەکانیانەوە بزانین چییان بەسەر دێ؟

﴿ يُرۡسَلُ عَلَيۡكُمَا شُوَاظٞ مِّن نَّارٖ وَنُحَاسٞ فَلَا تَنتَصِرَانِ ﴾، بڵێسەی ئاگرو مسی قاڵکراوەتان بەسەردا دەنێردرێ {واتە: بەسەرتان دادەبەزێنرێ} سەرکەوتوو نابن.

یانی: ئەگەر بتانەوێ ڕابکەن و لە گۆشەو کەنارەکانی ئاسمانەکان و زەوی دەربچن، تووشی ئەو بڵێسەی ئاگرو مس و کانزای تواوە دەبن، ئەمەش ئاماژەیە بۆ ئەو پارچە نەیزەک و بڵێسانەی کە ئێمەی خەڵکی سەر زەوی دەیانبینین، بە تایبەتی لە شەواندا کە خەڵک دەڵێن: ئەوە ئەستێرەیە ڕاخزی، یان ئەوە ئەستێرەیە کشا، بەڵام لە ڕاستییدا ئەوانە هەموویان پارچە نەیزەک و بچووکتر

لـە نەیزەکەکانـن کـە دەبنـە بڵێسـەی ئاگـر، بـەڵام ئەگـەر گەورەبـن، بـە قەبـارەی جـۆراو جـۆر دەکەونـە سـەر زەوی و وێرانکاریـی گـەورە لـە ئەنجامـی کەوتنـە سـەر زەوییـان دا دروسـت دەبـێ، بـەڵام بـە زۆریـی ئـەو پارچـە ئەسـتێرەو خڕۆکانـەی بـەرەو بەرگـە هـەوای زەوی دێـن، لەبـەر ئـەوەی بەرگـە هـەوای زەوی مەودایەکـی بـاشی هەیـەو هـەزار (١٠٠٠) کیلۆمەتـر بەرزتـرە، ئـەو پارچانـە دەسـووتێنرێن، ئەگەرنـا لـە هـەر شـەو ڕۆژێکـدا بـە مەزەنـدەی زانایـان زیاتـر لـە یـەک ملیـۆن (١٠٠٠٠٠٠) بـەردی بچـووک دێنـە نێـو بەرگـە هـەواوە، بـەڵام لەبـەر ئـەوەی ئـەو بەرگـە هەوایـە گازی ئۆکسـجینی تێدایـە کـە یارمەتیـی سـووتان دەدات و، گازی هایدرۆجینـی تێدایـە کـە دەسـووتێ و، ئـەو پارچانـەش زۆر گەرمـن، لـە ئەنجامـی لێکخشـاندا گـڕ دەگـرن دەسـووتێن، مەگـەر بـە دەگمـەن و جـار جـار تـاک و تەرایەکیـان بـە قەبارەیـەک بگاتـە زەوی، ئەگەرنـا ئـەوانی دیکـە هەموویـان دەسـووتێن و بڵاودەبنـەوە، ئنجـا کـە بڵاویـش دەبنـەوە دیسـان ئـەوەش سـوودی هەیـە، چونکـە تۆزوگەردەکەیـان دەبـێ بـە چـەق بـۆ ئـەو دڵۆپـە بـاران و بەفـرو تەرزانـەی کـە پـاش پرۆسـەی هەڵمانـدنی دەریـاکان، پەیـدا دەبـن و سـەرەنجام لـە ئاسـمانەوە ئاومـان بـۆ دادەبـەزێ، لـە شـێوەی بـاران و بەفـرو تـەرزەدا.

بۆیـە دەفەرمـوێ: بڵێسـەی ئاگـری بـێ خڵتـەو، مـسی قاڵکراوەتـان بـۆ سـەرتان دەنێـردرێ و ئێـوە سـەرکەوتوو نابـن، ﴿ فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ ﴾، ئنجـا ئـەی کۆمەڵـی جنـدو مـرۆڤ! ئایـا نکوولیـی لـە کام لـە چاکـەکانی پەروەردگارتـان دەکـەن؟

ئنجا خوا ﷻ دەگوازێتەوە بۆ باسێکی دیکەو باسی دوایی ڕۆژی دوایی دەکات، هەڵبەتـە ئـەوەی پێشـێش هـەر زەمینـە خۆشـکردن بـووە بـۆ بـاسی ڕۆژی دوایـی، کـە خوا ﷻ فەرمووی: خۆمتان بۆ یەکلایی دەکەمەوە تاکو سزاو پاداشتتان بدەم، دوایـی فەرمـووی: ناتوانـن ڕابکـەن، بـە گۆشـەو کەنـارەکانی ئاسـمانەکان و زەوی دا، توانـای ڕاکردنتـان نیـە، لەبـەر ئـەوەی بڵێسـەی ئاگـرو مـسی قاڵکراوەتـان بەسـەردا دەبەزێـنرێ.

www.alibapir.com


دوایی دەفەرمووێ: ﴿ فَإِذَا ٱنشَقَّتِ ٱلسَّمَآءُ ﴾، کە دێتە سەر باسی ڕۆژی دوایی، پێشێ باسی قۆناغی ئاخیر زەمان دەکات و دەفەرمووێ: کاتێک ئاسمان لەت بوو، واتە: ئەم گەردوونە، ﴿ فَكَانَتْ وَرْدَةً ﴾، سوور هەڵگەڕا ﴿ كَٱلدِّهَانِ ﴾، وەک (دِهَان)، (دهان)یش: أ- هەم بەتڵتی زەیت دەگوترێ، ب- هەم بە ڕۆنی داغ، ج- هەم بە چەرمی سووریش واتە: ئاسمان وەک گوڵێک سوور هەڵدەگەڕێ، لە شێوەی تڵتی زەیت، یان ڕۆنی داغ کراو، یاخود چەرمی سووردا، ﴿ فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ ﴾، ئنجا ئەی کۆمەڵی جندو مرۆڤ! ئایا نکووڵیی لە کام لە چاکەکانی پەروەردگارتان دەکەن؟

﴿ فَيَوْمَئِذٍ لَّا يُسْـَٔلُ عَن ذَنۢبِهِۦٓ إِنسٌ وَلَا جَآنٌّ ﴾، لەو ڕۆژەدا نە مرۆڤ، نە جند لە بارەی گوناحیەوە لێی ناپرسرێ، واتە: هیچ مرۆڤێک و هیچ جندێک لە بارەی گوناح و تاوانیەوە پرسیاری لێ ناکرێ، ئایا کردووتە یان نەتکردوە؟ یان چیت کردوەو چیت نەکردوە؟ چونکە هەموو شتێک تۆمارکراوە، واتە: پرسیارکردنی ئەوە کە بزانرێ: چییان کردوە؟ ئەو پرسیارەیان لێ ناکرێ، بۆیە کە لە شوێنی دیکەدا دەفەرمووێ: ﴿ وَقِفُوهُمْ إِنَّهُم مَّسْـُٔولُونَ ﴿٢٤﴾ ﴾**الصافات**، ڕایانگرن ئەوان لێیان دەپرسرێتەوە، ئەو پرسیارکردنە، پرسیارکردنی سەرزەنشتکردن و سەغڵەتکردنە، بەڵام ئەوەی ئێرە کە دەفەرمووێ: لێیان ناپرسرێ، مەبەست پرسیارکردنی پەیداکردنی زانیارییە، خوا بسم الله الرحمن الرحيم و فریشتەکان لێیان ناپرسن، تاکو زانیارییان لێ وەدەست بێنن، داخۆ چیان کردوەو چییان نەکردوە؟ چونکە هەموو شتێک تۆمارکراوەو، هەرچی کردوویانە لەلای خوای پەروەردگار زانراوەو فریشتەکانیش تۆماریان کردوە، ﴿ فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ ﴾، ئەی کۆمەڵی جندو مرۆڤ! ئایا نکووڵیی لە کام لە چاکانی پەروەردگارتان دەکەن؟

﴿ يُعْرَفُ ٱلْمُجْرِمُونَ بِسِيمَٰهُمْ ﴾، تاوانباران بە نێو چەوانەکانیان دەناسرێنەوە، ﴿ فَيُؤْخَذُ بِٱلنَّوَٰصِى وَٱلْأَقْدَامِ ﴾، یەکسەر تووکی پێشەرەکانیان لەگەڵ پێیەکانیان پێکەوە دەگیرێن، تووکی پێشە سەر و پێیان خڕ دەکرێنەوە، یانی: هەردووکیان پێکەوە

www.alibapir.com


دەگیرێـن و کەلەپچـە دەکرێـن، بـۆ ئـەوەی فڕێدرێنـە دۆزەخـەوە، خـوا پەنامـان بـدات، ﴿ فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ ﴾، ئنجـا ئـەی کۆمەڵـی جنـدو مـرۆڤ! نکووڵیـی لـە کام لـە چاکـەکانی پەروەردگارتـان دەکـەن؟

﴿ هَٰذِهِۦ جَهَنَّمُ ٱلَّتِي يُكَذِّبُ بِهَا ٱلْمُجْرِمُونَ ﴾، ئەمـە ئـەو دۆزەخەیـە کە تاوانبـاران بە درۆی دادەنێـن، تاوانبـاران نکووڵیـی لێدەکـەن و بـڕوای پـێ ناهێنـن، واتـە: پێیـان دەگوتـرێ: ئەمـە ئـەو دۆزەخەیـە فەرمـوون تەماشـای بکـەن! ﴿ يَطُوفُونَ بَيْنَهَا وَبَيْنَ حَمِيمٍ ءَانٍ ﴾، لـە نێـوان دۆزەخ و لـە نێـوان ئاوێکـی کـوڵاو و داغـدا (کـە گەیشـتۆتە ئەوپـەڕی داغیـی و کوڵاویـی) دێـن و دەچـن، واتـە: جـارێ بـە ئاگـر دەسـووتێنرێن و، جـارێ ئـاوی کـوڵاو داغیـان بـە گـەروودا دەکـرێ، یاخـود بەسـەردا دەکـرێ، ﴿ فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ ﴾، ئنجـا ئایـا ئـەی کۆمەڵـێ جنـدو مـرۆڤ! نکووڵیـی لـە کام لـە چاکـەکانی پەروەردگارتـان دەکـەن؟ کـە بێگومـان هەبـوونی ئـەو سـزایەش بـۆ تاوانبـاران کـە سـەختترین سـزایە، هـەر لـە چاکـەو نیعمەتـەکانی خـوای پـەروەردگارە کـە لـێ ناگـەڕێ سـتەمکاران و تاوانبـاران و خراپـەکاران وەک بەرزەکـی بانـان بـۆی دەربچـن، لـە دنیـادا، تەراتێنـی زۆریـان کـردوەو، سـتەم و خراپـەی زۆریـان کـردوەو، نابـێ لـە قیامـەت دا وەک بەرزەکی بانان بۆی دەربچن، بۆیە خوا ﷻ ئەوەش وەک چاکەو نیعمەتێکی هـەرە بـاڵای خـۆی بـۆ مـرۆڤ و جنـد دەخاتـە ڕوو.

ئنجـا لـەم ئایەتـە موبارەکـەش وەردەگیـرێ کـە جندیـش، وەک مـرۆڤ سـزای دەبـێ، وەک چـۆن ئایەتـەکانی دیکـەش بەڵگـەن لەسـەر ئـەوە کـە پاداشتیشـیان دەبـێ، هەروەهـا کـۆی ئـەو سـی و یـەک (٣١) جـارەی خـوا دەفەرمـوێ: ﴿ فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ ﴾، ئایـا نکووڵیـی لـە کام لـە چاکـەکانی پەروەردگارتـان دەکـەن، ئـەی کۆمەڵـی جنـدو مـرۆڤ؟ بەڵگـەن لەسـەر ئـەوە کـە جندیـش وەک مـرۆڤ، لـە هەموو ئـەو نیعمەتانـەی خـوا باسـیان دەکات لـە دنیـاو لـە دواڕۆژدا، بەهرەمەنـدن، واتـە: ئەوانیـش بەهـرە وەردەگـرن لـە خـۆر، لـە مانـگ، لـە زەوی، لـە ڕووەکـی زەوی، لـە دەریا، لە هەموو ئەو شتانەی خوا ﷻ باسیان دەکات، وەک چۆن بۆ مرۆڤەکان

جێی بەهرەن و مایەی سوودو کەڵکن، بۆ جندیش بە هەمان شێوە، ئەگەرنا خوا بسم الله الرحمن الرحيم ئەوانیشی لەگەڵ مرۆڤاندا باس نەدەکردو، ئەو چاکەو نیعمەتانەی خۆی نەدەخستە بەرچاویان و، لێی نەدەپرسین بە پرسیارکردنی چەسپێنەرانە، چونکە ئەو سی و یەک پرسیارە، پرسیارکردنی چەسپێنەرانە **(الإستفهام التقريري)** ن و، دەشگونجێ پرسیارکردنی نکووڵییلێکەرانە بن، ئایا ئەی کۆمەڵی مرۆڤ و جند! نکووڵیی لە کام لە چاکەکانی پەروەردگارتان دەکەن؟ ئنجا ئەگەر جندیش بەهرەمەند نەبوونایە وەک مرۆڤ لەو نیعمەتانە، خوا بسم الله الرحمن الرحيم ئەو چاکانەی بۆ ئەوانیش باس نەدەکردن و، لەسەر ئەوە پرسیاری لێ نەدەکردن، چ پرسیارکردنی چەسپێنەرانە، چ پرسیارکردنی نکووڵی لێکەرانە.

لە تۆڕە کۆمەڵایەتییەکان لەگەڵتانین
Stay in touch on social media
نحن معكم عبر مواقع التواصل الاجتماعي
ڕاگەیاندنی مەکتەبی مامۆستا عەلی باپیر
AliBapir/عەلی باپیر
archive.org/details/@alibapir
AliBapir/عەلی باپیر
کەناڵی ڕاگەیاندنی مەکتەبی مامۆستا عەلی باپیر
AliBapir
Google Play
App Store
www.alibapir.net
کوردی - عربي - English
ڕاگەیاندنی مەکتەبی مامۆستا عەلی باپیر

www.alibapir.com


مەسەلە گرنگەکان

## مەسەلەی یەکەم:

**ڕاگەیاندنی خوای دادگەر بە جندو مرۆڤ کە لە ڕۆژی دواییدا خۆی بۆ لێپرسینەوەیان، یەکلایی و دەست خاڵیی دەکات:**

خوا دەفەرموێ: ﴿ سَنَفۡرُغُ لَكُمۡ أَيُّهَ ٱلثَّقَلَانِ ﴿٣١﴾ فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ ﴿٣٢﴾ ﴾.

## شیکردنەوەی ئەم دوو ئایەتە لە دوو بڕگەدا:

١)- ﴿ سَنَفۡرُغُ لَكُمۡ أَيُّهَ ٱلثَّقَلَانِ ﴾، بە دڵنیایی بۆتان دەست خاڵیی دەبین، ئەی دوو قورسەکان، خوێنراویشەتەوە: (سَيَفْرُغُ لَكُمْ) واتە: (سَيَفْرُغُ لَكُمْ الله)، خوا بۆتان دەست خاڵیی دەبێ و خۆیتان بۆ یەکلایی دەکاتەوە، (الثَّقَلانِ) (مُثَنَّى الثَّقَل)، **(الثَّقَلُ: هُوَ كُلُّ شَيْءٍ لَهُ قَدْرٌ، وَوَزْنٌ يُنَافَسُ بِهِ، وَأُطْلِقَ عَلَيْهِمَا الثَّقَلاَن لِعَظَمِ قَدْرِهِمَا أو لأَنَّهُمَا أُثْقِلا بِالْتَّكَالِيْف)**، (ثَقَل): (مُثَنَّى)یەکەی (ثَقَلان)ەو بریتیە لە هەر شتێک کە کێشی هەبێ و قەدری هەبێ، بەراوردو پێشبڕکێی پێ بکردرێ لەگەڵ شتێکی دیکەدا، لێرەدا کە بە مرۆڤ و جند گوتراوە: (ثَّقَلانِ) لەبەر ئەوەیە قەدریان مەزنە، یان لەبەرئەوەیە شانیان قورسکراوە بە ئەرکە شەرعییەکان، ئنجا کە خوا دەفەرموێ: ﴿ سَنَفۡرُغُ لَكُمۡ ﴾، ئەمە خوا بسم الله الرحمن الرحيم بە پێی عەقڵی ئێمە فەرمایشتی فەرمووە تاکو تێیبگەین.

**(الفَرَاغُ لِلشَّيْءِ: الخُلُوُّ عَمَّا يُشْغِلُ عَنْهُ، وَهُوَ تَمْثِيلٌ لِلإِعْتِنَاءِ بِالشَّيْءِ، وشُبِّهَ حَالَ المُقْبِلِ عَلَى عَمَلٍ دُونَ عَمَلٍ آخَرَ، بِحالِ الوِعاءِ الَّذِي أُفْرِغَ مِمَّا فِيهِ لِيُمْلأَ بِشَيْءٍ آخَرَ)**، **(الفَراغُ لِلشيْءِ)** واتە: خاڵیی بوونەوە بۆ شتێک، بریتیە لەوە کە مرۆڤ دەست بەتاڵ بێ لەو شتەی پێوەی سەرقاڵە، تاکو یەکلابێتەوە بۆ سەرگەرم بوون بەو شتەی دیکەوە، ئەمە لێرەدا وێنە هێنانەوەیە بۆ گرنگییدان بە شتێک، ئنجا

www.alibapir.com


حاڵی کەسێک کە ڕوو لە کارێک دەکات بۆ ئەوەی خۆی بۆ یەکلایی بکاتەوە، چوێنراوە بە دەفرێکەوە کە ئەو شتەی تێدایە، لێی دەڕێژرێ و لێی خاڵیی دەکرێتەوە، تاکو بە شتێکی دیکە پڕ بکرێ، کەواتە: ﴿ سَنَفْرُغُ لَكُمْ ﴾، واتە: (سَنَتَفَرَّغُ لَكُم)، واتە: ئێمە لەمەودوا خۆمانتان بۆ یەکلایی دەکەینەوە، یەکێک بە یەکێک دەڵێ: (سَأَتَفَرَّغُ لَكَ، أي: سَأجِدُّ فِي أَمْرِك وَأُعَاقِبُك) واتە: زۆر بە جیددیی سەرگەرمی کاری تۆ دەبم و سزات دەدەم.

زانایان زۆریان لەو بارەوە قسە کردوە، یەکێکیان (**شیخ حسنین محمد المخلوف**)، لە (**صفوة البيان**)ەکەی خۆیدا[1] دەڵێ: (**الفَرَاغُ هُنَا: القَصْدُ إلى الشَّيءِ وَالإقْبَالُ عَلَيْهِ، يُقَالُ: فَرَغَ لَهُ وَفَرَغَ إلَيْهِ، سَأَفْرُغُ لِفُلَانٍ: سَأَجْعَلُهُ قَصْدِي**)، (**فَرَاغ**): (دەست بەتاڵ بوون) لێرەدا مەبەست پێی ڕووکردنە شتێکەو، پێوە سەرگەرم بوونیەتی و، خۆ بۆ یەکلاکردنەوەیەتی، دەگوترێ: (**فَرَغَ لَهُ وَفَرَغَ إلَيْهِ**)، واتە: خۆی بۆ خاڵیی کرد، یان خۆی بۆ لا خاڵییکردو بۆ یەکلاکردەوە، (**سَأَفْرُغُ لِفُلَانٍ**) واتە: فلانکەس دەکەمە جێی مەبەستم.

یەکێکی دیکە لە زانایان دەڵێ: (**مَعْنَى سَنَفْرُغُ لَكُمْ: سَنَطْوِي بِسَاطَ النَّشْأَةِ الأُوْلَى وَنَشْتَغِلُ بِكُمْ، وَالمُرَادُ بِالإشْتِغَالِ بِهِمْ: بَعْثُهُمْ وَحِسَابُهُمْ وَمُجَازَاتُهُمْ بِأَعْمَالِهِمْ، فَالْفَرَاغُ اسْتِعَارَة بِالكِنَايَةِ عَنْ تَبَدُّلِ النَّشْأَةِ**)، واتە: مانای (**سَنَفْرُغُ لَكُمْ**) خۆتان بۆ یەکلایی دەکەینەوە، واتە: ئەم ژیانەی یەکەم کۆتایی پێ دێنین و، سەرگەرمتان دەبین، مەبەست لە پێوە سەر گەرم بوونیان، زیندوو کردنەوەیان و لێپرسینەوەیان و سزاو پاداشتدانەوەیانە.

کەواتە: لێرەدا وشەی (**فَرَاغ**) خوازراوەتەوە بە کنارە، بۆ ئەوە کە ئەم حاڵەی دنیا دەگۆڕدرێ و ڕۆژی دوایی دێتە پێش.

---

(١ ) ص: (٦٨٩، ٦٩٠).

www.alibapir.com



بێگومـان گۆڕینــی ئـەم ژیـانی دنیایـەو کۆتایـی پێهاتنـی و، هێنانـە پێـشی ڕۆژی دوایـی و، تێـدا چەسـپاندنی سـزاو پاداشـتی خـوا؛ سـزا بەسـەر بێبڕوایـانی تاوانبـارو سـتەمکارو خراپـەکارداو، پاداشـت بـۆ بڕوادارانێـک کـە پارێزکاربـوون و چاکـەکار بـوون، پارێزکاربـوون بەرانبـەر بـە خـواو چاکـە کار بـوون بەرانبـەر بـە خەڵکـی خـوا، بەڵـێ بێگومـان ئـەوەش لـە چاکـەو نیعمەتـە مەزنـەکانی خـوای میهرەبانـە، بۆیـەش دوای ئـەوە یەکسـەر خـوا دەفەرمـوێ:

٢)- ﴿ فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ ﴾، ئنجا ئەی کۆمەڵی جندو مرۆڤ! نکووڵیی لە کام لە چاکەکانی پەروەردگارتان دەکەن؟ واتە: ئایا نکووڵیی لەو چاکەیە دەکەن، کە ئەم ژیانی دنیایە قۆناغێکی دیکەی بە دوادا دێ، کە قۆناغی ڕۆژی دواییەو، تەنیا بە ژیانی دنیا کۆتایی نایەت و دیزەبەدەرخۆنە ناکرێ لە ژیانی مرۆڤان، بەڵکو ژیانێکی دیکەو قۆناغێکی دیکە لە ژیان دێتە پێش، هەڵبەتە لە نێوان ڕۆژی دوایی و دنیاشدا، قۆناغێکی دیکە هەیە، بە ناوی قۆناغی بەرزەخ، وەک لە تەفسیری سووڕەتی (**المؤمنون**)دا، باسێکمان لەو بارەوە کرد، لەبەر تیشکی ئەو ئایەتە موبارەکەدا کە دەفەرموێ: ﴿ وَمِن وَرَآئِهِم بَرْزَخٌ إِلَىٰ يَوْمِ يُبْعَثُونَ ﴿١٠٠﴾ ﴾**المؤمنون**، واتە: لە پشتیانەوە پەردەیەک و نێوانێک هەیە، تاکو ئەو ڕۆژەی تێیدا زیندوو دەکرێنەوە، هەڵبەتە قۆناغی بەرزەخیش زۆر لە قۆناغی ژیانی دنیا، فراوانترە، چونکە ئەو مرۆڤانەی کە لە سەرەتاوە دروست بوون و بەس خوا دەزانێ چەند هەزار ساڵە مردوون، هەر لە قۆناغی بەرزەخدان، شەست، حەفتا (٦٠-٧٠) یان هەشتا نەوەد (٨٠-٩٠) ساڵێک، ئەوپەڕی سەد، دوو سەد (١٠٠-٢٠٠) ساڵێک ژیاون[١]، بەڵام چەندان هەزار ساڵە لە قۆناغی بەرزەخدان، بەس خواش ﷽ دەزانێ چەند هەزار ساڵی دیکەش تێیدا دەمێنن، تاکو ڕۆژی دوایی دێتە پێش، کەواتە: ژیانی مرۆڤ، تەنیا لە چوارچێوەی ژیانی دنیا دا کورت نەبۆتەوە، بەڵکو قۆناغێکی دیکەی بەدوادا دێ، کە قۆناغێکی

---

(١) جگـە لـە نـووح علیـه السلام و گەلەکـەی و ئەوانـەی نزیکیـان لـە ڕووی کاتـەوە، کـە تەمانیـان زیاتر بـووە.

ڕاگوزەرە، قۆناغی بەرزەخ و، دوای ئەوە قۆناغی ڕۆژی دواییش دێ، کە قۆناغی کۆتاییە.

وشـەی: ﴿سَنَفۡرُغُ لَكُمۡ﴾، وەک گوتمـان بـە (**يَفْـرُغ**)ش هاتـوە، (**سَـيَفْرُغُ لَكُـمْ**) واتـە: (**سَيَفْرُغُ لَكُمْ الله**)، خوا بسم الله الرحمن الرحيم خۆیتان بۆ یەکلایی دەکاتەوە، وشەی (**أَيُّه**) بە سێ جـۆر خوێندراوەتـەوە:

**أ-** (**أَيُّهَا**) هایەکە ئەلیفی هەبێ.

**ب-** (**أَيَّهَ**) هایەکە سەر (**فتحة**)ی هەبێ.

**ج-** هەروەها بە (**أَيُّهُ**) هایەکە بۆر (**ضمَّة**)ی هەبێ، بە هەر سێک جۆرەکە خوێنراوەتەوە.

ئـەوەی لێـرەدا خـوا دەیفەرمـوێ، زەمینـە خۆشـکردنە بـۆ ئـەوەی دوایـی دەیفەرمـوێ، کـە باسی ڕۆژی دواییـە، لەوێش خوا بسم الله الرحمن الرحيم بەر لەوەی باسی ڕۆژی دوایـی بـکات، پێشـێ ئاخیـر زەمـان و، دوایـی قیامـەت، بـاسی ئـەوە دەکات: ئـەی کۆمەڵـی مـرۆڤ و جنـد! ئێـوە ئەگـەر بشـتانەوێ ڕابکـەن، ناتوانـن لەبـەر دەسـتی خـواو لـە ژێـر ڕکێفـی خـوا بچنـە دەرێ.

ئایەتـەکانی قوڕئـان هەمیشـە وەک ئاڵقـەکانی زنجیـر پێکـەوە یەکـدی دەبەسـتنەوە، هـەر کامێکیـان هـی دوای خـۆی دەخـوازێ و، هـەر کامێکیـان هـی پێـش خـۆی دەخـوازێ.



www.alibapir.com


## مەسەلەی دووەم:

**هەڕەشەکردنی خوای دادگەر لە جندو مرۆڤ، کە توانای دەرچوون لە سنووری ئاسمان و زەوی و قوتار بوونیان لە لێپرسینەوەو سزای خوا نیە، مەگەر بە دەسەلات، ئەو دەسەلاتەش شک نابەن و، لە کاتی هەوڵی ڕاکردنیاندا بڵێسەی ئاگری ڕووت و مسی قاڵکراوەیان بەسەردا دەبارێنرێ و سەرکەوتوو نابن:**

خوا دەفەرمووێ: ﴿ يَٰمَعۡشَرَ ٱلۡجِنِّ وَٱلۡإِنسِ إِنِ ٱسۡتَطَعۡتُمۡ أَن تَنفُذُواْ مِنۡ أَقۡطَارِ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ فَٱنفُذُواْۚ لَا تَنفُذُونَ إِلَّا بِسُلۡطَٰنٖ ﴿٣٣﴾ فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ ﴿٣٤﴾ يُرۡسَلُ عَلَيۡكُمَا شُوَاظٞ مِّن نَّارٖ وَنُحَاسٞ فَلَا تَنتَصِرَانِ ﴿٣٥﴾ فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ ﴿٣٦﴾ ﴾.

## شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە هەشت بڕگەدا:

١)- ﴿ يَٰمَعۡشَرَ ٱلۡجِنِّ وَٱلۡإِنسِ ﴾، ئەی کۆمەڵی جندو مرۆڤ! **(والمَعْشَرُ: اسْمٌ لِلْجَمْعِ الكَثِيرِ الَّذِي يُعَدُّ عَشَرَةً عَشَرَةً دُونَ آحادٍ)**، (مَعْشَرُ) ناوە بۆ کۆمەڵێک کە دە دە دەژمێردرێن، نەک یەک یەک، لێرە خوا ﷽ باسی جندی پێشخستوە: ﴿ يَٰمَعۡشَرَ ٱلۡجِنِّ وَٱلۡإِنسِ ﴾، لەبەر ئەوەی جند توانای ڕاکردن و دەرچوونیان زیاترەو، خێراترن لە جموجۆڵ دا، بەڵام ئێستا مرۆڤ بە هۆی تەکنۆلۆژیاوە ڕەنگە پێش جند کەوتبێتەوە، بەتایبەت هەندێکیان، بەڵام واپێدەچێ هەندێک لە جۆرەکانی جند کە دەتوانن بەرز ببنەوەو گوێ لە قسەی فریشتان بگرن - کاتی خۆی توانیویانە - واپێدەچێ مرۆڤەکان نەتوانن بگەنە ئاستی ئەو جۆرانەی جند، بەڵام گرنگ ئەوەیە بە گشتیی جند جووڵەیان خێراترەو، لە ڕاکردندا ئازاترن، بۆیە خوا ئەوانی پێشخستوە.

کە دەفەرمووێ: ﴿ يَٰمَعۡشَرَ ٱلۡجِنِّ وَٱلۡإِنسِ ﴾، ئەی کۆمەڵی زۆری جندو مرۆڤ! واپێدەچێ ئەوەی لێرەدا دواندنەکەی ئاڕاستە کراوە، ئەوانە بن کە خەتابارو تاوانبارن لە جندو مرۆڤ، چونکە بڕواداران، نەک هەر نایانەوێ لە ژێر ڕکێفی خوا دەربچن و ڕابکەن، بەڵکو زۆریش حەز بە دیداری خوای پەروەردگاریان

www.alibapir.com


دەكـەن، وەک لـە فەرمـوودەی پێغەمبـەردا هاتـوە ﷺ: {مَـنْ أَحَـبَّ لِقَـاءَ اللَّـهِ أَحَـبَّ اللَّـهُ لِقَـاءَهُ، وَمَـنْ كَـرِهَ لِقَـاءَ اللَّـهِ، كَـرِهَ اللَّـهُ لِقَـاءَهُ} (أخرجـه مسـلم: ٢٦٨٤) واتـە: هەر كەسـێک حـەز بـە دیـداری خـوا بـكات، خـوا حـەز بـە دیـداری دەكات و، هــەر كەسـێک دیداری خـوای ڕق لـێ بـێ، حـەز لـە دیـداری خـوا نـەكات، خـواش حـەز بـە چـارەی نـاكات.

٢)- ﴿ إِنِ ٱسۡتَطَعۡتُمۡ أَن تَنفُذُواْ مِنۡ أَقۡطَارِ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ ﴾، ئەگەر توانیتان دەربچن لە گۆشەو كەنارەكان و لایەكانی ئاسمانەكان و زەوی.

٣)- ﴿ فَٱنفُذُواْ ﴾، دەربچن، واتە: ئەگەر توانیتان ڕابكەن، ڕابكەن.

٤)- ﴿ لَا تَنفُذُونَ إِلَّا بِسُلۡطَٰنٖ ﴾ (بەڵام) ناتوانن دەربچن و ڕابكەن، مەگەر بە دەسەڵات حوكمڕانیی (كە بێگومان ئەوەشتان نیە).

(النُّفُـوذُ والنَّفـاذُ: جَـوازُ شَيْءٍ عَـنْ شَيْءٍ وخُرُوجُـهُ مِنـهُ)، (ونُفُـوذ ونَفـاذ) بریتیـە لـە دەرچـوونی شـتێک لـە شـتێک كـە پێیـدا تێپـەڕێ و لێـی دەربچـێ، (أَقْطَار)یـش كـۆی (قُطْـر)ە، (قُطْـر: الجَانِـب والنَّاحِيَـةُ الواسِـعَةُ مِـنَ المَـكَانِ الأوْسَـعِ)، یـانی: لا تەنیشـت و گۆشـەو كەنارێكـی فـراوان لـە شـوێنێكی فراوانـتر.

بێگومـان كـە دەفەرمـوێ: ﴿ فَٱنفُذُواْ ﴾، دەربچـن، ئـەم دواندنـە لـە دنیـادا پێیـان دەگوتـرێ و ئاڕاسـتەیان دەكـرێ، هەندێكیـش گوتوویانـە: ئـەوە لـە ڕۆژی دواییـدا ئاڕاسـتەیان دەكـرێ، بـەڵام مـن پێـم وایـە ڕای یەكـەم ڕاسـتە، چونكـە بـەس خـوا دەزانـێ ڕۆژی دوایـی و، پێكهاتـەی ئـەو ئـەو عالەمـەی مرۆڤـی تێـدا زینـدوو دەكرێتـەوە، سزاو پاداشـتی تێـدا بەسـەردا دەچەسـپێنرێ، چۆنـە؟ خـوا دەفەرمـوێ: ﴿ يَوۡمَ تُبَدَّلُ ٱلۡأَرۡضُ غَيۡرَ ٱلۡأَرۡضِ وَٱلسَّمَٰوَٰتُۖ وَبَرَزُواْ لِلَّهِ ٱلۡوَٰحِدِ ٱلۡقَهَّارِ ٤٨ ﴾ إبراهيم، ئـەو ڕۆژە كـە زەوی جگـە لـەم زەوییـە دەبـێ و، ئاسـمانەكانیش جگـە لـەم ئاسـمانە دەبـن و، هەموویـان بـۆ خـوای تاكـی مـل پـێ كەچكـەر دێنـە گـۆڕێ، وەک لـە تەفسـیری سـوورەتی (إبراهیـم)دا بـە تەفسـیل باسـمانكردوە.

www.alibapir.com



کـە خـوا دەفەرمـوێ: ﴿ يَـٰمَعْشَرَ ٱلْجِنِّ وَٱلْإِنسِ إِنِ ٱسْتَطَعْتُمْ أَن تَنفُذُوا۟ مِنْ أَقْطَارِ ٱلسَّمَـٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ فَٱنفُذُوا۟ ۚ لَا تَنفُذُونَ إِلَّا بِسُلْطَـٰنٍ ﴿٣٣﴾ ﴾الرحمـن، (الطـبري) لـە تەفسـيرو لێکدانـەوەی دا دوو ڕایـان دێنـێ:

**أ)- (إِنِ اسْتَطَعْتُمْ أَنْ تَجُوزُوا أَطْرَافَ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ، فَتُعْجِزُوا رَبَّكُمْ حَتَّى لَا يَقْدِرَ عَلَيْكُمْ، فَجُوزُوا ذَلِكَ، فَإِنَّكُمْ لَا تَجُوزُونَهُ إِلَّا بِسُلْطَانٍ مِنْ رَبِّكُمْ)[1].**

واتـە: ئەگـەر توانیتـان لـە گۆشـەو کەنـارەکانی ئاسـمانەکان و زەوی دەربچـن و پەروەردگارتـان دەستەوسـان بکـەن، کـە دەسـەڵاتی بەسـەرتان دا بشـکێ، بـڕۆن و دەربچـن! بـەڵام ناتوانـن دەربچـن، مەگـەر بـە دەسـەڵاتێک لـە پەروەردگارتانـەوە.

**ب)- (إِنِ اسْتَطَعْتُمْ أَنْ تَعْلَمُوا مَا فِي السَّمَوَاتِ وَالْأَرْضِ، فَاعْلَمُوا وَلَنْ تَعْلَمُوهُ إِلَّا بِسُلْطَانٍ أَيْ بِبَيِّنَةٍ مِنَ اللَّهِ عَزَّ وَجَلَّ).**

واتـە: ئەگـەر توانیتـان بزانـن چ لـە ئاسـمانەکان و زەویـدا هەیـە، بیزانـن، بـەڵام ناتوانـن بیزانـن مەگـەر بـە بەڵگەیـەک لـە خـواوە.

بـەڵام بەدڵنیایـی مانـای یەکەمیـان ڕاستەو، لێرەدا بـەس ئـەو مەبەسـتە، چونکـە هـەم ئایەتەکـەی پێشـتر: ﴿ سَنَفْرُغُ لَكُمْ أَيُّهَ ٱلثَّقَلَانِ ﴾ پەیوەسـت دەبێتـەوە بـەوەوە: دوای ئـەوەی خـوا خـۆی یەکلایـی دەکاتـەوەو دەسـتخاڵی دەبـێ، بـە تەعبیـری ئێمـە بـە جیددیـی سـەرگەرمی لێپرسـینەوەو سزاو پاداشـتی مـرۆڤ و جنـد دەبـێ، ئەوانیـش ئەگـەر بۆیـان بکـرێ، ڕادەکـەن و هەڵدێـن، بۆیـە خـوا دەفەرمـوێ: ئەگـەر توانیتـان ڕابکـەن لـە گۆشـەو کەنـارەکانی ئاسـمانەکان و زەوی، ڕابکـەن و دەربچـن، بـەڵام ناتوانـن مەگـەر بـە دەسـەڵات و، ئـەو دەسەڵاتەشـتان نیـە، دوایـی دەفەرمـوێ:

٥)- ﴿ فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ ﴾، ئەی مرۆڤ و جند! بە کام لە چاکەکانی پەروەردگارتان بێبڕوا دەبن، نکووڵییان لێ دەکەن؟.

---

(١) جامع البيان: ج: ٢٧، ص: ١٤٣

www.alibapir.com


٦)- ﴿ يُرۡسَلُ عَلَيۡكُمَا شُوَاظٞ مِّن نَّارٖ وَنُحَاسٞ ﴾، بڵێسە لە ئاگر و مسی قاڵکراوەاتان بەسەردا دەنێردرێ.

٧)- ﴿ فَلَا تَنتَصِرَانِ ﴾، ئنجا ئێوە سەرکەوتوو نابن (لە دەربازبوون دا) یاخود: هیچ یارمەتییدەرێکتان دەست ناکەوێ، (**شُوَاظٌ**) وەک چۆن بە بۆر (**ضمَّة**) خوێندراوەتەوە، بە (**شِواظٍ**)یش خوێندراوەتەوە، (**نُحَاس**)یش خوێندراوەتەوە: (**مِنْ نَارٍ وَنُحَاسٍ**)، هەروەها خوێنراوەتەوەش: (**ونُحَاسٌ**)، (**نُحَاس**)یش:

أ- بە دوو کەڵێک کە بڵێسەی لەگەڵدا نیە.

ب- بە مسی قاڵکراوەش، دەگوترێ، واتە: (**الصُّفْرُ المُذَاب**) مسی توێندراوەو قاڵکراوە.

ئنجا ئەگەر بخوێنرێتەوە: (**يُرْسَلُ عَلَيْكُمَا شُوَاظٌ مِنْ نارٍ وَنُحَاسٍ**) واتە: بڵێسە لە ئاگرو لە مسی قاڵکراوەتان بۆ دەنێردرێ، بەڵام ئەگەر بخوێنرێتەوە: (**يُرْسَلُ عَلَيْكُمَا شُواظٌ مِنْ نارٍ وَنُحَاسٌ**)، یانی: بڵێسەی لە ئاگر و، مسی قاڵکراوەتان بەسەردا دەنێردرێ، نەک مسەکەش بەشێک بێ، لە بڵێسەکە، ﴿ فَلَا تَنتَصِرَانِ ﴾، (**أي لَا تَجِدَانِ مَخْلَصاً**)، واتە: شوێنی دەربازبوونتان نابێ، یاخود: (**لَا تَجِدَانِ نَاصِراً**) واتە: هیچکەس نابێ هاوکارییتان بکات.

٨)- ﴿ فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ ﴾، ئنجا ئەی کۆمەڵی جندو مرۆڤ! نکووڵیی لە کام لە چاکەکانی پەروەردگارتان دەکەن؟

شایانی باسە: هەندێک لە زانایان ئەم ئایەتانەیان وا لێکداوەتەوە کە مەبەست پێی ئەوەیە مرۆڤ دەتوانێ بچێتە سەر مانگ و سەر مەرریخ و خڕۆکەکانی دیکە، بەڵام پێم وایە ئەم ئایەتە هیچ پەیوەست نیە بەوەوە، بەڵێ ئایەتی دیکەمان هەیە لەو بارەوە کە خوا دەفەرموێ: ﴿ وَسَخَّرَ لَكُم مَّا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِي ٱلۡأَرۡضِ جَمِيعٗا مِّنۡهُۚ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَأٓيَٰتٖ لِّقَوۡمٖ يَتَفَكَّرُونَ ١٣ ﴾ **الجاثية**، واتە: هەرچی لە ئاسمانەکان و زەویدا هەیە، بۆ ئێوەی دەستەمۆ کردوە، لەلایەن خۆیەوە، لەوەدا نیشانە

هەن بۆ کۆمەڵێک بیربکەنەوە. ئەو ئایەتانە باشترە بە بەڵگە بهێنرێنەوە بۆ ئەوە کە مرۆڤ خوا ڕێی پێداوە، بچێتە سەر مانگ و هەر شوێنێکی دیکەش، بەڵام ئەمەیان پەیوەست نیە بەوەوەو لەگەڵ ئەو مەبەستەدا ناگونجێ، بەڵکو پێچەوانەی ئەوەوەیە، چونکە خوا دەفەرموێ: ﴿فَلَا تَنتَصِرَانِ﴾، ئێوە سەرکەوتوو نابن، چونکە بڵێسەتان بەسەردا دەبارێنرێ و، مسی قاڵکراوەتان بۆ دەنێردرێ، کە ئەوەش ڕاستییەکی زانستییەو، ئێستا هەر کەسێ بیەوێ زەوی دەربچێ و بەرەو بەرگە هەوا بەرز بێتەوە، ڕووبەڕووی بڵێسە ئاگرو پارچە نەیزەکەکان دەبێتەوە، بۆیە جگە لە دووریی ماوەکە، ئەو پەرچ و کۆسپەش هەر هەیە، لە بەردەم مرۆڤدا، بەڵام خوای پەروەردگار مەبەستی پێ ئەوەیە کە ئەی مرۆڤ و جند! ئێوە ناتوانن دەربچن لە دەسەڵاتی خواو، لە گۆشەو کەنارەکانی ئاسمان و زەوییەوە بڕۆنەدەرێ، کە بە مەزەندەی زانایان زیاتر لە دوو تریلیۆن (٢,٠٠٠,٠٠٠,٠٠٠,٠٠٠) کەهکەشان لە گەردوون دا هەن، ئەو گەردوونەی تاکو ئێستا بۆ مرۆڤ بیندراوەو، هەر کام لەو کەهکەشانانەش نزیکەی تریلیۆنێک ئەستێرەی تێدا هەن، وەک پێشتر لە چەند جێیەکی دیکەدا باسی فراوانیی ئاسمان و گەردوون و، بەرزکرانەوەی ئاسمانمان کرد.

Stay in touch on social media
AliBapir/عەلی باپیر
archive.org/details/@alibapir
www.alibapir.net
عربي - کوردی - English

www.alibapir.com


## مەسەلەی سێیەم:

**باسی هاتنی ئاخیر زەمان بە لەتبوونی ئاسمان و سوور هەڵگەڕانی وەک ڕۆنی داغ و، پرسیار لێ نەکردنی جندو مرۆڤ، لە بارەی گوناهەکانیانەوەو، ناسرانی تاوانباران بە نیشانەیان و، گرتنی تووکی پێشەسەرو پێیەکانیان و، فڕێدرانە نێو دۆزەخیان و، هاتن و چوون و سووڕانیان لە نێوان ئاگری دۆزەخ و ئاوی کوڵاوو داغدا:**

خوا دەفەرموێ: ﴿ فَإِذَا ٱنشَقَّتِ ٱلسَّمَآءُ فَكَانَتۡ وَرۡدَةٗ كَٱلدِّهَانِ ٣٧ فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ ٣٨ فَيَوۡمَئِذٖ لَّا يُسۡـَٔلُ عَن ذَنۢبِهِۦٓ إِنسٞ وَلَا جَآنّٞ ٣٩ فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ ٤٠ يُعۡرَفُ ٱلۡمُجۡرِمُونَ بِسِيمَٰهُمۡ فَيُؤۡخَذُ بِٱلنَّوَٰصِي وَٱلۡأَقۡدَامِ ٤١ فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ ٤٢ هَٰذِهِۦ جَهَنَّمُ ٱلَّتِي يُكَذِّبُ بِهَا ٱلۡمُجۡرِمُونَ ٤٣ يَطُوفُونَ بَيۡنَهَا وَبَيۡنَ حَمِيمٍ ءَانٖ ٤٤ فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ ٤٥ ﴾.

## شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە یازدە بڕگەدا:

**١)-** ﴿ فَإِذَا ٱنشَقَّتِ ٱلسَّمَآءُ ﴾ ئنجا هەرکات ئاسمان لەتبوو، وەک زۆرجار گوتوومانە، لێرەدا پیتی **(ف)** بۆ **(تفریح)**ە واتە: بینا لەسەر ئەو شتانەی باسکران، هەر کاتێک ئاسمان لەت بوو، **(إِنْشَقَّت: إِنْصَدَعَت)** واتە: لەتبوو، شەق و پەق بوو، وشەی **(سَمَاء)** وەک زۆرجار باسمان کردوە کە لە قورئاندا دێ، واتە: هەموو دروستکراوی خوا بسم الله الرحمن الرحيم لە خوار عەرش و، درەختی کۆتایی **(سدرة المنتهى)**یەوە، واتە: هەموو ئەوەی پەیوەندیی بە ژیانی مرۆڤەوە هەیە، کە جاری وایە خوا بسم الله الرحمن الرحيم بە **(سَمَاوَات)** دەیهێنێ و، جاری وایە بە **(سَّمَاء)**و، جاری واشە بە **(سَبْعَ سَمَاوَات)**و، هەمووی هەر یەک شتەو مەبەست پێی کۆی دروستکراوەکانی خوایە، ئەوەی ئێمە ئێستا پێی دەڵێین: گەردوون **(كون)** بە عەرەبیی و (univers) بە ئینگلیزیی، ئەو ئەندازەیەی دەکەوێتە بەرچاوی دووربین و تەلسکۆبەکانی مرۆڤ، کە وەک پێشتر گوتوومانە: بە پێی ئەوە کە خوا بسم الله الرحمن الرحيم لە چەند شوێنێک لە قورئاندا دەفەرموێ: ئاسمانی نیزیکتر لە ئێوەمان بە چرایان

www.alibapir.com


ڕازاندۆتەوە: (**وزينا السماء الدنيا بمصابيح**) مەبەستیش لە چرایان ئەستێرەکانن، کەواتە: هەرچی ئەستێرەیەو هەرچی کەهکەشانە کە لە ئەستێرەکان پێک دێن، هەرچی گەلە کەهکەشانە، هەمووی دەبێ لە سنووری ئاسمانی یەکەمدا بن، هەرچی دەکەوێتە بەرچاوی دووربینەکان، هەمووی ئەو ئەندازەیە کە مرۆڤ توانیویەتی لە ئاسمانی یەکەم ببینێ و، لەسەرووی ئەوەشەوە کە بەس خوا دەزانێ چەندی دیکەش هەیەو، لە کوێ سنووری ئاسمانی یەکەم کۆتایی پێ دێ، ئنجا لەسەرووی ئەویشەوە شەش ئاسمانی دیکە هەن، ئا ئەوە بەپێی ئایەتەکانی قورئان، هەمووی وشەی (**سماء**) دەیگرێتەوە، وەک لە تەفسیری سوورەتی (**فصلت**)دا باسێکی گەردووغان کردو، لە چەند شوێنی دیکەش دا لەو بارەوە قسەمان کردوە.

کەواتـە: ﴿ فَإِذَا ٱنشَقَّتِ ٱلسَّمَآءُ ﴾ یـانی: کاتێـک ئـەو دروسـتکراوەی خـوا خولْقاندوویـەتی، کـە هەمـووشی پەیوەسـتە بـە ژیـانی مرۆڤـەوە: حـەوت ئاسـمانەکان و پێکهاتەکانیـان و، ئـەوەی دەکەوێتـە نێوانیـان و، زەویـش کـە پێکهاتەیەکـی بچووکـی گەردوونـە، کاتێـک ئـەو ئاسـمانە لەتبـوو شـەق و پـەق بـوو، (**جَـوَابُ إِذَا مَحْـذُوفٌ، أَي: يَكُـونُ مِـنَ الأَهْـوَالِ وَالأَحْـوَالِ مَـا لَا يُحِيْـطُ بِـه دَائِـرَةَ المَقَـال**)، واتـە: کاتێـک کـە ئاسـمان لـەت و پـەت دەبـێ، حـاڵ و باڵـی سـامناکی وادێنـە پێشـێ، کـە بازنـەی قسـە ناتوانـێ دەورەیـان بـدات، شـتی وا دەقەومـێ نایەتـە وەسـفکردن.

٢)- ﴿ فَكَانَتْ وَرْدَةً كَٱلدِّهَانِ ﴾، ئاسمان (کە لەت دەبێ) سوور هەڵدەگەرێ، وەک تڵتی زەیت، یان وەک چەرمی سوور، چونکە وشەی (**وَرْدَةً**) لە: (**فَكَانَتْ وَرْدَةً**) دا: (**تَشْبِيهٌ بَلِيغٌ، أَيْ كانَتْ كَوَرْدَةٍ، والوَرْدَةُ: واحِدَةُ الوَرْدِ، وهو زَهْرٌ أَحْمَرُ مِن شَجَرَةٍ دَقِيقَةٍ ذاتِ أَغْصانٍ شائِكَةٍ، تَظْهَرُ فِي فَصْلِ الرَّبِيعِ**)، ئەمە جۆرێکە لە جۆرەکانی وێچواندن پێی دەگوترێ: (**تَشْبِيهٌ بَلِيغٌ**)، وێچواندنێک کە گەیشتبێتە ئەوپەڕی، واتە: ئەم ئاسمانە، وەک گوڵێکی لێ دێ، (**وَرْدَة**)ش کۆیەکەی (**وَرْد**)ە، کە جۆرە گوڵێکی خاوەن گەڵای وردەو لق و پۆپەکانی دڕکاویین، زیاتر لە کەشی بەهاردا، پەیدادەبێ {ئێمە گوڵەباغی پێدەڵێین} واتە: ئەو ئاسمانە سوور هەڵدەگەڕێ وەک ڕەنگی گوڵەباغ، (**كَالدِّهَان**) لە

www.alibapir.com


گەرمییدا وەک تلّتی زەیت، یان ڕۆنی داغکراوی لێ دێ، کە ئێمە هەر لەوە حاڵیی دەبین، ئەگەرنا بەدڵنیایی لەوەش گەرمترە، یاخود وەک چەرمی سووری لێ دێ، بەو شێوەیە ئەو گۆڕانکارییە بەسەر ئەم ئاسمانەدا دێ، چونکە (**دِهَان**):

**أ-** یان کۆی (**دُهْن**)ە، کە بریتیە لە تلّتی ڕۆنی زەیت.

**ب-** یاخود: (**دِهَان: الأدِيْمُ الأحْمَر**)، پێستی سوور، چەرمی سوور، کۆی (**دِهَان**)یش بریتیە لە (**أدْهُن**) و (**دُهن**) واتە: چەرمەکان.

**٣)-** ﴿ فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ ﴾، ئنجا ئایا ئەی کۆمەڵی جندو مرۆڤ! ئێوە نکوولّیی لە کام لە چاکەکانی پەروەردگارتان دەکەن؟ کە وەک گوتمان: کۆتایی پێهاتنی ئەم دنیایەو، هاتنە پێشی عالەمێکی دیکەو قۆناغێکی دیکە، بۆ ئەوەی دادگەریی خوا بچەسپێ لە ژیانی مرۆڤ و جندداو، خراپەکاران بە سزای خۆیان بگەن و، چاکەکاران بە پاداشتی خۆیان بگەن، ئا ئەوەش هەر لە چاکەکانی خوایە، بۆیە خوا دەپرسێ: ئایا نکوولّیی لە کام لە چاکەکانی خوای پەروەردگارتان دەکەن؟

**٤)-** ﴿ فَيَوْمَئِذٍ لَّا يُسْـَٔلُ عَن ذَنۢبِهِۦٓ إِنسٌ وَلَا جَآنٌّ ﴾، لەو ڕۆژەدا، نە مرۆڤ، نە جند لە بارەی گوناهیەوە لێی ناپرسرێ، (**إنْسٌ: إسْمُ جَمْعِ الإنْسَان وَالإنْسِيُّ وَاحِدٌ مِنْهُم، وَالجَانّ: أبُو الجِنّ أو الجِنُّ كُلُّهُمْ**)، (**إنْسٌ**) ناوی کۆی مرۆڤەو (**إنْسِيّ**) تاکی مرۆڤە، (**جَانّ**)یش یان بابی جندانە، یاخود کۆی: جندانە، ئنجا ئایا بۆچی لە گوناهیان ناپرسرێ؟ لەبەر ئەوەی هەموو شتێک تۆمارکراوەو زانراوە، واتە: پرسیارکردنی پەیداکردنی زانیارییان لێ ناپرسرێ و، ئەو جۆرە پرسیارەیان لێ ناکرێ کە بزانرێ چییان کردوەو چییان نەکردوە؟ پێویست بەوە ناکات و هەموو شتێک تۆمار کراوە، بە هەموو شێوەکانی تۆمارکردن، (**المَقْصُود بِالسُّؤَال: هُوَ النَّحْوُ المَألُوفُ فَهُوَ النَّوْعُ المَنْفِيُّ مِنَ السُّؤَال، وَلَكِن قَوْلُهُ تَعَالَى:** ﴿ وَقِفُوهُمْ ۖ إِنَّهُم مَّسْـُٔولُونَ ﴿٢٤﴾ ﴾ **الصافات،** ﴿ فَوَرَبِّكَ لَنَسْـَٔلَنَّهُمْ أَجْمَعِينَ ﴿٩٢﴾ عَمَّا كَانُوا۟ يَعْمَلُونَ ﴿٩٣﴾ ﴾ **الحجر، فَهُوَ سُؤَالُ تَوْبِيْخٍ وَزَجْرٍ، أوِ المُرَادُ إنَّ القِيَامَة فِيْهَا مَوَاقِف مُتَعَدِّدة، فَيُسْألُوْن فِي بَعْضِهَا وَيُخْتَم عَلَى الأفْوَاه فِي بَعْضِهَا**)، کە دەفەرموێ: لێیان

www.alibapir.com


ناپرسرێ مەبەست پێی پرسیاری ئاساییە، ئەو پرسیارە لابراوە، پرسیاری ئاسایی کە بگوترێ: ئەوەت کردوە، یان نەتکردوە؟ بەڵام خوای بەرز کە لە سوورەتی **(الصافات)** دا دەفەرموێ: ﴿ وَقِفُوهُمْ إِنَّهُم مَّسْئُولُونَ ﴿٢٤﴾ ﴾ **الصافات**، ڕایانبگرن بێگومان لێپرسراون، هەروەها لە سوورەتی **(الحجر)**دا خوا دەفەرموێ: ﴿ فَوَرَبِّكَ لَنَسْأَلَنَّهُمْ أَجْمَعِينَ ﴿٩٢﴾ عَمَّا كَانُوا يَعْمَلُونَ ﴿٩٣﴾ ﴾ **الحجر**، واتە: سوێند بە پەروەردگارت لە تێکڕایان دەپرسینەوە، لە بارەی ئەوەوە کە کردوویانە، ئەو پرسیارکردنانەی لە **(الصافات والحجر)**دا هاتوون، مەبەست پێیان پرسیارکردنی سەرزەنشتکەرانەو سەرکۆنە کەرانەیە، {ئایا ئەوەت نەکرد! ئەوەت نەکرد! ئەوەت نەکرد!} یاخود مەبەست ئەوەیە کە لە قیامەتدا، قۆناغی جۆراو جۆر دێنە پێش و، لە هەندێک قۆناغان دا لێیان ناپرسرێ و لە هەندێک قۆناغان دالێیان دەپرسرێ و، لە هەندێ قۆناغیش دا، وەک خوا بسم الله الرحمن الرحيم دەفەرموێ: مۆر بەسەر زمانیانەوە دەنرێ و قسەیان بۆ ناکرێ و، فەرمان دەکرێ بە ئەندامەکانیان قسە بکەن، وەک لە تەفسیری سوورەتی **(فصلت)**دا باسمان کرد، لە سوورەتی **(النور)**دا هاتوە: ﴿ يَوْمَ تَشْهَدُ عَلَيْهِمْ أَلْسِنَتُهُمْ وَأَيْدِيهِمْ وَأَرْجُلُهُم بِمَا كَانُوا يَعْمَلُونَ ﴿٢٤﴾ ﴾ **النور**، هەروەها لە سوورەتی **(فصلت)**دا کە دەفەرموێ: ﴿ حَتَّىٰ إِذَا مَا جَاءُوهَا شَهِدَ عَلَيْهِمْ سَمْعُهُمْ وَأَبْصَارُهُمْ وَجُلُودُهُم بِمَا كَانُوا يَعْمَلُونَ ﴿٢٠﴾ ﴾ **فصلت**، کەواتە: قیامەت قۆناغ قۆناغە، بۆیە کەسێک بە سادەیی و سەرکێڵیی تەماشای قورئان بکات، چ لێرەو، چ لە هەر شوێنێکی دیکەدا، دەڵێ: بۆچی لە جێیەک وا دەفەرموێ و، لە جێیەک ئاوا دەفەرموێ؟ بەڵام ئەوە جیاوازیی دیمەنەکان و جیاوازیی قۆناغەکانە، کە ئەگەر بە سەرکێڵیی تەماشای بکەی، دەڵێی: لێرە وا دەفەرموێ و لێرەش وا دەفەرموێ و تێکدەگیرێن! بەڵام ئەوە تێکگیران نیەو تەواوکردنی کۆی هەموو دیمەنەکەیە، لەو ڕووەوە تەماشای بکەی ئا وایەو، لەلایەکی دیکەوە تەماشای بکەی، ئاوا دێتە بەرچاوو، لەولاوەش تەماشای بکەی، بە جۆرێکی دیکە، دێتە بەرچاوت.

٥)- ﴿ فَبِأَيِّ آلَاءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ ﴾، ئنجا ئەی کۆمەڵی جندو مرۆڤ! نکووڵیی لە کام لە چاکەکانی پەروەردگارتان دەکەن؟

www.alibapir.com


٦)- ﴿ يُعْرَفُ ٱلْمُجْرِمُونَ بِسِيمَٰهُمْ ﴾، تاوانباران بە نیشانەی خۆیان دەناسرێنەوە، (السِّيمَا: العَلَامَةُ) نیشانە، زانایان هەندێکیان باسیان کردوە کە چاویان شین هەڵدەگەڕێ و ڕوویان ڕەش دادەگەڕێ! بەڵام خوای پەروەردگار لێرەدا باسی نەکردوە، ئەوەندە هەیە دەفەرموێ: تاوانباران بە نیشانەو سیمای خۆیان دەناسرێنەوە، هەر کەسە بە پێی ئەو نیشانەیەو ئەوەی خوا بسم الله الرحمن الرحيم لە ڕۆژی دواییدا، ئەوانی تووش دەکات، دەناسرێتەوە، ڕەنگە زانایان لەوە وەریان گرتبێ کە دەفەرموێ: ﴿ يَوْمَ يُنفَخُ فِى ٱلصُّورِ ۚ وَنَحْشُرُ ٱلْمُجْرِمِينَ يَوْمَئِذٍ زُرْقًا ﴿١٠٢﴾ ﴾طه، ئەو ڕۆژەی فوو بە کەڕەنادا دەکرێ و تاوانباران کۆدەکەینەوە، بە شینهەڵگەڕاویی، ئنجا ئایا چاویان شینهەڵدەگەڕێ؟ یان ڕوویان شین و ڕەش و مۆر دەبێتەوە؟ لەوانەیە، لەوە وەریان گرتبێ، ئینسان کە زۆر خەفەت دەخوات و ناڕەحەت دەبێ و دەترسێ، ڕەنگی تاڵخ و ڕەش دەبێ، دەگوترێ: شین و مۆر هەڵگەڕاوە، وا پێدەچێ مەبەست پێی ئەوە بێ.

٧)- ﴿ فَيُؤْخَذُ بِٱلنَّوَٰصِى وَٱلْأَقْدَامِ ﴾، ئنجا تووکی پێشەسەروپێیەکان دەگیرێن، (نَوَاصِي) کۆی (نَاصِيَة)یە، واتە: تووکی پێشەسەر، (أقْدَام)یش کۆی (قَدَم)ە، واتە: پێ، واتە: تووکی پێشەسەریان و پێیەکانیان دەگیرێن، کە کەسێک تووکی پێشەسەری بگیرێ لەگەڵ پێی دا، مانای وایە وەک گلۆڵە خڕ دەکرێتەوە! یانی: کەلەپچە دەکرێن و تووکە سەریان و پێیان پێکەوە دەبەسترێن، بۆ ئەوەی هیچ جووڵەیەکیان بۆ نەکرێ، ئنجا بەو شێوەیە فڕێ دەدرێنە دۆزەخەوە، وشەی (النَّواصِي) کە (أل)ی ناساندنی لەسەرە، هەروەها (الأقْدَام)یش هەردووک ناساندنەکان: (عِوَضٌ عَنِ المُضَافِ إلَيْهِ) قەرەبووی پاڵوەلادراون، واتە: (فَيُؤْخَذُ بِالنَّواصِي أي: بِنَواصِيهِمْ، والأقْدَام، أي: وأقْدامِهِمْ)، چونکە لێرەدا ناگونجێ (أل) بۆ تێکرا (جنس) بێ، واتە: تێکڕای تووکی پێشەسەرەکان و تێکڕای پێیەکان، کەواتە: (النَّواصِي والأقْدَام) لە جیاتی بفەرموێ: (بِنَواصِيهِمْ وأقْدامِهِمْ) ئەو (أل)ە لە جێی پاڵوێدراو (المُضافِ إلَيْهِ) بەکارهێنراوە، یانی: تووکی پێشەسەرو پێیەکانیان دەگیرێن.

www.alibapir.com


هەڵبەتــە ئەگــەر بشــگوترێ: (ألْ)کــە بــۆ ناســاندنی (**عهــد**)ە، واتــە: تووکــی پێشەســەرەکانی ئــەوان و پێیــەکانی ئــەوان، ئــەوەش هــەر گونجــاوە.

ئنجـا ئەمـە ئاماژەیەکیشی تێدایـە بە ئیعجازێکی عیلمیی، ئەویش ئەوەیە پێشەسـەری مـرۆڤ، ئـەو بەشـەی مێشـک کە لای پێشەسـەرە، چەقـی بڕیاردانـەو کەسـایەتیی مرۆڤ زیاتـر لەوێـدا شـێردراوەتەوە، لێـرەوە لـەو بەشـەی مێشـک کـە لـە پێشـە سـەردایە، مـرۆڤ بڕیـاردەدات و خێـرو شـەڕو هەڵدەبژێـرێ، ڕاسـت و چـەوت لێـک جیادەکاتەوە، بۆیە خوا ﷽ ئاماژەی بەوێ داوە، هەروەک لە سوورەتی (**العلق**)دا دەفەرموێ: ﴿كَلَّا لَئِن لَّمْ يَنتَهِ لَنَسْفَعًا بِالنَّاصِيَةِ ﴿١٥﴾ نَاصِيَةٍ كَاذِبَةٍ خَاطِئَةٍ ﴿١٦﴾﴾**العلـق**، واتــە: نەخێــر، ئەگــەر وازنەهێنـێ ئێمـە بـە توندیـی تووکـی پێشەسـەری دەگریـن، ئـەو پێشـە سـەرەی کـە درۆزن بـووەو، گوناهبـارو خەتـاکار بـووە، خـوا پشـتیوان بـێ کـە گەیشـتینە تەفسـیری سـوورەتی (**العلـق**)، لـەوێ زیاتـر بـاسی ئـەو ئیعجـازە عیلمییـە دەکەیـن.

٨)- ﴿فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ﴾، ئنجا ئەی کۆمەڵی جندو مرۆڤ! نکووڵیی لە کام لە چاکەکانی پەروەردگارتان دەکەن؟

٩)- ﴿هَٰذِهِۦ جَهَنَّمُ ٱلَّتِي يُكَذِّبُ بِهَا ٱلْمُجْرِمُونَ﴾، ئەمە ئەو دۆزەخەیە کە تاوانباران بە درۆیان دادەنا و پێی بێبڕوابوون، (هَٰذِهِۦ جَهَنَّمُ ٱلَّتِي يُكَذِّبُ بِهَا ٱلْمُجْرِمُونَ) (**مَقُول قَوْلٍ مَحْذُوف**)، گوتراوی قسەیەکی قرتێنراوە، واتە: (**نَقُولُ لَهُم**) یان (**يُقَالُ لَهُم**) پێیان دەڵێین، یان پێیان دەگوترێ: ئەمە ئەو دۆزەخەیە کە تاوانباران پێی بێبڕوابوون، نکووڵییان لێدەکردو، بە درۆیان دادەنا، ئەوەتا تێوەی ڕامێنن!

١٠)- ﴿يَطُوفُونَ بَيْنَهَا وَبَيْنَ حَمِيمٍ ءَانٍ﴾، لە نێوان ئەو دۆزەخەو، لە نێوان ئاوێکی کوڵاودا {کە گەیشتۆتە ئەوپەڕی کوڵاویی و داغیی} دێن و دەچن، (**يَطُوفُون**) (**طَوَاف**)، ئەوەیە بە دەوری شتێکدا بێی و بچی، بەڵام لە شتێکیشەوە بۆ شتێکی دیکە بچی، هەر پێی دەگوترێ: (**طَوَاف**)، هەر بۆیە جووڵەی نێوان سەفاو مەڕوە، جگە لەوەی بە ڕۆیشتن (**سعي**) ناوبراوە، بە تەوافیش ناوبراوە.

www.alibapir.com


لە نێوانیانـدا دێـن و دەچـن، مەبەسـت ئەوەیـە کـە لـە نێـوان ئاگـری بڵێسـەداری دۆزەخ و، ئـاوی کـوڵاو داغ دا، دێـن و دەچـن، جارێـک لـەوێ دەسـووتێنرێن و جارێکیـش دەبرێـن بـۆ ئـەوێ، یـان: خۆیـان دوای ئـەوەی دەسـووتێنرێن، دەچـن خۆیـان فێنـک بکەنـەوەو تـۆزێ ئـاو بخۆنـەوە، بـەڵام ئاوەکـە کـوڵاوەو داغـە، کـە هـەم دەشـیخۆنەوەو، هـەم بەسەریشـیاندا دەکـرێ، وەک خـوا لـە سـوورەتی **(الحـج)** دا دەفەرمـوێ: ﴿ يُصَبُّ مِن فَوْقِ رُءُوسِهِمُ ٱلْحَمِيمُ ﴿١٩﴾ يُصْهَرُ بِهِۦ مَا فِى بُطُونِهِمْ وَٱلْجُلُودُ ﴿٢٠﴾ ﴾**الحـج**، واتـە: بەسـەر تەپڵـی سـەریاندا دەکـرێ (ئـاوی کـوڵاوو داغ)، بەهۆیـەوە هەرچـی لـە نێـو هەناویانـدا هەیـە، دەتوێتـەوە پێستەکەشـیان دادەماڵـرێ و قاڵدەبێتـەوە، ﴿ وَلَهُم مَّقَٰمِعُ مِنْ حَدِيدٍ ﴿٢١﴾ ﴾**الحـج**، قەمچییـە ئاسنەکانیشـیان بـۆ هـەن، کـە ئەمـە هـەر باسـکردنەکەی زۆر سـامناکەو لـە خەیـاڵ و ئەندێشـەی مـرۆڤ دا، زۆر بە زەحمەت جێی دەبێتەوە، بەڵام هەرچی خوا ﷻ بیفەرموێ: سەدا سەد وایە، ئەویـش بـەس ئـەو ئەندازەیـە کـە ئێمـە لێـی حاڵیـی دەبیـن، چ بـە نسـبەت ئـازارو مەینەتییـەکانی دۆزەخ و، چ بـە نسـبەت خۆشـیی و نیعمەتـەکانی بەهەشـتەوە، بـەس ئـەو ئەندازەیـەی ئێمـە لێـی حاڵیـی دەبیـن و، لـە قاڵبـی ئـەو وشـەو تەعبیرانـەدا، کـە لـە ئاسـتی فیکـری بەشـەردان، جێیـان دەبێتـەوە، ئەگەرنـا بەدڵنیاییـی بەهەشـتیش زۆر زۆر لەوە خۆشترە، دۆزەخیش زۆر زۆر لەوە ناخۆشترە، کە خوا ﷻ باسی دەکات و، دەیـەوێ ئێمـە حاڵیـی بـکات و تێبگەیەنـێ، واتـە: ئـەوەی کـە بـە کـردەوە هەیـە لـەوێ، لـەوەی ئێسـتا ئێمـە بمانـەوێ بـەو وشـەو تەعبیرانـە لێـی تـێ بگەیـن، لێـک دوورن، هـەر بۆیـەش گوتـراوە: {لَيْسَ الْخَبَرُ كَالْمُعَايَنَةِ} **(أخرجـه ابـن حبـان: ٦٢١٣، قـال شـعيب الأرنـؤوط: حديـث صحيـح)**، واتـە: هـەواڵ وەک دیـتن و لەگەڵدابـوون نیـە، کـە دەفەرمـوێ: ﴿ يَطُوفُونَ بَيْنَهَا وَبَيْنَ حَمِيمٍ ءَانٍ ﴾، **(الطَّـوافُ: تَـرْدادُ المَـشْيِ والإكْثـارُ مِنـهُ، يُقـالُ طَـافَ بِـهِ، وَطَـافَ عَلَيْـهِ، والحَمِيـمُ: المـاءُ المُغْـلِيُّ الشَّـدِيدُ الحَـرَارَةِ، وآنٍ: اسْـمُ فَاعِـلٍ مِـن أَنَى، إذَا اشْـتَدَّتْ حَرارَتُـهُ)**، **(طَـوَاف)**: بریتیـە لـە دووبـارە کردنـەوەی ڕۆیشـتن و زۆر ڕۆیشـتن، **(طَـافَ بِـهِ وَطَـافَ عَلَيْـه)** دەوری داو، بەسـەریەوە گـەڕا، **(حَمِيْم)**یـش ئـەو ئاوەیـە کـە

www.alibapir.com


زۆر کوڵیوە گەیشتۆتە ئەوپەڕی کوڵان، (ءَان): ناوی بکەر (**إسم فاعل**)ە، (**أنی**) واتە: ئاوێکی گەرمی کوڵاوی داغ کە گەیشتۆتە ئەوپەڕی لە گەرمییدا.

**٤٥)-** ﴿فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ﴾، ئەی جندو مرۆڤ! لە کام لە چاکەکانی پەروەردگارتان نکووڵیی دەکەن؟

سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ، أَشْهَدُ أَنَّ لاَ إِلَهَ إِلاَّ أَنْتَ، أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ.

لە ڕێی کۆمەڵایەتییەکان لەگەڵتانین
Stay in touch on social media
نحن معكم عبر مواقع التواصل الاجتماعي
ڕاگەیاندنی مەکتەبی مامۆستا عەلی باپیر
AliBapir/عەلی باپیر
archive.org/details/@alibapir
AliBapir/عەلی باپیر
AliBapir
کەناڵی ڕاگەیاندنی مەکتەبی مامۆستا عەلی باپیر
www.alibapir.net
کوردی - عربي - English
ڕاگەیاندنی مەکتەبی مامۆستا عەلی باپیر

www.alibapir.com

## پێناسه ئەم دەرسه

ئـەم دەرسـەمان لـە سـی و سـێ (٣٣) ئایـەتی کۆتایـی سـوورەتی (**الرحمـن**) پێـک دێ، ئایەتـەکانی: (٤٦ - ٧٨)، کـە بـاسی پاداشـتی بـڕوادارانی خـاوەن تـرس و بیمـە بەرانبـەر بـە پەروەردگاریـان، بڕوادارانێـک کـە سـام و هەیبەتیـان هەیـە بەرانبـەر بـە پێگـەی بـەرزو بـێ وێنـەی پەروەردگاریـان، ئنجـا ئـەو پاداشـتەی خـوا داینـاوە بۆ ئەوانـەی سـام و هەیبەتیـان بەرانبـەر بـە پێگـەی بـەرزو بـێ وێنـەی هەیـە، خـوا ﷽ لە دوو جووتە بەهەشت دا باسی دەکات، واتە: چوار باخ، کە خوای کارزان و میهرەبـان هـەر کامیـان (هـەر جووتـە باخـە) بـە شـەش وەسـف پێناسـە دەکات و سـەرجەم دەبنـە دوازدە (١٢) وەسـف:

**جووتـە بەهەشـتی یەکـەم:** لـە حـەوت ئایەتـەکانی: (٤٨ و ٥٠ و ٥٢ و ٥٤ و ٥٥ و ٥٦ و ٥٨)دا، شـەش وەسـفیان دەکات.

**جووتـە بەهەشـتی دووەم:** لـە حـەوت ئایەتـەکانی: (٦٤ و ٦٦ و ٦٨ و ٧٠ و ٧٢ و ٧٤ و ٧٦)دا، یـانی: جووتـە باغـی یەکـەم لـە حـەوت ئایەتانـداو، جووتـە باغـی دووەم لـە حـەوت ئایەتانـدا، یەکـی بـە شـەش سـیفەت وەسـف و پێناسـە کـراون.

﴿ وَلِمَنْ خَافَ مَقَامَ رَبِّهِۦ جَنَّتَانِ ﴿٤٦﴾ فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ ﴿٤٧﴾ ذَوَاتَآ أَفْنَانٍ ﴿٤٨﴾ فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ ﴿٤٩﴾ فِيهِمَا عَيْنَانِ تَجْرِيَانِ ﴿٥٠﴾ فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ ﴿٥١﴾ فِيهِمَا مِن كُلِّ فَٰكِهَةٍ زَوْجَانِ ﴿٥٢﴾ فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ ﴿٥٣﴾ مُتَّكِـِٔينَ عَلَىٰ فُرُشٍۭ بَطَآئِنُهَا مِنْ إِسْتَبْرَقٍ ۚ وَجَنَى ٱلْجَنَّتَيْنِ دَانٍ ﴿٥٤﴾ فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ ﴿٥٥﴾ فِيهِنَّ قَٰصِرَٰتُ ٱلطَّرْفِ لَمْ يَطْمِثْهُنَّ إِنسٌ قَبْلَهُمْ وَلَا جَآنٌّ ﴿٥٦﴾ فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ ﴿٥٧﴾ كَأَنَّهُنَّ ٱلْيَاقُوتُ وَٱلْمَرْجَانُ ﴿٥٨﴾ فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ ﴿٥٩﴾ هَلْ جَزَآءُ ٱلْإِحْسَٰنِ إِلَّا ٱلْإِحْسَٰنُ ﴿٦٠﴾ فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ ﴿٦١﴾ وَمِن دُونِهِمَا جَنَّتَانِ

www.alibapir.com



﴿٦٢﴾ فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ ﴿٦٣﴾ مُدْهَآمَّتَانِ ﴿٦٤﴾ فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ ﴿٦٥﴾ فِيهِمَا عَيْنَانِ نَضَّاخَتَانِ ﴿٦٦﴾ فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ ﴿٦٧﴾ فِيهِمَا فَٰكِهَةٌ وَنَخْلٌ وَرُمَّانٌ ﴿٦٨﴾ فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ ﴿٦٩﴾ فِيهِنَّ خَيْرَٰتٌ حِسَانٌ ﴿٧٠﴾ فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ ﴿٧١﴾ حُورٌ مَّقْصُورَٰتٌ فِى ٱلْخِيَامِ ﴿٧٢﴾ فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ ﴿٧٣﴾ لَمْ يَطْمِثْهُنَّ إِنسٌ قَبْلَهُمْ وَلَا جَآنٌّ ﴿٧٤﴾ فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ ﴿٧٥﴾ مُتَّكِـِٔينَ عَلَىٰ رَفْرَفٍ خُضْرٍ وَعَبْقَرِيٍّ حِسَانٍ ﴿٧٦﴾ فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ ﴿٧٧﴾ تَبَٰرَكَ ٱسْمُ رَبِّكَ ذِى ٱلْجَلَٰلِ وَٱلْإِكْرَامِ ﴿٧٨﴾

## مانای دەقا و دەقی ئایەتەکان

{هەروەها بۆ هەر کەسێکیش لە پایەی بەرزی پەروەردگاری بترسێ، دوو باخ هەن ﴿٤٦﴾ ئنجا ئایا (ئەی مرۆڤ و جند!) نکووڵیی لە کام لە چاکەکانی پەروەردگارتان دەکەن؟ ﴿٤٧﴾ (ئەو دوو باخە) خاوەن لق و پۆپە دڵگیرەکانن ﴿٤٨﴾ ئنجا ئایا (ئەی مرۆڤ و جند!) نکووڵیی لە کام لە چاکەکانی پەروەردگارتان دەکەن؟ ﴿٤٩﴾ (ئەو دوو باخە) دوو سەرچاوەیان تێدان (بە نێویان دا) دەڕۆن ﴿٥٠﴾ ئنجا ئایا (ئەی مرۆڤ و جند!) نکووڵیی لە کام لە چاکەکانی پەروەردگارتان دەکەن؟ ﴿٥١﴾ (ئەو دوو باخە) لە هەر میوەیەک دوو جۆریان تێدان ﴿٥٢﴾ ئنجا ئایا (ئەی مرۆڤ و جند!) نکووڵیی لە کام لە چاکەکانی پەروەردگارتان دەکەن؟ ﴿٥٣﴾ ئەو (بەهەشتیی)انە لەسەر (جێگاو) تەخت و ڕایەخی وا ڕاکشاون، دیوی لای بنەوەیان ئاوریشمەو، میوەی دوو باخەکەش (لێیانەوە) نیزیکە (بە ئاسانیی دەچنرێ) ﴿٥٤﴾ ئنجا ئایا (ئەی مرۆڤ و جند!) نکووڵیی لە کام لە چاکەکانی پەروەردگارتان دەکەن؟ ﴿٥٥﴾ لەو جێگایانەدا (و لەسەر ئەو ڕایەخ و تەختانە)، (ئافرەتانێکی) نیگای خۆ کورت هەڵهێنەر (لەسەر مێردەکانیان) هەن، کە پێش وان نە مرۆڤ و نە جند، کچێنیی لانەبردوون (دەستی لێ نەداون) ﴿٥٦﴾

www.alibapir.com


ئنجا ئایا (ئەی مرۆڤ و جند!) نكووڵیی لە كام لە چاكەكانی پەروەردگارتان دەكەن؟ ﴿٥٧﴾ (ئەو ئافرەتانە لە جوانیی و سپیی و سافیی دا) وەک یاقووت و مرواریین ﴿٥٨﴾ ئنجا ئایا (ئەی مرۆڤ و جند!) نكووڵیی لە كام لە چاكەكانی پەروەردگارتان دەكەن؟ ﴿٥٩﴾ ئایا پاداشتی چاكەكاریی هەر چاكەكاریی نیە؟ ﴿٦٠﴾ ئنجا ئایا (ئەی مرۆڤ و جند!) نكووڵیی لە كام لە چاكەكانی پەروەردگارتان دەكەن؟ ﴿٦١﴾ هەروەها لە خوار وانیشەوە دوو باخی دیكە هەن ﴿٦٢﴾ ئنجا ئایا (ئەی مرۆڤ و جند!) نكووڵیی لە كام لە چاكەكانی پەروەردگارتان دەكەن؟ ﴿٦٣﴾ دوو باخی سەوزی یەكجار تۆخن (مەیلەو ڕەش دەنوێنن) ﴿٦٤﴾ ئنجا ئایا (ئەی مرۆڤ و جند!) نكووڵیی لە كام لە چاكەكانی پەروەردگارتان دەكەن؟ ﴿٦٥﴾ دوو سەرچاوەی فیچقەكەریان تێدان ﴿٦٦﴾ ئنجا ئایا (ئەی مرۆڤ و جند!) نكووڵیی لە كام لە چاكەكانی پەروەردگارتان دەكەن؟ ﴿٦٧﴾ (جۆرەكانی) میوەو دارخورماو هەناریان تێدان ﴿٦٨﴾ ئنجا ئایا (ئەی مرۆڤ و جند!) نكووڵیی لە كام لە چاكەكانی پەروەردگارتان دەكەن؟ ﴿٦٩﴾ لە جێیەكاندا (و لەسەر ئەو تەختانەی نێو دوو باخەكە)، ئافرەتانی زۆر چاک و ئەوپەڕی جوان هەن ﴿٧٠﴾ ئنجا ئایا (ئەی مرۆڤ و جند!) نكووڵیی لە كام لە چاكەكانی پەروەردگارتان دەكەن؟ ﴿٧١﴾ (ئەو ئافرەتانە) چاو گەش و ڕەشن لە نێو خێوەتان دا نیشتەجێن (خزمەت دەكرێن) ﴿٧٢﴾ ئنجا ئایا (ئەی مرۆڤ و جند!) نكووڵیی لە كام لە چاكەكانی پەروەردگارتان دەكەن؟ ﴿٧٣﴾ (ئەو ئافرەتە شۆخ و شەنگانە) لە پێش وان دا نە مرۆڤ و نە جند (دەستیان نەگەیاندوونێ و) كچێنییان لانەبردوون ﴿٧٤﴾ ئنجا ئایا (ئەی مرۆڤ و جند!) نكووڵیی لە كام لە چاكەكانی پەروەردگارتان دەكەن؟ ﴿٧٥﴾ لەسەر ڕایەخێكی سەوزی ناوازەی هەرە جوان پاڵیان داوەتەوە ﴿٧٦﴾ ئنجا ئایا (ئەی مرۆڤ و جند!) نكووڵیی لە كام لە چاكەكانی پەروەردگارتان دەكەن؟ ﴿٧٧﴾ بەرزو بەپێزە ناوی پەروەردگاری خاوەن پایەو شكۆو، چاكەو بەخشش ﴿٧٨﴾}.

www.alibapir.com



## شیکردنەوەی هەندێک لە وشەکان

(مَقَامَ رَبِّهِۦ): (مَقَام: مَصْدرُ قِيَام، أو اسْمُ مَكَانِ القِيَام)، وشەی (مَقَام)، یان چاوگی (قِيَام)ە، یانی: هەڵسان، ڕاوەستان، یاخود ناوی شوێنە بۆ ڕاوەستان و هەڵسان، واتە: یان بە مانای پێگەو پایە دێ، یاخود بە مانای شوێنی وەستان لە بەرانبەر پەروەردگاردا دێ.

(أَفْنَانٍ): (والأفْنانُ: جَمْعُ فَنَنٍ، وَهُوَ الغُصْنُ الغَضُّ الوَرَق)، (فَنَن): بە چڵ و لقی تەڕو گەڵادار دەگوترێ، هەروەها (فَنَن) بە جۆرێک لە شتیش دەگوترێ، هەندێکیش گوتوویانە: جۆری شت بە (فُنُون) کۆدەکرێتەوە، نەک بە (أفْنانُ).

(مُتَّكِـِٔينَ): (الإتِّكَاءُ: افْتِعَالٌ مِنَ الوَكْءِ مَهْمُوزُ اللَّامِ وهو الإعْتِمادُ، فَصارَ الاتِّكاءُ اسْمًا لِاعْتِمادِ الجالِسِ ومِرْفَقِهِ إلى الأرْضِ وجَنْبِهِ إلى الأرْضِ، وهي هَيْئَةٌ بَيْنَ الإضْطِجاعِ عَلَى الجَنْبِ والقُعُودِ)، (مُتَّكِئِيْن) لە (اِتِّكاءُ)ەوە هاتوە، ئەویش ئیفتیعالە لە (و ك ء)ەوە کە بریتیە لە پاڵ وێدان، (اِتِّكاءُ) بە کوردیی دەڵێین: شاندادان و پاڵدانەوە، کە بریتیە لەوەی بابای دانیشتوو، ئانیشکی لەسەر زەوی بێ و تەنیشتیشی لەسەر زەوی بێ، ئەویش شێوەیەکە لە نێوان ڕاکشان و دانیشتن دا، بە کوردیی دەڵێین: شاندادان و پاڵدانەوە.

(فُرُشٍ): (جَمْعُ فِراشٍ كَكِتاب وكُتُبٍ)، (فُرُش) کۆی (فِراش)ە، وەک (كِتَاب) کە کۆیەکەی (كُتُب)ە، (الفِرَاشُ: أَصْلُهُ مَا يُفْرَشُ، أيْ: يُبْسَطُ عَلَى الأرْضِ لِلنَّوْمِ والإضْطِجاعِ) لە ئەسڵدا (فِراش) بەوە دەگوترێ: کە ڕادەخرێ بۆ خەو و بۆ ڕاکشان، (ثُمَّ أُطْلِقَ الفِرَاشُ عَلَى السَّرِيرِ المُرْتَفِعِ عَلَى الأرْضِ بِسُوقٍ)، دوایی بەو چوار پایە، یان بەو تەختە دەگوترێ کە بە چەند پێچەکەیەک بە چەند پایەیەک لەسەر زەوی بەرز دەکرێتەوە.

www.alibapir.com


(بَطَآئِنُهَا ): (**البَطَائِنُ: جَمْعُ بِطَانَةٍ، وهي مُشْتَقَّةٌ مِنَ البَطْنِ ضِدٌّ الظَّهْرِ، وَهُوَ هُنَا مَجَازٌ عَنِ الأَسْفَلِ وَضِد البِطَانَة الظِّهَارَة**)، (**بَطائِنُ**) كۆی (**بِطانَة**)یە ئەمیش لە (**بطن**)ەوە داتاشراوە، واتە: سک کە پێچەوانەی پشتە، ئنجا لێرەدا بە مەجاز بەکارهێنراوە بۆ لای بنەوەو، پێچەوانەی (**بِطانَة**) بریتیە لە (**ظِهَارة**) واتە: لای پشتەوە، بۆ وێنە پۆشاکێک دیوی دەرێی پێی دەگوترێ: (**ظِهَارَة**)، دیوی بنەوە پێی دەگوترێ: (**بِطانَة**)، ئنجا خوا بسم الله الرحمن الرحيم دەفەرموێ: دیوی بنەوەی ئەو ڕایەخ و جێگاو پۆشاکانەی لەسەریان دادەنیشن، بریتیە لە ئاوریشم، ئنجا دەبێ دیوی دەرەوەیان چۆن بێ!.

(وَجَنَى ): (**الجَنَى: مَا يُقْطَفُ مِنَ الثَّمَرِ**)، (**جنى**) ئەوەیە کە دەچنرێ لە میوە.

(دَانٍ ): (**أي: قَرِيب**)، (**دَنَى، يَدْنُوا فَهُوَ دَانٍ**)، واتە: نیزیک بوو، نیزیک دەبێتەوە، نیزیک.

(قَـٰصِرَٰتُ ٱلطَّرْفِ ): نیگای خۆ کورتکەرەوە، (**صِفَةٌ لِمَوْصُوفٍ مَحْذُوفٍ: نِسَاءٌ قَصَرن طَرْفَهُنَّ عَلَى أَزْوَاجِهِن، أو المُرَادِ: نِسَاءٌ فِي نَظَرِهِنَّ مِثْلُ القُصُورِ والغَضِّ خِلْقَةً أو حَيَاءً**)، (**قاصِراتُ الطَّرْفِ**) سیفەتە بۆ وەسفکراوێکی قرتێندراو، واتە: ئافرەتانێک کە نیگای خۆیان لەسەر مێردەکانیان کورت کردۆتەوە، یاخود مەبەست ئەوەیە ئافرەتانێک کە لە چاویاندا جۆرێک لە شکستیی هەیە، لە ڕووی شەرم و شکۆوە، یان هەر خوای کارزان وای خوڵقاندوون، جۆرێک لە نەرمیی لە نیگای چاویاندا هەیە، یاخود: (**قَاصِراتُ الطَّرْفِ**) ئافرەتانێک کە وا دەکەن بینەر تەنیا تەماشای ئەوان بکات، ئەوەندە پێیان سەرسام بێ.

(لَمْ يَطْمِثْهُنَّ ): (**الطَّمْثُ: مَسِيسُ الأُنْثَى البِكْرِ**)، (**طَمْث**): بریتیە لەوەی دەست بگەیەنرێتە مێینەییەکی کچ، (**الطَّمْثُ: دَم الحَيْض**)، (**طَمْث**): بە خوێنی حەیزیش دەگوترێ، هەروەها بە لابردنی کچێنییش دەگوترێ، (**الطَّامِث: الحَائِض**)، (**طَامِث**) ئافرەتێک کە کەوتۆتە حەیزەوە، (**وَطَمْثَ المَرْأَةَ: افْتَضَّهَا**) واتە: چووە لای و

www.alibapir.com



لەگەڵی جووت بوو، کچێنیی لابرد، دەگوترێ: (مَا طَمَثَ هَذِهِ الرَّوْضَةَ أَحَدٌ قَبْلَنَا، وَمَا طَمَثَ النَّاقَةَ جَمَلٌ)، ئەم باخچەیە پێش ئێمە کەس دەستی نەگەیاندۆتێ و، حوشترە مێیەکە، جارێ نێرە لەگەڵی دا جووت نەبووە.

(ٱلْيَاقُوتُ): (حَجَرٌ مِنَ الأَحْجَارِ الكَرِيْمَةِ وَاحِدَتُهُ أو القِطْعَةُ مِنْهُ: يَاقُوتَة وَالجَمْعُ: يَوَاقِيْت)، (يَاقُوت): جۆرێکە لە بەردە بە نرخەکان، تاکەکەی یاخود پارچەیەکی پێی دەگوترێ: (يَاقُوتَة)و بە کۆ پێیان دەگوترێ: (يَوَاقِيْت) یاقووتەکان، لە کوردییشدا هەروا بەکاردەهێنرێ.

(وَٱلْمَرْجَانُ ): (جِنْسُ حَيْوَانَاتٍ بَحْرِيَةٍ ثَوَابِتُ مِن الطَّائِفَةِ المَرْجَانِيَّةِ يُعَدُّ مِنْ الأَحْجَارِ الكَرِيْمَةِ)، (المعجم الوسيط) وای پێناسە دەکات، دەڵێ: مەرجان جۆرێکە لە ژیانداره دەریاییەکان کە لە شوێنی خۆیاندا چەسپاون و، ئەویش لە کۆمەڵی مەرجانییەکانە، ئەویش چەند جۆرێکی هەیەو، لە بەردە بە نرخ و دەگمەنەکان دادەنرێ.

( مُدْهَآمَّتَانِ): (أي سَوْدَاوَان مِنْ شِدَّة الخُضْرَة، ادْهَامَّ الشَّيءُ: إِسْوَادَّ)، (مُدْهَامَّتَان) واتە: ئەو دوو باخە زۆر سەوزن لە سەوزییان هێندە تۆخن، ڕەش دەنوێنن، دەگوترێ: (إِدْهَامَّ الشَّيءُ: إِسْوَادَّ)، واتە: ڕەشهەڵگەڕا.

(نَضَّاخَتَانِ ): (النَّضَّاخَةُ مُؤَنَّثُ النَّضَّاخِ، عَيْنٌ نَضَّاخَة: فَوَّارَة غَزِيْرَةُ المَاءِ، وَنَضَخَ المَاءُ يَنْضَخُ نَضْخاً وَنُضُوخاً: اشْتَدَّ فَوَرَانُهُ)، (نَضَّاخَتَانِ) واتە: ئەو دوو کانیاوە ئاوەکەیان بە فیچقە دێتە دەرێ، چونکە (النَّضَّاخَةُ) مێینەی (النَّضَّاخ)ە، دەگوترێ: (عَيْن نَضَّاخَة) سەرچاوەیەک کە ئاوەکەی بە فیچقە و بە توندیی دێتە دەر، (وَنَضَخَ المَاءُ يَنْضَخُ نَضْخاً وَنُضُوخاً: اشْتَدَّ فَوَرَانُهُ) واتە: هەڵقوڵینەکەو دەرقوڵینەکەی زۆر بەهێز بوو.

(خَيْرَٰتٌ): (جمع خَيْرَة: مَا يُخْتَار)، (خَيْرَات) کۆی (خَيْرَة)یە، واتە: باشترین، یاخود ئەوەی هەڵدەبژێردرێ، (وَالخَيْرَةُ: الفَاضِلَة فِي كُلِّ شَيء) (خيرة) باشترین لە هەر شتێک، دەگوترێ: (فُلَانَةُ الخَيْرَةُ مِن النِّسَاء)، فلان ئافرەتە باشترینی ئافرەتانە،

www.alibapir.com


(**خَيْرَاتٌ**) سوككراوەی (**خَيِّرَات**)ە، واتە: زۆر باش، لێرەدا یانی: ئافرەتانی زۆر چاك و پەسند لە ڕووی ڕەوشت و ئاكارو هەڵس و كەوتی مەعنەوییەوە.

(**حِسَانٌ**): (**جَمْعُ حَسْنَاء**) (**حِسان**) كۆی (**حَسْناء**)ە: زۆر جوان لە ڕووی جەستەییەوە، كەواتە: ئەوانە هەم مەخبەرو دیوی مەعنەوییان زۆر جوانە، هەم ڕواڵەت و باری جەستەییشیان زۆر ڕێك و پێك و سەرنج ڕاكێشە.

(**حُورٌ**): (**الحُورُ: جَمْعُ حَوْراءَ وَهِيَ ذَاتُ الحَوْرِ، وَهُوَ وَصْفٌ مُرَكَّبٌ مِنْ مَجْمُوعِ شِدَّةِ بَيَاضِ أَبْيَضِ العَيْنِ، وشِدَّةِ سَوَادِ أَسْوَدِها**)، (**حُورُ**) كۆی (**حَوْراءَ**)ە، واتە: خاوەن، (**حَوْر**) ئەویش بریتیە لە وەسفێك كە ئەو ئافرەتە، یان ئەو كەسە، سپێنەی چاوی زۆر سپیی بێ و، ڕەشكێنەی چاویشی زۆر ڕەش بێ.

واتایەكی دیكەی (**حُورُ**) كە كۆی (**حَوْراءَ**)ە، واتە: زۆر سپیی و ڕوون و گەش.

هەروەها واتایەكی دیكەی (**حُورُ**) كە كۆی (**حَوْراءَ**)ە، واتە: (**يَحَارُ فِيْهِنَّ الطَّرْفُ مِنْ حُسْنِهن**)، واتە: چاو تێیاندا سەرسام دەبێ لەبەر جوانیی، (**حَارَ بَصَرُهُ يَحَارُ حَيْراً وَحَيْرَةً وَحَيْرَاناً: نَظَرَ إلى الشَّيءِ فَلَمْ يَقوِ عَلَى النَّظْرِ إلَيْهِ وَارْتَدَّ عَنْهُ**)، كاتێ مرۆڤ تەماشای شتێك دەكات، بەڵام دوایی چاوی دەگەڕێتەوە بۆ لای لەبەر ئەوەی ناتوانێ زۆر سەرنجی بدات لەبەر جوانیی، یان لەبەر ئەوەی سەرسامی دەبێ، ناتوانێ تەواو تەماشای بكات، یان لەبەر سپێتیی و درەوشاوەیی، هەروەها دەگوترێ: (**حَارَ فِي الأَمْرِ: ضَلَّ فَهُوَ حَائِر وَحَيْرَان وَهِيَ حَيْرى**)، لەو كارەدا سەرگەردان بوو، سەراسیمە بوو، ئنجا بۆ پیاو (**حَائِر**) و (**حَيْرَان**) و، بۆ ئافرەتیش (**حَيْرى**) دەگوترێ: واتە: سەرسام، (**وَتَحَيَّرَ: وَقَعَ فِي الحيْرَة**) واتە: كەوتە نێو حاڵەتی سەراسیمەیی و سەرسوڕمانەوە.

كەواتە: (**حُور**) سێ مانای هەن: هەم بە مانای سپیی و گەش دێ، هەم بە مانای چاوگەش و جوان دێ، هەم بە مانای ئەوە دێ كە چاو ناتوانێ چاك تەماشای بكات لەبەر جوانیی.

www.alibapir.com


(مَّقْصُورَٰتٌ): کـورت هەڵێـنراو، (قَصَرْتُـه: جَعَلْتُـه فِي قَـصْرٍ)، واتـە: خسـتمە نێـو کۆشـکەوە، کەواتـە: (مَقْصُـورَات) واتـە: کۆشـک نشـینەکان، واتایەکـی دیکـەی: (المَقْصُـورَة مِـنَ النِّسَـاء: المُنَعَّمَـةُ فِي البَيْـت لَا تَتْرُكُـه لِتَعْمَـل)، (مَقْصُـورَات) واتـە: ئافرەتێک کـە خزمـەت دەکـرێ و نـازی دەکێـشرێ و پێویسـت نـاکات بـۆ خـۆی کار بـکات، هەروەهـا واتایەکـی دیکـەی: (المَـرْأَةُ المَقْصُـورَة: المَصُونَـة المخَـدَّرَة) واتـە: ئافرەتێکـی پارێـزراوی داپـۆشراو، نـەک بچـێ بگـەڕێ لەمـلاو لا.

(ٱلْخِيَامِ): (الخِيَـام: جَمْـعُ خَيْمَـةٍ، والبَيْـتُ الَّـذِي يُقَـامُ مِـنْ أَعْـوَادِ الشَّـجَر)، (خِيَـام) کـۆی (خَيْمة)یـە، ئـەو ماڵـەی کـە لـە دارو درەخـت دروسـت دەکـرێ، یاخـود: (البَيْـتُ الَّـذِي يُتَّخَـذُ مِـنَ الصـوفِ أو القُطْـنِ، وَيُقَـامُ عَـلَى أَعْـوَادِ وَيُشَـدُّ بِأَطْنَـاب)، یـان ئـەو ماڵـەی لـە خوریـی یـان لـە لۆکـە دروسـت دەکـرێ، [یـان لـە جۆرێـک لـە قومـاش کـە ئێمـە ڕەشـماڵ و خێـوەت و چـادری پـێ دەڵێیـن]، لەسـەر چەنـد دارێـک دادەنـرێ، ئەسـتوندە گیـشی دەدرێتـە بـەرو، بـە چەنـد پەتێکیـش ئـەو لاو لای دەبەسـترێن، تاکـو نەجووڵـێ و بـا نەیخـات، کـە بـە (خَيـمَات)و (خِيَـام)و (خِيَم)یـش کـۆ دەکرێتـەوە.

(رَفْرَفٍ خُضْرٍ): (رَفْـرَف) تاکەکـەی (رَفْرَفَة)یـە، (رَفْـرَف): بریتیـە لـە نـاوی کـۆ، کـە بـە باڵنـدە و بـە سـەرین و بـە فـەڕش و ڕایـەخ و پۆشـاک دەگوتـرێ، (خُـضْر) کـۆی (أَخْـضَر)ە واتـە: سـەوز.

(وَعَبْقَرِيٍّ): (وَهُـوَ نِسْـبَةٌ إِلى عَبْقَـرٍ، وَهُـوَ صِفَـةٌ لِـكُلِّ مَـا بُولِـغَ فِي وَصْفـه، وَمَـا يُفُوقُـه شَيءٌ) (عَبْقَـرِي): پاڵـدەدرێ بـۆ لای (عَبْقَـرٍ) کـە سـیفەتێکە بـۆ هـەر شـتێک زۆر وەسـف بکـرێ، پاڵدەدرێتـە لای ئـەو.

عـەڕەب قەناعەتیـان وابـووە شـیوێک هەبـووە بـە نـاوی (عَبْقَـر)، هـەر شـتێکی زۆر نایـاب و سـەیر بـێ، گوتوویانـە: لـەو شـیوەوە هاتـوە، کـە جنـدی لێـن و ئـەوان دروسـتیان کـردوە، ئـەوەش ئەفسـانەیەک بـووە، بـەڵام دوایـی (عَبْقَـري) واتـە: شـتی زۆر نایـاب و سـەرووی ئاسـتی چـاوەڕوان کـردن.

www.alibapir.com


(تَبَٰرَكَ ٱسۡمُ رَبِّكَ): (تَبَارَكَ: إرْتَفَعَ وَتَقَدَّس وَتَنَزَّه وَتَعَالى)، واتە: ناوی خوا بەرزەو، پاکەو، دوورە لە کەم و کوڕیی و، بڵندە، کەواتە: لێرەدا (تَبَٰرَكَ ٱسۡمُ رَبِّكَ)، واتە: ناوی پەروەردگارت هەرە بەرزو پایەدارو بە پێزو بڵندە.

## مانای گشتیی ئایەتەکان

خوای میهرەبان و کارزان دوای ئەوەی لە ئایەتەکانی پێشوودا باسی بیست (٢٠) لە چاکەو نیعمەتەکانی خۆی کردو، چەند جارێک پرسیاری لە کۆمەڵی جندو مرۆڤ کرد: ئایا نکوولیی لە کام لە چاکەکانی پەروەردگارتان دەکەن؟ دوای ئەوە خوا بسم الله الرحمن الرحيم باسی ڕۆژی دوایی کرد، کە مرۆڤ و جند، ناتوانن لە ژێر ڕکێفی خوا دەرباز بن و، باسی سەرەنجامی شوومی بێبڕوایانی کرد لە دۆزەخدا، ئنجا باسی پاداشتی کەسانێک دەکات کە سام و هەیبەتی خوای پەروەردگاریان لە دڵدایەو، شەرم لە خوا دەکەن و، پارێزکارن و بڕواداران، ئەویش لە چوار بەهەشتدا، لە چوار باخدا بە جووت جووت، واتە: دوو جووتە باخ کە وەک پاداشت داندراون، بۆ بڕواداران لە بەرانبەر دۆزەخێکی پڕ تاو و تین و بڵێسەدارو کڵپەستاندوودا، کە بۆ بێبڕوایانی ستەمکارو تاوانبارو خراپەکار ئامادە کراوە.

سەرەتا خوا بسم الله الرحمن الرحيم باسی جووتە باخی یەکەم دەکات و دەفەرموێ: ﴿وَلِمَنۡ خَافَ مَقَامَ رَبِّهِۦ جَنَّتَانِ﴾، بۆ هەر کەسێک لە پایەو پێگەی بێ وێنەی پەروەردگاری بترسێ، دوو باخ هەن، واتایەکی دیکەشی ئەوەیە: هەر کەسێک لە وەستانی لە بەردەم دادگای پەروەردگاریدا بترسێ، واتە: ترس و سامی ئەو ڕۆژەی لەبەربێ، کە ڕادەگیرێ بۆ دادگایی کران لە بەردەم خوای پەروەردگاردا، دوو باخی بۆ دانراون، یاخود: هەر کەسێک ترس و سامی ئەوەی هەبێ کە پەروەردگاری بەسەریەوە چاودێرەو بەسەری ڕادەگات و مشووری دەخوات و سەرپەرشتیی دەکات، دوو باخی بۆ داندراون، چونکە وشەی (مقام):

www.alibapir.com


**أ**- دەگونجێ بە مانای پێگەو پایەی خوای بەرز بێ.

**ب**- دەگونجێ بە مانای سەرپەرشتیی و چاودێریی خوای بەرز بێ، بۆ هەر مرۆڤێک، وەک خوا دەفەرموێ: ﴿ أَفَمَنْ هُوَ قَآئِمٌ عَلَىٰ كُلِّ نَفْسٍۭ بِمَا كَسَبَتْ ﴿٣٣﴾ ﴾ **الرعد**، واتە: ئایا ئەو زاتەی وەستاوە بەسەر هەر کەسێکەوە، کە چی دەکات؟ واتە: ئاگای لێیەتی.

**ج**- هەروەها دەشگونجێ بریتی بێ لە وەستانی مرۆڤ و جند لە بەرانبەر خوای پەروەردگاردا، هەر سێکیان دەگرێتەوە، هەر کەسێ وابێ، دوو باخی هەن، ﴿ فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ ﴾، ئنجا ئەی جندو مرۆڤ! بە کام لە چاکەکانی پەروەردگارتان بێبڕوان، یان: نکوولّیی لە کام لە چاکەکانی پەروەردگارتان دەکەن؟

﴿ ذَوَاتَآ أَفْنَانٍ ﴾، ئەو دوو باخە خاوەن چڵ و پۆپی زۆرن، یاخود خاوەن جۆری زۆرن، واتە: خاوەن جۆری زۆرن لە درەختەکان، چونکە (**أَفْنَان**) کۆی (**فَنَن**)ە، کە هەم بە مانای لق و پۆپ و چڵ و گەڵا دێ، هەم بە مانای جۆر (**نوع**)یش دێ، جۆرە میوە، یان جۆرە درەخت، ﴿ فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ ﴾، ئنجا ئایا ئەی کۆمەڵی جندو مرۆڤ! نکوولّیی لە کام لە چاکەکانی پەروەردگارتان دەکەن؟

﴿ فِيهِمَا عَيْنَانِ تَجْرِيَانِ ﴾، ئەو دوو باخە، کە خاوەن چڵ و پۆپی نەرم و شل و چڕو پڕن، یان خاوەن جۆرە میوەو درەختی زۆرن، دوو سەرچاوەیان تێدا دەڕۆن، واتە: دوو سەرچاوە کە ئاویان لەبەر دەڕوات، ئاوەکە یان هەڵدەقوڵێ، بەڵام هێندە زۆرە، لەبەریان دەڕوا، ﴿ فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ ﴾، ئنجا ئەی کۆمەڵی جندو مرۆڤ! نکوولّیی لە کام لە چاکەکانی پەروەردگارتان دەکەن؟

﴿ فِيهِمَا مِن كُلِّ فَٰكِهَةٍ زَوْجَانِ ﴾، لەو دوو باخەدا، لە هەر جۆرە میوەیەک دوو جۆر هەن، (**زَوْجَان**)، (**زَوْج**) بە مانای جووتی هەر شتێک دێ، بۆ وێنە: جووتە پێڵاوێک بە هەرکامێکیان دەگوترێ: (**زَوْج**)، ژن و مێرد بە هەر کامێکیان دەگوترێ: (**زَوْج**) کە دەفەرموێ: (**زَوْجَان**) واتە: دووان، واتە: لە هەر جۆرە میوەیەک دووان هەن، ئنجا ئەو دووانە چین و چۆنن؟ زانایان قسەیان زۆر لەسەر کردووە،

www.alibapir.com



ئێمەش دواتر لە مەسەلە گرنگەکاندا زیاتر شییان دەکەینەوە، ئەو مەسەلانەی لێرە زیاتر بە گشتیی باسیان دەکەین، لەوێ پتر ڕوونیان دەکەینەوە، ﴿فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ﴾، ئنجا ئەی جندو مرۆڤ! نكووڵیی لە كام لە چاكەكانی پەروەردگارتان دەكەن؟ واتە: چاكەكانی پەروەردگارتان و نیعمەتەكانی، هیچ كامیان هی ئەوەنین نكووڵییان لێ بكەن و، نەیانسەلمێنن و دانیان پێدانەهێنن،

﴿مُتَّكِـِٔينَ عَلَىٰ فُرُشٍۭ بَطَآئِنُهَا مِنْ إِسْتَبْرَقٍ﴾، شانیان داداوەو ڕاكشاون لەسەر چەند جێگایەك دیوە پەنهانەكانیان لە ئاوریشمی ئەستوورە، (فُرُش) كۆی (فِرَاش)ە، شوێنی لەسەر پشوودان و سرەوتن و شان لەسەردادان و پاڵدانەوەیە، ئنجا ئەو ڕاخراوانەو ئەو شوێنانەی بۆ ئیسڕاحەت و پشوودان ئامادەكراون، ﴿بَطَآئِنُهَا مِنْ إِسْتَبْرَقٍ﴾، دیوەكانی بنەوەیان لە ئاوریشمە، (بَطَائِن) كۆی (بِطَانَة)یە، وەك چۆن (ظَهَائِر) كۆی (ظِهَارَة)یە، (ظِهَارَة) واتە: پشت و دیوی دەرەوەی پۆشاكێك، یاخود نوێنێك، بەڵام (بِطَانَة) واتە: دیوی شێرراوەو بنەوەی، ئنجا ئەگەر دیوی بنەوەی لە ئاوریشمی ئەستوور بێ، كە دیوی بنەوە كەمتر جێی بایەخ پێدانە، دیوی بنەوەی فەرشێك كە ڕادەخرێ، یاخود نوێنێك و پێخەفێك، ئەدی دیوی دەرێی دەبێ چۆن بێ! ﴿وَجَنَى ٱلْجَنَّتَيْنِ دَانٍ﴾، چنراوی دوو باخەكانیش نیزیكە، واتە: میوەكەیان نیزیكە و بە ئاسانیی دەستی دەگەیەنرێتێ، ﴿فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ﴾، ئنجا ئەی جندو مرۆڤ! نكووڵیی لە كام لە چاكەكانی پەروەردگارتان دەكەن؟

﴿فِيهِنَّ قَٰصِرَٰتُ ٱلطَّرْفِ﴾، لەو جێگایانەدا ئافرەتانێكی نیگای خۆی كورت هەڵهێنەر، نیگای خۆ كورتكەرەوە هەن، واتە: ئافرەتانێك كە چاوو نیگایان كورت كردۆتەوە، لەسەر هاوسەرەكانیان، لەسەر مێردەكانیان.

واتایەكی دیكەی ئەوەیە: چاوەكانی بینەران لەسەر خۆیان كورتهەڵدێنن، یانی: هەركەس بیانبینێ، چاویان لەسەر لانادات و چاویان لەسەر كورت هەڵدێنێ،

www.alibapir.com



﴿لَمۡ يَطۡمِثۡهُنَّ إِنسٞ قَبۡلَهُمۡ وَلَا جَآنّٞ﴾، نەچوونە لایان و لەگەڵیان دا جووت نەبوون، نە مرۆڤ لە پێش ئەوانداو نە جندیش، واتە: هیچ کەس دەستی نەگەیاندوونێ، وشەی (لَمۡ يَطمِثهُن)، مانا گشتییەکەی: لەگەڵیان دا جووت نەبوون و دەستیان نەگەیاندوونێ لە ڕووی جینسییەوە، بەڵام ئەسڵی مانایەکەی: (طَمَث، يَطمُثُ) یانی: خوێنی پێدا هێنا، ئەو هاوسەرە لەگەڵ ژنەکەی دا جووتبوو، خوێنی پێدا هێنا، کەواتە: (طَمث) مەبەست پێی لابردنی پەردەی کچێنییە، بەڵام دوایی بۆ هەر جۆرە جووت بوونێک بەکارهێنراوە، گرنگ ئەوەیە خوا دەفەرمویێ: ئەو ئافرەتانە لە پێش ئەو هاوسەرانەیاندا، کە لە بەهەشتێ دەیاندرێنێ، نە مرۆڤ دەستی گەیاندوونێ، نە جندیش، ئەمەش ئەوەی لێ وەردەگیرێ کە جندیش دەچن بۆ بەهەشت و، ئەوانیش وەک مرۆڤ هاوسەریان دەبن و جووتبوونیان دەبێ، ﴿فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ﴾، ئنجا ئەی جندو مرۆڤ! نکوولیی لە کام لە چاکەکانی پەروەردگارتان دەکەن؟

﴿كَأَنَّهُنَّ ٱلۡيَاقُوتُ وَٱلۡمَرۡجَانُ﴾، ئەو ئافرەتانە وەک یاقووت و مەرجان وان، یاقووت جۆرە بەردێکە لە بەردە بە نرخەکان، بە زۆریی وایە ڕەنگی سوورە، زانایان دەڵێن: لە سووریی کوڵمەو لێویاندا چوێنراون بە یاقووتەوە، مەرجانیش وەک پێشتریش باسمانکرد، جۆرە بەردێکە لە ژیانداریکی دەریایی پەیدا دەبێ، کە لە ئەسڵدا ژیانداره، بەڵام دوایی کە هەر پێکەوەن زاووزێ دەکەن و لێک جیانابنەوە، پاش مردن و ڕەقبوون، دەبنە بەردو جاری وا هەیە دەبنە چیایەکی گەورەو پێیان دەگوترێ: دورگە مەرجانییەکان، مەرجانیش زۆر سپیی و سافە، کەواتە: لە سوورییدا وەک یاقووتن و، لە ڕوونیی و صافییدا وەک مەرجانن، ﴿فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ﴾، ئنجا ئەی جندو مرۆڤ! نکوولیی لە کام لە چاکەکانی پەروەردگارتان دەکەن؟

﴿هَلۡ جَزَآءُ ٱلۡإِحۡسَٰنِ إِلَّا ٱلۡإِحۡسَٰنُ﴾، ئایا پاداشتی چاکەکاریی هەر چاکەکاریی نیە! واتە: کەسێک چاک بەندایەتیی بۆ خوای کرد بێ و، لەگەڵ بەندەکانی

www.alibapir.com


خـوادا چـاک بـوو بـێ و، چـاک پابەنـد بـوو بـێ بـە شـەریعەتەوەو، هـەم هەقـی خـوای جێبەجـێ کردبـێ، هـەم هەقـی بەنـدەکان، پاداشـتی هـەر ئەوەیـە کـە چاکـەی بدرێتـەوە، چاکـەی خـوای بـێ هاوەڵیـش لـە بەهەشـتدا بەرجەسـتە دەبـێ، ئـەم پرسـیارکردنەش، پرسـیارکردنی چەسـپاندن (**تقریـري**) پـێ دەڵێـن، واتـە: (**مَـا جَزَاء الإِحْسَـان إلاَّ الإِحْسَـان**)، پاداشـتی چاکەکاریـی بـەس چاکەکارییـەو هیـچ شـتێکی دیکـە نـی.

﴿ فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ ﴾، ئنجـا ئـەی جنـدو مـرۆڤ! نکووڵیـی لـە کام لـە چاکـەکانی پەروەردگارتـان دەکـەن؟

ئەمـە جووتـە باخـی یەکـەم، کـە ئـەم جووتـە باخـە، وەک زانایـان گوتوویانـەو قسەکەشـیان زۆر پێدەچـێ و، فەرمایشـتی پێغەمبەریـش ﷺ وەک دوایـی دەیهێنین، ئامـاژەی پێـدەکات، بـۆ ئەوانەیـە کـە پلـەو پایەیـان بەرزتـرە لـە بەهەشـت دا، کـە وەسـفی (**سَـابِقُون**)یان بـۆ بەکارهێنراوەو، وەسـفی (**مُقَرَّبُون**)یشیان بـۆ بەکارهێنراوە، واتـە: ئەوانـەی پێشـکەوتوون لـە چـاکان داو، ئەوانـەی زۆر لـە خـوا نیزیکـن، چونکـە وەسـفەکانی ئـەم دوو باخـە، ئـەم جووتـە باخـە، بەرزتـرن لـە وەسـفەکانی ئـەو دوو باخـەی، یـان ئـەو جووتـە باخـەی دوایـی دێـن و، ئایەتەکـەش کـە دوایـی دێ بـە ڕاشـکاویی دەیفەرمـوێ: ﴿ وَمِن دُونِهِمَا جَنَّتَانِ ﴾، لـە خـوار ئەوانـەوەش دووبـاخ هەن، هەرچەنـدە (**مِـنْ دُونِهِـمَا**) دەشـگونجێ مەبەسـت (لـە خـوار) لـە ڕووی جوگرافییـەوە بـێ، بـەڵام زیاتـر وابێدەچـێ لـە ڕووی پێگـەوە بـێ، واتـە: ئـەم دوو باخـە لـە ڕووی پێگـەو پلـەوە، لـە خـوار ئـەو دوو باخـەی دیکـەوەن، ئەوانـەش - وەک دوایـی دەردەکـەوێ - بـۆ کەسـانێکن کـە لـە قوڕئانـدا بـە: (**أَصْحَـابُ الـمَيْمَنَة**)، ئەوانـەی خـاوەنی خێـرو بەرەکەتـن، یاخـود (**أَصْحَـابُ اليَمِـيْن**) ئەوانـەی بـە دەسـتی ڕاسـتیان نامەکانیـان دەدرێتـەوە، واپێدەچـێ ئـەوەش بـۆ ئـەوان بـن کـە هـەر بڕواداران، بـەڵام لـە خـوار کۆمەڵـی یەکەمـەوەن، کـە (**مُقَرَّبُـون**) و (**سَـابِقُون**)ن، ﴿ فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ ﴾، ئنجـا ئـەی جنـدو مـرۆڤ! نکووڵیـی لـە کام لـە چاکـەکانی پەروەردگارتـان دەکـەن؟

www.alibapir.com



﴿ مُدۡهَآمَّتَانِ ﴾، ئەو دوو باخە زۆر سەوزی تۆخن، واتە: دوو باخی زۆر سەوزن و هێندە تۆخن لە تۆخییان دا، ڕەش دەنوێنن، ئەگەر لە دوورەوە تەماشایان بکەین، ﴿ فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ ﴾، ئنجا ئەی جندو مرۆڤ! نکوولّیی لە کام لە چاکەکانی پەروەردگارتان دەکەن؟

﴿ فِيهِمَا عَيۡنَانِ نَضَّاخَتَانِ ﴾، دوو سەرچاوەی بەفیچقە دەرقوڵیویان تێدان، یانی: ئاوەکەیان لێ دەردەقوڵێ بە فیچقە، ئاوەکەیان بە تەوژم دێتە دەرێ و ئەو دوو باخەیان پێ ئاودێر دەکرێن، یاخود هەر بۆ جوانیی ئەو دوو کانیی و سەرچاوە بەتەوژم دەرقوڵیوە، لەو دوو باخەدا هەن، هەر کام لە دوو باخەکان، کانیی و سەرچاوەیەکی تێدا هەیە، ﴿ فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ ﴾، ئنجا ئەی جندو مرۆڤ! نکوولّیی لە کام لە چاکەکانی پەروەردگارتان دەکەن؟

﴿ فِيهِمَا فَٰكِهَةٞ وَنَخۡلٞ وَرُمَّانٞ ﴾، لەو دوو باخانەدا هەیە، میوە (هەموو جۆرەکانی میوە)و، دارخورماو هەنار، میوە بە وشەی: (**فَاكِهَة**) دێنێ، واتە: هەموو درەختەکانی کە میوە دەگرن، خورماش باسی درەختەکەی دەکات، چونکە دارخورما خورما دەگرێ، هەنار (**رُمَّان**)یش بە میوەکەشی و بە درەختەکەشی دەگوترێ: (**رُمَّان**)، ئنجا دارخورما یەکجار بەرزەو، دار هەنار کەمتر بەرزە، کە دەفەرموێ: (**فَاكِهَة**) لەبەر ئەوەی بە نەناسراو (**نكرة**) دەیهێنێ (میوە) واتە: هەموو جۆرە میوەیەکیان تێدا هەیە، ﴿ فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ ﴾، ئنجا ئەی جندو مرۆڤ! نکوولّیی لە کام لە چاکەکانی پەروەردگارتان دەکەن؟

﴿ فِيهِنَّ خَيۡرَٰتٌ حِسَانٞ ﴾، لەو جێگاو ڕێگایانەدا (کە لە نێو ئەو دوو باخەدا هەن) ئافرەتانی چاک و قەشەنگ هەن، واتە: لە کۆشکەکان و لە ژوورەکانیانداو، لە شوێنی حەوانەوە و ئیسڕاحەتیاندا (**خَيْرَاتٌ حِسَان**) ئافرەتانێکی زۆر چاک و زۆر جوان، هەن، (**خَيْرَات**) کۆی (**خَيْرَة**)یە، دەگوترێ: (**هَذِهِ المرأة خيرة النِّسَاء**) واتە: لە هەموو ئافرەتان باشترە، باشیی لە ڕووی مەعنەوییەوەو، لە ڕوو ڕەوشت

www.alibapir.com



و ئاکارو ڕەفتارو دیوی مەعنەوییەوە، (**حِسَان**)یش کۆی (**حسناء**)ە، واتە: هەرە جوان، واتە: لە ڕووی ڕواڵەت و جەستەوە، هەرە جوانن و، لە ڕووی چاکیی مەعنەوییشەوە، هەرە چاکن، ئەمەش باشترین وەسفە، (**خَيْرَات**) ئەسڵی خۆی لە (**خيِّرات**)ەوە هاتوە، بەڵام دوایی گیرە (**شدّة**)ەکەی لابراوەو بۆتە (**خَيْرَاتٌ**).

ئنجا کە پێشێ خوا ﷻ باسی دوو باخان دەکات و، دوایی بە کۆ (**جمع**) دەفەرموێ: (**فِيهِنَّ**) زانایان هەندێکیان گوتوویانە: جاری وا هەیە دووان (**مُثَنَّى**)ش بە کۆ دێ، هەندێکی دیکەش گوتوویانە: کە خوا ﷻ باسی دوو باخەکان دەکات، مانای وا نیە بەس دوو باخن و، میوەو درەخت و خورماو کانیی و سەرچاوەیان تێدایەو هیچی دیکە، بەڵکو ئەو باخانە کۆشکیان تێدان و کۆشکەکان ژووریان تێدان، کەواتە: لە کۆشکەکانیانداو لە ژوورەکانیاندا، ئافرەتانێکی هەرە باش لە ڕووی مەعنەوییەوەو، هەرە جوان لە ڕووی جەستەییەوە هەن، ﴿ فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ ﴾، ئنجا ئەی جندو مرۆڤ! نکوولیی لە کام لە چاکەکانی پەروەردگارتان دەکەن؟

﴿ حُورٌ مَّقْصُورَٰتٌ فِى ٱلْخِيَامِ ﴾، (**حُور**) کۆی (**حَوْرَاء**)ە، کە زانایان سێ واتایان بۆ لێکداونەوە :

**أ-** (**حَوْرَاء**) دەگونجێ بە مانای ئافرەتێک بێ، زۆر سپیی و ڕوون و جوان لە ڕووی جەستەوە، چونکە (**حُور**) بە مانای (**بَيَاض**) سپێتییە.

**ب-** واتایەکی دیکەی ئەوەیە، کە چاویان سپێنەکەی زۆر سپییەو ڕەشکێنەکەی زۆر ڕەشە، ئەوەش جوانترین جۆری چاوە.

**ج-** واتایەکی دیکەی ئەوەیە (**حُور**) کە کۆی (**حَوْرَاء**)ە، واتە: هەر کەسێک تەماشایان بکات سەراسیمە دەبێ و، سەری سوڕدەمێنێ لە جوانییان.

(**مَقْصُورَات فِي الخِيَام**)، (**مَقْصُورَات**) کۆی (**مَقْصُورة**)یە واتە: کورت هەڵێنراو، (**خِيَام**)یش کۆی (**خيمة**)یە، کە هەم بە مانای خێوەت و چادر دێ و، هەم بە

www.alibapir.com



مانـای کۆشـکیش دێ، وەک دوایـی لـە فەرمایشـتی پێغەمبـەردا ﷺ دەیهێنیـن کـە دەفەرمـوێ: ئـەو (**خیمة**)یـە گەوهەرێکـی کوڵـدراوە زۆر زۆر گەورەیـە، ئنجـا ئـەو ئافرەتانـە لـە نێـو ئـەو خانووبەرانـەدا هـەر لەوێدان، واتـە: پێویسـت ناکات دەربچن بـۆ ئیش و کار، چونکـە عـادەت وایـە ئافـرەت زۆرجـار ئیـش و کار دەکات، بـەڵام ئـەو ئافرەتانـە خزمەتکـراون و، لـە جێـگاو ڕێـگای سرەوتنیانـدا کـورت هەڵێـنراون و، خزمەتکـراون و پێویسـتییان بـە چوونـەدەر نیـە، ﴿ فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ ﴾، ئنجـا ئـەی جنـدو مـرۆڤ! نکووڵیـی لـە کام لـە چاکـەکانی پەروەردگارتـان دەکـەن؟

﴿ لَمْ يَطْمِثْهُنَّ إِنسٌ قَبْلَهُمْ وَلَا جَآنٌّ ﴾، لـە پێـش ئـەو (پیـاوە بەهەشـتیی)نەدا (کـە ئـەو ئافرەتانەیـان پـێ دەدرێـن، ئـەو حۆرییانـە) هیـچ مرۆڤێـک و هیـچ جندێـک دەسـتی نەگەیاندوونـێ و لەگەڵیـان دا جـووت نەبـووە، ﴿ فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ ﴾، ئنجا ئـەی جنـدو مـرۆڤ! نکووڵیـی لـە کام لـە چاکـەکانی پەروەردگارتـان دەکـەن؟

﴿ مُتَّكِـِٔينَ عَلَىٰ رَفْرَفٍ خُضْرٍ وَعَبْقَرِيٍّ حِسَانٍ ﴾، پاڵیانداوەتـەوەو شـانیان داداوە لەسـەر جێگایـەک و ڕایەخێـک، کـە بـۆ پشـوودان دانـدراوە، (**رَفْـرَف**) کـۆی (**رَفْرَفَـة**) یـە، یـانی: ڕایـەخ و شـوێنی پشـوودان و ئیسـڕاحەت لەسـەرکردن، (**خُضْر**)یـش کـۆی (**أخْـضَر**) یـان کـۆی (**خَـضْرَاء**)ە واتـە: سـەوز، (**عَبْقَـرِي حِسَـان**)، (**عَبْقَـرِي**) لـە نێـو عەرەبانـدا عـادەت وابـووە، هـەر شـتێک زۆر نایـاب و جێـی سەرسـوڕمان بـوو بـێ، گوتوویانـە: ئـەوە هـی (**عَبْقَـر**)ە، گوایـە: شـوێنێک و دۆڵێکـە جنـدی تێـدا هـەن، کـە شـتی سـەیرو عەجایـب و سەرسـوڕهێنەر دروسـت دەکـەن، واتـە: هـەر شـتێک زۆر جێـی سەرسـوڕمان بـێ، پاڵیانداوەتـە لای (**عَبْقـر**)، دوایـی بـە هـەر مرۆڤێکـی هەڵکەوتووشـیان گوتـوە: (**عَبْقَـرِيّ**)، (**حِسَـان**)یش کـۆی (**حَسْـنَاء**)ە، واتـە: ئـەو ڕایـەخ و فـەڕش و نوێنانـە کـە پشـوویان لەسـەر دەدەن و سـەوزن، زۆر دەگمـەن و نایابـن، ئـەو پـەڕی جوانـن، ﴿ فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ ﴾، ئنجا ئـەی جنـدو مـرۆڤ! نکووڵیـی لـە کام لـە چاکـەکانی پەروەردگارتـان دەکـەن؟

﴿ تَبَٰرَكَ ٱسۡمُ رَبِّكَ ذِي ٱلۡجَلَٰلِ وَٱلۡإِكۡرَامِ ﴾، بـەرزو بـە پیـزو بەردەوامـە، نـاوی پـەروەردگاری خـاوەن هەیبـەت و مەزنیـی و پایـە بەرزیـی و، خـاوەن چاکـەو بەزەیـی و بەخشـشـت.



www.alibapir.com


مەسەلە گرنگەکان

## مەسەلەی یەکەم:

**وەسفی جووتە باخی یەکەم، بە شەش سیفەتی گەورەو گرنگ:**

**١)**- خاوەنی چڵ و پۆپی زۆرن.

**٢)**- دوو سەرچاوەی ئاو لەبەر ڕۆیشتوویان تێدان.

**٣)**- لە هەر میوەیەک دوو جۆریان تێدان.

**٤)**- لەسەر چەند جێگایەک پاڵیانداوەتەوەو شانیان داداوە، کە دیوی لای بنەوەی ئەو جێگەو ڕایەخانە ئاوریشمی ئەستوورە.

**٥)**- میوەکەیان زۆر نیزیکە بۆ چنین.

**٦)**- ئافرەتی قەشەنگ و نیگای خۆی لەسەر مێرد کورتکەرەوەی صاف و بێگەردی وەک یاقوت و مرواریيان تێدان، کە هیچ مرۆڤ و جندێک پێش ئەوان توخنیان نەکەوتوون.

خـوا دەفەرمـوێ: ﴿ وَلِمَنْ خَافَ مَقَامَ رَبِّهِۦ جَنَّتَانِ ﴿٤٦﴾ فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ ﴿٤٧﴾ ذَوَاتَآ أَفْنَانٍ ﴿٤٨﴾ فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ ﴿٤٩﴾ فِيهِمَا عَيْنَانِ تَجْرِيَانِ ﴿٥٠﴾ فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ ﴿٥١﴾ فِيهِمَا مِن كُلِّ فَٰكِهَةٍ زَوْجَانِ ﴿٥٢﴾ فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ ﴿٥٣﴾ مُتَّكِـِٔينَ عَلَىٰ فُرُشٍۭ بَطَآئِنُهَا مِنْ إِسْتَبْرَقٍۚ وَجَنَى ٱلْجَنَّتَيْنِ دَانٍ ﴿٥٤﴾ فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ ﴿٥٥﴾ فِيهِنَّ قَٰصِرَٰتُ ٱلطَّرْفِ لَمْ يَطْمِثْهُنَّ إِنسٌ قَبْلَهُمْ وَلَا جَآنٌّ ﴿٥٦﴾ فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ ﴿٥٧﴾ كَأَنَّهُنَّ ٱلْيَاقُوتُ وَٱلْمَرْجَانُ ﴿٥٨﴾ فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ ﴿٥٩﴾ هَلْ جَزَآءُ ٱلْإِحْسَٰنِ إِلَّا ٱلْإِحْسَٰنُ ﴿٦٠﴾ فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ ﴿٦١﴾ ﴾.

www.alibapir.com



## شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە حەڤدە بڕگەدا:

**١)-** ﴿وَلِمَنْ خَافَ مَقَامَ رَبِّهِ جَنَّتَانِ﴾، بۆ هەر کەسێک لە پێگەی پەروەردگاری بترسێ، دوو باخ هەن، وەک گوتمان: پێگەی پەروەردگار (**مَقَام رَبّه**): لێرەدا سێ واتای هەن:

**أ-** دەگونجێ بە مانای پێگەو پایەی بەرزو بێ وێنەی پەروەردگار بێ.

**ب-** دەگونجێ بە مانای ڕاوەستانی پەروەردگار بێ، واتە: سەرپەرشتییکردن و چاودێریی خوای پەروەردگار، کەسێک لەوە بترسێ.

**ج-** یاخود (**مَقَام**) بە مانای (**قِيَامه أَمَامَ رَبّه**) ڕاوەستێنرانی لە بەردەم پەروەردگاریدا، هەر کەسێک ترسی ئەو ڕۆژەی ببێ، دوو باخی هەن، (ل)ی (**لِـمَن**) بۆ کردنە خاوەن (**تمليك**)ە، (**مَنْ**)یش مەبەست پێی تێکڕای ئەوانەیە کە ئەو ترس و سام و هەیبەتەیان هەبووە بەرانبەر بە پەروەردگاریان، یان ترسی وەستانیان لە بەردەم پەروەردگاریان لە دڵدا هەیە.

کە دەفەرموێ: دووباخ (**جنّتان**) زانایان زۆر قسەیان لەسەر کردوون، کە بۆچی دوو باخن؟

(**الشوكاني**)[١] لە تەفسیرەکەی خۆیدا، لەوبارەوە هەشت ڕای هێناون:

**١-** یەکێکیان (**جنّة العدن**)ەو ئەوی دیکەیان (**جنّة النَّعيم**)ە، واتە: باخی هەمیشە تێدا مانەوەو، باخی پڕ لە نازو نیعمەت.

**٢-** یەکێکیان تایبەت بۆ ئەو مرۆڤە، یان بۆ ئەو جندە دروستکراوە، وەک پاداشت، ئەوی دیکەشیانی بە میرات گرتوە، لەو بێبڕوایەی ئەگەر ئیمانی هێنابایە، بەهەشتیی دەبوو و، ئەو باخەی دەدرایە، ئەویش لەو بە میراتی گرتوە.

---

(١ ) ج٥، ص: ١٧٠.

www.alibapir.com


٣- یەکیان جێگاو ڕێگای خۆی و میوانیەتی، ئەوی دیکەش جێگاو ڕێگای ماڵ و خێزانیەتی.

٤- یەکیان بۆ کەسێکە کە سام و هەیبەتی بەرانبەر بە پەروەردگار هەبێ لە مرۆڤان و، ئەوی دیکەش لە جندان.

٥- یەکێکیان لە بەرانبەر ئەوەدایە کە فەرمانبەریی بۆ خوا کردوە، ئەوی دیکەشیان لە بەرانبەر ئەوەدایە کە سەرپێچیی لە خوا نەکردوە.

٦- یەکێکیان لە بەرانبەر ئیمان و عەقیدەکەی دایەو، ئەوی دیکەشیان لە بەرانبەر کردەوە باشەکەیدایە.

٧- یەکێکیان بە کردەوەی خۆی وە دەستی هێناوەو، ئەوی دیکەش بە بەخششی خوا.

٨- یەکێکیان نیعمەتی ڕووحانیی تێدایەو، ئەوی دیکەش نیعمەتی جەستەیی و ماددیی.

هەڵبەتە ئەوانە هەموویان ڕاو بۆچوونن، بەڵام هیچیان دەق نین و، دەشگونجێ هەموو ئەو ڕایانە یان زۆربەیان، لە یەک کاتدا مەبەست بن.

٢)- ﴿فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ﴾، [ئەم ڕستەیە بۆ جووتە باخی یەکەم، هەشت جاران دووبارە دەبێتەوەو، بۆ جووتە باخی دووەمیش، هەشت جاران دووبارە دەبێتەوە]، واتە: ئەی کۆمەڵی جندو مرۆڤ! نکووڵیی لە کام لە چاکەکانی پەروەردگارتان دەکەن؟ واتە: هیچ کام لە چاکەو نیعمەتەکانی پەروەردگار هی ئەوەنین نادیدەیان بگرن و نکووڵییان لێبکەن و نەیسەلمێنن، کە ئەوە چاکەو ڕەحمەت و نیعمەتی پەروەردگارە بەخشیویەتی.

### سیفەتی یەکەمی جووتە باخی یەکەم:

٣)- ﴿ذَوَاتَآ أَفۡنَانٍ﴾، هەردووکیان خاوەن لق و پۆپ و چڵی زۆرن، ئەمە یەکەمین سیفەتی جووتە باخی یەکەمە، لە شەش سیفەتەکەیان، (أَفْنَان: جَمْعُ فَنَن)، (فَنَن):

www.alibapir.com


أ- بە مانای (**الغصن**) دێ، لق و پۆپ و چڵ، کە لەو درەختانە جیا دەبنەوە.

ب- هەروەها (**فَنَن**) بە مانای (**نوَعْ**) دێ واتە: ئەو دوو باخە جۆرە درەختی زۆریان تێدا هەن، یاخود جۆرە میوەی زۆریان تێدا هەن، (**ذَوَاتَا**) دووانە (**مثنّی**)ی (**ذات**)ە، واتە: خاوەن، هەردووکیان خاوەنی لق و پۆپی چڵی زۆرن، یاخود خاوەنی جۆرە درەختی زۆرن، یان جۆرە میوەی زۆرن.

٤)- ﴿فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ﴾، ئنجا ئایا ئەی کۆمەڵی جندو مرۆڤ! نکووڵیی لە کام لە چاکەکانی پەروەردگارتان دەکەن؟

سیفەتی دووەمیان:

٥)- ﴿فِيهِمَا عَيْنَانِ تَجْرِيَانِ﴾، لە نێو ئەو دوو باخەدا، دوو سەرچاوە هەن، واتە: هەر کامێکیان سەرچاوەیەک ئاوی زۆرەو لەبەری دەڕوات وەک ڕووبارێک، یەکێک لە ڕوونکەرەوانی قورئان دەڵێ: (**ذِكْرُ العَيْنَانِ الَّتِي يَجْرِي مَاؤُهُمَا بَعْدَ الأَفْنَانِ، لأَنَّ مَنْظَرَةَ الأَشْجَارِ بِغَيْرِ ذِكْرِ المَاءِ، يَقْدَحُ فِي جَمَالِيَّةِ مَنْظَرَةِ الأَشْجَارِ**)، واتە: باسی دوو سەرچاوەکان، کە ئاوەکەیان لەبەر دەڕوا، لە دوای باسی چڵ و لق و پۆپی درەختەکان، لەبەر ئەوەیە کە دیمەنی درەختەکان بەبێ باسکردنی دیمەنی ئاوو کانیی و سەرچاوە، زیان دەگەیەنێ بە جوانێتیی و ڕەونەقی دیمەنی دارو درەختەکان.

٦)- ﴿فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ﴾، ئنجا ئایا ئەی کۆمەڵی جندو مرۆڤ! نکووڵیی لە کام لە چاکەکانی پەروەردگارتان دەکەن؟

سیفەتی سێیەمیان:

٧)- ﴿فِيهِمَا مِن كُلِّ فَٰكِهَةٍ زَوْجَانِ﴾، لە هەر میوەیەک جووتی تێدا هەن، (**زَوْجَان**) وەک چۆن بە مانای دوو شتی وەک یەک دێ، ژن و مێرد، بە هەر کامێکیان دەگوترێ: (**زَوْج**)، هەروەها بە جووتە پێڵاوێک و هەرشتێک دووان بێ، بە هەر کامێکیان دەگوترێ: (**زَوْج**)، بە هەمان شێوە (**زَوْج**) بە مانای جۆر (صنف)یش دێ، واتە: لە هەر میوەیەک

www.alibapir.com


دوو جۆری تێدا هەن، هەموو جۆرە میوەیەکی تێدایە، ئنجا لە هەر میوەیەک دوو جۆر هەن، هەندێک لە زانایان گوتوویانە: مەبەست لە دووەکە، یەکێکیان ناسراوەو پێی ئاشنان و لە دنیادا بینیویانە، یان شێوەی ئەوەیان بینیوە، بەڵام یەکێکیان پێی ئاشنا نین و پێی نامۆن و، لە دنیادا خۆی یان شێوەکەییان نەدیوە. هەروەها زانایان زۆر قسەی دیکەشیان کردوون، بەڵام هیچیان وانین لێی دڵنیابم کە مەبەستەکە ئەوەیە، گرنگ ئەوەیە خوا ﷻ دەفەرموێ: لە هەر میوەیەک دوو جۆر یان دوو شێوە هەن.

٨)- ﴿فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ﴾، ئنجا ئایا ئەی کۆمەڵی جندو مرۆڤ! نکووڵیی لە کام لە چاکەکانی پەروەردگارتان دەکەن؟

## سیفەتی چوارەمی ئەو جووتە باخەی یەکەم:

٩)- ﴿مُتَّكِـِٔينَ عَلَىٰ فُرُشٍۭ بَطَآئِنُهَا مِنْ إِسْتَبْرَقٍ﴾، پاڵیانداوەتەوە لەسەر چەند ڕایەخێک بەرگ و پۆشاکی بنەوەیان دیوی ژوورێیان لە ئاوریشمی ئەستوورە، (**بِطَانَة**) واتە: دیوی بنەوەی پۆشاک، (**ظِهَارَة**)ش دیوی دەرێیە، (**فُرُش**)یش کۆی (**فِرَاش**): (**مَا يُبْسَطُ للنَّوْمِ والإِضْطِجاعِ**)، هەر شتێکە کە ڕادەخرێ بۆ لەسەر خەوتن و ڕاکشان و پشوودان، هەڵبەتە بەهەشت خەوی لێ نیە، وەک پێغەمبەر فەرموویەتی: {**النَوْمُ أَخُو المَوْت**} (**أخرجه البيهقي في شعب الإيمان: ٤٧٤٥، والديلمي: ٦٩٠٧**) واتە: خەو برای مردنە، بەهەشت خەوی لێ نیە، بەڵام مەبەست پێی پشوودان و ئیسڕاحەت و پاڵدانەوەو شاندادانە، (**مُتَّكِئِيْن: الإتِّكَاءُ: افْتِعَالٌ مِنَ الوَكْءِ وهو الإعْتِمادُ، ومِرْفَقِهِ إلى الأرْضِ وجَنْبِهِ إلى الأرْضِ، وهي هَيْئَةٌ بَيْنَ الإضْطِجاعِ عَلى الجَنْبِ والقُعُودِ**)، وشەی (**إتِّكَاء**)، لەسەر کێشی (**افْتِعالٌ**)ە، لە (**وَكْء**)ەوە هاتوە، (**وَكْء**) بریتیە لە پاڵوێدان، ئەویش ئەوەیە شانی یاخود ئانیشکی لەسەر زەوی دا بنێ، هەروەها تەنیشتیشی لە زەوی نیزیک بێ، ئەمەش حاڵەتێکە لە نێوان ڕاکشان و دانیشتن دا، کوردەواریی (شاندادان)ی پێ دەڵێن و پاڵدانەوەشی پێ دەڵێن، بەڵام ئەگەر ئینسان بخەوێ لەسەر تەنیشت یان لەسەر پشت دەڵێن: ڕاکشاوە، ئەو جۆرە دانیشتنەش، دانیشتنی کەسانی خۆشگوزەران و خاوەن پشوویە.

www.alibapir.com


(الإسْتَبْرَقُ: صِنْفٌ رَفِيعٌ مِنَ الدِّيبَاجِ الغَلِيظِ، والدِّيباجُ: نَسِيجٌ غَلِيظٌ مِن الحَرِيرِ، والإسْتَبْرَقِ يُنْسَجُ بِخُيُوطِ الذَّهَبِ، قَالَ: فَخْرَ الدِّيْن الرَّازِي: وهو مُعَرَّبٌ عَنِ الفَارِسِيَّةِ: تَبْرَك: ثَخِينٍ، أو إسْتَبْرَك) واته: (إسْتَبْرَقُ) جۆرێکی زۆر بەرزە لە ئاوریشمی ئەستوور، (دیباج)یش چنراوێکە لە ئاوریشمێ کە دەزووەکەی ئەستوور بێ (إسْتَبْرَقُ) عادەت وایە لە داوی زێڕ دەچنرێ، (فخرالدين الرازي) گوتوویەتی: ئەمە وشەیەکە کراوەتە عەرەبیی و لە ئەسڵدا فارسییە (تبرك) و (إسْتَبْرَك) یانی: ئەستوور.

### سیفەتی پێنجەمیان:

**١٠)-** ﴿وَجَنَى ٱلْجَنَّتَيْنِ دَانٍ﴾، میوەی دوو باخەکانیش نیزیکە، (**جَنَى: مَا يُجْنَى ويُقْطَفُ مِنَ الثَّمَرِ**)، (**جَنى**) هەرشتێکە کە دەچنرێ و لێ دەکرێتەوە لە میوە، (**دَان: قَرِيْب**)، (**دَنَى، يَدْنُوا، فَهُوَ دَان**) واتە: نیزیک، یانی: پێویست بە زەحمەت ناکات، تاکو میوەکەی بچنن.

**١١)-** ﴿فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ﴾، ئنجا ئایا ئەی کۆمەڵی جندو مرۆڤ! نکووڵیی لە کام لە چاکەکانی پەروەردگارتان دەکەن؟

ئنجا دێتە سەر سیفەتی شەشەم و کۆتایی، کە باسی ئەو ئافرەتانەیە لەو باخانەی دەوری ئەو کۆشکانەدان و، دەفەرموێ:

**١٢)-** ﴿فِيهِنَّ قَـٰصِرَٰتُ ٱلطَّرْفِ﴾، لە نێو ئەو کۆشکانەدا، یاخود لە نێو ئەو خانووانەدا، کە لە دوو باخەکەدا هەن، چونکە باخەکان هەر باخی ڕووت نین، بەڵکو کۆشکیان تێدان، خانووبەرەیان تێدان، جێگەو ڕێگەیان تێدان، ئەمەش بە سیاق و سەلیقە دەزانرێ، هەرچەندە خوا ﷻ لێرە باسی کۆشکەکانی نەکردوە، بەڵام لە شوێنی دیکە باسیکردوون، بۆیە هەندێک لە زانایان گوتوویانە: ئەوە ئیشکالە کە خوا ﷻ باسی دوو باخان دەکات، دوایی دەفەرموێ: (**فِيهِنَّ**) کە بۆ کۆی مێینە (**مُؤَنَّث**)یە؟ وەڵامەکەشی ئەوەیە کە خوا ﷻ باسی دوو باخانی کردوە، بەڵام ئەو دوو باخە پڕن لە کۆشک و تەلارو خانووبەرەو شوێنی ئیسڕاحەت، ئنجا خوا دەفەرموێ: لەو کۆشک

www.alibapir.com


و تەلارانەدا، کە لەو دوو باخانەدا هەن، لەو خانووبەرانەدا کە شوێنی پشوودانن: ﴿فِيهِنَّ قَٰصِرَٰتُ ٱلطَّرْفِ﴾ ئافرەتانێکی نیگا کورتکەرەوە هەن، **(قَاصِرات)** سیفەتی وەسفکراوێکی قرتێنراوە، واتە: (**نِسَاءٌ قاصِراتُ الطَّرْفِ**)، یاخود (**حُورٌ قاصِراتُ الطَّرْفِ**)، ئافرەتانێکی کورتکەرەوەی نیگا، هەن.

(**طَرْف**) بە مانای چاو ترووکاندن دێ و، بە مانای نیگای چاو دێ.

(**قَاصِرة**) یانی: کورتکەرەوەو (**قاصرات**) کۆیەکەیەتی.

ئنجا ئەمە سێ واتای هەن:

أ- نیگاو چاوی خۆیان کورت کردۆتەوە، لەسەر مێردەکانی خۆیان،

ب- یاخود: (**قاصِراتُ الطَّرْفِ**)، یانی: وا دەکەن هەر کەسێک تەماشایان بکات، چاوی لەسەریان کورت بکاتەوەو چاو لانەدات، ئەوەندە پێیان سەرسام دەبێ.

ج- واتایەکی دیکەی ئەوەیە: لە چاویان دا جۆرێک لە نازو نەرمیی و ناسکیی هەیە، بە جۆرێک وابزانرێ کە چاویان باش هەڵنایەت.

١٣)- ﴿لَمْ يَطْمِثْهُنَّ إِنسٌ قَبْلَهُمْ وَلَا جَآنٌّ﴾ لە پێش وان دا بەلایاندا نەچووەو لەگەڵیان جووت نەبووە، هیچ مرۆڤێک و هیچ جندێک، یانی: نە مرۆڤ لەگەڵیان دا جووت بووە نە جند، (**الطَّمْثُ: مَسِيسُ الأُنْثَى البِكْرِ**)، (**طَمْث**): بریتیە لە جووتبوون لەگەڵ ئافرەتێکی کچ دا، هەروەها کچێنیی لابردنی کچ، پێی دەگوترێ: (**طَمْث**)، بەڵام لێرەدا مەبەست ئەوەیە: نە لەگەڵ ئافرەتە حۆرییەکاندا کە مرۆڤن، هیچ پیاوێک جووت بووە، نە لەگەڵ ئافرەتە حۆرییە جندەکاندا، هیچ جندێکی پیاو جووت بووە. هەندێک لە زانایان باسی ئەوەیان کردوە، کە ئایا دەگونجێ پیاوی جند بچێتە لای ئافرەتی مرۆڤ؟ یاخود پیاوی مرۆڤ بچێتە لای ئافرەتی جند؟ زۆربەی زانایان ئەوەیان ڕەتکردۆتەوە، بۆچوونێکی وا لە (ئیمام مالیک)ەوە هاتوە، بەڵام گوتوویەتی: ئەو ڕایە خراپەکاریی لێ پەیدادەبێ! منیش پێم وایە مەگەر وەک حاڵەتێکی خەیاڵ، ئەگەرنا

www.alibapir.com


هەرگیز لە حاڵەتی بەرجەستە بوون دا، ئەوە نابێ و زۆریشم لەوبارەوە کۆڵیوەتەوە، هەندێک لە زانایانیش گوتوویانە: ئەگەر کەسێک لە کاتی جووتبوون لەگەڵ خێزانیدا **(بسم الله)** نەکات، ناوی خوا نەهێنێ، جندی نێر خۆی لە ئەندامی زاوزێی پیاوەکە دەئاڵێنێ!! بەڵام ئەوەش هیچ بەڵگەیەکی وای لەسەر نیەو، ڕایەکە لە هەندێک لە زانایانەوە هاتوە.

کەواتە: کە خوا دەفەرموێ: لە پێش واندا نە مرۆڤ لەگەڵیاندا جووت بووەو، نە جند، واتە: لەگەڵ ئافرەتە مرۆڤ حۆرییەکاندا، مرۆڤ جووت نەبووەو، لەگەڵ ئافرەتە حۆرییە جندەکانیشدا پیاوی جند جووت نەبووە.

١٤)- ﴿فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ﴾، ئنجا ئایا ئەی کۆمەڵی جندو مرۆڤ! نکووڵیی لە کام لە چاکەکانی پەروەردگارتان دەکەن؟

١٥)- ﴿كَأَنَّهُنَّ ٱلْيَاقُوتُ وَٱلْمَرْجَانُ﴾، ئەو ئافرەتانە [هێندە ڕوون و سوورو سپیی و جوانن]، دەڵێی یاقووت و مەرجانن، پێشتر باسمانکرد (یاقووت) جۆرە بەردێکە زۆر سوورو جوانە، بەردێکە لەسەر زەوی هەیە، وەک چۆن زێڕو زیوو ئەڵماس، کانزان و لەسەر زەوی هەن، بە هەمان شێوە یاقووتیش هەر لە بەردەکانی سەر زەوی پەیدادەکرێ، بەڵام مەرجان جۆرە بەردێکە لە ژیاندارێک پەیدا دەبێ کە لە دەریادا دروستی دەکات، واتە: لە ڕووی سەفاو سافیی و ڕوونییەوە، وەک یاقووتن و، لە ڕووی سوورییەوەش، وەک مەرجانن، یان بە پێچەوانەوە: لە ڕووی سوورییەوە وەک یاقووتن و، لە ڕووی سافییەوە، وەک مەرجانن، چونکە هەر کام لە یاقووت و مەرجانیش، ڕەنگی سوورو جوانیان هەیەو، سافیی و ڕوونییشیان هەیە.

١٦)- ﴿فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ﴾، ئنجا ئایا ئەی کۆمەڵی جندو مرۆڤ! نکووڵیی لە کام لە چاکەکانی پەروەردگارتان دەکەن؟.

١٧)- ﴿هَلْ جَزَآءُ ٱلْإِحْسَٰنِ إِلَّا ٱلْإِحْسَٰنُ﴾، ئایا پاداشتی چاکەکاریی هەر چاکەدانەوە نیە؟ واتە: **(الإِحْسَانُ فِي العَمَل، جَزَاؤُهُ الإِحْسَانِ فِي الثَّوَاب)**، واتە: چاک ئەنجامدانی کار

(چاك ئەنجامدانی بەندایەتیی بۆ خوا) پاداشتەكەی بریتیە لە چاك پاداشت درانەوەی لەلایەن خوای بەخشەرو كارزانەوە.

كـە خـوای پـەروەردگار دەفەرمـوێ: ﴿ فِيهِنَّ ﴾ دوای ئـەوەی بـاسی (**جنّتـان**)ی كـردوە، زانایـان بـە پێنـج جـۆر مانایـان كـردوە:

١- رایەك دەڵێ: (**مثنّی**) لە زمانی عەرەبییدا دەگونجێ بە (كۆ)ش بگوترێ، وەك لە سوورەتی (**التحريم**)دا، دەفەرموێ: ﴿إِن تَتُوبَآ إِلَى ٱللَّهِ فَقَدۡ صَغَتۡ قُلُوبُكُمَاۖ وَإِن تَظَٰهَرَا عَلَيۡهِ فَإِنَّ ٱللَّهَ هُوَ مَوۡلَىٰهُ وَجِبۡرِيلُ وَصَٰلِحُ ٱلۡمُؤۡمِنِينَۖ وَٱلۡمَلَٰٓئِكَةُ بَعۡدَ ذَٰلِكَ ظَهِيرٌ ٤﴾ **التحريم**.

٢)- رایەكی دیكە دەڵێ: واتە: لەو نازو نیعمەت و شتانەدا كە باسكران، لە نێو واندا ئافرەتانێك هەن بەو شێوەیەن، بۆیە راناوی كۆی بەكارهێناوە.

٣)- رایەكی دیكە دەڵێ : لە نێو ئەو كۆشك و تەلارانەدا، كە لەو دوو باخانەدا هەن، ئافرەتانێكی وا هەن.

٤)- رایەكی دیكە دەڵێ: لەو سەر جێگایانە كە راخراون بۆ پشوودان، مادام باسی جێگایان دەكرێ، بە زۆریی كە باسی جێگاو راكشان و پاڵكەوتن دەكرێ، ئافرەتیش بە مێشك دا دێ.

٥)- رایەكی دیكە دەڵێ: لەو ژوورانەدا كە لە نێو ئەو دوو باخانەدا هەن، ئافرەتانێكی بەو شێوەیە هەن، كە باسكران.



www.alibapir.com


## مەسەلەی دووەم:

**وەسفی جووتە باخی دووەم، بە شەش سیفەتی گرنگ، بەڵام نزمتر لە هی جووتە باخی یەکەم:**

**١)**- دوو باخی سەوزی تۆخی ڕەشباو.

**٢)**- دوو سەرچاوەی فیچقەکەرو بە تەوژم هاتووەدەرو دەرقوڵیو.

**٣)**- میوەو دارخورماو هەناری زۆر.

**٤)**- ئافرەتانی لە ڕووی مەعنەوییەوە زۆر باش و پەسندو، لە ڕووی جەستەییەوە ئەوپەڕی جوان.

**٥)**- چاوگەش و گەورەو خزمەتکراوو سەقامگیر لە خێوەتاندا، کە پێش ئەوان مرۆڤ و جند کچێنییان لانەبردوون و، دەستیان لێ نەداون.

**٦)**- پاڵدانەوە لەسەر ڕایەخی سەوزی هەرە نایاب.

خوا دەفەرموێ: ﴿ وَمِن دُونِهِمَا جَنَّتَانِ ﴿٦٢﴾ فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ ﴿٦٣﴾ مُدْهَآمَّتَانِ ﴿٦٤﴾ فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ ﴿٦٥﴾ فِيهِمَا عَيْنَانِ نَضَّاخَتَانِ ﴿٦٦﴾ فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ ﴿٦٧﴾ فِيهِمَا فَٰكِهَةٌ وَنَخْلٌ وَرُمَّانٌ ﴿٦٨﴾ فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ ﴿٦٩﴾ فِيهِنَّ خَيْرَٰتٌ حِسَانٌ ﴿٧٠﴾ فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ ﴿٧١﴾ حُورٌ مَّقْصُورَٰتٌ فِى ٱلْخِيَامِ ﴿٧٢﴾ فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ ﴿٧٣﴾ لَمْ يَطْمِثْهُنَّ إِنسٌ قَبْلَهُمْ وَلَا جَآنٌّ ﴿٧٤﴾ فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ ﴿٧٥﴾ مُتَّكِـِٔينَ عَلَىٰ رَفْرَفٍ خُضْرٍ وَعَبْقَرِىٍّ حِسَانٍ ﴿٧٦﴾ فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ ﴿٧٧﴾ تَبَٰرَكَ ٱسْمُ رَبِّكَ ذِى ٱلْجَلَٰلِ وَٱلْإِكْرَامِ ﴿٧٨﴾ ﴾.

## شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە حەڤدە بڕگەدا:

**١)**- ﴿ وَمِن دُونِهِمَا جَنَّتَانِ ﴾، لە خوار ئەو دوو (باخ)ەوە، دوو باخی دیکە هەن، هەرچەندە (مِنْ دُونِهِمَا) دەگونجێ مەبەست پێی لە ڕووی جوگرافییەوە بێ، واتە: شوێنی دوو

www.alibapir.com



باخەکەی دیکە بەرزترە، هەروەها دەشگونجێ (مِنْ دُونِهِمَا) مەبەست پێی ئەوەبێ کە: جگە لەو دوو باخە، دوو باخی دیکەش هەن، هەر بۆ ئەو بەهەشتییانەی باسکران.

بەڵام واپێدەچێ مەبەست پێی ئەوە بێ کە لە ڕووی پێگەوە، لە خوار ئەو دوو باخەوە، کە بۆ بەهەشتییانێک دانراون، کە پلەو پایەیان بەرزتر بووەو بە (**مُقَرَّبِيْن**) و (**السَّابِقُون**) وەسفکراون لە قورئاندا، دوو باخی دیکەش هەن، بۆ ئەوانەی بە (**أَصْحَابُ اليَمِيْن**)، هاوەڵانی لای ڕاست وەسفکراون و، لە پلەو پێگەو پایەدا، لە خوار ئەو دوو باخەی پێشووەوەن، (**أي: أَدْنَى مِنْهُمَا مِنْ حَيْثُ الدَّرَجَة، فَهَاتَيْنِ أَنْزَل دَرَجَة وَشَرَفاً**)، لە ڕووی پلەوە لە خوارەوەن، ئنجا ئەو دووانە ئەگەر تەماشایان بکەین، سیفەتەکانیان لە خوار سیفەتەکانی ئەو دوو باخەی پێشەوەن.

٢)- ﴿فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ﴾، ئەی کۆمەڵی جندو مرۆڤ! نکووڵیی لە کام لە چاکەکانی پەروەردگارتان دەکەن؟

### سیفەتی یەکەمیان:

٣)- ﴿مُدْهَآمَّتَانِ﴾، ئەو دوو باخە زۆر سەوزی تۆخن، مەیلەو ڕەش دەنوێنن، (**إِدْهِمَام**): لە (**دُهْمَة**)ەوە هاتوە، (**دُهْمَة**): بریتیە لە زۆر سەوزو کەسک بوون، بەشێوەیەک کە مەیلەو ڕەش بنوێنێ، هەڵبەتە باخ و ڕووەکێک زۆر سەوزو جوان بێ، مانای وایە زۆر ساغ و تەڕو پاراوە.

٤)- ﴿فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ﴾، ئەی کۆمەڵی جندو مرۆڤ! نکووڵیی لە کام لە چاکەکانی پەروەردگارتان دەکەن؟ کە هیچ کامیان شایانی ئەوەنین نکووڵییان لێ بکەن و، دانیان پێدانەهێنن.

### سیفەتی دووەم:

٥)- ﴿فِيهِمَا عَيْنَانِ نَضَّاخَتَانِ﴾، دوو کانیی و سەرچاوەی بە فیچقە دەرقوڵیویان تێدان، (**نَضَّاخَتَان: فَوَّارَتَانِ، مُتَدَفِّقَتَان**) واتە: دوو کانیی و سەرچاوەی دەرقوڵیوو بە

www.alibapir.com


فیچقەو بە تەوژم هاتووەدەر، ئاوەکەیان بەهێز دێتە دەرێ و دەردەقوڵێ، هەروەها هەندێکیش گوتوویانە: (نَضَّاخَتَان: تَضْمَخَان الطِّيْبَ) کە دێنە دەرێ بۆنی خۆشیشیان لەگەڵدا بڵاودەبێتەوە.

٦)- ﴿فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ﴾، ئەی کۆمەڵی جندو مرۆڤ! نکووڵیی لە کام لە چاکەکانی پەروەردگارتان دەکەن؟

**سیفەتی سێیەم:**

٧)- ﴿فِيهِمَا فَٰكِهَةٌ وَنَخۡلٌ وَرُمَّانٌ﴾، لە نێو ئەو دوو باخانەدا، میوە هەیە (هەموو جۆرەکانی میوە) و دارخورماو، هەنار هەیە، هەناریش دەگونجێ مەبەست درەختەکەی بێ و دەشگونجێ مەبەست پێی میوەکەی بێ، کە بێگومان درەختەکەی میوەشی پێوەیە، کەواتە: کە دەفەرموێ: ﴿فِيهِمَا فَٰكِهَةٌ وَنَخۡلٌ وَرُمَّانٌ﴾، مەبەست لە دارخورماو هەنار میوەکەیانە.

٨)- ﴿فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ﴾، ئەی کۆمەڵی جندو مرۆڤ! نکووڵیی لە کام لە چاکەکانی پەروەردگارتان دەکەن؟

**سیفەتی چوارەم:**

٩)- ﴿فِيهِنَّ خَيۡرَٰتٌ حِسَانٌ﴾، تێیاندا هەن، ئافرەتانێکی زۆر چاک و پەسندو جوان، واتە: لەو دوو باخەدا، هەرچەندە دووانن، بەڵام خوا بسم الله الرحمن الرحيم ڕاناوی کۆی بۆ بەکارهێناون یاخود: لە کۆشکەکانی کە لەو دوو باخانەدا هەن، یاخود: ئەو نازو نیعمەت و کانیی و سەرچاوەو باخانە تێیاندا هەن: ﴿خَيۡرَٰتٌ حِسَانٌ﴾، (خَيْرَات) کۆی (خَيْرَة)یەو (خَيْرَة)ش ئەسڵەکەی (خَيِّرَة)، لەو دوو باخانەدا، ئافرەتانێک هەن، لە ڕووی مەعنەوییەوە زۆر چاکن و ئاکارو بەرزو پەسندن و، لە ڕووی جەستەییشەوە زۆر جوانن، چونکە (حِسَان) کۆی (حَسْنَاء)ە، واتە: ئەوپەڕی جوان، (خَيْرَات)یش کۆی (خَيْرَة)، واتە: ئەوپەڕی چاک، واتە: ئەو ئافرەتانە هەم لە ڕووی مەعنەوییەوە زۆر نایابن، هەم لە ڕووی جەستەییەوەش زۆر جوانن، چونکە ئافرەتی وا هەیە، لە ڕووی جەستەییەوە زۆر جوانە، بەڵام لە ڕووی

www.alibapir.com


مەعنەوییەوە فلسێکی قەڵب ناهێنێ و هیچی لە باراندا نیە، یان هەیە لە ڕووی مەعنەوییەوە سیفەتی بەرزو جوانی هەن، بەڵام لە ڕووی جەستەو ڕواڵەتەوە، بەو شێوەیە نیە، بەڵام ئەو ئافرەتانەی خوا لە بەهەشت دا دەیانڕەخسێنێ، هەم لە ڕووی مەعنەوییەوەو لە ڕووی ئاکارو ڕەوشت و ڕەفتارو دیوی پەنهانەوە، لەوپەڕی چاکییدان، هەم لە ڕووی جەستەییشەوە لەوپەڕی جوانییدان.

**١٠)-** ﴿فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ﴾، ئەی کۆمەڵی جندو مرۆڤ! نکووڵیی لە کام لە چاکەکانی پەروەردگارتان دەکەن؟

ئنجا خوا ﷻ هەر لە درێژی سیفەتی چوارەمیان دا دەفەرموێ:

**١١)-** ﴿حُورٌ مَّقْصُورَٰتٌ فِى ٱلْخِيَامِ﴾، سپیی و سۆڵن ولە چادران دا کورت هەڵێنراون. **(حُور)** کۆی **(حَوْرَاء)**ە، پێشتر باسمانکرد بە هەرسێ واتایەکەی:

**أ-** مرۆڤ کە تەماشای دەکات سەری سوڕ دەمێنێ و سەراسیمە دەبێ.

**ب-** زۆر سپیی و جوانن.

**ج-** چاویان زۆر گەورەو جوانن و ڕەشکێنەکەی زۆر ڕەشە، سپێنەکەی زۆر سپییە، ﴿مَّقْصُورَٰتٌ فِى ٱلْخِيَامِ﴾، لە نێو خێوەتاندا کورت هەڵێنراون، واتە: خزمەتکراون لە نێو جێگاو ڕێیەکانی خۆیانداو، پێویستییان بە چوونەدەر نیە، واتە: لەوپەڕی خۆشگوزەرانیی دان.

**١٢)-** ﴿فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ﴾، ئەی کۆمەڵی جندو مرۆڤ! نکووڵیی لە کام لە چاکەکانی پەروەردگارتان دەکەن؟

### سیفەتی پێنجەم:

**١٣)-** ﴿لَمْ يَطْمِثْهُنَّ إِنسٌ قَبْلَهُمْ وَلَا جَآنٌّ﴾، لە پێش ئەواندا نە مرۆڤ دەستی گەیاندوونێ و لەگەڵیان جووت بوونەو، نە جندیش.

www.alibapir.com


**١٤)- ﴿ فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ ﴾**، ئەی کۆمەڵی جندو مرۆڤ! نکووڵیی لە کام لە چاکەکانی پەروەردگارتان دەکەن؟

سیفەتی شەشەم و کۆتایی:

**١٥)- ﴿ مُتَّكِـِٔينَ عَلَىٰ رَفۡرَفٍ خُضۡرٖ وَعَبۡقَرِيٍّ حِسَانٖ ﴾**، پاڵیانداوەتەوەو شانیان داداوە، لەسەر تەخت و ڕایەخی سەوزی یەکجار نایاب و، ئەوپەڕی جوان و ڕەونەقدار، **(رَفْرَفُ)** ناوی کۆیە **(اسْمُ جَمْعُ رَفْرَفَةٍ، وهو ما يُبْسَطُ عَلَى الفِرَاشِ لِيُنَامَ عَلَيْهِ)**، **(رَفْرَف)**: ئەوەیە کە لە سەر ڕایەخ ڕادەخرێ لە پۆشاک و نوێن، بۆ ئەوەی مرۆڤ لەسەری بخەوێ و ئیسڕاحەت بکات، **(حِسَان)**یش کۆی **(حَسْنَاء)**ە، کە سیفەتی **(رَفْرَف)**ە، واتە: ئەوپەڕی جوان، چونکە **(رَفْرَف)** ناوی کۆیە، **(حِسَان)**یش، هەر کۆیە، واتە: ئەو ڕایەخ و فەڕش و تەختانە، لەوپەڕی جوانیی دان، کە دەفەرموێ: **(عَبْقَرِي)** ئەمە سیفەتە بۆ هەر شتێکی زۆر دەگمەن و نایاب، **(عَبْقَر)** لەلای عەرەبەکان باو بووە کە وڵاتی جندە و، شیوێکە جندەکانی تێدا هەن و، هەر شتێک کە زۆر سەرسوڕهێنەرو نایاب بوو بێ، پاڵیانداوەتە لای ئەو، تەنانەت مرۆڤیش بە مرۆڤیشیان گوتوە: فلانکەس **(عَبْقَرِي)**یە، واتە: زۆر بلیمەتە، وەک لەو شوێنەوە هاتبێ، واتە: لەسەرووی ئاستی بەشەرەوەیە، تەنانەت پێغەمبەریش ﷺ وشەی **(عَبْقَرِي)** بۆ عومەر رضي الله عنه بەکارهێناوە کە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ:

{خەونم بینی ئاوم لە بیرێک هەڵدەکێشا، دوایی دۆڵچەکەم دا بە ئەبوو بەکر، ئەویش چەند دۆڵچەیەکی ڕاکێشا، دوایی ئەویش دایە دەست عومەر، عومەریش دۆڵچەکەی وەرگرت، تاکو ئاوەکە لە بیرەکە هەڵهێنجێ، ئیدی هیچ عەبقەرییەکم نەبینی، وەک وی ئەو ئاوە چاک لە بیرەکەدا دەربێنێ}[1]، کە

---

(١) {حديث عَبْدِ اللهِ بْنِ عُمَرَ رضي الله عنهما، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَالَ: أُرِيتُ فِي الْمَنَامِ أَنِّي أَنْزِعُ بِدَلْوِ بَكْرَةٍ عَلَى قَلِيبٍ، فَجَاءَ أَبُو بَكْرٍ، فَنَزَعَ ذَنُوبًا أَوْ ذَنُوبَيْنِ نَزْعًا ضَعِيفًا، واللهُ يَغْفِرُ لَهُ، ثُمَّ جَاءَ عُمَرُ بْنُ الخَطَّابِ فَاسْتَحَالَتْ غَرْبًا، فَلَمْ أَرَ عَبْقَرِيًّا يَفْرِي فَرِيَّهُ، حَتَّى رَوِيَ النَّاسُ وَضَرَبُوا بِعَطَنٍ} أخرجه البخاري: ٣٤٧٩، والترمذي: ٢٢٨٩، وأحمد: ٥٨١٧، والنسائي في الكبرى: ٧٦٣٦.

www.alibapir.com


ئاماژەیـە بە حکومڕانیی عومەڕ ﵁ کە دە سـاڵ و شـەش مانـگ، دەوامی کردوەو، هـی ئەبـوو بەکریـش ﵁ لەبـەر ئـەوەی ماوەکەی کەم بـووە، ئەگەرنا بـە دڵنیایی پێگـەو پایـەی ئەبـوو بەکـر ﵁ لەگـەڵ هی عومـەر، وەک یەک نیـن و ئەبوو بەکر پێگـەو پایەکـەی بەرزتـر بـووە.

**١٦)-** ﴿فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ﴾، ئەی کۆمەڵی جندو مرۆڤ! نکووڵیی لە کام لە چاکەکانی پەروەردگارتان دەکەن؟

**١٧)-** ﴿تَبَٰرَكَ ٱسۡمُ رَبِّكَ ذِي ٱلۡجَلَٰلِ وَٱلۡإِكۡرَامِ﴾ ناوی پەروەردگاری خاوەن شکۆو ڕێز گرتنت، مەزن و بەرزە. (تَبَارَكَ): (تَفَاعُلٌ مِنَ البَرَكَة)، (تَبَارَكَ) واتە: (تَعَاظَمَ وَتَعَالَى وَكَثُرَ خَيْرُهُ)، خوا زۆر مەزنەو، زۆر بەرزەو، زۆر خاوەن پیزو بەرەکەتە، ئنجا ﴿ٱسۡمُ رَبِّكَ﴾، واتە: ناوی پەروەردگارت، لە شوێنی دیکە وشەی (تَبَارَكَ) پاڵدراوەتە لای خوای: ﴿تَبَٰرَكَ ٱلَّذِي بِيَدِهِ ٱلۡمُلۡكُ وَهُوَ عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٖ قَدِيرٌ ١﴾ الملك، ﴿تَبَارَكَ ٱلَّذِي نَزَّلَ ٱلۡفُرۡقَانَ عَلَىٰ عَبۡدِهِۦ لِيَكُونَ لِلۡعَٰلَمِينَ نَذِيرًا ١﴾ الفرقان، بەڵام لێرەدا (تَبَارَكَ) پاڵدراوەتە لای ناوی پەروەردگار، واتە: ناوی پەروەردگارت یەکجار بەرزو مەزن و خاوەن پێزە، ﴿ذِي ٱلۡجَلَٰلِ وَٱلۡإِكۡرَامِ﴾، ئەو پەروەردگارە خاوەنی جەلال و ئیکڕامە.

(**الجَـلَالُ: العَظَمَـةُ وَالكِبْرِيَـاء**)، (**جَلَال**): بـە مانـای مەزنیـی و، گەورەیـی و، بەرزیـی و، دەستڕۆیشـتوویی دێ.

(**والإكْـرامُ: التفضُّـل وَالإنعـام وَالتَّكْرِيْـم**) (**إكـرام**) بـە مانای بەخشـین و چاکـە لەگەڵدا کردن و ڕێزلێگرتن دێ، واتە: سیفەتی جەلالی خوا ﷻ هەموو ئەو سیفەتانەی دەگرێتـەوە کـە پەیوەندییـان هەیـە، بـە بەرزیـی و دەسـەڵات و، گەورەیـی و، مەزنیـی و، بـێ نیازیـی خـواوە، بـەڵام (**إكْـرَام**) هەمـوو ئـەو سـیفەتانەی خـوا دەگرێتـەوە، کـە پەیوەندییـان هەیـە بـە چاکەکاریـی و بەزەیـی و بەخشـش و ڕێزلێگرتنـی خـواوە، بۆیـە زانایـان گوتوویانـە: سـیفەتەکانی خـوا دوو جـۆرن:

www.alibapir.com


**أ-** سیفەتەکانی شکۆداریی **(صفات الجلال)**.

**ب-** سیفەتەکانی جوانیی **(صفات الجمال)**.

هەردووك جۆرەکەشیان سیفەتەکانی تەواو یی **(صفات الکمال)**ن و، لەوپەڕی تەواویی دان.

## کورتە باسێک: سێ بابەتی گرنگ

**بابەتی یەکەم:** خوا ﷻ لەم سوورەتەدا، سی و یەک (٣١) جار ڕستەی: ﴿ فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ ﴾ی، دووبارە کردۆتەوە، واتە: ئەی کۆمەڵی جندو مرۆڤ! نکووڵیی لە کام لە چاکەکانی پەروەردگارتان دەکەن؟ ئەو سی و یەک جارەش بە سێ شێوە هاتوون:

**أ)**- شێوەی یەکەمیان هەشت(٨) جار، خوا ﷻ ئەو ڕستەیەی دووبارە کردۆتەوە دوای ئەوەی بیست (٢٠) لە نیعمەتەکانی خۆی خستوونەڕوو، لە دوو توێی سی (٣٠) ئایەت دا.

**ب)**- شێوەی دووەمیان حەوت (٧) جاری دووەم، لە پازدە ئایەتی دووەمدا، ئایەتەکانی: (٣١ - ٤٥)، خوا ﷻ باسی ئەوەی کردوە کە مرۆڤ و جند ناتوانن لە ژێر ڕکێفی خوا دەربچن، خوا ﷻ لە ڕۆژی دواییدا خۆی یەکلایی دەکاتەوە بۆ سزاو پاداشت دانەوەیان، ئەوانیش توانای دەربازبوونیان نابێ و، ناتوانن لە گۆشەو کەنارەکانی ئاسمانەکان و زەوی دەربچن و، نە لە دنیاو نە لە دواڕۆژیشدا، دوایی باسی هاتنی ئاخیر زەمان و قیامەت دەکات، دوایی باسی سزای دۆزەخ دەکات.

**ج)**- شێوەی سێیەمی دووبارە بوونەوەی ئەم ڕستە موبارەکە، شازدە (١٦) جارە، ئەوانەی پێشێ (٨ + ٧ = ١٥)، دەمێننەوە شازدە، چونکە هەمووی سی و یەک (٣١) جار هاتوە، شازدە جاریش لە دوای باسی چوار باخەکان، دوو جووتە باخەکان، هەر جووتێک هەشت جار، کەواتە: هەشت کۆ هەشت دەکاتە شازدە (٨+٨= ١٦) جار، ئنجا ئایا ئەمە چی لێ وەردەگیرێ؟

www.alibapir.com



وەک (الألـوسي) خـاوەنی تەفسـیری (روح المعـاني)[1] گوتوویـەتی و ڕەنگـە زانایـانی دیکـەش ئاماژەیـان پـێ کـرد بـێ، بـەڵام ئـەو وردتـر هێناویـەتی، دەڵـێ: ئەمـە دەتوانین ئـەوەی لـێ هەڵهێنجیـن، کـە هـەر کەسـێک سـوپاسی خـواو سـتایشی بـکات، ئـەو بیسـت چاکـەو نیعمەتـەی خوا ﷻ کە لە دنیادا بەخشیونی بە جندو مرۆڤ، لەبەر چاویان بگرێ، هەروەها ئەو چاکەو نیعمەتانەی دیکەی خوا ﷻ کە لە قیامەتـدا، لـە چـوار باخەکانـدا بەرجەسـتە دەبـن، ئەوانـەش لەبەرچـاو بگـرێ و، بڕوای پێیان بێ، خوا ﷻ لەو دۆزەخە کە حەوت دەرگای هەن، دەیپارێزێ و چەپاڵەی دەدات و، دەیخاتـە نێـو ئـەو بەهەشـتانەوە، کـە هەشـت دەرگایـان هـەن، وەک لـە فەرمایشـتی پێغەمبـەردا ﷺ هاتـوە [**إن في الجنَّـة ثمانيـة أبـواب، فيهـا بـابٌ يُسـمَّى الريَّـان لا يدخلـهُ إلاّ الصائمـون**] البخـاري: ٣٢٥٧، واتـە: هـەر کەسـێک سوپاسـگوزاریی خـوا بـکات، لەسـەر ئـەو چاکانـەی کـە لـە سـی (٣٠) ئایـەتی سـەرەتادا هاتـوون، کـە هەشـت جاران خوا ﷻ لە بەرانبەریانـدا فەرموویەتی: نکووڵیی لە کام لە چاکـەکانی پەروەردگارتـان دەکـەن؟ هـەر کەسـێک بـڕوای بـەو بیسـت نیعمـەت و چاکەیەی خوا بێ، ئنجا بڕوای بە ڕۆژی دوایی بێ، کە خوا ﷻ لە پازدە ئایەتی دوای ئەوانـدا بـاسی دەکات، ئـەوە لـەو دۆزەخـە کـە حـەوت دەرگای هـەن، وەک خـوا دەفەرمـوێ: ﴿لَهَا سَبْعَةُ أَبْوَٰبٍ لِّكُلِّ بَابٍ مِّنْهُمْ جُزْءٌ مَّقْسُومٌ ﴿٤٤﴾﴾ **الحجـر**، لـەو دۆزەخە دەیپارێزێ، بۆیەش خوا ﷻ لە باسی ڕۆژی دوایی و دۆزەخدا، حەوت جـاران فەرموویـەتی: ﴿فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ﴾،

سـەرەنجامیش خـوا دەیخاتـە نێـو ئـەو دوو جووتـە باخـەوەو، بەهەشـیش هەشـت دەرگای هەن، خواش ﷻ لە دوای باسکردنی هەر جووتە بەهەشتێک، هەشت جـاران فەرموویـەتی: ﴿فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ﴾، بەڕاسـتیی ئەمـە هەڵهێنجانێکـی جوانـە.

---

(١) ج١٤، ص١٦٩.

www.alibapir.com



**بابەتی دووەم:** ئایا جند توانای جووتبوونیان هەیە لەگەڵ ئافرەتانی مرۆڤدا؟ زانایان ڕاجیاییان هەیە لەو بارەوە، بۆ وێنە: خاوەنی (**روح المعاني**)[1] دەڵێ:

(**قَالَ مُجَاهِد وَالحَسَن: قَدْ تُجَامِعُ الجِنُّ نِسَاءَ البَشَرِ مَعَ أَزْوَاجِهِنَّ، إذَا لَمْ يَذْكُر الزَّوْجُ اسْمَ الله تَعَالَى**)، واتە: (**مُجَاهِد وَالحَسَن البَصْرِي**) گوتوویانە: دەگونجێ پیاوی جند لەگەڵ ئافرەتانی بە شەردا جووت بن، لە حاڵێکدا مێردی ئەو ئافرەتانە ناوی خوای بەرز ناهێنن لە کاتی جوتبووندا {ئەوانیش بە جۆرێک لە جۆرەکان، لەگەڵ ئەو ئافرەتانەدا جووت بن}.

بەڵام زۆربەی زانایان دەڵێن: نەخێر، جند ئەو توانایەیان نیە، هەروەک مرۆڤیش بەنسبەت ئافرەتانی جندەوە ئەو توانایەی نیە، بەڵێ هەندێک لەوانەی شێت دەبن و تێکدەچن و دوایی چاک دەبنەوە، دەڵێن: من لەگەڵ جندا ڕۆیشتم و ئافرەتێکی جندیان دامێ! بەڵام من وای تێدەگەم ئەوە هەمووی جۆرێکە لە فێڵ لێکردنی جند لە مرۆڤ و هەڵخەڵەتاندنیانەو، جۆرێک لە خستنە دنیای خەیاڵ و ئەندێشەیە، نەک لە دنیای واقیعدا، وابێ، چونکە جند ماددەی دروستبوونیان کە ئاگرەو، شێوەی بوونەکەشیان لە هی ئێمە جیایە و تاکو خۆیان نەجەستێنن و نەیەنە سەر شێوەی جەستە، نابینرێن، بۆیەش زۆربەی زانایان ئەوەیان ڕەتکردۆتەوەو بەندەش پێشتر گوتم هەر ڕام وایە.

ئنجا خوا ﷽ کە دەفەرموێ: ﴿فِيهِنَّ قَٰصِرَٰتُ ٱلطَّرۡفِ لَمۡ يَطۡمِثۡهُنَّ إِنسٌ قَبۡلَهُمۡ وَلَا جَآنٌّ﴾، (**قَالَ حمْزةُ بْنُ حَبِيبٍ: الْجِنُّ فِي الْجَنَّةِ لَهُمْ قَاصِرَاتُ الطَّرْفِ مِنَ الْجِنِّ نَوْعِهِمْ، فَالْمَعْنَى لَم يَطْمِثْ الإنْسِيَّاتِ أَحَدٌ مِنَ الإنْسِ، وَلَا الجِنِّيَات أَحَدٌ مِنَ الجِنِّ، قَبْلَ أَزْوَاجِهِن**).

واتە: جندیش ئافرەتانی حۆرییان هەن، لە بەهەشتدا لە جۆری خۆیان، کەواتە: مانایەکەی ئەوەیە کە نە ئافرەتانی مرۆڤ، هیچ کام لە مرۆڤان لەگەڵیان

---

(١) ج٢٧، ص١٥٩.

www.alibapir.com


دا جووتبـوون، پێـش هاوسـەرەكانیان كـە لـە بەهەشـتێ دا دەیاندرێنـێ و، نـە ئافرەتێ جندیـش هیـچ كام لـە پیـاوانی جنـد لەگەڵیـان دا جووتبـوون، پێـش مێردەكانیـان.

ئنجـا زۆربـەی هـەرە زۆری زانایـان گوتوویانـە: جندیـش وەك مرۆڤان، هـەم دەچنە نێـو ئاگـری دۆزەخ و، هـەم دەچنـە بەهەشـتیش وەك مرۆڤـان، پێشـم وایـە نـەك زۆربە، دەبووایە هەموویان لەسەرئەوە یەكدەنگ بن، چونكە خوا بسم الله الرحمن الرحيم لە چەند ئایـەت لـە قورئانـدا هەڕەشـە دەكات لـە مـرۆڤ و لـە جنـد، كـە ئەگـەر سـەرپێچیی بكـەن و بێبڕوابـن هەڕەشـەیان لـێ دەكات بـە دۆزەخ، كەواتـە: دەبـێ جندیـش وەك مرۆڤـان بچنـە نێـو دۆزەخ، هەروەهـا بـاسی چوونـە بەهەشتیشـیان دەكـرێ، ئەوەتـا لێـرەدا بـە ڕاشـكاویی و لـە شـوێنی دیكـەش بـە ئامـاژە باسـكراوە، كەواتـە: دەبـێ جندەكانیـش ئەگـەر بڕواداربـن و فەرمانبەریـی خـوا بكـەن، پاداشـتیان بـە بەهەشـت بدرێتـەوە، ئنجـا ئەگـەر جنـد دۆزەخیـان نەبووایە بـۆ سـزادان و، بەهەشـتیان نەبووایە بۆ پاداشت دانەوە، خوا بسم الله الرحمن الرحيم هێندە باسی مرۆڤ و جندی نەدەكرد، بە تایبەتی لـەم سـوورەتە موبارەكـەدا كـە سـی و یـەك (٣١) جـار نـاوی هەردووكیـانی هێنـاوەو، لە چەند شوێنی دیكەی قورئانیش دا، خوا بسم الله الرحمن الرحيم باسی هەردووكیان دەكات، باسی جندو مرۆڤ، بۆ وێنە: لە سوورەتی **(الأنعام)**دا، خوا بسم الله الرحمن الرحيم دەفەرموێ: ﴿ يَٰمَعْشَرَ ٱلْجِنِّ وَٱلْإِنسِ أَلَمْ يَأْتِكُمْ رُسُلٌ مِّنكُمْ يَقُصُّونَ عَلَيْكُمْ ءَايَٰتِى وَيُنذِرُونَكُمْ لِقَآءَ يَوْمِكُمْ هَٰذَا ۚ قَالُوا۟ شَهِدْنَا عَلَىٰٓ أَنفُسِنَا ۖ وَغَرَّتْهُمُ ٱلْحَيَوٰةُ ٱلدُّنْيَا وَشَهِدُوا۟ عَلَىٰٓ أَنفُسِهِمْ أَنَّهُمْ كَانُوا۟ كَٰفِرِينَ ﴿١٣٠﴾ ﴾**الأنعام**، واتـە: ئـەی كۆمەڵـی مـرۆڤ و جنـد! ئایـا لـە خۆتـان پێغەمبەرانتـان بـۆ نەهاتـن؟! ئایەتـەكانی منیـان بەسـەردا دەخوێندنـەوەو، لـە دیداریـی ئەمڕۆتـان دەیانترسـاندن! گوتیـان: شـایەدییمان لەسـەر خۆمـان داو، ژیـانی دنیـا فریـوی دان و، شـایەدییان لەسـەر خۆیـان دا كـە ئـەوان بێبڕوابـوون، كەواتـە:

١- پێغەمبەران (عَلَيْهِمُ الصَّلَاةُ وَالسَّلَامُ) بە گشتیی، نەك تەنیا پێغەمبەری خاتەم موحەممەد ﷺ بۆ مرۆڤ و بۆ جند هاتوون.

www.alibapir.com


**٢-** ئایەتەکانیش خوا پێغەمبەرانی (**عَلَيْهِمُ الصَّلاَةُ وَالسَّلاَم**) ئەرکدار کردوون، کە بەسەر مرۆڤ و بەسەر جنددا بیانخوێننەوە.

**٣-** مرۆڤ و جندیش هەموویان دەچن بۆ قیامەت و، تووشی سزاش دەبن و، تووشی پاداشتیش دەبن و، ئەو سێ ڕاستییە بەڕوون و ڕاشکاویی لە ئایەتی ژمارە (١٣٠)ی (**الأنعام**)دا هاتوون.

کەواتە: قسەکەی (**إبن عاشور**) کە پێشتریش بەرپەرچمان دایەوە کە دەڵێ: خوا ﷻ جندی موکەللەف نەکردوون بە شوێنکەوتنی شەریعەت، ئەم ئایەتە زۆر بەڕوونیی ئەوە دەگەیەنێ کە قسەکەی ڕاست نیەو، بەس ئەم ئایەتە قسەکەی لێ هەڵدەوەشێنێتەوە، جگە لە سوورەتی (**الرحمن**)یش، کە سی و یەک (٣١) جار، خوا ﷻ هەرکام لە مرۆڤ و جند وێکڕا دەدوێنێ.

ئەگەر یەکێک بڵێ: ئەدی بۆچی پێغەمبەران (**عَلَيْهِمُ الصَّلاَةُ وَالسَّلاَم**) تەنیا لە مرۆڤان هاتوون؟ وەڵامەکەی ئەوەیە: ئەو پێغەمبەرانە (**عَلَيْهِمُ الصَّلاَةُ وَالسَّلاَم**) کە لە مرۆڤان هاتوون، ئەرکدار کراون، جندیش ئاگادار بکەنەوە، گرنگیش ئەوەیە جند پێغەمبەریان بوو بن، با لە خۆشیان نەبن، بێگومان جندیش لە خوار مرۆڤانەوەن و، وادیارە خوا ﷻ بە شایستەی ئەوەی نەزانیون پێغەمبەران (**عَلَيْهِمُ الصَّلاَةُ وَالسَّلاَم**) لە جندان بن، هەروەک پێغەمبەران (**عَلَيْهِمُ الصَّلاَةُ وَالسَّلاَم**) لە مرۆڤانیش تەنیا لە پیاوان هاتوون: ﴿وَمَآ أَرۡسَلۡنَا مِن قَبۡلِكَ إِلَّا رِجَالٗا نُّوحِيٓ إِلَيۡهِمۡۚ فَسۡـَٔلُوٓاْ أَهۡلَ ٱلذِّكۡرِ إِن كُنتُمۡ لَا تَعۡلَمُونَ ٤٣﴾ **النحل**، لەبەر ئەوەی کۆمەڵێک ئەرک و تایبەتمەندیی پێغەمبەرایەتیی هەن، تەنیا پیاوان لە تواناییاندا هەن و، ئافرەتان لە تواناییاندا نین.

**بابەتی سێیەم:** دوو دەقی سوننەت لە بارەی بەهەشتەوە:

**١-** پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێ: {**جِنانُ الفِرْدَوْسِ أَرْبَعٌ: جَنَّتَانِ مِنْ فِضَّةٍ آنِيَتُهُمَا وَمَا فِيهِمَا، وَجَنَّتَانِ مِنْ ذَهَبٍ، آنِيَتُهُمَا وَمَا فِيهِمَا، وَمَا بَيْنَ الْقَوْمِ وَبَيْنَ أَنْ يَنْظُرُوا إِلَى رَبِّهِمْ إِلاَّ**

www.alibapir.com


**رِدَاءُ الْكِبْرِ عَلَى وَجْهِهِ فِي جَنَّةِ عَدْنٍ}** **(أخرجه البخاري: ٤٥٩٧، ومسلم: ١٦٣، وأحمد:١١٦٩، والنسائي في الكبري: ٧٧٨٥، وابن ماجه: ٥٨٦).**

واتـە: باخـەكانی فیـردەوس چـوارن: دوو باخیـان لـە زیـون، (خشـڵیان) قـاپ و قاچاغیـان و هەرچـی تێیانـدا هەیـە هەمـووی زیـوە، دوو باخیشـیان لـە زێـڕن، قـاپ و قاچاغیـان و هەرچـی تێیـان دا هەیـە (لـە زێـڕە) و، لـە نێـوان ئـەوەدا کـە خەڵکەکـە تەماشـای پەروەردگاریـان بکـەن، جگـە لـە پۆشـاکی گەورەیـی و بەرزیـی و سـەرڕووی (خـوا) لـە بەهەشـتی هەمیشـەیی و هەرمـاودا، هیچـی دیکـە نیـە.

**٢-** لە بارەی ئەوەوە کە خوا فەرموویەتی: ﴿حُورٌ مَّقۡصُورَٰتٌ فِي ٱلۡخِيَامِ ﴿٧٢﴾﴾ **الرحمن،** ئافرەتانی حۆریی کورت هەڵێندراو لە نێو خێوەتاندا، ئەم دەقە دێنین:

پێغەمبـەر ﷺ دەفەرمـوێ: **{الْخَيْمَـةُ دُرَّةٌ طُولُهَا فِي السَّـمَاءِ سِـتُّونَ مِيـلاً، فِي كُلِّ زَاوِيَـةٍ مِنْهَـا أَهْـلٌ لِلْمُؤْمِـنِ لاَ يَرَاهُـمُ الآخَـرُونَ}** **(أخرجـه البخـاري: ٣٠٧١، ومسـلم: ٢٨٣٨، والترمـذي: ٢٥٢٨).**

واتـە: ئـەو خێوەتـە گەوهەرێکـە درێژییەکـەی لـە ئاسـمانێ شەسـت میلـە، لـە هـەر گۆشـەیەکی دا بـۆ بـڕوادار کـەس و کارو هاوسـەر هـەن، کـە ئـەوانی دیکـە، نایانبینـن.

خـوا بـە لوتـف و کەڕەمـی خـۆی یارمەتییـمان بـدات، بـە جۆرێـک ژیـانی دنیامـان بگوزەرێنیـن، شایسـتەی ئـەو نـازو نیعمەتـەی خـوای بەخشـەر بیـن لـە ڕۆژی دواییدا.

سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ، أَشْهَدُ أَنَّ لاَ إِلَهَ إِلاَّ أَنْتَ، أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ.

www.alibapir.com


## دەستپێک

بەڕێـــــزان!

ئەمـڕۆ کـە (١٤)ی شـەعبانی سـاڵی (١٤٤١) کۆچییـە، بەرانبـەر (٢٠٢٠/٤/٧)ی زایینـی، لـە شـاری هەولێـر، دەسـت دەکەیـن بـە تەفسیرکردنی سـووڕەتی (الواقعـة).

## پێناسەی سووڕەتی (الواقعة) و بابەتەکانی

### یەکەم: ناوی ئەم سووڕەتە:

ئـەم سـووڕەتە تەنیـا ناوێکـی هەیـە، کـە بریتیـە لـە (سُورَةُ الْوَاقِعَـةِ) یـان (الْوَاقِعَةِ)، لـەو بـارەوەش چەنـد دەقێـک هـەن، کـە نـاوی ئـەم سـووڕەتە موبارەکەیـان تێـدا هێـنراوە، چ لەسـەر زمـانی پێغەمبـەری خاتـەم ﷺ، چ لەسـەر زمـانی هـاوەڵانی (خـوا لێیـان ڕازی بـێ):

**أ)- {عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رضي الله عنهما، قَالَ: قَالَ أَبُو بَكْرٍ رضي الله عنه: يَا رَسُولَ اللَّهِ، قَدْ شِبْتَ؟ قَالَ: شَيَّبَتْنِي هُودٌ، وَالْوَاقِعَةُ، وَالْمُرْسَلاَتُ، وَعَمَّ يَتَسَاءَلُونَ، وَإِذَا الشَّمْسُ كُوِّرَتْ} (أخرجه الترمذي: ٣٢٩٧، وَقَالَ: حَسَنٌ غَرِيبٌ، والحاكم: ٣٣١٤، وَقَالَ: صَحِيح عَلَى شَرْطِ البُخَارِي).**

واتـە: عەبدوڵـڵای کـوڕی عەببـاس رضي الله عنهما دەڵـێ: ئەبوو بەکـر رضي الله عنه ڕۆژێک بە پێغەمبـەری خـوای گـوت: ئـەی پێغەمبـەری خـوا ﷺ! مووی سـپییت لـێ پەیدابوون! ئەویـش فەرمـووی: (**هُـود، وَالْوَاقِعَةُ، وَالْمُرْسَـلَاتُ، وعَـمَّ يَتَسَـاءَلُونَ، وَإِذَا الشَّـمْسُ كُوِّرَتْ**)، مـووی سـپییان تێـدا پەیـدا کـردم.

واتـە: ئـەو سـووڕەتە موبارەکانـە، کـە یـان بەسـەرهاتی پێغەمبەرانیـان (**عَلَيْهِـمُ الصَّـلاَةُ وَالسَّـلاَمُ**)، تێدایـە، یـان ڕووداوەکانی ڕۆژی دواییـان تێدایـەو، بـاسی بەهەشـت

www.alibapir.com


و دۆزەخیان تێدایەو، باسی دیداری خوای پەروەردگاریان تێدا هەیە، بە تایبەت لە سوورەتی هوددا باسی فەرمانکردن بە ڕێک وەستاویی: ﴿ فَٱسْتَقِمْ كَمَآ أُمِرْتَ ﴿١١٢﴾ ﴾ هود، هەیە.

**ب)-{عَنْ عَبْدِ اللَّهِ ابْنِ مَسْعُودٍ رضي الله عنه، قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: مَنْ قَرَأَ سُورَةَ الْوَاقِعَةِ كُلَّ لَيْلَةٍ لَمْ تُصِبْهُ فَاقَةٌ أَبَدًا} (أخرجه البيهقي في «شعب الإيمان»: ٢٤٩٩، وابن السني: ٦٨٠ في عمل اليوم والليلة، وابن الضريس: ٢٣٦، وإسناده ضعيف عند بعض المحدثين).**

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی مەسعوود رضي الله عنه، دەڵێ: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەیفەرموو: هەر کەسێک هەموو شەوێک سوورەتی (الْوَاقِعَة) بخوێنێ، هەرگیز هەژاریی و ئاتاجیی تووش نابێ.

(**إبن عطية**) وەک (**إبن عجيبة**)[1]، لێی دەگوازێتەوە - (**إبن عطية**)ەش یەکێکە لە ڕوونکەرەوەکانی قورئان - گوتوویەتی: (**فِيهَا ذِكْرُ الْقِيَامَةِ وحُظُوظ النَّاس فِي الآخِرَةِ، وفَهْمُ ذَلِكَ غِنَىً لَا فَقْرَ مَعَهُ، وَمَنْ فَهِمَهُ شُغِلَ بِالإسْتِعْدَادِ**) واتە: لە سوورەتی (**الْوَاقِعَةَ**)دا، باسی ڕۆژی دوایی هەیەو باسی پشک و بەشەکان (پاداشتی) خەڵک لە ڕۆژی دواییداو، تێگەیشتن لەوەش دەوڵەمەندییەکە هەژاریی تێدا نیەو، هەر کەسێکیش لەوە تێبگات، سەرقاڵ دەکرێ بە خۆ ئامادە کردن بۆ ڕۆژی دواییەوە، واتە: دنیا بە کەمگرو، دواڕۆژ هەڵبژێرەر دەبێ بەسەر دنیادا، بابای واش بە کەمێکی حەڵاڵ قەناعەت دەکات و، چاوی لە زۆرو بۆری حەڕام نیە.

**ج)-{عَنْ جَابِرِ بْنِ سَمُرَةَ رضي الله عنه، قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَقْرَأُ فِي الْفَجْرِ: الْوَاقِعَةَ وَنَحْوَهَا مِنَ السُّوَرِ} (أخرجه أحمد: ٢١٠٣٣، تعليق شعيب الأرنؤوط: صحيح لغيره).**

واتە: جابیری کوڕی سەموڕە رضي الله عنه، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ عادەتی وابووە لە نوێژی بەیانییدا سوورەتی (**الْوَاقِعَةَ**)و هاووێنەکانی دەخوێند.

---

(١) البحر المديد في تفسير القرآن المجيد: ج٧، ص٢٨٦.

www.alibapir.com


هەروەهـا لـە کتێبـەکانی سـوننەت و لـە موصحەفەکانیشـدا، کـە کاتی خـۆی بەدەسـت نـووسراون و هەبـوون، ئـەم سـوورەتە موبارەکـە هـەر بـە **(سـورة الْوَاقِعَـةِ)** ناوبــراوە.

## دووەم: شوێنی دابەزینی:

زۆربـەی هــەرە زۆری زانایــان و شــارەزایانی قورئــان گوتوویانــە: ئـەم سـوورەتە مەککەییـە، واتـە: لـە شـاری مەککـەو، لـە قۆناغـی پێـش کۆچکـردنی پێغەمبـەر ﷺ و، هــاوەڵانی بــۆ مەدینــە، دابەزیــوە، ئنجـا هەرچەنــدە هەندێـک لـە زانایــان چەنـد ئایەتێکیــان لــێ هــەڵاواردوون و بــە مەدینەییــان دانــاون، بــۆ نموونــە: هــەردووک ئایــەتی: ﴿أَفَبِهَٰذَا ٱلْحَدِيثِ أَنتُم مُّدْهِنُونَ ﴿٨١﴾ وَتَجْعَلُونَ رِزْقَكُمْ أَنَّكُمْ تُكَذِّبُونَ ﴿٨٢﴾﴾**الواقعــة**، گوتوویانـە: ئـەم دووانـە مەدینەییـن، بـەڵام هیـچ بەڵگەیەکـی دڵنیاکـەر لـەو بـارەوە نیـە، ئایەتەکانیـش وەک ئاڵقەیـەکانی. زنجیرێکـن و پێکـەوە پەیوەسـتن، بۆیـە هــەر ئـەو بۆچوونـە ڕاسـتە کـە هەمـووی پێکـەوە دابەزیـوە لـە مەککـە، واتـە: پێـش ئەوەی پێغەمبـەری خـوا ﷺ لـە شـاری مەککـەوە کـۆچ بـکات بـۆ مەدینـە.

## سێیەم: ڕیزبەندیی لە موصحەف و دابەزین دا:

ئـەم سـوورەتە موبارەکـە لـە ڕیزبەندیـی دابەزینـدا ژمـارە (٤٦)ی بـۆ دانــراوە، واتـە: چـل و شەشـەمین سـوورەت بـوو، دابەزیـوەو، لـە موصحەفیشـدا ژمـارە پەنجـاو شـەش (٥٦)ە، جابیـری کـوڕی زەیـد ڕای وایـە کـە ئـەم سـوورەتە موبارەکـە لـە پێـش **(الشـعراء)** دابەزیـوەو، لـە دوای سـوورەتی **(طـه)**، بـەو پێیـەش بـێ واپێدەچـێ لـە نێـوە ڕاسـتی قۆناغـی مەککـەدا، تۆزێـک بـە لای بـەشی دووەمیـەوە، دابەزیبـێ، واتـە: لـە سـاڵانی (٧ و ٨) بـەرەو دوا.

www.alibapir.com


## چوارەم: ژمارەی ئایەتەكانی:

هەرچەنـدە زۆربـەی ژمێـرەرانی ئایەتـەكانی قورئـان ژمـارە (٩٦)یـان تەبەننیـی كـردوە، بـەڵام هـەر كام لـە ژمـارەی (٩٧ و ٩٩)ش لەلایـەن بەشـێک لـە زانایانـەوە تەبەننیی كراون، بۆیە ئەگەر لەسەر موصحەفێک دا بینیمان: ژمارە (٩٧) یان (٩٩) دانـرا بـوو، باسـەرمان سـوڕنەمێنێ، ئـەو ژمارانـەش لەلایـەن بەشـێک لـە زانایانـەوە، بـۆ ئایەتـەكانی سـوورەتی (الْوَاقِعَـةَ) باسـكراون، زۆرجاریـش گوتوومانـە: جیاوازیـی لـە ژمـارەی ئایەتەكانـدا دەگەڕێتـەوە بـۆ چۆنیەتیـی كورتیـی و درێژیـی ڕسـتەكان و، چۆنیەتیـی وەسـتانەكان، ئایەتێـک كـە لـە نێـو قەدەكەیـدا بوەسـتی، دەبێتـە دوو ئایـەت، بـەڵام ئەگـەر هەمـووی بـە دەم یەكـەوەو یـەک ڕسـتە بـێ، بـە یـەک ئایـەت لـە قەڵـەم دەدرێ، ئنجا زانایـان لـەو بـارەوە ڕاجیاییـان هەبـووە، لـە بـارەی هەندێـک لـە ئایەتەكانـەوە.

## پێنجەم: نێوەڕۆكی:

ئـەم سـوورەتە هەمـان نێوەڕۆكـی قورئـانی مەككەیـی هەیـە، بـەڵام پانتاییەكـی زۆری بـۆ بـاسی ڕۆژی دوایـی، بـە هـەردوو قۆناغـی ئاخیـر زەمـان و قیامەتـەوەو بـە بەهەشـت و دۆزەخ تەرخانكـراون، دەتوانیـن بڵێیـن: جوگرافیـای بابەتـەكانی ئـەم سـوورەتە موبارەكـە، لـەم چـوار خاڵـەدا بەرجەسـتە دەبـن:

١)- ئایەتەكانی: (١ - ٥٦)، پەنجاو شەش (٥٦) ئایەتی سەرەتای ئەم سوورەتە، هەمووی باسی ئاخیر زەمان و قیامەت و، باسی بەهەشت و دۆزەخ و بەهەشتییەكان و دۆزەخییەكانە.

٢)- ئایەتەكانی: (٥٧ - ٧٤) واتە: هەژدە (١٨) ئایەت، باسی بەڵگەكانی پەروەردگارێتیی خوان ﷽.

**٣)**- ئایەتەکانی: (٧٥ - ٨٢) واتە: هەشت (٨) ئایەت، باسی قورئان و دڵنیا کردنەوەی هەموو لایەکە کە ئەم قورئانە لەلایەن پەروەردگاری جیهانییانەوە دابەزێنراوەو، جگە لە فریشتە پاککراوەکان، کەس دەستی نایگاتێ، بە پێچەوانەی بۆ چوونی دڵڕەشانەو، نەزانانەو کینە لە دڵانەی کافرەکان، کە پێغەمبەریان ﷺ بەوە تۆمەتبار دەکرد: شەیتانەکان (**شیاطین**) ئەوەی فێر دەکەن، یاخود بابایەکی نەصڕانیی فێری دەکات، یان بۆ خۆی هەڵیبەستوە.

**٤)**- ئایەتەکانی: (٨٣ - ٩٦) واتە: چواردە (١٤) ئایەتی کۆتایی ئەم سووڕەتە، باسی گیان کێشران و سەرەنجامی ئەوانەیە کە ڕووحیان لە جەستەیان جیا دەکرێتەوەو، لە دوای سەرە مەرگ دەکەونە قۆناغی بەرزەخەوە، چ لە بەهەشتدا، چ لە دۆزەخدا، یانی: خوا بسم الله الرحمن الرحيم وەک چۆن لەسەرەتای سووڕەتەکەوە،بەهەشتییان پۆلێن دەکات بۆ(**السابقون وأصحاب اليمين**)، لێرەش دیسان هەر پۆلێنیان دەکاتەوە بۆ (**السابقون**) و (**المقربون**) و بۆ (**أصحاب اليمين**)، کەواتە: پەنجاو شەش، کۆ هەژدە، کۆ هەشت، کۆ چواردە، یەکسانە بە نەوەدو شەش (٥٦+١٨+٨+١٤=٩٦) ژمارەی ئایەتەکانی ئەم سووڕەتە.

## شەشەم: تایبەتمەندییەکانی ئەم سووڕەتە:

ئێمە هەشت تایبەتمەندییمان کەوتوونە بەرچاو، کە ئەم سووڕەتە جیا دەکەنەوە لە سووڕەتەکانی دیکە:

**١)**- تەنیا لەم سووڕەتەدا، هەم دوای باسی ئاخیر زەمان، باسی بەهەشتییان و دۆزەخییان کراوە، هەم دوای باسی گیان کێشران، وەک گوتمان: لە پەنجاو شەش (٥٦) ئایەتی یەکەمدا، باسی ئاخیر زەمان و قیامەت، کراوە، دوایی باسی پۆلێنکردنی خەڵک بۆ بەهەشتییان و دۆزەخییان، بەهەشتییانیش بۆ دوو پۆل: (**السابقون**) و (**أصحاب اليمين**)، واتە: پێشکەوتووەکان لەگەڵ هاوەڵانی دەستە ڕاست، ئنجا بێبڕوایەکانیش ناونراون: (**أصحاب الشمال**) هاوەڵانی دەستە چەپ، لای چەپ.

www.alibapir.com



دوایی لە چوارە (١٤) ئایەت، ئایەتەکانی: (٨٣ - ٩٦)یش دا، خوا ﷻ باسی گیان کێشرانی کردوە، دوایی دووبارە باسی دابەشکردن و پۆلێنکردنی مرۆڤایەتیی کردوە، بۆ سێ بەش: (**مُقَرَّبون**) ئەوانەی زۆر لە خوا نیزیکن، ئنجا (**أَصْحَاب الْيَمِين**) هاوەڵانی لای ڕاست، دواییش (**أَصْحَاب الشِّمَال**) هاوەڵانی لای چەپ، ئەمە تاکە سووڕەتێکە کە تێیدا بەو شێوەیە، لە دوای ئاخیر زەمان و قیامەت، باسی بەهەشتییان و دۆزەخییان بکرێ و، لە دوای گیان کێشرانیش، کە وەک دوایی باسی دەکەین، ئەوە نهێنییەکی گەورەی تێدایە.

**٢)**- تەنیا لەم سووڕەتەدا بەپێی زانیاریی بەندە، بە ڕاشکاویی باسی ئەوە کراوە، کە مرۆڤەکان لە ڕۆژی دواییدا بە جۆرێکی دیکەی جیاواز، لە هی ئێستا، کە نایزانن دروست دەکرێنەوە، وەک خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿نَحْنُ قَدَّرْنَا بَيْنَكُمُ الْمَوْتَ وَمَا نَحْنُ بِمَسْبُوقِينَ ﴿٦٠﴾ عَلَىٰ أَن نُّبَدِّلَ أَمْثَالَكُمْ وَنُنشِئَكُمْ فِي مَا لَا تَعْلَمُونَ ﴿٦١﴾﴾ **الواقعة**، واتە: ئێمە مردنمان لە نێو ئێوەدا داناوەو، ئێمە دەستەپاچە نین، (لێ پێشکەوتووەوە نین، کەسێک بتوانێ لە ژێر ڕکێفی ئێمە دەربچێ)، کە ئێوە بگۆڕین، با هاو وێنەکانتان و، ئێوە بەشێوەیەک دروست بکەینەوە، کە نایزانن.

**٣)**- تەنیا لەم سووڕەتەدا هەرکام لە:

**أ)**- دروستکرانی مرۆڤ لە نوتفە.

**ب)**- ڕواندنی کشت و کاڵ.

**ج)**- دابەزاندنی ئاوی شیرینی خواردنەوە لە سەرێوە.

**د)**- ڕەخساندنی سووتەمەنیی بۆ ئاگر.

وەک بەڵگە لەسەر پەروەردگارێتیی خواو باڵادەستیی خواو، لەسەر زیندووکرانەوە، خراونەڕوو، لە ئایەتەکانی: (٥٧ - ٧٣)دا، تەنیا لەم سووڕەتەدا، ئەو چوارە بە ڕیز: دروستکردنی مرۆڤ لە نوتفە، ڕواندنی کشتوکاڵ، دابەزاندنی ئاوی شیرین، ڕەخساندنی سووتەمەنیی بۆ ئاگر، وەک چوار بەڵگە، هەم لەسەر

www.alibapir.com


پەروەردگارێتیی خوا، هەم لەسەر توانای خوا بۆ زیندووکرانەوەی مرۆڤەکان، خراونەڕوو.

**٤)**- تەنیا لەم سوورەتەدا سوێند بە ڕێ و شوێنی ئەستێرەکان **(مواقع النجوم)** خوراوەو، بە سوێندێکی مەزنیش دانراوە، کە لە ئایەتەکانی: (٧٥و ٧٦)دا هاتوە: ﴿فَلَآ أُقْسِمُ بِمَوَٰقِعِ ٱلنُّجُومِ ﴿٧٥﴾ وَإِنَّهُۥ لَقَسَمٌ لَّوْ تَعْلَمُونَ عَظِيمٌ ﴿٧٦﴾﴾**الواقعة**، کە ئەمەش وەک دوایی باسی دەکەین، نهێنییەکی گەورەی زانستیی تێدایەو، زانستی گەردووناسیی لەم ڕۆژگارەدا، زیاتر ئەو نهێنییەی دەرخستوە، کەبۆچی خوا بسم الله الرحمن الرحيم دەفەرموێ: ئەگەر بزانن سوێند خواردن بە ڕێ و شوێن و جێگاو ڕێگای ئەستێرەکان، سوێندێکی مەزنە؟

**٥)**- تەنیا لەم سوورەتەدا، باسی دەست لێ نەدرانی قورئان کراوە، مەگەر لەلایەن پاککراوانەوە: ﴿لَّا يَمَسُّهُۥٓ إِلَّا ٱلْمُطَهَّرُونَ ﴿٧٩﴾﴾**الواقعة**، دوایی قسەی لێوە دەکەین، کە زانایان لەو بارەوە مشتومڕی زۆریان بووە، کە تەنیا پاککراوان دەست لە قورئان دەدەن و، جگە لە پاککراوان دەستی لێ نادەن، مەبەست پێی چییە؟

**٦)**- تەنیا لەم سوورەتەدا دووجار ڕستەی: ﴿فَسَبِّحْ بِٱسْمِ رَبِّكَ ٱلْعَظِيمِ ﴿٧٤﴾﴾**الواقعة**، ﴿فَسَبِّحْ بِٱسْمِ رَبِّكَ ٱلْعَظِيمِ ﴿٩٦﴾﴾**الواقعة**، لە ئایەتەکانی: (٧٤ - ٩٦)دا هاتوە، هەڵبەتە لە سوورەتی **(الحاقة)**دا، لە کۆتاییەکەیدا: ﴿فَسَبِّحْ بِٱسْمِ رَبِّكَ ٱلْعَظِيمِ ﴿٥٢﴾﴾**الحاقة**، هاتوە، بەس یەک جار، تەنیا لەم سوورەتەدا، ئەم ڕستە موبارەکە دوو جار هاتوە.

**٧)**- لەم سوورەتەدا، هەروەها لە هەردوو سوورەتی پێشووشدا لە سوورەتی **(القمر)** و سوورەتی **(الرحمن)**دا، ناوی **(أَللە)** نەهاتوە، کە لە قەبارەی خۆیاندا، لەو بارەوە بێ وێنەن، واتە: ئەم سێ سوورەتە، سوورەتەکانی: **(القمر والرحمن والواقعة)**، لە قەبارەی خۆیاندا کە هەر کامیان یەکی دەوری یەک لەسەر چواری جوزئێکن و لە قەبارەی خۆیاندابێ وێنەن، کەناوی خوا بسم الله الرحمن الرحيم بەوشەی **(أَللە)**، لەوسێ سوورەتەدانەهاتوە، بەڵام **(الرحمن)** و **(رب)** هاتوون و سیفەتەکانی خوا هاتوون، بەڵام **(أَللە)** بسم الله الرحمن الرحيم نەهاتوە.

www.alibapir.com


**٨)-** چەند وشەیەک تەنیا لەم سوورەتەدا هاتوون:

**١)-** وشەی ﴿مَّوۡضُونَةٖ ١٥﴾ واتە: چنراو، گەوهەربەند، لە زێڕ چنراو، لە گەوهەر چنراو، لە ئاوریشم چنراو، تەنیا لەم سوورەتەدا ئەم وشەیە هاتوە.

**٢)-** ﴿سِدۡرٖ مَّخۡضُودٖ ٢٨﴾، واتە: سیدری بێ درک، یان درک شکێنراو.

**٣)-** وشەی ﴿وَطَلۡحٖ مَّنضُودٖ ٢٩﴾ واتە: مۆزی ڕیز بەستوو، یان لەسەر یەک هەڵچنراو بە دارەکەوە.

**٤)-** ﴿وَظِلّٖ مَّمۡدُودٖ ٣٠﴾، واتە: سێبەرێکی درێژ کراوە، سێبەرێک کە کۆتایی نایەت.

**٥)-** ﴿وَمَآءٖ مَّسۡكُوبٖ ٣١﴾، واتە: ئاوێکی هەڵڕژاو، تاڤگە.

**٦)-** ﴿عُرُبًا ٣٧﴾ واتە: کۆی **(عروب)**ە، واتە: ئافرەتێک کە مێردی خۆی زۆر خۆش دەوێ و، زۆر پێوەی پەیوەستە.

**٧)-** ﴿أَتۡرَابٗا ٣٧﴾ کۆی **(ترب)**ە، هاوتەمەن، کە ئەمە تایبەتە بە ئافرەتانەوە، بەڵام بۆ پیاو دەگوترێ: **(أقران)** کۆی **(قِرْن)**ە، واتە: هاوتەمەن.

**٨)-** ﴿يَحۡمُومٖ ٤٣﴾ واتە: دوو کەڵی ڕەش **(الدخان الأسود)**.

**٩)-** ﴿شُرۡبَ ٱلۡهِيمِ ٥٥﴾ **(هیم)** کۆی **(أهیم)**ەو کۆی **(هیماء)**ە، **(أهیم)** بۆ نێرینە **(مذكَّر)**ەو **(هیماء)** بۆ مێینە **(مؤنث)**یە، کە بریتین لە ئەو حوشترانەی تووشی نەخۆشیی **(هُیَام)**دەبن، واتە: تینوبوونێک کە تێر ئاوبوونی بە دوادا نەیەت.

**١٠)-** ﴿تَفَكَّهُونَ ٦٥﴾ واتە: **(تَعْجَبُون)** سەرتان سوڕدەمێنێ بە مانای **(تَنْدَمُون)**یش هەر هاتوە، واتە: پەشێمان دەبنەوە.

**١١)-** ﴿ٱلۡمُزۡنِ ٦٩﴾ واتە: هەور، هەندێکیش گوتوویانە: هەوری سپیی **(السَّحَاب الأَبْيَض)**.

www.alibapir.com



**١٢)-** ﴿لِّلْمُقْوِينَ ﴿٧٣﴾﴾ واتە: ئەوانەی لە دەشت و بیابان دەمێننەوە، واتە: (**المسافرين الذين يبيتون فِي الصَّحْرَاء أو فِي البيداء**) هەروەها (**للمقوين**) بە مانای (**الجائعين**)یش هاتوە، ئەوانەی سکیان خاڵیی دەبێ.

**١٣)-** ﴿الْحُلْقُومَ ﴿٨٣﴾﴾ واتە: گەروو، قوڕقوڕاگە.

## حەوتەم: دابەشکردنی ئەم سووڕەتە بۆ چەند دەرسێك:

ئێمە کۆی نەوەدو شەش (٩٦) ئایەتەکەی ئەم سووڕەتە، بۆ چوار دەرس دابەش دەکەین:

**دەرسی یەکەم:** ئایەتەکانی: (١ - ٤٠)، کە جگە لە شەش ئایەتی سەرەتا، ئایەتەکانی: (١ - ٦)، سی و چوار (٣٤) ئایەتەکەی دیکە، هەموویان باسی حاڵ و باڵی بەختەوەرانەی (**السابقون**) و (**أصحاب اليمين**) دەکەن، کە هەردووکیان لە بەهەشتە ڕازاوە نەبڕاوەکانی خوای میهرەبان دا، بە نازو نیعمەتی زۆرەوە ژیان دەبەنە سەر، ئەوانیش بەو شێوەیە:

ئایەتەکانی: (١٠ - ٢٦) واتە: حەڤدە (١٧) ئایەت، بۆ باسی (**السابقون المقربون**) پێشکەوتووە نیزیکخراوەکان.

ئایەتەکانی: (٢٧ - ٤٠) واتە: چواردە (١٤) ئایەت، بۆ باسی (**أصحاب اليمين**)، واتە: هاوەڵانی دەستە ڕاست، ئەوانەی کە لە خوار (**المقربون والسابقون**)ن.

**دەرسی دووەم:** لە ئایەتەکانی: (٤١ - ٥٦)، واتە: شازدە (١٦) ئایەت پێک دی، بۆ باسی (**أصحاب الشمال**)، هاوەڵانی چەپەیە (هاوەڵانی دەستە چەپ) کە حاڵ و باڵی سەخت و دژوارو پڕ ئازارو مەینەتیی و شەرمەزارییان، لە دۆزەخی پڕ چڕە دوو کەڵ و بڵێسەی ئاگرو گڕەباو ئاوی کوڵاوو داغدا، دەخەینە ڕوو.

www.alibapir.com


**دەرسی سێیەم:** لە ئایەتەکانی: (٥٧ - ٧٤) واتە: هەژدە (١٨) ئایەت، پێک دێ، بۆ دواندنی بێبڕوایان و خستنەڕووی هەر کام لە: (لە نوتفەو دروستبوونی مرۆڤ، ڕواندنی کشتوکاڵ، دابەزاندنی ئاوی شیرین لە سەرێوە، ڕەخساندنی سووتەمەنیی بۆ ئاگر)، وەک چوار چاکەو نیعمەتی خوا خراونەڕوو، لە هەمان کاتیشدا، وەک چوار بەڵگەی ئیسپاتی باڵادەستیی و چاکەکاریی و پەروەردگارێتیی خوا لە ژیانی بەشەردا، دیسان وەک بەڵگەش لەسەر ئەوە کە خوا ﷻ توانایە لەسەر زیندووکردنەوەو ژیاندنەوەی مرۆڤەکان، دوای مردنیان و هێنانە پێشی سزاو پاداشت بۆیان.

**دەرسی چوارەم و کۆتایی:** لە ئایەتەکانی: (٧٥ - ٩٦)، واتە: بیست و دوو (٢٢) ئایەت، پێک دێ، بۆ باسی قورئانی بەڕێزو پێز، پاشان باسی حاڵەتی گیانکێشرانی مرۆڤ و بێچارەیی دەوروبەرەکەی بەرانبەری و، دواتر بەڕێکرانی ئەو کەسەی گیانی دەکێشرێ، بەرەو شوێنی شایستەی خۆی، کە ئەگەر لە (**مقربین**) یان (**أصحاب الیمین**) بێ، بەهەشتە، هەر کەسە بە پلەی خۆی و، ئەگەر لە (**المکذبین الضالین**) بێ واتە: (**أصحاب الشمال**) بە درۆدانەرانی گومڕا، بەرەو کڵپەی دۆزەخ بەڕێ دەکرێ.

لە کۆتایی ناساندنی ئەم سووڕەتەو خستنەڕووی نێوەڕۆکی نێوەڕۆکی دا دەڵێین: شایانی باسە: ئەم سووڕەتە یەکێکە لە سووڕەتە گشتگیرو کۆکەرەوەکان، بۆ زۆربەی هەرە زۆری بابەتەکانی ئیمان و عەقیدە، کە دەتوانین بڵێین نۆ (٩) بابەتی گرنگی عەقیدەیی لەم سووڕەتە موبارەکەدا هاتوون:

**١)-** باسی ئاخیر زەمان، کە ناوی: ﴿ٱلْوَاقِعَةُ﴾، واتە: ڕووداو، قەوماو، بۆ ئاخیر زەمان بەکارهاتوە.

**٢)-** باسی قیامەت و پۆلێنکرانی خەڵک بۆ سێ بەشی سەرەکیی: ﴿وَكُنتُمْ أَزْوَٰجًا ثَلَٰثَةً﴾، (**أي: أصنافاً ثلاثة**) پۆلێنکران بۆ سێ بەش، کە دوو بەشیان بەرەو بەهەشتن و، بەشێکیان بەرەو دۆزەخە.

**٣)-** باسی پاداشتی بڕواداران بە هەردوو جۆرەکەیانەوە: **(السابقون المقربين)** پێشکەوتووەکان، زۆر لە خوا نیزیکخراوەکان، جۆری دووەمیش **(أصحاب اليمين)** هاوەڵانی دەستە ڕاست، هەروەها **(أصحاب الميمنة)**شی بۆ بەکارهاتوە، واتە: هاوەڵانی خێرو خۆشیی و، بەرەکەت و پێز، یاخود **(ميمنة)** بە مانای لای ڕاستە **(مفعلة)**یە، لە **(يمين)**.

**٤)-** باسی سزای بێبڕوایان کە بە دوو وشە پێناسە کراوە: بە **(أصحاب المشئمة)** خاوەنانی نەگبەتیی و بێ خێریی، **(أصحاب الشمال)** خاوەنانی لای دەستە چەپ، لە کۆتایی سووڕەتەکەشدا بە **(المكذبين الضالين)** بە درۆ دانەرانی گومڕا، ناسێنراون.

**٥)-** خستنەڕووی چوار بەڵگەی گەورەی سەلمێنەری پەروەردگاریێتیی خواو، باڵادەستیی خواو، توانای خوا بۆ زیندووکرانەوەی مرۆڤەکان، چونکە سووڕەتەکە بە زۆریی باسی ئەوەیە، ئەو چوار بەڵگەیەش بریتین لە: لە تۆو دروست بوونی مرۆڤ و، ڕواندنی کشتوکاڵ و، دابەزاندنی ئاوی شیرین و، ڕەخساندنی سووتەمەنیی بۆ ئاگر کردنەوە.

**٦)-** سوێند خواردن بە ڕێ و شوێنی ئەستێران، لەسەر ڕاستیی قورئان کە لە خواوەیەو، ئاماژەکردن بەڵکو بە ڕاشکاویی گوتنی ئەوە، کە ئەو سوێندە سوێندێکی گەورەیە، بەڵام بە مەرجێک بزانن، واتە: ئەگەر زانیارییتان هەبێ، ئنجا قەدری ئەو سوێند خواردنەی خوا بە ڕێ و شوێنی ئەستێرەکان، دەزانن.

**٧)-** باسی نیزیکیی فریشتە گیانکێشەکان، کە لە خەڵکە دانیشتووەکەی دەوری مردووەکە، یان دەوری ئەو مرۆڤەی لە گیانەڵا دایەو خەریکی گیان کێشران و، ڕووحدانە، لێی نیزیکترن، بەڵام نایانبینن، واتە: خەڵکەکە کە بە دەوری مردووەکەوەن، فریشتەکان نابینن، ئەگەرنا فریشتەکان لێی نیزیکترن.

**٨)-** باسی بەڕێکرانی ڕاستەوخۆی ڕووحی مرۆڤ، پاش کێشرانی لە جەستەکەی بەرەو بەهەشت، یاخود بەرەو دۆزەخ لە قۆناغی ژیانی بەرزەخدا.

**٩)**- باسی حاڵەتی گیانکێشران کە خەڵک لە بەرانبەریدا، دەستە پاچەو بێچارەن.

هەر بۆیەش (**المسروق**) کە یەکێکە لە زانایان گوتوویەتی: (**مَنْ أَرَادَ عِلْمَ نَبَأَ الْأَوَّلِينَ وَالْآَخِرِينَ، وَنَبَأَ أَهْلِ الْجَنَّةِ، وَنَبَأَ أَهْلِ النَّارِ، ونَبَأ أَهْلِ الدُّنْيا وأَهْلِ الآخِرَةِ، فَلْيَقْرَأْ سُورَةَ الْوَاقِعَةِ**)[1]، واتە: هەر کەسێک دەیەوێ هەواڵی پێشووەکان و، هەواڵی دواییینەکان بزانێ، هەورەها هەواڵی خەڵکی بەهەشت و هەواڵی خەڵکی ئاگری دۆزەخ بزانێ، هەروەها هەواڵی خەڵکی دنیا (ئەوانەی دنیایان هەڵبژاردوە)و، هەواڵی خەڵکی ڕۆژی دوایی (ئەوانەی ڕۆژی دواییان هەڵبژاردوە) بزانێ، با سوورەتی (**الْوَاقِعَة**) بخوێنێ.




---

(١) البحر المديد في تفسير القرآن المجيد: ج٧، ص٢٨٦.

www.alibapir.com


## پێناسەی ئەم دەرسە

ئـەم دەرسـەمان لـە چـل (٤٠) ئایـەتی سـەرەتای سـوورەتی (**الواقعـة**) پێـک دێ، ئایەتـەکانی: (١ - ٤٠) کـە بـاس و بابەتـەکانی بـەم جـۆرەن:

**١)**- شەش ئایەتی سەرەتا باسی ئاخیر زەمان و، ژمارەیەک لە ڕووداوە گەورەو گرنگەکانی ئاخیر زەمان دەکەن.

**٢)**- پێنج ئایەتی دوای ئەوان، ئایەتەکانی: (٧ - ١١) باسی پۆلێنکردنی هەر سێک کۆمەڵە سەرەکییەکەی مرۆڤایەتیی لە قیامەتدا: (**أصحاب الميمنة، أصحاب المشئمة، السابقون القربون**) دەکەن.

**٣)**- پازدە ئایەتی دواتر، کە ئایەتەکانی: (١٢ - ٢٦)، باسی حاڵ و گوزەرانی (**السابقون المقربون**) لە بەهەشتدا دەکەن.

**٤)**- چواردە ئایەتی دواتر، کە ئایەتەکانی: (٢٧ - ٤٠) باسی حاڵ و گوزەرانی (**أصحاب اليمين**) لە نێو نازو نیعمەتەکانی بەهەشتدا دەکەن.

شـایانی گوتنیشـە: بـە بـەراورد کـردنی نـازو نیعمەتـەکانی هـەر کام لـە (**السـابقون**) و (**أصحـاب اليمـين**)، بـە ئاشـکرا دیـارە، کـە کۆمەڵـی یەکـەم نـازو نیعمەتەکەیـان بەرزتـرو نایابـترو چاکـترە، لـە نـازو نیعمـەتی کۆمەڵـی دووەم.

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

﴿إِذَا وَقَعَتِ ٱلۡوَاقِعَةُ ١ لَيۡسَ لِوَقۡعَتِهَا كَاذِبَةٌ ٢ خَافِضَةٞ رَّافِعَةٌ ٣ إِذَا رُجَّتِ ٱلۡأَرۡضُ رَجّٗا ٤ وَبُسَّتِ ٱلۡجِبَالُ بَسّٗا ٥ فَكَانَتۡ هَبَآءٗ مُّنۢبَثّٗا ٦ وَكُنتُمۡ أَزۡوَٰجٗا ثَلَٰثَةٗ ٧ فَأَصۡحَٰبُ ٱلۡمَيۡمَنَةِ مَآ أَصۡحَٰبُ ٱلۡمَيۡمَنَةِ ٨ وَأَصۡحَٰبُ ٱلۡمَشۡـَٔمَةِ مَآ أَصۡحَٰبُ ٱلۡمَشۡـَٔمَةِ ٩ وَٱلسَّٰبِقُونَ ٱلسَّٰبِقُونَ

www.alibapir.com



﴿١٠﴾ أُوْلَٰٓئِكَ ٱلْمُقَرَّبُونَ ﴿١١﴾ فِي جَنَّٰتِ ٱلنَّعِيمِ ﴿١٢﴾ ثُلَّةٌ مِّنَ ٱلْأَوَّلِينَ ﴿١٣﴾ وَقَلِيلٌ مِّنَ ٱلْأٓخِرِينَ ﴿١٤﴾ عَلَىٰ سُرُرٍ مَّوْضُونَةٍ ﴿١٥﴾ مُّتَّكِـِٔينَ عَلَيْهَا مُتَقَٰبِلِينَ ﴿١٦﴾ يَطُوفُ عَلَيْهِمْ وِلْدَٰنٌ مُّخَلَّدُونَ ﴿١٧﴾ بِأَكْوَابٍ وَأَبَارِيقَ وَكَأْسٍ مِّن مَّعِينٍ ﴿١٨﴾ لَّا يُصَدَّعُونَ عَنْهَا وَلَا يُنزِفُونَ ﴿١٩﴾ وَفَٰكِهَةٍ مِّمَّا يَتَخَيَّرُونَ ﴿٢٠﴾ وَلَحْمِ طَيْرٍ مِّمَّا يَشْتَهُونَ ﴿٢١﴾ وَحُورٌ عِينٌ ﴿٢٢﴾ كَأَمْثَٰلِ ٱللُّؤْلُوِٕ ٱلْمَكْنُونِ ﴿٢٣﴾ جَزَآءًۢ بِمَا كَانُواْ يَعْمَلُونَ ﴿٢٤﴾ لَا يَسْمَعُونَ فِيهَا لَغْوًا وَلَا تَأْثِيمًا ﴿٢٥﴾ إِلَّا قِيلًا سَلَٰمًا سَلَٰمًا ﴿٢٦﴾ وَأَصْحَٰبُ ٱلْيَمِينِ مَآ أَصْحَٰبُ ٱلْيَمِينِ ﴿٢٧﴾ فِي سِدْرٍ مَّخْضُودٍ ﴿٢٨﴾ وَطَلْحٍ مَّنضُودٍ ﴿٢٩﴾ وَظِلٍّ مَّمْدُودٍ ﴿٣٠﴾ وَمَآءٍ مَّسْكُوبٍ ﴿٣١﴾ وَفَٰكِهَةٍ كَثِيرَةٍ ﴿٣٢﴾ لَّا مَقْطُوعَةٍ وَلَا مَمْنُوعَةٍ ﴿٣٣﴾ وَفُرُشٍ مَّرْفُوعَةٍ ﴿٣٤﴾ إِنَّآ أَنشَأْنَٰهُنَّ إِنشَآءً ﴿٣٥﴾ فَجَعَلْنَٰهُنَّ أَبْكَارًا ﴿٣٦﴾ عُرُبًا أَتْرَابًا ﴿٣٧﴾ لِّأَصْحَٰبِ ٱلْيَمِينِ ﴿٣٨﴾ ثُلَّةٌ مِّنَ ٱلْأَوَّلِينَ ﴿٣٩﴾ وَثُلَّةٌ مِّنَ ٱلْأٓخِرِينَ ﴿٤٠﴾﴾.

## مانای دەقا و دەقی ئایەتەکان

{بە ناوی خوای بە بەزەیی بەخشندە. هەر کات ڕووداوەکەی (ئاخیر زەمان) قەوما ﴿١﴾ ڕوودانەکەی درۆی تێدانیە ﴿٢﴾ نزمکەرەوە (ی بێبڕوایان)و بەرزکەرەوە (ی بڕوادارانە) ﴿٣﴾ کاتێک زەوی بە ڕاتەکێنران، ڕاتەکێنرا ﴿٤﴾ چیایەکانیش بە وردو خاش بوون، هاڕران ﴿٥﴾ ئنجا بوونە تۆزو گەردی پرژو بڵاو ﴿٦﴾ ئێوەش (ئەی خەڵکینە!) بوونە سێ (جۆرە) کۆمەڵ ﴿٧﴾ (ئەوانیش بریتین لە:) هاوەڵانی ڕاستەی بەختەوەر، هاوەڵانی ڕاستەی بەختەوەر کێن و چۆنن؟ ﴿٨﴾ هەروەها هاوەڵانی چەپەی نەگبەت، هاوەڵانی چەپەی نەگبەت کێن و چۆنن؟ ﴿٩﴾ پێشکەوتووان، پێشکەوتووان (ن لە چاکەکاریی دا) ﴿١٠﴾ ئەوانەن (لە خوا) زۆر نیزیکخراوان ﴿١١﴾ لە نێو باخەکانی پڕ نازو نیعمەت دان ﴿١٢﴾ کۆمەڵێکی زۆرن لە (کۆمەڵە) پێشووەکان ﴿١٣﴾ کەمێکیش لە دواینەکان (لە ئۆممەتی موحەممەد ﷺ)ن ﴿١٤﴾ لەسەر تەختە چنراوەکان (گەوهەر بەندەکان) ﴿١٥﴾ بەرانبەر بە یەکدی پاڵیان داوەتەوە ﴿١٦﴾ تازە لاوانی هەمیشە لاو (بۆ خزمەتکردن) بەسەریانەوە

دەگەڕێن ﴿١٧﴾ بە پەرداخ و سوڕاحیی و پێک (ی مەی) لە سەرچاوەیەکی لەبەر ڕۆیشتوو ﴿١٨﴾ کە بە هۆیەوە ژانەسەر ناگرن و سەرخۆشیش نابن ﴿١٩﴾ هەروەها میوەیەک (ی نایاب)یان بەسەرەوە دەگێڕن، لەوەی خۆیان هەڵیدەبژێرن ﴿٢٠﴾ هەروەها دیسان گۆشتی باڵندە لەوەی ئارەزووی دەکەن ﴿٢١﴾ هەروەها ئەوانە ئافرەتانی جەستە سپیی و دڵگیرو چاوگەش و گەورەیان هەن ﴿٢٢﴾ ئەو ئافرەتانە وەک گەوهەری شێردراوە (لە قۆزاخەدا)ن ﴿٢٣﴾ ئەوەش پاداشتی ئەوەیە کە دەیانکرد (لە کردەوەی چاک) ﴿٢٤﴾ نە قسەی پووچ و نە قسەی گوناهبارکەری تێدا نابیستن ﴿٢٥﴾ تەنیا گوتنی: سەلام، سەلام (ی تێدا دەبیستن) ﴿٢٦﴾ هەروەها هاوەڵانی ڕاستە، هاوەڵانی ڕاستە، کێن و چۆنن؟ ﴿٢٧﴾ لە نێو (درەختی) سیدری بێ دڕک دان ﴿٢٨﴾ هەروەها (درەختی) مۆزی میوە (و گەڵا) ڕیزکراو (لەسەریەک هەڵچنراو) ﴿٢٩﴾ دیسان لە (بن) سێبەرێکی (بەردەوام و) درێژکراوەدان ﴿٣٠﴾ هەروەها ئاوی هەڵڕژاو (تاڤگە لە شوێنی نیشتەجێبوونیان دا) هەیە ﴿٣١﴾ میوەی (جۆراو جۆری) زۆریش (یان هەیە) ﴿٣٢﴾ (ئەو میوەیە) نەدەبڕێ و نە ڕێی لێ دەگیرێ ﴿٣٣﴾ هەروەها ڕایەخ و پێخەفی بەرزو بەهادار (یان هەن) ﴿٣٤﴾ (ئافرەتەکانیش) بە دروستکردنێکی تایبەت دروستمان کردوون ﴿٣٥﴾ ئنجا وامان لێکردوون بەردەوام کچ بن ﴿٣٦﴾ (هەروەها گێڕاومانن بە) مێرد خۆشویستی هاوتەمەن (ی مێردەکانیان) ﴿٣٧﴾ (ئەوەش هەمووی) بۆ هاوەڵانی ڕاستە ﴿٣٨﴾ (ئەوانیش کۆمەڵێکی زۆر لە (ئوممەتە) پێشووەکان ﴿٣٩﴾ کۆمەڵێکی زۆریش لە دواییینەکان ﴿٤٠﴾}.

لە تۆڕە کۆمەڵایەتییەکان لەگەڵتانین
Stay in touch on social media
نحن معكم عبر مواقع التواصل الاجتماعي
ڕاگەیاندنی مەکتەبی مامۆستا عەلی باپیر
عەلی باپیر/AliBapir
archive.org/details/@alibapir
عەلی باپیر/AliBapir
AliBapir
کەناڵی ڕاگەیاندنی مەکتەبی مامۆستا عەلی باپیر
www.alibapir.net
کوردی - عربي - English
ڕاگەیاندنی مەکتەبی مامۆستا عەلی باپیر

www.alibapir.com


## شیکردنەوەی هەندێک لە وشەکان

(إِذَا): (كَلِمَةٌ مَبْنِيَّةٌ عَلَى السُّكُونِ تَأَتِي لِمَعْنَيَيْنِ: أَوَّلًا: حَرْفُ المُفَاجَأَةِ مِثْلُ: خَرَجْتُ فَإِذَا المَطَرُ، ثَانِيَاً: أَدَاةٌ للشَّرْطِ وَالجَزَاءِ نَحْو: وَإِذَا تُرَدُّ إِلى القَلِيْلِ تَقْنَعُ)، (إذا): وشەیەکی بنیاتنراو (مبنيّ) لەسەر زەنە (سُكون) {واتە: هەروەک خۆی دەمێنێتەوە} بە دوو واتایان دێ: یەکەم: بە مانای شتێکی کتوپڕ پێی دەگوترێ: (إذَا المفَاجَأة) وەک (خَرَجْتُ فَإِذَا المَطَرُ)، واتە: چوومە دەرێ، یەکسەر بارانم بینی، واتە: کتوپڕ بارانم بینی، مانای دووەم (أدَاةٌ للشَّرْطِ وَالجَزَاء) ئامرازێکە بۆ مەرج و بۆ بەرانبەر، یان پاداشتێک کە لەسەر ئەو مەرجە هەڵدەچنرێ، وەک (وَإِذَا تُرَدُّ إِلى القَلِيْلِ تَقْنَعُ) {ئەمە قسەیەکی عەرەبییە} تۆ ئەگەر بگێردرێیەوە بۆ شتێکی کەمیش، هەر قەناعەتی پێ دەکەی.

(وَقَعَتِ): (الوُقُوعُ: ثُبُوتُ الشَّيء وَسُقُوْطُه، وَالوَاقِعَةُ لاَ تُقَالُ إلاَّ فِي الشِّدَّةِ وَالمَكْرُوه)، (وُقُوع): چەسپاندنی شتێک و کەوتنە خواریەتی، (وَاقِعَة) تەنیا بە شتێک دەگوترێ: کە سەختییەک هەبێ و، شتێکی ناخۆشویستراوو ناڕەحەت بێ.

(ٱلْوَاقِعَةُ): (إِسْمٌ مِنْ أَسْمَاءِ القِيَامَةِ، السَّاعَة)، (وَاقِعَة): ناوێکە لە ناوەکانی قیامەت، بەڵام بەشی قۆناغی یەکەمی قیامەت یان ئاخیر زەمان، نەک قیامەت، بە واتای زیندووکرانەوەو لێپرسرانەوە، واتە: بە تایبەت لەم سوورەتەدا ﴿إِذَا وَقَعَتِ ٱلْوَاقِعَةُ﴾ کاتێک ڕووداوەکە قەوما، مەبەست پێی ئاخیر زەمانە، چونکە ئەو شتانەی دوایی خوا لەگەڵیدا باسیان دەکات، هەموویان لە ئاخیر زەمان دا ڕوو دەدەن: ﴿إِذَا وَقَعَتِ ٱلْوَاقِعَةُ ﴿١﴾ لَيْسَ لِوَقْعَتِهَا كَاذِبَةٌ ﴿٢﴾ خَافِضَةٌ رَّافِعَةٌ ﴿٣﴾ إِذَا رُجَّتِ ٱلْأَرْضُ رَجًّا ﴿٤﴾ وَبُسَّتِ ٱلْجِبَالُ بَسًّا ﴿٥﴾ فَكَانَتْ هَبَآءً مُّنۢبَثًّا ﴿٦﴾﴾ الواقعة، ئەوانە هەموویان پەیوەندییان بە دەرەنجامی فوو بە کەڕەنادا کردن لەلایەن ئیسرافیلەوە بۆ جاری یەکەم، هەیە.

www.alibapir.com


(كَاذِبَةٌ ): (نُسِبَ الكَذِبُ إلى نَفْسِ الفِعْلِ: فِعْلَةٌ كَاذِبَة، وَمِثْلُ: نَاصِيَةٍ كَاذِبَة، كَاذِبَة: إسْمٌ يُوضَعُ مَوْضِعَ المَصْدَرِ كَالْعَاقِبَة وَالعَافِيَة)، (كَاذِبَة): واتە: درۆ، پاڵدراوەتە لای خودی کارەکە، وەک (فِعْلَةٌ كَاذِبَة) واتە: کارێکی درۆ، یان دەگوترێ: (نَاصِيَةٍ كَاذِبَة خَاطِئَة) وەک لە قورئاندا هاتوە، واتە: پێشە سەرێکی درۆ کاری خەتابار، ئنجا لێرەدا وشەی (كَاذِبَة) دانراوە لە شوێنی چاوگ دا، وەک (عَاقِبَة) واتە: سەرەنجام، (عَافِيَة) واتە: سەلامەتیی، کەواتە: (كَاذِبَة)ەش واتە: درۆ، درۆ کردن، ﴿ لَيْسَ لِوَقْعَتِهَا كَاذِبَةٌ ﴾، کاتێک کارەساتی ئاخیر زەمان دەقەومێ، درۆی تێدانیە.

(رُجَّتِ ٱلْأَرْضُ ): (رَجَّهُ رَجّاً: هَزَّهُ وَحَرَّكَهُ بِشِدَّة، وَرَجَّ الشَّيءُ: اضْطَرَب)، (رَجَّهُ رَجّاً) واتە: ڕایوەشاندو، تێکییەوە ڕاشەقاند، ڕایتەکاند بەهێز، دەگوترێ: (رَجَّ الشَّيءَ) واتە: شتەکەی ڕاتەکاند، بەڵام (رَجَّ الشَّيءُ: اضْطَرَب) واتە: شتەکە بۆ خۆی جووڵا، کەواتە: وشەی (رَجَّ) هەم بە (لاَزِم) هاتوە، کە بەرکاری ناوێ، هەم بە تێپەڕێنەر (مُتَعَدِّي)یش هاتوەو بەرکار دەخوازێ.

( وَبُسَّتِ ٱلْجِبَالُ ): (بَسّ الشَّيء: فَتَتَهُ وَفَرَّقَهُ)، شتەکەی پرژو بڵاوکردو، وردو خاش کرد، (تَفْتِيت) بریتیە لە وردو خاشکردن و هاڕینی شتێک، کەواتە: ﴿ وَبُسَّتِ ٱلْجِبَالُ بَسًّا ﴾، کاتێک چیایەکان هاڕدران و وردو خاش کران.

(هَبَآءً ): بوون بە تۆزو گەردی پرژوبڵاو، (الهَبَاءُ: التُّرَابُ الَّذِي تُطَيْرُهُ الرِّيحُ وَيَلْزَقُ بِالأشْيَاء)، (هَبَاء): بریتیە: لەو تۆزو خۆڵەی با ڕایدەدات، دوایی بە شتەوە دەنووسێ، کە تاکەکەی (هَبَاءَة)یە، واتە: گەردێک لەو تۆزو گەردەی با دەیجووڵێنێ.

(مُّنۢبَثًّا ): (أَصْلُ البَثُّ التَّفْرِيقُ وَإثَارَةُ الشَّيء، كَبَثُّ الرِّيحِ التُّرَاب، بَثَثْتُه فانبَثَّ فَهُوَ مُنْبَثٌّ)، (مُنْبَثّاً) (بَثّ) لە زمانی عەرەبییدا بە مانای بڵاوکردن دێ و، بە مانای لە شوێنی خۆ هەڵقەندنی شتێک دێ، وەک چۆن با گڵ ڕادەداو پرژو بڵاوی دەکاتەوە، دەگوترێ: (بَثَثْتُه فانبَثَّ فَهُوَ مُنْبَثٌّ) واتە: پرژو بڵاوم کرد، پرژو بڵاو بۆوە، ئەو پرژو بڵاوە.

www.alibapir.com


(أَزْوَٰجًا ): (يُقَالُ لِكُلٍّ مِنَ القَرِيْنَيْنِ مِنَ الذَّكَرِ وَالأُنْثَى فِي الحَيْوَانَاتِ المُتَزَاوِّجَة: **زَوْج، وَأَزْوَاج: أَصْنَاف وَأَنْوَاع وَأَشْبَاه وَقُرَنَاء**)، ئەو ئاژەڵانەی پێکەوە جووت دەبن، بە هەر کامیان پێی دەگوترێ: (**زَوْج**): هەم بە نێرەکە، هەم بە مێیەکە، [پیاویش پێی دەگوترێ: (**زَوْج**)و ئافرەتیش پێی دەگوترێ: (**زَوْج**)]، بەڵام وێڕای ئەوە بە هەموو ئەو شتانەی پێکەوەش دەبن، با جووتیش نەبن، هەر دەگوترێ: (**زَوْج**)، ئەو کاتەش (**زَوْج**) واتە: پۆل (**صِنْف**): ﴿ٱحْشُرُوا۟ ٱلَّذِينَ ظَلَمُوا۟ وَأَزْوَٰجَهُمْ وَمَا كَانُوا۟ يَعْبُدُونَ ﴿٢٢﴾﴾ **الصافات**، (**أي: أَصْنَافَهُمْ، وَأَشْكَالَهُم، وَأَشْبَاهَهُم**)، واتە: ئەوانەی وەک ئەوانن و هاوەڵی ئەوانن، وەک ئەوان دەچن.

کەواتە لێرەدا: ﴿ وَكُنتُمْ أَزْوَٰجًا ثَلَٰثَةً ﴾، (**أي: أَصْنَافاً وَأَنْوَاعاً وَأَشْبَاهاً**)، واتە: بوونە سێ پۆل، سێ جۆر، سێ کۆمەڵی وێکچوو، سێ کۆمەڵی پێکەوە بوو.

(ٱلْمَيْمَنَةِ ): (**اليَمِيْنُ: أَصْلُهُ الجَارِحَة، أَصْحَابُ اليَمِيْن: أَصْحَابُ السَّعَادَةِ وَالمَيَامِيْن، اليَمِيْن: التَّيَمُّنُ**)، وشەی (**مَيْمَنَة**) (**مَفْعَلَةٌ مِنَ اليُمْنِ، أي: البَرَكَةَ**)، (**مَيْمَنَة**) لەسەر کێشی (**مَفْعَلَة**)یە، لە (**يُمْن**)ەوە هاتووە، واتە: بەرەکەت و پیرۆزو بەرهەمداریی و چاکیی، چونکە وشەی (**يمين**) لە ئەسڵدا بە مانای دەستی ڕاست (**جَارِحَة**) دێ، (**أَصْحَابُ اليَمِيْن**) واتە: هاوەڵانێک کە خاوەنی بەختەوەریی و پیت و پیرۆزن (**يَمِيْن**) بە مانای دەستی ڕاست دێ، بە مانای بەرەکەت و (**يُمن**)یش دێ، واتە: پڕ خێریی، بە پێچەوانەی (**شُوءم**) واتە: نەگبەتیی و بێ خێریی.

(ٱلْمَشْـَٔمَةِ ): (**مَفْعَلَةٌ مِنَ الشُّؤْمِ**)، (**مَشْئَمَة**) لەسەر کێشی (**مَفْعَلَة**)یە، لە (**شُوءم**)ەوە هاتووە، یانی: نەگبەت و بێ خێر، ئنجا عەرەب عادەتیان وابووە، لای چەپیان بۆ شتی بێ خێرو نەگبەت داناوە، بۆ شتێک مایەی ڕەشبینیی بێ و، لای ڕاستیان بۆ چاکەو خێر داناوەو، ئەگەر ویستبایان سەفەرێک یان مامەڵەیەک یان کارێک بکەن، دەچوونە سەر هێلانەی باڵندەیەک و هەڵیاندەفڕاند، ئنجا ئەگەر بە لای ڕاستدا ڕۆیشتبایە، دەیانگوت: (**تَيَامَن**) ئەوکارەی دەمانەوێ بیکەین، ڕوو لە خێرو

www.alibapir.com



بەرەکەتەو، ئەگەر بەلای چەپدا ڕۆیشتبایە، دەیانگوت: (تَشَاءم) بەرەو نەگبەتیی و بێ خێرییەو ئەو کارە مەکەن.

هەڵبەتە ئەوە تەنیا ئەفسانەیەکە، ئەگەرنا باڵندە کە هەڵیدەفڕێنی بە کوێیدا دەرفەت بێ، بەوێدا دەردەپەڕێ، جاری وایە بەلای ڕاستدا بواری هەیەو، جاری وا بەلای چەپ داو، جاری وا هەیە ڕێک بەرز دەبێتەوە.

(ثُلَّةٌ): (**الثُّلَّةُ: قِطْعَةٌ مُجْتَمِعَةٌ مِنَ الصُّوف، وَلِذَلِكَ قِيْلَ للغَنَمِ ثُلَّة، وَلاعْتِبَار الإجْتِمَاعِ قِيْلَ: ثُلَّة**)، (**ثُلَّة**): لە ئەصڵدا بە پارچەیەک لە خوریی دەگوترێ، هەر بۆیە بە مەڕ گوتراوە: (**ثُلَّة**) لەبەر ئەوەی تۆپەڵە خوریی پێوەیە، یان تۆپەڵە خورییان لێ دروست دەبێ، ئنجا لەو ڕووەوە کە خەڵکێکیش کۆدەبێتەوە، کۆ دەبن و وەک تۆپەڵ دەبن، لەو ڕووەوە بە کۆمەڵە خەڵکێکی زۆر گوتراوە: (**ثُلَّة**)، کەواتە: (**ثُلَّة مِنَ الأوَّلِيْن**) واتە: خەڵکێکی زۆر، کۆمەڵێکی زۆر لە پێش وان.

(سُرُرٍ): (**جَمْعُ سِرِيْر: الَّذِي يُجْلَسُ عَلَيْهِ مِنَ السُّرُورِ، جَمْعُهُ: أَسِرَّة وَسُرُر**)، (**سَرِيْر**) کە بە (**أسِرّه وَسُرُر**) کۆدەکرێتەوە، (**سِرِيْر**): ئەوەیە کە لە ڕووی دڵخۆشییەوە، خاوەنەکەی لەسەری دادەنیشێ [لەسەری ڕادەکشێ و پاڵدەداتەوە]، دوایی لە مەسەلە گرنگەکاندا زیاتر ئەم وشەی (**سَرِيْر**) کە بە (**سرُرٌ**) لە قورئاندا زۆر هاتوە، شیی دەکەینەوە.

(مَّوۡضُونَةٖ): (**الوَضْنُ: نَسْجُ الدِّرْعِ، وَيُسْتَعَارُ لِكُلِّ نَسْجٍ مُحْكَم**)، (**وَضْن**): لە ئەصڵدا بە مانای چنینی زرێ دێ، زرێ کە ئاڵقەکانی دەچنە نێویەک، دوایی خوازراوەتەوە بۆ هەر چینێکی مەحکەم و ڕێک.

(مُتَّكِـِٔينَ): (**الوِكَاءُ: رِبَاطُ الشَّيء، تَوَكَّأَ عَلَى العَصَى: اعْتَمَد بِهَا وَتَشَدَّدَ بِهَا**)، (**مُتَّكِئِيْن**) بە کوردیی دەبێتە: شانیان داداوە، پاڵیانداوەتەوە، (**الوِكَاءُ: رِبَاطُ الشَّيءِ**) (**وكاء**) شتێکە شتێکی پێ ببەسترێ، وەک لە فەرمووودەدا هاتوە: {**وِكَاءُ السَّهِ الْعَيْنَانِ، فَمَنْ نَامَ فَلْيَتَوَضَّأْ**} (**أخرجه أبو داود: ٢٠٣، وحسنه الألباني**)، واتە: چاو

www.alibapir.com


بەستنەوەی کۆمە، ئنجا هەرکەس خەوی لێکەوت، با دەستنوێژ بگرێ، چونکە دەست نوێژەکەی بە شکاو لە قەڵەم دەدرێ، مادام بە شێوەیەک دانەنیشتبێ، چەسپاو بێ لە زەوی.

(**تَـوَكَّأَ عَـلَى العَـصَى**) واتـە: سـەنگی دایـە سـەر گۆچانەکـەو خـۆی پـێ بەهێـز کـرد، (**مُتَّكِئ**)یـش لەسـەر کێشی (**مُفَعِّل**) نـاوی بکـەرە، کەسـێک خـۆی داوەتـە سـەر شـتێک، کەسـێک لـە سـەر سـەرینێک و باڵنجێـک پاڵدەداتـەوەو شـاندا دەدات.

(وِلۡدَٰنٞ): (**جَمْعُ وَلَـد، وَوَلِيْـد: مَـنْ قَـرُبَ عَهْـدُهُ بِالـوِلَادَة**)، (**وِلْـدَان**): واتـە: کـوڕو کاڵ، لاوەکان، کـۆی (**وَلَـد**)و (**وَلِيْـد**)، (**وَلَـد**) کەسـێکە لـە دایـک بـووە، (**وَلِيْد**)یـش دیسـان کەسـێک لـە دایـک بـووە، بـەڵام لـە مێـژ نیـە لـە دایـک بـووە، کەسـێک کاتی لـە دایـک بـوونی نزیکـە واتـە: تـازە پێگەیشـتوە، بۆیـە (**وِلْـدَان**) یـانی: تـازە پێگەیشـتووان، لاوان، گەنجـانی تـازە پەیدابـوو.

(مُّخَلَّدُونَ): (**مُبْقَـون بِحَالَتِهِـم لَا يَعْتَرِيهُـم اسْـتَحَالَة**) واتـە: هێشـتراوان لـەو حاڵەتـەدا کـە لەسـەرنیی، کـە حاڵـەتی لاویـی و گەنجیەتییـەو، گۆڕانیـان بەسـەردا نایـەت، کـە تەمەنیـان هەڵکشـێ و کامـڵ بـبن و بکەونـە تەمەنـەوە، هەروەهـا (**مُخَلَّـدُون**) بـە واتایەکـی دیکـەش هاتـوە: (**أي: مُقَرَّطُـونَ بِخَلَـدَةٍ: وَهِـيَ ضَرْبٌ مِـنَ القِرْطَـة**) واتـە: گوارەیـان لـە گـوێ کـراوە، (**خَلْـدَة**) جۆرێکـە لـە گـوارە (**وَإِخْـلَادُ الـشَّيء: جَعلـه مُبْقـى**) (**أَخْلَـدَ الـشَّيء**) واتـە: ئـەو شـتەی وا لێکـرد بمێنێتـەوەو هەرمـاوی کـرد.

(بِأَكۡوَابٖ): (**جَمْـعُ كُـوُب: قَـدَحٌ لاَ عُـرْوَةَ لَـهُ**)، (**كُـوب**): پەرداخێکـە دەسـکی نەبـێ، جـام، ڕەنگـە بـە کوردیـی بگوتـرێ: جـام، زیاتـر مانـای (**قَـدَح**) بگەیەنـێ.

(وَأَبَارِيقَ): کـۆی (**إِبْرِيْـق**)ە، کـە (**فخـر الديـن الـرازي**) گوتوویـەتی: (**إِبْرِيْق**) لـە (**ابْرِيْز**) ەوە هاتـوە، ئاوڕێـژ، بـە کوردیـی سـووڕاحی پـێ دەگوتـرێ، ئەوەیـە کـە گەورەتـرە لـە پـەرداخ و کـووپ، هـەر خواردنەوەیەکـی پـێ لـە پەرداخـەکان و لـە جامـەکان دەکـرێ.

www.alibapir.com


(وَكَأْسٍ): (الكَأسُ: الإِنَاءُ بِمَا فِيْهِ مِنَ الشَّرَاب وَسُمِّيَ كُلُّ وَاحِدٍ مِنْهُمَا بِانْفِرَادِه كَأسَاً)، (كَأْس) ئەو دەفرەیە شەڕابی تێدەکرێ، بە هەر کامێکیان واتە: هەم بە خودی شەڕابەکە دەگوترێ: (كَأْس)، هەم بە دەفرەکەش کە شەڕابی پێ دەخورێتەوەو تێدەکرێ، دەگوترێ: (كَأْس).

(مَّعِينٍ): (ظَاهِرٍ لِلْعُيُوْن) واتە: بینراو، واتە: سەرچاوەیەک کە ئاوەکە لە بەری دەڕواو دەبینرێ.

(لَّا يُصَدَّعُونَ عَنْهَا): سەر ئێشەی پێ ناگرن، ژانە سەری پێ ناگرن، واتە: ئەو شەڕاب و مەیەی، دەیخۆنەوە، ژانەسەری پێ ناگرن، وەک شەڕابی دنیا، (الصَّدْعُ: الشَّقُّ فِي الأَجْسَامِ الصُّلْبَةِ كَالْزُّجَاجِ، وَالصُّدَاعُ شُبِّهَ الإِنْشِقَاقَ فِي الرَّأسِ)، (صَدْع): بە مانای لەتکردنە، لەو تەنانەدا کە ڕەقن، وەک شکانی شووشە، (صُدَاع)یش کە سەر ئێشەیە تەشبیهکراوە بەوەوە، وەک ئەو کەسە سەری شکا بێ و سەری لەت بووبێ.

(وَلَا يُنزِفُونَ): دەگوترێ: (سَكْرَانُ نزِيْف: نُزِعَ فَهْمُه بِسُكرِه)، سەرخۆشێکی نەزییف واتە: عەقڵی لەلای خۆی نەماوە، لە ئەنجامی مەست بووندا، (يَنْزِفُون وَيُنْزِفُون) هەردووکیان هاتوون، (مِنْ أَنْزَفُوْا إِذَا نَزَفَ شَرَابُهُم، أو نُزِعَت عُقُولُهُمْ)، (يَنْزِفُون ويُنْزِفُون)، واتە: شەڕابەکەیان نەما، کۆتایی هات، یاخود عەقڵیان داڕنرا، بێ هۆش بوون، کەواتە: (يَنْزِفُون) واتە: شەڕابەکەیان نامێنێ، بەڵام (يُنزِفُون) واتە: عەقڵیان نامێنێ و، هەردووکیان بە هەردوو واتایەکان هێناون، (نَزَفَ يَنْزِفُ وَأَنْزَفَ يُنْزِفُ) واتە: هەم بە (ثُلاَثِي) هەم بە (رُبَاعِي) بە هەردوو واتاکانیان هێناون.

(وَحُورٌ): (جَمْعُ أَحْوَر، وَحَوْرَاء، حَوَّرْتُ الشَّيءَ: بَيَّضْتُهُ)، پێشتریش باسی ئەم وشەیەمان کردو دواتریش جارێکی دیکە باسی دەکەینەوە، (حُور) کۆی (أَحْوَر)ە، دەشگونجێ کۆی (حَوْرَاء) بێ، (حُور) کۆیە، یان کۆی (أَحْوَر)ە، پیاوێکی سپیی،

www.alibapir.com



یان کۆی (حَوْرَاء)ە، ئافرەتێکی سپیی، کەواتە: (حُور) دەگونجێ کۆی (أَحْوَر) بێ و بۆ پیاوان بەکاربێ و، دەگونجێ کۆی (حَوْرَاء) بێ و بۆ ئافرەتان بەکاربێ، بەڵام بەپێی سیاق دەزانرێ، دەگوترێ: (حَوَّرْتُ الشَّيء: بَيَّضْتُهُ) واتە: شتەکەم سپییکرد، سپییمکردو سافم کرد.

(عِينٌ): (يُقَالُ لِبَقَرِ الوَحْشِ: أَعْيَن وَعَيْنَاء لِحُسْنِ عَيْنِهِ، وَجَمْعُهَا عِيْنٌ وَبِهَا شُبِّهَ النِّسَاء)، واتە: بە مانگای وەحش دەگوترێ: (أَعْيَن وَعَيْنَاء) بە نێرەکەی دەگوترێ: (أَعْيَن)و بە مێیەکەی دەگوترێ: (عَيْنَاء) لەبەر ئەوەی چاوی زۆرجوانە، چاوی حۆرییەکانیش چوێنراوە بە چاوی ئەو جۆرە ئاژەڵەوەو، لە کوردییدا وشەی چاو بەڵەک بەکاردەهێنرێ، کە ئەویش ئەو ئافرەتەیە سپێنەی چاوی زۆر سپیی بێ و، ڕەشکێنەی چاویشی زۆر ڕەش بێ.

(ٱلْمَكْنُونِ): (الكِنُّ: مَا يُحْفَظُ فِيْهِ الشَّيء)، (كِنّ): هەر شتێک شتێکی تێدا دەپارێزرێ و پەنهان دەکرێ و دەشاردرێتەوە، (مَكْنُون: مَسْتُور وَمَخْفِيّ)، واتە: پەردەپۆش کراوو، پەنهانکراو و شێردراوە.

(سِدْرٍ مَّخْضُودٍ): (السِّدْرُ: شَجَرٌ قَلِيْل الغَنَاء عِنْدَ الأَكْلِ)، (سِدْرٍ) درەختێکە بەرەکەی زۆر کەڵێنێ ناگرێ بۆ خواردنێ، (مَخْضُود: مَكْسُور الشَّوْكِ)، واتە: دڕکەکانی شکێنراون، لێرەدا مەبەست ئەوە نیە، دڕکی هەبن و شکێنراون، واتە: بێ دڕکو دڕکی هەر نین.

(وَطَلْحٍ مَّنضُودٍ): (الطَّلْحُ: شَجَرٌ وَالوَاحِدَةُ: طَلْحَة)، (طَلْح): جۆرە درەختێکە تاکەکەی پێ دەگوترێ: (طَلْحَة)، ئەویش بە دوو واتا هاتوە:

أ- (الطَّلْحُ: شَجَر عِظَامٌ مِنَ شَجَرِ العضَاه تَرْعَاهُ الإِبْلِ) (طَلْح): درەختێکی مەزنە، لە درەختە دڕکاوییەکانی بیابان، حوشتر لەسەری دەلەوەڕێ.

ب- هەروەها (طَلْح) بە مانای مۆز (المَوْز) هاتوە، ئێمە دەڵێین: مۆز، بەڵام لە ئەسڵدا (مَوْز)ە، ئەو مۆزەی دەخورێ.

www.alibapir.com


(مَّسْكُوبٍ): (مَصْبُوب) ئاوێكی هەڵـڕژاو، (دَمْعٌ سَاكِبٌ مُتَصَوَّرٌ بِصُورَةِ الفَاعِل)، واتـە: فرمێسـكێكی ڕژاو، كـە لێرەدا وێنـا كـراوە بەشـێوەیەک كـە فرمێسـكەكە خـۆی بـڕژێ، ئنجـا (مَسْـكُوب) واتــە: ڕژێـنراو، بــە كوردیـی بـەو ئاوانــەی هەڵدەڕژێـن لەسـەر ڕا بـۆ خـوارێ، دەڵێیـن: تاڤگـە، بـە عەڕەبیـی دەگوتـرێ: (شَـلَّال) و (شَـلَّالات) كۆیەكەیـەتی.

(وَفُرُشٍ مَّرْفُوعَةٍ): (فُـرُش جَمْـعُ فِـرَاش: وَالفِـرَاشُ: بَسْـطُ الثِّيَـاب وَكُنِّـيَ بَالْفِـرَاشِ عَـنْ كُلِّ مِـنَ الزَّوْجَـيْنِ كَـمَا جَـاءَ فِي الحَدِيْـث: {الْوَلَـدُ لِلْفِـرَاشِ وَلِلْعَاهِـرِ الْحَجَـرُ} (أخرجـه البخـاري: ١٩٤٨، ومسـلم: ١٤٥٧).

(فُـرُش) كـۆی (فِـرَاش)ە، واتـە: جێـگا، یـان شـتێک كـە ڕادەخـرێ بۆ لەسـەر ڕاكشـان و لەسـەر پشـوودان، ئنجـا جـاری وایـە، هـەر بـە خـودی جێگاكـە دەگوتـرێ: نوێـن، پێخـەف، جێـگا، یـان بـەڕە، ڕایـەخ، جـاری وایـە وەک كینایـە، بـۆ هـەر كام لـە ژن و مێـرد بـەكاردێ، وەک لـە فەرمایشـتی پێغەمبـەردا هاتـوە: منـداڵ پاڵدەدرێتـە لای ئـەو جێیـەی تێیـدا لـە دایـک بـووەو، ئـەوەی داوێـن پیسـییشی كـردوە، بـەردی بـەزار، واتە: هیچـی پـێ نابـڕێ، بـا هـەر بڵـێ: ئـەو منداڵـە لـە منـە، ئـەو منداڵـە پاڵدەدرێتـە لای ئـەو شـوێنەی لێـی بـووە، ئنجـا ئەگـەر ئـەو پیـاوە لـەوێ بـێ، خـاوەنی ئـەو جێـگاو ڕێگایـە بـوو بـێ، هـی ویـە، بـەڵام هـەر پیاوێكـی دیكـە بڵـێ: ئـەوە هـی منـە، نەخێـر ئـەو بەدڕەوشـتە بـەردی بـە زار!!

(فُـرُشٍ مَرْفُوعَـةٍ) واتـە: چەنـد جێگایەكـی بـەرز كـراوەو، ئـەو بەرزكرانەوەیـەش دەگونجـێ مەبەسـت پـێ بەرزكردنـەوەی ڕواڵەتیـی بـێ، واتـە: لەسـەر ئاسـتی زەوی بـەرز كراونـەوەو، دەشـگونجێ مەبەسـت پێـی بەرزكردنـەوی مەعنەویـی بـێ، واتـە: قـەدرو قیمـەتی گەورەیـان هەیـە، ئنجـا ئـەو كاتـەش دیسـان مەبەسـت پێـی جێگابـێ، یـان مەبەسـت پێـی ئافرەتەكـە بـێ كـە لەسـەر جێگایـە، دیسـان ئـەوەش هـەردوو واتایەكـەی هـەر هـەن: لـە شـوێنێكی بـەرزن، یاخـود قـەدرو قیمەتێكـی گـەورەو ڕێـزو حورمەتێكـی گەورەیـان هەیـە.

(أَبْكَارًا): (جَمْعُ بِكر: الَّتِي لَمْ تَلِد، التِي لَمْ تُفْتَض)، (أبْكَار) كۆی (بِكر)ە، بۆ ئافرەتێک کە منداڵی نەبوو بێ، یاخود کچێنیی لانەبردرابێ و هەر کچ بێ.

(عُرُبًا): (جَمْعُ عرُوب، مُعرِبة بِحَالِها عَن عِفّتِهَا وَمَحَبَّتِهَا لِزَوْجِهَا)، (عرُوب): ئافرەتێکە بە زمانی حاڵ دەریخات، کە پاکەو، مێردی خۆی زۆر خۆش دەوێ و، بۆی دڵسۆزە.

(أَتْرَابًا): (جَمْعُ تِرْب: لِدَاتٌ)، (تِرب) واتە: هاو تەمەن، کەواتە: (أَتْرَاب) واتە: ئەو ئافرەتانە هاوتەمەنی یەکدین، وەک پێکەوە لە دایک بووبن، (التِّرْبُ: المُمَاثِلُ فِي السِّنِّ، وَأَكْثَرُ مَا يُسْتَعْمَلُ فِي المُؤَنَّث)، (تِرب) واتە: هاو تەمەن، بەڵام بە زۆریی بۆ ئافرەت بەکاردێ، یان بۆ مێینە بەکاردێ، جاری وا هەیە بۆ ئاژەڵانیش بەکاردێ، بەڵام بۆ پیاو، یان بۆ نێرینە (قِرْن) بەکاردێ لە جیاتی (تِرْب) کە (قِرْن) بە (أَقْرَان) کۆدەکرێتەوە، (قِرْن) (هَذَا الرَّجَلُ قِرْنُ ذَاكَ)، ئەو پیاوە هاوتای ئەو پیاوەیە، یانی: هاوتەمەنیەتی بەڵام بۆ ئافرەت دەگوترێ: (هَذِهِ المَرْأَةُ تِرْب تِلْكَ) واتە: هاوتەمەنیەتی.

لە تۆڕە کۆمەڵایەتییەکان لەگەڵتانین
Stay in touch on social media
نحن معكم عبر مواقع التواصل الاجتماعي
ڕاگەیاندنی مەکتەبی مامۆستا عەلی باپیر
AliBapir/عەلی باپیر
archive.org/details/@alibapir
AliBapir/عەلی باپیر
AliBapir
کەناڵی ڕاگەیاندنی مەکتەبی مامۆستا عەلی باپیر
www.alibapir.net
کوردی - عربي - English
ڕاگەیاندنی مەکتەبی مامۆستا عەلی باپیر

www.alibapir.com


## مانای گشتیی ئایەتەکان

سەرەتا خوا بسم الله الرحمن الرحيم دەفەرموێ: (بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ) بە ناوی خوای بـە بەزەیـی بەخشـندە، واتـە:

دەستپێکردنم بە ناوی خوایە، مەبەستیش پێی ئەوەیە:

١ - ئەم کارە تەنیا بۆ خوا دەکەم.

٢ - ئەم کارە بە پێی شەرعی خوا دەکەم.

٣ - ئەم کارە بە تواناو یارمەتیی خوای پەروەردگار دەکەم.

٤ - ئەم کارە بۆ هێنانەدی ڕەزامەندیی خوا ئەنجام دەدەم.

﴿إِذَا وَقَعَتِ ٱلۡوَاقِعَةُ﴾، هــەر کات ڕووداوەکــە قەومــا! واتــە: ئــەو ڕووداوەی هەمـوو مرۆڤایەتیـی چاوەڕێـی دەکات و گـەردوون چاوەڕێـی دەکات، کـە بریتیـە لـە پێچرانـەوەی لاپـەڕەی ئـەم ژیانـە دنیاییـەو، هێنرانـە پێـشی قۆناغێکـی دیکـە لـە ژیـان، کـە قۆناغـی زینـدوو کرانـەوەو لێپرسرانەوەیـە، هەڵبەتـە قۆناغێکـی ڕاگـوزەری کاتیـی لـە نێـوان ئـەو دوو قۆناغـەدا هەیـە، کـە بریتیـە لـە قۆناغـی بـەرزەخ.

(الوَاقِعَــة)ش یەکێکــە لــە نــاوەکانی ڕۆژی دوایــی، بــە تایبــەت قۆناغــی ئاخیــر زەمـان، (الوَاقِعَـة)ش لـە (وُقُوع)ەوەیـە یـانی: بەربوونـەوەی شـتێک و ڕوودانی شـتێک، (الوَاقِعَــة) واتــە: ئــەو ڕووداوەی ڕوودەدات، وەک شــتێک بــێ بکەوێتــە خــوار.

﴿لَيۡسَ لِوَقۡعَتِهَا كَاذِبَةٌ﴾، درۆ لـە قەومـان و ڕوودانی دا نیـە، ئەو کارەسـات و ڕووداوە، کـە ئاخیـر زەمانـە، درۆی تێدانیـە، یاخـود لـە کاتی ڕوودانیـدا هیـچ کـەس درۆ نـاکات، بڵـێ: نیـە.

﴿خَافِضَةٞ رَّافِعَةٌ﴾، نزمکــەرەو بەرزکــەرە، واتــە: نزمکــەرە بــۆ بێبڕوایــان و تاوانبارانێـک، کـە خۆیـان بـەرز کردۆتـەوە بەسـەر خەڵکدا بـە ناحـەق، لـەو ڕۆژەدا

www.alibapir.com


ئـەوان نـزم دەبنـەوە، یـان: ئـەو ڕۆژە نزمیـان دەکاتـەوەو شـۆڕیان دەکاتـەوە، ﴿رَّافِعَةٌ﴾، ئەوانـەش کـە مافیـان پێشـێل کـراوەو لەبـن دەسـت و پێیانـدا بـوون، چەوسـێنراونەوەو، سـتەمیان لێکـراوەو، نزمکراونـەوە بـە ناهـەق، ئـەو ڕۆژە بەرزیـان دەکاتـەوە، یاخـود: ﴿خَافِضَةٌ رَّافِعَةٌ﴾، مەبەسـت پێـی ئەوەیـە کـە ئـەو کارەسـات و ڕووداوە، کـە دەقەومـێ شـوێنە بـەرزەکان نـزم دەکات و شـوێنە نزمـەکان بـەرز دەکاتـەوە، هەموویـان دەکاتـە یـەک ئاسـت.

ئنجا خوا ﷻ دوو لە دیاردەکانی ئاخیر زەمان دەخاتە بەرچاوو دەفەرموێ: ﴿إِذَا رُجَّتِ ٱلْأَرْضُ رَجًّا﴾، هـەر کات زەوی بـە هەژێـنران و ڕاتەکێـنران، ڕاتەکێـنرا.

﴿وَبُسَّتِ ٱلْجِبَالُ بَسًّا﴾، هەروەها چیایەکانیش بە وردو خاش بوون، هاڕدران.

﴿فَكَانَتْ هَبَآءً مُّنۢبَثًّا﴾، چیایـەکان بوونـە تـۆزو گـەردی پـرژو بـڵاو، (هَبَـآءَة) بـە دەنکێـک لـە گڵ، یـان تـۆزو گەردێـک دەگوترێ، (هَبَـاءً)ش نـاوی کۆیـە، واتـە: ئـەو چیایانـە دەبـن بـە تـۆزو گـەردی پـرژو بـڵاو.

﴿وَكُنتُمْ أَزْوَٰجًا ثَلَٰثَةً﴾، ئێـوەش بوونـە سـێ پـۆل، **(أزْوَاج)** لێـرەدا یانـی: **(أصنـاف وأشـكال وأشـباه)**، یـانی: ئێـوە دەبـن بـە سـێ کۆمـەڵ، کـە هـەر کام لـەو سـێ کۆمەڵـە وێکدەچـن و هەمـوو ئـەو خەڵکانـەی وێکچـوون، دەکرێنـە کۆمەڵێـک و، بەوجـۆرە دابەش دەبن بۆ سێ کۆمەڵ، دوایی خوا ﷻ ڕوونی دەکاتەوە ئەو سێ کۆمەڵە چۆنـن؟

﴿فَأَصْحَٰبُ ٱلْمَيْمَنَةِ مَآ أَصْحَٰبُ ٱلْمَيْمَنَةِ﴾، خوا ﷻ بەپێناسەکردن‌وڕوونکردنەوەی سـێ کۆمەڵەکانـدا دێ و، دەفەرمـوێ: **(فأصحـاب الميمنـة مـا أصحـاب الميمنـة)** ئنجـا هـاوەڵانی پـڕ پیـت و پێـز، هـاوەڵانی پـڕ پیـت و پێز چیـن؟ یاخود هـاوەڵانی لای ڕاسـتە، هـاوەڵانی لای ڕاسـتە، کێـن و چیـن؟ واتـە: بـە شـێوەیەکن کـە بازنـەی وەسـفکردن، ناتوانـێ دەوریـان بـدات.

www.alibapir.com



﴿ وَأَصۡحَٰبُ ٱلۡمَشۡـَٔمَةِ مَآ أَصۡحَٰبُ ٱلۡمَشۡـَٔمَةِ ﴾، هـاوەڵانی لای چەپـەش، هاوەڵانـی لای چـەپ چیـن؟ یـان هـاوەڵانی نەگبـەت و بـێ خێـر، هـاوەڵانی نەگبـەت و بـێ خێر کێـن و چۆنن؟ ئەمـە بـۆ سـەر لێ سـوڕماندن و گـەورە کـردن و قەبـە پێشـاندانی وەسـفکراوەکەیە.

﴿ وَٱلسَّٰبِقُونَ ٱلسَّٰبِقُونَ ﴾، پیشـکەوتووەکان، پێشـکەوتووەکان، واتـە: پێشـکەوتووەکان لـە کـردەوە چاکەکانـدا، مەگـەر هـەر بـە خۆیـان پێناسـە بکرێـن، یاخـود پێشـکەوتووەکان لـە چاکەکانـدا، بـەس ئەوانـن کـە لـە ڕۆژی دواییـدا، پێـش خەڵـک دەکـەون، بـەرەو بەهەشـتەکانی خـوا.

﴿ أُوْلَٰٓئِكَ ٱلۡمُقَرَّبُونَ ﴾، ئـا ئەوانـەن زۆر نیزیکخـراوان، واتـە: زۆر لـە خـوا نیزیـک خـراوان، بـەو شـێوەیەی بـۆ خـوا شایسـتەیە.

﴿ فِي جَنَّٰتِ ٱلنَّعِيمِ ﴾، ئەوانـە لـە نێـو باخـەکانی پڕ نـازو نیعمەتـدان، (**جَنَّـات**) کـۆی (**جَنَّة**)یـەو، بـە مانـای بـاخ و گـوڵ و گوڵـزارو سـەوزاییە، (**النَّعِيْـم**) واتـە: نـازو نیعمەت.

﴿ ثُلَّةٌ مِّنَ ٱلۡأَوَّلِينَ وَقَلِيلٌ مِّنَ ٱلۡأٓخِرِينَ ﴾، ئەمـە بـاسی کۆمەڵـی یەکەمـە، کـە لـە ڕووی ڕیزبەندییشـەوە لـە پێشـەوەن، دەفەرمـوێ: کۆمەڵێکـی زۆرن لـە پێشـووەکان و، کەمێکیـش لـە دواییـنەکان، واتـە: لـە کۆمەڵگاکانی پێشـوودا، پێش ئۆممـەتی موحەممەد ﷺ کۆمەڵێکـی زۆریـان تێدابـوون، لـە ئەوانـەی لـە پێشـکەوتووەکان و زۆر لـە خـوا نیزیکخراوەکان بوون، بەڵام لە دواییینەکان لەوانەی دوای ئەو ئۆممەتانە هاتـوون (لـە ئۆممـەتی موحەممـەد ﷺ) کەمێکیـان لەوان لـەو جۆری پێشـکەوتووان و زۆر لـە خـوا نیزیکخـراوان، تێـدان کـە دوایـی قسـەی لـێ دەکەیـن، لـە هەندێـک گێڕدراوانـدا هاتـوە، هەندێـک لـە هـاوەڵان لـەو بـارەوە نیگـەران بـوون: چـۆن دەبـێ لـە گەلـە ڕابـردوو و پێشـووەکاندا، زیاتـر جـۆری پێشـکەوتووەکانیان تێدابووبـن، ئـەم جـۆری پێشـکەوتووانە، کـە جۆرێکـی هـەرە نایابـە، لـە دوو جۆرەکـەی بەهەشـتییان، چـۆن دەبـێ کەمێـک لـە ئۆممـەتی موحەممـەد ﷺ لەوانـە بووبـن؟! دوایـی ئـەوەی لـەو بـارەوە هاتـوە، هەندێـک فەرمـوودەو دەق، دێنیـن.

www.alibapir.com



﴿ عَلَىٰ سُرُرٍ مَّوْضُونَةٍ ﴾، ئا ئەو پێشکەتووە چاکەکارانە لەسەر جێگاو تەختانێکی چنراو دانیشتوون و پاڵیانداوەتەوە، چونکە دوایی دەفەرموێ: ﴿ مُّتَّكِـِٔينَ عَلَيْهَا مُتَقَـٰبِلِينَ ﴾، شانیان داداوەو، پاڵیانداوەتەوە ڕووبەڕووی یەکدیی، (سُرُر) کۆی (سَرِیْر)ە، (سَرِیْر) بە کوردیی چوار پایەشی پێ دەڵێن، (سَرِیْر) یانی: تەخت، تەنیا ئەوەنیە جێگایەک بێ، بەڵکو بەرزیش کراوەتەوە، (سَرِیْر) بە (سُرُر)و، بە (أسرَّة)ش کۆ دەکرێتەوە، کە چوار پێچکەی هەبوون و بەرز کراوەتەوەو، نوێن و پێخەف بۆ پشوو لەسەردانی لەسەری ڕاخراوە.

کە دەفەرموێ: ﴿ عَلَىٰ سُرُرٍ مَّوْضُونَةٍ ﴾، لە سەر تەختانێکی چندراون، (مَوْضُون) لە ئەصڵدا بە چنینی زرێ دەگوترێ، دوایی بۆ هەر شتێکی دیکە، کە بە مەحکەمی چندرابێ، بەکارهێنراوە، ئەو چنرانەش بێگومان، یان بە زێڕ یان بە زیو، یان بە گەوهەرو مرواریيەو چنرانی ئاسایی نیە، ﴿ مُّتَّكِـِٔينَ عَلَيْهَا مُتَقَـٰبِلِينَ ﴾، لەسەر ئەو تەخت و جێگا بەرزانە، پاڵیانداوەتەوەو شانیان داداوە، ڕووبەڕووی یەکدیی، لە زۆر جێی قورئاندا، باسی ئەو ڕووبەڕووی یەکدیی دانیشتن و پێکەوە بوون و پێکەوە قسەکردنی بەهەشتییان کراوە، کە بە داخەوە لە نێو کلتوورو فەرهەنگی باوی میللەتاندا، ئەوە کەمتر زانراوەو دەرخراوەو کەمتر مافی خۆی پێدراوە، زۆر کەس ڕەنگە وا بەهەشت وێنا بکات، کە هەر کەسە بە تەنیا لە شوێنی خۆی دەبێ، وەک کۆمەڵگایەکی داخراوو کەس پەیوەندیی بە کەسەوە نیە!! بەڵام کە تەماشای قورئان دەکەین خوای کارزان زۆر باسی ئەوە دەکات کە بەهەشتییان ڕووبەڕووی یەکدیی پێکەوە دادەنیشن و قسە دەکەن، یادی دنیا دەکەنەوە، وەک لە سوورەتی (**الصافات**)دا لەوبارەوە کورتە باسێکمان کردوە.

﴿يَطُوفُ عَلَيْهِمْ وِلْدَٰنٌ مُّخَلَّدُونَ ﴾، واتە: لاوانێکی تازە پێگەیشتووی لە تەمەنی لاوێتییدا، هێڵدراوە، بەسەریانەوە دەگەڕێن، بێگومان بۆ خزمەتکردن، (**وِلْدَان**) کۆی (**وَلِیْد**)، یاخود (**وَلَد**)ە، واتە: لاوی تازە پێگەیشتوو، گەنجی کەم تەمەن، (**مُخَلَّدُون**) کۆی (**مُخَلَّد**)ە، کە بە مانای (**مُبْقَى**) هێڵدراوەیە، واتە: لەو تەمەنی

www.alibapir.com


گەنجێتیی و لاوێتییدا، دەهێڵرێنەوە، ئنجا ئایا ئەوانە خوا ﷻ بە تایبەت لە بەهەشتێ دا دروستیان دەکات، بۆ خزمەتی بەهەشتییان؟ یاخود: هەر منداڵی نەباڵقی مسوڵمانانن؟ یاخود: منداڵی نەباڵقی، نامسوڵمانانن؟ لەو بارەوە زانایان چەند ڕایەکیان هەن، دوایی قسەی لێ دەکەین.

﴿ بِأَكْوَابٍ وَأَبَارِيقَ وَكَأْسٍ مِّن مَّعِينٍ ﴾، ئەو گەنج و لاوانە بەگۆزە و سوڕاحیی و پەرداخی لە سەرچاوەی مەی پڕ کراوەوە، بەسەریانەوە دەگەڕێن. (**أَكْوَاب**) کۆی (**كُوب**)ە، (**أَبَارِيق**) کۆی (**إِبْرِيق**)ە، (**كَأْس**)یش هەم بە مەی دەگوترێ و، هەم بەو دەفرەش کە مەی تێدەکرێ، (**مَعِيْن**)یش واتە: بەچاو بینراو، یاخود: کانیی و سەرچاوەیەک کە ئاوەکەی لە بەر بڕوات و بە چاو ببینرێ، (**أَكْوَاب**) کە کۆی (**كُوب**)ە، (**كُوب: قَدَحٌ لاَ عُرْوَةَ لَه**)، (**كوب**) دەفرێکە هەنگڵی پێوە نەبێ و دەسکی پێوە نەبێ بگیرێ، بە کوردیی جامی پێ دەڵێین، یان جامۆلکەی پێ دەڵێین، هەڵبەتە (**كُوب**) هەندێکیشیان لێکیان داوەتەوە بە گۆزە واتە: گەورەتر لە (**إِبْرِيق**)، کە بە مانای سوڕاحیی دێ، (**أَبَارِيق**)یش کۆی (**إِبْرِيق**)ە، کە هەندێک دەڵێن ئەسڵەکەی فارسییە لە (**آبريز**)ەوە هاتوە، واتە: ئاوڕێژ، چونکە ئاو یان شەڕابی پێ دەکرێتە نێو پەرداخ و جامۆلکەکان، کەواتە: دەبێ (**كُوب**) لە (**إِبْرِيق**)ی گەورەتر بێ و (**إِبْرِيق**)یش لە (**كَأْس**)، کە (**كَأْس**) هەم بە خودی شەڕابەکە دەگوترێ، هەم بەو پەرداخەی شەڕابەکەی تێدەکرێ و دەخورێتەوە.

﴿ لَّا يُصَدَّعُونَ عَنْهَا وَلَا يُنزِفُونَ ﴾، ئەو شەڕابە، ئەو مەیە، کە دەیخۆنەوە، نە سەر ئێشەو ژانەسەری پێ دەگرن و، نە عەقڵیشیانی پێ لە دەست دەدەن، چونکە (**يُنْزِفُون**) خوێنراویشەتەوە: (**يَنْزِفُون**) (**نَزَفَ يَنْزِفُ**) واتە: عەقڵی لە دەستدا، عەقڵ لە دەست دەدات، هەروەها (**نَزَفَ يَنزِفُ**) واتە: شەڕابەکەی نەما، نامێنێ، دیسان: (**أَنزَفَ يُنْزِفُ**)یش هەم بە عەقڵ لە دەست دان، هەم بە لێبڕانی شەڕاب و مەی دەگوترێ، ئنجا دەفەرموێ: نە ژانەسەری پێ دەگرن و، نە عەقڵیشی پێ لە دەست دەدەن، یاخود: نە شەڕابەکەشیان لێ دەبڕێ.

www.alibapir.com


﴿ وَفَٰكِهَةٍ مِّمَّا يَتَخَيَّرُونَ ﴾، هەروەهـا ئـەو لاوە تازەپێگەیشـتووانە، بەسـەریانەوە دەگەڕێـن بـە میوەیـەک کـە خۆیـان هەڵیدەبژێـرن، (فَاكِهَـة) بـە نەنـاسراو هاتـوە، واتـە: هەمـوو جـۆرە میوەیـەک کـە خۆیـان لێـی هەڵدەبژێـرن.

﴿ وَلَحْمِ طَيْرٍ مِّمَّا يَشْتَهُونَ ﴾، لە گۆشتی باڵندەش، لەوەی خۆیان ئارەزووی دەکەن.

﴿ وَحُورٌ عِينٌ ﴾، هەروەهـا بـۆ ئـەوان (بـۆ ئـەو ئیماندارانـە) لـەو بەهەشـتانەدا، لـەو باخانـەدا ئافرەتـانی سـپیی و سـۆڵ و، چـاو گـەش و گـەورە، هـەن.

﴿ كَأَمْثَٰلِ ٱللُّؤْلُؤِ ٱلْمَكْنُونِ ﴾، وەک وێنـەی گەوهـەری شـێردراوە وان، هێنـدە سـپیی و صـاف و جـوان و بـێ پەڵـەو بـێ لەکـەن.

هەڵبەتـە لێـرەدا: ﴿ وَفَٰكِهَةٍ مِّمَّا يَتَخَيَّرُونَ ﴾ و ﴿ وَلَحْمِ طَيْرٍ مِّمَّا يَشْتَهُونَ ﴾، هەردووکیـان دەگێڕدرێنـەوە بـۆ: ﴿ بِأَكْوَابٍ وَأَبَارِيقَ ﴾، واتـە: ئـەو گەنـج و لاوە تـازە پێگەیشـتووانە، بەسـەریانەوە دەگەڕێـن، بـەو شـتانەوە، بـەڵام: ﴿ وَحُورٌ عِينٌ ﴾، هەرچەنـدە بـە: (**حـورٍ عينٍ**)یـش خوێنراوەتـەوە، بـەڵام زیاتـر بـە: ﴿ وَحُورٌ عِينٌ ﴾، خوێنراوەتـەوە، واتـە: بـۆ ئـەوان لـەوێ دا، هەیـە، نـەک: ﴿ وَحُورٌ عِينٌ ﴾ یـان بەسـەرەوە بگێڕدرێـن! واتـە: بـۆ وان لـە بەهەشـتدا هەیـە، ئافرەتـانی {(**حُـور**) کـۆی (**حَـوْرَاء**)ەو (**عِيْن**)یـش کـۆی (**عَيْنَـاء**)ە} سـپیی و جـوان و سـەرنجڕاکێش و، چاوگـەش و گـەورە، کـە وەک گەوهـەری شـێردراوە وان.

﴿ جَزَآءًۢ بِمَا كَانُوا۟ يَعْمَلُونَ ﴾، پاداشتی ئەوەیە کە دەیانکرد.

﴿ لَا يَسْمَعُونَ فِيهَا لَغْوًا وَلَا تَأْثِيمًا ﴾، لەوێـدا تێیـدا نابیسـتن، نـە قسـەی پـووچ، نە قسـەی گوناهبارکەر.

﴿ إِلَّا قِيلًا سَلَٰمًا سَلَٰمًا ﴾، تەنیـا شـتێک کـە لەوێـدا دەیبیسـتن، هـەر بریتیـە لە سـەلامی پەیتـا پەیتـا، کـە خۆیـان سـەلام لـە یەکـدی دەکـەن و فریشـتەکان سـەلامیان لـێ دەکەن.

ئنجا خوا بسم الله الرحمن الرحيم دێتە سەر باسی کۆمەڵی دووەم لە بەهەشتییەکان، کە بریتین لـە هـاوەڵانی دەسـتە ڕاسـت، یاخـود هـاوەڵانی سـەر بـە خێـرو بەرەکـەت.

www.alibapir.com


﴿ وَأَصۡحَٰبُ ٱلۡيَمِينِ مَآ أَصۡحَٰبُ ٱلۡيَمِينِ ﴾ هـاوەڵانی لای ڕاسـت، هـاوەڵانی لای ڕاسـت، کێـن و چۆنـن؟ واتـە: حاڵیـان بەشـێوەیەکە نایەتـە وەسـفکردن.

﴿ فِي سِدۡرٖ مَّخۡضُودٖ ﴾، ئەوانیـش حاڵیـان وایـە لـە نێو دارو درەختی سـیدر دان، سـیدر جـۆرە درەختێکـە، تاکەکـەی پـێ دەگوتـرێ: (سِـدْرَة)و (سِـدْر) نـاوی کۆیـە، (مَخْضُـود) بـێ دڕک، (مَخْضُـود) ئەوەیـە کـە دڕکـی شـکێنراوە، بـەڵام بێگومـان لێـرەدا مەبەسـت ئەوەیـە دڕکـی نیـە، لەبـەر ئـەوەی لـە دنیـا دا درەختـی سـیدر هەیـەو درەختێکـی بۆنخۆشـە، بـەڵام دڕکـی هەیـە، ئنجـا ئـەو درەختـە بۆنخۆشـەی لـە بەهەشـتدا هەیـە، بـێ دڕکـە.

﴿ وَطَلۡحٖ مَّنضُودٖ ﴾، مـۆزی لەسـەریەک ڕیـز بـوو، واتـە: درەختـی مۆزیـشی تێدایـە، کـە بەرەکـەی هەمـوو لەسـەریەک هەڵچـنراوەو ڕیـز بـووە.

﴿ وَظِلّٖ مَّمۡدُودٖ ﴾، سـێبەرێکی بـێ کۆتایـی، سـێبەرێکی درێـژ کـراوەش، نـەک تۆزێـک سـێبەرو دوایـی هەتـاوی بێنـێ!

﴿ وَمَآءٖ مَّسۡكُوبٖ ﴾، ئاوێکـی هەڵـڕژاو، لێرەدا خوا ﷻ بـاسی کۆی دیمەنی بەهەشـت دەکات، واتـە: لەلایەکـەوە درەختـی سـیدرو، لەلایەکـەوە درەختـی مـۆز کـە بەرەکـەی ڕیـز کـراوە، ئنجـا سـێبەرێکی دوورو درێـژ، ئنجـا ئاوێکـی هەڵـڕژاو، کـە وەک پێشـتر گوتمـان: بـە کوردیـی تاڤگـەی پـێ دەڵێـن، بـە عەڕەبیـی (شـلال)ی پـێ دەڵێـن.

﴿ وَفَٰكِهَةٖ كَثِيرَةٖ ﴾، هەروەها میوەی زۆر، واتە: زۆر جۆرە میوە.

﴿ لَّا مَقۡطُوعَةٖ وَلَا مَمۡنُوعَةٖ ﴾، نـە بـڕدراوە (میوەکـەی ببـڕێ و کۆتایـی بـێ) نـە ڕێ لێگیراویشـە، وەک میـوەی دنیـا نیـە، کـە لـە وەرزێکـدا هەیـەو لـە وەرزێکـی دیکـەدا نیـە، یاخـود هەیـە، بـەڵام دەبـڕێ، یاخـود ڕێـی لێدەگیـرێ، لـە بەهەشـتدا نـە میوەکـە کۆتایـی پێـدێ و، نـە ڕێشـی لێدەگیـرێ.

www.alibapir.com


﴿ وَفُرُشٍ مَّرْفُوعَةٍ ﴾، هەروەها چەند جێگایەک بۆ تێدا پشوودان و سرەوتن، کە بەرزکراونەوە، (فُرُش) کۆی (فِرَاش)ە، (مَرْفُوعَة)ش سیفەتی (فُرُش)ە، واتە: چەند جێیەک کە بەرزکراونەوە، ئنجا ئەو بەرزکرانەوەیە، دەگونجێ مانا مەعنەوییەکەی مەبەست بێ، واتە: زۆر بە قەدرو قیمەت و پڕ نرخ و بەهان، دەشگونجێ مەبەست پێی حاڵەتە ماددییەکەی بێ، واتە: لە ئاستی زەوی بەرزکراونەوە، نەک لەسەر زەوی بن.

﴿ إِنَّآ أَنشَأۡنَٰهُنَّ إِنشَآءً ﴾، یەکسەر لە باسی جێگاو ڕێگاو پێخەف و شوێنی ئیسراحەت دا، دێتە سەر باسی ئافرەتان، دەفەرموێ: ئافرەتەکانی بەهەشت بە پێگەیاندن و دروستکردنی تایبەت دروستمان کردوون.

﴿ فَجَعَلۡنَٰهُنَّ أَبۡكَارًا ﴾، گێڕاومانن بە کچ، واتە: ئافرەتی دەست لێ نەدراون.

﴿ عُرُبًا أَتۡرَابًا ﴾، (عُرُب) کە کۆی (عَرُوب)ە، بریتیە لەو ئافرەتەی مێردی خۆی زۆر خۆشدەوێ و زۆر پێوەی پەیوەستە، ﴿ أَتۡرَابًا ﴾، کۆی (ترب)ە، واتە: هاوتەمەنن لەگەڵ مێردەکانیان، یاخود ئافرەتەکان هەموویان هاوتەمەنی یەکدیین.

﴿ لِّأَصۡحَٰبِ ٱلۡيَمِينِ ﴾، هەموو ئەوە (ئەو نازو نیعمەتە هەمووی) بۆ هاوەڵانی دەستە ڕاست، ئەوانەی بە دەستی ڕاستیان نامەی کردەوەکانیان دەدرێتەوە، یان ئەوانەی خاوەنی خێرو خۆشیی و بەرەکەت و پێزن.

﴿ ثُلَّةٞ مِّنَ ٱلۡأَوَّلِينَ وَثُلَّةٞ مِّنَ ٱلۡأٓخِرِينَ ﴾، هاوەڵانی لای ڕاستیش، کۆمەڵێکی زۆر لە پێشووەکان هەن، کۆمەڵێکی زۆریش لە دواییەکان، واتە: لە ئۆممەتی موحەممەد ﷺ لە هەردوو لە ئۆممەتەکە زۆرن: لە پێشووەکان و، لە ئۆممەتی پێغەمبەری کۆتایی (موحەممەد)یش ﷺ، لە هاوەڵانی دەستە ڕاست، خەڵکێکی زۆر هەن.

www.alibapir.com


مەسەلە گرنگەکان

## مەسەلەی یەکەم:

**قەومانی ڕووداوی ئاخیر زەمان، ڕاستەو درۆی تێدانیە، کە مایەی نزمکردنەوەی کەسانێک و بەرزکردنەوەی کەسانێکی دیکەیەو، تێیدا زەوی بە توندیی ڕادەتەکێنرێ و، چیایەکان بە وردو خاش بوون دەهاڕدرێن و، دەبنە تۆزو گەردی پرژو بڵاو:**

خوا دەفەرموێ: ﴿إِذَا وَقَعَتِ ٱلْوَاقِعَةُ ۝١ لَيْسَ لِوَقْعَتِهَا كَاذِبَةٌ ۝٢ خَافِضَةٌ رَّافِعَةٌ ۝٣ إِذَا رُجَّتِ ٱلْأَرْضُ رَجًّا ۝٤ وَبُسَّتِ ٱلْجِبَالُ بَسًّا ۝٥ فَكَانَتْ هَبَآءً مُّنۢبَثًّا ۝٦﴾.

## شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە پێنج بڕگەدا:

١)- ﴿إِذَا وَقَعَتِ ٱلْوَاقِعَةُ ۝١ لَيْسَ لِوَقْعَتِهَا كَاذِبَةٌ﴾، هەر کات ڕووداوەکە قەوما! بەدڵنیاییی مەبەست لە ڕووداوەکە ڕۆژی دواییە، قۆناغی یەکەمی ڕۆژی دوایی، کە ئاخیر زەمان و، تێکچوونی گەردوون و، پێچرانەوەی ئەم لاپەڕەی ژیانی مرۆڤە، کە لە دنیادا دەیگوزەرێنێ، چونکە **(واقعة)** بۆ خۆی یەکێکە لە ناوەکانی ئاخیر زەمان، **(وَقَعَت: الوُقُوْع ثُبُوتُ الشَّيءِ وَسُقُوطُهُ)**، **(وُقُوع)** بە مانای چەسپاندنی شتێک و کەوتنی شتێکە، **(وَالوَاقِعَة: لاَ تُقالُ إلاَّ فِي الشِّدَّةِ وَالمَكْرُوه)**، وشەی **(وَاقِعَة)** تەنیا بۆ حاڵەتی سەختیی و، شتێک کە ناخۆشویستراو بێ دەگوترێ، هەروەها: **(الوَاقِعَة: الحَادِثَةُ الَّتِي وَقَعَتْ وَحَصَلَت، وَالوَاقِعَةُ: المَوْصُوفَةُ بِالْوُقُوعِ وَالحُدُوث)**، **(وَاقِعَة)** ئەو ڕووداوەی دەقەومێ و پەیدا دەبێ، **(واقعة)** ڕووداوێکی وەسفکراوە بە پەیدابوون و قەومان.

**(الطبري)** ڕەحمەتی خوای لێ بێ لە تەفسیرەکەی خۆیدا لە عەبدوڵڵای کوڕی عەبباسەوە (خوا لە خۆی و بابی ڕازی بێ) هێناویەتی کە گوتوویەتی: **(الْوَاقِعَةُ**

www.alibapir.com



**وَالطَّامَّةُ وَالصَّاخَّةُ، وَنَحْوُ هَذَا، مِنْ أَسْمَاءِ الْقِيَامَةِ، عَظَّمَهُ اللَّهُ) (جامع البيان: ٣٣٣٣٣)** واتە: (**الْوَاقِعَةُ وَالطَّامَّةُ وَالصَّاخَّةُ**)، وێنەی ئەوە، هەموویان لە ناوەکانی ڕۆژی قیامەتن، خوا ئەو ڕۆژەی مەزن پیشانداوە، بۆیە ئەو هەموو ناوانەی لێناون.

لە بارەی وشەی (**إِذَا**)وە کە لە سەرەتای ئایەتەکەوە هاتوە، دوو ڕای سەرەکیی هەن:

یەکەم: (**إِذَا: ظَرْفٌ مَحْضٌ لَيْسَ فِيهَا مَعْنَى الشَّرْطِ، وَالعَامِلُ فِيهَا مَا فِي مَعْنَى «لَيْسَ» مِنَ النَّفِي، كَأَنَّهُ قِيلَ: يَنْتَفِي الكَذِبُ بِوُقُوعِهَا إِذَا وَقَعَت، وَهَذَا اخْتِيَارُ الزَّمَخْشَرِي**).

واتە: کە دەفەرموێ: ﴿إِذَا وَقَعَتِ ٱلْوَاقِعَةُ لَيْسَ لِوَقْعَتِهَا كَاذِبَةٌ﴾، (**إِذَا**) لێرەدا زەرفێکی ڕووتە {(**ظرف**) واتە: کاتێک، یان شوێنێک کە شتێکی تێدا ڕوو دەدات}و مانای مەرجی تێدانیە، ئەوەی مەنصووبی کردوە، ئەوەیە کە لە مانای (**لَيْسَ**)دا هەیە، لە لابردن (**نَفي**)، کە دەفەرموێ: ﴿لَيْسَ لِوَقْعَتِهَا كَاذِبَةٌ﴾، واتە: ڕووداوەکە ڕوودانەکەی درۆ نیەو کاتێک ڕوودەدا، درۆی تێدا نامێنێ، زەمەخشەریی ئەم ڕایەی هەڵبژاردوە بۆ مانای (**إِذَا**).

دووەم: هەندێکی دیکە لە زانایان وەک (**أَبِي حَيَّان**) گوتوویەتی: (**إِذَا: شَرْطِيَّةٌ وَالعَامِلُ فِيهَا الفِعْلُ الَّذِي بَعْدَهَا وَالذِي يَلِيهَا، وَهُوَ اخْتِيَارُ أَبِي حَيَّان أي: ﴿إِذَا وَقَعَتِ ٱلْوَاقِعَةُ﴾ جُوزِيَ النَّاسُ كُلٌّ حَسْبَ عَمَلِهِ**).

گوتوویەتی: (**إِذَا**) لێرەدا بۆ مەرجەو، ئەوەش کە مەنصووبی کردوە، ئەو کردارەی دوایەتی و ئەوەی دوایی ویش، واتە: کاتێک ئەو ڕووداوە قەوما، خەڵک هەر کەسە بەپێی کردەوەی خۆی سزاو پاداشتی دەدرێتەوە.

هەردووک ڕایەکانیش وێدەچن، بەڵکو (**محي الدين درويش**) لە تەفسیرەکەی: (**إعراب القرآن الكريم**)دا دە (١٠) ڕای زانایانی هێناون لە بارەی ئەم (**إذا**)یەوە، ڕەحمەتی خوا لە زانایان بێ و، خوا پاداشتیان بداتەوە، هەندێک جاران بە بۆچوونی من زیاد لە پێویست خۆیان بە وردەکاریی زمانەوانییەوە سەرقاڵ

www.alibapir.com



کـردوە، لەسـەر حیسـابی هەندێـک لایـەنی دیکـە، کـە پێویسـتە بـۆ تێـدا قوڵبوونـەوەی قورئـان و لـێ تێگەیشـتنی و، وەرگرتنـی حیکمـەت و نهێنییـەکانی.

(**الطـبري**) دەربـارەی: ﴿إِذَا وَقَعَتِ ٱلْوَاقِعَةُ لَيْسَ لِوَقْعَتِهَا كَاذِبَةٌ﴾، دەڵـێ: (**وَالْكَاذِبَـةُ فِي هَـذَا الْمَوْضِـعِ مَصْـدَرٌ، مِثْـلُ الْعَاقِبَـةِ وَالْعَافِيَـةِ**)، وشـەی (**كَاذِبَـة**) لـەم شـوێنەدا: ﴿لَيْسَ لِوَقْعَتِهَا كَاذِبَةٌ﴾، چاوگـە، وەک (**العَاقِبَـةِ وَالْعَافِيَـةِ**)، (**عاقبـة**) سـەرەنجامەو، (**عافيـة**) واتـە: بـێ بەڵایـی و سـەلامەتیی، کەواتـە: ﴿إِذَا وَقَعَتِ ٱلْوَاقِعَةُ لَيْسَ لِوَقْعَتِهَا كَاذِبَةٌ﴾، کاتێـک ڕووداوەکـە قەوما، کـە ئاخیـر زەمانـە، لـە کاتی ڕوودانەکـەیدا درۆ نامێنـێ، بـەو واتایـە کـە هیـچ کـەس نامێنـێ، بڵـێ: ڕاسـت نیـە.

هەندێکـی دیکـە لـە زانایـان گوتوویانـە: (**كَاذِبَـةُ**) سـیفەتی وەسـفکراوێکی قرتێـنراوە، ﴿إِذَا وَقَعَتِ ٱلْوَاقِعَةُ لَيْسَ لِوَقْعَتِهَا كَاذِبَةٌ﴾، واتـە: (**لَيْـسَ لِوَقْعَتِهَـا نَفْـسٌ كَاذِبَـة**)، هیـچ کەسـێک نامێنـێ لـەو کاتـەدا درۆ بـکات و، بڵـێ ئاخیـر زەمـان و ڕۆژی دوایـی ڕاسـت نیـە.

## کۆی قسەی زانایان لەوبارەوە، لە سێ بۆچووندا کورت دەکەینەوە:

١- (**لَيْسَ لِوَقْعَتِهَا كَذِبٌ بَلْ هِيَ صَادِقَةٌ وَحَاصِلَةٌ يَقِيْنَاً**)، واتە: ڕوودانەکەی درۆی تێدانیە، بەڵکو ڕاستەو جێی دڵنیاییە.

٢- (**لَيْسَ لِوَقْعَتِهَا نَفْسٌ كَاذِبَة**)، واتە: بۆ ڕوودانەکە هیچ کەسی درۆکەر نابێ.

٣- (**لَيْسَ لِوَقْعَتِهَا كَاذِبَة**)، واتە: لە کاتی ڕوودانیدا، هیچ کەسێک نامێنێ، درۆ لەگەڵ خاوەنەکەی دا بکات، بە نکووڵییلێکردنی.

ئنجا دێتە سەر باسی ئەوە کە لەو ئاخیر زەمانەدا چی دەقەومێ! پێشێ دەفەرموێ:

٢)- ﴿خَافِضَةٌ رَّافِعَةٌ﴾، نزمکەرەوەیەو بەرزکەرەوەیە، (**الطبري**) ئاوای مانا کردوە، چونکە خوا بە ڕەهایی هێناویەتی، بەرزکەرەو نزمکەرە، چی بەرز دەکاتەوەو چی نزمدەکاتەوە؟خوا ﷻ باسی نەکردوە،بەڵام بەپێی سیاق دەگونجێ مانای بۆدابنرێ،

www.alibapir.com


خوای پەروەردگاریش بۆیە باسی نەکردوە، تاکو زیاتر لە واتایەک هەڵبگرێ و، کتێبی خۆیشی قەڵەباڵغ نەکات بە شتێک کە مرۆڤ فیکری پێ دەشکێ، **(الطبري)** دەڵێ: **(الْوَاقِعَة حِينَئِذٍ خَافِضَة أَقْوَامًا كَانُوا فِي الدُّنْيَا أَعِزَّاءَ إِلَى النَّارِ، ورَفَعَتْ أَقْوَامًا كَانُوا فِي الدُّنْيَا وُضَعَاءَ إِلَى رَحْمَةِ اللَّهِ وَجَنَّتِهِ) (أخرجه الطبري: ٣٣٣٣٥، عن قتادة).**

واتە: ئەو کارەساتە، ئەو ڕووداوە لەو ڕۆژەدا کۆمەڵە خەڵکێک کە لە دنیادا خاوەن عیززەت و باڵادەست بوون، نزمیان دەکاتەوەو، شۆڕیان دەکاتەوە بۆ ئاگری دۆزەخ، هەروەها کەسانێکیش کە لە دنیادا بێ دەست و پێ و ژێر دەست بوون، بەرزیان دەکاتەوە بەرەو بەزەیی خواو بەهەشتی خوا.

هەندێک لە زانایانیش گوتوویانە: ﴿ خَافِضَةٌ ﴾، واتە: نزمکەرەوەیە بۆ هەموو بەرزاییەکان، ﴿ رَّافِعَةٌ ﴾، واتە: بەرزکەرەوەیە بۆ هەموو نزمایییەکان، واتە: ئەم سەر زەوییە بەرزیی و نزمیی تێدا نامێنێ، هەمووی تەخت و یەکسان دەبێ، لە سووڕەتی (طه)دا خوای باڵادەست دەفەرموێ: ﴿ فَيَذَرُهَا قَاعًا صَفْصَفًا ﴿١٠٦﴾ ﴾طه، دەیکاتە تەختاییەکی بێ بەرزیی و نزمیی، ساف و بێ گرێ و گۆڵ.

٣)- ﴿ إِذَا رُجَّتِ ٱلْأَرْضُ رَجًّا ﴾، کاتێک زەوی ڕاتەکێنرا، بە ڕاتەکێنران، **(الطبري)** وشەی (رَجّاً) ئاوا لێکداوەتەوە: **(إِذَا زُلْزِلَتِ الأَرْضُ فَحُرِّكَتْ تَحْرِيْكاً)**، کاتێک کە زەوی لەرزێنرایەوەو، جووڵێنرا بە جووڵاندنێکی بەهێز.

٤)- ﴿ وَبُسَّتِ ٱلْجِبَالُ بَسًّا ﴾، چیایەکانیش وردو خاش کران، بەهاڕدران، **(فُتِّتْتْ الجِبَال فَتّاً فَصَارَتْ كَالدَّقِيقِ الْمَبْسُوسِ وَهُوَ الْمَبْلُولُ)**، چیایەکان هاڕدران، وەک ئاردی تەڕیان لێهات، ئاردێک کە تەڕ دەکرێ، دەبێتە هەویر، **(رَجَّهُ: هَزَّهُ، وَارْتَجَّ: اهْتَزَّ)**، **(رَجَّهُ)** واتە: **(هَزَّهُ)** ڕایتەکاند، ڕایشەقاند، **(وَارْتَجَّ: اهْتَزَّ)** هەردووکیان بە یەک واتان واتە: ڕاتەکێندراو، ڕاشەقێندرا، وەک خوا بسم الله الرحمن الرحيم لە سووڕەتی **(المزمل)**دا دەفەرموێ: ﴿ يَوْمَ تَرْجُفُ ٱلْأَرْضُ وَٱلْجِبَالُ وَكَانَتِ ٱلْجِبَالُ كَثِيبًا مَّهِيلًا ﴿١٤﴾ ﴾، واتە: ئەو ڕۆژەی زەوی دەلەرزی و چیایەکان دەبن بە تەپۆلکەیەک، لە ئاردێکی هاڕدراو، یان: لمێکی ورد،

www.alibapir.com


(البَسِيْسَـةُ عِنْـدَ العَـرَبِ: الدَّقِيْـقُ وَالسَّـوِيْقُ يُلَـتُّ وَيَتَّخَـذُ زَاداً)، (بَسِيْسَـة) لـەلای عەڕەبـان بریتیـە لـە ئـاردو هەویرێک کـە تۆزێک ئـاوی پێدەکەن و وەک توێشـوویەک هەڵدەگیـرێ.

٦)- ﴿فَكَانَتْ هَبَآءً مُّنۢبَثًّا﴾، ئنجا چیایەکان (کە ئاوا دەهاڕدرێن و وردو خاش دەکرێن) دەبن بە تۆزو گەردێکی پرژو بڵاو، وشەی (هباء) ناوی کۆیەو تاکەکەی بریتیە لە (هَبَاءَة)، (الهَبَاءُ: الغُبَارُ الّذِي تُطِيْرُه الرِّيْحُ فَيَلْزَقُ بِالأَشْيَاء)، (هَبَاءْ): بریتیە لەو تۆزو گەردەی با دەیڕفێنێ و، بە شتەوە دەنووسێ، تاکی (هَبَاء)یش (هَبَاءَة)یە، کە دەنکێکی ئەو تۆزەیە، (هَبَاءً) ناوی کۆیەتی.

(مُنْبَث) پرژو بڵاو، (بَثَّهُ) پرژو بڵاوی کرد، (منبثَّة) پرژو بڵاو بوو.

لە بارەی (هَبَاءً)وەش زانایان زۆر شتیان گوتوە:

١)- (هُوَ شُعَاعُ الشَّمْسِ الَّذِي يَدْخُلُ مِنَ الْكُوَّةِ كَهَيْئَةِ الْغُبَارِ)، بریتیە لە تیشکی خۆر کە لە پەنجەرەوە دێ، وەک شێوەی تۆزو گەرد دەنوێنێ، کە لە ڕاستییدا ئەوە تیشکی خۆر نیە شێوەی تۆزو گەرد دەنوێنێ، بەڵکو تۆزو گەردەکەیە بەهۆی تیشکی خۆرەکەوە دەردەکەوێ.

٢)- (هُوَ رَهَجُ الدَّوَابِّ) ئەو تۆزو خۆڵەیە کە لە بن پێی ئاژەڵان بەرز دەبێتەوە.

٣)- (تَطَايرٌ مِنْ شَرَرِ النَّارِ الّذِي لَا عَيْنَ لَهُ)، بریتیە لەو پارچە وردانەی کە لە ئاگر بەرز دەبنەوەو جەستەیان نیە، دووکەڵ و پارچەی وردی لێ بەرز دەبنەوە کە بۆت ناگیرێن.

٤)- (مَا تَذْرُوْهُ الرِّيَاحُ مِنْ حطَام الشَّجَر)، (هَبَاء) ئەوەیە کە بایەکان پاڵی پێوەدەنێن و بڵاوی دەکەنەوە، لە تۆزو گەردی تێکشکاوی گژوگیا.

مانایەکانیش هەموویان لێک نزیکن.

www.alibapir.com

خوا ﴿بسم الله الرحمن الرحيم﴾ لێرەدا باسی ئاخیر زەمان دەکات و بە سێ وەسف، پێناسەی دەکات:

١)- ﴿خَافِضَةٌ رَّافِعَةٌ﴾، نزمکەرو بەرزکەرە، ئەمەش دوو مانای هەن:

أ- مەبەست پێی نزمکەرو بەرزکەری مرۆڤەکانە لە ڕووی مەعنەوییەوە، هەندێکیان کە لە دنیادا خۆیان بە بەرزگرتوە، بەهۆی ئەو ڕۆژەوە نزم دەبنەوەو چییەتیان دەردەکەوێ و، هەندێکیش کە بە ناحەق نزمکراون، بەرز دەبنەوە.

ب- مەبەست پێی نزمکردن و بەرزکردنی بەرهەستە، واتە: ئەو بەرزاییانەی لەسەر زەویدا دەیانبینی، نامێنن، نزمایییەکانیش پڕدەبنەوە، بەرزاییەکانیش دادەکەون و سەرزەوی هەمووی تەخت دەبێ، وەک دواییش زیاتر باسی دەکەین.

٢)- ﴿إِذَا رُجَّتِ ٱلۡأَرۡضُ رَجّٗا﴾، کاتێ زەوی ڕادەتەکێنرێ، بەڕاتەکێنران (رَجّ) بریتیە لە ڕاشەقاندن و ڕاتەکاندن.

٣)- ﴿وَبُسَّتِ ٱلۡجِبَالُ بَسّٗا﴾، چیایەکانیش وردو خاش دەبن و دەهاڕدرێن، ﴿فَكَانَتۡ هَبَآءٗ مُّنۢبَثّٗا﴾، ئنجا دەبن بە تۆزو گەردی پرژوبڵاو.

لە تۆڕە کۆمەڵایەتییەکان لەگەڵتانین
Stay in touch on social media
نحن معكم عبر مواقع التواصل الاجتماعي
ڕاگەیاندنی مەکتەبی مامۆستا عەلی باپیر
عەلی باپیر/AliBapir
archive.org/details/@alibapir
عەلی باپیر/AliBapir
AliBapir
کەناڵی ڕاگەیاندنی مەکتەبی مامۆستا عەلی باپیر
www.alibapir.net
English - عربي - کوردی
ڕاگەیاندنی مەکتەبی مامۆستا عەلی باپیر

www.alibapir.com


## کورتە باسێک لە بارەی سەرەنجامی زەوی و چیایەکانەوە لە ئاخیر زەمان دا

ئـەم کورتـە باسـە لەبـەر ڕۆشـنایی چەنـد ئایەتێکـی قورئـانی مەزنـدا دەخەینـەڕوو، ئەویـش لـە دوو بڕگـەدا:

### بڕگەی یەکەم: لە بارەی زەوییەوە:

خوا ﷻ لە بارەی زەوییەوە کە چی بەسەر دێ! ئەم زەوییەی ئێمە ئێستا لەسـەری دەژیـن، ئارامـە وەک بێشـکەو لانکەیـەک، لەگـەڵ ئەوەشـدا کـە پێنـج جـۆرە جووڵـەو سـووڕانەوەی هـەن:

**١-** بە دەوری خۆیدا دەخولێتەوەو، لە بەرانبەر خۆردا بە خێرایی سی (٣٠) کیلۆمەتر لە خولەکێک دا، کە دەبێتە هۆی پەیدابوونی شەو و ڕۆژان، واتە: هەزارو هەشتسەد (١٨٠٠) کیلۆمەتر لە سەعاتێکدا.

**٢-** بە دەوری خۆردا دەخولێتەوە بە خێرایی سی (٣٠) کیلۆمەتر لە چرکەیەکدا، واتە: شەست (٦٠) ئەوەندەی خێرایی سووڕانەوەی بە دەوری خۆیداو، دەبێتە هۆی پەیدابوونی چوار کەشەکان.

**٣-** پاشان لەگەڵ خۆریشدا بە دەوری داڵی ڕاوەستاودا دەخولێتەوە بە خێراییەکی دیکە.

**٤-** دواییش لەگەڵ داڵی ڕاوەستاویشدا بە نێو چەقی کەهکەشاندا.

**٥-** دوایی لەگەڵ کەهکەشانیشدا سووڕانەوەیەکی دیکە هەیە، بەڵام ئێمە ئارام و سەقامگیری دەبینین، ئنجا خوا ﷻ لە چەند ئایەتێکدا لە قورئاندا، باسی ئەوەی کردوە کە زەوی چ گۆڕانکارییەکی بەسەر دادێ لە ئاخیر زەماندا، کە ئێمە وەك نمونە شەش (٦) دەقان دێنین:

www.alibapir.com


**١)**- لەو بارەوە لە سوورەتی (**إبراهيم**)دا خوا دەفەرمویٚ: ﴿ يَوۡمَ تُبَدَّلُ ٱلۡأَرۡضُ غَيۡرَ ٱلۡأَرۡضِ وَٱلسَّمَٰوَٰتُۖ وَبَرَزُواْ لِلَّهِ ٱلۡوَٰحِدِ ٱلۡقَهَّارِ ﴿٤٨﴾ ﴾ **إبراهيم**، واتە: ئەو ڕۆژە کە زەوی جیادەبێ لەم زەوییەی ئێستاو، ئاسمانەکانیش جیا دەبن لەم ئاسمانانەی ئێستا، واتە: نە ئاسمانەکان وەک خۆیان دەمێنن، نە زەویش، هەڵبەتە زەوی شتێکی بچووکە لە نێو ئاسمانەکاندا، بەڵام بۆ ئێمە زەوی ئەگەر لە ئاسمان گرنگتر نەبێ، کەمتر گرنگ نیە، چونکە ژیانی ئێمە بە زەوییەوە بەستراوەو، خوا ﷻ تەنیا زەوی واهەڵخستوە، ژیانی مرۆڤی لەسەر بگوزەرێ، ئنجا وەک لە تەفسیری سوورەتی (**إبراهيم**)دا گوتوومانە: ئەمە تاکە ئایەتێکە لە قورئاندا - بەپێی تێگەیشتنی من - کە وێنەی نیەو خوا ﷻ تێیدا باسی ئەوە دەکات، نە ئاسمانەکان وەک خۆیان دەمێنن لە ڕۆژی دواییداو، نە زەویش، بەڵکو دەگۆڕێن و عالەمێکی دیکە دێتە ئاراوە.

**٢)**- ئەو ئایەتانەی سوورەتی (**الزلزلة**)، کە خوا تێیان دا دەفەرموێ: ﴿ إِذَا زُلۡزِلَتِ ٱلۡأَرۡضُ زِلۡزَالَهَا ﴿١﴾ وَأَخۡرَجَتِ ٱلۡأَرۡضُ أَثۡقَالَهَا ﴿٢﴾ وَقَالَ ٱلۡإِنسَٰنُ مَا لَهَا ﴿٣﴾ يَوۡمَئِذٖ تُحَدِّثُ أَخۡبَارَهَا ﴿٤﴾ بِأَنَّ رَبَّكَ أَوۡحَىٰ لَهَا ﴿٥﴾ ﴾.

واتە: هەر کاتێک زەوی لەرزیەوە، ئەو لەرزینەوەیەی بۆی دانراوەو، زەوی قورساییەکانی خۆی دەرهاویشت {قورساییەکانی چین؟ خەزنەکان کە تێیدا شێردراونەوە، جەنازەکانی مرۆڤەکان و جندەکانن، هەرچی هەیە لە زەویدا، هەمووی دەردەهاوێ} مرۆڤیش بە سەرسوڕمانەوە گوتی: بۆچی وا دەکات؟ لەو ڕۆژەدا زەوی هەواڵەکانی خۆی باس دەکات، کە پەروەردگاری سروشی بۆ کردوە. {فەرمانی پێکردوە، کە دەبێ وا بکات}.

کە بێگومان ئەوە مەبەست پێی زمانی حاڵە، هەڵبەتە لەلای خوا ئاسانە زەوییش بێنێتە گۆ: ﴿ وَقَالُواْ لِجُلُودِهِمۡ لِمَ شَهِدتُّمۡ عَلَيۡنَاۖ قَالُوٓاْ أَنطَقَنَا ٱللَّهُ ٱلَّذِيٓ أَنطَقَ كُلَّ شَيۡءٖۚ وَهُوَ خَلَقَكُمۡ أَوَّلَ مَرَّةٖ وَإِلَيۡهِ تُرۡجَعُونَ ﴿٢١﴾ ﴾ **فصلت**، خوا کە هەموو شتێکی هێناوەتە گۆ، دەتوانێ زەوییش بێنێتە گۆ، بەڵام وا پێدەچێ مەبەست پێی ئەوەبێ: بە زمانی حاڵ، زەوی خەڵک تێدەگەیەنێ کە خوا فەرمانی پێکردوە،

www.alibapir.com


ژیانی مرۆڤ لەسەر زەوی کۆتایی پێ بێ، بۆیە وا زەوی دەکەوێتە ئەو جووڵە جووڵەو، دەرهاویشتنی قورساییەکانی خۆی.

**٣)**-لە سوورەتی **(الحاقة)**ش داخوا ﷻ ئاوا باسی ئەو گۆڕانکارییانە دەکات کە بەسەر زەوی دا دێن، دەفەرموێ: ﴿فَإِذَا نُفِخَ فِي الصُّورِ نَفْخَةٌ وَاحِدَةٌ ﴿١٣﴾ وَحُمِلَتِ الْأَرْضُ وَالْجِبَالُ فَدُكَّتَا دَكَّةً وَاحِدَةً ﴿١٤﴾ فَيَوْمَئِذٍ وَقَعَتِ الْوَاقِعَةُ ﴿١٥﴾﴾، واتە: کاتێ: یەک دانە فوو بە (کەڕەنا)دا کرا، {یانی: بۆ جاری یەکەم} زەوی و چیایەکان هەڵگیران و، بە یەکجار پێکدادران، . لەو ڕۆژەدا ڕووداوەکە {ئەو ڕووداوەی خوا هەواڵی پێداوەو پێشتر باسیکردوە} دەقەومێ {کە مەبەست پێی ئاخیر زەمانە}.

**٤)**- لە سوورەتی **(الإنشقاق)**یش دا خوا دەفەرموێ: ﴿وَإِذَا الْأَرْضُ مُدَّتْ ﴿٣﴾ وَأَلْقَتْ مَا فِيهَا وَتَخَلَّتْ ﴿٤﴾ وَأَذِنَتْ لِرَبِّهَا وَحُقَّتْ ﴿٥﴾﴾، واتە: کاتێک زەوی لێککێشرایەوە، هەرچی لە نێو هەناویدا هەیە، فڕێیداو خۆی خاڵیی کردەوە، {هیچی لە نێو خۆیدا نەهێشت} گوێی گرت بۆ پەروەردگاری و فەرمانبەر بوو، لەسەریشی پێویست بوو {ئەو فەرمانبەرییە، یاخود، ئەو ڕووداوەی بەسەری هاتوە چەسپا}.

**٥)**- لە سوورەتی **(الفجر)**یش دا خوا دەفەرموێ: ﴿كَلَّا إِذَا دُكَّتِ الْأَرْضُ دَكًّا دَكًّا ﴿٢١﴾﴾، واتە: نەخێر! وازبێنن {ئەی بێبڕوایەکان، ئەم **(كَلَّا)**یە پەیوەندیی بە پێش خۆیەوە هەیە} کاتێک زەوی وردو خاش بوو، بە وردو خاشبوونێکی تەواو، هاڕدرا بە هاڕدران.

**٦)**- ئەو ئایەتەی سوورەتی **(الواقعة)**، کە خوا دەفەرموێ: ﴿إِذَا رُجَّتِ الْأَرْضُ رَجًّا ﴿٤﴾﴾، واتە: کاتێک زەوی ڕاتەکێنرا بە ڕاتەکاندن.

ئنجا ئەگەر کەسێکی سەرکێڵ و سادە تەماشای ئەو ئایەتە موبارەکانە بکات، دەڵێ: بۆچی خوا ﷻ لە شوێنێکدا دەفەرموێ: زەوی لەرزیەوەو، لە شوێنێکی دیکەدا دەفەرموێ: زەوی و چیایەکان پێکدادران و، لە شوێنێک دا دەفەرموێ: زەوی ڕاتەکێنراو، لە شوێنێک دا دەفەرموێ: زەوی هەرچی لە هەناویدا هەیە، دەریهاویشت و، لە شوێنی دیکەدا دەفەرموێ: زەوی دەگۆڕدرێ؟!

www.alibapir.com


دەڵێین: لە ڕاستییدا ئەوانە قۆناغەکانی ئەو کارەساتە گەورەیەن، کە بەسەر زەویدا دێ، کە سەرەتا دەلەرزێتەوەو، دوایی بەرز دەبێتەوەو، دوایی لەگەڵ چیایەکان پێکدادەدرێن و، دوایی چیایەکان دەهاڕدرێن و، زەوی وردو خاش دەبێ، ئنجا خوای کاربەجێ لە هەر شوێنە باسی قۆناغێک و دیوێکی ئەو حاڵەتەی کردوە، کە لە ئاخیر زەماندا بەسەر زەویدا دێ.

## بڕگەی دووەم: لە بارەی چیایەکانەوە:

لەو بارەشەوە هەشت (٨) دەقان دێنین:

**١)**- لە سوورەتی (**التكوير**)دا خوا دەفەرموێ: ﴿وَإِذَا ٱلْجِبَالُ سُيِّرَتْ ۝٣﴾، واتە: کاتێک چیایەکان ڕۆیێندران، ڕۆیشتێندران، واتە: لە شوێنی خۆیان نەهێڵدران.

**٢)**- لە سوورەتی (**النبأ**)دا خوا دەفەرموێ: ﴿وَسُيِّرَتِ ٱلْجِبَالُ فَكَانَتْ سَرَابًا ۝٢٠﴾، واتە: چیایەکانیش ڕۆیشتێنران و بوونە تراویلکە، (**سَرَاب**) بە کوردیی تراویلکەی پێ دەڵێن، ئەوەیە کە لە بیابان دا لە دوورەوە تەماشای دەکەی، وەک شەپۆلی ئاو دێتە بەرچاوت، بەڵام دوایی کە لێی نیزیک دەبیەوە، دەبینی بەس شەپۆلی گەرما بووە، لەسەر بیابان، کە وێنەی ئاو دەکات، واتە: چیایەکان وەک تراویلکەیان لێ دێ، کە وردو خاش دەبن.

**٣)**- لە سوورەتی (**الواقعة**)دا خوا دەفەرموێ: ﴿وَبُسَّتِ ٱلْجِبَالُ بَسًّا ۝٥ فَكَانَتْ هَبَآءً مُّنۢبَثًّا ۝٦﴾، واتە: چیایەکان وردو خاشکران و هاڕدران و، بوونە تۆزو گەردی پرژو بڵاو.

**٤)**-لەسوورەتی(**المعارج**)دا،خوا ﷻ بەجۆرێکی دیکە،باسی چیایەکان دەکات کە لە ئاخیر زەماندا چییان لێ دێ! دەفەرموێ: ﴿وَتَكُونُ ٱلْجِبَالُ كَٱلْعِهْنِ ۝٩﴾، واتە: چیایەکان، وەک خورییان لێ دێ، خوریی ئەوەیە کە لە مەڕو بەران دەکرێتەوە، لە شوێنی دیکە دەفەرموێ: (كَٱلْعِهْنِ ٱلْمَنفُوشِ) وەک خوریی شکنراوە، شکنرانەوەش ئەوەیە

www.alibapir.com


خوریی پێشێ تۆپەڵێکە، دوایی دەزوو دەزوو لێکی دەکەیەوە، بۆ ئەوەی بچنرێ، یان بڕێسرێ، ئا ئەوە پێی دەگوترێ: شکنرانەوەو شیکرانەوە، واتە: ئەو چیایانە وەک خوریی شکنراوەو، شیکراوەیان لێ دێ.

٥)- لە سووڕەتی (**القارعة**)ش دا، هەر باسی ئەوە دەکات کە چیایەکان وەک خورییان لێ دێ، بەڵام لەوێ دەفەرموێ: ﴿وَتَكُونُ ٱلْجِبَالُ كَٱلْعِهْنِ ٱلْمَنفُوشِ ۝٥﴾، واتە: چیایەکان، وەک خوریی ڕەنگاو ڕەنگیان لێ دێ، (**مَنْفُوش**) هەندێک گوتوویانە: واتە: (**مَنْقُوش**) ڕەنگاو ڕەنگ، (**ذُو ألوَان**)، هەندێکیش گوتوویانە: (**مَنْفُوش**)یش هەر بە مانای پرژو بڵاوکردن و شیکردنەوە دێ، (**نَفَشَتْ فِيْهِ غَنَمُ القَوْم**) واتە: مەڕەکە بە شەو چووە نێو کشتوکاڵەکەوە، دەگوترێ: (**نَفَش**) لەبەر ئەوەی لەوێدا پرژو بڵاو دەبێتەوە.

٦)-لەسووڕەتی(**المرسلات**)یش دا، بەجۆرێکی دیکە خوا ﷻ باسی چیایەکان دەکات، دەفەرموێ: ﴿وَإِذَا ٱلْجِبَالُ نُسِفَتْ ۝١٠﴾، واتە: کاتێک چیایەکان (نەسف) بوون، واتە: لە شوێنی خۆیان هەڵقەنران و، لە بیخەوە هێندران، (**نَسْف**) هەم بە مانای هەڵقەندن، هەم بە مانای وردو خاش بوون و هاڕدرانیش دێ.

٧)- لە سووڕەتی (**الحاقة**)دا خوا دەفەرموێ: ﴿وَحُمِلَتِ ٱلْأَرْضُ وَٱلْجِبَالُ فَدُكَّتَا دَكَّةً وَٰحِدَةً ۝١٤﴾، واتە: زەوی و چیایەکان هەڵگیران و، یەکجار پێکدادران، واتە: وردو خاشکران.

٨)- دەقێکی دیکە کە پەیوەندیی هەم چیایەکانەوە هەیە، هەم بە زەوییەوە، کە بریتیە لە سێ ئایەتی سووڕەتی (**طه**)، کە خوا دەفەرموێ: ﴿وَيَسْـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلْجِبَالِ فَقُلْ يَنسِفُهَا رَبِّى نَسْفًا ۝١٠٥ فَيَذَرُهَا قَاعًا صَفْصَفًا ۝١٠٦ لَّا تَرَىٰ فِيهَا عِوَجًا وَلَآ أَمْتًا ۝١٠٧﴾.

واتـە: (ئـەی موحەممـەد ﷺ!) لـە بـارەی چیایەکانـەوە پرسـیارت لـێ دەکـەن (چییـان لـێ دێ لـە ئاخیـر زەماندا؟) بڵـێ: پـەروەردگارم لەبـەر یەکیان هەڵدەوەشـێنێ {(**نَسْـف**) بریتیـە: لـە بـەر یەکهەڵوەشـاندن و پارچـە پارچەکـردن} (**فَيَذَرُهَـا**) (هـا) یەکـەی دەچێتـەوە بـۆ زەوی، هەرچەنـدە باسی زەوی نەکـراوە، بەڵام چیایەکان لەسـەر

www.alibapir.com


زەویین و چیایەكان بە ڕواڵەت لەسەر زەوی دانراون، ئەگەرنا لە ڕاستییدا لە نێو زەوی دان، چونكە هەر چیایەك چەندەی بە دەرەوەیە، بە پێی قسەی زانایانی شارەزایانی زەویناسیی دەڵێن: لە حەوت هێندە، تاكو پازدە هێندەی بە ناخی زەویدا چۆتە خوار، بۆ وێنە: چیای هیمالایا، لووتكەی ئیڤرست، كە هەشت هەزارو هەشتسەدو شەشت و شەش (٨٨٦٦) مەتر یانی: دەوری نۆ كیلۆمەتر بەرزە، مانای وایە نۆ (٩) كیلۆمەتر جارانی دە (١٠) بكە، یان جارانی پازدە (١٥) بكە، واتە: دەوری نەوەد (٩٠) كیلۆمەتر، یاخود سەدو پەنجا (١٥٠) كیلۆمەتری بە ناخی زەویدا چۆتە خوار!} ئنجا خوا بسم الله الرحمن الرحیم دەفەرموێ: ﴿ فَيَذَرُهَا قَاعًا صَفْصَفًا ﴾، زەوی دەكات بە گۆڕەپانێكی تەخت و بێ بەرزیی و نزمیی (صَفْصَف) واتە: بێ گرێ، ﴿ لَّا تَرَىٰ فِيهَا عِوَجًا وَلَآ أَمْتًا ﴾، ئەمە لە ڕووی ڕەوانبێژییەوە پێی دەگوترێ: شێوازی درێژە پێدان (**إطناب**) چونكە حاڵ و مەقامەكە وا دەخوازێ، (**قَاعًا**) واتە: تەخت، (**صَفْصَف**) واتە: ساف و بێ گنج و گرێ و گۆڵ، دوایی دەفەرموێ: ﴿ لَّا تَرَىٰ فِيهَا عِوَجًا وَلَآ أَمْتًا ﴾، نە لاریی تێدا دەبینی، نە بەرزایی، (**عِوَج**) لاریی و، (**أَمْتْ**) بەرزایی، نە تەپۆلكەیەك، نە بەرزاییەك، نە گرێیەك، نە گنجێكی تێدا نابینی.

شایانی باسە: هەندێك لە زانایان كە بە بۆچوونی من باش لە ئایەتەكان ورد نەبوونەوە، پێیان وابووە ئەو ڕووداوانە پەیوەندییان بە قیامەتەوە هەیەو، وایانزانیوە ئەم گەردوونە هەروەك خۆی دەبێت، بەڵام ئایەتەكەی سوورەتی (**إبراهيم**) بابەتەكە بۆ ئێمە یەكلایی دەكاتەوە: ﴿ يَوْمَ تُبَدَّلُ الْأَرْضُ غَيْرَ الْأَرْضِ وَالسَّمَاوَاتُ ۖ وَبَرَزُوا لِلَّهِ الْوَاحِدِ الْقَهَّارِ ﴿٤٨﴾ ﴾ **إبراهيم**، واتە: ئەو ڕۆژەی نە ئاسمانەكان، نە زەوی، وەك خۆیان نامێنن و، هەموویان بۆ خوای تاكی ملپێكەچكەر دێنە گۆڕێ، واتە: كاتێك قیامەت دێ، ئەم عالەم و جیهانەی ئێستا ئێمە تێیدا دەژین، ئاوا نەماوەو جیهانێك و عالەمێكی دیكە هاتۆتە گۆڕێ و، ئێمە لە تەفسیری سوورەتی (**إبراهيم**)دا لە كاتی تەفسیركردنی ئەو ئایەت موبارەكەدا كە هێنامانەوە

{ئایـەتی ژمـارە (٤٨)} باسـمانکرد کـە پێغەمبـەری خـوا ﷺ دەفەرمـوێ: (خەڵـک لـە ڕۆژی قیامەتـدا لەسـەر زەوییـەک کـۆ دەکرێتـەوە بـۆ سـزاو پاداشـت و لێپرسرانـەوە کـە وەک نانێکـی سـپیی وایـە، لـەم سـەر بـۆ ئەوسـەری دیـارەو هیـچ نیشـانەیەکی کەسـی لەسـەر نیـە)[1]، کەواتـە: عالەمـی ڕۆژی دوایـی، قیامـەت بـە جۆرێکـی دیکـە دەبـێ.

لێـرەدا هەمـوو ئـەو گۆڕانکاریـی و ڕووداوانـە، کـە خـوا بـاسی زەوی و چیایـەکان دەکات، کـە بـە سـەریان دا دێـن، مـن هەوڵمـدا زۆربەیـان بێنـم، ئەمـەش هەمـووی بـاسی ئاخیـر زەمانـە، کـە قۆناغـی یەکەمـی ڕۆژی دواییـەو بریتیـە لـە کۆتایـی هاتنـی ئـەم ژیانـە دنیاییـە.




(١) {عَـنْ سَـهْلِ بْـنِ سَـعْدٍ رضي اللـه عنـه، قَـالَ: سَـمِعْتُ النَّبِـيَّ صـلى اللـه عليـه وسـلم يَقُـولُ: يُحْـشَرُ النَّـاسُ يَـوْمَ الْقِيَامَـةِ عَـلَى أَرْضٍ بَيْضَـاءَ عَفْـرَاءَ كَقُرْصَـةِ نَقِـيٍّ لَيْـسَ فِيهَـا مَعْلَـمٌ لأَحَـدٍ} (أخرجه البخـاري: ٦١٥٦، ومسـلم: ٢٧٩٠، وابـن حبـان: ٧٣٢٠، وأبـو يعـلى: ٧٥٤٩).

www.alibapir.com



### مەسەلەی دووەم:

**پۆلێنکردنی خەڵکی لە ڕۆژی قیامەت دا، بۆ سێ کۆمەڵی سەرەکیی: هاوەڵانی ڕاستەی سەر بەخێرو، هاوەڵانی چەپەی نەگبەت و، پێشکەوتووە زۆر لە خوا نیزیکخراوەکان، کە کۆمەڵێکی زۆریان لە پێشووەکان و کەمێکیشیان لە دوایینەکانن، واتە: پێشکەوتووە زۆر لە خوا نزیکخراوەکان:**

خوا دەفەرمویٚ: ﴿ وَكُنتُمۡ أَزۡوَٰجٗا ثَلَٰثَةٗ ﴿٧﴾ فَأَصۡحَٰبُ ٱلۡمَيۡمَنَةِ مَآ أَصۡحَٰبُ ٱلۡمَيۡمَنَةِ ﴿٨﴾ وَأَصۡحَٰبُ ٱلۡمَشۡـَٔمَةِ مَآ أَصۡحَٰبُ ٱلۡمَشۡـَٔمَةِ ﴿٩﴾ وَٱلسَّٰبِقُونَ ٱلسَّٰبِقُونَ ﴿١٠﴾ أُوْلَٰٓئِكَ ٱلۡمُقَرَّبُونَ ﴿١١﴾ فِي جَنَّٰتِ ٱلنَّعِيمِ ﴿١٢﴾ ثُلَّةٞ مِّنَ ٱلۡأَوَّلِينَ ﴿١٣﴾ وَقَلِيلٞ مِّنَ ٱلۡأٓخِرِينَ ﴿١٤﴾ ﴾.

## شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە نۆ بڕگەدا:

**١)**- ﴿ وَكُنتُمۡ أَزۡوَٰجٗا ثَلَٰثَةٗ ﴾ ئنجا ئێوەش بوونە سێ کۆمەڵ، دوای ئەوەی خوا ﷻ باسی ئاخیر زەمانی کرد، دەفەرمویٚ: لە دوای ئاخیر زەمان، کە قیامەت دێتە پێشێ، ئێوە دەبنە سێ کۆمەڵ، (**وَالأَزْوَاجُ: الأَصْنَافُ وَالأَنْوَاع**)، (**زَوْج**): بە مانای هەر شتێک دێ، کە لە وێنەی خۆی بەرانبەرێکی هەبێ، ئنجا چ ڕەگەزی جیا بێ، چ ڕەگەزی جیا نەبێ، بۆ نموونە: جووتە گا، یان جووتە پێڵاو، واتە: هەردووکیان وەک یەکن، دوایی وشەی (**أَزْوَاج**) بە مانای جۆرو پۆل و کۆمەڵ دێ، کە لێرەدا دەفەرمویٚ: ﴿ وَكُنتُمۡ أَزۡوَٰجٗا ثَلَٰثَةٗ ﴾، واتە: ئێوە دەبنە سێ کۆمەڵ، واتە: سێ کۆمەڵ کە هاوشێوەی یەکدیین، چونکە هەموویان مرۆڤن و، هەموویان بۆ سزادران و پاداشت درانەوە، زیندووکراونەوەو کۆ کراونەوە.

ئنجا خوا ﷻ دوای ئەوەی دەفەرمویٚ: دەبنە سێ کۆمەڵ، پۆلێنیان دەکات و هەر کام لەو کۆمەڵە، ناوونیشانێکیان لێ هەڵدەدا، دەفەرمویٚ:

**٢)**- ﴿ فَأَصۡحَٰبُ ٱلۡمَيۡمَنَةِ ﴾، ئنجا هاوەڵانی مەیمەنە.

www.alibapir.com


٣)- ﴿ مَآ أَصۡحَٰبُ ٱلۡمَيۡمَنَةِ ﴾، هاوەڵانی مەیمەنە کێن؟ (**المَيْمَنَة: مَفْعَلَةٌ مِنَ اليُمْنِ وَالمَيْمَنَةُ مَصْدَرٌ اليُمْنِ**)، (مَيْمَنَة) لەسەر کێشی (مَفْعَلَة)یە لە (يُمْن)ەوە هاتوە، (مَيْمَنَة) چاوگی (يُمْن)ە، (يُمْن) واتە: خێردار، بەرەکەتدار، (يُمْن) پێچەوانەی (شُؤْم)ە واتە: نەگبەت و بێ خێر، کەواتە: (يُمْن) واتە: بەرەکەتدارو سەربەخێر.

کە دەفەرموێ: ﴿ فَأَصۡحَٰبُ ٱلۡمَيۡمَنَةِ ﴾، واتە: (**الَّذِينَ يُجْعَلُونَ فِي الْجِهَةِ الْيُمْنَى فِي الْمَحْشَرِ، وَالْيَمِينُ جِهَةُ عِنَايَةٍ وَكَرَامَةٍ فِي الْعُرْفِ**) واتە: ئەوانەی لەلای ڕاست دادەنرێن، لە کاتی کۆکرانەوەدا لە قیامەت و، لای ڕاست هەمیشە ئەو لایەیە کە ڕێزو حورمەت و گرنگیی پێدانی زیاتری ئاراستە دەکرێ، (يَمِيْن)یش لە (يُمْن)ەوە داتاشراوە، واتە: بەرەکەت و پیرۆز سەر بەخێریی، کە دەفەرموێ: ﴿ مَآ أَصۡحَٰبُ ٱلۡمَيۡمَنَةِ ﴾، (مَا) بۆ پرسیارکردنە، واتە: هاوەڵانی لای ڕاست، یان هاوەڵانی سەر بەخێر، کێن؟ یانی: بە جۆرێکن کە بازنەی وەسفکردن ناتوانێ دەوری بدات.

ئنجا خوا ﷻ باسی کۆمەڵی دووەم دەکات، دەفەرموێ:

٤)- ﴿ وَأَصۡحَٰبُ ٱلۡمَشۡـَٔمَةِ . مَآ أَصۡحَٰبُ ٱلۡمَشۡـَٔمَةِ ﴾؟، هەروەها هاوەڵانی (مَشْئَمَة)، هاوەڵانی (مَشْئَمَة) کێن؟

(مَشْئَمَة)ش چاوگەو لە (شُؤْم)ەوە هاتوە، کەواتە: ﴿ وَأَصۡحَٰبُ ٱلۡمَشۡـَٔمَةِ ﴾، یانی: (**أَصْحَاب الشُّؤْمِ**)، هەروەک ﴿ فَأَصۡحَٰبُ ٱلۡمَيۡمَنَةِ ﴾، واتە: (**أَصْحَاب اليُمْن**)، پرسیارکردن لە بارەی هەردووکیانەوە، کە دەفەرموێ: ﴿ مَآ أَصۡحَٰبُ ٱلۡمَيۡمَنَةِ ﴾؟ ﴿ مَآ أَصۡحَٰبُ ٱلۡمَشۡـَٔمَةِ ﴾؟ ئەم پرسیارکردنە بۆ گەورەو گرنگ و قەبە پیشاندانە (**للتَفْخِيْم وَالتَّعْظِيْم**) واتە: بە جۆرێکە کە بە ئاسانیی نایەتە وەسفکردن.

ئنجا وەک چۆن: ﴿ فَأَصۡحَٰبُ ٱلۡمَيۡمَنَةِ ﴾، واتە: هاوەڵانی لای ڕاست، یاخود هاوەڵانی سەر بەخێرو بەرەکەتدار، بە هەمان شێوە: ﴿ وَأَصۡحَٰبُ ٱلۡمَشۡـَٔمَةِ ﴾، واتە: هاوەڵانی لای چەپ، یاخود هاوەڵانی نەگبەت و بێ خێر، ئنجا وەک چۆن (يَمِيْن) لە (يُمْن)ەوە هاتوە، (مَشْئَمَة)ش لە (شُؤْم)ەوە هاتوە، (**وَصِنْفٌ أَصْحَابُ الْمَشْأَمَةِ، وَهِيَ اسْمُ**

www.alibapir.com


جِهَةٍ مُشْتَقَّةٌ مِنَ الشُّؤْمِ، وَهُوَ ضِدُّ الْيُمْنِ، فَهُوَ الضُّرُّ وَعَدَمُ النَّفْعِ)، کۆمەڵی هاوەڵانی نەگبەتیی (یان کۆمەڵی لای چەپ) (مَشْئَمَة) لە (شُؤْم)ەوە هاتوە واتە: نەگبەتیی، ئەویش دژو پێچەوانەی (يُمْن)ە، واتە: خێرو بەرەکەت، کە بریتیە لە زیان و بێ کەڵکیی، لە ئایەتەکانی دیکەدا خوا ﷻ لە جیاتی: ﴿فَأَصۡحَٰبُ ٱلۡمَيۡمَنَةِ﴾، دەفەرموێ: (أَصْحَابُ الْيَمِينِ)و لە جیاتی: ﴿وَأَصۡحَٰبُ ٱلۡمَشۡـَٔمَةِ﴾، دەفەرموێ: (وأَصْحَابُ الشِّمَال)، ئنجا (يُمْن) دژو پێچەوانەی (شُؤْم)ەو، (يَمِيْن)یش دژو پێچەوانەی (شِمَال)ە، هەمیشە ئەمە عەدەتی عەرەبان وابووەو ڕەنگە عادەتی زۆربەی گەلانیش هەروابێ، کە لای ڕاست زیاتر بەلای پیت و پێزو بەرهەم و چاکەو خێر دانراوەو، لای چەپ بە لای نەگبەت و خراپە دانراوە، هەر بۆیە (شِمَال)و (مَشْئَمَةِ) لەلایەک و، (مَيْمَنَةِ)و (يَمِيْن)، لەلایەك، یەک واتایان هەیە، بەڵام بێگومان (مَيْمَنَةِ) لە (يُمْن)ەوە هاتوە، بە مانای سەربەخێر، (مَشْئَمَةِ)ش لە (شُؤْم)ەوە هاتوە بە مانای نەگبەت، بەڵام (يَمِيْن وشمال) ڕاست و چەپ، دژو پێچەوانەی یەکدیین.

٥)- ﴿وَٱلسَّٰبِقُونَ ٱلسَّٰبِقُونَ﴾، پێشکەوتووەکان پێشکەوتووەکان، خوا ﷻ بەپرسیار کردن ناپرسێ، پێشکەوتووەکان کێن و چۆنن؟ نا فەرموێ: (السَّابِقُونَ مَا السَّابِقُونَ؟) وەک بۆ هی پێشێ دەفەرموێ: ﴿فَأَصۡحَٰبُ ٱلۡمَيۡمَنَةِ مَآ أَصۡحَٰبُ ٱلۡمَيۡمَنَةِ﴾، ﴿وَأَصۡحَٰبُ ٱلۡمَشۡـَٔمَةِ مَآ أَصۡحَٰبُ ٱلۡمَشۡـَٔمَةِ﴾، بەڵکو بەس دەفەرموێ: ﴿وَٱلسَّٰبِقُونَ ٱلسَّٰبِقُونَ﴾، (حَقِيقَةُ السَّبْقِ: وُصُولُ أَحَدٍ مَكَانًا قَبْلَ وُصُولِ أَحَدٍ آخَرَ)، چییەتی (سبق) بریتیە لە گەیشتنی کەسێک بە شوێنێک بەر لەگەیشتنی یەکێکی دیکە، (سَابِق): واتە: پێشکەوتوو، کەسێک لە پێش کەسێکی دیکەوە بێ، (فلان سابق) واتە: ئەو پێشکەوتوەو لە پێشدا گەیشتوە، ئنجا کە لێرە دەفەرموێ: ﴿وَٱلسَّٰبِقُونَ ٱلسَّٰبِقُونَ﴾، (سَابِقُون)ی دووەم هەواڵە بۆ (سَابِقُونَ)ی یەکەم، واتە: پێشکەوتووەکان ئەوانن کە پێشکەوتوون لە ڕۆژی دواییدا، ئەوانن بردوویانەتەوەو براوەن.

یاخود: ﴿وَٱلسَّٰبِقُونَ ٱلسَّٰبِقُونَ﴾، (سَابِقُون)ی دووەم جەختکردنەوەیە بۆ هی یەکەم، واتە: ئەگەر بمانەوێ (سابقون) پێناسە بکەین، جگە لە ناوی خۆیان

www.alibapir.com


پێناسـەیەكی دیكـەی باشـترمان نیـە، وەك جـاری وا هەیـە كـە مەدحـی كەسـێك دەكـەی، ئەگـەر ئینسـانێكی بـاش بـێ، بـۆ وێنـە: ئەگـەر نـاوی ئەحمـەد بـێ دەڵێـی: كاكە ئەحمەد، ئەحمەدە، یان فڵانكەس، فڵانكەسە، بەڵام دوایی خوا ﷻ پێناسەی (سـابِقُون) دەكات و دەفەرمـوێ:

٦)- ﴿ أُولَٰٓئِكَ ٱلۡمُقَرَّبُونَ ﴾، ئەوانە زۆر نیزیكخراوانن، (الْمُقَرَّبُ: أَبْلَغُ مِنَ الْقَرِيبِ لِدَلَالَةِ صِيغَتِهِ عَلَى الْإِجْتِبَاءِ وَالتَّقْرِيْب)، (مقرَّب) بەهێزترە لە (قريب) بەهۆی گەیاندنی ڕێژگەكەی بۆ هەڵبژاردن و نیزیكخستنەوە، ئەوانە نیزیكخراوانن، واتە: ئەوانە كەسانێكن كە زۆر لە خواوە وە نزیكخراون.

٧)- ﴿ فِي جَنَّٰتِ ٱلنَّعِيمِ ﴾ لە نێو باخەكانی نازو نیعمەت دان.

٨)- ﴿ ثُلَّةٌ مِّنَ ٱلۡأَوَّلِينَ ﴾، ئەوانیش كۆمەڵێكی زۆرن لە پێشووەكان، (ثُلَّةٌ: خَبَرٌ عَنِ مُبْتَدَإٍ مَحْذُوفٍ: هُمْ ثُلَّة مِنَ الْأَوَّلِينَ)، (ثلَّة) هەواڵە بۆ نیهادێكی قرتێنراو، یانی: ئەوان كۆمەڵێكی زۆرن لە پێشووەكان (لە ئۆممەتە پێشووەكان) پێش ئۆممەتی ئیسلام.

٩)- ﴿ وَقَلِيلٌ مِّنَ ٱلۡأٓخِرِينَ ﴾، هەروەها كەمێكن لە دواییینەكان، واتە: لە ئۆممەتی موحەممەد دا ﷺ ئەم (السَّابِقُون المُقَرَّبُوْن) ژمارەیان كەمترە بە بەراورد لەگەڵ ئەوانەی لە ئۆممەتانی پێش ئۆممەتی پێغەمبەری كۆتایی دا بوون ﷺ.

هەندێـك گوتوویانـە: (ثلَّـة) بـە مانـای كۆمەڵێكـی زۆرە، هەندێكیـش گوتوویانـە: (ثلَّـة) بـە مانـای كۆمەڵێـك، چ كـەم بـێ، چ زۆر بـێ.

هەندێكیش لە زانایان ڕایان وایە كە خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ وَقَلِيلٌ مِّنَ ٱلۡأٓخِرِينَ ﴾، كەمێـك لـە دواییینـەكان، دەڵێـن: كەمێـك لـە زۆران، مانـای وایـە زۆر نایابـەو زۆر هەڵكەوتـوو و دەگمەنـە، وەك (سَـمَوءل) كـە یەكێكـە لـە شـاعیرەكان گوتوویـەتی: (تُعَيِّرُنَـا بِأَنّـا قَلِيْـلٌ عَدِيدُنـا ... فَقُلْـتُ لَهَـا إِنَّ الكِـرَامَ قَلِيْـلُ).

ئافرەتێـك دەدەوێنـێ، ئنجـا ئایـا دەسـتگیرانی بـووە، حـەزی لێكـردوە، هـەر كەسـێك بـووە، دەڵـێ:

عەیبـمان لـێ دەگـری بـەوەی ژمارەمـان کەمـە ... گوتـم هەمیشـە بەڕێـزەکان کەمـن.

ئەوانـەی بەڕێـزن و پەسـندو چاکـن، هەمیشـە کەمـن، کـەم و پوخـتن نـەک وەک خەڵکـی دیکـە زۆرو بـۆر بـن.



www.alibapir.com


## مەسەلەی سێیەم:

**باسی ئەو نازو نیعمەتە ناوازەیەی کە پێشکەوتووە زۆر لە خوا نیزیکخراوەکان، لێی بەهرەمەندن، کە سەرجەم حەوت نیعمەت و چاکەی سەرەکیین:**

**١)-** پاڵدانەوە لەسەر تەختی گەوهەربەند بەرامبەر بە یەکدی.

**٢)-** بە سەرەوەگەڕانی کوڕو کاڵی بە گەنجیی ماوەوە، بۆ خزمەتکردنیان بە سوڕاحیی و پێکی شەڕابەوە.

**٣)-** دووریی لەسەر ئێشەو سەرخۆشبوون، بە هۆی ئەو شەڕابەوە کە دەیخۆنەوە.

**٤)-** میوەی هەڵبژاردەی کە خۆیان کە هەڵیدەبژێرن، بەوەشەوە خزمەتچییەکان بەسەریاندا دەگەڕێن.

**٥)-** گۆشتی باڵندەی ئارەزوو کراویان.

**٦)-** لەو نیعمەتانەی بۆ پێشکەوتووە لە خوا نیزیکخراوەکان لە بەهەشتدا هەن، ئافرەتانی سپیی و سۆڵ و چاوگەش، وێنەی گەوهەری شێردراوە.

**٧)-** تێدا نەبیستنی قسەی پووچ و مایەی گوناهو، نەبیستنی جگە لە سەلامی بەردەوام و پەیتا پەیتا.

خوا دەفەرموێ: ﴿ عَلَىٰ سُرُرٍ مَّوۡضُونَةٍ ﴿١٥﴾ مُّتَّكِـِٔينَ عَلَيۡهَا مُتَقَٰبِلِينَ ﴿١٦﴾ يَطُوفُ عَلَيۡهِمۡ وِلۡدَٰنٌ مُّخَلَّدُونَ ﴿١٧﴾ بِأَكۡوَابٍ وَأَبَارِيقَ وَكَأۡسٍ مِّن مَّعِينٍ ﴿١٨﴾ لَّا يُصَدَّعُونَ عَنۡهَا وَلَا يُنزِفُونَ ﴿١٩﴾ وَفَٰكِهَةٍ مِّمَّا يَتَخَيَّرُونَ ﴿٢٠﴾ وَلَحۡمِ طَيۡرٍ مِّمَّا يَشۡتَهُونَ ﴿٢١﴾ وَحُورٌ عِينٌ ﴿٢٢﴾ كَأَمۡثَٰلِ ٱللُّؤۡلُوِ ٱلۡمَكۡنُونِ ﴿٢٣﴾ جَزَآءَۢ بِمَا كَانُواْ يَعۡمَلُونَ ﴿٢٤﴾ لَا يَسۡمَعُونَ فِيهَا لَغۡوًا وَلَا تَأۡثِيمًا ﴿٢٥﴾ إِلَّا قِيلًا سَلَٰمًا سَلَٰمًا ﴿٢٦﴾ ﴾.

www.alibapir.com



## شیكردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە یازدە بڕگەدا:

خـوای بـەرز ئـاوا بـاسی ئـەو نـازو نیعمەتـە دەكات، كـە پێشـكەوتووە لـە خـوا نزیكخـراوەكان تێیـدا دەگوزەرێنـن، دەفەرمـوێ:

١)- ﴿عَلَىٰ سُرُرٖ مَّوۡضُونَةٖ ١٥ مُّتَّكِـِٔينَ عَلَيۡهَا مُتَقَٰبِلِينَ﴾، لەسەر چەند تەخت و جێگایەكی چندراو، پاڵیانداوەتەوە ڕووبەڕووی یەكدیی، وشەی (**سُرُر وَأَسِرَّة**) هەردووكیان كۆی (**سَرِير**)ن، (**سَرِير: مَكَانُ الجُلُوسِ وَالْإِتِّكَاءُ**) (**سرير**) شوێنی دانیشتن و شاندادان و پاڵدانەوەیە، (**مَوْضُونَة**) وەک پێشتریش گوتمان لە (**وَضْن**)ەوە هاتوە كە بریتیە لە چنینی زرێ (**نَسْجُ الدِّرْع**) زرێ كە دەچنرێ، قوڵفە قوڵفە پێكەوە دەچنرێ، كاتی خۆی زرێ هەبووەو لەبەریان كردوە، بۆ ئەوەی شیرو تیرو چەكی بڕندە، كە بەكاریان هێناوە، كاریان تێ نەكات، (**وَضْن**) بە مانای چنینە، (**مَوْضُونَة: مَنْسُوجَة مِنَ المَعَادِنِ الفَاخِرَة**)، چنراو لە كانزایە بە نرخەكان، وەک: زێڕو ئەڵماس و زیو و گەوهەرو مرواریی، زانایان لەوبارەوە قسەی جۆراوجۆریان كردوە، بەڵام خوا ﷻ دەفەرموێ: تەختەچنراوەكان، كە بەدڵنیایی مەبەست ئەوە نیە لە موو، یان خوریی و تووک دەچنرێ، بەڵكو مەبەست ئەوەنیە كە لە ئاوریشمیش دەچنرێ، چونكە ئەگەروابووایە، خوا ﷻ ناوی دەهێنا، بەڵكو چنراون، یانی: لەو شتانەی زۆر بەنرخ و گرانبەهان، هەڵبەتە ئێمە لە دنیادا، تەنیا گەوهەرو مرواریی و زێڕو زیوو ئەڵماس، دەزانین، بەڵام هیچ گومانی تێدانیە، كە ئەو نازو نیعمەتەی خوا لە بەهەشت دایناوەو، ئەو كەلوپەلانەی خوا بۆ دۆستەكانی خۆی، بۆ بڕواداران لە بەهەشتدا داینناون، بەس ناویان وەک شتەكانی دنیایە، ئەگەرنا لە نێوەڕۆكدا زۆر جیان و هیچ گومان لەوەدا نیە، كە عەبدوڵڵای كوڕی عەبباس (خوا لە خۆی و بابی ڕازی بێ) ئەوەی گوتوەو بە عەقڵ و سەلیقەش دیارە، بە پێی ئایەتە موبارەكەكەی سوورەتی (**السجدة**) دەفەرموێ: ﴿فَلَا تَعۡلَمُ نَفۡسٞ مَّآ أُخۡفِيَ لَهُم مِّن قُرَّةِ أَعۡيُنٖ جَزَآءَۢ بِمَا كَانُواْ يَعۡمَلُونَ ١٧﴾، واتە: هیچ كەسێک نازانێ ئەوەی كە بۆیان پەنهانكراوە، لەوەی كە مایەی دڵخۆشیی و

www.alibapir.com



شادمانییانە، هیچ کەس چییەتەکەی نازانێ، هەروەها فەرمایشتەکەی پێغەمبەر ﷺ کە دەفەرموێ: {فِيْها ما لَا عَيْنٌ رَأَتْ، وَلَا أُذُنٌ سَمِعَتْ، وَلَا خَطَرَ عَلَى قَلْبِ بَشَرٍ} (أخرجه أحمد: ٨١٢٨، والبخاري: ٣٠٧٢، ومسلم: ٢٨٢٤، والترمذي: ٣١٩٧)، واتە: ئەوەی لە بەهەشتدا هەیە، نە هیچ چاوێک دیتوویەتی و، نە هیچ گوێیەک بیستوویەتی و، نە بەسەر ئەندێشەو خەیاڵی هیچ مرۆڤێکیشدا هاتوە، بەڵام خوا ﷻ کە بیەوێ ئێمە حاڵیی بکات، هەر بەو وشانەی ئێمە بەکاریان دێنین، دەگونجێ ئێمە حاڵیی بکات، لە گۆشەیەک لە نیعمەتەکانی خوا.

﴿ مُّتَّكِـِٔينَ عَلَيۡهَا مُتَقَٰبِلِينَ ﴾، وشەی (مُتَّكِئِيْن) لە (وَكء)ەوە هاتوە، (الإتِّكَاءُ: مِنَ الوَكءِ وَهُوَ بَيْنَ الإضْطِجاعِ وَالقُعُود)، (مُتَّكِئِيْن) واتە: شانیان داداوەو پاڵیان داوەتەوە، لە (وكء)ەوە هاتوە، کە بریتیە لە شاندانە سەر شتێک و، سەنگ دانە سەر شتێک، پاڵدانەوەو شاندادان لە نێوان دانیشتن و ڕاکشان دایە کە دەفەرموێ: (مُتَقَابِلِيْن) واتە: ڕووبەڕووی یەکدیین، خوا ﷻ وەک جاری دیکەش باسمانکردوە، زۆر باسی ئەو نیعمەتە دەکات، کە بەهەشتییەکان لە بەهەشتدا ڕووبەڕووی یەکدیین و، پێکەوە کۆدەبنەوەو، قسە دەکەن.

٢)- ﴿ يَطُوفُ عَلَيۡهِمۡ وِلۡدَٰنٞ مُّخَلَّدُونَ ﴾، کوڕانێکی لە تەمەنی گەنجێتییدا هێڵدراوە، لاوانێکی بە لاویی هێڵدراوە، بەسەریانەوە دەگەڕێن (بۆ خزمەت)، ئایا چییان پێیە کە بەسەریانەوە دەگەڕێن؟

٣)- ﴿ بِأَكۡوَابٖ وَأَبَارِيقَ وَكَأۡسٖ مِّن مَّعِينٖ ﴾، بە گۆزان و سوراحییان و پەرداخی (پڕلەمەی) لەسەر چاوەیەکی لەبەر ڕۆیشتوو، (أَكْوَاب) کۆی (كُوب)ەو (أَبَارِيْق) کۆی (إِبْرِيْق)ە، ﴿ وَكَأۡسٖ مِّن مَّعِينٖ ﴾، پەرداخێک لە مەیی، لە کانیی و سەرچاوەیەک کە لەبەری دەڕواو بە چاو دیارە، ﴿ يَطُوفُ عَلَيۡهِمۡ ﴾، (الطَّوافُ: المَشْيُ المُكَرَّرُ حَوْلَ شَيْءٍ وهو يَقْتَضِي المُلازِمَةَ لِلشَيْءِ)، (طَواف) بریتیە لە ڕۆیشتنێکی دووبارەو بەردەوام، بە دەوری شتێکدا کە مەبەست پێی ئەوەیە هەمیشە لەگەڵیەتی، واتە: هەمیشە لەگەڵیانن بۆ خزمەتکردن.

www.alibapir.com



﴿ وِلْدَانٌ مُّخَلَّدُونَ ﴾، (وِلْـدَان) کـۆی (وَلِيْـد) یـان (وَلَـد)ە، یـانی: گەنجـی تـازە پێگەیشـتوو، لاوی تـازە پێگەیشـتوو، ﴿ مُّخَلَّدُونَ ﴾، (مُفَعَّـلُ مِـنَ الخُلْـدِ) لەسـەر کێشی (مُفَعَّـل)ە، لـە (خُلْـد) واتـە: مـاوەوە، (أَي: لَا يَتَغَـيَّرُوْن) ناگۆڕێـن و ناکەونـە تەمەنـەوە، هـەر بـە گەنجیـی و لاویـی دەمێننـەوە بـۆ خزمەتکردن، (مُخَلَّـدُون: مُبْقَـوْن)، هـەر بـە لاویـی دەهێڵدرێنـەوە، هەندێکیـش گوتوویانـە: لـە (خَلَـدَة)وە هاتـوە واتـە: جۆرێـک لـە گوارەیـان لـە گوێدایـە.

بـەڵام زیاتـر وایێدەچـێ مەبەسـت لـە: (مُخَلَّـدُون) ئەوەبـێ کـە هێڵـدراوەن لـە تەمـەنی گەنجێتیـی و لاوێتییـدا.

﴿ بِأَكْوَابٍ وَأَبَارِيقَ وَكَأْسٍ مِّن مَّعِينٍ ﴾، (أَكْـوَاب) کـۆی (كُـوُب)ە، کـە بریتیـە لـە دەفـری شـەڕاب، کـە هەنگڵـی نەبـێ و، زاری هەبـێ، پێـی تێبکرێ، بۆیـە وایێدەچێ مەبەسـت پێـی گـۆزە بـێ، وەک ئیبنـو عەبباس رضي الله عنهما گوتوویـەتی: (الأَكْـوَابُ: الجِـرَارُ مِـنَ الفِضَّـة)، (أخرجـه الطـبري: ٣٣٣٨٤)، واتـە: (أَكْـوَاب) گـۆزە زیوینەکانـن، هەڵبەتـە (كُـوُب) ئێسـتا لە زاراوەی ئێستای ئێمەدا، واتە: پەرداخ، بەڵام مادام خوا بسم الله الرحمن الرحيم لە پێش (أَبَارِيْق) دا بـاسی دەکات، کـە ئێسـتا (إِبْرِيْـق) بـە مەسـینەو سـوڕاحیی دەگوتـرێ، کەواتـە: دەبـێ (كُـوب) لـە (إِبْرِيْـق) گەورەتـر بـێ، واتـە: گۆزەیـان بـە دەسـتەوەن پـڕن لـە شـەڕاب، (أَبَارِيْـق) کـۆی (إِبْرِيْـق)ەو ڕەنگـە لـە (آبريـز)ی فارسـییەوە هاتبـێ، ئـەو دەفـرەی کـە ئـاو و شـەڕابی پـێ لـە شـتی گچکەتـر دەکـرێ، کەواتـە: دەبـێ (أَكـواب) لـە (أَبَارِيْـق) گەورەتربـن، بۆیـە قسـەکەی عەبدوڵـڵای کـوڕی عەببـاس خـوا لـە خـۆی و بـابی ڕازییـێ زۆر جێـی خۆیـەتی کـە دەڵـێ: (الأَكْـوَابُ: الجِـرَارُ مِـنَ الفِضَّـة). (الأَبَارِيـقُ: جَمْـعُ إبْرِيـقَ التـي لَهَـا عـروة)، (إِبريـق) ئەوەیـە هەنگڵـی هەیـە، ئێسـتا پێـی دەڵێیـن: سـوڕاحیی، ﴿ وَكَأْسٍ مِّن مَّعِينٍ ﴾ (كَأْسٍ) بـە دەفـری شـەڕاب پـێ خواردنـەوە دەگوتـرێ، ئنجا پەرداخـە هەرچـی هەیـە، هەروەهـا بـە خـودی شـەڕابەکەش دەگوتـرێ، (مَعِيْن) یـش هـەم بـە خواردنەوەیـەک دەگوتـرێ کـە لـە سـەرچاوەیەکەوە، بـێ، هـەم بـە مانـای ڕۆیشـتوو (جاري)یـش دێ، ئـەوەی بەچـاو دەبینـرێ.

www.alibapir.com


(قتادة) وەک (الطبري) لێیەوە هێناوە: (عَنِ قَتَادَةَ ﴿وَكَأْسٍ مِّن مَّعِينٍ﴾ أي: خَمْرٍ جَارِيَةٍ)، (أخرجه: الطبري: ٣٣٣٩٤) واتە: شەڕابێک کە لە کانیی و سەرچاوەیەکە، لە بەری دەڕوات.

بەڵام ئایا ئەو شەڕابەی دەیخۆنەوە، وەک هی دنیایە کە سەر ئێشەو ژانەسەری پێ بگرن و، پێی سەرخۆش و بێهۆش بن و، عەقڵ و شعووریانی پێ لە دەست بدەن؟

بێگومان نەخێر.

٤)- ﴿لَّا يُصَدَّعُونَ عَنْهَا وَلَا يُنزِفُونَ﴾، نە بەهۆیەوە ژانەسەرو سەرئێشە ناگرن و، بەهۆشیەوە، هۆشیان لە دەست نادەن. خوێنراویشەتەوە: (ولا يَنْزِفون) ئەویش هەمان بە مانای هەیە، (نَزَفَ يَنزِفُ)و (أَنْزَفَ يُنزِفُ) مانایەکەیان هەریەکە.

ئایا چی دیکەشیان بەسەرەوە دەگێڕن ئەو لاوو گەنجانە؟.

٥)- ﴿وَفَٰكِهَةٍ مِّمَّا يَتَخَيَّرُونَ﴾ هەروەها میوەیەک لەوەی خۆیان هەڵیدەبژێرن، (فَاكِهَة)ی کە بە نەناسراو (نكرة) هاتوە، واتە: هەموو جۆرە میوەیەک لەوەی بۆ خۆیان لێی گوڵبژێر دەکەن.

٦)- ﴿وَلَحْمِ طَيْرٍ مِّمَّا يَشْتَهُونَ﴾، هەروەها لە گۆشتی باڵندەش، لەوەی ئارەزووی دەکەن، هەر جۆرە گۆشتێکی باڵندە کە ئارەزووی دەکەن، ئەوەشیان بەسەرەوە دەگێڕن.

ئەوانەی بۆ خزمەتکردنی بەهەشتییان، بەسەریانەوە دەگەڕێن، ئەو شتانەیان بەسەرەوە دەگێڕن، ئنجا خوا ﷻ باسی نیعمەتێکی دیکەی ئەو پێشکەتووە، زۆر لە خوا نیزیکخراوەکان دەکات:

٧)- ﴿وَحُورٌ عِينٌ﴾ هەروەها ئافرەتانی سپیی و جوان و چاوگەش، ﴿وَحُورٌ عِينٌ﴾، خوێنراویشەتەوە: (حُورٍ عِينٍ)، (حُور)یش کۆی (حَوْرَاء)ە و (عِين)یش کۆی (عَيْنَاء)ە، هەڵبەتە پێشتریش باسمانکرد (حَوْرَاء) یانی: ئافرەتی سپیی و ڕوون و جەستە ناسک

www.alibapir.com



(عِيْن)یش کە کۆی (عَيْنَاء)ە واتە: ئافرەتی چاوگەش و گەورە، پێشتریش باسی (حُور)مان کرد، کە بە سێ واتایان هاتوە:

١- ئافرەتانێک کە زۆر سپیین و جەستەیان زۆر جوانە.

٢- ئافرەتانێک کە هەر کەس تەماشایان بکات، چاوو سەرنجی لە سەر خۆیان کورت هەڵدێنن.

٣- ئافرەتانێک کە هەر کەسێک تەماشایان بکات، سەراسیمەو سەرگەردان دەبێ.

٨)- ﴿كَأَمْثَٰلِ ٱللُّؤْلُؤِ ٱلْمَكْنُونِ﴾، وەک گەوهەری شێردراوە وان، گەوهەر ئەگەر لە نێو صەدەفەکەی خۆی دابێ، هیچ تۆزو گەردێکی لێ نەنیشتوە، هەروەها ئەگەر شاردرابێتەوەو پەنهان کرا بێ، ڕەنگەکەی زۆر سپیی و جوانترە، ئنجا کە دەفەرموێ: ﴿ٱللُّؤْلُؤِ ٱلْمَكْنُونِ﴾، گەوهەری شێردراوە، پێشتر باسی گەوهەرمان کرد، کە چۆن ژیاندارێک لە دەریادا، ئەو گەوهەرە لە لیکێکی کە دەیڕێژێ، دروستی دەکات، (مَكْنُون)یش بە مانای (مَسْتُور) دێ، یانی: شێردراوە، ئنجا شێردراوە بە ڕەهایی، یاخود شێردراوە لە نێو قۆزاخەکەیدا.

٩)- ﴿جَزَآءًۢ بِمَا كَانُوا۟ يَعْمَلُونَ﴾، ئەوە پاداشتی ئەوەیە کە پێشتر دەیانکرد، ئەمەش بیرخستنەوەی هۆکاری ئەوەیە، کە چۆن گەیشتوونە ئەو نازو نیعمەتە؟ ئنجا نیعمەتی حەوتەم و کۆتایی باس دەکات و دەفەرموێ:

١٠)- ﴿لَا يَسْمَعُونَ فِيهَا لَغْوًا وَلَا تَأْثِيمًا﴾، لەوێدا (لەو بەهەشتەدا) نابیستن، نە قسەی پووچ و نە قسەی گوناهبارکەر، (**اللَّغْوُ: الكَلاَمُ الَّذِي لا يُعْتَدُّ بِهِ كالهَذَيانِ، والكَلاَمُ الَّذِي لَا مُحَصَّلَ لَهُ**)، (**لَغْو**): قسەیەکە هیچ گرنگیی پێ نادرێ، وەک قسەی وڕێنە، هەروەها ئەو قسەیە کە هیچ سوودو بەرهەمێکی نیە، قسەی وا لە بەهەشتدا نابیستن، ﴿وَلَا تَأْثِيمًا﴾، (**التَّأْثِيمُ: اللَّوْمُ والإِنْكَارُ، وهو مَصْدَرُ أَثَّمَ، إذا نَسَبَ غَيْرَهُ إلى الإِثْمِ**)، (**تَأْثِيمْ**) بە مانای ڕەخنەگرتن و نکوولّییکردنەو، چاوگە لە (**أَثَّمَ**) واتە: جگە لە خۆی پاڵدایە لای

www.alibapir.com


گوناح، واته: کەس لە بەهەشتدا نابیستێ کە بەرامبەرەکەی پاڵبداته لای گوناهو تاوان و قسەی خراپ، ئەدی چی لە وێدا دەبیستن؟

١١)- ﴿ إِلَّا قِيلًا سَلَـٰمًا سَلَـٰمًا ﴾ جگە لە گوترانی: سەلام سەلام، لە دوانی نێوان خۆیاندا قسەی پووچ نابیستن و، ڕەخنە لە یەکدیی گرتن و، قسەی ناشیرین بە یەکدی گوتن و گوناهبارکردن، نابیستن، ﴿ إِلَّا قِيلًا سَلَـٰمًا سَلَـٰمًا ﴾، جگە لە گوتنی سەلام، سەلام، واته: سەلامی بەردەوام لە یەکدی دەکەن.

جارێک یەکێک وا لە ئایەتانە حاڵیی بوو بوو، کە لە بەهەشتدا گۆرانیی و قسەی خۆش و دەنگی خۆش و مۆسیقای لێ نیە، گوتم: نەخێر، باشی لێ حاڵیی نەبووی، خوای کاربەجێ بۆیە باسی ئەوانە دەکات، چونکە پێشێ باسی شەڕاب و مەی خواردنەوەی کردوە، خواش ﷻ دەزانێ ئەوانەی لە دنیادا شەڕاب و مەی دەخۆنەوە، سەرخۆش دەبن و قسەی پووچ دەکەن، بگرە جاری وا هەیە، لەگەڵ یەکدییدا شەڕە چەنگەو چەنگە پرچەش دەکەن و لێک دەدەن، بەڵکو جاری وایە کوشتنی لێ پەیدا دەبێ، بۆیە خوا ﷻ کە باسی شەڕاب دەکات، باسی نەخۆشیی و ژانەسەرو سەرئێشە دەکات و دەفەرموێ: ئەوەی بەدوادا نایەت، هەم باس دەکات کە قسەی پووچ و خراپیشی تێدانیەو، سەرخۆشیی و بێهۆشیی و لە دەستدانی هەست و شعووری بەدوادا نایەت، ئایا ئەوە چ لەززەتێکە مرۆڤ شتێک بخوات، بەڵام دوایی ئەو عەقڵەی پێی لە ئاژەڵان جیادەبێتەوە، لە دەستی بدات و بە دەستی خۆی، خۆی نەفام بکات؟! بەدڵنیایی بەهەشتییەکان خوا ﷻ لەوە زیاتر ڕێزیان لێ دەگرێ، کە خواردن و خواردنەوەیەک بخۆن، عەقڵ و هەست و هۆشیان لە دەست بدەن، قسەی پووچ و خراپ و گوناهبارکەر لەگەڵ یەکدیی دا بکەن.

کە دەفەرموێ: ﴿ إِلَّا قِيلًا سَلَـٰمًا سَلَـٰمًا ﴾، واته: هەر سەلام لە دوای سەلام لەوێدا دەبیستن:

www.alibapir.com


**أ-** دەگونجێ مەبەست پێی سەلامی بەینی خۆیان بێ.

**ب-** دەشگونجێ مەبەست پێی سڵاو کردنی فریشتەکان بێ لێیان.

**ج-** دەشگونجێ مەبەست پێی سڵاوکردنی خوای پەروەردگار بێ لێیان.

لێرەدا لە بارەی (سرر موضونة)وە، ڕای دوو لە زانایان دێنین:

**یەکەم:** (الطبري) دەڵێ: (**فَوْقَ سُرَرٍ مَنْسُوجَةٍ، قَدْ أُدْخِلَ بَعْضُهَا فِي بَعْضٍ، كَمَا يُوضَنُ حَلَقُ الدِّرْعِ بَعْضُهَا فَوْقَ بَعْضٍ مُضَاعَفَةً، وَقِيلَ: إِنَّمَا قِيلَ لَهَا سُرَرٌ مَوْضُونَةٌ، لِأَنَّهَا مُشَبَّكَةٌ بِالذَّهَبِ وَالْجَوْهَرِ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ** رضي الله عنهما: ﴿عَلَىٰ سُرُرٍ مَّوْضُونَةٍ﴾، **قَالَ: «مَرْمُولَةٍ بِالذَّهَبِ»**) (جامع البيان: ٣٣٣٦٩)، (**وَقَالَ عِكْرِمَةُ وَقَولُهُ:** ﴿عَلَىٰ سُرُرٍ مَّوْضُونَةٍ﴾، **مُشَبَّكَةٍ بِالدُّرِّ وَالْيَاقُوتِ**) (جامع البيان: ٣٣٣٧٤).

واتە: (الطبري) گوتوویەتی: کە دەفەرموێ: ﴿عَلَىٰ سُرُرٍ مَّوْضُونَةٍ مُّتَّكِـِٔينَ عَلَيْهَا مُتَقَـٰبِلِينَ﴾، واتە: لەسەر چەند تەخت و جێگایەک کە چنراون، هەندێکی خراوەتە نێو هەندێکی، وەک چۆن ئاڵقەکانی زرێ دەخرێنە نێو یەک و لەسەریەک دادەنرێن و دەکرێن بە دووقات، ئەوانیش بەو شێوەیەن.

گوتراوە: بۆیە دەفەرموێ: لەسەر چەند تەختێک کە چنراون، چونکە بە زێڕو گەوهەر چندراون، لە عەبدوڵڵای کوڕی عەبباسەوە رضي الله عنهما هاتوە کە گوتوویەتی: ﴿عَلَىٰ سُرُرٍ مَّوْضُونَةٍ﴾، بە زێڕ پێکەوە پەیوەست کراون و چنراون.

لە (عِكْرِمَة)ەوە هاتوە کە گوتوویەتی: ﴿عَلَىٰ سُرُرٍ مَّوْضُونَةٍ﴾، واتە: بە گەوهەرو یاقووت، ئەو جێگاو تەختی ئیسراحەت و پشوو لەسەردانە، چنراون.

**دووەم:** قسەیەکی (**إبن عاشور**)یش دێنین هەر لەو بارەوە، چونکە وشەی: ﴿سُرُرٍ﴾، لە قورئاندا زۆر دووبارە بۆتەوە، دەڵێ: (**والسُّرُرُ جَمْعُ سَرِيرٍ، وهو كُرْسِيٌّ طَوِيلٌ مُتَّسِعٌ يَجْلِسُ عَلَيْهِ المُتَّكِئُ والمُضْطَجِعُ، لَهُ سُوقٌ أرْبَعٌ، مُرْتَفِعٌ عَلى الأرْضِ بِنَحْوِ ذِراعٍ، يُتَّخَذُ مِن مُخْتَلِفِ الأعْوادِ، ويَتَّخِذُهُ المُلُوكُ مِن ذَهَبٍ وفِضَّةٍ، ومِن عاجٍ ومِن**

www.alibapir.com



**نَفِيسِ العُودِ، كالأَبَنُوسِ، ويَتَّخِذُهُ العُظَماءُ المُتَرَفِّهُونَ مِنَ الحَدِيدِ الصِّرْفِ، ومِنَ الحَدِيدِ المُلَوَّنِ أوِ المُزَيَّنِ بِالذَّهَبِ، والسَّرِيرُ مَجْلِسُ العُظَماءِ والمُلُوكِ)**[1].

(**إبن عاشور**) ڕوونکردنەوەیەکی جوانی هێناوە بۆ وشەی: ﴿سُرُرٍ﴾:

دەڵێ: (سُرُر) کۆی (سَرِیر)ە، کە کورسییەکی درێژو فراوانە، هەم کەسێک کە بیەوێ پاڵبداتەوە لەسەری، دەتوانێ دانیشێ، هەم کەسێک کە دەیەوێ لەسەری ڕاکشێ، ڕادەکشێ، (واتە: وەک کورسی ئاسایی نیە، جێی نەفەرێک بێ) چوار پێچکەی هەن، لەسەر زەوی بەرزبۆتەوە بە ئەندازەی باسکێک کەمتر یان زیاترو، لە چەندان جۆرە تەختەو دار دروست دەکرێ و، حوکمڕانەکان ئەو تەخت و شوێنی ئیسڕاحەت لەسەرکردنە، لە زێڕ یاخود لە زیوو لە عاج، (عاج بە ددانی فیل دەگوترێ)، لەوە دروستی دەکەن، هەروەها لەو دارو درەختانەی زۆر دەگمەن و بە نرخن، وەک (ئەبەنووس)، خەڵکی دیکەی مەزنی خۆشگوزەران لە ئاسنی ڕووت، هەروەها لە ئاسنی ڕەنگ کراو و، لە ئاسنی ڕازاوە بە زێڕ، دروستی دەکەن و، تەخت (سَرِیر) شوێنی دانیشتنی مەزنان و، شوێنی دانیشتنی حوکمڕانانە.

کەواتە: ﴿سُرُرٍ﴾، کە کۆی (سَرِیر)ە، بە کوردیی دەگونجێ بگوترێ: تەخت، قەنەفە، قەرەوێڵە، ئەو شتانەی ئێمە پێیان ئاشناین، بەڵام کاتی خۆی حوکمڕانان ئەو تەختەی لە سەری دانیشتوون، چوار پایەو پێچکەی هەبوون، بەرز بووە، بابای دانیشتوو توانیویەتی چەند کەسی دیکە لە تەنیشت خۆی دابنێ و، خەڵکەکەی دیکەش لە بەرانبەری بوونە.

خوای بەرز دەیەوێ تێمان بگەیەنێ: ئەو بەهەشتییانەی دەیانبەمە بەهەشت، وەک چۆن لە دنیادا پادشایەکان دەژین و جێ و ڕێیان چۆنە، شوێنی ئیسڕاحەت و دانیشتن و پاڵدانەوەیان چۆنە، ئەو بەهەشتییانەش جێگاو ڕێگاو شوێنەکانیان

---

(١) التحرير والتنوير ج١١، ص: (٢٩٢، ٢٩٣).

بەو شێوەیەن، بەڵکو ئەوە بەس بۆ حاڵییکردنی ئێمەیە، چونکە ئێمەی خەڵکی دنیا، لە پادشاو حکومڕانان، خۆشگوزەرانترو لە جێگاو ڕێگای ئەوان خۆشترو بەرزترمان نەبینیوە، بۆیە خوای بەرز بەو شێوەیەمان بۆ پێناسەو وەسف دەکات، ئەگەرنا بێگومان جێگاو ڕێگای کەسێک کە لە بەهەشت دا پلەکەی لە هەموو کەس نزمترە، لە هی هەموو حوکمڕان و پادشایانی سەر زەوی خۆشترو ڕاقییترو بەرزترە.

لە تۆڕە کۆمەڵایەتییەکان لەگەڵتانین
Stay in touch on social media
نحن معكم عبر مواقع التواصل الاجتماعي
ڕاگەیاندنی مەکتەبی مامۆستا عەلی باپیر
عەلی باپیر/AliBapir
archive.org/details/@alibapir
عەلی باپیر/AliBapir
AliBapir
Google Play
App Store
کەناڵی
ڕاگەیاندنی مەکتەبی مامۆستا عەلی باپیر
www.alibapir.net
کوردی - عربي - English
ڕاگەیاندنی مەکتەبی مامۆستا عەلی باپیر

www.alibapir.com


## مەسەلەی چوارەم:

**باسی نازو نیعمەتی تەرخانکراو بۆ هاوەڵانی ڕاستە، کە سەرجەم شەش جۆرە نازو نیعمەتی ناوازەن:**

١)- نشینگەیان لە نێو دارستانی سیدری بێ دڕک دایە.

٢)- هەروەها لە نێو درەختی مۆزی میوەو گەڵا ڕیز بەستوو.

٣)- هەروەها سێبەری بەردەوامیان هەیە.

٤)- دیسان شوێنەکەیان تاڤگەو ئاوی هەڵڕژاوی لێن.

٥)- میوەی جۆراو جۆری زۆرو بەردەوامیشیان هەیە.

٦)- تەخت و جێگا بڵندیشیان هەن، کە ئافرەتانی بە تایبەتی دروستکراوی، هەمیشە کچ و، مێرد دۆست و، هاوتەمەنیانی تێدان.

ئەوانەی پێشێ نیعمەتی پێشکەوتووە زۆر لە خوا نیزیکخراوەکان بوون، کە بێگومان ئەوان پێگەو پلەیان بەرزترە، بۆیە نازو نیعمەتەکەشیان بەرزتر بوو، بەڵام ئەمانە هی هاوەڵانی لای ڕاستن، هاوەڵانێک کە ئەهلی خێرو چاکەن، ئەوانیش بەدڵنیایی لە نازو نیعمەتێکی گەورەدان:

خوا دەفەرموێ: ﴿ وَأَصْحَٰبُ ٱلْيَمِينِ مَآ أَصْحَٰبُ ٱلْيَمِينِ ﴿٢٧﴾ فِى سِدْرٍ مَّخْضُودٍ ﴿٢٨﴾ وَطَلْحٍ مَّنضُودٍ ﴿٢٩﴾ وَظِلٍّ مَّمْدُودٍ ﴿٣٠﴾ وَمَآءٍ مَّسْكُوبٍ ﴿٣١﴾ وَفَٰكِهَةٍ كَثِيرَةٍ ﴿٣٢﴾ لَّا مَقْطُوعَةٍ وَلَا مَمْنُوعَةٍ ﴿٣٣﴾ وَفُرُشٍ مَّرْفُوعَةٍ ﴿٣٤﴾ إِنَّآ أَنشَأْنَٰهُنَّ إِنشَآءً ﴿٣٥﴾ فَجَعَلْنَٰهُنَّ أَبْكَارًا ﴿٣٦﴾ عُرُبًا أَتْرَابًا ﴿٣٧﴾ لِّأَصْحَٰبِ ٱلْيَمِينِ ﴿٣٨﴾ ثُلَّةٌ مِّنَ ٱلْأَوَّلِينَ ﴿٣٩﴾ وَثُلَّةٌ مِّنَ ٱلْءَاخِرِينَ ﴿٤٠﴾ ﴾.

www.alibapir.com



## شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە چواردە بڕگەدا:

١)- ﴿وَأَصۡحَٰبُ ٱلۡيَمِينِ مَآ أَصۡحَٰبُ ٱلۡيَمِينِ﴾، هاوەڵانی لای ڕاست، هاوەڵانی لای ڕاست کێن و چۆنن؟ واتە: ئەوان بە شێوەیەکن کە بابای وەسفکراو، ناتوانێ وەسفیان بکات.

ئنجا دێتە سەر باسی ئەو نازو نیعمەتانەی کە تێیدان.

٢)- ﴿فِي سِدۡرٖ مَّخۡضُودٖ﴾، ئەوان لە نێو باخێکدان، کە درەختی سیدری دڕک شکێنراوی لێیە.

سیدر جۆرە درەختێکە بۆنی زۆر خۆشە، بەڵام دڕکی هەیە لە دنیادا، خوای بەرز دەفەرموێ: ﴿فِي سِدۡرٖ مَّخۡضُودٖ﴾، ئەو سیدرەی بەهەشتیيان لە نێویدان، بێ دڕکە، (**مخضود**) واتە: دڕک شکێنراو، بەڵام لێرەدا مەبەست ئەوەیە بێ دڕکە، (**خُضِدَ شوكُهُ: قُطِعَ**)، واتە: دڕکەکەی شکێنراوە، زانایان ئاوا باسی سیدر دەکەن دەڵێن: (**والسِّدْرُ: شَجَرٌ مِن شَجَرِ العِضاهِ ذُو ورَقٍ عَرِيضٍ مُدوَّرٍ، وَقَالَ فَخْر الدِّيْن الرَّازِي: ذُو وَرَقٍ صَغِيْرٍ بِخِلاَفِ الطَّلْحِ فَهُوَ ذُو ورَقٍ عَرِيضٍ**)، ڕەنگە سیدریش، جۆراو جۆر بێ، چونکە (**إبن عاشور**) دەڵێ: سیدر لەو درەختانەیە کە دڕکاویین و، گەڵایەکەی پان و خڕە، بەڵام (**فخرالدین الرازي**) دەڵێ: گەڵایەکەی بچووکە، بە پێچەوانەی مۆز (**طَلح**)ەوە کە گەڵایەکەی گەورەیە، واش پێدەچێ سیدر چەند جۆری هەبێ، جۆری گەڵا وردی هەبێ و، جۆری گەڵا درشتی هەبێ، هەروەک چۆن چنارو سپیدراو، دارو گوێزو ئەوانە، جۆریان زۆرە، بۆ وێنە: دارخورما زانایان دەڵێن: زیاتر لە هەشتسەد (٨٠٠) جۆر خورما هەیە لە دنیاداو دارەکەشی جۆراو جۆرە.

٣)- ﴿وَطَلۡحٖ مَّنضُودٖ﴾، {هاوەڵانی لای ڕاست، ئەو بەهەشتییانەی بە دەستی ڕاستیان نامەی کردەوەکانیان وەرگرتۆتەوە} لە نێو باخی مۆزدان، (**منضود**) واتە: ڕیز بەستوو، مۆزەکانیان لەسەر یەکن، (**الطبري**) گوتوویەتی: (**أَهْل التَّأْوِيل مِنَ الصَّحَابَة وَالتَّابِعِينَ**

www.alibapir.com



فَإِنَّهُمْ يَقُولُونَ: **الطَّلْحُ هُوَ المَوْز**)، دەڵێ: ئەوانەی قورئانیان ڕوونکردۆتەوە لە هاوەڵان و لە شوێنکەوتووانیان، دەڵێن: (**طلْح**): بریتیە لە مۆز، هەڵبەتە ئێمە هەر دەڵێین: مۆز، بەڵام لە ئەسڵ دا ناوەکەی (مەوز)ە، (**مَنْضُود: إسْمُ مَفْعُول مِنَ النَّضْدِ**)، (**نَضْد**) واتە: ڕیزکردن و ڕیز بەستن و لەسەریەک دانان و هەڵچنین، (**منضود**) ناوی بەرکارەو لە (**نَضْد**)ەوە هاتوە.

٤)- ﴿وَظِلٍّ مَّمْدُودٍ﴾، هەروەها لە نێو سێبەرێکی دوورو درێژدان، سێبەرێکە نابڕێتەوەو بێ کۆتاییە، (**الظِّلُّ المَمْدُودُ: الَّذِي لا يَتَقَلَّصُ كَظِلِّ الدُّنْيا، وهو ظِلٌّ حاصِلٌ مِنَ التِفافِ أَشْجارِ الجَنَّةِ**)، سێبەرێکە کورت نابێتەوەو کۆتایی نایەت، وەک سێبەری دنیا، ئەو سێبەرەی بەهەشتیش لە تێکچڕژانی دارو درەختەکانی بەهەشت، پەیدادەبووە.

٥)- ﴿وَمَآءٍ مَّسْكُوبٍ﴾، ئاوێکی هەڵڕژاو، دەگوترێ: (**سَكَبَ الماءَ: صَبَّهُ، وأُطْلِقَ هُنا عَلى جَرْيِهِ بِقُوَّةٍ يُشْبِهُ السَّكْبَ**)، واتە: ئاوەکەی ڕشت، بەڵام لێرەدا وشەی (**سَكب**) بەکارهێنراوە بە مانای ڕۆیشتنی ئاو بەهێز، وەک هەڵڕژێ.

منیش دەڵێم: ئەم لێکدانەوەیە ڕاست نیە، بەڵکو (**مسكوب**) واتە: هەڵڕژاو، وەک ئێمە ئێستا تاڤگەکان دەبینین، کە بە عەرەبیی پێیان دەگوترێ: (**شَلاَّلات**) وەک: تاڤگەی گەلی عەلی بەگ و سەرچاوەی زەڵم و، ئەو تاڤگانەی دیکە، کە دیمەنێکی زۆر جوانیان هەیە، واتە: لە بەهەشتدا ئاوی هەڵڕژاوو تاڤگەکان هەن.

٦)- ﴿وَفَٰكِهَةٍ كَثِيرَةٍ﴾، هەروەها لە نێو میوەیەکی زۆردان، واتە: میوەیەکی جۆراو جۆری زۆر.

٧)- ﴿لَّا مَقْطُوعَةٍ وَلَا مَمْنُوعَةٍ﴾، نە دەبڕێ نە ڕێی لێ دەگیرێ، واتە: نە ئەوەیە کە میوەکە ببڕێ و ئەندازەکەی کەم بێ، هەروەها ڕێشی لێ ناگیرێ.

یاخود: نابڕێ، بەو واتایە ئێستا هەبێ و دوایی نەبێ، وەک میوەی دنیا، بۆوێنە: تەڕەکارو کاڵەک و شووتیی و ترۆزیی و خەیار، لە کەشی هاویندا هەن، بەڵام

www.alibapir.com



دوایـی نامێنـن، مەگـەر هەڵگیرێـن، یـان بـە شـێوەیەکی ناسروشـتیی پێبگەیەنرێـن، خوا ﷻ هەر میوەیە لە کاتی خۆیداو، لە کەشی خۆیدا دروست دەکات، کە بۆ ئـەو کەشـە باشـە، پرتەقـاڵ و لیمـۆو نارنـج و ئەوانـە لـە کـەشی زسـتان دا، لەبـەر ئـەوەی مـرۆڤ پێویسـتیی بـە ڤیتامیـن سـیی (C) زیاتـرە، تاکـو بەرهەڵسـتیی زیاتـر بێ لـە بەرانبـەر نەخۆشـییەکانی کـە لـە سـەرما پەیدادەبـن، بـەڵام تـەڕەکارو شـووتیی و ترۆزیـی و خەیـارو کاڵـەک و ئەوانـە، هەمووپـان لـە کـەشی هاوینـدا، لەبـەر ئـەوەی هـەوا گەرمـەو مـرۆڤ پێویسـتیی بـە قەرەبـوو کردنـەوەی ئـاوی جەسـتەی هەیـە.

هەڵبەتـە بـە نسـبەت مـۆز (**طَلْـح**)ەوە، زانایـان زۆر قسـەیان لەسـەر کـردووەو زۆربەیـان گوتوویانـە: (**طَلْـح**) جـۆرە درەختێکـە کـە گـەڵای بـەرزەو، گەڵایەکـەشی زۆر پانـە، بـەڵام (**سِـدْر**) گـەڵای وردەو، کەواتـە: لـە گـەڵای وردەوە تاکـو گـەڵای پـان، یـانی: هەمـوو جـۆرە درەختێـک لـە بەهەشـتدا هەیـە.

وەک چـۆن (**الطـبري**) گـوتی: هـاوەڵان و شـوێنکەوتووان ڕایـان وایـە، کـە (**طَلْـح**) بـە مانـای (**مَـوْز**)ە، (**الشـوكاني**)یش دەڵـێ: (**قَـالَ أَكْـثَرُ الْمُفَسِّرِيـنَ: إِنَّ الطَّلْـحَ فِي الْآيَـةِ هُـوَ شَـجَرُ الْمَـوْزِ، وَقَـالَ جَمَاعَـةٌ: هُـوَ الطَّلْـحُ الْمَعْـرُوفُ، وَهُـوَ أَعْظَـمُ أَشْـجَارِ الْعَـرَبِ**)[١].

واتـە: زۆربـەی توێـژەرەوان گوتوویانـە: (**طَلْـح**) واتـە: درەختـی مـۆز، بـەڵام کۆمەڵێـک لـە زانایـان گوتوویانـە: مەبەسـت لـە (**طَلْـح**) ئـەو درەختەیـە کـە نـاسراوە، کـە گەورەتریـن درەختـی عەرەبانـەو گـەڵای زۆر پانـە.

منیـش دەڵێـم: هەردووکیـان گونجـاون، بـەڵام مـادام زیاتـر ڕایـان وابـێ کـە بـە درەختـی مـۆز دەگوتـرێ، ئـەو ڕایـە ڕاسـترە.

ئنجا خوا ﷻ باسی نیعمەتێکی دیکەیان دەکات، پێشتر باسی: ﴿سِدْرٍ مَّخْضُودٍ وَطَلْحٍ مَّنضُودٍ وَظِلٍّ مَّمْدُودٍ وَمَآءٍ مَّسْكُوبٍ وَفَٰكِهَةٍ كَثِيرَةٍ لَّا مَقْطُوعَةٍ وَلَا مَمْنُوعَةٍ﴾ی کـرد، ئـەوە پێنـج نیعمـەت، ئنجـا بـاسی نیعمـەتی شەشـەم دەکات دەفەرمـوێ:

---

(١) فتح القدير: ج٥، ص١٨٦.

www.alibapir.com



**٨)- ﴿وَفُرُشٍ مَّرْفُوعَةٍ﴾** هەروەها چەند جێگەو پێخەفێکی بەرزیان هەن، **(فُرُش)** کۆی (فِراشٍ)ە، **(فِراشٍ: مَكَانُ الإِسْتِرَاحَةِ وَالإِضْطِجَاعِ وَالنَّوْمِ)** **(فراش)** شوێنی پشوودان و ڕاکشان و خەوتنە، بەڵام بێگومان لە بەهەشت دا خەوی لێ نیە، وەک پرسیار لە پێغەمبەر کراوە ﷺ فەرموویەتی: {**النَّوْمُ أَخُو الْمَوْتِ**} **(أخرجه البيهقي في شعب الإيمان: ٤٧٤٥، والديلمي: ٦٩٠٧، وصححه الألباني)** واتە: خەوتن برای مردنە، بۆیە بەهەشت خەوتنی لێ نیەو، لە بەهەشتدا مرۆڤ ماندوو نابێ، تاکو پێویستیی بە ئەوە بکات بە هۆی خەوەوە، ئەو وزەیەی لە دەستی چووە، قەرەبووی بکاتەوە.

کەواتە: وەک چۆن خواردن و خواردنەوەکانی بەهەشت بەس بۆ چێژوەرگرتن و خۆشیین، نەک بۆ لابردنی تینوێتیی و برسیەتیی، شوێنی پشوودانیش بە هەمان شێوە بۆ خەوتن و لابردنی ماندوێتیی نیە! کە دەفەرموێ: ﴿وَفُرُشٍ مَّرْفُوعَةٍ﴾، یانی: ئەو جێگاو پێخەفانە بەرز کراونەوەو لەسەر تەختەکان دانراون، **(أي: مَرْفُوعَةٌ عَلَى الأَسِرَّةِ أَيْ لَيْسَتْ مَفْرُوشَةً عَلَى الأَرْضِ)**، واتە: ئەو پێخەف و نوێنانەی بۆ ئیسڕاحەت و ڕاکشان داندراون، بەرز کراونەوە لەسەر تەختەکان، نەک لەسەر زەوی دابندرێن. یاخود: ﴿وَفُرُشٍ مَّرْفُوعَةٍ﴾، واتە: ئەو جێگایانە زۆر بەرزن و لە ڕووی بەهای مەعنەوییەوە زۆر زۆر گرانبەهان، ئنجا خوا ﷻ یەکسەر لە باسی جێگاو شوێنی ئیسڕاحەت و تێدا پشوودان، یەکسەر دێتەوە سەر باسی ئافرەتانێک کە لە بەهەشتدا هەن، چونکە لەگەڵ مرۆڤ باسی شوێنی ئسڕاحەت و پشوودانی کرد، یەکسەر پیاو خەیاڵی بە لای هاوسەریدا دەچێ و، ئافرەت خەیاڵی بە مێردی دا دەچێ، بۆیە دەفەرموێ:

**٩)- ﴿إِنَّآ أَنشَأْنَٰهُنَّ إِنشَآءً﴾** {هەرچەندە باسی ئافرەتەکان نەکراوە، بەڵام بەسیاق و سەلیقە دەزانین واتە:} ئەو ئافرەتانەی لەو جێگاو ڕێگاو پێخەف و نوێنانەدا ئیسڕاحەت دەکەن، لەگەڵ مێردەکانیان، ئێمە بە تایبەتیی دروستمان کردوون، **(إِنْشَاء)** بریتیە لە پێکگەیاندن و دروستکردن، **(إِنْشَاء)** واتە: بە پێگەیاندنێکی تایبەت پێمان گەیاندوون و دروستمانکردوون.

www.alibapir.com


**١٠)- ﴿ فَجَعَلۡنَٰهُنَّ أَبۡكَارًا ﴾**، گێڕاومانن بە کچ، ئنجا ئایا هەر ئافرەتەکانی دنیان، خوای پەروەردگار کە دروستیان دەکاتەوە، لە شێوەی کچاندا دروستیان دەکاتەوە، یان مەبەست پێی ئەو حۆرییانەن کە خوا بە تایبەت بۆ پیاوانی بەهەشت دەیانخوڵقێنێ؟ هەردوو واتایەکە دەگەیەنێ و دەشگونجێ هەردووکیشیان وێکڕا هەم ئافرەتەکانی دنیاو، هەم حۆرییەکانیش خوای کارزان ئاوا دروستیان بکات.

**١١)- ﴿ عُرُبًا أَتۡرَابًا ﴾** مێرد خۆشویستەری هاوتەمەنن، (**عُرُب**) کۆی (**عَرُوب**)ە، (**العَرُوبَ: المَرْأَةُ المُتَحَبِّبَةُ إلى زَوْجِهَا**)، ئافرەتێک کە خۆی لە لای مێردەکەی خۆی خۆشەویست دەکات، (**عُرُب**) کۆی (**عَرُوب**)ە، هەروەها (**عرِبة**)ەشی پێ دەگوترێ: کە بە (**عرِبات**) کۆ دەکرێتەوە، واتە: ئەو ئافرەتەی خۆی لە لای مێردی خۆی خۆشەویست دەکات، مێردی خۆی خۆشدەوێ و، بۆی دڵسۆزە، (**أتْرَاب**) کۆی (**ترب**)ە واتە: هاوتەمەن، واتە: تەمەنیان لەگەڵ مێردەکانیان دا یەکە، یاخود: ئافرەتەکان پێکەوە هاوتەمەنن، ئنجا (**ترب**) بۆ ئافرەت بەکاردێ، بەڵام بۆ پیاوان، ئەگەر بویسترێ بگوترێ: هاوتەمەنن، دەبێ بگوترێ: (**أقْرَان**) کە تاکەکەی (**قِرْن**)ە، (**فُلَان قِرْنُ فُلَان**) واتە: پێکەوە هاوتەمەنن، بەڵام بۆ ئافرەت دەگوترێ: (**فُلَانَةُ تِرْبُ فُلَانَةٍ**) ئەو ئافرەتە هاوتەمەن لەگەڵ فڵان ئافرەتەدا.

**١٢)- ﴿ لِّأَصۡحَٰبِ ٱلۡيَمِينِ ﴾**، بۆ هاوەڵانی لای ڕاست.

**١٣)- ﴿ ثُلَّةٞ مِّنَ ٱلۡأَوَّلِينَ ﴾**، کۆمەڵێکی زۆر لە گەلە پێشووەکان (هاوەڵانی لای ڕاستن لە بەهەشتدا).

**١٤)- ﴿ وَثُلَّةٞ مِّنَ ٱلۡأٓخِرِينَ ﴾**، کۆمەڵێکی زۆریش لە دواییینەکان (واتە: لە ئوممەتی پێغەمبەری کۆتایی ﷺ).

کە خوا ﷻ یەکسەر لە باسی پێخەف و جێگاو ڕێگای تێدا ئیسراحەت کردن دا، یەکسەر باسی ئافرەتانی کرد، وشەی (**فِرَاش**) کۆیەکەی (**فُرُش**)ە، لە فەرمایشتی پێغەمبەردا ﷺ هەم بۆ ژن، هەم بۆ مێردیش بەکارهاتوە، وەک لە فەرمایشتێکی

www.alibapir.com


پێغەمبــەردا هاتــوە ﷺ: {الْوَلَـدُ لِلْفِـرَاشِ وَلِلْعَاهِـرِ الْحَجَـرُ} (أخرجـه البخـاري: ١٩٤٨، ومسـلم: ١٤٥٧)، واتـە: منـداڵ هـی ئـەو جێیەیـە کـە تێیدا لـە دایک بووە، ئەوکەسـەش کـە داوێـن پیسـیی کـردوە، بـەردی بـە زار، واتـە: هیچـی پـێ نابـڕێ، کەواتـە: (فِـرَاش) هـەم بـۆ ژن بـەکاردێ و، هـەم بـۆ پیاویـش بـەکاردێ، لەبەرئـەوەی ژن و پیـاو لـەو پێخـەف و نوێنـەدا ئیسـڕاحەت دەکـەن، کـە لـە ماڵەوەیاندایـە.

ئێمـە لـە کۆتایـی بـاسی ئـەو نـازو نیعمەتانـەدا کـە بـۆ هـاوەڵانی لای ڕاسـت تەرخانکـراون، دەڵێیــن:

ئـەو نـازو نیعمەتانـەی بـۆ پێشـکەوتووەکان و لـە خـوا نزیکخـراوەکان، باسـکراون، بـە گشـتیی بەرزتـرن لـەوەی بـۆ هـاوەڵانی لای ڕاسـت باسـکراون، بـەڵام دەبـێ لـە یـەک شـت وریا بین: مـەرج نیە ئەوەی خوا ﷻ بۆ پێشـکەوتووە زۆر لە خوا نیزیکـەکانی باسـکردوون و، ئـەوەی بـۆ هـاوەڵانی لای ڕاسـتی باسـکردوون، مانـای وابێ: هەرچـی خـوا بـۆ وانی باسـکردوە، ئـەوان نیانـەو، هەرچـی بـۆ ئـەوانی باسـکردوە، ئـەوان نیانـە، بەڵکـو بەهەشـت هەرچـی مـرۆڤ دڵـی بیخـوازێ لێیـەتی، بـۆ هەمـوو کـەس، بـەڵام هـەر کەسـە بـە پێـی پلـەو پێگـەی خـۆی، ئەگەرنـا خـوای بـەرز کـە بـاسی (سَـابِقُون) دەکات، فـڵان شـتەیان هەیـەو فـڵان شـتەیان هەیـە، دوایـی بـاسی (أَصْحَـابُ الیَمِـیْن) دەکات، کـە ئەوانیـش ئـەو شـتەو ئـەو شـتەیان هەیـە، مانـای ئـەوە نیـە کـە ئـەوەی (سَـابِقُون) هەیانـە (أَصْحَـابُ الیَمِـیْن) نەیانبـێ و، ئـەوەی (أَصْحَـابُ الیَمِـیْن) هەیانـە (سـابقون) نەیانبـێ، بەڵکـو هەموویـان لـە هەمـوو ئـەو نیعمەتانـە بەهرەمەنـدن، بـەڵام هـەر کەسـە بـە پلـەی خـۆی و بـە شـێوەی خـۆی.

ئنجا با ئەم سێ فەرموودەیەش بێنین:

**١)**- پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: {أَهْلُ الجَنَّةِ عِشْرُونَ وَمِائَةُ صَفٍّ، ثَمَانُونَ مِنْهَا مِنْ هَذِهِ الْأُمَّةِ، وَأَرْبَعونَ مِنْ سَائِرِ الْأُمَمِ} (أخرجه أحمد: ٢٢٩٩٠، والترمذي: ٢٥٤٦، وقال: حسن، وابن ماجه: ٤٢٨٩، والدارمي: ٢٨٣٥، وابن حبان: ٧٤٥٩، والحاكم: ٢٧٣، وقال: صحيح على شرط مسلم).

www.alibapir.com


واتـە: ئەهـلی بەهەشـت سـەدو بیسـت (١٢٠) ڕیـزن، هەشـتا (٨٠) ڕیزیـان لـەم ئۆممەتـەن (واتـە: لـە ئۆممـەتی پێغەمبـەر موحەممـەدن ﷺ)و چـل (٤٠) ڕیزیشـیان لـە ئۆممەتـەکانی دیکـەو لـە کۆمەڵگایـەکانی دیکـەن.

**٢)- پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: {إِنَّ فِي الْجَنَّةِ لَشَجَرَةً يَسِيرُ الرَّاكِبُ فِي ظِلِّهَا مِائَةَ عَامٍ لَا يَقْطَعُهَا، واقْرَؤُوا إنْ شِئْتُم : ﴿وَظِلٍّ مَّمْدُودٍ﴾} (أخرجه البخاري: ٤٨٨١، ومسلم: ٢٨٢٦).**

واتـە: لـە بەهەشـتدا درەختێکـی تێدایـە، سـوار چـاک سـەد (١٠٠) سـاڵ لـە ژێـر سـێبەرەکەیدا دەڕوات، تـەواو نابـێ، ئەگـەر دەتانـەوێ ئـەم ئایەتـە بخوێنـن: ﴿وَظِلٍّ مَّمْدُودٍ﴾ واتـە: سـێبەرێکی درێـژ.

**٣)- {عن قتادة، أَنَّهُ بَلَغَهُ أَنَّ النَّبيّ ﷺ قَالَ: «أَتَرْضَوْنَ أَنْ تكُونُوا رُبُعَ أَهْل الجَنَّة؟ قَالُوا: نَعَمْ، قَالَ: أَتَرْضَوْنَ أَنْ تكُونُوا ثُلُثَ أَهْل الجَنَّة؟ قَالُوا: نَعَمْ، قَالَ: وَالَّذي نَفْسي بَيَدِهِ إِنِّي، لأَرْجُو أَنْ تَكُونُوا شَطْرَ أَهْل الجَنَّةِ، ثُمَّ تَلاَ هَذِهِ الآية: ﴿ثُلَّةٌ مِّنَ ٱلْأَوَّلِينَ ﴿٣٩﴾ وَثُلَّةٌ مِّنَ ٱلْآخِرِينَ ﴿٤٠﴾﴾} (أخرجه البخاري: ٤٧٤١، مسلم: ٢٠٢١، والطبري: ٣٣٥٣٣).**

واتـە: قەتـادە گوتوویـەتی: پێـم گەیشـتوە کـە پێغەمبـەر ﷺ ڕۆژێ بـە هـاوەڵانی بەڕێـزی خـۆی فەرمـووە: ئایا ڕازیـن یـەک لەسـەر چـواری خەڵکـی بەهەشـت بـن؟ گوتوویانـە: بەڵـێ، فەرموویـەتی: ئایا ڕازیـن کـە یەک لەسـەر سـێی خەڵکی بەهەشـتێ بـن؟ گوتوویانـە: بەڵـێ، فەرموویـەتی: سـوێند بـەو کەسـەی گیـانی منـی بەدەسـتە، ئومێـدم وایـە ئێـوە نیـوەی خەڵکـی بەهەشـتێ بـن، دوایـی ئـەم ئایەتـەی خوێنـدەوە: ﴿ثُلَّةٌ مِّنَ ٱلْأَوَّلِينَ ﴿٣٩﴾ وَثُلَّةٌ مِّنَ ٱلْآخِرِينَ ﴿٤٠﴾﴾ **الواقعـة.**

لە کۆتایی ئەم دەرسەشدا وەڵامی پرسیارێک بە کورتیی دەدەینەوە:

خوا ﷻ حۆرییەکانی بۆ پیاوانی بەهەشتێ داناون، ئەدی ئافرەتەکان کە دەچنە بەهەشـت، چـی بـۆ داناون؟

www.alibapir.com



ئـەو پرسـیارە کاتی خـۆی لـە کتێبـی: (ئافـرەت و خێـزان لـە سـایەی شـەریعەت)دا، وەڵامـم داوەتـەوە:

کە خوا ﷻ بە پێی سرووشتی پیاوان و ئافرەتان، باسی نیعمەتەکان دەکات، بۆ پیاو کە خوا ﷻ سرووشتەکەی وا خوڵقاندوە حەز دەکات، زیاتر لە هاوسەرێکی هەبێ و، پیـاو زیاتـر بـەدوادا چـوو (طالـب)و عەودالـە، بـەڵام ئافـرەت حـەز دەکات بـەدوادا گـەڕاو (مطلـوب) بـێ و، خەڵـک بـۆی عـەودالّ بـێ و، داواکـراو بـێ، نـەک داواکەر، بۆیە خوا ﷻ بەپێی سرووشتی پیاوەکان باسی ئەوەی کردوە کە ئافرەتانی تایبەتتـان بـۆ دەڕەخسـێنێ، وێـڕای هاوسـەرەکانی خۆتـان، بـەڵام بێگومـان ئافرەتـانی بـڕوادار، چ ئەوانـەی هاوسـەردار بـوون، چ ئەوانـەی بـێ هاوسـەر بـوون، ئەوانیـش لـە هەمـوو ئـەو نـازو نیعمەتانـە لەگـەڵ پیاوەکانـدا بەشـدارن، بـەڵام پێچەوانـەی سرووشـتی ئافرەتـە، بگوتـرێ: هەندێـک پیـاوی جوانـت بـۆ دەڕەخسـێنین! ئەمـە پێچەوانـەی سرووشـتی ئافرەتـەو، ئافـرەت پێـی خۆشـە، هـی پیاوێـک بـێ و پێـی خۆشـە داواکـراو بـێ، نـەک داواکـەر، بـەڵام پیـاو سرووشـتەکەی وایـە، پێـی خۆشـە داواکـەر بـێ، پیاویـش بـە سرووشـت پێـی خۆشـە زیاتـر لـە هاوسـەرێکی هەبـێ، بـەڵام ئافـرەت، ئەگـەر سرووشـتەکەی تێـک نەچـوو بـێ، پێـی خۆشـە، هـی یـەک پیاو بـێ، نـەک چەنـد پیاوێـک دەسـتاو دەسـتی پـێ بکـەن، ئـەوە پێچەوانـەی سرووشـت و زگماکـی سـاغی ئافرەتـە، ئەگـەر تێکنەچـوو بـێ.

سُبحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ، أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إلاَّ أَنْتَ، أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ.

www.alibapir.com


## پێناسەی ئەم دەرسە

ئـەم دەرسـەمان لـە شـازدە ئایـەت (١٦) پێـک دێ، کـە ئایەتـەکانی: (٤١ - ٥٦) ن، ئـەم شـازدە ئایەتـە هەموویـان تەرخانکـراون بـۆ بـاسی سـزای سـەخت و دژواری هاوەڵانی چەپە (**أَصْحَاب الشِّمَال**)، کە خوا بسم الله الرحمن الرحيم لە ڕۆژی دواییدا دەیانخاتە نێو ئـازارو مەینەتییەکـی زۆر بێـڕەزاوە لـە دۆزەخـدا، کـە سـەرجەم لێـرەدا باسـی پێنـج جـۆرە سـزایان بـۆ دەکات:

١- گڕەبایەکی زۆر گەرم.

٢- ئاوی کوڵاوو داغ.

٣- سێبەری دووکەڵێکی ڕەش.

٤- خواردن لە درەختی زەققووم (ژەقنەمووت).

٥- خواردنەوە لە ئاوی کوڵیوو داغ، وەک خواردنی حوشتری تووشبوی نەخۆشیی تێر ئاو نەبوون (هیام).

ئنجا لـە میانی ئـەوەدا، خوا بسم الله الرحمن الرحيم باسی هۆکارەکانی گیرۆ دەبوونی ئەو سـزاو ئازارانـەش دەکات، کـە چـوار هـۆکارن:

١)- خۆشگوزەرانیی حەڕام لەسەر حیسابی خەڵکی دیکە.

٢)- بەردەوام بوون لەسەر گوناهی مەزنی هاوبەشدانان بۆ خوا، یان کوفر.

٣)- نکوڵییکردن لە زیندووکرانەوە.

٤)- گومڕایی، کە بەدڵنیایی گومڕاییەکە، بنک و ڕیشەی هەموو هۆکارەکانی دیکەیە.

www.alibapir.com



﴿وَأَصۡحَٰبُ ٱلشِّمَالِ مَآ أَصۡحَٰبُ ٱلشِّمَالِ ﴿٤١﴾ فِي سَمُومٖ وَحَمِيمٖ ﴿٤٢﴾ وَظِلّٖ مِّن يَحۡمُومٖ ﴿٤٣﴾ لَّا بَارِدٖ وَلَا كَرِيمٍ ﴿٤٤﴾ إِنَّهُمۡ كَانُواْ قَبۡلَ ذَٰلِكَ مُتۡرَفِينَ ﴿٤٥﴾ وَكَانُواْ يُصِرُّونَ عَلَى ٱلۡحِنثِ ٱلۡعَظِيمِ ﴿٤٦﴾ وَكَانُواْ يَقُولُونَ أَئِذَا مِتۡنَا وَكُنَّا تُرَابٗا وَعِظَٰمًا أَءِنَّا لَمَبۡعُوثُونَ ﴿٤٧﴾ أَوَءَابَآؤُنَا ٱلۡأَوَّلُونَ ﴿٤٨﴾ قُلۡ إِنَّ ٱلۡأَوَّلِينَ وَٱلۡأٓخِرِينَ ﴿٤٩﴾ لَمَجۡمُوعُونَ إِلَىٰ مِيقَٰتِ يَوۡمٖ مَّعۡلُومٖ ﴿٥٠﴾ ثُمَّ إِنَّكُمۡ أَيُّهَا ٱلضَّآلُّونَ ٱلۡمُكَذِّبُونَ ﴿٥١﴾ لَأٓكِلُونَ مِن شَجَرٖ مِّن زَقُّومٖ ﴿٥٢﴾ فَمَالِـُٔونَ مِنۡهَا ٱلۡبُطُونَ ﴿٥٣﴾ فَشَٰرِبُونَ عَلَيۡهِ مِنَ ٱلۡحَمِيمِ ﴿٥٤﴾ فَشَٰرِبُونَ شُرۡبَ ٱلۡهِيمِ ﴿٥٥﴾ هَٰذَا نُزُلُهُمۡ يَوۡمَ ٱلدِّينِ ﴿٥٦﴾﴾.

## مانای دەقاو دەقی ئایەتەكان

{هاوەڵانی چەپە، هاوەڵانی چەپە كێن و چۆنن؟ ﴿٤١﴾ لە نێو گڕەباو ئاوی كوڵاودان ﴿٤٢﴾ هەروەها لە بن سێبەرێكی لە چڕە دووكەڵی ڕەش دان ﴿٤٣﴾ نە (فێنك و) ساردەو، نە كەڵكیشی هەیە ﴿٤٤﴾ (هۆكاری ئەو سزاو جەزرەبەیەش ئەوەیە)، بێگومان ئەوان پێش ئەوە ( لە ژیانی دنیایاندا) خۆشگوزەران بوون (بە سامانی حەڕام و لەسەر حیسابی خەڵك) ﴿٤٥﴾ هەروەها ئەوان لەسەر گوناهی مەزن مكوڕ بوون ﴿٤٦﴾ دەشیانگوت: ئایا كاتێك مردین و بووینە گڵ و ئێسك، ئایا ئێمە زیندوو دەبینەوە؟ ﴿٤٧﴾ هەروەها ئایا باب و باپیرانی یەكەمیشمان (زیندوو دەبنەوە)؟ ﴿٤٨﴾ بڵێ: بە دڵنیایی پێشینەكان و دواییینەكان ﴿٤٩﴾ مسۆگەر بۆ ژوانگەی ڕۆژێكی زانراو (دیارییكراو) كۆ دەكرێنەوە ﴿٥٠﴾ ئنجا بێگومان ئێوە ئەی گومڕایانی بە درۆدانەر (ی ڕۆژی دوایی)! ﴿٥١﴾ مسۆگەر لە (بەرو میوەی) درەختی زەققووم دەخۆن ﴿٥٢﴾ سكتانی لێ دەئاخنن (پڕی دەكەن) ﴿٥٣﴾ ئنجا لە ئاوی كوڵیوو داغی لەسەر دەخۆنەوە ﴿٥٤﴾ ئنجا خۆرەوە دەبن (وێنەی ئاو خواردنەوەی حوشترانی (گیرۆدەبووی نەخۆشیی) تێر ئاو نەبوون ﴿٥٥﴾ ئەوەیە شێوەی میوانداریی لێكردنیان لە ڕۆژی سزاو پاداشتدا ﴿٥٦﴾}.

www.alibapir.com


## شیکردنەوەی هەندێک لە وشەکان

(وَأَصۡحَٰبُ ٱلشِّمَالِ ): هـاوەڵانی دەسـتە چـەپ، یـان هـاوەڵانی چەپە، پێشـتر باسـمانکرد، کـە ڕاسـت و چـەپ دژو پێچەوانـەی یەکدییـن و، لای ڕاسـت نیشـانەی بەختەوەرییـە، لەبـەر ئـەوەی (یَمِیْن) لـە (یُمْـن)ەوە هاتـوە واتـە: بەرەکـەت و خێرداریـی و، لای چـەپ (شِمَال) نیشانەی نەگبەتیی و بێ خێرییە، کە خوا بسم الله الرحمن الرحيم لە ئایەتەکانی پێشێدا بە (أَصْحَابُ المَشْـئَمَة) باسـیکردن و، (مَشْـئَمة)ش لـە (شُـؤم)ەوە هاتـوە، واتـە: نەگبەتیـی و بـێ خێریـی، کـە بێگومـان مەبەسـت پێـی ئەوانەیـە کـە نامـەی کردەوەکانیـان بـە دەسـتی چـەپ وەردەگرنـەوە، یـان لـەلای چـەپ ڕادەگیرێـن، لـە ڕۆژی کۆکرانـەوەو لێپرسـینەوەدا، دوایـی بـەرەو دۆزەخ بـە ڕێ دەکرێـن.

(سَمُومٍ ): (السَّمُوم: الرِّيْحُ الحَارَّة الَّتِي تُؤَثِّر فِي الجِسْم تَأْثِير السُّمِّ، أو الرِّيْحُ النَّافِذَة فِي المَسَامِّ، وَجَمْعُ المَسَام: سَمَائِم)، (سَمُوْم) ئـەو بایـە گەرمەیـە کـە کاریگەریـی لـە جەسـتەدا وەک کاریگەریـی ژەهـرە، یاخـود (سَـمُوم) واتـە: ئـەو گڕەبـا گەرمـەی دەچێتـە نێـو کونـەکانی جەسـتەوە، (مَسَـام) واتـە: کـونی جەسـتە، کـە بـە (سَمَائِم) کۆ دەکرێتـەوە.

(حَمِيمٍ): (المَاءُ الشَّدِيْدُ الحَرَارَة) ئاوێکـە گەرماییەکـەی زۆر سـەخت بێ، لـە (حَمَّة) وە هاتـوە، (الحَمَّـةُ: المَـاءُ الحَـارُّ الخَـارِجُ مِـنْ مَنْبَعِـهِ)، (حَمَّـة): ئـەو ئـاوە گەرمەیـە کـە لـە سـەرچاوەکەی دەردەقوڵـێ، ئنجـا لـەو بـارەوە پەندێکـی عـەڕەبی هەیـە دەڵـێ: (العَالِـمِ كالحُمَّـةِ يأتِيهَـا البُعْـدَاءَ، ويَزْهَـدُ فِيهَـا القُرْبَـاءُ) وەک لـە (إبـن الأثـير) لـە کتێبەکـەی دا[1] هێناویـەتی.

واتـە: زانـا وەک سـەرچاوەی ئـاوی گـەرم وایـە، کـە خەڵکـی دوور بـۆی دێ، بـەڵام ئەوانـەی لێـی نیزیکـن، بـە کەمگرنی و بایەخـی پـێ نـادەن.

---

(١ ) النهاية في غريب الحديث والأثر: ج١، ص٤٤٥.

www.alibapir.com



(كَرِيمٍ): (كُلُّ شَيءٍ شَرُفَ فِي بَابِـهِ يُوصَـفُ بِالْكَـرَم)، ﴿ لَّا بَارِدٍ وَلَا كَرِيمٍ ﴾ واتـە: نـە ساردەو نـە بەكەڵکـە، چونکـە (كَرِيْـم) هـەر شـتێکە لـە جـۆری خـۆی بـاش بـێ، ئاوێکـی بـە کەڵـک، خواردنێکـی بـاش، کەسـێکی بەڕێـز: (مَـاءٌ كَرِيْـم، طَعَـامٌ كَرِيْـم، شَـخْصٌ كَرِيْـم) پێچەوانـەی (كَرِيْم)یـش لێـرەدا یـانی: بـێ کەڵـک.

(مُتْرَفِينَ): (التُّرْفَـةُ: التَّوَسُّـعُ فِي النِّعْمَـةِ، أُتْـرِفَ فَهُـو مُـتْرَف)، (مُتْرَفِيْن) کـۆی (مُـتْرَف)ە، لـە (تُرْفَـة)وە هاتـوە، کـە بریتیـە لـە فراوانیـی لـە خۆشـگوزەرانیی و نـازو نیعمـەت و ڕابـواردن دا، دەگوتـرێ: (أُتْـرِفَ فَهُـوَ مـتُرْفَ) خۆشـگوزەران کـراوە، ئـەو خۆشـگوزەرانە.

(الْحِنثِ الْعَظِيمِ): (الذَّنْـبُ المُؤْثِـم، وَسُـمِّيَ اليَمِيْن الغَمُـوسُ حِنْثَـاً لِذَلِـكَ، حَنِـثَ فِي يَمِيْنِـه: لَـمْ يَـفِ بِهَـا)، (حِنْـث) واتـە: گوناهێـک کـە مـرۆڤ سـزا بـار بـکات، (عَظِيْم)یـش واتـە: مـەزن، سـوێندێک کـە خاوەنەکـەی دەیخـوات و دەشـزانێ درۆ دەکات، پێـی دەگوتـرێ: (اليَمِـيْن الغَمُـوس) سـوێندی نقومکـەر، نقومکـەر لـە گوناهـدا، سـوێندێک کـە خاوەنەکـەی دەزانـێ درۆیـەو، دەشـیڵێ، پێـی دەگوتـرێ: (الغمـوس)، دەشـگوترێ: (حَنِـثَ فـي يَمِيْنِـه: لَـمْ يَـفِ بِهَـا) واتـە: سـوێندی خـواردو سـوێندەکەشی نەهێنایـە دی.

(مِيقَاتِ): (المِيْقَـات: الوَقْـتُ المَـضْرُوبُ للـشَّيء)، کاتی دیاریکـراو بـۆ شـتێک، بـە کوردیـی ژوانگـەی پـێ دەڵێـن، (میعاد)یـش بەڵێنگەیـە، شـوێنی بەڵێـن و گفـت.

(زَقُّومٍ): (عِبَـارَةٌ عَـنْ أَطْعِمَـة كَرِيْهَـةٍ فِي النَّـارِ، وَمِنْـهُ اسْـتُعِيْر: زَقَـمَ فُـلاَنٌ وَتَزَقَّـمَ: ابْتَلَـع شَـيْئَاً كَرِيْهَـاً)، (زَقُّـوْم): بریتیـە لـە خواردنـە خـراپ و ناخۆشویسـتراوەکان، لـە ئاگـری دۆزەخـدا، هـەر لەویشـەوە ئـەوە خوازراوەتـەوە دەگوتـرێ: (زَقَـمَ فُـلاَنٌ وَتَزَقَّـم) ئەگەر کەسـێک شـتێکی قووتـدا کـە پێـی ناخـۆش بـێ، لـە تەفسـیری سـوورەتی (الصافـات) دا ڕوونمان کردۆتەوە، کە (زقوم) جۆرە میوەیەکە لە دۆزەخدا، وەک خوا ﷻ باسی کـردوە: ﴿ طَلْعُهَا كَأَنَّهُۥ رُءُوسُ ٱلشَّيَٰطِينِ ﴿٦٥﴾ ﴾الصافات، میوەکـەی وەک سـەری شـەیتانان وایـە، کەسـیش سـەری شـەیتانانی نەبینیـوە، بـەڵام لـە خەیـاڵ و ئەندێشـەی هەموو خەڵکدا، سەری شەیتانان شتێکی دزێوو ناقۆڵایە، بۆیە خوا ﷻ بەری

درەختی زەقومی چواندوە بە شتێکەوە کە لە ئەندێشەو خەیاڵی مرۆڤەکاندا شتێکی ناقۆڵاو نارێکە.

(**شُرۡبَ ٱلۡهِيمِ**): خواردنەوەی حوشترێک کە تووشی نەخۆشیی (**هُيَام**) بووە، (**وَالهُيَامُ: دَاءٌ يَأْخُذُ الإبلَ مِنَ العَطْشِ**)، (**هُيَام**) جۆرە نەخۆشییەکە تووشی حوشتر دێ، زۆر تینوو دەبێ، ئنجا ئەگەر نێر بێ پێی دەگوترێ: (**بَعِيْرٌ أَهْيَم**)و، ئەگەر مێ بێ، پێی دەگوترێ: (**نَاقَةٌ هَمْيَاء**) (**هُيَام**) ئەو نەخۆشییەیە کە حوشتر تووشی دێ و، هەرچەندە ئاو دەخواتەوە تێر نابێ.

(**نُزُلُهُمۡ**): (**النُّزُل: مَا يُعَدُّ للنَازِلِ مِنَ الزَّادِ**)، (**نُزُل**): ئەوەیە کە بۆ بابای دابەزیوو میوان دادەنرێ لە پێخۆرو خواردن، بۆیەش پێیگوتراوە: (**نُزُل**)و بە میوانیش گوتراوە: (**نَازِل**) دابەزیو، چونکە ئەو کاتە عادەت وابووە، میوان بە زۆریی ئەوانە بوون، کە بە رێگادا هاتوون و، دیارە سواری وڵاخ بوون، ئنجا رێبوار کە دابەزیوەو بۆتە میوان، خانە خوێیەکەشی پێشوازیی لێکردوە، ئنجا ئەو خواردنەی کە بۆ میوان دادەنرێ و دەست و برد دەدرێ بە میوان، پێش ئەوەی خواردنی بنەڕەتیی بۆ ئامادە بکرێ، پێی دەگوترێ: (**نُزُل**).

لە تۆڕە کۆمەڵایەتییەکان لەگەڵتانین
Stay in touch on social media
نحن معكم عبر مواقع التواصل الاجتماعي
راکەیاندنی مەکتەبی مامۆستا عەلی باپیر
AliBapir/عەلی باپیر
archive.org/details/@alibapir
AliBapir/عەلی باپیر
AliBapir
کەناڵی راکەیاندنی مەکتەبی مامۆستا عەلی باپیر
www.alibapir.net
کوردی - عربي - English
راکەیاندنی مەکتەبی مامۆستا عەلی باپیر

www.alibapir.com


## مانای گشتیی ئایەتەکان

بەڕێـــزان!

خـوا لـەم چەنـد ئایەتـەدا بـاسی حاڵـی هـاوەڵانی لای ڕاسـت و لای چـەپ دەکات، ئەوانـەی چاکـەکارن، خـوا بـە دەسـتی ڕاسـتیان نامـەی کردەوەکانیـان دەداتـەوەو، ئەوانـەش کـە خراپـەکارن، بـە دەسـتی چەپیـان نامـەی کردەوەکانیـان دەداتـەوە، دەفەرمـوێ: ﴿ وَأَصۡحَٰبُ ٱلشِّمَالِ مَآ أَصۡحَٰبُ ٱلشِّمَالِ ﴾، هـاوەڵانی چەپـە، کێـن و چیـن و چۆنـن؟ واتـە: حـاڵ و بـاڵ و گوزەرانیـان هێنـدە سـەخت و دژوارە، کە وەسفکەر بە زەحمەت بۆی وەسـف دەکرێ، ئنجا خوا بسم الله الرحمن الرحيم باسی گوزەرانی سـەختیان دەکات:

﴿ فِي سَمُومٖ وَحَمِيمٖ ﴾، لە نێو گڕەبای گەرم و ئاوی کوڵاوو داغ دان.

﴿ وَظِلّٖ مِّن يَحۡمُومٖ ﴾ هەروەهـا سـێبەرێک کـە دووکەڵـی ڕەشـە، (ظِـلّ) سـێبەرە، بـەڵام (يَحْمُـوم) واتـە: دووکەڵـی ڕەش، یـانی: بـە ڕواڵـەت سـێبەرە، بـەڵام لـە ڕاسـتییدا دووکەڵێکـی داوەسـتاوی ڕەشـە، لـە دوور ڕا وادەزانی سـێبەرە.

﴿ لَّا بَارِدٖ وَلَا كَرِيمٍ ﴾، نـە فێنـک و ساردەو نـە بـە کەڵکیشـە، واتـە: فێنک و سـارد نیە، وانـەزانی ئـەو دووکەڵـە ڕەشـە داوەسـتاوە، فێنکایەتیـی هەیـە، بەڵکـو یەکجـار گەرمـەو مایـەی تەنگەنەفەسییە، ﴿ وَلَا كَرِيمٍ ﴾، هەروەهـا هیـچ کەڵکێکیـشی پێـوە نیـە.

هەندێکیـش لـە زانایـان لـە مانـای: ﴿ لَّا بَارِدٖ وَلَا كَرِيمٍ ﴾ دا گوتوویانـە: نـە لـە ڕووی جەسـتەییەوە، لێـی بەهرەمەنـدن، نـە لـە ڕووی مەعنەوییشـەوە، هیـچ ڕێـزو حورمەتێکـی تێدایـە، چونکـە بـە زۆریی وایـە کە کەسێک دەبرێتە بەرسێبەرێک، هەم جەسـتەی بەهرەمەنـدە لـەو سـێبەرەو، هـەم لـە ڕووی ڕووحیـی و مەعنەوییشـەوە، ڕێـز لێگرتنێکـە بـۆی، بـەڵام ئـەو سـێبەری دووکەڵـی ڕەش دا وەسـتاوە، کـە خاوەنـانی

www.alibapir.com


دەستە چەپی دەبڕێنێ، نە فێنکایەتیی و ساردیی هەیە، بۆ جەستەیان، نە ڕێزو حورمەتێکیشی تێدا هەیە بۆ ڕووحیان.

ئنجا لێرەدا یەکسەر پرسیارێک دێتە زەینی هەر کەسێکەوە: ئەو سزا سەختە لە پای چی و چی بۆ وایان لێ دەکرێ؟

دەفەرموێ: ﴿ إِنَّهُمْ كَانُواْ قَبْلَ ذَٰلِكَ مُتْرَفِينَ ﴾، ئەمە شیکاردۆزیی ئەوەی پێشێیەو پاساو دانەوەو بەڵگە بۆ هێنانەوەیەتی: بە دڵنیایی ئەوان پێش ئەوە خۆشگوزەران بوون، ئنجا ئایا خۆشگوزەران بوون، شتێکی ناشەرعیی و خراپە، تاوانە؟ نەخێر، بەڵام ئێمە بە سەرنجدانی وەسفەکانی ئەو جۆرە کەسانە دەزانین، کە ئەوانە خۆشگوزەرانییەکەیان لەسەر حیسابی خەڵک بووەو لە ڕێیەکی ناشەرعییەوە بووە، خۆشگوزەرانییەکەیان بۆتە مایەی ئەوە، کە خواو خەڵکیان لە بیربچێ، ئنجا ئەو جۆرە خۆشگوزەرانییە ناپەسندە، ئەگەرنا خۆشگوزەرانییەک مرۆڤ بە کاسبیی حەڵاڵ و، بە ڕەنجی شان دابینی کردبێ، هیچ ئیشکالی تێدانییەو خوای پەروەردگار هەموو نیعمەتەکانی سەر زەوی بۆ مرۆڤەکان خوڵقاندوون: ﴿ هُوَ الَّذِي خَلَقَ لَكُم مَّا فِي الْأَرْضِ جَمِيعًا ﴿٢٩﴾ ﴾ **البقرة**، ﴿ وَالْأَرْضَ وَضَعَهَا لِلْأَنَامِ ﴿١٠﴾ ﴾، ﴿ سَخَّرَ لَكُم مَّا فِي السَّمَاوَاتِ وَمَا فِي الْأَرْضِ ﴿٢٠﴾ ﴾ **لقمان**، بەڵام ئەوانەی خوا بسم الله الرحمن الرحيم باسیان دەکات، ئەوانە بوون کە هەر خەریکی خۆشگوزەرانیی و ڕابواردن و لەوەڕان بوون، وەک لە شوێنی دیکەدا دەفەرموێ: ﴿ إِنَّ اللَّهَ يُدْخِلُ الَّذِينَ آمَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ جَنَّاتٍ تَجْرِي مِن تَحْتِهَا الْأَنْهَارُ ۖ وَالَّذِينَ كَفَرُوا يَتَمَتَّعُونَ وَيَأْكُلُونَ كَمَا تَأْكُلُ الْأَنْعَامُ وَالنَّارُ مَثْوًى لَّهُمْ ﴿١٢﴾ ﴾ **محمد**، ئەوانەی بێبڕوان دەخۆن و ڕادەبوێرن، وەک چۆن ئاژەڵ ڕادەبوێرێ و جێگاو ڕێگاو شوێنی حەوانەوەشیان ئاگرە.

﴿ وَكَانُوا يُصِرُّونَ عَلَى الْحِنثِ الْعَظِيمِ ﴾ هەروەها ئەوانە سوور و مکووڕ بوون لەسەر گوناهی مەزن، ئەو گوناهە مەزنە، خوا بسم الله الرحمن الرحيم ڕوونی نەکردۆتەوە، بەڵام هەر دیارە، گوناهی مەزن، کە مایەی چوونە دۆزەخ بێ، کوفرە، شیرکە، ئیلحادە، تاوان و

www.alibapir.com


لادانە لە شەریعەت، ئەگەر خوا ﷻ دیاریی کردبایە، یەک شتی دەگەیاند، بەڵام ئێستا هەموو ئەو شتانە دەگەیەنێ، ئیلحادو، شیرک و، بێبڕوایی بە ڕۆژی دوایی و، بێبڕوایی بە پەیامی خواو، بێبڕوایی بە پێغەمبەرو، لادان لە شەریعەت و، تاوانباریی و ستەم، هەموو ئەوانە دەگەیەنێ.

﴿ وَكَانُوا۟ يَقُولُونَ أَئِذَا مِتْنَا وَكُنَّا تُرَابًا وَعِظَٰمًا أَءِنَّا لَمَبْعُوثُونَ ﴾ هەروەها دەیانگوت (لە دنیادا دەیانگوت:) ئایا کاتێک ئێمە مردین و بووینەوە گڵ و ئێسقانەکان، ئایا ئێمە زیندوو دەکرێینەوەو دەژیێنرێینەوە؟ هەڵدەستێنرێینەوە؟ بە پرسیارکردنی نکوڵیلێکردنەوە وایانگوتوە، یانی: شتی وا نیە، بۆیەش بە زۆریی لە قورئاندا دەفەرموێ: ﴿ تُرَابًا وَعِظَٰمًا ﴾، گڵ و ئێسکەکان، لەبەر ئەوەی کە گۆشتەکە دەبێتەوە بە گڵ و خۆڵ، ئێسکەکان کە پتەوترن، جارێ دەمێننەوەو، پەیکەرە ئێسکەکە، دەمێنێتەوە، بەڵام گۆشتەکە زوو دەبێتەوە بە گڵ و خۆڵ، هەڵبەتە دوایی کە وەختی زۆری بەسەردا تێپەڕ بوو، ئێسکەکانیش هەر دەبنەوە بە خۆڵ، بەڵام لە قۆناغی یەکەمدا گۆشتەکە، دەڕزێ، بێبڕوایەکانیش ئەوانەی پێش خۆیانیان دیوەکە گۆشتەکەیان بۆتەوە خۆڵ و پەیکەرە ئێسکەکانیان ماونەوە، بۆیە ئەو پرسیارەیان کردوە.

﴿ أَوَءَابَآؤُنَا ٱلْأَوَّلُونَ ﴾، ئایا باب و باپیرانی پێشووشمان (ئەوانیش هەڵدەستێنرێنەوە و زیندوو دەکرێنەوە)؟!

خوا ﷻ بە پێغەمبەری خاتەم ﷺ دەفەرموێ: ﴿ قُلْ إِنَّ ٱلْأَوَّلِينَ وَٱلْءَاخِرِينَ ﴾، بڵێ: بە دڵنیایی پێشووەکان و دواییینەکان، یەکەمەکان و کۆتاییەکان.

﴿ لَمَجْمُوعُونَ إِلَىٰ مِيقَٰتِ يَوْمٍ مَّعْلُومٍ ﴾، کۆدەکرێنەوە بۆ ژوانگەی ڕۆژێکی زانراو، ڕۆژێکی دیاریکراو.

﴿ ثُمَّ إِنَّكُمْ أَيُّهَا ٱلضَّآلُّونَ ٱلْمُكَذِّبُونَ ﴾، دوایی ئێوە ئەی گومڕا بووە بە درۆ دانەرەکان!

www.alibapir.com



﴿لَآكِلُونَ مِن شَجَرٍ مِّن زَقُّومٍ﴾، بـە دڵنیایـی ئێـوە بخـۆر دەبـن لـە درەختێـک لـە زەققـووم، واتـە: لـە بـەرو میـوەی درەختێـک، جـۆرە درەختێـک کـە بریتیـە لـە درەختـی زەققووم، کە لە سـووڕەتی (**الصافات**)یـش دا خوا ﷻ باسی درەختی زەققوومـی کـردوەو، لـەو بـارەوە کورتـە باسـێکمان کـردوە لـە تەفسـیری سـووڕەتی (**الصافـات**)دا.

کە خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿أَذَٰلِكَ خَيْرٌ نُّزُلًا أَمْ شَجَرَةُ الزَّقُّومِ ﴿٦٢﴾ إِنَّا جَعَلْنَاهَا فِتْنَةً لِّلظَّالِمِينَ ﴿٦٣﴾ إِنَّهَا شَجَرَةٌ تَخْرُجُ فِي أَصْلِ الْجَحِيمِ ﴿٦٤﴾ طَلْعُهَا كَأَنَّهُ رُءُوسُ الشَّيَاطِينِ ﴿٦٥﴾ فَإِنَّهُمْ لَآكِلُونَ مِنْهَا فَمَالِئُونَ مِنْهَا الْبُطُونَ ﴿٦٦﴾ ثُمَّ إِنَّ لَهُمْ عَلَيْهَا لَشَوْبًا مِّنْ حَمِيمٍ ﴿٦٧﴾ ثُمَّ إِنَّ مَرْجِعَهُمْ لَإِلَى الْجَحِيمِ ﴿٦٨﴾﴾**الصافـات**، پێشـێ بـاسی بەهەشـتییان دەکات و دەفەرمـوێ: ئایـا ئـەو جـۆرە میوانداریـی و پێشـوازییلێکردنە، باشـترە، یاخـود درەختـی زەققـووم؟ ئێمـە درەختـی زەققومـمان کـردوە، بـە مایـەی تاقیکردنـەوە بـۆ سـتەمکاران، (تاقیکردنەوەکەشـیان ئەوەبـوو کـە دەیانگـوت: چـۆن درەخـت لـە نێـو ئاگـردا دەڕوێ؟! یاخـود (فتنـة) بـە مانـای سـزاو ئەشـکەنجەیە، کردوومانـە بـە مایـەی ئەشـکەنجە بـۆ سـتەمکاران)، دوایـی دەفەرمـوێ: ﴿إِنَّهَا شَجَرَةٌ تَخْرُجُ فِي أَصْلِ الْجَحِيمِ﴾، بێگومـان ئـەو درەختێکـە لـە تەختـی بنـەوەی دۆزەخ، دەردەچـێ، واتـە: ڕەگ و ڕیشـەکەی لـە تەختـی بنـی دۆزەخ دایـە، ﴿طَلْعُهَا﴾، (طَلْع) لـە ئەسـڵدا بـە کیفـی هێشـووە دارخورمـا دەگوتـرێ، دوایـی بـە کیفـی هـەر میوەیـەک دەگوتـرێ، بـەڵام لێـرەدا مەبەسـت پێـی میـوەو بەرەکەیـەتی، ﴿كَأَنَّهُ رُءُوسُ الشَّيَاطِينِ﴾، وەک سـەری شـەیتانان وایـە، وەک سـەلکی شـەیتانەکان وایـە، هەڵبەتـە هیچکـەس سـەری شـەیتانانی نەبینیـوە، بـەڵام لـە خەیـاڵ و ئەندێشـەی هەمـوو کەسـدا، شـەیتان شـتێکی دزێـوو ناقۆڵایـەو، سـەریشی زۆر دزێـوو ناقۆڵایـە.

ئنجـا دەفەرمـوێ: ﴿فَإِنَّهُمْ لَآكِلُونَ مِنْهَا فَمَالِئُونَ مِنْهَا الْبُطُونَ﴾ بێگومـان لێـی دەخـۆن لـەو درەختـی زەققومـە، {کـە یەکجـار تاڵـە، کوردەواریـی دەڵێـن: ژەقنەمـووت، بـە ژەقنەمـووتی بـێ، یـان بـە تـاڵاوی بـێ} لێـی دەخـۆن و، ورگـی خۆیـانی لـێ دەئاخنـن،

www.alibapir.com


چونكە هیچی دیكەیان دەست ناكەوێ بیخۆن، تەنیا لە شوێنێكی دیكەدا، خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ لَّيْسَ لَهُمْ طَعَامٌ إِلَّا مِن ضَرِيعٍ ﴿٦﴾ لَّا يُسْمِنُ وَلَا يُغْنِي مِن جُوعٍ ﴿٧﴾ ﴾ الغاشية، دەفەرموێ: ئەوانە هیچ خۆراكێكیان نیە، جگە لە (ضَرِیْع) {كە ڕووەكێكی دڕكاوییە، بە كوردیی پێی دەگوترێ: حوشتر خۆركەو، زۆر تاڵ و دڕكاوییەو، زۆر ڕەقەو، بەس حوشتر بۆی دەخورێ}.

﴿ لَّا يُسْمِنُ وَلَا يُغْنِي مِن جُوعٍ ﴾، نە قەڵەو دەكات و، نە برسییەتیش لادەبات، كەواتە: دۆزەخییەكان یان لە زەققووم دەخۆن، یان لە حوشتر خۆركە (**ضريع**).

ئنجا دەفەرموێ: ﴿ ثُمَّ إِنَّ لَهُمْ عَلَيْهَا لَشَوْبًا مِّنْ حَمِيمٍ ﴾، دوایی تێكەڵەیەكیشیان لە ئاوی كوڵاو بۆ هەیە، ئاوی كوڵاویشی لەگەڵ تێكەڵ دەكەن، ﴿ ثُمَّ إِنَّ مَرْجِعَهُمْ لَإِلَى الْجَحِيمِ ﴾، دوای ئەو ئاو خواردنەوەیەش، ئنجا دەیانبەنە نێو كڵپەی ئاگری دۆزەخ، كە بەس وێنا كردنەكەی زۆر قورس و بە زەحمەتە، واتە: تەنیا لە مێشكی خۆتدا وێنای بكەی، زۆر قورس و زەحمەتە، چ جای بە كردەوە خەڵك بەو شێوەیە سزا بدرێ، بەدڵنیایی خوا ﷻ خاوەنی ئەوپەڕی میهرەبانیی و بەزەییە، هەروەها خاوەنی ئەوپەڕی دادگەریی و كاربەجێیی و كارزانییە، بەڵام بەو شێوەیە سزایان دەداو، ئەوەش سزای پڕ بە پێستیانە.

لێرەش دەفەرموێ: ﴿ لَآكِلُونَ مِن شَجَرٍ مِّن زَقُّومٍ ﴾، لە درەختێك كە لە زەققوومە دەخۆن، واتە: لە میوەو بەرەكەی دەخۆن، كە لە سوورەتی (**الصافات**)دا، خوا ﷻ باش شەرح و تەفسیری كردوە، بۆیە لێرە بە كورتی هێناویەتی، چونكە لەوێ وردەكارییەكەی باسكردوە، ﴿ فَمَالِئُونَ مِنْهَا الْبُطُونَ ﴾، ورگیانی لێ دەئاخنن، واتە: پڕی سكیانی لێ دەخۆن، چونكە زۆر برسیین.

﴿ فَشَارِبُونَ عَلَيْهِ مِنَ الْحَمِيمِ ﴾، دواییش ئاوی كوڵاوو داغی لەسەر دەخۆنەوە.

﴿ فَشَارِبُونَ شُرْبَ الْهِيمِ ﴾، وەك چۆن ورگی خۆیان لە بەری درەختی زەققوم دەئاخنن، بە هەمان شێوە ئەو ئاوە كوڵیوو داغەش كە دەیخۆنەوە، خواردنەوەی

خـۆرەوانی ئـەو ئـاوە، وەک خواردنـەوەی حوشـترێکە کـە تـووشی نەخۆشـیی (**هُیَـام**)، یـانی: (تێـر ئـاو نەبـوون) بـووە، (**هِیْـم**) کـۆی (**أَهْیَـم**)ە‌و، کـۆی (**هَیْـمَاء**)ە، (**أَهْیَـم**) واتـە: حوشـتری نێـر کـە تـووشی نەخۆشـیی (**هُیَـام**) بـووە، هەروەهـا (**هَیْـمَاء**) واتـە: حوشـتری مـێ کـە تـووشی نەخۆشـیی (**هُیَـام**) بـووە.

لـە کۆتایـی دا خـوا دەفەرمـوێ: ﴿ هَٰذَا نُزُلُهُمۡ يَوۡمَ ٱلدِّينِ ﴾، ئـا ئەمـە خواردنیانـە، ئەمـە ئـەو خـواردن و خۆراکەیـە کـە بۆیـان دادەنـرێ لـە ڕۆژی سـزاو پاداشـت دا، بێگومـان ئـەوە لێـرەدا وەک توانـج و تەوسـە، چونکـە (**نُـزُل**) ئەوەیـە کـە بـۆ میـوان دادەنـرێ، واتـە: ئەوانـەش میوانێکـن، ئـا بـەو شـێوەیە پێشـوازییان لـێ دەکـرێ، چونکـە میـوانی دۆزەخن!!



www.alibapir.com


مەسەلە گرنگەکان

## مەسەلەی یەکەم:

**هاوەڵانی چەپە لە گوزەرانێکی هێندە دژواردان، وەسف ناکرێ، لە نێو گڕەباو، ئاوی کوڵاودا، لە سێبەرێکی بەرهەمی دووکەڵێکی ڕەش دان، کە هیچ جۆرە فێنکایەتیی و سوودو کەڵکێکی تێدانیە، ئەو سێبەرەش لە دووکەڵی ڕەش داوەستاوەو دروست بووە:**

خوا دەفەرموێ: ﴿وَأَصْحَٰبُ ٱلشِّمَالِ مَآ أَصْحَٰبُ ٱلشِّمَالِ ﴿٤١﴾ فِى سَمُومٍ وَحَمِيمٍ ﴿٤٢﴾ وَظِلٍّ مِّن يَحْمُومٍ ﴿٤٣﴾ لَّا بَارِدٍ وَلَا كَرِيمٍ ﴿٤٤﴾﴾.

شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە پێنج بڕگەدا:

١)- ﴿وَأَصْحَٰبُ ٱلشِّمَالِ﴾، هاوەڵانی چەپە، یان هاوەڵانی دەستە چەپ، **(صَاحِب)** بە **(أَصْحَاب)** کۆدەکرێتەوە، **(صَاحِب)** هەم بە مانای هاوەڵ دێ، هەم بە مانای خاوەنیش دێ، کەواتە: چ بڵێی: خاوەنانی دەستە چەپ، چ بڵێی: هاوەڵانی دەستە چەپ، واتە: ئەوانەی کە خاوەنی لای چەپەن، یاخود ئەوانەی هاوەڵانی لای چەپەن، ئنجا بۆچی وایان پێ گوتراوە؟ **(الَّذِيْنَ يَتَسَلَّمُونَ كِتَابهمْ بِشَمَائِلِهِمْ أَو بِشِمَالِهِم)** ئەوانەی نامەی کردەوەکانیان، لیستی کردەوەکانیان بە دەستە چەپەکانیان، یان دەستی چەپیان وەردەگرنەوە، وەک لە سوورەتی **(الحاقة)**دا دەفەرموێ: ﴿وَأَمَّا مَنْ أُوتِىَ كِتَٰبَهُۥ بِشِمَالِهِۦ فَيَقُولُ يَٰلَيْتَنِى لَمْ أُوتَ كِتَٰبِيَهْ ﴿٢٥﴾﴾ **الحاقة**، بەڵام کەسێک کە بە چەپەی (بە دەستی چەپی) نووسراوەکەی خۆی (لیستی کردەوەکانی خۆی، بڕوانامەکەی وەربگرێتەوە) دەڵێ: ئەی خۆزگە نووسراوەکەمم وەرنەگرتبایەوە، ئنجا دوایی خوا ﷻ باسی ئەو حاڵە دژوارە دەکات، کە تێیدان لە سوورەتی **(الحاقة)**و، لە چەند شوێنێکی دیکەی قورئاندا، خوا ﷻ ئەو تەعبیرەی دووبارە کردۆتەوە.

www.alibapir.com


٢)- ﴿ مَآ أَصۡحَٰبُ ٱلشِّمَالِ ﴾ هاوەڵانی چەپەکێن و چین؟ ﴿ مَآ ﴾ بۆ پرسیارکردنە، (مَا الإِسْتِفْهَامِيَّة)یەو، دەبێتە نیهاد (مُبْتَدَأ)و ﴿ أَصۡحَٰبُ ٱلشِّمَالِ ﴾ دەبێ بە گوزارە (خَبَر)ی، ئنجا ئەمە هەمووی: ﴿ أَصۡحَٰبُ ٱلشِّمَالِ ﴾ی یەکەم دەبێتە نیهاد (مُبْتَدَأ)و ﴿ مَآ أَصۡحَٰبُ ٱلشِّمَالِ ﴾، هەمووی دەبێتە گوزارە (خَبَر)ی ﴿ أَصۡحَٰبُ ٱلشِّمَالِ ﴾ی یەکەم.

﴿ مَآ أَصۡحَٰبُ ٱلشِّمَالِ ﴾، واتە: هاوەڵانی دەستە چەپ یان هاوەڵانی چەپە، کێن؟ یان چین؟ ئەم (مَا)یە، (إِبْهَامٌ يُفِيْدُ التَّنبيه بهم)، نامۆ کردنێکە مایەی ئەوەیە، سەرنج بدرێ، مایەی ئەوەیە مرۆڤ بێداربێتەوەو بزانێ داخۆ کێن و چۆنن و چۆن باس دەکرێن؟ هەروەها ئەم تەعبیرە ئەوەشی لێ دەفامرێتەوە کە ئەمانە حاڵ و بارودۆخیان بە جۆرێکە، کە هیچ وەسفکەرێک ناتوانێ وەسفیان بکات، ئنجا خوا ﷻ باسی حاڵ و گوزەرانی سەختیان دەکات و دەفەرموێ:

٣)- ﴿ فِي سَمُومٖ وَحَمِيمٖ ﴾، لە نێو گڕەبای گەرم و لە نێو ئاوی کوڵاوو داغ دان، (السُّمُومُ: الرِّيحُ الشَّدِيدُ الْحَرَارَةِ) (سموم) بایەکە گەرمییەکەی زۆر سەخت و توندە، ئەو گڕەبا گەرمەی هیچ تەڕایی پێوە نیە،

(سَـمُـوم):

أ- یان لە (سُمّ) وەرگیراوە، لەبەر ئەوەی وەک چۆن ژەهر دەچێتە نێو جەستەو تێکەڵ بە خانەکانی جەستە دەبێ و پێیدا بڵاودەبێتەوە، ئەو بایەش ئاوا دەچێتە نێو جەستە.

ب- یاخود لەوەوە هاتوە کە دەچێتە نێو کونەکانی جەستەوە، واتە: بایەکە کە لێی دەدات، دەچێتە نێو جەستەوە بە کونەکانی پێستدا.

﴿ وَحَمِيمٖ ﴾، (الْحَمِيمُ: الْمَاءُ الشَّدِيدُ الْحَرَارَةِ)، ئاوێک کە زۆر گەرمە، ئاوی کوڵاوو داغ، کەواتە: بێبڕوایان لە نێو گڕەبادان، لە نێو ئاوی کوڵاو داغ دان، چی دیکەش؟

٤)- ﴿ وَظِلّٖ مِّن يَحۡمُومٖ ﴾ هەروەها لە سێبەرێکدان کە لە دوو کەڵی ڕەش پێکهاتوە، (يَحْمُومُ: الدُّخانُ الْأَسْوَدُ عَلَى وَزْنِ يَفْعُول، مُشْتَقٌّ مِنَ الْحُمَمِ بِوَزْنِ صُرَدٍ اسْمٌ لِلْفَحْمِ.

www.alibapir.com



**وَالْحُمَمَةُ: الْفَحْمَةُ، وَالحَمَّةُ العَيْنُ الَّتِي مَاؤُهَا حَارٌّ**)، (**يَحْمُومُ**): بە مانای دووکەڵی ڕەش دێ، لەسەر کێشی (**يَفْعُول**)ە، کە داتاشراوە لە (**حُمَم**) کە لەسەر کێشی (**صُرَد**)ە، ناوە بۆ ڕەژوو، خەڵووز، (**حُمَمَةٌ**) واتە: (**فَحْمَة**) واتە: خەڵووز، پشکۆ، (**حَمَّة**) بە ئاوێک دەگوترێ: کە بە گەرمیی هەڵدەقوڵێ، لەو بارەوەش عەرەب قسەیەکیان هەیە دەڵێن: (**العَالِمُ كَالْحَمَّةِ، يَأْتِيهَا البُعَدَاء وَيَزْهَدُ فِيْهَا القُرَبَاء**)، زانا وەک سەرچاوەی گەرمە، خەڵکی دوور بۆی دێ، (خۆیانی پێ بشۆن و لێی بەهرەمەند بن) بەڵام ئەوانەی لێی نیزیکن، بە کەم بایەخ تەماشای دەکەن و، گرنگیی پێ نادەن.

٥)- ﴿لَّا بَارِدٍ وَلَا كَرِيمٍ﴾ {ئەو سێبەرە کە لە چڕە دووکەڵێکی ڕەشە} نە ساردو فێنکە، نە باش و پەسندیشە، (**وَصْفُ الظِلِّ بـ: ﴿لَّا بَارِدٍ وَلَا كَرِيمٍ﴾ للتَّهَكُّمِ، حَيْثُ نَفَى مِنْهُ البَرْدَ وَالكَرَمَ**)، کە خوا سێبەرەکە بەوە وەسف دەکات، دەفەرموێ: ﴿لَّا بَارِدٍ وَلَا كَرِيمٍ﴾، نە ساردەو نە کەریمە، (**كَرِيْم**)یش هەر شتێکە لە جۆری خۆیدا باش بێ، ئەمە بۆ توانج تێگرتن و گاڵتەپێکردنە، چونکە بێگومان سێبەرێک لە دووکەڵی ڕەش دا بوەستێ، سارد نیەو، بە کەڵک و سوود بەخش نیە، بۆ کەسێک کە دەچێتە ژێری، کەواتە: ئەو سێبەرەی سارد نەبێ و، بە کەڵکیش نەبێ، مانای وایە گەرم و زیانبەخشە.

(**الطبري**) لە وەسفی ئەوەدا، کە ئەو سێبەرەی لە دوو کەڵی ڕەش داوەستاوە و لە ئەنجامی ئەوەدا ئەو سێبەرە دروست بووە، دوایی خوا بسم الله الرحمن الرحيم هەم ساردێتیی و هەم پەسندیی لێ لادەبات، دەڵێ: (**الْعَرَب تُتْبِع كُلَّ مَنْفِيٍّ عَنْهُ صِفَةَ حَمْدٍ، نَفي الْكَرَمِ عَنْهُ، فَتَقُولُ: مَا هَذَا الطَّعَامُ بِطَيِّبٍ وَلَا كَرِيم، وَمَا هَذَا اللَّحْم بِسَمِينٍ، وَلَا كَرِيم، وَمَا هَذِهِ الدَّار بِنَظِيفَةٍ وَلَا كَرِيمَة**).

واتە: عەرەب عادەتیان وایە ئەگەر هەر شتێک بیانەوێ هەموو سیفەتێکی باشی لێ لابەرن، بە لێ لابردنی سیفەتی کەڕەم، هەموو سیفەتێکی باشی لێ لادەبەن، بۆ وێنە دەڵێن: ئەم خواردنە، نە خۆشەو نە کەریمە، هەروەها دەڵێن: ئەم گۆشتە نە خۆشەو نە کەریمە، ئەم خانووە نە پاکەو نە کەریمە، واتە:

www.alibapir.com


خواردنەکەو گۆشتەکەو خانووەکە، وێڕای ئەوەی خۆش نین و قەڵەو نین و پاک نین، سوودیشیان نیەو بێ کەڵکن، یان مەبەست ئەوەیە ئەوشتە هیچ دادێکی خاوەنەکەی نادات، یانی: بۆ زێدەڕۆییکردن و زیاتر جەختکردنەوەی لابردنی ئەو سیفەتەیە کە لێیان لابردوە.

با لەوبارەوەش ئەم دوو دەقە بێنین:

أ)- **(الطبري)** لە **(الضحاك)**ەوە: **(عَنِ الضَّحَّاكِ، قَالَ: كُلُّ شَرَابٍ لَيْسَ بِعَذْبٍ فَلَيْسَ بِكَرِيمٍ)** **(أخرجه الطبري: ٣٣٥٥٣)**، گوتوویەتی: هەر خواردنەوەیەک زوڵاڵ شیرین نەبێ، پێی دەگوترێ: کەریم نیە، واتە: سوودبەخش نیە.

ب)- هەروەها **(الطبري)** لە **(قتادة)**ەوە: **(عَنْ قَتَادَةَ، قَالَ : لَا بَارِد الْمَنْزِل، وَلَا كَرِيمِ الْمَنْظَر)** **(أخرجه الطبري: ٣٣٥٥٤)**. واتە: نە دابەزینەکەی فێنك و ساردە و، نە دیمەنەکەشی جوان و بەڕێزە.

لە تۆڕە کۆمەڵایەتییەکان لەگەڵتانین
Stay in touch on social media
نحن معكم عبر مواقع التواصل الاجتماعي
ڕاگەیاندنی مەکتەبی مامۆستا عەلی باپیر
AliBapir/عەلی باپیر
archive.org/details/@alibapir
AliBapir/عەلی باپیر
AliBapir
www.alibapir.net
عربي - کوردی - English
کەناڵی ڕاگەیاندنی مەکتەبی مامۆستا عەلی باپیر

www.alibapir.com



## مەسەلەی دووەم:

**هـۆكاری ئـەو سـەرەنجامە دژوارو سـەختەی هاوەڵانــی دەسـتە چـەپ، ئەوەیـە كـە پێشـتر هــەر سـەرگەرمی خۆشـگوزەرانیی و عەیـش و نـۆشی حـەڕام بـوون و، بـەردەوام بـوون لەسـەر گوناهـی مـەزن و، نكووڵیيلێكـردن لـە زیندووكرانـەوەو هەبـوونی سـزاو پاداشـت:**

خـوا دەفەرمـوێ: ﴿ إِنَّهُمْ كَانُوا۟ قَبْلَ ذَٰلِكَ مُتْرَفِينَ ﴿٤٥﴾ وَكَانُوا۟ يُصِرُّونَ عَلَى ٱلْحِنثِ ٱلْعَظِيمِ ﴿٤٦﴾ وَكَانُوا۟ يَقُولُونَ أَئِذَا مِتْنَا وَكُنَّا تُرَابًا وَعِظَٰمًا أَءِنَّا لَمَبْعُوثُونَ ﴿٤٧﴾ أَوَءَابَآؤُنَا ٱلْأَوَّلُونَ ﴿٤٨﴾ ﴾.

## شیكردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە پێنج بڕگەدا:

**١)-** ﴿ إِنَّهُمْ كَانُوا۟ قَبْلَ ذَٰلِكَ مُتْرَفِينَ ﴾، {ئەو سەرەنجامە دژوارەو، ئەو ئازارو مەینەتیی و جەزرەبەیەی بەسەریاندا دەسەپێنرێ:} بە هۆی ئەوەوەیە كە بە دڵنیایی ئەوان لە پێش ئەوەدا خۆشگوزەران بوون.

**(الطبري)** ئەم دەقەی هێناوە: (**عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ** رضي الله عنهما**، يَقُولُ:** ﴿ مُتْرَفِينَ ﴾، **مُنَعَّمِينَ**) (**أخرجه الطبري:** ٣٣٥٥٥). واتە: ئیبنو عەبباس رضي الله عنهما گوتوویەتی: خۆشـگوزەران بوون، هــەر خەریكــی عەیــش و نــۆش و خەریكــی ڕابــواردن بــوون، بــەڵام ڕابواردنێكــی حــەڕام، ڕابواردنێـك لەسـەر حیسـابی ڕۆژی دواییـان و، ڕابواردنێـك لەسـەر حیسـابی خەڵـك.

**٢)-** ﴿ وَكَانُوا۟ يُصِرُّونَ عَلَى ٱلْحِنثِ ٱلْعَظِيمِ ﴾، ئەوان مكووڕ بوون لەسەر گوناهی مەزن، سوور بوون لەسەری و دەستبەرداری نەدەبوون، **(إِصْرَار)** ئەوەیە كە كەسێك لەسەر شتێك سوور بێ و مكووڕ بێ و دەست بەرداری نەبێ.

هەروەها **(الطبري)** ئەو دەقانەشی هێناون:

www.alibapir.com


أ- (عَنْ مُجَاهِد يُصِرُّونَ: يُدْمِنُونَ) (جامع البيان: ٣٣٥٥٦)، (مجاهد) گوتوویەتی: (يُصِرُّونَ: يُدْمِنُونَ) واتە: بەردەوام بوون، (أَدْمَنَ عَلَى شَيء: دَاوَمَ)، واتە: بەردەوام بوو لەسەری و مکووڕ بوو.

ب- (الطبري) لە (الضَحَاك)ەوە هێناویەتی کە ﴿ٱلۡحِنثِ ٱلۡعَظِيمِ﴾، مەبەست پێی چییە؟ (قَالَ الضَّحَّاك: الحِنْثُ: الشِّرْكُ) (جامع البيان: ٣٣٥٦٠)، واتە: (حنث) هاوبەش بۆ خوا دانانە.

ج- (الطبري)یش دەڵێ: (وَكَانُوا يُقِيمُونَ عَلَى الذَّنْب الْعَظِيم، والذَّنْب الْعَظِيْم هُوَ الشِّرْكُ بِالله)، ئەوانە بەردەوام و مکووڕ بوون لەسەر گوناهی مەزن و، گوناهی مەزنیش بریتیە لە هاوبەش بۆ خوا دانان.

هەڵبەتە هاوبەش بۆ خوادانان یەکێکە لە گوناهە مەزنەکان و، ئەو گوناهەیە کە هەرگیز خوا بسم الله الرحمن الرحیم قەڵەمی عەفووی بەسەردا ناهێنێ، وەک دەفەرموێ: ﴿إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَغۡفِرُ أَن يُشۡرَكَ بِهِۦ وَيَغۡفِرُ مَا دُونَ ذَٰلِكَ لِمَن يَشَآءُۚ وَمَن يُشۡرِكۡ بِٱللَّهِ فَقَدِ ٱفۡتَرَىٰٓ إِثۡمًا عَظِيمًا ٤٨﴾ النساء، واتە: خوا لەوە نابوورێ هاوبەشی بۆ دابنرێ، بەڵام جگە لەوە لە هەر شتێک بیەوێ، بۆ هەر کەسێک بیەوێ، دەبوورێ {واتە: بەبێ تۆبەو گەڕانەوەش، بەڵام لە شیرک نابوورێ بەبێ گەڕانەوەو دەست لێ هەڵگرتنی} هەر کەسێکیش هاوبەش بۆ خوا دابنێ ئەوە درۆیەکی مەزنی بۆ خوا هەڵبەستوە، بەڵام بێگومان شیرک جۆرێکە لە جۆرەکانی کوفرو، کوفر گشتییە: شیرک دەگرێتەوە، ئیلحاد دەگرێتەوە، بێبڕوایی بە ڕۆژی دوایی دەگرێتەوە، بێبڕوایی بە پێغەمبەر ﷺ دەگرێتەوە، بێبڕوایی بە پەیامی خوا دەگرێتەوە، کەواتە: ﴿ٱلۡحِنثِ ٱلۡعَظِيمِ﴾، جگە لە کوفرو شیرک و ئیلحاد، هەموو جۆرەکانی بێبڕوایی و، هەموو گوناح و لادان و تاوانەکانی دیکەش دەگرێتەوە.

ئنجا خوا بسم الله الرحمن الرحیم نەیخستۆتە ڕوو، گوناهی مەزن چییە؟!

www.alibapir.com



کەواتە: ئەوە بۆچوونی زانایانە، کە زۆربەیان دەڵێن: (**الحنث العظیم**) هاوبەش بۆ خوادانانە، لەبەر ئەوەی هاوبەش بۆ خوا دانان باوترین جۆری کوفر بووەو، ئێستاش لەگەڵدابێ، هەر وایە ئەگەرنا ﴿ٱلۡحِنثِ﴾، مادام بە مانای گوناح و تاوان بێ، ﴿ٱلۡعَظِيمِ﴾یش، واتە: مەزن، هەموو گوناهە گەورەکان دەگرێتەوە، هەر لە شیرک و ئیلحادەوە بگرە، هەتا قەتڵ و زیناو ڕێگریی و دزیی و تێکدانی ئاسایشی خەڵک و هەموو گوناهەکانی دیکە، چ سزای دنیاییان لەسەر بێ، چ هەڕەشەی قیامەتییان لەسەر بێ، ئەوانەی هەڕەشەی قیامەتییان لەسەرە، وەک: خۆبەزلگریی و، درۆو، غەیبەت و، قسەهێنان و بردن و، گاڵتە بە خەڵک کردن و، گومانی خراپ بە خەڵک بردن و، حەسەدو ... هتد، ئەوانەش کە سزای دنیاییان لە سەرە دیارن: قەتڵ، زینا، ڕێگریی، دزیی...

٣)- ﴿وَكَانُواْ يَقُولُونَ﴾، ئەوان کاتی خۆی دەیانگوت:

٤)- ﴿أَئِذَا مِتۡنَا وَكُنَّا تُرَابٗا وَعِظَٰمًا أَءِنَّا لَمَبۡعُوثُونَ﴾، ئایا ئەگەر ئێمە مردین و بووینەوە خۆڵ و، ئێسکەکان، ئایا ئێمە زیندوو دەکرێینەوە؟! هەمزەی پرسیارکردن لە هەردوو شوێنەکاندا، ﴿أَئِذَا مِتۡنَا﴾ و ﴿أَءِنَّا لَمَبۡعُوثُونَ﴾، ئەم هەمزەیە لە هەردوو شوێنەکان دا (**لِلإِنْكَارِ وَالإِسْتِبْعَاد**) بۆ نکووڵییلێکردن و بە دوور تەماشاکردنە، (**إِسْتَبْعَدُوا أَنْ يُبْعَثُوا بَعْدَ المَوْت**)، بە دووریان زانی، لە دوای مردن زیندوو بکرێنەوە، بۆیەش دەڵێن: ﴿وَكُنَّا تُرَابٗا وَعِظَٰمًا﴾، بووینەوە گڵ و ئێسکەکان، (**عَظْم**) کۆیەکەی (**عِظَام**)ە، بە زۆریی خوا ﷻ وشەی (**عَظْم**)ی لە قورئاندا بە (**عِظَام**) هێناوە، بە ئێسقانەکان، ئێسکەکان، چونکە گۆشتەکە زووتر دەبێتەوە بە گڵ و خاک، بەڵام پەیکەری ئێسکی مرۆڤ لەبەر ئەوەی ماددەکەی سەختترە، دەمێنێتەوە، هەڵبەتە ئەویش لە سەرەنجامدا هەر دەبێتەوە بە خاک، وەک خوا فەرموویەتی: ﴿مِنۡهَا خَلَقۡنَٰكُمۡ وَفِيهَا نُعِيدُكُمۡ وَمِنۡهَا نُخۡرِجُكُمۡ تَارَةً أُخۡرَىٰ ٥٥﴾طه، واتە: لەوێوە دەرمان هێناون و، دەشتانگێڕینەوە بۆ وێ (بۆ نێو خاک)و جارێکی دیکەش لەوێ دەرتان دێنینەوە، ئەمەش هەمووی مەبەست پێی جەستەیە، ئەگەرنا ڕووح نە لە خاکەوە هاتوە، نە دەچێتەوە نێو

خاک و، نە لەخاکیش دێتەوە دەرێ، بەڵکو ڕووح دروستکراوێکی تایبەتیی خوایە، لەسەرووی ماددەوەیەو، حەقیقەتی مرۆڤ بریتیە لە ڕووحەکەی ، جەستەکەی تەنیا بەرگ و پۆشاکێکە بە بەریدا دەکرێ و دیکۆرێکە، ڕووحەکەی دەچێتە نێوی، هەتا ئەو جەستەیەش بە کەڵکی تێدامان بێ، ڕووحەکەی تێیدایە، کە بە کەڵکی تێدا مانەوە نەما، ڕووحەکەی لێی دەچێتە دەرێ بە فەرمانی خواو، ئەو ڕووحە دەچێتە شوێنێک، لە قۆناغی بەرزەخ داو ئەگەر چاکەکار بوو بێ، لە بەهەشت دایە، یاخود لە دۆزەخ دایە، ئەگەر خراپەکاربوو بێ، ئنجا ئایا ئەو بەهەشت و دۆزەخە، بەهەشت و دۆزەخێکی کاتیی و ڕاگوزەرن لە قۆناغی بەرزەخ دا، یان هەمان بەهەشت و دۆزەخی یەکجارەکیین و تەنیا وەک ڕووح دەچنە تێیان؟ زانایان هەردوو ڕایەکەیان هەن، گرنگ ئەوەیە ڕووح لە نێو گۆڕەکەدا نیە، بەڵام جۆرێک لە پەیوەندیی لەگەڵ جەستەکەیدا دەبێ، تاکو جەستە کە مابێ، زۆر لە دەقەکانی سوننەت ئەوە دەگەیەنن، بەڵام ئەوەکە ڕووح دوای ئەوە لە جەستە هاتەدەرێ، بچێتەوە نێو جەستە! هیچ دەقێک وای نەفەرمووەو، هەندێک دەق کە ڕواڵەتەکەیان ئەوە دەگەیەنێ، دەبێ وا تەئویل و مانا بکرێن کە مەبەست ئەوەیە، وەک زیندوو بن، ئاوا پرسیارو وەڵامیان لەگەڵدا دەکرێ، ئەگەرنا ئەو جەستەیە کە ڕووحی لێ چووە دەر، ڕووحەکە ناچێتەوە تێی، تاکو ڕۆژی دوایی، ڕۆژی دواییش هەر خوا دەزانێ ئەو جەستەیە لە چ جۆرە ماددەیەک دەبێ و چۆن دەبێ، بەڵام گرنگ ئەوەیەهەرکەسەکەسایەتیی خۆی پارێزراو دەبێ بەهۆی ڕووحەکەیەوەو، خوا بسم الله الرحمن الرحیم ئەو جەستەیەش بە شێوەیەک، کە ئەو خەڵکە لە قیامەتیش یەکدیی بناسنەوەو، پێک ئاشنابنەوە، بەو شێوەیە دروستی دەکاتەوە، بەڵام وەک دوایی دەیگەیێنێ لە ماددەیەکە کە جۆرێکی دیکەیەو، لە پێکهاتەیەکی دیکەیە، کە لەگەڵ قۆناغی بەرزەخدا دەگونجێ و، دواتریش لەگەڵ قۆناغی قیامەت دا دەگونجێ.

٥)- ﴿ أَوَءَابَآؤُنَا ٱلۡأَوَّلُونَ ﴾، هەروەها ئایا باب وباپیرانی پێشووشمان (ئەوانیش زیندوو دەکرێنەوە)؟!.

بێگومان پرسیارکردنە بۆ نکووڵییلێکردنە، یانی: وانیە.

www.alibapir.com


## مەسەلەی سێیەم:

**وەڵامدرانەوەی بێبڕوایان کە بە دڵنیایی تێکڕایان زیندوو دەکرێنەوەو، لە ژوانگەی ڕۆژێکی دیاریکراودا خڕ دەکرێنەوەو، ئەو کاتەش گومڕایانی بەدرۆدانەر لە میوەو بەری درەختی زەققووم دەخۆن و، سکیانی لێ دەئاخنن و، لە ئاوی کوڵیویش وەک حوشتری تووشبووی نەخۆشیی تێر ئاو نەبوون، دەخۆنەوە، ئا ئەوەیە شێوازی میوانداریی لێکردنیان:**

خوا دەفەرمووێ: ﴿ قُلْ إِنَّ ٱلْأَوَّلِينَ وَٱلْـَٔاخِرِينَ ﴿٤٩﴾ لَمَجْمُوعُونَ إِلَىٰ مِيقَٰتِ يَوْمٍ مَّعْلُومٍ ﴿٥٠﴾ ثُمَّ إِنَّكُمْ أَيُّهَا ٱلضَّآلُّونَ ٱلْمُكَذِّبُونَ ﴿٥١﴾ لَءَاكِلُونَ مِن شَجَرٍ مِّن زَقُّومٍ ﴿٥٢﴾ فَمَالِـُٔونَ مِنْهَا ٱلْبُطُونَ ﴿٥٣﴾ فَشَٰرِبُونَ عَلَيْهِ مِنَ ٱلْحَمِيمِ ﴿٥٤﴾ فَشَٰرِبُونَ شُرْبَ ٱلْهِيمِ ﴿٥٥﴾ هَٰذَا نُزُلُهُمْ يَوْمَ ٱلدِّينِ ﴿٥٦﴾ ﴾.

## شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە هەشت بڕگەدا:

دوای ئەوەی کە ئەوان بە پرسیارکردنی نکووڵیلێکەرانەو بە دوور دانەرانە (**مُنْكِرِيْن وَمُسْتَبْعِدِيْن**) گوتیان: ئایا کە مردین و بووینەوە خاک و خۆڵ بووینەوە ئێسقان، ئایا ئێمە زیندوو دەکرێینەوە؟ هەروەها ئایا باب و باپیرانی پێشووشمان، ئەوانیش زیندوو دەکرێنەوە؟! خوا ﷻ دەفەرمووێ:

**١)-** ﴿ قُلْ إِنَّ ٱلْأَوَّلِينَ وَٱلْـَٔاخِرِينَ ﴾، بڵێ: بە دڵنیایی پێشووەکان و کۆتاییەکان، ئەوانەی ڕابردوون و ئەوانەی دوایی دێن، (**الأَوَّلِيْنَ مِنَ الأُمَمِ وَالأخِرِيْن مِنْهُمْ الَّذِيْنَ أَنْتُمْ مِنْ جُمْلَتِهِم**)، کۆمەڵگا پێشووەکان و کۆمەڵگا دواییینەکان، کە ئێوەی بێبڕوایان (ی کۆمەڵگای پێغەمبەر ﷺ) لە نێو ئەوان دان.

**٢)-** ﴿ لَمَجْمُوعُونَ إِلَىٰ مِيقَٰتِ يَوْمٍ مَّعْلُومٍ ﴾، کۆدەکرێنەوە بۆ ژوانگەی ڕۆژێکی زانراو، بۆچی دەفەرمووێ: ﴿ لَمَجْمُوعُونَ ﴾ و نەیفەرمووە: (**لَمَبْعُوثُون**)؟ یان (**لَمَحْشُورُوْن**)، کە لە شوێنی دیکەدا ئەو بێژانەش هاتوون؟ وەڵامەکەی ئەوەیەکە: ﴿ لَمَجْمُوعُونَ ﴾، لە

www.alibapir.com



یەک کاتدا، سێ واتایان دەگەیەنێ: أ- زیندووش دەکرێنەوەو، ب- خڕیش دەکرێنەوەو، ج- پێکەوەش دەبن، واتە: بە پرژو بڵاویی نابن، بەڵێ بە پرژو بڵاویی هەر کەسە لە شوێنی خۆی هەڵدەستێتەوە، بەڵام دوایی هەموویان خڕ دەکرێنەوە سەریەک، بۆ کوێ؟ ﴿إِلَىٰ مِيقَٰتِ يَوۡمٍ مَّعۡلُومٍ﴾، بۆ ژوانگەی ڕۆژێکی زانراو، (**المِيقَاتُ: أَصْلُهُ آلَةٌ للوَقْتِ، ثُمَّ أَطْلَقُوُه عَلَى مَكَانٍ أو وَقْتِ عَمل مَا**)، (**مِيقَاتْ**): لە ئەصڵدا بریتیە لە ئامرازی کات، بەڵام دوایی بەکارهێنراوە بۆ شوێن یان کاتی کردەوەیەکی دیارییکراو.

بۆچـی دەفەرمـوێ: ﴿لَمَجۡمُوعُونَ إِلَىٰ مِيقَٰتِ يَوۡمٍ مَّعۡلُومٍ﴾ و نافەرمـوێ: (**لَمَجْمُوعُـون فِي مِيقَـاتِ يَـوْمٍ مَعْلُـوُم**) کـە لـە ئەصڵـدا کۆکردنـەوە (**جمـع**) بـە پیتـی (**فِي**) بـەرکار دەخـوازێ، کەچـی لێـرەدا بـە (**إلى**) بـەرکاری خواسـتوە؟ کـۆ دەکرێنـەوە بـەرەو ژوانگـەی ڕۆژێکـی زانـراو؟ وەڵامەکـەی: چونکـە (**ضُمِّـنَ مَجْمُوُعُـون مَعْنَـى مَسُـوقُوْن**)، واتــە: ئێـوە کۆدەکرێنـەوەو دوایـی لـێ دەخوڕدرێـن و دەبرێـن بـەرەو ژوانگـەی ڕۆژێکـی زانـراو، واتـە: (**مَجْمُوعُـون**) کـە بـە (**إلى**) بـەرکاری خواسـتوە، هـەم مانـای کۆکردنـەوەو خڕکردنـەوە، هـەم مانـای وە پێـش خـۆدان و بردنیـش دەگەیەنـێ، (**مَجْمُوعُـون**) بـە بێژەکـەی خـۆی و، بردنیـان بـەرەو ژوانگـە (**سـوق**)کەش بەهـۆی ئـەو پیتـەوە کـە بەرکارەکـەی پـێ خواسـتوە، کـە بریتیـە لـە (**إلى**).

٣)- ﴿ثُمَّ إِنَّكُمۡ أَيُّهَا ٱلضَّآلُّونَ ٱلۡمُكَذِّبُونَ﴾، دوایی بە دڵنیایی ئێوە ئەی گومڕا بووە بە درۆدانەرەکان! (**ثُمَّ: للتَرْتِيْب الرُّتْبِي**) (**ثم**) بۆ ڕیزبەندیی پلە پلەییە، چونکە ئەوەی دێ، پلەو پێگەکەی گرنگترە لەوەی ڕابردووە، سەرەتا کۆدەکرێنەوەو، پێش خۆ دەدرێن بەرەو ژوانگەی ڕۆژێکی زانراو، ﴿ثُمَّ إِنَّكُمۡ﴾، ئنجا دوای ئەوە، ئێوە ئەی گومڕابووە بەدرۆدانەرەکان!

٤)- ﴿لَأٓكِلُونَ مِن شَجَرٍ مِّن زَقُّومٍ﴾، بەدڵنیایی بخۆر دەبن لە درەختێک کە لە زەققوومە، واتە: لە بەری جۆرە درەختێک کە بریتیە لە زەققووم، لەوە دەخۆن، (**مِن**)ی یەکەم ﴿مِن شَجَرٍ﴾، ئەمە بۆ دەستپێکردن (**إبتداء**)ە، (**مِن**)ی (**من زقوم**)یش بۆ ڕوونکردنەوە

www.alibapir.com



(**بیان**)یە، ئایا ئەو درەختە چ جۆرە درەختێکە؟ درەختی زەققوومە، کە پێشتر باسی درەختی زەققووممان کردوە، بە کوردیی دەڵێن: ژەقنەمووت، هەندێک لە زانایانیش گوتوویانە: جۆرە درەختێک هەیە، بەرەکەی زۆر تاڵ و زۆر تفتەو قووت ناچێ، دەشگونجێ ئەو درەختەی زەققووم ئێستا لە دنیادا نەبێ، واتە: وێنەکەشی لە دنیادا نەبێ، ئەگەرنا بێگومان ئەوەی خوا ﷻ لە دواڕۆژدادەیکات بە خۆراک بۆ ئەو گومڕا بووە بە درۆدانەرانە، وەک هی دنیا هەر نیەو هیچ شتێکی ڕۆژی دوایی، وەک هی دنیا نیە، ڕەنگە هەر وێنەشی نەبێ لە دنیادا، کاتی خۆی لە تەفسیری سووڕەتی (**الصافات**) دا باسمانکردوە، کە زانایان گوتوویانە: زەققووم جۆرە درەختێکی دڕکاوییە، بەرەکەی زۆر تاڵ و تفتە، بەڵام بەپێی ئەوە کە خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿إِنَّهَا شَجَرَةٌ تَخْرُجُ فِىٓ أَصْلِ ٱلْجَحِيمِ ﴿٦٤﴾ طَلْعُهَا كَأَنَّهُۥ رُءُوسُ ٱلشَّيَٰطِينِ ﴿٦٥﴾﴾ **الصافات**، واپێدەچێ درەختێک بێ، تەنیا لە قیامەت داو، لە دۆزەخ دا هەبێ، بۆ تاوانباران.

٥)- ﴿فَمَالِـُٔونَ مِنْهَا ٱلْبُطُونَ﴾، ئنجا ئێوە ورگتانی لێ پڕ دەکەن، ئێوە پڕکەری ورگەکان دەبن، لێی، (أل)ی سەر ﴿ٱلْبُطُونَ﴾، بۆ ناساندنە، بەڵام لێرەدا قەرەبووی پاڵوەلادراو (**مُضَاف إليْهِ**) دەکاتەوە، واتە: (**فَمَالِئُوْن مِنْهَا بُطُونَكُم**) ئێوە سکی خۆتانی لێ دەئاخنن، ئەگەر بەشێوەی دواندن (**خِطَاب**) بێ، ئەگەرنا: (**فَمَالِئُوْن مِنْهَا بُطُونَهُم**) واتە: ئەوان ورگی خۆیانی لێ پڕ دەکەن.

٦)- ﴿فَشَٰرِبُونَ عَلَيْهِ مِنَ ٱلْحَمِيمِ﴾، ئنجا ئێوە لەسەری خۆرەوە دەبن لە ئاوی کوڵاوو داغ، (**الحَمِيْم: المَاءُ المَغْلِيُّ الشَّدِيدُ الحَرَارَةِ**)، (**حميم**) ئاوێکی کوڵاوی یەکجار زۆر گەرمە، ئاو لە پلەی سەد (١٠٠) دەکوڵێ، لێرە لەلای ئێمە لە دنیادا، بەڵام مەرج نیە ئاوی دۆزەخ لە پلەی سەد (١٠٠) بکوڵێ و ببێتە هەڵم و نەمێنێ، چونکە لە دنیادا ئاو لە پلەی سەدو، دوای ئەوەی کوڵی، دەبێتە هەڵم و نامێنێ، بەڵام هی ئەوێ وەک چۆن ئاگرەکەی حەفتا (٧٠) هێندەی ئاگری دنیا گەرمە، کە لە فەرمایشتی پێغەمبەردا ﷺ هاتوە، ئاوەکەشی مەرج نیە تەنیا لە پلەی سەد دا بکوڵێ، هەڵبەتە هەموو حاڵ و حیسابەکانی ڕۆژی دوایی چ بۆ بەهەشتییان، چ بۆ دۆزەخییان، لەوەی دنیا

www.alibapir.com


جیان و جەستەکانیشیان جیان و تەحەممولکردنیشیان جیایە، ئەگەرنا کەسێک بیخەیە نێو ئاوی کوڵیوو داغەوە، دەمرێ، یان بیخەیە نێو بڵێسەی ئاگرەوە، دەبێتە قەرەبرووت و دەسووتێ و کۆتایی پێ دێ، بەڵام ئەو دۆزەخییانە جەستەیەکیان هەیە، تەحەممولی ئەو بڵێسە گەرمە دەکەن، تەحەممولی ئەو ئاوە گەرمەش دەکەن و، تەحەمولی خواردنی بەری درەختی زەققووم و حوشتر خۆرکە (**ضريع**)یش دەکەن و، بەردەوامیش دەبن لە ژیاندا بە فەرمانی خوا، وەک دەفەرموێ: ﴿ثُمَّ لَا يَمُوتُ فِيهَا وَلَا يَحْيَىٰ ﴿١٣﴾﴾ **الأعلى**، دوایی نە تێیدا دەمرێ و، نە تێیدا دەژی، نە دەمرێ و کۆتایی پێ بێ و، نە دەژی ژیانێک بە ژیان لە قەڵەم بدرێ.

٧)- ﴿فَشَٰرِبُونَ شُرْبَ ٱلْهِيمِ﴾ ئنجا خۆرەوەی دەبن خواردنەوەی حوشتری تێرئاونەبوو. یانی: ئەو ئاوە کوڵاوو داغەی دەیخۆنەوە، وەک خواردنەوەی حوشترێکە کە تووشی نەخۆشیی هویام بووە، وشەی (**شُرْب**) خوێنراویشەتەوە: (**شَرْب**)، ﴿فَشَٰرِبُونَ شُرْبَ ٱلْهِيمِ﴾ و (**شَرْبَ الهِيْم**)، (**هِيْم**)یش کۆی (**أَهْيَم و هَيْمَاء**)ە، (**أَهْيَم**) بۆ نێر (**مذكَّر**)ە، حوشتری نێر کە تووشی نەخۆشیی هویام دەبێ، (**هَيْمَاء**)یش حوشتری مێیە، کە تووشی نەخۆشیی هویام دەبێ، (**الهُيام: داءٌ يُصِيبُ الإِبِلَ يُورِثُها حُمَّى فِي الأَمْعاءِ، فَلا تَزَالُ تَشْرَبُ وَلَا تَرْوَى**)، (**هُيَام**): دەردێکە تووشی حوشتر دێ و، گەرمیی و تایەک لە ڕیخۆڵەکانیدا پەیدا دەبێ، بەردەوام ئاو دەخواتەوەو تێر نابێ، بێبڕوایانیش لەو ئاوە گەرم و داغ و کوڵاوەی نێو دۆزەخ دەخۆنەوە، وەک ئەو حوشترەی تووشی ئەو دەردو نەخۆشییە بووە، لە کۆتاییدا خوای بەرز دەفەرموێ:

٨)- ﴿هَٰذَا نُزُلُهُمْ يَوْمَ ٱلدِّينِ﴾، ئا ئەمە میوانداریی کردنیانە، (ئەمە ئەو خواردنەیە کە بۆیان دادەنرێ) لە ڕۆژی سزاو پاداشت دا، (**نُزُل: مَا يُقَدَّمُ للضَّيْفِ مِنْ طَعَام**)، ئەو خواردنەی بۆ میوان دادەنرێ.

www.alibapir.com


## پوختەی باسی سزای بێبڕوایان و هۆکارەکانی:

بەپێی ئەو ئایەتانەی ڕابردن، سزا و جەزرەبەی هاوەڵانی چەپە لە پێنج شتان دا بەرجەستە دەبێ:

١- ﴿سَمُومٍ﴾، گڕەبای گەرم.

٢- ﴿وَحَمِيمٍ﴾، ئاوی کوڵاوو داغ، کە تێیدا دەبن، چونکە دەفەرموێ: ﴿فِي سَمُومٍ وَحَمِيمٍ﴾، لە نێو گڕەبادا دەبن و، لە ئاوی کوڵاویشدا دەبن.

٣- ﴿وَظِلٍّ مِّن يَحْمُومٍ﴾، سێبەرێک لە دووکەڵی ڕەش داوەستاو، یان چڕە دووکەڵێکە سێبەری کردوە.

٤- ﴿لَآكِلُونَ مِن شَجَرٍ مِّن زَقُّومٍ﴾، خواردن لە میوەی درەختی زەققووم.

٥- ﴿فَشَارِبُونَ عَلَيْهِ مِنَ الْحَمِيمِ﴾، ئاو خواردنەوە لە ئاوی کوڵاو، وەک جۆرە ئاو خواردنەوەی حوشترێک کە تووشی نەخۆشیی تێر ئاو نەبوون بووە.

ئەمانە ئەو پێنج جۆرە سزاو جەزرەبەن، کە هاوەڵانی دەستە چەپیان پێ سزا دەدرێن.

### هـــۆکارەکەی چـــییە؟

خوا ﷻ هۆکارەکەش لە چوار شتان دا باس دەکات، ئەگەر بەپێی ڕیزبەندیی کە لە ئایەتەکاندا هاتوون، بیانهێنین، نەک بەپێی ڕیزبەندیی کاتیی و ڕیزبەندیی بوونیان:

١)- خۆشگوزەرانیی (**الإِتْراف**): ﴿إِنَّهُمْ كَانُوا قَبْلَ ذَلِكَ مُتْرَفِينَ﴾ ئەوان پێشتر خۆشگوزەران بوون، تەنیا خەمیان خواردن و خواردنەوەو گرنگیی دان بوو بە عەیش و نۆش، بێ سەرنجدانی حەڵاڵ و حەرام و، بەبێ ئاوڕدانەوە لە خەڵک و سەرهەڵبڕین، بەرەو خواو بەرەو قیامەت، ئەگەرنا ئەسڵی خۆشگوزەرانیی و ئەوە کە مرۆڤ خۆش بژی لەشەرعدا، بەشتێکی ناپەسند دانەنراوە، بەڵکو خوا ﷻ لەو هەموو ئایەتانەدا

www.alibapir.com



منەت دەکات لەسەر مرۆڤەکان، کە هەرچی نیعمەتە بۆ ئێوەم خولقاندوە، ئنجا جاری دیکەش باسمانکردوە کە خوا ﷻ سەرزەنشتی ئەوانە دەکات، کە بژیوە پاک و چاکەو خۆش و بە لەززەتەکان قەدەغە دەکەن: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تُحَرِّمُواْ طَيِّبَٰتِ مَآ أَحَلَّ ٱللَّهُ لَكُمْ وَلَا تَعْتَدُوٓاْۚ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُحِبُّ ٱلْمُعْتَدِينَ ﴿٨٧﴾﴾ المائدة، ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە! ئەو بژیوە پاک و چاک و خۆش و بە کەڵکانەی خوا بۆی ڕەوا کردوون، قەدەغەیان مەکەن و، سنوور شکێنیی مەکەن، بێگومان خوا ﷻ سنوور شکێنانی خۆشناوێن، کەواتە: لێرەدا مەبەست خۆشگوزەرانییەکە، لەسەر حیسابی قیامەت بێ و، لەسەر حیسابی خەڵکی ڕەش و ڕووت بێ و، بە شێوەیەک بێ کە لەسەر حیسابی ڕووح و، لەسەر حیسابی ڕۆژی دوایی و بەها بەرزەکان بێ و، بەشێوەی چاو لەسەر چڕ داگرتنی، تەنیا عەیش و نۆش و خۆشگوزەرانیی ماددیی و جەستەیی بێ.

**٢)**- بەردەوام بوون لەسەر گوناهی مەزن: (وَكَانُواْ يُصِرُّونَ عَلَى ٱلْحِنثِ ٱلْعَظِيمِ ) گوناحی مەزنیش شیرک و کوفرە بە هەموو جۆرەکانیەوەو، گوناهەکانی دیکەن، وەک: ستەم و قەتڵ و زیناو ڕێگریی و ... هتد.

**٣)**- گومڕایی: ﴿أَيُّهَا ٱلضَّآلُّونَ﴾، گومڕابوون و بە ڕێ نەزانین و سەرگەردانیی.

**٤)**- بێبڕوایی بە ڕۆژی دوایی: (**المكذبون**) بەدرۆدانەرانی ڕۆژی سزاو پاداشت.

کەواتە: ئەوانە چوار هۆکارەکان بوون: خۆشگوزەرانیی و، مکووڕ بوون لەسەر گوناهی مەزن و، گومڕایی و، بێبڕوایی بە ڕۆژی سزاو پاداشت و، زیندوو بوونەوەو هەبوونی سزاو پاداشت.

کەواتە: ئەگەر ڕیزبەندیی بوونیی (**الترتيب الوجودي**) ڕەچاو بکەین، دەبێ بڵێین:

**١**- گومڕایی.

**٢**- ئنجا لە ئەنجامی گومڕایی دا ژیانی خۆشگوزەرانییان هەڵبژاردوە، لەسەر حیسابی قیامەت و، لەسەر حیسابی خەڵک و، بە شێوەیەکی وا کە ڕەچاوی حەڵاڵ و حەڕام و، چاودێریی خواو، مافی خەڵک نەکەن.

www.alibapir.com


٣- ئەوەش دوایی سەری کێشاوە بۆ ئەوە کە بەردەوام بن لەسەر گوناهی مەزن.

٤- پاشان بێبڕواش بن، بە ڕۆژی دوایی.

کەواتــە: لــە ڕووی ڕیزبەندیــی بوونیــی (**الترتيــب الوجودي**)يــەوە، گومڕابــوون پێش هەموویـان دەکـەوێ، بەڵام خوا ﷻ لێرەدا بەپێـی ڕیزبەندیی بوونیی نەیهێنـاون، بەڵکو بەپێـی ئـەوە هێنـاونی کـە چ شـتێک لەوانـدا زیاتـر زەقـە، ئەویـش خۆشـگوزەرانییە، ئنجـا ئەگـەر تەماشـای خەڵکـی دنیـاش بکـەی، ئەوانـەی بێبـڕوان، هـەر وایـان دەبینـی، وادەزانـن مـرۆڤ تەنیـا گـەدەو داوێنـەو، تەنیـا هەسـت بـە لـە پشـتێن بـەرەو ژێـری خۆیـان دەکـەن، بـەڵام هەسـت بـە عەقـڵ و دڵ و دەروون و ڕووحیـان ناکـەن، هەسـت بـە داخوازیـی و پێداویسـتییەکانی ڕووح و دڵ و هەناویـان ناکـەن، تەنیـا هەسـت بـە بـوونی لـە پشـتێن بـەرەو ژێریـان دەکـەن، بۆیـە تەنیـا لـە بیـر لێکردنـەوەی: پـڕ کـردنی گیرفـان و تێرکـردنی داوێـن و گەدەیانـدان، بۆیـەش خـوا ﷻ بەوە دەسـتی پێکردوە، چونکە ئەوە زەقترین سیفەت و سیماو دروشمی کەسـانی بێبڕوایـە.

خـوا بـە لوتـف و کەرەمـی خـۆی، ئێمـە پەنـا بـدات کـە بـەو شـێوەیە بیربکەینەوە، کـە پێمان وابـێ تەنیـا جەسـتەیەکی ڕووتیـن، و پێـمان وابـێ تەنیـا لـە پشـتێن بـەرەو ژێرین.

سُبحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ، أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إلاَّ أَنْتَ، أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ.

www.alibapir.com


## پێناسەی ئەم دەرسە

ئەم دەرسەمان ئایەتەکانی: (٥٧ - ٧٤) کە هەژدە (١٨) ئایەتن، دەگرێتە خۆی، ئەم هەژدە ئایەتە خوای کارزان و میهرەبان تێیاندا باسی بەڵگە هێنانەوە لەسەر سەلماندنی ڕاستیی زیندووکرانەوەو، هەبوونی سزاو پاداشت، کردوە، ئەویش بە هێنانەوەی چوار بەڵگە:

**یەکەم:** دروستکردنی مرۆڤ لە نوتفە، تۆویلکەیەک کە بەزەحمەت بە چاو دەبینرێ.

**دووەم:** ڕواندنی کشتوکاڵ، بەڵێ مرۆڤەکان زەوی دەکێڵن و، نەمامەکان دەنێژن و، تۆوەکان دەوەشێنن، بەڵام ئەوەی دەیانڕوێنێ، خوایە.

**سێیەم:** لەسەرێوە دابەزاندنی ئاوی شیرین و زوڵاڵ، کە هەر لەو ئاوە سوێرو تاڵەی زەریاو ئۆقیانووسەکان پەیدابووەو، پاڵێوراوە لە ڕێی بە هەڵم بوون، بە هۆی تیشکی خۆرەوە، پاشان بەرزبوونەوەی هەڵمەکەو، هێنرانی بۆ شوێنە ساردەکان و دوایی پێکهاتنی هەورەکان، کە هەورەکانیش هەر هەڵمەکەن، خڕ دەبنەوەو چڕ دەبنەوە، دوایی هاتنە خواری ئاو لەو هەورانە، بە هەر سێ شێوەی: باران و بەفرو تەرزە.

**چوارەم:** ڕەخساندنی سووتەمەنیی بە گشتیی و، بە تایبەتی دارو درەخت و سەوزایی، کە دەبێتە سووتەمەنیی، هەم وەک سووتەمەنیی ڕواڵەتیی، هەم وەک سووتەمەنی پەنهان، وەک خەڵووزی بەردو غازو نەوت، کە هەموو ئەوانە بەپێی قسەی زانایانی زەویناسیی، ئەو پاوان و لە وەڕگاو دارو درەختە ژێر زەویی کەوتووانەی کاتی خۆی بوون، دوایی گۆڕانی کیمیاییان بەسەردا هاتوە، هەرچی نەوت و غازو خەڵووزی بەردە، ئەوە سەرچاوەکەیانە.

هەڵبەتە ئەم چوار بەڵگانە، وێڕای ئیسپاتکردنی زیندوو کرانەوەو، توانایی خوا لەسەر هەڵسانەوەی مرۆڤان و سزاو پاداشتدانەوەیان، لە هەمان کاتدا، بەڵگەی سەلماندنی پەروەردگارێتیی خوای بەرزو بێ وێنەشن.

www.alibapir.com



﴿ نَحْنُ خَلَقْنَٰكُمْ فَلَوْلَا تُصَدِّقُونَ ﴿٥٧﴾ أَفَرَءَيْتُم مَّا تُمْنُونَ ﴿٥٨﴾ ءَأَنتُمْ تَخْلُقُونَهُۥٓ أَمْ نَحْنُ ٱلْخَٰلِقُونَ ﴿٥٩﴾ نَحْنُ قَدَّرْنَا بَيْنَكُمُ ٱلْمَوْتَ وَمَا نَحْنُ بِمَسْبُوقِينَ ﴿٦٠﴾ عَلَىٰٓ أَن نُّبَدِّلَ أَمْثَٰلَكُمْ وَنُنشِئَكُمْ فِى مَا لَا تَعْلَمُونَ ﴿٦١﴾ وَلَقَدْ عَلِمْتُمُ ٱلنَّشْأَةَ ٱلْأُولَىٰ فَلَوْلَا تَذَكَّرُونَ ﴿٦٢﴾ أَفَرَءَيْتُم مَّا تَحْرُثُونَ ﴿٦٣﴾ ءَأَنتُمْ تَزْرَعُونَهُۥٓ أَمْ نَحْنُ ٱلزَّٰرِعُونَ ﴿٦٤﴾ لَوْ نَشَآءُ لَجَعَلْنَٰهُ حُطَٰمًا فَظَلْتُمْ تَفَكَّهُونَ ﴿٦٥﴾ إِنَّا لَمُغْرَمُونَ ﴿٦٦﴾ بَلْ نَحْنُ مَحْرُومُونَ ﴿٦٧﴾ أَفَرَءَيْتُمُ ٱلْمَآءَ ٱلَّذِى تَشْرَبُونَ ﴿٦٨﴾ ءَأَنتُمْ أَنزَلْتُمُوهُ مِنَ ٱلْمُزْنِ أَمْ نَحْنُ ٱلْمُنزِلُونَ ﴿٦٩﴾ لَوْ نَشَآءُ جَعَلْنَٰهُ أُجَاجًا فَلَوْلَا تَشْكُرُونَ ﴿٧٠﴾ أَفَرَءَيْتُمُ ٱلنَّارَ ٱلَّتِى تُورُونَ ﴿٧١﴾ ءَأَنتُمْ أَنشَأْتُمْ شَجَرَتَهَآ أَمْ نَحْنُ ٱلْمُنشِـُٔونَ ﴿٧٢﴾ نَحْنُ جَعَلْنَٰهَا تَذْكِرَةً وَمَتَٰعًا لِّلْمُقْوِينَ ﴿٧٣﴾ فَسَبِّحْ بِٱسْمِ رَبِّكَ ٱلْعَظِيمِ ﴿٧٤﴾ ﴾.

## مانای دەقا و دەقی ئایەتەکان

{(ئەی بێبڕوانیە!) ئێمە دروستمان كردوون، دەبووایە (زیندووكرانەوەشتان) بە ڕاست بزانن ﴿٥٧﴾ ئایا ئەو (تۆو)ەتان دیوە كە دەیڕێژن (ە نێو منداڵدانەوە)؟ ﴿٥٨﴾ ئایا ئێوە دروستی دەكەن، یان ئێمەین بەدیهێنەر (و قۆناغ قۆناغ گەشەپێدەری)؟ ﴿٥٩﴾ ئێمە مردنمان لە نێوتاندا ئەندازەگیری كردوە (هەركەس لە كات و شوێن و بە هۆكاری دیارییكراوی دەمرێ)و، ئێمە لێ پێشكەوتووەوە (و بێ توانا) نین ﴿٦٠﴾ كە بە هی وەك خۆتان بتانگۆڕین (ئێوە لابەرین و كەسانی دیكە بێنین)و، بەشێوەیەك كە نایزانن، دروستتان بكەینەوە (لە قۆناغی بەرزەخ و قیامەتیشدا) ﴿٦١﴾ بە دڵنیاییش پێگەیاندنی یەكەمتان زانیوە، (كە لە چییەوە هێناومانن!) ئنجا دەبووایە وەبیرتان بێتەوە (و پەندی لێوەربگرن) ﴿٦٢﴾ هەروەها ئایا ئەو (كشتوكاڵ)ەتان دیوە كە (زەوی بۆ دەكێڵن و) دەیچێنن! ﴿٦٣﴾ ئایا ئێوە دەیڕوێنن، یان ئێمە ڕوێنەرینی؟ ﴿٦٤﴾ بە دڵنیایی ئەگەر ویستبامان دەمانكردە پووش و پەڵاشی تێكشكاو، ئنجا ئێوەش سەرتان سوڕدەماو ژیوان دەبوونەوە ﴿٦٥﴾ (دەتانگوت:) بێگومان ئێمە دۆڕاوو زیانبارین (و ڕەنج بە خەسارین) ﴿٦٦﴾ بەڵكو

www.alibapir.com


ئێمە بێبەشین (و دەم لە پووشین)! ﴿٦٧﴾ هەروەها ئایا ئەو ئاوەتان دیوە کە دەیخۆنەوە! ﴿٦٨﴾ ئایا ئێوە لە هەورەوە داتانبەزاندوە، یان ئێمەین دابەزێنەری؟ ﴿٦٩﴾ ئەگەر ویستبامان تاڵ و سوێرمان دەکرد، دەبووایە سوپاسگوزاریی (بۆ خوا) بکەن! ﴿٧٠﴾ هەروەها ئایا ئەو ئاگرەتان دیوە کە هەڵیدەکەن (دایدەگیرسێنن)! ﴿٧١﴾ ئایا ئێوە درەخت (و سووتەمەنیی)ەکەیتان پێگەیاندوە، یان ئێمە پێگەیەنەرینی؟ ﴿٧٢﴾ ئێمە ئەو (ئاگر)ەمان گێڕاوە بە بیرخەرەوە (بۆ هەموو لایەکتان) و بەهرە گەیەنەر بۆ ڕێبواران (و برسییان) ﴿٧٣﴾ ئنجا ناوی پەروەردگاری مەزنت بە پاک بگرە ﴿٧٤﴾}.

## شیکردنەوەی هەندێک لە وشەکان

(خَلَقْنَكُمْ): وەدیمان هێناون، دروستمان کردوون، (الخَلْقُ: **أَصْلُهُ التَّقْدِيْرُ الْمُسْتَقِيْم وَيُسْتَعْمَلُ فِي إِبْدَاعِ الشَّيءِ مِنْ غَيْرِ أَصْلٍ وَلاَ احْتِذَاء، وَيُسْتَعْمَلُ فِي إِيْجَادِ الشَّيء مِنَ الشَّيء**)، وشەی (خَلْق): ڕیشەکەی بریتیە لە ئەندازەگیرییەکی ڕێک و ڕاست و، بەکاریش دەهێنرێ بۆ داهێنانی شتێک، بێ ئەوەی بناغەیەکی بووبێ و، چاوی لە شتێکی دیکەدا تێدا کرابێ، هەروەها بەکاردەهێنرێ بۆ پەیداکردنی شتێک لە شتێکی دیکە.

(تُصَدِّقُونَ): بەڕاست بزانن، (**صَدَّقْتُ فُلاَنَاً: نَسَبْتُهُ إِلى الصِّدْقِ**)، (**صَدَّقْتُ فُلانَاً**) واتە: فلانکەسم پاڵدایە لای ڕاستگۆیی و بە ڕاستم دانا.

(مَّا تُمْنُونَ): (**المَنِيُ: القَدْرُ، مَنَى لَكَ المَانِي: قَدَّرَ لَكَ المُقَدِّرُ، وَالمَنُّ: الَّذِي يُوزَنُ بِهِ، وَالمَنِيُّ: الَّذِي قُدِّرَ فِيْهِ الحَيْوَانَات، تُمْنَى: تُقْذَفُ وَتُقْدَر**)، کە دەفەرموێ: (**مَا تُمْنُون: مَا تَقْذِفُون أو مَا تَصُبُّون**) واتە: ئەوەی دەیڕێژن، ئەو ئاوەی پیاو دەیڕێژێتە نێو منداڵدانی ئافرەت، بەڵام بە مانای : (ئەندازەگیریی کرد) دێ، دەگوترێ:

www.alibapir.com


(مَنَى لَكَ المَانِي: قَدَّرَ لَكَ المُقَدِّرُ) ئەندازەگیرییکەر بۆت ئەندازەگیریی بکات، هەروەها (مَنّ) ئەو سەنگەی شتی پێ دەکێشرێ، (مَنِيّ)یش ئەو ئاوەیە زیندەوەرەکانی تێدا ئەندازەگیریی کراون، (مَنَى يَمْنِي) و (أَمْنَى يُمْنِي) هەردووکیان بە مانای (قَذَفَ يَقْذِفُ) و (صَبَّ يَصُبُّ)ن، واتە: (مَنَى وَأَمْنَى) بە (ثُلاَثِي ورباعي) هەردووکیان هاتوون و یەک واتاشیان هەیە بە مانای ڕژاندی دەیرێژێ، واتە: تۆو دەڕێژێ.

(قَدَّرْنَا): (القَدَر وَالتَّقْدِيْرُ: تَبْيِيْنُ كَمِّيَّةِ الشَّيء، وَالتَّقْدِيْرُ: إِعْطَاءُ القُدْرَة، وَجَعْلُهُ عَلَى مِقْدَارٍ مَخْصُوص)، (قَدَر) و (تَقْدِيْر) هەردووکیان بە مانای دیارییکردنی ئەندازەی شتێکن، (تَقْدِيْر) بە مانای پێدانی دەسەڵات و توانا دێ و، بە مانای گێڕانی شتێکە بە ئەندازەیەکی تایبەت.

(بِمَسْبُوقِينَ): (أَصْلُ السَّبْقِ: التَّقَدُّم فِي السَّيْرِ)، (سَبْق): ئەوەیە کە لە ڕۆیشتنێدا کەسێک پێشبکەوێ، (وَمَا نَحْنُ بِمَسْبُوقِيْن: لاَ يَفُوْتُونَنَا) واتە: لێمان پێش ناکەون و، لێمان دەرباز نابن، چونکە ئەگەر کەسێک پێش کەسێک بکەوێ، مانای وایە لە دەستی قوتار بووە، خوا دەفەرموێ: ئێوە لە دەستی ئێمە قوتار نابن، کە دەفەرموێ: ﴿ وَمَا نَحْنُ بِمَسْبُوقِينَ ﴾، ئێمە لێ پێشکەوتووەوە نین، واتە: هیچکەس ناتوانێ ببێتە پێشکەوتووەوە بۆ ئێمە، پێشکەوێتەوەو بڕواو دەربازی بێ.

(أَمْثَلَكُمْ): (أَمْثَال: جَمْعُ مِثْل: شِبْه، أو جَمْعُ مَثَل: الوَصْف)، (أَمْثَال) هەم دەگونجێ کۆی (مِثْل)بێ، بە مانای (شِبْه ونظير)ە، یانی: هاوتاو وێنە، دەشگونجێ (أَمْثَال) کۆی (مَثَل) بێ، بە مانای سیفەت و وەسف، ﴿ لِلَّذِينَ لَا يُؤْمِنُونَ بِالْآخِرَةِ مَثَلُ السَّوْءِ ۖ وَلِلَّهِ الْمَثَلُ الْأَعْلَىٰ ۚ وَهُوَ الْعَزِيزُ الْحَكِيمُ ﴿٦٠﴾ ﴾ النحل، (المَثَل الأعلى) (أي: الوَصْفُ الأَعْلَى) وێنەی هەرە بەرز بۆ خوایە، یان سیفەتی هەرە بەرز.

﴿ نُبَدِّلَ أَمْثَلَكُمْ ﴾: (نُبَدِّلَ بِكُم أَمْثَالَكُم: نَجْعَلَ أَمْثَالَكُم بَدَلاً، أَي: نَخْلُقَ ذَوَاتاً مُمَاثِلَةً لِذَوَاتِكُمْ)، ﴿ نُبَدِّلَ أَمْثَلَكُمْ ﴾، بە چەند تەعبیرێک مانا کراوە، یانی: ئێوە لابەرین

www.alibapir.com


و خەڵكێكـی دیكـە بێنینـە شـوێنی ئێـوە، ئـەوە مانایەكەیـەتی، ﴿نُّبَدِّلَ أَمْثَٰلَكُمْ﴾، هاووێنـانی ئێـوە بهێنینـە شـوێنی ئێـوە، واتـە: هاووێنـانی ئێـوە بكەینـە جێـداری ئێـوە، یاخـود هەندێـك دروسـتكراوان دروست بكەیـن، كـە وەك ئێـوەن، ئێـوە لابەریـن و ئـەوان بێنیـن.

(وَنُنشِئَكُمْ): پێتـان بگەیەنیـن، (النَّشْأ وَالنَّشْـأَةُ: إِحْـدَاثُ الـشَّيءِ وَتَرْبِيَتُـهُ)، (نَشْـأ وَنَشْأَة): بریتیـە لـە پەیداكـردنی شـتێك و بـە خێـو كـردنی و پێگەیاندنـی، پـێ بـە پـێ.

(تَحْرُثُونَ): (الحَـرْثُ: إِلْقَـاءُ البَـذْرِ فِي الأَرْضِ وَتهيئَتُهَـا للـزَّرْعِ ، وَيُسَـمَّى المَحْـرُوْثُ: حَرْثَاً)، (حَـرْث): لـە ئەصڵـدا بریتیـە لـە تـۆ و وەشـاندن لـە زەویـداو، ئامادەكـردنی زەوییەكـە بـۆ ئـەوەی ئـەو تـۆوەی تێـدا بـڕوێ، (حَـرْث) بـە مانـای كێڵانی زەویـی و هەڵكوڵینـی و شـیكردنەوەیەتی بـۆ ئـەوەی ئـەو تـۆوەی تێیخـراوە، سـەروبن بـێ و بـڕوێ، بـەڵام لێرەدا وشـەی (حَـرْث) یـانی: (مَحْـرُوْث) تـۆوی وەشـێنراو، یـان: زەوی كێڵـدراو.

(تَزْرَعُونَهُۥ): (الـزَّرْعُ: الإِنْبَـاتُ وَحَقِيْقَـةُ ذَلِـكَ تَكُـونُ بِالأُمُـورِ الإِلَهِيَّـةِ دُونَ البَشَرِيَّـةِ، وَالـزَّرْعُ مَصْـدَرٌ عُـبِّرَ بِـهِ عَـنِ المَـزْرُوعِ)، (زَرْع): بریتیـە لـە ڕوانـدن، چییـەتی ئـەوەش بـە كاروبـاری خوایـی دەبـێ، نـەك هـی مـرۆڤ، واتـە: مـرۆڤ بـەس تەنهـا تۆوەكـە دەوەشـێنێ، بـەڵام ئەوكەسـەی دەیڕوێنـێ، یـان نایڕوێنـێ، سـەوزی دەكات، یـان نایـكات، خـوای پـەروەردگارە، (زَرْع) چاوگـەو تەعبیـری پێكـراوە لە (مَزْروع) كشـتوكاڵ و چێنـدراو ڕوێنـدراو.

(حُطَٰمًا): (الحَطْـمُ: كَـسْرُ الـشَّيءِ مِثْـلُ الهَشْـمِ وَنَحْـوِهِ، ثُـمَّ اسْـتُعْمِلَ لِكَـسْرٍ مُتَنَـاهٍ)، (حَطْـم): بریتیـە لـە شـكاندنی شـتێك، وەك وشـەی (هَشْـم) كـە وردكـردنی شـتێكە، دوایـی بەكارهێـنراوە بـۆ شـكاندنێك كـە كۆتایـی بـەو شـتەی هێنابـێ و وردو خـاشی كردبـێ، هەندێكـی دیكـە ئاوایـان مانـا كـردوە: (الحُطـامُ: الـشَّيْءُ الَّـذِي حَطَمَـهُ حَاطِـمٌ، أَيْ: دَقَّـهُ فَهـو بِمَعْنَـى المَحْطُـومِ، كَـما تَـدُلُّ عَلَيْـهِ زِنَـةُ فُعَـالٍ مِثْـلُ: جُـذَاذ، وَفُتَـات، وَدُقَـاق)، (حُطْـام): ئـەو شـتەیە كـە شـكابێ و شـكێنەرێك شـكاندبێتی و وردی كردبـێ، كەواتـە:

www.alibapir.com


(حُطَام) بە مانای (مَحْطُومٍ)ە، تێکشکاو، هەروەک کێشی (فُعَال) ئەوە دەگەیەنێ، دەگوترێ: (جُذَاذ) شتێکی ڕەقی وردو خاشکراو، (فُتَات) ئەو وردە نانانەی لەسەر سفرە دەمێنێتەوە، (دُقَاق) شتێکی ڕەق کە ورد کرابێت و وەک ئاردی لێکرابێت.

(فَظَلْتُمْ): (ظَلْتُ وَظِلْتُ يُعَبَّرُ بِهِ عَمَّا يُعْمَلُ فِي النَّهَار، وَيَجْرِي ظَلَّ بِمَعْنَى: صَارَ)، (ظَلْتُ وَظِلْتُ)، (ظَلَلْتُ وَظَلِلْتُ) ئەمە تەعبیری پێ دەکرێ لەو کارانەی بە ڕۆژێ دەکرێن {هەروەک (بَاتَ يَبِيْتُ) تەعبیری پێ دەکرێ، لەو کارەی کە لە شەودا دەکرێ} وشەی (ظَلّ) بە مانای (صَار) بەکاردەهێنرێ واتە: شتەکە بوو، کەواتە: ﴿فَظَلْتُمْ تَفَكَّهُونَ﴾، واتە: ئێوە دەستتان دەکرد بەوە کە (تفكّه) بکەن.

(تَفَكَّهُونَ): (تَتَعَاطُون الفُكَاهَةَ، وَقِيْلَ: تَتَنَاوَلُوْنَ الْفَاكِهَةَ، والفُكَاهَةَ: حَدِيْثُ ذَوي الأُنْسِ، وَقِيْلَ تَفَكَّهُوْن: تَعْجَبُون، وَقِيْلَ: تَحْزَنُون، وَقِيْلَ تَنْدَمُون) زانایان لە بارەی وشەی (تَفَكَّهُوْن)ەوە دوای ئەوەی لەسەر ئەوە ڕێککەوتوون، کە (تَفَكُّه) بە مانای قسەی خۆشکردن، یان: میوە خواردنە، (فُكَاهَة)ش یانی: قسەی خۆش بەزۆرییش وایە قسەی خۆش لە کاتی میوە خواردن دا دەکرێ، (تَفَكَّهُوْن) واتە: (تَتَعَاطُون الفُكَاهَةَ) واتە: قسەی خۆش و سوعبەت پێکەوە دەکەن، هەندێکیش گوتوویانە: بە مانای میوە دەخۆن، هەندێکیش وشەی (تَفَكَّهُوْن)یان بە (تَعْجَبُون) واتە: سەرتان سوڕدەمێنێ و، هەندێکیان بە (تَحْزَنُون) واتە: پەژارەدار دەبن و، هەندێکیان بە (تَنْدَمُون) واتە: پەشیمان دەبنەوە، بێگومانیش هەندێک لەوانە پەیوەست (لازم)ی مانا بنەڕەتییەکەن، کە بریتیە لە میوە خواردن، یاخود: قسەی خۆشکردن، هەندێک لە زانایانیش گوتوویانە: (تَفَكُّه) لەسەر کێشی (تَفَعُّل)ە، وەک (تَأَثَّم: تَرَكَ الإِثْمَ، وَتَحَرَّجَ: تَرَكَ الحَرَج) (تَفَكّه) واتە: وازی لە قسەی خۆش هێناو، خەمباریی و پەژارە دایگرت.

(لَمُغْرَمُونَ): (الغُرْمُ: مَا يَنُوبُ الإنْسَانَ فِي مَالِهِ مِنْ ضَرَرٍ لِغَيْرِ جِنَايَةٍ مِنْه، أو خِيَانَةٍ)، (غُرْم): بریتیە لەو زیانەی بەسەر مرۆڤ دێ لە ماڵ و سامانی دا (مرۆڤ ماڵێکی لە دەست بچێ) بێ ئەوەی تاوانێکی کرد بێ و ناپاکیی کرد بێ، دەگوترێ:

(**غَـرِمَ كَـذَا غُرْمَـاً وَمَغْرَمَـاً**) ئەمـە کردارەکەیـەتی، (**غَـرِمَ كَـذَا**) واتـە: ئەوەنـدەی زیـان لێکـەوت.

(**الغَـرَامُ: الشِّـدَّةُ وَالمُصِيْبَـة**)، (**غَـرَام**): بـە سـەختیی و بـەڵا دەگوتـرێ، هەروەهـا بـە لـە بەینچـوون (**هَلَاك**)یـش دەگوتـرێ، کەواتـە: (**إِنَّا لَمُغْرَمُوْن**) واتـە: ئێمـە زیانباریـن، یـان ئێمـە ڕەنـج بـە خەسـارین، ئـەو ڕەنجـەی کـە داومانـە بـەو کشـتوکاڵەوە، کەلێنـی بـۆ نەگرتیـن، لەبـەر ئـەوەی کشـتوکاڵەکە بـوو بـە پـووش و پـەڵاش و فەوتـا.

(**اَلْمُزْنِ**): (**السَّـحَابُ المُـضِيءُ وَالقِطْعَـةُ مِنْـهُ مُزْنَـة**)، (**راغـب الأصفهـاني**) پێـی وایـە (**مُـزْن**) بـە مانـای هـەورە، جینسـی هـەور، بـەڵام هـەوری ڕوون، پارچەیـەک لـە (**مُزْن**)یـش پێـی دەگوتـرێ: (**مُزْنَـة**) واتـە: پارچـە هەورێـک، بەشـێک لـە هـەور، بـەڵام زانایـانی دیکـە گوتوویانـە: (**مُـزْن**) بـە ڕەهایـی هـەورە، سـپیی بـێ، یـان هـەر ڕەنگێکـی دیکـەی هەبێ.

(**أُجَاجًا**): (**أُجَـاج: شَـدِيْدُ المُلُوحَـةِ وَالحَـرَارَة، مِـنْ قَوْلِهِـم أَجِيْـجُ النَّـار**)، (**أُجَـاج**) واتـە: زۆر سـوێرو زۆریـش گـەرم، لـەو قسـەیانەوە هاتـوە کـە دەڵـێ: (**أَجِيْـجُ النَّـار**) واتـە: بڵێسـەی ئاگـر، وەک چـۆن بڵێسـەی ئاگـر دەسـووتێنێ، ئـەو ئـاوەش لەبـەر سـوێرییان جەسـتەی مـرۆڤ دەسـووتێنێ.

(**تُورُونَ**): (**وَرِيَ الزَّنْـدَ يُـرِي وَرْيَـاً: أَخْـرَجَ نَـارَهُ**)، (**زَنْـد**): بـە کوردیـی بـەردو ئەسـتێی پـێ دەڵێـن، ئاسـنێک لەگـەڵ جـۆرە بەردێـک لێکیـان داون و ئاگریـان پێکردۆتـەوە، جـۆرە پووشـێک هەبـووە، کاتێ خـۆی کـە ویسـتوویانە شـتێك داگیرسـێنن، سـەبیلە داگیرسـێنن، یـان سـیغار داگیرسـێنن، بـە بـەردو ئەسـتێ دایانگیرسـاندوە، لـە نێـو عـەرەب دا پێیـان گوتـراوە: (**زَنْـد وَزَنْـدَة**) ئـەوەی سـەرێ (زەند)یـان پـێ گوتـوەو، (زەنـدە)ش ئـەوەی خـوارێ بـووەو، چواندوویانـە بـە نێـرو مـێ وە، ئـەو دووانـەش کـە پێـک دەکێشرێـن، ئاگـر پەیدادەبـێ، بـەڵام (**تُـورُون**) واتـە: (**تُوقِـدُون**) و (**تُؤَجِّـجُوْن**) دادەگیرسـێنن، مـەرج نیـە تەنیـا بـە بـەردو ئەسـتێ بـێ، یـان بـە مـەرخ و عەفـار بـێ، کـە دوو جـۆرە درەختـی سـەوز بـوون، لێکیـان داون و بڵێسـە ئاگریـان لـێ پەیدابـوون.

www.alibapir.com


(لِّلْمُقْوِينَ): (للمسافرين، أقْوَى الرَّجُلُ: صَارَ فِي قَوَاءٍ، وَالقَوَاءُ أرْضٌ لاَ أَهْلَ فِيْهَا، أي: قَفْرٍ، وَتُصُوِّرَ فِي القَفْرِ الفَقْرُ فَقِيْلَ أَقْوَى فُلاَنٌ: افْتَقَرَ مِثْلُ: أَرْمَلَ وَأتْرَب)، (للمُقْوِيْن) واتە: (لِلْمُسَافِرِيْن) بۆ ڕێبواران، یاخود (لِلْدَاخِلِيْنَ فِي القَوَاء)، (قَوَاء)یش زەوییەکی چۆڵە کە کەسی لێ نەبێ، کەواتە: (أقْوَى الرَّجُلُ) واتە: پیاوەکە چۆ نێو دەشت و بیابان و چۆڵایی، ئنجا خوا ﷻ دەفەرموێ: ئەو ئاگرە مایەی مەدار سازکردنە، بە تایبەت بۆ کەسانی ڕێبوار، کەسانێک کە لە چۆڵاییین و سەرمایان دەبێ، لە نێو شارنین، تاکو خۆراکی ئامادەکراو هەبێ، دەبێ خۆیان ئاگر بکەنەوەو خواردنی پێ ئامادە بکەن، هەندێکیش گوتوویانە: (مُقْوِيْن أي: جَائِعِيْن) ئەوانەی برسیین، چونکە (أَقْوَى فُلاَنٌ: افْتَقَرَ) هەژار بوو، یاخود (جَاعَ) واتە: سکی خاڵیی بوو لە خواردن، برسیی بوو، وەک: (أرْمَلَ) لماویی بوو، (وَأتْرَب) خۆڵاویی بوو، بە هەمان شێوەش (أقْوَى) یانی: (افْتَقَرَ) کەوتە حاڵەتی نەداریی و هەژاریی.

## مانای گشتیی ئایەتەکان

خوا ﷻ - وەک لە پێناسەی ئەم دەرسەدا گوتمان - لەم هەژدە (١٨) ئایەتەدا، ڕوو لە بێبڕوایان دەکات، بە پلەی یەکەم، ئەگەرنا دواندنەکە دەشگونجێ بۆ کۆی مرۆڤانیش بێ، بەڵام زیاتر بێبڕوایان و هاوبەش بۆ خوادانەران دەگرێتەوە، چونکە جۆرێک لە هەڕەشەو سەرزەنشتی تێدایە، کە بێگومان خوای کارزان و میهرەبان بەو شێوەیە بەس ئەوانە دەدوێنێ کە بێبڕوان و، هاوبەش بۆ خوا دانەرن، بەڵام لە پشت ئەوانیشەوە ئەم ئایەتە موبارەکانە، ڕوو لە هەموو مرۆڤەکانیش دەکەن، با بڕوادارێش بن، هەرچەندە بە پلەی یەکەم، ڕووی دواندن لەوانەیە کە بێبڕوان و هاوبەش بۆ خوادانەرن، یانی: بێبڕوان بە ڕۆژی دوایی، چونکە خوا ﷻ لەم ئایەتە موبارەکانەدا، سەرنجی ئەوانە ڕادەکێشێ بۆ چوار دیاردە وەک بەڵگە، لەسەر ئەوە کە خوا ﷻ دەتوانێ زیندوویان بکاتەوەو دەبێ سزاو

www.alibapir.com



پاداشت هەبێ، بۆیەش کە بێبڕوان، لە ڕاستییدا پشت ئەستوور نین بە هیچ بەڵگەیەک، بەڵکو بە پێچەوانەوە: هەم خۆیان و، هەم کشت و کاڵەکەیان و، هەم ئاوێک کە دەیخۆنەوە، هەم ئەو ئاگرە کە دایدەگیرسێنن، هەموو ئەوانە بەڵگەن لەسەر ئەوە کە ئەم ژیانی دنیایە، قۆناغی دیکەی بەدوادا دێ و، خوا ﷻ کە سەرپەرشتیاری گەردوون و مرۆڤ و ژینە، بەس ئەوەندە ژیانەی بە مرۆڤ ڕەوا نەبینیوە.

سەرەتا دەفەرموێ: ﴿ نَحۡنُ خَلَقۡنَٰكُمۡ فَلَوۡلَا تُصَدِّقُونَ ﴾، ئێمە ئێوەمان هێناوەتە دی و، ئێوەمان ئەندازەگیریی کردوەو دروستکردوە، ﴿ فَلَوۡلَا تُصَدِّقُونَ ﴾ ئنجا دەبووایە بەڕاست دابنێن! ئەم (ف)ە (تَفْرِيعٌ عَمَّا سَبَق) دەگەڕێتەوە بۆ ڕابردوو، واتە: ئەو خوایەی ﷻ پێشتر باسی کردەوەکانی کرا، ئەو خوا پەروەردگارە ئێوەی هێناوەتە دی، ئنجا دەبووایە ئێوە بە ڕاست دابنێن، چی بە ڕاست دابنێن؟ (**تُصَدِّقُونَ بِأَنَّ اللە يُحِييكُمْ**)، ئەوە بەڕاست دابنێن کە خوا زیندووتان دەکاتەوەو، (**يُحَاسِبكم**) لێتان دەپرسێتەوە، (**تُصَدِّقُونَ**) بەرکارەکەی قرتێنراوە چونکە دەزانرێ: (**تُصَدِّقُونَ بِالسَّاعَة، تُصَدِّقُونَ بِالقِيَامَة، تُصَدِّقُونَ بِيَوْمِ الدِيْن، تُصَدِّقُونَ بِإِخْبَارِ اللە إِيَّاكُمْ إِنَّكُم سَتُبْعَثُوْن**) هەموویان دەگرێتەوە.

ئنجا خوا ﷻ بەڵگە دێنێتەوە لەسەر ئەوە کە دەبووایە بڕوابێنن بە زیندوو کرانەوەو سزاو پاداشت درانەوە، سەرنجیان ڕادەکێشێ بۆ چوار شتان:

**یەکەم:** ﴿ أَفَرَءَيۡتُم مَّا تُمۡنُونَ ﴾ بۆ مەنیی، ئەو تۆوەی دەیڕێژن، کەواتە: لێرەدا ڕووی دواندن لە بێبڕوایانەو، لە نێویشیان دا لە پیاوەکانیان، لە نێرینەکان، چونکە پیاوە کە مەنیی دەڕێژێ، ئاوی ئافرەت هەر لە نێو جەستەی خۆیدایە، کە هێلکۆڵەی تێدایەو، دوایی لە هەردووکیان: لە زیندەوەری تۆو (**الحيوان المنوي**)ی پیاوو، لە هیلکۆڵە (**بويضة**)ی ئافرەت، نوتفە دروست دەبێ، واتە: پیاو و ئافرەت هەردووکیان بە ئەندازەی یەک کاریگەرن و، بیست و سێ (٢٣) کرۆمۆسۆم لە ئاوی ئافرەت، لە

www.alibapir.com



هێلکۆڵەی ئافرەت دا هەن و، بیست و سێ (٢٣)ش لە هی پیاوداو، بە هەردووکیان چل و شەش (٤٦)، لەو چل و شەش کرۆمۆسۆمە، هەموو سیفەتەکان لە باب و دایکەوەو، لە زنجیرەی دایکیشی تاکو سەرێ دەڕوات و، لە زنجیرەی بابیشی تاکو سەرێ دەڕوات، سیفەتەکان لەو دوو بیست و سێ کرۆمۆسۆمەدا، کە دەبن بە چل و شەش، بۆ ئەو منداڵە دێنەوەو، ئەو منداڵە لە ئاوی هەردووکیان دروست دەبێ، ئەوەش ئێستا زانستیی دەریخستوە، بەڵام پێش ئەوەی زانست دەری بخات، قورئان فەرموویەتی: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ إِنَّا خَلَقْنَٰكُم مِّن ذَكَرٍ وَأُنثَىٰ وَجَعَلْنَٰكُمْ شُعُوبًا وَقَبَآئِلَ لِتَعَارَفُوٓا۟ ۚ إِنَّ أَكْرَمَكُمْ عِندَ ٱللَّهِ أَتْقَىٰكُمْ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ عَلِيمٌ خَبِيرٌ ﴿١٣﴾﴾ **الحجرات**، ئەی خەڵکینە! ئێمە لە نێرو مێیەک دروستمان کردوون... کەواتە: هەردووکیان هاوبەشن لە دروست بوونی دا، بەڵام لێرەدا ڕوو لە پیاوان دەکات و دەفەرموێ: ئەو ئاوە دەبینن کە دەیڕێژن، ئەو تۆوەی دەیڕێژن، واتە: دەیڕێژنە نێو منداڵدانی هاوسەرانتانەوە!

﴿ءَأَنتُمْ تَخْلُقُونَهُۥٓ أَمْ نَحْنُ ٱلْخَٰلِقُونَ﴾، ئایا ئێوە دەیهێننە دی، ئەندازەگیرییتان کردوە، یاخود ئێمە بەدیهێنەرینی؟ پیاوان بەس ڕژاندنی ئاوەکەیان لەسەرەو، بەزۆریی هەر نازانن مرۆڤ چۆنیش دروست دەبێ، کە ئێستا زانست دەریخستوە: لەگەڵ هەر جارێک کە پیاو تۆوی دێت، لە دوو سەد ملیۆن تاکو پێنج سەد ملیۆن (٢,٠٠,٠٠٠,٠٠٠-٥,٠٠,٠٠٠,٠٠٠) زیندەوەری تۆوی (**الحیوان المنوي**) کە (**حَيْمَنْ**) کورتکراوەکەیەتی، تێدان، ئنجا کاتی خۆی وایانزانیوە: کۆرپەلە لە هەموو ئاوەکە دروست دەبێ، بەڵام پێغەمبەر فەرموویەتی: {**مَا مِنْ كُلِّ الْمَاءِ يَكُونُ الْوَلَدُ، وَإِذَا أَرَادَ اللَّهُ خَلْقَ شَيْءٍ لَمْ يَمْنَعْهُ شَيْءٌ**} (**أخرجه مسلم: ١٤٣٨، وأبو يعلى: ١١٥٣**).

واتە: لە هەموو ئاوەکە منداڵ پەیدانابێ و، هەرکاتیش خوا ویستی شتێک دروست بکات، هیچ شتێک ڕێی لێناگرێ.

بێگومان خەڵک بەس لەوەندە حاڵیی بووە، ئەگەرنا بەدڵنیایی پێغەمبەری خوا ﷺ، خوا لە هەموو ئەو وردەکارییانەی حاڵیی کردوە، بەڵام ئەگەر باسی

www.alibapir.com



جینــات و کرۆمۆســۆم و حەیــوانی مەنەویــی و هێلکۆڵــەی کردبایــە، خەڵــک تێــی نەدەگەیشــت، بۆیــە فەرموویــەتی: لــە هەمــوو ئاوەکــە منــداڵ دروســت نابــێ و لــە هەندێکــی دروســت دەبــێ.

﴿نَحْنُ قَدَّرْنَا بَيْنَكُمُ الْمَوْتَ وَمَا نَحْنُ بِمَسْبُوقِينَ﴾، ئێمــە مردنمــان لــە نێوتانــدا ئەندازەگیریی کــردووەو، ئێمــەش لــێ پێشــکەوتووەوە نیــن، واتــە: ئێمــە دەســتەپاچە نیــن، خەڵــک لــە ژێــر دەســتەڵاتی ئێمــە بچێتــە دەرێ و، لــە ژێــر ڕکێفــی ئێمــە قوتــاری بــێ و نەتوانیــن ســزای بدەیــن، واتــە: ئــەو مردنــەی پێــی دەمــرن، ئێمــە لــە نێوتانــدا دامانناوەو ئەندازەگیرییــمان کــردووەو، هــەر کەســە لــە کاتی خــۆی دا و لــە شــوێنی خــۆی دا و بــە هــۆکاری خــۆی دەمــرێ، ئێمەیــن وامــان دانــاوە، ئەگەرنــا دەمانتــوانی واشــتان دروســت بکەیــن، نەمــرن، بــەڵام ئێمەیــن مردنمــان لەســەرتان دانــاوە لــە دنیــادا، چونکــە ژیــانی دنیــا شــوێنی تاقیکردنەوەیەو شــوێنی تێدامانــەوە نیــە، ﴿وَمَا نَحْنُ بِمَسْبُوقِينَ﴾، هەروەها ئێمــە لــێ پێشــکەوتووەوە نیــن، کــە دوایــی زیندووتــان دەکەینــەوە، یەکێــک بتوانــێ دەربــازی بــێ و ڕابــکات، یاخــود ئێمــە لــێ پێشــکەوتووەوە نیــن لــە چــی؟

﴿عَلَىٰٓ أَن نُّبَدِّلَ أَمْثَٰلَكُمْ﴾، کــە هــاو وێنــەکانی ئێــوە بێنینــە شــوێنی ئێــوە، (**أَمْثَال**) کۆی (**مِثْل**)ە، یــان کــۆی (**مَثَل**)ە، واتــە: هــاو وێنــەکانی ئێــوە بێنینــە شــوێنی ئێــوە، یاخــود هــاو وەســفەکانتان بێنینــە شــوێنی ئێــوەو ئێــوە لابەریــن، ﴿وَنُنشِئَكُمْ فِي مَا لَا تَعْلَمُونَ﴾ {ئێــوەش کــە لادەبەیــن و دەتانبەینــە قۆناغــی بــەرزەخ، پاشــان قیامــەت} بــە جۆرێــک پێتــان بگەیەنینــەوە کــە نایزانــن، واتــە: ئێســتا نایزانــن چۆنــە؟ دوایــی لــە مەســەلە گرنگەکانــدا زیاتــر تیشــک دەخەینــە ســەر، ئــەم ڕســتە موبارەکــە، کــە ڕاســتییەکی زۆر گــەورەی گرتۆتــە خــۆی و، لــە هەمــوو قورئانــدا بەپێــی زانیــاری مــن، تەنیــا ئــەم ڕســتەیە بــەو شــێوەیە هاتوە، کــە خــوا بسم الله الرحمن الرحيم باسی ئەوە دەکات دروســتکردنەوەی ئێمە لە قۆناغــی بــەرزەخ و قیامەتــدا جیایــە، لــەوەی دنیــا، واتــە: دروســتکردنەوەی ئێمــە لــە ڕووی جەســتەییەوەو لــە ڕووی ڕووحییــەوە، لــە ڕووی پێکهاتــەی ڕواڵــەت و پەنهانمانەوە، لــەوەی ئێرەمــان، هــی ئــەم ژیانــە دنیاییەمــان، جیایــە.

www.alibapir.com



﴿ وَلَقَدۡ عَلِمۡتُمُ ٱلنَّشۡأَةَ ٱلۡأُولَىٰ ﴾، بە دڵنیایی ئێوە پێگەیاندنی یەکەمتان زانیوە، ﴿ فَلَوۡلَا تَذَكَّرُونَ ﴾، ئنجا دەبووایە پەند وەربگرن و، بیر بکەنەوەو وەبیرتان بێتەوە کە ئەو خوایەی بەو شێوەیە هێناونی، کە لە نوتفەیەک لێی دروست بوون، نوتفەش لە خوێن دروست دەبێ و، خوێنەکەش لە خواردنی هەزمکراو و، خواردنی هەزمکراو، لەو شتانەی مرۆڤ دەیانخوات: ڕووەک و گۆشت و دانەوێڵەو ...هتد، هەروەها لە هەواو، تیشکی خۆر، مانای وایە نوتفە لە کۆمەڵی شتی زۆر پرژو بڵاوو پەرا گەندە، دروستبووە، بۆیەش ئەگەر ئێوە پێگەیاندنی یەکەمی خۆتان بزانن، دەبووایە وەبیرتان بێتەوە، کە دوای ئەوەی پەرا گەندەش دەبن و، جەستەکەتان دەمرێ و دەبێتەوە بە خاک، پێشێش هەروا پەراگەندە بوون و، لە شێوەی نوتفەیەکدا، کە لە ئاوی بابتان و، ئاوی دایکتان، پێکهاتوە، ئنجا دوای ئەوەی پرژو بڵاو دەبنەوە، ئەو زاتەی کاتی خۆی توانی لەو گەردو گەردیلەو پارچە بچووکە پرژو بڵاوانە، ئەو نوتفەیە دروست بکات و، لە نێو منداڵداندا، بەو قۆناغانەدا تێیپەڕێنێ، ئێستاش دەتوانێ دروستتان بکاتەوە.

**دووەم:** ئنجا خوا بسم الله الرحمن الرحيم سەرنجیان ڕادەکێشێ بۆ دیمەنێکی دیکە، کە بریتیە لە کشت و کاڵ: ﴿ أَفَرَءَيۡتُم مَّا تَحۡرُثُونَ ﴾، ئایا ئەو کشت و کاڵەتان بینیوە، کە دەیچێنن! یان ئەوەتان بینیوە کە دەیکێڵن؟ واتە: ئەو تۆوەی زەوی بۆ دەکێڵن، دوایی تۆوەکە دەوەشێنن، هەڵبەتە لێرەدا کە دەفەرموێ: ﴿ أَفَرَءَيۡتُم مَّا تَحۡرُثُونَ ﴾ و لە هەر سێک شوێنەکانی دیکەش مەبەست لە بینین، بینینی عەقڵەو زانینە، چونکە ئەو تۆوەی پیاو دەیخاتە منداڵدانی ئافرەتەوە، نایبینێ لە کاتێک دا تێیدەکات، هەروەها شتەکانی دیکەش مەرج نیە، هەموویان بە چاو ببینرێن، یانی: ئایا دەزانن و ئاگاتان لەو تۆوە هەیە، کە دەیرێژن؟ هەروەها ئاگاتان لەو کشتوکاڵە هەیە کە ئێوە زەوی بۆ دەکێڵن و دوایی تۆوەکە دەوەشێنن؟ ﴿ ءَأَنتُمۡ تَزۡرَعُونَهُۥٓ أَمۡ نَحۡنُ ٱلزَّٰرِعُونَ ﴾، ئایا ئێوە دەیڕوێنن یان ئێمە ڕوێنەرینی؟ واتە: هیچکەس هەرچەندە زۆر نکوڵیلێکەر بێ، ناتوانێ، بڵێ: من ڕوواندومە، ئەو دەنکە تۆوە، یاخود ئەو نێوکە درەختە، هەر کە

www.alibapir.com


دەکەوێتە نێو زەوی لە کاتی خۆیدا، یەکسەر دەبێتە دوو بەش، ئەو دەنکە چەند ڕەقە! گەنمە، جۆیە، نیسکە، نۆکە، هەرزنە، ماشە، برنجە، زۆر ڕەقەو بە زەحمەت بە ددان دەشکێ، هەروەها نێوکەکان: نێوکە خۆخە، قەیسییە، گێلاسە، ئەو دارو درەختانە نێوکەکەیان زۆر ڕەقە، کەچی ئەو نێو کە ڕەقە، یان ئەو دەنکە تۆوە ڕەقە، دەشکێ و دەبێتە دوو بەش، چەکەرەیەک بەرەو سەرێ دێ و، بەشێکی بەرەو خوار دەچێ، واتە: پێچەوانەی ڕێڕەوی یەکدیی، بەشێکیان بەرەو سەر و بەشێکیان بەرەو خوار، بەشەکەی بەرەو سەر دێ، زەوی دەقڵێشێ بەرەو سەرو، ئەوی دیکەشیان زەوی کون دەکات، بەرەو خوار، ئنجا هەردووکیان وردە وردە هەتا بەشەکەی خوارێ گەورە بێ، بەشەکەی سەرێش گەورە دەبێ، ئنجا لە نێوان ئەو دوو بەشەدا، هاوکاریی هەیە: هەم بەشەکەی خوارێ تام و خوێ و ئاو دێنێ، بۆ ئەوەی سەرێ و، هەم ئەوەی سەرێ تیشکی خۆرو ئەو خۆراکەی لە ڕێی تیشکە پێکهاتنەوە وەریدەگرێ، دەیدا بە هی خوارێ و، ئەو دوو بەشە زۆر پێکەوە هاوکارن، کە دوای ئەوەی زانستیی ڕووەکناسیی بەرەو پێشەوە چووە، ئنجا مرۆڤ دەزانێ ڕووەک چۆن دەڕوێ بە گشتیی، بۆیە کە دەفەرموێ: ئایا ئێوە دەیڕوێنن یان ئێمە ڕوێنەرینی؟ ئەوە پرسیارکردنی نکوڵیلێکەرانەیەو پێویستیی بە وەڵام نیە، واتە: ئێمە ڕوێنەرینی.

﴿ لَوْ نَشَآءُ لَجَعَلْنَـٰهُ حُطَـٰمًا ﴾، ئەگەر ویستبامان بە دڵنیایی دەمانکردە تێکشکاو، واتە: پووش و پەڵاشێکی تێکشکاو، ﴿ فَظَلْتُمْ تَفَكَّهُونَ ﴾، ئەو کاتە ئێوە بەردەوام دەبوون لەسەر قسەکردن، قسەی خۆشکردن، یاخود: سەرسوڕمان، یان دڵتەنگ بوون، یاخود پەشێمان بوونەوە، ئەگەر مەبەست قسەی خۆشکردنیش بێ، ئەوە بە توانج و تەوسەوەیە واتە: وەک چۆن هەموو ژیانی ئێوە بریتیە لە قسەی خۆش و سوعبەت و گاڵتەو گەپ، ئەو کاتەش کە ئەو کشتوکاڵەتان دەبوو بە پووش و پەڵاش، دیسان قسەی خۆشتان دەکرد، واتە: قسەی خۆشتان بۆ نەدەکراو، ئەو کاتە بە پێچەوانەوە، دڵتەنگ دەبوون، پەشێمان دەبوون، دەتانگوت چی؟ ﴿ إِنَّا لَمُغْرَمُونَ ﴾، ئێمە زیانبارین، ئێمە ڕەنج بە خەسارین، ﴿ بَلْ

www.alibapir.com


﴿نَحۡنُ مَحۡرُومُونَ﴾، بەڵکو ئێمە بێ بەشین و دەم لە پووشین، ئێمە زیانبارو ڕەنج بە خەسارین، هیچمان بۆ نەماوەتەوە، بەس پووش و پەڵاشمان بۆ ماوەتەوە.

**سێیەم:** ئنجا خوا بسم الله الرحمن الرحيم باسی دیاردەی سێیەم دەکات: ﴿أَفَرَءَيۡتُمُ ٱلۡمَآءَ ٱلَّذِي تَشۡرَبُونَ﴾، ئایا ئەو ئاوەتان بینیوە کە دەیخۆنەوە! ئەو ئاوە شیرین و زوڵاڵ و خۆشە، ﴿ءَأَنتُمۡ أَنزَلۡتُمُوهُ مِنَ ٱلۡمُزۡنِ أَمۡ نَحۡنُ ٱلۡمُنزِلُونَ﴾، ئایا ئێوە لە هەور داتانبەزاندوە، یاخود ئێمە دابەزێنەرینی؟ دیسان لێرەدا مەبەست لە دیتن، دیتنی عەقڵەو مەبەست زانینە، ﴿لَوۡ نَشَآءُ جَعَلۡنَٰهُ أُجَاجٗا فَلَوۡلَا تَشۡكُرُونَ﴾، ئەگەر ویستبامان دەمانگێڕا بە تفت و تاڵ، یان تاڵ و سوێر، یان سوێرو گەرم، (**أُجَاج**) هەم بە مانای تاڵ دێ، هەم بە مانای گەرم دێ، هەم بە مانای سوێر دێ، واتە: وەک ئاوە ئەسڵییەکەی کە لێوەی هاتوە، کە ئاوی ئۆقیانووس و زەریاکانە، بەڵام ئێمە لە ڕێی هەڵماندن (تبخیر)ەوە، کە بە هۆی تیشکی خۆرەوە ڕوو دەدات، پاشان دوایی دەبێتە هەورو، دەبێتە باران و بەفرو تەرزە، بەو پڕۆسەیە پاکمانکردۆتەوە لەو سوێریی و تاڵیی و تفتییە، ئەگەر ویستبامان هەروەک خۆی بۆمان دادەبەزاندن، چونکە ئاوی سوێریش لە نێو زەویدا هەیە، ئاوی سوێرو تاڵ و تفت، بۆیە دەفەرموێ: ﴿فَلَوۡلَا تَشۡكُرُونَ﴾، دەبووایە سوپاسگوزاریی بکەن.

**چوارەم:** ئنجا دەگوازێتەوە بۆ پێشاندانی دیاردەی چوارەم، کە ئەویش هەر لە نزیکمانەوەو لە ژیانی بەشەردایە: ﴿أَفَرَءَيۡتُمُ ٱلنَّارَ ٱلَّتِي تُورُونَ﴾، ئایا ئەو ئاگرەتان بینیوە، ئەو ئاگرە دەزانن کە دایدەگیرسێنن؟ ﴿ءَأَنتُمۡ أَنشَأۡتُمۡ شَجَرَتَهَآ أَمۡ نَحۡنُ ٱلۡمُنشِـُٔونَ﴾، ئایا ئێوە درەختەکەیتان پێگەیاندوە، یان ئێمەین پێگەیەنەرینی؟ ئنجا ئیعجازی قورئان لەوەدایە، کە خەڵکی سادە، مانای سادەی لێ وەردەگرێ و، هەتا مرۆڤیش بەرەو پێشەوە بچێ، مانای قووڵتری تێدا دەبینێ، کاتی خۆی وایانزانیوە کە مەبەست پێی:

**أ-** مەڕخ و عەفارن، کە دوو درەختی سەوزن، لێکیان بدەی، ئاگریان لێ بەرز دەبێتەوە.

**ب-** یاخود مەبەست پێی ئەو دارو سووتەمەنییەیە، وەک چیلکەو دار کە دەیسووتێنن و ئاگری پێدەکەنەوە، لە ماڵێ یان لە دەشت و سارا، بەڵام ئێستا کە زانست بەرەو پێشەوە

www.alibapir.com

چووە، دەزانین کە هەرچی نەوت و گازو خەڵووزو هەموو ئەو سووتەمەنییەیەی لە زەویدا هەیە، هەمووی هی ئەو دارستانانە بووە، کە کاتی خۆی سەر زەوی هەمووی دارستان و درەختی زۆر گەورەو بێڕەزا بوون، دوایی پێش ملیۆنان ساڵ، لە ئەنجامی گۆڕانکارییانەی بەسەر زەویدا هاتوون، ئەو دارو درەختانە کەوتوونە بن زەوی، هەروەها هەندێک لە ئاژەڵە گەورەکانیش وەک دیناسۆرەکان، لە ئەنجامی مردنیان و گۆڕانکاریی کیمیایی کە بە سەریاندا هاتوە، ئەوە هەمووی بۆتە ئەو نەوت و غازو خەڵووزی بەردەی، ئێستا سووتەمەنیین، بۆیە خوا دەفەرموێ: ئایا ئێوە درەختەکەیتان پێگەیاندوە، کە دوایی لە بن زەویدا دەبێتە نەوت و غازو سووتەمەنیی، یاخود ئێمە پێگەیەنەری ئەو دارو درەختە بووین؟

﴿ نَحۡنُ جَعَلۡنَٰهَا تَذۡكِرَةٗ وَمَتَٰعٗا لِّلۡمُقۡوِينَ ﴾، ئێمە ئەو ئاگرەمان گێڕاوە بە مایەی بیرکەوتنەوەو، بەهرەو سوود بۆ ڕێبواران، بە تایبەت بۆ ڕێبواران، یاخود بۆ برسییان ئەوانەی برسییان دەبێ و دەیانەوێ خواردن بەو ئاگرە ساز بکەن.

لە کۆتاییدا دەفەرموێ: ﴿ فَسَبِّحۡ بِٱسۡمِ رَبِّكَ ٱلۡعَظِيمِ ﴾، دەجا ناوی پەروەردگاری مەزنت بە پاک بگرە، پەروەردگارێک ئەو هەموو مشوورانەی خواردوون، ئەو هەموو نیعمەتانەی بۆ ڕەخساندوون، شایستەی ئەوەیە کە ناوی مەزنی (ناوی ئەو پەروەردگارە مەزنە) بە پاک بگیرێ و، نەهێنرێتە ئاستی دروستکراوەکانی، وەک عادەتی هاوبەش بۆ خوا دانەران، ئێمەش دەڵێین: **(سبحان ربي العظيم وبحمده)**.

لە ڕێگەی کۆمەڵایەتییەکان لەگەڵتانین
Stay in touch on social media
نحن معكم عبر مواقع التواصل الاجتماعي
ڕاگەیاندنی مەکتەبی مامۆستا عەلی باپیر
AliBapir/عەلی باپیر
archive.org/details/@alibapir
AliBapir/عەلی باپیر
AliBapir
کەناڵی ڕاگەیاندنی مەکتەبی مامۆستا عەلی باپیر
www.alibapir.net
کوردی - عربي - English
ڕاگەیاندنی مەکتەبی مامۆستا عەلی باپیر

www.alibapir.com


مەسەلە گرنگەکان

## مەسەلەی یەکەم:

**دیاردەی یەکەم: کە دروست بوونی مرۆڤەکانەو، بیرهێنانەوەی خوا بۆ بێبڕوایان کە خۆی وەدیهێناون لە تۆوێک کە ئەوان بەس ڕژاندنییان لە دەست دێ، بەڵام خوا بە ئەندازەگیرییەکی زۆر ورد مرۆڤی دروست کردوەو، مردنیشی لە نێودا داناون، لەسەر لابردن و جێگۆڕکێ پێکردنیشیان توانایەو، لە قیامەتیش بە جۆرێک کە ئێستا نایزانن، پێیان دەگەێنێتەوەو دروستیان دەکاتەوە، بۆیە دەبووایە بە دروستبوونی یەکەمیان، زیندووکرانەوەشیان بێتەوە یادو نکوولّیی لێ نەکەن:**

خوا دەفەرموێ: ﴿ نَحْنُ خَلَقْنَاكُمْ فَلَوْلَا تُصَدِّقُونَ ﴿٥٧﴾ أَفَرَءَيْتُم مَّا تُمْنُونَ ﴿٥٨﴾ ءَأَنتُمْ تَخْلُقُونَهُۥٓ أَمْ نَحْنُ ٱلْخَٰلِقُونَ ﴿٥٩﴾ نَحْنُ قَدَّرْنَا بَيْنَكُمُ ٱلْمَوْتَ وَمَا نَحْنُ بِمَسْبُوقِينَ ﴿٦٠﴾ عَلَىٰٓ أَن نُّبَدِّلَ أَمْثَٰلَكُمْ وَنُنشِئَكُمْ فِى مَا لَا تَعْلَمُونَ ﴿٦١﴾ وَلَقَدْ عَلِمْتُمُ ٱلنَّشْأَةَ ٱلْأُولَىٰ فَلَوْلَا تَذَكَّرُونَ ﴿٦٢﴾ ﴾.

## شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە هەشت بڕگەدا:

١)- ﴿ نَحْنُ خَلَقْنَاكُمْ فَلَوْلَا تُصَدِّقُونَ ﴾، ئێمە ئێوەمان هێناوەتە دی، یاخود ئێوەمان ئەندازەگیریی کردوە، دەبووایە بەڕاست دابنێن. چونکە (خَلْق) هەم بە مانای پەیداکردنی شتێک دێ، لە نەبوون، هەم بە مانای ئەندازەگیریی کردنی ڕێک و ڕاست (التَّقْدِيْر المُسْتَقِيْم)ە، ﴿ فَلَوْلَا تُصَدِّقُونَ ﴾، (لَوْلا) بە مانای (هَلاّ)یە، واتە: دەبووایە ئێوە بەڕاست بزانن، یانی: کە خوا دەفەرموێ: زیندووتان دەکەمەوە، ڕاست دەفەرموێ و، زیندووتان دەکاتەوە.

www.alibapir.com


(الطبري) لە تەفسیرەکەی خۆی دا،[1] ئەم ئایەتە موبارەکەی ئاوا مانا کردوە، دەڵێ: (نَحْنُ خَلَقْنَاكُمْ أَيُّهَا النَّاس! وَلَمْ تَكُونُوا شَيْئًا فَأَوْجَدْنَاكُم بَشَرًا، فَهَلاَّ تُصَدِّقُونَ مَنْ فَعَلَ ذَلِكَ بِكُمْ فِي قِيْلِهِ لَكُمْ: إِنَّهُ يَبْعَثُكُم بَعْدَ مَمَاتِكُم، وَبِلاكُم فِي قُبُورِكُم، كَهَيْأَتِكُم قَبْلَ مَمَاتِكُمْ!).

واتە: ئەی خەڵکینە! ئێمە ئێوەمان هێناوەتە دی، کە هیچ شتێک نەبوون و کردمانن بە مرۆڤ، دەبووایە ئەو زاتەی ئەوەی پێکردوون، لەو فەرمایشتەی دا کە پێتان دەڵێ: زیندووتان دەکاتەوە، دوای مردنتان و دوای ئەوەی لە گۆڕەکانتان دا ڕزیون، وەک حاڵەتی پێش مردنتان لێ دەکاتەوە، دەبووایە بڕوای پێ بکەن و بەڕاستی دابنێن!

٢)- ﴿أَفَرَءَيْتُم مَّا تُمْنُونَ﴾، ئایا ئەو تۆوەتان بینیوە، کە دەیڕێژن ئایا ئەوە دەزانن یان: بە چاوی عەقڵ و دڵ بینیوتانە، کە وەک تۆو دەیڕێژن؟ ﴿تُمْنُونَ﴾، خوێندراویشەتەوە: (تَمْنُون)، (مَنَى يَمْنِي، وَأَمْنَى يُمْنِي: أي قَذَفَ المَنِيَّ أو صَبَّ المَنِيَّ)، تۆوی فڕێدا، یاخود تۆوی ڕشت، کەواتە: ﴿أَفَرَءَيْتُم مَّا تُمْنُونَ﴾، یان (مَا تَمْنُون) واتە: ئایا ئەو تۆوەتان بینیوە کە دەیڕێژنە نێو منداڵدانی ئافرەتانەوە.

٣)- ﴿ءَأَنتُمْ تَخْلُقُونَهُۥٓ أَمْ نَحْنُ ٱلْخَـٰلِقُونَ﴾، ئایا ئێوە دروستی دەکەن واتە: ئێوە ئەندازەگیری دەکەن و وێنەی دەکێشن، دوایی دەیکەن بە مرۆڤێکی ڕێک و پێک، یاخود ئێمە؟!

هەر (الطبري) لە بارەی ئەم ئایەتەوە دەڵێ، واتە: ئەی نکووڵییکەران لە دەستەڵاتی خوا لەسەر زیندووکردنەوەتان، دوای مردنتان، ئایا ئەو تۆویلکانەتان بینیون کە دەیانڕژێننە نێو منداڵدانی ئافرەتەکانتانەوە، ئایا ئێوە ئەو تۆویلکانە دروست دەکەن، یاخود ئێمە بەدیهێنەرین؟

٤)- ﴿نَحْنُ قَدَّرْنَا بَيْنَكُمُ ٱلْمَوْتَ﴾، ئێمە مردنمان لە نێوتاندا ئەندازەگیریی کردوە، مردنمان لە نێوتاندا داناوە، (قَدَّرْنَا) خوێنراویشەتەوە: (قَدَرْنَا) هەردووکیان بە مانای

---

(١) جامع البيان: ج٢٧، ص٢٠٣.

www.alibapir.com


دابەشمان کردوە، ئەندازەگیرییمان کردوە (**أي: قَسَمْنَاهُ عَلَيْكُمْ، وَوَزَّعْنَاهُ بَيْنَكُمْ، أو قَضَيْنَاهُ بَيْنَكُمْ، أو كَتَبْنَاهُ عَلَيْكُمْ**)، واتە: مردنمان لە نێوتاندا ئەندازەگیریی کردوە، یاخود دابەشمان کردوەو بەشیومانەتەوە، هەر کەسە پشک و بەشی خۆی، یاخود بڕیارمان داوە، یان لەسەرتانمان نووسیوە.

٥)- ﴿وَمَا نَحْنُ بِمَسْبُوقِينَ عَلَىٰٓ أَن نُّبَدِّلَ أَمْثَٰلَكُمْ﴾، ئێمە لێ پێشکەوتووەوە نین، لەسەر ئەوەی هاووێنەکانتان بهێنینە شوێنتان، زانایان گوتوویانە: (**أي: وَمَا نَحْنُ بَعَاجِزِيْنَ**) واتە: ئێمە دەستەپاچە نین، لەبەر ئەوەی کەسێک لە کەسێک پێشکەوێتەوە، مانای وایە بێ تواناو دەستە پاچەی کردوەو لێی دەرباز بووە، بەڵام ئەصڵی مانایەکەی: ﴿وَمَا نَحْنُ بِمَسْبُوقِينَ﴾، واتە: کەس لە ئێمە پێش ناکەوێـتەوەو لە دەستمان دەرباز نابێ، ﴿عَلَىٰٓ أَن نُّبَدِّلَ أَمْثَٰلَكُمْ﴾، لەسەر ئەوە کە هاووێنەکانی ئێوە، بێنینە شوێنی ئێوە، (**أي: نَجْعَلَ أَمْثَالَكُمْ بَدَلاً لَكُمْ**) یانی: هاووێنەکانی ئێوە بکەینە جێداری ئێوە، (**أَمْثَال**)یش یان کۆی (**مِثْل**)ە، بە مانای (**شِبه وَنَظِيْر**) دێ، واتە: وێنەو هاوکووف، یان کۆی (**مَثَل**)ەو، بە مانای سیفەت دێ، (**أَمْثَالَكُم**) واتە: (**أَوْصَافَكُم**) سیفەتەکانی ئێوە بگۆڕین، یاخود کەسانێکی دیکە، بێنین کە وەسف و سیفەتیان وەک هی ئێوەیە، یاخود زاتیان وەک هی ئێوەیە، ئەگەر (**مِثْل**) بێ، ﴿وَمَا نَحْنُ بِمَسْبُوقِينَ﴾، واتە: (**وَمَا نَحْنُ بِمَغْلُوبِيْنَ: غَلَبَهُ عَلَى كَذَا، إِذَا حَالَ بَيْنَهُ وبَيْنَ نَوالِهِ**) واتە: ئێمە بەسەردا زاڵبوو نین و، ئێمە لێ پێشکەوتووەوە نین، لەسەر ئەوەی ئێوە لابەرین و، هاو وێنەکانی ئێوە بێنینە شوێنی ئێوە.

٦)- ﴿وَنُنشِئَكُمْ فِي مَا لَا تَعْلَمُونَ﴾، ئێوەش بە جۆرێک پێبگەیەنین کە نایزانن، ئێوە بە جۆرێک دروست بکەینەوە کە نایزانن، (**أي: لَاَ تَعْلَمُونَ تَفَاصِيْلَ تِلْكَ الأَحْوَال**)، وردەکارییەکانی ئەو حاڵانە، کە ئێمە ئێوەی تێدا دروست دەکەین، نایزانن.

٧)- ﴿وَلَقَدْ عَلِمْتُمُ ٱلنَّشْأَةَ ٱلْأُولَىٰ﴾، بە دڵنیایی ئێوە پێگەیاندنی یەکەمتان زانیوە، دەزانن چۆن هاتوون.

www.alibapir.com


٨)- ﴿فَلَوْلَا تَذَكَّرُونَ﴾، دەبووایە بیر بکەنەوە، خوێندراویشەتەوە: (وَلَقَدْ عَلِمْتُم النَّشَاةَ الأولَى)، واتە: هەمزەکە گۆ ناکرێ و، وەک ئەلیف گۆ دەکرێ و، هەریەک واتایان هەیە، واتە: ئێوە پێگەیاندن و دروست بوونی یەکەمتان زانیوە، هی سەرەتا دەزانن لە کوێ ڕاهاتوون! ﴿فَلَوْلَا تَذَكَّرُونَ﴾، دەبووایە بیر بکەنەوەو پەند وەربگرن، کەخوایەک ﷻ توانیبێتی بەو قۆناغانەتان دابێنێ، دەشتوانێ دوای ئەوەی دەمرن جارێکی دیکە دروستتان بکاتەوە، چونکە هۆکاری ئەوە کە نکوڵییان کردوە لە زیندووکرانەوەو، ئەوانی خستۆتە ئیشکالەوە، ئەوەیە کە گوتوویانە: ئەگەر پرژو بڵاو بووین، چۆن زیندوو دەکرێینەوە؟ ﴿وَقَالَ الَّذِينَ كَفَرُوا هَلْ نَدُلُّكُمْ عَلَىٰ رَجُلٍ يُنَبِّئُكُمْ إِذَا مُزِّقْتُمْ كُلَّ مُمَزَّقٍ إِنَّكُمْ لَفِي خَلْقٍ جَدِيدٍ ۝٧﴾ سبأ، ئەوانەی بێبڕوابوون گوتیان: ئایا پیاوێکتان پێشان بدەین هەواڵتان پێدەدا (ئەو پێغەمبەرە)، کە ئێوە هەرکات زۆر پارچە پارچە بوون، پرژ و بڵاو بوون، جارێکی دیکە لە نوێ زیندوو دەکرێنەوە؟ ئنجا ئەگەر ئەوان لە دروستکردنی یەکەمی خۆیانەوە، ڕامابانەیە، هەرگیز ئەو گومان و ئیشکالەیان نەدەبوو، چونکە مرۆڤ لە نوتفە دروست دەبێ، ئەو نوتفەیەش لە حەیمەن و هێلکۆڵە باب و دایک دروست دەبێ، کە هەردووکیان دوو زیندەوەری زۆر بچووکن، یەکدەگرن و دروستکراوێکی دیکە پێک دێ، کە پێی دەگوترێ: نوتفە، ئنجا ئایا ئاوی پیاوو ئافرەت لە کوێ دروست دەبێ؟ بێگومان لە خوێن، ئەدی خوێن لە چی دروست دەبێ؟ لە خواردنی هەرسکراو، خواردنی هەرسکراویش دەرەنجامی خواردنی ئاساییە، کە خەڵک دەیخوات، ئایا خواردنی ئاسایی لە چی دروست دەبێ؟ بێگومان لەو شتانەی لە زەوی دا دەڕوێن، یان لە ژیاندارانی زەوی یان هی دەریا، هەروەها لە تیشکی خۆرو لە هەوا، کەواتە: ئەو نوتفەیە ئەگەر ورد تەماشای بکەین: کەرەستەخاو و سەرەتاییەکەی زۆر پرژو بڵاوە، بەڵام خوا ﷻ هەمووی کۆکردۆتەوە لە دوو زیندەوەری بچووکدا، یەکێکیان پێی دەگوترێ: ژیانداری تۆویی (حَيْمَن) کە لە هەر دڵۆپێک ئاوی پیاوادا، بە ملیۆنان لەو (حَيْمَن)ە هەیە، هی ئافرەتیش پێی دەگوترێ: هێلکۆڵە (بُويضَة) کە هیچیان بە چاو نابینرێن[1]، ئنجا ئەو

---

(١) حەیمەن نابینرێ و هێلکۆڵە (بویضة)ش بە زەحمەت دەبینرێ.

www.alibapir.com


دووانە یەکدەگرن و هەر کامێکیان یەکی بیست و سێ کرۆمۆسۆمیان تێدایە، کە هەرچی سیفەتی بابە، ئەو بیست و سێ (٢٣) کرۆمۆسۆمە لە بابەکەوە دەیانهێنن و، ئەو بیست و سێ کرۆمۆسۆمەی دیکەش لە دایکەکەوە سیفەتەکان دێنن و (٢٣ کۆ ٢٣) دەبنە چل و شەش (٤٦) کرۆمۆسۆم، کە ئەگەر کرۆمۆسۆمێک کەم بێ یان زیاد بێ، ئەم منداڵە نارێک دەردەچێ و، بەشێوەیەکی نا ئاسایی دەردەچێ، ئنجا لە ئەنجامی یەکگرتنی ئەو دوو زیندەورە بچووکەدا، ئەو مرۆڤە دروست بووە، واتە: ئەگەر بزانن دروستکردنی یەکەمیان چۆن بووە، پەند وەردەگرن و بیر دەکەنەوەو، ناکەونە دوو دڵیی و گومانەوە لە دروستکردنەوەی دواییش.

## چەند هەڵوەستەیەکی زمانەوانیی:

لێرەدا کە خوا دەفەرموێ: ﴿نَحْنُ قَدَّرْنَا بَيْنَكُمُ الْمَوْتَ وَمَا نَحْنُ بِمَسْبُوقِينَ (٦٠) عَلَىٰ أَن نُّبَدِّلَ أَمْثَالَكُمْ وَنُنشِئَكُمْ فِي مَا لَا تَعْلَمُونَ (٦١)﴾، چەند هەڵوەستەیەکی ڕەوانبێژیی و زمانەوانیی پێویستن:

**١)**- خوا ﷻ فەرموویەتی: ﴿نَحْنُ قَدَّرْنَا بَيْنَكُمُ الْمَوْتَ﴾، ئێمە مردنمان لە نێوتاندا داناوەو، ئەندازەگیرییمان کردوە، نەیفەرموە: **(نَحْن نُمِيتُكُم)** ئێمە ئێوە دەمرێنین، بەڵکو فەرموویەتی: ئێمە مردنمان لە نێوتاندا داناوە، بە ئەندازەگیریی کردن، واتە: ئەو مردنەی ئێوە پێی دەمرن، ئێمە وامان لێکردوە کە بە ئەندازە بێ و زانراوە: هەر کەسە مردنەکەی لە چ کاتێکدا دەبێ و، لە چ شوێنێکدا دەبێ و، بە چ هۆکارێک دەبێ و، تەمەنی چەند دەبێ؟ هەمووی ئەندازەگیریی کراوە، وشەی: ﴿قَدَّرْنَا بَيْنَكُمُ الْمَوْتَ﴾، هەموو ئەو واتایانە دەگەیەنێ، بەڵام ئەگەر فەرمووبای: ئێمە ئێوە دەمرێنین، یان ئێمە مرێنەری ئێوەین، بەس ئەوەی دەگەیاند کە دەیانمرێنێ.

**٢)**- کە دەفەرموێ: ﴿بَيْنَكُمُ﴾، ئایا وشەی: ﴿بَيْنَكُمُ﴾ ی بۆچی هێناوە؟ ﴿نَحْنُ قَدَّرْنَا بَيْنَكُمُ الْمَوْتَ﴾، **(أي: المَوْتُ يَأْتِي عَلَى آحَادِهِمْ تَداوُلًا وتَناوُبًا، فَلا يُفْلِتُ واحِدٌ مِنْهُم)**، واتە: مردن بەسەر یەک یەکیان دا دێ، بە نۆرەو، یەک لە دوای یەک، هیچکامیان

www.alibapir.com


دەرباز نابن، کەواتە: ئەم ﴿بَيْنَكُمُ﴾، ئەوە دەگەیەنێ کە ئەو مردنەی لە نێوتاندایە، تێدەگەڕێ: جارێک ئەو و جارێک ئەو، جارێک لە ڕاست، جارێک لە چەپ، جارێک لەولاو، جارێک لەولا، هیچکامیان لێی دەرباز نابن، هەروەها وشەی: ﴿بَيْنَكُمُ﴾، زۆر باوە کە بەکارهێنراوە بۆدابەشکردن،وەک خوا بسم الله الرحمن الرحیم دەفەرموێ: ﴿وَنَبِّئْهُمْ أَنَّ الْمَاءَ قِسْمَةٌ بَيْنَهُمْ كُلُّ شِرْبٍ مُحْتَضَرٌ ﴿٢٨﴾﴾ القمر، هەواڵیشیان بدەیە کە ئاوەکە لە نێوانیاندا {لە نێوان خەڵکەکەی گەلی سەموودو حوشترەکەدا} دا بەشکراوە، ڕۆژێک بۆ حوشترەکەو ڕۆژێک بۆ خەڵکەکە، کەواتە: ئەو مردنەش لە نێوتاندا دێ و دەچێ، هەرکامەتان پشک و بەشی خۆی لێی هەیە.

٣)- کە دەفەرموێ: ﴿وَمَا نَحْنُ بِمَسْبُوقِينَ﴾، ئێمە لێ پێشکەوتووەوە نین، (السَّبْقُ: مَجَازٌ مِنَ الغَلَبَةِ والتَّعْجِيزِ)، (سَبْق) واتە: پێشکەوتنەوە بە مەجاز بەکارهێنراوە بۆ زاڵبوون و دەستە پاچە کردن و دەستەوسانکردن، چونکە ئەو کەسەی پێش کەسێک دەکەوێتەوە، بابای لێ پێشکەوتووەوەی بێ دەسەڵات و دەستەوسانکردوە، لە دەستی دەرباز بووەو بەسەریدا زاڵبووە.

٤)- کورتەو پوختەی مانای ئەم دوو ئایەتە موبارەکە، لە تەفسیری (**الميزان**)ەوە دێنین: هی (**محمد حسين طباطبائي**) پێم وایە جوانی هێناوە لە تەفسیرەکەی دا[١] دەڵێ:

**(وَمُحَصَّلُ مَعْنَى الآيَتَيْنِ، أَنَّ المَوْتَ بَيْنَكُمْ إِنَّمَا هُوَ بَتَقْدِيْرٍ مِنَّا لَا لِنَقْصٍ فِي قُدْرَتِنَا بِأن لَا يَتَيَسَّرَ لَنَا إِدَامَةُ حَيَاتِكُمْ، وَلَا لِغَلَبَةِ الأَسْبَابِ المُهْلِكَةِ المُبِيْدَةِ وَقَهْرِهَا وَتَعْجِيْزِهَا لَنَا، فِي حِفْظِ حَيَاتِكُمْ وَإِنَّمَا قَدَّرْنَاهُ بَيْنَكُم عَلَى أَسَاسِ تَبْدِيْلِ الأَمْثَالِ، وَإِذْهَابِ قَوْمٍ وَالإِتْيَانِ بِآخَرِيْنَ وَإِنْشَاءِ خَلْقٍ لَكُمْ يُنَاسِبُ الحَيَاةَ الآخِرَةَ، وَرَاءَ الخَلْقِ الدُّنْيَوِي الدَاثِرِ فَالْمَوْتُ انْتِقَالٌ مِنْ دَارٍ إِلى دَارٍ، وَتَبَدُّلُ خَلْقٍ إِلى خَلْقٍ آخَرَ، وَلَيْسَ بِانعِدَامٍ وَفَنَاءٍ).**

واتە: پوختەی مانای ئەو دوو ئایەتەو ئەوەی پەیدای دەکەن و لێیان بەرهەم دێ، ئەوەیە کە مردن لە نێو ئێوەدا بە ئەندازەگیریی ئێمەیەو، بە هۆی کەمیی

---

(١ ) تفسير الميزان: ج١٩، ص١٣٣.

www.alibapir.com


توانای ئێمەوە نیە، کە نەتوانین ژیانتان درێژە پێ بدەین، هەروەها بەهۆی زاڵبوونی هۆکارە فەوتێنەرەکانەوە نیەو، ملپێکەچکەریی هۆکارە لە بەین بەرەکان و دەستەپاچە کردنیان بۆ ئێمە، نیە، کە ئێمە نەتوانین ژیانتان بپارێزین، بەڵکو ئێمە مردنمان لە نێوتاندا ئەندازەگیریی کردوە، لەسەر بناغەی لابردنی هەندێک و، هێنانی هاو وێنەکانیان و، کۆمەڵێک لاببرێن، کۆمەڵێکی دیکە بهێنرێن، پاشان ئێوەش بە جۆرێکی دیکە دروست بکەینەوە، کە دەگونجێ لەگەڵ ژیانی ڕۆژی دواییدا، لە دوای ئەم ژیانە دنیاییەوە، کەواتە: مردن گواستنەوەیە لە مەنزڵگایەک بۆ مەنزڵگایەک و، گۆڕانە لە دروستکراوێکەوە بۆ دروستکراوێکی دیکە، نەک لە بەین چوون و بێ سەرو شوێن بوون، بێ.

٥- ئەم ڕستە قورئانییە، وەک پێشتریش ئاماژەم پێکرد کە دەفەرموێ: ﴿ وَنُنشِئَكُمْ فِي مَا لَا تَعْلَمُونَ ﴾، ئێمە دەستەپاچە نین، یان لێ پێشکەوتووەوە نین کە ئێوە لابەرین و، ئێوەش بەجۆرێک دروست بکەینەوەو پێبگەیەنین کە نایزانن، لە هەموو قورئاندا ئەم ڕستە موبارەکە، وێنەی نیەو تەنیا لێرەدا هەیە.

لێرەدا نەمبینیوە توێژەرەوانی قورئان وەک پێویست هەڵوەستەی لەگەڵدا بکەن، بەڵام من مانایەکی تایبەتیی تێدا دەبینم و، پێم وایە ئەم ئایەتە تاکە، لە بواری خۆیدا لە هەموو قورئان دا، بەڵام جارێ با سەرنجی قسەی زانایان بدەین و، دوایی لە کورتەباسێك دا ڕاو تێگەیشتنی خۆم لەبارەیەوە دێنین:

١)- هەندێک لە زانایان گوتوویانە: ئەمە هەڕەشەیە بە بنبڕکردن (تَهْدِيْدٌ بِالإِسْتِئْصَال)، یانی: ئێوە لە بەین دەبەین و کۆتاییتان پێ دێنین.

٢)- هەندێکی دیکە گوتوویانە: ئەمە هەڕەشەیە بەگۆڕین و مەسخ کردنەوە (هَذَا تَهْدِيْدٌ بِالمَسْخ) واتە: دەتوانین ئێوە بگۆڕین بۆ وێنە: بەمەیموون و بەراز، وەک خوا بسم الله الرحمن الرحيم هەندێ لە جولەکەکانی کاتی خۆی والێکردوون.

٣)- هەندێکی دیکەش هەندێ شتی دیکەیان گوتوە، شێوەی ئەوانە.

بەڵام لە ڕاستییدا ئەم ئایەتە ئاماژەیە بەوەیە کە ئەی مرۆڤەکان! وەختێک ئێوە ئەم ژیانە دنیاییە کۆتایی پێ دێنن، ڕووح لە جەستەتان جیا دەکەینەوەو، ئێوە لادەبەین و خەڵکێکی دیکە شوێنی ئێوە دەگرنەوە، ئێوەش دەبەینە قۆناغێکی دیکەو بە شێوەیەک دروستتان دەکەینەوە، کە ئێستا ئێوە نایزانن، ئەمەش هەم قۆناغی بەرزەخ دەگەیەنێ، هەم قۆناغی قیامەت و ڕۆژی دواییش دەگەیەنێ، چونکە کەسایەتیی مرۆڤ بە ڕووحەکەیەوە پەیوەستە، نەک بە جەستەکەیەوە، کەواتە: تاکو ڕووحەکە بمێنێ، ئەو جەستەیە، بچێتە هەر قاڵبێکی دیکەوە، کەسایەتیی ئەو مرۆڤە پارێزراوە، ئنجا با ئەمە لە کورتە باسێکدا ڕوون بکەینەوە:



www.alibapir.com


## کورتە باسێک لە بارەی گۆڕانی گەردوون و گۆڕانی جەستەی مرۆڤەوە

بەڕێـــــــــزان!

لە سێ بڕگەدا ئەم کورتە باسە دەکەین:

**بڕگـەی یەکـەم:** ناگونجـێ شـوێنی تێـدا تاقیکرانـەوەو، ژیـانی کاتیـی و، شـوێنی ئەنجـام وەرگرتنـەوەو، ژیـانی هەمیشـەیی جیـاواز نەبـن، ئەمـە شـتێکی بەڵگـە نەویسـتەو، شـتێکی لۆژیکییـە کـە ئـەو شـوێنەی مـرۆڤ تێیـدا تاقیدەکرێتـەوە کـە ژیـانی دنیایـەو، ئـەو تەمەنـە کاتییـەی بـۆی دانـراوە، کـە پێـی تاقیبکرێتـەوە، دەبـێ هـەم ئـەو شـوێنەی ئەنجامـی لێوەردەگرێتـەوەو، هـەم ئـەو تەمەنـەی پاداشـت و سـزا وەردەگرێتـەوە لـە میـانی دا، هـەم تەمەنەکـەش جیـا بـێ و، هـەم شـوێنەکەش جیـا بـێ، هەروەهـا جەسـتەیەکدا کـە مـرۆڤ پێـی تاقیدەکرێتـەوەو، ئـەو تەمەنـە کورتـەی بـۆی دانـدراوە لـە دنیـادا، لەگـەڵ جەسـتەیەک کـە پاداشـت و سـزای پـێ وەردەگرێتـەوەو، تەمەنێـک کـە بـۆی دادەنـدرێ، کـە بریتیـە لـە تەمەنێکـی بـێ کۆتایـی، دەبـێ لـە یـەک جیابـن.

**بڕگەی دووەم:** ئەگەر تەماشا بکەین لە سوورەتی (**إبراهيم**)دا خوا ﷻ باسی ئـەوە دەکات کـە ئـەو گەردوونـەی ئێسـتا ئێمـە تێیدایـن، ئـەو ئاسـمان و زەوییـە، لـە ڕۆژی دواییـدا وەک خۆیـان نامێنـن و بـە جۆرێکـی دیکـە عالەمێکـی دیکـە دێتـە پێـش، دەفەرمـوێ: ﴿ يَوْمَ تُبَدَّلُ ٱلْأَرْضُ غَيْرَ ٱلْأَرْضِ وَٱلسَّمَٰوَٰتُ ۖ وَبَرَزُوا۟ لِلَّهِ ٱلْوَٰحِدِ ٱلْقَهَّارِ ﴿٤٨﴾ ﴾ **إبراهيم**، واتـە: ئـەو ڕۆژە کـە زەوی دەبێتـە جیـا لـەم زەوییـەو ئاسـمانەکانیش جیـا دەبـن لـەم ئاسـمانانەی ئێسـتا، ﴿ وَبَرَزُوا۟ لِلَّهِ ٱلْوَٰحِدِ ٱلْقَهَّارِ ﴾، هەموویـان بـۆ خـوای تاکـی ملپێکەچکـەر دێنـە گـۆڕێ، دێنـە مەیدانـێ.

www.alibapir.com



کەواتـە: وەک کاتی خـۆی لـە تەفسـیری سـوورەتی (**إبراهیـم**)دا گوتوومانـە: ئـەم ئایەتـەش تاکـە ئایەتـە لـە بـواری خۆیـدا لـە هەمـوو قورئانـدا، هەڵبەتـە ئایەتـەکانی دیکـەش بـە گشـتیی ئاماژە دەکەن بـە گۆڕانکاریی دیکە، بـەڵام لێرە خوا ﷻ بـە دەق دەفەرمـوێ: نـە زەوی وەک خـۆی دەمێنـێ و نـە ئاسـمانەکانیش وەک خۆیـان دەمێنـن لـە ڕۆژی دواییـداو، لـەوێ بـە تەفسـیل باسـمانکردوە، کـە پێغەمبـەر ﷺ دەفەرمـوێ: ئـەو زەوییـەی خەڵکـی لەسـەر کـۆ دەکرێتـەوەو، لەسـەری لێـی دەپرسرێتـەوە، وەک نانێکـی سـپی وایـە، هیـچ نیشـانەیەکی لەسـەر نییـە[1]، کەواتـە: ئـەو شـوێنە نابـێ ئـەم زەوییـەی ئێسـتای ئێمـە بـێ، هەروەهـا لـە فەرموودەکـەدا هاتـوە کـە لـەو مەیدانـەدا لـەو سـەر بـۆ ئـەو سـەری، خەڵـک دەبیـنرێ، کەواتـە: نابـێ ئـەو گۆڕەپـان و مەیدانـەی خەڵکـی لەسـەر کۆدەکرێتـەوە، ئـەم سـەر زەوییـەی ئێسـتامان بـێ، ئـەو ئایەتـە بـە ڕوونیـی ئـەوە دەگەیەنـێ.

**برگـەی سـێیەم:** بـۆ گۆڕانی جەسـتەی مرۆڤیش، کە خـوا ﷻ باسی ڕووحی نەکـردوە، بـەڵام بـاسی جەسـتەی کـردوە کـە دەگـۆڕێ، لـە سـوورەتی (**الواقعـة**)دا خـوا دەفەرمـوێ: ﴿ وَمَا نَحْنُ بِمَسْبُوقِينَ ۝٦٠ عَلَىٰٓ أَن نُّبَدِّلَ أَمْثَٰلَكُمْ وَنُنشِئَكُمْ فِى مَا لَا تَعْلَمُونَ ۝٦١ ﴾، واتـە: ئێمـە لـێ پێشـکەوتووەوەو دەسـتەپاچە نیـن کە ئێـوە بگۆڕیـن، بـە هاووێنەکانی ئێـوەو، ئێـوەش بـە جۆرێـک دروسـت بکەینـەوە کـە نایزانـن، هەڵبەتـە ئەگـەر سـەرنجی ئایەتەکـە بدەیـن، زۆر ڕوونـە کـە دروسـتکردنەوەی جەسـتەی ئێمـە، چ لـە قۆناغـی بـەرزەخ داو، چ لـە قۆناغـی قیامەتـدا، ڕووحەکـە وەک خـۆی دەمێنـێ، بـەڵام لـە بەرزەخـدا، وەک ئایەتـەکان ئامـاژە پێدەکـەن و، فەرمایشـتەکانی پێغەمبەریش ﷺ بـە ڕاشـکاویی و بـە ڕوونیـی دەیفەرمـوون، ڕووحـەکان دەچنـە جۆرێـک لـە جەسـتەی دیکـەوە لـە قۆناغـی بەرزەخـداو، لـە قیامەتیشـدا خـوا جەسـتەکان زینـدوو دەکاتەوە، بـەڵام ئـەو جەسـتانەی ئـەو ڕووحەیـان بـە بـەردا دەکرێتـەوە، چ لـە قۆناغـی بـەرزەخ، چ لـە قیامـەت دا، جیـان لـەم جەسـتانەی ئێسـتا، چونکـە ئـەم جەسـتەیەی ئێسـتا،

---

(١) لە لاپەڕە (٦٨١) لە پەراوێزەکەیدا دەقی ئەو فەرمایشتەمان هێناوە.

www.alibapir.com



لەو جۆرە ماددەیەی لەسەر زەوی هەیە پێکهاتوە، لە گڵ و خاکی زەوی و ئاوو هەواو تیشکی خۆر، ئەو جەستەیەش بەو پێکهاتەیەوە تەنیا ئەوەندە بڕ دەکات و تەحەممولی ئەوە دەکات، حەفتا هەشتا نەوەد ساڵێک و، بە دەگمەن لە سەد (١٠٠) تێدەپەڕێ، ئەوەندە بژی، بەس تەحەممولی ئەوەندە ژیانە دەکات، کەواتە: جەستەیەک کە خوا ﷻ دەیخوڵقێنێ بۆ بەهەشتییان، کە ژیانی هەمیشەیی و بەردەوام و نەبڕاوەی پێ بگوزەرێنن، هەروەها بۆ دۆزەخییان کە لە دۆزەخ دا ژیانێکی هەمیشەیی نەبڕاوەی پێ بگوزەرێنن، دەبێ ماددەکەی جیابێ و، شێوەی پێکهاتەکەشی جیا بێ.

ئنجا ئەگەر تەماشای فەرموودەکانی پێغەمبەریش بکەین ﷺ ئەوە زۆر ڕوونە، بۆ وێنە، دوو فەرمایشت دێنم ئەگەرنا فەرمایشت زۆرن:

**١)- {مَنْ يَدْخُلُ الْجَنَّةَ يَنْعَمُ، لَا يَبْأَسُ، وَلَا تَبْلَى ثِيَابُهُ، وَلَا يَفْنَى شَبَابُهُ، فِي الْجَنَّةِ مَا لَا عَيْنٌ رَأَتْ، وَلَا أُذُنٌ سَمِعَتْ، وَلَا خَطَرَ عَلَى قَلْبِ بَشَرٍ} (أخرجه: مسلم: ٢١٨١).**

واتە: کەسێک کە دەچێتە بەهەشت لە نیعمەت و خۆشییدا دەبێ و، هەرگیز تووشی ناڕەحەتیی نابێ و، پۆشاکەکەی ناڕزێ و لە بەین ناچێ و، گەنجێتییەکەی لە بەین ناچێ، {هەر بە گەنجیی دەمێنێتەوە} لە بەهەشتدا ئەوەی لێیەتی، نە هیچ چاوێک دیتوویەتی، نە هیچ گوێیەک بیستوویەتی، نە بەسەر دڵی کەسدا هاتوە.

خوای موتەعالیش لە سوورەتی (**السجدة**)دا دەفەرموێ: ﴿فَلَا تَعْلَمُ نَفْسٌ مَّآ أُخْفِيَ لَهُم مِّن قُرَّةِ أَعْيُنٍ جَزَآءَۢ بِمَا كَانُواْ يَعْمَلُونَ ١٧﴾**السجدة**، واتە: هیچ کەس نازانێ ئەوەی بۆیان پەنهان کراوە، لە مایەی شادمانیی، هیچ کەس نازانێ، مانای وایە ئەوەی کە لەوێ هەیە، جیایە لەوەی ئێرە، چونکە ئەوەی ئێرە دەزانین، ئنجا ئایا خوای پەروەردگار بۆچی بۆمان باسی ڕووباری ئاوو ڕووباری شیرو ڕووباری شەراب و ڕووباری هەنگوین دەکات، وەک لە سوورەتی (**محمد**)دا هاتوە؟

www.alibapir.com


هەروەهـا بۆچـی بۆمـان بـاسی میـوەو گۆشـت و خواردنـەکان دەکات؟ چونکـە ئێمـە بـەس لـەوە تێدەگەیـن! بۆیـە عەبدوڵڵای کـوڕی عەبباس (خـوا لـە خـۆی و بـابی ڕازی بـێ) زۆر جـوانی گوتـوە: ئـەو نـازو نیعمەتـەی خـوا بـاسی کـردوە بـۆ بەهەشـتییان، تەنیـا لـە نـاودا لەگـەڵ ئـەوەی دنیـادا تێـک دەکەنـەوە و، لـە نێوەڕۆکـدا ئاسـمان و ڕێسـمانیان بەینـە.

**٢)-** {قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: **إِنَّ أَوَّلَ زُمْرَةٍ يَدْخُلُونَ الْجَنَّةَ عَلَى صُورَةِ الْقَمَرِ لَيْلَةَ الْبَدْرِ، ثُمَّ الَّذِينَ يَلُونَهُمْ، عَلَى أَشَدِّ كَوْكَبٍ دُرِّيٍّ فِي السَّمَاءِ إِضَاءَةً؛ لاَ يَبُولُونَ، وَلاَ يَتَغَوَّطُونَ، وَلاَ يَتْفِلُونَ، وَلاَ يَمْتَخِطُونَ، أَمْشَاطُهُمُ الذَّهَبُ، وَرَشْحُهُمُ الْمِسْكُ، وَمَجَامِرُهُمُ الأَلُوَّةُ الأَنْجُوجُ عُودُ الطِّيبِ، وَأَزْوَاجُهُمُ الْحُورُ الْعِينُ، عَلَى خَلْقِ رَجُلٍ وَاحِدٍ، عَلَى صُورَةِ أَبِيهِمْ آدَمَ سِتُّونَ ذِرَاعًا فِي السَّمَاءِ**} **(أخرجه البخاري: ٣٣٢٧، ومسلم: ٢٨٣٤).**

پێغەمبـەر ﷺ دەفەرمـوێ: یەکەمیـن کۆمـەڵ کـە دەچنـە بەهەشـت لەسـەر شـێوەی مانگـن لـە چواردەو پازدەدا، (واتـە: ئەوپـەڕی بـە شـەوقیی مانـگ، ئـەوان کـە دەچنـە بەهەشـت کۆمەڵـی یەکـەم ئـاوا شـۆق دەدەن)، دوایـی ئەوانـەی لـە دوای وان دێـن (لـە ڕووی پڕشـنگدان و ڕووناکییەوە) لەسـەر شـێوەی ڕووناکترین ئەسـتێرەی ئاسـمانن، (هەڵبەتـە بـۆ ئێمـەی خەڵکـی سـەر زەوی ڕووناکتریـن ئەسـتێرەی ئاسـمان، شـەوقی ناگاتـە هـی مانـگ، ئەگەرنا دەزانیـن کـە ئەسـتێرەکانیش وەک خـۆرن)، نـە میـز دەکـەن و، نـە پیسـایی دەکـەن و، نـە تـف و بەڵغەمیـان هەیـەو، نـە چڵمیـان هەیـە، شـانەکانیان زێـڕن، ئارەقەکەیـان بریتیـە لـە میسـک، بـۆ ندانەکەیـان [کـە بـۆنی خـۆشی تێدەکـەن] بریتیـە لـە داری عـوود {کـە زۆر بۆنخۆشـە}و، هاوسەرەکانیشـیان بریتیـن لـە ئافرەتـانی سـپیی چـاو گـەش و گـەورە، پیـاوە بەهەشـتییەکان لـە ڕووی جەسـتەوە، وەک یـەک پیـاو وان {هەموویـان بـە ئەنـدازەی یەکـن} لەسـەر شـێوەی بابیـان ئادەمـن، کـە شەسـت باسـک بـووە لـە ئاسـمان، {بـەلای کـەم دەکاتـە سـیی (٣٠) مەتـر}.

www.alibapir.com



کەواتـە: بەهەشـتییەکان باڵایـان بـەلای کەمـەوە دەبێتـە سـیی مەتـر، واتـە: سـێ عەمـوود زیاتـر، دیـارە ئەستوورییشـیان لـە قـەدەر ئەوەیـە و، قیافەیـان لـەو قـەدو قیافـەی کـە لـە دنیـادا بوویانـە، جیایـە، هەروەهـا لـە فەرمایشـتەکانی پێغەمبـەردا بـاسی ئینسـانی بێبـڕوا دەکات کـە لـە دۆزەخ دا ددانێکـی هێنـدەی چیـای ئوحـودەو[1]، نێوشـانی ئەوەنـدە ڕۆژەڕێ[2] پانـە، کەواتـە: ڕاسـتە کـە گۆڕانکاریـی بەسـەر جەسـتەی مرۆڤـەکان دا دێ لـە ڕۆژی دواییـدا، چ بەهەشـتییەکان و، چ دۆزەخییەکانیـش.

هەڵبەتـە زانینـی ئـەو دوو ڕاسـتییەش کـە هـەم گـەردوون گۆڕانکاریـی بەسـەردا دێ، هـەم مـرۆڤ لـە ڕووی جەسـتەییەوە گـۆڕانی بەسـەردا دێ، وەڵامـی زۆر ئیشـکال و پرسـیارمان بـۆ دەسـتەبەر دەکات، بـۆ وێنـە:

لـە ژیـانی دنیـادا خەڵـک کـە خـواردن و خواردنـەوەی هەیـە، دوایـی میـزو پاشـەڕۆکی هەیـە، ئایا لە بەهەشـتدا ئەوە هەیـە؟ نەخێر، پێغەمبـەر ﷺ دەفەرموێ: لـە بەهەشـت دا میـزو پاشـەڕۆک نیـە.

هەتـا لێیـان پرسـیوە: ئـەدی ئـەو خـواردن و خواردنەوەیـە چـی لـێ دێ؟ فەرموویـەتی: قرپیـان[3] دێ، بۆنەکـەی وەک بـۆنی میسـکەو، ئارەقەکەیـان کـە دەیکـەن بـۆنی وەک بـۆنی میسـکە، یـانی: خـواردن و خواردنەوەکەیـان دەبێتـە قـرپ و ئارەقـە (**جُشـاء ورشـح**)، کەواتـە: کۆئەندامەکانیشـیان دەگۆڕێـن، کـە لـە دنیـادا کۆئەندامیـان

---

(١) [ضرس الكافـر يـوم القيامـة مثـل أحـد وعـرض جلـده سـبعون ذراعـا].... مسـلم : ٢٨٥١ والترمـذي: ٢٥٧٨ وأحمـد: ٨٣٤٥.

(٢) [مابين منكبي الكافر مسيرة ثلاثة أيام للراكب المسرع] البخاري: ٦٥٥١.

(٣) { يَـأْكُلُ أَهْـلُ الجَنَّـةِ فِيهَـا، وَيَشْرَبُـونَ، وَلَا يَتَغَوَّطُـونَ، وَلَا يَمْتَخِطُـونَ، وَلَا يَبُولُـونَ، وَلكِـنْ طَعَامُهُـمْ ذَلِـكَ جُشَـاءٌ كَرَشْـحِ المِسْـكِ، يُلْهَمُـونَ التَّسْـبِيحَ وَالتَّكْبِـيرَ، كَمَا يُلْهَمُـونَ النَّفَـسَ } (أخرجـه أحمـد: ١٤٨١١، وعبـد بـن حميـد: ١٠٣٠، ومسـلم: ٢٨٣٥، وأبـو داود: ٤٧٤١، وابـن حبـان: ٧٤٣٥.

www.alibapir.com


هەن، هی میزو پاشەڕۆک فڕێدان، هەروەها چڵم و بەڵغەم، ئەوانە هەموویان گۆڕانکارییان بەسەردا دێ.

هەروەها بە نسبەت ئەوەوە کە لە ڕۆژی دواییدا خەڵک لە کوێ جێی دەبێتەوە بۆ کۆکرانەوەو لێپرسینەوە؟ ئایەتەکەی سووڕەتی (**إبراهیم**) ئاتی ژمارە (٤٨)، وەڵامی ئەو ئیشکالەش دەداتەوە، کە ئەم سەر زەوییە هەڵناگرێ، ئەو خەڵکە هەمووی لەسەری کۆ بکرێتەوە، بەڵام خوا دەفەرموێ: لە قیامەتدا نە زەوی وەک خۆی دەمێنێ و، نە ئاسمانەکانیش، کەواتە: زەوییەکی دیکەو عالەمێکی دیکەو، وەزعێکی دیکە، دێتە ئاراوە، بە گشتیی و بۆ مرۆڤ لە ڕووی جەستەییەوە بە تایبەتیی.

لە ڕاستییشدا وەک گوتمان: کەسایەتیی مرۆڤ بە ڕووحەکەیەوەیە، نەک بە جەستەکەی، چونکە جەستەی مرۆڤ وەک چۆن مرۆڤ پۆشاک لەبەر دەکات، جەستەش وەک پۆشاکێک و بەرگێکە بۆ ڕووح، کەواتە: ئەو ڕووحە لە دنیادا ئەم جەستە خاکییە لەبەر دەکات و پێی داپۆشراوەو، لە قۆناغی بەرزەخدا جەستەیەکی دیکەی دەبێ، پێغەمبەر دەفەرموێ: ڕووحی شەهیدان لە نێو کەلەشی باڵندەی سەوزدایە کە لە بەهەشتدا، ئەو چڵ و ئەو چڵ دەکات[1]، کەواتە: لە قۆناغی بەرزەخیشدا دیسان ڕووح جەستەیەکی دیکەی هەیە، بەڵام لە قەدەر قۆناغی بەرزەخ، دیسان لە قیامەتیش دا مرۆڤ هەم ڕووحی دەبێ و،

---

(١) {عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ مَسْعُودٍ رَضِىَ اللَّهُ عَنْهُ: أَنَّهُ سُئِلَ عَنْ أَرْوَاحِ الشُّهَدَاءِ؟ فَقَالَ: قَدْ سَأَلْنَا عَنْ ذَلِكَ فَقَالَ: «أَرْوَاحُهُمْ كَطَيْرٍ خُضْرٍ لَهَا قَنَادِيلُ مُعَلَّقَةٌ فِي الْعَرْشِ تَسْرَحُ حَيْثُ شَاءَتْ، ثُمَّ تَأْوِي إِلَى قَنَادِيلِهَا، فَبَيْنَمَا هُمْ عَلَى ذَلِكَ إِذِ اطَّلَعَ عَلَيْهِمْ رَبُّكَ اطِّلاَعَةً، فَيَقُولُ: مَا تَشْتَهُونَ؟ فَيَقُولُونَ: وَمَا نَشْتَهِى! وَنَحْنُ فِي الْجَنَّةِ نَسْرَحُ حَيْثُ شِئْنَا، فَإِذَا رَأَوْا أَنْ لاَ بُدَّ مِنْ أَنْ يَسْأَلُوا، قَالُوا: تُرَدُّ أَرْوَاحُنَا فِى أَجْسَادِنَا، فَنُقَاتِلُ فِي سَبِيلِ اللَّهِ، فَنُقْتَلُ مَرَّةً أُخْرَى، فَإِذَا رَأَى أَنْ لاَ يَسْأَلُوهُ شَيْئًا تَرَكَهُمْ»، لَفْظُ حَدِيثِ أَبِى عَبْدِ اللَّهِ وَفِي رِوَايَةِ الْمُقْرِئِ قَالَ: سَأَلْنَا عَبْدَ اللَّهِ بْنَ مَسْعُودٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ عَنْ هَذِهِ الآيَةِ: (وَلاَ تَحْسَبَنَّ الَّذِينَ قُتِلُوا فِي سَبِيلِ اللَّهِ أَمْوَاتًا بَلْ أَحْيَاءٌ عِنْدَ رَبِّهِمْ يُرْزَقُونَ فَرِحِينَ) قَالَ: أَمَا إِنَّا قَدْ سَأَلْنَا عَنْ ذَلِكَ ثُمَّ ذَكَرَ مَعْنَاهُ} أخرجه مسلم: ٤٩٩٣.

هەم جەستەش، بەڵام جەستەکەی لە قەدەر ئەوێ دەبێ، وەک خوا دەفەرموێ: ﴿وَنُنشِئَكُمْ فِي مَا لَا تَعْلَمُونَ ﴿٦١﴾﴾ **الواقعة**، بەشێوەیەک دروستتان دەکەینەوە، کە ئێوە ئێستا نایزانن چۆنە؟



## مەسەلەی دووەم:

**پرسیارکردنی خـوا لـە بێبڕوایـان، کـە ئایـا خۆیـان کشـت و کاڵەکەیـان دەڕوێنـن، یان ئەوان بەس کێڵان و چاندن و تۆ وەشـاندنیان لەسـەرەو، خوا ﷻ بۆیان دەڕوێنـێ؟ ئەگـەر خـوا بیـەوێ دەیکاتـە پـووش و پـەڵاشی تێکشـکاو، ئـەو کاتـەش جگـە لـە سەرسـوڕمان و پەشـێمانیی و بـاسی دۆڕان و زیانباریـی خـۆ کـردن، هیچیـان پـێ نامێنـێ:**

خــوا دەفەرمــوێ: ﴿ أَفَرَءَيْتُم مَّا تَحْرُثُونَ ﴿٦٣﴾ ءَأَنتُمْ تَزْرَعُونَهُۥٓ أَمْ نَحْنُ ٱلزَّٰرِعُونَ ﴿٦٤﴾ لَوْ نَشَآءُ لَجَعَلْنَٰهُ حُطَٰمًا فَظَلْتُمْ تَفَكَّهُونَ ﴿٦٥﴾ إِنَّا لَمُغْرَمُونَ ﴿٦٦﴾ بَلْ نَحْنُ مَحْرُومُونَ ﴿٦٧﴾ ﴾.

## شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە شەش بڕگەدا:

**١)- ﴿ أَفَرَءَيْتُم مَّا تَحْرُثُونَ ﴾**، [خوا ﷻ بە پرسیارکردنی نکوڵیلێکەرانە ڕوو لە بێبڕوایەکان دەکات و دەفەرموێ:] ئایا ئەوە دەبینن کە دەیکێڵن؟ **(الحَرْثُ: شَقُّ الأَرْضِ لِيُزْرَعَ فِيها أَوْ يُغْرَسَ، أي: مَا تَحْرُثُونَ لَهُ، أي: لأَجْلِهِ، وَهُوَ الزَّرْعُ وَالنَّبَاتُ)**، **(حَرْث)**: بریتیە لە شەقکردنی زەوی، زەوی کێڵان، بۆ ئەوەی تۆوی تێدا بوەشێنرێ، یاخود نەمامی تێدا بنێژرێ، واتە: ئایا ئەوە دەبینن کە ئێوە لە پێناوی دا زەوی دەکێڵن، کە بریتیە لە کشت و کاڵ و ڕووەک! **(حَرْث)** بە مانای کێڵان دێ، بەڵام زەوی کێڵان بۆ ئەوەیە دوایی تۆوی تێدا بوەشێنرێ، یاخود نەمامی تێدا بنێژرێ، کەواتە: دەگونجێ بگوترێ: ئایا ئەو کشتوکاڵە دەبینن، یاخود ئەو دارو درەختە دەبینن، کە ئێوە زەوی بۆ دەکێڵن، دوایی تۆوەکە دەوەشێنن، یاخود نەمامەکان دەنێژن! چونکە لێرەدا مەبەست لە **(حَرْث)** ئیشکردنە لە زەوی دا، بۆ ئەوەی تۆوی تێدا بوەشێنرێ، دوایی دەفەرموێ:

**٢)- ﴿ ءَأَنتُمْ تَزْرَعُونَهُۥٓ أَمْ نَحْنُ ٱلزَّٰرِعُونَ ﴾**، ئایا ئێوە دەیڕوێنن، یاخود ئێمەین ڕوێنەر؟ واتە: **(أَأَنْتُمْ تُنْبِتُونَهُ، أَم نَحْنُ المُنْبِتُون)**، بێگومان وەڵامەکەی دیارە واتە: ئێمە دەیڕوێنین، لێرەدا (زرع).

www.alibapir.com


أ- چاوگەو بە مانای (مَزْرُوع)ە، واتە: کشت و کاڵ و تۆوی وەشێندراو یان نەمامی نێژراو.

ب- (زَرْعُ) بە مانای تۆو وەشاندن لە زەویدا، یاخود نەمام چاندنە، لە فەرهەنگی (لِسَان العَرَب)دا دەڵێ: (زَرْعُ الحَبِّ: بَذْرُهُ) چاندنی تۆوەکە ئەوەیەکە بە زەویدا بڵاوبکرێتەوە بۆ ئەوەی بڕوێ، ئنجاخوا بسم الله الرحمن الرحيم دەفەرموێ: ئایائێوە دەیڕوێنن ئەو تۆوەی دەیوەشێنن و، ئەو نەمامەی دەینێژن، ئەو کشتوکاڵەی زەوی بۆ دەکێڵن، یان ئێمە؟

٣)- ﴿لَوۡ نَشَآءُ لَجَعَلۡنَٰهُ حُطَٰمٗا﴾، ئەگەر ویستبامان بە دڵنیایی دەمانکردە پووش و پەڵاشی تێکشکاو، (ل)ی (لَجَعَلْنَاهُ) بۆ جەختکردنەوەیە، لەوانی دیکەدا خوا بسم الله الرحمن الرحيم (ل)ی نەخستۆتە سەر، لەبەر ئەوەی کشتوکاڵەکە لەبەر دەستی خۆیانە، بەڵام باران کە دەبارێ، بێگومان هەورەکە لەبەر دەستی ئەوان دا نیە، هەروەها هۆکارەکانی ئاگر لەبەر دەستی ئەواندا نین، بەڵام کشتوکاڵەکە خۆیان دەستیان تێیدا هەیە، بۆیە دەفەرموێ: بە دڵنیایی، ئەگەر ویستبامان دەمانکردە پووش و پەڵاشی تێکشکاو، (الحُطَامُ: الشَّيْءُ الَّذِي حَطَّمَهُ حَاطِمٌ، أيْ كَسَّرَهُ ودَقَّهُ)، (حُطَام): شتێکە تێکشکێنەرێک تێکیشکاند بێ و، وردو خاشی کرد بێ، پێشتریش باسی وشەی (حُطامُ)مان کرد کە لەسەر کێشی (فُعَال)ە، وەک (فُتَات و جُذَاذ) کە بە شتی وردو خاش دەگوترێن.

٤)- ﴿فَظَلۡتُمۡ تَفَكَّهُونَ﴾، ئنجا ئەو کاتە ئێوە دەستتان دەکرد بە (تَفَكُّه)، (تَفَكَّهُونَ: مِن فَكِه: فَرِحَ وَانْبَسَط)، (فَكِه) واتە: دڵخۆش بوو، قسەی خۆشی کرد، (فُكَاهَة)ش قسەی خۆشکردنە، ئنجا ﴿فَظَلۡتُمۡ تَفَكَّهُونَ﴾، چەند واتایەکی هەن:

١- یەکێک لە واتایەکانی ئەوەیە ئێوە وەک عادەتی خۆتان بەردەوام دەبوون لەسەر قسەی خۆش و سوعبەت، کە ئەمە بە توانج و تەوسەوەیە.

٢- یاخود (تَفَكَّهُونَ) (تَفَكَّهَ مِنْ أَفْعَالِ الإزَالَةَ كَتَحَرَّجَ وَتَأَثَّمَ، أي: أَزَالَ الفُكَاهَة، وَهِيَ المَسَرَّة، فَتَحْصّل النَّدَامَةُ)، (محي الدين درويش) خاوەنی (إعراب القرآن) لە تەفسیرەکەی دا[1] دەڵێ: وشەی (تَفَكَّهَ) لەو فیعلانەیە کە مانای لابردن دەگەیەنێ، وەک: (تَحَرَّجَ،

---

(١) إعراب القرآن: ج٩، ص٤٣٩.

www.alibapir.com


أي: رَفَعَ الحَرَج)، (تَأَثَّمَ: رَفَعَ الإِثْمَ)، سەغڵەتیی لابرد، گوناهی لابرد، کەواتە: (تَفَكَّهَ: أي أزَالَ الفُكَاهَةَ)، قسەی خۆش و سوعبەتی لابرد، یانی: ئەو کاتە سوعبەت و قسەی خۆشتان نەدەماو، لە جیاتی ئەوە پەشێمانیی و دڵتەنگیی و خەفەتباریی، یاخود سەرسوڕمانتان بۆ پەیدا دەبوو.

هەروەها خاوەنی (إعراب القرآن) قسەیەکی دیکەی جوان دەکات دەڵێ: (التَفَكُّه: أَصْلُهُ تَنَاوُل ضُرُوبِ الفَوَاكِه لِلأَكْلِ، وَالفُكَاهَة: المُزَاحُ، قِيْلَ: فِي وَصْفِ الرَّسُولِ فِي حَدِيْث زَيْدِ: كَانَ مِنْ أَفْكَهِ النَّاسِ مَعَ أَهْلِهِ)، (تَفَكُّه) لە ئەصڵدا بریتیە لە دەست گەیاندنە میوە، بۆ خواردن، (فُكَاهَة)ش مانای قسەی خۆش دەگەیەنێ، لەبەرئەوەی بە دەم میوە خواردنەوە زۆرجار وابووەو ئێستاش قسەی خۆش و سوعبەت دەکرێ، لە وەسفی پێغەمبەردا ﷺ هاتوە: {عَنْ ثَابِتِ بْنِ عُبَيْدٍ، قَالَ: كَانَ رسول الله مِنْ أَفْكَهِ النَّاسِ إِذَا خَلاَ مَعَ أَهْلِهِ } (أخرجه البيهقي في شعب الإيمان، وابن أبي شيبة: ٨٢٠٠)، واتە: پێغەمبەری خوا لەگەڵ ماڵ و خێزانی خۆی دا، لە هەموو کەس قسە خۆشتر بوو، میهرەبانتر بووە.

کەواتە: ﴿ فَظَلْتُمْ تَفَكَّهُونَ ﴾، یانی: أ - (بە توانجەوە) بەردەوام دەبوون لەسەر قسەی خۆش، ب- قسەی خۆشتان نەدەما، بەڵکو دڵتەنگیی و پەشێمانییتان بۆ پەیدا دەبوو، بێ.

دوای ئەوەش دەتانگوت:

٥)- ﴿ إِنَّا لَمُغْرَمُونَ ﴾، بە دڵنیایی ئێمە زیانبارین، هەروەها خوێنراویشەتەوە: (أَءِنَّا لَمُغْرَمُونَ) ئایا ئێمە زیانبارین؟ وشەی (مُغْرَمُون) لە (غُرْم)ەوە هاتوەو بریتیە لەوەی ماڵ و سامانێک بکەوێتە سەر کەسێک، بێ ئەوەی تاوانێکی کرد بێ، یاخود ناپاکییەکی کرد بێ، دەگوترێ: غەرامەیان کردوە، لێرەدا یانی: باج لێ ستاندنی بە ناهەق،

ئەمەش سێ واتای هەن:

www.alibapir.com



أ)- (إِنَّا لَمُلْزَمُونَ غَرَامَةَ مَا أَنْفَقْنَا فِيْهَا)، واتە: ئێمە ئەو ماڵ و سامانەی لەو کشتوکاڵەدا خەرجمانکردوە، لێی تووشی زیان بووین.

ب)- (إِنَّا لَمُهْلَكُون لِهَلَاكِ قُوتِنَا مِنَ الغَرَامِ وَهُوَ الهَلَاكَ)، واتە: ئێمە دەفەوتێین چونکە بژیوەکەمان نەما، خۆشمان دەفەوتێین، لە (غرام)ە هاتوە یانی: فەوتان.

ج- واتایەکی دیکەشیان بۆ لێکداوەتەوە: (إِنَّا لَمُعَذَّبُون) بە دڵنیایی ئێمە سزادراوین، واتە: خوا سزای داوین کە ئەو ماڵ و سامانەمان ئاوا ڕۆیشتوەو، ئەو کشتوکاڵەمان ئاوا فەوتاوە، یاخود ئێمە تووشی سزاو ئازارو ناڕەحەتیی دەبین، بە هۆی ئەوەوەکە کشتوکاڵەکەمان نەماوە.

٦)- ﴿بَلْ نَحْنُ مَحْرُومُونَ﴾، بەڵکو ئێمە بێ بەشین، واتە: نەک هەر غەرامەو باجەکەیمان کەوتۆتە سەرو زیانێکمان لێ کەوتوە، بەڵکو هەر یەکجاریی بێ بەش بووین، (حُرِمْنَا مِن رِزْقِنَا بِشُؤْمِ تَفْرِيْطِنَا)، واتە: ئێمە لە بژیوەکەی خۆمان، بێ بەش بووین، بەهۆی نەگبەتیی کەمتەرخەمییەکەمانەوە.

(قتادة) لە بارەی (حُرِمْنَا)وە گوتوویەتی: (هُوَ المُحَارَفُ الَّذِي انْحَرَفَ عَنْهُ رِزْقُه)، (أخرجه الطبري: ٣٣٥٩١) واتە: لێ لادراو، ئەو کەسەیە بژیوەکەی لێی لادەدرێ و لێی دوور دەخرێتەوە.

﴿فَظَلْتُمْ تَفَكَّهُونَ﴾، (ظَلَّ) (أي: اسْتَمَرَّ فِي عَمَلِ النَّهَار) یانی: لەسەرکاری ڕۆژی بەردەوام بوو، بەڵام دوایی بۆ بەردەوام بوون لەسەر هەر کارێک بەکارهاتوە، هەروەک چۆن (بَاتَ يَفْعَلُ كَذَا) واتە: بە شەوێ کارەکەی کرد، بەڵام دوایی هەرکام لە (بات) و (ظَلَّ)ە بۆ بەردەوام بوون لەسەر هەر کارێک بەکاردێن، بە شەو بێ یان بە ڕۆژ بێ.

جگە لەو مانایەی سەرەوە بۆ (تفكّهون)، زانایان سێ واتای دیکەشیان بۆ باسکردوون:

www.alibapir.com


**١**- (**الطبري**) دەڵێ: (**فَظَلْتُم تَتَعَجَّبُونَ مِمَّا نَزَلَ بِكُمْ فِي زَرْعِكُم مِنَ المُصِيْبَةِ بِاحْتِرَاقِهِ وَهَلَاكِهِ**)، واتە: سەرتان سوڕدەما بە هۆی ئەوەوە کە دابەزیوەتە سەر کشتوکاڵەکەتان، ئەو بەڵایەی دابەزیوەتە سەری کە سووتاوە، یان بۆتە پووش و پەڵاش و لە بەین چووە.

هەروەهـا عەبدوڵـڵای کـوڕی عەبـباس و موجاهیدیـش (**تَفَكَّهُونَ**)یان بـە (**تَتَعَجَّبُون**) (سـەرتان سـوڕدەما) لێکداوەتەوە:

**أ)**- وەک (**الطبري**) بە ژمارە (٣٣٥٨٣) لە (**إبن عباس**)ەوە هێناویەتی.

**ب)**- هەروەها بە ژمارە (٣٣٥٨٤) لە (**مجاهد**)ەوە هێناویەتی.

**٢)**- هەندێکی دیکە لە زانایان بۆ وێنە (**عِكرمة**) (**تَفَكَّهُوْنَ**)ی بە (**تَلَاوَمُوْن**) واتە: لە بەینی خۆتان سەرکۆنەی یەکدییتان دەکرد، هێناوە، (**الطبري**) بە ژمارە: (٣٣٥٨٦) هێناویەتی.

**٣)**- حەسەنی بەصڕایی (**تَفَكَّهُونَ**)ی بە (**تَنْدَمُوْن**)ی ژیوان و پەشێمان دەبوونەوە، هێناوە، (**الطبري**) بە ژمارە: (٣٣٥٨٨) لێوەی هێناوە.

(**إبـن عجيبـة**) لـە تەفسـیرەکەی خـۆی: (**البحـر المديـد في تفسـير القـرآن المجيـد**)دا[١] لـە بـارەی سەرسـوڕمانەکەوە، بۆچـی سـەریان سـوڕدەمێنێ؟ دەڵـێ:

**أ)**- (**تَتعَجَّبُونَ مِنْ سُوْءِ حَالِهِ إِثْرَ مَا شَهِدْتُمُوهُ عَلَى أَحْسَنِ مَا يَكُون**)، سەرتان سوڕدەما لەو حاڵە خراپەی بەسەر کشتوکاڵەکەتاندا هاتوە، دوای ئەوەی بە باشترین شێوە بینیوتانە، زۆر بە ڕەونەق و گەش و گۆڵ و جوان بوو، دوایی بوو بە پووش و پەڵاش سەرتان لێی سوڕما.

**ب**- هەروەها لە بارەی پەشێمانییەکەیانەوە، ئەگەر (**تفكّهون**) بە مانای (**تندمون**)بێ، گوتوویەتی:

(**تَنْدَمُـونَ عَـلَى تَعَبِكُـم فِيْـهِ وَإِنفَاقِكُـم عَلَيْـهِ، أو عَـلَى مَـا اقْتَرَفْتُـم مِـنَ المَعَـاصِي الَّتِـي أُصِبْتُـم بِذَلِـكَ مِـنْ أَجْلِهَـا**)، واتـە: پەشـێمان دەبنـەوە لەسـەر ئـەو ماندووبوونـەی

---

(١) ج٧، ص٢٩٧.

www.alibapir.com


پێتانەوە کێشاوەو ئەو مەسرەفەی لێتان کردوە، یاخود لەسەر ئەو گوناهانەی کە بە هۆیانەوە، کشتوکاڵەکەتان تووشی ئەو بەڵایە بووە.

(الطبري) وەک عادەتی خۆی کە مەگەر چۆن، ئەگەرنا دوای ئەوەی ڕای پێشووان لە هاوەڵان و شوێنکەوتووان و زانایانەوە، دێنێ، دوایی خۆی ڕایەک هەڵدەبژێرێ، لێرەدا دەڵێ: (**وَأَوْلَى الْأَقْوَال فِي ذَلِكَ بِالصَّوَابِ قَوْل مَنْ قَالَ : مَعْنَى: ﴿فَظَلْتُمْ تَفَكَّهُونَ﴾: فَأَقَمْتُمْ تَعْجَبُونَ مِمَّا نَزَلَ بِزَرْعِكُمْ، وَأَصْلُهُ مِنَ التَّفَكُّهِ بِالْحَدِيثِ، إِذَا حَدَّثَ الرَّجُلُ الرَّجُلَ بِالْحَدِيثِ يَعْجَبُ مِنْهُ، وَيَلْهَى بِهِ، وَكَأَنَّ مَعْنَى الْكَلَامِ: فَأَقَمْتُمْ تَتعَجَّبُونَ ويُعَجِّبُ بَعْضُكُمْ بَعْضاً مِمَّا نَزَلَ بِكُمْ**).

دەڵێ: نیزیکترین قسە لە ڕاستییەوە، قسەی کەسێکە کە گوتوویەتی: ﴿فَظَلْتُمْ تَفَكَّهُونَ﴾، واتە: بەردەوام دەبوون لە سەرسوڕمان لەوەی تووشی کشتوکاڵەکەتان بووە، وشەی (**تَفَكُّه**)یش لە ئەسڵدا بریتیە لە قسەی خۆشکردن، پیاوێک پیاوێکی دیکە دەدوێنێ، قسەیەک دەکات ئەویش پێی سەیر دەبێ و، پێوەی دەخافڵێ، مانای ئەم فەرمایشتە وەک ئەوەیە: ئێوە بەردەوام دەبوون لەسەر سەرسوڕمان و، هەندێکتان سەری ئەوی دیکەتان سوڕدەماند لەوەی بەسەرتاندا هاتوە.

دەربارەی بەکارهێنانی وشەی (زَرع)، ئەم فەرمایشتە دێنین: {**عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ** رضي الله عنه**: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ** ﷺ **قَالَ: لاَ يَقُولَنَّ أَحَدُكُمْ: زَرَعْتُ، وَلَكِنْ يَقُولُ: حَرَثْتُ، قَالَ: أَبُو هُرَيْرَةَ** رضي الله عنه **أَلَم تَسْمَعُوْا اللهَ يَقُولُ:** ﴿أَفَرَءَيْتُم مَّا تَحْرُثُونَ ﴿٦٣﴾﴾} **(أخرجه البزار: ١٢٨٩، وإبن حبان: ٥٧٢٣، والطبري: ٣٣٤٩٢، والبيهقي في الشعب: ٥٢١٧، ٥٢١٨)**.

واتە: ئەبوو هورەیرە رضي الله عنه دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: یەکێک لە ئێوە نەڵێ: کشتوکاڵەکەم ڕواند، بەڵکو با بڵێ: زەوییەکەم کێڵاو کشت و کاڵەکەم کرد، (تۆوەکەم وەشاندو نەمامەکانم ناشتن، چونکە ئەوەی دەیروێنێ خوای پەروەردگارە) ئەبوو هورەیرە رضي الله عنه گوتوویەتی: ئایا گوێتان لە قسەی خوای بەرز نەبووە، کە دەفەرموێ: ﴿أَفَرَءَيْتُم مَّا تَحْرُثُونَ ﴿٦٣﴾ ءَأَنتُمْ تَزْرَعُونَهُۥٓ أَمْ نَحْنُ ٱلزَّٰرِعُونَ ﴿٦٤﴾﴾؟!

www.alibapir.com


### مەسەلەی سێیەم:

**پرسیارکردنی نکووڵییلێکەرانەی خوا لە بێبڕوایان، کە ئایا ئەو ئاوە شیرین و زوڵاڵەی دەیخۆنەوە، ئەوان لە هەوران دایانبەزاندوە، یان خوا ﷻ، کە ئەگەر ویستبای سوێرو تفت و تاڵی دەکرد؟**

خوا دەفەرموێ: ﴿أَفَرَءَيْتُمُ الْمَآءَ الَّذِى تَشْرَبُونَ ﴿٦٨﴾ ءَأَنتُمْ أَنزَلْتُمُوهُ مِنَ الْمُزْنِ أَمْ نَحْنُ الْمُنزِلُونَ ﴿٦٩﴾ لَوْ نَشَآءُ جَعَلْنَٰهُ أُجَاجًا فَلَوْلَا تَشْكُرُونَ ﴿٧٠﴾﴾.

## شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە چوار بڕگەدا:

**١)-** ﴿أَفَرَءَيْتُمُ الْمَآءَ الَّذِى تَشْرَبُونَ﴾، ئایا ئەو ئاوەتان بینیوە (بە چاوی سەر) کە دەیخۆنەوە؟ یاخود مەبەست پێی زانیوتانە واتە: دیتن لێرەدا مەبەست پێی دیتنی عەقڵ و دڵە، ئەو ئاوەی دەیخۆنەوە، زانیوتانە؟ بۆچی دەفەرموێ: ئەو ئاوەی دەیخۆنەوە؟ چونکە مەبەست و ئامانجی گەورە لە ئاوی شیرین، خواردنەوەیە، هەڵبەتە دوایی کشتوکاڵیشی پێ دەکرێ و، شتن و شواریشی پێ دەکرێ و، پێداویستییەکانی دیکەشی پێ جێبەجێ دەکرێن، بەڵام ئامانجی سەرەکیی لە ئاوی شیرین، بریتیە لە خواردنەوەی.

**٢)-** ﴿ءَأَنتُمْ أَنزَلْتُمُوهُ مِنَ الْمُزْنِ أَمْ نَحْنُ الْمُنزِلُونَ﴾، ئایا ئێوە لە هەوران داتانبەزاندوە، یاخود ئێمە دابەزێنەرینی؟ (**الْمُزْنُ: جَمْعُ اسْمِ مُزْنَة، وَهِيَ السَّحَابَة**)، (**مُزْن**) ناوی کۆی (**مُزْنَة**)یە، کە بە یەک هەور دەگوترێ، (**راغب الأصفهاني**) دەڵێ: (**السَّحَابُ الأَبْيَض**) یان (**السَّحَابَة البَيْضَاء**) هەوری سپیی.

**٣)-** ﴿لَوْ نَشَآءُ جَعَلْنَٰهُ أُجَاجًا﴾، ئەگەر ویستبامان سوێرو تاڵمان دەکرد، (**أُجَاجُ: الشَّدِيدُ المُلُوحَةِ والمَرارَةِ، مِنْ أَجَّجَ النَّارَ إِذَا أَشْعَلَهَا**)، (**أُجَاج**): بە مانای زۆر سوێرو زۆریش تاڵ، لە (**أَجَّجَ النَّارَ**)ەوە هاتوە، واتە: ئاگرەکەی خۆشکرد، خاوەنی (**مختار الصّحاح**) دەڵێ: (**أُجَاج: ضُرٌّ شَدِيْدُ المـُلُوحَة**) واتە: هەم بە زیان و هەم زۆریش سوێر.

www.alibapir.com


٤)- ﴿فَلَوْلَا تَشْكُرُونَ﴾ دەبووایە سوپاسگوزاریی بکەن، (لَوْلَا) بە مانای (هلّا) یە، سوپاسگوزاریی بۆ خواش ئەوەیە کە بەندایەتیی بۆ بکەن و، واز لە شیرک و بتپەرستیی بێنن.

## چەند تایبەتمەندییەکی ئاوی خواردنەوە

١)- ئاو نە ڕەنگی هەیە، نە تامی هەیە، نە بۆنی هەیە، لە خودی خۆیدا، بۆچی خوای وای دروستکردوە؟ بۆ ئەوەی بە کەڵکی هەموو شتێک بێ، دەتوانی ماستاوی لێ دروست بکەی، شەربەتی لێ دروست بکەی، هەر شتێک بتەوێ لەو ئاوە دەتوانی دروستی بکەی، ئەگەر ڕەنگ و تام و بۆنێکی هەبووایە، بە کەڵکی هەموو شتێک نەدەهات.

٢)- ئاو زوو دەبێتە هەڵم، لە پلەی چواردەوە دەست بە بوونە هەڵم دەکات، واتە: لە پلەی چواردەوە کە گەرم دەبێ، دەست بە بوونە هەڵم دەکات، بۆچی؟ بۆ ئەوەی ئەو ئۆقیانووسە گەورانە کە تیشکی خۆر لێیان دەدات، ئەگەر زۆریش بەهێز نەبێ، وردە وردە هەر پرۆسەی هەڵماندن (تبخیر) دروست بێ، چونکە هەورەکان لەو هەڵمەی لە ئۆقیانووسەکان پەیدادەبێ، دروست دەبن.

٣)- هەر کاتێک بۆ پلەی چواری ژێر سفر، ئاو سارد کرا، قەبارەکەی گەورە دەبێ، هەر بۆیە ئاوی بەستەڵەکەکانی دەریا گەورەکان کە دەیانبەستێ، تەنیا ڕووی سەرێیانەو، ئاوەکەش کە دەیبەستێ قەبارەی گەورە دەبێ و هەڵدەچێ بۆ لای سەرێ و، بنەوەی بە شێوەو حاڵەتی ئاو دمێنێتەوە، ئەگەر وانەبووایە دەریایەکان لەسەرێیان تاکو خوارێ، هەموویان وشک دەبوون، ئەو کاتەش پرۆسەی هەڵماندن نەدەبوو، باران و بەفرو تەرزەش نەدەبارین، ژیاندارەکانی نێو دەریاش ئەگەر هەموو بەستبای، تێکڕا دەمردن، هەروەها ڕووەکیش نەدەڕواو، ئاژەڵەکانی وشکانییش بەبێ ئاو تێکڕایان دەمردن، دوایی مرۆڤیش هەر کۆتایی پێ دەهات.

٤)- ئاوی شیرین لە ئەصڵدا بوونی نیە، بەس ئەو ئۆقیانووسە گەورانە هەن، کە سێ لەسەر چواری پانتایی زەوییان داپۆشیوە، بەڵام تیشکی خۆر کە لەو ئۆقیانووسانە دەدات، ئەوەتا لە پلەی چواردەوە ئاو وردە وردە دەست بە بوونە هەڵم دەکات، ئنجا هەمیشەش لەسەر ڕووی دەریا، با هەیەو ئەو بایە هەڵمەکە هەڵدەگرێ و دەیهێنێ بۆ شوێنە ساردەکان و، لە شوێنە ساردەکان، گەردەکانی هەڵم لێک نیزیک دەبنەوەو دڵۆپە پێکدێنن، ئنجا بەپێی ئەندازەی ساردیی کەش و هەوایەکە، جاری وا هەیە باران دروست دەبێ، جاری وا هەیە تەرزەو، جاری واش هەیە بەفر.

لە تۆڕە کۆمەڵایەتییەکان لەگەڵتانین
Stay in touch on social media
نحن معكم عبر مواقع التواصل الاجتماعي
ڕاکەیاندنی مەکتەبی مامۆستا عەلی باپیر
AliBapir/عەلی باپیر
archive.org/details/@alibapir
AliBapir/عەلی باپیر
AliBapir
www.alibapir.net
عربي - كوردی - English
کەناڵی
ڕاکەیاندنی مەکتەبی مامۆستا عەلی باپیر

www.alibapir.com



## مەسەلەی چوارەم و کۆتایی:

**بێگومـان ئاگرێکیـش کـە دایدەگیرسـێنن بـە سـووتەمەنیی جـۆراو جـۆر، کـە ڕیشـەکەیان هـەر دەگەڕێتـەوە بـۆ ڕووەک و درەخـت، خـوا درەخـت و ڕووەکـەی پێگەیانـدوە، نـەک مرۆڤـەکان، کـە خەڵکـی ڕێبـوارو برسـیی بـە پلـەی یەکـەم لـەو ئاگـرە، بەهرەمەنـد دەبـن:**

خوا دەفەرموێ: ﴿ أَفَرَءَيْتُمُ ٱلنَّارَ ٱلَّتِى تُورُونَ ﴿٧١﴾ ءَأَنتُمْ أَنشَأْتُمْ شَجَرَتَهَآ أَمْ نَحْنُ ٱلْمُنشِـُٔونَ ﴿٧٢﴾ نَحْنُ جَعَلْنَٰهَا تَذْكِرَةً وَمَتَٰعًا لِّلْمُقْوِينَ ﴿٧٣﴾ فَسَبِّحْ بِٱسْمِ رَبِّكَ ٱلْعَظِيمِ ﴿٧٤﴾ ﴾.

## شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە پێنج بڕگەدا:

**١)- ﴿ أَفَرَءَيْتُمُ ٱلنَّارَ ٱلَّتِى تُورُونَ ﴾**، ئایا ئەو ئاگرەتان بینیوە کە دایدەگیرسێنن؟! (**تُورُون: تُوقِدُون**) واتە: دایدەگیرسێنن، ئەو ئاگرەی دەیکەنەوە، (**الإِيْرَاءُ: إِظْهَارُ النَّارُ بِالْقَدْحِ، أُورى يُورِي ورياً**)، (**إيراء**): بریتیە لە دەرخستنی ئاگر بە قەدح، کە کاتی خۆی لە کوردەواریی خۆماندا بەردو ئەستێی پێ گوتراوە لەگەڵ پووشوو، بەردیان لە ئەستێیەکە داوە، یان ئەستێیەکەیان لە بەردەکە داوە، پووشووش هەبووە کە پووشێکی زۆر وردە، لە پەنای بەردو ئەستێیەکەیان ڕاگرتوە، کە پڕیشکە ئاگری لێ بۆتەوە، پێی داگیرساوە، گەلی عەرەبیش: بەرد و ئەستێ (زەندو زەندە)یان پێ دەڵێن، ئەصڵی پڕۆسەکەش قەدحی پێ دەڵێن واتە (لێدان)، جاری واش هەبووە دوو درەختی (مەڕخ و عەفار) کە لێکیان داون، ئاگریان لێ پەیدابووە، ئنجا گوتراوە: (**قَدَحَ فأوری، أو قدح فَأَكْبى**) واتە: بەردو ئەستێیەکەی لێکدان ئاگری لێ بۆوە، پڕیشکە ئاگر، بەڵام ئەگەر ئاگری لێ نەبێتەوە دەڵێ: (**فَأَكْبَى**) واتە: چرووکی کرد، ئاگرەکەی لێ پەیدا نەبوو، خوا دەفەرموێ: ئەو ئاگرەتان بینیوە کە هەڵیدەکەن؟

**٢)- ﴿ ءَأَنتُمْ أَنشَأْتُمْ شَجَرَتَهَآ ﴾**، ئایا ئێوە درەختەکەیتان پێگەیاندوە! (**الإِنْشَاءُ: إِحْدَاثُ الشَّيء وَتَرْبِيَتُهُ**)، (**إِنْشَاء**): بریتیە لە پەیداکردنی شتێک و، پێگەیاندنی و مشوور لێخواردنی،

www.alibapir.com


چونکە ئەو درەختە یەک تەکان پەیدا نەبووە، بەڵکو وردە وردە چەکەرەی داوەو، بۆتە چرۆ و گەورە بووەو گەورە بووە، تاکو بۆتە ئەوەی دوایی بگونجێ بکرێتە سووتەمەنیی.

٣)- ﴿أَمۡ نَحۡنُ ٱلۡمُنشِـُٔونَ﴾، یاخود ئێمە پێگەیەنەرینی، پێگەیەنەری ئەو دار و درەختەین، کە ئێوە دوایی دەیکەن بە سووتەمەنیی؟

٤)- ﴿نَحۡنُ جَعَلۡنَٰهَا تَذۡكِرَةً وَمَتَٰعًا لِّلۡمُقۡوِينَ﴾، ئێمە ئەو ئاگرەمان گێڕاوە بە مایەی بیرخستنەوەو پەند وەرگرتن، [هەروەها بەهرەمەندبوون] بۆ ڕێبواران و برسییان (**الْمُقْوِيْن: الْمُسَافِرِيْن أو الجَائِعِيْن**) (**المقوين**) هەم بە ڕێبواران، هەم بە برسییان لێکیان داوەتەوە، (**أَقْوَى: إِذَا سَافَرَ أي نَزَلَ القَوَاءَ، يُقَالُ: أَقْوَيْتُ مُنْذُ كَذَا وَكَذَا، أَي: مَا أَكَلْتُ شَيْئًا، وَبَاتَ فُلَانٌ الْقَوَاءَ، وَبَاتَ الْقَفْرَ: إِذَا بَاتَ جَائِعًا**)، وشەی (**قَوَاء**): هەم بە بیابان دەگوترێ، هەم بە سکی خاڵییش دەگوترێ، دەگوترێ: (**أَقْوَى**) ئەگەر کەسێک سەفەری کردو چووە دەشت و بیابان، هەروەها دەگوترێ: (**أَقْوَيْتُ مُنْذُ كَذَا وَكَذَا، أَيْ: مَا أَكَلْتُ شَيْئًا**) ماوەی ئەوەندەو ئەوەندە هیچم نەخواردوە، (**وَبَاتَ فُلَانٌ الْقَوَاءَ، وَبَاتَ الْقَفْرَ**) واتە: فلانکەس بە برسیەتیی شەوی کردەوەو، لە بیابان شەوی کردەوە.

٥)- ﴿فَسَبِّحۡ بِٱسۡمِ رَبِّكَ ٱلۡعَظِيمِ﴾ ئنجا ناوی پەروەردگاری مەزنت بە پاک بگرە، بە دووری بگرە لە هەر پەڵەو لەکەو کەم و کوڕییەک.

### دار و درەخت کانگای ئاگر و سووتەمەنییە :

کاتی خۆی هەموو تەفسیرەکان، وایان ئەم ئایەتە مانا کردوە، وەک چۆن بەشێوەی سەرەتایی بەردو ئەستێیان لێکداوەو ئاگری لێ پەیدابووە، هەروەها دارو چڵۆیان هێناوەو کردوویانەتە سووتەمەنیی هەروایان لێکداوەتەوە، بەڵام بێگومان وێڕای ئەم مانا ڕواڵەتییە کە بۆ سەردەم و ڕۆژگاری خۆی وای لێ تێگەیشتوون و ڕاستیشە، مانایەکی دیکەی گەورەتر، بەڵام پەنهانی هەیە، کە زانست دەریخستوە[1]، ئەویش ئەوەیە کە لە چاخەکانی پێشوودا، چاخە

---

(١) د. محمد راتب النابلسي لە تەفسیرەکەی دا باسیکردوە، هەروەها (طنطاوي جوهري)یش

www.alibapir.com


بارانارییەکان (العصور المطيرة) کاتی خۆی ئەم سەر زەوییەی ئێمە بەو شێوەیە نەبووە، ئاوا بەو شێوەیە بەرگە هەوای هەبێ و، بەرگی ئاویی هەبێ و، بەو شێوەیەی ئێستا بێت، ئنجا لەو چاخە زووانەدا، کە ملیۆنان ساڵ لەمەو پێش بووە، ڕووەکی زۆر گەورەو زەبەلاح و دارو درەختی زل و گەورە هەبوون، وەک زانایانی زەویناسیی دەڵێن، ئنجا ئەو درەختە زەبەلاح و گەورەو بە کەلەشانە، کە بوومە لەرزەکان ڕوویانداوەو، ئاگر پڕژێنەکان ڕوویانداوەو، گۆڕانکاریی زۆر بەسەر زەوی دا هاتوون و، بوونە هۆی ئەوەی ئەو ڕووەک و درەختە زەبەلاح و بە کەلەشانە بکەونە بن زەوی، بەردو دارو گڵ و خۆڵی زۆریان بکەوێتە سەرێ و ئەوان بچنە نێو زەوی و، ملیۆنان ساڵ بەو شێوەیە بمێننەوە، تاکو لە ئەنجامدا گۆڕانی کیمیاییان بەسەردابێ و، ببنە گازو نەوت، هەروەها هەندێکیان ببونە خەڵووزی بەرد.

کەواتە: ئەو نەوت و گازەی ئێستا ئێمە دەستمان دەکەوێ و، لە نێو جەرگەی زەوی دا هەیە، هەمووی هی ئەو ڕووەک و درەختە گەورانەیە، هەندێکیش لە زانایان دەڵێن: هی هەندێک لە ژیاندارە گەورەکانیشە وەک دیناسۆڕەکان و، ژیاندارو ئاژەڵی گەورە گەورەو، دڕندەی گەورە گەورەش هەبوون جگە لە دیناسۆڕەکان، هەیانبووە هێندەی چیایەک بووە، یان هێندەی گردێک بووە، ئەوانەش لە ئەنجامی ئەوەدا کە گۆڕانکارییەک بەسەر زەویدا هاتوە، فەوتاون و، زانایان لەو بارەوە بیردۆزەی جیا جیایان هەن، ئایا دیناسۆڕەکان بۆچی فەوتاون؟ ئایا لە ئەنجامی ئەوەدا بووە کە پارچە نەیزەکێکی گەورە بە زەوی کەوتوە؟ یان لە ئەنجامی ئەوەدابووە کە پلەی گەرمیی زەوی دابەزیوە لەهی ئەوکاتەی ئەوان تێیدا ژیاون؟ یاخود پلەی گەرمیی زۆر بەرزبۆتەوەو ئەوان فەوتاون؟ گرنگ ئەوەیە ئەو نەوت و گازەی لە بن زەویدا هەیە، هەمووی بەرهەمی کەلەشی ئەو ئاژەڵانە و، ئەو دارو درەخت و ڕووەکانەیە، کە کاتی خۆی کەوتوونە ژێر

---

لە تەفسیرەکەیدا هێناویەتی.

www.alibapir.com


زەوی، کەواتە: لێرە کە خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿أَفَرَءَيۡتُمُ ٱلنَّارَ ٱلَّتِي تُورُونَ ٧١﴾، ئەو ئاگرە دەبینن کە دایدەگیرسێنن؟ واتە: ئەو سووتەمەنییەی دەیکەن بە ئاگر، کە مەرج نیە بەس دارو درەخت بێ، ﴿ءَأَنتُمۡ أَنشَأۡتُمۡ شَجَرَتَهَآ أَمۡ نَحۡنُ ٱلۡمُنشِـُٔونَ ٧٢﴾، ئایا ئێوە درەختەکەیتان، (چونکە نەوتەکەش و گازەکەش کاتی خۆی هەر درەخت بوون، بە پلەی یەکەم) ئایا ئێوە ئەو درەختەیتان کە دوایی ئەو نەوت و گازەی لێ پەیدابووە، دروست کردوە، یاخود ئێمە پێگەیەنەرینی؟

هەڵبەتە لە سوورەتی (الأعلى)شدا کە خوای پەنهانزان دەفەرموێ: ﴿سَبِّحِ ٱسۡمَ رَبِّكَ ٱلۡأَعۡلَى ١ ٱلَّذِي خَلَقَ فَسَوَّىٰ ٢ وَٱلَّذِي قَدَّرَ فَهَدَىٰ ٣ وَٱلَّذِيٓ أَخۡرَجَ ٱلۡمَرۡعَىٰ ٤ فَجَعَلَهُۥ غُثَآءً أَحۡوَىٰ ٥﴾**الأعلى**، واتە: ناوی پەروەردگاری هەرە بەرزت بە پاک بگرە. کە دروستیکردو ڕێکیخست. هەروەها ئەندازەگیریی کردو ڕێنمایی کرد، هەروەها ئەو زاتەی لەوەڕگاو گژو گیاو دارو درەختی زۆری دەرهێنا، ﴿فَجَعَلَهُۥ غُثَآءً أَحۡوَىٰ﴾، دوایی کردی بە تلتێکی ڕەش، یان کردی بە پووش و پەڵاشێکی ڕەش داگەڕاو، کە ئەمەش هەر ئاماژەیە بە دروست بوونی غازو نەوت، لە ئەنجامی ئەو گژو گیاو دارو درەختەی کاتی خۆی لەسەر ڕووی زەوی هەبووە.

بۆیە ئەوەی سووڕەتی (الأعلى)ش هەرئاماژەیەکی ڕوونە بەو ڕاستییە زانستییە.

لە بارەی ئاگرەوە و، ئاگری دۆزەخ زۆر گەرمترە لە ئاگری دنیا، ئەم فەرمایشتەی پێغەمبەر دێنین کە جاری دیکەش بە بۆنەی دیکەوە هێناومانە: {**إِنَّ نَارَكُمْ هَذِهِ الَّتِي يُوقِدُ ابْنُ آدَمَ جُزْءٌ مِنْ سَبْعِينَ جُزْءًا مِنْ نَارِ جَهَنَّمَ، قَالُوا: وَاللَّهِ، إِنْ كَانَتْ لَكَافِيَةً يَا رَسُولَ اللَّهِ. قَالَ: فَإِنَّهَا فُضِّلَتْ عَلَيْهَا بِتِسْعَةٍ وَسِتِّينَ جُزْءًا، كُلُّهُنَّ مِثْلُ حَرِّهَا**} (**أخرجه البخاري: ٣١٦٥، ومسلم: ٢٨٤٣، والترمذي: ٢٦٨٩**) واتە: ئەم ئاگرەی وەچەی ئادەم دایدەگیرسێنن، بەشێکە لە حەفتا بەش لە ئاگری دۆزەخ، هاوەڵان خوا لێیان ڕازیبێ گوتیان: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ! بە خوا هەر ئەم ئاگرەش بەس بوو (بۆ سزادانی ئەوانەی دەخرێنە دۆزەخەوە؟) فەرمووی: ئاگری دۆزەخ

بە شەست و نۆ بەش بەسەر ئاگری دنیادا بەرزکراوەتەوە، هەر کام لەو شەست و نۆ بەشە، گەرماییەکەی وەک گەرمایی ئاگری دنیا وایە.

هەڵبەتە وشەی حەفتا بەش (**سَبْعِينَ جُزْءًا**) مەرج نیە ڕێک مەبەست پێی حەفتا بێ، بەڵکو دەگونجێ زیاتر بێ و دەگونجێ کەمتر بێ و، ئێستا کە زانست بەرەو پێشەوە چووە، دەزانین کە لە ئەستێرەکاندا بۆ وێنە: خۆرەکەی خۆمان، لە نێو هەناوی خۆردا، پلەی گەرمیی ملیۆنانەو، لە دیوی دەرەوەی خۆریش، پلەی گەرمیی چەند هەزار جاری ئەو گەرمایەیە کە ئێمە دەیزانین، لە لای خوای پەروەردگاریش ئاسانە کە پلەی گەرمیی دۆزەخ، زۆر لەو پلە گەرمییەی ئێمە پێی ئاشناین، بەرزتر بکاتەوە، وەک فەرمایشتەکەی پێغەمبەر ﷺ ئاماژەی پێدەکات بە گشتیی.

**سُبحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ، أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ أَنْتَ، أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ.**

لە ڕێگەی تۆڕە کۆمەڵایەتییەکان لەگەڵتانین
Stay in touch on social media
نحن معكم عبر مواقع التواصل الاجتماعي
ڕاگەیاندنی مەکتەبی مامۆستا عەلی باپیر
AliBapir/عەلی باپیر
archive.org/details/@alibapir
AliBapir/عەلی باپیر
AliBapir
کەناڵی ڕاگەیاندنی مەکتەبی مامۆستا عەلی باپیر
www.alibapir.net
کوردی - عربي - English
ڕاگەیاندنی مەکتەبی مامۆستا عەلی باپیر

www.alibapir.com



## پێناسەی ئەم دەرسە

ئـەم دەرسـەمان بیسـت و دوو (٢٢) ئایـەتی کۆتایـی ئـەم سـوورەتە موبارەکـە دەگرێتـە خـۆی، واتـە: ئایەتـەکانی: (٧٥ - ٩٦)، جوگرافیـای دابەشـبوونی ئایەتەکانیـش بەسـەر بابەتـەکانی ئـەم دەرسـەدا، بـەم شـێوەیە:

هەشـت (٨) ئایـەتی سـەرەتا، ئایەتـەکانی: (٧٥ - ٨٢) لـە بـارەی قورئانـەوەن، کـە قورئـان دابەزێـنراوی خـوای پـەروەردگاری جیهانییانـەو، جگە لە فریشـتە پاککـراوەکان، توخنـی نەکەوتـوون و توخنـی ناکـەون، دوایـی سەرزەنشـتی کافـرەکان کـراوە، کـە بۆچـی لـە جیـاتی بـڕوا پێهێنـانی، بـە درۆی دادەنێـن؟ هەمـوو پشـک و بـەشی خۆیـان لـەم قورئانـە، کـە سـەرچاوەی خێـرو بەرەکەتـە، بریتیـە لـە بـڕوا پێنەهێنـانی؟!

دوایـی لـە پێنـج ئایەتی نێوەڕاسـتدا، ئایەتـەکانی: (٨٣ - ٨٧) باسی حاڵـەتی گیانکێشران کـراوە، کاتێـک کەسێک دەکەوێتـە گیانـەڵاو ئەوانـەی لـە دەوروبـەری، بابـای کەوتـوە گیانـەڵا دانیشـتوون، هیچیـان لـە دەسـت نایـەت و دەسـتە پاچـەن و، هیچیـان پـێ ناکـرێ و، فریشـتەکانی خـواش لـەوان لێـی نزیکـترن، بـەڵام ئـەوان نایانبینـن.

لـە نـۆ (٩) ئایـەتی کۆتاییشـدا، ئایەتـەکانی: (٨٨ - ٩٦) بـاسی جێگاو ڕێگای هەرسـێک جۆرەکـەی مرۆڤـان دەکات، واتـە: (**المقربين**) لـە خـوا نیزیکخـراوان، (**أَصْحَابُ الْيَمِيْن**) هـاوەڵانی دەسـتە ڕاسـت و، بەدرۆدانـەرانی گومـڕا (**المكذبين الضالِّين**) واتـە: هـاوەڵانی دەسـتە چـەپ.

﴿فَلَآ أُقْسِمُ بِمَوَٰقِعِ ٱلنُّجُومِ ﴿٧٥﴾ وَإِنَّهُۥ لَقَسَمٌ لَّوْ تَعْلَمُونَ عَظِيمٌ ﴿٧٦﴾ إِنَّهُۥ لَقُرْءَانٌ كَرِيمٌ ﴿٧٧﴾ فِى كِتَٰبٍ مَّكْنُونٍ ﴿٧٨﴾ لَّا يَمَسُّهُۥٓ إِلَّا ٱلْمُطَهَّرُونَ ﴿٧٩﴾ تَنزِيلٌ مِّن رَّبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿٨٠﴾ أَفَبِهَٰذَا ٱلْحَدِيثِ أَنتُم مُّدْهِنُونَ ﴿٨١﴾ وَتَجْعَلُونَ رِزْقَكُمْ أَنَّكُمْ تُكَذِّبُونَ ﴿٨٢﴾ فَلَوْلَآ إِذَا بَلَغَتِ ٱلْحُلْقُومَ ﴿٨٣﴾ وَأَنتُمْ

www.alibapir.com



حِينَئِذٍ تَنظُرُونَ ﴿٨٤﴾ وَنَحْنُ أَقْرَبُ إِلَيْهِ مِنكُمْ وَلَٰكِن لَّا تُبْصِرُونَ ﴿٨٥﴾ فَلَوْلَآ إِن كُنتُمْ غَيْرَ مَدِينِينَ ﴿٨٦﴾ تَرْجِعُونَهَآ إِن كُنتُمْ صَٰدِقِينَ ﴿٨٧﴾ فَأَمَّآ إِن كَانَ مِنَ ٱلْمُقَرَّبِينَ ﴿٨٨﴾ فَرَوْحٌ وَرَيْحَانٌ وَجَنَّتُ نَعِيمٍ ﴿٨٩﴾ وَأَمَّآ إِن كَانَ مِنْ أَصْحَٰبِ ٱلْيَمِينِ ﴿٩٠﴾ فَسَلَٰمٌ لَّكَ مِنْ أَصْحَٰبِ ٱلْيَمِينِ ﴿٩١﴾ وَأَمَّآ إِن كَانَ مِنَ ٱلْمُكَذِّبِينَ ٱلضَّآلِّينَ ﴿٩٢﴾ فَنُزُلٌ مِّنْ حَمِيمٍ ﴿٩٣﴾ وَتَصْلِيَةُ جَحِيمٍ ﴿٩٤﴾ إِنَّ هَٰذَا لَهُوَ حَقُّ ٱلْيَقِينِ ﴿٩٥﴾ فَسَبِّحْ بِٱسْمِ رَبِّكَ ٱلْعَظِيمِ ﴿٩٦﴾

## مانای دەقا و دەقی ئایەتەکان

{وانیە (کە ئێوە دەڵێن ئەی بێبڕواینە!) سوێند بە شوێنەکان (و سوڕگەکان)ی ئەستێرەکان ﴿٧٥﴾ بێگومان ئەم سوێندەش ئەگەر بزانن (سوێندێکی) مەزنە ﴿٧٦﴾ بە دڵنیایی ئەوە قورئانێکی بەڕێزو پێزە ﴿٧٧﴾ لە نووسراوێکی شێردراوەدایە ﴿٧٨﴾ جگە لە فریشتە زۆر چاکەکان (هیچ کەس) دەستی لێ نادات ﴿٧٩﴾ لەلایەن پەروەردگاری جیهانییانەوە دابەزێنراوە ﴿٨٠﴾ ئنجا ئایا ئێوە (ئەی بێبڕوایەکان!) بەرانبەر بەم فەرمایشتە کەمتەرخەمیی دەکەن! ﴿٨١﴾ بژیو (و پشک)تان (تێیدا) ئەوەیە کە بە درۆی دادەنێن (و نکووڵیی لێدەکەن)؟! ﴿٨٢﴾ دەجا دەبووایە کاتێک (یەکێکتان ڕووحی) دەگاتە گەرووی (لە دەمی گیان کێشراندا) ﴿٨٣﴾ کە ئێوەش لەو کاتەدا تەماشا دەکەن (و تێوەی ڕاماون) ﴿٨٤﴾ لە حاڵێکدا کە ئێمە لە ئێوە لێی نیزیکترین (بە هۆی فریشتەکانمانەوە)، بەڵام ئێوە نایبینن ﴿٨٥﴾ ئنجا ئەگەر (ڕاستە) ئێوە ژێر دەست (ی خوا) نین ﴿٨٦﴾ دەبووایە بیگێڕنەوە (و نەهێڵن ئەو ڕووحە لە جەستەی دەربچێ)، ئەگەر لە ڕاستانن ﴿٨٧﴾ ئنجا ئەگەر (ئەو گیانە کێشراوە) لە زۆر (لەخوا) نیزیکخراوان بێ ﴿٨٨﴾ ئەوە (پاداشتەکەی لە قۆناغی بەرزەخ دا) ئاسوودەیی و شوێنی پڕ گوڵ و ڕەیحان و، باخی پڕ نازو نیعمەتە ﴿٨٩﴾ ئەگەر لە هاوەڵانی ڕاستەش بێ ﴿٩٠﴾ ئەوە سەلام لە تۆ بێ لە هاوەڵانی ڕاستەوە ﴿٩١﴾ ئەگەر لە (هاوەڵانی چەپەی) بە درۆدانەرە گومڕایەکانیش

www.alibapir.com


بێ ﴿٩٢﴾ ئەوە (سزایان) میوانداریی کرانیانە ﴿٩٣﴾ لە ئاوی کوڵاوو خرانە نێو کڵپە ی ئاگری دۆزەخ) ﴿٩٤﴾ بە دڵنیایی ئەمە (کە گوترا) هەقێکی (ڕاست و) جێی دڵنیاییە ﴿٩٥﴾ دەجا ناوی پەروەردگاری مەزنت بە پاک بگرە ﴿٩٦﴾}.

## شیکردنەوەی هەندێک لە وشەکان

(بِمَوَٰقِعِ ): (مواقِع: جَمْعُ مَوْقِع: مَكَانُ الوُقُوعِ، وَالوُقُوعُ: السُّقُوْطُ وَالهَوِيُ، وَالْمَقْصُوْد مَوَاضِعُ غُرُوبِهَا، أو الوقُوعُ: الحُلُولُ فِي الْمَكَان)، (مَواقِع) کۆی (مَوْقِع)ە، ئەویش بە مانای شوێنی لێکەوتن، دێ، (وُقُوع) بە مانای بەربوونەوەو دابەزین، دێ، کەواتە: مەبەست پێی ئەو شوێنانەیە کە لێی ئاوا دەبن، چونکە (وُقُوع) بە مانای (الحُلُوْل فِي الْمَكَان) هاتنە شوێنێک، دێ.

(كَرِيمٌ ): (الرَّفِيْعُ النَّفِيْسُ فِي نَوْعِهِ، كَثِيْرُ الخَيْرِ وَالعَطَاء)، کە خوا قورئان بە کەریم پێناسە دەکات، (كَرِيْم): بریتیە لە بە هادار و بەرز لە جۆری خۆی، یاخود زۆر بەخشندەو سوودبەخش.

(مَّكْنُونٍ ): (مُشْتَقٌّ مِنَ الإكْتِنَانِ: هو الإسْتِتَار، مَحْجُوبٌ عَنِ الأنْظَار)، (مَكْنُون): داتاشراوە لە (إكْتِنَان)ەوە، (وَهُوَ الإسْتِتَار) واتە: پەنهان کردن، کە مەبەست پێی ئەوەیە لە نووسراوێک دایە لە چاوان دیار نیەو شێردراوەیەو، مەبەست پێی زانیاریی بێ سنووری خوایە، یاخود مەبەست پێی (اللَّوْحُ المَحْفُوظ)ە، کە دەشگونجێ مەبەست لە (لَوْحُ المَحْفُوْظ)یش و (كتاب مكنون)یش و (إمَامُ مُبِيْن) یش زانیاریی بێ سنووری خوا بێ.

(ٱلْمُطَهَّرُونَ ): (المَلائِكَة المُطَهَّرُون)، پاککراوەکان واتە: فریشتە پاککراوەکان، بەڵام (راغب) دەڵێ: (إنَّهُ لاَ يَبْلُغ حَقَائِق مَعْرِفَتِهِ، إلاَّ مَنْ طَهَّرَ نَفْسَهُ وَتَنَقَّى مِنْ دَرَنِ الفَسَاد)، دەفەرموێ: ﴿ لَّا يَمَسُّهُۥٓ إِلَّا ٱلْمُطَهَّرُونَ ﴾ واتە: ناگاتە ناسین و زانینی

www.alibapir.com



ڕاستییەکانی مەگەر کەسێک خۆی پاککردبێتەوەو خۆی خاوێن کردبێتەوە، لە چڵک و چەپەری خراپ و گوناح.

ئەوەش مانا مەجازییەکەیەتی.

(مُّدۡهِنُونَ): (الإِدْهَانُ: فِي الأَصْلِ مِنَ التَّدْهِيْنِ)، (إِدْهَان) لە بنچینەدا لە (تَدْهِيْن) چەور کردنەوە هاتوە، (وَلَكِن جُعِلَ عِبَارَةً عَنِ المُدَارَاةِ وَالمُلايَنَةِ وَتَرْكِ الجِدِّ، مُدْهِنُوْن، أَي: مُتَهَاوِنُون)، دوایی وشەی (إِدْهَان) بەکارهێنراوە بۆ وشەی ساچاندن و نەرمیی کێشان و وازهێنان لە شتی جیددیی، کەواتە: (مُدْهِنُوْن: أَي مُتَهَاوِنُون) واتە: کەمتەرخەمن و گوێ پێ نادەرن.

(ٱلۡحُلۡقُومَ): (الحَلْقُ: العضُو، المُجَوَّفُ، وَالجَمْعُ: حَلَاقِيْم)، (حلْق) قورگ یان قوڕ قوڕاگە، کە بە (حَلَاقِيْم) کۆدەکرێتەوە، قوڕگەکان، گەرووەکان.

(مَدِينِينَ): (أَي: مُجَازِيْن، أَو مَرْبُوبِيْن، أَو مَمْلُوكِيْن، أَو محَاسَبِيْن، أَو مَجْزِيين)، بە چەند وشەیەک مانا لێکداوەتەوە، واتە: ئەوانەی سزادەدرێن، یاخود ئەوانەی خاوەندارن، یان ئەوانەی ژێر دەستن، یان ئەوانەی لێپرسراون، یان ئەوانەی سزاو پاداشت دەدرێنەوە.

(فَرَوۡحٞ): (الرَّوْحُ: الرَّاحَةُ، وَالرَّوْحُ: الفَرَجْ، والرَّوْحُ: الرَّحْمَة) وشەی (رَوْح) هەم بە ئاسوودەیی و، هەم بە دەروو لێبکرانەوە، هەم بە بەزەیی، لێکدراوەتەوە، لە بنچینەدا وشەی (رَوْح) بە مانای هەناسەدانەو، مرۆڤ کاتێک هەناسە دەدات، هەوا هەڵدەمژێ و دەداتەوە، ئاسوودە دەبێ.

(رَيۡحَانٞ): (مَالَهُ رَائِحَةٌ، أَو الرَّيْحَان: الرِّزْق)، (رَيْحَان): ئەو گیایەیە کە هەموومان دەزانین، گیایەکی بۆنخۆشە، یاخود مەبەست پێی بژیوە.

(وَتَصۡلِيَةُ جَحِيمٍ): (أَصْلُ الصَّلِي: الإِيقَادُ بِالنَّارِ، صَلِيَ بِالنَّارِ وَبِكَذَا: بُلِيَ بِهَا، وَصَلَيْتُ الشَّاةَ: شَوَيْتُها)، وشەی (صَلِيَ) لە بنچینەدا بریتیە لە سووتاندن بە ئاگر،

www.alibapir.com



دەگوترێ: (صَلِيَ بِالنَّارِ وَبِكَذَا) واتە: پێی تاقیكرایەوە، دەگوترێ: (وَصَلَيْتُ الشَّاةَ) واتە: مەڕەكەم برژاند.

(حَقُّ ٱلْيَقِينِ): (الحَقُّ: الثَّابِتُ، وَاليَقِيْن: المَعْلُوم جَزْمَاً، الَّذِي لَا يَقْبَلُ التَّشْكِيْك)، (حَقّ اليَقِيْن)، (حَق) شتێكی چەسپاوە، (يَقِيْن)یش زانراوێكە كە مرۆڤ تێیدا دڵنیابێ و هیچ دوو دڵیی تێدا نەبێ.

هۆی هاتنە خوارەوەی ئایەتەكان

دەربارەی هۆی هاتنە خوارەوەی ئایەتەكانی: ﴿فَلَآ أُقْسِمُ بِمَوَٰقِعِ ٱلنُّجُومِ ﴿٧٥﴾ وَإِنَّهُۥ لَقَسَمٌ لَّوْ تَعْلَمُونَ عَظِيمٌ ﴿٧٦﴾ إِنَّهُۥ لَقُرْءَانٌ كَرِيمٌ ﴿٧٧﴾ فِى كِتَٰبٍ مَّكْنُونٍ ﴿٧٨﴾ لَّا يَمَسُّهُۥٓ إِلَّا ٱلْمُطَهَّرُونَ ﴿٧٩﴾ تَنزِيلٌ مِّن رَّبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿٨٠﴾ أَفَبِهَٰذَا ٱلْحَدِيثِ أَنتُم مُّدْهِنُونَ ﴿٨١﴾ وَتَجْعَلُونَ رِزْقَكُمْ أَنَّكُمْ تُكَذِّبُونَ ﴿٨٢﴾﴾، ئەم گێڕدراوەیە دێنین:

{عَن ابْنُ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا، قَالَ: مُطِرَ النَّاسُ عَلَى عَهْدِ النَّبِيِّ ﷺ فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: أَصْبَحَ مِنَ النَّاسِ شَاكِرٌ، وَمِنْهُمْ كَافِرٌ، الشاكرون قَالُوا: هَذِهِ رَحْمَةٌ وَضَعَهَا اللَّهُ، وَقَالَ بَعْضُهُمْ: لَقَدْ صَدَقَ نَوْءُ كَذَا وَكَذَا، فَنَزَلَتْ هَذِهِ الآيَةُ: ﴿فَلَآ أُقْسِمُ بِمَوَٰقِعِ ٱلنُّجُومِ ﴿٧٥﴾ وَإِنَّهُۥ لَقَسَمٌ لَّوْ تَعْلَمُونَ عَظِيمٌ ﴿٧٦﴾ إِنَّهُۥ لَقُرْءَانٌ كَرِيمٌ ﴿٧٧﴾ فِى كِتَٰبٍ مَّكْنُونٍ ﴿٧٨﴾ لَّا يَمَسُّهُۥٓ إِلَّا ٱلْمُطَهَّرُونَ ﴿٧٩﴾ تَنزِيلٌ مِّن رَّبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿٨٠﴾ أَفَبِهَٰذَا ٱلْحَدِيثِ أَنتُم مُّدْهِنُونَ ﴿٨١﴾ وَتَجْعَلُونَ رِزْقَكُمْ أَنَّكُمْ تُكَذِّبُونَ ﴿٨٢﴾﴾} (أخرجه مُسْلِم: ٧٣، والسيوطي في الدر المنثور ج٨، ص٢٩، عَنْ عَائِشَة رَضِيَ اللهُ عَنْهَا).

واتە: عەبدوڵڵای كوڕی عەبباس رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا دەڵێ: لە ڕۆژگاری پێغەمبەردا ﷺ خەڵك بارانیان بۆ باری، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: خەڵك هەندێكیان سوپاسگوزاربوون (لە بەرانبەر ئەو باران بارینەدا)و، هەندێكیشیان سپڵەبوون، ئەوانەی سوپاسگوزار بوون گوتیان: ئەمە بەزەیی خوایە، هەندێكیشیان گوتیان: بەپێی فڵان ئەستێرەو

فڵان شته، (باران باری) ئەوە قسەکە ڕاست دەرچوو (واتە: باران بارینەکەیان لە گۆڕانکاریی و لە کاری ئەستێرەو خڕۆکان زانی)، ئیدی لەو بارەوە ئەم ئایەتانە دابەزین.

وشەی: (**نَوْءُ: النَّجْمُ إِذَا مَالَ لِلْغُرُوبِ**) وەک (**المعجم الوسيط**)[1] دەڵێ: (**نَوْء**): بریتیە لە ئەستێرە کاتێک بەلای ئاوابووندا لادەدا، (**صَدَقَ نَوْءُ كَذَا وَكَذَا**) فڵان ئەستێرە ڕاستیکرد، دیارە کاتی خۆی وەک چۆن ئێستا کەشناسیی هەیە، کاتی خۆشی حیسابگر هەبوون، بەپێی سەرنجدانی ئاوو باو، سەرنجدانی ئەستێرەو خڕۆکەکان حیسابیان کردوون، هەڵبەتە خوا ﷻ هیچ شتێک ناکات لە دنیای ماددیی ئێمەدا، کە هۆکارێکی لە پشتەوە نەبێ، ئنجا چ هۆکارەکە بزانین و، چ نەیزانین، بەڵام لە پشت هۆکارەکانەوە، هۆکارساز هەیە، مەبەستی پێغەمبەریش ئەوە بووە کە ئەوانەی دەستی خواو سازاندنی خوا، بۆ هۆکارەکان نادیدە دەگرن، ئەوانە بە دڵنیایی سپڵەو ناسوپاسن بەرانبەر بە چاکەکانی خوا.




(١) ص٩٦١.

www.alibapir.com



## مانای گشتیی ئایەتەکان

بەڕێـــزان!

خوا بسم الله الرحمن الرحیم لە کۆتایی سوورەتی (**الواقعة**)دا دەفەرموێ: ﴿فَلَآ أُقۡسِمُ بِمَوَٰقِعِ ٱلنُّجُومِ﴾، ئـەم (**ف**)یـە بـۆ (**تفريـع**)ە، یـانی: بنیـات دەنرێتـەوە لەسـەر قسـەکانی ڕابـردوو، واتـە: ئـەو ڕاسـتییانەی ڕوونکرانـەوە بـەو شـێوەیەو، ئـەو نکوولّییـەی ئێـوە کردتـان و، ئـەو سپلّەییەی ئێـوە نواندتـان، بینا لەسـەر ئـەوە، ئـەوەی دەیلّێن، ڕاسـت نیـە، ئـەم (**لا**)یـە بـۆ لابردنـی قسـەیەکە بـە سیاق و سـەلیقە دەزانـرێ: ﴿أُقۡسِمُ بِمَوَٰقِعِ ٱلنُّجُومِ﴾، سـوێند دەخـۆم بـە شـوێنەکانی ئەسـتێرەکان، بـە سـوڕگەکانیان.

﴿وَإِنَّهُۥ لَقَسَمٞ لَّوۡ تَعۡلَمُونَ عَظِيمٌ﴾، ئـەوەش سـوێندێکە، ئەگـەر بزانـن، سـوێندێکی مەزنـە، دوایـی تیشـک دەخەینـە سـەر چەمکـی ئـەم ڕسـتە موبارەکـە کـە خـوا دەفەرمـوێ: سـوێند خـواردن بـە ڕێ و شـوێن و سـوڕگەی ئەسـتێرەکان، سـوێندێکی مەزنـە، ئەگـەر زانیارییتـان هەبـێ، ئنجـا ئەمـە سـوێندەکە، ئایـا سـوێند لەسـەر خوراوەکـە چییـە؟

﴿إِنَّهُۥ لَقُرۡءَانٞ كَرِيمٞ﴾، بـە دڵنیایـی ئـەوە (ئـەوەی موحەممـەد ﷺ بـە نـاوی فەرمایشـتی خـواوە بەسـەرتاندا دەخوێنێتـەوە) قوڕئانێکـی، (خوێندراوەیەکـی) پـڕ ڕێـزو حورمەتـە، خوێندراوەیەکـی زۆر سـوود بەخشـەو، زۆر سـەر بەخێـرە.

﴿فِي كِتَٰبٖ مَّكۡنُونٖ﴾، لـە نووسراوێکـی شـێردراوە دایـە، واتـە: وەنەبـێ موحەممـەد ﷺ نـە (**شَيَاطِيْن**) فێریـان کـرد بێ، نە قسـەی گیرفانی خـۆی بێ، نە بابایەکـی نەصرانیی فێـری کـرد بـێ، بەڵکو ئەسـڵەکەی لـە نووسراوێکی پەنهـان و شـێردراوەدایە.

﴿لَّا يَمَسُّهُۥٓ إِلَّا ٱلۡمُطَهَّرُونَ﴾، جگـە لـە زۆر پاککـراوەکان (کـە فریشـتەکانن) هیـچ کـەس دەسـتی نایگاتـێ، هیـچ کـەس توخنـی نەکەوتـوەو توخنـی ناکـەوێ،

www.alibapir.com


وەک دوایی باسی دەکەین ئەمە بۆ بەرپەرچدانەوەی هەندێک لە بیرۆکەی بێبڕوایەکانە، کە دەیانگوت: موحەممەد شەیتانەکان فێری قورئانی دەکەن، یان دەستی لێ وەشێنراوە، یان کاهینەو فاڵچییەو... هتد.

﴿ تَنزِيلٌ مِّن رَّبِّ ٱلْعَـٰلَمِينَ ﴾، دابەزێنراوە لەلایەن پەروەردگاری جیهانییانەوە.

﴿ أَفَبِهَـٰذَا ٱلْحَدِيثِ أَنتُم مُّدْهِنُونَ ﴾، ئنجا ئایا (ئەی بێبڕوایەکان!) ئێوە بەرانبەر بەم فەرمایشتە، کەمتەرخەمیی دەکەن! (**مُدْهِن**) واتە: ڕۆن تێدەر، لە (**دُهْن**)ەوە هاتوە، ئنجا ئەمە خوازراوەتەوە بۆ کەسێک کە لە شتێکدا کەمتەرخەمیی و نەرمکێشیی بکات، بە باری بڕوا پێنەهێنان و خۆ لێ دوورخستنەوەدا.

﴿ وَتَجْعَلُونَ رِزْقَكُمْ أَنَّكُمْ تُكَذِّبُونَ ﴾، لەم فەرمایشتە پڕ خێرو بەرەکەتەی خوادا، پشک و بەش و بژیوتان هەر ئەوەندەیە، کە پێی بێبڕوان؟ هەندێکی گوتوویانە: لە جیاتی سوپاسکردن، ئێوە دێن نکوڵییلێدەکەن و پێی بێبڕوان و بە درۆی دادەنێن؟ ئنجا یەکسەر خوا بسم الله الرحمن الرحيم ئەمە پەیوەست دەکاتەوە بەو چارەنووسەی هەر کامێک لە مرۆڤەکان، لە نێویشیاندا بێبڕوایەکان، چاوەڕێیانە کە بریتیە لە مردن.

﴿ فَلَوْلَآ إِذَا بَلَغَتِ ٱلْحُلْقُومَ ﴾، {مادام ئێوە ئاوا بێ منەتن، بەرانبەر بە هیدایەتی خواو کتێب و فەرمایشتی خوا} دەبوایە کاتێک کە دەگاتە گەروو، باس نەکراوە چی دەگاتە گەروو، بەڵام ڕاناوی مێینەی بۆ بەکارهێنراوە، هەر کام لە نەفس و ڕووحیش ڕاناوی مێینەیان بۆ بەکاردێ، مێینەی مەجازیی لە زمانی عەرەبییدا، ئنجا بە سیاق و سەلیقە دەزانرێ ئەوەی کە دەگاتە گەروو، دوایی کەس ناتوانێ بیگێڕێتەوە نێو جەستە، هەر ڕووحە، بۆیە: ﴿ فَلَوْلَآ إِذَا بَلَغَتِ ٱلْحُلْقُومَ ﴾، واتە: دەبوایە کاتێک کە ڕووح دەگاتە گەروو، یەکێک لە ئێوە دەمرێ.

﴿ وَأَنتُمْ حِينَئِذٍ تَنظُرُونَ ﴾، ئێوەش لەو کاتەدا تەماشا دەکەن و تێوەڕاماون.

﴿ وَنَحْنُ أَقْرَبُ إِلَيْهِ مِنكُمْ وَلَـٰكِن لَّا تُبْصِرُونَ ﴾، ئێمەش لە ئێوە لێی نزیکترین، بەڵام نابینن، مەبەستی فریشتەکانی خوای بەرزە، وەک دەفەرموێ: (**تَوَفَّتْهُ رُسُلُنَا وَهُمْ**

www.alibapir.com



لَا يُفَرِّطُون) الأنعام -٦١- ، واتە: ڕەوانەكراوەكانی ئێمە، نوێنەرەكانی ئێمە، كە ئەو كارەمان پێ سپاردوون، ڕووحەكەی وەردەگرن، بێ ئەوەی كەمتەرخەمیی بكەن، ئنجا لێرەدا (لَوْلَا) بۆ هاندانە، یانی: دەبووایە كاتێك كە ڕووحەكە دەگاتە گەروو، ئێوەش لەو كاتەدا تەماشای دەكەن و، ئێمە لە ئێوەی لێ نیزیكترین، بەڵام نایبینن، دەبووایە بیگێڕنەوە.

﴿ فَلَوْلَآ إِن كُنتُمْ غَيْرَ مَدِينِينَ ﴾، ئەم (لَوْلَا)یە دەگونجێ دووبارە كردنەوەبێ بۆ جەختكردنەوەی (لَوْلَا)ی یەكەم واتە: دەبووایە ئەگەر ئێوە ڕاست دەكەن، ملپێكەچكراو نین و سزا بەسەردا سەپێنراونین.

﴿ تَرْجِعُونَهَآ إِن كُنتُمْ صَٰدِقِينَ ﴾، ئەگەر ڕاست دەكەن هەر خۆتانن و، ئێوە لەبەر دەستی خوادا نین و ملكەچ نین بۆ خواو، بەر فەرمانی خوا نین، بیگێڕنەوە ئەگەر لە ڕاستانن، ڕووحەكە بگێڕنەوە بۆ نێو جەستەی و مەهێڵن لە گەرووی بچێتە دەرێ و ژیانی كۆتایی پێ بێ، ئنجا دوایی یەكسەر خوا بسم الله الرحمن الرحيم باسی سەرەنجامی ئەو كەسە دەكات كە ڕووحەكەی دەكێشرێ:

﴿ فَأَمَّآ إِن كَانَ مِنَ ٱلْمُقَرَّبِينَ ﴾ ئنجا ئەگەر ئەو كەسە، لەوانە بێ كە زۆر - لەخوا - نیزیكخراوە بووە، كە لە سەرەتای سووڕەتەكەدا بە (سابِقُون)یش پێناسەی كردن، ئەوانەی پێش خەڵك كەوتوون لە چاكانداو، لە ئەنجامی ئەوەدا خوا زۆر لە خۆی نیزیكی خستوونەوە، بە نیزیكییەك كە نیزیكی ڕێزو حورمەت لێگرتنە، ئەگەر لەوانەبێ:

﴿ فَرَوْحٌ وَرَيْحَانٌ وَجَنَّتُ نَعِيمٍ ﴾، واتە: شوێنەكەی (رَوْح)ەو (رَيْحَان) و (جَنَّة النَّعِيْم) ە، (رَوْح) بە مانای ئاسوودەیی و دەروو لێكرانەوە دێ، بە مانای فەڕەحنایی و شادمانیی دێ، (رَيْحَان)یش زۆربەی زانایان هەر بە مانای ئەو گیا بۆنخۆشەیان مانا كردوە، هەندێكیشیان گوتوویانە: (رَيْحَان) بژێوە، ﴿ وَجَنَّتُ نَعِيمٍ ﴾، باخێكی پڕ لە نازو نیعمەت.

www.alibapir.com


﴿ وَأَمَّآ إِن كَانَ مِنۡ أَصۡحَٰبِ ٱلۡيَمِينِ ﴾، بەڵام ئەگەر لە هاوەڵانی دەستە ڕاست بێ، کە نامەی کردەوەکانی بە دەستە ڕاست وەرگرتوە، یاخود لە لای ڕاست ڕاگیراون، لە مەیدانی کۆکرانەوەو لێپرسرانەوەدا.

﴿ فَسَلَٰمٞ لَّكَ مِنۡ أَصۡحَٰبِ ٱلۡيَمِينِ ﴾، سەلام لە تۆ بێ، لەلایەن هاوەڵانی دەستە ڕاستەوە، واتە: ئەوان بۆ خۆیان سەلامەتن و سڵاویش بۆ تۆ دەنێرن ئەی موحەممەد! یاخود تۆ دڵنیابە کە ئەوان لە سەلامەتیی و خێرو خۆشیی دان.

﴿ وَأَمَّآ إِن كَانَ مِنَ ٱلۡمُكَذِّبِينَ ٱلضَّآلِّينَ ﴾، بەڵام ئەگەر لە بەدرۆدانەرە گومڕایەکان بێ، ئەو کەسەی ڕووحەکەی کێشراوە.

﴿ فَنُزُلٞ مِّنۡ حَمِيمٖ ﴾، میوانداریی دەکرێ لە نێو ئاوی کوڵاودا، (**نُزُل**) ئەوەیە کە بۆ میوان دادەنرێ، کەواتە: ئەو وەک میوانێک میوانداریی دەکرێ، لە نێو ئاوی کوڵاوو داغ دا.

﴿ وَتَصۡلِيَةُ جَحِيمٍ ﴾، هەر بەوەندەش وازی لێ ناهێنرێ، بەڵکو دەشخرێتە نێو کڵپەی ئاگری دۆزەخەوە، چونکە وشەی (**تَصْلِيَة: تَفْعِيْلَة لصَلاَّهُ**)، واتە: خستیانە نێو ئاگرەوە، کە (**صَلِي**)یش هەر چوونە نێو ئاگرێکی گشتیی نیە، بەڵکو چوونە نێو ئاگرێکی تایبەتییە، دەگوترێ: (**صَلَيْتُ الشَّاةَ**) واتە: مەڕەکەم برژاند، (**شَاةٌ مَصْلِيَّة**) کە بە عەرەبیی (**مكذُوُف**)ی پێ دەڵێن، ئەوەیە کە لە هەر چوار دەور ڕا ئاگرەکەی بگاتێ و بیبرژێنێ.

﴿ إِنَّ هَٰذَا لَهُوَ حَقُّ ٱلۡيَقِينِ ﴾، ئەوەی باسکرا، چەسپاوی جێی دڵنیاییە، یاخود ئەم قورئانە چەسپاوە لەلایەن خواوەو، جێی دڵنیاییشەو دوو دڵیی تێدانیە.

﴿ فَسَبِّحۡ بِٱسۡمِ رَبِّكَ ٱلۡعَظِيمِ ﴾، دەجا تۆ ناوی پەروەردگاری مەزنت بە پاک بگرەو، بە دووری بگرە لە هەر کەم و کوڕیی و لەکەو پەڵەیەک.

www.alibapir.com



مەسەلە گرنگەکان

## مەسەلەی یەکەم:

**سوێند خواردنی خوای بەرزو مەزن بە ڕێ و شوێنی ئەستێران، کە بە هۆی زانیارییەوە مەزنیی ئەو سوێندە دەزانرێ، لەسەر ئەوە، کە قورئانی بەڕێزو پێز لە زانیاریی پەنهانی خوادایەو، جگە لە فریشتە پاک و چاکەکان، دەستی ناگەیەنێ و دەستیان نەگەیاندوَتێ و، لەلایەن پەروەردگاری جیهانییانەوە دابەزێنراوە، پاشان سەرکۆنەکردنی کافرەکان، کە ئایا هەموو پشک و بەشیان تێیدا بریتییە لە بەدرۆدانان و نکوولْییلێکردنی؟**

خوا دەفەرموێ: ﴿فَلَآ أُقۡسِمُ بِمَوَٰقِعِ ٱلنُّجُومِ ﴿٧٥﴾ وَإِنَّهُۥ لَقَسَمٞ لَّوۡ تَعۡلَمُونَ عَظِيمٌ ﴿٧٦﴾ إِنَّهُۥ لَقُرۡءَانٞ كَرِيمٞ ﴿٧٧﴾ فِي كِتَٰبٖ مَّكۡنُونٖ ﴿٧٨﴾ لَّا يَمَسُّهُۥٓ إِلَّا ٱلۡمُطَهَّرُونَ ﴿٧٩﴾ تَنزِيلٞ مِّن رَّبِّ ٱلۡعَٰلَمِينَ ﴿٨٠﴾ أَفَبِهَٰذَا ٱلۡحَدِيثِ أَنتُم مُّدۡهِنُونَ ﴿٨١﴾ وَتَجۡعَلُونَ رِزۡقَكُمۡ أَنَّكُمۡ تُكَذِّبُونَ ﴿٨٢﴾﴾.

## شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە هەشت بڕگەدا:

**١)-** ﴿فَلَآ أُقۡسِمُ بِمَوَٰقِعِ ٱلنُّجُومِ﴾، وانیە، سوێند دەخۆم بە سوڕگەو ڕێ و شوێنەکانی ئەستێرەکان، وەک دوایی باسی دەکەین، (لَا) لێرەدا بۆ لابردنی قسەیەکە لە سیاق دەفامرێتەوە، یانی: قسەی بێبڕوایەکان وەک دەڵێن وانیە، کە قورئان موحەممەد ﷺ خۆی داینابێ، یان (شَيَاطِيْن) وەسوەسەیان بۆ کرد بێ، یان کاهین بێ و هەڵیبەستبێ، نەخێر! ﴿أُقۡسِمُ بِمَوَٰقِعِ ٱلنُّجُومِ﴾، سوێند دەخۆم بە شوێنەکانی ئەستێرەکان، بە سوڕگەکانیان، خوێنراویشەتەوە: **(بِموقع النُّجُوم)** شوێنی ئەستێرەکان.

www.alibapir.com



زانایان بە چەند شێوەیەک تەعبیریان کردوە لە مانای (مَواقِع) بۆ وێنە:

أ- **(القرطبي)** دەڵێ: **(مَسَاقِطُهَا وَمَغَارِبِهَا)**، واتە: ئەو شوێنانەی ئەستێرەکانی دەکەونێ و لێیان ئاوادەبن.

ب- هەندێکی دیکە گوتوویانە: **(مَنَازِلُهَا)** واتە: ئەو شوێنانەی ئەستێرەکان تێیان دا دێن و دەچن.

ج- هەندێکیش گوتوویانە: **(أَفْلَاكُهَا)** واتە: سوڕگەکانیان، **(مَواقِع)**یش کۆی **(مَوْقِع)**ەو بە مانای **(مَحلّ)** دێ، واتە: شوێن.

٢)- ﴿ وَإِنَّهُۥ لَقَسَمٌ لَّوْ تَعْلَمُونَ عَظِيمٌ ﴾، ئەمە سوێندێکە ئەگەر بزانن (سوێندێکی) مەزنە، کە دەفەرموێ: ﴿ لَّوْ تَعْلَمُونَ ﴾، ئەمە بە دوو شێوە مانای لێک دەدرێتەوە:

أ- **(مَفْعُول تَعْلَمُونَ مَحْذُوفٌ)** بەرکاری **(تعلمون)** قرتێنراوە، واتە: **(لَوْ تَعْلَمُونَ عَظَمَتَهُ فَهُوَ عَظِيْم)** ئەگەر ئێوە مەزنیی ئەم سوێندەتان زانیبایە، دەتانزانی کە سوێندێکی مەزنە.

ب- یاخود **(تَعْلَمُونَ)** بە مانای (لازم)ەکەی هاتوە، واتە: **(لَوْ كَانَ لَكُمْ عِلْمٌ)** ئەگەر زانیارییتان هەبووایە، دەتانزانی کە ئەمە سوێندێکی مەزنە، ئەو مانایەی دووەمیان ڕێک و ڕاستتر دێتە بەرچاو.

هەڵبەتە (ف)ی (فَلَا) بۆ بنیاتنانە لەسەر پێشوو **(للتفْرِيغ عَلَى مَا سَبَق)** واتە: **(لَيْس كَمَا تَقُولُونَ، أقْسِمُ بِمَوَاقِعِ النُّجُوم)**، وەک ئێوە دەڵێن، وانیە، سوێند دەخۆم بە ڕێ و شوێنەکانی ئەستێرەکان، دوایی هەندێک لە زانایانیش گوتوویانە: **(لا)** بۆ لابردنی سوێندەکەیە واتە: **(لَا أُقْسِم)** سوێند ناخۆم، ئنجا خوا دەفەرموێ: ﴿ وَإِنَّهُۥ لَقَسَمٌ لَّوْ تَعْلَمُونَ عَظِيمٌ ﴾، ئەگەر بزانن ئەوە سوێندێکی مەزنە، کەواتە: ئەو ڕایە ڕاست نیە، چونکە خوا فەرموویەتی: سوێندێکی مەزنە! هەندێکی دیکە گوتوویانە: ئەم (لا)یە فەتحەیەو تێر **(إشْبَاع)** کراوەو واتە: **(فَلَأُقْسِمُ بِمَوَاقِعُ النُّجُوم)**، یانی: ئنجا

www.alibapir.com


بـە جەختکردنـەوە سـوێند بـە ڕێ و شـوێنی ئەسـتێرەکان دەخـۆم، ڕای ڕاسـتیش هـەر ئەوەیـە کـە (لا) بـۆ لابـردنی قسـەیەکە لـە سیاق دەفامرێتـەوە، کـە هەڵەیـەو پێویسـت بـووە بـەر پـەرچ بدرێتـەوە، دواییـش زیاتـر تیشـکی دەخەینـە سـەر.

**٣)-** ﴿إِنَّهُۥ لَقُرْءَانٌ كَرِيمٌ﴾، بە دڵنیایی ئەمە قوڕئانێکی کەریمە، قوڕئان بە مانای خوێنراوە دێ، چونکە جار لە دوای جار دەخوێندرێتەوە، (**الكَرِيْمْ: النَّفِيْسُ الرَّفِيْعُ فِي نَوْعِهِ**)، (**كَرِيم**): هەر شتێکی زۆر بە نرخ و نایابە لە جۆری خۆی، هەروەها (**كَرِيم**) بە مانای زۆر سوودبەخش و سەر بەخێر، هەروەها بە مانای بەڕێزو حورمەت و، بە مانای بەهێزو پێز، بە هەموو ئەو واتایانە دێ.

**٤)-** ﴿فِي كِتَٰبٍ مَّكْنُونٍ﴾ [قوڕئان لە بنچینەدا] لە نووسراوێکی پەنهان دایە، (**كِتَابٍ مَسْتُور**)، کە مەبەست پێی زانیاریی بێ سەرەتای خوایە، دەشگونجێ مەبەست لە: ﴿فِي كِتَٰبٍ مَّكْنُونٍ﴾، هەرئەوە بێ کە دەفەرموێ: (**فِي لَوْحٍ مَحْفُوظ**) لە تەختێکی پارێزراو دایە، دەشگونجێ هەر کام لە: (**لَوْح محْفُوظ**)و (**كِتَاب مَكْنُون**) و (**إمام مبين**) تەعبیر بن بۆ زانیاریی بێ سنوور و زانیاریی ڕەهای خوا، خوا بەپێی عەقڵی ئێمە ئێمەی دەدوێنێ، ئێمە شتێک ئەگەر بمانەوێ لێمان تێک نەچێ و لێمان تێکەڵ نەبێ، دەینووسین، وەک گوتراوە: (**قَيِّدوا العَلْمَ بِالكِتَابة**)، ئنجا زانیارییەکانی خواش وەک نووسرابن، بەو شێوەیەن و لێی تێک ناچن.

هەڵبەتە خوا ﷻ پێویستیی بە نووسین نیە، بۆ ئەوەی زانراوەکانی لێ تێک نەچـن، بـەڵام ویسـتوویەتی ئێمـە تێبگەیەنـێ، دەشـگونجێ (**لَـوْح مَحْفُـوظ**) هەبـێ، کـە لێـرە بـە (**كِتَـاب مَكْنُـون**) تەعبیـری لێـداوەو، لـە شـوێنی دیکـە بـە (**إمَـامُ مُبِـيْن**) دەگونجـێ مەخلووقێکـی خـوا هەبـێ، خـوا هەمـوو زانیارییـەکانی خـۆی تێـدا تۆمـار کـرد بـن.

**٥)-** ﴿لَّا يَمَسُّهُۥٓ إِلَّا ٱلْمُطَهَّرُونَ﴾، تەنیا پاککراوەکان دەستی لێ دەدەن، (**مُطَهَّرُون**) بە دوو جۆری دیکەش خوێندراوەتەوە: أ- (**المُطْهَرُون**) پاککراوان، بەبێ گیرە (شَدَّة)،

www.alibapir.com


ب- هەروەها (**المُطَهَّرُون**) واتە: خۆ پاككەرەوەكان، ئاواش هەر خوێندراوەتەوە، كە دەفەرمویٚ: (**لَا يَمَسُّهُ**)، (**مَسّ**) واتە: دەست گەیاندن، بەڵام لێرەدا مەبەست لە دەست گەیاندن یانی: لە كاتێكدا ئەو فەرمایشتە دەگوترێ، ئەوان دەستكاریی بكەن و دەستی بگەیەننێ و دەستی تێوەر بدەن.

٦)- ﴿ تَنزِيلٌ مِّن رَّبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴾، دابەزێنراوە لە پەروەردگاری جیهانییانەوە، (**تَنْزِيْلٌ**) خوێندراویشەتەوە: (**تَنْزِيْلاً**) واتە: بە (رفع)یش خوێنراوەتەوەو بە (نصب)یش، واتە: گەیشتنی ئەم قورئانە بە ئێوە، بە دابەزاندنی لەلایەن پەروەردگاری جیهانییانەوە لە میانی فریشتە پاكەكان دا، كەواتە: بزانن سەرچاوەكەی كوێیە و چۆنە؟!

٧)- ﴿ أَفَبِهَٰذَا ٱلْحَدِيثِ أَنتُم مُّدْهِنُونَ ﴾، ئایا ئێوە بەم قسەیە نەرمكێشیی و كەمتەرخەمیی دەكەن؟ (**إدْهَان**) وەك پێشتر گوتمان: لە (**دهن**)ەوە هاتوە، واتە: ڕۆن، (**إدْهَان**)یش: ڕۆن تێدان و چەور كردن، واتە: ئایا ئێوە بەرانبەر بەم قورئانە كەمتەرخەمیی دەكەن، وەك چۆن شتێك چەور دەكرێ و نەرم دەكرێ، لە جیاتی توندو پەیتیی نەرمكێشیی دەكەن، بۆ ئەوانەی كە پێی بێبڕوان، ئێوەش لەبەر وان بێبڕوایی پێشاندەن، یاخود مەبەست لە (**تُدْهِنُون: أي تُكَذِّبُون**) واتە: پێی بێبڕوان، یان تێیدا كەمتەرخەمن.

٨)- ﴿ وَتَجْعَلُونَ رِزْقَكُمْ أَنَّكُمْ تُكَذِّبُونَ ﴾، پشك و بەشی خۆتان، بژیوی خۆتان لەم قورئانەدا، دەگێڕن بە بە درۆدانان و نكووڵییلێكردنی؟ واتە: پشك و بەشی خۆتان لەم قورئانە، كە هەمووی خێرو نوورو بەرەكەتە، هەموو پشك و بەشەكەتان تێیداو، هەموو بەهرە وەرگرتنەكەتان تێیدا، ئەوەیە كە پێی بێبڕوان و، بە درۆی دادەنێن، نكووڵییلێدەكەن

(**الطبري**) ئاوا مانای ئەم ڕستە قورئانییە دەكات: (**أَفَبِهَذَا الْقُرْآنِ الَّذِي أَنبَأْتُكُمْ خَبَرَهُ، وَقَصَصْتُ عَلَيْكُمْ أَمْرَهُ، أَيُّهَا النَّاسُ! أَنْتُمْ تُلِينُونَ الْقَوْلَ لِلْمُكَذِّبِينَ بِهِ، مُمَالَأَةً مِنْكُمْ لَهُمْ عَلَى التَّكْذِيبِ بِهِ وَالْكُفْرِ بِه**)[1]. واتە: ئێوە ئەی خەڵكینە! ئەم قورئانەی

---

(١) جامع البيان: ج٢٧، ص٢١٤.

www.alibapir.com



کـە هەواڵەکەیتانـم پێـداو بەسـەرهاتەکەیتانم بـۆ خوێندنـەوە، قسـەی نـەرم دەکـەن، لەگـەڵ ئەوانـەدا کـە پێـی بێبـڕوان، وەک لەگەڵـدا ڕۆیشـتن و بـە قسـەکردنی ئێـوە بـۆ ئـەوان، لەسـەر پـێ بێبڕوابـوونی و بـە درۆ دانـانی؟

هەڵبەتـە پرسـیارکردنەکە پرسـیارکردنی سەرزەنشـتکارانە و سـەرکۆنەکانەکارانەیە: (**الإسْـتِفْهَام للتَوْبِيْـخ والتبكيـت**).



www.alibapir.com


## کورتە باسێک لە چوار سەرنج دا

**سەرنجی یەکەم:** کە دەفەرموێ: ﴿فَلَآ أُقۡسِمُ بِمَوَٰقِعِ ٱلنُّجُومِ﴾، وەک گوتمان هەندێک لە زانایان گوتوویانە: واتە: سوێند ناخۆم بەڕێ و شوێنی ئەستێرەکان، (لا)یەکە بۆ لابردنە، هەندێکیش گوتوویانە: ﴿فَلَآ أُقۡسِمُ بِمَوَٰقِعِ ٱلنُّجُومِ﴾، ئەسڵەکەی (فَلَأُقسِمُ) بەڵام فەتحەکە تێر (إشْبَاع) کراوەو کراوە بە ئەلیف! بەڵام وەک جاری دیکەش هەر باسمانکردوە: ئەگەر سەرنجی ئایەتەکان بدەین، زۆر جوان دەزانین کە (لا) هەر بۆ لابردنەو لە شوێنی خۆیەتی، بەڵام پەیوەندیی بە لابردنی سوێندەکەوە نیە، چونکە خوا ﷻ دەفەرموێ: ئەمە سوێندێکی مەزنە، ئنجا مادام سوێندێکی مەزن بێ، دیارە خوا سوێندەکەی خواردوە، بەڵکو مەبەست پێی لابردنی قسەیەکی پێشترە، هی بێبڕوایەکان کە کردوویانەو، بە سیاق و سەلیقە دەزانرێ، ئایا ئەو قسەیەی بە سیاق و سەلیقە دەزانرێ چییە؟

ئەوەیە کە ئەوان گوتوویانە: موحەممەد کاهینەو، شەیتانەکان فێری قورئانی دەکەن، یان گوتوویانە: موحەممەد جادووگەرەو ئەوەی دەیڵێ بە یارمەتیی شەیتانەکانە، یان گوتوویانە: موحەممەد شاعیرەو خۆی قورئانی بێژتوە، یان گوتوویانە: شێتەو وڕێنە دەکات، یان گوتوویانە: هەڵیبەستووە بە ناوی خواوە، خواش دەفەرموێ: (فَلَا) ئەو قسانە هیچیان وانین، ﴿أُقۡسِمُ بِمَوَٰقِعِ ٱلنُّجُومِ ٧٥﴾، سوێند دەخۆم بە شوێنەکانی ئەستێرەکان، بە سوڕگەکانیان و جێ و ڕێیەکانیان، ئنجا وەنەبێ ئەوە بەس لێرەدا هاتبێ، بەڵکو لە سووڕەتی (القیامة)شدا هاتوە: ﴿لَآ أُقۡسِمُ بِيَوۡمِ ٱلۡقِيَٰمَةِ ١ وَلَآ أُقۡسِمُ بِٱلنَّفۡسِ ٱللَّوَّامَةِ ٢﴾، لەوێش دا دیسان بە هەمان شێوە، چونکە ئایا خوا سوێند ناخوات بە ڕۆژی قیامەت؟ ئایا سوێند ناخوات بەو کەسەی سەرکۆنەی خۆی دەکات؟ بەڵکو واتە: وانیە (وەک ئێوە دەڵێن)

www.alibapir.com


﴿أُقْسِمُ بِيَوْمِ ٱلْقِيَٰمَةِ﴾، سـوێند دەخـۆم بـە قیامـەت و بـە هەڵسـانەوەو، وانیـە (وەک ئێـوە دەڵێـن) سـوێند دەخـۆم بـەو کەسـەی سـەرکۆنەی خـۆی دەکات.

هەروەهـا لـە سـوورەتی (**البلـد**)دا: ﴿لَآ أُقْسِمُ بِهَٰذَا ٱلْبَلَدِ ۝١﴾ یـانی: وانیـە (وەک ئێـوە دەڵێـن) سـوێند دەخـۆم بـەم وڵاتـە بـەم نشـتیمانە، کـە مەبەسـت پێـی (**البلـد الحرام**)ە، بۆچی؟ چونکە خوا ﷽ لە سوورەتی (**التین**)دا سوێندی پێ خواردوە، ئـەدی چـۆن لـەوێ دەفەرمـوێ: سـوێندی پـێ ناخـۆم؟ ﴿وَٱلتِّينِ وَٱلزَّيْتُونِ ۝١ وَطُورِ سِينِينَ ۝٢ وَهَٰذَا ٱلْبَلَدِ ٱلْأَمِينِ ۝٣﴾**التین**، سـوێند بـە هەنجیـرو زەیتـوون و بـە کێوی (سَـيْنَاء) و، بـەم وڵاتـە پـڕ هێمنیـی و ئاساییشـە، کەواتـە: خـوا سـوێندی خـواردوە بـەو وڵاتـە، ئنجا لـەوێ کـە بفەرمـوێ: سـوێندی پـێ ناخـۆم، ئـەوە تێـک دەگیرێـن، کەواتـە: (**لا**) بـۆ لابـردنی قسـەیەکە کـە پێشـتر کـراوە.

**سـەرنجی دووەم:** کـە دەفەرمـوێ: ﴿فَلَآ أُقْسِمُ بِمَوَٰقِعِ ٱلنُّجُومِ ۝٧٥ وَإِنَّهُۥ لَقَسَمٌ لَّوْ تَعْلَمُونَ عَظِيمٌ ۝٧٦﴾**الواقعة**، نەخێـر، سـوێند دەخـۆم بـە شـوێنەکانی ئەسـتێرەکان و، ئەگـەر بشـزانن ئەمـە سـوێندێکی مەزنـە.

ئێمـە لـە چەنـد شـوێنێک دا، بـاسی ئەسـتێرەکان و کەهکەشـانەکانمان کـردوەو، ئـەو وردەکارییـەی خـوای کارزان و زانـاو توانـا ڕەچـاوی کـردوە لـە دروسـتکردنی هەمـوو شـتێکدا، بـە تایبەتیـی و، گەردووندا بەگشـتیی باسـمانکردوە، بـەڵام لێـرەش دا چەنـد ئاماژەیەکـی خێـرا بـە گـەردوون دەکەیـن، چونکـە ئێمـە لـە سـوورەتی (**فصلـت**)دا بـاسی دروسـتبوونی گەردوونمـان کـردوەو، لـە سـوورەتی (**الرحمن**)یـش دا لەوبـارەوە باسـێکمان کـرد، لـە تەفسـیری ئـەوەدا کـە خـوا دەفەرمـوێ: ﴿وَٱلسَّمَآءَ رَفَعَهَا وَوَضَعَ ٱلْمِيزَانَ ۝٧﴾**الرحمـن**، پێـش ویـش دەفەرمـوێ: ﴿ٱلشَّمْسُ وَٱلْقَمَرُ بِحُسْبَانٍ ۝٥﴾**الرحمـن**، بۆیـە لێـرەد بـە چەنـد ئاماژەیەکـی خێـرا، واز دێنیـن:

**١-** زانایانی گەردووناس نوێترین بیردۆزەیان لە بارەی ژمارەی کەهکەشانەکانی گەردوونەوە ئەوەیە، کە ژمارەیان دوو تریلیۆن (٢،٠٠٠،٠٠٠،٠٠٠،٠٠٠) کەهکەشانە، واتە: دوو هەزار ملیار کەهکەشان لە گەردووندا هەیە.

www.alibapir.com



٢- هەر کەهکەشانێک نیزیکەی یەک تریلیۆن (١,٠٠٠,٠٠٠,٠٠٠,٠٠٠) ئەستێرەی تێدایە، کەهکەشانەکەی ئێمە کە خۆری ئێمە، یەکێکە لە ئەستێرەکانی، دەوری یەک تریلیۆن واتە: یەک هەزارملیار ئەستێرەی تێدایە.

٣- پانتایی گەردوون زۆر زۆر فراوانە، کە دەکاتە: چوار پۆینت چوار جارانی دە توان بیست و سێ (٤,٤×$١٠^{٢٣}$) کیلۆمەتر، پێشتریش گوتوومانە: لێرەش دووبارەی دەکەینەوە چۆن ئەوە دەزانین؟ زانایان دەڵێن: تەمەنی گەردوون سێزدە ملیارو هەشت سەد ملیۆن (١٣,٨٠٠,٠٠٠,٠٠٠) ساڵە، ئنجا ئێمە بۆ ئەوەی بزانین تیرەی گەردوون چەند کیلۆمەترە، ئەمسەر بۆ ئەو سەری گەردوون، ئەوەندەی کە تاکو ئێستا هاتۆتە بەرچاوی دووربین و تەلیسکۆبەکان؟ دەبێ پێشێ بێنین:

١- تیشک کە لە چرکەیەکدا سێسەد هەزار (٣٠٠٠٠٠)کم دەبڕێ، ئەم (٣٠٠٠٠٠) جارانی شەست (٦٠) بکەین بۆ زانینی خێرایی تێشک لە خولەکێکدا، چونکە خولەکێک شەست چرکەیە: (١٨,٠٠٠,٠٠٠=٣٠٠٠٠٠×٦٠) هەژدە ملیۆن کیلۆمەتر لە خولەکێکدا تیشک دەیبڕێ.

٢- بۆ ئەوەی بزانین تێشک لە سەعاتێکدا چەند کیلۆمەتر دەبڕێ؟ (١٨,٠٠٠,٠٠٠) هەژدە ملیۆن جارانی شەست (٦٠) دەکەین: (١,٠٨٠,٠٠٠,٠٠٠=١٨٠٠٠٠٠٠×٦٠) ملیارێک و هەشتا ملیۆن کیلۆمەتر لە سەعاتێکدا.

٣- جارێکی دیکە، بۆ ئەوەی بزانین لە شەوو ڕۆژێکدا چەندە؟ ملیارێک و هەشتا ملیۆن (١,٠٨٠,٠٠٠,٠٠٠) کیلۆمەتر جارانی بیست و چوار (٢٤) دەکەین، ژمارەی سەعاتەکانی شەو و ڕۆژ: (٢٥,٩٢٠,٠٠٠٠٠٠=١,٠٨,٠٠٠٠٠٠×٢٤) دەکاتە: بیست و پێنج ملیارو نۆ سەدو بیست ملیۆن کیلۆمەتر لە شەو ڕۆژێکدا.

٤- ئنجا بۆ ئەوەی بزانین لە ساڵێکدا تیشک چەند دەبڕێ؟ دێنین بیست و پێنج ملیارو نۆسەدو بیست ملیۆن (٢٥,٩٢٠,٠٠٠,٠٠) جارانی سێ سەدو (٣٦٥) دەکەین: (٩,٤٦٠,٥٢٨,٠٠٠٠٠٠=٢٥,٩٢٠,٠٠٠٠٠×٣٦٥) نۆ تریلیۆن و چوارسەدو شەست ملیارو

www.alibapir.com


پێنجسەدو بیست و هەشت ملیۆن لە ساڵێکدا.

٥- ئنجا تەمەنی گەردوون جارانی ئەو ماوەیە دەکەین کە تیشک لە ساڵێکدا دەیبڕێ[1]، واتە: سێزدە ملیارو هەشتسەد ملیۆن، جارانی نۆ تریلیۆن و چوار سەدو شەست ملیارو پێنجسەدو بیست و هەشت ملیۆن (١٣,٨٠٠,٠٠٠,٠٠٠×٩٤٦٠٥٢٨٠٠٠٠٠٠=٨,٨×١٠^٢٦)م، هەشت پۆینت هەشت جارانی دە بیست و شەش مەتر، ئەگەر بیکەیتە کیلۆمەتر واتە: چوار پۆینت چوار جارانی دە توان بیست و سێ(٤,٤×١٠^٢٣) کیلۆمەتر واتە: ژمارەی چل و چوار بیست و سێ سفری لە پێشەوەبن!

ئـەوە بـە نسـبەت ڕێ و شـوێنی ئەسـتێرەکانەوە، کـە خـوا دەفەرمـوێ: ئەگـەر زانیارییتـان هەبـێ، دەزانـن کـە سـوێند پێخواردنیـان سـوێندێکی چەنـدە مەزنـە، چونکە زانیاریـی تاکـو زیاتـر بـەرەو پێشـەوە بچـێ، زیاتـر لـە فەرمایشـتی خـوا تێـدەگات.

**سـەرنجی سـێیەم:** کـە دەفەرمـوێ: ﴿إِنَّهُۥ لَقُرۡءَانٞ كَرِيمٞ﴾، بـە دڵنیایـی ئەمـە خوێندراوەیەکی بەڕێزەو، بە پێزەو، بە حورمەتە، لێرەدا خوا بسم الله الرحمن الرحيم بە چوار شت پێناسـەی قورئـانی کـردوە:

١- ﴿إِنَّهُۥ لَقُرۡءَانٞ كَرِيمٞ﴾، قورئانێکی بەڕێزو بەپێزو بەخشندەو سوودبەخشە.

٢- ﴿فِي كِتَٰبٖ مَّكۡنُونٖ﴾، لە نووسراوێکی شێردراوەو پەنهان دایە.

٣- ﴿لَّا يَمَسُّهُۥٓ إِلَّا ٱلۡمُطَهَّرُونَ﴾، تەنیا پاککراوەکان واتە: فریشتە پاک و بێ گوناحەکان، دەستی دەگەیەننێ، بیهێنن بۆ موحەممەد ﷺ.

٤- ﴿تَنزِيلٞ مِّن رَّبِّ ٱلۡعَٰلَمِينَ﴾، دابەزێنراوە لە پەروەردگاری جیهانیانەوە.

**سـەرنجی چـوارەم:** کـە دەفەرمـوێ: ﴿لَّا يَمَسُّهُۥٓ إِلَّا ٱلۡمُطَهَّرُونَ﴾، ئەمـە بێگومـان هیـچ پەیوەندیـی بـە دەسـت لێـدانی قورئانـەوە نیـە، کـە ئایا دروسـتە بەبـێ دەسـت نوێژیـی، چ بـێ دەسـت نوێژیـی گچکـە، چ هـی گـەورە، دەسـتی لـێ بـدەی؟

(١) یانـی: وا مەزەنـدە کـراوە کـە گـەردوون لەکاتی دەسـتپێك و سـەرەتایەوە بەئەنـدازەی خێرایی تیشـك، لـە فـراوان بـوون و لێککشـان دایە.

www.alibapir.com



بەڵکو بەپێی ئەم سیاقە، ئەگەر سەرنجی بدەین دەزانین کە مەبەست پێی بەرپەرچدانەوەی قسەو تۆمەتی بێبڕوایانە، وەک لە جێی دیکەش دا، خوا ﷻ باسی ئەو بابەتەی کردوە، بۆ وێنە:

**أ-** لە سوورەتی **(الشعراء)**دا، دەفەرموێ: ﴿وَمَا تَنَزَّلَتْ بِهِ ٱلشَّيَـٰطِينُ ﴿٢١٠﴾ وَمَا يَنۢبَغِى لَهُمْ وَمَا يَسْتَطِيعُونَ ﴿٢١١﴾ إِنَّهُمْ عَنِ ٱلسَّمْعِ لَمَعْزُولُونَ ﴿٢١٢﴾﴾، واتە: (قورئان) شەیتانەکان دایاننەبەزاندوەو، بۆیان ناگونجێ و ناشتوانن، چونکە ئەوان لە گوێگرتن کەنارگیر کراون.

واتە: شەتیانەکان بواریان نیە گوێ لە قسەی فریشتان بگرن، کاتێک خوا ﷻ وەحیی دەکات بۆ فریشتەکان، فریشتەکانیش دەیهێنن بۆ موحەممەد ﷺ.

**ب-** هەروەها هەر لە سوورەتی **(الشعراء)**دا دەفەرموێ: ﴿هَلْ أُنَبِّئُكُمْ عَلَىٰ مَن تَنَزَّلُ ٱلشَّيَـٰطِينُ ﴿٢٢١﴾ تَنَزَّلُ عَلَىٰ كُلِّ أَفَّاكٍ أَثِيمٍ ﴿٢٢٢﴾ يُلْقُونَ ٱلسَّمْعَ وَأَكْثَرُهُمْ كَـٰذِبُونَ ﴿٢٢٣﴾﴾، واتە: ئایا هەواڵتان پێ بدەم شەیتانەکان دادەبەزنە سەر کێ؟ دادەبەزنە سەر، هەر درۆ هەڵبەستەرێکی گوناهبار، ئەو (درۆ هەڵبەستەر)انە لە گوناهەکان گوێ هەڵدەخەن، زۆربەشیان درۆ دەکەن.

بەڵێ جار جار شەیتانەکان ڕەنگە زانیارییەکیان، هەواڵێکیان بۆ بێنن، بەڵام زۆربەشیان درۆ دەکەن، بۆ کڵاو لەسەری خەڵک نان، وەک پێشتر باسمانکردوە، کەواتە: بە تەماشاکردنی سیاقەکە دەزانین کە بەڵگە هێنانەوە بەم ئایەتە موبارەکە، لەسەر ئەوەی دروست نەبێ، بەبێ دەستنوێژ، دەست لە قورئان بدرێ، لە جێی خۆیدا نیە، هەروەها ئەو کاتە قورئان لە دوو توێی موصحەفدا نەبووە، چونکە ئەم سوورەتە موبارەکە لە مەککە دابەزیوەو، ئەوکاتیش قورئان لە دوو توێی موصحەفێکدا نەبووە، تاکو باسی ئەوە بکرێ: دەستی لێ مەدەن! بەڵکو هەموو ئایەتەکان پێکەوە هەر باسی ئەوەن، کە بەرپەرچی ئەو قسانەی ناحەزانی ئیسلام بدەنەوە، کە قورئان بەوە تۆمەتبار دەکەن کە شەیتانەکان بۆ موحەممەدی دەنێرن! هەروەها: جادووگەرەو، فاڵچییەو، شێتەو، شاعیرە، بەرپەرچدانەوەی ئەو تۆمەتانەیە.

www.alibapir.com


## حوكمی دەست لێدانی قورئان بۆ بابای بێ دەستنوێژ

ئێمە لەوبارەوە دوو ڕای زانایان دێنین:

**١)**- (القرطبي) لە تەفسیرەكەیدا دەڵێ: (**فَالْجُمْهُورُ عَلَى الْمَنْعِ مِنْ مَسِّهِ لِحَدِيثِ عَمْرِو بْنِ حَزْمٍ**)[١]، واتە: زۆربەی زانایان ڕایان وایە: نابێ دەست لە قورئان بدرێ (نەک لەبەر ئەم ئایەتە) بەڵكو لەبەر ئەو فەرموودەیەی (**عَمْرِو بْنِ حَزْمٍ**) كە دوایی دەیهێنین.

**٢)**- (الشوكاني)ش لەو بارەوە دەڵێ: (**قَدْ ذَهَبَ الْجُمْهُورُ إِلَى مَنْعِ الْمُحْدِثِ مِنْ مَسِّ الْمُصْحَفِ، وَبِهِ قَالَ عَلِيٌّ وَابْنُ مَسْعُودٍ وَسَعْدُ بْنُ أَبِي وَقَّاص وَسَعِيد ابْن زَيْدٍ وَعَطَاءٌ وَالزُّهْرِيُّ وَالنَّخَعِيُّ وَالْحَكَمُ وَحَمَّادٌ وَجَمَاعَةٌ مِنَ الْفُقَهَاءِ مِنْهُمْ: مَالِكٌ وَالشَّافِعِيُّ، لَكِنَّ ابْنَ عَبَّاسٍ وَأَبَا حَنِيْفَة يَقُوْلَانِ عَنْه: يَجُوزُ مَسّ المُحْدِثُ للقُرْآن**)[٢].

واتە: زۆربەی زانایان ڕایان وایە دروست نیە، دەست لە موصحەف بدرێ، (ئەوەی قورئانی تێدا نووسراوە)، ئەمەش ڕای (**عَلِيٌّ وَابْنُ مَسْعُودٍ وَسَعْدُ بْنُ أَبِي وقاص وسعيد ابن زَيْدٍ وَعَطَاءٌ وَالزُّهْرِيُّ وَالنَّخَعِيُّ وَالْحَكَمُ وَحَمَّادٌ وَجَمَاعَةٌ مِنَ الْفُقَهَاءِ مِنْهُمْ: مَالِكٌ وَالشَّافِعِيُّ رَحِمَهُم الله**)، بەڵام (**عبدالله بن عباس** رضي الله عنهما) لە هاوەڵان، (**أبو حنيفة**)ش لە شەرعزانان و هەندێكی دیكە لە زانایان گوتوویانە: دروستە بەبێ دەستنوێژیی دەست لە قورئان بدرێ، چ بێ دەستنوێژیی گەورە بێ، چ هی گچكە.

با لەو بارەوەش ئەم دوو دەقە بێنین:

**١)**- {**مِنْ مُحَمَّدٍ النَّبِيِّ إِلَى شُرَحْبِيلَ بْنِ عَبْدِ كُلَالٍ وَالْحَارِثِ بْنِ عَبْدِ كُلَالٍ، وَنُعَيْمِ بْنِ عَبْدِ كُلَالٍ قَيْلُ ذِي رُعَيْنٍ وَمَعَافِرَ وَهَمْدَانَ، أَمَّا بَعْدُ، وَكَانَ فِي كِتَابِهِ: أَلَّا يَمَسَّ الْقُرْآنَ إِلاَّ طَاهِرٌ**}

---

(١) ج١٤، ص١٧٢.

(٢) فتح القدير: ج٥، ص ١٩٦ و ١٩٧.

**(أخرجه مالك: ج١، ص١٩٩، عن عبدالله بن أبي بكر بن حزم مُرْسَلاً، وَصَحَّحَهُ الألباني لشواهد فِي «الإرواء»: ١٢٢).**

ئـەم نامەیـە کـە سـەنەدەکەیمان خوێنـدەوە، پێغەمبـەر ﷺ ناردوویـەتی: لـە موحەممـەد پێغەمبـەرەوە ﷺ **(إِلَى شُرَحْبِيـلَ بْنِ عَبْـدِ كُلَالٍ وَالْحَارِثِ بْنِ عَبْـدِ كُلَالٍ وَنُعَيْمِ بْـنِ عَبْـدِ كُلَالٍ)** کـە گـەورەی **(ذِي رُعَيْنٍ وَمَعَافِرَ وَهَمْدَانَ)**ن، [اتـە: پادشـاو حوکمـڕان]، لـە درێـژەی نامەکـەدا هاتـوە دوای ستایشـیی خـوا: نابـێ جگـە لـە ئینسـانی پـاک، دەسـت لـە قوڕئـان بـدات.

**٢)-** هەروەها ئەم دەقەش هەیە: **(قَالَ ابْنُ عُمَرَ** رضي الله عنهما**: قَالَ النَّبِيُّ** ﷺ**: لَا تَمَسَّ الْقُرْآنَ إِلَّا وَأَنْتَ طَاهِرٌ}** **(أخرجه الطبراني: ٣١٣٥، والدارقطني: ٦، والحاكم: ٦٠٥١، وقال: صحيح الإسناد، وأورده الألباني فـي «الإرواء»: ج ١، ص١٥٩)**، واتە: ئیبنو عومەر رضي الله عنهما دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: دەست لە قوڕئان مەدە، مەگەر تۆ پاک بی.

ئنجـا هەرچەنـدە ئـەم دەقانـەی سـوننەت لەوبـارەوە بـۆ کەسـێک تێبینیـی لـە سـەر سـەندو مەتنەکەیـان نەبـێ، دەگونجـێ پشـتیان پـێ ببەسـتێ، بـەڵام ناگونجـێ ئایەتەکـە بکرێتـە بەڵگـەی ئـەوەو، بـاسی هۆکارەکەیشـیمان کـرد.

لە ئۆرە کۆمەڵایەتییەکان لەگەڵتانین
Stay in touch on social media
نحن معكم عبر مواقع التواصل الاجتماعي
ڕاکەیاندنی مەکتەبی مامۆستا عەلی باپیر
AliBapir/عەلی باپیر
archive.org/details/@alibapir
AliBapir/عەلی باپیر
AliBapir
کەناڵی ڕاکەیاندنی مەکتەبی مامۆستا عەلی باپیر
www.alibapir.net
کوردی - عربي - English
ڕاکەیاندنی مەکتەبی مامۆستا عەلی باپیر

www.alibapir.com


**مەسەلەی دووەم:**

**باسی حاڵەتی گیانەڵاو ڕووح کێشرانی مرۆڤ، بە تایبەت لە بێبڕوایان و، بێ چارەیی خەڵکەکەی دەوری و، نیزیکیی فریشتان لێی و نەبینرانیان:**

خوا دەفەرمویٚ: ﴿ فَلَوْلَآ إِذَا بَلَغَتِ ٱلْحُلْقُومَ ﴿٨٣﴾ وَأَنتُمْ حِينَئِذٍ تَنظُرُونَ ﴿٨٤﴾ وَنَحْنُ أَقْرَبُ إِلَيْهِ مِنكُمْ وَلَـٰكِن لَّا تُبْصِرُونَ ﴿٨٥﴾ فَلَوْلَآ إِن كُنتُمْ غَيْرَ مَدِينِينَ ﴿٨٦﴾ تَرْجِعُونَهَآ إِن كُنتُمْ صَـٰدِقِينَ ﴿٨٧﴾ ﴾.

## شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە لە پێنج بڕگەدا:

١)- ﴿ فَلَوْلَآ إِذَا بَلَغَتِ ٱلْحُلْقُومَ ﴾، دەبووایە کاتێک دەگاتە گەروو (واتە: ڕووح دەگاتە گەروو)، دیارە (أل)ی سەر (**الحُلقُوم: للعَهْدِ الجِنْسِيِّ**) واتە: دەگاتە گەرووەکان، بەڵام جینسی گەرووەکانی کە زانراون هی بێبڕوایانن و، ڕاناوی (**بَلَغَت**) دەگەڕێتەوە بۆ ڕووح کە بە سیاق دەزانرێ، هەروەک لە شوێنی دیکەش دا خوا دەفەرمویٚ: ﴿فَقَالَ إِنِّيٓ أَحْبَبْتُ حُبَّ ٱلْخَيْرِ عَن ذِكْرِ رَبِّي حَتَّىٰ تَوَارَتْ بِٱلْحِجَابِ ﴿٣٢﴾ ﴾ ص، کە باسی خۆریش نەکراوە، واتە: تاکو خۆر لە پەردە گیرا.

٢)- ﴿ وَأَنتُمْ حِينَئِذٍ تَنظُرُونَ ﴾، ئێوە لەوکاتەدا تەماشا دەکەن، تێوە ڕاماون لە مردووەکە.

٣)- ﴿ وَنَحْنُ أَقْرَبُ إِلَيْهِ مِنكُمْ وَلَـٰكِن لَّا تُبْصِرُونَ ﴾، ئێمە لە ئێوە لێی نیزیکترین، بەڵام ئێوە نابینن، بێگومان مەبەست پێیان فریشتەکانە، یانی: فریشتەکانمان لە ئێوە لێی نیزیکترن، بەڵام ئێوە نایانبینن.

٤)- ﴿ فَلَوْلَآ إِن كُنتُمْ غَيْرَ مَدِينِينَ ﴾، دەجا دەبووایە ئەگەر ئێوە ملپێکەچکراو نین، یاخود: ئەگەر ئێوە سزاو پاداشت نادرێنەوە.

٥)- ﴿ تَرْجِعُونَهَآ إِن كُنتُمْ صَـٰدِقِينَ ﴾، دەبووایە بیگێڕنەوە، ئەگەر لە ڕاستانن، واتە: ئەگەر ڕاست دەکەن هەوڵبدەن ئەو ڕووحە بگێڕنەوە بۆ نێو جەستەی و، نەهێڵن

www.alibapir.com


لە جەستەی بچێتە دەرێ.ئەگەر ڕاست دەکەن، ئێوە لەبەر دەستی خوادا نین و، دەتوانن نەهێڵن مردنتان بەسەردا بێت.

(**الحُلقُومُ**) واتە: گەروو، (**الحُلقُومُ : تَجْوِيفٌ خَلْفَ تَجْوِيف الفَم، وَفِيهِ سِتُّ فَتْحَاتٍ: فتْحَة الفَمِ الخَلْفِيَّة، وفَتْحَتَا المِنْخرَيْن، وفَتْحَتَا الأُذُنَيْنِ، وَفَتْحَة الحُنْجُرة، وَهِيَ مَجْرَى الطَّعَام وَالشَّرَابِ وَالنَّفَس**)[1]. واتە: (**حُلقُوم**) بریتیە: لەو بۆشاییەی لە پشت زارەوە هەیە، شەش دەرچەی هەن: یەکێکیان دەرچەی پشتەوەی زارەو، هەردوو دەرچەی دوو کونە لووتەکان و، هەردوو دەرچەی دوو گوێیەکان و، دەرچەی قوڕقوڕاگە کە صندووقی دەنگەو، ئەو قوڕگە شوێنی پێدا ڕۆیشتنی خواردن و خواردنەوەو هەناسەشە.

هەڵبەتە (**لَوْلَا**) بۆ هاندانە، بەڵام لێرەدا بۆ دەستەوسان کردن (**تَعْجِيز**)ە واتە: بێگومان ئێوە ناتوانن ئەو ڕووحە کە لە جەستەکە دەردەکێشرێ، فریشتەکان دەیهێننە دەرێ، نەهێڵن بکێشرێ.

لێرەدا کە دەفەرموێ: ﴿ وَأَنتُمْ حِينَئِذٍ تَنظُرُونَ ﴾، (**الطبري**) دەڵێ: (**خَرَجَ الخِطَابُ هَاهُنَا عَامّاً للجَمِيْعِ وَالمُرَادُ بِهِ مَنْ حَضَر المَيْت مِنْ أَهْلِه وَغَيْرِهِم**)، لێرەدا هەرچەندە ڕووی دواندن بە گشتیی هاتوە، بەڵام مەبەست پێی ئەوانەن کە لە کاتی گیان سپاردن دا، ئامادەی مردووەکە دەبن، لە خزم و کەسی و جگە لە ئەوانیش.

(**الطبري**) لە تەفسیری ئەوەدا کە دەفەرموێ: ﴿ فَلَوْلَآ إِذَا بَلَغَتِ ٱلْحُلْقُومَ ﴾، دەڵێ: (**فَهَلَّا إِذَا بَلَغَتِ النُّفُوسُ عِنْدَ خُرُوجِهَا مِنْ أَجْسَادِكُمْ أَيُّهَا النَّاسُ! حَلَاقِيمَكُمْ**)، واتە: دەبووایە ئەی خەڵکینە! کاتێک کە ڕووحەکان لە جەستەتان دەچنە دەرێ و دەگەنە گەروەکانتان {ئەگەر ڕاست دەکەن، نەهێڵن دەرکێشرێن و بچنە دەرێ}.

---

(١) المعجم الوسيط: ص١٩٣.

www.alibapir.com


ئەم ئایەتانە چۆن پەیوەست دەبنەوە بەوانەی پێشێوە؟

**یەکەم:** بیرخستنەوەی مەرگ و بێدەسەڵاتیی بێبڕوایان لە بەرانبەر ڕووح دەرچوون دا، کەواتە: هەتا زووە خەمی خۆتان بخۆن! بەرلەوەی بکەونە حاڵەتی گیانەڵاو، هیچتان لە دەست نەیەت، بڕوا بە قورئان بێنن و، بەندایەتیی بۆ خوا بکەن و، سوپاسی ئەو نیعمەتەی خوا بکەن، کە بریتیە لە کتێب و بەرنامەکەی کە بۆی ناردوون.

**دووەم:** هەڕەشە لێکردنیانە بە سزای ڕۆژی دوایی، کە مردن دەروازەیەکە، وەک چۆن بڕواداران لەو دەروازەیەوە دەچن بۆ بەهەشتی پڕ نازو نیعمەتی خواو بەرەو پاداشتی خواو ڕەزامەندیی خوا، دەچن، دەروازەیەکیشە بۆ بێبڕوایان و تاوانباران کە لێوەی بچن، بەرەو سزاو ئازارێک کە خوا بۆی ئامادە کردوون.

ئنجا لەم ئایەتە موبارەکە هەڵدەهێنجرێ:

کە خوا دەفەرموێ: ﴿ فَلَوْلَآ إِذَا بَلَغَتِ ٱلْحُلْقُومَ ﴾، هەروەها لە ئایەتی (٢٦) لە سوورەتی **(القيامة)**دا: ﴿ كَلَّآ إِذَا بَلَغَتِ ٱلتَّرَاقِيَ ﴿٢٦﴾ ﴾، وازبێنن هەر کاتێک گەیشتە ئێسقانەکانی سینگ، **(تَرَاقِي)** کۆی **(تَرْقوة)**یە کە ئەو ئێسقانەی دەوری سینگە، لێیان وەردەگیرێ، وێڕای ئەوەی بە ئەزموونیش دیارە، کە ڕووح پلە پلە لە جەستە دێتە دەرێ و، لە نووکی پێوە دێ، دوا قۆناغی دەرچوونی ڕووح لە جەستەش، گەروویەو، ئنجا ئەوە بە چاویش دیارەو شتێکی ئەزموونکراویشە، کە دواجار، بابای مردوو دەم پێکدا دەدات و ڕووحەکەی دەردەچێ و چاوی ئەبڵەق دەبن.

www.alibapir.com



## مەسەلەی سێیەم و کۆتایی:

**باسی سەرەنجامی ڕووحی هەر کام لە سێ کۆمەڵەکە: زۆر نیزیکخراوان لە خواو، هاوەڵانی ڕاستەو، بەدرۆدانەرە گومڕایەکان، کە کۆمەڵی یەکەم و دووەم هەر کەسە بە پلەی خۆی بەهەشتیین و، هی سێیەمیشیان دۆزەخییە:**

خوا دەفەرمویٚ: ﴿فَأَمَّآ إِن كَانَ مِنَ ٱلۡمُقَرَّبِينَ ﴿٨٨﴾ فَرَوۡحٞ وَرَيۡحَانٞ وَجَنَّتُ نَعِيمٖ ﴿٨٩﴾ وَأَمَّآ إِن كَانَ مِنۡ أَصۡحَٰبِ ٱلۡيَمِينِ ﴿٩٠﴾ فَسَلَٰمٞ لَّكَ مِنۡ أَصۡحَٰبِ ٱلۡيَمِينِ ﴿٩١﴾ وَأَمَّآ إِن كَانَ مِنَ ٱلۡمُكَذِّبِينَ ٱلضَّآلِّينَ ﴿٩٢﴾ فَنُزُلٞ مِّنۡ حَمِيمٖ ﴿٩٣﴾ وَتَصۡلِيَةُ جَحِيمٍ ﴿٩٤﴾ إِنَّ هَٰذَا لَهُوَ حَقُّ ٱلۡيَقِينِ ﴿٩٥﴾ فَسَبِّحۡ بِٱسۡمِ رَبِّكَ ٱلۡعَظِيمِ ﴿٩٦﴾﴾.

## شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە هەشت بڕگەدا:

١)- ﴿فَأَمَّآ إِن كَانَ مِنَ ٱلۡمُقَرَّبِينَ﴾، ئنجا ئەگەر ئەو کەسە (کە ڕووحەکەی کێشراوە) لە نیزیکخراوان بێ، (نیزیکخراوان لە خوا بسم الله الرحمن الرحیم)، ئەوە پاداشتەکەی:

٢)- ﴿فَرَوۡحٞ وَرَيۡحَانٞ وَجَنَّتُ نَعِيمٖ﴾، شوێنی تەرخانکراو بۆ ڕووحەکەی، دڵخۆشیی و فەڕەحنایی و ڕەیحانەو باخی پڕ نیعمەتە، چونکە باس باسی ڕووح کێشرانە واتە: ئەو شوێنەی ڕووحەکەی دەچێتێ: ﴿فَرَوۡحٞ وَرَيۡحَانٞ وَجَنَّتُ نَعِيمٖ﴾، سێ وشەی بەکارهێناون: رَوْح، رَيْحان، جَنَّة نعيم، (الطبري) لە بارەی (رَوْح)ەوە گوتوویەتی: دەڵێ: **(الرَّوْحُ: الفَرَحُ وَالرَّحْمَةُ وَالمَغْفِرَة)**، (مُجَاهد) دەڵێ: **(الرَّوْحُ: الرَّاحَةُ) (الطبري: ٣٣٦٧٢)**.

کەواتە: (رَوْح) واتە: دڵخۆشیی و بەزەیی و لێبوردنە (مجاهد) دەڵێ: (رَوْح) ئاسوودەییە.

لە بارەی (الرَّيْحَان)ەوە، (الطبري) دەڵێ: **(الرَّيْحَانُ: المَعْرُوفُ، يُتَلَقَّى بِهِ عِنْدَ المَوْتِ)**، ئەو ڕیحانەیەی زانراوە (بۆنی خۆش) لە کاتی مردندا، بۆنەکەی بە بن تفنکی هەڵا دەبردرێ.

www.alibapir.com


(جنة نعیم)یش باخی پڕنازو نیعمەتە.

٣)- ﴿ وَأَمَّآ إِن كَانَ مِنَ أَصۡحَـٰبِ ٱلۡيَمِينِ ﴾، بەڵام ئەگەر لە هاوەڵانی دەستە ڕاست بێ، واتە: ئەوانەی نامەی کردەوەکانیان بە دەستی ڕاست دراوەتەوە.

٤)- ﴿ فَسَلَـٰمٌ لَّكَ مِنۡ أَصۡحَـٰبِ ٱلۡيَمِينِ ﴾، سەلامەتیی لە تۆبێ و سڵاوت لێبێ لە هاوەڵانی ڕاستەوە.

**أ-** زانایان چوار واتایان بۆ ئەم ڕستەیە باسکردووون: (**سَلاَمَاً مِنْ عِنْدِ اللهِ وَسَلَّمَت عَلَيْهِ مَلاَئِكَةُ الله**)، (**جامع البيان: ٣٣٨٦٢**) واتە: سەلام لەلایەن خواوەو، فریشتەکانی خواش سڵاوی لێدەکەن.

**ب-** (**إبن زيد**) وەک (**الطبري**) لێوەی هێناوە دەڵێ: (**سِلْمٌ مِمَّا يَكْرَهُ**)، (**جامع البيان: ٣٣٦٨٣**) واتە: سەلامەتە لەوەی پێی ناخۆشە.

**ج-** هەندێکیش گوتوویانە: ﴿ فَسَلَـٰمٌ لَّكَ مِنۡ أَصۡحَـٰبِ ٱلۡيَمِينِ ﴾، واتە: (**سَلَامٌ لَكَ إِنَّكَ مِنْ أَصْحَابِ الْيَمِينِ**)، تۆ کە بە دەستی ڕاستت نامەکەت وێدراوەتەوە (نامەی کردەوەکانت) سەلام لە تۆ بێ، تۆ لە هاوەڵانی دەستە ڕاستی.

**د-** مانایەکی دیکەشی هەیە: (**فَسَلَامٌ لَكَ يَا أَيُّهَا النَّبِيُّ ﷺ من أصحاب اليمين**)، سەلام لە تۆ بێ ئەی پێغەمبەر ﷺ! لە هاوەڵانی دەستە ڕاستەوە، ئەوان سڵاوت لێ دەکەن، کەواتە: بۆ خۆشیان لە حاڵەتی سەلامەتیی و ئاشتیی و خێرو خۆشییدان.

٥)- ﴿ وَأَمَّآ إِن كَانَ مِنَ ٱلۡمُكَذِّبِينَ ٱلضَّآلِّينَ ﴾، بەڵام ئەگەر ئەو کەسە (ئەو ڕووحەی کێشراوە خاوەنەکەی) لە بە درۆدانەرانی گومڕا بووبێ.

٦)- ﴿ فَنُزُلٌ مِّنۡ حَمِيمٍ وَتَصۡلِيَةُ جَحِيمٍ ﴾، ئەوە خواردنی بۆ ئامادەکراوی هەیە لە ئاوی کوڵاوو، دەشخرێتە نێو کڵپەی دۆزەخەوە، (**التَّصْلِيَة: التَّفْعِلَةُ مِنْ صَلاَّهُ اللَّهُ النَّارَ، فَهُوَ يُصَلِّيهِ تَصْلِيَة، وَذَلِكَ إِذَا أَحْرَقَهُ بالنَّار**)، (**يُصَلِّيهِ تَصْلِيَة**) واتە: (**تصلية**) (**تفعلة**) یە لە (**صلاّه الله النار فهو يُصَلِّيه تصليةً**) خوا بە ئاگر سووتاندی، دەیسووتێنێ، سووتاندن،

www.alibapir.com


بەڵام پێشتریش گوتوومانە: (صَلِي بالنار) بەس ئەوە نیە کە بە ئاگر بسووتێ، بەڵکو سووتاندنێکی تایبەتە، وەک عەرەب دەڵێن: (شَاةٌ مَصْلِيّة) مەڕ کە لە هەر چوار دەورەیەوە ئاگری دەدرێتە بەرو دەپیشێنرێ، ئەوە پێی دەگوترێ: (صَلِي).

٧)- ﴿إِنَّ هَٰذَا لَهُوَ حَقُّ ٱلْيَقِينِ﴾، ئا ئەوەی باسکرا، چەسپاوەو جێی دڵنیاییە، (الطبري) دەڵێ: (حَقُّ الأَمْرِ اليَقِيْن) واتە: هەقی قسەیەکی جێی دڵنیاییە، یاخود: (الحَقُّ اليَقيْن) یانی: ئەمە چەسپاوێکی جێی دڵنیاییە، (حَق) بە مانای چەسپاو، (يَقِيْن)یش بە مانای شتێک کە زانراوەو، هیچ دوو دڵیی لە بارەوە نیە.

٨)- ﴿فَسَبِّحْ بِٱسْمِ رَبِّكَ ٱلْعَظِيمِ﴾ ئنجا {مادام وایە} ناوی پەروەردگاری مەزنت بە پاک بگرە.

## چوار بەڵگە لەسەر سزا و نیعمەتی بەرزەخ:

لە کۆتایی تەفسیری ئەم سوورەتە موبارەکەدا دەڵێین:

١- لە تەفسیری سوورەتی (المؤمنون) ئایەتی ژمارە (١٠٠)دا، کە دەفەرموێ: ﴿حَتَّىٰٓ إِذَا جَآءَ أَحَدَهُمُ ٱلْمَوْتُ قَالَ رَبِّ ٱرْجِعُونِ ﴿٩٩﴾ لَعَلِّىٓ أَعْمَلُ صَٰلِحًا فِيمَا تَرَكْتُ ۚ كَلَّآ ۚ إِنَّهَا كَلِمَةٌ هُوَ قَآئِلُهَا ۖ وَمِن وَرَآئِهِم بَرْزَخٌ إِلَىٰ يَوْمِ يُبْعَثُونَ ﴿١٠٠﴾﴾ المؤمنون، باسێکی تێرو تەسەلمان لە بارەی قۆناغی بەرزەخەوە کرد، لێرەدا هەر ئەوەندە دەڵێین:

لە قورئاندا، هەم ئایەتی ژمارە (١٠٠)ی سوورەتی (المؤمنون): ﴿وَمِن وَرَآئِهِم بَرْزَخٌ إِلَىٰ يَوْمِ يُبْعَثُونَ ﴿١٠٠﴾﴾، لە پشتیانەوە دوای مردنیان پەردەیەک هەیە، تاکو ڕۆژێک کە تێیدا زیندوو دەکرێنەوە، کەواتە: قۆناغی بەرزەخ، قۆناغێکی ڕاگوزەرەو دەکەوێتە نێوان دنیاو دواڕۆژەوە، چونکە خوا ناوی لێناوە: بەرزەخ و نێوانە لە بەینی ژیانی دنیادا کە کۆتایی دێ، هەتاکو ڕۆژی زیندوو کرانەوەو، ئەو قۆناغە دەکەوێتە نێوانیانەوە.

www.alibapir.com


**٢-** هەروەها ئەو دوو ئایەتانەی سوورەتی (**غافر**)، بەڵگەیەکی زۆر بەهێزن، لەسەر هەبوونی قۆناغی بەرزەخ، کە دەفەرموێ: ﴿ فَوَقَىٰهُ ٱللَّهُ سَيِّـَٔاتِ مَا مَكَرُواْ ۖ وَحَاقَ بِـَٔالِ فِرْعَوْنَ سُوٓءُ ٱلْعَذَابِ ﴿٤٥﴾ ٱلنَّارُ يُعْرَضُونَ عَلَيْهَا غُدُوًّا وَعَشِيًّا ۖ وَيَوْمَ تَقُومُ ٱلسَّاعَةُ أَدْخِلُوٓاْ ءَالَ فِرْعَوْنَ أَشَدَّ ٱلْعَذَابِ ﴿٤٦﴾ ﴾، لە باسی ئەو بەندە بڕوادارەدا، کە بەرگریی لە مووسا (عَلَيْهِ الصَّلاَةُ وَالسَّلاَم) کردوە دەفەرموێ: خوا لە خراپەی پیلانەکانی ئەوان، کە دەیانگێڕان پاراستی و دارو دەستەی فیرعەونیش سزایەکی خراپ دەوری دان، ئاگرە لەسەری ڕادەنوێنرێن بەیانیان و ئێواران، کاتێکیش (سَاعَة) دێ {واتە: قیامەت} ﴿ أَدْخِلُوٓاْ ءَالَ فِرْعَوْنَ أَشَدَّ ٱلْعَذَابِ ﴾، دەگوترێ: دارو دەستەو شوێنکەوتووانی فیرعەون بخەنە نێو سەختترین سزاوە.

کەواتە: پێش (**ساعة**)ش: ﴿ ٱلنَّارُ يُعْرَضُونَ عَلَيْهَا غُدُوًّا وَعَشِيًّا ﴾، بەیانیان و ئێواران لەسەر ئاگر ڕادەنوێنرێن، بەڵام کاتێک قیامەت دێ، دەگوترێ: بیانخەنە نێو سەختترین سزاوە.

**٣-** بەڵگەیەکی دیکەی سێیەم لەو بارەوە، کە زۆر بەڵگەیەکی ڕۆشنە، ئەوەیە کە خوا لە بارەی گەلی نووحەوە، لە سوورەتی (**نوح**) ئایەتی ژمارە (٢٥)دا دەفەرموێ: ﴿ مِّمَّا خَطِيٓـَٔـٰتِهِمْ أُغْرِقُواْ فَأُدْخِلُواْ نَارًا فَلَمْ يَجِدُواْ لَهُم مِّن دُونِ ٱللَّهِ أَنصَارًا ﴿٢٥﴾ ﴾**نوح**، بە هۆی گوناهەکانیانەوە خنکێنران و، یەکسەریش خرانە نێو ئاگرەوەو، جگە لە خواش هیچ هاوکارو یارمەتییدەرێکیان نەبوو.

کەواتە: یەکسەر دوای خنکێنرانیان، خراونە نێو ئاگرەوە واتە: لە قۆناغی بەرزەخدا، چونکە جارێ قیامەت نەهاتوە.

**٤-** هەروەها ئەم ئایەتانەی سوورەتی (**الواقعة**)ەش بەڵگەیەکی دیکەی چوارەمن لەوبارەوە، وەک لەو باسەدا کە لە سوورەتی (**المؤمنون**)دا کردوومانە، ئەم ئایەتانەشمان هێناونەوە کە خوا بِسْمِ اللهِ الرَّحْمنِ الرَّحِيمِ لەسەرەتای سوورەتی (**الواقعة**) باسی چوونە بەهەشت و چوونە دۆزەخی مرۆڤەکان دەکات واتە: لە قیامەتدا، چونکە لەوێ باسی ئاخیر زەمان، دوایی

www.alibapir.com


باسی قیامەت دەکات: ﴿وَكُنتُمْ أَزْوَاجًا ثَلَاثَةً ۝٧﴾ الواقعة، هەم دوای ئاخیر زەمان و هەم دوای قیامەت، باسی ئەو سێ کۆمەڵەی کردوە، بەڵام لێرە دوای ئەوەی باسی ڕووح کێشران و چوونە بەهەشتی: (**مُقَرَّبِيْن وَأَصْحَابُ اليَمِيْن**)و، چوونە دۆزەخی: (**المُكَذِّبِيْن الضَّالين**) کراوە، کەواتە: ئەمەی ئێرە قۆناغی بەرزەخەو، ئەوەی پێشتر باسی قیامەتە، بۆیەش خوا ﷻ لەوێ باسی هەر سێ کۆمەڵەکەی هێناوە: (**السَّابِقُون المُقَرَّبُون**) کە باسی پاداشتەکەیانی کردوە بە درێژیی، پاشان: (**أَصْحَابُ اليَمِيْن**) دیسان باسی پاداشتیانی کردوە بە درێژیی، هەروەها: (**أَصْحَابُ الشِّمَال**) باسی سزایەکەیانی کردوە بە درێژیی، بەڵام لێرەدا بە کورتیی باسیکردوە، چونکە ئەوێ ژیانی هەتا هەتایی قیامەتە لە بەهەشتدا، بۆ بڕواداران و، لە دۆزەخ دا بۆ بێبڕوایان و خراپەکاران و تاوانباران، بەڵام لێرە لە قۆناغی بەرزەخدایە، بۆیە خوا ﷻ لە قەدەر ئەوە کە قۆناغێکی ڕاگوزەرو کورتە، بە کورتییش باسی هەر کام لە پاداشتی: (**مُقَرَّبِيْن وَأَصْحَابُ اليَمِيْن**)و، سزای: (**أَصْحَابُ الشِّمَال**) بەدرۆدانەرو گومڕایەکانی کردوە.

لە خوای پەروەردگار دەپاڕێینەوە کە یارمەتیی و تەوفیقی زیاترمان بدات، باشتر لە فەرمایشتەکەی تێبگەین و، زیاتریش بە هۆیەوە پێبگەین و، یارمەتییشمان بدات دەستمان کراوە بێ، کە ئەو بەهرەیەی خۆمان وەریدەگرین لە قورئان و هیدایەتی خوا، بیگەیەنین بە دەوروبەری خۆمان و، دەوروبەری خۆشمانی پێ چاک و پاک بکەین، بە پێی ڕێبازی پێغەمبەری کۆتایی موحەممەد ﷺ و میتۆد (**منهج**)ێک، کە پێشینیی چاکمان پەیڕەوییان لێکردوە، بۆ مامەڵەکردن لەگەڵ قورئان و ڕێبازی پێغەمبەری خوادا ﷺ.

**سُبحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ، أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ أَنْتَ، أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ.**

www.alibapir.com


## نێوەڕۆك



## تەفسیری سوڕەتی (الطور)

www.alibapir.com




## تەفسیری سوڕەتی (النجم)

www.alibapir.com

www.alibapir.com


## تەفسیری سوڕەتی (القمر)

www.alibapir.com




## تەفسيرى سورەتى (الرحمن)

www.alibapir.com




## تەفسیری سوڕەتی (لواقعة)

www.alibapir.com


لە تۆڕە کۆمەڵایەتییەکان لەگەڵتانین
Stay in touch on social media
نحن معكم عبر مواقع التواصل الاجتماعي
ڕاگەیاندنی مەکتەبی مامۆستا عەلی باپیر
AliBapir/عەلی باپیر
archive.org/details/@alibapir
AliBapir/عەلی باپیر
AliBapir
کەناڵی
ڕاگەیاندنی مەکتەبی مامۆستا عەلی باپیر
www.alibapir.net
کوردی - عربي - English
ڕاگەیاندنی مەکتەبی مامۆستا عەلی باپیر